چاپی یەکەم
2013

# خاڵەکانی بڕیاردان



جۆرج دەبلیو. بوش

GEORGE W. BUSH

# DECISION POINTS

وەرگێڕانی: لە ئینگلیزییەوە

بەرهەم ناودەشتی

جۆرج دەبلیو. بوش

# خاڵەکانی بڕیاردان

وەرگێڕانی لەئینگلیزییەوە:

بەرهەم ناودەشتی

چاپی یەکەم

٢٠١٣

## پێڕست

# پێشەکی

لەدوایین ساڵی سەرۆکایەتییەکەمدا، بە شێوەیەکی جددی بیرم لە نووسینەوەی بیرەوەرییەکانم دەکردەوە. لەسەر پێشنیاری کارل رۆڤ، زیاتر لەدە دوانزە مێژوونووسم بینی. ئەوان پێیان وتم ئەرکت لەسەر شانە کە بۆکەسێك بنووسیت. پێیان وابوو گرنگە کە روانگەی خۆم لەلایەن خۆمەوە لەبارەی سەرۆکایەتی تۆمار بکەم.

مێژوونووس (جەی وینیك) وتی "فیلمی سینەمایی ئەپۆلۆ ۱۳"ت بینیووە؟ هەمووان دەزانن کە هەسارەناسەکان لەکۆتاییدا دەگەڕێنەوە سەر زەوی، بەڵام تۆ زۆر تامەزرۆیت و ئەپرسیت ئەمە چۆن بوو؟"

نزیکەی هەموو مێژوونووسەکان پێشنیاری ئەوەیان کرد کە *بیرەوەرییەکانی* سەرۆك (یولیسێس ئێس.گرانت) بخوێنمەوە. کتێبەکە دەنگی ناوازەی ئەو دەگەیەنێت. ئەو قسەی نەستەق بەکاردەهێنێت بۆ زیندووکردنەوەی ئەزموونەکەی لەماوەی شەڕی ناوخۆدا. توانیم لەوە تێبگەم کە بۆچی بەرهەمەکەشی ئەوەندە پایەدار بووە.

وەکو گرانت، بڕیارمدا بەسەرهاتی تاقەتپروکێنی ژیانم یان سەرۆکایەتییەکەم نەنووسمەوە. لەبری ئەمە، بە سەرنج خستنەسەر لایەنی هەرە گرنگی کارەکەم، واتە بڕیارەکان، سەردەمی خۆمم لەکۆشکی سپی گێڕاوەتەوە. هەر بەشێك لە بەشەکان لەسەر بنەمای بڕیارێکی گەورە یان زنجیرەیەك بڕیاری پەیوەندیدار داڕێژراوە. سەرەنجام، کتێبەکە وەکو هەڵگری بیرۆکەیەك بەرجەستە دەبێت، نەك لەشێوەی کرۆنۆلۆژیای رۆژانەدا. باسی هەموو ئەو کێشانە ناکەم کە هاتوونەتەوە بەردەمم، زۆرێك لەستاف و ئەندامانی دڵسۆزی کابینەکەم بە کورتی باسکراون یان هەر ناویان نەهێنراوە. لەگەڵ ئەوەشدا ستایشی خزمەتەکەیان دەکەم و هەمیشە سوپاسگوزار دەبم لەبەرانبەر بەشدارییەکانیان.

ئامانجەکانی نووسینی ئەم کتێبەم دوو لای هەیە. یەکەم، هیوادارم دیمەنێك لەوە پیشان بدەم کە خزمەتی سەرۆکایەتی بۆ ماوەی هەشت ساڵی یەك لەدوای یەك وەکو چی وایە. بڕوام وایە کە گەیشتن بە دەرەنجامی دیاریکراو لەبارەی سەرۆکایەتییەکەمەوە - یان هەر سەرۆکایەتییەکی ئەم دواییە - تاوەکو چەند دەیەدەیەك دواتر ئەستەمە. تێپەڕبوونی کات وا دەکات کە سۆزەکان سارد ببنەوە، ئەنجامەکان روون ببنەوە و لێکۆڵەرەکان بۆچوونە جیاجیاکان بەراورد بکەن. هیوادارم ئەم کتێبە خزمەتێك بەوانە بکات کە تاووتوێ ئەم ماوەیەی مێژووی ئەمریکا دەکەن.

دووەم، لەبەرئەوە دەنووسم کە روانگەیەك بدەمە خوێنەران لەبارەی بڕیاردان لەژینگەیەکی ئاڵۆزدا. زۆرێك لەو بڕیارانەی کە دەگەنە سەر مێزی سەرۆك زۆر قورسن کە بە هەردوولادا پاساوی لەگەڵدایە. بە درێژایی کتێبەکە، ئەو رێگەچارانەی کە هەڵسەنگاندوون و ئەو پرەنسیپانەی لەسەریان رۆیشتووم باس دەکەم، هیوادارم ئەمە تێگەیشتنێکی باشتر فەراهەم بکات لەبارەی ئەوەی کە بۆچی ئەو بڕیارانەم داوە. تەنانەت لەوانەیە بۆ بڕیارەکانی ژیانی خۆشت بەکەڵك بن.

*خاڵەکانی بڕیاردان* زیاتر لەسەر بنەمای یادەوەرییەکانم بونیادراوە. بە یارمەتی توێژەران، باسەکەم بە بەڵگەنامەکانی حکومەت، تێبینییە هاوکاتەکان، گفتوگۆ تایبەتییەکان، راپۆرتە هەواڵەکان و سەرچاوەکانی تر، کە هەندێکیان بە نهێنی دەمێننەوە، تۆکمە کردووە. حاڵەت هەیە کە تیایدا دەبووایە تەنیا و تەنیا پشت بە بیرەوەرییەکانم ببەستم. ئەگەر کەموکورتییەکیش لەم کتێبەدا هەبێ، بەرپرسیارێتییەکەی لەئەستۆی منە.

لەو لاپەڕانەی دواییدا، ئەوپەڕی هەوڵی خۆمم داوە تا لەبارەی ئەو بڕیارانە بنووسم کە تیایاندا راست بووم، ئەو بڕیارانەی کە تیایاندا هەڵە بووم و ئەوانەش کە بە شێوەیەکی جیاواز ئەمدان ئەگەر دەرفەتێکم پێ بدرایە. بێگومان لەسەرۆکایەتیدا، پێداچوونەوە نیە. پێویستە ئەوە بکەیت کە پێت وایە راستە و دەرەنجامەکان قبوڵ بکەی. لەماوەی ئەو هەشت ساڵەی سەرۆکایەتیمدا هەموو رۆژێك هەوڵمداوە ئەمە بکەم. خزمەتکردن وەکو سەرۆك فەخری تەمەنێکە، پێدانی دەرفەتێکیش لەلایەن ئێوەوە بۆ گێڕانەوەی بەسەرهاتەکەم بەرز دەنرخێنم.

# وازهێنان

(لۆرا)ی خێزانم بە دەنگە هێمنەکەیەوە پرسیارێکی سادەی کرد "دوایین ڕۆژی خواردنەوەت بیر دێتەوە؟" بە هەڕەشە یان بۆڵەبۆڵ ئەم پرسیارەی نەکرد. چاوەڕێی وەڵامێکی دەکرد. ژنەکەم لەو جۆرانەیە کە ساتەکان هەڵدەبژێرێت. ئەمەش ئەو ساتە بوو.

بە داکۆکییەوە وەڵامم دایەوە، "بێگومان بیرم دێتەوە". پاشان خەیاڵم چووەوە سەر هەفتەی رابردوو. لەشەوی دووشەممەدا چەند بیرەیەکم لەگەڵ هاوڕێیان خواردبووەوە. سێشەممە، خواردنەوەی دڵخوازی پاش نانی ئێوارەم ئامادەکردبوو: بێنێدیکتین و براندی (بی ئەند بی). چوارشەممە، دوای ئەوەی (باربارا) و (جێنا)ی کچم بردبووە ناو جێگە، دوو ویسکیی بۆربون و سێڤنم خواردبووەوە. پێنجشەممە و هەینی شەوانی خواردنەوەی بیرە بوون. ڕۆژی شەممە، من و لۆرا لەگەڵ هاوڕێیان دەچووینە دەرەوە. پێش نانی ئێوارە چەند مارتینی-یەک، لەگەڵ نانی ئێوارە چەند بیرەیەک و پاش نانی ئێوارە چەند (بی ئەند بی)یەکم دەخواردەوە. ئوە-ئۆه، هەفتەی یەکەمم وەکو پێویست نەبوو.

بە درێژایی ڕۆژێکی وشك بەردەوام بووم لەسەر چالاککردنەوەی یادەوەرییەکانی چەند هەفتەی رابردووم، پاشان مانگی رابردووم، پاشان لەمێژتر. نەمتوانی هیچم بێتەوە یاد. خواردنەوە ببوو بە خوویەك.

کەسایەتییەکی خووگرتووم هەیە. بۆ ماوەی نزیکەی نۆ ساڵ جگەرەم کێشا، لە سەردەمی کۆلێژەوە دەستم پێکردبوو. بە مژینی توتن وازم لە جگەرەکێشان هێنا. لە ڕێگەی جوینی توتنی گەڵادرێژەوە وازم لەمەش هێنا. دواجار هاتمەسەر کێشانی چروت.

بۆ ماوەیەك هەوڵمدا خویەكی خواردنەوەی مەعقولم هەبێت. بە هیچ شێوەیەك ئەوەندەی هەندێ سەرخۆش خراپ نەبووم كە لەو شارەی زێدی خۆم، میدلاند، تەكساس، دەمناسین. بە ڕۆژ یان كاتی دەوام نەمدەخواردەوە. لەش و لارم بێ عەیب بوو و هەموو ڕۆژێك دوانیوەڕۆكەی ڕام دەكرد، ئەمەش خوویەكی ترم بوو.

بەپێی تێپەڕبوونی كات، بۆم دەركەوت كە نەك تەنیا بۆ ئەوەی جەستەم ڕێك بێت بەڵكو بۆ ئەوەش كە لەشم لە ژەهرەكان پاك بكەمەوە، ڕام دەكرد. پرسیارە بچوكەكەی لۆرا، كۆمەڵێك پرسیاری گەورەی خۆمی وروژاند. ئایا ویستبووم كاتێك لەگەڵ كچەكانم لەماڵەوە بەسەر ببەم یان لەدەرەوە بە خواردنەوەوە خەریك بم؟ حەزم دەكرد لەگەڵ لۆرا لەناو جێگەدا بخوێنمەوە یان بە تەنیا دوابەدوای خەوتنی خێزان خەریكی خواردنەوەی بۆربون بم؟ ئایا دەمتوانی لە خوداوەند نزیكتر بكەومەوە یان كحول ببووە خوای من؟ وەڵامەكانم دەزانی، بەڵام سەخت بوو ئیرادەم كۆ بكەمەوە بۆ دروستكردنی گۆڕانكاری.

لەساڵی ١٩٨٦دا، من و لۆرا، هەروەها هاوڕێی نزیكمان، (دۆن) و (سوزی ئێڤان)یش بووین بە چل ساڵ. بەو بۆنەیەوە بڕیارماندا ئاهەنگێكی هاوبەش لە سەیرانگەی (برۆدمور) لە (كۆلۆرادۆ سپرینگس) بگێڕین. هاوڕێیانی سەردەمی منداڵی، جۆ و جان ئۆنێیل، براكەم نێیلێ و هاوڕێیەكی ترمان لە میدلاند، پێنی سۆیەر، بانگهێشت كرد.

ئێوارەخوانی ڕەسمیی یادی لەدایكبوون لەشەوی شەممەدا بوو. ژەمێكی گەورەمان ڕێكخستبوو كە جۆرەها بوتڵە شەرابی (سیلڤەر ئۆك)ی شەست دۆلاری لەگەڵدا دانرابوو. بە خۆشیی تەندروستیمان، منداڵەكانمان، دایەنەكان كە تاوەكو گەڕانەوە چاودێری منداڵەكانیان دەكرد، خواردمانەوە. دەنگمان بەرزتر و بەرزتر بووەوە، هەمان بابەتمان دووبارە و چەندبارە دەكردەوە. من و دۆن لەخاڵێكدا ئەوەندە چووبووینە قووڵاییەوە كە بڕیارمدا لەمێزێكەوە بچینە مێزێكی تر. كۆتاییمان بە دانیشتنەكە هێنا، پارەی خوانێكی گەورەماندا و چووینە ناو جێگە.

بۆ سبەینێ بەیانییەکەی بە سەرئێشەیەکی سوکەوە خەبەرم بووەوە. کاتێك بۆ راکردنی رۆژانە چوومە دەرەوە، نەمتوانی زۆرێك لەو شتانەی شەوی رابردووم بێتەوە یاد. نزیکی نیوەی رێگام بڕیبوو کە مێشکم ساف بووەوە. دووڕیانەکانی ژیانم هاتەوە بەرچاو. چەند مانگێك بوو دوعام دەکرد کە خوا پیشانم بدات کە چۆن بە شێوەیەکی باشتر ئیرادەی ئەو بەرجەستە بکەم. خوێندنەوەکانم بۆ کتێبی پیرۆز، سروشتی وەسوەسە و ئەو واقیعەی روون کردبووەوە کە دەشێ خۆشییەکانی سەر زەوی شوێنی خۆشەویستی خوا بگرنەوە. کێشەی من تەنیا خواردنەوە نەبوو، بەڵکو خۆپەرستیش بوو. کحول وایلێکردبووم خۆم لەسەروو هەموو ئەوانیتر، بە تایبەت خێزانەکەم ببینمەوە. لۆرا و کچەکانم زۆر لەوە زیاتر خۆش دەویستن کە بهێڵم ئەمە روو بدات. ئیمان رێگای چوونە دەرەوەی پیشان دام. دەمزانی کە دەتوانم بۆ گۆڕانم پشت بە بەخشندەیی خوا ببەستم. ئاسان نەبوو، بەڵام دواجار، بڕیاری خۆمم دا: وازم لەخواردنەوە هێنا.

کاتێك گەڕامەوە بۆ ژووری هۆتێلەکە. بە لۆرام وت کە هەرگیز جارێکی تر ناخۆمەوە. بە جۆرێك لێی روانیم وەك بڵێی هێشتا بەری نەداوم، ئینجا وتی، "باشە، جۆرج".

دەمزانی بیر لەچی دەکاتەوە. پێشتر وتبووم واز دێنم و بێ سوود بوو. شتێك کە ئەو نەیزانی، ئەوە بوو کە ئەمجارەیان من لەناخەوە گۆڕابووم- ئەمەش یارمەتیدەر دەبوو بۆئەوەی رەفتارم بۆ هەمیشە بگۆڕم.

پێنج رۆژی خایاند تا بڕیارەکەم رەونەقی نەما. هەر کە یادەوەریم لەسەرئێشەکە نەما، وەسوەسەی خواردنەوەم توند بوو. جەستەم کەوتە ناڵەناڵ بۆ کحول. دوعای بەهێزیم کرد بۆ رووبەڕووبوونەوەی ئارەزووەکانم. وەکو دیسپلینێك بۆ خۆم، خێراتر رام دەکرد و رێگایەکی درێژترم دەبڕی. هەروەها بڕێکی زۆر چکلێتم دەخوارد. جەستەم بۆ شەکر دەیناڵاند، چکلێتیش شێوازێکی ئاسان بوو بۆ دەرخوارد دانی. ئەمە پاڵنەرێکی تری لا دروست کردم بۆ راکردن: بۆ دابەزاندنی چەند پاوەندێك لەکێشم.

لۆرا زۆر پاڵپشت بوو. هەستی کرد کە بە راستی دەمەوێ واز بێنم. هەر کاتێك کە بابەتەکەم دەهێنایە بەر باس، هانی دەدام کە بەردەوام بم. هەندێ جار تەنیا لەبەر ئەوە باسی خواردنەوەم دەکرد تا گوێم لە قسە هاندەرەکانی بێت.

هاوڕێیەکانیشم یارمەتیدەر بوون، هەرچەندە زۆربەیان ئەو کاتانەی لایان بووم وازیان لەخواردنەوە نەهێنا. سەرەتا زۆر قورس بوو تەماشای یەکێك بکەیت کە کۆکتێل یان بیرە دەخواتەوە. بەڵام بوون بە کە سێکی بێدار یارمەتیدام درك بەوە بکەم کە دەبێ کاتی سەرخۆش بوون چەندە بێ مێشك دەرکەوتبێتم. چەند کات تێپەڕی، ئەوەندە هەستم بە تین و توان کردەوە لە خۆمدا. نەخواردنەوە خۆی بۆ خۆی بووە خوویەك- خوویەك کە خۆشحاڵ بووم بە پاراستنی.

***

وازهێنان لەخواردانەوە یەکێك بوو لەبڕیارە هەرە قورسەکان کە تاوەکو ئەو کاتە دابێتم. بەبێ ئەم بڕیارە، هیچ کام لەو بڕیارانەی تر کە لەم کتێبەدا باس کراون، نەئەدران. لەگەڵ ئەوەشدا، بەبێ ئەزموونەکانی ئەو چل ساڵەی ژیانم، وازهێنان لەخواردنەوەش ئاسان نەدەبوو. بەشی زۆری کارەکتەرم، بەشێکی زۆری بیروباوەڕم، لەماوەی ئەو چوار دەیەی یەکەمدا پێکهاتن. گەشتەکەم تەحەدی، ململانێ و شکستی تێدا بوو. ئەمە گەواهیی بەهێزیی خۆشەویستی، هێزی ئیمان و ئەو راستییە بوو کە خەڵکی دەتوانن بگۆڕێن. لەسەرووی ئەمانەشەوە، رەوتێکی سەرنجڕاکێش هەبوو.

***

من یەکەم کوڕی جۆرج و باربارا بوش-م. باوکم بۆ دووەم جەنگی جیهانی جلی عەسکەری لەبەر کرد و هەر کە گەڕایەوە، دەنکەکەی مارە کرد و خێرا خێزانێکی نوێی پێکهێنا. بەسەرهاتەکە بۆ زۆرێك لە ژن و مێردە گەنجەکانی سەردەمی خۆی ئاشنا بوو. لەگەڵ ئەوەشدا هەمیشە شتێکی سەرووئاسایی هەبوو لەبارەی (جۆرج ئێیچ.دەبلیو بوش)ەوە.

کاتێك هێرش کرایە سەر بەندەری (پێرل)، باوکم خوێندکاری ئامادەیی بوو. لە زانکۆی (یەل) وەرگیرابوو. لەبری ئەمە، لەهەژدەهەمین ساڵیادی لەدایکبوونیدا لەهێزی دەریایی خۆی ناونووس کرد و بوو بە گەنجترین فڕۆکەوان. بەر لەوەی کە بەرەو ئۆقیانووسی ئارام بکەوێتەڕێ، کەوتە داوی خۆشەویستیی کچێکی جوانەوە بە ناوی (باربارا پیەرز).

دەستبەجێ بە هاورێکانی وت کە مارەی دەکات. وەکو یادگارییەك، ناوی لەسەر لایەکی فڕۆکەکەی نووسی.

بەیانییەکی سێپتەمبەری ١٩٤٤، باوکم بە ئەرکێك بەسەر (چیچیجیما)دا دەفڕی، دوورگەیەك کە لەلایەن ژاپۆنییەکانەوە داگیرکرابوو. فڕۆکەکەی کە لەجۆری (تی بی ئێم ئەڤێنجەر) بوو کەوتە بەر تەقەی دوژمن، بەڵام لەفڕین بەردەوام بوو- دوو سەد مایل لەسەعاتێکدا دەفڕی- تا ئەوەی کە بۆمبەکانی بەردایەوە و ئامانجەکەی پێکا. هاواری کردە دۆستەکانی لەفڕۆکەکانی تردا کە بە پەرەشوت دابەزن، پاشان خۆشی دابەزی. بە تەنیا لەباشووری ئۆقیانووسی ئارامدا، بەرەو قایەغێکی چوپی بچوك کە کوشنی فڕۆکەکەی بوو مەلەی کرد. کاتێ باوکم لەلایەن ژێردەریاییەك رزگارکرا، پێی وترا کە دەتوانێ بچێتەوە ماڵەوە. لەبری ئەمە پەیوەندی کردەوە بە گروپی فڕۆکەوانییەکەیەوە. ئەرکەکەی پێش کریسمەس کۆتایی هات و لە ٦ی کانوونی دووەمی ١٩٤٥دا، لەکڵێسەی خێزانەکەی لەشاری رای، نیویۆرك دایکمی مارە کرد. پاش جەنگ، دایکم و باوکم، بەرەو شاری نیو هاڤن رۆیشتن بۆئەوەی بچێتە زانکۆی یەڵ. وەرزشکارێکی باش بوو- یاریزانی بەرگریی بنچینەی یەك و کاپتنی تیمی بەیسبۆڵ بوو. دایکم بۆ هەموو یارییەکان دەهات، تەنانەت لەبەهاری ١٩٤٦یشدا کە سکپڕ بوو بە من. خۆشبەختانە، ستادیۆمەکە کورسییەکی دەبڵی تێدا بوو کە بۆ پرۆفیسۆری پێشووی یاسا، ویلیەم هەوارد تافت دروستکرابوو.

باوکم لەپۆلدا زیرەك بوو. تەنیا لەدوو ساڵ و نیودا کۆمەڵگای ئەکادیمی فەخریی (فی بێتا کاپا)ی تەواو کرد. لەباوەشی دایکمدا، بەشداری رێورەسمی تەخەروجەکەیم کرد. لەبەشی هەرە زۆری ئاهەنگەکەدا خەوی ئەیبردمەوە. ئەمە دواجار نەبوو کە لەمحازەرەکانی زانکۆی یەڵ-دا خەو بمباتەوە.

ساڵانێك دواتر، ملیۆنان ئەمریکی لەبارەی بەسەرهاتی باوکم شتیان دەزانی. بەڵام من هەر لەسەرەتاوە لەدڵەوە ئەمزانی. یەکێك لەیەکەمین یادەوەرییەکانم ئەو جارە بوو کە لەگەڵ دایکم لەسەر ئەرزەکە دانیشتبووین سەیری ئەلبومی پارچەی وێنە و نووسینەکانمان دەکرد، چەند وێنەیەکی پیشاندام کە بریتین بوون لە، مەشقی

فرۆکەوانیی باوکم لەشاری کۆرپەس کریستی، تۆماری خاڵەکانی لەپاڵەوانێتیی ساڵانەی بەیسبۆڵ (CWS)، وێنەیەکی ناسراو لەگەڵ بەیب رۆس لەسەر گردۆلکەی هەڵدانی تۆپی بەیسبۆڵ لەگۆرەپانی یەڵ. بە وردی سەرنجم دایە وێنەکانی ئاهەنگی گواستنەوەیان: ئەفسەری دەریاوانی و بوکە گەنجە دەم بە خەندەکەی. بەشی دڵخوازی ئەلبومەکە بە لای منەوە، پارچەیەکی ئەو چوپە بوو کە گیانی باوکمی لەئۆقیانووسی ئارامدا رزگار کردبوو. سەرم ئەکردە سەری بۆئەوەی بەسەرهاتەکانی جەنگم بۆ بگێڕێتەوە. نەیدەویست شانازی بە خۆیەوە بکات. بەڵام دایکم شانازی پێوە دەکرد. ئەو عاشقی بوو، منیش هەروا. کە ئەکەومە تەمەنەوە، خەڵکانی تر هەن کە بپرژێمە سەریان. بەڵام راستییەکەی ئەوە بوو کە هەرگیز نەدەبووایە بە دوای نموونەیەکی بالادا بگەڕێم. من کوڕی جۆرج بوش بووم.

***

کاتێك باوکم لە ساڵی ١٩٤٨ تەخەروجی کرد زۆر کەس وایزانی کە دەچێت بۆ ناوچەی دارایی و بۆرسەی (وۆڵ ستریت). چونکە باوکی، شەریك بوو لە خانەی وەبەرهێنان. بەڵام باوکم ویستی لەسەر پێی خۆی بوەستێت. بۆیە ئەو و دایکم ئۆتۆمبێلی ستودبەیکەرە سوورەکەیان پڕکرد و بەرەو خۆرئاوا رۆیشتن. من هەمیشە سەرسام بووم پێیان لەبەرانبەر موجازەفەکردنیاندا و هەمیشە سوپاسگوزاربووم لەوەی لەو شوێنە گیرسانەوە کە لێی نیشتەجێبوون. یەکێك لەو میراتانەی بۆم مایەوە ئەوە بوو کە لە خۆرئاوای تەکساس گەورە بووم.

ساڵی یەکەممان لە شارۆچکەی کرێکارانی (ئۆدێسە) بەسەر برد کە چەند جادەیەکی داڕێژراوی کەم و زوو زوو زریانی تێدا هەڵدەکرد. ئێمە لە شوقەیەکدا ژیانمان بەسەر برد و گەرماوێکی هاوبەشمان هەبوو لەگەڵ — بە خواستی خۆت— یەك یان دوو سۆزانی. باوکم لە ئاستێکی هەرە نزمی کۆمپانیایەکی خزمەتگوزاریی نەوت ئیش دەکرد. کارەکانی بریتی بوون لە خاوێنکردنەوەی گەنجینە و بۆیەکردنی جەکی پەمپ. جارێکیان کرێکارێکی تری کۆمپانیاکە پرسیاری لە باوکم کرد ئاخۆ خریجی کۆلێژە. باوکم وتی بەڵێ

و له راستیدا له (یەل) خوێندوویەتی. کابرا کەمێك ڕاما و وتی، "قەت ئەم شوێنەم نەبیستووە".

پاش مانەوەیەکی کورت لە کالیفۆرنیا، لە ساڵی ١٩٥٠ گەڕاینەوە بۆ خۆرئاوای تەکساس. لە میدلاند نیشتەجێ بووین، ئەو شوێنەی کە کاتێك بیر لە گەورەبوونم دەکەمەوە وێنای دەکەم. میدلاند بیست مایڵ لە ئۆدێسەوە دوورە. درەختی رەسەن لەو شارۆچکەیەدا نەبوون. زەویەکە وشك، تەخت و تۆزاوی بوو. لە ژێریەوە دەریایەك نەوت هەبوو.

میدلاند پایتەختی (پێرمیان بەیسن) بوو کە لە ١٩٥٠کاندا بە نزیکەی ٢٠٪ی بەرهەمی نەوتی ئەمریکا هەژمار دەکرا.

شارۆچکەکە روکەشێکی کاروەگەڕخەری سەربەخۆی هەبوو. کێبڕکێی توند لەئارادابوو، بەتایبەت لە کەرتی نەوتدا. بەڵام لە هەمان کاتدا هەستێکی کۆمەڵایەتیش هەبوو. هەر کەسێك دەشیا سەرکەوتوو بێت و دەشیا شکستیش بهێنێت. هاوڕێکانی دایك و باوکم جۆرەها ئیشیان کردبوو. یەکێکیان خانووی بۆیاخ دەکرد. یەکێکیان نەشتەرگەر بوو. یەکێکیان چیمەنتۆی هەڵدەڕشت. چەند بینایەیەك لەو سەرەوە وەستایەکی خانوو دەژیا بەناوی مستەر هارۆڵد وێڵش. چارەکە سەدەیك تێپەڕی بەر لەوەی چاوم پێی بکەوێت و داوای پەیوەندی لە کچە شیرینەکەی، لۆرا لەین، بکەم.

ژیان لە میدلاند سادە بوو. من بایسکیلم لەگەڵ هاوڕێیانی وەکو مایك پرۆکتەر، جۆ ئۆنێیل و رۆبەرت مکلێسکی لێدەخوڕی. بە گەشتی دیدەوانی دەردەچووین. من دەرگا بە دەرگا دەگەڕام و نوقڵی میوەم دەفرۆشت بۆ کاری خێرخوازی. من و هاوڕێکانم بۆ چەند سەعاتێك یاری بەیسبۆڵمان دەکرد، زەربەی توندمان لێ ئەدا و تۆپمان هەڵئەداتا ئەو کاتەی کە دایکم لەودیو پەرژینی حەوشەکەمانەوە بانگی ئەکردم بۆئەوەی بچم نانی ئێوارە بخۆم. خەنی بووم لە خۆشیا کاتێ باوکم بۆ یاری هاتە دەرەوە. ئەو بەوە ناسرابوو کە تۆپە لێدراوەکانی لەلای پشتیەوە دەگرتەوە، فێڵێك کە لە کۆلێژ فێری ببوو. من و هاوڕێکانم هەوڵماندەدا لاسایی بکەینەوە. ئاکامی ئەمەش رووشانێکی زۆر بوو لەسەر شانمان.

یەکێك لە چرکەساتە هەرە پڕشانازییەکانی گەنجێتیم ئەو کاتـە بـوو کـە تەمـەنم پانزە ساڵان بوو. من و بـاوکم لـە حەوشـەکە یـاری گرتنـەوەی تۆپمـان دەکـرد. تـۆپێکی تیـژی تێگرتم، منیش بـە دەستکێشـەکەم گرتمـەوە. بـە خەندەیەکـەوە وتـی " ڕۆڵـە ئیتر تـۆ پێگەیشتوویت، ئەتوانم چەندەی بڵێی خێرا بیهاوێژم بۆت".

ئەم چـەند سـاڵە، سـاڵانی بێبـاکی مـن بـوون. ئـەو وشـەیەی کـە دەکـرێ ئێستا بـۆی بەکاربهێنم بریتییە لە خەیاڵی. شەوانەی هـەینی دەچـوین بـۆ هـاندانی تیمی تـۆپی پێی (ئامادەیی میدلاند). لـە بـەیانیانی یەکشەممەدا دەچووین بـۆ کەنیسـە. کـەس دەرگـای دانەدەخست. ساڵانێك دواتر، کاتێك من باسی (خەونی ئەمریکی)م دەکرد، ئـەوە میدلاند بوو کە لە خەیاڵمدابوو. لە نێوەندی ئەم خەونە خۆشەدا، تـەوژمێکی خەفـەت دەرکـەوت. لـە بـەهاری ١٩٥٣دا، (ڕۆبـن)ی خوشـکی سـێ سـاڵانم تووشـی (لوکیمیـا) بـوو، جـۆرێکی نەخۆشییە کە ئەو کاتە تەقریبەن چارەسەری نەبوو. دایك و بـاوکم بردیـان بـۆ سـەنتەری شێرپەنجەی (سـلۆن کێتـەرین مێمۆریـاڵ) لـە نیویـۆرك بـۆ پـشکنین. ئومێـدی پـەرجو (معجزە)یەکیان هـەبوو. ئـەوان بـە هـەمان شـێوە زانیـان کـە توێـژەران لـە توێژینـەوەی نەخۆشییەکەی شت فێر دەبن.

دایکم چەند مانگێك لە تەك پێخەفی ڕۆبندا بەسەر برد. باوکم لە هاتوچۆدا بـوو لـەنێوان تەکساس و ئیست کۆست (کـەنارەکانی خۆرهـەڵات)دا. مـن لەگـەڵ هاوڕێکانی دایك و باوکمدا مامەوە. کاتێك باوکم لە ماڵەوە دەبوو، زووتر لە خەو هەڵئەسـتا بـۆ سـەر ئیش. دواتر زانیم کە هەموو بەیانییەك سەعات شەش و نیو دەچوو بۆ کەنیسە بۆ ئەوەی نزا بۆ ڕۆبن بکات. دایك و باوکم نەیانزانی چۆن پێم بڵێن کە ڕۆبن دەمرێت. ئەوان تـەنیا وتیان لە خۆرهـەڵات نـەخۆش کـەوتووە. ڕۆژێکیـان مامۆستاکەم لـە قوتابخانـەی بنـەڕەتی سام هوستن لـە میدلانـد داوای لـە مـن و هـاوپۆلێکم کـرد کـە تەسجیلێك لـە بـۆ لایـەکی تـری قوتابخانەکە بگوازینەوە. لەکاتێکدا کە ئامێرە قەبەکەمان رادەکێشا، تووشی شۆك بووم کە دایك و باوکم لە ئۆتۆمبێلی ئۆڵدزمۆبێلە سەوزەکەدا بینی وەستان. دەمتـوانی سوێند بخۆم کـە قـژە بـژە زەردەکـانی ڕۆبـنم لـە پـەنجەرەکـەوە بـینی. بـۆ لای ئۆتۆمبێلەکە دەرپەڕیم. دایکم توند لە باوەشی گرتم. سەیری کوشنی دواوەم کرد. ڕۆبـن لـەوێ نـەبوو.

دایکم بە چرپە پێی وتم "مرد". لە گەشتێکی کورتدا بەرەو ماڵەوە، بۆ یەکەمین جار لە ژیانمدا بینیم کە دایك و باوکم دەگرین.

مەرگی ڕۆبن منیشی دڵتەنگ کرد، بە شێوازی منداڵێکی حەوت ساڵان. دڵتەنگ بووم بە لەدەستدانی خوشك و هاوڕێی ئایندەی یاریم. دڵتەنگ بووم کە بینیم دایك و باوکم زۆر ئازار دەچێژن. ساڵانێك مابوو کە تێبگەم جیاوازی چیە لەنێوان خەفەتی من و ئەو ئازارە کەمەرشکێنەی دایك و باوکم لە لەدەستدانی کچەکەیان دەیانچەشت.

ماوەی پاش مەرگی ڕۆبن، سەرەتای نزیکبوونەوەیەکی نوێی نێوان من و دایکم بوو. باوکم بە هۆکاری ئیش و کار کاتێکی زۆر دیار نەدەما و من نزیکەی هەموو کاتم لای ئەو بەسەر دەبرد، سۆزبارانم دەکرد و بە نوکتە دڵخۆشم دەکرد. ڕۆژێکیان مایك پرۆکتەر لە دەرگایدا و داوای لێکردم ئاخۆ ئەتوانم یاری لەگەڵ بکەم. من وتم "نا، ئەبێ لەگەڵ دایکم بمێنمەوە".

بۆ ماوەیەك پاش مردنی ڕۆبن، هەستم کرد تاکە منداڵم. (جێب)ی برام کە حەوت ساڵ لە من منداڵتر بوو تەنیا ساوایەك بوو. دوو برا منداڵترەکانی ترم، نێیل و مارڤین و خوشکەکەم دۆرۆ، دواتر لەدایك بوون. لەکاتێکدا کە دەچوومە تەمەنەوە، دایکم هێشتا ڕۆڵێکی گەورەی دەبینی لە ژیانمدا. ئەو سەرۆکی گروپی دیدەوانییەکە بوو کە ئێمەی بەرەو (کارلسباد کاڤێنس) ڕێنوێنی کرد کە لەوێ ئێمە بەناو ستەلەگمایت و ستەلکتایتەکاندا ڕۆیشتین. وەکو دایکی لیتڵ لیگ (کۆمەڵەی بچوك)، لە هەموو یارییەکدا خاڵی تۆمار دەکرد. لە (بیگ سپرینگ) منی بردە لای نزیکترین ددانڕاستکەرەوە و هەوڵیدا من لە ناو ئۆتۆمبێلدا فێری فەرەنسی بکات. دەتوانم خۆمان بێنمەوە بەرچاو کە کاتێك بە بیاباندا ڕێگەمان تەی دەکرد ئەم چەند وشەیەم دووبارە دەکردەوە "فێغم لابوش...ئوڤغ لافۆنێتغ." ئای ئەگەر ئەو کاتە جاك شیراك چاوی لێ دەبووم.

بەو شێوەیە، بەشێکی زۆری کەسایەتی دایکم گرتەخۆ. هەمان حەزی گاڵتەوگەپمان هەبوو. حەز دەکەین سەرکۆنە بکەین بۆ پیشاندانی سۆز. هەردووکمان میزاجێکمان هەیە کە دەشێ بە خێرایی گڕ بگرێت. هەروەها دەشێت ڕاشکاو بین کە بەهۆیەوە ناوبەناو تووشی کێشە دەبین. کاتێك خۆم بۆ پارێزگاری تەکساس کاندید کرد، بە خەڵکم وت کە

من چاوەکانی باوکم و دەمی دایکم هەیە. ئەوەم وت بۆئەوەی پێکەنینێکم دەستکەوێ.
بەڵام راستیش بوو.

کوڕی جۆرج و باربارا بوش بوون، چاوەڕوانی گەورەی لەگەڵدابوو، بەڵام بەو جۆرە نا
کە زۆرێك لە خەڵکی دواتر وێنایان کرد. دایك و باوکم هەرگیز خەونەکانی خۆیان لە مندا
چاوەڕوان نەکرد. چ ئەوەی هیوای ئەوەیان هەبوویێت کە ببمە تۆپ هەڵدەری بەیس بۆڵ،
یان سیاسییەك، یان هونەرمەندێك (مەحاڵ)، هەرگیز پێیان نەوتم. تێڕوانینیان لەبارەی
دایك و باوکایەتییەوە پێشکەشکردنی خۆشەویستی و هاندانم بوو بۆ دارشتنی رێچکەی
خۆم. سنووریان بۆ رەفتارم دانا، کاتیش هەبوو کە لێیان رەت دەبووم. دایکم سەپێنەری
ئەو سنوورانە بوو. دەشیا گەرم دابێت، لەبەرئەوەی هەمان کەسایەتیشمان هەبوو،
دەمزانی چۆن لە ژێیە هەستیارەکانی بدەم. بێ ئەدەبیم دەکرد و ئەویش قسەی
نەدەکرد. ئەگەر دەم هەراش بوومایە، هەروەکو خۆی ئەیوت، ئەوا دەبووایە ناو دەمم بە
سابون بشۆم. ئەمە لە جارێك زیاتر روویدا. زۆربەی کات نەمدەویست ئاڵۆزی بکەم،
کوڕێکی زیتەڵ بووم کە رێگای خۆم گرتبووەبەر، هەروەکو چۆن ئەویش وەکو دایکێك
رێگەی خۆی گرتبووە بەر. من تەنیا وەکو نیمچە گاڵتەیەك دەڵێم بەرپرسیارم لە
سەرسپی بوونی.

لەکاتێکدا کە بەتەمەندا دەچووم، بۆم دەرکەوت کە خۆشەویستی دایك و باوکم بێ
قەیدومەرجە. دەزانم چونکە تاقیم کردەوە. کاتێك تەمەنم چواردە ساڵان بوو دوو جار
دەعمم کرد، ئەو کاتە ئەمە تەمەنی یاسایی لێخوڕینی ئۆتۆمبێل بوو. دایك و باوکم هێشتا
خۆشیان دەویستم. ئۆتۆمبێلی باوکم بردە دەرەوە، بێ باکانە لە بەگ پێم پیانا و
دەرگاکەم لێکردەوە. فۆدکام کردە ناو کاسەی ماسییەکە گۆڵدفیشی (دۆرۆ)ی خوشکە
بچوکەکەم کوشت. بە دڵنیاییەوە هەندێ کات، سەر بە گوێبەن و بێ تام بووم. سەرەڕای
هەموو ئەمانەش، دایك و باوکم هێشتا خۆشیان دەویستم. دواجار خۆشەویستی
بەئۆقرەیان کاری تێکردم. کاتێك تۆ ئەزانیت خۆشەویستییەکەت بێ مەرجە، یاخیگەری
پێویست نییە و نابێ لە شکست بترسیت. سەربەست بووم لەوەی کە دوای غەریزەکانم

بکەوم، چێژ لە ژیان وەربگرم و بەو رادەیە دایك و باوکم خۆش بوێت کە خۆشیان ویستم.

رۆژێکیان ماوەیەکی کورت دوای ئەوەی کە فێری لێخوڕین بووم و باوکم بە گەشتێکی کارەکەی رۆیشتیبوو، دایکم بانگی کردمە ژووری خەوتنەکەی. تۆنێکی تەنگەتاوی لە دەنگیدا هەبوو. داوای لێکردم بەپەلە بیگەیەنمە نەخۆشخانە. پرسیارم کرد کێشەکە چییە. وتی لە ئۆتۆمبێلەکەدا پێت ئەڵێم.

لەکاتێکدا کە لە رێگای بەردەمماڵەوە دەردەچووم، پێی وتم کە لەسەرخۆ لێبخوڕم و خۆم لە تاسە لابدەم. پاشان پێی وتم کە منداڵی لەبەرچووە. تووشی سەرسوڕمان بووم. ئەمە بابەتێك بوو کە پێشبینیم نەکردبوو لەگەڵ دایکمدا قسەی لەسەر بکەم. هەروەها پێشبینی ئەوەم نەدەکرد کە پاشماوەی کۆرپەلە ببینم کە لە شوشەیەکدا هەڵیگرتبوو و دەیهێنا بۆ نەخۆشخانە. بیرمە کە لە دڵی خۆمدا ئەموت: ژیانی مرۆڤێك بوو، برا یان خوشکێکی بچوك.

دایکم گەیشتە نەخۆشخانە و برایە ژووری پشکنین. من بە درێژای مامەڕەکە ئەهاتم و ئەچووم بۆئەوەی هێور ببمەوە. دوای ئەوەی چەند جارێك بەلای پیرەژنێکدا رەتبووم، وتی" خەمت نەبێ رۆڵە، ژنەکەت باش دەبێت".

کاتێك رێگەیاندام بچمە ژووری دایکم، دکتۆر وتی باش دەبێت، بەڵام دەبێ شەو بمێنێتەوە. بە دایکم وت کە پیرەژنەکە چی پێ وتووم. بە یەکێك لە قاقا هەرە گەورەکانی پێکەنی و من بە هەستێکی ئارامترەوە گەڕامەوە ماڵەوە.

رۆژی دواتر چوومەوە نەخۆشخانە بۆئەوەی هەڵیگرم. سوپاسی کردم کە وەها وریا و بەرپرس بووم. هەروەها داوای لێکردم کە لەبارەی لەبارچوونەکەوە بە کەس نەڵێم کە پێی وابوو مەسەلەیەکی تایبەتی خێزانە. منیش بە قسەم کرد، تا ئەو کاتەی کە رێگەیدام لەم کتێبەدا بیگێڕمەوە. ئەوەی کە ئەو رۆژە بۆ دایکم کرد بچوك بوو، بەڵام بۆ من گەورە بوو. ئەمە یاریدەدەر بوو بۆ پەیوەندی تایبەتی نێوانمان.

***

لەکاتێکدا کە لە تەکساس گەشەم دەکرد، بەشەکەی تری بنەماڵەی بوش بەشێک بوون لە جیهانێکی جیاواز. کاتێك نزیکەی شەش ساڵان بووم، سەردانی دایك و باوکی باوکم کرد لە گرینویچ، ویلایەتی کۆنێکتیکەت. بانگهێشتکرام کە لەگەڵ گەورەکاندا نانی ئێوارە بخۆم. دەبووایە کۆت و بۆنباخ لەبەر بکەم، شتێك کە لە میدلاند لە دەرەوەی قوتابخانەی سەندەی (یەکشەممان) نەمکردبوو. سفرەی سەر مێزەکە رازێنرابووەوە. هەرگیز ئەو هەموو کەوچك، چەتاڵ و چەقۆیەم نەبینیبوو. هەمووی بە رێك و پێکی دانرابوون. ژنێك کە جلی رەشی لە بەردابوو و بەرکوشەیەکی سپی بەستبوو، سوپێکی سووری سەیری بۆ دانام کە پەڵەیەکی سپی لە ناوەڕاستیدا بوو. کەمێك تامم کرد. زۆر ناخۆش بوو. بە زوویی هەموویان چاویان تێبڕیم، چاوەڕێیان دەکرد ئەو خواردنە تایبەتە تەواو بکەم. دایکم ئاگاداری کردبوومەوە کە بەبێ سکاڵاکردن هەموو شتێك بخۆم. بەڵام بیری چووبوو بە سەرپەرشتیاری مەتبەخ بڵێت کە بە کەرەی عەلی بابا و جەلی گەورە کراوم نەك بە سوپی روسی.

لە زاری باوکمەوە، زۆرم لەبارەی نەنك و باپیرم بیستبوو. باپیرم (پریسکۆت بوش) پیاوێکی باڵابەرز بوو– شەش پێ و چوار ئینچ ، بە پێکەنینێکی گەورە و کەسایەتییەکی گەورەوە. ئەو لە گرینویچ بە بزنسمانێکی سەرکەوتوو بە پاکییەکی حاشاهەڵنەگرەوە و ناسرابوو و ماوەیەکی دوور و درێژ سەرۆکی ئەنجومەنی شار بوو. هەروەها یاریزانێکی دیاری گۆڵف و سەرۆکی رێکخراوی گۆڵفی ئەمریکی بوو و جارێکیان لە پاڵەوانێتی ئەمریکیدا بۆ پێگەیشتووان، شەست و شەش لێدانی تۆمار کرد. لە ساڵی ١٩٥٠دا، (گامپی)، هەروەکو هەموومان بەو ناوە بانگمان دەکرد، خۆی بۆ ئەنجومەنی پیران پاڵاوت و بە نزیکەی زیاتر لە هەزار دەنگ سووتا و بەڵێنیدا واز لە سیاسەت بێنێت. بەڵام دوو ساڵ دواتر، کۆمارییەکانی کۆنێکتیکەت قایلیان کرد جارێکی تر تاقی بکاتەوە. ئەمجارەیان بردییەوە.

کاتێك من تەمەنم دە ساڵان بوو، سەردانی گامپیم کرد لە واشنتۆن. ئەو و نەنکم منیان برد بۆ گردبوونەوەیەك لە ماڵەکەیان لە جۆرجتاون. لەناو گەورەکاندا دەهاتم و دەچووم، گامپی قۆڵی گرتم. وتی "جۆرجی، دەمەوێ بە کەسێکت بناسێنم". من بەرەو رووی

کابرایەکی زەبەلاح کردەوە، کە تاکە کەسێك بوو لە ژوورەکەدا ئەوەندەی خۆی بەرز بێت.

گامپی بە کابراکەی وت "یەکێك لە دەنگدەرەکانتم هێناوە". دەستێکی قەبە، دەستی منی لوولدا. هاورێیەکەی گامپی کە سەرۆکی زۆرینەی ئەنجومەنی پیران (لیندۆن جۆنسن) بوو، وتی "خۆشحالم بە ناسینت".

دەگونجا باپیرم پیاوێکی زۆر وشك بێت. ئەو لەو قوتابخانەیە بوو کە دەیگوت "دەبێ مندالان ببینرێن بەلام نەبیسترێن" کە بەلای بچکۆلێکی ترزلی زۆربلێی وەکو منەوە نامۆ بوو. بە زەبر و بە خێرایی دیسپلینی دەسەپاند، هەروەکو ئەو کاتە بۆم دەرکەوت کە بە دەوری ژوورەکەدا بەدوامەوە بوو لەبەرئەوەی کلیکی سەگە خۆشەویستەکەیم راکێشابوو. ئەو سەروەختە وامدەزانی تۆقێنەرە. سالانێك دواتر، بۆم روون بووەوە کە ئەم کابرا رەقە دلێکی نەرمی هەیە: دایکم پێی وتم کە چۆن دلی داوەتەوە بە هەلبژاردنی شوێنێکی ناشتنی جوان بۆ رۆبن لە گۆرستانی گرینویچ. کاتێك باپیرم لە سالی ١٩٧٢ مرد، لای ئەو نێژرا. باوکم رێزی لە باوکی دەگرت و خۆشی دەویست، دایکیشی زۆر خۆش دەویست. (دۆرۆسی وۆکەر بوش) وەکو فریشتە بوو. بە (گانی) بانگمان دەکرد، دەتوانم بلێم شیرینترین کەسێك بووبێت کە تائێستا بینیبێتم. بیرمە دەیبردمە ناو جێگە کە منال بووم. دەستی بە پشتمدا دەهێنا کە نزای شەوانەمان دەخوێند. ئەو خاکی بوو و پێ دەوتین کە هەرگیز رۆح گەورە نەبین. ئەو بە سەرۆك هەلبژاردنی باوکمی بینی و لە تەمەنی نەوەد و یەکسالیدا مرد، چەند هەفتەیەك پاش دەرنەچوونی لە سالی ١٩٩٢دا. باوکم لە دوا چرکەساتەکاندا لەگەلیدا بوو. داوای لێکرد کە لای پێخەفەکەیەوە لە ئینجیل بۆی بخوێنێتەوە. هەر کە کتێبەکەی کردەوە، لولەکێك لە کاغەزی کۆن کەوتنە خوارەوە. ئەمانە نامەگەلێك بوون کە باوکم سالانێك لەمەوبەر بۆی نووسیبوون. ئەویش بە درێژایی ژیانی پاراستبوونی، دواجاریش ویستبووی لای خۆیەوە بن.

دایك و باوکی دایکم، لە شاری (رای) نیویۆرك ژیابوون. دایکی، (پۆلین رۆبینسن پیەرس) ئەو کاتە مرد کە من تەمەنم سێ سالان بوو. بە رووداوی ئۆتۆمبێل مرد کاتێك باپیرم (مارڤین) لەکاتی لێخورینی ئۆتۆمبێلدا دەستی درێژکردبوو بۆ ئەوەی نەهێلێت

کوپێکی قاوە برژێت. ئۆتۆمبێلەکە لە ڕێگە لایدابوو و کێشابووی بە دیوارێکی بەردین. خوشکە بچوکەکەم بەناوی ئەنکمەوە کرابوو.

زۆر هۆگری باوکی دایکم، مارڤین پیەرس بووم کە بە مۆنك (راهیب) ناسرابوو. ئەو لە زانکۆی مایامی لە (ئۆهایۆ) چوار وەرزش فێر ببوو کە لەبەرچاوی من هالەیەکی ئەفسانەیی پێ بەخشیبوو. سەرۆکی کۆمپانیای (مککۆڵس) و خزمێکی دووری سەرۆك فرانکلین پییەرس بوو. دێتەوە بەرچاوم کە کەسێکی نەرم و نیان، ئارام و خاکی بوو.

گەشتەکانم بۆ خۆرهەڵاتی وڵات دوو وانەی گرنگیان فێر کردم: یەکەم، دەتوانم تەقریبەن لە هەر ژینگەیەکدا بێت خۆم ئاسودە بکەم. دووەم، بە راستی حەزم لە ژیان بوو لە تەکساس. بێگومان ژیان لە (ئیست کۆست)یش باشیی خۆی هەبوو: دەمتوانی سەیری یارییەکانی کۆمەڵەی گەورەی بەیسبۆڵ بکەم. کاتێك تەمەنم نزیکەی دە ساڵان بوو، مامی دڵسۆزم (بەکی) کە بچوکترین برای باوکم بوو، بردمی بۆ یاریی (نیویۆرك جایەنتس) لە (پۆلۆ گراوندن). هێشتا ئەو رۆژەم بیرە کە تەماشای پاڵەوانەکەی خۆم (ویلی مەیز) دەکرد کە لە دەرەوەی حەقل یاری دەکرد.

پێنج دەیە دواتر ویلی-م بینییەوە، کاتێك وەکو راسپێردراوی فەخریی بۆ یارییەکی تی بۆڵ (بەیسبۆڵ)ی گەنجان لەسەر فریزی باشووری کۆشکی سپی ئامادە بوو. تەمەنی حەفتا و پێنج ساڵ بوو، بەڵام بەلای منەوە هێشتا هەر (سەی هەی کید)ەکەی جاران بوو کە نازناوی بوو. ئەو رۆژە بە یاریزانانی گەنج دەوت "دەمەوێ ویلی مەیز جیلی خۆم بم، بەڵام نەمدەتوانی شوتێکی قۆقز لێدەم. بۆیە لەبری ئەمە، بووم بە سەرۆك".

***

لە ساڵی ١٩٥٩دا، خێزانەکەم میدلاندیان جێ هێشت و لە ویلایەتەکەدا بە درێژایی ٥٥٠ مایل لە ویلایەتەکەدا بەرەو (هوستن) پەڕینەوە. باوکم بەڕێوەبەری جێبەجێکاری کۆمپانیایەك بوو لە بواری ڕوولەگەشەی هەڵکەندنی دەریایی و بۆ ئەو بەجێ بوو کە لە بۆرییەکانی کەنداوی مەکسیکەوە نزیك بێت. خانووە نوێکەمان لە ناوچەیەکی سەرسەوزی پردەخت بوو کە زۆر جار دەکەوتە بەر لێزمەی باران و زریان. ئەمەش تەواو پێچەوانەی میدلاند بوو کە لەوێ تاکە زریانێك کە هەڵیبکردایە، زریانی تۆز بوو. من

نیگەران بووم بەو گواستنەوەیە، بەڵام (هوستن) شارێکی سەرنجڕاکێش بوو. من فێری یاری گۆڵف بووم، هاوڕێی نوێم پەیدا کرد و لە قوتابخانەیەکی تایبەت دەستم بە خوێندن کرد بەناوی (کینکەید). ئەو کاتە، جیاوازییەکانی نێوان میدلاند و هوستن گەورە دیار بوون. بەڵام بە بەراورد بەوەی کە دواتر دەهات، هیچ نەبوون. من لە پۆلی نۆ بووم و دایکان هەرگیز نەدەهاتنە دەرەوە تا پاسەکە ببینن- لانی کەم دایکی من وەها بوو. دیار بوو کە لەبارەی شتێکەوە دڵخۆش بوو. ئەو کاتەی کە لە پاسەکە دابەزیم، ئەم قسانەی لە دەم هاتە دەرەوە: "پیرۆزە، جۆرج، تۆ لە ئاندۆڤەر قبوڵ کرایت!" ئەمە هەواڵێکی خۆش بوو بۆ ئەو. من زۆر دڵنیا نەبووم.

هاوینی پێشوو باوکم منی بردبوو بۆئەوەی شوێنی خوێندنەکەی خۆیم پیشان بدات، ئەکادیمیای(فیلیپس) لە ئاندۆڤەر، ماساشوسێتس. بە دڵنیاییەوە ئەمە جیاواز بوو لەوەی لەسەری ڕاهاتبووم. زۆربەی بەشە ناوخۆییەکان بینایەی دروستکراو لە بریکی گەورە بوون بە دەوری ڕووبەری ناوەوەدا. بە کۆلێژ دەچوو. حەزم لە کینکەید بوو، بەڵام بڕیارەکە درابوو. ئاندۆڤەر نەرتێکی خێزانی بوو. من ئیتر نەچووم.

یەکەمین تەحەدیم ڕوونکردنەوەی ئاندۆڤەر بوو بۆ هاوڕێیانم لە تەکساس. لەو ڕۆژانەدا، زۆربەی ئەو تەکساسییانەی کە ڕۆیشتبوون بۆ ئامادەیی، کێشەی دیسپلینیان هەبوو. کاتێک بە هاوڕێیەکم وت کە دەچمە قوتابخانەیەکی دەرەوەی شار لە ماساشوسێتس، تەنیا یەك پرسیاری هەبوو: "بوش، چی هەڵەت کردووە؟" کاتێک لە پاییزی ١٩٦١ چوومە ئاندۆڤەر، بیرم لەوە کردەوە کە لەوانەیە ئەو شتێکی ڕاستی وتبێت. بۆ ناو پۆل، بۆ ژەمەکان و بۆ ئامادەبوونی ناچاری لە کەنیسەدا، بۆینباخمان دەبەست. لە مانگەکانی زستاندا، دەشیا لە یەك کاتدا لە سیبریاش بین. وەکو تەکساسییەك، من چوار وەرزم ناسییەوە: بەفری بەستەڵەك، بەفری تازە، بەفری تواوە و بەفری سپی. ژنی لێ نەبوو، بێجگە لە ئەوانەی لە کتێبخانە کاریان دەکرد. بەپێی تێپەڕبوونی کات، ئەوان وەکو ئەستێرەکانی سینەما دەهاتنە بەرچاومان.

قوتابخانەکە تەحەدییەکی ئەکادیمی سەخت بوو. چوون بۆ ئاندۆڤەر قورسترین شتێك بوو کردبێتم تا ئەو کاتەی کە چل ساڵ دواتر خۆم بۆ سەرۆکایەتی پاڵاوت. لە ڕووی

ئەکادیمییەوە لە دوای قوتابییەکانی ترەوە بووم و دەبووایە وەکو شێت سەعی بکەم. لە ساڵی یەکەممدا، گڵۆپەکانی ژوورەکانی بەشە ناوخۆییەکەمان لە سەعات دەوە دەکوژێنرانەوە و زۆر شەو تا درەنگانێك لە بەر ئەو رووناکاییەی هۆڵەکە دەمخوێندەوە کە لە کەلێنی دەرگای ژوورەکەوە دەدرەوشایەوە. زۆربەی کات بە زمانی ئینگلیزی بەردەوام بووم. بۆ یەکێك لە یەکەمین واجبەکانم، لەبارەی خەمی لەدەستدانی زۆبنی خوشکم نوسیم. بریارمدا کە دەبێ وشەیەکی باشتر لە فرمێسك بخەمە سەر کاغەز. دواجار، من لە (ئیست کۆست) بووم و دەبووایە هەوڵ بدەم قووڵ بم. بۆیە (موراڤیفاتی رۆجێت)م دەرهێنا کە دایکم خستبوویە ناو جانتاکەمەوە و نووسیم "شەونمەکان لە کولمەکانمەوە ئەهاتنە خوارەوە".

کاتێك وەرەقەکان درانەوە، سفرێکی چاوزەقی پێوەبوو. تووشی سەرسورمان بووم و شکام. لە تەکساس هەمیشە نمرەی باشم دەهێنا، ئەمەیان یەکەمین شکستی منی تۆمار کرد. تەلەفۆنم بۆ دایك و باوکم کرد و پێم وتن کە نائاسودەم. هانیاندام کە بمێنمەوە. بریارمدا خۆم بگرم. لەوانە نەبووم کە واز دێنن.

خۆگونجاندنی کۆمەڵایەتیم خێراتر لە خۆگونجاندنی ئەکادیمیم هات. پێرێکی بچوکی هاوشاریی تەکساسییەکان لە ئاندۆڤەر هەبوون، لەوانەش هاوشارییەك لە (فۆرت وێرس)ەوە بە ناوی کلەی جۆنسن. بە هەمان زمان قسەمان دەکرد و بووینە هاورێی نزیك. بە زوویی بازنەکەم فراوان کرد. بۆ کەسێك کە بایەخی بە خەڵك دەدا، ئاندۆڤەر لەوەرگایەکی باش بوو.

بۆم دەرکەوت کە من رێکخەرێکی سروشتیم. ساڵی کۆتاییم لە ئاندۆڤەر، خۆم وەکو کۆمسیۆنەری کۆمەڵەی ستیکبۆڵ (یارییەکی نزیکی لە بەیسبۆڵ) دەستنیشان کرد. خۆم ناونا تویدس بوش، وەکو لاساییکردنەوەیەکی بەرپرسێکی سیاسیی بەناوبانگی نیویۆرك. کابینەیەکی یاریدەدەرانم دیاریکرد، لەوانەش چاودێری سەرەکی و دەروونناسی کۆمەڵەکە. یاسای چرۆپڕ و هەروەها سیستەمێکی یاریی یەکلاییکردنەوەمان دانا. من لە دەرەوەی رێساکاندا نەبووم، چونکە کەسێکی بێگەردم.

هەروەها پلانێکمان دانا بۆ چاپکردنی کارتی پێناسی کۆمەڵەکە کە دەکرا بە شێوەیەکی گونجاو وەکو پێناسی تەزویر کۆپی بکرێن. پلانکە لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی قوتابخانەوە کەشفکرا. ڕێنماییمکرا کە بوەستم و وەستام. لە دوایین یاسامدا وەکو ڕێکخەر، جێگرەوەیەکم دەستنیشان کرد کە (کێڤن رافێرتی)ی ئامۆزام بوو.

ئەو دوایین ساڵە لە ئاندۆڤەر، مامۆستایەکی مێژووم هەبوو بە ناوی تۆم لیۆنس. حەزی دەکرد بە کێشانی یەکێك لە دار شەقەکانی بە تەختەڕەشەکەدا، بەئاگامان بێنێتەوە. مامۆستا لیۆنس لە زانکۆی براون یاری تۆپی پێی کردبوو بەر لەوەی کە تووشی ئیفلیجی ببێت. ئەو نموونەیەکی بەهێز بوو بۆ من. وانەکانی، کەسایەتییە مێژووییەکانی دەهێنایە ژیانەوە، بەتایبەت سەرۆك فرانکلین روزڤێلت.

مامۆستا لیۆنس حەزی لە سیاسەتی فرانکلین روزڤێلت بوو و وای بۆ دەچم کە ئیلهامی لە سەرکەوتنی روزڤێلت بەسەر نەخۆشییەکەیدا وەرگرتبێت.

مامۆستا لیۆنس فشاری دەخستە سەرم. تەحەدای دەخستەڕوو، لەگەڵ ئەوەشدا فێری دەکردم. زۆری لێئەکردم و تینی بۆ ئەهێنام و ستایشیشی دەکردم. داوای زۆری دەکرد و لە سایەی ئەودا خۆشەویستییەکی تاهەتاییم بۆ مێژوو پەیدا کرد. چەند دەیەیەك دواتر، مامۆستا لیۆنسم بانگهێشت کرد بۆ ئۆفیسی ئۆڤاڵ (هێلکەیی) لە کۆشکی سپی. ئەمە چرکەساتێکی تایبەت بوو بۆ من: خوێندکارێك کە مێژووی دروست دەکرد لە تەك ئەو پیاوە وەستابوو کە بەری ساڵانێکی زۆر وانەی پێ وتبوو.

***

لەکاتێکدا کە ڕۆژانی ئاندۆڤەر بەرەو کۆتایی دەچوون، کاتی ئەوە هات کە تەقدیمی کۆلێژ بکەم. یەکەم بیرۆکەم (یەڵ) بوو. دواجار من لەوێ لەدایك ببووم. بەشێکی دووروودرێژی تەقدیمکردنەکە، پڕکردنەوەی ئەو کارتە شینە بوو کە داوای لێ دەکردیت ناوی خزم و کەسی خزیجت بنووسی. باپیرم و باوکم نووسی. هەروەها هەموو براکانیان. هەروەها ئامۆزا، خاڵۆزا و پورزاکانم. دەبووایە ناوی خزمانی دوورتر لەودیوی کارتەکە بنووسم.

سەرباری پەیوەندییە خێزانییەکانم، گومانم هەبوو لەوەی وەربگیرێم. نمرە و ئەنجامی تاقیکردنەوەکانم خراپ نەبوون، بەڵام لەدواوەی زۆرێکیان بوو لە پۆلەکەمدا. راگری ئاندۆڤەر (جی.گرێنڤیل بێنێدیکت) کەسێکی واقعبین بوو. ئامۆژگاری ئەوەی کردم کە "بیمەیەکی باش بەدەستبێنم" ئەگەر لە یەڵ وەرنەگیرام. تەقدیمی شوێنێکی باشی ترم کرد، زانکۆی تەکساس لە (ئۆستن) و لەگەڵ باوکم گەشتێکم بە کامپەکەیدا کرد، دەستم کرد بە وێناکردنی خۆم لەوێ وەکو خوێندکارێکی پرۆگرامی باڵا کە پێی دەوترا پلان دوو. رۆژێکیان تووشی سەرسوڕمان بووم کە بینیم زەرفێکی نامەی ئەستوور لە سندوقی پۆستەکەدا هەیە کە قبوڵی (یەڵ)ی لەسەرە. مامۆستا لیۆنس پشتگیری بۆ نووسیبووم و تاکە شتێك کە بیرم لێکردەوە ئەوە بوو کە دەبێ ئەو نامەیەکی زۆر باشی نووسیبێت.کلەی جۆنسن لە هەمان کاتدا نامەی پەسەندکردنەکەی کردەوە. کاتێك رازی بووین لەسەر ئەوەی کە لە یەك ژوور بین، بڕیارەکە دەنگی پێدرا.

***

جێهێشتنی ئاندۆڤەر وەکو ئەوە وابوو کە جلی کۆتکردنی شێت لەبەر خۆم داکەنم. فەلسەفەکەم لە کۆلێژ ئەو قسە کۆنە بوو کە : سەخت کار بکە، سەخت یاری بکە. ئەوەی یەکەمیانم پشتڕاستکردەوە و لەوەی دووەمیاندا بەرەوپێش چووم. پەیوەندیم کرد بە برایەتیی(دێلتا کاپا ئێپسیلۆن)، یاری رەگبی و وەرزشە بە کۆمەڵەکانم کرد، گەشتی رێگەبڕینم بەرەو کۆلێژەکانی کچان ئەنجام دەدا و کاتێکی زۆرم لەگەڵ هاوڕێیاندا بەسەر دەبرد.

گیانی زیندوویەتیم چەند جار پەرتی دەکردم. لە ماوەی ساڵی کۆتاییمدا، ئێمە لە (پرینستن) بووین بۆ یارییەکی تۆپی پێ. بە کەوتنە ژێر کاریگەریی بردنەوەی (یەڵ) – و کەمێ زیاتر لە کحولێکی بچوك– رێبەرایەتی گروپێکی بچوکم کرد بەرەو گۆڕەپانەکە بۆ تێکشکاندنی عاریزەی گۆڵەکەکان. هاندەرانی پرینستن دڵخۆش نەبوون. من لەسەری سەرەوەی دەروازەی گۆڵ دانیشتبووم و قاچەکانم بەردابووەوە کە پاسەوانی ئاسایش هات و منی هێنایە خوارەوە. ئەو کاتە من بە درێژایی گۆڕەپانەکە بردمیان و خستمیانە

ناو ئۆتۆمبێلێکی پۆلیسەوە. هاوڕێیانی یەڵ دەستیان کرد بە هەژاندنی ئۆتۆمبێلەکە و هاواریان کرد "بوش ئازاد بکەن!"

بە هەستکردن بە کارەساتێك، هاوڕێم ڕۆی ئۆستن،– کابرایەکی زلی خەڵکی دوورگەی (سەینت ڤینسنت) کە کاپتنی تیمی تۆپی پێی یەڵ بوو– هاواری بەسەر قەرەباڵغییەکەدا کرد کە لەوێ نەمێنن. پاشان لەگەڵ من خۆ هەڵدایە ناو ئۆتۆمبێلەکە. کاتێ گەیشتینە بنکەی پۆلیس، داوایان لێکردین کە کەمپی زانکۆی پرینستن جێ بهێڵین و هەرگیز نەگەڕێینەوە. هەموو ئەو ساڵانەی دواتر هەرگیز نەگەڕاومەتەوە بۆ ئەوێ. هەرچی ڕۆی ئۆستنە، بەردەوام بوو لە پەرەدان بە شارەزایەتییە دیپلۆماسییەکانی. چوار دەیە دواتر، من کردم بە باڵیۆزی ئەمریکا لە ترینیداد و تۆباگۆ.

لە یەڵ، حەزم لەوە نەبوو ببمە سیاسییەکی کامپەکە. بەڵام ناوبەناو دەکەوتمەبەر سیاسەتی کامپەکە. پاییزی ئەو ساڵەی کە قاز بووم، باوکم خۆی بۆ ئەنجومەنی پیران کاندید کرد لە بەرانبەر ئەندامێکی دیموکراتەکان بەناوی (ڕالف یاربۆرۆ). باوکم دەنگی زیاتر لە هەر کاندیدێکی تری کۆمارییەکان هێنا لە مێژووی تەکساسدا، بەڵام ئەو لێشاوە دەنگە نیشتمانییەی کە سەرۆك جۆنسن هێنای زۆر لەوە زیاتر بوو کۆنترۆڵ بکرێت. ماوەیەکی کورت پاش هەڵبژاردن ، خۆم بە قەشەی (یەڵ) ناساند کە ناوی ویلیام سلۆن کۆفین بوو. ئەو باوکمی لەو ڕۆژگارەوە کە لەوێ بەیەکەوە بوون دەناسی. منیش پێم وابوو کە قسەیەکی ئاسودەییم بۆ دەکات. لەبری ئەوە، پێم وتم باوکم "لەلایەن پیاوێکی باشترەوە شکستی پێهێنراوە".

ئەو قسانە لێدانێکی توند بوون لە کوڕێکی هەژدە ساڵان. کاتێك بەسەرهاتەکە زیاتر سی ساڵ دواتر لە ڕۆژنامەکاندا بڵاوکرایەوە، کۆفین نامەیەکی بۆ ناردم تیایدا نوسیبووی کە داوای لێبووردنی هەیە بۆ ئەو قسەیە، ئەگەر ئەو کردبێتی. من پۆزشەکەیم قبوڵ کرد. بەڵام ئەو تێڕوانینە خۆبەراست ، نموونەیەکی بچوك بوو لەو لێدوانە ڕەقەی کە لە ماوەی سەرۆکایەتیمدا لە ناو زۆرێك لە ئوستادەکانی کۆلێژدا دەردەکەوت. یەڵ شوێنێك بوو کە من تیایدا هەستم بە سەربەستی کرد بۆ دۆزینەوە و سۆراخکردنی سۆزەکانم. ئەو ڕیزە کۆرسانەی هەڵمبژاردن، بریتی بوون لە هەسارەناسی، پلاندانانی شار، ئارکیۆلۆژیای

پێش مێژوو، چەند شاکارێکی ئەدەبی ئیسپانی و لەگەڵ یەکێك لەو رشتانەی بەلامەوە پەسەند بوون، واتە هایکۆی ژاپۆنی. هەروەها کۆرسێکی زانستی سیاسیشم هەڵبژارد کە (پەیوەندی) اتصالاتی گشتی بوو کە تەرکیزی دەخستە سەر "ناوەرۆك و کاریگەریی اتصالاتی گشتی". ئەنجامەکەم حەفتا بوو، کە لەوانەیە پەیوەندیی لەرزۆکم لەگەڵ میدیادا دەربخات بە درێژایی سالآنی رابردوو.

حەزم لە مێژوو بوو، کە بوو بە بابەتی سەرەکی خوێندنم. خۆشیم بینی لە گوێگرتن بۆ وانەکانی ئوستادەکانی وەکو جۆن مۆرتن بلوم، گادیس سمیس و هێنری تێرنەر. یەکێك لە یەکەمین کۆرسەکانی مێژووم تەرکیزی کردە سەر شۆڕشی فەرەنسا. مامۆستا ستانلی مێلۆن هیوایەتی بوو بڵێت "ئیشی من رابردووە" ئەو دیمەنی هەژێنەری رووداوی (تێنیس کۆرت ئۆس)، تیرۆرکردنی رۆبسپێر و سەرهەڵدانی ناپلیۆنی دەگێڕایەوە. من تۆقیم بە شێوازی بەلاوەنانی ئەو بیرۆکانەی ئیلهامیان دایە شۆڕش کاتێك دەسەلآت لە دەستی چەند کەسێکدا قەتیس بوو.

یەکێك لە کۆرسە هەرە لەیادەکانم مێژووی یەکێتی سۆڤیەت بوو کە وانەبێژێکی ئەڵمانیای خۆرهەلآت بەناوی (ۆڵفگانگ لیۆنارد) دەیگوتەوە. مامۆستا لیۆنارد کە منداڵ بوو لە دەست ئەڵمانیای نازی رایکردبوو و لە یەکێتیی سۆڤیەت گەورە ببوو کە لەوێ لە ماوەی رامالینەکانی ستالیندا دایکی گیرابوو. ئەو ئامادە کرابوو کە ببێتە بەرپرسێکی کۆمەنیست، بەلآم جیا ببووەوە و رایکردبوو بۆ خۆرئاوا. بە شێوە زمانە ئەڵمانییە ناسراوەکەی، کەوتە باسکردنی دادگاییە رێکخراوەکان، دەستگیرکردنە بەکۆمەڵەکان و بێبەشکردنە بەرفراوانەکان. پاش گوێگرتن لێی، چیتر بە هەمان شێواز بیرم لە یەکێتیی سۆڤیەت یان بزاڤی کۆمەنیستی نەکردەوە، وانە ناساندنێك بوو بە ململانێی نێوان سەرکوتگەری و ئازادی، شەڕێك کە لە تەواوی ژیانی دواترمدا هۆشی منی گرتبوو.

لە ساڵی کۆتاییمدا، کۆرسێکم وەرگرت بە ناوی (مێژوو و پیادەکردنی وتاردانی ئەمریکی) کە مامۆستا (رۆڵین جی. ئۆستەروایز) دەیگوتەوە. ئێمە وتاری ئەمریکیی بەناوبانگمان دەخوێندەوە، هەر لە وتارە دینییە ئاگراوییەکانی وتاربێژ جۆناسان ئێدواردز لەسەردەمی کۆلۆنیالیزمدا تا وتاری (رۆژی بەدناو)ی رۆزڤێلت پاش هێرشی

(پێرل هاربەر). من کارتێکراو بووم بە هێزی وشەکان بۆ پێکهێنانی مێژوو. من توێژینەوەیەکم نووسی بۆ شیکردنەوەی وتارێکی (هێنری دەبلیو. گرەیدی)ی ڕۆژنامەنووسی جۆرجی بەناوی (باشووری نوێ) و ماوەی چوار خولەك خەریکی نوسینەوەی ئەو تێبینییانە بووم کە ئەستێرەی تیمی (ڕێد سۆکس)، (کارل یاستەرزێمسکی)یان کاندید دەکرد بۆ پارێزگاری (بۆستن). مامۆستا ئوستەروایز پێی وتین کە چۆن وتارێك بونیاد بنێین: ناساندن، سێ خاڵی سەرەکی، بەشی کۆتایی و دەرەنجام. لە تەواوی ژیانمدا مۆدێلەکەی ئەوم لەبیر بوو کە هەروەکو دواتر دەرکەوت، ژمارەیەکی زۆر کەمی وتاری گرتبووەخۆ.

هیچ لەم قسانەم بەو مانایە نییە کە بڵێم من بەتایبەت خوێندکارێکی جێ سەرنج بووم. پێم وایە ئەشێ بڵێم کە زیاتر لە ئوستادەکانم کەڵکم لە ئەزموونەکە وەرگرت. جارێکیان جۆن مۆرتن بلوم پرسیاری لێکرا ئاخۆ لەبارەی جۆرج دەبلیو بوش-ی خوێندکاری، چی لە بیرە. ئەو لە وەڵامدا وتبووی، "تەنانەت تەمومژاویترین یادەوەریشم نییە لەبارەیەوە". بەڵام من مامۆستا بلوم-م لەبیرە.

***

تەخەروجکردن لە کاتێکی زۆر پەشێودا هات. مارتن لوسەر کینگ جونیەر لە مانگی نیسانی ساڵی کۆتاییمدا تیرۆر کرابوو. ئاژاوەی نەژادگەری لە شیکاگۆ و واشنتۆن دی.سی هەڵایسابوو. ئەو کاتە، چەند ڕۆژێك بەر لە مەراسیمی وەرگرتنەوەی بڕوانامە، من و هاوڕێیانم لە گەشتێك دەگەڕاینەوە بۆ سەرووی ویلایەتی نیویۆرك کاتێك لە ڕادیۆ گوێبیستی ئەوە بووین کە بۆبی کەنەدی کوژراوە. کەس لە ناو ئۆتۆمبێلەکەدا یەك قسەی نەکرد. هەستێك هەبوو لەبارەی ئەمەی کە هەموو شتێك دەشێوێت.

لە زۆربەی هەرە زۆری سەردەمی ئێمەدا لە یەڵ، مافە مرۆییەکان ڕووبەری مشتومڕەکانیان گرتبوو. بە هاتنی ساڵی کۆتاییمان، پرسێکی تر لەسەر هۆشمان لەنگەری گرت. جەنگ لە ڤێتنام گڕی دەسەند و سەرۆك جۆنسن ڕەشنوسێکی ئامادە کردبوو. دوو بژارەمان لەبەردەمدا بوو: پەیوەندی بکە بە سوپاوە یان ڕێگایەك بدۆزەرەوە بۆ ڕاکردن لە ڕەشنوسەکە. بڕیاری من ئاسان بوو. من دەچومە خزمەتی

سەربازی. من باوکێك پەروەردەی کردم کە بۆ وڵاتەکەی قوربانی دابوو. تووشی شەرمەزاری دەبووم کە لەو ئەرکە خۆم بدزیایەتەوە. بۆچوونم لەبارەی جەنگەوە گوماناوی بوو، بەڵام قبوڵ بوو. من بەگومان بووم لە ستراتیژییەکە و ئەو خەڵکەی کە لە ئیدارەی جۆنسندا جێبەجێیان دەکرد بەگومان بووم. بەڵام من ئامانجی راگەیەنراوی جەنگم قبوڵ کرد: وەستاندنی بڵاوبوونەوەی کۆمەنیزم. رۆژێکیان لە پایزی ساڵی کۆتاییمدا، بەلای بنکەیەکی ناونوسینی سەربازیدا تێپەڕیم کە پۆستەرێکی فڕۆکەیەکی جێت لە بە پەنجەرەکەیەوە بوو. فڕۆکە فڕیووەکان شێوازێکی سەرنجڕاکێش دەبن بۆ خزمەتی سەربازی. چوومە لای ناونوسەکە و فۆرمێکم دەستدایە.

کاتێك بۆ کریسمەس گەڕامە ماڵەوە، لەبارەی بایەخدانم بە هێزی ئاسمانی قسەم لەگەڵ کردن. باوکم منی نارد بۆلای پیاوێك بەناوی (سید ئەیدگە)، فڕۆکەوانێکی پێشوو کە شوێنی باشی هەبوو لەناو کۆمەڵی فڕۆکەوانیدا. ئەو پێشنیاری ئەوەی کرد کە بیر لە پەیوەندیکردن بە (گاردی نیشتمانیی ئاسمانی تەکساس)ەوە بکەم کە شاغیری فڕۆکەوانییان هەبوو. بە پێچەوانەی ئەندامانی گاردی ئاسایی، دەبووایە فڕۆکەوانان ساڵێکی مەشق، شەش مانگی رێنمایی تایبەتمەند وپاشان فڕینی ناویەناو تەواو بکەن بۆئەوەی توانای خۆیان بپارێزن.

خزمەتکردن وەکو فڕۆکەوانێکی گارد رایکێشام. شارەزایەتییەکی نوێ فێر دەبووم. ئەگەر پێویستی بکردایە، لە شەڕدا دەفڕیم. ئەگەر نا، ئەوا نەرم و نیانیم پیشان دەدا بۆ کردنی شتی تر. لەو خاڵەی ژیانمدا، سۆراخی پیشەیەکم نەدەکرد. دەیەی یەکەمی پاش کۆلێژم وەکو سەردەمی گەڕان بینی. لەنگەرم نەویست بۆ ئەوەی جێگیرم بکات. ئەگەر شتێك سەرنجی منی رابکێشایە، ئەوا تاقیم دەکردەوە. ئەگەر نا، ئەوا بەردەوام دەبووم. ئەمەش روانگەیەك بوو کە بۆ کارەکانی هاوینەدا هەمبوو. لە ساڵی ١٩٦٣دا، لە کێڵگەیەکی مانگادا ئیشم کرد لە ئەریزۆنا. رەئیسەکە کابرایەکی سەر ماش و برنجی بوو بەناوی (تێرمان). ئەو قسەیەکی هەبوو لەبارەی ئەو خەڵکە خوێندەوارەی دەیناسین : "کتێب زیرەکە، شۆستە دەبەنگە". سوور بووم لەسەر ئەوەی کە ئەو دێڕە بەسەر مندا پیادە نەبێ. هاوینەکانی ترم بە کارکردن لە بۆڕیە نەوتی کەناراوێك لە لویزانا بردەسەر

لەودیو مێزی خانەی معامەلەچێتی و وەکو فرۆشیارێکی کاڵای وەرزشی لە سیەرز، رۆیەک. لەو ماوەیەدا هەندێ کارەکتەری بێ هاوتام ناسین: لەوانەش کاوبۆییەکان و کەیجنەکان (رەچەڵەک فەرەنسییەکانی لویزانا)، حەماڵەکان و شەقاوەچییەکان. هەمیشە پێم وابووە کە لەو ساڵانەدا بە دوو پرۆسەی خوێندندا تێپەڕیووم: یەکێکیان لە قوتابخانە زۆرباشەکان و ئەویتریان لە خەڵکی پتەو.

لە پایزی ١٩٦٨دا، هەواڵم بۆ بنکەی ئاسمانی (مودی) نارد لە جۆرجیابۆ مەشقی فرۆکەوانی. بە نزیکەی سەد ئامادەبووی مەشق دەستمان پێکرد و بە نزیکەی پەنجا کەس تەخروجمان کرد. شکستەکان زوو وەخت و ناوبەناو بوون. کابرایەکی خەڵکی نیویۆرک-م لەبیرە کە لە یەکەمین گەشتی ئاسمانییەکەی لە (سێسنا ١٧٢)یەک گەڕایەوە کە ئەوەندەی رەنگی جلی فرۆکەوانییەکی سەوز هەڵگەڕابوو- ئەو کاتەی لێدەرکە کە خواردنەکەی لێ رژابوو. ئەزموونە سەرەتاییەکانم لە هێزی ئاسمانیدا تەنیا تا رادەیەک باش بوون. مامۆستاکەم دەیتووانی هەست بە نائارامی بکات و باوەڕی بە راوێژی زۆر نەبوو. لە یەکێك لە گەشتە ئاسمانییە سەرەتاییەکانمدا، ئەو لە پڕ جڵەوەکەی گرت و ئەوەندەی پێیکرا رایکێشا و فرۆکەکەی وەستاند. فرۆکەکە دەمی هەڵبڕی و لەرزی. پاشان گێرەکەی بەرەو پێش جولاند و دەمەکە نرم بووەوە. فرۆکەکە گەڕایەوە باری ئاسایی. راهێنەرەکە یەکەم مانۆڕی گەڕانەوە باری ئاسایی لە دوای وەستان، پیشان دام. سەیری کردم و وتی، "کوڕە، ئەگەر دەتەوێ ببیت بە فرۆکەوان، پێویستە ئەم ماشێنە کۆنترۆڵ بکەیت و نەهێڵیت کۆنترۆڵت بکات".

ئامۆژگارییەکەم بە جددی وەرگرت، شارەزایەتیم لە بنچینەکانی فڕیندا پەیدا کرد، لەوانەش جولەی سپرینگی، جولەی گلۆربوونەوەی بەرمیل و ئامێرەکان. کاتێك باوکم هات پشتم بگرێت، هەستێکی یەکجار گەورەی سەرکەوتنم لا دروست بوو. دوای قوتابخانەی فڕین، رۆیشتم بۆ هوستن کە لەوێ فێربووم فرۆکەوانی بە جێتێکی شەڕکەر بکەم بەناوی (F-102) لە بنکەی ئاسمانیی ئێلینگتن. ئێف سەدودووەکە یەك کوشنی تاك مەکینەیی بوو. کاتێك تاوەکو کۆتایی رێچکەکە جولەم پێکرد، خێراییەکەم گەیاندە

ئاستی تەوژمەکە و هەستم کرد کە مەکینەکە کەوتە سەر سکە، گرنگ نەبوو کە کێ بوویت و لە کوێوە هاتوویت، دەبووایە ئاگاداری چرکەساتەکە بێت.

حەزم لە فڕین بوو، بەڵام بە هاتنی ساڵی ١٩٧٢، بەرە بەرە بێتاقەت دەبووم. کاتەکانی فڕینم لە سەر لە ئێوارەکان یان کۆتایی هەفتەکاندا ئەنجام دەدا و بە درێژایی ڕۆژەکانیش لە بوارێکی بزنسی کشتوکاڵدا ئیشم دەکرد. ئەرکەکانم لە ئۆفیسدا بریتی بوون لە ئەنجامدانی توێژینەوە لە پیشەسازیی قارچکدا لە (پەنسلڤانیا) و سەردانکردنی کێڵگەکانی پاراستنی ڕووەك کە کۆمپانیاکە بەدەستی هێنابوون. ئەمە بە ڕاستی ئیشێکی سەرنجڕاکێش نەبوو. ڕۆژێکیان پەیوەندییەکی تەلەفۆنیم لە هاوڕێکەم (جیمی ئالیسن) پێگەیشت، کارمەندێکی سیاسیی (میدلاند) بوو کە لە ساڵی ١٩٦٦دا هەڵمەتی سەرکەوتووی باوکمی بۆ ئەنجومەنی نوێنەرانی ئەمریکا بەڕێوەبردبوو. ئەو لەبارەی دەرفەتێکەوە قسەی لەگەڵ کردم لە هەڵمەتەکەی (ڕێد بلاونت)دا بۆ ئەنجومەنی پیرانی ئەمریکا لە ویلایەتی (ئالاباما). ئەمەیان پێدەچوو خۆش بێت و من ئامادەبووم بجوڵێم.

ئەفسەری فەرماندەرەکەم، موقەدەم (جێری کیلیان) گواستنەوەی منی بۆ (ئالاباما) قبوڵ کرد بەو تێگەیشتنەی کە من ئەو سەعاتانەی ئیش کە لەسەرمە، لەوێ دەخەمەکار. من بە فەرماندەکانی گاردی (ئالاباما)م ڕاگەیاند کە دەبێ لە ماوەی هەڵمەتەکەدا لە چەند کۆبوونەوەیەکدا ئامادە نەبم، ئەوان وتیان دەتوانم پاش هەڵبژاردن باربووی بکەمەوە، کە هەر ئەوەشم کرد. زۆرم بیر لەمە نەکردەوە تاوەکو چەند دەیەیەکی تر.

بەداخەوە، نووسینەوەی ڕووداوەکان خراپ بوو و تۆماری ئامادەبوونم ڕوون نەبوو. کاتێ چوومە ناو سیاسەتەوە، نەیاران درزی ناو سیستەمەکەیان بەکارهێنا بۆ بانگەشەی ئەمەی کە ئەرکی خۆمم ڕانەپەڕاندووە. لە دوادواکانی ١٩٩٠ەکاندا، داوام لە یاریدەدەرێکی جێ متمانەم کرد بەناوی (دان براتلێت) کە سۆراخێکی تۆمارەکانم بکات. ئەمانە پیشانیاندا کە من بەرپرسیارێتییەکانم جێبەجێ کردووە. لە ساڵی ٢٠٠٤دا، دان هەندێ تۆماری پەیوەندیدار بە ددانی دۆزییەوە، دەریدەخست کە من لە (بنکەی گاردی نیشتمانیی ئاسمانی) پشکنینم بۆ کراوە لە مۆنتۆگەمری، ئالاباما. لەو ماوەیەدا ئەو ڕەخنانە بڵاوبوونەوە کە گوایە من غایب بووم. ئەو بە نوکتەیەکی زیرەکانەوە لە بەرانبەر

سەرسامم بەوانە و ڕێزیان لێدەگرم کە ڕەوانەی ڤێتنام کران. نزیکەی شەست هەزاریان هەرگیز نەگەڕانەوە. خزمەتی من بە بەراورد بە هی ئەوان هیچ نەبوو.

***

لە ساڵی ١٩٧٠دا، باوکم بڕیاریدا جارێکی تر خۆی بۆ ئەنجومەنی پیران بپاڵێوێت. هەستێکی باشمان هەبوو لەمەڕ دەرفەتەکانی بۆ خۆپاڵاوتنەوە لە بەرانبەر ڕالف یاربۆرۆ. بەڵام سیناتۆر یاربۆرۆ ئەوەندە خەڵکی لێ بووەوە کە خولی سەرەتاییەکەی لە بەرانبەر (لۆید بێنسن)ی دیموکراتی کۆنسێرڤاتیڤ (موحافیزکار) لەدەستدا. باوکم پێشبڕکێیەکی باشی کرد، بەڵام دیسان کورتی هێنا. وانەکە ئەوە بوو کە هێشتا سەختە وەکو کۆمارییەك لە تەکساس هەڵبژێردرێت.

بە ڕوویی وانەیەکی تر لەئارادا بوو. شکست، هەر چەندە بەئازارە، هەمیشە کۆتایی نییە. ماوەیەکی کورت پاش هەڵبژاردنی ١٩٧٠، سەرۆك ڕیچارد نیکسن داوای لە باوکم کرد سەرۆکایەتی کۆمیتەی نیشتمانیی کۆمارییەکان بکات. ئەمە دەرکەوت کە وانەیەکی بەنرخە لە بەڕێوەبردنی قەیراندا کاتێك باوکم حزبەکەی لە فەزیحەی (واتەرگەیت) تێپەڕاند.

ئەو ڕۆژەی کە سەرۆك نیکسن ئیستیقالەی کرد و جیراڵد فۆرد سوێندی سەرۆکایەتی خوارد، دایك و باوکم لە کۆشکی سپی بوون. بەڕوویی دوای ئەمە، سەرۆك فۆرد داوای لە باوکم کرد کە خۆی یەکێك لە دوو باڵیۆزیی لەندەن یان پاریس هەڵبژێرێت کە بە شێوەیەکی نەریتی، ئەمانە دوو پۆستی دیپلۆماسی هەرە خوازراو بوون. باوکم وتی حەز دەکات بچێت بۆ چین و ئەو و دایکم چواردە مانگی بێ وێنەیان لە بێجینگ بەسەر برد. ئەوان ئەو کاتە گەڕانەوە وڵات کە فۆرد داوای لە باوکم کرد سەرۆکایەتیی ئاژانسی هەواڵگریی ناوەندی (سی.ئای.ئەی) بکات. ئەمەش کارێکی خراپ نەبوو بۆ کەسێك وەکو کاندیدی ئەنجومەنی پیران، دوو جار شکستی هێنابوو. هەڵبەت لەوێشەوە کۆتایی نەبوو.

من سەرسامی سەرکەوتنەکانی باوکم بووم. هەر لە ساڵانی هەرزەکاریمەوە، من بە مکوڕییەوە، ڕێگای ئەوم گرتبووەبەر – ئاندۆڤەر و یەڵ، پاشان خزمەتکردن وەکو

فرۆکەوانی سوپا. کاتێکیش زیاتر چوومە تەمەنەوە، دەرککردنێکی گرنگم هەبوو: کەس داوای لێ نەدەکردم لەگەڵ تۆماری باوکمدا خۆم بگونجێنم، نە پێویستیشم بەوە بوو تاقی بکەمەوە. ئێمە لە دوو بارودۆخی تەواو جیاواز دابووین. بە گەیشتنم بە تەمەنی سی ساڵی، ئەو لە جەنگدا شەڕی کردبوو، ژنی هێنابوو، ببووە باوکی سێ منداڵ و یەکێکیانی بە شێرپەنجە لەدەستدابوو. کاتێک لە دوادواکانی بیستەکانی تەمەنمدا گاردم جێ هێشت، بەرپرسیارێتییەکی وەها جددیم نەبوو. ڕەمەکی (عفوی) و سۆراخکەر بووم، بە دوای سەرکەشییەوە بووم. ئامانجم بونیادنانی شوناسی خۆم و دروستکردنی ڕێچکەی خۆم بوو. لە لای خۆیانەوە، باوك و دایکم ڕۆحی زیندوویان ناسیمەوە و نەیانژاکاند. کاتێك هێڵەکەم تێدەپەڕاند، پێیان دەوتم. یەکێك لە وتوێژە هەرە توندەکانم لەگەڵ باوکمدا ئەو کاتە بوو کە بیست ساڵان بووم. بۆ هاوین لە کۆلێژ گەڕابوومەوە ماڵەوە و لەسەر بۆڕییەکی نەوت لە دەریاچەی چارلز، لویزیانا، کرێکاریم دەکرد. هەفتەیەك کارم دەکرد و هەفتەیەك ئۆف بووم. پاش کارێکی زۆری سەخت و گەرم، بڕیارمدا دوایین هەفتە لێدەم و کاتێك لەگەڵ هاوڕێ کچەکەم لە هوستن بەسەر ببەم.

باوکم بۆ ئۆفیسەکەی بانگی کردم. بە نەرمییەوە پێم وت بڕیارمداوە هەفتەیەك زووتر واز لە ئیشەکەم بێنم. پێی وتم کۆمپانیاکە بە نیەتپاکییەوە منی دامەزراندووە و من ڕازی بووم کە تاوەکو بەروارێکی دیاریکراو کار بکەم. گرێبەستێکم هەبووە و پێشێلم کردووە. لەوێ دانیشتم و بەرە بەرە زیاتر هەستم بە ناخۆشی دەکرد. کاتێك بەم قسانە "کوڕم، بێ ئومێد بووم" کۆتایی هێنا، سەرمەزار بووم.

چەند سەعاتێك دواتر، زەنگی تەلەفۆن لە ماڵەوە لێیدا. باوکم بوو. نیگەرانی ئەوە بووم کە محازەرەیەکی تر وەربگرم. لەبری ئەمە، پرسیاری لێکردم "جۆرج، ئەمشەو چی دەکەی؟" پێی وتم کە چەند تیکتێکی پێیە بۆ یاریی (کۆمەڵەی گەورەی بەیسبۆڵ)ی هوستن و من و هاوڕێ کچەکەمی بانگهێشت کردووە. دەستبەجێ قبوڵم کرد. ئەزموونەکە جەختێك بوو لە گرنگیی لەسەر قسەی خۆ بوون. هەروەها قوڵایی خۆشەویستی باوکمی پیشاندام.

که پێویستی بکردایە، باوکم جددی بوو، بەڵام ناو خێزانەکەمان پڕ بوو لە پێکەنینز باوکم حەزی لە نوکتە گێڕانەوە بوو بۆ ئێمەی منداڵ: " ئەو نوکتەیەی فرۆکەکەت بیستووە؟ گوێ مەدەیە، ئەوە بەسەر سەرتەوەیە". لەقەبی بۆ خێزان و هاوڕێیان دادەنا. لە کاتێك لە کاتەکاندا بە منی دەوت (جونی) کە کورتکراوەی جونیەر ( بچوك). (نێیل)ی برام بە ویتی ناسرابوو کە کورتکراوەی ویتنی بوو، ئەمەش لەبەر قژە زەردەکەی. هاوڕێی خۆشەویستی باوکم، جەیمز بەیکەر ببوو بە بەیك. لە دەسکەوتە هەرە بەرزەکەیدا، باوکم دایکمی ناونا ڕێوی زیوین.

حەزی گاڵتە و گەپی باوکم بە درێژایی ژیانی بەردەوام بوو. کاتێك سەرۆك بوو، خەڵاتی (سکۆکرۆفت)ی دروستکرد- بەناوی راوێژکاری ئاسایشی نیشتمانی برێنت سکۆکرۆفت کراوە- بۆ ئەو ئەندامانەی ستاف کە لە کۆبوونەوەدا خەو دەیبردنەوە. ئێستا، لە هەشتاکانی تەمەنیدا، لە ڕێگەی ئیمەیڵەوە نوکتە بڵاو دەکاتەوە و لە یەکەوە (خراپ) بۆ دە (زۆرباش)، پلەبەندی دەکات. چەند ساڵێك لەمەوبەر، باوکم لە نەشتەرگەرییەکەی چاك دەبووەوە لە مایۆ کلینیك. کاتێك پەرستارەکە هات پشکنینی بۆ بکات، پرسیاری کرد: "ئار مای تێستیکڵس باك؟" واتە گونەکانم ڕەشن؟ پەرستارەکە واقی ورما. "ببوورە، جەنابی سەرۆك؟" پرسیارەکەی دووبارە کردەوە، ئارِ مای تێستیکڵس باك. کاتێ پەرستارەکە دەستی برد بۆ پەڕە کاغەزێك، باوکم زیرەکانە وتبووی: "ئای سێد، ئار مای تێست ریزەڵتس باك؟" واتە، وتم ئەنجامەکانی پشکنینەکەم دەرچوون؟ تیمە پزیشکییەکەی دابوویانە قاقای پێکەنین.

بەدرێژایی ساڵانێك مقۆمقۆی یەکجار زۆر هەبووە لەبارەی پەیوەندیی من بە باوکمەوە. پێم وایە ئەمە بۆ جوت سەرۆکێکی باوك و کورِ لەماوەی ١٧٢ ساڵدا، سروشتییە. تاکە راستیی سادە ئەوەیە کە من زۆر خۆشم دەوێت. بە درێژایی ژیانم ڕێزم گرتووە، سەرسامی بووم و سوپاسگوزاری خۆشەویستییەکەی بووم. چیرۆکێکی بەدناو هەیە لەبارەی منەوە کە درەنگانی شەوێك بە ئۆتۆمبێل گەڕاومەتە ماڵەوە، بەسەر تەنەکەخۆڵی دراوسێکەماندا ڕۆیشتووم و پاشان لە بەرانبەر باوکمدا دەمهەراشیم کردووە.

لە ڕاستیدا من کوڕێکی کحولی بووم، ئەویش بەشێوەیەکی بەجی باوکێکی هەستیار بوو. زۆر بیرمان لەمە نەکردەوە تاوەکو بیست ساڵ دواتر لە ڕۆژنامەکاندا بلاوکرایەوە.

چرکەساتی لەو شێوەیە، بیرهێنەرەوەیەکی ئەوەیە کە من تەنیا کوڕی باوکم نیم. مجامەلەیەکی ڕەق و هەڵچووی باربارا بوش-م هەیە. هەندێ جار لە ڕێگای خۆم چوومەتەدەرەوە بۆ پیشاندانی سەربەخۆیی خۆم. پێم وایە ئەوان لەمە تێگەیشتن، تەنانەت ئەو کاتەش کە تورەم دەکردن.

دواجار شتەکانم لە ڕوانگەی دایك و باوکمەوە بینی کاتێك منداڵی خۆم پەیدا بوون. (جێنا)ی کچم دەشیا ڕەق و توند بێت، ڕێك وەکو خۆم. کاتێك لە ساڵی ١٩٩٤ چوومە پێشبڕکێی بۆ پۆستی پارێزگار، بە ڕێکەوت تەقەم لە (کیلّدیەر)ێك کرد، باڵندەیەکی دەنگخۆشی دەگمەن، لە یەکەمین ڕۆژی وەرزی ڕاوکردنی کۆتردا. هەڵکە مانشێتەکانی داگیر کرد، بەڵام بە خێرایی بزر بوو. چەند هەفتەیەك بەر لە هەڵبژاردن، من و لۆرا لەگەڵ کچەکان لە پێشانگەی ویلایەتی تەکساس لە (دالاس) هەڵمەتمان ئەنجامدا. جێنای دوانزە ساڵان، باڵندەیەکی ئاخنراوی وەکو خەڵات لە یاری کەرنەڤاڵدا بردەوە. لەکاتێکدا کە کامێراکانی تەلەفزیۆن دەهاتن و دەچوون، ئەو باڵندە ئاخنراوەکەی بەرز کردەوە بۆ هەوا و بە بزەیەکی ساردەوە وتی "سەیرکە باوکە، ئەمە کیلّدیەرە"!

***

لە پایزی ١٩٧٢دا سەرێکی داپیرەمدا لە فلۆریدا. هاوڕێی کۆلێژم مایك بروکس لە ناوچەکە بوو و پێکەوە یاری گۆلفمان کرد. مایك تازە لە بەشی بزنسی زانکۆی هارڤارد تەخەروجی کردبوو. پێی وتم کە دەبێ بیر لەوە بکەمەوە بچمە ئەوێ. ئەو فۆرمێکی تەقدیمکردنی بۆ ناردم و پێی وتم دڵنیا بمەوە کە قسەکەیم لە گوێ گرتووە. بایی ئەوەندە تامەزرۆ بیووم کە پڕی بکەمەوە. چەند مانگێك دواتر، قبوڵ کرام. دڵنیا نەبووم لەوەی کە بگەڕێمەوە بۆ خوێندن یان بۆ خۆرهەڵات. گومانەکانم لای (جێب)ی برام باس کرد. ئەو کاتەی کە لە گەشەکردندا بوو جێبی برام باش نەدەناسی- ئەو تەنیا هەشت ساڵان بوو کە من چوومە قوتابخانەی دەرەوەی شار- بەڵام کاتێك دەچووینە تەمەنەوە بەیەکەوە بووین.

جێب هەموو کاتێك لە من بیرکردنەوەی مکوڕتری هەبوو. ئەو زیرەك، بەتەرکیز و لەهەموو ڕوویەکەوە خاوەن ئەنگێزە بوو. ئەوی فێری قسەکردنی ئیسپانی بوو بە ڕەوانی، پسپۆڕی لە کاروباری ئەمریکای لاتینیدا پەیدا کرد و لە (ڤ بیتا کاپا)ی زانکۆی تەکساس تەخەروجی کرد. لە ماوەی ساڵی کۆتایی خوێندنی ئامادەییدا، وەکو بەشێك لە پرۆگرامی ئاڵوگۆڕی خوێندکاران، لە مەکسیك ژیا. هەر لەوێ بە ژنێکی جوان ئاشنا بوو بە ناوی (کۆلومبا گارنیکا). هەردووکیان گەنج بوون، بەڵام دیار بوو کە جێب کەوتبووە داوی خۆشەویستییەوە. کاتێك بەیەکەوە دەچوونە سەیری یارییەکانی کۆمەڵەی گەورەی بەیسبۆڵ، من تەماشای یاریم دەکرد و ئەویش نامەی بۆ (کۆلو) دەنووسی. ئەوان دوو هەفتە پاش بیست و یەکەمین ساڵەی لەدایکبوونی، هاوسەرگیرییان کرد.

شەوێکیان من و جێب لەگەڵ باوکمدا لە ریستۆرانتێك نانی ئێوارەمان دەخوارد لە هوستن. من لە پرۆگرامێکی ئامۆژگاری کارم دەکرد لە بازنەی سێیەم(سێرد وارد)ی هەژارکەوتووی هوستن و من و باوکم گفتوگۆیەکمان هەبوو لەبارەی ئایندەمەوە. جێب یەکسەر دەمی کردەوە، "جۆرج لە هارڤارد وەرگیراوە".

پاش کەمێك بیرکردنەوە، باوکم وتی "کوڕم دەبێ بە جددی بیر لە چوون بکەیتەوە. ئەمە دەبێتە ڕێگەیەکی باش بۆ فراوانکردنی ئاسۆکانت". ئەمە هەموو ئەو شتە بوو کە وتی. بەڵام وایلێکردم بیر بکەمەوە. فراوانکردنی ئاسۆکانم ڕێك ئەو شتە بوو کە لەو ساڵانەدا هەوڵم ئەدا بیکەم. ئەمە شێوازێکی تری وتنی ئەمە بوو "خۆت بخەڕوو بۆئەوەی درك بە بەهرە خواپێداوەکانت بکەیت".

بۆ دووەم جار لە ژیانمدا، لە هوستن-ەوە بەرەو ماساشوسێتس ڕۆیشتم. شۆفێری تەکسییەکە لای کامپی زانکۆی هارڤارد وەستا و بەخێرهاتنی کردم بۆ "پنتی خۆرئاوای سەرمایەداری". من بە پێشبینی چوومە ئاندۆڤەر و بە نەریت چوومە یەڵ، بەڵام بە هەڵبژاردن لە هارڤارد بووم. لەوێ میکانیکی دارایی، ژمێریاری و ئابووری فێربووم. لە ئاکامدا باشتر لە بەڕێوەبردن تێگەیشتم، بەتایبەت گرنگیی دانانی ئامانجی روون بۆ دامەزراوەیەك، ئاراستەکردنی ئەرکەکان و بەدواداچوونی خەڵك. هەروەها ئاسوودەیی ئەوەم بەدەستهێنا کە سۆراخی کاروەگەڕخستن بکەم.

وانەکانی بەشی بزنسی زانکۆی هارڤارد بەهۆی سەرچاوەیەکەوە کە پێشبینی نەدەکرا، جەختی لێکرایەوە: گەشتێك بۆ سەردانی دایك و باوکم لە چین پاش تەخەروجکردن. بەراوردەکە دیار بوو. من لە پێنتی خۆرئاوای سەرمایەدارییەوە چووبووم بۆ سەنگەری خۆرهەڵاتی کۆمەنیزم، لە کۆماری ئیختیاری تاکەکەسییەوە بۆ وڵاتێك کە تیایدا هەموویان هەمان جلی خۆڵەمێشییان لەبەر دەکرد. لەکاتێکدا کە بایسکیلەکەم بە جادەکانی بێجینگ-دا لێدەخوڕی، چەند جارێك ئۆتۆمبێلێکی لیمۆزینی ڕەشم دەبینی کە جامەکانی ڕەش کرابوون کە هی یەکێك لە کەسایەتییە گرنگەکانی حزب بوو. ئەگەرنا ئەوا ئۆتۆمبێلی کەم و هیچ نیشانەیەکی بازاڕی ئازاد نەبوو. سەرم سوڕما کە بینیم چۆن وڵاتێکی وەها مێژوو دەوڵەمەند دەکرێ وەها مردوو بێت.

لە ساڵی ١٩٧٥دا، چین لە شۆڕشی کەلتوورییەوە سەری دەردەهێنا، واتە تەقەلای حکومەتەکەی بۆ پاککردنەوە و زیندووکردنەوەی کۆمەڵگە. کاربەدەستانی کۆمەنیست پرۆگرامەکانی بەڕێبازکردنیان دانابوو، پڕوپاگەندەیان لە ڕێگەی بڵندگۆ بەربڵاوەکانەوە پەخش دەکرد و سۆراخی ئەوەیان دەکرد کە هەر بەڵگەیەکی مێژووی کۆنی چینی توڕ هەڵبدەن. گروپەکانی خەڵکی گەنج هێرشیان دەکردە سەر بەتەمەنەکان و نوخبەی ڕووناکبیر. کۆمەڵگەی بەسەر خۆیدا دابەش ببوو و بەرەو ئاژاوە و پشێوی هەنگاوی دەنا.

ئەزموونی چین منی بیر شۆڕشەکانی ڕوسیا و فەرەنسا هێنایەوە. ڕێساکە هەر هەمان شت بوو: خەڵکی بە بەڵێندانی هەندێ خەیاڵی دیاریکراو کۆنترۆڵیان گرتە دەست. هەر کە دەسەڵاتیشیان گرتەدەست، خراپ بەکاریان هێنا، بیروباوەڕەکانیان بەلاوەنا و هاوڵاتییانیان چەوساندەوە. هەروەکو ئەوە وابوو کە مرۆڤایەتی نەخۆشییەکی هەبێت و بەردەوام خۆی تووش بکاتەوە. ئەو بیرکردنەوە بێدارکەرەوەیە باوەڕی منی قوڵکردەوە لەبارەی ئەمەی کە ئازادی-ئابووری، سیاسی و ئایینی- تاکە ڕێگای دادپەروەرانە و بەرهەمهێنی حکومڕانیی کۆمەڵگەیە.

***

زۆربەی کاتم لە هارڤارد، نەمدەزانی چۆن چۆنی بروانامەی بزنسەکەم بەکاربهێنم. دەمزانی نابێ چی بکەم. هیچ ئارەزووی ئەوەم نەبوو بچمە (وۆڵ ستریت). لەکاتێکدا کە خەڵکێکی شایستە و بەڕێزم دەناسین کە لە وۆڵ ستریت ئیشیان کردبوو، لەوانەش باپیرم، پریسکۆت بوش، من بەگومان بووم لە پیشەسازیی دارایی. بەردەوام بە هاوڕێیانم دەگوت کە وۆڵ ستریت شوێنێکە کە یان دەتکرێت یان دەتفرۆشێت، بەلام منەتێکیان بە تۆ نییە تا ئەو کاتەی کە دەتوانن پارەت پێ پەیداکەن.

کاتێك (دێل مارتینگ)ی هاوپۆلم لە هارڤارد بانگهێشتی کردم بۆ بەسەربردنی پشووی بەهاری ١٩٧٥ لە کێڵگەی خێزانەکەیان لە (توکسۆن)، ئەریزۆنا، خەریکی گەڕان بووم بەدوای بژارەکانی بەردەممدا. لە ڕێگەی جێ هێشتنی خۆرهەلاتدا، بڕیارمدا سەرێکی میدلاند بدەم. لە زاری جیمی ئالیسن-ی هاوڕێم کە (میدلاند ریپۆرتەر تێلیگرام)ی چاپ و بلاودەکردەوە بیستبووم کە شوێنەکە لە گەشەکردندایە. راستی دەکرد. پیشەسازیی وزە پاش بایکۆتی نەوتی عەرەبی لە ساڵی ١٩٧٣دا، لە هەڵکشاندا بوو. تەگەرەکانی بەردەم چوونەناو پیشەسازییەکەوە نزم بوون. حەزم دەکرد کە بزنسێکی خۆم دەستپێبکەم. بڕیاری خۆممدا: گەڕامەوە بۆ تەکساس.

لە پاییزی ١٩٧٥دا بە هەموو شتەکانمەوە کە لە پشت (ئۆلدزمۆبێل کوتلاس)ەکەمەوە بارم کردبوون گەیشتمەوە شار. زۆر مابوو فێر بم، بۆیە بەدوای ئامۆژگاریکەردا گەڕام. یەکێك لەو یەکەمین کەسانەی کە سەردانم کردن پارێزەرێك بوو بەناوی (بۆید لەفلین) کە بە سۆزەوە بە لوفۆل ناسرابوو. ئەو کۆبوونەوەیەکی لەگەڵ (بەز میلس) ڕێکخست، پیاوێکی کەڵەگەتی قژ حەفر کراو و خاوەن ساڵانێك ئەزموون لە بزنسی نەوتدا. بۆم دەرکەوت کە بەز و شەریکەکەی کە پیاوێکی جگەرە لەدەم بوو بەناوی (رالف وەی)، یاری (جین رەمی) دەکەن کە جۆرێك بوو لە یاری وەرەقە. ناتوانم بیخەمڵێنم کە چەندە پارەیان لە گرەوی ئەو یارییەدا دادەنا، بەلام یەکجار زۆرتر بوو لەوەی کە من هەمبوو.

لەودیو مەشرەبی دێهاتییانەی هاوڕێیانەیان، تێگەیشتنێکی زیرەکانەیان هەبوو لە بزنسی نەوتدا. بە بەز و رالفم وت کە دەمەوێ فێری ئەوە بم ببمە خزمەتگوزاری زەوی. ئیشی خزمەتگوزاری زەوی ئەوە بوو کە سەفەر بکات بۆ دادگای پارێزگا و توێژینەوە

لەوە بکات کە کێ مافە کانزاییەکانی هەیە بۆ ئەو مەوقیعانەی هەڵکەندن کە لەوانەیە ئامادە بکرێن. کلیلی سەرکەوتن لە ئیشەکەدا بریتی بوو لە ئامادەیی خوێندنەوەی برێکی زۆری کاغەز و ئەوراق، چاوێکی تیژ بۆ وردەکاری و ئۆتۆمبێلێکی جێ متمانە. سەرەتا چوومە لای ئەو کەسانەی کە ئەزموونیان لە بوارەکەدا هەبوو کە پێیان وتم چۆن کتێبەکانی ناونیشانەکان بخوێنمەوە. پاشان بە تەنیا چەند گەشتێکم ئەنجامدا و تۆمارەکانی دادگام بۆ باجی رۆژانە پشکنی. دواجار هەندێ رێژەی سەدی و پشکی بچوکی چالاکم لە چاڵە نەوتەکانی بەز و رالف کڕی. بە بەراورد بە پیاوانی نەوتی گەورەی سەردەم، وەکو ئەوە وابوو من وردە نان کۆ بکەمەوە. بەڵام بژێوییەکی شایستەم دەست دەکەوت و شتی زۆر فێر دەبووم.

من تێچوونەکانم بەپێی چەماوەی بژێوی، نزم دەکردەوە. من خانووی کۆڵانێکم بەکرێ گرت بە ڕووبەری پێنجسەد پێی چوارگۆشە کە هاوڕێکانم بە "پاشەڕۆیەکی ژەهراوی" ناویان دەبرد. سوچێکی سیسەمەکەم بە بۆینباخێك پێکەوە بەسترابووەوە. ئامێری جلشۆرم نەبوو، بۆیە جلەکانم بۆ شتن دەبردە شوێنی دۆن و سوسی ئێڤان. من و سوسی لە سەروەختی قوتابخانەی بنەڕەتییەوە دەناسی. ئەو شووی بە دۆن کردبوو، کابرایەکی خەڵکی هوستن کە دوو بڕوانامەی لە زانکۆی تەکساس بەدەستهێنابوو و هەردووکیان گواستبوویانەوە بۆ میدلاند بۆئەوەی بچنە ناو بزنسی نەوتەوە. دۆن پیاوێکی بێ رادە خاکی بوو بە هەستێکی گاڵتە و گەپی گەورەوە. پێکەوە رامان دەکرد، یاری گۆڵفمان دەکرد و هاوڕێیەتییەکی تاهەتاییمان دروستکردبوو.

لە بەهاری ١٩٧٦دا، دۆن و هاوڕێیەکی نزیکی ترم، نەشتەرگەرێکی ئێسقان و ماسولکە بەناوی (چارلی یەنگەر)، پێیان وتم کە پەیوەندییان پێوە بکەم بۆ کۆنسێرتێکی (ویلی نێلسن) لە ئۆدێسا. بێگومان، کەمێك خواردنەوەمان پێویست بوو بۆئەوەی بۆ چوون خۆمان ئامادە بکەین. چەند بوتڵێکی ویسکی (بۆربون)مان کڕی و لە رێگە چەند پێکێکمان نۆش کرد. کاتێك گەیشتینە (ئێکتەر کاونتی کۆلسیەم)، ئەوەمان بیر هێنرایەوە کە رێگە بە خواردنەوەی کحولی نادرێت. دوو سێ قومی تریشمان خواردەوە، بوتڵەکانمان فرێدا و چووینە شوێنی خۆمان.

چارلی بڕیاریدا کە پێویستمان بە کحولی زیاترە بۆئەوەی بە تەواوی چێژ لە ئەزموونەکە وەربگرین. تووشی سەرسوڕمان بووین کە بینیمان توانی بەردەستێکی لای شانۆکە رازی بکات بەوەی کە ویلی نێلسن بیرەی دەوێت. کابرا بەوپەڕی خەمخۆرییەوە چووە دەرەوە و بە پارەی چارلی بیرەیەکی کڕی. چارلی کەیسێکی بۆ ویلی برد و کەیسێکی بە دزییەوە بۆ ئێمە هێنایەوە. ئێمە لەسەر کورسییەکانمان خۆمان نزم کردەوە و وەکو لە تینووا خنکاو کەوتینە هەڵقوڕاندن. پاش ئەوەی هەر یەکەمان دوو سێ بوتڵی بە خێرایی خواردەوە، چارلی وتی با بچینە سەری تەختەی شانۆ و سوپاسی هاوڕێ نوێکەی بکەین. دۆن ژیرانە لە دواوە مایەوە. من نا. لە سەروو دەنگی باندەکەوە، گوێم لە خەڵك بوو هاواری ناوی منی دەکرد. گروپێکی میدلاندییەکان لە ریزی پێشەوەی ئامادەبوواندا من و چارلییان ناسیبووەوە. هاواریان دەکرد بۆ بیرە. ئێمە بۆمان دابین کردن. کاتێك کۆنسێرتەکە تەواو بوو، چارلی چەند شووشەیەکی مل درێژی خستە ژێر قەمیسەکەی. لەکاتێکدا کە ئەو سێ کەسەمان دەچووینە دەرەوە، شووشەکان خزان و یەك لە دوای یەك کەوتنە سەر زەوی و شەقەیان هات. وەك بلێی زەنگی ئاگادارکردنەوەمان بۆ بەرپرسانی شوێنەکە لێدا. رۆیشتنی لەسەرخۆمان بوو بە ڕاکەڕاك بۆ دەرچوونە دەرەوە، سێ دەبەنگ لەبەر بەدناوبوونمان هەڵدەهاتین.

ڕۆژی دواتر، چەندەها کەسی میدلاند پێیان وتم کە منیان لەسەر تەختەی شانۆکە بینیووە لەگەڵ ویلی. هیچ سەروتارێك دەرنەکەوت تا ئەو کاتەی کە کوڕێکی پیر پێی وتم وەکو گەمژە لەوێ دەرکەوتووم. ڕاستیشی دەکرد.

***

کۆتایی هەفتەی (ڕۆژی کرێکاران)ی ١٩٧٦م لەماڵەوە بەسەر برد لە (کێنبەنکپۆرت)، مەین. ئەو شەوی شەممەیە، لە بارێك بووم لەگەڵ (دۆرۆ)ی خوشکم، یاریدەدەری سیاسیی لەمێژینەی باوکم (پیت رۆسێل) و لە هاوڕێیانی خێزانەکەمان، ئەستێری تێنسی ئوسترالی (جۆن نیوکەم) و (ئانجی)ی ژنی. جۆنی نەریتی ئوسترالیی (خواردنەوەی بیرە بە بێ بەکارهێنانی دەستەکان)ی پێ ناساندم. ددانەکانت لە لێواری پەرداخەکە گیر

دەکەی و سەرت بەرەو دواوە نەجولێنیت، بەم شێوەیە بیرەکە بە قورگتدا دەچێتە خوار. کاتێکی زۆر خۆشمان بەسەر برد تا ئەوەی کە گەڕاینەوە ماڵەوە.

پۆلیسێکی خۆجێیی بەناوی (کلڤین بریجس) پێی وابوو کە سەیرە من نزیکەی دە مایل لە سەعاتێکدا لێدەخوڕم لەکاتێکدا کە دوو تایەم لەسەر خۆڵەکەیە. کاتێك نەمتووانی بێمەوە سەر راستەڕێ، ئەو دایبەزاندم و بردمی بۆ بنکە. من تاوانبار بووم و هەرواشم بە بەرپرسەکان وت.

بە هەمان شێوە شەرمەزار بووم. هەڵەیەکی جدیم کردبوو. بەختەوەر بووم کە زیانم بە هیچ کام لە سەرنشینەکانم، شۆفێرەکانی تر یان خۆم نەگەیاندبوو. غەرامەیەکی ١٥٠ دۆلاریم دا بۆ دوای ئەو ماوەیەی کە ئۆتۆمبێل لێخوڕینم لە (مەین) لیَ قەدەغە کرابوو، لەویَ لێم نەخوڕییەوە. کەیسەکە داخرا. یان وابزانم پێم وایە.

***

پاییزی ئەو ساڵە بە جددی دەستم کرد بە بیرکردنەوە لە جێگیر بوون. دی.یو.ئای(خواردنەوە لە ژێر کاریگەری کحولدا)یش بەشێك بوو لەمە، بەڵام هەستەکە بۆ ماوەی چەند مانگێك لە بەرجەستەبووندا بوو. شێوازە بێ رەگوریشەکانم کەمێك بەتەمەندا دەچوون. هەروەها منیش. (٣٠)یە گەورەکە لەو هاوینەدا هاتبوو. بەڵێنم بەخۆمدا بوو کە دە ساڵی یەکەمی دوای کۆلێژ بە ئەزموونی زۆر دەبەسەر و سنووردار نابم. ئەمە بەڵێنێك بوو کە دابووم. بەڵام ئەو دەیەیە تەقریبەن بەسەر چووبوو.

بە گەڕانەوەم بۆ میدلاند لە تەمموزی ١٩٧٧، (جۆ ئۆنێیل)ی کۆنە هاوڕێم، بانگهێشتی کردم بۆ ماڵەوە بۆ خواردنی بەرگەر. من بە دەگمەن ژەمەکانی ناو ماڵ رەت دەکەمەوە. بێگومان ئەم ژەمانە لەو خواردەمەنییە ئامادەکراو (فاست فود)انە باشترن کە خواردنی بنچینەیی من بوون. جۆ و (جان)ی هاوسەری دەیانویست کەسێك ببینم: یەکێك لە هاوڕێ هەرە باشەکانی جان، لۆرا وێلش. کەمێك درەنگ گەیشتم. لە حەوشەی پشتەوە، جان و لۆرای لێ بوو کە درێسێکی هاوینەی شینی لەبەردابوو.

زۆر شۆخ و شەنگ بوو. جوتێ چاوی شینی بزوێنەری هەبوو و زۆر بە ڕێك و پێکی بە ڕێگەدا دەڕۆیشت. زۆر زیرەك و شایستە بوو بە بزەیەکی گەرم و گوڕ و ئاسان لەسەر لێوانی. ئەگەر خۆشەویستیی یەکەم سەرنج بوونی هەبێت، ئەوا ئەمە بوو.

من و لۆرا بۆمان دەرکەوت کە ئێمە لە نزیك یەکترییەوە لە میدلاند گەورە بووین و هەردووکمان چووینەتە پۆلی حەوت لە ئامادەیی (سان جاسینتۆ جونیەر). تەنانەت ئێمە لە هەمان بینایەدا ژیابووین لە هوستن. ئەو لە بەرەی ئارامدا ژیانی بردبووە سەر، لەو شوێنەی کە تیایدا خەڵکی لە بەردەم حەوزی ئاوەکە دادەنیشن و کتێب دەخوێننەوە. منیش لەو بەرەیە ژیابووم کە تیایدا خەڵکی تاوەکو کۆتایی شەو یاری باڵەی ناو ئاویان دەکرد. سەیر نییە کە ڕێچکەکانمان هەرگیز نەدەکەوتنەوە سەر یەك.

ڕۆژی دواتر تەلەفۆنم بۆ لۆرا کرد و ڕێکەوتین کە ئەو شەوە جارێکی تر یەکتر ببینینەوە. پرسیارم کرد ئاخۆ حەز دەکات یاری گۆڵف بکەین. زانیم کە ئەگەر ڕازی بێت ئەوا ئەو کچەیە کە خۆم دەمەوێت. یارییە کورتخایەنەکەی کەمێك ناڕێك بوو، بەڵام خۆش بوو کە لەلام بوو. بۆچوونە سەرەتاییەکانم لەبارەیەوە لە ئێوارەی پێشوودا، بەهێزبوون. تەنیا یەك شتێ خراپ هەبوو. لۆرا دەبووایە بگەڕێتەوە بۆ ئۆستن، لەوێ کارمەندی کتێبخانەی قوتابخانەی بنەڕەتی (داوسن) بوو. بەزوویی بیرم کرد و دەستم کرد بە سەردانکردنی زوو زوو لەوێ. ئێمە جوتێکی گونجاو بووین. من قسەکەرم، لۆراش گوێگرە. من بێ ئۆقرەم، ئەویش ئارامە. من دەشێ کەمێك هەڵچم، ئەو کرداری و مەعقول بوو. سەرەڕای ئەمانەش، ئەو واقعی و سروشتی بوو. هیچ شتێکی ساختەی نییە. سەرنجڕاکێشییەکەی دەستبەجێ و بەردەوام بوو. لە مانگی ئابدا، سەردانی ماڵەوەم کرد لە (کێنێبەنکپۆرت) و پلانی ئەوەم هەبوو هەفتەیەك بمێنمەوە. شەوێك دواتر، گەڕامەوە بۆ تەکساس بۆئەوەی لەگەڵ لۆرا بم.

چەند هەفتەیەك پاش ئەوەی کە یەکترمان ناسی، لۆرا منی بە باوك و دایکی (هارۆڵد و جێنا وێڵش) ناساند. دایکی، ژنێکی نەرم و نیان، شیرین و ئارام بوو. هەمیشە وایلێدەکردم هەست بکەم لە ماڵی خۆمم. باوکی حەزی لە وەرزشەکان دەکرد و خۆشی لەوە دەبینی کە گرەوێك یان دوو گرەو لەسەر یاری تۆپی پێ بکات. شوێنێك کە زۆر لێی

دەمایەوە، جۆنیس باربەکیو (برژاوی جۆنی) بوو. خەڵکی دەوروبەر بە بەرازی نەخۆش (سیك پیگ) ناویان دەبرد، ئەمەش بەهۆی ئەو بەرازە تەختە درێوەی لەسەری سەرەوەی ریستۆرانتەکە هەڵواسرابوو.

رۆژێکیان باوکی لۆرا هاورێیەکانی لە سیك پیگ پێناساندم لەوانەش خودی جۆنی. پێم وابوو براوەم، چونکە کۆکتێلێکی ڤۆدکا و شەربەتی پرتەقاڵم پێشکەشکرا و رەتم کردەوە. سەعات نۆی بەیانی بوو.

پەیوەندییە سۆزدارییەکە بە خێرایی بەڕێوە چوو. کۆتایی هەفتەیەك، من و لۆرا گەشتێکمان کرد بۆ کێڵگەی (ئان و تۆبین ئارمسترۆنگ) لە باشووری تەکساس. ئان باڵیۆزی پێشووی ئەمریکا بوو لە بریتانیا و ئەو و تۆبین شازادە (چارلس)یان بانگهێشت کردبوو تا یاری پۆلۆ (یاری تۆپی سەر ئەسپ) بکەن. کۆتایی هەفتەیەکی تر سەردانی جۆن و ئانجی نیوکۆم-مان کردلە ئەکادیمی تێنسەکەی لە (نیوبرۆنفێلس) لە لادێی جوانی (تەکساس هیڵ). ئەمجارە دەستم خستە سەر پەرداخی بیرەکە و لە سوکانم بەردا. زۆر بە سەختی کەوتبوومە داوی لۆراوە، من لەو کەسانە نەبووم بایەخ بە پشیلە بدەم، بەڵام دەمزانی پەیوەندییەکی تۆکمەمان هەیە کاتێك پەیوەندیم لەگەڵ پشیلە رەش و سپییەکەی دروستکرد کە ناوی دیوی بوو بە ناوی زانا (مێلڤیل دیوی) کرابوو.

هەرگیز ترسم نەبووە لە بڕیاردان، لە دوادواکانی مانگی سێپتەمبەریشدا بڕیارێکی گەورەمدا. شەوێکیان لە خانووە بچوکە کرێکەی لۆرا لە (ئۆستن)، وتم "با هاوسەرگیری بکەین". یەکسەر وتی باشە. پەیوەندییەکەمان رۆمانسیەتێکی زریان ئاسا بوو، بەڵام ئامادە بووین کە پابەند بین.

زوو پاش مارەبڕینەکە، من و لۆرا سەفەرمان کرد بۆ هوستن، لەوێ جێب و کۆلومبا ئاهەنگی ناونانی کچەکەیان (نۆوێل) دەگێڕا. لۆرام بە خێزانەکەمان ناساند. ئەوانیش ئەوەندەی من سەرسام بوون پێی. لۆرا زانی کە دەچێتە ناو بنەماڵەیەکی گەورەی پڕهەوڵ و ئەمەش بۆ ئەو گونجاو بوو. وەکو تاکە منداڵێکی خێزانەکەی، زۆر دڵی خۆش بوو بە بنەماڵەی بوش.

دایك و باوکم خشتەی بەرنامەکەیان سەیر کرد و یەکەمین ڕۆژی شەممەمان هەڵبژارد کە ٥ی نۆڤەمبەری ١٩٧٧ بوو. ئاهەنگێکی بچکۆلانەمان لەگەڵ خێزان و هاوڕێ نزیکەکان لە میدلاند ڕێك خست. بانگهێشتنامەکان لەلایەن دایکی لۆراوە نوسران. ڕێنوێن و بەردەستی بوك و بەردەستی زاوا و شتی وامان نەبوو. تەنیا من و لۆرا و باوکی بووین کە لۆرای بەرەو خوارەوەی پلیکانەکان دەبرد.

هەرچەندە وردەکاری ئەو کاتە لەبیر نییە، بەڵام پێم وایە هۆکارێك هەبووە بۆئەوەی کە من و لۆرا هەموو ئەو ساڵانەی پێشتر هەرگیز یەکترمان نەناسیبوو. خوا ڕێك لە کاتی گونجاودا ئەوی هێنایە ناو ژیانی منەوە، ڕێك ئەو کاتەی کە ئامادەی جێگیر بوون بووم و بەلامەوە ئاسایی بوو کە شەریکێك لە ژیانمدا هەبێ. ئەمەیان باشترین بڕیاری ژیانم بوو.

***

ماوەیەکی کورت پاش ئەوەی کە هاوسەرگیریمان کرد، من و لۆرا بڕیارماندا کە منداڵمان ببێت. پاش دوو سێ ساڵ هەوڵدان، بەو ئاسانییە ڕووینەدەدا کە هیوامان خواستبوو. گفتوگۆمان کرد، تێڕامایین، نزامان کرد و بڕیارماندا کە منداڵێك تەبەنی بکەین. سەرەتا من ئاسودە نەبووم لە باوکایەتیی منداڵی کەسێکی تر. بەڵام چەندەی زۆرتر لە تەبەنیکردن وردبوومەوە، ئاسودەتر بووم. هاوڕێمان هەبوون کە منداڵیان تەبەنی کردبوو و وەکو نیعمەتێکی بێ هاوتا خۆشیان ویستبوو. ئێمەش بەختەوەر بووین بە زانین لەبارەی ئاژانسێکەوە بەناوی خانەی (ئێدنا گلادنی) لە فۆرت وێرس.

گلادنی کە لەلایەن ئایین بڵاوکەرەوەیەکی میتۆدیست (سەر بە بەزاڤێکی پرۆتستانتی) لە ساڵی ١٨٨٧ دامەزرێنرا بوو، ببووە یەکێك لە خانە هەرە سەرەکییەکانی تەبەنیکردن لە جیهاندا. من و لۆرا لە ڕێگەی تەلەفۆنەوە بە بەڕێوەبەری لەمێژینە (روبی لی پیستەر) ناسێنراین. ئەو بانگی کردین بۆئەوەی بەناو نەخۆشخانەکەدا پیاسەیەك بکەین کە لەوێ چاومان بە هەندێ ژنی سکپڕ کەوت کە لە کاتی منداڵبوون نزیك کەوتبوونەوە. من سەرسام بووم بە بڕیاری خۆنەویستانەی هێنانە دنیا منداڵ و بەخشینی بە ژن و مێردی وەکو ئێمە.

فۆرمی تەقدیمکردن چەند مانگێکی خایاند. یەکەم جار چاوپێکەوتنی سەرەتایی هەبوو کە لەخۆگری چەند پرسیارێکی دوورودرێژ بوو. خۆشبەختانە ئێمە دەرچووین. لە قۆناغی دواتردا، گلادنی پلانی ئەوەی دانا کە نوێنەرێك بنێرێت بۆ سەردانی ماڵەوە. من و لۆرا بەوپەڕی وردییەوە خۆمان ئامادە دەکرد. پاشان لە سەرەتاکانی ساڵی ١٩٨١دا، بەو هەواڵە سەری سوڕماندم کە هەست دەکات سکی پڕە.

چەند هەفتەیەك دواتر، بەرنامەی ئەوەمان دانا کە سەردانی شارەزایەکی شەپۆلە دەنگییەکان (سۆنۆگرام) بکەین لە هوستن، ژنێکی هیندی-ئەمریکی دڵگیر بەناوی (سرینی مالینی). هەستم بە نیگەرانی کرد کاتێك بینیم ئەو ئامێرە بە جەستەی لۆرادا دەهێنێت. سەیرێکی شاشەی ڤیدیۆیەکەی کرد و وتی "ئەمە سەریەتی و ئەمەش جەستەیەتی. کچە!" ژنەکە تۆزێك جوڵا بۆئەوەی باشتر بڕوانێت. لەناکاو هاواری کرد، "دوو منداڵ دەبینم، دوو منداڵی جوان! ئەمەشیان کچە. ئێوە دەبنە دایکی و باوکی دووانەیەك". چاوەکانم پڕبوون لە فرمێسك. ئەمە نیعمەتێکی دووانەیی بوو. ئیتر وێنەی شەپۆلە دەنگییەکانم بە یەکەم وێنەی خێزانیی خۆمان دانا.

کاتێك پەیوەندیمان کردەوە بە بەڕێوەبەری گلادنی بۆئەوەی هەواڵەکە بزانێ، بەشێوەیەکی نامۆ هەستمان بە گوناه کرد، وەك بڵێی پێمان رابواردووە. بە زمانێکی شیرین بە لۆرای وت "گیانەکەم، هەندێ جار ئەم شتانە روودەدەن. گلادنی دەتوانێ یارمەتی ژن و مێرد بدات کە بە شێوەیەك لە شێوەکان منداڵی هەبێت". روبی زۆر لەوە راستتر بوو کە خۆی ئەیزانی. لە فۆرمی بنچینەیی پرسیارەکاندا بۆ تەقدیمکردن، لۆرا خەتی لەو چوارگۆشەیەدابوو کە تەنیشتییەوە نووسرابوو حەز دەکەم دووانەیەك تەبەنی بکەم.

دکتۆرەکان هۆشدارییان پێدابووین کە دەشێت دووانە، سکپڕییەکی پڕمەترسی بێت. لۆرا رەتیکردەوە لەسەر قسەی بێ بنەما دایەنگەکە بڕازێنێتەوە. پاش حەوت مانگ لە سکپڕی، لۆرا تووشی (پریکلامپسیا) بوو، حاڵەتێکی توند کە دەشیا زیان بە گورچیلەکان بگەیەنێت و تەندروستی کچەکان بخاتە مەترسییەوە. رۆژی دوای وەرگرتنی ئەم هەواڵە، لۆرا داخڵی نەخۆشخانەی (بایلۆر) کرا لە دالاس کە لەوێ مامی نەشتەرگەر بوو.

دکتۆرەکان بە لۆرایان وت دەبێ لە جێگەدا پشوو بدات. دەمزانی کە لۆرا لەژێر باشترین چاودێریدایە، بەڵام نیگەران بووم. لەبارچوونەکەی دایکم لەیاد بوو. دایک و باوکم باش مردنی رۆبن لەبیر بوو. دەمزانی چەندە بە ئازارە کە منداڵێك لەدەست بدەیت. لای لۆرا دانم بە شڵەژانەکەمدانا. قەت کاردانەوەکەیم لەبیر ناچێ. بە چاوە شینەکانی سەیری کردم و وتی، جۆرج، من ئەو کچانە دەهێنمە دنیاوە. بە تەندروستیشەوە لەدایك دەبن". بەتوانایی ژنەکەم کاری تێکردم. ئەم ژنە هێمن و خاکییە، رۆحێکی تۆکمە بوو.

دوو هەفتە دواتر، لە ئۆفیسەکەم بووم لە میدلاند– لەنێوان ئەوێ و دالاسدا دەهاتم و دەچووم– کاتێك پەیوەندییەکی تەلەفۆنیم لە دکتۆر جەیمس بۆید پێگەیشت. ئەو بەرپرس بوو لە چاودێریکردنی لۆرا، زۆریش لە قسەی لابەلا وەستا نەبوو. وتی "جۆرج، بەیانی دوو مناڵەکەت دێنە دنیاوە. من سەعات شەشی بەیانی دەیانهێنمە دەر". پرسیارم لەبارەی تەندروستیی لۆرا کرد. وتی باش دەبێت. "ئەی کچەکان؟" لە وەڵامدا وتی "پێنج هەفتە پێش کاتی خۆیان لەدایك دەبن. باش دەبن. بەڵام ئێستا کاتی ئەوە هاتووە بجولێین". تەلەفۆنم بۆ لۆرا کرد بۆئەوەی پێی بڵێم کە چەندە دڵخۆشم. پاشان تەلەفۆنم بۆ دایك و باوکی کرد لە میدلاند، بۆ دایك و باوکم بە واشنتن، کۆمەڵێك هاورێ– و هەڵبەت بۆ هێڵی ئاسمانیش.

من لە ماوەی ژیانمدا بە هەندێ رووداوی دڵخۆشکەردا تێپەریووم –دەستبەکاربوون وەکو سەرۆك، قسەکردن لەبەردەم کۆمەڵانی گەورەی خەڵکدان هەڵدانی یەکەم تۆپ لە ستادیۆمی یانکییەکاندا– بەڵام هیچی وەکو ئەو چرکەساتە نەبوو کە ئەو کچانە هاتنە دنیاوە. لۆرا لەناو جێگەدا بوو و بێ هۆش بوو. دەستم بەسەریدا هێنا. ماوەیەك پێش ئەوە، دکتۆر جەستەیەکی بچکۆلەی سووری دەستدایە، ساواکە قیژاندی و دکتۆر جەختی لە تەندروستییەکەی کردەوە. پەرستارێك پاکی کردەوە و بە منیدا. (باربارا)ی بچوك. پاشان (جێنا)شی دەستدایە. ویستمان کچەکانمان ناوی دوو ژنی دانسقە هەڵبگرن، بۆیە بە ناوی دایکی یەکتریمان کردن.

بۆ ماوەیەکی دووروودرێژ بیرم لەو کچانە کردبووەوە بەجۆرێك کە بە ئەستەم باوەرم وابوو کە لە ناو دەستەکانمدان. ئەوە رۆژێك بەر لە جەژنی سوپاسگوزاری ١٩٨١ بوو.

هەر هەستیشم وا بوو، سوپاسگوزار بووم. سوپاسی خوام کرد لە بەرانبەر ژیانپێدانیان، سوپاسی تیمە پزیشکییەکەم کرد لە بەرانبەر چاودێریی نایابیاندا و سوپاسی لۆرام کرد لە بەرانبەر سووربوونی لەسەر هەلگرتنی کچەکانمان لە سکیدا بە ماوەیەکی درێژ بەر لەوەی بە تەندروستی لەدایك ببن. هەلگرتنی باربارا و جێنا بۆ یەکەمین جار، چرکەساتی رۆشنییەکی بێ وێنە بوو. نیعمەت و بەرپرسیارێتییەکم پێ بەخشرابوو. سوێندم خوارد کە ئەوەندەی بکرێت باشترین باوکم بم.

ئەو مانگانەی سەرەتا، زەنگی ئاگادارکەرەوە بوون. کچەکان لە ناوەراستی شەودا دەستیان دەکرد بە گریان. هەلمدەگرتن، هەریەکان لە دەستێکمدا، و بە دەوری ناو مالدا دەهاتم و دەچووم. دەمویست لای لایەیان بۆ بکەم، بەلام نەمدەزانی. لەبری ئەمە، زۆرجار گۆرانی شەڕی (یەل)م بۆ دەوتن "بولدۆگ بولدۆگ، باو واو واو". ئەمە ئارامی دەکردنەوە. لەوانەشە هەر لەبەر ئەوە بووبێت کە نەیانویستبێت چیتر گوێیان لێ بم گۆرانی بلێم. هۆکارەکە هەرچییەك بووبێت، کاریگەری هەبوو. دەمخستنە ناو بێشکەکانی خۆیان و وەکو باوکێکی شاد دەچوومەوە لای لۆرا.

***

لەکاتێکدا کە من و لۆرا بە خێزانی نوێمانەوە لەگەل ژیاندا دەگونجاین، بزنسێکی نوێم بەرێوە دەبرد. لە سالی ١٩٧٩دا، کۆمپانیایەکی گەڕان بەدوای وزەی بچوکم لە میدلاند دامەزراند. پارەم کۆکردەوە، زۆربەشی لە (ئیست کۆست)، بۆئەوەی دارایی بۆ چالەکانی گاز و نەوت بە مەترسییەکی کەم و داهاتێکی کەمەوە دابین بکەم. هەندێ دۆزینەوەی تا رادەیەك باشم ئەنجامدا، لەوانەش هەندێکیان کە هێشتا لە بەرهەمهێنان نەکەوتوون. هەروەها لە پشکی عادیلانەی خۆم چالە وشکەکانم هەلکەند. بەرێوەبردنی بزنسی بچوك زۆری فێر کردم، بەتایبەت ئەمەی کە دەشێت هەلومەرجی بازاڕ بە خێرایی بگۆرێت، بۆیە دەبێ خۆت بۆ چاوەڕواننەکراو ئامادە بکەیت.

لەکاتێکدا کە نرخەکانی نەوت لە ١٩٨٣دا نزم بوونەوە، بڕیارمدا کە ئۆپەراسیۆنەکانم لەگەل دوو کاروەگەرخەری خەلکی (سینسیناتی) بە ناوی (بیل دێویت) و (مێرسەر

رینۆلدز). من لە ئەکساس تەنیا چاو و گوێ دەبوو لەسەر زەوی و ئەوانیش لە خۆرهەڵات دارایان کۆ دەکردەوە. بزنسەکە بۆ چەند ساڵێک باش بوو و ئێمە بووینە هاوڕێی نزیک، بەڵام لە سەرەتاکانی ١٩٨٦دا، نرخی نەوت لە بیست و شەش دۆلارەوە دابەزی بۆ دە دۆلار بۆ هەر بەرمیلێک. زۆرێک لەوانەی کە دەمناسین پارەیەکی زۆریان قەرز کردبوو و ئێستا لە مەترسییەکی دارایی سەختدابوون. خۆشبەختانە ئێمە قەرزەکانمان بە نزمی هێشتبووەوە و توانیمان بزنسەکەمان لە بزنسێکی گەورەتری گشتیدا بەناوی (هارکن ئێنێرجی)دا لێکبدەین. ناوەراستی هەشتاکان، ساڵانێکی تاریک بوون لە میدلاند. دۆخێکی شڵەژان هەبوو و زۆر کەس بەدوای ئامانجدا دەگەڕان. ئایین هەموو کاتێک بەشێک بووە لە ژیانم؛ بەڵام بە راستی باوەڕدارێک نەبووم، من لە (دوایت هۆڵ چاپێل) ی مەسیحیی بێ لایەن لە یەڵ تەعمید کرام. کاتێک منداڵ بووم، دایک و باوکم بردیانم بۆ (یەکەم کەنیسەی مەشایەخی پرۆتستانت) لە میدلاند، (سەینت مارتینس ئێپیسکۆپاڵ) لە هوستن، و (سەینت ئانس ئێپیسکۆپاڵ) لە کێنێبەنکپۆرت.

لەبەرئەوە چوومە کەنیسە لە ئاندۆڤەر کە ناچاری بوو. لە یەڵ قەت نەچووم. ئەو کاتەی کە سەردانی دایك و باوکم کرد چووم، بەڵام ئەرکی سەرەکیم ئەوە بوو کە دایکم نارەحەت نەکەم. من و لۆرا لە یەکەم میتۆدیستی یەکگرتوو) لە میدلاند هاوسەرگیریمان کرد. ئێمە پاش هاتنەدنیای دوو کچەکانمان دەستمان کرد بە هاموشۆی ئاسایی بۆ ئەوێ، چونکە هەستمان بە بەرپرسیارێتی کرد لەوەی کە بە ئیمان پەروەردەیان بکەین. حەزم لە بەسەربردنی کات بوو لەگەڵ هاوڕێیان لە ناو خەڵکەکەدا. خۆشیم بینی لە دەرفەتی تێڕامان. جارێکیان، گوێبیستی وتارێک بووم کە ئیلهامی پێبەخشیم. کتێبی پیرۆزم ناوبەناو دەخوێندەوە و وەکو کۆرسێکی خۆباشکردن بینیم. دەمزانی کە دەتوانم خۆباشکردن بەکاربهێنم. بەڵام بۆ بەشی هەرە زۆری، ئایین زیاتر نەریتێک بوو نەك ئەزموونێکی رۆحی. گوێم دەگرت، بەڵام نەمنەبیست.

لە هاوینی ١٩٨٥دا، گەشتی ساڵانەمان بۆ (مەین) ئەنجامدا. دایك و باوکم وتاربێژی ئینجیلی گەورە (بیلی گراخام)یان بانگهێشت کردبوو. باوکم داوای لێکردبوو کە پاش نانی ئێوارە وەڵامی هەندێ پرسیاری خێزانەکە بداتەوە. ئەمەیان هەر لە باوکم دەوەشایەوە،

هەمیشە ئامادەی هاوبەشیکردن بوو. ئەو پیاوێکی بەخشندە بوو، بەتاڵ لە هەموو ڕۆح گەورەییەك. ئێمە لەوێ دانیشتین، نزیکەی سی کەس دەبووین- لۆرا، داپیرەم، براکانم و خوشکم، خزمە نزیك و دوورەکان- لە ژوورێکی گەورە لە کۆتایی خانووەکەدا لە ناوچەی (بنەماڵەی بوش).

پرسیاری یەکەم لەلایەن باوکمەوە بوو. ئەو وتی "بیلی، هەندێ خەڵك دەڵێن دەبێ ئەزموونی دووبارە لەدایکبوونەوەت هەبێت بۆئەوەی بچیتە بەهەشت. ئەوە دایکم (داپیرەی من) کە بەدینترین و بەبەزەییترین کەسێکە کە تا ئێستا ناسیبێتم، کەچی ئەزموونی دووبارە لەدایکبوونەوەی نییە. ئایا دەچێتە بەهەشت؟" واو، پرسیارێکی تەواو قوڵ لەلایەن پیاوە بەتەمەنەکەوە. هەموومان روانیمانە بیلی . بە دەنگە هێمن و بەهێزەکەیەوە وەڵامی دایەوە، "جۆرج، هەندێکمان پێویستمان بە ئەزموونی دووبارە لەدایکبوونەوەیە بۆئەوەی لە خودا تێبگەین و هەندێکمان وەکو مەسیحی لەدایك بووین. وا دەردەکەوێت وەك بڵێی دایکت ڕێك وەکو مەسیحییەك لەدایك بووبێت".

من کارتێکراوم بووم بە قسەکەی بیلی. ئامادەییەکی بەهێزی هەبوو، پڕ لە بەزەیی و شکۆ و بە ئەقڵێکی زیرەکانەوە. ڕۆژی دواتر، داوای لێکردم بە دەوری موڵکەکەماندا پیاسەیەك بکەین. پرسیاری لە ژیانی من کرد لە تەکساس. من لەبارەی کچانەوە قسەم کرد و ئاڵوگۆڕی بیروڕام کرد لەمەڕ ئەوەی کە خوێندنەوەی کتێبی پیرۆز دەتوانێ بمکاتە کەسێکی باشتر. بە شێوازە نەرم و بەسۆزەکەیەوە، بیلی دەستیکرد بە قوڵکردنەوەی تێگەیشتنی رووکەشم لە ئیمان. ئەو وتی ئاساییە کە کتێبی پیرۆز وەکو ڕێنوێنێکی خۆباشکردن بەکاربهێنیت. ژیانی عیسا نموونەیەکی بەهێزمان بۆ خودی خۆمان دابین دەکات. بەڵام خۆباشکردن بە راستی ئامانجێکی کتێبی پیرۆز نییە. چەقی مەسیحییەت بریتی نییە لە خود. بریتییە لە عیسا.

بیلی روونی کردەوە کە ئێمە هەمووما‌ن گوناهبارین و ناتوانین لە ڕێگەی کردارە چاکەکانەوە خۆشەویستی ئەو بەدەستبهێنین. ئەو روونی کردۆتەوە کە ڕێگای نەجات بە شکۆی خوادا تێدەپەڕێت. ڕێگای دۆزینەوەی ئەو شکۆیەش بریتییە لە لە باوەشگرتنی

عیسا وەکو مەزنێکی دەرکەوتوو- کوڕی خودا ئەوەندە بەهێز و خۆشەویستە کە توانای ڕکێفکردنی مەرگ و شکستپێهێنانی گوناهی بەخشییە کوڕەکەی".

ئەمانە چەمکی قوڵ بوون و ئەو ڕۆژە بەتەواوی دەرکم نەکردن. بەڵام بیلی تۆوێکی چاندبوو. ڕوونکردنەوە قووڵەکەی خاکەکەی کەم توند و ڕووەکەکانی کەم ئەستوور کردبوو.

ماوەیەکی کورت دوای گەڕانەوەمان بۆ تەکساس، پاکەتێك لەلایەن بیلی-یەوە گەیشت. ئەمەیان کۆپییەکی (کتێبی پیرۆزی زیندوو) بوو. بەم شێوەیە پێشکەشکردنەکەی نووسیبوو: "بۆ جۆرج دەبلیو بوشی هاوڕێم، خوا هەمیشە بتپارێزێ بکات لەگەڵ لۆرا دا". ئەو دێڕێکی لە فیلیپیانس ١:٦ نووسیبوو "وە من دڵنیام کە خودا، کە کاری باشی لەناو تۆدا دەستپێکرد، بەردەوام دەبێ لە کارەکەی تا ئەو کاتەی دواجار تەواو دەبێت ئەو ڕۆژەی کە عیسای مەسیح دەگەڕێتەوە".

لە سەرەتای پاییزدا، لای دۆن ئێڤانس باسی گفتوگۆیەکەم کرد لەگەڵ بیلیدا. پێی وتم کە ئەو و هاوڕێیەکی تر میدلاند بەناوی (دۆن جۆنس) هاموشۆی کۆمەڵێکی توێژینەوەی کتێبی پیرۆز دەکەن. ئەو کۆمەڵەیە لە شەوانی چوارشەممەدا لە (یەکەم کەنیسەی مەشایەخی پرۆتستانت) یەکتریان دەبینی. منیش بڕیارمدا تاقی بکەمەوە.

هەر هەفتەیەك، بەشێکمان لە (عهد جدید) دەخوێندەوە. سەرەتا کەمێك بەگومان بووم. کاتێکی سەختم بەسەر دەبرد لە فریوخواردن بۆ نوکتەی ژیرانە. شەوێکیان سەرۆکی گروپەکە پرسیاری کرد: "پەیامبەر چییە؟" ، وەڵامم دایەوە و وتم، "ئەوەیە کە کاتێك داهات لە خەرجییەکان تێدەپەڕێت. تا ئێستا کەس لێ نەبینیوونەوە لە سەردەمی ئەلیاس-ەوە".

بە زوویی دەستم کرد بە بەجددی وەرگرتنی کۆبوونەوەکان. لەکاتێکدا کە کتێبی پیرۆزم دەخوێندەوە، زۆر کارتێکراوبووم بە چیرۆکەکانی بەزەیی عیسا لە بەرانبەر ئازارچەشتووانی غەریبەدا، چاککردنەوەی کوێر و ئیفلیج و ئەوپەڕی خۆشەویستی قوربانییانەی کاتێك لە خاچدرا. بۆ کریسمەسی ئەو ساڵە، دۆن ئێڤانس، (ڕۆژانەیەکی

کتێبی پیرۆزی پێدام کە بەسەر ٣٦٥ خوێندنەوەدا دابەشکرابوو. هەموو بەیانییەک دەمخوێندەوە و نزام دەکرد کە روونتر لێی تێبگەم. پێ بەپێی کات ئیمانم گەشەی کرد.

یەکەم جار بە گومانەکانم شڵەژابووم. بیرۆکەی خودایەکی زیندوو، بازدانێکی گەورە بوو، بەتایبەت بۆ کەسێك کە ئەقڵێکی لۆژیکی وەکو منی هەبوو. خۆتەسلیمکردنت بە خالقێك ئەحەدییەکە لە بەرانبەر رۆح گەورەییەکەتدا. بەڵام دوایی گەیشتمە ئەو ئەنجامەی کە ململانێیەکان و گومانەکان لایەنێکی سروشتین لە ئیمان. ئەگەر گومانت نەکردایە، لەوانەیە بەو سەختییە بیرت لەوە نەکردایەتەوە کە باوەڕت پێیەتی.

سەرەنجام، ئیمان گەشتێکە- بەرەو تێگەیشتنێکی مەزنتر. مومکین نییە بوونی خودا بسەلمێنیت، بەڵام نابێ ئەمە پێوانە بێت بۆ باوەڕ. دواجار بەهەمان شێوەش ئەستەمە نەبوونی بسەلمێنیت. لە کۆتاییدا، چ ئەوەی باوەڕ بێنیت یان نا، پێگەت لەسەر ئیمان بونیاد نراوە. ئەم پەیبردنە، من ئازاد کرد بۆ ناسینەوەی نیشانەکانی ئامادەیی خودا. جوانی سروشت، سەرسوڕهێنەرێتی کچەکانم، خۆشەویستیی پابەندکەری لۆرا و دایك و باوکم و ئەو ئازادیەی لەگەڵ لێبووردەییدا دێت، بینی- هەموو ئەو شتانەی کە وتاربێژ تیمۆسی کێلەر پێی دەوتن "نیشانەکانی خودا". بە شێوەیەکی ئاسودەتر لە گەشتەکەمدا بەرەوپێش چووم. نزا ئەو خۆراکدەرە بوو کە من پایەدار کرد. لەکاتێکدا کە تێگەیشتنم لە عیسا قووڵ کردەوە، لە ئامانجی بنچینەیی بوون بە کەسێکی باشتر، نزیکتر بوومەوە- نەك لەبەرئەوەی کە لە دەفتەرچە بەهەشتییەکەمدا خاڵی پۆزەتیف کۆ بکەمەوە، بەڵکو لەبەرئەوەی کە کارتێکراو بووم بە خۆشەویستی خودا.

***

دەرکم بە شتێکی تر کرد. کاتێك بیلی لەو شەوەدا لە (مەین) دەستی کرد بە وەڵامدانەوەی پرسیارەکان، لە سێیەمین پەرداخی شەرابەکەمدا بووم، پاش دوو سێ بیرەی پێش نان خواردن. پەیامی بیلی بەسەر کحولەکەدا زاڵ بوو. بەڵام حاڵەتەکە هەمیشە وەها نەبوو. ماوەیەکی درێژ بوو کە مەشروبخۆرێکی کۆمەڵایەتی بووم. حەزم دەکرد لەگەڵ هاورێیان، لەگەڵ ژەمەکان، لە بۆنە وەرزشییەکاندا و لە ئاهەنگەکاندا

بخۆمـەوە. بـە گەیـشتنم بـە تەمـەنی ناوەراسـتی سـییەکان، بـە شـێوەیەکی ڕۆشـبینی دەمخواردەوە، کە جارجارە ڕشانەوەی تێکچوون بە کحولی لەگەڵدا بوو.

لە خۆرهـەڵاتی تەکساس وتەیـەکمان هەیـە: " شـەوی رابـردوو وایزانـی دە سـاڵانێکە، کەچی لە راستیدا کەرێك بوو". ئەمە زیاد لەجارێك بەسەر مندا پیادە بوو. حەزم لە گاڵتە و گەپە، بەڵام کحول شێوازێکی گۆڕینی توانج و پلاری هەیە بۆ لێدان و ئیهانە. ئەوەی کە بەهۆی کحولەوە گاڵتەئامێز دیارە دەشێت دوایی گەمژانە دەرکەوێت. شەوێکی هـاوین لـە (مەین) نانی ئێوارەمان دەخوارد پاش ڕۆژێکی گـەورەی ماسیگرتن و گۆلـف. تـا رادەی تینوویەتی ماندوو ببووم کە دواتر بە کۆکتێلی ویسکی و سێڤن تینووایەتییەکـەم شـکاند. لەکاتێکدا کە نانمان دەخوارد، رووم کردە هاوڕێیەکی جوانی دایك و بـاوکم و پرسـیارێکی کحولاویم کرد: "باشە، سێکس پاش تەمەنی پەنجاساڵی چۆنە؟"

هەمووان لەسەر مێزەکە بە بێدەنگی چاویان بڕیـە خواردنـەکانیان- جگـە لـە دایـك و باوکم و لۆرا کە بە باوەڕنەکردنەوە سەرنجیان بڕیبووە من. ژنە جوانەکە پێکەنینێکی پڕ شـڵەژانی لـیَ بـەدیار کـەوت و گفتوگۆیەکە بـەردەوام بـوو. کاتێـك ڕۆژی دواتـر لـە خـەو هەڵسام، بیرم هاتەوە کە چیم وتووە. دەسبتەجیَ هەستم بە پەشیمانی دوای سەرخۆشی کـرد. دوای ئـەوەی تەلـەفۆنم بـۆ ئـەو ژنـە کـرد بـۆ داوای لێبـووردن، دەسـتم کـرد بـە پرسیارکردن لە خۆم ئاخۆ ئەمە بـە راسـتی ئـەو شـێوازەیە کـە ئەمویسـت ژیـانم بـەڕێوە ببەم. ساڵانێك دواتر، کاتێك تەمەنم گەیشتە پەنجا، ژنە خـۆش مەشرەبەکە تێبینییـەکی بۆ کۆشکی حاکمی تەکساس ناردبوو: "ئێ جۆرج، چۆنە؟"

لۆراش دەرکەوتنی ڕێسایەکی دەبینی. ئەوەی کە بەلای من و هاوڕێیانمەوە گاڵتـەئامێز یان زیرەکانە دیار بوو، بەلای ئەوەوە دووبارە و منداڵانە بوو. بەلایەوە زەحمەت نەبوو کـە پێم بڵێ بیری لە چی کردووەتەوە، بەڵام نەیـدەتووانی لـەبری مـن واز بهێنێـت. دەبووایـە خۆم واز بهێنم. لە تەمەنی چل ساڵیدا، دواجـار توانـای ئـەوەم پەیـدا کـرد ئـەوە بکـەم- توانایەك کە لەو ڕۆژانەی سەرەتای خۆشەویستییەوە هەستم پێکردبوو، لەو ئیمانەش کـە بۆ ماوەی ساڵانێکی زۆر بە تەواوی نەمدۆزیبووەوە، دەهات.

لەو شەوەوە لە (برۆدمور) لە ساڵی ١٩٨٦، یەك دڵۆپە كحولم نەخواردەوە. مەحاڵ بوو بزانم كە ژیانم بەرەو كوێ ئاراستە دەبوو ئەگەر بڕیاری وازهێنان لە كحولم نەدایە. بەڵام من دڵنیام كە ئەم بیرۆكانەم وەكو حاكمی پێشووی تەكساس و سەرۆكی ئەمریكا تۆمار نەدەكرد.

پرسیارم لێكراوە ئاخۆ خۆم بە كەسێكی كحولی لەقەڵەم دەدەم. ناتوانم بە دڵنیاییەوە بڵێم. دەزانم من كەسایەتییەكی خووگرتووم هەیە. زۆرم دەخواردەوە، ئەمەش كێشەی دروست دەكرد. توانام بۆ وازهێنانی لەناكاو و تاهەتایە، واملێدەكات باوەڕبهێنم بەوەی كە معتادبوونێكی كیمیاییم نەبوو. هەندێ لە مەشروبخۆران ئەوەندەی من خۆشبەخت نەبوون. سەرسامی ئەوانەم كە شێوازی خۆیان بەكاردەهێنن بۆ وازهێنان؛ وەكو پرۆسەی (دوانزە هەنگاوی).

بەبێ ئیمان نەمدەتوانی واز لە خواردنەوە بێنم. بەهەمان شێوە پێم وانییە ئیمانم ئەوەندەی ئێستا بەهێز بووایە ئەگەر وازم لە خواردنەوە نەهێنایە. بڕوام وایە كە خوا یارمەتیدام چاوەكانم بكەمەوە كە بەهۆی كحولەوە داخرابوون. لەبەر ئەو هۆیە، هەمیشە هەستم بە پەیوەندییەكی تایبەت كردووە بە وشەكانی "شكۆی سەرسوڕهێن"ەوە كە سرودی پەسەندی منە: "جارێ لە جاران گومڕابووم، بەڵام ئێستا دۆزراومەتەوە/كوێر بووم، بەڵام ئێستا دەبینم".

# خۆکاندیدکردن

سەر لە بەیانیی ١٢ی حوزەیرانی ١٩٩٩ جوان بوو لە تەکساس. تیمی بەیسبۆلی (رەینجەرس) شوێنیان لە پلەی یەکەمی (کۆمەڵەی خۆرئاوای ئەمریکا)دا بوو. مونەشیری پیشەسازیی (داوجۆنز) لە ١٠,٤٩٠دا وەستابوو. باوکم هەنوکە یادی لەدایکبوونی حەفتاوپێنجساڵی کردبووەوە لە رێگەی بە پەرەشوت خۆهەڵدانە خوارەوە لە فرۆکەیەک-بە سەرکەوتوویی. منیش خەریک بوو بازێکی خۆم بدەم.

چەند مانگێک لە پشکنینی بڕوا و ئەنگێزەکانم و چەندەها سەعات لە هەڵسەنگاندنی باشییەکان و خراپییەکان، بەرەو (ئایۆوا) کەوتبوومە رێ، شوێنی یەکەم کۆنگرەی حزبی لە هەڵبژاردنە سەرۆکایەتییەکەی ساڵی ٢٠٠٠داز من لە شڵەژانی بڕیاردان ئازاد ببووم و تامەزۆری ئەنجامدانی گەشتەکە بووم. من و لۆرا ماچی ماڵئاواییمان لە کچەکان کرد، بەرەو فرۆکەخانە کەوتینەڕێ و سواری فرۆکەیەکی هێڵی ئاسمانی (TWA) بووین رووەو (سیدار راپیدز).

فرۆکەکە پڕ بوو، زۆربەشیان رۆژنامەنووس بوون. ئەوان کاتەکانی تەلەفزیۆن و پەڕەی هەواڵی مشتومڕ، پرسیار و وەڵام و شیکردنەوەیان پڕ کردبووەوە لەبارەی ئەوەی ئاخۆ من دەچمە پێشبڕکێوە. ئێستا ئیتر وەڵامەکەیان دەست دەکەوت. بڕیارمدا کەمێک گاڵتەیان لەگەڵ بکەم. من ناوی فرۆکەکەمان نابوو (چاوەڕوانییە گەورەکان). ماوەیەکی کەم دوای بەرزبوونەوەمان لە زەوی، مایکرۆفۆنەکەم دەستدایە و رامگەیاند، "ئەمە کاندیدەکەتانە. تکایە چاوەڕوانییەکانتان بە ئارامی بکەنە ناو تەنەکە خۆڵەکەی سەرتان، چونکە لەوانەیە لە گەشتەکەماندا بسوڕێن و بەر ببنەوە و کەسێک ئازار بدەن، بەتایبەت من".

زۆرجار من گاڵتە و گەپم بۆ کەمکردنەوەی دڵەنگی بەکاردەهێنا، بەڵام دەمزانی کە مەترسییەکی جددیە. زیاتر لە هەر کاندیدێکی تر لە مێژوودا، تێگەیشتم لەوەی کە پێشبڕکێ بۆ سەرۆکایەتی چی بەدوای خۆیدا دەهێنێت. باوکم بینیبوو کە بەرگەی چەند مانگێکی تاقەتپڕوکێنی گرت لە هەڵمەتی کۆکردنەوەی پشتگیریدا، لە ژێر پشکنینی بەردەوامی چاپەمەنییەکی گوماناویدا. بینیبووم کە چۆن تۆمارەکەی دەشێوێنرێت، هێرش دەکرێتە سەر کەسایەتییەکەی، گاڵتە بە ڕواڵەتی دەکرێت. شایەتی ئەوە بووم کە هاوڕێیان لێی هەڵدەگەڕێنەوە و یاریدەدەرانی دەستبەرداری دەبن. دەمزانی چەندە سەختە بیبەیتەوە. دەشمزانی چەندە ئازاربەخشە بدۆڕێیت.

بەشی زۆری نیگەرانیم لە باربارا و جێنای کچە حەڤدە ساڵەکانمان بوو. دەرکم بەوە کردبوو ئەمەی کە منداڵی سیاسییەك بیت قورسترە لەوەی کە خۆت سیاسی بیت. لەو ئازار و ناکامییە تێگەیشتم کە لە بیستنی ئەوەوە دێت باوکت ناوی قێزەونی بدرێتە پاڵ. دەمزانی چ هەستێکی نیگەرانکەرە هەرکاتێك کە تەلەڤزیۆن هەڵدەکەیت. دەشمزانی چۆنە کە بەو بیرکردنەوەیەوە بژیت کە هەر لەدەمدەرچوونێکی بەریئانە دەشێت سەرۆکی ئەمریکا شەرمەزار بکات.

ئێستا ئیتر وەڵامەکەیان دەست دەکەوت. بڕیارمدا کەمێك گاڵتەیان لەگەڵ بکەم. من ناوی فرۆکەکەمان نابوو (چاوەڕوانییە گەورەکان). ماوەیەکی کەم دوای بەرزبوونەوەمان لە زەوی، مایکرۆفۆنەکەم دەستدایە و رامگەیاند، "ئەمە کاندیدەکەتانە. تکایە چاوەڕوانییەکانتان بە ئارامی بکەنە ناو تەنەکە خۆڵەکەی سەر سەرتان، چونکە لەوانەیە لە گەشتەکەماندا بسوڕێن و بەر ببنەوە و کەسێك ئازار بدەن، بەتایبەت من".

زۆرجار من گاڵتە و گەپم بۆ کەمکردنەوەی دڵەنگی بەکاردەهێنا، بەڵام دەمزانی کە مەترسییەکی جددیە. زیاتر لە هەر کاندیدێکی تر لە مێژوودا، تێگەیشتم لەوەی کە پێشبڕکێ بۆ سەرۆکایەتی چی بەدوای خۆیدا دەهێنێت. باوکم بینیبوو کە بەرگەی چەند مانگێکی تاقەتپڕوکێنی گرت لە هەڵمەتی کۆکردنەوەی پشتگیریدا، لە ژێر پشکنینی بەردەوامی ڕاگەیاندنی گوماناویدا. بینیبووم کە چۆن تۆمارەکەی دەشێوێنرێت، هێرش دەکرێتە سەر کەسایەتییەکەی، گاڵتە بە ڕواڵەتی دەکرێت. شایەتی ئەوە بووم کە

هاوڕێیان لێی هەڵدەگەڕێنەوە و یاریدەدەرانی دەستبەرداری دەبن. دەمزانی چەندە سەختە ببیەیتەوە. دەشمزانی چەندە ئازاربەخشە بدۆڕێیت.

بەشی زۆری نیگەرانیم لە باربارا و جێنای کچە حەڤدە ساڵەکانمان بوو. دەرکم بەوە کردبوو ئەمەی کە منداڵی سیاسییەك بیت قورسترە لەوەی کە خۆت سیاسی بیت. لەو ئازار و ناکامییە تێگەیشتم کە لە بیستنی ئەوەوە دێت باوکت ناوی قێزەونی بدرێتە پاڵ. دەمزانی چ هەستێکی نیگەرانکەرە هەرکاتێك کە تەلەفزیۆن هەڵدەکەیت. دەشمزانی چۆنە کە بەو بیرکردنەوەیەوە بژێیت کە هەر لەدەمدەرچوونێکی بەریتانە دەشێت سەرۆکی ئەمریکا شەرمەزار بکات. لە چلەکانی تەمەنمدا بە هەموو ئەمانەدا تێپەڕیبووم. ئەگەر ببمە سەرۆك، ئەوا ئەو کاتەی لە ئۆفیس دەبم، کچەکانم لە کۆلێژ دەبن. دەمتوانی وێنای ئەوە بکەم کە چەندە سەختتر دەبێت بۆیان.

لە ڕێگەی هەندێ پرسیاری گەورەوە دەمزانی. ئایا ئامادەیی ئەوەم تیابوو کە تاهەتایە چاوپۆشی لە بزربیەکەم بکەم؟ ئایا ئەوە ڕاست بوو کە خێزانەکەم بخەمەبەر پشکنینی هەڵمەتی نیشتمانی؟ ئایا دەمتوانی دەست و پەنجە لەگەڵ شەرمەزاریی شکستدا نەرم بکات لەکاتێکدا کە تەواوی وڵات تەماشا دەکات؟ ئایا بە ڕاستی منی هی ئەو کارە بووم؟

بڕوام وایە کە وەڵامەکانم دەزانی، بەڵام ئەستەم بوو دڵنیا بم. دەمزانی کە هەست بە زەنگێك دەکەم بۆ پێشبڕکێ. من نیگەرانی ئایندەی وڵات بووم و ڕوئیایەکی ڕوونم هەبوو بۆ ئەوەی کە بەرەو کوێ ئاراستەی بکەم. دەمویست باجەکان کەم بکەمەوە، ستانداردەکانی قوتابخانە گشتییەکان بەرز بکەمەوە، چاودێری تەندروستی و ئاسایشی کۆمەڵایەتی ریفۆرم بکەم، پشتیوانی خێرخوازەکانی ئیمان بکەم و پەرە بە تێڕوانینی گەلی ئەمریکا بدەم لە ڕێگەی هاندانی سەردەمێکی نوێی بەرپرسیارێتیی کەسی. هەروەکو لە وتارەکانمدا وتم، "کاتێك دەستەکانم دەخەمە سەر کتێبی پیرۆز، سوێند دەخۆم کە نەك تەنیا پاڵپشتیی یاساکانی خاکەکەمان

دەکەم، سوێند دەخۆم کە پاڵپشتی فەخر و شکۆی ئەو ئۆفیسە بکەم کە بۆی هەڵبژێردراوم، بۆیە خوایە یارمەتیم بدە".

دەرکەوتنم بۆ سەرۆکایەتی، شیمانەی کارەکەی دەرخستبوو. ئەو دوو سەرۆکەی کە من بە باشترین شێوە دەمناسین، باوکم و رۆناڵد ریگن کاتی خۆیان لە ئۆفیس بەکارهێنابوو بۆ بەدیهێنانی ئامانجە مێژووییەکان. سەرۆك ریگن، تەحەدای یەکێتیی سۆڤیەتی کردبوو و یارمەتیدەر بوو بۆ بردنەوەی جەنگی سارد. باوکم کوەیتی رزگار کردبوو و ئەوروپای رووەو یەکێتی و ئاشتی ئاراستە کردبوو.

منیش بەهەمان شێوە لایەنە کەسییەکەی سەرۆکایەتیم بینیبوو. بەو هەموو سۆراخکردن و پاڵەپەستۆیەوە، باوکم حەزی لە ئیشەکە بوو. کاتێك ئۆفیسی جێ هێشت، فەخر و بەهاکانی هەر مابوون. سەرباری ئەو هەموو فشارە، سەختیی ئەزموونەکە، بنەماڵەکەمانی لە یەکتر نزیکتر کردەوە.

پرۆسەی بڕیاردانەکە تاقەت و کاتێکی زۆری برد. بیرم لێی کردەوە، لەبارەیەوە قسەم کرد، شیم کردەوە و نزام بۆ کرد. فەلسەفەیەکم هەبوو ئەمویست پەرەی پێبدەم و قەناعەتم بەوە هەبوو مە دەتوانم تیمێك دروست بکەم کە شایستەی سەرۆکایەتی بێت. ئاسایشی دارایم هەبوو کە بۆ خێزانەکەمی دابین بکەم، چ ئەوەی ببەمەوە یان بدۆڕێم. سەرەنجام، فاکتەرە یەکلاییکەرەوەکان کەمتر بەرجەستە بوون. هەستم بە پاڵنەرێك کرد بۆئەوەی ژیانێکی شایستەتر بگوزەرێنم، پاڵ بە ئیمکانیەتمەوە بنێم و شارەزایەتییەکانم لە ئاستێکی بەرزتردا تاقی بکەمەوە. من کارتێکراو بوو بەو نموونەیەی خزمەتکردن کە باوکم و باپیرم پێشکەشیان کردبوو. تەماشام کردبوو کە باوکم بەسەر گەورەترین بەرزاییدا سەردەکەوێت و سەرکەوتوو دەبێت. دەمویست بزانم ئاخۆ منیش ئەوە تیادا مەوجودە کە وەکو ئەو بم.

تەنانەت ئەگەر بشمدۆڕاندایە، هێشتا ژیانێکی بێ وێنەم دەبوو. خێزانەکەم خۆشیان دەویستم. حاکمی ویلایەتێکی گەورە بووم. هیچ پێویستیش نەبوو کە رابمێنم لەوەی کە چییە. بە هاوڕێیانم دەوت "کاتێک سەردەمی من بەسەر چوو، چیتر لەوێ نابم".

راگەیاندنەکەم لە ژەمێکی برژاندندا بوو لە شارۆچکەیەکی بچوکی ئایۆوا بەناوی (ئامانا). وتارەکەم لەسەری سەرەوەی سەکۆی مەزرایەک پێشکەش کرد کە بە کا داپۆشرابوو و لەبەردەم کێلگەیەکی گەنمەشامی بوو. کۆنگرێسمان (جیم نەسل)، کە دواتر دەبوو بە بەڕێوەبەری ئۆفیسی بەڕێوەبردن و بودجەی لە ئیدارەی مندا، بە وتنی گۆرانی "مکوڕەکەی ئایۆوا"ی فیلمی (زە میوزیک مان)، منی ناساند. لەکاتێکدا کە لۆرا لە تەنیشتمەوە وەستا بوو، وتم، "من بۆ سەرۆکایەتی ئەمریکا خۆم دەپاڵێوم. پاشگەزبوونەوە نییە و نیازمە ببمە سەرۆکی داهاتوو".

***

ڕێگەم بەرەو ئەو رۆژە نائاسایی بوو. تەمەنێکم لە پلاندانان بۆ خۆکاندیدکردن بۆ سەرۆکایەتی بەسەر نەبردبوو. ئەگەر هەمبووایە، لەوانەیە کە گەنجتر بووم چەند شتێکم بە شێوەی جیاواز ئەنجامبدایە. لەگەڵ ئەوەشدا بە درێژایی گەشتەکە، ئارەزوو و شارەزایەتییەکانی دەستپێکردن و بردنەوەی هەڵمەتی سەرۆکایەتیم پەیدا کردووە. تۆوەکانی ئەو بڕیارە، وەکو زۆرێکی تر لە ژیانمدا، لە ئەرزی تۆزاوی لە ژێر ئاسمانیی بێ سنووری میدلاند دا لە تەکساس، چێنرابوون.

سیاسەتەکان لە میدلاند کۆنسێرڤاتیف بوون. خۆرئاوای تەکساس رۆحێکی سەربەخۆ و بێمتمانەیی بەرانبەر حکومەتی بەناوەندبوو هەیە. وەکو بەشی زۆری تەکساس، میدلاند بۆ چەند جیلێک لەلایەن حزبی دیموکراتەوە قۆرخ کرابوو. رووبەری درێژبووەوەی کۆنگرێس لە میدلاند، کە ١٧ قەزای دەگرتەوە، چل و سێ ساڵ بوو لەلایەن دیموکراتێکەوە بەناوی (جۆرج ماهۆن) نوێنەرایەتی دەکرا. ئەو

پڕخزمەتترین کۆنگرێسمان بوو لە ئەمریکا. لە ٦ی تەمموزی ١٩٧٧دا- یادی لەدایکبوونی سی و یەك ساڵەم- ئەو رایگەیاند کە لە کۆتایی خولەکەیدا خۆی خانەنشین دەکات.

تاوەکو ئەو کاتە، من ئیتر بۆ ماوەی دوو ساڵ گەڕاومەتەوە میدلاند دوای تەواوکردنی بەشی بزنس. من فێری بزنسی نەوت، پەیوەندیکردنەوە بە هاوڕێیان و بە گشتی خۆشی وەرگرتن لە ژیان دەبووم. هەروەها هەستێکم بۆ چوونە ناو سیاسەت پەیدا دەکرد. لەکاتێکدا کە هەرگیز سیاسەتم وەکو پیشەیەك لەبەرچاو نەگرتووە، لە هەموو هەڵمەتەکانی باوکمدا فریادڕەس بووم: پێشبڕکێی بۆ ئەنجومەنی پیران لە ساڵی ١٩٦٤، هەڵمەتی ئەنجومەنی نوێنەران لە ساڵی ١٩٦٦ و دووەمین خۆکاندیدکردنەوەی بۆ ئەنجومەنی پیران لە ١٩٧٠دا. پێش ئەوەی دەست بە مەشقی فرین بکەم لە ١٩٦٨دا، چەند مانگێکم وەکو یاریدەدەری گەشتیاریی کۆنگرێسمان (ئێدوارد گێرنی) بەسەر برد کە خۆی بۆ ئەنجومەنی پیران لە فلۆریدا کاندید کردبوو. لایەنی گرنگی ئەزموونەکە، پاڵپشتییەکی گەورە بوو لە (جاکسنهیل) کە لەوێ گێرنی لەلایەن حاکمی باڵابەرزی ئەسمەری کالیفۆرنیا (رۆناڵد ریگن) پشتگیری دەکرا. لە ساڵی ١٩٧٢دا، من بەڕێوەبەری سیاسیی هەڵمەتی ئەنجومەنی پیران بووم بۆ (رێد بلاونت) لە ئالاباما. لە ساڵی ١٩٧٦دا، کاری خۆبەخشانەم بۆ ئۆپەراسیۆنی سەرۆك فۆرد کرد لە خۆرئاوای تەکساس لە هەڵبژاردنی بەرایی کۆمارییەکاندا. من یارمەتیدا تا کۆی سفر نوێنەر بباتەوە.

شێوەژیانی هەڵمەتەکە بە تەواوی گونجاو بوو بۆ من کە لە بیستەکانی تەمەندا بووم. خۆشیم لە جموجۆڵ و ئاشنابوون بە خەڵکی نوێ دەبینی. من دڵخۆش بووم بە توندی و کێبڕکێی هەڵبژاردنەکان. حەزم لەو یەکلاییبوونەوەیە بوو کە لە رۆژی هەڵبژاردندا هات، کاتێك دەنگدەران براوەیەکیان هەڵبژارد و ئێمە هەموومان

رووەوپێش چووین. من بەم شێوازە پلانم دانەنابوو، بەڵام لەگەڵ خانەنشین بوونی کۆنگرێسمان (ماهۆن)، من تاڕادەیەك بکەرێکی سیاسیی بەناوکەوتوو بووم.

من دەستم کرد بە بیرکردنەوە لەبارەی خۆکاندیدکردن بۆ کورسییەك. ئەزموونی ئەوەم هەبوو کە لایەنی سیاسیی پێشبڕکێکە جڵەو بکەم. هەروەها هەستم کرد شتێکی بەهێزتر رامدەکێشێت. من نیگەرانی ئاراستەی وڵات بووم. ئەزموونەکان لە بەشی بزنس، چین و بزنسی نەوت لەناو ڕستێك بیروباوەڕدا ئاوێتە دەبوون: بازاڕی ئازاد عادیلانەترین ڕێگای دابین کردبوو بۆ جیاکردنەوەی سامانەکان. باجە نزمەکان کاری قورسیان پارسەنگدایەوە و هانی موجازەفەیاندا کە پەیدابوونی کاری لێکەوتەوە. لابردنی تەگەرەکانی بەردەم بازرگانی، بازاڕی هەناردەی نوێی بۆ بەرهەمهێنەرانی ئەمریکی و بژارەی زیاتری بۆ بەکاربەران دروستکرد. دەبێت حکومەت ڕێز لە سنوورە دەستوورییەکانی بگرێت و سەربەستیی ژیان بداتە خەڵك.

کاتێك روانیمە واشنتۆن لەژێر سەرۆکایەتیی سەرۆك جیمی کارتەر و کۆنگرێسی دیموکراتدا، پێچەوانەکەم تێبینی کرد. پلانی ئەوەیان هەبوو باجەکان بەرز بکەنەوە، کۆنترۆڵی حکومەت بەسەر کەرتی وزەدا زیاد بکەن و خەرجیی فیدراڵی بە کاردابینکەریی کەرتی تایبەت جێگۆڕکێ پێبکەن. نیگەرانی جوڵانی ئەمریکا بووم بەلای چەپدا، بەرەو وێنەیەکی دەوڵەتی خۆشگوزەرانیی ئەورووپی، کە تیایدا پلاندانانی حکومەتی ناوەندی، خەڵکی لە پرۆژەی ئازاد بێبەش کردووە. ویستم شتێك بکەم لەمبارەیەوە. لە یەکەمین ئەزموونی بووم لەگەڵ مێشولەی سیاسیدا و بە سەختی پێیوەئەدام. کاتێك بیرۆکەکەم لای باوك و دایکم باس کرد، تووشی سەرسوڕمان بوون. حەتمەن بڕیارەکەم وەها دەردەکەوت کە بێ بنەما بێت، بەڵام نەیانویست تامەزرۆییەکەم تووڕ هەڵبدەن. باوکم پرسیاری لێکردم ئاخۆ گوێ لە ئامۆژگاری هاوڕێیەکی خۆی دەگرێت، حاکمی پێشووی تەکساس (ئالان شیڤەرز).

من وتم "بە دڵنیاییەوە". شیڤەرز ئەفسانەیەک بوو. ئەو پڕخزمەترین حاکم بوو لە مێژووی تەکساسدا. ئەو دیموکراتێکی کۆنسێرڤاتیڤ بوو و ئامۆژگارییەکی لە کێبڕکێیەکدا لە بەرانبەر (کێنت هانس)ی سیناتۆری ویلایەت و راستڕەوی ناوەند و کاندیدی شیمانەیی دیموکراتەکان، بەنرخ دەبوو.

کاتێک چووم حاکمە بەتەمەنەکە ببینم، بە زمانێکی رەقەوە پرسیاری لێکردم ئاخۆ خۆم کاندید دەکەم بۆ شوێنی (ماهۆن). من وتم بە جددی بیر لە کێبڕکێ دەکەمەوە. ئەو چاوی بڕییە چاوەکانم و وتی، "کوڕم، تۆ ناتوانی ببەیتەوە". نە هیچ هاندانێک لە ئارادا بوو، نە هیچ شتێک. ئەو پێی وتم کە ناوچەکە بە تەواوی بەکێش بووە بۆ هەڵبژاردنی (کێنت هانس). لەبەر خۆمەوە وتم "هیوادارم تۆ هەڵە بیت ئەگەر بڕیاری خۆپاڵاوتن بدەم" و سوپاسم کرد بۆ کاتەکەی.

بیرمە تێڕامابووم لەبارەی ئەمەی کە بۆچی باوکم منی بە حاکم ناساندبوو. کە ئاوڕی لێدەدەمەوە، پێم وایە ئەمە شێوازێکی خۆی بووبێت بەبێ بەربەستکردنی ئاواتەکەم، کە دەبێ ئامادەی دۆڕان بم.

قۆناغی یەکەمی هەڵمەتەکە، هەڵبژاردنی بەرایی کۆمارییەکان بوو. توانیم بچمە ناو خولی دووەمەوە لە دژی (جیم ریس)، بێژەری وەرزشیی قسە نەرمی پێشوو و پارێزگاری (ئۆدێسە). ئەو لە ساڵی ١٩٧٦دا لە دژی (جۆرج ماهۆن) خۆی پاڵاوتبوو و هەستی بە شایستەیی دەکرد کە لە ١٩٧٨دا خۆی کاندید بکات. ئەو زۆر دڵتەنگ بوو بەوەی کە من لە یەکەمین خولی هەڵبژاردنی بەراییدا دەنگم لەو زیاتر هێنا بوو.

ریس تایبەتمەندییەکی تودی هەبوو، پشتیوانەکانیشی هەر وەهابوون. ستراتیژیان ئەوە بوو بۆیاخی لیبراڵم لێبدەن و وەها دەرمبخەن کە کەسێکی نەناسراو و پێشوازی لێنەکراوم. ئەوان هەموو جۆرەکانی تیۆرەی گەلەکۆمەیان تاقی کردەوە. باوکم بەشێک بوو لە هەڵمەتی کۆمسیۆنی سێ لایەنە بۆ بونیادنانی حکومەتێکی جیهانی. من لەلایەن بنەماڵەی (رۆکفێلەر)ەوە نێردرابووم بۆ کڕینەوەی

زەویی کێڵگەیەك. چوار ڕۆژ بەر لە هەڵبژاردن، ڕیس کۆپییەکی بڕوانامەی لەدایکبوونی منی ئامادەکرد بۆئەوەی بیسەلمێنێت من لە خۆرهەڵات لەدایك بووم. چۆن دەمتووانی ڕووبەڕووی ئەمە ببمەوە؟ من بە دێڕێك وەڵامم دایەوە کە باوکم جارێکیان بەکاریهێنابوو: "نا، من لە تەکساس لەدایك نەبووم، چونکە ئەو ڕۆژە ویستم لە دایکمەوە نزیك بم".

ڕیس پاڵپشتی و هاوبەشیی هەڵمەتەکانی لەلایەن ڕۆناڵد ڕیگن-ەوە بەدەست هێنا کە دەیویست لە هەڵبژاردنە بەراییەکەی ١٩٨٠دا توانا لە بەرانبەر باوکمدا بەدەست بهێنێتەوە. سەرباری قسەی پڕوپوچ، من گەشبین بووم لەسەر دەرفەتەکانم. ستراتیژی من بریتی بوو لە بونیادنانی دیوارێك لە زێدی خۆم لە میدلاند. من و لۆرا لە سەرتاسەری شارۆچکەکەدا بەشداریی قاوەخواردنەوەمان کرد، بینایە لەدوای بینایەی شارۆچکەکەمان ڕێکخست و ئەو هاوڕێیانەشمان ڕازی کرد یارمەتیمان بدەن کە هەرگیز نەچووبوونە ناو سیاسەتەوە. شەوێکی هەڵبژاردن، هەوڵی خەڵکەکەمان لە میدلاند دەنگێکی گەورەی بەرهەمهێنا. من دەنگی هەموو قەزاکانی ترم لە ناوچەکەدا لەدەستدا، بەڵام میدلاندم لە ئاستێکی ئەوەندە گەورەدا بەدەستهێنا کە پاڵاوتنەکەم بردەوە.

باوکم پێشبینی ئەوەی کردبوو کە ڕیگن تەلەفۆن بکات بۆ پیرۆزبایی ئەگەر هەڵبژاردنی بەرایی ببەمەوە. ڕۆژی دواتر تەلەفۆنی کرد. ئەو بەڕێز بوو و خۆبەخشی خۆی پیشاندا بۆ یارمەتیدانم لە هەڵبژاردنی گشتیدا. من سوپاسگوزاری تەلەفۆنەکەی بووم و هیچ دڵگرانییەکم نیشان نەدا. بەڵام من سوور بووم لەسەر خۆپاڵاوتن وەکو پیاوی خۆم. هیچ هەڵمەتێکم نە لەگەڵ ڕیگن نە لەگەڵ باوکم ئەنجام نەدا.

پێشبڕکێ لەگەڵ ڕیس، منی وەکو کاندیدێك بەهێز کرد. دەمزانی کە دەشێت زەربەی توندم بەر کەوێت، بەردەوام بم لە شەڕ و ببمەوە. نەیارەکەم لە هەڵبژاردنی

گشتیدا (کێنت هانس) بوو کە سیناتۆری ویلایەت، حاکم شیفەرز لەبارەیەوە هۆشداری پێدابووم. ستراتیژی هانس، وەکو هی ریس بوو- بمکات بە بێگانەیەکی کەناری خۆرهەلات (ئیست کۆست)- بەلام ئەو پلانەکەی بە وردی و سیحرەوە جێبەجێ دەکرد.

یەکێك لە یەکەمین ریکلامەکانم لە حالەتی راکردنی نەرمدا پیشاندا، کە پێم وابوو جەختکردنەوەیە لە وزە و گەنجێتیم. هانس بە دێرێك ئەوەی لە دژ هەلگەراندمەوە: "تاکە کاتێك کە تیایدا خەلکی لێرە راکردن ئەنجام دەدەن ئەو کاتەیە کە کەسێك بەدوایانەوەیە".

ئەو بەهەمان شێوە ریکلامێکی رادیۆیی ئاراستە کرد: " لە سالی ١٩٦١دا، کاتێك کێنت هانس لە ئامادەیی (دیمیت) لە (ناوچەی نۆزدەهەمی کۆنگرێس) تەخەروجی کرد، نەیارەکەی، واتە جۆرج دەبلیو بوش، لە ئەکادیمیای ئاندۆڤەر لە ماساشوسێتس دەیخوێند. لە سالی ١٩٦٥دا، کاتێك کێنت هانس لە (تەکساس تەکنۆلۆژی) تەخەروجی کرد، نەیارەکەی لە زانکۆی یەل بوو. کاتێکیش کێنت هانس لە زانکۆی تەکساس، بەشی یاسا تەخەروجی کرد، ، نەیارەکەی...گوێ لەمە بگرن خەلکینە... لە هارڤارد دەیخوێند. پێویستمان بە کەسێکی خەلکی باکووری خۆرهەلات نییە پێمان بلێت کێشەکانمان چییە".

هانس چیرۆکبێژێکی گەورە بوو و شارەزایەتییەکەی بەکاردەهێنا بۆ یاریکردن بە بیرۆکەی بێگانەیی. چیرۆکە دلخوازەکەی لەبارەی پیاوێکەوە بوو لە لیمۆزینێکدا کە لایدایە کێلگەیەك کە لەوێ هانس کاری دەکرد. کاتێك شۆفێرەکە داوای رێنوێنی لێکرد بۆ شارۆچکەی دواتر، هانس وتی، "بەلای راستدا پێچ بکەوە رێك بەلای پەرژینی مەروماڵاتەکەدا تێپەرە، پاشان رێگاکە بگرە بەر". قسە بەقوەتەکە ئەو کاتە دێت کە شۆفێرەکە پرسیار دەکات " بمبوورە، بەلام رەنگی یەکپۆشیی ئەو پەرژینە چۆنە؟" خەلکی خۆرئاوای تەکساس حەزیان لەمە بوو. هانس وەلامە

کاریگەرەکەی بەم شێوەیە دەدایەوە، "من کە خۆم نەمدەزانی لیمۆزینەکی رەقەمەکەی ماساشوسێتسە یان کۆنێکتیکەتە".

من و لۆرا بە شێوەیەکی کاتی چووینە (لەبۆک)ی گەورەترین شاری ناوچەکە کە ۱۱٥ مایڵ لە باکووری میدلاندەوە دوورە. شوێنگەیەکی گرنگە بۆ بزنسی لۆکە، لەبۆک زێدی زانکۆی تەکنۆلۆژیی تەکساس بوو. ئێمە شارەکەمان وەکو بنکەی خۆمان بەکارهێنا بۆ هەڵمەت لە قەزاکانی پێدەشتی ناوچەکە. من و لۆرا چەندەها سەعاتمان بەیەکەوە بەسەر برد، لە شارۆچکەکانی وەکو (لێڤلاند)، (پلەینڤیو) و براونفیلد وتاری سیاسیم پێشکەش دەکرد. بۆ یەکێك کە بە شێوەیەکی تایبەت گرنگی بە سیاسەت نەدەدا، لۆرا کامپەینەر (هەڵمەت وەگەڕخەر)ێکی سروشتی بوو. بلیمەتییەکەی بۆ دەنگدەرانی ئاسان کرد تا پەیوەندی پێوە بکەن. پاش ئاهەنگی گواستنەوەمان، گەشتێکی کورتمان بۆ (کۆزومێل)ی مەکسیك ئەنجام دابوو، بەلام گاڵتەمان کرد کە وتمان هەڵمەتەکەمان مانگی هەنگوینیمانە.

لە چواری تەمموزدا، لە (مەلشو)ی بەشی هەرە ژووروی ناوچەکە هەڵمەتمان ئەنجامدا. لە هەڵبژاردنە بەراییەکانی مانگی مایسدا، من لە قەزای (بەیلی) لە ۲۳۰ دەنگ، ٦ دەنگم بەدەستهێنابوو. بەو شێوازەی کە دەمبینی، بوارێکی یەکجار زۆرم هەبوو بۆ باشبوون. من و لۆرا زەردەخەنە وماڵئاواییمان کرد لە تەماشاچییانی پشت پیکەبە سپییەکەمان. کەس رووی خۆشی نیشان نەدا. خەڵکی بەجۆرێك لێی دەڕوانین وەك بڵێی بێگانەین. لە کۆتاییدا، گەیشتمە ئەو قەناعەتەی کە تاکە پشتیوانێك کە لە (مەلشو) هەمبێت، ئەو کەسەیە کە لە تەکمەوە دانیشتووە.

شەوی هەڵبژاردن هات و دەرکەوت کە حاکم شیڤەرزی پیر راستی وتووە. لە قەزای میدلاند و لە بەشی باشووری ناوچەکە بە دەنگێکی زۆر بردمەوە، بەلام بایی ئەوەندە نا کە رێژەی دەنگەکانی هانس لە (لەبۆك) و شوێنی تر پارسەنگ بدەمەوە. دوایین ئەنجام بریتی بوو لە ٥۳٪ بە ٤٧٪.

رقم له دۆڕان بوو، بەڵام دڵخۆش بووم کە خۆم پاڵاوت. خۆشیم لە کاری فورسی سیاسەت، ناسینی خەڵك و خستنەڕووی کەیسەکەم دەبینی. فێربووم کە ڕێگەدان بە نەیارەکەت بۆئەوەی کە پێناسەت بکات، یەکێکە لەو هەڵە هەرە مەزنانەی کە دەشێت لە هەڵمەتێکدا بیکەیت. هەروەها بۆم دەرکەوت کە دەشێت شکست قبوڵ بکەم و بەرەوپێش بچم. ئەمە بۆ کەسێك کە وەکو من کێبڕکێکار بوو، ئاسان نەبوو، بەڵام ئەمە بەشێکی گرنگی ئاقڵبوونم بوو.

هەرچی پەیوەندی بە کۆنگرێسمان بە (کێنت هانس)ەوە هەیە، شایستەی ئەوە بوو پێشبڕکێکە بباتەوە و بووینە هاوڕێی باش. ئەو هێشتا ئاکە سیاسییەکە تاوەکو ئێستا شکستی پێهێنابم، کە دواتر بووینە دوو سەرکەوتووی حاکمی و سەرۆکایەتی. ئەو سێ خولی لە ئەنجومەنی نوێنەران خزمەت کرد بەر لەوەی کە پێشبڕکێیەك بۆ ئەنجومەنی پیران لەدەست بدات. ئینجا بووە کۆمارییەك و هاوبەشی کرد لە هەڵمەتەکانی تردا. کێنت ئێستا سەرۆکی تەکساس تەکنۆلۆژییە. ئەو دەڵێت بەبێ من هەرگیز نەدەبوویتە سەرۆك. لەوانەیە ڕاستیش بکات.

***

شەش پاش ئەوەی هەڵمەتەکەم کۆتایی هات، پێشبڕکێیەکی تر هەبوو بیری لێبکەوە. باوکم خۆکاندیدکردنی بۆ هەڵبژاردنی سەرۆکایەتیی ١٩٨٠ ڕاگەیاند. ئەو هەوڵێکی نادڵنیا بوو لە بەرانبەر ڕۆناڵد ریگن-دا، بەڵام هەڵمەتێکی بەهێزی لە ئایۆوا خستەگەڕ و سەرکەوتنێکی لەرزۆکی لە کۆنگرێس بەدەست هێنا. بەداخەوە، گەشتە گەرم و گوڕەکەی لە ناوەڕاستی زستانە ساردەکانی (نیوهەمپشایەر)دا کورتی هێنا. ریگن لەوێ شکستی پێهێنا و بەردەوامبوو لە پاڵاوتنی کۆماری.

دەنگۆیەکی زۆر هەبوو لەبارەی ئەوەی کە ئەبێ ریگن کێ بۆ جێگری هەڵبژێرێت. لە کۆنفرانسی (دیترۆیت)دا، ئەو لە مشتومڕدا بوو لەگەڵ جیراڵد فۆرد لەبارەی جۆرێك لە هاوسەرۆکایەتی. ئەوان لەسەر ئەوە کۆك بوون کە ئەمە کاریگەری نابێ-

بڕیارێکی باش بوو. پاشان ریگن پەیوەندی بە باوکمەوە کرد و داوای لێکرد کی لەگەڵیدابێت بۆ خۆکاندیدکردنەکە-تەنانەت بڕیارێکی باشتریش.

لە شەوی هەڵبژاردندا، لیستی ریگن-بوش (جیمی کارتەر) و (وۆڵتەر مۆندەیل)ی بە ٤٨٩ بە ٤٩ لە لیژنەی هەڵبژاردندا (کە بەپێی دەنگی خەڵك لەهەر ویلایەتێك، سەرۆك و جێگرەکەی هەڵدەبژێرن) تێکشکاند. من و لۆرا بەرەو واشنتن فڕین بۆ دەستبەکاربوونی سەرۆکایەتی لە ٢٠ی کانوونی دووەمی ١٩٨١دا، کە بۆ یەکەمین جار مەراسیمەکە لە بەشی خۆرئاوای سیحراویی (کاپیتاڵ) بەڕێخرا. ئێمە خەندەیەکی گەورەمان کەوتە سەر لێوان کاتێك دادوەر پۆتەر ستیوارت باوکمی سوێند دا. پاشان رۆناڵد ریگن ئەو سوێندەی دووبارە کردەوە کە لەلایەن سەرۆکی دادوەران، وارن بێرگەر بەڕێوەبرا.

وەکو شارەزایەکی مێژوو، دڵخۆش بووم بەوەی کە لە کورسییەکی ریزی پێشەوە دابنیشم. وەکو کوڕێك، پڕبووم لە شانازی. قەت بە بیرمدا نەهات کە رۆژێك لە رۆژان لەسەر ئەو سەکۆیە دابنیشم و لە دەستبەکاربوونی دوو خولی سەرۆکایەتیدا دەستی راستم بەرز بکەمەوە. سەرەتاکانی هەشتاکان، چرکەساتی سەختی لەگەڵ خۆیدا هێنا، هەر لە بێبازاڕیی (کەساد)ی کارەساتبارەوە بۆ تەقاندنەوەی مەقەرەکانی مارینز لە لوبنان، بەڵام ئیدارەی ریگن-بوش ئەو بەڵێنەی بردە سەر کە دابووی. باجەکانیان کەم کردەوە، لە جەنگی سارد دا توانایان بەدەست هێنایەوە و مەعنەوییاتی ئەمریکییان گەڕاندەوە.

کاتێك سەرۆك ریگن و باوکم لە ساڵی ١٩٨٤دا ریکۆردەکەیان خستە بەردەم دەنگدەران، چل و نۆ ویلایەتیان لە پەنجا ویلایەت بردەوە.

باوکم دڵخوازێکی لۆژیکی بوو بۆ پاڵاوتنی سەرۆکایەتیی ١٩٨٨، بەڵام پێشبڕکێیەکە ئاسان نەدەبوو. ئەو ئەوەندە دڵسۆز بوو بۆ سەرۆك ریگن کە تەقریبەن هیچی بۆ خۆی نەکردبوو تا برەو بە خۆی بدا. ئەو بەهەمان شێوە شەڕی

ڕاکێشەری ڤان بیورێنی بەناوی دەکرد. تا ئەو کاتەی کە لە ساڵی ١٨٢٦ (مارتن ڤان بیورێن) دوای (ئەندرو جاکسن) کەوت بۆ کۆشکی سپی، هیچ جێگرێکی سەرۆک هەڵنەبژێردرابوو کە جێگەی ئەو سەرۆکە بگرێتەوە کە لەگەڵیدا خزمەتی کردبوو.

لە سەرەتاکانی دووەمین خولیدا، سەرۆک ریگن بە بەخشندەییەوە ڕێگەی بە باوکمدا تا شوێنی حەوانەوەی سەرۆکایەتی لە کامپ دەیڤد بەکاربهێنێت بۆ کۆبوونەوەیەک لەگەڵ تیمی هەڵمەتەکەی. ئەمە لە زیرەکیی باوکم بوو کە هەموو خوشک و براکان و منداڵەکانی بانگ بکات. خۆشحاڵ بووم بە ناسینی تیمەکەی، هەرچەندە من هەندێ تەحەفوزاتم هەبوو. گەورە ستراتیژی باوکم کابرایەکی گەنج بوو بەناوی (لی ئەتواتەر)، وەکو گیتارژەنێکی خێرا قسەکەری خەڵکی کارۆلاینای باشوور، لی بە یەکێک لە دیارترین ڕاوێژکارانی سیاسی وڵات دادەنرا. قسەی تێدا نییە زیرەک بوو. گومان هەڵناگریت کە ئەزموونی هەبوو. دەمویست بزانم ئاخۆ دڵسۆزە.

کاتێک باوکم پرسیاری کرد ئاخۆ هیچ ئەندامێکی خێزان پرسیاری هەیە، دەستم بەرز کردەوە. پرسیارم کرد "لی، چۆن بزانین کە دەتوانین متمانەت پێ بکەین، چونکە شەریکەکانی بزنسەت بۆ کاندیدەکانی تر ئیش دەکەن؟" جێب دەمی گردەوە: "ئەگەر کەسێک قومبەلەیەک بە باوکمدا بدات، چاوەڕێ دەکەین تۆ خۆتی بۆ هەڵدەیت". تۆنی دەنگمان توند بوو، بەڵام پشاندەری خۆشەویستیمان بوو بۆ باوکمان و چاوەڕوانیمان لە ستافەکەی- ئەجێندایەک کە کاندیدەکە دەخاتە پلەی یەکەم و ئەوەی کەسی دەخاتە پلەی دووەم. لی وتی، باوکمی لە کۆمیتەی نیشتمانیی کۆماری ناسیوە، زۆر پێی سەرسام بووە و ویستوویەتی بیباتەوە. ئەو وتیشی کە پلانی ئەوە دادەنێت پەیوەندییە بزنسە ناکۆکەکانی توند بکات. لەگەڵ ئەوەشدا ڕوون بوو کە گومانەکانمان ئەویان هێنابووە لەرزە. دواتر هەر لەو ڕۆژەدا، سۆراخی من و جێبی برامی کردبوو. ئەو پرسیاری کرد، ئەگەر ئەوەندە نیگەرانن

بۆچی یەکێك لە ئێمە نەدەهاتە واشنتن دی سی و لە هەڵمەتەکەدا یارمەتیان نەدەخستەڕوو و چاودێری ئەو ستافەکە نەدەبوون؟

بانگهێشتەکە تووشی تێڕامانی کردیم. ئەوقیتەکە گونجاو بوو. پاش داکەوتن لە بازاڕەکانی ئەوتدا، من و شەریکەکانم کۆمپانیای گەڕان و سۆراخکردنەکەمان لێکدابوو و ئیشمان بۆ هەموو کارمەندەکان دۆزیبووەوە. باوکم کەیفی بە بیرۆکەکە دەهات و لۆرا ئامادە بوو تاقی بکاتەوە.

لە ئۆفیسی هەڵمەتەکە لە ناوەڕاستی واشنتن، من هیچ پۆستێکم نەبوو. هەروەکو باوکم دەیگوت، من تازە ناونیشانێکی باشم هەیە: کوڕ. من ئەرکێرم کردەسەر دارایی کۆکردنەوە، سەفەرکردن بۆ لادێ بۆ پێشکەشکردنی وتاری بەلەیری و بزواندنی مەعنەویاتی خۆبەخشان بە سوپاسکردنیان لەبری باوکم. جارجارەش، بیری هەندێ کارمەندی پلەبەرزی ستافەکەم دەهێنایەوە کە ئەوان لە تیمێکدان بۆ بەرەوپێشبردنی هەڵبژاردنی جۆرج بوش، نەك پیشەی خۆیان. من وانەیەکی بەنرخ لەبارەی واشنتنەوە فێر بووم: نزیکایەتی لە دەسەڵات، بەدەسەڵاتبوونە. هەبوونی گوێچکەی باوکم، منی کاریگەر کرد.

یەکێك لە ئەرکەکانم گەڕان بوو بەناو داواکارییەکانی ڕۆژنامەنووساندا بۆ پرۆفایلەکان. کاتێك (مارگرێت وارنەر)ی گۆڤاری (نیویۆرك) پێی وتین کە دەیەوێ چاوپێکەوتنێك ئەنجام بدات، ئێمە ڕاسپاردەی ئەوەمان دا کە هاوکاریین. مارگرێت بەهرەمەند بوو و پێدەچوو ئامادە بێت پارچەیەکی دادپەروەرانە بنووسێت. باوکیشم ڕازی بوو.

دایکم ئەو بەیانییەی کە گۆڤارەکە کەوتە سەر ستاندەکانی هەواڵ، تەلەفۆنی بۆ کردم. "نیویۆرکت بینیووە؟" وتم هێشتا نا. بە توڕەییەوە وتی "باوکتیان بە بودەڵە ناوبردووە!"

بە خێرایی سۆراخی کۆپییەکی گۆڤارەکەم کرد و پیایدا چوومە خوارەوە و چاوم کەوتە سەر سەردێڕێکی تۆخ: "شەڕ لەگەڵ فاکتەری بودەڵەییدا". نەمتووانی باوەڕ بکەم. گۆڤارەکە دەلالەتی لەوە دەکرد کە باوکم، فڕۆکەوانی بۆمبهاوێژی دووەم جەنگی جیهانی، بودەڵەیە. سوور ببوومەوە. بە تەلەفۆن پەیوەندیم بە مارگرێتەوە کردەوە. ئەو بەڕێزەوە پرسیاری لێکردم ئاخۆ چۆن بیرم لە بابەتەکە کردووەتەوە. من بێ ئەدەبانە پێم وت کە ئەو بەشێکە لە کەمینێکی سیاسی. ئەو بە سکاڵاکردنەوە شتێکی درکاند لەبارەی ئەوەی کە موحەریرەکان بەرپرسن لە بەرگی گۆڤارەکە. من سکاڵام نەکرد. لەبارەی موحەریرەکانەوە سکاڵام کرد و نیگەران بووم. لەو کاتە بەدواوە، لە ڕۆژنامەنووسە سیاسییەکان و موحەریرە نەبینراوەکانیان کەوتمە گومان.

پاش تەواوکردنی سێیەمین سەرکەوتن لە ئایۆوا، باوکم سەرکەوتنێکی لە نیوەمپشایەر بەدەستهێنا و گەیشتە پاڵاوتنەکە. نەیارەکەی لە هەڵبژاردنی گشتیدا (مایکڵ دوکاکیس)ی حاکمی لیبراڵی ماساشوسێتس بوو. باوکم هەڵمەتەکەی بە وتارێکی مەزن لە کۆنفرانس لە (نیوئۆرلێنز) دەستپێکرد. من سەرسام بووم بە هێزی وشەکانی، کە بە ڕێکوپێکی نووسرابوون و بە کاریگەرییەوە ئاراستە دەکران. ئەو باسی لە نەتەوەیەکی "بەسۆزتر، نەرمتر" دەکرد کە بەهۆی هاوسۆزی و بەخشندەیی گەلی ئەمریکا بونیاد دەنرێت- شتێك کە ئەو پێی دەوت، "هەزاران پنتی ڕووناکی". ئەو ئەجێندایەکی سیاسەتی بەهێزی خستەڕوو، لەوانەش پەیمانێکی ئازایانە: "لێوەکانم بخوێننەوە، هیچ باجی نوێ لەئارادا نییە".

من کارتێکراو بووم بە توانای تەوقیتی باوکم. ئەو توانی بە شێوەیەکی کامڵ گواستنەوەکە لە جێگر سەرۆکێکی وەفادارەوە بۆ کاندید ئەنجام بدات. ئەو وەکو پێشڕەوێکی دەنگدان کۆنفرانسی جێهێشت و دەستبەرداری پاڵدانەوە لە ماڵەوە بوو. لە ٨ی نۆڤەمبەری ١٩٨٨دا، خێزانەکەمان تەماشای ئەنجامەکانیان کرد لە

ماڵی (دکتۆر چارلز نیبلێت) لە هوستن. دەمزانی باوکم بردوویەتەوە کاتێک ئۆهایۆ و نیوجێرسی، کە دوو ویلایەتی حەساسن، ڕێگەیان بۆ خۆش کردبوو. بە هاتنی کۆتایی شەو، ئەو چل ویلایەت و ٤٢٦ دەنگی لیژنەی هەڵبژاردنی بەدەستهێنابوو. جۆرج ئێچ دەبلیو بوش، ئەو پیاوەی کە پێی سەرسام بووم و زۆرم خۆش دەویست، بە چل و یەکەمین سەرۆکی ئەمریکا هەڵبژێردرا.

من و لۆرا خۆشیمان لەو ساڵ و نیوە بینی لە واشنتن. بەڵام کاتێک خەڵکی پێشنیاری ئەوەی کرد لە واشنتن بمێنمەوە و پەیوەندییەکانم بەهێز بکەم، هەرگیز لەبەرچاوم نەگرت. من هیچ بایەخێکم نەبوو بۆ ئەوەی ببمە لۆبیست (کۆکەرەوەی پاڵپشتی) یان کلکێک لە ئیدارەی باوکمدا. زۆر بەسەر هەلبژاردندا تێنەپەڕی، بارگەمان تێکنا و گەڕاینەوە بۆ تەکساس.

من هۆکارێکی ترم هەبوو بۆ گەڕانەوە بۆ ماڵەوە. لە نزیک کۆتایی هەڵمەتەکەی باوکم، پەیوەندییەکی تەلەفۆنیی جێی بایەخم لە شەریکی بزنسی پێشوو (بیڵ دێویت) پێگەیشت. باوکی بیڵ خاوەنی کۆمەڵەی بەیسبۆڵی گەورەی (سینسیناتی ریدز) بوو و باش چووبووە ناو کۆمەڵی بەیسبۆڵەوە. ئەو بیستبووی کە (ئێدی چیلیس)، خاوەنی بنەڕەتیی (تەکساس ڕەینجەرز) دەیویست تیمەکە بفرۆشێت. ئایا من ئەمەوێ بیکڕمەوە؟ من تەقریبەن لە کورسییەکەمەوە خۆم هەڵدا. هەبوونی تیمێکی بەیسبۆڵ خەونێکە کە دێتە دی. سوور بووم لەسەر ئەوەی بیهێنمەدی.

ستراتیژی من ئەوە بوو کە خۆم بکەمە کڕیاری ئیختیار. من و لۆرا، ڕۆیشتین بۆ دالاس و من ڕووبەڕوو سەردانی ئێدی و فران-ی هاوسەریم کرد. من بەڵێنمدا کە چاودێرێکی باشی ئەو وەکالەتە بم کە خۆی حەزی لێی بوو. وتی "تۆ ناوێکی گەورە و توانایەکی مەزنت دەستکەوتووە. کوڕم، من حەز دەکەم بەتۆی بفرۆشم، بەڵام تۆ پارەت نییە".

من رۆیشتم ئیش لەسەر وەبەرهێنەرانی بەهێز بکەم، کە زۆربەیان هاوڕێیانم بوون لەسەرتاسەری وڵاتدا. کاتێک کۆمسیۆنەر (پیتەر ویێبێرۆس) جەختی لەوە کردەوە کە ئێمە پێویستمان بە خاوەنداری خۆجێیی زیاتر هەیە، چووم وەبەرهێنەری هەرە سەرکەوتووی (فۆرت وێرس) ریچارد رەینوەتەر ببینم. پێشتر تکام لە ریچارد کردبوو و رەتی کردبوومەوە. ئەمجارەیان نەرم بوو. ریچارد رازی بوو لەسەرنەوەی کە نیوەی پارە بۆ وەکالەتەکە ئامادە بکات ئەگەر من نیوەکەی تر کۆ بکەمەوە و رازی بوو لەسەر ئەوەی کە هاوڕێکەی، (رەستی رۆز) بکاتە شەریکی دەستەی بەڕێوەبردن.

چووم رەستی لە یانەی گۆلفی (بروک هۆلۆ) ببینم لە دالاس. ئەو وەکو پیاوێکی شەرمن دەرکەوت. ئەو هەرگیز متابعەی بەیسبۆڵی نەکردبوو، بەڵام لە مەسەلەی داراییدا بێ وێنە بوو. ئێمە باسی ئەوەمان کرد کە ئەو کەسی ناوەوە بێت و سەروکاری لەگەڵ ژمارەکاندا هەبێ و منیش کەسی دەرەوە بم و دەست و پەنجە لەگەڵ خەڵکدا نەرم بکەم.

ماوەیەکی کورت پاش ئەوە، من و لۆرا لە بۆنەیەکی خێرخوازیی نیمچەرەسمی بووین. پلانەکانمان بۆ تیمەکە دزەی کردبوو و ئاشنایەکی ئاسایی منی جیاکردەوە و بەگوێیدا چرپاندم: "ئایا دەزانی کە رەستی رۆز شێتە؟ پێویستە ئاگادار بیت". یەکەمجار من ئەمەم وەکو دەمەتەقێیەکی پوچ بەلاوەنا. پاشان نیگەران بووم. مەبەست لە "شێت" چییە؟

پەیوەندیم بە ریچاردەوە کرد و پێم وت کە چیم بیستووە. پێی وتم کە خۆم پرسیار لە رەستی بکەم. ئەمەیان کەمێك سەیر دەبێت. من بە ئەستەم کابرام دەناسی و قەرار وابوو جێگیریی ئەقڵی بخەمەژێر پرسیار؟ ئەو پاش نیوەڕۆیە رەستیم لە کۆبوونەوەیەکدا بینی. هەر کە چوومە ناو ژووری کۆنفرانس، ئەو هاتەلام

وتی " بیستم کە کێشەت لەگەڵ حاڵەتی ئەقڵی من هەیە. هاتوچۆی دەروونناسێك دەکەم. من نەخۆش بووم. عەیبی تێدایە؟"

دەردەکەوێ کە رەستی نەخۆش نییە. ئەمە شێوازی سەیری خۆی بوو بۆ دەرخستنی راستییەکە، کە ئەوە بوو بە دەست ناهاوسەنگییەکی کیمیاییەوە نالاندوویەتی کە ئەگەر بە رێك و پێکی چارەسەر نەکرایە ئەوا لەوانەبوو ئەقڵی چالاکی بەرەو شڵەژان ببات. هەستم زۆر بە بچوکی کرد. داوای لێبووردنم کرد.

من و رەستی بەردەوام بووین لە بونیادنانی پەیوەندییەکی گەورە. یارمەتیدام تێبگەم لەوەی کە خەمۆکی، نەخۆشییەك کە دواتر زانیم دایکیشم بە هەمان شێوە جارێك لە جاران لە ژیانیدا تووشی بووە، دەشێت بە چاودێرییەکی رێکوپێك بەرێوەببرێت. دوو دەیە دواتر لە ئۆفیسی ئۆڤاڵ، لەگەڵ هەردوو سیناتۆر (پیت دۆمینیسی) و (تێد کەنەدی) وەستام و پرۆژەیاسایەکەم واژۆ کرد بۆ ئەوەی کە کۆمپانیاکانی بیمە چارەسەر بۆ نەخۆشەکانی ئەقڵی بخەنە بەرنامەیان. لەو کاتەدا، بیرم لە هاورێم، رەستی رۆژ دەکردەوە.

پێکەوە لەگەڵ رەستی و ریچارد وەکو بەشێك لە گروپی خاوەندارێتیمان، کرینی تیمەکەمان قبوڵ کرد. ئێدی چارلی وتی کە لە رۆژی کردنەوەی وەرزی ١٩٨٩ ئێمە وەکو خاوەنی نوێ بە هاندەران دەناسێنێت. ئێمە لە پەنایەکە هاتینە دەرەوە، لەمبەر بۆ ئەوبەری سەوزاییەکە رۆیشتین بەرەو گردۆلکەی لێدانی تۆپ کە لەوێ چاومان بە ئێدی و راهێنەری ئەفسانەیی (دالاس کاوبۆین) تۆم لاندری کەوت کە یەکەم تۆپی لێدا. من رووم کردە رەستی و وتم "ئەمە ئەوەندەی بەرهەمەکەی باشە". بە درێژایی چوار وەرزی دواتر، من و لۆرا چووین بۆ پەنجا یان شەست یاری لە ساڵێکدا. گەلێك بردنەوەمان بینی، بەرگەی پشکی عادیلانەی زیانەکانمان گرت و خۆشیمان لە چەندەها سەعاتی پێکەوەیی وەرگرت. کچەکانمان دەبرد بۆ راهێنانی بەهاری و ئەوەندەی بکرایە دەمانهێنان بۆ پارك. من بە درێژایی بازاڕی

(ڕەینجەرەکان) گەشتم دەکرد، وتارم پێشکەش دەکرد بۆ فرۆشتنی بلیتەکان و لە میدیای خۆجێییەوە وەسفی یانەی بەیسبۆڵەکەم دەکرد. پێ بەپێی تێپەڕبوونی کات، لە پشت مینبەرەوە ئاسودەیی زۆرم پەیدا کرد. فێربووم کە چۆن پەیوەندی لەگەڵ کۆمەڵە خەڵکێکدا دروست بکەم و پەیامێکی روون بگەیەنم. هەروەها ئەزمونێکی بەنرخم بەدەستهێنا لە رووبەڕووبوونەوەی پرسیارە قورسەکاندا لەلایەن رۆژنامەنووسان کە لەم حاڵەتەدا زۆربەی پەیوەندی هەبوو بە نۆرەی ناجێگیری تۆپ هەڵدانمان.

بەڕێوەبردنی (ڕەینجەرز) شارەزایەتییەکانی بەڕێوەبردنی لام قوڵکردەوە. من و رەستی، کاتی خۆمان لە مەسائیلی ستراتیژی و دارایی گەورەدا بەسەر برد و بڕیارەکانی بەیسبۆڵمان بۆ پیاوانی بەیسبۆڵ بەجێهێشت. کاتێک خەڵکی ئەدائیان باش نەبووایە، گۆڕانکاریمان دەکرد. ئاسان نەبوو کە داوا لە کەسانی شایستەی وەکو بۆبی ڤالەنتاین، بەڕێوەبەرێکی چالاک کە ببووە هاوڕێم، بکەیت کە بجوڵێن. بەڵام هەوڵمدا هەواڵەکە بە شێوەیەکی ئاقڵانە بگەیەنم و بۆبی وەکو پرۆفێشناڵێک پیادەی کرد. من سوپاسگوزار بووم کاتێک، ساڵانێک دواتر، بیستبووم وتبووی "من دەنگم بە جۆرج دەبلیو بوش دا هەرچەندە لەکارەکەم دەریکردم".

کاتێک من و رەستی جڵەوی کارەکەمان گرتەدەست، رەینجەرز ریکۆردێکی دۆڕانی حەوتەمی نۆ ساڵی پێشووی تەواو کردبوو. یانەکە ریکۆردێکی بردنەوەی چواری یەکەم پێنج وەرزی ئێمەی تۆمار کرد. باشبوونەکانی سەر گۆڕەپان، خەڵکێکی زیاتری هێنایە سەر کورسییەکانز لەگەڵ ئەوەشدا، ئابووریی بەیسبۆڵ بۆ تیمێکی بازاڕی بچوک، سەخت بوو. قەت بۆ سەرمایەی زیاتر داوامان لە گروپی خاوەندارێتی نەکرد، بەڵام قەتیش پارەمان ڕادەست نەکرد.

من و رەستی گەیشتینە ئەو ئەنجامەی کە باشترین رێگە بۆ زیادکردنی نرخی دوورمەودای وەکالەتەکە بریتییە لە گەشەپێدانی ستادیۆمەکە. رەینجەرز تیمێکی

کۆمەڵەی گەورە بوو کە لە پارکی کۆمەڵەی بچوکدا یاری دەکرد. ئێمە سیستەمێکی داراییپێدانی (گشتی-تایبەت)مان گەڵاڵە کرد بۆ تەمویلکردنی بونیادنانی ستادیۆمێکی نوێ. من هیچ لاریم نەبوو لە زیادکردنی کاتیی باجی فرۆش بۆ بەخشینی بە پارکەکە، بەو پێیەی کە هاوڵاتیانی دەوروبەر دەرفەتێکیان هەبوو بۆ دەنگدان لەبارەیەوە. ئەوان بە نزیکەی دوو بەرانبەر یەک تێیان پەڕاند.

لە سایەی رێبەرایەتی (تۆم شیفەر)- نوێنەرێکی دیموکراتی پێشووی ویلایەتەکە کە کارێکی باشی کرد بە سەرپەرشتیکردنی پرۆژەی ستادیۆمەکە کە دواتر من داوام لێکرد ببێتە باڵیۆز لە ئوستراليا و ژاپۆن- پارکە نوێ جوانەکە ئامادە بوو بۆ رۆژی کردنەوەی وەرزی ١٩٩٤. لە ماوەی لەماوەی ئەو چەند ساڵەی دواتردا، ملیۆنەها تەکساسی هاتن بۆ تەماشاکردنی یارییەکان لە گۆرەپانە تازەکەدا. ئەمە هەستێکی سەرکەوتنی گەورە بوو کە بزانم بەشێك بووم لەو تیمەی بەرێوەبردن کە ئەمەی مومکین کردووە. هەرچەندە بە هاتنی ئەو کاتە، پێشبڕکێ بۆ ئاڵای بردنەوە تاکە جۆرێك نەبوو کە من لە مێشکمدا بوو.

***

ماوەیەکی کورت دوای ئەوەی کە لە ساڵی ١٩٨٩دا رەینجەرز-مان کڕی، هەڵمەت بۆ هەڵبژاردنی ١٩٩٠ی حاکمی تەکساس دەستپێیکرد. ژمارەیەك لە هاورێیانی ناو سیاسەت پێیان وتم کە خۆم بپاڵێوم. قسەی خۆشم بۆ کرا، بەڵام هەرگیز بە جددی وەرمنەگرت.

زۆربەی قاڵبوونی سیاسیم لەسەر باوکم چەقی بەستبوو. لەماوەی چەند مانگێکی بوون بەسەرۆکدا، ئەو رووبەڕووی وەرچەرخانی زەوی لەرزێن بووەوە لە جیهاندا. تەقریبەن بەبێ هیچ هۆشدارییەك، دیواری بەرلین لە ساڵی ١٩٨٩دا هەرەسی هێنا. سەرسامی شێوازی مامەڵەکردنی باوکم بووم لەگەڵ بارودۆخەکەدا. ئەو دەیزانی کە دەشێت رووداوەکە بەشێوەیەکی ناپێویست سۆڤیەتییەکان بجوڵێنێت کە

پێویستیان بە کات و بوار هەبوو گواستنەوەکە لە کۆمەنیزمەوە بە شێوەیەکی ئاشتییانە ئەنجام بدەن.

لە سایەی دیپلۆماسیەتی جێگیری باوکمدا لە کۆتایی جەنگی سارد- و کاردانەوە توندەکانی لە بەرانبەر شەڕانگێزی لە پەناما و عێراق- وڵات متمانەیەکی یەکجار زۆری بە حوکمدانی سیاسەتی دەرەوەی جۆرج بوش هەبوو. بەڵام من نیگەرانی ئابووری بووم کە لە ١٩٨٩وە دەستی کردبوو بە خاو بوونەوە. بە هاتنی ١٩٩٠، ترسی ئەوەم هەبوو کە بێ بازاڕییەك سەرهەڵبدات. من موڵکە بچوکەکانم کردەوە بە پارە و ئەو قەرزەم دایەوە کە رامکێشابوو بۆ کڕینی پشکم لە(رەینجەرز). هیوادار بووم کە هەر کەوتنێك بە خێرایی کۆتایی بێت لەبەر خاتری وڵات و لەبەر خاتری باوکم.

لە هەمان کاتدا، باوکم دەبووایە بڕیار بدات ئاخۆ جارێکی تر خۆی هەڵدەبژێرێتەوە. لەکاتێکدا کە پێکەوە لە (مەین) لە هاوینی ١٩٩١دا ڕاوەماسیمان دەکرد پێی وتم، "کوڕم، زۆر دڵنیا نیم لەوەی کە پێویستە جارێکی تر خۆم کاندید بکەمەوە". پرسیارم کرد "بە ڕاستتە؟ بۆچی؟"

ئەو وتی "هەست بە بەرپرسیارێتی دەکەم لە بەرانبەر ئەوەی کە بەسەر (نەیل) هات". (نەیل)ی برام ئەندامی دەستەی (سیلڤێرادۆ) بوو بۆ قەرز و پاشەکەوت. باوکم باوەڕی وابوو کە نەیل کەوتووەتەبەر هێرشی توندی ڕۆژنامەنووسان لەبەرئەوەی کوڕی سەرۆکە. هەستێکی زۆر ناخۆشم بۆ نەیل لا دروست بوو و دەمتووانی لە ئازاری باوکم تێبگەم. بەڵام وڵات پێویستی بە سەرکردایەتی جۆرج بوش هەبوو. ئاسودە بووم کاتێك باوکم بە بنەماڵەکەی وت کە پێشبڕکێیەکی لەبەردەمدا ماوە.

هەوڵی خۆهەڵبژاردنەوە سەرەتایەکی خراپی هەبوو. وانەی یەکەم لە سیاسەتی هەڵبژاردندا ئەوەیە کە قاعیدەکەت خۆش بکەیت. بەڵام لە ساڵی ١٩٩٢دا، قاعیدەی

باوکم دەسڕایەوە. هۆکاری سەرەکی ئەوە بوو کە شکاندنی سوێندەکەی بوو بۆ بەرزنەکردنەوەی باجەکان- دێڕی بەدناوی "لێوەکانم بخوێننەوە" لە وتاری کۆنفرانسی ١٩٨٨دا. باوکم زیادکردنی باجی لە کۆنگرێسی دیموکراتەکانەوە قبوڵ کردبوو لە بەرانبەر کۆنترۆڵکردنی خەرجیدا. لەکاتێکدا کە بڕیارەکەی سوودی بۆ بودجە هەبوو، هەڵەیەکی سیاسی ئەنجام دابوو.

وتارنووسی راستڕەوی توند (پات بوچانان)، لە هەڵبژاردنی بەرایی (نیوهامپشایەر)دا تەحەدای باوکمی کردبوو و ٣٧٪ی بەدەستهێنابوو- پرۆتێستۆیەکی دەنگی جددی. بۆ خراپترکردنی کێشەکان، ملیاردێری تەکساس (رۆس پیرۆت) بڕیاریدابوو کە هەڵمەتێکی لایەنی سێیەم بەگەڕ بخات. ئەو بە بەلاغەتی دژە-کورتهێنان و دژەبازرگانییەوە، ڕاوی لەسەر کۆنسێرڤاتیڤە بەئاگاهاتووەوەکان دەکرد. یەکێک لە سەنتەرەکانی هەڵمەتی پیرۆت لەسەر جاددەیەکی دالاس لەوبەری ئۆفیسەکەی منەوە بوو. روانین لە پەنجەرەکەوە وەکو دەنگدانێکی سۆراخکەری رۆژانە وابوو. کادیلاک و ئێس یو ڤی-یەکان لای سەکۆیەکەی پیرۆت ریزیان بەستبوو بۆ هەڵگرتنی لەزگەکان و تابلۆی حەوشەکان. دەرکم بەوە کرد کە دەبێ باوکم شەڕێکی دوو بەرەیی بکات بۆ هەڵبژاردنەوە، لە بەرەیەکەوە لەگەڵ پیرۆت و لەبەرەیەکی ترەوە لەگەڵ کاندیدی دیموکراتەکان.

بەهاتنی بەهاری ١٩٩٢، روون بوو کە ئەو کاندیدە کێ دەبێت، (بیڵ کلینتن)ی حاکمی (ئەرکەنساس) بوو. کلینتن بیست و دوو ساڵ لە باوکم گەنجتر و شەش هەفتە لە من منداڵتر بوو. هەڵمەتەکە دەستپێکی وەرچەرخانێکی گشتی لە سیاسەتی ئەمریکادا نیشانە کرد. تاوەکو ئەو کاتە، هەموو سەرۆکێک، هەر لە فرانکلین روزڤێلت-ەوە، لە دووەم جەنگی جیهانیدا خزمەتی کردبوو، چ لە سوپادا یان وەکو فەرماندەی گشتی. بە هاتنی ساڵی ١٩٩٢، جیلی (لەدایکبوونی بەرفراوان) و لاوان بەشێکی گەورەی دەنگدەرانیان پێکهێنا. کلینتن بایی پێویست زیرەک بوو

که له سیاسەتی دەرەوەدا تواناکانی باوکم کۆنترۆڵ بکات. ئەوان بە شێوەیەکی سروشتی بەکێش دەبن بۆ پشتگیریکردنی کەسێکی جیلی خۆیان. ئەو ناجێگیریی ئابووری لە وڵاتدا ناسییەوە و پەیامێکی بەدیسپلینی ئاراستە کرد: "ئابوورییە، گەمژە".

لە تەواوی ساڵی هەڵبژاردندا، من لە نزیک باوکم مامەوە. بە هاتنی سەرەتاکانی هاوینی ١٩٩٢، هەڵمەتەکە نەکەوتبووە سەر سکە. بە باوکم وت کە پێویستە بیر لە جوڵەیەکی بوێرانە بکاتەوە بۆ هێنانەلەرزەی داینامیکی پێشبڕکێکە. یەکێك لە شیمانەکان بریتی بوو لە جێگۆڕکێپێکردنی جێگری سەرۆك (دان کوایل) کە من ڕێزم لێدەگرت و کەیفم پێی دەهات، بە هاوەڵێکی تر. پێشنیاریم کرد کە (دیك چینی)ی وەزیری بەرگری لەبەرچاو بگرێت. دیك وریا، جددی و بەئەزموون و سەرسەخت بوو. ئەو کارێکی مەزنی ئەنجام دا بوو لە سەرپەرشتیکردنی سوپا لە ماوەی رزگارکردنی پاناما و جەنگی کەنداودا. باوکم وتی نا، پێی وابوو ئەو کردارە نائومێدانە دیارە و (دان)یش ئیحراج دەبێت. لەلایەکی ترەوە، پێم وانییە کە باوکم بە دیاریکردنی کەسێکی تر وەکو هاوەڵی پالاوتن، ئەنجامێکی باشتری هەبووایە. بەڵام من هەرگیز بە تەواوی وازم لە بیرۆکەی لیستی بوش-چینی نەهێنا.

تاکە گۆڕانکارییەك کە باوکم ئەنجامیدا گەڕاندنەوەی وەزیری دەرەوە جەیمز بەیکەر بوو بۆ کۆشکی سپی وەکو سەرۆکی ستاف. هەڵمەتەکە بەهۆی بەیکەرەوە زۆر هەموارتر بەڕێوەچوو. دەنگدەران تەرکیزیان خستبووە سەر بوش لە بەرانبەر کلینتندا. دەنگەکان بەرتەسك بوونەوە. پاشان چوار ڕۆژ پێش هەڵبژاردن، (لۆرێنس وَلش) ئەو دادوەرەی کە لە فەزیحەی (ئێران کۆنترا)ی ئیدارەی ریگن-ی دەکۆڵییەوە، تۆمەتێکی خستەپاڵ وەزیری بەرگریی پێشوو (کاسپار واینبێرگەر). تۆمەتەکە هەواڵەکانی داگیر کرد و هێزی لەبەر هەڵمەتەکە بڕی. پارێزەری دیموکرات (رۆبەرت بێنێت) کە نوێنەرایەتی (کاسپار)ی دەکرد، دواتر تۆمەتەکەی وەها ناودێر

کرد "یەکێك لە خراپ بەکاربردنە هەرە گەورەکانی دەسەڵاتی دادوەری کە من تاوەکو ئێستا رووبەرووی بوومبێتەوە". ئەمەش پەیوەندی هەبوو بە سەربەخۆیی دەستەی سەربەخۆی دادوەران.

لە دوایین رۆژەکانی بەر لە هەڵبژاردن، (مارڤین)ی برام پێشنیاری ئەوەی کرد کە لە هەڵمەتەکەدا بم لەگەڵ باوکم بۆئەوەی مەعنەویاتی بەرز بێت. رازی بووم، هەرچەندە لە میزاجێکی باشدا نەبووم. بەتایبەت بە گروپەکانی چاپەمەنی بێزار ببووم کە پێم وابوو ئیش بۆ بیل کلینتن دەکەن. لە یەکێك لە دوایین وێستگەکانی هەڵمەتەکەدا، دوو ریپۆرتەری رۆژنامەوانی لە نزیك پلیکانەکانی (هێزی ئاسمانی یەك) لێم نزیك بوونەوە. ئەوان لەبارە فەزای ناو فڕۆکەکە پرسیاریان کرد. وەڵامێکی سیاسیی زیرەکانە ئەوە بوو کە شتێکی ئاسایی وەکو "هەست دەکات ئەم گردەی قابیلی پیا سەرکەوتنە" بڵێم. لەبری ئەوە سارد بوومەوە. بە ریپۆرتەرەکانم وت پێم وایە بابەتەکانتان لایەنگیری تێدایە. تۆنی دەنگم توند بوو و رەق بووم. ئەمە تاکە لەدەمدەرچوونی تورەی من نەبوو لە هەڵمەتەکەدا. لەناو گروپەکانی چاپەمەنیدا ناوم بەوە رۆیشتبوو کە هەڵچووم، و من شایستەی ئەوە بووم. ئەوەی کە راگەیاندنەکان لێی تێنەگەیشتن، ئەوە بوو کە تەقینەوەکانم، خۆشەویستی پاڵنەریان بوو، نەك سیاسەت. شەوی هەڵبژاردن هات و باوکم نەیبردەوە. بیل کلینتن ٤٣,٠٪ی دەنگەکانی بردەوە. باوکم ٣٧,٤٪ی دەنگەکانی هێنا. رۆس پێرۆت ١٨,٩٪ی هینا، لەوانەش ئەو ملیۆنان دەنگەی کە بە پێچەوانەوە بۆ جۆرج بوش دەچوون. باوکم بە شکۆیەکی تایبەتمەندەوە رووبەرووی شکست بووەوە. ئەو لە سەروبەری ئێوارەدا تەلەفۆنی بۆ بیل کرد بۆ پیرۆزبایی و بنەمای بۆ یەکێك لە دۆستایەتییە نامومکینەکان دانا لە مێژووی سیاسیی ئەمریکادا.

باوکم وەکو کەسێکی لەسەرخۆ پەروەردە ببوو. ئەو سەرزەنشتی کەسی نەکرد، تورە نەبوو. بەڵام دەمزانی کە ئازار دەچێژێت. تەواوی شتەکە ئەزموونێکی ناخۆش

بوو. بینینی ئەوەی کە پیاوێکی باش دەدۆڕێت، ١٩٩٢ی کرد بە خراپترین ساڵەکانی ژیانم.

بەیانیی دوای هەڵبژاردن، دایکم وتی " باشە ئێستا ئەوەمان تێپەڕاند. ئێستا کاتی بەرەوپێشچوونە" . خۆشبەختانە بۆ من، وەرزی بەیسبۆڵ هەرگیز دوور نەبوو. لە هەمان کاتدا، من مەشقم کردبوو بۆ ماراسۆنی هوستن کە تیایدا من لە ڕێکەوتی ٢٤ی کانوونی دووەمی ١٩٩٣دا ڕاکردنم ئەنجامدا- چوار ڕۆژ دوای ئەوەی کە باوکم ئۆفیسی جێ هێشتبوو.

من لە هەنگاونانی ٨:٣٣ لە مایلێکدا بووم کە بەلای کەنیسەی دایک و باوکمدا ڕەتبووم لە دەوروبەری مایلی نۆزدەیەم. ئامادەبوونی ٩:٣٠ی بەیانی تازە تەواو ببوو و خێزانەکەمان لە لێواری ڕێگاکە کۆ ببوونەوە. من هەنگاوەکانم کەمێك گەورە کردن بۆئەوەی بگەمە سەکۆیەکە. باوکم بە شێوازە تایبەتەکەی خۆی هانیدام. هاواری کرد "ئەمە کوڕەکەمە!" دایکم بۆچوونێکی جیاوازی هەبوو. هاواری کرد "بەردەوام بە لە ڕۆیشتن، جۆرج! هەندێ خەڵکی قەڵەوە لەپێشتەوەن!" من بە سێ سەعات و چل و چوار خولەك تەواوم کرد. لە هێڵی تەواوبوونی ماراسۆنەکە هەستم کرد دە ساڵ گەنجترم و ڕۆژێك دواتر هەستم کرد دەساڵ بەتەمەنترم.

***

ڕێك وەکو ئەو جارەی کە بۆ پاککردنەوەی جەستم لە کحول ڕامکردبوو، ماراسۆنەکە یارمەتیدەر بوو بۆئەوەی ئەو نائومێدییە لە خۆم دەربکەم کە لە ١٩٩٢دا هەستم پێکردبوو. لەکاتێکدا کە ئازارەکە دەستی بە نەمان کرد، هەستێکی نوێ شوێنی گرتەوە: جارێکی ترئەنگێزەی خۆپاڵاوتن بۆ ئۆفیس.

پەیتا پەیتا دەستم پێکرد. کاتێك من و لۆرا لە ١٩٨٨دا گەڕاینەوە بۆ تەکساس، من زیاتر ئاگادار بووم لەو تەحەدییانەی ڕووبەڕووی ویلایەتەکە دەبوونەوە. سیستەمی پەروەردەییمان لە کێشەدا بوو. ئەو منداڵانەی کە نەیاندەتوانی

بخوێننەوە یان ماتماتیك فێربن، بەناو سیستەمەکەدا دەبردران بەبێ ئەوەی کەسێك زەحمەتی ئەوە بکێشێ پرسیار بکات ئاخۆ چی یان هیچ فێربوون.

کەش و هەوای یاسایی لە ویلایەتەکەماندا، نوکتەیەکی نیشتمانی بوو. پارێزەرانی برینی کەسیی تەکساس حوکمی دادوەریی گەورە گەورەیان تۆمار دەکرد و ئیش و کاریان دەردەپەڕاندە دەرەوەی ویلایەت. تاوانی لاوان لەزیادبووندا بوو. منیش نیگەرانی کەلتوورێکی "هەستێکی خۆش دەبەخشێت، بیکە" و "ئەگەر کێشەیەکت هەیە سەرزەنشتی کەسێکی تر بکە" بووم.

قازانجەکانی ئەو ئاراستەیە کێشەخولقێن بوون. منداڵێکی زۆر لە دەرەوەی پەیوەندیدا لەدایك دەبوون. باوکانێکی زۆر لەدەست بەرپرسیارێتییەکانیان رایان دەکرد. پشت بەستن بە خۆشگوزەرانی شوێنی پاڵنەر بۆ کارکردنی دەگرتەوە.

ئەزموونەکانم لە هەڵمەتەکانی باوکمدا و بەڕێوەبردنی (رەینجەرز)، شارەزاییەتییەکانی منی لە سیاسەت، بەڕێوەبردن و اتصالدا قووڵ کردبووەوە. هاوسەرگیری و خێزان روانگەکانی منی فراوان کردبوو. باوکیشم ئێستا لە سیاسەت چووبووە دەرەوە. نائومێدیی سەرەتاییم لە دۆڕاندنەکەی ئەو، رێگەی خۆش کرد بۆ هەستێکی ئازادبوون. دەمتووانی سیاسەت دابڕێژم بەبێ بەرگری کردن لەوانەی ئەو. پێویست نەبوو کە نیگەرانی ئەوە بم بڕیارەکانم دابڕانن لە سەرۆکایەتییەکەی ئەو. من سەربەست بووم کە بەتەنیا خۆم کاندید بکەم.

من لەناو خێزانەکەمدا تاکەکەس نەبووم کە گەیشتمە ئەو دەرەنجامە. لە بەهاری ١٩٩٣دا، جێب پێی وتم کە بەجددی خۆی بۆ حاکمی فلۆریدا دەپاڵێوێت. بە شێوەیەکی پلارئامێز، شکستی باوکم بەرپرس بوو لە دەرفەتی هەردووکمان. ئەوەی کە یەکەم جار وەکو کۆتاییەکی خەمگین بۆ چیرۆکێکی مەزن دیار بوو، ئێستا وەکو دەستپێکی دوو ژیانی نائیحتیمالی دەردەکەوت. ئەگەر باوکم لە

١٩٩٢دا بیبردایەتەوە، گومانم هەیە لەوەی کە لە ١٩٩٤دا خۆم بۆ ئۆفیس کاندید بکردایە و بەدڵنیاییەوە نەدەبووم بە سەرۆک.

پرسیاری گەورە ئەوە بوو کە چۆن بچمە ناوەوە. داوای ئامۆژگاریم لە هاوڕێیەکی نزیک کرد، ستراتیژیستی سیاسی، کارل رۆڤ. بۆ یەکەم جار کارل-م لە ١٩٧٣دا ناسی، کاتێك باوکم سەرۆکی کۆمیتەی نیشتمانیی کۆمارییەکان بوو و کارل-یش سەرۆکی رێکخراوی خوێندکاریی کۆمارییەکان بوو. من پێم وابوو ئەو دەبێتە یەکێکی تر لەو جۆرە سیاسیەکانی زانکۆ کە لە یەلّ ساردیان کردبوومەوە. بە زوویی زانیم کە کارل جیاوازە. ئەو لەخۆڕازی و خۆ بەڕاست زان نەبوو و بەدڵنیاییشەوە نموونەی کامپەینەرێکی لەسەرخۆ نەبوو. کارل وەکو زانایەکی سیاسی شێت وابوو-رووناکبیر، سوعبەتچی و لێوانلێو لە وزە و ئایدیا.

کەس ناناسم کە ئەوەندەی کارل مێژووی خوێندبێتەوە یان هەرس کردبێت. ئەمە بە دڵنیاییەوە دەڵێم، چونکە من هەوڵمداوە خۆمی پێبگەیەنمەوە. باری ناوەختم ئەدایە پێشەوە. پاشان کارل بەوە تۆمەتباری دەکردم کە کەلکێکی ناعادیلانە وەردەگرم لەڕێگەی هەڵبژاردنی بەرهەمە کورتترەکان. لەو کاتە بەدواوە، ئێمە نەك تەنیا ژمارەی کتێبی خوێندراوەمان پێوانە دەکرد، بەڵکو بەهەمان شێوە ژمارەی لاپەڕەکانیشمان دەژمارد. تاوەکو کۆتایی ساڵ، هاوڕێکەم لەهەموو پۆلێنەکاندا من داپۆشی.

کارل نەك تەنیا مەعریفەی کۆدەکردەوە، بەڵکو بەکاریشی دەهێنا. ئەو توێژینەوەی کردبوو لە ستراتیژی هەڵبژاردنی (ویلیام مکینلی) لە ١٨٩٦دا. لە ١٩٩٩دا، ئەو پێشنیاری کرد کە من هەمان هەڵمەتی هەیوانی پێشەوە رێك بخەم. دەرکەوت کە شێوازێکی کاریگەر و ژیرانەیە. پەشیمانم لەوەی کە لەماوەی خۆکاندیدکردنندا بۆ کۆنگرێس لە ١٩٧٨دا، لەگەڵ کارلدا ئیشم نەکرد. جارێکی تر ئەو هەڵەیەم ئەنجام نەدایەوە.

لە ساڵی ١٩٩٣، من و کارل هەردووکمان دەرفەتێکی سیاسیمان بینی. ژێربی باو ئەوە بوو کە حاکمی تەکساس (ئان ریچاردز) گرەنتی هەڵبژێردرانەوەی لە مانگی نۆڤەمبەری دواتردا پێدرابوو. وەکو یەکەمین حاکمی ژنی تەکساس لە ١٩٣٠یەکانەوە، ئان ریچاردز سیاسییەکی پێشەنگ بوو. ئەو پەیڕەوانێکی زۆری هەبوو لەناو دیموکراتە نیشتمانییەکاندا و زۆرێك بڕوایان وابوو کە لەوانەیە ڕۆژێك لە ڕۆژان ببێتە سەرۆك یان جێگر سەرۆك.

هەمووان دەیانگوت حاکم جەماوەری هەیە، بەڵام من و کارل پێمان وانەبوو کە لە ڕاستیدا دەسکەوتی زۆری هەبووبێت. کارل شیکردنەوەی خۆی پیشاندام لەبارەی ئەمەی کە زۆرێك لە تەکساسییەکان-تەنانەت هەندێ لە دیموکراتەکانیش- کراوە دەبن لە بەرانبەر هەر کاندیدێکدا کە بەرنامەیەکی جددی هەبێت بۆ باشکردنی ویلایەتەکە. ئەمە کتومت ئەو شتە بوو کە لە مێشکمدا بوو.

لە هەڵبژاردنی بێ وێنەی بەهاری ١٩٩٣دا، حاکم ریچاردز ڕێوشوێنێکی تەمویلکردنی قوتابخانەی خستە دەنگدانەوە. پلانەکەی بریتی بوو لە دابەشکردنەوەی پارە لە ناوچە دەوڵەمەندەکانەوە بۆ ناوچە هەژارەکان، بۆیە بە شێوەیەکی گاڵتەئامێز بە "ڕۆبن هود" ناوزەد کرا. دەنگدەران بە ڕێژەیەکی بەرچاو شکستیان پێهێنا. لەکاتێکدا کە ئەو شەوە من و لۆرا تەماشای ئەنجامەکانی هەڵبژاردنمان دەکرد، گوێبیستی گفتوگۆیەك بووین لەگەڵ ئان ریچاردز. ئەو نائومێد بوو بەهۆی شکستپێهێنانی ڕێوشوێنی تەمویلکردنی قوتابخانە و بەشێوەیەکی تەنزئامێز گووتی، "کوڕە، ئێمە هەموومان بە تامەزرۆییەوە چاوەڕێی هەر بیرۆکە و پێشنیارێك دەکەین کە واقیعی بێ". من رووم کردە لۆرا و وتم "من پێشنیارێکم هەیە. لەوانەیە خۆم بۆ حاکمی بپاڵێوم". ئەو بە جۆرێك تەماشای کردم وەك ئەوەی شێت بم. پرسیاری کرد "چییە سوعبەت دەکەی؟". من وەڵامم دایەوە "ڕاست دەکەی". ئێمە لە دالاس زۆر ئاسودە بووین. حەزم لە ئیشەکەم بوو لەگەڵ

(ڕەینجەرز). کچەکانمان لە گەشەدابوون. لەگەڵ ئەوەشدا جارێکی تر مێرووی سیاسەت لێیدابوومەوە و هەردووکیشمان ئەوەمان دەزانی.

***

کاتێك پێشبڕکێکی حاکمیم دەهێنایە بەرباس، هەمیشە هەمان شتم گوێ لێدەبووەوە: "بە دڵنیاییەوە ئان ریچاردز جەماوەری هەیە". من داوای ئامۆژگاریم لە هەندێ لە ستراتیژیستە سیاسیەکانی پێشووی باوکم کرد. بەڕێزەوە پێشنیاری ئەوەیان کرد کو چەند ساڵێك راوەستم. کاتێك بڕیارمدا لەسەر ئەوەی کە خۆم کاندید دەکەم، وەڵامی دایکم لە شوێنی خۆیدا بوو: "جۆرج، تۆ ناتوانی بیبەیتەوە".

هەواڵی خۆش ئەوە بوو کە کێڵگەی کۆماری تەواو کراوە بوو. کەس نەیدەویست تەحەدای ریچاردز بکات، بۆیە توانیم دەستبەجێ سەرنجی خۆم بدەمە هەڵبژاردنی گشتی. بە دانانی روئیایەکی گەشبینانەی دیاریکراو بۆ ویلایەتەکە، ئاراستەیەکی مەنهەجیم بەکارهێنا. تەرکیزم خستە سەر چوار پرسی کارنامە: پەروەردە، دادپەروەریی لاوان، ریفۆرمی خۆشگوزەرانی و ریفۆرمی زیانگەیاندن.

ئێمە تیمێکی هەڵمەتی شارەزا و بەتوانامان کۆکردەوە. من بە شێوەیەکی تایبەت دوو کەسی گرنگم دامەزراند. یەکەمیان (جۆ ئالبۆ) بوو، کە پیاوێکی بەسامی شەش پێ و چوار ئینچی سەر تەخت بوو و رەقیبی مەشق بوو کە وەکو سەرۆکی ستافی حاکمی (ئۆکلاهۆما) هێنری بێلمۆن خزمەتی کردبوو. من جۆ-م هێنایە ناوەوە بۆ ئەوەی هەڵمەتەکە بەڕێوە ببات و کارێکی بێ وێنەی بەڕێوەبردنی رێکخراوەکەی ئەنجام دا. ئێمە بەهەمان شێوە، بەڕێوەبەرێکی نوێی اتصالات (کارێن هیوگز)مان دامەزراند. من بۆ یەکەم جار (کارێن)م لە کۆنفرانسی ویلایەتی حزب لە ۱۹۹۰دا ناسی. بە مەبەستەوە وتی "لە ئەرکەکانت ئاگادارت دەکەمەوە". ئەو دواتر فرمانەکانی جموجۆڵی ئاراستە دەکرد. هیچ گومانێك نەبوو لەوەی کە ئەم

ژنە بەرپرس بوو. کاتێك پێی وتم کە باوکی ژنەرەاڵێکی دوو ئەستێرەیە، مانایەکی تەواو بەخشی.

پاش کۆنفرانس لە پەیوەندیدا مامەوە لەگەڵ کارێن-دا. ئەو کەسایەتییەکی گەرم و گوڕ و چاوکراوە و پێکەنینێکی گەورەی هەبوو. وەکو پەیامنێرێکی پێشووی تەلەڤزیۆن، ئەو میدیای دەناسی و دەیزانی چۆن دەستەواژەیەك هەڵگێڕێتەوە. نیشانەیەکی باش بوو کاتێك هات وتاری ڕاگەیاندنەکەی لە پاییزی ١٩٩٣دا من ببیستێت. ناسینەوەی ئەو ئاسان بوو، چونکە کوڕەکەی، (ڕۆبەرت)، لەسەر شانەکانی دادەنیشت. کارێن لە جۆرە کەسانی پەسەندی من بوو- واتە لەوانەی کە خێزانی لە پلەی یەکەمدا دادەنا. ئەو ڕۆژەی کە لەگەڵ هەڵمەتەکەدا واژۆی کرد، یەکێك بوو لە باشترین ڕۆژەکانی ژیانی سیاسیم.

لەکاتێکدا کە هەڵمەتەکەم دەستی کرد بە بەرهەمهێنانی تامەزرۆیی، میدیای هەواڵی نیشتمانیش، بایەخی دا. ڕیپۆرتەرەکان ناوبانگی هەڵچوونی منیان دەزانی و مشتومڕێك لەئارادا بوو لەمەڕ ئەوەی کە چ کاتێك دەتەقمەوە. ئان ڕیچاردز ئەوپەڕی هەوڵی خۆیدا تا بمخاتە داوەوە. ئەو منی بە "ئەحۆلێك" و "نەمام" ناو دەبرد، بەڵام من لەگەڵ ئەوەدا نەبووم قسە فڕێ بدەم. زۆربەی خەڵکی نەیانتووانی لەوە تێبگەن کە جیاوازییەکی هەیە لەنێوان هەڵمەتەکانی من ئەوانەی باوکمدا. وەکو کوڕی کاندیدێك، سۆزاوی دەبووم و بەرگریم لە جۆرج بوش دەکرد باجەکەی هەرچییەك بووایە. خۆم وەکو کاندیدێك، دەمزانی کە دەبێ سنووری خۆم بزانم و دیسپلینم هەبێ. دەنگدەران سەرکردەیەکیان ناوێت کە لە تووڕەییدا هەڵدەچێت و تۆنی ڕووبەڕووبوونەوە بەلادا دەبات. باشترین پوچکردنەوەی درۆودەلەسەکان، بردنەوەی هەڵبژاردن بوو.

لە ناوەڕاستی مانگی ئۆکتۆبەردا، من و ئان ڕیچاردز بۆ یەکەمین ڕووبەڕووبوونەوەی تەلەڤزیۆنی یەکتریمان بینی. من کتێبەکانی لێدوانم

خوێندبوومەوە و لە گفتوگۆ گاڵتەئامێزەکانیشدا ڕاهێنانم کردبوو. هەفتەیەک پێش شەوی گەورە، وەستاندنی ئامۆژگاریم پەسند. من تێبینی هەندێ لە ئامادەکارییەکانی ڕووبەڕووبوونەوەکەی باوکم کردبوو. دەمزانی کە دەشێ کاندید بە پێشنیارەکانی دوایین خولەک بە ئاسانی سەری لێبشێوێت. قسە نەستەقە دڵخوازەکەی من بریتی بوو لە "تەنیا خۆت بە". بە ڕاستیە، فرمانی ئەوەم کرد کە هەموو ئامۆژگارییەکانی ڕووبەڕووبوونەوەکە لە فلتەری کارێن بدرێن. ئەگەر پێی وابوو جەوهەرین، ئەوا با تێیان پەڕێنێت. بە پێچەوانەوە، هۆشم بە ڕوونی و تەرکیز رادەگرت.

لە شەوی ڕووبەڕووبوونەوەکدا، من و کارێن لەناو مەسعەدەکەدا بووین کە ئان ریچاردز هاتە ناوەوە. من تەوقەم لەگەڵ کرد و وتم "بەختێکی باش، حاکم". لە توندترین دەنگی هێمنیدا وتی "ئەمە بۆ تۆ سەخت دەبێت، کوڕە". ئەمەیان وەهماندنی کلاسیک بوو. بەڵام کاریگەرییەکەی پێچەوانە بوو لەگەڵ ئەوەی مەبەستی بوو. ئەگەر حاکم نیازی بووبێت بمترسێنێت، پێم وابوو کە دەبێ هەست بە نائارامی بکات. خەندەیەکی گەورەم پێبەخشی و ڕووبەڕووبوونەوەکە بە باشی بەڕێوەچوو. بایی پێویست سیاسەتم بینیبوو تا بزانم کە تۆ بە ڕاستی ناتوانی ڕووبەڕووبوونەوەکە ببەیتەوە. تۆ تەنیا دەتوانی بدۆڕێیت بە درکاندنی شتێکی گەمژانە یان دەرکەوتن بە تەمبەڵی یان شڵەژانەوە. لەم حاڵەتەدا، من نە بێتاقەت و نە شڵەژاو بووم. من قسەکانی خۆم بە بڕوابەخۆبوونەوە کردن و خۆم لە هەر بەهەڵەداچوونێک لادا.

هەروەکو پێشوو، هەفتەکانی کۆتایی هەندێ مفاجەئەیان هێنا. ڕۆس پێرۆت هاتە ناو پێشبڕکێکەوە بۆ پاڵپشتیکردنی ئان ریچاردز. ئەمە منی بێزار نەکرد. من هەمیشە بڕوام وابووە کە پاڵپشتیکردنەکان لە سیاسەتدا موبالەغەیان پێوەکراوە. بە دەگمەن سوودیان هەیە و هەندێ جار ئازاربەخشن. من بە ریپۆرتەرێکم وت، "

ڕۆس پیرۆتی پیرۆز بێت. من نۆلان ریانی بەیسبۆڵ و باربارا بوشم دەوێت". من ئەوەم نەدرکاند کە دایکم هێشتا پێی وانییە دەبەمەوە.

کاتێک ئەنجامەکان لە شەوی هەڵبژاردندا دەرکەوتن، خەنی بووم لە خۆشیا. ئێمە لە شتێکدا سەرکەوتین کە رۆژنامەی (دالاس مۆرنینگ نییوز) پێی دەوت "جارێك لە جاران قابیلی بیرلێکردنەوە نەبوو". (نیویۆرك تایمز) نووسیبووی "هەژانێکی سەرسوڕهێن". باوکم لە (ئۆستن ماریۆت) تەلەفۆنی بۆ کردم و وتی "جۆرج پیرۆز بێ لێت ئەو بردنەوە گەورەیە، بەڵام پێدەچێت جێب بیدۆڕێنێت". هەستێکی ناخۆشم لا دروست بوو بۆ براکەم کە خۆی زۆر ماندوو کردبوو و شایستەی بردنەوە بوو. بەڵام هیچ شتێك نەیتووانی ئەو خۆشییەم تاریك بکات کە هەستم پێکرد کاتێك چووم بۆ هۆڵی (ماریۆت) بۆئەوەی وتاری سەرکەوتنم پێشکەش بکەم.

***

بەرواری دەستبەکاربوون، ١٧ی کانوونی دووەمی ١٩٩٥ بوو. لەکاتێکدا کە لە ژووری هۆتێلەکە بەر لە مەراسیمەکە خۆم ئامادە دەکرد، دایکم زەرفێکی نامەی دایە دەستم. دوو دەگمەی سەردەستەی چاکەت و نامەیەکی باوکمی تێدا بوو:

*ئازیزم جۆرج*

"ئەم دووگمەی سەردەستانە شمەکی هەرە بەهاداری منن. ئەمانە لە بەرواری ٩ حوزەیرانی ١٩٤٣دا دایك و باوکم پێیاندام کاتێك لە (کۆرپەس کریسیتی) توانیم لە هێزی دەریایی فڕۆکەوانی بکەم. دەمەوێ ئێستا هی تۆ بن، چونکە، لە مانایەکدا، هەرچەندە تۆ توانیت لە هێزی ئاسمانی ببیتە فڕۆکەوان و ئەو فڕۆکەوانیی ئەو جێتانە بکەیت، ئەوا جارێکی تر "ئەتوانی بفڕیت" لەکاتێکدا کە سوێندی حاکمیی ئێمە ئەخۆیت".

ئەو نووسی کە چەندە فەخر دەکات و ئەمەی کە چۆن دەتوانم هەمیشە متمانە بە خۆشەویستی ئەو و دایکم بکەم. لە کۆتاییدا نووسیبووی:

"تۆ زۆر لەوە زیاترت بە ئێمە داوە کە تاوەکو ئێستا شایستەی بووین. تۆ قوربانیت بۆ ئێمە کرد. تۆ وەفا و دڵسۆزی لەبنەهاتووی خۆتت بە ئێمەداوە. ئێستاش نۆرەی ئێمەیە".

باوکم لەو جۆرە کەسانە نییە کە شتێکی وەها بەشێوەیەکی کەسی بڵێت. تێبینییە دەستنووسەکە ستایلی خۆی بوو وشەکانی مانایەکی زۆریان هەبوو. ئەو بەیانییە هەستم بە پەیوەندییەکی بەهێز کرد بە نەریتی خێزانیی ئەو خزمەتکردنەی کە من ئێستا بە شێوازی خۆم لەسەری بەردەوام دەبووم.

***

وەکو حاکم، پێویستم بەوە نەبوو کە پلانی ئەجێنداکەم دابنێم. دوایین ساڵم لەوەدا بەسەر برد کە بە هەمووان بڵێم کتومت دەمەوێ چی بەدی بێنم.

هەمیشە باوەڕم وابووە کە بەرنامەی هەڵمەت تەنیا ئەو شتە نییە کە تۆ بەکاری دەهێنیت بۆئەوەی هەڵبژێردرێیت. بەڵکو پلانێکە بۆئەوەی کە تۆ لە ئۆفیسدا ئەنجامی دەدەیت.

من هۆکارێکی ترم هەبوو بۆئەوەی بە خێرایی بەرەوپێش بچم. لە تەکساس، دەستەی یاسادانانبە دووو ساڵ جارێك تەنیا ١٤٠ جار کۆدەبێتەوە. ئامانجم ئەوە بوو کە هەر چوار دەستپێشخەریی ناو بەرنامەکەم بە یەك دانیشتن لە هەردوو ئەنجومەنەکە تێپەڕێنم.

بۆئەوەی ئەمە رووبدات، پێویستم بە پەیوەندیی باش هەبوو لەگەڵ دەستەی یاسادانانددا. ئەمەش بە یاریدەدەری حاکم دەست پێدەکات کە وەکو سەرۆکی ئەنجومەنی پیران لە ویلایەتەکەدا، خزمەت دەکات لیژنەکان پڕ دەکاتەوە و بڕیار لەسەر پرۆژەیاساکان دەدات. یاریدەدەری حاکم بە شێوەیەکی جیا لە حاکم هەڵدەبژێردرێت، بەو مانایەی کە دەشێت ئەو دوو بەرپرسە گەورەیە لە دوو حزبە دژیەکە بن– هەروەکو من و یاریدەدەری حاکم، بۆب بولۆك وەها بووین.

بولۆك ئەفسانەیەك بوو لە سیاسەتی تەکساسدا. ئەو بۆ ماوەی شانزە ساڵ لە پۆستی بەهێزی کۆنترۆڵکەری ویلایەت کاری کردبوو بەرلەوەی لە ١٩٩٠دا بۆ پۆستی یاریدەدەری حاکم هەڵبژێردرێت. ئەو بە مەچەکێکی زۆر بەهێزەوە خۆی بۆ ئەنجومەنی پیران کاندید

کرد. هەروەها کارمەند و هاوڕێی پێشووی هەبوون کە لە ئاژانسە جیاجیاکانی حکومەتدا شوێنیان گرتبوو کە وایلێکردبوو زۆر بەئاگا بێت.

بولۆک توانای ئەوەی هەبوو کە ژیانم ناخۆ بکات. لەلایەکی ترەوە، ئەگەر بمتوانیایە رازی بکەم کارم لەگەڵ بکات، ئەوا دەبووە هاوپەیمانێکی بەهادار.

چەند هەفتەیەک بەر لە هەڵبژاردن، جۆ ئاڵبۆ پێشنیاری ئەوەی کردبوو کە بە نهێنی لەگەڵ بولۆک دابنیشم. لە پاشنیوەڕۆیەکی هێمندا دزەم کرد و فڕیم بۆ ئۆستن. هاوسەرەکەی بولۆک، (جان)، دەرگای کردەوە. ئەو ژنێکی جوانە بە خەندەیەکی گەرم و گوڕەوە. پاشان بولۆک دەرکەوت. ئەو پیاوێکی بەهێز بوو بە ڕواڵەتێکی دنیادیدەوە. ئەو پێنج جار هاوسەرگیری لەگەڵ چوار ژندا کردبوو. جان دوایین ژن و خۆشەویستی ژیانی بوو. تەنیا یەک جار لەگەڵ ئەو هاوسەرگیری کردبوو. جارێک لە جاران، بولۆک مەشروبخۆرێکی سەرسەخت بوو. لە بەسەرهاتێکی بەناوبانگدا، ئەو سەرخۆش بووە و بە چەکەکەی تەقەی لە تەوالێتەکانی میزکردن کردووە. بە بێ پچڕان جگەرەی کێشاوە، سەرباری ئەو ڕاستییەی کە بەشێکی سییەکانی لەدەستداوە. ئەو لەو جۆرە پیاوانە بوو کە ژیانی، بە شێوازە سەختەکەی بردبووە سەر. دەستی هێنایە پێشەوە و وتی، "من بولۆکم. وەرە ژوورەوە". بردمی بۆ ژووری نووسینگەکەی. شوێنەکە لە کتێبخانەیەکی لێکۆڵینەوە دەچوو. چەندەها بەستەی دۆکیومێنت، ڕاپۆرت و داتای دانابوو. بولۆک فایلێکی قەبەی لەسەر مێزەکە لەبەردەم من دانا و وتی "ئەوەش ڕاپۆرتێک لەسەر دادپەروەریی لاوان". ئەو دەیزانی کە هەڵمەتەکەی من بەشێکی لەسەر ریفۆرمی دادپەروەریی لاوان بوو و پێشنیاری کرد کە بیر لە هەندێ لە ئایدیاکانی بکەوە. پاشان چەندە ڕاپۆرتی هاوشێوەی بۆ ریفۆرمی پەروەردە و خۆشگوزەرانی هێنایە دەرەوە. ئێمە بۆ سێ تا چوار سەعات قسەمان کرد. بولۆک پشتگیری لە ئان ریچاردز کردبوو، بەڵام ڕوونی کردەوە کە ئەگەر من دەرچم ئەوا پشتیوانیم دەکات.

یاریکەرە سەرەکییەکەی تر وتەبێژی ئەنجومەنی نوێنەران، (پیت لانی) بوو. وەکو من، پیت خەڵکی خۆرئاوای تەکساس بوو. ئەو جوتیارێکی لۆکەی (هەیڵ سێنتەر) بوو کە شارۆچکەیەکی دەشتەکییە لەنێوان (لەبۆک) و (ئاماریلۆ) کە من لە هەڵمەتی ١٩٧٨دا

بۆی چووبووم. پیت کابرایەکی زۆر بەرچاو نەبوو. کەچی بولۆک نیازی بوو کارتەکانی پیشان بدات– و ناویەناویش هەموو کارتەکانی بەسەردا هەڵدەدایت– لانی دەستی بە کڵاوەکەیەوە گرتبوو با نەیبات. ئەو دیموکراتێک بوو کە هاوپەیمانی لە هەردوو لا هەبوو.

ماوەیەکی کورت دوای ئەوەی کە ئۆفیسەکەم وەرگرت، من و بۆب و پیت رازی بووین لەسەر ئەوەی کە هەفتانە پێکەوە ژەمێکی بەیانی بخۆین. سەرەتا ژەمەکان دەرفەتێک بوون بۆ ئاڵوگۆڕی بەسەرهات و یارمەتیدانی من بۆ زانین لەبارەی دەستەی یاسادانانەوە. هەر کە پرۆژەیاساکان دەستیان کرد بە جوڵە بەناو سیستەمەکەدا، ژەمە هەفتەییەکانی بەیانیان بوونە ستراتیژی گرنگی کۆبوونەوەکان. چەند هەفتەیەک پاش دەست بەکاربوونم، بولۆک ژمارەیەک پرۆژە یاسای گرنگی بەرەو ئەنجومەنی پیران جوڵاندبوو. زۆربەیان لە ئەنجومەنی نوێنەران لە چاوەڕوانیدابوون. بولۆک کرداری دەویست و دەیوست لانی–یش ئەمە بزانێ. لەکاتێکدا کە کێکی هێلکە و شیر، پشتەمەزەی هەڵگیراوی بەراز و قاوە دەخواردەوە، پیت بە هێمنییەوە بە یاریدەدەری حاکمی وت کە پرۆژە یاساکان دەگەیەنرێنە شوێنی خۆیان. بولۆک سوور دەبووەوە. ماوەیەکی زۆر پێشتر کوڵابوو. ڕێک چاوەکانی بڕیە من و هاواری کرد "حاکم، شەرت بێ سوارت بم. وات لێبکەم وەکو گەمژە دەربکەویت".

کەمێک بیرم کردەوە، هەستامە سەر پێ، بەرەولای بولۆک چووم و وتم "ئەگەر نیازتە سوارم بی، ئەوا پێویستە یەکەم جار ماچم بدەیەی". بە شێوەیەکی دەستبازییانە لە باوەشم گرت، بەڵام خۆی لە دەستی راپسکاندم و دەرپەڕیە دەرەوە. من و لانی دەستمان کرد بە پێکەنین. ئەمە شێوازی خۆی بوو بۆئەوەی بە لانی بڵێت کە کاتی ئەوە هاتووە پرۆژەیاساکانی لە ئەنجومەنی نوێنەران دەرچن.

ئاخۆ پەیامی بولۆک کاریگەری لەسەر لانی هەبوو یان نا، هەرگیز نازانم. بەڵام بەو فشارەی کە هەرسێکمان دروستمان کردبوو، یاسای پەروەردە، دادپەروەریی لاوان و ریفۆرمی خۆشگوزەرانی بە خێرایی دەچوون بەڕێوە. برگەی هەرە ئاڵۆزی ئەجێنداکە ریفۆرمی زیانگەیاندن بوو. پشکنینی کەیسە یاساییە ترۆهاتەکان زۆر گرنگ بوو بۆ رێگرتن لە کارەکان لەوەی ویلایەت جێ بێڵن. بەڵام دژایەتییەکی گەورە هەبوو لەلایەن

دەستەی پارێزەرانی دادگاییەوە، کە کاریگەر بوو و تەمویلی باش دەکرا. من هاوپەیمانێتیم لەگەڵ (دەیڤد سیبلی)ی هەبوو، کە سیناتۆرێکی کۆماریی ویلایەتەکە بوو لە (واکۆ) و سەرۆکی ئەو کۆمیتەیە بوو کە چاودێریی پرسەکەی دەکرد.

شەوێکیان کە تازەبەتازە ئۆفیسم گرتبووە دەست، بۆ نانی ئێوارە بانگهێشتی دەیڤدم کرد. ئێمە تازە دەستمان کردبوو بە خواردن کە تەلەفۆنێکی لە بولۆکەوە پێگەیشت. من گوێم دەگرت لەکاتێکدا گفتوگۆ یەکسەرەکە دەردەکەوت. دەیڤد سەری دەلەقاند و بە بێدەنگییەکی دەموچاو رەقبووەوە سەرنجی ئەدا لە بارێکدا کە یاریدەدەری حاکم ناخی خۆی هەڵدەرشت. پاشان وتی "ئەوەتا لێرە دانیشتووە. دەتەوێ قسەی لەگەڵ بکەی؟" بولۆک دەیویست شتێ بڵێ. تەلەفۆنەکەم وەرگرت.

بۆچی ریفۆرمی زیانگەیاندن بەربەست دەکەی؟ وامزانی تۆ کێشەت نابێ. بەڵام نا، تۆ حاکمێکی..." بولۆک دوو سێ بۆمبی هاویشت و تەلەفۆنەکەی داخستەوە. دەیڤد دەیزانی چی روویداوە. پێشتر بینیبووی و دڵنیا نەبوو من وەڵامم چۆن دەبێ. من پێکەنیم و پێکەنینەکەم خێراتر کرد. بولۆک سەرسەخت و قسەلەڕوو بوو، بەڵام هەستم کرد کە ئەمە زریانێکی تێپەڕ دەبێ.

هەر کە دەیڤد دەرکی بەوە کرد کە بەرگەری زەربەکە دەگرم، رووومان کردە پرۆژەیاسای زیانگەیاندن. جیاوازیی سەرەکی بڕوڕا لەسەر قەبارەی ئەو پارەیەی کە وەکو قەرەبووی سزایی دەدریت. من لە سنووری ٥٠٠,٠٠٠ دۆلارم ویست، بولۆک ١٠٠٠,٠٠٠ی ویست. دەیڤد پێی وتم ئەگەر بتوانێ رێکەوتن لەسەر ئەم یاسایە بەدەست بێنێت، ئەوا پێنج پرۆژەیاساکەی تری زیانگەیاندن کە بەشێك بوون لە پاکێجی ریفۆرمەکە، بە خێرایی دەجوڵێن.

ئەو پێشنیاری دان وستانێکی کرد: پرۆژەیاسایەك بە ئاستی ٧٥٠,٠٠٠ دۆلارەوە چۆنە؟ گومانی تیا نەبوو کە ئەمە سیستەمەکەی باش دەکرد. رازی بووم. دەیڤد تەلەفۆنی بۆ بولۆک کرد و بەئەنجامگەیشتنەکەی پێ گووت. ئەم تەلەفۆنەیان کورتتر بوو، بەڵام دیسان سیبلی تەلەفۆنەکەی دایەوە دەست من. بولۆک بە شێوازە رەسمییەکەوە دەستی پێکرد "حاکم بوش، تۆ خەریکە دەبیتە حاکمێکی جەهەنەمی. شەو باش".

***

لە ساڵی ١٩٩٦دا، لۆرا تووشی موفاجەئەی کردم بە پەنجاھەمین ساڵیادی لەدایکبوون لە کۆشکی حاکمیدا. ئەو بانگهێشتی خێزان و هاورێیانی کردبوو لە میدلاند، هوستن و دالاس: هاوپۆلەکانی ئاندۆڤەر، یەڵ و هارڤارد و کەسانی سیاسی لە ئۆستن، لەوانەش بولۆک و لانی. لۆرا تاکەکەسێك نەبوو کە موفاجەئەی لە ھەگبەدا بوو. کە رۆژ ئاوا بوو، خواردنەوەی بە خۆشی یەکتری دەستی پێکرد. بولۆك رووی کردە مایکرۆفۆنەکە و بە خەندەیەکەوە وتی "لەدایکبوونت پیرۆز بێت. تۆ حاکمێکی جەھەنەمیت". پاشان بەردەوام بوو و وتی " وە حاکم بوش، تۆ سەرۆکی دواتری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبیت".

پێشگۆییەکەی بولۆك تووشی شۆکی کردم. من تەنیا بۆ ماوەی ھەژدە مانگ حاکم بووم. سەرۆك کلینتن تەنیا لە خولی یەکەمیدا بوو. من لە ١٩٩٨دا بە ئەستەم بیرم لە خۆکاندیدکردنەوە کردبووەوە و لێرەوە بولۆك باسی لە ٢٠٠٠ دەکرد. من زۆر بە جددیم وەرنەگرت، بولۆك ھەمیشە ھەوڵی بابەت وروژاندنی دەدا. بەڵام قسەکەی ئیلھامبەخشی بیرۆکەیەکی بایەخمەند بوو. دە ساڵ زووتر، من بە سەرخۆشی لە برۆدمور ئاھەنگی چل ساڵەی خۆمم دەگێرا. ئێستاش لە سەر فریزی کۆشکی حاکمی تەکساس بە خۆشی من وەکو سەرۆکی دواتر دەخورایەوە. ئەمەیان دەیەیەکی تەواوی بەسەردا تێپەڕیووە.

لە ھەمان کاتدا، ھەڵمەتێکی سەرۆکایەتیی واقیعی لە بەرێوەچووندابوو. حزبی کۆماری، سیناتۆر (بۆب دۆڵ)ی کاندید کردبوو، پاڵەوانێکی دووەم جەنگی جیھانی کە تۆمارێکی یاسادانانی ناسراوەی ھەبوو. من سەرسام بووم بە سیناتۆر دۆڵ پێم وابوو دەبێتە سەرۆکێکی باش و لە تەکساس ھەڵمەتێکی باشم بۆ ئەنجامدا. بەڵام نیگەرانی ئەوە بووم کە حزبەکەمان دانی نەنابێت بە وانەی سیاسەتی جیلیی ١٩٩٢: ھەر کە دەنگدەران سەرۆکێکیان لە جیلی سەردەمی لەدایکبوونی زۆر ھەڵبژارد، ئەوا ئەگەری نەبوو کە پاشگەز ببنەوە. بە دڵنیاییەوە، سیناتۆر دۆل تەکساسی بردەوە، بەڵام سەرۆك کلینتن ھەڵبژاردنەوەی بردەوە.

من بە ھەستێکی ئاسودەییەوەی لەبارەی تۆمارەکەم چوومە ناو ١٩٩٨. من ئاکامی ھەر چوار ئەولەویەتەکەم کە دامنابوون بۆ یەکەمین ھەڵمەتی حاکمایەتیم، بەرجەستە

کردبوو. هەروەها ئێمە گەورەترین کەمکردنەوەی باجمان لە مێژووی تەکساسدا بەئەنجام گەیاندبوو و بۆ منداڵانی (چاودێریی تەبەنی)مان ئاسان کردبوو کە لەلایەن خێزانە دڵسۆزەکانەوە تەبەنی بکرێن. زۆرێك لەم یاسایانە لەلایەن دیموکراتەکانەوە سپۆنسەری و پاڵپشتی دەکران. من هەستم بە ڕێزێکی زۆر کرد کە کاتێك بۆب بولۆك، کە بۆ ماوەی نزیکەی نیو سەدە پشتگیریی کاندیدەکانی دیموکراتەکانی کردبوو، بە ئاشکرا پاڵپشتی هەڵبژێردرانەوەی کردم. هەروەها کەمێك سەرم سوڕما. بولۆك عەرابی منداڵەکانی یەکێك لە نەیارەکانم بوو.

من سوور بووم لەسەر ئەوەی هیچ شتێك ئیهمال نەکەم و بە سەختی هەڵمەتم دەست پێکرد. لە شەوی هەڵبژاردندا، زیاتر لە ٦٨٪ی دەنگەکانم بەدەستهێنا، لەوانەش ٤٩٪ی هیسپانیکەکان، ٢٧٪ی ئەمریکییە ئەفریقییەکان و ٧٠٪ی سەربەخۆکان. من یەکەم حاکمی هەڵبژێردراوی تەکساس بووم کە بۆ خولە چوار ساڵییە یەك لەدوای یەکەکان هەڵبژێردرام.

هەر ئەو شەوە چاوم بڕیبووە پێشبڕکێیەکی تر. جێب بە ڕێژەیەك دەنگی ئاسودەبەخش بوو بە حاکمی فلۆریدا. من لە کانوونی دووەمی ١٩٩٩دا چووم بۆ دەستبەکاربوونەکەی، بەمە دەبووینە یەکەمین دوو برای حاکم لە یەك کاتدا لە سەروەختی نێلسن و وین ڕۆکفێلەرەوە نزیکەی چارەکە سەدەیەك پێشتر. ئەمە چرکەساتێکی بێ وێنە بوو بۆ بنەماڵەکەمان. هەروەها کاتی بیرکردنەوە بوو لە ئاییندە. هەروەها پرسیارێکی گەورە لە مێشکمدا دروست ببوو.

***

خۆکاندیدکردن بۆ سەرۆکایەتی، بڕیارێك بوو کە بەپێی کات گەشەی دەکرد. زۆر کەس پێیان وتم کە خۆم بپاڵێوم- هەندێکیان لەبەرخاتری وڵاتەکەم و هەندێکی تریان لەبەرئەوەی هیوادار بوون پێشبڕکێکە بەرەو شکۆمەندی ببەم. زۆرجار هەمان قسەم گوێ لێ دەبووەوە: "تۆ دەتوانی ببەیتەوە. تۆ دەتوانی ببیتە سەرۆك". من بە ئاسودەبەخشی مجامەلە دەکرام. بەڵام بڕیارم بە قسەی ئەوانیتر کە دەیانوت

دەبیەیتەوە کارتێکراو نەدەبوو. دواجار، هەمووان پێیان وتم کە دەتوانم ئان ریچاردز بیەزێنم.

پرسیاری سەرەکی ئەوە بوو ئاخۆ هەستم بە زەنگەکە دەکرد بۆ خۆکاندید کردن. لەکاتێکدا کە لە بڕیارەکەوە ڕامام، ئاستەنگێک هەبوو. بەهۆی قەبارە و ئالۆزکاویی هەڵمەتی سەرۆکایەتی، دەبێ زووتر پلان دابنێیت، تەنانەت ئەگەر دڵنیاش نەبیت کە خۆت دەپاڵێویت. مۆڵەتم بە کارل دا تا دەست بکات بە ئامادەکردنی ئەوراق و سازدانی تۆڕێک لەو خەڵکەی کە پارەیان کۆدەکردەوە و ئاراستەی ئۆپەراسیۆنی سیاسیی جەماوەرییان وەردەگرت. هەر کە پرۆسەکە دەستی پێکرد، دۆخێکی حەتمیەتی دروست کرد. لە ئۆکتۆبەری ١٩٩٨دا، بە (دەیڤد بڕۆدەر)ی ستوونووسی ڕۆژنامەی (واشنتۆن پۆست)م وت کە هەست دەکەم "پارچە تەبەدۆرێکم لەناو رووبارێکی تیژڕەودا". کاتێک مانگی دواتر خۆهەڵبژاردنەوەم بردەوە، تەوژمەکان تەنانەت توندتر بوون.

من مکوڕ بووم لەسەر ئەوەی کە ڕانەماڵرێم. ئەگەر قەرار وابووایە بچمە ناو پێشبڕکێکەوە، دەبووایە هۆکاری دروستم هەبوونایە. ناتوانم کتومت دیاری بکەم کە کەی بڕیاری خۆمدا، بەڵام بە درێژایی ڕێگاکە چەند چرکەساتێکی روون هەن. یەکێکیان ئەو کاتە بوو کە بۆ دووەمین جار بۆ حاکمی خۆم پاڵاوتەوە. سەر لەبەیانیی مەراسیمەکە، چووینەپاڵ سروتێکەوە لە (یەکەم کەنیسەی میتۆدیستی یەکگرتوو) لە ناوەراستی ئۆستن. من و لۆرا بەرێز (مارک کرەیگ)مان بانگهێشت کردبوو کە هاورێمان و بەرپرسی کەنیسەیەکی دالاس بوو، بۆئەوەی وتارە ئایینییەکە پێشکەش بکات.

بە سەختی هەوڵمدا تا سەرنج بخەمەسەر ڕێورەسمی دەستبەکاربوونەکە، بەڵام نەمتووانی. لەکاتێکدا کە بەرەو کەنیسە رۆیشتین، بە دایکمم وت کە لە ململانێدام بۆ بڕیاری ئەمەی کە ئاخۆ خۆم بۆ سەرۆکایەتی بپاڵێوم.

وتی "جۆرج، بڕۆ. بڕیاری خۆت بدە و بەرەوپێش بڕۆ". ئەمە ئامۆژگارییەکی باش بوو، بەڵام لەو کاتەدا زۆر یارمەتیدەر نەبوو.

پاشان مارک کرەیگ دەستی پێکرد. لە وتارەکەیدا، لەبارەی کتێبی (ئێکسدەز) قسەی کرد، کاتێک خوا بانگەوازی موسا دەکات کە هەنگاو بنێ. کاردانەوەی یەکەمی موسا

بێمتمانەیی بووە: "من کێم تا رووبەرووی فیرعەون بوەستم و ئیسرائلییەکان لە میسر بهێنمە دەرەوە؟" ئەو هەموو پۆزشێکی لە کتێبەکەدا هەبوو. ئەو ژیانێکی نایابی نەبوو، دڵنیا نەبوو ئاخۆ خەڵکی دوای دەکەون، تەنانەت نەیدەتووانی بەو روونییەش قسە بکات. ئەمە کەمێك ئاشنا دیار بوو.

مارك دڵنیاکردنەوەکەی خودای بۆ موسا وەها وەسف کرد کە هێزی ئەوەی دەبێت ئەو ئەرکە جێبەجێ بکات کە بۆی بانگەواز کرابوو. پاشان مارك گردبوونەوەکەی بە هەنگاونان کۆتایی پێ هێنا. ئەو رایگەیاند کە وڵات لەبرسامردووی ئەخلاقی سەرکردایەتییە. وەکو موسا، ئەو گەیشتە دەرەنجامی ئەوەی کە "ئێمە، هەریەکەمان، دەرفەتی ئەوەمان هەیە شتی راست و بۆ هۆکاری راست ئەنجام بدەین".

من بیرم لەوە دەکردەوە کە ئاخۆ ئەمە وەڵامی پرسیارەکەی منە. هیچ دەنگێکی رازئامێز بە گوێیدا نەدەچرپاندم، تەنیا دەنگە تەکساسییە تۆن بەرزەکەی مارك کرەیگ لەسەر سەکۆیەکەوە دەهات. پاشان دایکم لەسەر کورسییەکەیەوە بەرەو پێشەوە چەمایەوە. ئەو سەرنجی منی راکێشا و وتی "ئەو لەگەڵ تۆ قسە دەکات".

پاش سروتەکە، هەستێکی جیاوازم لا دروست بوو. فشارەکە دەرچوو. هەستم بە ئارامییەك کرد.

***

من و لۆرا بۆ ماوەی هەژدە مانگ لە مشتومڕی پێشبڕکێی سەرۆکایەتیدا بووین. لەکاتێکدا کە لەبارەی سلبیات و ئیجابیات قسەم دەکرد، ئەو بڕیاردەری کۆتایی من بوو. هەوڵی نەدەدا تا بە شەڕەدەمە لە پێشبڕکێ بمهێنێتە دەرەوە، نە دەشیویست بمخاتە ناویەوە. بە ئارامییەوە گوێی گرت و راوبۆچوونەکانی خۆی وت. پێم وایە هەمیشە هەستی ئەوەی کردووە کە من خۆم کاندید دەکەم. هەروەکو دەیوت، سیاسەت، بزنسی بنەماڵەکەیە. ئامانجی ئەوە بوو دڵنیا بێتەوە ئاخۆ من لەبەر هۆکار راست، بڕیارم داوە، نەك لەبەرئەوەی ئەوانیتر فشاریان بۆ هێنابم بەشداری پێشبڕکێکە بکەم.

ئەگەر نارازی بووایە، ئەوا پێی دەوتم و منیش خۆم کاندید نەدەکرد. لەکاتێکدا نیگەرانی فشارەکە دەبوو، من وەکو سەرۆك هەستم دەکرد، ئەو گوێبیستی ئومێدەکانی من دەبوو بۆ وڵات و متمانەی ئەوەی هەبوو کە دەتوانم رێبەرایەتی بکەم. شەوێکیان تەنیا خەندەیەکی کرد و وتی "من لەگەڵتام".

کردنەوەی هەواڵەکە لای کچەکان قورستر بوو. باربارا و جێنا حەڤدەساڵان بوون، کە سروشتێکی سەربەخۆیان هەبوو و ئەمەش زۆر باوکیان بیر دەخستمەوە. هەر لە سەرەتاوە داوایان لێکردبووم کە خۆم کاندید نەکەم—هەندێ جار بە گاڵتە و هەندێ جار بە جددی، زۆرجار لە قووڵایی سییەکانیانەوە ئەمەیان دەردەبڕی. یەکێك لەو دێڕانەی زۆر حەزیان دەکرد بیڵێن ئەوە بوو "باوکە، تۆ دەدۆڕێیت. تۆ ئەوەندەش رۆح سوك نیت کە بیری لێدەکەیتەوە". جاری واش هەبوو دەیانوت، "بۆچی دەتەوێ ژیانی ئێمە تێکدەیت؟"

ئەمانە قسەی زۆر سەخت بوون بۆ باوکێك. من نازانم ئاخۆ کچەکانمان بە راستی پێیان وابوو دەدۆڕێم یان نا، بەڵام دەمزانی کە نەیاندەویست دەستبەرداری ژیانی نیمچە تایبەتیان بن. ئێوارەکیان داوام لە جێنا کرد کە لە هەیوانی پشتەوەی کۆشکی حاکم بێتە دەرەوە. ئەمەیان شەوێکی جوانی تەکساس بوو و هەردووکمان دانیشتین و بۆ ماوەیەك پێکەوە قسەمان کرد. پێم وت "دەزانم کە پێت وایە بە خۆکاندیدکردنم بۆ سەرۆکایەتی ژیانت تێکدەدەم. بەڵام لەراستیدا، دایکت و من ژیانی خۆمان دەژین—هەروەکو چۆن لە بەخێوکردنی تۆ و بارباراشدا ئەمەمان کرد". پێی وتم کە هەرگیز بەو شێوەیە بیری لێنەکردووەتەوە. بیرۆکەی ژیان تا قووڵترین ئاستی و بە مانا تەواوەکەی، سەرنجی ئەوی راکێشا، هەروەکو چۆن هەمیشە بەلای منیشەوە وەهابووە. ئەو دڵخۆش نەبوو. بەڵام پێم وابوو لەو چرکەساتە بەدواوە، ئەو و باربارا تێگەیشتن. بە ئاوڕدانەوەی لێی دەیەیەك دواتر، کچەکانمان ستایشی ئەو دەرفەتانەیان کرد کە لەگەڵ سەرۆکایەتیدا هاتن. ئەوان لە گەشتە نێودەوڵەتییەکانماندا سەفەریان لەگەڵ کردین، خەڵکی بێ وێنە و ئیلهامبەخشیان ناسی وەکو، ڤاکلاڤ هاڤێل و ئێلێن جۆنسن سیرلیف و لەبارەی خزمەتی

گشتییەوە شت فێربوون. سەرەنجام، لەوانەیە من و لۆرا باربارا و جێنامان لە ماوەی سەرۆکایەتیمدا زۆر زیاتر بینیبێت وەکو لەوەی کە ئەگەر لە تەکساس بماینایەتەوە.

یەکێك لە شوێنە دڵخوازەکانمان بۆ کات بەسەر بردن لەگەڵ کچەکان کامپ دەیڤد بوو. کۆتاهەفتەیەکی هاوینی ۲۰۰۷، من و لۆرا جێنا و (هێنری هەیگەر)ی هاوڕێ کوڕەکەیمان بانگهێشت کرد کە کوڕێکی گەنجی پۆشتەی خەڵکی ڤیرجینیا بوو کە لە هەڵمەتەکەی ۲۰۰٤دا ناسیبووی. لە نانی ئێوارەی هەینیدا، هێنری وتی کە دەیەوێ ڕۆژی دواتر قسەم لەگەڵ بکات. وتم "سەعات سێ لە کابینەی سەرۆکایەتی دەستبەتاڵ دەبم".

هێنری لە کاتی دیاریکراودا گەیشت و دیاربوو خۆی ئامادە کردبوو. وتی " جەنابی سەرۆك، کچەکەتم خۆش دەوێت" و پاشان وتارێکی کاریگەری دا. پاش چەند خولەکێك قسەم پێبڕی . وتم، "هێنری، وەڵامەکەم بەڵێیە، تۆ مۆڵەتی منت لایە". پاشان وتم، "ئێستا با بچین لۆرا بێنین". ڕواڵەتی ڕوخساری دەیگوت "بوەستە من خاڵەکانی قسەکانم تەواو نەکردووە !" لۆرا ئەوەندەی من دڵخۆش بوو. بە شێوەیەکی ژیرانە، هێنری بە هەمان شێوە داوای مۆڵەتی بارباراشی کرد. چەند هەفتەیەك دواتر، لە پارکی نیشتمانیی (ئەکەدیا) لە مەین خوازبێنی جێنای کرد. ئەوان لە کێڵگەکەمان لە کراوفۆرد لە مانگی مایسی ۲۰۰۸ هاوسەرگیرییان کرد. ئێمە مێزێکی پیرۆزمان هەبوو کە لە بەردە کلسی تەکساس داتاشرابوو و لەسەر نیمچەدوورگەیەك لە دەریاچەکەماندا دانرابوو و هاوڕێی بنەماڵەکەمان (کیربیجۆن کالدوێل) — بەرپرسێکی کڵێسای خەڵکی هوستن کە بێ وێنە بوو— مەراسیمەکەی لە زەردەپەڕێکدا بەجێ گەیاند. بوك سەرسوڕهێن بوو. لۆرا و باربارا ئەدرەوشانەوە. یەکێك لە خۆشییەکانی ژیانم بوو کە جێنای خوێن شیرین لە پلیکانەکان بیەمە خوارەوە. پاش هەشت ساڵم لە سەرۆکایەتی، خێزانەکەمان نەك تەنیا بەهێزتر ببوو، بەڵکو گەورەتریش ببوو.

***

پاش ئەوەی لە لە حوزەیرانی ساڵی ۱۹۹۹دا خۆکاندیدکردنم ڕاگەیاند، من و لۆرا چووین بۆ مەین بۆ سەردانی دایك و باوکم. زانیاریی تازە پێدان لەبارەی هەڵمەتەکەوە. ئینجا هەرچوارمان پێکەوە بۆ سەر فریزە پیاسەمان کرد. لە پشتمانەوە ئۆقیانووسی

ئەتلەسیی جوان بوو. لە پێشمانەوە گروپێکی گەورەی فۆتۆگرافەکان هەبوون. یەکێك لەتاك ڕستە کلاسیکەکانی دەربڕی. ئەو سەیرێکی گروپەکانی چاپەمەنی کرد و پرسیاری کرد، "لە ساڵی ١٩٩٢دا ئێوە لە کوێ بوون؟" من پێکەنیم. من سەرسام مام بەم ژنە بێ وێنەیە. ئەو بەرپرس بوو لە بەشی زۆری شتە باشەکانی ژیانم. ڕووم کردە باوکم. هۆشم چووەوە سەر ئەو ڕۆژانەی زوو کە بە تەماشاکردنی وێنە کۆنەکانی بەسەرم دەبرد. وەکو ئەو وێنە کۆنانە، ڕوخساری ژاکابوو. بەڵام ڕۆحی هێشتا بەهێز بوو. بە ڕۆژنامەنووسانم وت کە بۆ تەمەنێك چیم ناسیووە: باشییەکی مەزن بوو کە کوڕی جۆرج و باربارا بوش بووم. چ گەشتێك بوو کە بەیەکەوە کردمان. حەوت ساڵ زووتر، دوایین هەڵمەتی باوکم بە شکست کۆتایی هات. ئێستاکە من بە شانازییەوە لە تەکیەوە وەستابووم ، بە دەرفەتێکەوە کە ببمە چل و سێیەمین سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

***

کاتێك گەڕاینەوە بۆ تەکساس، یەکەمین وێستگەم، ماڵی بۆب و جان بولۆك بوو. ساڵانی خراپ بەکاربردن کاریگەری خراپی دانابوو و جەستەی بۆب لە چالاکی دەکەوت. پێستەکەی ڕەنگی لەدەست دەدا، ئەو لەناو جێگەدا کەوتبوو و دەمامکی ئۆکسجینی دەپۆشی. من باوەشێکی نەرمم پیا کرد. دەمامکەکەی لابرد و کۆپییەکی گۆڤاری (نییوزویك)ی لەسەر مێزی لای جێگەکەی هەڵگرت. وێنەی من لەسەر بەرگەکەی بوو.

وتی " چۆن بوو خەندەت نەکەوتە سەر لێوان؟". پێکەنیم. هەر بولۆك-ەکەی جاران بوو. پاشان تووشی موفاجەئەی کردم. وتی "حاکم، وتاری لاواندنەوەی ماتەمینییەکەم پێشکەش دەکەی؟"

دەمامکی ئۆکسجینەکەی پۆشییەوە و چاوەکانی داخست. من سەردانەکەی (ئایۆوا) و وتاری ڕاگەیاندنەکەم لە لای برژاوەکە بۆ باس کرد. دڵنیا نیم کە قسەیەکی منی بیستبێت. پاش گەشتی بێ وێنەمان پێکەوە، من و هاوڕێ نائیحتیمالییەکەم هەردووکمان دەبووایە بجوڵێین.

# کارمەندان

خوێندنەوەی روخساری دیک زۆر قورس بوو. هیچ هەستێکی لە خۆی دەرنەخست. ئەو سەرنجی دەدایە مانگاکان کە لە ژێر خۆری گەرمیبەخشدا لە کێلگەکەمان لە کراوفۆرد دەلەوەڕان. ٣ی تەمموزی ٢٠٠٠ بوو. دە هەفتە پێشتر، پاش زامنکردنی پاڵاوتنی سەرۆکایەتیی کۆماری، من بەڕێوەبەری هەڵمەت، جۆ ئالبۆ-م ناردبوو بۆ سەردانی (دیک چینی) لە دالاس. داوام لێکرد کە وەڵام بۆ دوو پرسیار بدۆزێتەوە. یەکەم، ئاخۆ چینی بایەخدەرە بەوەی ببێتە کاندیدی جێگری سەرۆک؟ ئەگەر نا، یارمەتیم دەدات تا هاوەڵێکی خۆکاندیدکەر بدۆزمەوە؟

دیک بە جۆ-ی وت دڵخۆشە بە ژیانی و کاری سیاسی تەواو کردووە. بەڵام ئامادەیە کە سەرکردایەتیی کۆمیتەی سۆراخکردنی جێگری سەرۆک بکات. هەروەکو پێشبینیم کردبوو، دیک کارێکی تەواو و چڕوپڕی ئەنجام دابوو. لە یەکەم کۆبوونەوەماندا، من پێوەرەکانی خۆم داتابوو بۆ هاوەڵێکی کاندید. کەسێکم دەویست کە لەگەڵیدا ئاسودە بم، کەسێک کە ئامادەبێ وەکو بەشێک لە تیمەکە خزمەت بکات، کەسێک بە ئەزموونی واشنتنەوە کە من نەمبوو و لەهەمووی گرنگتر، کەسێک کە ئامادە بوو لە هەر چرکەساتێکدا وەکو سەرۆک خزمەت بکات. دیک تیمێکی بچوکی پارێزەرانی سازدا و بە وریاییەوە چەندەها بەستەی ئەوراقی لەسەر کاندیدی شیاو خڕ کردەوە. بە هاتنی ئەو کاتەی کە هات لە کێلگەکە من ببینێت، ئێمە لیستەکەمان تەسک کردبووەوە بۆ نۆ کەس. بەڵام بە مێشکی خۆم، هەمیشە دەیەمین کەس هەبوو. پاش نیوەڕۆخوانێکی ئاسودە لەگەڵ لۆرادا، من و دیک چووینە حەوشەکەی پشت خانووە دارینە کۆنەکەی

کێڵگەکەمان. بە ئارامییەوە گوێم گرت لەکاتێکدا کە دیک دوایین راپۆرتی کۆمیتەی سۆراخکردنی بۆ روون دەکردمەوە. پاشان چاوم بڕیە چاوەکانی و وتم، "دیک، من بڕیاری خۆمم دا".

***

وەکو خاوەنی بزنسێکی بچوک، راپەڕێنەری بەیسبۆڵ، حاکم و چاودێری ریزی پێشەوەی کۆشکی سپیی باوکم، من فێری گرنگیی رێکوپێك بونیادنان و ستاف بۆدانانی دامەزراوەیەك بووم. ئەو خەڵکەی کە هەڵیدەبژێریت بۆئەوەی دەورەت بدەن، چۆنایەتیی ئەو ئامۆژگارییەی کە تۆ وەریدەگریت و ئەو ئامانجانەی کە جێبەجێیان دەکەیت، دیاری دەکەن. لە ماوەی هەشت ساڵمدا وەکو سەرۆك، بڕیارەکانی کارمەندەکانم هەندێ لە پرسیاری هەرە ئاڵۆز و هەستیاریان وروژاندووە کە گەیشتوونەتە ئۆفیسی ئۆڤاڵ: چۆن تیمێکی هەماهەنگ پێکبهێنیت، کەی دامەزراوەیەك ئاڵوگۆڕ تێبخەیت، چۆن ململانێکان بەڕێوە ببەیت، چۆن کاندیدە لێهاتووەکان جیا بکەیتەوە و چۆن هەواڵی ناخۆش بە خەڵکی باش بگەیەنیت.

من هەر بڕیارێکم لەسەر کارمەندەکانم بە پێناسەکردنی چۆنێتی ئیشەکە و پێوەرەکان بۆ کاندیدی نموونەیی دەدا. توێژینەوەیەکی بەرفراوانم ئاراستە کرد و چەندەها بژارەم لەبەرچاو گرت. بۆ دامەزراندنە گەورەکان، من رووبەڕوو چاوپێکەوتنم لەگەڵ کاندیدەکاندا دەکرد. کاتەکەم بەکارهێنا بۆ پێوانەکردنی کارەکتەر و کەسایەتی. من سۆراخی راستگۆیی، لێهاتوویی، خۆنەویستی و توانای مامەڵەکردن لەگەڵ گووشارم دەکرد. هەمیشە کەیفم بەو جۆرە کەسانە دەهات کە هەستێکی گاڵتە و گەپیان هەبوو، کە ئەمەش نیشانەیەکی خاکیبوون و لەخۆگەیشتن بوو.

ئامانجی من پێکهێنانی تیمێك لە خەڵکی بەهرەمەند بوو کە ئەزموونیان و شارەزایەتییان تەواوکەری هی یەکتری بوو و من هەستم بە ئاسودەیی دەکرد کە ئیشیان پێ بسپێرم. من خەڵکێکم دەویست کە رازی بوون بە ئاراستەی ئیدارەکە، بەڵام هەستیان دەکرد سەربەستن لە دەربڕینی جیاوازییەکان لەسەر هەر پرسێك. بەشێکی گرنگی کارەکەم دروستکردنی کەلتوورێك بوو کە هانی کاری بەکۆمەڵ و گەشەی بە وەفاداری

دەدا– بەرانبەر من نا، بەڵکو بەرانبەر وڵات و بەهاکانمان. من شانازی دەکەم بە زۆرێك لەو خەڵکە بەرێز، بەهرەمەند، ماندووەی کە لە ئیدارەکەی مندا خزمەتیان کرد. ئێمە جێگۆڕکێپێکردنی کەم، ململانێی ناوەکیی کەممان هەبوو و هاوکارییەکی توندوتۆڵمان هەبوو لە هەندێ لە کاتە سەختەکانی مێژووی گەلەکەماندا. من هەمیشە سوپاسگوزاری خزمەتی دڵسۆزانەیانم.

جارێکیان سەرۆك وەزیران مارگرێت تاتچەر وتبووی، "من زۆر جار لە دە چرکەدا لەبارەی پیاوێکەوە بڕیار دەدەم و زۆر بەدەگمەن دەیگۆڕم". من یەکجار بەو خێراییە نەمدەتوانی ئەمە بکەم، بەڵام هەمیشە توانیوومە خەڵك بخوێنمەوە. بۆ بەشی هەرە زۆری، ئەمەیان باشییەك بوو. بەڵام کات هەبوون کە تیایاندا من زۆر بەوەفا یان زۆر لەوە خاوتر بووم کە بگۆڕم. من خراپ حوکممدا لەسەر ئەوەی کە چۆن هەندێ دیاریکردن دەرك دەکرێن. هەندێ جار ڕێك و ڕەوان کەسێکی هەڵەم بۆ کارەکە هەڵبژاردووە. بڕیارەکانی پەیوەست بە کارمەندان لەناو یەکەم بڕیارەکانی مندا بوون وەکو سەرۆك– و لەهەمووشی گرنگتر بوون.

***

یەکەم بڕیاری گەورەی سەرۆك پێش گرتنە دەستی ئۆفیس دێت. دیاریکردنی جێگری سەرۆك پەنجەرەیەك بۆ دەنگدەران دابین دەکات کە لێیەوە دەڕواننە ستایلی بڕیاردانی کاندیدێك. ئەمە دەریدەخات کە چەندە بەئاگا و وردە. هەروەها ئاماژەیە بۆ ئەولەویەتەکانی سەرۆکێکی لێهاتوو بۆ وڵاتەکە. بە هاتنی ئەو کاتەی کە لە ئازاری ٢٠٠٠دا پاڵاوتنی کۆمارییەکانم بەدەستهێنا، شتێکی کەمم لەبارەی جێگر سەرۆکەکانەوە دەزانی. لە نزیکەوە سۆراخی پرۆسەی دیاریکردنم کردبوو کاتێك باوکم وەکو هاوەڵێکی کاندیدکردن بۆ ریچارد نیکسۆن لە ١٩٦٨ و جیراڵد فۆرد ١٩٧٦دا قسەی لەسەر کرا. شایەتی ئەوە بووم کە بۆ ماوەی هەشت ساڵ لەلای سەرۆك ریگن کاری کردبوو. تێبینی پەیوەندییەکەیم لەگەڵ دان کوایل کردبوو. هەروەها بەسەرهاتی ترسێنەری جێگری سەرۆکم لە گەنجێتیمدا لەبیرە، کاتێك کاندیدی دیموکراتی (جۆرج مکگۆڤەرن)، (تۆم

ئینگلەر)ی دیاری کرد بۆئەوەی ببێتە هاوەڵی خۆکاندیدکردنی، تەنیا دواتر زانی کە ئینگلەر تووشی چەند شێنهیارێکی عەسەبی بووە و چارەسەری شۆکی کارەبایی بۆ کراوە.

من سوور بووم لەسەر دووبارە نەکردنەوەی ئەو هەڵەیە، کە ئەمەش هۆکارێك بوو بۆئەوەی کە کەسێکمی بەئاگا و بەپلانی وەکو دیك چێنیم هەڵبژارد بۆئەوەی بێتەناو پرۆسەی خۆکاندیدکردنەکەمەوە. بە هاتنی سەرەتاکانی هاوین، ئێمە سەرنجمان خستبووەسەر کەسانی کۆتایی پێشبڕکێکە. چواریان حاکمی هەنوکەیی یان پێشوو بوون: (لامەر ئەلیکساندەر)ی حاکمی تێنیسی، (تۆم ریج)ی حاکمی پەنسیلڤانیا، (فرانك کیتین)ی حاکمی ئۆکلاهۆما و (جۆن ئینگلەر)ی حاکمی میشیگان. پێنجەکەی تر سیناتۆری هەنوکەیی یان پێشوو بوون: (جاك دانفۆرس)ی میسۆری، (جۆن کایل)ی ئەریزۆنا، (چوك هاگڵ)ی نێبراسکا و (بیل فریست) و (فرێد تۆمپسن)ی تێنیسی.

من بژارەکان بۆ دیك، لۆرا، کارل، کارێن و چەند یاریدەدەرێکی جێ متمانەی تر روون کردەوە. کارێن، تۆم ریجی پێشنیار کرد، سەربازێکی کۆنی ولایەتێکی سەرەکیی بێ لایەن بوو. وەکو هاوەڵێکی بەڕێوەبەری جێبەجێکار، تۆم توانایەکی زۆری دەبێت بۆ بەڕێوەبردنی ولات ئەگەر شتێك بەسەر من بێت. ئەو بەهەمان شێوە لایەنگیری (ئیختیارکردن) بوون، کە هەواداریتیی میانڕەوەکانی هەردوو حزبەکەی هەبوو لەکاتێکدا کە هەندێ لە کۆمارییەکانی سارد دەکردەوە. ئەوانیتر رەئیان لەسەر چوك هاگڵ بوو کە سەرۆکی کۆمیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی ئەنجومەنی پیران بوو و ئەزموونی سیاسەتی دەرەوەی هەبوو. من لە فرانك کیتین و جۆن ئینگلەرەوە نزیك بووم و دەمزانی لەگەڵ هەر کامێکیان بێت، باش ئیش دەکەم. جۆن کایل کۆنسێرڤاتیڤێکی وشك بوو کە دەیتوانی پاڵپشتی قاعیدەکە بکات. لامار ئەلیکساندەر، بیل فریست و فرێد تۆمپسن پیاوانێکی باش بوون و لەوانەبوو یارمەتیم بدەن پشێوییەك لە تێنیسی دابمرکێنمەوە، کە ویلایەتی زێدی پاڵێوراوی دیموکراتەکان، جێگر سەرۆك (ئالگور) بوو.

جاك دانفۆرس جێی بایەخم بوو. وەکو قەشەیەکی ناونراو، جاك راستگۆ، ئەخلاقی و راشکاو بوو. تۆماری دەنگدانی لە ماوەی سێ خولدا لە ئەنجومەنی نوێنەران حاشاهەڵنەگر بوو. ئەو بە داکۆکیکردنەکەی لە (کلارەنس تۆماس) لە ماوەی

دانیشتنەکەی لە دادگای باڵادا لە ١٩٩١، ڕێزی منی بەدەستهێنابوو. ئەو کۆنسێرڤاتیڤێکی خاوەن پرەنسیپ بوو. کە دەشیتووانی لەمبەر بۆنەوبەری هەردوو حزبەکەوە کاریگەری هەبێت. بەشی خۆی، لەوانەیە یارمەتیدەر بێت بۆ ئاراستەکردنی میسۆری کە ویلایەتێکی شەڕگەی سەرەکییە.

من بە جددی بیرم لەوە کردەوە کە ئیشەکە بدەمە دەست دانفۆرس، بەڵام بەردەوام هەستم دەکرد دەگەڕێمەوە سەر دیک چێنی. ئەزموونی چێنی زۆر بەفراوانتر و هەمەڕەنگتر بوو لە هەرکەسێکی تری لیستەکەم. وەکو سەرۆکی ستاف کۆشکی سپی، یارمەتی سەرۆك فۆردی دابوو تا وڵات لە پاشەواری (واتەرگەیت) تێپەڕێنێت. ئەو زیاتر لە دەیەیەك لە کۆنگرێس خزمەتی کردبوو و هەرگیز هەڵبژاردنێکی نەدۆڕاندبوو. وەزیرێکی بەرگریی بەهێز بوو. بزنسێکی جیهانیی بەڕێوە بردبوو و لە کەرتی تایبەت تێگەیشتبوو. بە پێچەوانەی هەر سیناتۆر یان حاکمێکی سەر لیستەکەم، ئەو لە تەك سەرۆکەکاندا وەستابوو لەو بڕیارە هەرە حەساسانەی کە گەیشتبوونە ئۆفیسی ئۆڤاڵ، لەوانەش ناردنی ئەمریکییەکان بۆ جەنگ. دیک نەك تەنیا ڕاوێژکارێکی بەنرخ دەبوو، بەڵکو دەیتووانی بەتەواوی سەرۆکایەتی بگرێتە ئەستۆی.

لەکاتێکدا دیک تەقریبەن زیاتر لە هەر کەسێکی تر واشنتۆنی باشتر دەناسی، وەکو شارەزایەك ڕەفتاری نەدەکرد. شانازییەکەی بەوانەی خوارەوە دەسپارد. کاتێك لە کۆبوونەوەکاندا قسەی دەکرد، قسە وریایانە هەڵبژاردووەکانی ڕەوایەتی و کاریگەرییان هەڵگرتبوو. وەکو من، دیکیش خۆرئاوایی بوو. خۆشی دەبینی لە کات بەسەر بردن بە ڕاوەماسی و کات بەسەربردن لە دەرەوە. ئەو لەگەڵ (لین ڤینسنت)دا هاوسەرگیری کردبوو کە دڵدارەکەی قوتابخانەی ئامادەیی بوو لە (ویۆمینگ) و بە تەواوی خۆی بۆ کچەکانی (لین) و (ماری) تەرخان کردبوو. ئەقڵێکی کرداری و هەستێکی گاڵتە و گەپی زیرەکانەی هەبوو. ئەو وتی کە چەندساڵێك بەر لە من لە یەیڵ دەستی بە خوێندن کردووە، بەڵام زانکۆ پێی گوتووە کە نەگەڕێتەوە. دووجار. ئەو وتی جارێکیان فۆرمێکی ئاقیکردنەوەی گونجانی پڕکردووەتەوە کە بە شێوەیەك بووە کە لەگەڵ کەسایەتییەکەی

بە ژیانێکی پیشەیی گونجاوەوە، بێتەوە. کاتێکی ئەنجامەکان هاتوونەتەوە، دیک پێی وتراوە کە باشترین حەل ئەوەیە کە ببێتە سەرپەرشتیاری مردووناشتن.

لەکاتێکدا کە لەسەر بڕیارەکەم هەڵوەستەم کردبوو، داوام لە باوکم کرد بۆ رەئیبەکەی دەرەکی. ئەو ناوانەی کە لەبەرچاوم گرتبوون بۆم خوێندنەوە. ئەو زۆربەی کاندیدەکانی دەناسی و وتی هەموویان خەڵکی باشن. پرسیارم کرد، "ئەی دیک چێنی؟". وتی "دیک بژارەیەکی گەورەیە. ئەو ئامۆژگاریی بەهێز و راشکاوانەت پێ دەدات. هەروەها پێویست ناکات نیگەران بیت کە لە پشتتەوە دەڕوات".

بەهاتنی ئەو کاتەی کە دیک هاتە کێڵگەکە بۆ گەیاندنی دوایین راپۆرتی، بڕیارمدابوو کە جارێکی تر پێی بڵێمەوە. هەر کە قسەکانی تەواو کرد، وتم "دیک، تۆ هاوەڵێکی خۆکاندیدکردنی کامڵیت".

لەکاتێکدا کە پێشتر ئاماژەم گەیاندبوو، دەیتووانی بزانێت کە من ئەمجارە بە جددیمە. دواجار، وتی" پێویستم بەوەیە قسە لەگەڵ لین بکەم" من ئەمەم وەکو نیشانەیەکی مژدەبەخش وەرگرت. ئەو وتی کە سێ جار تووشی جەڵتەی دڵ بووە و ئەو لین ژیانێکی ئاسودەیان هەیە لە دالاس. پاشان وتی "ماری گەوادە". دەمتووانی بە شێوازی وتنی قسەکەی تێبگەم مەبەستی چییە. دیک بە روونی کچەکەی خۆش دەویست. هەستم دەکرد بیەوێ تەحەمولی من پێوانە بکات. ئەو لە جەوهەردا دەیگووت، " ئەگەر تۆ کێشەیەکت لەگەڵ ئەمە هەیە، ئەوا پیاوی تۆ نیم".

بە رووی پێکەنیم و وتم، "دیک، کاتی خۆت وەربگرە. تکایە قسە لەگەڵ لین بکە. ناتوانم روانگەی ماریش بە کەمتر وەربگرم".

کاتی دواتری ئەو رۆژە، قسەم لەگەڵ چەند یاریدەدەرێکی جێ متمانە کرد. هێشتا نەمدەویست هەموو کارتەکانم بخەمە سەر مێز. تەنیا پێم وتن کە بەجددی بیر لە چێنی دەکەمەوە. زۆربەیان تووشی سەرسوڕمان بوون. کارل لە دژی ئەمە بوو. داوام لێکرد کە بێت بۆ کۆشکی حاکم بۆئەوەی قسەی خۆی بکات. یەک کەسم بانگ کرد بۆئەوەی بە هێمنی گوێ بگرێت. ئەو کەسەش دیک-ە. بڕوام بە دەربڕینی ناڕەزاییەکان هەیە.

هەروەها دەمویست پەیوەندییەکی لە قالبدراو بە متمانە لەنێوان کارل و دیکدا دروست بکەم لەکاتێکدا کە پێکەوە کاریان لە کۆشکی سپیدا تەواو بوو.

کارل ئارایانە بەڵگەکانی خۆی گەیاند: ئامادەیی چێنی لە لیستەکەدا، هیچ ئیزافەیەک ناخاتەسەر نەخشەی هەڵبژاردن، چونکە سێ دەنگی هەڵبژاردنی (ویۆمینگ) لەناو کۆمارییە هەرە باوەڕپێکراوەکاندا بوون لە وڵاتدا. تۆماری چێنی لە کۆنگرێس، زۆر کۆنسێرڤاتیڤانە بوو و هەندێ دەنگی هەڵچووی دەگرتەخۆ کە دەشێ لە دژی ئێمە بەکاربهێنرێتەوە. حاڵەتی دڵی چێنی کۆمەڵێک پرسیار دەوروژێنێت لەبارەی گونجاوییەکەیەوە. هەڵبژاردنی وەزیری بەرگریی باوکم، دەشیا پرسیار لەبارەی ئەوەوە دروست بکات ئاخۆ من پیاوی خۆمم. دواجار، دیک لە تەکساس دەژیا و دەستوور ڕێگەی لەوە گرتبوو کە دوو دانیشتووی هەمان ویلایەت، دەنگی لیژنەی هەڵبژاردن بەدەست بهێنن.

من بە وردی گوێم لە بەرهەڵستییەکانی کارل گرت. دیک وتی پێی وابووە کە هەردووکیان قایل بوون. بەڵام من نا. تۆماری کۆنگرێسی کۆنی دیک منی بێزار نەکرد. من ئەزموونی ئەوم لە (کاپیتل هیل) بە سەرمایەیەک وێنا کرد. نەبوونی کاریگەریشی لەسەر نەخشەی هەڵبژاردن، کاری لە من نەکرد. بڕوام وایە کە دەنگدەران بڕیاری لەسەر بنەمای کاندیدی سەرۆکایەتی دەدەن نەک جێگری سەرۆک.

هەرچی پەیوەندی بە نیگەرانی کارلەوە هەیە لەبارەی دیاریکردنی وەزیری بەرگریی باوکم، من گەیشتمە ئەو قەناعەتەی کە سوودەکانی دیاریکردنی هاوەڵێکی خۆکاندیدکردنی جددی و سەرکەوتوو قەرەبووی هەر وێنایەک دەکاتەوە لەبارەی ئەوەی کە من هانام بۆ یارمەتی باوکم بردووە.

دوو نیگەرانی هەن کە پێویستە موخاتەبە بکرێن: تەندروستیی دیک و مەسەلەی زێدەکەی. دیک ڕازی بوو بەوەی کە پشکنینێکی پزیشکی بکات و ئەنجامەکانی بۆ (دکتۆر دێنتن کولی) نارد کە پشکنەرێکی دڵی بەڕێز بوو لە هوستن. دکتۆر وتی دڵی دیک بەرگەی فشارەکانی هەڵمەتەکە و جێگر سەرۆکی دەگرێت. دیک و لین دەتوانن تۆماری

دەنگدەرێتی بۆ (ویۆمینگ) بگۆڕن، ئەو ویلایەتەی کە دیک نوێنەرایەتی کردبوو لە کۆنگرێس و هێشتا بە ماڵی خۆی دادەنا.

شێوازی دیک بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو چەند هەفتە ئاسکەدا، ئاسودەیی منی قوڵکردەوە بەوەی کە ئەو بڕارە راستیەکەیە. ئەو هەرگیز جارێک لە جاران فشاری نەخستمەسەر بۆئەوەی بڕیار بدەم. لە راستیدا ئەو سوور بوو لەسەر ئەوەی کە بەر لەویە بڕیاری کۆتایی بدەم، جاک دانفۆرس ببینم. من و دیک چووین بۆ دیداری جاک و هاوسەرەکەی، سالی، لە شیکاگۆ لە رێکەوتی ١٨ی تەمووزدا. سەردانێکی سێ سەعاتیی ئاسودەبەخش بوو. بۆچوونە پۆزەتیڤەکانم لەبارەی جاکەوە جێگیر بوون. بەڵام بڕیارم لەسەر دیک دابوو.

هەفتەیەک دواتر، تەقدیمی رەسمیم ئاراستە کرد. هەروەکو خویەک، لە دەوروبەری سەعات ٥ هەڵسام. پاش دوو کوپ قاوە، نیگەران بووم لە جوڵان. چاوەڕێ بووم تا ٦:٢٢ی دوانیوەڕۆ بەر لەوەی تەلەفۆن بۆ دیک بکەم. ئەوم لەسەر جیهازی ترێدمیلەکە (رۆیشتن لەسەر قایشە جوڵاوەکە) گرت ، کە بە نیشانەیەکی باشم دانا. ئەو و لین هاتن بۆ ئۆستن بۆ راگەیاندنەکە لەو دوانیوەڕۆیەدا.

دوای دەساڵ، پەشیمان نەبوومەتەوە لە بڕیاری ئەوەی کە لەگەڵ دیک خۆم کاندید کرد. هەڵوێستەکانی بۆ ژیانخوازی و کەمیی باج یاریدەدەر بۆ پتەوکردنی بەشە سەرەکییەکانی قاعیدەکەمان. رێزێکی گەورەی هەبوو کاتێک رایگەیاند "یارمەتی بە رێگاوەیە" بۆ سوپا. وەڵامە پایەدار و کاریگەرەکانیلە رووبەڕووبوونەوەی جێگر سەرۆکی لەگەڵ جۆ لیبەرماندا، دەنگدەرانی دڵنیا کردەوە لەبارەی بەهێزیی لیستەکەمان. ئەو ئاسودەیی پێ بەخشیم کاتێک زانیم ئامادە دەبێت هەنگاو بنێ ئەگەر شتێک بەسەر من بێت.

سوودە راستەقینەکانی دیک، چواردە مانگ دواتر، رۆشنتر بووەوە. لە سەرلەبەیانیی سێپتەمبەری ٢٠٠١دا، ئەمریکییەکان لە قەیرانێکی وێنانەکراو بێداربوونەوە. ئەو پیاوە هێمن و بێدەنگەی کە من لەو رۆژەی هاوینی کراووفۆرد دا دامەزراندبوو، وەکو داری بەڕوو بەهێز وەستا.

***

دیاریکردنی جێگری سەرۆك لە کۆتایی وەرزی بەرایی تاقەتپڕوکێندا هات. پرۆسەی هەڵمەتەکە شێوازێکی لە توێکڵ دامالینی کاندیدەکانی هەبوو. ئەم پرۆسەیە، بەهێزییەکان و لاوازییەکان بۆ دەنگدەران دەردەخات. ئەو کاتە دەرکم بەوە نەکرد، بەڵام قورسیی هەڵمەتەکە یارمەتی کاندیدەکە دەدات تا خۆی ئامادە بکات بۆ فشارەکانی سەرۆکایەتی. ئەو رۆژە پڕ فشارانە بە هەمان شێوە کارەکتەری خەڵکی دەوروبەری بۆ دەرخستم و زەمینەی دانا بۆ ئەو بڕیارە پەیوەندیدارانەی کارمەندان کە دواتر لە کۆشکی سپی رووبەڕووم بوونەوە.

هەڵمەتەکە بۆ کۆنگرەی (ئایۆوا) دەستی پێکرد، کە باشترین ئەزموونی جەماوەری بوو. من و لۆرا سەفەرمان کرد بۆ ویلایەتەکە، هەزاران دەستمان گووشی و چەندەها جلیکانە قاوەمان ئیستیهلاك کرد. بۆ هەموو پلانە ورد دارێژراوەکانمان، یەکێك لە چرکەساتە هەرە ئەزمونبەخشەکانی هەڵمەتەکە، پلان بۆ دانەنراو بوو.

لە دیسەمبەری ۱۹۹۹دا، بەشداری رووبەڕووبوونەوەیەکی کۆماریم کرد لە (دێس مۆینس). رێکخەرانی رووبەڕووبوونەوەکە بریتی بوون لە (تۆم برۆکۆ)ی (NBC) و پێشکەشکارێکی خۆجێیی بەناوی (جۆن باچمان). پاش قسەکردن لەسەر چەند بابەتێکی پێشبینیکراو، باچمان مفاجەئەیەکی دەربڕی: "زیاتر بایەخ بە کام فەیلەسوف یان بیرمەندی سیاسی ئەدەیت و بۆچی؟" من سێیەم کەس بووم بۆ ئەوەی نۆرەی وەڵامدانەوەم بێت. بیرم لەوە دەکردەوە کە ئاماژە بە کەسێکی وەکو (میل) یان (لۆك) بکەم کە تیۆرەی یاسای سروشتییان کاریگەری خستبووە سەر (باوکانی دامەزرێنەر). پاشان (لینکۆلن)م لە مێشکدا بوو کە ئەستەم بوو لەگەڵ (ئەیب)دا لە رووبەڕوونەوەی کۆماریدا بەهەڵەدا بچێت. هێشتا بیرم دەکردەوە کە باچمان رووی کردە من : "حاکم بوش؟" کاتم نەما بۆ لەبەرچاوگرتنی بژارەکانم: وتم "عیسا"، چونکە دڵمی گۆڕی".

هەموویان واقیان ورما. ئەمە لە کوێوە هات؟ لە رێگەی گەڕانەوەدا بۆ هۆتێل، دایك و باوکم بۆ دڵنیاکردنەوە تەلەفۆنیان کرد. ئەوان تەقریبەن هەمیشە پاش رووداوە

گرنگەکان تەلەفۆنیان دەکرد. باوکم وتی "زۆر باش بوو کورِم. باوەڕ ناکەم وەڵامەکەت زۆر ئازارت بدات". پرسیارم کرد "کام وەڵامە؟" وتی "ئەزانی، ئەوەی وتت عیسا". سەرەتا بیرم لەوە نەکردبووەوە کە وەڵامەکەم ئازارم دەدات. من تەنیا ئەوەم لەم دەم هاتە دەر کە لە دڵمدا بوو. لەگەڵ ئەوەشدا، کە تێرامام، تێبینی حەزەڕێکم کرد. من بەگومان بووم لەو سیاسییانەی کە ئایینیان دەکردە ئامراز بۆ بەدەستهێنانی دەنگ. من باوەڕم بە شێوازی میتۆدیست یان جولەکە یان موسڵمان نەبوو بۆ بەرنامەی گشتی. رۆڵی حکومەت نەبوو کە برەو بە هیچ ئایینێك بدات. من وەکو حاکمی تەکساس ئەوە نەکردبوو و بە دڵنیاییشەوە نیازی ئەوەم نەبوو کە وەکو سەرۆکیش ئەمە بکەم.

بە دڵنیابیەوە، قسەکانم هانی کاردانەوەیەکیاندا. ستوون نووسێك وتی "شتێکی ناپیرۆز لەمەدا هەیە". یەکێکی تر وتی "دەبلیو، تەنیا ژمارەکانی عیسا دەژمێرێت و عیسا لە ئایۆوا دەنگی باش خڕ دەکاتەوە".

کاردانەوەکە هەمووی نێگەتیڤ نەبوو. وەڵامەکەم گەیشتبووە زۆرێك لەو خەڵکانەی کە ئەزموونی هاوشێوەیان هەبوو لە ژیانی خۆیاندا و قسەکردنی راشکاوانەی منیان لەبارەی ئیمانەوە ستایش کرد.

لە شەوی کۆنگرەدا، من بە رێژەی ٤٠٪ی دەنگەکان، ئایۆواك دەستەبەر کرد. پاش ئاهەنگێکی سەرکەوتنی کورت، رێگەمان بەرەو (نیوهەمپشایەر) گرتەبەر. دەمزانی کە دەشێت (ویلایەتە گرانیتەکە) دووڕوو بێت بۆ کاندیدەکانی پێشەوە. دەنگدەرانی نیوهەمپشایەر مێژوویەکیان هەیە لە بێ نرخکردنی دڵخوازەکەیان . هەستم باش بوو لەمەڕ ئۆپەراسیۆنەکەمان لە ویلایەتەکەدا کە هاوڕێم سیناتۆر (جەد گرێگ) بەڕێوەی دەبرد. کاتێکی زۆرم لەوێ بەسەر برد، بەشێوەی رێپێوان دەڕۆیشتین و شارەزایەتییەکانم پەرە پێدەدا. لە رۆژی هەڵبژاردنی بەراییدا، من و لۆرا لە هۆتێلەکەی خۆمان لە مانچستەر نیشتەجێ بووین بۆئەوەی تەماشای ئەنجامەکان بکەین. لە سەرەتای پاش نیوەڕۆدا، لەگەڵ یەکەمین دەرچوونی دەنگەکان کارل سەرێکی لێدام: من لە دۆڕاندا بووم، دۆڕانێکی خراپ.

لۆرا دەستی کرد بە قسە "جۆرج دەتەوێ ببیتە سەرۆك؟" من سەرێکم بۆ لەقاند. "دە کەواتە باشترە رێگە بە خۆت نەدەیت پێناسە بکرێیتەوە". راستی دەکرد. من هەڵەی کلاسیکی کاندیدی پێشەوەم کردبوو. رێگەم بە سیناتۆر جۆن مککەینی ئەریزۆنا دابوو کە کێبڕکێکارێکی تری گەورەبوو تا لە نیوەهەمپشایەر دەستی بباتە پێشەوە. ئەو هەڵمەتێکی پڕ وزەی خستبووەگەڕ کە زۆرێك لە سەربەخۆکانی راکێشابوو کە پشتگیری تۆکمەی منی لە هاوتا کۆمارییەکانم کۆنترۆڵ کردبوو. مککەین لە ١٩٨٣وە ئەندامی کۆنگرێس بوو کە سیستەمی قوتابخانەی ریفۆرم کردبوو، یاساکانی زیانگەیاندنی گۆڕیبوو و شێوازی تەکساسی بۆ خۆشگوزەرانی چاك کردبوو. دەبووایە رێز لە جۆن بنێم بۆ هەڵمەتە زیرەکانە و کاریگەرەکەی و لە هەڵەی خۆشمەوە وانەیەك فێر بم.

چوومە هۆڵی وەرزشی بۆ راهێنانێکی سەخت. لەسەر جیهازی ترێدمیلەکە رووبەرووی گەورەترین بڕیاری پەیوەندیدار بە کارمەندان بوومە لە هەڵمەتە ساواکەمدا. یارییە تەقلیدییەکە پێ وتم کە چەند کەسێك دەربکەم و بانگەشەی سەرەتایەکی تازە بکەمەوە. بڕیارمدا لە ئاراستەیەکی پێچەوانەوە بێمەوە ناو. ستاڤ بالآم کۆ کردەوە و پێم وتن کە من نامەوێ بۆ قایلکردنی دەنگە بەرزەکانی سەر تەلەفزیۆن کەس تورهەڵدەم. تەنیا کەسێك شایستەی سەرزەنشت بوو، ئەویش من بووم. چ بە بردنەوە یان بە دۆڕان، ئەوا ئێمە وەکو تیمێك ئەو پێشبڕکێیەمان تەواو دەکرد. پاشان بە هەر کامێکیان ئەرکێکم پێیاندا. کارل تەلەفۆنی بۆ بەڕێوەبەرانی سیاسیی کرد لەو ویلایەتانەی کە هەڵبژاردنی بەراییان تیادا بەڕێوەبوو. جۆ ستاڤ هەڵمەتەکەی دڵنیا کردەوە. کارێن چووەلای ئەندامانی سەرەکیی دەزگاکانی میدیا. دۆن ئێڤانس دارایی کۆکەرەوەکانی دڵخۆش کرد.

من تەلەفۆنم بۆ بەڕێوەبەری بەرنامە (جۆش بۆلتن) کرد کە لەگەڵ زۆرینەی ستافەکەمان بوو لە بارەگای سەرکردایەتیی هەڵمەتەکە لە ئۆستن. پرسیارم کرد "جەماعەت ورەیان چۆنە؟" ئەو وتی "زۆربەی خەڵکی لە شۆکدان". دەمزانی کە تیمەکە چاوەڕوانی منی دەکرد بۆ ئیعازێك. بە (جۆش)م وت کە کۆیان بکەرەوە و با سەریان بەرز هەڵبڕن چونکە ئێمە خەریکە ئەو شتە دەبەینەوە".

بە ناوڕدانەوە لێی، دۆڕاندن لە نیوەهەمپشایەر، دەرفەتێکی دروست کرد. دەنگدەران حەز دەکەن پێوانەی ئەوە بکەن کە کاندید چ کاردانەوەیەکی بەرانبەر ناحەزی. ریگن و باوکم هەستانەوەی خۆیان پێشاندا پاش دۆڕاندنیان لە ئایۆوا لە ساڵی ١٩٨٠ و ١٩٨٨دا یەک لەدوای یەک. بیل کلینتن هەڵمەتەکەی وەرچەرخاند پاش دۆڕانی لە نیوەهەمپشایەر لە ساڵی ١٩٩٢دا، هەروەکو چۆن باراک ئۆباما لە ٢٠٠٨ ئەمەی کرد. لە ساڵی ٢٠٠٠، من وەکو چانسێک سەیری شکستم کرد بۆئەوەی بیسەلمێنم کە دەتوانم زەربەیەک تەحەمول بکەم و بگەڕێمەوە. وانەکە ئەوەیە کە هەندێ جار باشترین جوڵەکردن بە کارمەندان، ئەو جوڵانەن کە نایانکەیت.

لە کارۆلاینای باشوور، بیرۆکەیەکی نوێمان هەڵبژارد بۆ رۆشنایی خستنەسەر دەسکەوتە دوولایەنەییەکان لە تەکساس: ریفۆرمخواز بە ئەنجامەوە. ئێمە گردبوونەوەی هۆڵی شارمان رێکخست کە تیایدا من دەست و پەنجەم لەگەڵ پرسیارەکاندا نەرم دەکرد تا ئەوەی کە ئامادەبووان شتیان لێدەبڕا تا پرسیاری لەبارەوە بکەن. من تەلەفۆنەکانم بەرێوەدەبرد، پشتیوانیی سەرکردەکانی سەتاسەری ویلایەتم کۆدەکردەوە. پاشان مککەین ریکلامێکی بڵاوکردەوە کە تیایدا بە بەراوردکردنمی بە بیل کلینتن، کارەکتەری منی خستەژێر پرسیارەوە. ئەمە هێڵێکی تێپەڕاند. من چوومە سەر ئیزاعە بۆئەوەی وەڵام بدەمەوە. وەڵامەکە لەگەڵ هەڵمەتی باش رێکخراوی جەماوەریدا، کاریگەری هەبوو. من بە ٥٣٪ی دەنگەکان، کارۆلاینای باشوورم بردەوە، بەمەش نۆ لە سێزدەی هەڵبژاردنە بەراییەکانم دەستەبەر کرد لە (سێشەممەی سوپەردا) و توانا و هێزم بە پاڵاوتنەکەمدا. لە سەرەتاکانی مایسدا، من و جۆن بۆ ماوەی سەعات و نیوێک لە (پیتسبێرگ) بەیەکەوە دانیشتین. ئەو بەشێوەیەکی مەعقول پەست بوو لەو زمانە پڕئیهانەیەی کە هەندێ لە پشتیوانانم لە کارۆلاینای باشوور بەکاریانهێنابوو. من لە تووڕەبوونەکەی تێگەیشتم و روونم کردەوە کە رێز لەکارەکتەرەکەی دەگرم. پاش کۆبوونەوەکەمان، بە ریپۆرتەرەکانی وت کە من دەتوانم "زیاتر لە پێویست"سەرڕاستی بۆ کۆشکی سپی بگەڕێنمەوە.

ئەمە هەرە زیرەکانەترین پاڵپشتی نەبوو کە من تاوەکو ئێستا بەدەستهێنابێت، بەڵام ئەمە سەرەتای ئاشتبوونەوە بوو لەنێوان من و جۆندا. لە مانگی ئابدا، جۆن و (سیندی)ی هاوسەری، لە کێڵگە جوانەکەیان لە سێدۆنای ئەریزۆنا، میوانداریبان کردین. خۆش بوو کە وەستای چێشتلێنان، مککەین لەودیو گۆشتبرژێنەکەوە بە ئاسودەیی ببینم کە خەریکی برژاندنی پەراسووە. ئێمە لە ٢٠٠٠دا و پاشان لە ٢٠٠٤دا بەیەکەوە هەڵمەتمان ئەنجامدا. من رێز لە جۆن دەگرم، خۆشحاڵ بووم کە لە بەرەی خۆمدا بینیمەوە.

***

ئالگۆر پیاوێکی بەهرەمەند و سیاسییەکی سەرکەوتوو بوو. وەکو من، ئەویش لە گروپی هەشت زانکۆ نەریتییەکەی خۆرهەڵاتی ئەمریکا تەخەروجی کردبوو و باوکی قاڵبووی سیاسەت بوو. بەڵام کەسایەتییەکانمان تەواو جیاواز لەیەکتری دیاربوون. ئەو وشک، جددی و دوورەدەست دیار بوو. وەك بڵێی لە سەرتاسەری ژیانیدا خەریکی خۆکاندیدکردن بووە بۆ سەرۆکایەتی. ئەو هاوپەیمانێتییەکی قایمی لیبراڵەکانی (حکومەتی گەورە)، نوخبە کەلتوورییەکان و یەکێتییە کرێکارییەکانی پێکهێنابوو. ئەو زۆر بەتوانا بوو لە دەستەویەخەبوون لەناو پۆپیولیزمی جەنگی چینایەتی. هەروەها ئەو لەماوەی گەشەی گەورەی ئابووریدا جێگرسەرۆك بوو. ئەو لەوانەبوو بەزاندنی زەحمەت بێ.

کاتێك ئاوڕ دەدەمەوە بۆ هەڵمەتی ساڵی ٢٠٠٠، زۆربەی هەرە زۆری کورت دەبێتەوە بۆ تەمێکی تەوقەکردن، دارایی کۆکردنەوە و دەستەویەخەبوون لەگەڵ سەردێڕی رۆژنامەکانی بەیانیاندا. دوو چرکەسات هەبوون کە تیایاندا رۆتینی سیاسیی بەردەوام وەستا. یەکەمیان لە کۆنفرانسی نیشتمانیی کۆمارییەکاندا بوو لە فیلادێلفیا کە لەلایەن وەزیری گواستنەوە و جێگری سەرۆکی ستافی پێشووی باوکم (ئاندی کارد) بە باشی بەڕێوەدەبرا.

من هەر لە ١٩٧٦ەوە لە هەموو کۆنفرانسێکدا ئامادە ببووم، بەڵام هیچ شتێك بەراورد نەبوو بە ئەو هەستەی کە لەکاتی چوونە سەر چەقی سەکۆکە لام دروست بوو. لە پشتی پەردەوە لە تاریکیدا، چاوەڕوان بووم و گوێم بۆ ژماردنی دابەزین گرتبوو: "پێنج، چوار،

سێ، دوو، یەك". پاشان چوومە دەرەوە بۆ پانتاییە پڕەکە. سەرتا دیمەنەکە سەرلێشێوێن بوو. ڕووناکی و دەنگ هەمووی لە دەوروبەری منەوە پەرش و بڵاو بوو. دەمتوانی هەست بە گەرمیی جەستە و بۆنی خەڵك بکەم. پاشان ڕوخسارەکان هاتنە بەر تەرکیزم. لۆرا و کچەکانم، دایك و باوکم بینی. لە تەواوی ژیانمدا، لە تەماشاکردنی جۆرج بوش-دا بووم کە قسەی کردووە. لەناکاو خۆم لە بێنچەوانەبوونەوەی ڕۆڵەکاندا بینییەوە.

من وتم "دەرفەتەکانمان زۆر گەورەن، ژیانمان زۆر لەوە کورتترە کە ئەم چرکەساتە بەفیڕۆ بدەین. بۆیە ئەمشەو، ئێمە سوێند دەخۆین بە گەلەکەمان کە ئەم چرکەساتە بەڵێنی ئەمریکی بقۆزینەوە. ئێمە ئەم کاتە باشانە بەکاردەهێنین بۆ ئامانجە گەورەکان... ئەم ئیدارەیە چرکەساتی خۆی هەبوو، چانسی خۆیان هەبوو. ئەوان پێشەنگییان نەکرد. ئێمە دەیکەین".

دوو مانگ دواتر، هەڵمەتەکان دیسان وەستان، ئەمجارەیان بۆ ڕووبەڕووبوونەوەکان. کارێن هیوگز چاودێریی تیمی ئامادەکاریی منی دەکرد و جۆش بۆڵتن سەرپەرشتیی بەرنامەی دەکرد. جۆش ئاوێتەیەکە لە ئەقڵی درەوشاوە، خاکیبوونی کاریگەر و ڕۆحێکی بەرزەفڕ. قەت ئەوەم بیرناچێت کە لە دەنگدانی نارەسمیی ئەیمز، ئایۆوا بووم لە ئابی ١٩٩٩ کە تەماشای چەندسەد مۆتۆرسایکلێکم کرد خۆیان هاویشتە ناو شارەکەوە. لەناو مۆتۆرسایکل لێخوڕەکاندا حاکم تۆمی تۆمپسن-ی ویسکەنسن و سیناتۆر بێن نایتۆرس کامپێل-ی کۆلۆرادۆ هەبوون. کاتێك کە کابرای پێشڕەو لە بایسکلە شینە درەوشاوەکەی دروستکراوی ئایۆوای دابەزی و کڵاوەکەی داگرت، سەرم سوڕما کە زانیم جۆش-ە، بەڕێوەکی لە مل کردبوو کە لۆگۆی هەڵمەتەکەمانی پێوە بوو. وتی "حاکم، بایسکلسوارانی بوشت پێ دەناسێنم".

یەکەم ڕووبەڕووبوونەوە لە بۆستن بوو لە پشت پەردەی هۆڵەکەوە پەیوەندیم بە کیربیجۆن کالدوێل کرد و لەسەر تەلەفۆن نزامان کرد. کیربیجۆن داوای لە خودا کرد کە توانا و ژیریم پێبدات. دەنگەکەی ئاسودەیی و ئارامییەکی وەهای پێدام کە تەلەفۆنم

لەگەڵ کیربیجۆندا کردە نەریتێک بەر لە رووداوە گەورەکان لە تەواوی هەڵمەتەکە و لەماوەی سەرۆکایەتیشمدا.

دەنگی دواتر کە بیستم، هی رێکخەر (جیم لێهرەر)ی ئیزاعەی PBS بوو کە کاندیدەکانی دەناساند. ئێمە لە سوچەکانی خۆمانەوە دەهاتینە دەر و لە ناوەراستی سەکۆیەکەدا بە یەکتری دەگەیشتین. ئالگۆر توندترین تەوقەی کرد. گومانی ئەوەم هەبوو کە هەوڵی ئەوە دەدات یاریی وەهماندن بکات، رێک وەکو ئان ریچاردز لەساڵی ١٩٩٤دا. من سەرنجم خستەسەر وەڵامدانەوەی پرسیارەکان، هەرچەندە کات هەبوو تیایدا خۆم لەسەر فرۆکەیەکی بێ فرۆکەوان ئەبینییەوە. بە هاتنی ئەو کاتەی کە سەرنجم دایە سەعاتەکەم- کە لە دەستم داکەندبوو و خستبوومە سەر مەنزەدەکە بۆ خۆلادان لەو هەڵەیەی کە باوکم جارێکیان لە رووبەڕووبوونەوەکەدا کردبووی- ئێمە تەقریبەن تەواو ببووین. ئێمە قسەکانی کۆتاییمان کرد، جارێکی تر تەوقەمان کردەوە-ئەمجارەیان دەستگوشینەکە ئاسایی بوو- و بەشداریمان کرد لە شەپۆلی خێزان، هاورێیان و یاریدەدەران پاش رووبەڕووبوونەوەکە.

دەستبەجێ دوای ئەو کاتە، کارێن پێی وتم کە گۆر هەڵەیەکی گەورەی ئەنجام داوە. ئەو بە بەردەوامی هەناسەی هەڵکێشابوو و دەم وچاوی خۆی گرژ کردبوو لەکاتێکدا کە من قسەم کردووە. ئەمە بۆ من هەواڵێک بوو. من ئەوەندە تەرکیزم خستبووەسەر ئەداکەم کە تێبینیم نەکردبوو. رووبەڕووبوونەوەی دووەم و سێیەم شێوازی جیاواز بەڵام هەمان ئەنجامیان هەبوو. هیچ کاممان هەڵەیەکی وەهامان نەکرد. چرکەساتێکی جێی بایەخ لە سێیەمین رووبەڕووبوونەوەدا هەبوو لە زانکۆی واشنتن لە سەینت لویس. دیزاینی هۆڵی شارەکە بواری جموجۆڵی رەخساندبوو لەسەر سەکۆکە. یەکەم پرسیار لەبارەی لیستی مافەکانی نەخۆشەوە بوو. من وەڵامی خۆمم دەدایەوە کاتێک بینیم گۆر بەرەو لای من دێت. ئەو پیاوێکی کەڵەگەتە و ئامادەییەکەی، بەخێرایی مەجالەکەی منی پڕ کردەوە. ئایا جێگرسەرۆک دەیویست سینگێک لە سینگم بدات؟ عەرزی عەزەڵات بوو؟ بۆ ماوەی نیوچرکەیەک پێم وابوو کە لە گۆرپانی قوتابخانەی بنەڕەتیی (سام هوستن)م. سەرنجێکی سوکی گاڵتەئامێزم دایە و بەردەوام بووم. هەستێکی باشم هەبوو لەبارەی

رووبەڕووبوونەوەکەوە. بڕوام وایە کە ئەدایەکەم لە سەروو چاوەڕوانییەکانەوە بوو و وێنای ئەو چرکەساتە دراماتیکییانەم کرد کە هەڵمەتەکەم تێپەڕاندووە. من هەڵە بووم.

***

پێنج ڕۆژ بەر لە هەڵبژاردن، لە لادانێکی ڕۆتینی لە ویسکەنسن، کارێن هیوگز جیای کردمەوە. چووینە ژوورێکی هێمن و وتی "ڕیپۆرتەرێك لە نیوهەمپشایەر تەلەفۆنی کردووە و پرسیار لەبارەی لێخوڕین لەژێر کاریگەریی کحول دەکات". دڵم خورپەی کرد. هەواڵی وەها نێگەتیڤ لە کۆتایی هەڵمەتێکدا هەژێنەرە.

من پێش چوار ساڵ بە جددی نیازی ئاشکراکردنی لێخوڕین لەژێر کاریگەریی کحولم هەبوو، کاتێك کە لەلایەن خزمەتگوزاریی دادوەرییەوە بانگ کرام. کەیسەکە لێخوڕینی بەسەرخۆشی گرتبووەخۆی. من لەلایەن دادوەرانەوە تەبەرەئە کرام چونکە، وەکو حاکم، لەوانەبوو دواتر لەسەر کەیسی بەرگریکار وەکو بەشێك لە پرۆسەی عەفو، حوکم بدەم. لەکاتێکدا کە خانەی دادی ئۆستن هاتمە دەرەوە، ڕیپۆرتەرێك هاواری کرد "ئایا قەت لەسەر مەسەلەی لێخوڕین لەژێر کاریگەریی کحول دەستگیر کراویت؟" وەڵامم دایەوە "وەکو گەنج ریکۆردێکی کاملم نییە. کاتێك گەنج بووم شتی گەمژانەی زۆرم کردووە. بەڵام من پێتان دەڵێم، داوا لە خەڵك دەکەم لەکاتی لێخوڕیندا نەخۆنەوە".

لە رووی سیاسییەوە، دەرخستنی لێخوڕین لەژێر کاریگەریی کحول کێشە نەدەبوو. هەڵبژاردنی دواتر، دوو ساڵی مابوو و من وازم لە خواردنەوە هێنابوو. نەمویست لێخوڕین لەژێر کاریگەریی کحول بوروژێنم لەبەر یەك هۆ: کچەکانم. باربارا و جێنا و زۆریان نەمابوو دەست بە لێخوڕینی ئۆتۆمبێل بکەن. نیگەرانی ئەوە بووم دەرخستنی ئەم مەسەلەیەم، ئەو محازەرانەم بێ ئاکام بکات کە لەبارەی لێخوڕین و خواردنەوە پێم دابوون. نەمدەویست بڵێن" باوکە ئەوەی کرد و هیچیشی لێنەهات، کەواتە ئێمەش دەتوانین".

ئەو ڕۆژە لۆرا لەگەڵ من لە گەشتدا بوو کە چاپەمەنییەکان لێخوڕین لەژێر کاریگەریی کحولیان ئاشکرا کرد. ئەو تەلەفۆنی بۆ باربارا و جێنا کرد بۆئەوەی پێیان بڵێت بەر لەوەی کە لە تەلەڤزیۆنەوە گوێبیستی ببن. پاشان من چوومە دەرەوە بۆلای کامێراکان و لێدوانێکم دا: "من ئۆتۆمبێلەکەیان پێ ڕاگرتبووم. لای پۆلیس دان بەوە دانابوو کە

مەشرویم خواردووەتەوە. غەرامەم دا و لەوەی کە روویدا پەشیمان بووم. بەڵام ئیتر روویدا. من پەندی خۆمم وەرگرت".

لەوانەیە ئاشکرا نەکردنی لێخوڕین لەژێر کاریگەریی کحول بە شێوازی خۆم تاکە زیانبەخشترین هەڵەی سیاسی بووبێت کە تاوەکو ئێستا کردبێتم. دواتر کارل مەزەندەی ئەوەی کرد کە زیاتر لە دوو ملیۆن کەس، لەوانەش زۆرێک لە کۆنزەرڤاتیڤە کۆمەڵایەتییەکان، یان لەماڵەوە مابنەوە یان دەنگیان گۆڕیبێت. ئەوان ئومێدەواری جۆرە سەرۆکێکی جیاوازیان بوون، کەسێك کە نموونەیەکی بەرپرسیارێتیی کەسی دەخاتەڕوو.

ئەگەر ئەو زەمەنە دووبارە ببوایەتەوە، ئەوا ئەو رۆژەی کە لە خانەی داد هاتمە دەرەوە لە هەموو شتێك تەبەری دەبووم. هەڵەکەم بۆ کچەکان روون دەکردەوە و گردبوونەوەیەکم لەگەڵ (دایکانی دژە لێخوڕینی سەرخۆشانە) ساز دەکرد بۆ گەیاندنی هۆشدارییەکی بەهێز لەدژی خواردنەوە لەکاتی لێخوڕیندا. ئەو شەوەی کە چوومە ناو جێگە لە ویسکەنسن، هەموو ئەو بیرۆکانە بە مێشکمدا گوزەریان کرد. کەواتە جارێکی تر: لەوانەیە هەنوکە باجی سەرۆکایەتییەکەم دابێت.

***

پێنج رۆژ دواتر، ئەو چوار خاڵەی کە بەر لە ئاشکرابوونی لێخوڕینی ژێر کاریگەریی کحول لە بەرژەوەندیمدا بوو، نەما. من لە دوایین هەفتەدا بە راشکاوییەوە بەردەوامیم بە هەڵمەتەکەمدا و بە هەمان ئاست لەگەڵ گۆردا چوومە ناو دوایین رۆژی کێبڕکێوە. ئەو شەوە، بنەماڵەکەمان کۆبووینەوە بۆ نانی ئێوارە لە برژاوی (شۆرلاین) لە ئۆستن کۆبووینەوە. خواردنەوە بە خۆشی یەکتری بەردەوام بوو تا ئەو چرکەساتەی کە ئەنجامەکانی دەنگدان بەرەبەرە دەردەکەوتن. تۆڕەکانی راگەیاندن، پەنسیلڤانیا، میشیگان و فلۆریدایان وەکو دەسکەوتی گور ناودێر کرد. پێشکەشکاری هەواڵی کەناڵی سی.بی.ئێس، (دان رازەر) بینەرانی دڵنیا کردەوە، "با شتێك راستەوخۆ لە مکوڕییەکەوە بەدەست بێنین... ئەگەر بڵێین کەسێك ویلایەتێکی بەدەستهێناوە. ئەوا زۆر دڵنیابە وەهایە".

ئەو میوانانەمان کە هیچیان لە سیاسەت نەدەزانی، بەردەوام بوون لە مقومقۆ. "سەر لە ئێوارەیە، دەشێ هەر شتێ رووبدات...." ئەوانەی کە لە نەخشەی هەڵبژاردن ئێگەیشتبوون، زانیبوویان کە من هەنوکە دۆڕاوم. من و جێب زۆر پەست بووین لەوەی کە تۆڕەکانی راگەیاندن فلۆریدایان بەر لەوەی پرۆسەی دەنگدان لە (پانهاندل) دابخرێت، راگەیاندبوو، کە ناوچەیەکی کۆماریی قورسی ویلایەتەکە بوو و کەوتووەتە ناوچەی تەوقیتی ناوەندییەوە. کێ دەزانێ کە چەند لایەنگیر هەواڵەکەیان بیستووە و بڕیاریان داوە دەنگ نەدەن؟ من و لۆرا لە خوانی ئێوارە دزەمان کرد بەبێ ئەوەی دەست لە خواردنەکەمان بدەین. گەڕانەوەمان بە ئۆتۆمبێل بۆ کۆشکی حاکم بە بێدەنگییەوە بوو. هیچی وەها نییە کە بیلێیت کاتێك دەدۆڕێیت. نائاسودە، نائومێد و کەمێك سەرم سوڕما بوو. هەستم بە تاڵی نەدەکرد. من ئامادە بووم کە فرمانی خەڵك قبوڵ بکەم و قسەکانی دایکم لەساڵی ١٩٩٢، دووبارە بکەمەوە: "کاتی ئەوە هاتووە کە بەرەوپێش بڕۆین".

بە ماوەیەکی کورت لە گەڕانەوەمان، زەنگی تەلەفۆن لێیدا. وێنای ئەوەم کرد کە ئەمە یەکەمین تەلەفۆنی دڵنەوایی بێت. کارل بوو وتی "باشترین تیری خۆتت هاویشت..." خەمبار دیار نەبوو، بە ورەیەکی بەرزەوە دەدوا. بە خێرایی قسەی دەکرد. ئەو دەستی کرد بە هەڵڕشتنی زانیاری لەبارەی ئەوەی کە چۆن دەنگەکانی کۆتایی لە فلۆریدا پارسەنگی ئەم یەکە ئیدارییە و ئەو بازنەیەی داوەتەوە.

من قسەکانم پێ بڕی و داوای پوختەم کرد. وتی مەزندەکان لە فلۆریدا لە رووی ماتماتیکییەوە کەموکورتی هەبووە. پاشان ئەو پەیوەندی کرد بە تۆڕەکان و بە دەنگی بەرز هاواری بەسەر ئەو دەنگ کۆکەرەوانەدا کرد کە راستییەکانیان لابوو. لە ماوەی دوو سەعاتدا ئەو بە شێوەیەکی سیستەماتیکی سەلماندبووی کە زۆربەی تۆڕەکانی تەلەڤزیۆن هەڵەن. لە ٨:٥٥ خولەکی پاش نیوەڕۆدا بەکاتی ناوەندی، سی.ئێن.ئێن و سی.بی.ئێس فلۆریدایان لە ستووی ئال گۆر هێنایە دەرەوە. پاشان هەموو ئەوانەی تر بەدوادا هاتن.

من و لۆرا لە کۆشکەوە لەگەڵ دایکم، باوکم، جێب و چەند یاریدەدەرێکی باڵای تردا بەدواداچوونمان بۆ دەرەنجامەکان کرد. سەرەنجام، ماڵی چێنی، دۆن ئێڤانس و کۆمەڵێك

لە هاوڕێی نزیکی تر گەیشتن. لە درێژەی شەوەکەدا، دەرکەوت کە ئەنجامی هەڵبژاردن بە فلۆریدا پشت ئەستوورە. لە ١:١٥ بەیانیدا، دیسان تۆڕەکان ویلایەتەکەیان ڕاگەیاند- ئەمجارەیان لە بەرژەوەندی من.

کەمێك دواتر، ئال گۆر تەلەفۆنی کرد. ئەو بە ڕێزەوە پیرۆزبایی لێکردم و وتی "بە ڕاستی پێچ و پەنایەکی زۆرمان پیشاندان". من سوپاسم کرد و وتم من لە چوونە دەرەوەدابووم بۆ موخاتەبەکردنی ئەو بیست هەزار ڕۆحە تۆکمەیەی لەبەر باران لەلای بینایەی دەستەی یاسادانانی ویلایەت خەریك بوو رەق دەبوونەوە. ئەو داوای کرد من چاوەڕێ بم تاوەکو ئەو لە پانزە خولەکێکدا قسە لەگەڵ پشتیوانەکانیدا دەکات. من رازی بووم.

کاتێکی پێچوو تا مانای هەواڵەکان شوێنی خۆی دەگرت. چەند سەعاتێك پێشتر من ئامادەی ئەوە بووم بەو ژیانەی خۆمەوە بەردەوام بم. ئێستاش خۆم ئامادە دەکەم ببمە سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. پانزە خولەك تێپەڕی. پاشان پانزەی تر. کەچی هێشتا وتاری تەنازول لەلایەن ئال گۆر لە ئارادا نەبوو. شتێك هەبوو. جێب چووە سەر لاپتۆپەکەی و دەستی کرد بە چاودێریکردنی دەرەنجامەکانی فلۆریدا. ئەو وتی کە دەنگەکانی من لە کەمبوونەوەدان. لە ٢:٣٠ سەر لەبەیانیدا، بیڵ دالی، سەرۆکی هەڵمەتی ئال گۆر تەلەفۆنی بۆ دۆن ئێڤانس کرد. دۆن بە کورتی قسەی لەگەڵ دالی کرد و تەلەفۆنەکەی دایە من. جێگرسەرۆك لەسەر خەت بوو. پێی وتم لە دوایین پەیوەندیی تەلەفۆنییەوە ژمارەکان لە فلۆریدا گۆڕانیان بەسەردا هاتووە و بۆیە لە وتارە تەنازولییەکەی پاشگەز دەبێتەوە.

تا ئەو کاتە قەت لە کاندیدێکم نەبیستبوو کە مل نەدات. پێم وت کە لە تەکساس، مانایەکی هەیە کاتێك کەسێك گفتێکت پێ دەدات. لە وەڵامدا وتی "پێویست ناکات قسەڕەق بیت". ماوەیەکی کەم دواتر، تۆڕەکان فلۆریدایان گەڕاندەوە بۆ پۆلێنێکی نادڵنیا-ئەمە چوارەمین قسەیان بوو لە ماوەی هەشت سەعاتدا- و دەرەنجامی هەڵبژاردنیان خستەژێر پرسیارەوە.

من نازانم قسه رەق بووم یان نا، بەلام پەست ببووم. رێك لەو كاتەدا كە پێم وابوو ئەم پێشبڕكێ توندە كۆتایی هاتووە، دەگەڕاینەوە بۆ دەروازەی دەستپێك. ژمارەیەك لە دۆستان لە ژووری دانیشتن ئامۆژگارییان كردم كە بچمە دەرەوە و سەركەوتن رابگەیەنم. من ئەمەم لەبەرچاو گرت، تا ئەوەی كە جێب هات و من جیاكردەوە و وتی" جورج، ئەوە مەكە. كۆتایی هەژماركردنەكە زۆر نزیك بووەتەوە". رێژەی دەنگەكان لە فلۆریدا گەیشتبووە كەمتر لە دووهەزار دەنگ. جێب راستی دەكرد، هەوڵ بۆ پالنانی مەسەلەكە نابەجێ بوو. من بە هەموانم وت كە ئەنجامی هەلبژاردن لەمشەودا راناگەیەنرێت. زۆربەیان چوون خەوتن. من لەگەڵ جێب و دۆن دا نەخەوتین لەكاتێكدا كە ئەوان لەسەر خەت بوون لەگەڵ فلۆریدا. لە كاتێك لە كاتەكاندا، دۆن پەیوەندی كرد بە وەزیری دەرەوەی فلۆریدا، كاسرین هاریس، بۆئەوەی شتێكی تازە وەربگرێت. گوێم لێ بوو هاواری لێ هەستا "مەبەستت چییە لەناو جێگەیت؟ تۆ لەوە تێدەگەی كە هەلبژاردنەكە لە ئەگەر و نەگەر دایە؟ چ باسە؟!" لەگەڵ ئەمەدا، شەوێكی نامۆ تێپەڕی- و تەنانەت پێنج هەفتەی نامۆتر دەستیان پێكرد.

***

لە ١٠٥ ملیۆن دەنگی دراو لە سەرتاسەری ولاتدا، هەلبژاردنی سالی ٢٠٠٠ دەوەستێتە سەر چەند سەد دەنگێكی یەك ویلایەت. فلۆریدا دەستبەجێ بوو بە شەڕگەیەكی یاسایی. دۆن ئێڤانس لە دەوروبەری ٤:٣٠ی بەیانیدا بۆی دەركەوت كە هەلمەتەكەی گۆر تیمێكی پارێزەرانی پێكهێناوە بۆ هەماهەنگیی هەژماركردنەوەی دەنگەكان. ئامۆژگاریی كردم كە منیش هەمان شت ئەنجام بدەم. من رووبەڕووی نامۆترین ئیختیاری كارمەند بوومەوە لە ژیانی گشتیمدا: كێ بنێرم بۆ فلۆریدا بۆ دلنیابوونەوە لەوەی كە پێشڕەویمان پارێزراوە. كاتی ئەوە نەمابوو كە لیستێك ئامادە بكەم یان دیدار ئەنجام بدەم. دۆن پێشنیاری (جەیمز بەیكەر)ی كرد. بەیكەر بژارەیەكی كامڵ بوو- پیاوی دەولەت، پارێزەرێكی زیرەك و موگناتیسی خەلكی بەهرەمەند بوو. تەلەفۆنم بۆ بەیكەر كرد و پرسیارم لێكرد ئاخۆ ئەم ئەركە دەگرێتە ئەستۆ. ماوەیەكی كورت دواتر، بەرەو (تالاهاسی) كەوتەڕێ.

من و لۆرا لەڕووی جەستەیی و دەروونییەوە هیلاك ببووین. ئێمە دوایین وزەی خۆمان لە پێشبڕکێکە سەرف کردبوو. هەر کە روون بووەوە کە ئێمە ئامادەین بۆ پرۆسەیەکی یاسایی دووردرێژ، زۆربەی کاتی خۆمان بە حەوانەوە لە کێڵگەکەمان لە کراوفۆرد بەسەر برد.

بۆ یەکەم جار لە ١٩٩٨دا کیلگەی (پرابەری چاپێل)م بینی. من هەمیشە شوێنێکم دەویست بۆئەوەی پێی بڵێم -پەناگەیەك لە ژیانی ئالۆز- هەروەکو چۆن باوکیشم لە (کێنێبەنکپۆرت) هەیبوو. کاتێك پشکی خۆمم لە رەینجەرز فرۆشت، من و لۆرا پارەمان هەبوو بۆئەوەی کڕینێك ئەنجام بدەین.

من بەنج بووم کاتێك شوێنی ١،٥٨٢ هێکتاریی (بێنی ئێنگلبرێشت)م لە قەزای (مکلینان) بینی کە تەقریبەن لە ناوەڕاستی ئۆستن و دالاسدایە. کێڵگەکە ئاوێتەیەك بوو لە پێدەشتێکی تەختی خۆشکراو بۆ لەوەڕی گاران و دۆڵی سەرسەخت کە وشکبووەوە بۆ بەریەستی نێوان هەردوو رووباری (بۆسك ریڤەر) و (رەینی کریك). دیمەنی بەرزاییە بەردینەکان لە خوارەوەی دۆڵە نەوەد پێییەکانەوە سەرسامکەر بوو. بەهەمان شێوە درەختەکانیش- گوێزە ئەمریکییە گەورەکان، بەرووە زیندووەکان، درەختەکانی سەروو، درەختەکانی مازوو و درەختەکانی (بۆیس دوئارك) بە میوە سەوزەکانیانەوە. بە گشتی، شوێنەکە دە دوانزە جۆری تەختەی لێ بوو؛ کە لە ناوەڕاستی تەکساس شتێکی دەگمەن بوو. بۆئەوەی دڵی لۆرا خۆش بکەم، بەڵێنمدا کە خانوویەك و ریگای نوێ دروست بکەم بۆ گەیشتن بە دیمەنە دڵڕفێنەکانی کێڵگەکە. ئەو بیناسازێکی گەنجی دۆزییەوە کە لە زانکۆی تەکساس خوێندبووی بەناوی (دەیڤد هێیمان) کە خانوویەکی یەك قاتی بە پەنجەرەی گەورەوە دیزاین کردبوو، هەر پەنجەرەیەك دیمەنێکی بێ هاوتای مولکەکەمانی پێ دەدایت. ئەو گەرمای جیۆتێرماڵ (وزەی گەرمی زەوی) و ئاوی کۆکراوەی بەکارهێنا بۆ کەمکردنەوەی کاریگەری لەسەر ژینگە. زۆربەی هەرە زۆری کارەکە لە ساڵی ٢٠٠٠دا ئەنجام درا. دەرچوونن لە هەڵمەتی سەرۆکایەتی و پرۆژەی دروستکردنی خانوو لەهەمان ساڵدا نیشانەی هاوسەرێتییەکی بەهێز بوو- و پەیوەندی هەبوو بە ئارامگرتن و شارەزایەتیی لۆرا بوش.

کێڵگەکە شوێنێکی کامڵ بوو بۆ دوورکەوتنەوە لە زریانی پاش هەڵبژاردن. نەعنوو پەیوەندیم بە جیم بەیکەرەوە دەکردەوە بۆ ئاگاداربوون و دابینکردنی ڕێنمایی ستراتیژی. من هەر زوو بڕیارم لەسەر ئەوەدا کە خۆم لە لێدوانی ناکۆتای هەناسەبڕی تەلەڤزیۆن بەدوور بگرم. لەبری ئەمە، ڕاکردنی درێژم ئەنجام دەدا کە دەرفەتی پێدەدام بۆنەوەی بیر لە ئاینده بکەمەوە، وزەی تەشەنوجم دەسوتاند لە ڕێگەی لابردنی درەختەکانی سەروو کە یەک دنیا ئاویان هەڵدەمژی کە درەختە تەختەییە ڕەسەنەکان پێویستیان بوو. هەروەها لەگەڵ لۆرا دەچوومە ڕێپێوان بە دەم ڕووبارەکەوە. ئەگەر ببوومایەتە سەرۆک ئەوا دەمویست پڕ وزە و ئامادە بم بۆ گواستنەوەکە.

بە درێژایی ڕێگاکە چەند چرکەساتێکی دراماتیکی لەئارادا بوو. لە ٨ی دیسەمبەردا، مانگێک و ڕۆژێک پاش هەڵبژاردن، من و لۆرا گەڕاینەوە بۆ ئۆستن. ئەو دوانیوەڕۆیە، دادگای باڵای فلۆریدا کاتی ئەوەی دیاریکردبوو کە بڕیارێک بدات کە جیم بەیکەر دڵنیابوو لەوەی سەرکەوتنەکەم بە ڕەسمی دەکات. من و لۆرا هاوڕێ باشەکانمان، (بێن) و (جولی کرێنشۆ)مان بانگهێشت کرد بۆ تەماشاکردنی ڕاگەیاندنەکە. بێن یەکێکە لە هەرە سەرکەوتووترین یاریزانانی گۆلفی سەردەمی خۆی و یەکێکە لە هەرە خۆشەویستترین کەسان لە وەرزشە پرۆفێشناڵەکاندا. لە ماوەی ئەو چەند هەفتەیەی ڕابردوودا، جێنتڵ بێن هاتبووە ناو قەرەباڵغییەکە و لە دەرەوەی کۆشکی حاکمدا نارەزایەتی دەردەبڕی. هەندێکیان لایەنگیرانی گۆر بوون، بەڵام زۆرێکیان پشتیوانی منیان دەکرد. یەکێک لە سێ کچە گەنجەکەی بێن و جولی، پۆستەرێکیان بە دەستەوە بوو کە وشەکانی تورە-دۆڕاو "سۆر-لوزەرمان"ی لەسەر بوو کە هەڵگێڕانەوەیەکی ناوەکانی لیستی (گۆر-لیبەرمان) بوو. بێن تابلۆیەکی لە ماڵەوە دروستکراوی هەڵگرتبوو کە بە پەمەیی لێی نووسرابوو "فلۆریدا، چیتر نا بۆ لێدانەوەکان".

من، بێن، جولی و لۆرا لە ژووری دانیشتن کۆ ببووینەوە بۆ چاوەڕوانکردنی بڕیارەکە. من یاسای نا بۆ تەلەڤزیۆنم شکاند بەو هیوایەی کە بتوانم سەرکەوتن لە ساتەوەختی ڕاستەقینەدا ئەزموون بکەم. دەوروبەری سەعات سێ، وتەبێژی دادگا بەرەو لای مەنزەدەکە ڕۆیشت. من خۆم ئامادە کردبوو کە لۆرا لەباوەش بگرم. پاشان ڕایگەیاند کە

دادگا بە ٤-٣ دەنگ، لە بەرژەوەندی گۆر بڕیاریداوە. پاشان هەژمارکردنەوەیەکی دەستیی سەرتاسەریی ڕاگەیاند، ئەمەش لێدانەوەیەکی تر.

ماوەیەکی کورت پاش ئەمە، جیم بەیکەر پەیوەندی پێوە کردم و پرسیاری کرد ئاخۆ دەمەوێ لە دادگای باڵای ئەمریکا تانە لە بڕیارەکە بدەم. ئەو و تێد ئۆلسن، کە پارێزەرێکی دیار بوو و جیم دایمەزراندبوو، هەستیان کرد کە قەزیەیەکی گەورەمان هەیە. ئەوان ڕوونیان کردەوە کە تانەدان لە بڕیارەکە، جوڵەیەکی مەترسیدارە. لەوانەیە دادگای باڵای ئەمریکا ئامادە نەبێ گوێ لە کەیسەکە بگرێت، یان دەشێت لەدژی ئێمە حوکم بدەن. بە جیمم وت کە سکاڵاکە بکات. من ئامادە بووم کە چارەنووسم قبوڵ بکەم. وڵاتەکەم، بە ڕێگایەک لە ڕێگاکان، پێویستی بە کۆتایی هەبوو.

لە ١٢ی دیسەمبەردا، سی و پێنج ڕۆژ پاش هەڵبژاردنەکە، من و لۆرا لەناو جێگەدا بووین کە کارل تەلەفۆنی کرد و سوور بوو لەسەرئەوەی کە تەلەفزیۆن داگیرسێنین. من بە سەرنجەوە گوێ لە تەلەفزیۆن گرت لەکاتێکدا کە پیت ویلیامز ی ئێن.بی.سی نیوز فرمانی دادگای باڵای ڕوون دەکردەوە. بە ٧-٢ دەنگ، دادوەرەکان بۆیان دەرکەوتووە کە ڕێوشوێنی هەژمارکردنەوەی پەرپوت و ناجێگیری فلۆریدا، بڕگەی پارێزگاریی یەکسانی دەستووری پێشێل کردووە. پاشان، بە ٥-٤ دەنگ، دادگا بڕیاری ئەوەیدا کە شێوازێکی دادپەروەرانە نەبووە بۆ هەژمارکردنەوەی دەنگەکان لەکاتی خۆیدا بۆئەوەی فلۆریدا بتوانێ بەشداری بکات لە لیژنەی هەڵبژاردندا. ئەنجامەکانی هەڵبژاردن جێگیر دەبن. بە ٢,٩١٢,٧٩٠ لە بەرانبەر ٢,٩١٢,٢٥٣دا، من فلۆریدام بردبووەوە. من دەبوومە چل و سێیەمین سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

یەکەم کاردانەوەم بریتی بوو لە حەسانەوە. نادڵنیاییەکە زیانێکی قورسی بە وڵات گەیاندبوو. پاش ئەو هەموو هەوراز و نشێوییە، ئەو توانا هەستییەم نەبوو کە دڵخۆشی دەربڕم. ئومێدی ئەوەم هەبوو کە لە شەوی هەڵبژاردندا لەگەڵ بیست هەزار کەس لەلای بینایەی دەستەی یاسادانان هاوبەشی بە سەرکەوتنەکەم بکەم. لەبری ئەمە، لەوانەیە من دەبوومە یەکەم کەس کە بزانم لەکاتێکدا کە ئەو لەگەڵ هاوسەرەکەی لە ناو جێگەدا پاڵی داوەتەوە و تەماشای تەلەفزیۆنی کردووە، سەرۆکایەتی بردووەتەوە.

***

لە یەکەم ١٤٠ ساڵی مێژووی ئەمریکادا، دەستبەکاربوونە سەرۆکایەتییەکان لە ٤ی ئازاردا رێك دەخران. سەرۆکێکی هەڵبژێردراو، نزیکەی ١٢٠ رۆژی هەبوو بۆئەوەی کە ئیدارەکەی ئامادە بکات. لە ساڵی ١٩٣٣دا، (بیستەمین هەموارکردن) رۆژی دەستبەکاربوونی گۆڕی بۆ ٢٠ی کانوونی دووەم و تێکڕای قۆناغی گواستنەوەی کردە نزیکەی ٧٥ رۆژ. کاتێك هەڵبژاردنی ساڵی ٢٠٠٠ی بوش لە بەرانبەر ئال گۆر یەکلایی بووەوە، من ٣٨ رۆژم هەبوو.

یەکەم بڕیاری گەورەم ئەوە بوو کە دەمویست کارکردنی کۆشکی سپی چۆن بێت. ئەمە پرسیارێك بوو کە پێشتر تێڕامابووم. لە ١٩٩١دا، باوکم داوای لێکردم کە تاووتوێ ئۆپەراسیۆنی کۆشکی سپیی ئەو بکەم. پاش چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەندامانی باڵای ستافەکەی، بیرۆکەیەکی باو سەری هەڵدا: خەڵکی ناڕازی بوون. زۆربەیان هەستیان دەکرد کە سەرۆکی ستاف (جۆن سەنونو) ناهێڵێت ئەوان بگەنە ئۆفیسی ئۆڤاڵ و گەیشتنی زانیارییەکانی بە باوکم سنووردار کردووە. من هەمیشە کەیفم بە جۆن دەهات، بەڵام ئیشی من ئەوە نەبوو کە مشتومڕ لەسەر کەیسەکە بکەم، بەڵکو تەنیا بەرزکردنەوەی راپۆرت بوو لەسەر ئەنجامەکان. من چەند رۆژێك بەر لە (رۆژی سوپاسگوزاری)ی ١٩٩١ ئەمەم کرد. باوکم گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە گۆڕانکارییەك پێویستە. داوای لێکردم کە جۆن ئاگادار بکەمەوە کە منیش بە گفتوگۆیەکی سەیر ئەمەم کرد. ئەو ماوەیەکی کورت دواتر ئیستیقالەکەی پێشکەش کرد. من سوور بووم لەسەر ئەوەی کە لە کۆشکی سپی خۆمدا لەو کێشە لابدەم. پێکهاتەیەکم دەویست کە بایی ئەوەندە توندوتۆڵ بێت کە تەوژمێکی زانیاریی سیستەماتیکی زامن بکات، بەڵام بایی ئەوەندە لاستیکی بێت کە بتوانم لە جۆرەها سەرچاوەوە ئامۆژگاری وەربگرم. گرنگ بوو کە راوێژکاران هەست بە سەربەستی بکەن لە راستەوخۆ دەربڕینی کێشەکان لەلای من بەبێ رەتبوون بە فلتەرێکدا. هەروەها ئاسانتر دەبێ کە ئەندامە سەرەکییەکانی خێزانی سیاسی تەکساسم قایل بکەم کە بگوازنەوە بۆ واشنتن بۆئەوەی زوو زوو پێم بگەن.

کلیلی دروستکردنی ئەو پێکهاتەیە، دامەزراندنی سەرۆکێکی ستاف بەئەزموون و باوەڕپێکراو بوو کە هەستی بە هەرەشە نەدەکرد لەبەرانبەر پەیوەندیم بە کارمەندەکانییەوە. بەشێوەیەکی پلارنامێز، پیاوێکی کاملم لە جێگری جۆن سەنونو-دا دۆزییەوە، کە ناوی (ئاندی کارد) بوو. کاتێک سەردانی کۆشکی سپی باوکم دەکرد، زۆرجار سەرێکی ئۆفیسی ئاندیم دەدا بۆ وەرگرتنی دەنگوباسێکی راستگۆیانە لەسەر ئەوەی کە چ باسە. ئاندی تێگەیشتوو، خاکی، دڵسۆز و خۆماندووکەر بوو. ئەو لەلای سەرۆکی ستاف لە هەردوو ئیدارەی ریگن و بوش خزمەتی کردبوو. ئەو حوکمدانێکی سەنگین و میزاجێکی جێگیری هەبوو کە من پێویستم پێیان بوو، هاوشانی دڵێکی بایەخدەر و حەزێکی گاڵتەوگەپی باش. من گەیشتمە ئەو قەناعەتەی کە ئەو کەسی گونجاوە کە سەرۆکایەتیی ستافی کۆشکی سپیم بکات.

چەند هەفتەیەک بەر لە هەڵبژاردن، من بە نهێنی لەگەڵ ئاندی لە فلۆریدا کۆبوومەوە. روون بوو کە پێی وابوو من داوای لێ دەکەم سەرۆکایەتی گواستنەوەکە بکات. وتم "نا، من باس لە گەورەکەیان دەکەم". بۆم روون کردەوە کە ئەو دەبێتە تاکە سەرۆکی ستاف، بەڵام بۆ راوێژ بەهەمان شێوە پشت بە تەکساسییەکانی وەکو کارل، کارێن، ئال گۆنزالیس، هاریت مایەرز، کلەی جۆنسن و دان بارتلێت-یش دەبەستم. ئاندی بە ئیشەکە رازی دەبوو ئەگەر هەر بڕیارێکم بدایە لە غیابی ئەودا، ئەوا پێم بووتایەتەوە. لە دوادواکانی نۆڤەمبەردا ئەوم دانا، بەمەش بوو بە یەکەم ئەندامی رەسمی تیمی کۆشکی سپی.

پڕکردنەوەی پۆستی گرنگی دواتر، بریتی بوو لە راوێژکاری ئاسایشی نیشتمانی. لە ئەنجامی چاودێریکردنی پەیوەندیی نزیکی باوکم بە برێنت سکۆوکرافتەوە، زانیم کە گرنگ بوو کەسێک بدۆزمەوە کە بێ رادە بەتوانا و تەواو جێی متمانەیە.

لە گەشتێکدا بۆ مەین لە هاوینی ۱۹۹۸دا، باوکم بە (کۆندۆلیزا رایس)ی ناساندبووم کە وەکو پسپۆڕی سۆڤیەت لە ستافی ئەنجومەنی ئاسایشی نیشتمانیەکەیدا کاری کردبوو. ئەو کچی قەشەیەکی ئەفریقی-ئەمریکی بوو لە (بیرمینگهام)ی جیاکراوە، ئالاباما. کۆندی دکتۆرای هەبوو لە زانکۆی (دینڤەر) و لە تەمەنی سی و هەشتساڵیدا ببووە راگری

زانکۆی ستانفۆرد. ئەو دەستبەجێ وەکو ژنێکی زیرەك، هۆشمەند و چالاك هانەبەر دیدەم.

لە ماوەی دوو ساڵ و نیوی دواتردا، من و کۆندی زوو زوو یەکتریمان دەبینی بۆ مشتومڕکردن لەسەر سیاسەتی دەرەوە. ڕۆژێکی هاوینی ۱۹۹۹، من، کۆندی و لۆرا وەرزشی ڕێرۆیشتنمان لە کێڵگەکە ئەنجام دەدا. لەکاتێکدا کە دەستمان کرد بە سەرکەوتن بەسەر قەدپاڵێکی نشێو، کۆندی چووەناو بابەتێك لەسەر مێژووی بەلکان. من و لۆرا هەناسەبڕکێمان بوو. کۆندی لە ڕۆیشتن بەردەوام بوو و پارچەپارچەبوونی یوگسلاڤیا و دەرکەوتنی (میلۆسۆڤیچ)ی ڕوون دەکردەوە. ڕێچکەی ئەو قەدپاڵە ئێستا بە گردی باڵکان ناسراوە. بڕیارمدا کە ئەگەر بچمە ئۆفیسی ئۆڤاڵ، کۆندی رایس لە لای من بێت.

یەکەم دیاریکردنی کابینەکە ئاسان بوو. کۆلن پاوڵ دەبووە وەزیری دەرەوە. من یەکەمجار پاولم لە کامپ دەیڤد بینی لە ساڵی ۱۹۸۹دا کاتێك کە ئەو سەرۆکی ستاف سەربازی بوو. ئەو و دیك چێنی هاتبوونە لای باوکم تا هەواڵی خۆبەدەستەوەدانی دیکتاتۆری پانامایی، (مانوێل نۆرێگا)ی پێ بگەیەنن. کۆلن جلە سەربازییەکەی لەبەربوو. بە پێچەوانەی ڕەسمیاتی جلەکەی، ئەو سروشتێکی چاك و دۆستانەی هەبوو. ئەو لە ژوورەکەدا لەگەڵ هەمووان قسەی دەکرد، تەنانەت کەسانی لابەلای وەکو منداڵانی سەرۆکیش.

کۆلن بە شێوەیەکی بەرفراوان مەرغوب لە وڵاتدا و ئامادەییەکی بەرجەستەی هەبوو لە سەرتاسەری جیهاندا. ئەو بەشێوەیەکی پڕمتمانە بەرگری لە بەها و بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا دەکرد هەر لە ناتۆی بەهێزەوە تا بازرگانیی ئازادتر. بڕوام وابوو کە کۆلن دەتوانێ ببێتە دووەمین هاتنی (جۆرج مارشاڵ)، سەربازێك کە بوو بە پیاوی دەوڵەت.

ئەو دوو پۆستەی ئاسایشی نیشتمانی کە مابوون، بریتی بوون لە وەزیری بەرگری و بەڕێوەبەری هەواڵگریی ناوەندی. زیاتر لە دەیەیەك پاش ئەوەی دیواری بەرلین ڕووخا، بەشی هەرە زۆری وەزارەتی بەرگری هێشتا بۆ ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ جەنگی سارد دیزاین کرابوو. من بۆ ڕوئیایەکی پڕئاواتی وەرچەرخاندنی سوپا هەڵمەتم ڕێکخستبوو.

پلانم دانا بۆ ڕێکخستنەوەی بونیادی هێزمان و وەبەرهێنان لە تەکنۆلۆژیای نوێی وەکو چەکە بەدیقەتەکان و بەرگریی موشەکی. دەمزانی کە لەناو پێنتاگۆندا بەرهەڵستی دەبێت و من پێویستم بە وەزیرێکی مکوڕی تازەگەر هەبوو بۆئەوەی ڕێبەرێتیی هەوڵەکە بکات.

کاندیدی هەرە لەپێشم (فرێد سمیس) بوو، کە دامەزرێنەر و سەرۆکی بەڕێوەبەری (فیدئێکس) بوو. فرێد دوو ساڵ پێش من لە یەل تەخەروجی کردبوو، ئەستێرەی زیوینی وەکو مارینزێک لە ڤێتنام بەدەستهێنابوو و کۆمپانیاکەی لەناو بزنسێکی هەرە سەرکەوتووی جیهاندا بونیاد نابوو. ئەو حەزی لە سوپا بوو و ئەقڵێکی ڕێکخراوەیی دەهێنایە ناو پێنتاگۆن. ئاندی کارد پەیوەندی بە فرێدەوە کرد، زانی کە ئیشەکەی پێ باشە و بانگهێشتی کرد بۆ ئۆستن. من خۆم ئامادە کردبوو کە پۆستەکە بخەمەڕووی فرێد، بەلام بەر لەوەی گەشتەکە ئەنجام بدات، تووشی حاڵەتێکی نەخۆشیی دڵ بوو. دەبووایە خۆی بەدوور بگرێت بۆئەوەی تەرکیز بخاتەسەر تەندروستییەکەی.

ئێمە جۆرەها ناوی ترمان بۆ وەزیری بەرگری لەبەرچاو گرت، لەوانەش دان کۆتس کە سیناتۆرێکی باشی خەڵکی (ئیندیانا) بوو. پاشان کۆندی بیرۆکەیەکی جێ بایەخی هێنایە بەرباس: ئەی دۆن ڕەمسفێڵد چۆنە؟

دۆن بەری بیست و پێنج ساڵ وەزیری بەرگری بوو، لە ئیدارەی فۆرد دا. لەو کاتە بەدواوە، ئەو لە چەند کۆمسیۆنێکی ئاسایشی نیشتمانی کاریگەردا ئیشی کردبوو. من ڕەمسفێڵدم بۆ سی.ئای.ئەی دیاریکردبوو، نەک بەرگری. کاتێک چاوپێکەوتنم لەگەڵ ئەنجامدا، دۆن ڕونیایەکی سەرنجڕاکێشی بۆ وەرچەرخاندنی وەزارەتی بەرگری گەڵاڵە کرد. ئەو لەبارەی سوککردن، جوڵاوترکردن و خێرا جێگیرکراوکردنی هێزەکانمان قسەی کرد. هەروەها ئەو لایەنگیرێکی بەهێزی سیستەمی بەرگریی موشەکی بوو بۆ پارێزگاری لەدژی دەوڵەتە شەڕانگێزەکانی وەکو کۆریای باکوور و ئێران.

ڕەمسفێڵد کاری تێکردم. ئەو بە مەعریفەت، ڕەوانبێژ و باوەڕبەخۆ بوو. وەکو وەزیری پێشووی بەرگری، ئەزموون و توانای ئەوەی هەبوو کە گۆڕانکاریی گەورە بەسەر پێنتاگۆندا بێنێت. ئەو بیرۆکراسی بەڕێوە دەبرد، نەیدەهێشت بەڕێوەی ببات. دێک چێنی

که جێگری ڕەمسفێڵد بووە ئەو کاتەی کە لە کۆشکی سپیی فۆرد دا سەرۆکی ستاف بووە، پێداگریی لەسەر ئەو کرد.

تەنیا مەسەلەیەکی سەیر هەبوو. هەندێ بڕوایان وابوو کە ڕەمسفێڵد کاریگەریی خۆی بەکارهێناوە کە سەرۆک فۆرد ڕازی بکات بۆ دیاریکردنی باوکم وەکو بەڕێوەبەری سی.ئای.ئەی لە ١٩٧٥دا، ئەمەش وەکو ڕێگایەک بۆ کردنە دەرەوەی لە پێشبڕکێی جێگر سەرۆکی. هیچ ڕێگایەکم نەبوو بۆ ئەوەی بزانم ئاخۆ ئەمە ڕاست بووە. بەلام هەر جۆرە ناکۆکییەک لە بیست و پێنج ساڵ لەمەوبەر هەبووبێت لەنێوان ئەم و باوکمدا، مایەی نیگەرانی من نییە تا ئەو شوێنەی کە دۆن دەیتوانی کارەکەی ڕاپەڕێنێت. دۆن ئیتر بوو بە گەنجترین و کۆنترین کەس کە ببێتە وەزیری بەرگری.

بە چوونی ڕەمسفێڵد بۆ پێنتاگۆن، من چیتر کاندیدێکی پێشەنگم نەما بۆ سی.ئای.ئەی. من ڕیزێکی زۆرم بۆ ئاژانسەکە هەبوو بەهۆی ئەوەی کە باوکم ماوەیەک لەوێ بوو. من بۆ ماوەی چەند هەفتەیەک وەکو سەرۆکی هەڵبژێردراو بەر لە دەست بەکاربوونم لێدوانی هەواڵگریم وەردەگرت ئەو کاتەی کە چاوم بە بەڕێوەبەری ئەو ماوەیە، (جۆرج تێنێت) کەوت. ئەو پێچەوانەی ئەو جۆرە بەڕێوەبەرەی سی.ئای.ئەی بوو کە تۆ لە ڕۆمانەکانی سیخوڕیدا لەبارەیەوە دەتخوێندەوە– بۆینباخی قردێلەیی، سەر بە گروپی هەشت زانکۆکە، جۆری نوخبە بوو. تێنێت کابرایەکی سەر بە خەڵکی کرێکار بوو، کوڕی کۆچبەرانی یۆنانی بوو کە لە شاری نیویۆرک دەژیان. ڕاشکاو، زۆرجار بە هەمەڕەنگییەوە، دەدوا و ڕوون بوو کە بە قووڵی خەمی ئاژانسەکەی لەبەرە.

گەڕاندنەوەی بەڕێوەبەرەکەی سی.ئای.ئەی بیل کلینتن پەیامێک دەبێت بۆ بەردەوامی و پیشانی دەدات کە من ئاژانسەکەم لەسەروو دەستی سیاسەتەوە داناوە. داوام لە باوکم کرد کە هەندێ پەیوەندیی تەلەفۆنیی دەزگای سی.ئای.ئەی–یەکەی خۆیم بۆ بدۆزێتەوە. ئەو پێی وتم کە تێنێت لەناو بەرپرسەکاندا زۆر بەڕێز بوو. لەکاتێکدا کە من و جۆرج کەوتینە ناسینی یەکتری، بڕیارمدا لە بیرکردنەوەی جێگۆڕکێپێکردن بوەستم. بەڕێوەبەرە جگەرە لەدەمە ڕەچەڵەک یۆنانییەکە ڕازی بوو کە بمێنێتەوە.

***

بەشی هەرە زۆری، تیمی ئاسایشی نیشتمانی لە سالانی سەرەتای ئیدارەکەدا بە خاوی کاری کرد. بەلام تیمە ئابوورییەکە نا. کێشەکە بەشێکی پەیوەندی هەبوو بە ناکامی نەگونجاویی کارمەندان. وەکو سەرۆک، من سێ راوێژکاری ئابووریی سەرەکیم هەبوو: بەڕێوەبەری ئەنجومەنی ئابووریی نیشتمانی، سەرۆکی ئەنجومەنی راوێژکارانی ئابووریی و وەزیری خەزێنە. من (لاری لیندسە)ی)م هەلبژارد بۆ ئەوەی ئەنجومەنی ئابووریی نیشتمانی بەڕێوە بیات کە ئابووریناسێکی سەرکەوتوو و راوێژکاری بالا بوو لە هەلمەتەکەمدا. (گلێن هوبارد)، کە ئابووریناسێکی هۆشمەندی تر بوو، سەرۆکایەتیی ئەنجومەنی راوێژکارانی ئابووریی کرد. ئەوان بە دیزاینکردنی کەمکردنەوەی باج کە لە ماوەی هەلمەتەکەمدا پێشنیارم کردبوو، کارێکی باشیان ئەنجام دا. یاسایەکە بە زۆرینەیەکی دووحزبی، تێپەڕێنرا.

وەزیری خەزێنەم، هەمان ئامەزرێیی بۆ کەمکردنەوەی باج نەبوو. (پۆل ئۆنێیل) لەلایەن دیک، کلەی جۆنسن و ئەوانیتری تیمەکەوە پێشنیار کرابوو. سی ڤییە بەهێزەکەی سەرکەوتنی لە ئۆفیسی بەڕێوەبردن و بودجەدا و وەکو بەڕێوەبەری (ئەلکوا)ی یەکێک لە کۆمپانیاکانی (فۆرچن ١٠٠) گرتبووەخۆ. هەستم کرد کە ئەزموونی بزنسە پراکتیکییەکەی، رێزێک لەناو (وۆل ستریت) و (کاپیتل هێل) دروست دەکات.

بەداخەوە، شتەکان هەر لەسەرەتاوە بە چەوتی بەڕێوەچوون. پۆل کەمکردنەوەی باجەکانی بە سوک تەماشا کرد، کە بێگومان بەسەر مندا دەشکایەوە. من و ئەو زووزوو یەکترمان دەبینی، بەلام هەرگیز لەیەکتر نزیک نەبووینەوە. ئەو متمانەی منی بەدەست نەهێنا، نە دلنیایی جەماعەتی دارایی، کۆنگرێس یان هاوکارەکانیشی لە ئیدارەکەدا بەدەستهێنا. من هیوای وەزیرێکی خەزێنەی بەهێزم دەخواست– سەرکردەیەکی وەکو جیم بەیکەر یان بۆب رۆبن– کە سیاسەتە ئابوورییەکانمیان لە وتارەکانیاندا و لەسەر تەلەڤزیۆن بەرەوپێش دەبرد. بە هاتنی کۆتاییەکانی ٢٠٠٢، نزیکەی دوو ملیۆن ئەمریکی لە سالی پێشوودا ئیشیان لەدەستدابوو و پۆل–یش مکوڕیی ئێمەی نەدەگەیاند بۆ گەڕاندنەوەیان بۆ سەر ئیشەکانیان. لەبری ئەمە، ئەو کۆبوونەوەکانی ئۆفیسی ئۆڤالی بەکاردەهێنا بۆ قسەکردن لە بابەتە ناپەیوەندیدارەکان، وەکو پلانی بۆ باشکردنی

سەلامەتیی شوێنی کار لە کارگەی دروستکردنی دراو. نەمدەویست هەڵەی باوکم لە ١٩٩٢دا دووبارە بکەمەوە، کاتێک وەها باسکرا کە خۆی لە ئابووری قوتار کردووە. بڕیاری ئەوەمدا کە گۆڕانکارییەکی تیمی ئابووری باشترین ڕێگەیە بۆ پیشاندانی ئەمەی کە ئیدارەکەم جددیە لەبارەی ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو خاوبوونەوەیەی کە کار دەکاتە سەر هەموو ئەمریکییەک. بۆئەوەی گۆڕانکارییەکە متمانەی پێبکرێت، دەبوایە شوێنەواری دیار بێت. لاری لیندسەی کارێکی باشی ئەنجام دابوو و ئاسان نەبوو کە داوای لێ بکەیت بجولێت. ئەو لە پێویستیی دەستپێکێکی تازە تێگەیشتبوو و بەشێوەیەکی شارەزایانە مامەڵەی لەگەڵ هەواڵەکاندا دەکرد. پۆل-یش ئەمەی وەرنەدەگرت. من نائومێد بووم لەوەی کە ئەو لە حاڵەتە خراپەکانەوە دەستی پێکردبوو، بەڵام خۆشحاڵ بووم بەوەی کە بڕیارمدابوو ئەو کاتەی کە دام.

***

هاوینی دواتر، بانگهێشتێکی سەرسامکەرم پێگەیشت کە گۆڕانکارییەکی تر ئەنجام بدەم. هەر هەفتەیەک، من و دیک چێنی بەیەکەوە نانی نیوەڕۆمان دەخوارد، تەنیا من و ئەو پێکەوە. جیمی کارتەر و والتەر مۆندەیل نەریتەکەیان دەستپێکردبوو و لەو کاتەوە درێژەی هەبوو. کەشە ئارامبەخشەکە و دەرفەتی بیستنی هەر شتێک کە دیک لە مێشکیدا بوو، بەدڵم بوو. لەکاتێکدا کە هەمان ئەو کۆبوونەوەمان لەگەڵ یاریدەدەرانی باڵای تردا هەبوو، دیک تاکە کەسێک بوو کە لە خشتەکەمدا دووبارە دەبووەوە. من وەکو راوێژکارێکی باڵای تر نەمڕوانییە جێگر سەرۆک. ئەو ناوی خۆی خستبووە دەنگدانەوە و هەڵبژێردرا. دەمویست بەرانبەر هەموو ئەو پرسانەی لەسەر مێزەکەم بوون، ئاسودە بێت. دواجار، دەشیا کە ببنە هی ئەو لە هەر چرکەساتێکدا بێت.

من و دیک، لە ژوورێکی بچوکی نان خواردنی ئۆفیسی ئۆڤاڵدا نانمان دەخوارد. دیکۆری ناو ژوورەکە، پەیکەری برۆنزی گای گرتبووە خۆ کە لەلایەن هەندێ هاوڕێی خۆرهەڵاتی تەکساس پێم بەخشرابوو. هەروەها تابلۆیەکی دیمەنی لێبوو کە کەنار دەریای (مەین)ی بیر دەهێنامەوە. پارچەی هونەریی هەرە دیار لە ژوورەکەدا، پۆرترێتی (جۆن کوینسی ئادەمز) بوو، کە تاکە کوڕێکی سەرۆکێکی تر بوو کە ئۆفیس بگرێتە دەست. من وەکو

تونکەیەکی خۆمانە لەگەڵ باوکمدا هەڵمواسیبوو. ڕۆژێکی سەرەتاکانی سەرۆکایەتییەکەم، ئەو تواناجی لێدەدام لەبارەی خزمایەتیی تایبەتی نێوان (دەبلیو) و (تکیو). پێم وت کە دەبێ لە ڕوخساردا بۆ کیو بگەڕێت کاتێکی تر کە هەستی کرد پلارگرتن پێویستە. من زۆرم لەبارەی کوینسی خوێندبووەوە. سەرسام بووم بە پرەنسیپە دژە کۆیلەییەکانی، هەرچەندە شەیدای هەڵمەتەکەی نەبووم بۆ کردنەدەری تەکساس لە یەکێتییەکە. لەگەڵ ئەوەشدا، پۆرترێتەکەم لە تەواوی ماوەی سەرۆکایەتییەکەمدا لە کۆشکی سپی هەڵواسی.

لە ناوەڕاستەکانی ۲۰۰۳دا، دیک نیوەڕۆخوانەکانی هەفتانەی پێکەوەمانی بە قسەیەکی نائاسایی دەستپێکرد. ئەو وتی، "جەنابی سەرۆک، دەمەوێ بزانی کە پێویستە بەلاتەوە ئاسایی بێت لە خولی خۆهەڵبژاردنەوەتدا لەگەڵ یەکێکی تردا خۆت کاندید بکەیت. بە جۆرێك لێمی وەرمەگرە". پرسیاری تەندروستییەکەیم لێکرد. وتی دڵم باشە. ئەو تەنیا ڕەئی ئەوەی هەبوو کە دەبێ بڕارەی تازەکردنەوەی لیستەکەم لەبەرچاو بگرم. پێشنیارەکەی کاری تێکردم. ئەمەیان شتێکی ناباو بوو لە واشنتنی برسی دەسەڵاتدا. ئەمە جەختێك بوو لەو هۆکارانەی کە بۆچی هەر لەسەرەتاوە چێنی-م هەڵبژارد.

من پێشنیارەکەیم لەبەرچاو گرت. قسەم لەگەڵ ئاندی، کارل و چەند کەسێکی تر کرد لەبارەی ئەگەری داواکردن لە بیل فریست، سێناتۆری کاریگەری تێنێسی کە ببووە سەرکردەی زۆرینە، بۆئەوەی لەبری چێنی ببێتە هاوەڵی خۆکاندیدکردنم. هەموومان چاوەڕوانیی ئەوەمان دەکرد کە ۲۰۰٤ هەڵبژاردنێکی تری نزیك بێنێتە پێشەوە. لەکاتێکدا کە دیك یارمەتیدەر بوو لە بەشە گرنگەکانی پێکەکەمان، ئەو ببووە ئامانجی ڕاستەوخۆی ڕەخنە لەلایەن میدیا و چەپەکانەوە. ئەو وەکو تاریکایی و بێ دڵ دەبینرا- موجریمی ئیدارەکە.

دیك زۆر باکی بە وێنەکەی نەبوو- کە من کەیفم پێی دەهات- بەلام ئەمە ڕێگەخۆشکەر بوو بۆ ئەوەی کاریکاتێرەکان دروست بن. یەکێك لە ئەفسانەکان ئەوە بوو کە لە ڕاستیدا دیك کۆشکی سپی بەڕێوە دەبات. هەمووان لە ناو بینایەکەدا، لەوانەش

جێگر سەرۆک، دەیانزانی کە ئەمە وانییە. بەڵام بۆچوون لە دەرەوەرا وەها بوو. قبولکردنی پێشنیارەکەی دیک، شێوازێك دەبوو بۆئەوەی کە پیشانی بدەم من بەرپرسم. چەندەی زیاتر بیرم لێبکردایەتەوە، زیاتر هەستم بەوە دەکرد کە دەبێ دیک بمێنێتەوە. ئەوم بۆ ئەوە هەڵنەبژاردبوو کە ببێتە موڵکێکی سیاسی، بۆئەوە هەڵمبژاردبوو کە یارمەتیم بدات کارەکە بکەم. ئەمەش کتومت ئەوە بوو کە ئەنجامی دابوو. ئەو هەر ئەرکێك کە پێم بسپاردایە قبولّی دەکرد. ئەو رەئییە بێ پێچ و پەناکانی پێ ئەوتم. ئەو لەوە تێگەیشت کە من دوایین بڕیارەکانم داوە. کاتێك ناکۆك دەبووین، ئەوا ناکۆکییەکانی بە نهێنی دەهێشتەوە. لەهەمووی گرنگتر، متمانەم بە دیک هەبوو. پایەدارییەکەیم بەرز دەنرخاند. خۆشیم دەبینی لەوەی کە لەلای دەبووم. ببووە هاورێیەکی باشیش. چەند هەفتەیەك دواتر لە نیوەڕۆخوانێکماندا، داوام لە دیك کرد بمێنێتەوە، ئەویش رازی بوو.

***

لەکاتێکدا کە هەڵبژاردنی ٢٠٠٤ نزیك بووەوە، نیگەرانیم لەمەڕ ناکۆکیی زیادبووی ناو تیمی ئاسایشی نیشتمانی پەیدابوو. لە زۆربەی ئیدارەکاندا، لێکهەڵبەزینەوەیەکی سروشتی لەنێوان دیپلۆماتەکانی وەزارەتی دەرەوە و جەنگاوەرەکانی وەزارەتی بەرگری هەیە. شەڕی وەزیری دەرەوە، جۆرج شولتز و وەزیری بەرگری کاسپەر واینبێرگەر لە ماوەی ئیدارەی ریگن-دا دەنگدانەوەی هەبوو. سەرۆك فۆرد بە شێوەیەکی سەرەکی لەبەرئەوە جێگۆڕکێی بە وەزیری بەرگری جەیمز شلێزینگەر کرد چونکە نەیدەتوانی لەگەڵ هێنری کیسنجەر بگونجێت. من رێگریم نەبوو لە هەندێ ناکۆکیی ئەفرێنەرانە لەناو دامەزراوەکەدا. ناکۆکیی بۆچوون لەناو راوێژکارەکاندا یاریدەدەر بوو بۆ روونکردنەوەی بڕیارە سەختەکان. کلیلی مەسەلەکە ئەوە بوو کە دەبووایە ناکۆکییەکان بەرێزەوە دەرببڕدرێن و بڕیارەکانی منیش وەکو ئەنجامی کۆتایی قبولّ بکرێن.

پاش رزگارکردنی سەرکەوتووانەی ئەفغانستان، بۆڵەبۆڵی ناوچەیی نێوان وەزارەتی دەرەوە و وەزارەتی بەرگری شایەنی تەحەمول دیار بوو. بەڵام کاتێك مشتومڕ لەسەر عێراق توند بوو، بەرپرسانی باڵای هەردوو وەزارەتەکە کەوتنە قسەی رەق بە یەکتر وتن.

لەلای من، کۆلن و دۆن هەمیشە بەڕێز بوون. بە تێپەڕبوونی کات بۆم دەرکەوت کە ئەوان جوتێك زۆرانبازی کۆنن کە دەمانچەکانیان لە کیفەکانیاندا هەلگرتووە، بەلام ڕێگە دەدەن بە کارمەندانی دووەمی و سێیەمییان کە شەڕ بکەن.

نموونەیەکی لەیادنەچوو لە یەکێك لە لێدوانە تەلەڤزیۆنییەکانی دۆن ڕەمسفێلد دابوو، کە لە دەستپێکردنی شەڕی ئەفغانستانەوە تەقریبەن ڕۆژانە لێدوانێکی وەهای ئەدا. تەماشاکردنی مامەڵەی دۆن لەگەڵ چاپەمەنیدا خۆش بوو. ئەو شارەزا بوو لە خۆلادان لە پرسیارەکانی ریپۆرتەرەکان و ڕووبەڕووبوونەوەکەی پڕ وزە و زیرەکانە بوو. حەزم کرد توانجی لێبدەم لەبارەی ئەستێرەییەکەی لەسەرە تەلەڤزیۆن لە سەرەتای پاش نیوەڕۆدا. پێم وت " تۆ ئەستێرەیەکی نمایشی بۆ خەڵکانی سەروو شەست ساڵ". ئەو توانجەکەی بە ئاسایی وەرگرت.

لەکانوونی دووەمی ۲۰۰۳دا، ریپۆرتەرێکی تەلەڤزیۆنیی هۆڵەندی پرسیار لە دۆن کرد ئاخۆ بۆچی هاوپەیمانە ئەوروپییەکانی ئەمریکا زیاتر پاڵپشت نەبوون بۆ بانگەوازەکانمان بۆ لێپێچینەوەی سەدام حسێن. دۆن لە وەڵامدا وتبووی "تۆ وەکو ئەڵمانیا و فەرەنسا بیر لە ئەوروپا دەکەیتەوە . بەلام من نا. من پێم وایە ئەوە هەر ئەوروپا کۆنەکەیە".

من لەگەڵ بۆچوونەکەی دۆن-دا هاوڕابووم. سیستەمە دیموکراسییە تازەکانی ناوەڕاست و خۆرهەڵاتی ئەوروپا لە سەرەتاوە لە مۆتەکەی دیکتاتۆری تێگەیشتبوون و پشتگیریی هەنگاونانیان لە دژی سەدام حسێن کردبوو. بەلام ئەوەی کە هەواڵەکەی دروستکرد ئەو بەلگاندنە مەعقولە نەبوو. ئاماژەکردن بە ئەڵمانیا و فەرەنسا وەکو "ئەوروپای کۆن" تەوژمێکی ناڕەزایی لێکەوتەوە.

کۆلن زۆر توڕە بوو. ئەو هەوڵی دەدا ئەڵمانی و فەرەنسییەکان ڕازی بکات تا بێنە پاڵ قەزیەکەمان لە نەتەوە یەکگرتووەکاندا و پێی وابوو کە دۆن هاتووەتە سەر ڕێگەی بە شێوەیەك کە ئەرکە دیپلۆماسییەکەی ئالۆز کردووە. کارمەندەکانیشی هەمان هەستیان هەبوو. مشتومڕەکانی سیاسەت کە جارێك لە جاران لەودیو دەرگا داخراوەکانەوە ئەنجام دەدران، هەلڕژانە ناو چاپەمەنییەکانەوە.

زۆر ناخۆش بوو بەلامەوە کە سەردێڕی وەکو "کۆشکی سپییەکی دابەشبوو: شەڕی ناوخۆی ئیدارەی بوش" و " ڕۆڵی دواتری بوش: ناوبژیوانی مشتومڕەکان لەبارەی بەڕێوەبردنی عیراقی پاش جەنگ" بخوێنمەوە. من لە کۆبوونەوەکانی ئەنجومەنی ئاسایشی نیشتمانی(ئێن.ئێس.سی) ڕامگەیاند کە شەڕەدەمە و دزەکردنەکان زیان بە متمانەمان دەگەیەنن و سوتەمەنی بە ڕەخنەگرەکانمان دەدەن. بە تەنیا قسەم لەگەڵ هەریەک لە دۆن و کۆلندا کرد. داوام لە دیك و کۆندی کرد کە لە پشت پەردەوە ئیش بکەن. بە جێگری لێهاتووی کۆندی (ستیڤ هادلی)م وت کە بە کارمەندە پلە دووەمی و سێیەمییەکان بڵێت کەشەکە ئارام بکەنەوە. هیچ سوودی نەبوو.

***

لە بەهاری ٢٠٠٤دا، دۆن بە هەواڵێکی جددییەوە هاتە لام. وەکو بەرەنگارییەك لە فرمانەکانیان و یاسای سەربازی، سەربازە ئەمریکییەکان زۆر بە قورسی مامەڵەی خراپیان لەگەڵ بەندییەکاندا کردبوو لە زیندانێکی عیراق بەناوی (ئەبوغرێب). زۆر حاڵم تێکچوو. ئەمە ئەو شتە نەبوو کە سوپاکەمان یان وڵاتەکەمان نوێنەرایەتی دەکرد. لەکاتێکدا کە ئەنجامدەران دادگایی سەربازی کران، ناوبانگی ئەمریکا زەربەیەکی توندی بەرکەوت. من ئەمە بە خاڵێکی نزمی سەرۆکایەتییەکەم لەقەڵەم دەدەم.

من بەهەمان شێوە واقم وڕما. دۆن پێی وتبووم کە سوپا لێکۆڵینەوە لە هەندێ ڕاپۆرتی ئەتککردنی ناو زیندان دەکات، بەڵام من هیچ بیرۆکەیەکەم نەبوو لەبارەی ئەمەی کە وێنەکان شێوەیان چۆنە یان چەند نامۆن. یەکەم جار کە بینیمن ئەو ڕۆژە بوو کە لە بەرنامەی (شەست خولەك)ەوە پیشان دران. من خۆشحاڵ نەبووم بەو شێوازەی کە مامەڵە لەگەڵ بارودۆخەکەدا کرا. تیمەکەی کۆشکی سپیش هەمان هەستیان هەبوو. خەڵکی دەستی کرد بە قسە لە چاپەمەنییەکانەوە و پەنجەی ئاماژەیان ڕادەکێشا، زۆربەشی لەبەرانبەر وەزیری بەرگریم. کاتێك دۆن پەیامی ڕاپۆرتەکانی پێگەیشت، تێبینییەکی دەستنووسی پێ گەیاندم: "جەنابی سەرۆك، دەمەوێ ئەوە بزانیت کە

ئەتوانی نامەی دەستلەکارکێشانەوەم وەکو وەزیری بەرگری وەربگریت هەر کاتێك هەستت کرد بارمەتیدەر دەبێ بۆت".

ئەو دۆنم بانگ کرد و پێم وت دەست لەکارکێشانەوەکەی قبول ناکەم. من لەبەرانبەر خراپ مامەڵەکردنی سەربازەکان لە ئەبوغرێب لۆمەی ئەوم نەدەکرد. نەشمدەویست لەبری کەر لە کورتانەکە بدەم. دەمویست کێشەکە چارەسەر بکرێت و ئەمەشم لەو دەویست. چوار رۆژ دواتر، دۆن نامەیەکی تری درێژی نارد. نووسیبووی:

لەماوەی چەند رۆژی رابردوودا، بیرێکی چاکم لە بارودۆخەکە کردەوە، لەبەردەم کۆنگرێس شایەتیمدا و تێڕوانینەکانی تۆم لەبەرچاو گرت. رێزێکی زۆرم بۆ تۆ، بۆ سەرکردایەتیی بێ وێنەی تۆ لە جەنگیی جیهانی دژی تیرۆر و هیواکانت بە وڵاتەکەت هەیە. لەگەڵ ئەوەشدا، گەیشتمە ئەو ئەنجامەی کە زیانی سەرچاوەگرتوو لە مامەڵە خراپەی لە ژێر چاودێری مندا کرا، لەلایەن ئەو کەسانەوە کە رەفتاریان سەرەنجام من لێی بەرپرسم، دەشێت بەباشترین شێوە لە رێگەی دەستلەکارکێشانەوەی منەوە وەڵام بدرێتەوە".

من رێزم هەبوو بۆ دۆن لە بەرانبەر دووبارەکردنەوەی پێشنیارەکەی. روون بوو کە پەیامەکەی پێشووی تەنیا رەسمیاتێك نەبووە، بەڵکو شێلگیر بوو لەسەر رۆیشتن. ئەمە گەواهییەك بوو بۆ کارەکتەرەکەی، دڵسۆزییەکەی بۆ ئۆفیس و تێگەیشتنی لەو زیانەی کە ئەبوغرێب خستبوویەوە. من بە جددی رەچاوی قبوڵکردنی ئامۆژگارییەکەیم کرد. دەمزانی کە ئەمە ئاماژەیەکی بەهێزە کە سەرۆکی پێنتاگۆن جێگۆڕکێ پێبکەیت پاش ئەو هەڵە گەورەیە. بەڵام فاکتەرێکی گەورە من پاشگەز کردەوە: جێگرەوەیەکی ئاشکرا لەئارادا نەبوو بۆ دۆن و من نەمدەتووانی بۆشاییەك لە سەری سەرەوەی وەزارەتی بەرگری دروست بکەم.

لەکاتێکدا کە بڕیارمدا ئیستیقالەکەی دۆن قبوڵ نەکەم، بەهاری ٢٠٠٤ دیاریکەری کۆتایی ئۆقرەگرتنم بوو لەبەرانبەر ئەو مقۆمقۆیەی لەناو تیمی ئاسایشی نیشتمانیدا هەبوو. ئەوەی کە وەکو تەنگژەیەکی ئەفرێنەرانە دەستی پێکردبوو، ببوو بە شتێکی وێرانکەر. دەنگۆکانی پەیوەست بە ناکۆکییەکان روکەشێکی لەبارەی نارێکی پەرپوتیی

ناو ئیدارەی گەشە پێدەدا و من بەمە پەست ببووم. گەیشتمە ئەو ئەنجامەی کە دوژمنایەتییەکە ئەوەندە بە قووڵی بەرجەستە بووە کە تاکە چارەسەر گۆڕینی سەرتاپای تیمی ئاسایشی نیشتمانیە پاش هەڵبژاردنی ٢٠٠٤.

کۆلن پاول بۆ ئاسانتر کردم. هەمان بەهاری ٢٠٠٤، ئەو پێی وتم کە ئامادەیە بجولێت. ئەو سێ ساڵی سەخت خزمەتی کردبوو و بەشێوەیەی سروشتی تاقەتی لێبڕابوو. هەروەها ئەو پیاوێکی هەستیار بوو کە بەهۆی ناکۆکیی ناوەوە بریندار ببوو و بەهۆی شکستی دۆزینەوەی چەکی کۆکوژ لە عیراق بێ ئومێد ببوو. داوام لە کۆلن کرد کە لە هەڵبژاردنەکەدا بمێنێتەوە و سوپاسگوزار بووم کە رازی بوو.

راگەیاندنی رەسمیی سەرەتایی کاتێکی زۆری پێدام بۆ بیرکردنەوە لە جێگرەوەیەک. کۆلنم بەلاوە پەسەند بوو، بەڵام هەندێ جار وا دیار بوو کە ئەو وەزارەتی دەرەوەیەی کە ئەو بەڕێوەی بردبوو، بە تەواوی لەگەڵ فەلسەفە و سیاسەتەکانی مندا نەیەتەوە. بۆ من گرنگ بوو کە درز لەنێوان سەرۆک و وەزیری دەرەوەدا نەبێت. پاش شەش ساڵ پێکەوەبوون لە کۆشکی سپی و لە هەڵمەتەکەدا، من زۆر لە کۆندی رایس نزیك ببوومەوە. دەیتووانی مێشك و میزاجم بخوێنێتەوە. روئیایەکی هاوبەشمان بۆ جیهان، هەبوو و ئەو ترسی ئەوەی نەبوو کە ئەو کاتەی لەگەڵ من هاوڕا نەبووایە پێم بڵێت.

بەهرەکانی کۆندی کاریگەر بوون. من لێدوانی ئەوم لەبەردەم ئەندامانی کۆنگرێسدا و بۆ راگەیاندنەکان لەبارەی پرسەکانی ئاسایشی نیشتمانی تەماشاکردبوو. ئەو پیانیستێکی بەهرەمەند بوو کە لەگەڵ (یۆیۆ ما) عەزفی کردبوو. ئەو بە داستانی گەورەبوون لە ناوچەی جیاکراوەی باشوور، ئیلهامی بەخەڵك بەخشیبوو. هەروەها دەیزانی چۆن مامەڵە لەگەڵ هەندێ لە گەورەترین کەسایەتییەکانی جیهاندا بکات.

ئەمەم لە مانگی ئازاری ٢٠٠١دا بینی، کاتێك کۆبوونەوەیەکم لەبارەی سیاسەتی پەیوەندیدار بە کۆریای باکوور رێکخست وەکو خۆئامادەکردنێك بۆ سەردانی رۆژی دواترم لەگەڵ سەرۆك (کیم دای جونگ)ی کۆریای باشوور، کە یەکەم سەردانم بوو لەگەڵ سەرۆکی دەوڵەتێکی ئاسیایی. ئیدارەی پێشوو هەندێ سازشی خستبووەڕووی دیکتاتۆری کۆریای باکوور (کیم جۆنگ ئیل) لەبەرانبەر پەیمانێکدا بۆ دەستبەرداربوون لە

پرۆگرامی چەکە ناوکییەکەی، سیاسەتەکە کاریگەری نەبوو و من بە تیمەکەم وتبوو کە ئەبێ بیگۆڕین. لەوکاتە بەدواوە، دەبووایە کۆریای باکوور رەفتاری خۆی بگۆڕێت بەر لەوەی ئەمریکا سازش بخاتەروو.

لە سەعات ٥:١٥ی بەیانیی دواتر، من واشنتن پۆستم دەخوێندەوە. بابەتێک بەم شێوەیە دەستی پێکردبوو "دوێنێ وەزیری دەرەوە کۆلن پاول وتی، ئیدارەی بوش نیازیەتی لەو شوێنەوە دەست پێبکات کە ئیدارەی کلینتن جێی هێشتبوو لە دانوستانەکاندا لەگەڵ کۆریای باکوور لەسەر پرۆگرامی موشەکەکانی". من سەرم سوڕما. من بۆ ئەوەچووم کە ریپۆرتەرەکە قسەکەی کۆلنی رتووش کردبێت، چونکە بابەتەکە تەواو پێچەوانەی ئەوە بوو کە لە کۆبوونەوەکەدا قسەمان لەسەر کردبوو. بانگی کۆندیم کرد. ئەویش وەکو من لەوانەیە کە زوو لە خەو هەڵدەستێت، بەڵام هێشتا رۆژنامەکەی نەبینیبوو. من پوختەیەکی بابەتەکەم پێدا و وتم، " تا ئەو کاتەی کە کۆلن دەگاتە کۆشکی سپی بۆ کۆبوونەوە، دەبێ ئەمە چاک بکرێت". من ئەرکێکی نیگەرانکەرم بە کۆندی سپاردبوو، دەبووایە بە وەزیری دەرەوە رابگەیەنێت، ژەنەراڵێک جیهانیی پێشوو کە جیلێک لەو بەتەمەنتر بوو، کە قسەکەی راست بکاتەوە. کاتێکی دواتری ئەو بەیانییە، کۆلن بە هەنگاوی پەلەوە هاتە ئۆفیسی ئۆڤاڵ و وتی" جەنابی سەرۆک نیگەران مەبە، هەموو شتێک صاف کرا". ساڵی دواتر، داوام لە کۆندی کرد کە هەمان ئەرک لە بەرانبەر جێگر سەرۆکدا بگرێتە بەر. ئابی ٢٠٠٢ بوو و من بیرم لە بڕیارێکم دەکردەوە ئاخۆ سۆراخی بڕیارێکی نەتەوە یەکگرتووەکان بکەم کە پشکنەرانی چەک بنێرمەوە بۆ عیراق. دیک وتارێکی لە (کۆنفرانسی جەنگاوەرە دێرینەکانی دەرەوە) پێشکەش کرد کە تیایدا وتبووی "گەڕانەوەی پشکنەران ئاسودەییەکی هەڵە دەبەخشێت لەمەڕ ئەوەی کە سەدام بەشێوەیەک لە شێوەکان چووەتەوە ناو قاوغی خۆی". ئەمە وا دەرکەوت وەک بڵێی من ئیتر بڕیارەکەم داوە. بەڵام من هێشتا لە بژارەکانم ورد دەبوومەوە. من داوام لە کۆندی کرد کە بۆ دیکی روون بکاتەوە کە لەبەردەم پۆستەکەی منەوە هاتووەتە دەرەوە. ئەو تەلەفۆنی کرد و ، لە چاکەی دیک، جارێکی تر ئەمە رووی نەدایەوە. بە ماوەیەکی کورت دوای هەڵبژاردنی ٢٠٠٤، خۆم ئامادەکرد بۆ راگەیاندنی پاڵاوتنی کۆندی وەکو وەزیری

دەرەوە. بۆ پڕکردنەوەی پۆستی ڕاوێژکاری ئاسایشی نیشتمانی، بڕیارمدا (ستیڤ هادلی)ی جێگرە بەتواناکەی بۆ ئەو پلەیە بەرز بکەمەوە، کە پارێزەرێکی خاکی و هۆشمەند بوو و ئامۆژگارییەکانی هەمیشە پایەدار، نهێنی و کارتێنەکراو بوو بە هیچ ئەجێندایەکی کەسی. پاشان، لەناکاو، ئاندی پێمی ڕاگەیاند کە کۆلن باسی لە پەشیمانبوونەوەی وازهێنان کردووە. من وەکو هاوڕێ سەیری کۆلنم دەکرد و ستایشی دەستکەوتەکانیم دەکرد، بەتایبەت لە کارەکەیدا بۆ سازدانی هاوپەیمانێتییەکی بەهێز لە جەنگی دژەتیرۆر و دانانی زەمینەی ئاشتیی ئایندە لەنێوان ئیسرائیلی و فەلەستینییەکاندا. بەڵام من هەنوکە بڕیارم لەسەر کۆندی دابوو.

من هەمیشە لەوە ڕاماوم ئاخۆ هۆکاری ڕاڕا بوونی کۆلن لەوەی کە وازبهێنێت ئەوە بووە کە چاوەڕوانی کردووە دۆن ڕەمسفێڵدیش بڕوات. ئەو لەوەدا ڕاست بووە کە گریمانەی ئەوەی کردبێت. من پلانی ئەوەم دانابوو کە گۆڕانکارییەک بکەم لە وەزارەتی بەرگریدا وەکو بەشێك لە تیمی ئاسایشی نیشتمانی. لە دوادواکانی ٢٠٠٤دا، داوام لە ئاندی کرد بچێتە لای فرێد سمیس بۆئەوەی بزانێ بیر لە ئیشەکە دەکاتەوە. من فرێدم بینیبوو و تەندروستی باش بوو. ئەمجارەیان کێشەکە تەندروستی خۆی نەبوو، بەڵکو هی کچە گەورەکەی بوو. وێندی بە حاڵەتێکی کوشندەی بۆماوەیی دڵەوە لەدایك ببوو و سمیس پێویستی بەوە بوو کە کاتەکەی لەگەڵدا بەسەر ببات. بەداخەوە هەر لە ٢٠٠٥یشدا مرد.

من جێگرەوەی شیمانەیی ترم بۆ وەزارەتی بەرگری لەبەرچاو گرت. بیرم لەوە کردەوە کە کۆندی بۆ پێنتاگۆن بنێرم، بەڵام پێم وابوو کە دەبێتە وەزیرێکی دەرەوەی باشتر. سیناتۆر (جۆ لیبەرمان)ی ویلایەتی کۆنێکتیکەتم لەبەرچاو گرت، بەڵام پێم وابوو کە ئەویش گونجاو نییە. لەکاتێك لە کاتەکاندا خۆم گەیاندە جیم بەیکەر. ئەگەر ئەو قبوڵی بکردایە، ئەوا دەیتووانی بانگەشەی تاجی سێیینەی مێژوویی بکات وەکو یەکەم کەس کە تاوەکو ئێستا وەکو وەزیری دەرەوە، وەزیری خەزێنە و وەزیری بەرگری خزمەتی کردووە. بەڵام ئەو خۆشی لە خانەنشینییەکەی دەبینی و بایەخی نەدەدا بە گەڕانەوە بۆ واشنتن.

ڕاستییەکەی ئەوەیە کە خەڵکێکی زۆر نییە کە بتوانن لەماوەی جەنگێکی جیهانیی ئاڵۆزدا سوپا بەڕێوە ببەن. دۆن ڕەمسفێڵد یەکێك بوو لە چەند کەسێکی دیاریکراو. ئەو ئەزموونێکی بەنرخی هەبوو و هاوبەشی دیدی من بوو لە جەنگی دژەتیرۆر وەکو ململانێیەکی ئایدۆلۆژیی دوورمەودا. چەند جارێك، دۆن منی نائومێد کردووە لە ڕەقییەکەی بەرانبەر سەرکردەکانی سوپا و ئەندامانی ستافەکەم. پێم وابوو ئەو هەڵەی کردووە بە خۆدزینەوە لە مەراسیمی خانەنشینی ژەنەراڵ (ئێریك شینسێکی)، سەرۆکی ستافی سوپا بە چوار ئەستێرەوە کە لە ساڵی ٢٠٠٣ پاش ئەزمونێکی پڕشانازی وازی لە کارەکەی هێنا. بڕیاری دۆن یاریدەدەر بوو بۆ دروستبوونی ئەو بۆچوونە هەڵەیەی کە ژەنەراڵ لەکارەکەی دەرکراوە لە بەرانبەر ناکۆکیی سیاسی لەسەر عێراق.

لەگەڵ ئەوەشدا کەیفم بە دۆن هەر دەهات. ئەو ڕێزی لە هەیکەلی قیادی دەگرت. ئەو و (جۆیس)ی ژنی، خۆیان تەرخان کردبوو بۆ سەربازەکانمان و زوو زوو سەردانی نەخۆشخانە سەربازییەکانیان دەکرد بەبێ ئەوەی سەرنجی چاپەمەنی ڕابکێشن. دۆن، بە وەرچەرخاندنی سوپا، کارێکی باشی ئەنجام دەدا، ئەرکێك کە هەر لەسەرەتاوە منی بەلای ئەودا ڕاکێشابوو. ئەو ڕێژەی فڕۆکە بێ فڕۆکەوانەکانی زیاد کردبوو، هێزەکانمانی پڕجموجۆڵتر کردبوو، توانای تێلێکۆمیونیکەیشنی سوپای بەرفراوان کرد بۆئەوەی بتوانین باشتر سوود لە وێنە و زانیاریی هاوکات وەربگرین، دەستی کرد بە هێنانەوەی هێزەکانمان لە سەنگەرەکانی جەنگی ساردی پێشوو بۆ نیشتمان لە وڵاتانی وەکو ئەڵمانیا و وەبەرهێنانێکی گەورەی کرد لە (هێزە تایبەتییەکان)دا، بەتایبەت لە یەکخستنی هەواڵگری و ئۆپەراسیۆنە تایبەتەکاندا.

سەرباری ڕوخساری دەرەکیی سەختی، دۆن ڕەمسفێڵد پیاوێکی شایستە و خەمخۆر بوو. ڕۆژێکیان من و ئەو لە ئۆفیسی ئۆڤاڵ بووین. ئەو تازە هەواڵی لەبارەی ئۆپەراسیۆنی سەربازی بە من گەیاندبوو و پێش کۆبوونەوەی دواتر چەند خولەکێکم هەبوو. هەروا بە شێوەیەکی ئاسایی لەبارەی خێزانەکەیەوە پرسیارم لێیکرد. ئەو یەکەم جار وەڵامی نەدایەوە. دواجار چەند قسەیەکی درکاند، بەڵام دواتر دەستی کرد بە گریان. ئەو بۆی ڕوون کردمەوە کە (نیك)ی کوڕی لە ململانێیەکی سەختی بەکاربردنی ماددە

هۆشبەرەکاندایە. بڕینی دۆن قـوول بـوو، خۆشەویستییەکەی ڕاستەقینە بـوو. چەند مانگێك دواتر هەواڵی نیکم لێ پرسی. دۆن گەشایەوە و ڕوونی کردەوە کە کوڕەکەی، بە بوژاندنەوەدا تێپەڕیوە و باشە. بینینی فەخری دۆن بە توانا و کارەکتەری کوڕەکەی، کاریگەر بوو.

جارێکی تر، لە ساڵی ٢٠٠٦دا هاوبەشی خەمی دۆنم کردەوە کاتێك گروپێك ژەنەراڵی خانەنشین تەوژمێك ڕەخنەی ئاشکرایان ئاراستەی کرد. لەکاتێکدا کە من هێشتا بیرم لە گۆڕینی کارمەندان دەکردەوە، ئەستەم بوو ڕێگە بدەم کە گروپێك ئەفسەری خانەنشین خۆم بەسەردا بسەپێنن بۆ وەزیری مەدەنیی بەرگری. ئەمە وەکو کودەتایەکی سەربازی دەردەکەوت و لێکەوتەیەکی کارەساتئامێزی دەبوو.

لەکاتێکدا کـە ٢٠٠٦ تێپـەڕی، بارودۆخی عیراق پەیتاپـەیتا خراپتر بـوو. توندوتیژیی تایەفی وڵاتەکـەی پەرتـەوازە دەکرد. لـە سـەرەتاکانی پـایزدا، دۆن پێـی وتم بـیری لـەوە کردووەتەوە کە لەوانەیە ئێمە پێویستمان بە "دیدێکی تازە" هـەبێت بۆ کێشەکە. من هاوڕا بووم لەسەر ئەوەی کە گۆڕانکاری پێویستە، بەتایبەت لەو کاتەوە کە من بە جددی لە ستراتیژییەکی نوێ ڕامابووم، واتە (زیادکردن). بەڵام هێشتا لـە ململانێـی دۆزینـەوەی جێگرەوەیـەکی لێهـاتوودا بـووم. ئێوارەیـەکی پـایزی ٢٠٠٦، خـەریکی دەمەتـەقێ بـووم لەگەڵ هاوڕێی ئامادەیی و کۆلێژم، (جاك مۆریسن)، کـە مـن لـە (دەسـتەی ڕاوێـژکاریی هەواڵگریی دەرەوەی سەرۆك) دامەزراندبوو. من نیگەرانی خراپبـوونی بـارودۆخی عـیراق بووم و ئاماژەم بە قسەکەی دۆن کرد لەمەڕ ئەوەی کە پێویستمان بە دیدی تازە هەیە.

جاك وتی "بیرۆکەیـەکم هەیـە. (بـۆب گـەیتس)ت پـێ چۆنە؟" ئەو پێی وتم کە بـەم دواییانە چاوی بە گەیتس کەوتووە وەکو بەشێك لە کاری دەستەی ڕاوێژکارییەکەی.

بۆچی من بیرم لە بۆب نەکردبووەوە؟ ئەو بەڕێوەبەری سی.ئای.ئەی بوو لـە ئیدارەی باوکم و جێگری ڕاوێژکاری ئاسایشی نیشتمانی بوو لای سەرۆك ریگن. ئەو دامەزراوەیەکی گەورەی (زانکۆی ئەی ئەند ئێم تەکساس)ی بـە سـەرکەوتوویی بـەڕێوە بردبـوو. ئـەو لـە کۆمـسیۆنی بەیکـەر-هـاملتن دا خزمـەتی کردبـوو کـە کارەکـەیان توێژینـەوە بـوو لـە کێشەکانی ناو عیراق. ئەو کەسێکی نموونەیی دەبوو بۆ ئیشەکە.

دەستبەجێ تەلەفۆنم بۆ ستیف هادلی کرد و داوام لێکرد سۆراخێکی بۆب بکات. ئێمە ساڵی پێشوو هەوڵماندابوو کە بیکەین بە بەڕێوەبەری هەواڵگری نیشتمانی، بەڵام ئەو رەتی کردبووەوە، چونکە حەزی لە ئیشەکەی خۆی بوو وەکو سەرۆکی ئەی ئەند ئێم. ستیف رۆژێك دواتر هەواڵی پێگەیاندمەوە. بۆب پێی خۆش بووە.

من تەواو دڵنیا بووم کە کەسی شیاوم بۆ ئیشەکە دۆزیووەتەوە. بەڵام خەمی کاتەکەم بوو. چەند هەفتەیەکمان مابوو بۆ هەڵبژاردنەکانی ناوەڕاستی ٢٠٠٦. ئەگەر لەو کاتەدا وەزیری بەرگریم ئاڵوگۆڕ بکردایە، ئەوا وەها دەردەکەوتم کە بڕیاری سەربازی بە ئەقڵی سیاسییەوە دەدەم. بڕیارمدا پاش هەڵبژاردن ئەم هەنگاوە بنێم.

کۆتایی هەفتەی پێش ماوەی هەڵبژاردنەکە، بۆب لە (کۆلێج ستەیشن)ی تەکساسەوە بەرەو کێڵگەکە لە کراوفۆرد بەڕێکەوت. ئێمە لە ئۆفیسەکەم یەکترمان بینی، کە بینایەیەکی یەکقاتی ئاساییە و نیو مایڵ لە خانووە سەرەکییەکەوە دوورە. لەلای بۆب هەستم بە ئاسودەیی کرد. ئەو پیاوێکی خاکیی راشکاوە بە بەهێزییەکی هێمنەوە. بەڵێنم پێدا کە هەر کاتێك پێویستی پێم بوو بێتە لام. هەروەها پێم وت شتێکی تر هەیە کە پێویستە بیزانێت بەر لە وەرگرتنی ئیشەکە: بە جددی زیادکردنی هێزە سەربازییەکانم لە عێراق لەبەرچاو گرتبوو. ئەو رازیبوونی نیشاندا. پێم وت کە دەزانم ژیانێکی بێ وێنەی لە ئەی ئەند ئێم هەیە، بەڵام وڵاتەکەشی پێویستی پێی هەیە. دەستبەجێ ئیشەکەی قبوڵ کرد.

دەمزانی کە دیك بە بڕیارەکەم خۆشحاڵ نابێت. ئەو هاوڕێیەکی نزیکی دۆن بوو. وەکو هەمیشە، دیك ئەوەی پێ گوتم کە بیری لێ دەکردەوە. ئەو وتی "من لەگەڵ بڕیارەکەت هاوڕا نیم. پێم وایە دۆن کارێکی باش ئەنجام دەدات. بەڵام ئەمە بڕیاری خۆتە. تۆ سەرۆکیت". داوام لە دیك کرد هەواڵەکە بە هاوڕێکەی بگەیەنێت، کە هیوادار بووم بەم شێوەیە کاریگەرییەکەی کەم بێتەوە.

دۆن وەکو پرۆفێشناڵێك، کە هەروایە، مامەڵەی لەگەڵ گۆڕانکارییەکە کرد. ئەو نامەیەکی هەست بزوێنی بۆم نارد. "من بە ڕێزێکی زۆرەوە بۆ تۆ و بۆ ئەو سەرکردایەتییەی کە تۆ هێنابووتە کایەوە لە یەکێك لە ماوە هەرە سەختەکانی

ولاتەکەماندا دەڕۆم". هەروەها نووسیبووی "...ئەوە فەخرێکی هەرە گەورەی ژیانی درێژم بوو کە توانیم خزمەتی ولاتەکەم بکەم لە کاتێکی هەرە ناسکی مێژووماندا".

***

جێگۆڕکێپێکردنی وەزیری بەرگری، یەکێك بوو لەو دوو گۆڕانکارییە هەرە سەرختانەی کارمەندان کە لە ٢٠٠٦دا ئەنجامدا. ئەویتریان گۆڕینی سەرۆکی ستاف بوو. لەکاتێکدا کە ژینگەی واشنتن ناخۆش دەبوو، ئاندی کارد زۆرجار ئەوەی بیر دەهێنامەوە کە تەنیا چەند پۆستێك هەن کە تیایاندا دەستکاریی کارمەندان بە گرنگ دەبینرێت. کارەکەی ئەو یەکێك بوو لەوانە. لە سەرەتاکانی ٢٠٠٦دا، ئاندی زۆرجار ئەگەری ڕۆیشتنی دەهێنایە بەر باس. ئەو دەیگوت " تۆ دەتوانی بە ئاسانی ئەمە بکەیت و دەشێت ئەمە ڕووبەڕووبوونەوەکە بگۆڕێت". وتی "ئەمە دەکەوێتە سەر خۆت کە لەبەرچاوی بگریت".

لە سەروبەندی ئەو کاتەدا، کلەی جۆنسن داوای بینینی منی کرد. هەر لە ١٩٩٥ەوە کە وەکو حاکم دەست بەکار ببووم، کلەی هەموو ڕۆژێك لەگەڵ مندا ئیشی کردبوو. ئەو ڕۆژەی کە پێکەوە بۆ نانی نیوەڕۆ دانیشتین، پرسیاری ئەوەی لێکردم ئاخۆ ئیشی کۆشکی سپی چۆن بەڕێوە دەچێت. پێم وت کە من کەمێك پەرپوتم. بەردەوام سکاڵای ئەندامانی ستافم دەبیستەوە. هەرچەندە، لە شوێنی سەرۆکایەتییەوە، قورس بوو بزانی ئاخۆ سکاڵاکان تەنیا بۆڵەبۆڵن یان بەڵگەی کێشەی جددین.

کلەی دیدێکی پێدام کە پیشانیدا هیچ گومانێك لە مێشکیدا نییە. پاشان قەڵەمێکی لە گیرفانی دەرهێنا، دەسەسڕەکەی لابرد و هێڵکاریی دامەزراوەیی کۆشکی سپی کرد. شتێك پەرپوت و شێواو بوو، چەند هێڵێکی دەسەڵات یەکتریان دەبڕی و تەمومژاوی بوون. مەبەستەکەی ڕوون بوو: ئەمە سەرچاوەی سەرەکیی پشێوییەکە بوو. پاشان وتی "من تاکەکەس نیم کە هەمان هەستی هەیە". پێی وتم کە چەند کەسێکی تر بەشێوەیەکی ڕەمەکی هەمان زاراوەی تێکچوونیان بەکارهێناوە بۆ وەسفکردنی بونیادی کۆشکی سپی: زاراوەکە بە "تۆپەڵ" دەستی پێدەکرد و بە چوار پیتی تر کۆتایی دەهات.

کلەی راستی ئەکرد. دامەزراوەکە لە سەرگەردانیدا بوو. خەڵکی لە ڕووبەرەکانی ئاسوودەییدا جێگیر ببوون و ئەو وریاییەی ڕۆژێک لە ڕۆژان تایبەتمەندیی ئۆپەراسیۆنەکەمان بوو، لەبەین چووبوو. کاریگەرترین رێگا بۆ چارەسەر کردنی کێشەکە، ئەنجامدانی گۆڕانکارییەک بوو لە سەری سەرەوە. بڕیارم دا کە کاتی ئەوە هاتووە پێشنیاری ئاندی بۆ بەرەوپێشچوون پیادە بکەم.

دەرککردنەکە ئازاربەخش بوو. ئاندی کارد پیاوێکی دڵسۆز و بەڕێز بوو کە بە شێوەیەکی کاریگەر لە ڕۆژە سەختەکاندا ڕێبەرایەتیی کۆشکی سپی کردبوو. لە گەشتێکدا بۆ کامپ دەیڤد لەو بەهارەدا، چووم ئاندی و (کاسی)ی ژنی لە یاری بۆلینگ ببینم. ئەوان یەکێکن لەو هاوسەرە بێ هاوتایانەی کە خۆشەویستییان بۆ یەکتری روونە. دەیانزانی کە من بۆ یاری لەوێ نیم. لەوانەیە روخسارم فێڵی لە ئازارەکەم کردبێت. بە سوپاسکردنی ئاندی بۆ خزمەتەکەی دەستم پێکرد. ئەو قسەی پێ بڕیم و وتی "جەنابی سەرۆک، دەتەوێ گۆڕانکاری ئەنجام بدەی". ئەمویست بۆی روون بکەمەوە بەڵام ڕێگەی نەدەدام. باوەشمان بە یەکتریدا کرد و بڕیارەکەمی قبوڵ کرد.

من لەوە نیگەران دەبووم کە شاغیرێکی گەورە دروست بکەم بەبێ ئەوەی کە جێگرەوەم ئامادە کردبێت. بۆیە، بەر لەوەی قسە لەگەڵ ئاندی بکەم، داوام لە جۆش بۆلت کردبوو بێت بمبینێت. زۆر ڕێزم لە جۆش دەگرت، هاوکارەکانیشی هەروا بوون بۆی. هەر لەو ڕۆژانەوە کە بەڕێوەبەری بەرنامەی هەڵمەتەکەم بوو، وەکو جێگری سەرۆکی ستاف بۆ بەرنامە و بەڕێوەبەری ئۆفیسی بەڕێوەبردن و بودجە کاری دەکرد. وەکو هەر کەسێکی تر، ئەولەویەتەکانی منی بە باشی دەزانی. متمانەی پێی کامڵ بوو.

کاتێک داوام لە جۆش کرد ببێتە سەرۆکی دواتری ستافەکە، پێشنیارەکەمی قبوڵ کرد. وەکو زۆربەیان لە کۆشکی سپی، ئەو ئاندی بەلاوە پەسەند بوو و دەیزانی کە ئیشەکە چەندە قورسە. پاش بیر لێکردنەوەی، ئەو رازی بوو لەسەر ئەوەی کە کۆشکی سپی پێویستی بە بونیادنانەوە و تازەکردنەوە هەیە. پێی وتم ئەگەر ئیشەکە وەربگرێت ئەوا چاوەڕێی ئەوە دەکات گڵۆپی سەوزی بۆ داگیرسێنم بۆ گۆڕینی کارمەندان و روونکردنەوەی هێڵەکانی دەسەڵات و بەرپرسیارێتی. پێم وت کە کتومت هەر

لەبەرئەوەشە کە ئەوم ویست، ئەو ئیشەکەی قبوڵکرد و تا کۆتایی مایەوە، بەدەر لە دوو بە یەکەم کارمەندی ئەو ستافەی من بۆ هەڵمەتەکە دامەزراندبوون و توانیبیان بوو کە ١٠ ساڵی ڕەبەق لەو میانەدا لە ئۆفیسی ئۆڤال مایەوە.

بە ماوەیەکی کورت دوای دەست بەکاربوونی، جۆش کۆمەڵێک گۆڕانکاری ئەنجامدا، لەوانەش جێگۆڕکێپێکردنی سکرتێری ڕۆژنامەوانی کۆشکی سپی بە تۆنی سنۆو، میواندارێکی پێشووی زیرەکی ڕادیۆ و تەلەفزیۆن بوو کە بوو بە هاوڕێیەکی خۆشەویست تا ئەو کاتەی کە لە ململانێی سەختی لەگەڵ شێرپەنجەدا لە ٢٠٠٨ گیانی لەدەستدا. فیلاوێترین جوڵە، پێناسەکردنەوەی ڕۆڵی کارل بوو. پاش هەڵبژاردنی ٢٠٠٤، ئاندی داوای لە کارل کردبوو ببێتە جێگری سەرۆکی ستاف بۆ بەرنامە، کە پۆستی هەرە گەورەی بەرنامەدانانە لە کۆشکی سپیدا. من لە مەعنەویاتی ئەو تێگەیشتم. کارل لە ڕاوێژکارێکی سیاسی زیاتر بوو. ئەو قاڵبوویەکی بەرنامە و ڕێوشوێنە بە سۆزێکی زۆرەوە بۆ زانین و بەکردارکردنی ئایدیاکان. من پلەبەرزکردنەوەکەیم پەسەند کرد، چونکە دەمویست سوود لە شارەزایەتی و تواناکانی کارل وەربگرم. بۆ خۆلادان لە بەهەڵە وەرگرتنەکان، ئاندی ڕوونی کردەوە کە کارل ناخرێتە ناو کۆبوونەوەکانی ئاسایشی نیشتمانی.

بەهاتنی ناوەڕاستی ٢٠٠٦، کۆمارییەکان لە کێشەدابوون لەبەرانبەر هەڵبژاردنەکانی ماوەی میانەیی و چەپەکان بەشێوەیەکی نادادپەروەرانە ڕۆڵی نوێی کارلیان بەکارهێنابوو بۆ تۆمەتبارکردنی ئێمە بە بەسیاسیکردنی بڕیارەکانی پەیوەست بە بەرنامە. جۆش داوای لە کارل کرد کە تەرکیز بخاتەسەر هەڵبژاردنە میانەییەکان و بەردەوام لەسەر دابینکردنی زانیاریی ستراتیژی. بۆ زاڵبوون بەسەر ئۆپەراسیۆنە ڕۆژانەییەکانی بەرنامە و ڕێوشوێن، جێگرەکەی لە ئۆفیسی بەڕێوەبردن و بودجە هێنا= جۆێل کاپلان کە دەرچوویەکی زیرەک و خاوەن کەسایەتیی بەشی یاسای زانکۆی هارڤارد بوو و لە ساڵی ٢٠٠٠ەوە ئیشی بۆ من کردبوو.

من نیگەرانی ئەوە بووم کە چۆن کارل هەنگاوەکە لێک دەداتەوە. ئەو پەردەیەکی ئەستووری لە واشنتن دروستکردبوو، بەڵام ئەو پیاوێکی هەستیاری پڕشانازی بوو کە خۆی دابووە بەر هێرشی زۆر توندی سەر من. ئەوە دڵسۆزی کارل و شارەزایەتیی

بەرژەوەبوونی جۆش بوو کە کارێکی رێکخستنی نوێیان ئەنجامدا تا ئەو کاتەی کارل لە ئۆگەستی ٢٠٠٧ کۆشکی سپی جێ هێشت.

***

لەکاتێکدا کە دامەزراندنەکانی ستاف و کابینەی کۆشکی سپی زۆر گرنگن بۆ بڕیاردان، کاتێ دامەزراندنە دادوەرییەکان هەمیشەیین. دەزانم باوکم چەند فەخری دەکرد کە (کلارانس تۆماس)ی زیر، خاوەن پرەنسیپ و مرۆڤی دامەزراند. هەروەها دەزانم کە ئەو نائومێد بوو لەوەی کە پالێوراوەکەی تری، (دەیڤد ساوتەر) ببووە دادوەرێکی جیاواز لەوەی کە ئەو پێشبینی کردبوو. مێژوو پڕە لە چیرۆکی هاوشێوە. زانراوە کە جۆن ئادەمز سەرۆکی دادوەرییەکەی (جۆن مارشاڵ)- کە سی ساڵ پاش ئەوەی ئادەمز ئۆفیسی جێهێشت لە پۆستەکەیدا خزمەتی کرد- بە گەورەترین دیاری بۆ گەلی ئەمریکا ناو برد. لەلایەکی ترەوە، کاتێک دوایت ئایزنهاوەر پرسیاری لێکرا کە گەورەترین هەڵەکانی وەکو سەرۆک ناو بهێنێت، لە وەڵامدا وتی " دوو هەڵەم کردووە هەردووکیشیان دانانی دادوەری دادگای باڵایە " ماوەیەکی کورت دوای ئەوەی هەڵبژاردنی ساڵی ٢٠٠٠ بڕیاری لێدرا، داوام لە راوێژکاری یاسایی کۆشکی سپی (ئەلبێرتۆ گۆنزالێس) و تیمی پارێزەرەکانی کرد کە لیستێک کاندید بۆ دادگای باڵا ئامادە بکەن. ئال ئەمریکییەکی کاریگەری جیلی دووەم بوو کە لە زانکۆی (رایس) و بەشی یاسای (هارڤارد) خوێندبووی و کاتێک حاکم بووم متمانەی منی بەدەستهێنابوو. پێم وت کە دەبێ لیستی دادگای باڵاکەم ژنان، کەمینەکان و خەڵکی تر کە ئەزموونیشیان نییە لە بوارەکەدا، بگرێتەخۆ. جەختم کردەوە لەوەی کە نابێ پشکنینێکی هەوداریی سیاسی لەئارادا بێت. تاکە پشکنینێک کە لە مێشکی مندا بوو بریتی بوون لە سەرڕاستی کەسی، توانای فیکری و بەربەستی دادوەری. من پەرۆشی ئەو دادوەرە چالاکانە بووم کە ئەولەویەتی کەسییان بە تێکستی یاسا جێگۆرکێ پێکردبوو. من چوومەوە سەر قوتابخانەی بونیادنەرێتی: من ئەو دادوەرانەم دەویست کە بڕوایان بەوە هەبوو کە دەستوور ئەوەی دەڵێت، مەبەستیەتی.

بۆ ماوەی زیاتر لە پانزە ساڵ، هەمان نۆ دادوەر پێکەوە لە دادگا دانیشتبوون، کە درێژترین ماوە بوو لە مێژووی مۆدێرندا. لە ٣٠ حوزەیرانی ٢٠٠٥دا، هاریت مایەرز- کە

کاتێک ئەو ببووە دادوەری گشتی وەکو راوێژکاری یاسایی شوێنی ئال گۆنزالێسی گرتبووەوە- پێی راگەیەنرابوو کە دادگای باڵا نامەیەک لە یەکێك لە دادوەرەکانەوە بە من دەگەیەنێت. ئێمە هەمووومان وامانزانی نامەکە لە سەرۆکی دادوەران (ویلیام رێنکویست)ەوەیە کە تەمەنی هەشتا ساڵ و نەخۆش بوو. بەڵام بەیانیی دواتر هاریت بە موفاجەئەیەکەوە تەلەفۆنی بۆ کردم و وتی "ئۆکۆنەرە".

من لەماوەی ساڵانێکدا چەند جارێك چاوم بە دادوەر (ساندرا دەی ئۆکۆنەر) کەوتبوو کە یەکەم دادوەری مێینە بوو لە مێژووی دادگاکەدا. ئەو کەسایەتییەکی شیرین و راست و رەوانی هەبوو. من کەیفم بە ساندرا دەهات و پاش ئەوەی نامەکەیم بەدەست گەیشت، دەستبەجێ پەیوەندیم پێوە کرد. ئەو پێی وتم کە کاتی ئەوە هاتوو بڕوات و چاودێریی (جۆن)ی مێردی خۆشەویستی بکات کە بەدەست ئەلزەهایمەرەوە دەیناڵاند.

لەکاتێکدا کە شاغیرەکە ئەوە نەبوو کە چاوەڕێم دەکرد، ئامادە بووین کە پڕی بکەینەوە. تیمی هاریت بەستەیەکی گەورەیان ئامادە کردبوو کە بایۆگرافیی پانزە کاندید و هەروەها شیکردنەوەی درێژی نووسینەکانیان، وتارەکانیان و فەلسەفە دادوەرییەکانیانی تێدابوو. من گەشتێکم بۆ ئەورووپا هەبوو کە بۆ سەرەتاکانی تەموز دیاریکرابوو و کاتی درێژی فڕۆکەی (هێزی ئاسمانیی یەك) کاتێکی باشی رەخساند بۆ خوێندنەوەیان. پاش خوێندنەوەی بەستەکە، لیستەکەم کورت کردەوە بۆ پێنج دادوەری کاریگەر: ساموێل ئالیتۆ، ئێدیس براون کلێمێنت، مایکڵ لوتیگ، جۆن رۆبەرتس و هارڤی ویلکینسن. هەر یەکەیان هات بۆ کۆشکی سپی بۆئەوەی بمبینێت.

هەوڵمدا پشویەك بدەن لە رێگەی پیاسەیەك بەناو پانتایی شوێنی دانیشتندا. پاشان بردمن بۆ ژووری دانیشتنی خێزان کە بەسەر لای خۆرئاوادا دەڕوانێت. من پوختەی بۆچوونە یاساییەکانیانم خوێندبووەوە. ئێستاش دەمویست خەڵکەکە بخوێنمەوە. من بەدوای کەسێکەوە بووم کە هەمان فەلسەفەی دادوەریی منی هەبوو و کە بەهاکانی بە پێی تێپەڕبوونی کات نەدەگۆڕان. من بەو هیوایە چوومە ناو چاوپێکەوتنەکانەوە کە کەسێکیان جیاواز بێت.

یەکێکیان وەهابوو. جۆن رۆبەرتس لە لەندەنەوە گەڕایەوە کە لەوێ بۆ وەرزی هاوین وانەی دەوتەوە. من لە تۆماری رۆبەرتسم دەزانی: لە هارڤارد و بەشی یاسای هارڤارد قدوەی پۆلەکەی بوو، نووسەری یاسایی دادوەر رێنکویست بوو، مشتومڕی دە دوانزە کەیسی کردبوو لەبەردەم دادگای باڵادا. رۆبەرتس کاندید کرابوو بۆ (تۆڕی دادگاکانی پێداچوونەوەی دی.سی)، بەڵام ئەو بەر لەهەڵبژاردن ناوی نەهێنرابوو. من کاندیدم کردبوو بۆئەوەی لە ۲۰۰۱ لە هەمان دادگا دەست بەکاربێت. ئەو لە ۲۰۰۳دا ناوی هێنرا و تۆمارێکی تۆکمەی دەستەبەر کرد. لە پشت سی ڤییە پرشنگدارەکەیەوە پیاوێکی رەسەن هەبوو بە رۆحێکی نەرم و نیانەوە. ئەو خەندەیەکی خێرای هەبوو و بە سۆزەوە لەبارەی ئەو دوو منداڵە گەنجەی دەدوا کە ئەو و (جەین)ی ژنی تەبەنییان کردبوو. سەرکردایەتییە یاساییەکەی روون بوو، هەروەکو کارەکتەرەکەی.

لەبارەی بڕیارەکەمەوە، قسەم لەگەڵ دیک، هاریت، ئاندی، ئال و کارل کرد. ئەوان حەزیان لە رۆبەرتس بوو، بەڵام لەسەرەوەی هەموو لیستەکان نەبوو. دیک و ئال پشتگیریی لوتیگ-یان دەکرد کە پێیان وابوو دڵسۆزترین دادوەری کۆنسێرڤاتیڤە. هاریت پشتگیری لە ئالیتۆ دەکرد، چونکە پایەدارترین تۆماری دادوەری هەبوو. ئاندی و کارل لە نیازی مندا بۆ رۆبەرتس هاوبۆچوون بوون. من رەئی ئەوانیتریشم وەرگرت، لەوانەش هەندێ پارێزەری گەنجی کۆشکی سپی. یەکێکیان (برێت کاڤانۆ) بوو، کە من بۆ تۆڕی دادگاکانی پێداچوونەوەی دی.سی کاندیدم کردبوو. برێت پێی وتم کە لوتیگ، ئالیتۆ و رۆبەرتس دادوەری بەهێز دەبن. ئەو وتی، پرسیارێکی تر ئەوەیە کە ئاخۆ کام پیاوە رێبەرێکی کاریگەر دەبێ لە دادگادا- بەتواناترین دەبێ لە قەناعەتپێهێنانی هاوکارەکانی لە رێگەی قایلکردن و بیرکردنەوەی ستراتیژییەوە.

بڕوام وابوو کە رۆبەرتس رێبەرێکی سروشتی دەبێ. نیگەرانی ئەوەی نەبووم کە پێ بەپێی تێپەڕبوونی کات لە پرەنسیپەکانی لابدات. ئەو فەلسەفەی خاکەڕاییە دادوەرییەکەی وەها دەربڕی کە هاوشێوەکردن بوو بە حاڵەتێکی بەیسبۆڵ و بۆ من گونجاو بوو: "دادوەرێکی باش وەکو ناوبژیوانێك وایە- و هیچ ناوبژیوانێکیش بیر لەوە ناکاتەوە کەگرنگترین کەسە لەسەر گۆڕەپانەکە".

له نۆزده‌ی ئه‌موزدا، بانگی جۆنم کرد که ئیشه‌که‌ی بخاته‌ڕوو. ئێمه راگه‌یه‌ندنه‌که‌مان له‌و شه‌وه‌دا له ژووری (ئیست) ئه‌نجامدا. هه‌موو شتێك به‌پێی پلان به‌ڕێوه‌چوو تا ئه‌وه‌ی که، له‌ماوه‌ی وتارێکی ته‌له‌فزیۆنیم له‌کاتێکی زۆرترین بینه‌ردا، جاك رۆبه‌رتسی چوار سالان له ده‌ستی دایکی هاته ده‌ره‌وه و ده‌ستی کرد به سه‌ما کردن له‌سه‌ر چوارده‌وری ئه‌رزه‌که. دواتر زانیمان که لاسایی سپایده‌رمانی کردووه‌ته‌وه. من له سوچی چاومه‌وه ده‌مبینی و هه‌موو ئه‌رکێزمی منی له به‌رده‌وام بوون له‌سه‌ر قسه‌کانم گرتبوو. سه‌ره‌نجام جه‌ین جاکی بچوکی گه‌ڕاندبووه‌وه لای خۆی. ئاماده‌بووان باش پێکه‌نین و خێزانه‌که‌ی جاکیش که‌ره‌سته‌یه‌کی نمایشی باشیان بۆ ته‌واوی ژیانیان ده‌سته‌به‌ر کرد.

له سه‌ره‌تاکانی سێپتێمبه‌ردا، سێ رۆژ پێش ئه‌وه‌ی که کاتی گوێبیستبوونی دیاریکردنی رۆبه‌رت ده‌ست پێبکات، کارل له دره‌نگانی شه‌وی شه‌ممه‌دا په‌یوه‌ندی پێوه کردم. من و لۆرا له‌ناو جێگه‌دابووین و که‌سیش له‌و کاته‌دا بۆ هه‌واڵی خۆش ته‌له‌فۆن ناکات. کارل پێی وتم که سه‌رۆکی دادوه‌ری مردووه. رێنکویست یه‌کێك بوو له مه‌زنه‌کان. ئه‌و سی و سێ ساڵ به دادگای باڵا خزمه‌تی کردبوو، نۆزده ساڵی وه‌کو سه‌رۆکی دادگاکه به‌سه‌ر بردبوو. ئه‌و سه‌رپه‌رشتی سوێندخواردنی باوکمی وه‌کو سه‌رۆك له ساڵی ١٩٨٩دا و هی منی له ٢٠٠١دا کردبوو. له‌کاتێکدا که دووه‌م خولی ده‌ستبه‌کاربوونم نزیك ده‌بووه‌وه، رێنکویست تووشی شێرپه‌نجه‌ی غوده‌ی ده‌ره‌قی ببوو. ئه‌و بۆ ماوه‌ی چه‌ند هه‌فته‌یه‌ك له‌ناو خه‌ڵکدا نه‌بینرابوو. به‌ڵام که کاتی سوێندخواردنی ده‌ست به‌کاربوونه‌وه‌م هات، ده‌نگه‌که‌ی به‌رز و روون بوو: "له‌دوامه‌وه بیلێره‌وه: من جۆرج ڤکه‌ر بوش، له‌ناخمه‌وه سوێند ده‌خۆم..."

ئێستا ئیتر دوو شاغیری دادگای باڵام هه‌بوو که پڕیان بکه‌مه‌وه. بڕیاری ئه‌وه‌مدا که توانای سه‌رکردایه‌تیی جۆن رۆبه‌رتس ئه‌وی کردبووه گونجاوێك کامڵ بۆ سه‌رۆکی دادوه‌ریی. جۆن له پرۆسه‌ی گوێبیستوونه‌که‌یدا کارامه‌یی نیشاندا، له‌لایه‌ن زۆرینه‌یه‌کی به‌رفراوانه‌وه په‌سه‌ند کرا و گه‌ڕایه‌وه بۆ ژووری (ئیست) بۆ سوێند خواردنه‌که‌ی. جۆن چرکه‌ساته‌که پیشانیدا که ژیان ده‌شێت چ ئاراسته‌یه‌کی نائه‌گه‌ری وه‌ربگرێت. جۆن

رۆبەرتس کە بەری سێزدە ساڵ وادادەنرا دەرفەتی بە دادوەربوونی نێبەرێنێت، ئێستا ئیتر سەرۆکی دادوەرەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بوو.

***

لەکاتێکدا کە شوێنی ئۆکۆنەر هێشتا بەتاڵ بوو، من زۆر بە پێویستم زانی کە بە ژنێك جێگۆرکێی پێبکەم. لەگەڵ ئەو بیرۆکەیەدا نەبووم کە دادگای باڵا تەنیا یەك ژنی تێدا بێت، دادوەر روس بادەر گینگسبێرگ. لۆرا لەگەڵ بیرۆکەکەی مندا بوو- و دید و بۆچوونەکانی بە راگەیاندنەکان گەیاند.

ئەمە بۆنەیەکی دەگمەن بوو کاتێك ئامۆژگاریی لۆرا هەڵڕژایە ناو خەڵك، بەڵام دوور لەو تەنیا کاتەی کە من پشتم بە راوێژە هۆشمەندانەکەی بەست. لۆرا هەستێکی غەریزی هەبوو بۆ ژیانی وڵات. ئەو نەدەچووە ناو هەموو پرسێکەوە و نەشیدەویست ئەمە بکات. ئەو، ئەو بوارانەی هەڵدەبژارد کە سەرنجی رادەکێشان- لەوانەش پەروەردە، تەندروستی ژنان، بونیادنانەوەی (گەلف کۆست) پاش زریانی کاترینا، ئایدز و مەلاریا و ئازادی لە بورما و ئەفغانستان.

من بە هاریت و کۆمیتەی سۆراخکردنم راگەیاند کە لیستێکی نوێ بە ژنی زۆرترەوە ئامادە بکەن. ئەو کاندیدانەی ئەو دۆزینییەوە کاریگەر بوون. بەڵام تەگەرەی نائومێدکەر هەبوون. کاتێك داوای پێشبینەیەکی چڕوپڕم کرد لەبارەی دادوەرێکی ژنی شیاو، دەرکەوت کە مێردەکەی کێشەی دارایی هەیە کە ناوهێنانەکەی دەخاتە مەترسییەوە. بژارەی هەرە گەورە (پرسیلا ئۆون) بوو، کە دادوەری پێشووی دادگای باڵای تەکساس بوو. پرسیلا یەکێك بوو لەو یەکەم کەسانەی کە من کاندیدم کردن بۆ پۆستێکی دادگای پێداچوونەوەی فیدراڵ لە ساڵی ٢٠٠١دا. بەداخەوە، دیموکراتەکان کردیان بە ئامانج. ئەو سەرەنجام لە بەهاری ٢٠٠٥دا وەکو بەشێك لە سازشێکی دووحزبی، ناوی هێنرا.

دوو پەیامی تر لە راوێژکارییەکانمانەوە لە بینایەی کۆنگرێسەوە هات. یەکەمیان ئەوە بوو کە دەبووایە بیر لە دیاریکردنی پارێزەرێك بکەمەوە لە دەرەوەی دەستەی دادوەرانەوە. دووەمیان ئەوە بوو کە بە جددییەوە راوێژکاری یاسایی کۆشکی سپی، هاریت مایەرز لەبەرچاو بگرم. ژمارەیەك لە سیناتۆرەکان زۆر کارتێکراو بوون بە هاریت

لەکاتێکدا کە ڕێنمایی چۆن ڕۆیەرتسی کرد لە ڕێگەی چاوپێکەوتنەکانییەوە لە کۆنگرێس. حەزم لە بیرۆکەی پالاوتنی هاریت بوو. ئەو پێشەنگێکی یاسایی بوو لە تەکساس- یەکەم ژن بوو کە سەرۆکی کۆمپانیایەکی یاسای گەورەی تەکساس بەناوی (دیلاس بار ئەسۆسیەیشن) و ئاژانسی دادوەریی (ستەیت بار ئەڤ تەکساس) بوو. ئەو بۆ ئەنجومەنی شاری دالاس هەڵبژێردرابوو، کۆمسیۆنی یانسیبی تەکساسی بەڕێوەبردبوو و نزیکەی پێنج ساڵ لە پۆستە بالاکانی کۆشکی سپیدا خزمەتی کردبوو. گومانم نەبوو کە هەمان فەلسەفەی دادوەریی منی هەبوو و ڕوانگەکەی ناگۆڕێت. ئەو دەبووە دادوەرێکی دیار.

پرسیارم لە هاریت کرد ئاخۆ بایەخ بە ئیشەکە دەدات. ئەو سەری سوڕما-زیاتر شۆک بوو- بەڵام وتی ئیشەکە دەکات ئەگەر من داوای لێ بکەم. بیرۆکەکەم لەگەڵ ئەندامانی تری گروپی سۆراخکردندا باس کرد. هاوکارەکانی هاریت کەیفیان پێدەهات و ڕێزیان دەگرت و هەندێکیان پێیان وابوو بژارەیەکی باشە. ئەوانیتر پێیان وابوو مەترسیدارە کەسێك دیاری بکەیت کە پێشینەی لە دەستەکەدا نییە یان ئەمەی کە ئێمە بە دۆستگەرایی تۆمەتبار دەکرێین. ژمارەیەکیان بە ڕاشکاوی پێیان وتم کە ئەو بژارەیەکی دروست نییە. کەس پێی نەوتم کە پێشبینی لێشاوێك ڕەخنە بکەم کە لەلایەن لایەنگرەکانمانەوە ئاراستەمان کرا.

بڕیارەکە گەیشتە سەر هاریت و پریسلا ئۆون. بڕیارمدا لەسەر هاریت یەکلایی ببمەوە. ئەوم باشتر دەناسی. پێم وابوو ئەو چانسێکی باشتری دەبێت کە ناوی بهێنرێت. هەروەها ئەو ڕوانگەیەکی بێ هاوتا لەگەڵ خۆیدا بۆ دادگا دەبات وەکو کەسێکی دەرەوەی گروپی دادوەری. لەسەرەتادا، ژمارەیەك سیناتۆر و دادوەر ستایشی دیاریکردنەکەیان کرد. لەگەڵ ئەوەشدا، دەنگیان بە زوویی کپ بووەوە. لەلای ڕاستەوە، مقۆمقۆی سەرەتایی بێ بڕوایی بوو بە هاواری واق وڕمان. چۆن دەکرێ من کەسێکی وەها کەم ئەزموون هەڵبژێرم؟ چۆن دەتوانن متمانە بە فەلسەفەی کەسێك بکەن کە نەیانناسیووە؟

وا دیار بوو کە بەلگاندنێکی تریش هەیە لەدژی هاریت، شتێك کە بە شێوەیەکی سەرەکی کپ مابووەوە: چۆن دەکرێ ناوی کەسێك بهێنم کە لەناو بازنە یاساییەکانی نوخبەکاندا خۆی کاندید نەکردووە؟ هاریت نەچووبوو بۆ بەشی یاسای گروپی هەشت زانکۆیەکە (ئایڤی لیگ). ستایلە کەسییەکەی گومانەکانی قووڵ کردەوە. ئەو ڕەوانبێژ نییە. ئەو لێوەشاوە نییە. زۆر بیر دەکاتەوە بەر لەوەی قسە بکات- تایبەتمەندییەك کە لە واشنتن زۆر دەگمەن بوو و بە هەڵە بە خاوی فیکری لەقەڵەم دەدرا. هەروەکو ڕەخنەگرێکی کۆنسێرڤاتیف بەشێوەیەکی خۆبەزلزانانە وتبووی "هەرچەندە رۆح سوك، یارمەتیدەر، چالاك و ڕێکپۆشە، هاریت مایەرز شیاو نییە بۆ دادوەرێتیی دادگای باڵا لە (وێست وینگ)، ئەوە دادوەرێکی واقیعی هەر هیچ".

هەموو ئەو ڕەخنانە لە بەناو هاوڕێکانەوە دەهاتن. کاتێك چەپەکانیش دەستیان کرد بە ڕەخنەگرتن لە هاریت، دەمزانی کە پاڵاوتنەکە شکستی هێناوە. پاش سێ هەفتەی ناخۆش، لە ئۆفیسەکەی خۆم لە ژووری (تریتی) کە تیایدا تا درەنگانی شەو کارم دەکرد، تەلەفۆنێکم پێگەیشت. بەداڵەی کۆشکی سپی پێی وتم هاریت لەسەر هێڵە. بە دەنگێکی تۆکمەی ئارام پێی وتم کە بیری لەوە کردووەتەوە کە باشترە پاشەکشە بکات لە لەبەرچاوگرتنی بۆ دادگای باڵا. بە بارەتەقای ئەو ئازارەی کە هەمبوو ڕازی بووم.

لەکاتێکدا کە دەزانم هاریت دادوەرێکی باشی لێدەردەچوو، بایی پێویست بیرم لەوە نەکردەوە کە دیاریکردنەکە لەلایەن ئەوانیترەوە چۆن لێکدەدرێتەوە. هاوڕێکەم خستە بارودۆخێکی ئەستەمەوە. ئەگەر لە رووی زەمەنییەوە گەڕابامە دواوە ئەوا هاریتم هەڵنەدەدایە بەردەم گورگەکانی واشنتن.

بەیانیی پاش ڕاگەیاندنەکە، هاریت ئاگاداریی کارکردنی گەیاند، وەکو هەر ڕۆژێکی تری ئاسایی. ئەو لە ئۆفیسێکەوە چوو بۆ ئۆفیسێکی تر لە (وێست وینگ)، ڕۆحیەتی زۆرێك لەو هاوکارە نزم و باڵایانەی بەرز دەکردەوە کە دڵگران بوون بەوەی کە ببینن کەسێك کە زۆر بەلایانەوە پەسەند بوو بەو شێوە خراپە مامەڵەی لەگەڵدا کراوە. کاتێك کە هات بۆ ئۆفیسی ئۆڤاڵ من پێم وت "سوپاس بۆ خوا کە تۆ پاشەکشەت کرد. هێشتا من

پارێزەرێکی گەورەم هەیە". ئەو بزەیەك گرتی و وتی "جەنابی سەرۆك، من ئامادەم ڕێبەریی سۆراخکردن بکەم بۆ کاندیدی دواتر".

***

دەبوایە ئیختیاری دواترم ڕاست بێت. لەکاتێکدا کە بیرۆکەی هەڵبژاردنی ژنێك هێشتا لەمێشکمدا بوو، نەمتووانی کەسێکی تری ئەوەندەی سام ئالیتۆ شیاو بدۆزمەوە. سام تا بلێی بەپارێز بوو. کاتێك بۆ یەکەم جار بۆ چاوپێکەوتن دانیشتین، نائاسودە دیار بوو. من بە شۆخییەکی کۆنی باو دەستم پێکرد- لەم حاڵەتەدا بەیسبۆڵ. سام هاندەرێکی گەورەی (فیلییەکان)ی فیلادێلفیایە. لەکاتێکدا کە قسەمان لەبارەی یارییەکەوە دەکرد، زمانی جەستەی گۆڕا. ئەو کەمێك کەوتە باسی ژیانی خۆی و یاسا. ئەو ئەکادیمیك، بەڵام پراکتیکی بوو. ئەو دادوەرێکی فیدراڵ بوو لە (نیوجێرسی) بەر لەوەی بچێتە (سێیەم دادگای پێداچوونەوە) لە ساڵی ١٩٩٠دا. بیروڕاکانی ڕەگداکوتاو و بەڵگەئامێز بوون. گومانی تیا نەبوو کە بەشێوەیەکی دەقاودەق پەیڕەوی لە دەستوور دەکات.

چوار ڕۆژ پاش کشانەوەی هاریت، من لە ئۆفیسی ئۆڤاڵ چاوم بە سام کەوت و ئیشەکەم خستەڕووی. ئەو قبوڵی کرد. لایەنگرەکانمان دڵخۆش بوون. ڕەخنەگرەکانمان دەیانزانی کە ناتوانن ناوهێنانی سام بەربەست بکەن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، ئەوان وایان لێکرد بە پرۆسەیەکی گوێبیستبوونی خراپدا تێپەڕێت. ئەوان هەوڵیاندا بۆیاخی نەژادپەرست، ڕادیکاڵ ، دەمارگیر و هەر شتێکی تر کە دەشیا بیری لێبکەنەوە لێبدەن- هەمووشی بێ بنەما بوو. من قەڵس بووم بەو مێشکپوچییە. لەکاتێکدا کە سیناتۆرێك تۆمەتە پوچەکانی باس دەکرد، ژنەکەی سام (مارتا ئان)، دەستی کرد بە گریان. کاردانەوەکەی ئەوەندە ڕاستەقینە بوو کە تەنانەت هەندێ لە دیموکراتەکانیش درکیان بەوە کرد کە لە بەرەکە تێیان پەڕاندووە. پاش ئەوەی کە ئەنجومەنی پیران سامی بۆ دادگا پەسەند کرد، من خۆی و خێزانەکەیم بانگهێشت کردن بۆ کۆشکی سپی بۆ سوێندخواردنەکەی. پێش ئەوەی بۆ مەراسیمەکە بچینە دەرەوە، چرکەساتێکی تەنیام لەگەڵ سامدا بەسەر برد. من سوپاسم کرد لەبەرانبەر بەرگەگرتنی پرۆسەی گوێبیستبوونەکە و ئومێدی سەرکەوتنم لە دادگا بۆ خواست. پاشان وتم "سام، پێویستە

تۆ سوپاسی هاریت مایەرز بکەیت لە بەرانبەر هێنانەکایەی ئەمە". لە وەڵامدا وتی "جەنابی سەرۆك، قسەکەی تۆ کتومت راستە".

***

سۆزاویترین بریاری پەیوەست بە کارمەندان کە دەبووایە بیدەم، دواهەمین بوو لە ماوەی سەرۆکایەتییەکەمدا. رەگی تەنگژەکەم درێژ دەبێتەوە بۆ هاوینی ۲۰۰۳. هێزە سەربازییەکانمان لە عیراق ئەو چەکە کۆکوژەیان نەدۆزیبووەوە کە هەموومان پێشبینیمان کردبوو و نیشانەگرتنەوەی میدیا بۆ کردنە ئامانج دەستی پێکرد. لە وتاری ساڵانەی بەردەم کۆنگرێسمدا لە ۲۰۰۳، وتەی ناو راپۆرتێکی هەواڵگریی بریتانیم هێنایەوە لەمەڕ ئەمەی کە عیراق ویستوویەتی یۆرانیوم لە نەیجریا بکڕێت. تاکە رستەی ناو ئەو وشارە پێنج هەزار وشەییەم خاڵێکی گەورە نەبوو لە کەیسی دژی سەدام حسێن. بریتانییەکان لە تەك دەزگای هەواڵگریدا وەستانەوە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو شانزە وشەیە بوونە جێی مقۆمقۆی سیاسی و ئاگایی پەرتکردنێکی گەورە. لە تەموزی ۲۰۰۳دا، باڵیۆزی پێشوو (جۆزێف ویلسن) ستونێکی بۆ رۆژنامەی نیویۆرك تایمز نوسیبوو و بانگەشەی ئەوەی کردبوو کە ئیدارەکە ئەنجامگیرییە گومانا وییەکانی فەرامۆش کردووە کاتێك سەفەری کردبوو بۆ ئەفریقا بۆ لێکۆڵینەوە لە پەیوەندی عیراق-نەیجریا. پرسیاری جددی هەبوون لەبارەی کتومتیی و تەواویی راپۆرتەکەی ویلسن، بەڵام تۆمەتەکەی بووە خاڵێکی پرقسە و باسی سەرەکی بۆ رەخنەگرانی جەنگ. بە ماوەیەکی کورت دوای ستونەکەی ویلسن، (بۆب نۆڤاك)ی ستوونووسی لەمێژینەی واشنتن ئەوەی بڵاوکردەوە کە ویلسن نە لەلایەن دیك چێنی و نە لەلایەن ئەندامێکی باڵای ئیدارەکەوە نەنێردراوە بۆ نەیجریا، بەو شێوەیەی کە خۆی وتبووی، بەڵکو بە پێشنیاری (ڤالێری پلەیم)ی ژنی رۆیشتووە کە لە سی.ئای.ئەی ئیش دەکات. پاشان دەرکەوت کە پۆستی ژنەکەی ویلسن شاردراوەتەوە. رەخنەگران رایانگەیاند کە کەسێك لە ئیدارەکەم تاوانێکی ئەنجامداوە لە رێگەی بە ئەنقەست دزەپێکردنی شوناسی کارمەندێکی سی.ئای.ئەی. وەزارەتی داد ناوی داواکارێکی تایبەتی هێنا بۆ لێکۆڵینەوە.

من بەشێوەیەکی سروشتی بەگومان بووم لە داواکارە تایبەتەکان. لەبیرمە کە چۆن لۆرێنز وَلش لێکۆڵینەوەکەی لە کەیسی (ئێران-کۆنترا) لە ماوەی هەڵمەتی ۱۹۹۲دا بەسیاسی کردبوو. بەڵام دزەکردنێکی هەواڵگری مەسەلەیەکی جددی بوو و من ستافەکەم ئاراستە کرد کە بە تەواوی هاوکار بن. پارێزەری گشتی (پاتریک فیتزجیراڵد) چاوپێکەوتنی لەگەڵ زۆربەی تیمەکەی ئەنجامدا. لە سەرەتای پرۆسەکەدا، جێگری وەزیری دەرەوە (ریچارد ئارمیتاج) بە فیتزجیراڵدی راگەیاند کە ئەو زانیاری لەبارەی (پلەیم) داوەتە نۆڤاک. لەگەڵ ئەوەشدا، پارێزەرە گشتییە تایبەتەکە بەردەوام بوو لە لێکۆڵینەوە.

لەماوەی زیاتر لە دوو ساڵدا، فیتزجیراڵد ژمارەیەکی زۆری بەرپرسی ئیدارەکەی هێنایە بەردەم دادوەریی گەورە، لەوانەش سەرۆکی ستاف دیک (سکوتەر لیبی). پاش دوو جار ئامادەبوونی سکوتەر، فیتزجیراڵد تۆمەتێکی ئامادە کرد لە بەرانبەر درۆکردن لە دادگادا، وەستاندنی رێوشوێنی دادگا و قسە هەڵبەستن. سکوتەر دادگایی کرا و تاوانبارکرا. لە حوزەیرانی ۲۰۰۷دا بە سی مانگ زیندانی حوکم درا.

من رووبەڕووی بڕیارێکی ئازاراوی بوومەوە. دەمتووانی رێگە بدەم سکوتەر بخرێتە زیندانەوە. دەمتوانی دەسەڵاتی خۆم بەکاربێنم بە پێی دەستوور بۆ لێبووردنی. یان دەمتووانی جێگۆڕکێ بە حوکمەکەی بکەم، بەو واتایەی کە تاوانبارکردنەکەی لە شوێنی خۆیەتی، بەڵام حوکمی زیندان نا. هەندێ کەس لە کۆشکی سپی، بە سەرپەرشتی جێگر سەرۆک، بە توندی فشاریان هێنا بۆ لێبووردن. بەڵگاندنەکەیان ئەوە بوو کە دەبووایە لێکۆڵینەوەکە هەرگیز بەرەوپێش نەچووبایە پاش ئەوەی کە فیتزجیراڵد سەرچاوەکەی نۆڤاکی ناسیووەتەوە. لەلایەکی ترەوە، زۆربەی راوێژکاران باوەڕیان وابوو کە حوکمی دادوەری راستە و پێویستە پیادە بکرێت.

من بڕیاری ئەوەمدا کە ئەمە پەیامێکی خراپ دەنێرێت بۆ بەخشینی ئەندامێکی پێشووی ستاف تاوانبارکراو بە وەستاندنی دادپەروەری، بەتایبەت پاش ئەوەی کە بە ستافەکەم رایگەیاندبوو کە هاوکاری لێکۆڵینەوەکە بن. بەڵام ئەو سزای سکوتەر وەریگرتبوو لەگەڵ تاوانەکەدا نەدەهاتەوە. دادگایی و لێکۆڵینەوە دووورودرێژەکە هەنوکە

زیانێکی کەسی، پیشەیی و دارایی بە سکوتەر و خێزانەکەی گەیاندبوو. لە سەرەتاکانی تەموزی ٢٠٠٧دا، من بڕیاری خۆم دا: "ڕێز لە حوکمی دادوەری دەگرم. بەڵام گەیشتوومە ئەو ئەنجامەی کە حوکمی زیندان کە بە بەڕێز لیبی دراوە زیادەڕەوی تێدایە. لەبەرئەوە، من ڕێژەی حوکمەکەی بەڕێز لیبی دەگۆڕم کە بریتی بووە لە بەسەربردنی سی مانگ زیندانی".

کاردانەوەی چەپ گڕی سەند. جارێکیان کۆنگرێسمانێك وتبووی "کرداری سەرۆك بوش لەمڕۆدا دەڵێت ئەمریکا، ئاساییە کە درۆ بکەیت، گومڕا بکەیت و دادپەروەری بوەستێنیت تا ئەو شوێنەی کە دڵسۆزیت بۆ ئیدارەکەی". یەکێکی تریان وتبووی "من بانگی دیموکراتەکانی ئەنجومەنی نوێنەران دەکەم تا ڕێوشوێنەکانی تاوانبارکردن لەبەرچاو بگرنەوە". هیچ کەس لە کۆشکی سپیش کەیفی بە بڕیارەکە نەدەهات. دیك بەردەوام بوو لە لایەنگیریکردنی لێبووردنی تەواوەتی.

یەکێك لە موفاجەئە هەرە گەورەکانی سەرۆکایەتییەکەم لێشاوی داواکاریی لێبووردن بوون لە کۆتاییدا. نەمتوانی باوەڕ بە ژمارەی ئەو خەڵکە بکەم کە جیایایان کردمەوە بۆ پێشنیارکردنی ئەمەی کە هاوڕێیەك یان هاوکارێکی پێشوو شایستەی لێبووردنە. لە سەرەتادا تووشی نائومێدی دەبووم. پاشان قەڵس دەبووم. دواجار چاوم بەو هەموو نادادپەروەرییەی ناو سیستەمەکە کەوت. ئەگەر تۆ پەیوەندییەکت بە سەرۆکەوە هەبووایە ئەوا دەتتوانی کەیسەکەت بخەیتە ناو جولەی دوایین خولەکەوە. بە پێچەوانەوە، دەبووایە چاوەڕێی وەزارەتی داد بکەیت تا چاوپێداخشاندنەوەیەك ئەنجام بدات و ڕاسپاردەیەك بخاتەڕوو. لە دوایین هەفتەکانمدا لە ئۆفیس، گەیشتمە ئەو ئەنجامەی کە لێبووردن بۆ هیچ کەسێك دەرناکەم کە چووەتە دەرەوەی کەناڵە ڕەسمییەکانەوە.

لە ڕۆژانی ئەخیروئۆخری ئیدارەکەدا، دیك جەختی لە بانگەوازەکەی خۆی کردەوە بۆئەوەی کە سکوتەر دەبێ لێبووردنی بۆ دەربکرێت. سکوتەر پیاوێکی شایستە و خزمەتکارێکی گشتیی دڵسۆز بوو و منیش دەرەنجامەکانم بۆ خێزانەکەی دەزانی. داوام لە دوو پارێزەری جێ متمانە کرد تا چاو بە کەیسەکەدا بخشێننەوە لە سەرەوە بۆ

خوارەوە، لەوانەش ئەو بەڵگەیەی کە لە دادگاییەکەدا لەدژی سکوتەر خراوەتەڕوو. بە هەمان شێوە مۆڵەتم پێدان تا سکوتەر ببینن و دیوەکەی خۆی بۆ چیرۆکەکە گوێبیست بین. پاش شیکردنەوەیەکی ورد، هەردوو پارێزەرەکە پێیان وتم کە ئەوان نەیانتووانی هیچ پاساوێك بۆ هەڵگێڕانەوەی حوکمی دادوەر بدۆزنەوە.

من دوایین کۆتایی هەفتەمان لە کامپ دەیڤد لە ململانێی بڕیارەکەدا بەسەر برد. لۆرا پێی وتم "تۆ ئەمە بۆ هەمووان تێك دەدەیت". سەرەنجام، گەیشتمە هەمان ئەو ئەنجامگیرییەی کە لە ٢٠٠٧دا پێی گەیشتبووم: پێویستە ڕێز لە حوکمی دادوەری بگیردرێت. لە یەکێك لە دوایین کۆبوونەوەکانماندا، بە دیك-م ڕاگەیاند کە لێبووردن دەرناکەم. بە سەرنجێکی توندەوە چاوی تێبڕیم. ئەو وتی" باوەڕ ناکەم کە نیازت بێ سەربازێك لە شەڕگەدا جێ بهێڵیت". قسەکەی تیغ بوو. لە ماوەی هەشت ساڵدا، هەرگیز دیکم وەها نەبینیبوو، یان تەنانەت نزیکی ئەو دۆخەش. نیگەرانی ئەوە بووم کە لەباشترین حاڵەتدا، ئەو دۆستایەتییەی کە بونیاتمان نابوو بە توندی زەرپەی بەر بکەوێت.

چەند ڕۆژێك دواتر، قسەم لەگەڵ کەسێکی تر کرد لەبارەی پرۆسەی لێبووردنەکەوە. لەکاتی لێخوڕینی ئۆتۆمبێلەکەمدا لە شەقامی پەنسیلڤانیا لە ڕۆژی دەستبەکاربووندا، نائومێدی خۆمم بە باراك ئۆباما گەیاند لەمەڕ سیستەمی لێبووردن. پێشنیارێکم دایە: بەرنامەی لێبووردن ڕابگەیەنە و پێیەوە پابەند بە.

پاش دەستبەکاربوونی سەرۆك ئۆباما، من و لۆرا بە هەلیکۆپتەر چووین بۆ (بنکەی هێزی ئاسمانیی یەکی ئەندروس). دوایین بۆنەمان پێش سواربوونی فرۆکە بەرەو ماڵەوە لە تەکساس، مەراسیمی ماڵئاوایی بوو لەبەردەم سێ هەزار هاوڕێ، خێزان و ستاف پێشوودا. دیك ڕازی بوو کە من بناسێنێت. ئەو لە گواستنەوەی سندوقدا پشتی بریندار ببوو، بۆیە دەبووایە لین لەسەر کورسی دوو تاییەکەی بەرەو سەر شانۆکە پاڵی پێوە نێت. دیك مایکرۆفۆنەکەی بەدەستەوە گرت. هیچم لە مێشکدا نەبوو کە دەبێ چی بڵێت. هیوادار بووم کە لەو نائومێدییە تێپەڕیبێت کە هەستی پێکردبوو. قسەکانی لەناخی دڵەوە و نەرم بوون: "هەشت ساڵ و نیو لەمەوبەر، دۆستایەتیم لەگەڵ جۆرج بوش

دەست پێکرد کە بە ڕاستی فەخرێکی تایبەت بوو بۆم... ئەگەر پەشیمانییەکم هەبێت، تەنیا ئەوەیە کە ئەو ڕۆژانە کۆتاییان هات و ئەمەی کە هەموو ئەندامانی ئەم تیمە باشە، ئێستا، دەبێ بە ڕێگای خۆیاندا بڕۆن".

ئەو پیاوەی کە لەو ڕۆژە گەرمەی تەموزدا هەڵمبژارد تا کۆتایی بە پایەداری مایەوە. هاوڕێیەتییەکەمان مایەوە.

# خانە بونیادییەکان

لە چەقی لەندەندا، بینایەیەکی سی و چوار نهۆمی هەیە. نهۆمێکیان فەزایەکی کراوەی گەورەی هەبوو کە بە (ژووری پیتاندن) ناسرابوو. لەناوەوە، تەکنیکییەکان بەشێوەیەکی بەپلان هێلکە و سپێرمیان لە لولەکەکانی تاقیکردنەوەدا تێکەڵ دەکرد بۆ بەرهەمهێنانی نەوەی دواتر. دەزگای هەڵهێنانەکە وەکو خوێنی حکومەتی جیهانی نوێ ئەرکی بەجێ دەهێنا، کە رێبەری هاوکێشەیەک بوو بۆ ئەندازەگیریی کۆمەڵگایەکی بەرهەمهێن و سەقامگیر.

ئەو دیمەنە دەستکردنی (جەی لێفکۆیتز) نەبوو، ئەو پارێزەرە زیرەکەی کە لە ساڵی ٢٠٠١دا لە ئۆفیسی ئۆڤاڵ بە دەنگی بەرز بۆی دەخوێندمەوە. بەڵکو لە رۆمانەکەی ١٩٣٢ی (ئەلدۆس هەکسلی)یەوە هاتبوو بەناوی (جیهانی نوێی ئازا). بەو بەرەوپێشچوونانەی ئەم دواییەی بایۆتەکنۆلۆژی و ژێنەتیکس، کتێبەکە ئێستا بەشێوەیەکی ترسێنەر گونجاوە. هەروەها وانەکەشی: بەهەموو ئەو کاراییەیەوە، جیهانی یۆتۆپیی هەکسلی بێ فەڕ، بێ تام و بەتاڵ لە مانا دیار بوو. گەشت بۆ مرۆڤایەتییەکی کامڵ بە لەدەستچوونی مرۆڤایەتی کۆتایی هات.

لە مانگی نیسانی هەمان ساڵدا، نووسینێکی تر لە ئۆفیسی ئۆڤاڵدا پەیدا بوو. بە وەسفکردنی ئەوەی کە خۆی پێی دەگوت "گەشتی پڕئازاری خێزانێک"، نووسەرەکە داوای لێکردبووم پشتگیری لە "شیمانەکانی موعجیزە"ی توێژینەوەی خانە بونیادییە کۆرپەلەییەکان بکەم بۆ دابینکردنی چارەسەر بۆ خەڵکانی وەکو مێردەکەی کە بەدەست نەلزەهایمەرەوە دەیناڵاند. ئەو لە کۆتاییدا نوسیبووی "جەنابی سەرۆک، من هەندێ

ئەزموونم هەیە لەمەڕ زۆرێك لەو بڕیارانەی كە تۆ هەر رۆژێك رووبەڕووی دەبیتەوە...من زۆر سوپاسگوزار دەبم كە تۆ بیرۆكە و نزاكانم لەبەرچاو بگریت لەم مەسەلە هەستیارەدا. دڵسۆزتان، نانسی ریگن".

ئەم لە تەنیشت یەك دانانەی نامەكەی خاتوو ریگن و رۆمانەكەی هەكسلی چوارچێوەی ئەو بڕیارەی دانا كە من لەمەڕ توێژینەوەی خانە بونیادییەكان رووبەڕووی بوومەوە. زۆر كەس هەستیان بەوە كرد كە حكومەتی فیدراڵ بەرپرسیارێتیی دارایی بۆ دابینكردنی ئەو توێژینەوە پزیشكییەی لە ئەستۆیە كە لەوانەیە یارمەتی رزگاركردنی ژیانی خەڵكی وەكو سەرۆك ریگن بدات. ئەوانیتر بەڵگەی ئەوەیان هێنایەوە كە دەشێ پشتگیریی تێكدانی كۆرپەلە مرۆییەكان ئێمە لە ئاكار لابدات بەرەو كۆمەڵگەیەكی بێ خەم كە ژیانی بێ بەها كردووە.

***

لە وتاری دەستبەكاربوونمدا لە ۲۰ی كانوونی دووەمی ۲۰۰۱دا، وتم "هەندێ جار جیاوازییەكانمان ئەوەندە قووڵ دەبنەوە كە لە كیشوەرێكدا هاوبەش دەبین، بەڵام لە وڵاتێكدا نا". "قبوڵی ناكەین و رێگەی پێنادەین. یەكێتیمان، یەكبوونمان، كارێكی شێلگیرانەی سەركردەكان و هاوڵاتییانە لە هەموو جیلێكدا. ئەمەش پەیمانی لەناخەوەی منە: كار دەكەم بۆ بونیادنانی تاكە نەتەوەیەك لە دادپەروەری و دەرفەت".

پاش نیوەڕۆخوانێك لەگەڵ كەسایەتییە گرنگەكان لە بینایەی كۆنگرێس، من و لۆرا بەرەو كۆشكی سپی بەڕێ كەوتین وەكو بەشێك لە رێڕۆیشتنی دەستبەكاربوونی رەسمی. شەقامی پەنسیلڤانیا، بە ریز خەڵكی پڕ هیوای لێوە وەستابوو هاوشانی چەند پەلەیەكی نارازی. ئەمان دروشمی گەورەیان بە زمانی شەڕانگێزانەوە بەرز كردبووەوە، هێلكەیان ئەگرتە كاروانی ماتۆڕەكان و لە بنی سییەكانیانەوە هاواریان دەكرد. من زۆربەی كاتەكەم لە ئۆتۆمبێلی لیمۆزینی سەرۆكایەتیدا لە پشت پەنجەرە شوشەییە ئەستوورەكاندا بەسەر برد، بۆیە هاواركردنەكانیان بە كپی دەگەیشت. لەكاتێكدا كە نەمدەتوانی قسەكانیان

بیبیستم، پەنجەی ناوەڕاستیان بە دەنگی بەرز دەدوا، ئاڵای هەڵبژاردنی ٢٠٠٠ وەها زوو نەدەڕەوایەوە.

من و لۆرا، پاشماوەی ڕێڕۆیشتنەکەمان لە سەکۆی چاوگێڕانی کۆشکی سپییەوە تەماشا کرد. ئێمە سڵاومان لە ڕێپێوەکانی هەر ویلایەتێک دەکرد و دڵخۆش بووین بە بینینی تیپەکانی ئامادەیی میدلاند و کراوفۆرد. پاش ڕێڕۆیشتنەکە، ڕۆیشتم سەیرێکی ئۆفیسی ئۆڤاڵ بکەم. لەکاتێکدا کە بە شوێنی دانیشتندا دەڕۆیشتم، ژوورەکە وا دەرکەوت وەک بڵێی دەدرەوشێتەوە. تیشکە درەوشاوەکانی و پەردە ئالتونییەکانی لە بەرانبەر ئاسمانی تاریکی زستاندا تەواو بەرجەستە دەبوون.

هەر سەرۆکێک بە شێوازی خودی خۆی ئۆفیسی ئۆڤاڵ دەڕازێنێتەوە. من چەند تابلۆیەکی تەکساسم هەڵواسی، لەوانەش (ئواندنەکانی ئالامۆ)ی جولیان ئۆندەردۆنک، کە دیمەنێکی خۆرئاوای تەکساسە، و مەزرایەکی گوڵی (بلوبۆنێت)– کە بیرهێنەرەوەیەکی ڕۆژانەی کێڵگەکەمان بوو لە کراوفۆرد. هەروەها تابلۆیەکم هێنابوو بەناوی (ڕیۆ گراند) کە هی هونەرمەندێکی هاوڕێم بوو لە شارۆچکەی (ئێل پاسۆ) بەناوی تۆم لی و دیمەنی ئەسپسوارێک کە بە گردێکدا هەڵدەگەڕا و دەبلیو.ئێچ.کۆرنەر کێشابووی. ناوی پارچەکە (هەڵمەتێک بۆ هێشتنەوەی)، ڕەنگدەرەوەی سرودێکی پرۆتستانتی میتۆدیستیی چارلز ویسلی بوو کە ئێمە لە یەکەم دەستبەکاربوونمدا وەکو حاکم، وتمان. هەردوو سرود و تابلۆیەکە ڕەنگدەرەوەی گرنگیی خزمەتکردنی قەزیەیەک بوون کە گەورەتر بوو لە خودێک.

بڕیاریشمدا کە پۆرترێتی (جۆرج واشنتن)ی کێشراو لەلایەن ڕێمبرانت پیل بهێڵمەوە کە باوکم و بیل کلینتن بەسەر ڕەفەی ئاگردانەکەوە هەڵیانواسیبوو. چەند نیوەپەیکەرێکی ئەبراهام لینکۆڵن، دوایت ئایزنهاوەر و وینستن چەرچڵم دانا– دیارییەکی خوازراو لە میهرەبانیی حکومەتی بریتانیا لەلایەن سەرۆک وەزیران تۆنی بلێرەوە. من بە تۆنی–م وتبوو کە من بویری، پرەنسیپ و حەزی گاڵتە و گەپی چەرچڵم بەلاوە پەسەندە کە بەلای منەوە هەمووی بۆ ڕێبەرایەتی پێویستن. (نموونەیەکم لە زیرەکی چەرچڵ وەلامێکە کاتێک فرانکلین ڕۆزڤێلت ڕێکەوتی کرد کە لە حەوزی حەمام دێتە دەرەوە کە بە سەردانێک لە دیسەمبەری ١٩٤١ دا لە کۆشکی سپی بوو. ئەو وتبووی "هیچم نییە لە سەرۆکی ویلایەتە

یەکگرتووەکانی ئەمریکای بشارمەوە !" پاش پانزەی سێپتەمبەر، من بۆم دەرکەوت کە سێ شێوەپەیکەرەکان شتێکی هاوبەشیان هەیە: هەموویان سەرکردە دیارەکانی سەردەمی جەنگ بوون. بە دڵنیاییەوە ئەو کاتەی کە هەڵمبژاردن ئەمەم لە مێشکدا نەبوو. بۆشاییەک لەسەر دیوارەکە، گێرابوو بۆ سەرۆکێکی کاریگەر. لینکۆلنم هەڵبژارد. ئەو ماندووکەرترین کاری لە هەر سەرۆکێکی تر هەبوو، ئەمەش بە زامنکردنی یەکێتی. هەندێکیان پرسیاریان کرد ئاخۆ بۆچی پۆرتریتی باوکم لە بۆشاییەکەدا هەڵنەواسیووە. من وتم "ژمارە چل ویەک لە سەر دڵم هەڵدەواسرێت. شانزە لەسەر دیوارە".

کەرەستەی دیکۆریی ناوەڕاستی ژوور، مێزی سەرۆک بوو. من مێزەکەم هەڵبژاردبوو لەبەر گرنگییە مێژووییەکەی. چیرۆکەکەی لە ١٨٥٦ەوە دەستی پێکردبوو، کاتێک شاژنە ڤیکتۆریا کەشتی (ئێچ ئێم ئێس ریزەلوت)ی رەوانە کرد بۆ گەڕان بەدوای دۆزەرەوە (جۆن فرانکلین) کە لە کاتی گەڕان بەدوای (ڕاڕەوی باکووری خۆرئاوا) بزر ببوو. ریزەلوت لە نزیک ناوچەی بەستەڵەکی باکوور گیری خوارد و گروپەکەی دەستبەرداری بوون. لە ساڵی ١٨٥٥دا لەلایەن کەشتییەکی نەهەنگ راوکەری ئەمریکی دۆزرایەوە و ریزەلوت-ی گەڕاندەوە بۆ کۆنەکتیکەت. کەشتییەکە لەلایەن حکومەتی ئەمریکییەوە کڕدرا، چاککرایەوە و گەڕێنرایەوە بۆ ئینگلتەرە وەکو دیارییەکی نیازپاکی بۆ شاژن. کاتێک ریزەلوت دوو دەیە دواتر لە کارخرا، شاژن ژمارەیەک مێزی رازاندنەوەی لە تەختەکەی دروست کرد، کە یەکێکیان بە سەرۆک (روزەرفۆرد بی.هایس) بەخشی.

هەر لە سەروەختی هایس-ەوە زۆربەی سەرۆکەکان مێزی ریزەلوتیان بە شێوەیەک لە شێوەکان بەکارهێناوە. فرانکلین رۆزڤێلت داوای دەرگای نەخشی لاکێشەیی کردبوو بە وازێی هەڵکەنراوی خۆیەوە کە هەندێ لە مێژوونووسان بڕوایان وایە بۆ شاردنەوەی کورسییە دووتاییەکەی خۆی بووە. جۆن. ئێف. کەنەدی جونیەری منداڵ، لە وێنەیەکی دەگمەنی ئۆڤاڵ ئۆفیسدا سەری لەو دەرگایە هێناوەتە دەرەوە. باوکم ریزەلوتی لە ئۆفیسی ڤاتی سەرەوە بەکاردەهێنا لە شوێنی دانیشتن، کەچی بیل کلینتن هێنایەوە بۆ ئۆڤاڵ. دانیشتن لە پشت مێزە مێژووییەکەوە بیرهێنەرەوەیەک بوو- ئەو رۆژە و هەموو رۆژێک- بۆ ئەمەی کە دامەزراوەی سەرۆکایەتی زۆر گرنگترە لەو کەسەی لایەتی.

ئاندی کارد لەگەڵم بوو ئەو کاتەی کە بۆ یەکەمین جار لای ریزەلوتەوە دانیشتم. یەکەم بریای ئۆفیسی ئۆڤاڵم بریتی بوو لە جێگۆڕکێپێکردنی کورسییەکە- پارچەیەکی سەیر کە کاتێك پلکەکەی هەڵکرابا دەلەرییەوە- بە شتێکی زۆر کرداریتر. پاشان دەرگای رووەو (باخچەی رۆز) کرایەوە. سەرم هەڵبڕی و باوکم بینی. وتی "جەنابی سەرۆك". قاتێکی رەشی لەبەر بوو، قژی هێشتا تەڕ بوو لە ئەنجامی ئەو حەمامەی گەرمی کە کردبووی.

منیش وەڵامم دایەوە و وتم "جەنابی سەرۆك".

ئەو هەنگاوی نایە ناو ئۆفیسەکە و من لەلای مێزەکەوە سوڕامەوە. ئێمە لە ناوەڕاستی ژوورەکە یەکترمان بینی. هیچ کاممان هیچی وەهامان نەوت. پێویست نەبوو بڵێین. چرکەساتەکە زۆر لەوە بزوێنەرتر بوو کە هەر یەکێك لە ئێمە دەریبڕێت.

لە نۆیەمین رۆژمدا وەکو سەرۆك، تیمی بەرنامە و رێوشوێنی خۆجێیم لە ئۆفیسی ئۆڤاڵدا گربوونەوە. هەموویان لە کاتی خۆیدا ئامادە بوون. ئەمە کتومت ئەو شتە بوو کە پێشبینیم دەکرد. تەوقیتەکان گرنگن بۆئەوەی کە دڵنیابیت لەوەی دامەزراوەکە خاو و خلیسك نابێت. قسەکەری سەرەکی لەو رۆژەدا (مارگرێت سپێڵینگز) بوو، کە دایکێکی چاوکراوە و زیرەکی دوو منداڵ بوو. مارگرێت لەگەڵ مندا لە ئۆستنەوە گواستبوویەوە بۆ واشنتن وەکو راوێژکاری بەرنامە و رێوشوێنی خۆجێیی. ئەو رۆژە، ئەو چەندەها بابەتی هێنایە بەر باس، لەوانەش دەستپێشخەرییەکی نوێ بۆ خەڵکانی خاوەن پێداویستی و کۆمسیۆنێکی ریفۆرمی هەڵبژاردنی سەرۆکایەتیکراو لەلایەن سەرۆکەکانی پێشوو فۆرد و کارتەر. پاشان چووە ناو مشتومڕێکەوە لەبارەی توێژینەوەی خانەی بونیادیی کۆرپەلەیی. "ئیدارەی کلینتن رێنمایی یاسایی نوێی دەرکردووە کە لێکدەرەوەی (هەموارکردنەکەی دیکی)ین بۆ رێگەدان بە تەمویلی فیدراڵی بۆ توێژینەوەی خانەی بونیادیی کۆرپەلەیی. ئێمە چەند بژارەیەکمان لەبەردەمدایە—" ئەو تا ئێرە بەردەوام بوو پێش ئەوەی قسەی پێببڕم. پرسیارم کرد "یەکەمیان، خانەی بونیادی کتومت چی دەگەیەنێت؟" من بە پرسیارکردن باشتر فێر دەبم. لە هەندێ حاڵەتدا، من بەدواداچوون دەکەم بۆ تێگەیشتن لە مەسەلەیەکی ئاڵۆز. هەندێ جاری تر، پرسیار ئاراستە دەکەم بۆ

تاقیکردنەوەی زانیاریی قسەکەرەکە. ئەگەر نەتوانن بە رێکی و بە ئینگلیزییەکی سادە وەڵام بدەنەوە، ئەوا ئەمە ئاماژەیەکی سوورە لەمەڕ ئەوەی کە دەشێ ئاگایییەکی تەواویان لە بابەتەکە نەبێت. هەروەکو پێشوو، مارگرێت باش خۆی ئامادە کردبوو. ئەو سەرەتا بە روونکردنەوەی زانستەکە دەستیپێکرد. خانە بونیادییە کۆرپەلەییەکان سەرچاوەیەکی پزیشکیی تایبەتن، چونکە دەتوانن وەربچەرخێن بۆ چەندەها جۆر خانەی جیاواز. هەروەکو چۆن قەدی رووەکی چنگە پشیلە بۆ چەندەها لقی جیا گەشە دەکات، خانە بونیادییە کۆرپەلەییەکان توانای گەشەیان هەیە بۆ خانە دەمارییەکان بۆ مۆخ، بۆ شانە ماسولکەییەکان، یان بۆ ئۆرگانەکانی تر. ئەم خانانە رێگایەکی شیاویان پێشکەش کرد بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشییەکان هەر لە شەکرەی منداڵکارانەوە تا ئەلزەهایمەر و تا پارکینسن. تەکنۆلۆژیاکە نوێ بوو و زانستەکەش نەسلمێنرابوو. بەڵام ئیمکانیەتەکە گرنگ بوو. لەگەڵ ئەوەشدا، تاکە رێگای دەرهێنانی خانە بونیادییە کۆرپەلەییەکان بریتییە لە وێرانکردنی کۆرپەلە. ئەمەش تەنگژەیەکی ئەخلاقی نایەوە: دەکرێ لەناوبردنی ژیانی مرۆڤێك بە هیوای رزگارکردنی ئەوانیتر پاساو بدرێت؟

وەڵامی کۆنگرێس روون دیار بوو. هەر لە ۱۹۹٥ەوە، هەر ساڵێك، ئەنجومەنی نوێنەران و پیران یاسایان پەسەند دەکرد بۆ رێگرتن لە بەکارهێنانی تەمویلی فیدراڵ بۆ ئەو توێژینەوەیەی کە تیایدا کۆرپەلەی مرۆڤ تێك دەدرا. یاساکە بە (هەمواری دیکی) ناسراوە کە بەناوی سپۆنسەرەکە، کۆنگرێسمان (جەی دیکی)ی ئەرکەنساس کراوە.

لە ساڵی ۱۹۹۸دا، توێژەرێك لە زانکۆی ویسکنسن بۆ یەکەمین جار خانەیەکی بونیادیی کۆرپەلەیی جیا کردەوە. لەکاتێکدا کە خانەکە دابەش دەبوو، چەندەها خانەی تری دروست دەکرد- بە هێڵ ناو دەبرا- ئەمە دەکرا بۆ توێژینەوە بەکار بهێنرێت. ماوەیەکی کەم دواتر، ئیدارەی کلینتن لێکدانەوەیەکی رۆمانیی بۆ (هەموارکردنەکەی دیکی) تەبەنی کرد. پارێزەران بەڵگەی ئەوەیان دەهێنایەوە کە دەشێ پارەی باجدەران بەکاربهێنرێت بۆ پشتگیری لە توێژنەوەی خانەی بونیادی لەسەر هێڵە داتاشراوەکانی کۆرپەلە وێرانکراوەکان ئەگەر خودی وێرانکردنەکە لەلایەن سەرچاوە تایبەتییەکانەوە تەمویل

بکرێت. (دامەزراوە نیشتمانییەکانی تەندروستی) ئامادە بوو کە پاداشتی دارایی لەژێر باری ئەو حاڵەتانەدا ببەخشێت، بەڵام خولی سەرۆک کلینتن کۆتایی هات بەر لەوەی هیچ ئەمویلێک پزیشکەش بکرێت. ئەو بڕیارە کتوپڕەی ڕووبەڕووی من دەبووەوە ئەوە بوو ئاخۆ ڕێگە بدەم بەو کۆمەکە داراییانەی ڕێچکەی خۆیان وەرگرن.

***

ڕوون بوو کە ئەمە لە مشتومڕێکی ئەمویلکردن زیاتر دەبێ. پرسیارە ئەخلاقییەکان قوول بوون: ئایا کۆرپەلەیەکی بەستوو، ژیانی مرۆڤێکە؟ ئەگەر وایە، ئێمە چ بەرپرسیارێتییەکمان هەبوو بۆئەوەی بیپارێزین؟

من بە مارگرێت و (جۆش بۆلتن)ی جێگری سەرۆکی ستافم وت کە من ئەمە بە بڕیارێکی دوورەدەست لەقەڵەم دەدەم. پرۆسەیەکم گەڵاڵە کرد بۆ دانی. من پرەنسیپە ڕێنوێنەکانی خۆم ڕوون دەکردەوە، گوێم لە شارەزایانی هەموو لایەکانی مشتومڕەکە دەگرت، دەگەیشتمە دەرەنجامێکی نادڵنیا و بە بەردەم خەڵکی بە مەعریفەتمدا تێدەپەڕاند. لە کۆتاییدا، پرۆسەیەکم دادەڕشت بۆ دڵنیابوونەوە لەوەی ئاخۆ بەرنامەکەم پیادە کراوە.

بۆ بەڕێخستنی پرۆسەکە، جۆش (جەی لێفکۆویتز)ی ڕاوێژکاریی یاسایی گشتی ئۆفیسی بەڕێوەبردن و بودجەی ئاگادار کردەوە، ئاژانسێک کە چاودێریی بەرنامەی ئەمویلەکەی دەکردم. جەی، پارێزەرێکی هۆشمەند و زیندووی خەڵکی نیویۆرک بوو بە پابەندییەکی شێلگیرانەوە بە دینی جوولەکە و هەستێکی سوعبەتی ناڕاستەوخۆوە. دەستبەجێ کەیفم پێهات. ئەمە باش بوو، چونکە خەریک بوو کە کاتێکی زۆر بەیەکەوە بەسەر ببەین.

جەی منی دەوڵەمەند کرد بە خوێندنەوەی باکگراوند. ئەو بابەتی بڵاوکراوە پزیشکییەکان، نووسینەکانی پەیوەست بە فەلسەفەی ئەخلاق و شیکردنەوەی یاسایی دەهێنا. خوێندنەوەکانی ئەو لێشاوێك ڕوانگەی دەگرتەخۆ. لە گۆڤاری (زانست)دا، توێژەری ئەخلاقی بایۆلۆژی دکتۆر (لویس گێنین) دەیگووت "ئەگەر ئێمە توێژینەوەی

خانەی بونیادیی کۆرپەلە بەلاوە نێین، ئەگەری ئەوە نییە کە ساوایەکی تر لەدایک بێت ئەگەر توێژینەوەکە بخەینەگەڕ، ئەوا لەوانەیە لە نێش ڕزگارمان بێت".

ئەوانەی بەرەکەی تری مشتومڕ بەڵگەی ئەوەیان دەهێنایەوە کە پشتگیری حکومەت بۆ تێکدانی ژیانی مرۆڤ، هێڵی ئەخلاقی دەبەزێنێت. شارەزای بواری ئەخلاقی بایۆلۆژی (ویسلی سمیت) لە (ناشناڵ ڕفیو)دا نوسیبووی "توێژینەوەی خانەی بونیادیی کۆرپەلە دەمانباتە سەر ڕێچکەیەک کە پەیڕەوکردنمان بۆ ژیانی مرۆڤ دەکاتە ساماتێکی سروشتی لاستیکیی بازرگانی- نزیک لە گاڕانی مانگا یان کانی مس- کە لە سوودی لەدایکبوو و زیندوو دەکار دەکرێت. لە چەقیدا، پرسی خانەی بونیادی، بیرهێنەرەوەی پێکدادانی نێوان زانست و ئەخلاق بوو. هەستم کرد بەلای هەردوو ئاراستەکەدا بەکێش دەبم. هیچ بایەخم نەدەدا بە کۆمەڵگای (زەوی تەختانە). من هاوخەم بووم لەگەڵ چارەسەری پزیشکیی نوێ. من خوشکێکم بە لوکیمیای منداڵیی لەدەست دابوو. لە بۆردی دامەزراوەی نیشتمانیی ئیفلیجیی (کێنت والدرێپ) کارم کردبوو کە گرووپێکی پشتیوانی بوو و لەلایەن یاریزانێکی تۆپی پێی پێشووی زانکۆی مەسیحیی تەکساس بەڕێوە دەبرا کە بە دەست برینێکی دڕکەپەتکەوە دەینالاند. من بڕوام بە بەڵێنی زانست و تەکنۆلۆژیا هەبوو بۆ سوکنایی بەخشین بە ئێش و نەخۆشی. لەماوەی هەڵمەتی سەرۆکایەتییەکەمدا، پەیمانم دابوو کە پەیڕەویی ئەو پابەندییە بکەم کە کۆنگرێس لە ١٩٩٠ەکاندا هێنابوویە کایەوە بۆ تمویلی دارایی دووقات بۆ (دامەزراوە نیشتمانییەکانی تەندروستی).

لە هەمان کاتدا، هەستم کرد کە دەبێ تەکنۆلۆژیا ڕێز لە سنووره ئەخلاقییەکان بگرێت. من نیگەرانی ئەوە بووم کە ڕێگەدان بە تێکدانی کۆرپەلە مرۆییەکان بۆ توێژینەوە ببێتە هەنگاوێک خلیسکان لە چیرۆکی زانستییەوە بۆ واقیعی پزیشکی. من وێنای ئەوەم دەکرد کە توێژەران کۆرپەلەکان کۆپی دەکەن بۆ دروستکردنی پارچە جەستییە یەدەکەکان لە تاقیگەدا. دەمتوانی وێنای کۆرپە دیزاینەرەکان بکەم کە توانایان بە دایکان و باوکان داوە ئەندازەگیریی یاریزانی سەڵەی قژزەردی خودی خۆیان بکەن. مۆتەکەی کۆپیکردنی بەرفراوانی مرۆڤ زۆر لەمەوە دوور نییە. دەمزانی کە ئەم

ئەگەرانە بەلای هەندێ خەڵکەوە خەیاڵپلاوی بوون. بەڵام هەر کە زانست دەستیکرد بە شۆڕبوونەوە بە ڕێچکەکەدا، ئەوا گەڕانەوەی ئەستەم دەبێ.

***

پرسی خانە بونیادییەکان لەگەڵ مشتومڕی لەباربردندا چوونەتەوە سەر یەک. ئێستا قورسە بڕوا بکەیت، بەڵام لەباربردن پرسێکی سیاسیی گەورە نەبوو کاتێك گەنج بووم. بیرم نایەت کە لەسەرەتاکانی هەڵمەتەکانی باوکمدا یان لە ئاندۆڤەر یان یەڵ ئەوەندە هاتبێتە بەر باس. ئەمە لە ١٩٧٣دا گۆڕا کاتێك دادگای باڵا، لە بڕیارێکیدا کە دادوەر (بایرۆن وایت) بە "کردارێك لە دەسەڵاتیی دادوەریی پێنەگەیشتوو" ناوی برد، لەباربردنی بە مافێکی پارێزراو لەلایەن دەستوورەوە دانا. پرسی لەباربردن قورسە، هەستیارە و کەسییە. ئیمان و ویژدانم وایلێکردم بگەمە ئەو ئەنجامەی کە ژیانی مرۆیی پیرۆزە. خودا مرۆڤی لە وێنەی خۆی دروستکردووە، بۆیە لە چاوی ئەودا هەر کەسێك بەهای هەیە. بەلای منەوە وا دیار بوو کە منداڵێکی لەدایکنەبوو، لەکاتێکدا کە وابەستەیە بە دایکییەوە، بوونێکی جودا و سەربەخۆیە کە شایستەی پارێزگاریلێکردنە بە مافی خۆی. کاتێك بۆ یەکەم جار باربارا و جێنام لە سۆنۆگرامەکەدا بینی، هیچ گومانم نەبوو لەوەی کە ئەوان جیاواز و زیندوو بوون. تەنیا ئەو ڕاستییەی کە ئەوان نەیاندەتوانی خۆیان قسە بکەن، هاندەری ئەرکی کۆمەڵگە بوو بۆ داکۆکی لێکردنیان.

خەڵکێکی شایستە و هۆشمەندی زۆر ناڕازی بوون، لەوانەش ئەندامانی خێزانەکەم. من لە هۆکارەکانیان تێگەیشتم و ڕێزم لە دیدەکانیان گرت. وەکو سەرۆك، هیچ ئارەزووی ئەوەم نەبوو کە ملیۆنان کەس وەکو گوناهبار ئیدانە بکەم یان بەنزینی نوێ بەسەر ئاگرە کەلتوورییە هەڵایساوەکاندا بکەم. هەستم بە لێپرسراوێتییەك کرد بۆ هەڵبڕینی دەنگی ژیاندۆستییەکەم و ئاراستەکردنی وڵات رووەو ئەو شتەی کە پاپا ژانپۆلی دووەم بە کەلتوورێکی ژیان ناوی دەبرد. من قەناعەتی ئەوەم هەبوو کە زۆربەی ئەمریکییەکان رازین لەسەر ئەوەی کە ئێمە بە لەباربردنی کەمتر، حاڵمان باشتر دەبێ. یەکێك لە یەکەم یاساکانم لە کۆشکی سپیدا، گەڕاندنەوەی ئەوە بوو کە پێی دەوترا (ڕێوشوێنی شاری مەکسیك)، کە ڕێگری دابینکردنی دارایی دەکرد بۆ ئەو گروپانەی کە لە دەرەوە برەویان

بە لەباربردن دەدا. مـن پـشتگیریی ئـەو یاسـا ویلایەتییانـەم دەکـرد کـە داوای ئاگادارکرنـەوەی دایکـان و باوکانیـان دەکـرد لەمـەڕ ئـەو بـالغ نەبووانـەی دەیانویست سکەکانیان لەبار ببەن. هەروەها پـشتگیری و واژۆ و بـەرگریم لـەو پرۆژەیاسایە کرد کە کرداری دزێوی لەباربردنی نیوەلەداکیبوونی قەدەغە دەکرد.

مـن و لۆرا بەهـەمان شێوە پـشتیوانی بـەهێزی بـەخێوکردن بـووین. پـاش قورسیی خستنەوەی مندالٚ، قورس بـوو بۆمـان کـە وێنـای ئـەوە بکـەین کەسێك ئـەو شتە رەفز دەکاتەوە کە ئێمە بە دیاریی بـەهادار ناومـان لەقـەڵممان دەدا. لەگـەلٚ ئەوەشدا، وەکو باوکی دوو کچ، دەمتووانی وێنای ئەو تەنگژەیە بکەم کە رووبەڕووی هەرزەکارێکی تۆقیـو بکەم کە سکێکی پلان بۆدانەنراوی هەیە. بەخێوکردن (تەبەنیکردن) ئەلتـەرناتیڤێکی زۆر پۆزەتیڤ بوو بۆ لەباربردن، رێگایەك بوو بۆ رزگـارکردنی ژیانێـك و دەوڵەمەنـدکردنی دوو ژیـانی تـر: دایـك و باوکـە بەخێوکەرەکـە. خۆشـحالٚ بـووم بـە واژۆکردنـی یاسـایەك بـۆ زیـادکردنی تـەمویل بـۆ سـەنتەرەکانی راوێـژکاریی قـەیرانی سـکپڕی، هـەروەها بـۆ فراوانکردنـی ئیمتیـازاتی بـاج بـۆ سـوککردنی تێچوونی بـەخێوکردن. لـە دوورمـەودا دا، ئومێدی ئەوەم هەبوو کـە گۆڕانێـك لـە دڵەکانـدا ببێتـەهۆی گـۆڕان لـە یاسـادا، هـەروەکو تەکنۆلۆژیا نوێکانی وەکو (سـێ رەهەندییـە سـەروو دەنگییـەکان) یارمـەتیی ژمارەیـەکی زیاتری ئەمریکییـەکان دەدەن تـا مرۆڤبـوونی کۆرپـە لەدایکنـەبووەکان بـزانن. هـەروەها هیواداربووم کە سەرکردە سیاسییەکان بەردەوام بن لە قسەکردن لەمـەڕ کـەلتوورێك کە تـەواوی ژیـانی مرۆیـی بـێ گونـاه دەنـرخێنن. (بـۆب کـەیسی)، حـاکمی کۆچـکردووی دیموکراتی پەنسیلڤانیا، چاکی وتووە "کاتێك ئێمـە دەڕوانینـە منـداڵێکی لـەدایك نـەبوو، پرسی راستەقینە ئەوە نییە کـە کـەی ژیـان دەسـت پێـدەکات، بـەڵکو ئەوەیـە کـە کـەی خۆشەویستی دەست پیّ دەکات".

***

هەر لەسەرەتای بەهاری ٢٠٠١ەوە، مارگرێت، جەی و کارل رۆڤ- کە زۆر نزیك بـوو لـە گروپـە پـشتیوانەکانی هـەردوو بەرەکـە- بانگهێـشتی کۆمـەڵێك پـشتگیریکار، زانـا،

ئەخلاقناس، بیرمەندی ئایینی ناسراویان کرد بۆ مشتومڕکردن لەسەر توێژینەوەی خانە بونیادییە کۆرپەلەییەکان. وتوێژەکان سەرنجیان راکێشام. چەندەی زیاتر فێر بووم، زیاتر پرسیارم لادروست دەبوو. کاتێک وتاری دەستپێکردنم لە (نۆتەردام) پێشکەش کرد، توێژینەوەی خانەی بونیادیی کۆرپەلەییم لەگەڵ راهیب (مالۆی)ی سەرۆکی زانکۆکە هێنایە بەر باس. کاتێک رۆژی دواتر لە یەڵ قسەم کرد، بابەتەکەم لەگەڵ دکتۆر ( هارۆلد ڤارمەس) هێنایە بەرباس کە سەرۆکی (سەنتەری شێرپەنجەی مێمۆریاڵ سلۆن کێتەرین) بوو. لە ئاهەنگێکی لەدایکبووندا بۆ دکتۆرێک لە یەکەی پزیشکیی کۆشکی سپی، پرسیاری ئەو شتەم لە هەموو پزیشکەکان کرد کە چاوەڕێیان دەکرد. کاتێک قسە هاتە سەر ئەوەی کە من سۆراخی راوبۆچوون دەکەم، کەوتمەبەر لێشاوی زانیاری پێدان لەلایەن سکرتێرەکانی کابینە، ئەندام ستافەکان، راوێژکارانی دەرەوە و هاوڕێیان.

بێگومان من داوای ئامۆژگاریم لە لۆرا کرد. باوکی بەهۆی ئەلزەهایمەرەوە مردبوو، دایکی تووشی شێرپەنجەی مەمك ببوو و ئومێدێکی گەورەی هەبوو بە ئەگەری چارەسەری نوێ. بەڵام نیگەرانی ئەوە بوو کە گروپە پشتیوانەکان زیادەڕەوی لە بەڵێنەکانیاندا هەبێت لەمەڕ ئەوەی کە توێژینەوەی خانەی بونیادیی کۆرپەلەیی چ دەسکەوتێکی دەبێت و خێزانە نائومێدەکان بە ئومێدی ناکام بهێڵێتەوە.

ئەندامانی کۆڕی زانستی دوو بەڵگاندنی سەرەکییان خستەڕوو لە بەرژەوەندی تەمویلکردنی توێژینەوەی خانەی بونیادیی کۆرپەلەیی. یەکەمیان بریتی بوو لە ئیمکانیەتی پزیشکی. توێژەران پێیان وتم کە ملیۆنان ئەمریکی هەن کە بەدەست ئەو نەخۆشییانەوە دەناڵێنن کە دەشێ کاریگەرییەکەی کەم بکرێتەوە لە رێگەی چارەسەری سەرچاوەگرتوو لە خانە بونیادییە کۆرپەلەییەکان. شارەزایان بڕوایان وابوو کە تەنیا چەند هێڵێکی خانەی بونیادیی کۆرپەلەیی کەم پێویست دەبن بۆ لێکۆڵینەوەی زانست و دیاریکردنی بەهاکەی. توێژەرێکی زانکۆی ستانفۆرد بە رۆژنامەی نیویۆرک تایمزی گوت "ئەگەر دە بۆ پانزە هێڵمان هەبێت، کەس سکاڵا ناکات".

تیمێکی توێژینەوەی (دامەزراوە نیشتمانییەکانی تەندروستی) پێیان وتم کە هەنوکە دە دوانزە هێڵی خانەی بونیادی لەژێر پەیدابووندان. هەروەها باسیان لە جۆرێک

توێژینەوەی سەرەتایی کرد لەسەر ڕێگا ئەلتەرناتیفەکانی داتاشینی خانەی بونیادیی بەبێ وێرانکردنی کۆرپەلە. ڕەئی هاوبەشیان، ئەوە بوو کە لاریکردن لە پشتگیریی فیدراڵ بۆ توێژینەوەی خانەی بونیادیی کۆرپەلەیی دەبێتەهۆی دەرفەتێکی لەدەستچوو. ئەوان دەیانگوت پارەی باجدەران نەک تەنیا سەرچاوەیەکی گرنگی تەمویلی دارایی، بەڵکو وەکو واژۆیەکی پەسەندکردنیشە بۆ نوێکاری زانستی.

دووەمین دیدی زاناکان، کردارییەکەیان بوو: زۆربەی ئەو کۆرپەلانەی کە بەکاردەهێنران بۆ داتاشینی خانە بونیادییەکان، لەوانەبوو هەرچۆنێك بێ فڕێ بدرێن. سەرچاوەی سەرەتایی ئەم کۆرپەلانە، کلینیکەکانی (پیتاندنی ناو لولەك) بوون. کاتێك ژن و مێردێك بەشدارییان لە (پیتاندنی ناو لولەك)دا دەکرد، بە شێوەیەکی ئاسایی دکتۆرەکان هێلکەیەکی زیاتریان لە دایکەکەدا دەچاند. سەرەنجام، هەندێ کۆرپەلە دەمانەوە پاش ئەوەی چارەسەرەکە تەواو دەبوو. ئەوان بە شێوەیەکی ئاسایی بەستوو بوون و لە لەلایەن کلینیکی پیتاندنەوە هەڵدەگیران. بە قسەی زاناکان، لەبەرئەوەی ئەم بەناو کۆرپەلە یەدەکانە بەکارنەدەهێنران بۆ خستنەوەی منداڵ، ئایا کارێکی بەجێ نەبوو کە بۆ توێژینەوەیەك بەکاربهێنرێن کە دەشێ بە ئەگەرێکی زۆر چەندەها ژیان ڕزگار بکات؟

یەکێك لەو گروپانەی کە بەشێوەیەکی کارا پشتیوانی لە توێژینەوەی خانەی بونیادیی کۆرپەلەیی دەکرد، دامەزراوەی توێژینەوەی شەکرەی منداڵکاران بوو. بە تەموزی ٢٠٠١دا، من بانگهێشتی نوێنەرانی دامەزراوەکەم کرد بۆ ئۆفیسی ئۆڤاڵ. لەناو وەفدەکەدا، دوو هاوڕێی من هەبوون، (ودی جۆنسن) و (مایك ئۆڤەرلۆك). هەردوو پیاوەکە پشتیوانانی سیاسی بوون و هەردووکیان منداڵیان هەبوو کە بە دەست شەکرەوە دەیانناڵاند. ئەوان پشتیوانی مکوڕ و شێلگیر بوون بە دڵسۆزییەکی جیاوازەوە بۆ منداڵەکانیان. بەڵام دڵنیاییان لەبارەی بەرەوپێشچوونی خێرای خانەی بونیادیی کۆرپەلەیی، سەرسامی کردم. کاتێك ئاماژەم کرد بەوەی کە زانستەکە نەسەلمێنراوە و ئەمەی کە دەشێت ئەلتەرناتیف هەبێت بۆ وێرانکردنی کۆرپەلە، ڕوون بوو کە گروپی پشتیوانەکان هیچ

بوارێکی نەهێشتوتەوە بۆ گومان لە ئەقڵەکاندا. دیدارەکە پەنجەرەیەك بوو بۆ ئەو سۆزانەی کە مەسەلەکە دەیتووانی بیانهێنێتەکایەوە.

هەمان ڕۆژ، بەهەمان شێوە چاوم کەوت بە نوێنەرانی (مافی سروشتی بۆ ژیان) دژی هەر توێژینەوەیەك بوون کە تێکدانی کۆرپەلەی لەگەڵدا بێت. ئەوان دەکرد کە هەر تۆپەڵەیەکی خانەی بونیادیی بچوك، توانای ئەوەی هەیە گەشە بکات بۆ کەسێك. لە ڕاستیدا، هەمووومان لەم دۆخە سەرەتاییەوە دەستمان کردووە بە ژیان. وەکو بەڵگەیەك، ئاماژەیان کرد بە پرۆگرامێکی نوێ کە (نایتلایت کریسچن ئەدۆپشنز) بەڕێوەی دەبرد. ئاژانسەکە مۆڵەتی لە بەشدارانی (منداڵی ناو لولەك) وەرگرتبوو بۆ دانانی کۆرپەلە بەستووە بەکارنەهێنراوەکانیان بۆ تەبەنیکردن. دایکانی بەسۆز کۆرپەلەیان لە ناودا دەچاندرا و سکپڕ دەبوون بە منداڵ- کە بە پروشەی بەفر- ناو دەبران. پەیامەکە زانراو بوو: لەناو هەر کۆرپەلەیەکی بەستوودا، سەرەتاکانی منداڵێك هەبوو. زۆرێك لەو زیندە-ئەخلاقناسانەی کە من دەمبینین، هەمان هەڵوێستیان هەبوو. ئەوان دانیان بەوەدا نا کە زۆربەی ئەو کۆرپەلانەی کە لە کلینیکەکانی (منداڵی ناو لولەك)دا بەسترابوون، نەدەبوونە منداڵ. لەگەڵ ئەوەشدا، بەڵگەی ئەوەیان دەهێنایەوە کە جیاوازییەکی ئەخلاقی هەیە لەنێوان ڕێگەدان بە کۆرپەلەکان بۆئەوەی بەشێوەیەکی سروشتی بمرن لەگەڵ ئەوەی کە بەشێوەیەکی دەستکرد کۆتایی بە ژیانیان بهێنرێت. بە بەڵگەی ئەوان، مۆڵەتدان بە وێرانکردنی ژیان بۆ ڕزگارکردنی ژیان، بەزاندنی ڕووبەڕی ئەخلاقیی مەترسیدارە. هەروەکو یەکێك وتبووی " ئەمەی کە بوونێك خەریکە دەمرێت، مافی ئەوەمان پێنادات کە بەکاری بێنین وەکو سامانێکی سروشتی بۆ دەکارکردن".

گوێبیستی هەندێ ڕەئی بوومەوە کە واقیان وڕ ماندم. (دکتۆر دان کالاهان) کە ئەخلاقناسێکی هۆشمەند بوو، پێی وتم کە ئەو لەگەڵ ئیختیاردا لە مەسەلەی لەباربردندا، بەڵام لەدژی توێژینەوەی خانەی بونیادیی کۆرپەلەییە. ئەو بڕوای وابوو کە جیاوازییەکی ئەخلاقی هەیە لەنێوان لەباربردنی منداڵ لە سوودی دایکەکەی و وێرانکردنی کۆرپەلەیەك بۆ مەبەستی تەمومژاوی و ناراستەوخۆی توێژینەوەی زانستی. (دکتۆر بێنجامین کارسن)، کە یەکێکە لە نەشتەرگەرە هەرە بەڕێزەکانی جیهان، پێی وتم کە دەشێت توێژینەوەی

خانەی بونیادیی کۆرپەلەیی بەهادار بێت، بەڵام دەبێت زاناکان سەرنج بخەنەسەر ئەلتەرناتیڤەکانی ویرانکردنی کۆرپەلە، وەکو کۆکردنەوەی خانە بونیادییەکان لە خوێنی ناوکەپەتک. لەلایەکی ترەوە، (تۆرێن هاچ) و (ستروم تیرمۆند)، دوو ئەندامی ژیانخوازی هەرە مکوڕی ئەنجومەنی پیران، پشتگیرییان لە تمویلی فیدراڵی دەکرد بۆ توێژینەوەی بونیادیی کۆرپەلەیی، چونکە پێیان وابوو کە سوودی رزگارکردنی ژیانەکان پارسەنگ دەرەوەی باجی ویرانکردنی کۆرپەلەکانە.

***

لە ئەمڕۆی ٢٠٠١دا، سەردانی پاپا ژانپۆلی دووەمم کرد لە شوێنی دانیشتنی جوانی هاوینەی (کاستێل گاندۆلفۆ). پاسەوانەکە بە جلی مەراسیمەوە بە زنجیرە ژوورێکدا و بۆ ناو هۆڵی پێشوازی هاورێیەتییان کردین. پاپا ژانپۆلی دووەم یەکێک بوو لە کەسایەتییە گەورەکانی مێژووی مۆدێرن. ئەو کە رزگاربوویەکی حوکمی نازی و کۆمەنیست بوو لە زێدی خۆی لە پۆڵەندا، لەماوەی ٤٥٥ ساڵدا بووە یەکەم پاپای دەرەوەی ئیتاڵیا. بە بانگەوازی "مەترسە"کەیەوە، ویژدانی خۆرهەڵات و ناوەراستی ئەورووپای کۆکردەوە بۆ رووخاندنی پەردەی پۆڵایین. وەکو مێژووناسێکی دیاری جەنگی سارد، (جۆن لویس گادیس) دواتر نوسیبووی "کاتێک پاپا ژانپۆلی دووەم لە ٢ی حوزەیرانی ١٩٧٩دا لە فرۆکەخانەی (وارسۆ) زەوی ماچ کرد، ئەو دەستی بە پرۆسەیەک کرد کە بەهۆیەوە کۆمەنیزم لە پۆڵەندا — و سەرەنجام لە هەموو شوێنێکی تری ئەورووپا — کۆتایی پێهات.

بەهاتنی ٢٠٠١، تین و توان وزەی (باوکی پیرۆز) لاواز ببوو. جوڵەکانی بە وریاییەوە بوو، قسەکانی نەرم و خاو بوون. لەگەڵ ئەوەشدا چاوەکانی دەدرەوشانەوە. ئەو پڕ بوو لە رۆحێکی ناسراوە. ئەو بە وریاییەوە لێورا، بارساری کچمان و منی بەرەو باڵکۆنەکە رێنمایی کرد کە لەوێ سەرسام ببووین بە دەریاچەی جوانی (ئالبانۆ) لەژێرەوە. پاشان من و ئەو چووینە ژوورێکی کۆبوونەوەی سادە کە لەوێ قسەمان لەسەر چەندە بابەت کرد، لەوانەش توێژینەوەی خانەی بونیادیی. ئەو لە بەڵێنی زانست تێدەگەیشت — باوکی پیرۆز خۆی تووشی پارکینسن ببوو. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو سوور بوو لەسەر ئەوەی کە

پێویستە ژیانی مرۆڤ لە هەموو شێوەکانیدا پارێزگاری لێبکرێت. لەبەرانبەر نموونەکەی لەمەڕ سەرکردایەتییەکی خاوەن پرەنسیپانە. من سوپاسیم کرد کردەوە کە پشتگیریی تۆکمەی کڵێسای کاسۆلیك لە ژیان، بناغەیەکی ئەخلاقی دابین کردووە کە سیاسییە ژیانخوازەکانی وەکو من دەتوانن هەڵوێستی لەسەر وەربگرن. من پێم وت کە هیوادارم کڵێسا هەمیشە وەکو پایەیەك بێت بۆ داکۆکی لە شکۆی مرۆڤ.

کاتێك لە ٢٠٠٥، باوکی پیرۆز کۆچی دوایی کرد من، لۆرا، باوکم، بیل کلینتن پێکەوە چووین بۆ ماتەمینییەکەی لە ڕۆما. ئەمە یەکەمین جار بوو کە سەرۆکێکی ئەمریکا لە مەراسیمی ناشتنی پاپایەك ئامادە بێت، چ جای ئەوەی کە دوو سەرۆکی پێشووش لەگەڵ خۆی بهێنێت. ماوەیەکی کورت پاش گەیشتنمان، ئێمە چووین ڕێز لە باوکی پیرۆز بنێین پێش ناشتنی. لەکاتێکدا کە ئەژنۆمان دادا لە مەراسیمەکەدا بۆ نزاکردن لەسەر تەرمەکەی، لۆرا ڕوویکردە من و وتی "ئێستا کاتی نزاکردنە بۆ موعجیزەکان". خورپەیەکی چاوەڕواننەکراو بە دڵمدا هات. نزام بۆ (پیتەر جێنینگز)ی پێشکەشکاری کەناڵی ئەی.بی.سی نیوز کرد کە بە شێرپەنجە لە گیانەلادا بوو.

کۆمەڵی ماتەمینییەکە بێ وێنە جوڵێنەر بوو. خەڵکی لەناو گۆرەپانی سەینت پیتەرز هاواریان دەکرد، گۆرانییان دەوت و لافیتە و دروشیمان بۆ ئیحتیفالکردن بە ژیانی باوکی پیرۆز بەرز کردبووەوە. پاش وتارێکی ئایینی لەلایەن کاردینال جۆزێف راتزینگەر- کە یانزە ڕۆژ دواتر لە کۆبوونەوەیەکەوە بوو بە پاپا بێندیکتی شانزەیەم - گروپێك بەرپرسی کڵێسا دارەمەیتی باوکی پیرۆزیان بردە سەرەوەی قادرمەکان بەرەو (سەینت پیتەرز باسیلیکا). ڕێك بەر لە چوونە ژوورەوە بە دەرگاکاندا، لایان کردەوە بۆ رووکردنە قەرەباڵغییەکە و بۆ دواهەمین جار تەرمەکەیان بەرز کردەوە. لەم چرکەساتەدا، هەورەکان لێك بوونەوە و خۆر تیشکەکانی ئاراستەی سندوقە دارینەکە کرد.

***

پاش چەند مانگێك لە گوێگرتن و تێڕامان، من لە بڕیاری توێژینەوەی خانەی بونیادی نزیك ببوومەوە. چرکەساتی یەکلاییکەرەوە ئەو کاتە بوو کە لە ١٠ی تەموزدا وتوێژم

لەگەڵ (لیۆن کاس)دا کرد. لیۆن پزیشکێکی زۆر بەڕێز و ئوستادی فەلسەفە بوو لە زانکۆی شیکاگۆ. ئەو لە بوارە جیاجیاکانی بایۆلۆژیای گەشەیی، ئەدەب و کتێبی پیرۆزدا وانەی وتبووەوە و شتی نووسیبوو. ئەو بەلای منەوە وەکو پیاوێکی هۆشمەند و ژیر دەرکەوت.

بە لیۆنم وت کە من لە ململانێی ئەم بڕیارەدا بووم. توێژینەوەی خانەی بونیادی وادیار بوو کە ئومێدێکی زۆر ببەخشێت. لەگەڵ ئەوەشدا نیگەرانیی پرکێشەی ئەخلاقی دەوروژاند. من بیرم لەوە دەکردەوە ئاخۆ دەشێ ڕێوشوێنێکی خاوەن پرەنسیپانە بدۆزمەوە کە زانست بەرەوپێش ببات و ڕێز لە شکۆی ژیان بگرێت.

ئەقڵی لۆژیکیی لیۆن چووە ناو کارەوە. ئەو بەڵگەی ئەوەی هێنایەوە کە کۆرپەلەکان—تەنانەت ئەو لەمێژە بەستووانەش— توانای ژیانیان هەیە و بۆیە جۆرێک لە ڕێزگرتنیان پێویستە. ئەو وتی "مرۆڤ هەست بە خەمباری دەکات ئەگەر ئەم شتانە بەکاربهێنێت. ئێمە لانی کەم ڕێزی ئەوەیانمان لەسەرمانە کە بۆ مەبەستەکانی خۆمان ئیستیغلالیان نەکەین. ئێمە مامەڵە لەگەڵ تووەکانی جیلی دواتر دەکەین".

من بیرۆکەیەکم خستەڕوو: چی دەبێ ئەگەر مۆڵەتم بە تمویلی دارایی فیدراڵ دا بۆ توێژینەوەی خانەی بونیادیی کۆرپەلەیی— بەڵام تەنیا بۆ هێناکایەی هێڵەکانی خانە بونیادییەکان؟ ئەو کۆرپەلانەی کە بەکارهێنرابوون بۆ دروستکردنی ئەو کۆرپەلانە، وێران کرابوون. هیچ ڕێگەیەک نەبوو بۆ گەڕاندنەوەیان. پێدەچوو لۆژیکی بێت کە ڕێگە بدەیت بە زاناکان تا بەکاریان بێنن بۆ سۆراخکردنی ئەو چارەسەرانەی کە دەشیا چەندەها ژیانی تر ڕزگار بکەن. بەڵام ئەمە پرسیارێکی تری دەوروژاند: ئەگەر من ڕێگەم بە تمویلی فیدراڵدا بۆ ئەو توێژینەوەیەی کە پشت ئەستوور بوو بە تێکدانی کۆرپەلەکان، ئەوا من ناراستەوخۆ هانی وێرانکردنی زیاترم دەدا؟

لیۆن وتی باوەڕم وایە کە تمویلکردنی توێژینەوەیەک لەسەر هەنوکە کۆرپەلەی وێرانکراو، ئەخلاقییە بە دوو مەرج. پێویستە جەخت بکەمەوە لەو پرەنسیپە ئەخلاقییەی کە پێشێلکراوە— لەم حاڵەتەدا، شکۆی ژیانی مرۆڤە. هەروەها پێویستە جەخت بکەمەوە لەوەی کە تمویلی فیدراڵ نابێ بەکاربهێنرێت بۆ وێرانکردنی زیاتری کۆرپەلەکان. ئەو وتی

ئەگەر هەردوو ئەمانە بکەم، ئەوا ڕێوشوێنەکە لە تاقیکردنەوەی ئەخلاقی دەردەچێت.
ئەو وتی "ئەگەر تۆ تمویلی توێژینەوەیەک لەسەر ئەو هێڵانە کە هەنوکە دروستکراون، ئەوا تۆ ئەگلاویتە وێرانکردنیان".

وتوێژ لەگەڵ لیۆن بیرکردنەوەی منی بەرجەستە کرد. بڕیارمدا کە حکومەت تمویلی توێژینەوە بکات لەسەر هێڵەکانی خانە بونیادییەکانی وەرگیراو لە ئەو کۆرپەلانەی کە هەنوکە وێران کرابوون. لەهەمان کاتدا، داوا لە کۆنگرێس دەکەم تمویل بۆ ئەو سەرچاوە ئەلتەرناتیڤانەی خانە بونیادییەکان زیاد بکات کە هیچ مشتومڕێکی ئەخلاقییان نەخستەوە. منیش سنوورێکی ئەخلاقیی بتەوم دەکێشا: پارەکانی باجی فیدراڵ بەکارناهێنرێن بۆ پشتگیری لە وێرانکردنی ژیان لەپێناو دەسکەوتی پزیشکیدا. هەروەها ئەنجومەنێکی زیندە-ئەخلاقیی سەرۆکایەتیی نوێم دروستکرد کە پێکهاتبوو لە شارەزایانی هەموو باکگراوندەکان بە سەرۆکایەتی لیۆن کاس.

هەنگاوی دواتر، ڕاگەیاندنی بڕیارێک بوو بۆ ڕاگەیاندنی بڕیارەکە بۆ خەڵکی ئەمریکا. کارێن پێشنیاری وتارێکی زۆرترین بینەر و گوێگری دەگمەنی کرد بۆ گەل. کاتێک سەرۆک لە کاتی زۆرترین بینەر و گوێگردا موخاتەبەی گەل دەکات، بە شێوەیەکی ئاسایی وەکو فەرماندەی هێزە چەکدارەکان دەدوێت. لەم حاڵەتەدا، من وەکو مامۆستایەکی بەرپرس دەدوێم. حەزم لەو بیرۆکەیە بوو. توێژینەوەی خانەی بونیادی پرسێکی جددی بوو بۆ وڵات، بەڵام بۆ زۆربەی هاوڵاتیان تەمومژاوی بوو- هەروەکو چۆن لە مانگی کانوونی دووەمدا بۆ منیش وەها بوو. ڕوونکردنەوەی بڕیارەکەم تەقریبەن وەکو بڕیاردانەکە گرنگە. لە نۆی ئابی ٢٠٠١دا، من قسەم بۆ تۆڕێکی تەلەفزیۆنیی سەرانسەری کرد لە کراوفۆرد، تەکساس- شەوی پێش وتارەکە، من و لۆرا نانی ئێوارەمان لەگەڵ جەی، کارێن و ڕۆبەرتی کوڕی و هاوڕێیەکی خێزان بەناوی کێن بلاسینگەیم کە دیزاینەری (فۆرت وێرس) بوو، خواردبوو. داوام لە جەی کرد کە نزایەک بخوێنێت بەر لەوەی دەست بە ژەمەکە بکەین. ئەو هەندێ قسەی هۆشمەندانەی کرد. کە تەواوی کرد، هەموومان سەرمان چەماندەوە، چاوەڕێی ئامین-مان دەکرد. پاش چەند چرکەیەک سەر

شۆڕکردنەوە، جەی وتی نزاخوێنانی جولەکە هەمیشە بە ئامێن کۆتایی ناهێنن. ئەو ئەنجامگیرییەکی گونجاو بوو بۆ پرۆسەیەکی پڕ لە فێربوون.

من وتارەکەم دەست پێکرد، "ئێوارەتان باش. ستایشی ئەو چەند خولەکە دەکەم کە ئەمشەو بە منی دەبەخشن بۆئەوەی بتوانم پرسێکی قورس و ئالۆز لەگەڵ ئێوەدا باس بکەم، پرسێك کە لەم سەردەمەماندا قوڵترینیانە". من تەنگژەکەم پوخت کردەوە: "لەکاتێکدا کە ئێمە پێویستە وزەیەکی گەورە بۆ زاڵبوون بەسەر نەخۆشیدا تەرخان بکەین. بە هەمان شێوەش گرنگە کە سەرنج بدەینە ئەو نیگەرانییە ئەخلاقییانەی کە لەلایەن بواری توێژینەوەی خانە بونیادییە کۆرپەلەییەکان وروژێنراوە. تەنانەت شەرەفمەندانەترین ئامانجەکان پاساوی هیچ ئامرازێك نادەن". لە نزیکی کۆتاییدا، چوومە سەر بڕیارەکەم:

"توێژینەوەی خانەی بونیادی، هەم مژدەیەکی گەورە و هەم مەترسییەکی گەورە پێشکەش دەکات. بۆیە من بڕیارمداوە کە پێویستە بە وریاییەکی زۆرەوە بەرەوپێش بچین...من گەیشتوومە ئەو ئەنجامەی کە ڕێگە بە تەمویلی فیدراڵی بدەین بەکاربهێنرێت بۆ توێژینەوە لەسەر ئەم هێڵانەی خانەی بونیادی کە هەنوکە هەن، لە شوێنێکدا کە هەنوکە بڕیاری ژیان و مەرگ دراوە. زانا پێشەنگەکان پێم دەڵێن کە توێژینەوە لەسەر ئەم شەست هێڵە مژدەیەکی گەورەی پێیە کە دەشێ بەرەوپێشچونێك لە دەرمان و چارەسەردا دروست بکات. ئەمە ڕێگەما پێدەدات کە سۆراخی بەڵێن و توانای توێژینەوەی خانەی بونیادی بکەین بەبێ بەزاندنی هێڵی ئەخلاقیی بنەڕەتی، لە ڕێگەی دابینکردنی تمویلی باجدەر کە مۆڵەتی یان هانی وێرانکردنی زیاتری کۆرپەلە مرۆییەکان دەدات کە لانی کەم توانایان بۆ ژیان هەیە...من ئەم بڕیارەم بە وریاییەکی زۆرەوە داوە و نزا دەکەم کە راست بێت".

بە ماوەی چەند هەفتەیەك پێش وتارەکە، هەستم بە جۆرێك لە شڵەژان کردبوو. بەردەوامی گریمانەکانم دەخستە ژێر پرسیارەوە و جارێکی تر بژارەکانم هەڵدەسەنگاندەوە. بە دانی بڕیارەکە، هەستم بە ئارامییەك کرد. نەمزانی کاردانەوەکە

چۆن دەبێ. ئێمە گرووپێکی تەرکیزمان پێك نەهێنا بوو نە راپرسیشمان کردبوو. تەنیا کە چاوەڕێی ئامێنمان کرد لە کۆتایی نزاکەی جەی-دا، کەوتینە چاوەڕوانی بۆ کاردانەوە.

***

کاردانەوە بۆ بڕیاری خانەی بونیادی بە خێرایی هاتەئاراوە. زۆرێك لە چالاکوانانی هەردوولا وەکو شتێکی بەجێ و هاوسەنگ ستایشی ڕێوشوێنەکەیان کرد. لەکاتێکدا کە هەندێ لە زاناکان و گروپە پشتیوانەکان بە نائومێدی وەلامیان دایەوە، زۆرێك لە خەلك وەکو دەنگێکی متمانە لە کارەکانیاندا پێشوازییان لە تەمویلی فیدراڵیی بێ وێنە کرد. سەرۆکی دامەزراوەی توێژینەوەی شەکرەی منداڵکاران، بەیانێکی دەرکرد تیایدا هاتبوو" ئێمە ستایشی سەرۆك دەکەین بۆ پشتگیری لە توێژینەوەی خانەی بونیادی کۆرپەلەیی". هاورێم کێنت والدرێپ، یاریزانی ئیفلیجی تۆپی پێی زانکۆی مەسیحیی تەکساس کە من لە بۆردە پشتیوانەکەیدا بووم، بە ریپۆرتەرێکی وت " ئەمە هەموو ئەو شتە دەکات کە کۆڕی زانستی پێویستیەتی و پێم وایە کەمێك لەوە زیاتریش".

ئەو ئاستەی رەخنە کە رووبەڕووم بووەوە لە ڕاستڕەوەکانەوە بوو. چالاکوانێکی کۆنسێرڤاتیف بڕیارەکەی منی بە رەفتاری نازییەکان لەماوەی (هۆلۆکۆست)دا بەراورد کرد. یەکێکی تریان وتی" من شەرمەزارم بە سەرۆکەکەمان، کە سازش دەکات و ئەو ئەقلیەتە بە جیلەکەم دەدات کە دەشێ ژیانی مرۆڤ جیا بکرێتەوە، ئەتك و وێران بکرێت". قسەکەری (کۆنفرانسی ئەمریکیی ئوسقوفە کاسۆلیکەکان) وتی " پێدەچێ من تاکە پیاوێك بم لە ئەمریکا کە دژی ڕێوشوێنەکەی سەرۆکە".

تەنیاییەکەی ئەو زۆری نەکێشا. تۆنی مشتومڕەکە بەخێرایی گەرم داهات و توند بوو. بە ئاوڕدانەوە دواوە، دەردەکەوێت کە دوو فاکتەری ژەهراوی ئاوێتە ببوون: پارە و سیاسەت.

زۆرێك لەوانەی کە یەکەم جار دژی ڕێوشوێنەکە بوون، زاناکان بوون. بە دابینکردنی هەندێ دارایی فیدراڵی، من شەهیەیانم زیاد کرد. لە بەهاری ٢٠٠٢دا، من مخاتەبەی سکالایەکی گەورەم کرد لە ڕێگەی ڕێگەدان بە توێژینەوەی خانەی بونیادیی کۆرپەلەیی

کە لەو بنکانەدا ئیشیان لەسەر بکرێت کە پارەی فیدراڵی وەردەگرن. ئەمە هەنگاوێکی گرنگ بوو، بەڵام ئەمە چاوی زاناکانی پڕ نەکردەوە ، کە بە بەردەوامی داوای زیاتریان دەکرد.

گروپە پشتیوانەکانیش بەخێرایی دوای ئەوان هاتن. ئومێدە بەرزەکانیان بۆ چارەسەری نوێ وای لێکردبوون کە بەڵێنی ناواقیعی بدەن. پێدەچوو هەست بەوە بکەن کە سنووردارکردنی ژمارەی ئەو خانە بونیادییانەی بەردەستن بۆ توێژینەوە، بەرەوپێشچوون دوا بخات. ئەوان ئەستێرە نیەتباشەکانی هۆلیودیان سازدا بۆئەوەی خەمبارکردنی خەڵك. ئەوان بەهەمان شێوە بۆیان دەرکەوت کە دەشێ پرسەی پارمەتیان بدات بڕی زۆری پارە کۆ بکەنەوە. هەندێ لەوانەی کە لە سەرەتاوە پشتگیرییان لە بڕیارەکەی من کرد بوون بە رەخنەگری دەنگ بەرز.

سیاسییەکان بۆیان دەرکەوت کە ئەوانیش دەتوانن پرسەکە بقۆزنەوە. بە هاتنی ٢٠٠٤، دیموکراتەکان گەیشتنە ئەو ئەنجامەی کە توێژینەوەی خانەی بونیادی، ئامانجێکی سیاسیی بردنەوە بوو. ئەمە رێگەی بۆ خۆش کردن کە بەرەیەکی نوێ لە مشتومڕی لەباربردندا بکەنەوە لەکاتێکدا کە بەهەمان شێوە بانگەشەی رۆڵی بەزەییهاتنەوەیان دەکرد. کاندیدەکانی سەرانسەری ولاـ ریکلامی تەلەفزیۆنییان خستەگەڕ بۆ رۆشنایی خستنەسەر سوودەکانی توێژینەوەی خانەی بونیادی بەبێ دەربڕینی ئەمەی کە زانستەکە نەسەلمێنراوە، پرسی ئەخلاق لە ژێر پرسیاردایە و ئەلتەرناتیڤی ئەخلاقی هەیە.

پاڵێوراوی دیموکراتیی سەرۆکایەتی، سیناتۆر (جۆن کێری) هەڵمەتێکی سەرسەختانەی لەسەر پرسەکە خستبووە گەڕ. کێری زوو زوو رەخنەی لەو شتە دەگرت کە ئەو بە "قەدەغە"ی توێژینەوەی خانەی بونیادی ناوی دەبرد. من ئاماژەم بەوە دەکرد کە قەدەغەیەکی وەها لەئارادا نییە. بە پێچەوانەوە، من یەکەمین سەرۆکم لە مێژوودا کە تمویلی توێژینەوەی خانەی بونیادی بکات. سەرەڕای ئەمەش، هیچ سنوور نەبوون لەبەردەم تمویل لە کەرتی تایبەتەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا، هەڵمەتی کێری توێژینەوەی خانەی بونیادی وەکو بناغەیەک بەکارهێنا بۆ هێرشی بەرفراوانتر، هەڵوێستەکانی منی بە "دژە زانستی" لەقەڵەم دەدا. تۆمەتەکە ساختە بوو. من بە تمویلکردنی توێژینەوەی خانەی بونیادیی ئەلتەرناتیف، برەودان بە پەرەدان بە وزەی خاوێن، زیادکردنی خەرجیی فیدراڵ بۆ توێژینەوەی تەکنۆلۆژی و خستنەگەڕی دەستپێشخەریی جیهانیی ئایدز، پشتگیریی زانستم کردبوو. لەگەڵ ئەوەشدا، مێشکشتنەوە بەردەوام بوو تاوەکو هەڵبژاردن. خاڵی هەرە خراپ لە مانگی ئۆکتۆبەردا دەرکەوت، کاتێک هاوەڵی خۆکاندیدکردنی کێری، سیناتۆر جۆن ئێدواردز بە گردبوونەوەیەکی سیاسی لە ئایۆوا وت کە ئەگەر کێری ببێت بە سەرۆک ئەوا "خەڵکانی ئیفلیجی وەکو کریستۆفەر ریڤ لە کورسییە دوو تاییەکەیان راست دەبنەوە و جارێکی تر بە رێگەدا دەڕۆن".

***

مشتومڕی خانەی بونیادی، ئاساندنێک بوو بە دیاردەیەک کە لە ماوەی سەرۆکایەتییەکەمدا بەدیم کردبوو: رەخنەی کەسیی بێ رادە. نەیارە حزبییەکان و وتارنووسان، زیرەکی، رەوایەتی و دڵسۆزیی منیان خستبووە ژێر پرسیارەوە. گاڵتەیان بە رواڵەتم، شێوەزارم و بیروباوەڕە ئایینییەکانم دەکرد. بە نازی، تاوانباری جەنگ و خودی شەیتان ناودێر دەکرام. ئەمەیان لە زاری سەرکردەیەکی بیانییەوە بوو، سەرۆکی ئەنزوێلا هوگۆ چاڤێز. یاسادانەرێک بە دۆڕاو و درۆزن ناوی بردم. ئەو بوو بە سەرۆکی ئەنجومەنی پیرانی ئەمریکا.

لە هەندێ رووەوە، من تووشی سەرسوڕمان نەبووم. من بەرگەی برێکی زۆری سیاسەتی رەقم گرتبوو لە تەکساس. باوکم و بیل کلینتنم بینیبوو کە لەلایەن نەیارانیان و میدیا و گاڵتەیان پێدەکرا. ئەبراهام لینکۆڵن بە مەیمونی کلک کورتی بابون بەراورد کرابوو. تەنانەت جۆرج واشنتن ئەوەندە خەڵکی لێ بیووەوە کە کاریکاتێرە سیاسییەکان پیشانیان دەدا کە چۆن شۆڕشی ئەمریکی بەرەو گیلۆتین (مقصلە) دەبردرێت. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو هەڵبەز و دابەزەی شایستەیی من لەماوەی سەرۆکایەتیمدا، کە بە پەیدابوونی هەواڵە بیست و چوار سەعاتییەکان و پەرە ئەنتەرنێتییە سەروو حزبییەکان

خراپتر بیوو، تەواو نائومێدکەر بوو. فەزای ژەهراوی لە سیاسەتی ئەمریکادا خەڵکی باش دەڕەوێنێتەوە لە خۆ کاندیدکردن بۆ ئۆفیس.

پێ بە پێی تێپەڕبوونی کات، ئیهانە پوچەکان و ناو و ناتۆرە لە ژێری تەقلیدیدا قاڵبی گرت. هەندێك دەیانگوت دەبووایە من لە بەرانبەر کاریکاتێرەکاندا سەختگیرتر بومایە. بەڵام هەستم کرد کە خۆبچوکرکردنەوە بۆ ئاستی رەخنەگران، سەرۆکایەتی لاواز دەکات. من لەسەر بەڵێنێك بۆ گۆڕینی تۆنەکە لە واشنتن، خۆم پاڵاوتبوو. من ئەم سوێندەم بە جدی خوارد و هەوڵمدا رۆڵی خۆم ببینم، بەڵام بە دەگمەن سەردەکەوتم.

مشتومڕە توندەکان قەت کاریان نەکردەسەر بڕیارەکانم. زۆرم مێژوو خوێندەوە و سەرسام بووم بەوەی کە چەند سەرۆك بەرگەی رەخنەی توندیان گرتبوو. پێوانەی کارەکتەریان و زۆرجار سەرکەوتنیان، ئەوەبوو کە چۆن وەڵام دەدەنەوە. ئەوانەی کە بڕیارەکانیان پەیوەست کردبوو بە پرەنسیپ، نەك جۆرێك لە وێنەی رای گشتی، زۆرجار بەپێی رەتبوونی کات بێبەری دەبوون.

جۆرج واشنتن جارێکیان نووسیبووی "سەرکردایەتیکردن بە بیروباوەڕ ئاسودەییەکی لەناخەوە پێ بەخشیبووم کە هیچ هەوڵێکی زەمینی نەیدەتوانی لێم بسەنێتەوە". هەروەها نووسیبووی "تیرەکانی زەفەربردن، چەندە دڕکاوی و تیژ بن، هەرگیز ناتوانن بگەنە بەشە هەرە ناسکەکەم".

ئەم قسانەم لە کتێبی (بوێریی سەرۆکایەتی)ی مێژوونووس (مایکڵ بێشلۆس)دا لە ساڵی ۲۰۰۷دا خوێندبووەوە. هەروەکو بە لۆرام وتبوو، ئەگەر ئەوان هێشتا میراتی جۆرج واشنتن زیاتر لە دوو سەدە پاش سەرۆکایەتییەکەی بەرز دەنرخێنن. ئەم جۆرج دەبلیو بوشە پێویست ناکات لەبارەی سەردێڕەکانی ئەمڕۆوە نیگەران بێت.

***

دوور لە هاوارکردن لە تەلەفزیۆنەکانەوە و لە ڕەوگەی هەڵمەتەکە، بەرنامەی خانەی بونیادیم بە هێمنی لە تاقیگەکاندا بەرەوپێش دەچوو. بۆ یەکەم جار لە مێژوودا، زاناکان کۆمەکی فیدراڵییان وەرگرت بۆ پشتگیری لە توێژینەوەی خانەی بونیادی. زاناکان بەهەمان شێوە تمویلی فیدراڵیی نوێیان بەکارهێنا بۆ توێژینەوەی خانەی بونیادیی

ئەلتەرناتیڤ بۆ لێکۆڵینەوە لە ئیمکانیەتی مۆخی ئێسقانی مرۆڤی باڵغ، مشیمە، شلەی ئەمنیۆتیك و سەرچاوەی تری ناکۆرپەلەیی. توێژینەوەکەیان چارەسەری نوێی لێکەوتەوە بۆ ئەو نەخۆشانەی کە بە دەست ژمارەیەك نەخۆشییەوە دەیانناڵاند- سلبیاتی ئەخلاقی نەبوو. بۆ نموونە، دکتۆرەکان ڕێگایەکیان دۆزییەوە بۆ کۆکردنەوەی خانەی بونیادی بە شێوەیەکی بێ زیان لە خوێنی ناوکەپەتك بۆ چارەسەرکردنی ئەو نەخۆشانەی کە بەدەست لوکیمیا و کەمخوێنیی داس شێوە، دەیانناڵاند.

بەشی هەرە زۆری ئەو توێژینەوەیە لەلایەن دکتۆر ئێلیاس زێرهۆنی)یەوە چاودێری کرا، کە ئەمریکی-جەزائیرییەکی بەهرەمەند بوو و من بە سەرۆکی دامەزراوە نیشتمانییەکانی تەندروستی دامنابوو. من پۆستێکی سەختم بە ئێلیاس دابوو. ئەو هەستی دەکرد کە لەنێوان سەرۆکێك کە ڕازی ببوو کاری بۆ بکات و کۆڕێکی زانستی کە بەشێك بوو لێی، گیر بووە. ئەو هاوڕا نەبوو لەگەڵ بەرنامەی خانە بونیادییەکەم. لەگەڵ ئەوەشدا بایەخدەر بوو بە چارەسەری نوێ وەکو لە سیاسەت. ئەو بە شێوەیەکی شێلگیرانە تمویلی سەرچاوە ئەلتەرناتیڤەکانی خانەی بونیادی کرد و چاکەیەکی زۆری بەرەوپێشچوونەکان لە بوارەکەدا دەگەڕێتەوە بۆ دکتۆر زێرهۆنی و تیمە پرۆفێشناڵەکەی لە دامەزراوە نیشتمانییەکانی تەندروستی.

بەداخەوە، زۆربەی ئەندامانی کۆنگرێس هۆشێکی زۆرتریان دایە سیاسەت نەك دۆزینەوە زانستییەکان. بە نزیکبوونەوەی هەڵبژاردنی ٢٠٠٦، دیموکراتەکان ڕوونیان کردەوە کە ئەوان جارێکی تر پرسەکە وەکو چەکێکی سیاسی بەکاردێنن. کاندیدێکی ئەنجومەنی پیرانی ئەمریکا لە (میسوری) (مایکڵ جەی فۆکس)ی کە نەخۆشی پارکینسنی هەبوو ڕازی کرد تا هێرش بکاتە سەر نەیارەکەی لە ڕیکلامە تەلەفزیۆنییە سەرانسەرییەکاندا. هەندێ لەو کۆمارییانەی کە لە سەرەتادا پشتگیری ڕێوشوێنەکەیان کردبوو، لە کورسییەکانیان ترسان و ڕەئییان گۆڕی. لە تەمووزی ٢٠٠٦دا، ئەنجومەنی نوێنەران و پیران پرۆژەیاسایەکیان لەبەرچاو گرت کە ڕێوشوێنی خانەی بونیادیی منی سەرەونگون دەکرد بە ڕێگەدان بە تمویلی فیدراڵی بۆ ئەو توێژینەوەیەی کە ژیانی مرۆڤی وێران دەکرد.

پاش پێنج و ساڵ و نیوی سەرۆکایەتی، من دەبووایە هێشتا پارچەیەکی یاساکە ڤیتۆ بکەم. من لە نزیکەوە ئیشم لەگەڵ زۆرینەی کۆنگرێسەکەمان کردبوو بۆ تێپەڕاندنی ئەو پرۆژەیاسایانەی کە دەکرا قبوڵیان بکەم. بەڵام کاتێک کە پرۆژەیاسای خانەی بونیادی ڕێگای بەرەو کۆنگرێس گرتبووەبەر، من ڕوونم کردبووەوە کە ڤیتۆی دەکەم. کاتێک گەیشتە سەر مێزەکەم، ئەمەم کرد. دواتر چەندەها ناوونازۆرەم درایە پاڵ لەوانەش "کەللەڕەق". بەڵام من هەڵوێستی خۆمم نەدەگۆڕی. ئەگەر من پرەنسیپەکانی خۆم لەسەر پرسی وەکو توێژینەوەی خانەی بونیادی واز لێبهێنایە، چۆن دەکرا متمانەی خۆم لەسەر هەر شتێکی تر بپارێزم؟

زۆر بیرم لەوە کردەوە کە چۆن ئاماژەیەکی ڕاست لەبارەی ڤیتۆکەوە بنێرم. من ڕێگایەکی ڕۆشن و دیارم ویست بۆ پیشاندانی ئەمەی کە هەڵوێستم لە ڕێزمدا بۆ ژیان ڕەگی داکوتاوە، نەک دژایەتی زانست. کاتێک (کارل زینمێیستەر)ی ڕاوێژکاری بەرنامەی خۆجێیم پێشنیاری ئەوەی کرد گروپێکی منداڵانی پرۆشەی بەفر بانگهێشت بکەم بۆ کۆشکی سپی، پێم وابوو بیرۆکەیەکی نایابە. هەریەکەیان لە کۆرپەلەیەکی بەستووەوە هاتبوو کە لەبری ئەوەی وێران بکرێن بۆ توێژینەوە، لە منداڵدانی دایکێکی بەخێوکەردا چاندرابوو.

من وتاری ڤیتۆیەکەم لە ژووری (ئیست) پێشکەش کرد بە ئامادەبوونی بیست و چوار منداڵی دڵخۆش و دایک وباوکیان لەسەر تەختەی شانۆکە. یەکێک لە گاگۆڵکێکەرەکان تەمەنی ١٤ مانگ بوو بەناوی (ترێی جۆنز). ئەو ژیانی وەکو کۆرپەلەیەکی پیتێنراو لەلایەن (دەیڤ و هیزەر رایت) ی خەڵکی ماکۆم، میشیگان، دەست پێکرد. دوو هاوسەرەکە بە پرۆسەی (پیتاندنی ناو لولەک)دا تێپەڕیبوون کە یارمەتیدابوون تا سێ منداڵی جوان بهێننە دنیاوە. ئەوان مۆڵەتیان دابوو کە کۆرپەلە بەستراوە ماوەکان تەبەنی بکرێن لەبری ئەوەی کە وێران بکرێن بۆ توێژینەوە.

لە سیپرێس، تەکساس، (جەی جەی) و (ترەیسی جۆنز) نزایان دەکرد بۆ منداڵێک. لە ڕێگەی ئاژانسی (نایتلایت کریسچن ئەدۆپشن)ەوە، ئەوان لەگەڵ کۆرپەلەکانی خێزانی (رایت) کۆکرانەوە. ئەنجامەکەش کوڕێکی قژ زەردی دەم بەخەندە بوو بەناوی (ترێی) کە

من لە کۆشکی سپی خستمە باوەشم. لەسایەی موعجیزەی زانست و هاوسۆزیی دوو خێزانەکە، ترێی ماڵێکی بەسۆز و ژیانێکی پڕئومێدی لەبەردەمدا بوو.

چەند هەفتەیەک پاش ئەو بۆنەیە، نامەیەکی کاریگەرم لە جەی جەی جۆنز پێگەیشت. ئەو باسی "ئێشی ئەزۆکی" دەکرد و ئەمەی کە ئەو و ترەیسی چەند هەستیان بە نیعمەت کردووە بە بەدەستهێنانی "(ترێی)یە بەنرکەیان کە هەندێ بە پاشماوەی شتێک لەقەڵەمی دەدەن کە ئامادەکرابوو بۆ وێرانکردنی بۆ توێژینەوەی زانستی". هەروەها پێی وتم کە ترێی بە زوویی هاوەڵێکی تری پەیدا دەبێت، بەرهەمی کۆرپەلەیەکی بەستووی تر کە ئەو و ترەیسی تەبەنییان کردبوو.

وەڵامی کۆنگرێس بۆ ڤیتۆکەم زۆر گەرم و گوڕ نەبوو. سپۆنسەری دیموکراتیی پرۆژەیاساکە بە دەربڕینێك تەقییەوە گوایە ڤیتۆیەکەی من لەسەر "دەسکەوتی سیاسیی خۆپەرستانە" بونیادنراوە. قورس ببینیت کە چۆن، چونکە زۆربەی راپرسییەکان دەریانخست کە روانگەی پەیوەندیدار بە خانەی بونیادیی من جەماوەری نەبوو. وەکو سزایەك بۆ ڤیتۆکەك، دیموکراتەکان ئەوەیان رەت کردەوە کە یاسایەك تێپەڕێنن بۆ پشتگیری لە سەرچاوە ئەلتەرناتیڤەکانی خانە بونیادییەکان. پەیامەکە ئەوە بوو کە ئەگەر ئەوان نەتوانن تمویلی توێژینەوەی خانەی بونیادی بکەن کە کۆرپەلەکانی وێران دەکرد، ئەوا پێیان باش بوو کە هیچ کامیان تمویل نەکەن. ئەمەش وەکو ئارەزوویەکی بەسۆزیان بۆ چاوەڕێبوونی چارەسەر نوێ.

کاتێك دیموکراتەکانی کۆنترۆڵی ئەنجومەنی نوێنەران و پیرانیان بەدەستهێنا، بڕیاریاندا جەولەیەکی تر بکەن بۆ سەرەونگونکردنی رێوشوێنەکەم. وتەبێژ (نانسی پیلۆسی) رایگەیاند کە ئەمە یەکێکە ئەولەویەتە هەرە بەرزەکانی. ئەوان پرۆژەیاسایەکی تریان لە حوزەیرانی ۲۰۰۷دا بۆ ناردم، منیش جارێکی تر بە ڤیتۆکەم رەوانەم کردەوە. سوپاس بۆ بوێریی ژمارەیەك لە کۆمارییەکانی کۆنگرێس، ڤیتۆیەکە سەری گرت.

***

پێنج مانگ دواتر، ئەمریکییەکان لە بەرانبەر سەردێڕێکی چاوەڕوانەکراوی نیویۆرک تایمز بێدار بوونەوە: "زاناکان پێویستیان بە کۆرپەلە نامێنێت بۆ بەدەستهێنانی خانە

بونیادییەکان". بابەتەکە باسی ئەوەی دەکرد کە چۆن دوو تیمی توێژەران، یەکێکیان لە ویسکنسن و ئەویتریان لە ژاپۆن، خانەیەکی پێستی مرۆڤێکی پێگەیشتوویان پرۆگرام کردبوو بۆئەوەی وەکو خانەی بونیادیی کۆرپەلەیی رەفتار بکات. بە دانانی تەنیا چوار بۆهێڵ(جین) لەسەر خانەی پێگەیشتووەکە، زاناکان دەیانتووانی بەڵێنی پزیشکیی خانە بونیادییە کۆرپەلەییەکان بەبێ مشتومڕی ئەخلاقی ببەنەسەر.

دۆزینەوەکە لە کۆڕی زانستیدا دەنگی دایەوە. پشتیوانانی مکوڕی توێژینەوەی خانەی بونیادی بەرەوپێشچوونەکەیان بە "پێشکەوتنێکی نایاب" و "لە رووی ئەخلاقییەوە روون" لەقەڵەم دا. "یان ویلمەت"، ئەو زانا سکۆتلەندییەی کە (دۆلی)ی مەڕی کۆپی کرد، رایگەیاند کە ئەو چیتر سۆراخی کۆپی کردنی کۆرپەلە مرۆییەکان ناکات، بەڵام لەبری ئەوە ئەم تەکنیکە نوێیە بەکار دەهێنێت.

من گەشامەوە بە هەواڵەکە. ئەمە ئەو بەرەوپێشچوونە زانستییە بوو کە هیوام بۆ خواستبوو کاتێک لە ٢٠٠١دا راگەیاندنەکەم ئاراستە کرد. (چارلس کراوتامێر)ی ستوونئوسی هەرە زیرەک لە ئەمریکا و رەخنەگری بەرێزی بڕیاری خانەی بونیادیم لە ٢٠٠١دا، نووسیبووی "بڕیارەکە روونە: بە دەگمەن سەرۆکێک-ی ئەوەندە هێرش بۆکراو لەبەرانبەر هەڵوێستە ئەخلاقییەکەیدا- ئەوەندە بە تەواوی بێ گوناه بووە". لە ساڵانی دواتردا، وڵاتەکەمان رووبەڕووی تەنگژەی زیاتری مەسەلەی زیندە-ئەخلاقی دەبێتەوە لەلایەن کۆپیکردن بۆ ئەندازەی بۆماوەیی. مێژوو بەشێوەیەکی سەرەکی لەسەر شێوازی وەڵامدانەوەمان بۆ ئەم تەحەدییانەی بەرانبەر شکۆی مرۆڤ، حوکمان لەسەر ئەدات. من ئیمانم هەیە، هەروەکو هەمبوو کاتێک بڕیاری خانەی بونیادیم لە ساڵی ٢٠٠١دا راگەیاند، بەوەی کە زانست و ئەخلاق دەشێ پێکەوە هەڵبکەن. بە بەرنامەیەکی هۆشمەندانەوە، ئێمە دەتوانین لەناو ئەو چارەسەرە نوێیانەدا دەست پێبکەینەوە کە نانسی ریگن هیوای بۆ دەخواست، بەبێ جوڵان رووەو ئەو جیهانەی ئالدۆس هەکسلی پێشبینی کردبوو.

***

پاش پێشکەشکردن وتارەکەم بۆ گەل لەبارەی توێژینەوەی خانەی بونیادی لە ئابی ٢٠٠١دا، ژمارەیەك وتارنووس بە بڕیاری هەرە گرنگی سەرۆکایەتییەکەم لەقەڵەمیاندا. ئەمە ئەو کاتە ڕاست بوو؛ بەڵام نەك بۆماوەیەکی درێژ.

# رۆژی ئاگر

لە رۆژی سێشەممەی ١١ی سێپتێمبەری ٢٠٠١دا، لە شوقەکەم لە (کۆلۆنی بیچ) و (تێنیس ریزۆت) لە نزیک ساراسۆتای فلۆریدا پێش سپێدە لە خەو هەڵسام. بەیانییەکەم بە خوێندنەوەی کتێبی پیرۆز دەستپێکرد و پاشان چوومە خوارەوە بۆ وەرزشی راکردن. کاتێک دەستم کرد بە جولان بە دەوری گۆرەپانی گۆلفەکەدا، تەواو تاریک بوو. کارمەندانی دەزگای نهێنی راهاتبوون لەسەر رۆتینی راهێنانەکەم، لەوانەیە خەڵك شوێنەکە ئەم راکردنەی منیان بە کەمێك سەیر بینیبێت.

بە گەڕانەوەم بۆ هۆتێل، ئاوێکم کرد بە خۆما، نانێکی سوکم خوارد و چاوێکم خشاند بە رۆژنامەکانی سەر لەبەیانیدا. گەورەترین بابەت ئەوە بوو کە دەیگوت مایکڵ جۆردان لە خانەنشینی دێتە دەر و پەیوەندی دەکاتەوە بە رێکخراوی یاری سەڵەی نیشتمانی. سەردێڕەکانی تر تەرکیزیان خستبووەسەر هەڵبژاردنە بەراییەکانی پارێزگای نیویۆرك و کەیسێکی گوماناویی نەخۆشیی شێتی مانگا لە ژاپۆن. دەوروبەری سەعات هەشتی بەیانی، لێدوانی رۆژانەی سەرۆکایەتیم وەرگرت. پی دی بی (لێدوانی رۆژانەی سەرۆك)، کە زانیاریی هەواڵگریی تەواو نهێنی ئاوێتە کردبوو بە شیکردنەوەی قووڵی جیۆپۆلەتیکس، یەکێك بوو لە بەشە هەرە سەرنجراکێشەکانی رۆژەکەم. لێدوانی ١١ی سێپتێمبەر، کە راقەکارێکی زیرەکی سی ئای ئەی بەناوی (مایك مۆرێل) پێشکەشی کرد، روسیا، چین، و راپەڕینی فەلەستینی لە کەناری خۆرئاوا و کەرتی غەزە گرتبووەخۆ.

ماوەیەکی کورت پاش پی دی بی-یەکە رۆیشتین بۆ سەردانی قوتابخانەی بنەڕەتیی (ئێم ئی بروکەر) بۆ رۆشنایی خستەسەر ریفۆرمی پەروەردە.

لە ڕۆیشتنێکی کورتدا لە کاروانەکەوە بەرەو پۆل، کارل ڕۆڤ وتی فڕۆکەیەک خۆی کێشاوە بە سەنتەری بازرگانیی جیهانیدا. ئەمە زۆر نامۆ بوو. من وێنای فڕۆکەیەکی پەروانەی بچووکم کرد کە چۆن بە شێوەیەکی خراپ لەناو دەچێت. پاشان کۆندی تەلەفۆنی کرد. من لە تەلەفۆنێکی سەلامەتەوە لە پۆلێکدا تەلەفۆنم کرد کە کرابووە سەنتەرێکی اتصالات بۆ ستاف گەشتی کۆشکی سپی. ئەو پێی وتم کە ئەو فڕۆکەیەی تازە خۆی کێشا بە تاوەری سەنتەری بازرگانیی جیهانی تەنیا فڕۆکەیەکی بچوک نەبووە، بەڵکو فڕۆکەیەکی ئەفەرهەڵگری بازرگانی بووە.

من واقم وڕما. لەوانەیە ئەم فڕۆکەیە خراپترین فڕۆکەوانی جیهانی تێدا بووبێت. چۆن دەشێ لە ڕۆژێکی ڕووناکدا فڕیبێتە ناو بینایەیەکی بەئاسمانداچوودا؟ لەوانەیە تووشی جەڵتەی دڵ بووبێت. بە کۆندی-م وت کە لەسەرەوەی بارودۆخەکەدا بمێنێتەوە و داوام لە بەڕێوەبەری اتصالاتم (دان بارتلێت) کرد کە ئیش لەسەر بەیانێك بکات بۆ بەڵێنی پشتگیریی تەواوی خزمەتگوزارییەکانی بەڕێوەبردنی ئیمێرجێنسی فیدراڵ.

من سڵاوم لە بەڕێوەبەری قوتابخانە بوکەر کرد کە ژنێکی نەرم ونیان بوو بەناوی (گوێن ریگێل). ئەو منی بە مامۆستا (ساندرا کەی دانیێلز) و ژوورێکی پڕ لە پۆلی دوو ناساند. خاتوو دانیلز بۆ ڕاهێنانێکی خوێندنەوە سەرپەرشتیی پۆلەکەی کرد. پاش چەند خولەکێك، داوای لە قوتابییەکانی کرد کە کتێبەکانی وانەکانیان هەڵگرن. هەستم کرد کەسێك لە دوامەوەیە. ئاندی کارد سەری لێم نزیك کردەوە و بە گوێمدا چرپاندی "فڕۆکەی دووەم کێشای بە تاوەری دووەمدا". هەر وشەیەکی بە نیازەوە بە شێوەزاری ماساشوسێت دەربڕی. هەروەها وتی "ئەمریکا لەژێر هێرشدایە".

***

کاردانەوەی یەکەمم هەڵچون بوو. کەسێك جورئەتی ئەوەی کردبوو هێرش بکاتەسەر ئەمریکا. ئەوان دەبووایە باجەکەی بدەن. پاشان چاوم بڕییە ڕوخساری منداڵەکانی بەردەمم. بەراوردم کرد لەنێوان دڵڕەقیی هێرشکەران و بەرائەتی ئەو منداڵانە. بەزوویی ملیۆنانی وەکو ئەوان متمانە دەکەنە سەر من بۆئەوەی پارێزگارییان لێ بکەم. سوور بووم لەسەر ئەوەی کە نائومێدیان نەکەم.

چەند ریپۆرتەرێکم لە پشتەوەی ژوورەکە بینی کە لە رێگەی ئامێری تێکست و مۆبایلەکانیانەوە لە هەواڵەکان ئاگادار دەکرانەوە. غەریزە هاتە ناوەوە. دەمزانی کی کاردانەوەکەم تۆمار دەکرێت و لەسەرتاسەری جیهاندا رەنگدەداتەوە. وڵات لە شۆکی دەبێت، بەڵام سەرۆك ناکرێ وەها بێ. ئەگەر بە هەڵەداوان دەرپەڕمە دەرەوە ئەوا منداڵەکان دەترسێن و شەپۆلی تۆقین بە وڵاتدا بڵاو دەکەمەوە. وانەی خوێندنەوەکە بەردەوام بوو، بەڵام مێشکم زۆر لە پۆلەکە دوور کەوتبووەوە کێ دەشێ ئەمەی ئەنجام دابێت؟ دەبێ زیانەکە چەندە بێت؟ پێویستە حکومەت چی بکات؟

سکرتێری رۆژنامەوانی (ئاری فلیشەر) خۆی خستبووە نێوان ریپۆرتەرەکان و منەوە. پارچە کاغەزێکی بۆ من بەرز کردبووەوە کە لێی نوسرابوو "جارێ هیچ مەڵێ". منیش پلانی ئەوەم نەبوو. خۆم لەسەر پلانێکی کرداری گیرساندبووەوە: کاتێ وانەکە کۆتایی هات، بە هێمنی پۆلەکە جێ دەهێڵم، راستییەکان کۆ دەکەمەوە و قسە بۆ گەل دەکەم.

نزیکەی حەوت خولەك پاش ئەوەی ئاندی هاتە ناو پۆلەکەوە، گەڕامەوە بۆ ژووری چاوەڕوانییەکە کە لەوێ کەسێك تەلەفزیۆنەکەی هەڵکردبوو. من تەماشای دیمەنێکی بە هێواشی لێدراوەی تۆقێنەری دووەم فڕۆکەم کرد کە خۆی دەکێشا بە تاوەری باشووردا. دوکەڵی تەقینەوە و تۆپەڵی ئاگرینی گەورە زۆر لەوە خراپتر بوون کە وێنام کردبوو. وڵات لە هەژاندا بوو و دەبووایە راستەوخۆ بچمە سەر تەلەفزیۆن. بە خێرایی دەستنووسی بەیانەکەم ئامادەکرد. ویستم کە گەلی ئەمریکا دڵنیا بکەمەوە لەوەی کە حکومەت وەڵام دەداتەوە و ئەمەی کە ئێمە دەبێ ئەنجامدەران بدەینە دادگا. پاشان ویستم هەرچی زووە بگەڕێمەوە بۆ واشنتن.

دەستم پێکرد. "خوشکان برایان، ئەمە چرکەساتێکی قورسە بۆ ئەمریکا". "...دوو فڕۆکە کێشاویانە بە سەنتەری بازرگانیی جیهانیدا لە هێرشێکی تیرۆریستیی ئاشکرادا بۆ سەر وڵاتەکەمان". هەناسەیەکی خەمی بیستراو هەبوو لەلایەن ئەو ئەندامانەی کۆمەڵ و دایك و باوکە بینەرانەدا کە چاوەڕێی وتارێکیان دەکرد لەسەر پەروەردە. وتم "تیرۆریزم لەدژی وڵاتەکەماندا بەرگە ناگرێت". وتارەکەم بە داوای ساتێك وەستان بە بێدەنگی بۆ قوربانییەکان کۆتایی پێهێنا.

دواتر، بۆ دەرکەوت کە قسەکانم رەنگدەرەوەی بەڵێنی باوکم بوون بۆ ئەمەی کە "ئەم شەرانگێزییە بەرگە ناگرێت" پاش ئەوەی سەدام حسێن کوێتی داگیر کردبوو. دووبارەکردنەوەکە نیازێکی لەپشت نەبوو. من لە تێبینییەکانمدا نووسیبووم "تیرۆریزم لە دژی ئەمریکا سەرناکەوێت". لەوانەیە قسەکانی باوکم لە ئەستمدا رەگیان داکوتابێت و چاوەڕێی ئەوە بووبن لە ساتێکی تری قەیراندا دەربڕدرێن.

***

دەزگای نهێنی ویستی بمگەیەنێتە (هێزی ئاسمانیی یەك) و بەخێراییش. لەکاتێکدا کە کاروانەکە بە جاددەی خێرای (فلۆریدا روت ٤١)دا دەرچوو، لە ناو لیمۆزینەکەوە لە تەلەفۆنێکی سەلامەتەوە پەیوەندیم بە کۆندی-یەوە کرد. ئەو پێی وتم کە سێیەم فڕۆکە تێکشکاوە، ئەمەیان خۆی کێشاوە بە پێنتاگۆندا. لە جێگەکەمەوە پاڵمدایەوە و لە قسەکانی رامام. بیرۆکەکانم روون بوونەوە: دەشێ یەکەم فڕۆکە رێکەوت بووبێت. دووەمیان بە دڵنیاییەوە هێرشێك بووە. سێیەمیان راگەیاندنی جەنگ بووە. لەناوەوە ئەکولام. دەبووایە بزانین کە ئەمەی کردووە و تەمێی بکەین.

سوڕان رووەو سەردەمی جەنگ لە فڕۆکەخانەکە دیار بوو. کارمەندەکان بە تفەنگی هێرشبردنەوە دەوری (هێزی ئاسمانیی یەك)یان دا. دوو لە ئامادەبووانی گەشتە ئاسمانییەکە لە سەرەوەی قادرمەکان وەستان. لە پشت روخسارەکانیانەوە ترس و خەمباری هەبوو. دەمزانی ملیۆنان ئەمریکی هەمان هەستیان هەیە. باوەشم کرد بە ئامادەبووانی گەشتە ئاسمانییەکە و پێم وتن هیچ نابێ.

چوومە ناو کابینەی سەرۆکایەتییەوە و داوام کرد کە بە تەنیا بم. بیرم لەو ترسە کردەوە کە دەبێ بەرۆکی سەرنشینەکانی ناو ئەو فڕۆکانەی گرتبێ و ئەو خەفەتەش کە بەرۆکی خێزانەکانی مردووەکان دەگرێ. خەڵکێکی زۆر خۆشەویستانیان بەبێ زەنگێکی ئاگادارکردنەوە لەدەستدابوو. نزام کرد کە خوا سوکنایی بەوانە بدات کە ئازاردەچێژن و ولات لەم تاقیکردنەوەیە تێپەڕێنێت. بیرم لە دێڕەکانی سرودە دڵخوازەکەم کردەوە "خودای نیعمەت و خودای شکۆمەندی" : "ژیریمان پێدە، بوێریمان پێبدە، بۆ رووبەڕووبوونەوەی ئەم کاتە".

لەکاتێکدا کە لەوانەیە هەستەکانم هاوشێوەی زۆربەی ئەمریکییەکان بووبێت، ئەرکەکانم نا. دواتر کات دەبێت بۆ ماتەمگێڕان. دەرفەتێك دەبێ بۆ پیادەکردنی دادپەروەری. بەڵام پێش هەموو شتێك دەبووایە قەیرانەکە بەڕێوە ببەم. هەر لە سەروەختی (پێرل هاربەر)ەوە تووشی کارەساتبارترین هێرشی لەپڕ بووینەتەوە. بۆ یەکەمین جار لە جەنگی ١٨١٢وە، دوژمنێك هێرشی کردبووە سەر پایتەختەکەمان. لە تەنیا یەك بەیانیدا، مەبەستی سەرۆکایەتییەکەم روون ببووەوە: پاراستنی گەلەکەمان و داکۆکیکردن لە ئازادییەکەمان کە کەوتبووە ژێر هێرش.

یەکەم هەنگاوی هەر کاردانەوەیەکی قەیرانی سەرکەوتوو بریتییە لە بەرجەستەکردنی ئارامی. ئەمەش ئەو شتە بوو کە دەمویست لە فلۆریدا بیکەم. دواتر، پێویستمان بەوە بوو کە راستییەکان هەڵبڕین، هەنگاو بنێین بۆ پاراستنی وڵات و یارمەتیدەر بین بۆ بوژاندنەوەی ناوچە بەرکەوتووەکان. پێ بە پێی کات، دەبووایە ستراتیژییەك دابڕێژین بۆ دانەدادگای تیرۆریستان بۆئەوەی جارێکی تر شتی وا نەکەنەوە.

هەر کە فڕۆکەی (هێزی ئاسمانیی یەك) چل و پێنج پێ بەرز بووەوە بەرەو بەرزایی، تەلەفۆنم بۆ دیك چێنی کرد. ئەو بردرابوو بۆ (سەنتەری ئۆپەراسیۆنەکانی ئیمێرجێنسیی سەرۆکایەتی)ی ژێر زەمین کاتێك دەزگای نهێنی بڕوای وابوو کە لەوانەیە فڕۆکەیەك دەبەستم بۆ جێبەجێکردنیان لەسەر زەوی. پێم وت کە من لە ئاسمانەوە هەندێ بڕیار دەدەم و پشت بەو رووەو کۆشکی سپی بێت.

دوو بڕیاری گەورە بە زوویی دران. سوپا، پاترۆڵە ئاسمانییە شەڕکەرەکان- تیمی فڕۆکەوانیی شەڕکەر بۆ بەربەستکردنی فڕۆکە سەرکەشەکان- ی رەوانەی واشنتۆن و نیویۆرك کرد. من وەکو فڕۆکەوانێکی ئێف سەدودوو پێش سی ساڵ لە گاردی نیشتمانیی ئاسمانیی تەکساس، بۆ بەربەستکردنی جەو-جەو مەشقم پێکرابوو. لەو سەردەمەدا، گریمانەی ئەوەمان دەکرد کە فڕۆکەی بە ئامانجکراو، بۆمبهاوێژێکی سۆڤیەتی دەبێت. کەچی ئێستا فڕۆکەیەکی نەفەرهەڵگری بازرگانیی پڕ لە خەڵکی بێ گوناهە.

پێویستمان بەوە بوو کە ڕێساکانی ڕوویەڕووبوونەوە ڕوون بکەینەوە. بە دیک–م وت کە دەبێ فڕۆکەوانەکانمان پەیوەندی بە فڕۆکە گوماناوییەکانەوە بکەن و هەوڵ بدەن بە شێوەیەکی بێ گێرەوکێشە بیاننیشێننەوە. ئەگەر ئەمە شکستی هێنا، ئەوا فەرمانی منیان پێبوو کە لێیان بدەن. فڕۆکە ڕفێنراوەکان چەکی جەنگ بوون. سەرباری باجە ئازاربەخشەکان، لەناوبردنی یەکێکیان دەشیا چەندەها گیان لەسەر زەوی ڕزگار بکات. من تازە یەکەم بڕیارم وەکو فەرماندەی گشتیی سەردەمی جەنگ دابوو.

دیکە چەند خولەکێك دواتر تەلەفۆنی کردەوە. کۆندی، جۆش بۆلتن و ئەندامانی بالای تیمی ئاسایشی نیشتمانی لە سەنتەرە ژێرزەمینییەکە چووبوونە لای. ئەوان پێیان وترابوو کە فڕۆکەیەکی سەرکەش بەڕێوەیە بەرەو واشنتن. دیک داوای لێکردم کە ئەو فەرمانی خستنە خوارەوەی کە دابووم دووپات بکەمەوە. منیش ئەمەم کرد. دواتر زانیم کە جۆش بۆلتن داوای ڕوونکردنەوەی کردبوو بۆ دڵنیابوونەوە لەوەی کە فەرمانە سەرکردایەتییەکان ڕێزیان لێدەگیردرێت. من ئەو ڕۆژانەم بەبیردا هاتەوە کە فڕۆکەوان بووم. بە ئاندی کارد–م وت "ناتوانم وێنای ئەوە بکەم کە وەرگرتنی ئەم فەرمانە چۆن دەکەوێتەوە". ئومێدی ئەوەم خواست کە کەس پێویست نەبووایە ئەمە جێبەجێ بکات.

بڕیاری دووەم ئەوە بوو کە هێزی ئاسمانی یەك لەکوێ بنیشێتەوە. هەستێکی بەهێزم لادروست بوو کە دەبێ بگەڕێینەوە بۆ واشنتن. ویستم لە کۆشکی سپی بم بۆئەوەی سەرپەرشتی کاردانەوەکە بکەم. ئەمە گەل دڵنیا دەکاتەوە لەوەی کە سەرۆك لەو پایتەختەدا دەبینن کە هێرشی کراوەتە سەر.

ماوەیەکی کورت دوای ئەوەی کە لە سەرەسۆتا کەوتینەڕێ، ئاندی کارد و ئێدی مارینزێل، ئەو کارمەندە وەرزشییە بەهێزەی دەزگای نهێنیی خەلکی پیتسبێرگ کە ڕێنوێنیی زانیاریی منی کرد لەسەر ١١ی سێپتێمبەر، بیرۆکەکەی ڕەواندەوە. ئەوان وتیان هەلومەرج لە واشنتن زۆر ناجێگیرە، مەترسیی هێرش زۆرە. ئیدارەی فڕۆکەوانیی فیدراڵ بڕوای وابوو کە شەش فرشۆکە ڕفێنراون، بەو مانایەی کە دەشێ سیانی تریان لە ئاسمان بن. من پێم وتن کە "ڕێگەنادەم بە تیرۆریستان زندەقم ببەن" و بە پێداگرییەوە وتم "من سەرۆکم" و "ئێمە بەرەو واشنتن دەڕۆین".

ئەوان لەسەر هەڵوێستی خۆیان مانەوە. رقم لەو وێنەیەی تیرۆریستان بوو کە تیایدا منیان خستبووە ناو راکەراکەوە. بەڵام چەندەی ویستی گەڕانەوەم هەبوو، ئەوەندەش درکم بەوە کرد کە بەشێکی بەرپرسیارێتیم دڵنیاکردنەوەی بەردەوامیی حکومەتە. ئەوە دەبێتە سەرکەوتنی گەورەی پروپاگەندە بۆ دوژمن ئەگەر سەرۆك بکوژن. یاریدەدەری سەربازی و کارمەندانی دەزگای نهێنی پێشنیاری ئەوەیان کرد کە فڕۆکەکەمان بەرەو بنکەی هێزی ئاسمانیی بارکسدەیڵ لە لویزانا ئاراستە بکەین کە لەوێ دەتوانین بەنزین تێبکەینەوە. دواجار رازی بووم. چەند خولەکێك دواتر، هەستم کرد کە هێزی ئاسمانیی یەك بە خێرایی رووەو خۆرئاوا پێچ دەکاتەوە.

***

یەکێك لە نائومێدییە هەرە گەورەکانم لەسەر ١١ی سێپتێمبەر، اتصالاتی تەکنۆلۆژیی زۆر خراپی ناو فڕۆکەی هێزی ئاسمانی یەك بوو. فڕۆکەکە تەلەفزیۆنی سەتەلایتی نەبوو. ئێمە پشت ئەستوور بووین بە هەر زانیارییەکی لۆکاڵی کە بمانتوانیایە وەریبگرین. پاش چەند خولەکێك لە وێستگەیەکی دیاریکراو، شاشەکە جوڵەی نەدەما. من بایی پێویست ئەو سەرنجە تێپەڕانەی رومالکردنەکەم بەدی کرد بۆئەوەی لە تۆقێنەرێتیی ئەو دیمەنە تێبگەم کە گەلی ئەمریکا تەماشایان دەکرد.

خەڵکانی بێ دەرەتان لە نهۆمەکانی سەری سەرەوەی تاوەرەکانی سەنتەری بازرگانیی جیهانییەوە خۆیان هەڵئەدایە ناو مەرگی خۆیان. ئەوانیتر بە هیوای رزگارکردن، خۆیان بە پەنجەرەکانەوە هەڵدەواسی. هەستم بە ئێش و نائومێدییان کرد. من بەهێزترین کارم هەبوو لە جیهاندا، لەگەڵ ئەوەشدا هەستم بە بێ هێزی کرد بۆ یارمەتیدانیان.

لە ساتێك لە ساتەکاندا، سیگناڵی تەلەفزیۆن ئەوەندە جێگیر بوو کە بتوانم هەرەسی تاوەری باشووری سەنتەری بازرگانیی جیهانی ببینم. تاوەری باکوور کەمتر لە سی خولەك دواتر رووخا. ئومێدی ئەوەم هەڵچنیبوو کە رۆحە نائومێدە گیرخواردووەکانی نهۆمەکانی سەرەوە کاتی ئەوەیان هەبێ رابکەن. ئێستا ئیتر دەرفەت نەمابوو.

هەرەسهێنانی تاوەرەکان، کارەساتەکەیان گەورە کرد. لە ڕۆژێکی ئاسایی دەوامدا، پەنجا هەزار کەس لە بینایەکاندا کاریان دەکرد. هەندێکیان چۆڵیان کردبوو، بەڵام بیرم لەوە دەکردەوە کە ئەبێ چەندیان جێ مابن. هەزاران؟ دەیان هەزار؟ هیچم بە بیردا نەدەهات. بەڵام من دڵنیابووم کە زیاتر لە هەر سەرۆکێکی تری مێژووی ئەمریکا تازە ژمارەیەکی زۆرتری ئەمریکیم دەبینی کە دەمرن.

لە ڕێگەی تەلەفۆن کردن بۆ دیک و کۆندی لە سەنتەرە ژێرزەمینییەکە، لە دوایین بەرەوپێشچوونەکان ئاگادار دەبوومەوە. ئێمە هەوڵماندا هێڵێکی کراوە دابنێین، بەڵام بەردەوام دەپچڕا. لە ساڵانی دواتردا، جێگری سەرۆکی ستاف (جۆ هاگین) سەرپەرشتی چاککردنە گەورەکانی سیستەمەکانی اتصالاتی (سەنتەری ئۆپەراسیۆنەکانی ئیمێرجێنسیی سەرۆکایەتی)، (ژووری بارودۆخ) و (هێزی ئاسمانی یەك)ی کرد.

کاتێك زانیاریمان وەردەگرت، زۆرجار هاودژ و هەندێ جار تەواو ناڕاست بوو. من تەمومژی جەنگم ئەزموون دەکرد. ڕاپۆرت هەبوو لەسەر بۆمب لە وەزارەتی دەرەوە، ئاگرکەوتنەوە لە پارکی (ناشناڵ مۆڵ)، فڕۆکەیەکی نەفەرهەڵگری کۆریی ڕفێنراو بۆ یێکانی ئەمریکا و پەیوەندییەکی تەلەفۆنی هەڕەشە لە هێزی ئاسمانیی یەك. تەلەفۆنکەرەکە کۆدی فڕۆکەکەی بەکارهێناوە کە (ئەینجڵ) بوو کە خەڵکێکی کەم دەیانزانی. سەیرترین ڕاپۆرت کاتێك بوو کە پێم وترا شتێکی زۆر خێرا بە ئاراستەی کێڵگەکەمان لە کراوفۆرد دەفڕێت. هەموو ئەو زانیارییانە دواتر ناڕاست دەرچوون. بەڵام بە لەبەرچاوگرتنی بارودۆخەکە، هەموو ڕاپۆرتێکمان بە جددی وەرگرت.

ڕاپۆرتێك کە وەرم گرت، ڕاست دەرچوو. چوارەمین فڕۆکە لە شوێنێکی پەنسلڤانیا بەر بووەوە. پرسیارم لە چێنی کرد "ئایا ئێمە بەرمان دایەوە یان خۆی بەربووەوە؟" کەس نەیزانی. هەستم بە هێڵنجدان دەکرد. ئایا من فرمانی مەرگی ئەو ئەمریکییە بێ تاوانانەم دابوو؟

کاتێك تەمەکە ڕەوییەوە؟ لەبارەی قارەمانێتیی دەستەی فڕۆکەی (فلایت ٩٣)م بیست. پاش گوێبیستبوون لەبارەی هێرشە سەرەتاییەکان لەپەیوەندییە تەلەفۆنییەکاندا بۆ خۆشەویستان لەسەر زەوی، سەرنشینان بڕیاریان دابوو کە هەڵبکوتنە سەر شوێنی

فڕۆکەوانەکان. لە هەندێ لە دوایین قسەکانیاندا کە لە فڕۆکە تێکشکاوەکەوە تۆمار کراوە، دەتوانرێ دەنگی پیاوێک بەناوی (تۆد بیمەر) ببیسترێ کە سەرنشینەکان کۆ دەکاتەوە بۆ هەنگاو نان بە وتنی "با گلۆر بینەوە". کۆمسیۆنی ١١ی سێپتێمبەر دواتر گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە لەوانەیە ڕابوونی سەرنشینانی (فلایت ٩٣) بووبێتە هۆی پوچەڵکردنەوەی وێرانکردنی بینایەی کۆنگرێس یان کۆشکی سپی. ئەو هەنگاوە بوێرانەیان دەچێتە خانەی هەنگاوە هەرە مەزنەکانی مێژووی ئەمریکا.

***

بە درێژایی ئەو بەیانییە دەمویست پەیوەندی بە لۆراوە بکەم. ئەو مەوعیدی ئەوەی هەبوو کە لەبەردەم کۆمیتەی ئەنجومەنی پیراندا گەواهی بدات بۆ پشتگیری دەستپێشخەریی پەروەردەمان. نزیکی هەمان کات فڕۆکەکان کێشابوویان بە تاوەرەکانی سەنتەری بازرگانیی جیهانیدا. چەند جارێك زەنگم لێدا، بەڵام هێڵەکە هەر دەپچڕا. بڕوام نەبوو کە سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نەتوانێت پەیوەندی بە ژنەکەیەوە بکات لە بینایەی کۆنگرێس. بە تووڕەییەوە هاوارم کرد بەسەر ئاندی کارد دا "ئەرێ ئەوە چییە؟"

دواجار لەکاتێکدا کە هێزی ئاسمانیی یەك لە بارکسدەیڵ دەنیشتەوە پەیوەندیم بە لۆراوە کرد. دەنگی لۆرا هەمیشە ئارامبەخشە، بەڵام بەتایبەت ئەو رۆژە ئاسودەبەخش بوو کە بیبیستی. ئەو پێی وتم کە لەلایەن دەزگای نهێنییەوە براوە بۆ شوێنێکی ئارام. من زۆر بوژامەوە کاتێك وتی قسەم لەگەڵ باربارا و جێنا کردووە وهەردووکیان باشن. لۆرا پرسیاری ئەوەی کرد ئاخۆ کەی دێمەوە بۆ واشنتن. پێم وت کە هەمووان پێم دەڵێن نابێ بگەڕێمەوە، بەڵام بەزوویی لەوێ دەبم. نەمدەزانی ئاخۆ ئەمە راستە، بەڵام بە دڵنیاییەوە ئومێدەوار بووم وابێت.

نیشتنەوە لە بارکسدەیڵ وەکو چوونەناو حاڵەتی فیلمێکی سینەمایی بوو. ئێف شانزەکانی یەکە کۆنەکەم لە بنکەی هێزی ئاسمانیی ئێلینگتن لە هوستن هاوڕێیەتی ئێمەیان کردبوو بۆ هاتنە ناوەوە. ڕێگای نیشتنەوە ریزان ڕیز بوو لە بۆمب هاوێژ. ئەمە دیمەنی کاریگەری توانای هێزی ئاسمانی یەکی پیشان دەدا. دەمزانی کە تەنیا مەسەلەی

فڕۆکەوانەکان. لە هەندێ لە دواین قسەکانیاندا کە لە فڕۆکە تێکشکاوەکەوە تۆمار کراوە، دەتوانرێ دەنگی پیاوێک بەناوی (تۆد بیمەر) ببیسترێ کە سەرنشینەکان کۆ دەکاتەوە بۆ هەنگاو نان بە وتنی "با گلۆر بینەوە". کۆمسیۆنی ١١ی سێپتێمبەر دواتر گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە لەوانەیە ڕابوونی سەرنشینانی (فلایت ٩٣) بووبێتەهۆی پوچەڵکردنەوەی وێرانکردنی بینایەی کۆنگرێس یان کۆشکی سپی. ئەو هەنگاوە بوێرانەیان دەچێتە خانەی هەنگاوە هەرە مەزنەکانی مێژووی ئەمریکا.

***

بە درێژایی ئەو بەیانییە دەمویست پەیوەندی بە لۆراوە بکەم. ئەو مەوعیدی ئەوەی هەبوو کە لەبەردەم کۆمیتەی ئەنجومەنی پیراندا گەواهی بدات بۆ پشتگیریی دەستپێشخەریی پەروەردەمان. نزیکی هەمان کات فڕۆکەکان کێشابوویان بە تاوەرەکانی سەنتەری بازرگانیی جیهانیدا. چەند جارێک زەنگم لێدا، بەڵام هێڵەکە هەر دەپچڕا. بڕوام نەبوو کە سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نەتوانێت پەیوەندی بە ژنەکەیەوە بکات لە بینایەی کۆنگرێس. بە تووڕەییەوە هاوارم کرد بەسەر ئاندی کارد دا "ئەرێ ئەوە چییە؟"

دواجار لەکاتێکدا کە هێزی ئاسمانیی یەک لە بارکسدەیل دەنیشتەوە پەیوەندیم بە لۆراوە کرد. دەنگی لۆرا هەمیشە ئارامبەخشە، بەڵام بەتایبەت ئەو ڕۆژە ئاسودەبەخش بوو کە بیبیستی. ئەو پێی وتم کە لەلایەن دەزگای نهێنییەوە براوە بۆ شوێنێکی ئارام. من زۆر بوژامەوە کاتێک وتی قسەم لەگەڵ باربارا و جێنا کردووە وهەردووکیان باشن. لۆرا پرسیاری ئەوەی کرد ئاخۆ کەی دێمەوە بۆ واشنتن. پێم وت کە هەمووان پێم دەڵێن نابێ بگەڕێمەوە، بەڵام بەزوویی لەوێ دەبم. نەمدەزانی ئاخۆ ئەمە ڕاستە، بەڵام بە دڵنیاییەوە ئومێدەوار بووم وابێت.

نیشتنەوە لە بارکسدەیل وەکو چوونەناو حاڵەتی فیلمێکی سینەمایی بوو. ئێف شانزەکانی یەکە کۆنەکەم لە بنکەی هێزی ئاسمانیی ئێلینگتن لە هوستن هاوڕێیەتی ئێمەیان کردبوو بۆ هاتنە ناوەوە. ڕێگای نیشتنەوە ڕیزان ڕیز بوو لە بۆمب هاوێژ. ئەمە دیمەنی کاریگەری توانای هێزی ئاسمانی یەکی پیشان دەدا. دەمزانی کە تەنیا مەسەلەی

کات بوو پێش ئەوەی ئەو هێزە لەدژی هەر کەسێک کە فرمانی هێرشەکانی دابوو، بخەمەگەڕ.

هیچ کاروانێکی سەرۆکایەتی لە بارکسدەیل کۆ نەبببووەوە، بۆیە دەبووایە ئەفسەری فەرماندەر (ژەنەراڵ تۆم کێک) شتێک بکا بە شتێ. کارمەندەکان بە پەلە منیان لە قادرمەکانی فڕۆکەکە بردە خوارەوە بەرەو ئۆتۆمبێلێک کە بە خێراییەکی وەک هەشتا مایل لە سەعاتێکدا بە ڕارەوەکەدا دەڕۆیشت. کاتێک کابرای شۆفێر دەستی دەکرد بە پێچکردنەوەیەکی بەو خێراییە، هاوارم دەکرد "هێواش بەرەوە هێواش، لەم بنکەیەدا تیرۆریستی لێ نییە!" لەوانەیە ئەو ڕۆژە نزیکترین کاتم بووبێت لە مردن.

لە باکسدەیل، لە ئۆفیسی ژەنەراڵ تۆم کێک، لە تەلەفۆنێکی سەلامەتەوە پەیوەندیم بە دۆن رەمسفێلدەوە کرد. دۆن بە سەختی توانیبووی بێتە سەر هێڵ، چونکە ئەو ببووە یەکەم وەڵامدەرەوە لە پێنتاگۆنەوە. پاش خۆکێشانی فڕۆکەکە، ئەو رایکردبووە دەرەوە یارمەتی کارمەندانی ئیمێرجێنسی دابوو تا قوربانییەکان بخەنەسەر نەقالە. بە دۆنم وت کە هێرشەکان بە کردارێکی جەنگ لەقەڵەم دەدەم و بڕیارەکەیم پەسەند کرد بۆئەوەی سوپا بخاتە حالەتی ئامادەباشییەوە بۆ ئاستی هەلومەرجی ئامادەیی بەرگریی سێ (دیفکۆن ٣) بۆ یەکەمین جار لە سەروەختی جەنگی عەرەب-ئیسرائیلی ١٩٧٣وە. بنکە سەربازییەکانی ئەمریکا لە سەرتاسەری جیهاندا وریایی ئاسایشییان تۆکمە کرد و خۆیان ئامادە کرد بۆ وەڵامدانەوەی دەستبەجێ بۆ فرمانەکانی دواتر. بە دۆنم وت کە یەکەم ئەولەویەتمان بریتییە لە دەربازبوون لە قەیرانە هەنوکەییەکە. پاش ئەمە، پلانم دانا بۆ لەبەرچاوگرتنی کاردانەوەیەکی سەربازیی جددی. پێم وت "تۆپەکە لە ساحەی تۆ و سەرۆکی هێزە چەکدارەکان (دیک مایەرز)دا دەبێت بۆ وەڵامدانەوە".

تاوەکو یانزە و نیو بەکاتی لویزانا، سێ سەعات بەسەر کاتی قسەکردن بۆ گەل تێپەڕیبوو. نیگەرانی ئەوە بووم خەڵکی ئەو بۆچوونەی لادروست ببێت کە حکومەت بێباکە. من و لۆرا هەمان نیگەرانیمان لادروست بوو. پەیامێکی کورتم تۆمار کرد بۆ روونکردنەوەی ئەمەی کە حکومەت کاردانەوەی دەبێت و وڵات رووبەڕووی تاقیکردنەوەکە دەبێتەوە. سۆزەکە لە شوێنی خۆیدا بوو، بەڵام زەمینەکە - ژوورێکی

کۆنفرانسی بێ فەڕ لە بنکەیەکی سەربازی لە لویزانا— ئەوەندە ئیلهامبەخشی ئاسودەیی نەبوو. گەلی ئەمریکا پێویستیان بەوە بوو کە سەرۆکەکەیان لە واشنتن ببینن.

پێداگریم کرد لە بەرانبەر ئاندی لەبارەی ئەوەی کە چ کاتێك دەگەڕێینەوە بۆ کۆشکی سپی. کارمەندانی دەزگای نهێنی هەستیان کرد کە هێشتا دیار نییە. دیك و کۆندی-ش هەمان بۆچوونیان هەبوو. ئەوان پێشنیاری ئەوەیان کرد کە من بچم بۆ (فەرماندەیی ستراتیژی) لە بنکەی هێزی ئاسمانی ئۆفوت لە نێبراسکا. لەوێ بوارێکی نیشتەجێبوونی سەلامەت و اتصالاتی جێ متمانە هەبوو. جارێکی تر ملمدا بۆ دواخستنی گەڕانەوەکەم. هەر کە سواری فڕۆکەکە بووین لە بارکسدەیل، فڕۆکەی (هێزی ئاسمانی ) پڕکرا لە خۆراك و ئاوی زیادە. دەبووایە ئامادەی هەر ئەگەرێك بین.

---

پاش ئەوەی گەیشتینە ئۆفوت، من برام بۆ سەنتەری فەرماندەیی کە پڕ بوو لە ئەفسەرانی سوپا کە لە راهێنانە پلان بۆدانراوەکەدا بەشدارییان پێکرابوو. لەپڕ، دەنگێك هاتەسەر سیستەمە دەنگییەکە. "جەنابی سەرۆك، فڕۆکەیەکی سەرکەش لە مەدریدەوە دێت. ئایا فرمانمان پێیە بەریدەینەوە؟"

یەکەم کاردانەوەم ئەوە بوو لەوە تێبفکرم ئاخۆ کەی ئەمە کۆتایی دێت؟ پاشان هێلکاریی ئەو رێسایانەم کردەوە کە پێشتر پەسەندم کردبوون. هۆشم بەناو خراپترین سیناریۆکاندا دەڕۆیشت. لێکەوتە دیپلۆماسییەکانی بەردانەوەی فڕۆکەیەکی بیانی چییە؟ ئەی چی دەبێ ئەگەر ئێمە زۆر درەنگ کەوتین و تیرۆریستەکان هەنوکە ئامانجەکەیان پێکابێ؟

دەنگی سپیکەرەکان دووبارە هاتەوە "فڕۆکەکەی مەدرید لە لیشبۆنەی پورتوگال نیشتووەتەوە".

لە دڵی خۆمدا وتم سوپاس بۆ خوا. ئەمەیان نموونەیەکی تر بوو لە تەمی جەنگ. ئێمە بەرەو سەنتەری اتصالات رۆیشتین کە لەوێ بانگەوازی کۆبوونەوەیەکی ئاسایشی نیشتمانیم کرد بە ڤیدیۆ کۆنفرانس. من بە وردی بیرم لەوە کرد... بڵێم. بە راگەیاندنێک...

بەدواوە، ئەمە ئەولەویەتی ئیدارەکەمان دەبێت". من زانیاریی تازەم پێگەیشت لەسەر کاردانەوەی ئیمێرجێنسی. پاشان رووم کردە جۆرج تێنێت و پرسیارم کرد "کێ ئەمەی کرد؟"

جۆرج بە دوو وشە وەڵامی دایەوە: ئەل قاعیدە.

***

بەر لە ١١ی سێپتێمبەر، زۆربەی ئەمریکییەکان لەبارەی ئەلقاعیدەوە هیچیان نەبیستبوو. من یەکەم لێدوانم لەبارەی تۆڕە تیرۆریستییەکەوە ئەو کاتە بیست کە کاندیدی سەرۆکایەتی بووم. ئەلقاعیدە کە ماناکەی بریتییە لە "بنکە" تۆڕێکی تیرۆری ئیسلامیی ئصولی بووکە لەلایەن حکومەتی تاڵیبان لە ئەفغانستان میوانداری و پشتیوانی دەکرا. سەرکردەکەی ئوسامە بن لادن بوو، کە سعودییەکی رادیکاڵی سەر بە خێزانێکی دەوڵەمەند بوو کە ئەو کاتەی رووبەرووی بڕیاری حکومەت ببووەوە بۆ رێگەدان بە سەربازانی ئەمریکی کە لە ماوەی جەنگی کەنداودا لەوێ بن، لەو وڵاتە دەرکرابوو. گروپەکە دیدی توندڕەوانەیان هەبوو و بە ئەرکی خۆیان دەزانی کە هەر کەسێک بێتە رێگەیان بیکوژن.

ئەلقاعیدە، ئارەزوومەندیی هێرشی گەورە گەورەیان هەبوو. بەری سێ ساڵ، تیرۆریستەکان تەقینەوەی هاوشێوەیان لە دوو باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە خۆرهەڵاتی ئەفریقا ئەنجام دابوو کە ببووەهۆی کوژرانی زیاتر لە دووسەد کەس و برینداربوونی زیاتر لە پێنج هەزار. هەروەها ئەوان لە پشت هێرشێک بوون بۆ سەر کەشتی تەفروتوناکەری (USS Cole) کە بووەهۆی گیانلەدەستدانی حەڤدە دەریاوانی ئەمریکی لە کەناراوی یەمەن لە ئۆکتۆبەری ٢٠٠٠دا. بەهاتنی پاش نیوەڕۆی ١١ی سێپتێمبەر، کۆڕی هەواڵگری بکەرانی ناسراوەی ئەلقاعیدەی لەسەر لیستی سەرنشینەکانی فڕۆکە رفێنراوەکان دۆزیبووەوە.

سی.ئای.ئەی پێش ١١ی سێپتێمبەر نیگەرانی هەبوو لە بەرانبەر ئەلقاعیدەدا، بەڵام هەواڵگرییەکەیان ئاماژەی دەدا بە هێرشێکی دەرەوەی وڵات. لە ماوەی دواداوکانی بەهار و سەرەتاکانی هاوینی ٢٠٠١دا، ئێمە ئاسایشمان لە باڵیۆزخانەکانی دەرەوە تۆکمە

کردبوو، هاریکاریمان لەگەڵ دەزگاکانی هەواڵگریی بیانیدا زیادکردبوو و لە ڕێگەی بەداری فرۆکەوانیی فیدراڵەوە هۆشداریمان دابوو لەبارەی ئەگەری فرۆکە ڕفاندن لەسەر ئاستی نێودەوڵەتیدا. لە یەکەم نۆ مانگی سەرۆکایەتیمدا، یارمەتیدەر بووین لە پوچەڵکردنەوەی هەڕەشەی تیرۆریستی لەسەر پاریس، ڕۆما، تورکیا، ئیسرائیل، سعودیەی عەرەبی، یەمەن و شوێنەکانی تر.

لە ماوەی هاویندا، داوام لە سی.ئای.ئەی کردبوو کە تواناکانی ئەلقاعیدە بۆ هێرشکردن لەناوەوەی ئەمریکادا هەڵبسەنگێنێتەوە. لە سەرەتاکانی مانگی ئابدا، ئاژانسەکە لێدوانێکی ڕۆژانەی سەرۆکایەتی گەیاندبوو لەمەڕ بەردەوامیی نیازی پایەداری بن لادن بۆ لێدانی ئەمریکا، بەڵام نەیتوانیبوو لە هیچ پلانێکی کۆنکریتی دڵنیا بێتەوە. لە لێدوانەکەدا هاتبوو "ئێمە نەمانتوانیوە کە بەڵگەی جۆرێك لە هەڕەشەی کتوپڕ بەدەست بخەین، وەکو ئەوەی کە بن لادن ویستوویەتی فرۆکەیەکی ئەمریکا بڕفێنێت.

لە ١١ی سێپتێمبەردا، روون بوو کە کۆڕی هەواڵگری شتێك گەورەی پێ نەزانیووە. من لە پچڕانێك وریابوومەوە و چاوەڕێی روونکردنەوەم کرد. بەڵام پێم وانەبوو کە گونجاو بێ لە ناوەڕاستی قەیرانەکەدا پەنجە رابکێشم و تۆمەت ببەخشمەوە. نیگەرانیی دەستبەجێم ئەوە بوو کە لەوانەیە بکەری تری ئەلقاعیدە لە ئەمریکادا هەبن.

لە پەناگەی ئۆفوتدا سەیری شاشەی ڤیدیۆیەکەم کرد و بە جۆرج تێنێت-م وت کە گوێکانی هەڵخات، حاڵەتێکی گوێگرتن بۆ هەموو هەواڵگری و تا دەگاتە خواری خوارەوە.

هەروەها ئەوەم روونکردەوە کە لە کاتی گونجاودا پلانی ئەوەم داناوە کە لەم جەنگەدا سوپا بەکاربێنم. کاردانەوەکەمان تەنیا لێدانێکی بچوکی موشەکی کروز نابێ. هەروەکو دواتر ئاماژەم پێکرد، ئێمە شتێکی زیاتر لە "دانانی موشەکێکی ملیۆن دۆلاری لەسەر خێمەیەکی پێنج دۆلاری" ئەنجام دەدەین. کاتێك ئەمریکا وەڵامی ئەو هێرشانە دەداتەوە، بەپلان، بەزەبر و کاریگەر دەبێت.

***

مەسەلەیەکی تریش لەئارادابوو بۆ قسە لەسەر کردن لە ڤیدیۆ کۆنفرانسەکەدا: کاتی گەڕانەوەم بۆ واشنتن؟ برایان ستافۆردـی بەڕێوەبەری دەزگای نهێنی پێی وتم کە پایتەخت هێشتا سەلامەت نییە. ئەم جارەیان خۆم قسەم تیا کرد. بڕیارم دابوو کە لەگەڵ گەلدا بدوێم و ئەستەم بوو کە ئەمە لە پەناگەیەکی ژێر زەمینییەوە بکەم لە نێبراسکا.

لە گەڕانەوەمدا، ئاندی و لیدوان ئامادەکەری سی.ئای.ئەی (مایک مۆرێل) هاتنە ژووری کۆنفرانس بۆ بینینی من. مایک پێی وتم کە دەزگای هەواڵگری فەرەنسی ڕاپۆرتی لەبارەی بکەرانی ترەوە دابین کردووە —ئەوەی کە پێیان دەوترێت شانەی نوستوو— لە ئەمریکا کە پلانیان هەیە بۆ شەپۆلی دووەمی هێرشەکان. ئەمە دەستەواژەیەکی لەرزێنەر بوو، "شەپۆلی دووەم". بڕوام وابوو کە ئەمریکا دەتوانێ بەبێ ترسی زیاتر بەسەر هێرشەکانی ١١ی سێپتێمبەردا زاڵ بێت.

لەکاتێکدا کە لە گەڕانەوەمدا تەماشای ڕووالکردنەکەم دەکرد، فۆتۆیەکی (باربارا ئۆلسن)م بینی. باربارا وتارنوسێکی تەلەڤزیۆنیی بەهرەمەند بوو و هاوسەری نوێنەری حکومەتی فیدراڵ لە دادگای باڵا، (تێد ئۆلسن) بوو کە لە کەیسی ژماردنەوەی دەنگەکانی فلۆریدا لەبەردەم دادگای باڵادا لە بەرژەوەندی من قسەی کردبوو. ئەو لە فڕۆکەی (ئەمێریکان ئەیەرلاینز فلایت ٧٧)دا بوو کە کێشابووی بە پێنتاگۆندا. ئەو یەکەم کەسی ناسیاوم بوو لە تراژیدییەکەدا. بە تەلەفۆن پەیوەندیم بە تێد–ەوە کرد. ئەو هێمن بوو، بەڵام دەمتووانی هەست بەو شۆك و داڕوخانە بکەم لە دەنگیدا. پێم وت کە چەندە بەداخم. ئەو پێی وتم کە چۆن باربارا لە فڕۆکە ڕفێنراوەکەوە پەیوەندی پێوە کردووە و لەسەرخۆ زانیاری پێگەیاندووە. ئەو نیشتمانپەروەرێکی بێ هاوتا بوو. سوێندم بۆ تێد خوارد کە ئەوانەی بەرپرسن لە مەرگی ئەو دەیاندۆزینەوە.

گەڕانەوە بەهەمان شێوە دەرفەتی ئەوەی بۆ ڕەخساندم تا قسە لەگەڵ دایك و باوکم بکەم. دایك و باوکم شەوی ١٠ی سێپتێمبەریان لە کۆشکی سپی بەسەر بردبوو و پاشان بەرەبەیانی ١١ی مانگ زوو ڕۆیشتبوون. ئەوان لە ئاسمان بوون کە هەواڵی هێرشەکان بڵاو بووەوە. بەدالەکە باوکمی بۆ وەرگرتم. دەمزانی کە شڵەژاوە. ئەو نیگەرانی

سەلامەتی من نەبوو-ئەو متمانەی بە دەزگای نهێنی هەبوو کە پارێزگاریم لێ دەکات- بەڵکو ئەو نیگەرانی ئەو فشارە دەروونییە بوو کە من هەست پێدەکرد. هەوڵمدا هێوری بکەمەوە. وتم "زۆر باشم". باوکم دایکمی پێدام. پرسیارم کرد "لە کوێی؟" لە وەلامدا وتی "ئێمە لە لە مۆتێلێکین لە بروکفیلد، ویسکنسن". وتم "بۆ خاتری خوا چی ئەکەن لەوێ؟" ئەو بە خێرایی وەلامی دایەوە و وتی "کوڕم، تۆ فڕۆکەکەی ئێمەت نیشاندەوە!"

بە شارەزاییەکی کەم وێنەوە، وەزیری گواستنەوە (نۆرم مینێتا) و ئیدارەی فڕۆکەوانیی فیدراڵ لە نزیکەی دوو سەعاتدا، چاودێریی نیشتنەوەی سەلامەتی چوار هەزار فڕۆکەیان کردبوو. هیوادار بووم کە تیرۆر لە ئاسمانەوە کۆتایی هاتبێت.

دەستم کرد بە بیرکردنەوە لەبارەی ئەوەی کە چی بە گەل بڵێم کاتێک ئەو شەوە لە ئۆفیسی ئۆڤاڵەوە دەدوێم. یەکەم غەریزەم ئەوە بوو کە بە گەلی ئەمریکی بڵێم ئێمە وڵاتێکین لە جەنگداین. بەڵام کاتێ کوشتارەکەم لە تەلەڤزیۆنەوە بینی، درکم بەوە کرد کە وڵات هێشتا لە شۆکدایە. بڕیارمدا ڕۆژێك چاوەڕێ بکەم.

ویستم بڕیارێکی گەورە رابگەیەنم کە دابووم: ئەمریکا ڕەچاوی ئەوە دەکات کە هەر وڵاتێك تیرۆریستانی پەنا دابێت، بەرپرسە لە کردارەکانی ئەو تیرۆریستانە. ئەم ڕێبازە تازەیە، ڕێچکەی رابردووی هەڵگەڕاندەوە کە تیرۆریستانی بەشێوەی جیا لە سپۆنسەرەکانیان دەبینی. دەبووایە ئێمە زۆر لە وڵاتان بکەین تا هەڵبژێرن، شەڕ لە دژی تیرۆریستان دەکەن یان هاوبەشیی چارەنووسیان دەکەن. هەروەها دەبووایە ئەم جەنگە لە بەرگریدا جاڕ بدەین، بە هێرشکردنە سەر تیرۆریستانی دەرەوە بەر لەوەی بتوانن جارێکی تر هێرشمان بکەنەوەسەر.

هەروەها من ویستم وتارەکەم دۆخی توڕەیی ئەخلاقیم بەیان بکات. کوشتاری بەپلانی خەلکی بێ تاوان، کردارێکی خراپەی بێ خەوشە. سەرباری ئەمەش، دەمویست ئاسودەیی و مکوڕی دەربڕم- ئاسودەیی ئەمەی کە ئێمە لەم زەربەیە چاك دەبینەوە و مکوڕی لەوەی کە تیرۆریستان دەدەینە دادگا. ڕێك پاش شەش و نیوی ئێوارە، هێزی ئاسمانیی یەك لە بنکەی هێزی ئاسمانیی ئەندروز لە ماریلاند نیشتەوە. من بە خێرایی

ڕۆیشتم بۆ (مارین یەك) بۆ گەشتێکی هەلیکۆپتەری ١٠ خولەك بەرەو فریزی باشوور. کۆپتەرەکە بەرەو ڕاست و چەپ بەشێوەیەکی نازیك پێچ و پەنای کرد. من نەترسام. دەمزانی فرۆکەوانەکانی مارینی (HMX-1) دەمگەیەننە مەنزڵ.

ڕوانیمە واشنتنێکی داخراو، جێهێڵراو. لە دوورەوە، تێبینی دوکەڵم کرد کە لە پێنتاگۆن بەرز دەبێتەوە. ڕەمزی توانای سەربازیمان دەسوتا. من سەرم لەوە سوڕما کە دەبێ فڕکەوانەکەی ئەلقاعیدە چەند شارەزا و دڵڕەق بووبێت کە ڕاستەوخۆ بە ئاراستەی ئەو بینایە نزمە فڕیووە. جارێکی تر هۆشم گەڕایەوە سەر مێژوو. دەمڕوانیبە (پێرل هاربەر)ێکی ڕۆژگاری مۆدێرن. هەروەکو چۆن فرانکلین ڕوزڤێلت گەل سازدابوو بۆ داکۆکی لە ئازادی، ئەمەش بەرپرسیارێتی من دەبێ کە ڕێبەرایەتیی جیلێکی نوێ بکەم بۆ پارێزگاری لە ئەمریکا. ڕووم کردە ئاندی و وتم "تۆ دەڕوانیتە یەکەم جەنگی سەدەی بیست و یەك".

***

پاش نیشتنەوەم، یەکەم وێستگەم لە فریزی باشوور ئۆفیسی ئۆڤاڵ بوو. چاوم خشاند بە ڕەشنووسێکی وتارەکەمدا و چەند دێڕێکم دەستکاری کرد. پاشان ڕۆیشتم بۆ سەنتەرە ژێرزەمینییەکە ، کە بەشێکی بونیادی ژێرزەمینیی سەخت بوو لە سەرەتاکانی ماوەی جەنگی سارد دروستکرابوو بۆ بەرەنگاری لەبەرانبەر هێرشێکی گەورەدا. پەناگەکە پڕکراوە لە ئەندامانی سوپا بە شەو و بە ڕۆژ و بایی پێویست خۆراک، ئاو و وزەی کارەبای هەیە کە بۆ ماوەیەکی دووردرێژ بەشی سەرۆك و خێزانەکەی بکات. لە چەخی شوێنەکەدا ژوورێکی کۆنفرانس هەیە بە مێزێکی تەختەی گەورەوە- (ژووری بارودۆخ)ی ژێرزەمینی. لۆرا لەوێ چاوەڕێی منی دەکرد. کاتی زۆرمان نەبوو بۆ قسەکردن، بەڵام پێویستمان پێی نەبوو. باوەشەکەی لە هەر قسەیەك کاریگەرتر بوو.

گەڕامەوە بۆ سەرەوە، ڕاهێنانم لەسەر وتارەکەم کرد و پاشان ڕووم کردە ئۆفیسی ئۆڤاڵ.

دەستم پێکرد "ئەمڕۆکە، هاوڵاتییانمان، شێوازی ژیانمان، ئازادیمان، لە زنجیرەیەك کردەوەی تیرۆریستی بەپلان و کوشندەدا کەوتنە بەر هێرش". باسی دڵڕەقیی هێرشەکە

و قارەمانێتیی ئەوانەم کرد کە وەڵامیان داونەتەوە. بەردەوام بووم: "لایەنەکانی هەواڵگری و سەپاندنی یاسام بە تەواوی ڕاسپاردووە تا ئەوانە بدۆزنەوە کە تاوانەکەیان ئەنجام داوە و ڕاپێچی دادپەروەرییان بکەن. ئێمە جیاوازی ناکەین لەنێوان ئەو تیرۆریستانەی ئەم کردەوانەیان ئەنجام داوە و ئەوانەش کە پەنایان داون".

من بە نزایەك کۆتاییم بە قسەکانم هێنا : "هەرچەندە بە دۆڵی سێبەری مەرگدا ڕێ دەکەم، لە هیچ خراپەیەك ناترسم، چونکە تۆ لەگەڵمایت". هەستم کرد ئەم وتارە زۆر باشترە لەو بەیاننامانەی کە لە فلۆریدا و لویزانا پێشکەشم کردن. لەگەڵ ئەوەشدا، دەمزانی کە دەبێ لە ڕۆژانی دواتردا کارێکی زیاتر بکەم بۆ سازدانی گەل.

پاش وتارەکە، گەڕامەوە بۆ سەنتەرە ژێرزەمینییەکە بۆ کۆبوونەوە لەگەڵ تیمی ئاسایشی نیشتمانیمدا. دەمویست لە دوایین بەرەوپێشچوونەکان بەئاگام بووم و کاردانەوەی ڕۆژی دواتر دابنێم. پێم وتن کە ئێمە ئەرکێکمان پێ سپێردراوە کە هیچ کام لە ئێمە نە سۆراخی کردووە و نە پێشبینیشی کردووە. من وتم، "دادپەروەری سەردەکەوێت".

کۆبوونەوەکە نزیکی ١٠ی ئێوارە تەواو بوو. من لە پێش بەرەبەیانەوە بەخەبەر بووم و تەواو چالاك ڕۆژەکەم بەڕێ دەکرد. کارل تروسکۆت، سەرۆکی (لقی پارێزگاریی سەرۆك). پێی وتین کە ئێمە لە ژوورێکی بچوکی دەرەوەی ژووری کۆنفرانسی سەنتەری ژێرزەمینی دەخەوین. لە پاڵ دیوارەکەوە قەنەفەیەکی کۆن هەبوو کە دەکرا بە جێگە خەوتن. پێدەچوو (هاری ترومان) خۆی لەوێی دانابێت. دەمتووانی وێنای شەوێکی بێ حەسانەوە بکەم لە ململانێ لەگەڵ دۆشەکە بەرتەسك و قاچە ستیلەکانیدا. ڕۆژی دواتر بڕیاری گرنگی بەدواوە بوو و پێویستم بە خەو بوو بۆئەوەی بە ڕوونی بیر بکەمەوە. بە کارلم وت "مەحاڵە لێرە بخەوم".

دەیزانی کە ڕەئی خۆم ناگۆڕم. وتی "لە شوێنی دانیشتن بخەوە، گەر کێشەیەکیش هەبوو دەتگوازینەوە".

بە ئاسانی خەوم پیا نەکەوت. مێشکم وێنەکانی ئەو ڕۆژەی لێدەدایەوە: فڕۆکەکان ئەکێشن بە بینایەکاندا، تاوەرەکان دەکەون، پێنتاگۆن لە بڵێسەدایە. بیرم لەو خەفەتە

کردەوە کە لەوانەیە خێزانێکی زۆر گیرۆدەی بووبن. هەروەها بیرم لەو قارەمانێتییە کردەوە- سەرنشینانی ئەو فڕۆکە رفێنراوانە کە بە هێمنی تەلەفۆنیان بۆ سەرپەرشتیاران دەکرد بۆ ئاگادارکردنیان لە بارودۆخیان و یەکەم وەڵامدەرەوەکان کە بە خێرایی بەرەو ئاگری سەنتەری بازرگانی جیهانی و پێنتاگۆن دەجوڵان.

هەر لەو کاتەدا کە خەریک بوو خەو دەیبردمەوە، بینیم تارماییەکی رەش لە دەرگای ژووری خەوتنەکەوە دەردەکەوێت. ئەو بە سەختی هەناسەی ئەدا و هاواری کرد "جەنابی سەرۆک، جەنابی سەرۆک، کۆشکی سپی لەژێر هێرشدایە، با بڕۆین!"

بە لۆرام وت کە پێویستە خێرا بڕۆین. کاتی ئەوەی نەبوو کە عەدەسەکانی بکاتە چاوی، بۆیە دایە من. من رۆبەکەیم گرت و بە قۆڵێکەوە رێنوێنیم کرد لەکاتێکدا کە بە قۆڵەکەی تر سەگە بچوکە سکۆتلەندییەکەمان (بارنی)م پڕدابوو. بانگی (سپۆت)ی سەگی (ئینگلش سپرینگە سپانێل)م کرد بێت. من پێ پەتی بووم و شۆرتی وەرزشی و تی شێرتێکم لەبەردا بوو. لەوانەیە دیمەنێکمان دروست کردبێت. دەزگای نهێنی ئێمە بە پڕتاو لە شوێنی دانیشتن هێنایە دەرەوە بەرەو پەناگەی ژێر زەمینی بردینی. گوێم لە دەنگی دەرگایەکی قورس و داخستنێکی بە قوەت بوو کاتێک چووینە ناو تونێلەکەوە. کارمەندەکان بە دەرگایەکی تردا رەتیان کردین. تەق، سسس. ئێمە بە دوایین راڕەودا چووینە خوارەوە، بەلای ئەو ستافەدا تێپەڕین کە لە دەرەوە دانیشتبوون و گەیشتینە سەنتەرە ژێر زەمینییەکە.

پاش چەند خولەکێک، مفەوەزێک هاتە ژووری کۆنفرانس. بە شێوەیەکی حاشاهەڵنەگر وتی "جەنابی سەرۆک، ئەوە هی خۆمان بوو". بە دیاریکردنی ئیعازێکی هەڵە، شەرکەرێکی ئێف شانزە بەسەر ناوچەی (پۆتۆماک)دا نزم ببووەوە. ئەو رۆژەی کە بە راکردنێک بە گۆرەپانی گۆڵفدا دەستی پێکردبوو، بە پەلەپرووزێ بۆ ناو پەناگە کۆتایی هاتبوو بۆ راکردن لەدەست هێرشی ئەگەری بۆسەر کۆشکی سپی.

***

کاتێک لە ١٢ی سێپتێمبەردا لە خەو هەڵسام، ئەمریکا شوێنێکی جیاواز بوو. فڕکە بازرگانییەکان نیشێنرابوونەوە. ماشێنە سەربازییەکان لە شەقامەکانی واشنتندا کۆ

دوو بوونەوە. لایەکی پێنتاگۆن بەبوو بە پاشماوە. بۆرسەی نیویۆرک داخرابوو. تاوەرەکەی سەنتەری بازرگانی نەمابوون. ئەرکێزی سەرۆکایەتییەکەم، کە چاوەڕوانم دەکرد بریتی بێ لە بەرنامەی خۆجێیی، ئیتر بریتی بوو لە جەنگ. وەرچەرخانەکە پیشانیدا کە چۆن دەشێت قەدەر بە خێرایی بگۆڕێ و چۆن هەندێ جار ئەو قورسترین ئەرکانەی سەرۆکێک رووبەڕوویان دەبێتەوە چاوەڕوان نەکراون.

دەروونی گەل هێنرابووە لەرزە. خێزانەکان نۆرەیان گرتبوو بۆ دەمامکی گاز و ئاوی بوتڵ. هەندێ خەڵك لە شارەکانەوە رایانکرد بۆ دێهاتەکان لەترسی ئەوەی کە رەنگە بینایەکانی ناو شار کرابنە ئامانج. ئەوانەیتر کە لە بینایە بەرزەکاندا کاریان دەکرد جەسارەتیان نەدەکرد بگەڕێنەوە سەر کارەکانیان. زۆر کەس تا چەند هەفتە و چەند مانگێك نەیدەویست سواری فڕۆکە بێت. تەقریبەن روون بوو کە هێرشێکی تر دەکرێت.

کتێبێك نییە لەبارەی ئەمەی کە چۆن گەلێك پایەدار بکەیت کاتێك بەهۆی دوژمنێکی نادیارەوە راچڵەکێنراوە. من متمانەم کردەسەر غەریزەکان و باکگراوندم. گەشبینییەکەی تەکساسم یارمەتیدام تا باوەڕبەخۆبوون بەرجەستە بکەم. ناوبەناو، کەمێك زۆر راشکاو دەدوێم، هەروەکو ئەو کاتەی کە وتم بن لادنم دەوێت "چ بە زیندوویی یان بە مردوویی". خەڵکانی دەوروبەرم لەو رۆژە سەختانەدا زۆر یارمەتییاندام. تیمەکەی کۆشکی سپی خۆگر و سەرچاوەی ئیلهام بوون. لۆرا کۆڵەکەیەك بوو لە جێگیری و خۆشەویستی. مارڤینی برام و دۆرۆی خوشکم، کە هەردووکیان لە ناوچەی واشنتن دەژیان، زووزوو بۆ ژەمەکان لایاندەدا. دایك و باوکم بە بەردەوامی پشتیوانییان دەخستەڕوو. خێزانەکەم بڕوابەخۆبوونیان پێبەخشم و یارمەتییاندام تا مێشکم رۆشن بکەمەوە. هەروەها بەهێزیم لە ئیمانم و لە مێژوو وەرگرت. سوکناییم لە کتێبی پیرۆز وەرگرت، کە ئەبراهام لینکۆڵن پێی دەگوت "باشترین دیاری کە خودا بەخشیوویەتی بە مرۆڤ". من مکوڕی و روونیی ئەخلاقیی لینکۆڵنم بەدڵ بوو. ئەو دەیگوت پێکدادانی نێوان ئازادی و زۆرداری "پرسێکە لەسەر بدرێت". جەنگی دژە تیرۆریش هەروا دەبێ. بۆ رۆژانی دوای هێرشەکان راستەوخۆ سێ ئامانجم دانا. یەکەم، مەهێڵە تیرۆریستەکان جارێکی تر هێرش بکەن.

دووەم، روونی بکەرەوە بۆ وڵات و جیهان کە ئێمە کەوتووینەتە ناو جۆرێکی نوێی جەنگ. سێیەم، یارمەتیدەر بە تا ناوچە زیانلێکەوتووەکان چاک بکرێنەوە و دڵنیا بەرەوە لەوەی کە تیرۆریستان سەرکەوتوو نەبوون لە وەستاندنی ئابووریمان یان دابەشکردنی کۆمەڵگەمان.

لە ١٢ای سێپتێمبەر و لەکاتی خۆیدا دەوروبەری سەعات حەوت چوومە ئۆفیسی ئۆڤاڵ، یەکەم فرمانی رۆژەکە بریتی بوو لە وەڵامدانەوەی ژمارەیەکی زۆر تەلەفۆن لەلایەن ئەو سەرۆکانەی جیهان کە هاوخەمی خۆیان دەردەبڕی. یەکەم تەلەفۆنم لەگەڵ سەرۆک وەزیرانی بریتانیا، تۆنی بلێر بوو. تۆنی بەوە دەستیپێکرد کە ئەو "کەوتووەتە دۆخێکی شۆکەوە" و ئەمەی کە لە شەڕی تیرۆردا لە سەداسەد شانبەشانی ئەمریکا دەوەستێت. ناڕوونییەک لە قسەکانیدا نەبوو. وتوێژەکە یارمەتیدەر بوو بۆ پتەوکردنی نزیکترین هاوڕێیەتییەک کە لەگەڵ هەر سەرکردەیەکی بیانیدا گرێم دەدا. لەکاتێکدا کە ساڵان تێپەڕین و بڕیارەکانی سەردەمی جەنگ پێکەوە گەشەیان کرد، هەندێ لە هاوپەیمانانمان کەوتنە ڕاڕایی، بەڵام تۆنی بلێر هەرگیز نا.

هەر سەرۆکێك کە تەلەفۆنی دەکرد، پشتگیری خۆی دەردەبڕشی. (جین چریتیان)ی سەرۆکی کەنەدا بە سادەییەوە وتی، "ئێمە لەوێین" بەڵێنێك کە لەلایەن هاوڵاتیانی کەنەدییەوە پشتڕاستکرایەوە کە پێشوازییان لە هەزاران ئەمریکی کرد کە بەهۆی راگیرانی فڕۆکەکانیانەوە سەرگەردان ببوون. (سیلڤیۆ بێرلسکۆنی)ی ئیتالیا پێی وتم "وەکو منداڵێکی بچوك گریاوم و خۆمم بۆ نەگیراوە" و پەیمانی هاوکاری دا. (جیانگ زێمین)ی سەرۆکی چین، (گێرهارد شرۆدەر)ی ئەڵمانیا و جاك شیراکی فەرەنسا بەڵێنی یارمەتییاندا بە هەر شێوازێك کە بتوانن. (جونیشیرۆ کۆیزومی)ی سەرۆك وەزیرانی ژاپۆن، ئەو وڵاتەی کە لە هێرشی پێرل هاربەردا هەڵیکوتایە سەر ئەمریکا، رووداوەکەی سێپتێمبەری بە "نەك تەنیا هێرشێك بۆ سەر ئەمریکا بەڵکو بە هێرشێك لەدژی ئازادی و دیموکراسی" لەقەڵەم دا. بۆ یەکەمین جار لە مێژووی پەنجاودوو ساڵەی (ناتۆ) ئەندامانی هاوپەیمانێتییەکە دەنگیان دا بە بەکارهێنانی برگەی (٥)ی پەیماننامەکە: هێرشی لەدژی یەکێك، هێرشە لەدژی هەمووان.

هاوپەیمانێتیی ئامادەیی لە جەنگ دژی تیرۆر لەدروستبووندابوو و لەم کاتەدا- هەمووان داوای هاتنەپاڵیان دەکرد.

***

پاش پەیوەندییە تەلەفۆنییەکانم، لێدوانێکی سی.ئای.ئەی-م هەبوو و کۆبوونەوەیەکی ئەنجومەنی ئاسایشم لە ژووری کابینە بەست. جۆرج تینێت جەختی لەوە کردەوە کە بن لادن بەرپرسە لە هێرشەکان. وەرگرتنە رادیۆییەکانی دەزگای هەواڵگری دەریخستبوو کە ئەندامانی قاعیدە لە خۆرهەڵاتی ئەفغانستان پیرۆزباییان لە یەکتری دەکرد. من روونم کردەوە کە ئەم جەنگە جۆرێکی جیاواز دەبێت. ئێمە رووبەرووی دوژمنێك دەبینەوە کە پایتەختێکی نییە کە پێی بڵێت نیشتمان و سوپای نییە تا لە شەرگەدا سۆراخ بکرێت. تێکشکاندنیان پێویستی بە سەرچاوەی تەواوی توانای نیشتمانیمان هەیە هەر لە کۆکردنەوەی زانیارییەوە تا بلۆککردنی حسابی بانکیی تیرۆریستان و تا خستنەکاری هێزی سەربازی.

کۆبوونەوەکە دەرفەتی پێدام تا بۆ راگەیاندنەکان بدوێم. من ئامادە بووم راگەیاندنەکە بخەمەروو کە شەوی پێشوو دوامخستبوو. وتم "ئەو هێرشە ئەنقەست و کوشندانەی کە دوێنێ ئاراستە کران لەدژی وڵاتەکەمان، لە کردەوەی تیرۆریستی زیاترن". "ئەمانە کرداری جەنگن".

نیوسەعات دواتر، چاوم کەوت بە سەرکردایەتی کۆنگرێسی هەردوو حزبەکە. من دوو خەمم خستەڕوو. یەکەمیان بریتی بوو لە رازیبوون لە دۆخەکە. ئەو کاتە قورس بوو وێنای ئەمە بکەیت، کاتێك ئازاری ١١ی سێپتێمبەر تازە بوو، بەڵام دەمزانی کە خەڵکی دواجار تێیدەپەڕێنن. وەکو سەرکردەی هەڵبژێردراو، ئێمە بەرپرسیارێتییەکمان لەسەر شان بوو بۆ تەرکیز خستنەسەر هەڕەشەکە و شەڕکردن تا زاڵبوون.

خەمی دووەمم لەبارەی پەرچەکردار بوو لە بەرانبەر ئەمریکییە موسڵمان و عەرەبەکان. من راپۆرتانەم بیستبووەوە کە هەراسانکردنی زارەکی هەیە لەدژی ئەوانەی پێدەچوو خەڵکی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بن. من بەئاگابووم لە لایەنە دزێوەکانی مێژووی ئەمریکا لە ماوەی جەنگدا. لە یەکەم جەنگی جیهانیدا، ئەمریکییە ئەڵمانییەکان پەراوێز

دەخران و لە هەندێ حاڵەتی توند دا دەخرانە زیندانەوە. لە دووەم جەنگی جیهانیدا، سەرۆك رۆزڤێلت پشتگیریی ئەوەی کرد کە ژمارەیەکی زۆری ئەمریکییە ژاپۆنییەکان بخرێنە ناو کەمپەکانی دەستبەسەرکردنەوە. یەکێك لەوانە (نۆرم مینێتا) بوو کە ئەو کاتە تەمەنی دە ساڵان بوو. بینینی ئەو لە ژووری کابینە لەو ڕۆژەدا بیرهێنەرەوەیەکی بەهێزی بەرپرسیارێتیی حکومەتی بوو بۆ پارێزگاری لەدژی هیستریا و ڕووبەڕووبوونەوەی جیاکاری. من پلانم دانا بۆ گەیاندنی ئەو پەیامە لە ڕێگەی سەردانکردنی مزگەوتێکەوە.

ئەندامانی کۆنگرێس یەکگرتوو بوون لە مکوڕییان بۆ پاراستنی وڵات. سیناتۆر تۆم داشل، ڕێبەری زۆرینەی دیموکرات، تێبینییەکی ئاگادارکەرەوەی گەیاند. وتی دەبێ لەبارەی وشەی جەنگەوە وریا بم، چونکە دەلالەتی بەهێزی هەیە. من گوێم لە نیگەرانییەکانی گرت، بەڵام ناکۆك بووم لەگەڵیدا. ئەگەر چوار هێرشی ڕێکخراو لەلایەن تۆڕێکی تیرۆریستییەوە کە پەیمانی ئەوەی پێبووە ژمارەیەکی هەرچی زۆری ئەمریکی بکوژێت، کرداری جەنگ نەبێ، کەواتە چییە؟ پێشێلکردنی پرۆتۆکۆڵێکی دیپلۆماسی؟

یەکێك لەو دوایین کەسانەی کە قسەی کرد، (ڕۆبەرت بیرد)ی سیناتۆری هەشتاوسێ ساڵەی دیموکراتی وێست ڤێرجینیا بوو. ئەو لەسەردەمی قەیرانی موشەکی کوبا، جەنگی ڤێتنام، کۆتایی جەنگی سارد و ژمارەیەکی زۆری تری تەحەدییدا، کاری کردبوو. قسە ڕێك و ڕەوانەکانی ئیلهامیان بە ژوورەکە بەخشی. ئەو وتی "سەرباری هۆڵیود و تەلەڤزیۆن، لەشکرێك لە خەڵکی هەن کە باوەڕیان بە ئاسمان و خالق هەیە... هێزە بەتواناکان دێن بۆ یارمەتیدانت".

***

درەنگانی پاش نیوەڕۆی ١٢ی سێپتێمبەر، گەشتێکی کورتم لەمبەر بۆ ئەوبەری (پۆتۆماك) بۆ پێنتاگۆن ئەنجامدا. بینایەکە دەسوتا و هێشتا لەناوەوەدا لاشە هەبوو. من و دۆن ڕەمسفێڵد بە شوێنی پاشماوەکەدا ڕۆیشتین و سوپاسی کرێکارەکانمان کرد بۆ دڵسۆزییان. لە ساتێك لە ساتەکاندا، تیمێکی کرێکاران لە سەری سەرەوەی بینایەیەك، ئاڵایەکی گەورەی ئەمریکایان هەڵدا. ئەمە نیشانەیەکی بەرەنگاری و مکوڕی بوو، ڕێك ئەوەی کە گەل دەیویست بیبینێت. یەکێك لە دوایین ئەو گروپانەی کە من بینیمن، تیمی

مەیخانە بوون. جۆ هاگن هێنانیە پێشەوە. ئەوان بە تۆز داپۆشرابوون پاش ئەوەی کە خەمناکترین ئەرکیان جێبەجێ کردبوو. پێم وتن کە چەندە ستایشکەری ئەو شکۆیەم کە بەخشیووبانە بە کارەکەیان.

ئەزموونەکە لە پێنتاگۆن هێنامیە سەر ئەو قەناعەتەی کە هەرچی زووە بچم بۆ نیویۆرک. جۆ پێی وتم بیرۆکەیە هەندێ گرفتی تێدایە. دەزگای نهێنی دڵنیا نەبوو کە ناوچەکە سەلامەتە. تیمەکانی پێشڕەوی کاتی ئەوەیان نەبوو خۆیان بۆ سەردانێکی سەرۆکایەتی ئامادە بکەن. کەس نەیدەزانی کە ژینگەی پاشەواری دوو تاوەرەکە چۆنە. ئەمە نیگەرانیی بەجێ بوون، بەڵام من بڕیاری خۆمم دابوو. دەمویست نیویۆرکییەکان بزانن کە بەتەنیا نین. منیش ئەوەندەی ئەوان هێرشەکەم بە شتێکی کەسی وەرگرتبوو. شتێکی تر نەبوو کە رووبەڕوو پێیان بوترێت.

بڕیارمدا کە بەرەبەیانی پێنجشەمە بکەمە هەواڵی بەپەلە. ئاری فلیشەر پێشنیاری ئەوەی کردبوو کە راگەیاندنەکان بانگ بکەینە ئۆفیسی ئۆڤاڵ بۆ بەدیکردنی پەیوەندییە تەلەفۆنییەکەم لەگەڵ حاکمی نیویۆرک (جۆرج پاتاکی) و پارێزگاری شارەکە (رودی جولیانی). وتم "ناتوانم پێتان بڵێم کە چەندە شانازی دەکەم بەو هاوڵاتییە باشانەی ئەو بەشەی ئێوە لە جیهاندا و ئەو کارە سەرووئاساییەی کە ئێوە هەمووان ئەنجامی دەدەن". پاشان موفاجەئەکەم دەرخست "ئێوە بانگهێشتێکی پرسۆزتان گەیاندووە بە من بۆئەوەی بێم بۆ نیویۆرک. قبوڵمە. من بەیانی پاش نیوەڕۆکەی لەوێ دەبم".

پاش پەیوەندییە تەلەفۆنییەکە رازی بووم کە چەند پرسیارێک لە راگەیاندنەکانەوە وەڵام بدەمەوە. ئەوان لەبارەی سەلامەتیی سیستەمی فڕۆکەوانی، شوێنی بن لادن و ئەمەی کە من داوای چی لە کۆنگرێس دەکەم، پرسیاریان کرد. دوایین پرسیار لەلایەن ریپۆرتەرێکی رۆژنامەی (کریستیان ساینس مۆنیتەر)ەوە بوو. ئەو وتی "ئەتوانی شتێکمان پێ بڵێی لەبارەی ئەمەی کە بیر لە چ جۆرە نزایەک دەکەیتەوە و دڵت لە کوێیە...؟"

من ویستبووم بۆ ماوەی دوو رۆژ لەناو خەڵکیدا هەستم کپ بکەم، بەڵام ئەم پرسیارە دەریخستەوە. من بیرم لە دەنگی خەفەتباری (تێد ئۆڵسن) دەکردەوە. وێنای تیمی

هێلاکی مەیتخانەم کردبوو. بیرم لەو منداڵە بێ گوناهانە دەکردەوە کە مردبوون و ئەوانەش کە دایک یان باوکیان لەدەستدابوو. ئەو خەفەتەی ئەوان هەیانبوو قووڵتر بووەوە. چاوەکانم پڕ بوون لە فرمێسک و قورگم گیرا. هەڵوەستەیەکەم کرد لەکاتێکدا کە کامێراکان بە خێرایی وێنەیان دەگرت. هێمنیم بەدەستهێنایەوە، دەستەکانم لەسەر مێزەکەم دانان و بەرەو پێشەوە چەمامەوە. "لەم چرکساتەدا من بیر لە خێزانەکان و منداڵەکان دەکەمەوە. من کەسێکی بەسۆزم، هەروەها هەرچۆنێک بێت کەسێکم کە کارێکی لەبەردەستدایە و نیازم هەیە بیکەم".

***

کاتێک دواتری ئەو ڕۆژە، من و لۆرا چووین بۆ (سەنتەری نەخۆشخانەی واشنتن) بۆ سەردانی قوربانییەکانی پێنتاگۆن. هەندێکیان لە بەشێکی زۆری جەستەیاندا سوتابوون. پرسیارم لە یەکێکیان کرد ئاخۆ سەربازی سوپای هەڵمەتبەرە. بەبێ هیچ وەستانێک وەڵامی دایەوە "نەخێر گەورەم، من هێزی تایبەتم. توانای زانیاریم لەوە زیاترە کە هەڵمەتبەرێک بم". هەمووانی ناو ژوورەکە- ژنەکەی، دکتۆرەکان، لۆرا و من- دامانە قاقای پێکەنین. خۆش بوو پێبکەنین. هەستم کرد نەخۆشخانەکە تەیار بووە بە بوێریی بریندارەکان و سۆزی دکتۆرەکان و پەرستارەکان.

ئاندی کارد لە ڕاڕەوی فریزی باشوور چاوەڕوان بوو کاتێک لە نەخۆشخانە گەڕاینەوە. بەر لەوەی بتوانم لە لیمۆزینەکە دابەزم، ئەو دەرگای کردەوە و بازیدا. وتی هەڕەشەیەکی تەقینەوە لەسەر کۆشکی سپی هەبووە. دەزگای نهێنی جێگری سەرۆکی گواستبووەوە و دەیانویست منیش بگوازنەوە. بە کارمەندانم وت کە دووەم جار پشکنینێکی هەواڵگری بکەنەوە و چەندەی بکرێ لە کارمەندانی ستافی کۆشکی سپی بنێرنەماڵەوە. بەڵام من لە شوێنەکە دەمامەوە. نیازم نەبوو جارێکی خۆشی ئەوە بدەمە دوژمن کە چۆن لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر جرت و فرتمە. دەزگای نهێنی، پشتێنی ئەمنیی کۆشکی سپی فراوان کرد. ڕۆژەکەمان تێپەڕاند، کاتێک چووینە ناو جێگە لە دڵی خۆمدا وتم، سوپاس بۆ خوا. ڕۆژێکی تری بێ هێرش.

***

له ١١ی سێپتێمبەردا، نزیکەی سێ هەزار پیاو، ژن، و منداڵی بێ تاوان کوژران. پێم وابوو گرنگە بۆ وڵات کە پێکەوە ماتەم بگێرین. بۆیە من رۆژی هەینیم وەکو (رۆژی نیشتمانیی نزا و یادکردنەوە) دیاریکرد. دەمزانی کە ١٤ی سێپتێمبەر رۆژێکی تاقەتبەر و خەماوی دەبێت. چاوەڕێی ئەوەم نەدەکرد کە رۆژێکی هەرە ئیلهامبەخشی ژیانم بێت.

کەمێك پاش حەوتی بەیانی، ئاندی کارد لە ئۆفیسی ئۆڤاڵ هات بمبینێت بۆ لێدوانی ئاسایشی نیشتمانیم. سی.ئای.ئەی بڕوای وابوو کە بکەری زیاتری قاعیدە لە ئەمریکادا هەن و ویستوویانە بە چەکی بایۆلۆژی، کیمیایی یان ناوکی هێرش بکەن. قورس بوو وێنای شتێکی وێرانکەرتر لە ١١ی سێپتێمبەر بکەیت، بەڵام هێرشێکی تیرۆریستی بە چەکی کۆکوژەوە لێیدەوەشایەوە.

داوام لە (بۆب موێلەر)ی بەڕێوەبەری ئێف بی ئای و داواکاری گشتی (جۆن ئاشکرۆفت) کرد لە بەرەوپێشچوونی لێکۆڵینەوەی ئێف بی ئای لەمەڕ فڕۆکە رفێنەرەکان، ئاگادارم بکەنەوە. بۆب پێی وتم زۆربەی تیرۆریستەکانیان ناسیوەتەوە و دەستنیشانی ئەوەیان کردووە کە چ کاتێك هاتوونەتە ناو وڵاتەوە، لە کوێ ماونەتەوە و چۆن پیلانەکەیان جێبەجێ کردووە. ئەمە لێکۆڵینەوەیەکی کاریگەر بوو. بەڵام بەس نەبوو.

پرسیارم کرد "چی دەکەیت بۆ بەرگرتن لە هێرشی داهاتوو؟" خەڵکەکە بە شڵەژانەوە لە جێگاکانی خۆیانەوە جوڵان. بە بۆبم وت کە دەبێ مەکتەبەکەی ئەقڵیەتێکی سەردەمی جەنگ پەیڕەو بکات. پێویستمان بەوە بوو کە هێرشەکان بوەستێنین بەر لەوەی روویدەن، نەك ئەوەی تەنیا پاش روودانیان لێکۆڵینەوەیان لێبکرێت. لە کۆتایی کۆبوونەوەکەدا، بۆب جەختی کردەوە "ئەمە ئەرکی نوێی ئێمەیە، بەرگرتن لە هێرشەکان". لە ماوەی ساڵانی دواتردا، ئەو بەڵێنەکەی جێبەجێ کرد و وەرچەرخانی هەرە بنچینەیی ئێف بی ئای لە مێژووی یەك سەدەییەکەیدا ئەنجام دا.

پاش پەیوەندییەکی تەلەفۆنی لەگەڵ ئەرێل شارۆنی سەرۆك وەزیرانی ئیسرائیل، سەرکردەیەك کە لە مانای شەڕی تیرۆر تێدەگەیشت، دەستم کرد بە یەکەم کۆبوونەوەی کابینەکەم لە پاش هێرشە تیرۆریستییەکانەوە. لەکاتێکدا کە دەچوومە ژوورەوە، تیمەکە

دەستیان کرد بە چەپڵەلێدان. تووشی سەرسوڕمان بووم و لە بەرانبەر ئەو پشتگیرییە دڵسۆزانەیاندا قوڕگم گیرا. بۆ جاری دووەم لە ماوەی دوو ڕۆژدا فرمێسک لە چاوم هاتە خوار. بە نزایەک دەستمان کرد بە کۆبوونەوەی کابینە، داوام لە ڕەمسفێڵد کرد کە سەرپەرشتی بکات. ئەو چەند قسەیەکی جوڵێنەری کرد لەبارەی قوربانییەکانی هێرشەکان و داوای "ئارامگرتن لە پێوانەکردنی تامەزرۆیی بەرپەرچدانەوەمان"ی کرد. چرکەساتی بێدەنگی پاش نزاکە دەرفەتی پێدام تا هەستەکانم کۆ بکەمەوە. بیرم لەو وتارە کردەوە کە بە زوویی لە (کەنیسەی نیشتمانی) پێشکەشم دەکرد. دیار بوو کە کۆلین پاولیش لەو دۆخەدا بوو. وەزیری دەرەوە تێبینییەکی خستە بەردەستم. ئەو نوسیبووی "بەڕێز جەنابی سەرۆک، کاتێک کە دەبێ من وتارێکی وەها پێشکەش بکەم، خۆم لەو قسانە لادەدەم کە دەزانم وام لێدەکەن ناخم هەڵڕێژم، وەکو دایک و باوکم". ئەمە ئاماژەیەکی هۆشیارانە بوو. کۆلین شەڕی بینیبوو، ئەو لەبارەی ئەو هەستە بەهێزانەوە دەیزانی کە هەمووان تێی دەکەوتین و دەیویست ئاسودەییم پێبدات. هەر کە کۆبوونەوەکەم دەست پێکرد، تێبینییەکەم بەرز کردەوە و کردمە گاڵتە "با پێتان بڵێم وەزیری دەرەوە چی نوسیوە...."بەڕێز جەنابی سەرۆک، هەرەس مەهێنە !"

***

کەنیسەی نیشتمانیی سەرەکی بینایەیەکی بێ هاوتایە، بنمیچی ١٠٢ پێیی، بنچینەی جوان و شوشەی بۆیەداری درەوشاوەی هەیە. لە چواردەی سێپتێمبەردا، سەکۆیەکان پڕببوون. سەرۆکەکانی پێشوو، فۆرد، کارتەر، بوش و کلینتن لەگەڵ هاوسەرەکانیاندا لەوێ بوون. بەهەمان شێوە نزیکەی هەموو ئەندامانی کۆنگرێس، تەواوی کابینەکە، سەرکردە سەربازییەکان، دادوەرانی دادگای باڵا، دەستە دیپلۆماسییەکان و خێزانەکانی قوربانییەکان. تاکە کەسێک کە لەوێ نەبوو دیک چێنی بوو. ئەو لە کامپ دەیڤد بوو بۆ جەختکردنەوە لە بەردەوامیی حکومەت، کە بیرهێنەرەوەیەکی هەڕەشەی هەنوکەیی بوو. من داوام لە لۆرا و کارێن هیوگز کردبوو کە پرۆگرامەکە دیزاین بکەن و کارێکی باشیان ئەنجام دا. وتاربێژان بریتی بوون لە ڕێبەرانی ئایینی دینە جیاوازیەکان: (ئیمام

موزەمیل سدیقی) ی کۆمەڵگەی ئیسلامیی ئەمریکای باکوور، رابیی جولەکە (جۆشوا هابەرمان)، بیلی گراهام، کاردینال تیۆدۆر مکاریک و (کیربیجۆن کالدویل). لە نزیکی کۆتایی مەراسیمەکەدا، نۆرەی من هات. هەر کە بە قادرمەکاندا سەرکەوتم بەرەو مینبەرەکە، نزایەکم خوێند: "خوایە، با رۆشنایی تۆ بەسەر مندا بباریٚ".

وتارەکەم لە کەنیسەی سەرەکی، لەهەموو ئەوانەی ماوەی سەرەتای سەرۆکایەتیم گرنگتر بوو. من بە وتارنووسەکانم – مایک گێرسن، جۆن مکۆنێل و ماتییۆ سکەلی-م وتبوو کە دەمەوێ سێ ئامانج بپێکم: دڵنەوایی قوربانیان بدەمەوە، بیر خەڵکی بهێنمەوە کە خودایەکی بەسۆز هەیە، و جەخت لەوە بکەمەوە کە ئەوانەی هێرشیان کردووەتەسەر گەلەکەمان رووبەڕووی دادپەروەری دەبنەوە.

کە دەستم پێکرد وتم "ئێمە لێرەین لە ناوەڕاستی خەفەتماندا". "خەڵکێکی زۆر زیانی گەورەیان بەرکەوتووە و ئەمڕۆکە ئێمە خەمی گەلەکەمان دەردەبڕین. ئێمە دێینە قاپی خودا بۆ نزاکردن بۆ ئەوانەی شوێنبزرن و ئەوانەی مردوون، بۆ ئەوانەش کە خشمان دەوێن...مندالآن، دایکان و باوکان و هاوسەران و خێزانەکان و هاوڕێیانی قوربانییەکان، ئێمە قووڵترین هاوخەمی گەل دەردەبڕین و دڵنیاتان دەکەمەوە ئێوە تەنیا نین".

چاوێکم بە قەرەباڵغییەکەدا خشاند. سێ سەرباز کە لەلای راستی منەوە دانیشتبوون فرمێسک بە روومەتەکانیاندا دەهاتە خوار. بە هەمان شێوە ئەو ژنەی پێشەوەشم (چاریتی والاس). من سوور بووم لەسەر ئەوەی کە نەکەومە داوی پەتای گریان. تەنیا یەك شوێن هەبوو کە نەدەوێرام لێ بڕوانم: ئەو سەکۆیەی کە دایکم، باوکم و لۆرا لێی دانیشتبوون. بەردەوام بووم لە قسەکانم:

"تەنیا سێ رۆژ لەم رووداوانە تێپەڕیووە، ئەمریکییەکان هێشتا دوورایی مێژوویان نییە. بەڵام هەنوکە بەرپرسیارێتیمان بەرانبەر مێژوو روونە: وەڵامدانەوەی ئەو هێرشانە و رزگارکردنی جیهان لە خراپەکار. جەنگ بە شێوەی فریودەرانە، بەدزییەوە و بە دزەکوژێ لەدژمان خراوەتەگەڕ. ئەم گەلە ئاشتیخوازە، بەڵام توندە ئەگەر تووڕەکرا. ئەم هەڵبژێردراوی خۆمان کۆتایی پێدەهێنرێت. ئەمەش بە شێواز و بە کاتی هەڵبژێردراوی خۆمان کۆتایی پێدەهێنرێت...

نیشانەکانی خودا هەموو کاتێك ئەوانە نین کە سۆراخی دەکەین. ئێمە لە تراژیدیادا فێر دەبین کە ئامانجی ئەو هەموو کاتێك هی ئێمە نییە. لەگەڵ ئەوەشدا ئازارچەشتنێکی شاراوە، چ لە ماڵی خۆمان یان لە کەنیسەی گەورە، دەزانرێ و دەبیسترێ و دەرك دەکرێ... ئەم جیهانەی کە ئەو دروستی کردووە، دیزاینێکی ئەخلاقی هەیە. خەفەت، تراژیدیا و رق تەنیا بۆ کاتێکن. چاکە، یادکردنەوە و خۆشەویستی، کۆتاییان نییە. خالقی ژیانیش هەموو ئەوانەی کە دەمرن و هەموو ئەوانەش کە ماتەم دەگێڕن دەگرێتەخۆ.

لەکاتێکدا کە لە شوێنەکەی خۆم لە تەنیشت لۆرا دانیشتمەوە، باوکم لێم نزیك کەوتەوە و قۆڵی گوشیم. هەندێ کەس وتوویانە کە ئەو چرکەساتە جیاکەرەوەی تێپەڕینێکی رەمزیی مەشخەڵەکە بووە لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر. من ئەوەم وەکو دەستلێدانێکی دڵنیاکەرەوەی باوکێك لەقەڵەمدا کە تەحەدییەکانی جەنگی دەزانی. من هێزم لە نموونەکەی و لە خۆشەویستییەکەی وەرگرت. من بۆ قۆناغی دواتری گەشتەکە، پێویستم بەو هێزە هەبوو: سەردانکردنی شوێنگەی هێرشەکە، بەشی خوارەوەی (مانهاتن).

***

فڕین بەرەو باکوور، هێمن بوو. من داوام لە کیربیجۆن کالدویل کردبوو کە گەشتەکەم لەگەڵدا ئەنجام بدات. من دیمەنی نیویۆرکم لەسەر تەلەفزیۆن بینیبوو و دەمزانی کە دارمانەکە گەورەیە. بوونی هاوڕێ و پیاوێکی ئایینی لەتەکما ئاسودەبەخش بوو.

حاکم (پاتاکی) و پارێزگار (جولیانی) لە بنکەی هێزی ئاسمانی (مگوایەر) سڵاویان لێکردم. شەکەت دیاربوون. حاکم لە بەرەبەیانی سێشەمەوە بێ وچان خەریك کارکردن بوو بۆ تەرخانکردنی سەرچاوەکانی ویلایەت و کۆکردنەوەی سەربازانی ژێر دەسەڵاتی. بە دەگمەنیش پیاوێك لە مێژوودا وەکو ئەو لە ١١ی سێپتێمبەردا سروشتیانە رووبەرووی چرکەساتەکەی ببووەوە. ئەو لە کاتی خۆیدا خۆگربوو، لەکاتی خۆیدا پەژارە دایدەگرت و لە تەواوی کاتەکەدا فەرماندە بوو.

لەگەڵ جۆرج و رودی سواری کۆپتەر بووم. لە گەشتەکەدا بۆ ناو شار، فڕۆکەوانە ماریبنزەکان بەسەر گراوند زیرۆ (شوێنەواری دارمانەکە)دا دەفڕین. بیرم چووەوە سەر گەشتی هەلیکۆپتەرەکەی ئێوارەی ١١ی سێپتێمبەر. پێنتاگۆن زەبری بەرکەوتبوو، بەڵام دانەرمابوو. کەیسی دوو تاوەرەکە وەها نەبوو. ئەوان نەمابوون. هیچ شتێکیان لێ نەمابووەوە جگە لە پاشەوارێکی داروپەردو. داڕوخانەکەدا شۆک ئامێز و تەواوەتی بوو. دیمەنەکە لە ئاسمانەوە هیچ نەبوو بە بەراورد بەوەی لە سەر ئەرزەکە بینیم. من، جۆرج و رودی خۆمان کرد بەناو پانتاییەکەدا. ئێمە تازە دەستمان کردبوو بە لێخوڕین بەرەو شوێنگەی کارەساتەکە کاتێک شتێك لە قەراغی رێگاکەوە بەرچاوم کەوت. پێدەچوو تۆپەڵێکی خۆڵەمێشیی جوڵاو بێت. جارێکی تر سەیرم کردەوە. ئەمانە کۆمەڵێك لە یەکەمین وەڵامدەرەوەکان بوون کە لەسەرەوە تا قولە پێ بە خۆڵەمێش داپۆشرابوون.

داوام لە شۆفێر کرد کە بوەستێت. بە شوێنەکەدا رۆیشتم و دەستم کرد بە دەست گوشین و سوپاسی هەموو پیاوەکانم کرد لە بەرانبەر ئەوەی کە ئەنجامیاندابوو. ئەوان بێ وچان کاریان دەکرد. هەندێکیان فرمێسك بە روومەتەکانیاندا دەهاتەخوار لەکاتێکدا کە وەکو جۆگەلە بەناو بیاباندا، بەناو رەژوودا رێگەیان دەبڕی. هەستی رووبەڕووبوونەوەکە، زەنگێك بوو بۆ ئەوەی کە دواتر دەهات.

لەکاتێکدا کە لە گراوند زیرۆ نزیك دەکەوتمەوە، هەستم کرد کە دەچمە ناو مۆتەکەیەکەوە. رووناکییەکی کەم هەبوو. دوکەڵ لە هەوادا دەهات و دەچوو و لەگەڵ گەردە هەڵواسراوەکاندا پەردەیەکی خۆڵەمێشی تۆقێنەری دروست دەکرد. ئێمە بە شڵپە شڵپ بەناو گۆماوەکانی بارانی بەرەبەیان و ئاوی ئاگرکوژێنەوەدا رۆیشتین. هەندێ وتوێژ لەنێوان کاربەدەستانی لۆکاڵدا هەبوو. "دەستەی بەڕێوەبەرایەتی لێرە بووە...لێرە یەکەکە کۆبوونەتەوە". من هەوڵمدا گوێ بگرم، بەڵام هۆشم بەردەوام دەچووەوە سەر دارمانەکە و سەر ئەوانەی کە فرمانیان بە ئەنجامدانی هێرشەکان کردبوو. ئەوان تەنانەت توندتر لەوەی دەرکم پێکردبوو، لێیان دابووین.

ئێمە چەند خولەکێك بوو پیاسەمان دەکرد کە جۆرج و رودی بەرەو ناو چاڵێك بردیانین کە تیایدا کرێکارانی رزگارکەر بۆ زیندووان دەگەڕان. ئەگەر پاشماوەکەی شوێنگەکە مۆتەکەیەك بووبێت، ئەمەیان دۆزەخێك بوو بۆخۆی. تاریکتر دیاربوو لەپانتاییەکانی سەرەوە. سەرباری گەردە قورسەکانی رەژوو لە هەوادا، چەند تەپۆلکەیەکی شوشە و ئاسنی پارچەبوو، هەبوون.

هەر کە کرێکارەکان منیان بینی، ریزێك دروست بوو. من یەك بە یەك دەستەکانم گووشی. روخسار و جلەکانی کرێکاران زۆر پیس ببوون. چاوەکانیان سوور هەڵگەڕابوو. دەنگیان نوسابوو. هەستەکانیان تەواوی فەزاکەی گرتبوو. ماندوویی و خەفەت، نیگەرانی و ئومێد، توڕەیی و شانازی لەئارادا بوون. هەندێکیان بە ئارامییەوە وتیان "سوپاس" یان "خوا بەرەکەتت بدات" یان "شانازیت پێوە دەکەین". من پێم وتن ئێوەش بەهەمان شێوە. من شانازیم پێوە دەکردن.

پاش چەند خولەکێك میزاجەکە دەستی بە گۆڕان کرد. ئاگرکوژێنەوەیەکی داپۆشراو بە رەژوو، پێی وتم کە بنکەکەی چەند پیاوێکی لەدەستداوە. هەوڵمدا کە سوکنایی پێبدەم، بەڵام ئەمە ئەو شتە نەبوو کە دەیویست. ئەو راستەوخۆ چاوی بڕییە چاوەکانم و وتی "جۆرج، ئەو حەرامزادانە بدۆزەوە کە ئەمەیان کرد و بیانکوژە". زۆر کەم خەڵك سەرۆك بە ناوی یەکەمی بانگ دەکەن. بەڵام بۆ من ئەمە ئاساییە. ئەمەیان شتێکی کەسی بوو.

چەندەی کاتی زیاترم لەگەڵ کرێکارەکاندا بەسەر برد، هەستی زیاترم لێ دەردەکەوتن. بەلای زۆربەی ئەو پیاو و ژنانەوە، من روخسارێك بوو کە لەسەر تەلەفزیۆن بینیبوویان. منیان نەدەناسی. ئەوان بە شێوەیەکی بەرجەستە منیان نەبینیبوو. ئەوان دەیانویست بزانن ئاخۆ منیش هەمان مکوڕی ئەوانم هەیە. پیاوێك هاواری کرد "نائومێدم مەکە!" یەکێکیان راستەوخۆ بە رووی مندا هاواری کرد "هەرچییەك پێویست بکا!" تینوویەتیی خوێن بەدی دەکرا و شیاوی لێ تێگەیشتن بوو.

ئاندی کارد پرسیاری کرد ئاخۆ دەمەوێ قسەیەك بۆ خەڵکەکە بکەم. بڕیارمدا کە دەبێ ئەمە بکەم. مینبەر، مایکرۆفۆن، تێبینی ئامادەکراو لەئارادا نەبوون. ئاندی بۆ

تەپۆلکەیەکی ئاسن ئامارەی بۆ کردم. من سەیری کارمەندی دەزگای نهێنی (کارل ترۆسکۆت)م کرد کە سەری لەقاند وەکو ئامارەیەک بەوەی کە چوونە سەر ئەوێ بێ مەترسییە. ئاگرکوژێنەوەیەکی پیر لەسەر تەپۆلکەکە وەستابوو. دەستم درێژکرد و ئەو بەرەو لای خۆی رایکێشام. ناوی (بینکوین) بوو.

نینا بیشۆپ، ئەندامی تیمی پێشڕەو، موکەبەرەیەکی پەیداکردبوو کە من بتوانم بەکاریبێنم بۆ موخاتەبەکردنی ئەوانەی کە کۆ ببوونەوە. ئەو هەڵیدایە ناو دەستەکانم. خەڵکە دەیتوانی لەسەر ئەو تەپۆلکەیە من ببینن کە دوایی زانیم شاحینەیەکی تێک قورپاوە. یەکەم غەریزەم بریتی بوو لە دڵدانەوە. پێم وتن کە ئەمریکا هاتووەتەسەر ئەژنۆ لە نزاکردن بۆ قوربانیان، رزگارکەران و خێزانەکان.

خەڵکی هاواریان کرد، "ئێمە گوێمان لێت نییە". منیش هاوارم کردەوە "من گوێم لێتانە!" ئەم قسەیە هاوارێکی خۆشی و ستایشی ئەوانی بەدواوە بوو. من ئومێدەواری ئەوە بووم کە کرێکاران کۆبکەمەوە و بڕیاری وڵاتیان پێ رابگەیەنم. لەپڕ زانیم چۆن. بە دەنگێکی بەرزتر وتم "دەتوانم بتانبیستم، بەشەکەی تری جیهانیش گوێی لێتانە". "ئەوانەش کە ئەم باڵەخانانەیان رووخاند بە زوویی گوێبیستی هەموومان دەبن!" خەڵکەکە دەستی کرد بە چەپڵە لێدان. ئەمە کردنەدەری وزەیەک بوو کە من پێشتر هەستم پێ نەکردبوو. ئەوان هوتافی "یو.ئێس.ئەی، یو.ئێس.ئەی، یو.ئێس.ئەی!"یان کێشا.

***

بۆ ماوەی چەند ساڵێک، کاتێکی باشم لە نیویۆرک بەسەر برد. بەڵام تاوەکو ١٤ی سێپتێمبەر دەرکم بە کارەکتەری راستەقینەی شارەکە نەکرد. پاش سەردانی گراوند زیرۆ، نزیکەی سێ مایڵ بە ئۆتۆمبێل بەرەو سەنتەری (جاڤیتز) رۆیشتین. من سەرم سوڕما لەو هەموو خەڵکەی ئەمبەر و ئەوبەری شارێی (وێست سایدی) کە ئاڵایان رادەوەشاند و هوتافیان دەکێشا "رقمان لە پەیمان شکاندنە لەگەڵ تۆدا، جەنابی سەرۆک" رودی بە گاڵتەوە وتی "بەڵام هیچ کام لەم خەڵکە دەنگیان بە تۆ نەداوە".

لە سەنتەری جاڤیتز، بەرەو سەکۆیەک چووم بۆ لای یەکەمین وەلامدەرەوانی سەرتاسەری وڵات. سڵاوم لە ئاگرکوژێنەوە و رزگارکەرانی ویلایەتە هەرە دوورەکان کرد لەوانەش ئۆهایۆ و کالیفۆرنیا. بەبێ ئەوەی داوایان لێبکرێت، ئەوان هاتبوون بۆ شارەکە بۆ ئەوەی کە وەکو پاڵپشت ئیش بکەن. من لەبری گەل سوپاسم کردن و داوام لێکردن کە لە ئیشە باشەکەیان بەردەوام بن.

گەراجی بینایەکە ببووە شوێنێکی گردبوونەوەی نزیکەی دووسەد ئەندام خێزانی یەکەمین وەلامدەرەوە بزرەکان. خەڵکی ناو ژوورەکە لە تەمەنی جیاجیا بوون، هەر لە داپیرە بەتەمەنەکانەوە تا ساواکان. زۆرێکیان لە هەمان مۆتەکەدا دەژیان: خۆشەویستانیان دوایین جار لە نزیک سەنتەری بازرگانی جیهانی بینرابوون یان دەنگیان بیسترابوو. دەیانویست بزانن ئاخۆی رزگاریان بووە.

من تازە گەردە رەژووەکانی تاوەرەکانم بینیبوو. دەمزانی دەرکەوتنی کەسێک وەکو موعجیزە دەبێ. لەگەڵ ئەوەشدا، خێزانەکان دەستبەرداربوونی ئومێدیان رەت دەکردەوە. ئێمە بەیەکەوە نزامان کرد و پێکەوە گریاین. زۆر کەس داوای وێنەگرتن و واژۆی منیان دەکرد. بەلامەوە سەیر بوو کە لە سەروەختی خەفەتدا واژۆ بکەم، بەلام دەمویست هەر شتێک بکەم کە برینیان سارێژ بکات. داوام لە هەر خێزانێک کرد کە کەمێک باسی خۆشەویستە بزرەکەیان بکەن. پاشان ئەموت "من ئەم کارتە واژۆ دەکەم و دوایی کاتێک باوکت (یان دایکت یان کوڕت یان کچت) دەگەڕێتە ماڵەوە، بڕوا دەکات کە تۆ بە ڕاستی چاوت بە سەرۆک کەوتووە".

هەر کە چوومە دوایین گۆشەی ژوورەکە، خێزانێکم بینی کە لە دەوری ژنێکی دانیشتوو گرد بوونەتەوە. لە تەنیشت ژنەکەوە دانیشتم کە پێی وتم ناوی (ئارلین هەوارد)ە. کوڕەکەی ئەفسەرێکی پۆلیسی بەڕێوەبەرایەتی بەندەر بوو کە رۆژی ١١ی سێپتێمبەر، پشووی بوو بەلام هەر کە گوێبیستی هێرشەکان ببوو، بە شێوەی خۆبەخش بۆ بارمەتیدان هاتبوو. ئەو دوایین جار بەری سێ رۆژ بینرابوو کە خۆی کردبوو بەناو تۆز و دوکەڵدا.

لەکاتێکدا کە خۆم ئامادە دەکرد بۆ ماڵئاوایی، ئارلین دەستی بۆجانتاکەی برد و پارچە ئاسنێکی دەرهێنا. لەکاتێکدا کە پارچە ئاسنەکەی توند خستە دەستمەوە، وتی "ئەمە باجی کورەکەمە. ناوی جۆرج هاواردە. تکایە لەبیرت بێت".

***

پاش ئەوەی دایکی ئارلین ئەو باجەی دامێ، ٢,٦٨٥ رۆژ وەکو سەرۆک بەردەوام بووم. لە هەموو ئەو رۆژانەدا لای خۆم پاراستبووم. لەکاتێکدا کە ساڵان تێپەرین، زۆربەی ئەمریکییەکان چووبوونەوە ناو ژیانی رۆژانەی خۆیان. ئەمەش سروشتی و دڵخواز بوو. ئەمە بەو مانایە بوو کە وڵات چاك دەبێتەوە و خەڵکی هەستیان دەکرد سەلامەترن.

لەکاتێکدا کە من ئەم بیرۆکانە تۆمار دەکەم، ئەو رۆژەی ئاگربارانە بۆ هەندێ لە هاوڵاتیانمان یادەوەرییەکی دوورە. گەنجترین ئەمریکییەکان زانیاری دەستی یەکی ئەو رۆژەیان نییە. سەرەنجام، ١١ی سێپتێمبەر زیاتر هەستێکی وەکو رۆژی پێرل هاربەر دەبەخشێ- بەروارێکی رێزلێنراو لەسەر رۆژمێر و چرکەساتێکی گرنگ لە مێژوودا، بەڵام نەك برینێك لە دڵدا، نەك هۆکارێك بۆ بەردەوام بوون لە شەر.

بەلای منەوە، هەفتەی ١١ی سێپتێمبەر هەمیشە شتێکی زیاتر دەبێ. من هێشتا سووتانی پێنتاگۆن، بڵێسەی تاوەرەکان، تەپۆلکەی ئاسنە بادراو و خواربووەوەکان دەبینم. هێشتا گوێبیستی هاواری دەنگی خۆشەویستان دەبم کە سۆراخی رزگاربووان و کرێکاران دەکەن "نائومێدم مەکە!" "هەرچییەك پێویست بکا!" هێشتا هەست بە خەمباری منداڵان، ناڵەی قوربانییانەی سوتانەکە و ئازاری خێزانە تێکشکاوەکان دەکەم. هێشتا سەرسامم بە ئازایەتی ئاگرکوژێنەرەوەکان و هاوسۆزی بێگانەکان و بوێریی بێ سنووری ئەو سەرنشینانەی فرۆکەکەیان بەزۆر نیشاندەوە.

١١ی سێپتێمبەر قوربانیدانی پێناسە کردەوە. من ئەرکم پێناسە کردەوە. ئەمیش کارەکەمی پێناسە کردەوە. بەسەرهاتی ئەو هەفتەیە، کلیلی تێگەیشتنە لە سەرۆکایەتی من. گەلێك بریار هەبوون کە بەدواداهاتن، زۆرێکیان مشتومرئامێز و ئاڵۆز بوون. لەگەڵ ئەوەشدا، پاش ١١ی سێپتێمبەر هەستم کرد بەرپرسیارێتییەکەم روونە. بە درێژایی ئەو ماوەیەی کە لە ئۆفیسدا بووم، قەت نەمتوانی ئەوەم بیر بچێت کە ئەو رۆژە چی بەسەر ئەمریکادا هات. من هەموو دڵ و گیانم دەخستەسەر پارێزگاریکردن لە وڵات، هەرچییەك پێویستی بکردایە.

# پێگەی جەنگ

لە حەفدەی ئۆکتۆبەری ۲۰۰۱دا، بە یەکەمین گەشتم بۆ دەرەوەی وڵات لە ١١ی سێپتێمبەرەوە، سواری هێزی ئاسمانی یەك بووم. ئێمە چووین بۆ شانگهای بۆ لوتکەی (هاوکاریی ئابووریی ئاسیا پاسیفیك) کە گردبوونەوەیەکی سەرۆکەکانی وڵاتانی (ئۆقیانووسی ئارام) بوو. دەزگای نهێنی نیگەران بوو لە گەشتەکە. بۆ چەند هەفتەیەك ڕاپۆرتی هەواڵگریی تەزووبەخشمان پێدەگەیشت لەبارەی ئەگەری هێرشی دواترەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، بەهێزکردنی پەیوەندییەکانی ئەمریکا لە خۆرهەڵاتی دوور، یەکێك بوو لە ئەولەویەتەکانی سەرەوەم و دەمویست لە پێشدا هاوتا سەرۆکەکانی جیهانم مکوڕیم ببینن لەمەڕ جەنگ لەدژی تیرۆریستان. هێزی ئاسمانیی یەك لە فڕۆکەخانەی شانگهای نیشتەوە، ئەو شارە تۆزاوییە پڕ لە پایسکیلەم بیر کەوتەوە کە لە ١٩٧٥دا لەگەڵ دایکم بۆی چووین. ئەمجارەیان تا بە

ئۆتۆمبێل بە شارێ مۆدێرنەکەدا گەیشتینە ناو شار، چل و پێنج خولەکی خایاند. ئێمە بەلای کەرتێکی نوێی گەشاوەی شارەکەدا تێپەڕین بەناوی (پودۆنگ). دواتر زانیم کە حکومەت نزیکەی سەدهەزار کەسی لە وشکانییەوە جوڵاندووە بۆ بونیادنانەکە. بینا بەئاسمانداچووەکان و ڕووناکییە نیۆنەکانلاس ڤێگاسیان بیر خستمەوە. بۆ شانگهای، پرۆژەی (بازی گەورە بەرەو پێشەوە) دواجار پێگەیشتبوو.

بەیانیی دواتر، لەگەڵ کۆلن پاوڵ، کۆندی رایز، ئاندی کارد و لێدوان ئامادەکەری سی.ئای.ئەی چووینە ژێر خێمەیەکی شینەوە لە ریتزکارلتۆن. ئەم بونیادە بۆ ئەوە دیزاینکرابوو تا لێدوانی ئاسایشی نیشتمانی بپارێزرێت لە دزەکەران. ئێمە شاشەیەکی

شیدیۆمان داگیرساند و روخساری دیك چێنی له نیویۆرکەوە دەرکەوت. ئەو بۆ وتارەکەی له مەراسیمی خێرخوازیی (دامەزراوەی ئێوارەخوانی یادەوەریی ئەلفرێد ئی.سمس)ی رێکخراو لەلایەن کلێسەی کاسۆلیکی ئوسقوفی گەورە، قاتی رەش و کراسی سپی لەبەردابوو.

هەر کە دیکم بینی، زانیم شتێك بووە. دەموچاوی وەکو بۆینباخەکەی سپی هەلگەڕابوو. وتی "جەنابی سەرۆك، یەکێك له پشکنەرە زیندەگییەکان له کۆشکی سپی زەنگی لێداوە. ئەوان شوێنەواری (ژەهری بوتۆکس)یان دۆزیووەتەوە. لەوانەیە هەموومان بەرکەوتبین".

سی.ئای.ئەی لێدوانی پێدابووم لەبارەی ژەهری بوتۆکسەوە. ئەمە یەکێك بوو لە هەرە ژەهراویترین ماددەکانی جیهان. کەس قسەی نەکرد. دواجار کۆلن پرسیاری کرد، "کاتی بەرکەوتن کەیە؟" ئایا ئەو خەریکی بیرکاریی ئەقڵی بوو و هەوڵی دەدا بزانێ چەندی خایاندووە لەوەتەی دوایین جار لە کۆشکی سپی بووە؟

جێگری راوێژکاری ئاسایشی نیشتمانی (ستیف هادلی) روونی کردەوە کە ئێف.بی.ئای خەریکی تاقیکردنەوەی ماددە گوماناوییەکەیە لەسەر مشکەکان. بیست و چوار سەعاتی داهاتوو یەکلاییەکەرەوە دەبێ. ئەگەر مشکەکان هێشتا بێن و بچن، قاچیان دابنێن، ئەوا ئێمە سەلامەت دەبین. ئەگەر مشکەکان لەسەر پشت بن و قاچیان لە هەوا بێت، ئەوا ئێمە مردووین. کۆندی هەوڵیدا میزاجمان هێور بکاتەوە. ئەو وتی "باشە، ئەمە رێگایەک بۆ مردن لە پێناو وڵاتەکەتدا".

من رۆیشتم بۆ کۆبوونەوەکانی لوتکە و چاوەڕێی ئەنجامەکانی تاقیکردنەوە بووم. رۆژی دواتر، کۆندی پەیامێك پێگەیشت کە ستیف هادلی دەیەوێ پەیوەندی پێوە بکات. ئەو وتی "وابزانم ئەمە تەلەفۆنەکەیە". پاش چەند خولەکێك، کۆندی بە هەواڵەکەوە گەڕایەوە. ئەو وتی "قاچەکان لە خوارەوە نەك لەسەرەوە". ئەوە تەنیا زەنگێکی هەڵ بووە.

***

سالآنێك دواتر، حاڵەتی وەکو مەترسی ژەهری بوتۆکس خەیاڵی و بڕواپێنەکراو بوون. ئاسانە کە پێکەنین بتگرێت بە وێنەی گەورە بەرپرسانی ئەمریکا لە حاڵەتی نزاکردن بۆئەوەی مشکەکانی تاقیگە بە راوەستاوی بمێننەوە. بەڵام ئەو کاتە، هەڕەشەکان کتوپڕ و واقیعی بوون. شەش بەیانی لە هەفتەیەکدا، جۆرج تێنێت و سی.ئای.ئەی لێدوانیاندا لەسەر ئەوەی کە ئەوان پێیان دەگوت قاڵبی هەڕەشە، پوختەیەك لە هەڕەشە ئەگەرییەکانی سەر وڵات. لە رۆژانی یەکشممەدا، لێدوانێکی هەواڵگری نوسراوم پێدەگەیشت. لەنێوان ١١ی سێپتێمبەر و ناوەڕاستی ٢٠٠٣دا، سی.ئای.ئەی لەبارەی نێکڕای ٤٠٠ هەڕەشەی دیاریکراو لە هەر مانگێکدا، راپۆرتی ئەدامێ. سی.ئای.ئەی شوێن پێی زیاتر لە بیست پیلانی هێرشی بەرفراوانی ئیحتیمالیی هەڵدەگرت، هەر لە ئۆپەراسیۆنەکانی چەکە بایۆلۆژی و کیمیاییە ئەگەرییەکانەوە لە ئەورووپا تا هێرشی ئەگەریی بۆ سەر وڵات کە دەستی شانە نوستووەکانی لە پشت دەبێ. هەندێ لە ریپۆرتەران، ئاماژەیان بە ئامانجی دیاریکراو دەکرد، لەوانەش بینایە گەورەکان، بنکە سەربازییەکان، زانکۆکان و مارکێتەکان. بۆ ماوەی چەند مانگێك پاش ١١ی سێپتێمبەر، لە نیوەشەودا رادەبووم لە نیگەرانی ئەوەی کە خوێندبوومەوە.

لێدوان ئامادەکەرەکانم بە پرسیار دادەباراند. ئایا هەر هەڕەشەیەك تا چەند ڕاست بوو؟ چیمان کردووە بۆئەوەی بەدوای نیشانەکاندا بچین؟ هەر برگە زانیارییەك وەکو کاشییەکی ناو موزایکێك وابوو. لە دوادواکانی سێپتێمبەردا، بۆب موێلەری بەڕێوەبەری ئێف.بی.ئای کاشییەکی گەورەی خستە سەر کاتێك پێی وتم لەوانەیە ٣٣١ بکەری ئەلقاعیدە لەناو ئەمریکادا هەبن. کۆی وێنەکە لە جێی خۆیدا بوو: دوورنمای دووەم شەپۆلی هێرشە تیرۆریستییەکان لەدژی ئەمریکا زۆر واقیعی بوو.

پێش ١١ی سێپتێمبەر، زۆر کەس تیرۆریزمیان بە شێوەیەکی سەرەکی وەکو تاوانێك کە دەبێ بخرێتە دادگایی، بینیبوو. هەروەکو چۆن دیدی حکومەت لە بەرانبەر تەقینەوەکەی ١٩٩٣ی سەنتەری بازرگانیی جیهانی وەهابوو. پاش ١١ی سێپتێمبەر، ڕوون بوو کە هێرشەکانی سەر باڵیۆزخانەکانمان لە خۆرهەڵاتی ئەفریقا و بۆ سەر (یو ئێس ئێس کۆل) لە تاوانی جیاکراوە زیاتر بوون. ئەمانە راهێنانێك بوون بۆ یانزەی

سێپتێمبەر، بەشێك لەو ماستەرپلانەکەی کە ئوسامە بن لادن رێکی خستبوو کە فرمانێکی ئایینی بەناوی فەتوا دەرکردبوو و تیایدا بانگەوازی ئەوەی کردبوو کە کوشتنی ئەمریکییەکان "ئەرکێکی تاکەکەسییە بۆ هەر موسڵمانێك کە بتوانێ بیکات لە هەر وڵاتێك کە بکرێت".

لە ۱۱ی سێپتێمبەردا روون بوو کە دیدی سەپاندنی یاسا بۆ تیرۆریزم شکستی هێناوە. پیاوانی خۆکوژی ئامادە بۆ فراندنی فرۆکەی نەفەرهەڵگر بە ئاراستەی بینایەکان، تەنیا تاوانباری ئاسایی نەبوون. ئەمانە بە هەڕەشەی دادگایی کردن ناڕەوێنەوە. ئەوان جەنگیان دژی ئەمریکا راگەیاندبوو. بۆ پاراستنی وڵات، دەبووایە جاڕی شەڕ بدەین لەدژی تیرۆریستان.

جەنگەکە جیاواز دەبوو لە هەر جەنگێك کە ئەمریکا لە رابردوودا ئەنجامی دابوو لە رابردوودا. دەبووایە پەردە لەسەر پیلانەکانی تیرۆریستان هەڵبماڵین. دەبووایە شوێنپێی جوڵەکانیان هەڵبگرین و ئۆپەراسیۆنەکانیان بپچڕێنین. دەبووایە پارەکانیان لێ ببڕین و لە پەناگەی سەلامەت بێبەشیان بکەین. دەبووایە هەموو ئەمەش لەژێر سێبەری هەڕەشەیەکی تردا بکەین. تیرۆریستان ژیانی مەدەنیی ئێمەیان کردبووە شەرگەیەك.

دانانی ئەمریکا لە پێگەی جەنگدا یەکێك بوو لە بڕیارە هەرە گرنگەکانی سەرۆکایەتیم. دەسەڵاتم بۆ بەرپاکردنی جەنگ لەدژی تیرۆر لە دوو سەرچاوەوە هات. یەکێکیان بڕگەی دووی دەستوور بوو کە وەکو فەرماندەی هێزە چەکدارەکان دەسەڵاتەکانی سەردەمی جەنگ بە سەرۆك دەدات. ئەویتریان بڕیارێکی جەنگی کۆنگرێس بوو کە سێ رۆژ پاش ۱۱ی سێپتێمبەر پەسەند کرا. بە رێژەیەکی دەنگی ۹۸ بە سفر لە ئەنجومەنی پیران و ٤۲۰ بە ۱ لە ئەنجومەنی نوێنەران، کۆنگرێس رایگەیاند:

"سەرۆك دەسەڵاتی پێدراوە تا هەموو هێزێکی پێویست و گونجاو بگرێتە بەر لەدژی ئەو وڵاتانە، دامەزراوانە یان کەسانەی کە ئەو مکوڕە لەسەر ئەوەی پلانیان داناوە، رێگەیان پێدراوە، دەستیان تێدابووە یان یاریدەدەر بوون لە هەر هێرشێکی تیرۆریستی کە لە ۱۱ی سێپتێمبەری ۲۰۰۱دا روویاندا یان ئەو دامەزراوە یان کەسانەیان پەناداوە

بونەوەی نەهێشتنی هەر کردارێکی تیرۆریزمی نێودەوڵەتی لە دژی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەلایەن ئەو وڵات، دامەزراوە یان کەسانەوە".

لە ساڵانی دواتردا، هەموو بەیانییەك لە بیری ئەو مەترسییە هەڵدەستام کە رووبەڕووی بووینەوە و ئەو بەرپرسیارێتییەش کە لە ئەستۆم گرتبوو. هەروەها بەپەرۆشەوە ئاگاداری ئەو سەرۆکانەش بووم کە مێژوویەکی زیاد لەپێویست خواستنیان هەبوو لە ماوەی جەنگدا. جۆن ئادەمز یاساکانی (ئەلیەنز) و (سێدیشن)ی واژۆ کرد کە نارەزایی گشتیان قەدەغە دەکرد. ئەبراهام لینکۆڵن یاسای (هێشتنەوەی زیندانی تەنیا بە حوکمی دادگا)ی لە ماوەی شەڕی ناوخۆدا هەڵپەساردبوو. فرانکلین رۆزڤێلت فرمانیدابوو کە ئەمریکیيە ژاپۆنییەکان لە ماوەی دووەم جەنگی جیهانیدا دەستبەسەر بکرێن. کاتێك من سوێندی ئۆفیسم خوارد، وتم سوێندبێ "دەستوور، بهێڵمەوە، بپارێزم و بەرگری لێبکەم". تاکە ئەرکی هەرە گرنگم پارێزگاریکردن لە ئەمریکا بوو–لە چوارچێوەی ئەو دەسەڵاتەی کە لەلایەن دەستوورەوە پێم درابوو.

***

ئەرکی راستەوخۆی پاش یانزەی سێپتێمبەر پتەوکردنی ئامرازەکانی بەرگریمان بوو لە دژی دووەم هێرش. پرۆسەکە راچڵەکێنەر بوو. بۆ وەستاندنی دوژمن، دەبووایە ١٠٠٪ی کاتەکە راست بین. بۆ ئازاردانمان، دەبووایە تەنیا یەك جار سەرکەوتوو بن.

ئێمە شەپۆلێك رێوشوێنی ئاسایشیی نوێمان جێبەجێ کرد. من دابەزاندنی هێزەکانی گاردی نیشتمانیم لە فڕۆکەخانەکان، دانانی ئەفسەری دژەتیرۆری زۆر لەسەر فڕۆکەکان پەسەند کرد و هێڵە ئاسمانییەکانم پابەند کرد بە تۆکمەکردنی دەرگاکانی بەشی فڕۆکەوانەکان و رێوشوێنەکانی پێدانی ڤیزا و چاودێریکردنی سەرنشینان توندوتۆڵ کرد. بە کارکردن لەگەڵ حکومەتەکانی ویلایەت و لۆکاڵ و کەرتی تایبەت، ئێمە ئاسایشمان لە دەربەندەکانی دەریا، پردەکان، کارگەکانی وزەی ناوکی و ژێرخانە هەستیارەکانی تر توندوتۆڵ کرد.

بە ماوەیەکی کورت دوای ١١ی سێپتێمبەر، (تۆم ریج)ی حاکمی پەنسلڤانیام لە پۆستێکی باڵای کۆشکی سپی دامەزراند بۆ چاودێریکردنی تەقەلای ئەمنیی وڵاتمان. تۆم

ئەزموونی بەڕێوەبردنی دەوڵەمەندی لەگەڵ خۆیدا هێنا، بەڵام بە هاتنی سەرەتاکانی ۲۰۰۲، روون بیووەوە کە ئەرکەکە لەوە گەورەترە کە لە ئۆفیسێکی بچوکی کۆشکی سپییەوە هەماهەنگی بکرێت. دە دوانزە ئاژانسی فیدراڵیی جیاجیا هاوبەشییان کرد لە بەرپرسیارێتیی پارێزگاریی لە نیشتمان. رێوشوێنی پینەکاری بەس نەبوو و مەترسی لەوە زیاتر هەبوو کە شتێ لەدەست دەرچێت. نموونەیەکی زۆر خراپ لە مانگی ئازاری ۲۰۰۲دا بوو، کاتێک دەزگای کۆچ و بەهاوڵاتیکردن نامەیەکی ناردبوو و تیایدا ئاماژەی دابوو بە قوتابخانەیەکی فڕۆکەوانیی فلۆریدا کە ڤیزای خوێندکاری بە (محمد عەتا) و (مەروان ئەلشەحی)دابوو. لەوانەیە ئەو کەسەی کە نامەکەی کردبێتەوە تووشی شۆک بوبێت. ئەوانە ئەو دوو فڕۆکەوانە بوون کە لە ١١ی سێپتێمبەردا فڕۆکەکانیان بە ئاراستەی دوو تاوەرەکە فڕاندبوو.

منیش تووشی شۆک بووم. هەروەکو ئەو کاتە بە راگەیاندنەکانم وت، "بە زەحمەت توانیم قاوەکەم دابنێم". هەڵە قێزەونەکە نموونەیەک بوو لە پێویستیی ریفۆرمی بەرفراوانتر. دەزگای کۆچ و بەهاوڵاتیکردن کە لقێکی وەزارەتی داد بوو، تاکە ئاژانسێک نەبوو کە لە ململانێدابوو لەگەڵ بەرپرسیارێتییە نوێکانی ئاسایشی نیشتمانی. دەزگای گومرگ کە راپۆرتی دەدایە وەزارەتی گەنجینە، رووبەڕووی ئەرکی گەورەی پاراستنی بەندەرەکانی وڵات ببووەوە. ئەوان ئەو لەگەڵ گاردی کەناراو لەو بەرپرسیارێتییە هاوبەش بوون کە بەشێک بوو لە وەزارەتی گواستنەوە.

سیناتۆری دیموکراتیی (کۆنێکتیکەت) جۆ لیبەرمان کەیسێکی گەورەی دەخستەڕوو لە رێگەی دروستکردنی وەزارەتێکی نوێی فیدراڵ کە تەقەلا ئاسایشییە نیشتمانییەکانی یەکدەخست. من رێزی جۆ-م دەگرت و کەیفم پێی دەهات. ئەو یاسادانەرێکی بەهێز بوو کە تالیی هەڵبژاردنی ۲۰۰۰ی پشتگوێ خستبوو و لە تەنگەتاویی جەنگ دژی تیرۆر تێگەیشتبوو. لە سەرەتادا لە بیرۆکەی ئەو بۆ وەزارەتێکی نوێ نیگەران بووم. بیرۆکراسییەکی گەورە بەڕێوەبردنی قورسە. هەروەها نیگەران بووم لە رێکخستنەوەیەکی گەورە لە ناوەڕاستی قەیراندا. هەروەکو جەی دی کرۆش، کە دواتر جێگری راوێژکاری

ئاسایشی نیشتمانیم بوو، وتی " کاتێك تۆ لە پرۆسەی لە کالان نانەوەی شمشێرەکان و گەڕانەوە بۆ دۆخی ئاساییت، ناتوانیت شەڕ بکەیت".

پێ بەپێی تێپەڕبوونی کات، بیرکردنەوەم گۆڕی. زانیم کە هەبوونی وەزارەتێك بۆ ئاسایشی نیشتمانی، دەسەڵات و بەرپرسیارێتی رێك دەخات. بەهەبوونی ئاژانسی بەرپرس لە پارێزگاریی لە وڵات لەژێر چەترێکدا، ئەوا کەلێنی کەمتر و ناپێویستیی کەمتر لەئارادا دەبێ. هەروەها زانیم کە پێشینەیەکی سەرکەوتووانە هەبووە بۆ رێکخستنەوەی حکومەت لەسەردەمی جەنگدا. لە بەرەبەیانی جەنگی سارد دا لە ١٩٤٨، سەرۆك هاری ترومان هەردوو وەزارەتی دەریاوانی و جەنگ بۆ وەزارەتێکی نوێی بەرگری یەکخستبوو. ریفۆرمەکانی، سوپای بۆ ماوەی چەند دەیەیەکی داهاتوو بەهێز کردبوو.

من بڕیارمدا کە رێکخستنەوەکە شایەنی موجازەفەکردنە. لە حوزەیرانی ٢٠٠٢دا، لە کۆشکی سپییەوە موخاتەبەی گەلم کرد بۆ بانگهێشتکردنی کۆنگرێس تا وەزارەتێکی نوێی ئاسایشی نیشتمانی دروست بکات.

سەرباری پشتیوانی زۆرێك لە یاسادانەران، پرۆژەیاساکە رووبەڕووی بەربەستێکی توند بووەوە. دیموکراتەکان یاساکەیان بە سووربوون لەسەر ئەوەی کە وەزارەتی نوێ ماف دانوستانی بەفراوان بە کارمەندەکانی دەدات کە لە هیچ ئاژانسێکی تری حکومەتدا پیادە نەدەبوو، راگرت. من پێم ناخۆش بوو کە دیموکراتەکان رێوشوێنێکی ئاسایشیی پێویست بۆ رازیکردنی یەکێتییەکانی کرێکاران دوادەخەن.

کاندیدە کۆمارییەکان، پرسەکەیان سپاردەی دەنگدەران کرد لە هەڵبژاردە میانییەکانی ٢٠٠٢دا و منیش چوومە پاڵیان. لە رۆژی هەڵبژاردندا، حزبەکەمان شەش کورسی لە ئەنجومەنی نوێنەران و دوو کورسی لە ئەنجومەنی پیران هەڵبژارد. کارل رۆڤ ئەوەی بیر هێنامەوە کە تاکە سەرۆکێکی پێشوو کە لە یەکەم هەڵبژاردنی میانەییدا کورسی لە هەردوو ئەنجومەنەکە هەڵبژاردبێت، فرانکلین رۆزڤێلت بووە.

لەماوەی دوو هەفتەی هەڵبژاردندا، پرۆژەیاسای ئاسایشی نیشتمانی پەسەند کرا. پێویست نەبوو کە زۆر بەدوای یەکەم وەزیری ئاسایشی نیشتمانیمدا بگەڕێم. من (تۆم ریج)م کاندید کرد.

***

له ٢ی ئۆکتۆبەری ٢٠٠١دا، ئامادەکارێکی ڕۆژنامەی وێنەیی بەناوی (بۆب ستیڤنس) بە نایەکی بەرز و ڕشانەوەوە داخڵی نەخۆشخانەی فلۆریدا کرا. کاتێک دکتۆرەکان پشکنینیان بۆ کرد، بۆیان دەرکەوت کە بەکتریایەکی کوشندەی هەڵمژیووە بەناوی (ئەنتراکس). سێ ڕۆژ دواتر مرد.

کارمەندی زیاتری ڕۆژنامە وێنەییەکە نەخۆش کەوتن شانبەشانی ئەو خەڵکانەی تر کە لە کەناڵەکانی ئێن.بی.سی، ئەی.بی.سی و سی.بی.ئێس نیوز نامەیان کردبووەوە. زەرق نامەی داپۆشراو بە تۆزی سپی گەیشتنە ئۆفیسی تۆم داشل لە ئەنجومەنی پیران. ژمارەیەک لە ستاقی باڵەخانەی کۆنگرێس و کرێکارانی پۆستە نەخۆش کەوتن. هەروەها کرێکارێکی نەخۆشخانەی نیویۆرک و ژنێکی نەوەد و چوار ساڵە لە (کۆنێکتیکەت). سەرەنجام، حەڤدە کەس تووش ببوون. بە داخەوە، پێنج کەسیش مرجن.

یەکێک لەو نامانەی ئەنتراکسی تێدابوو ئەمەی خوارەوەی تێدا نوسرابوو:

٢٠٠١/٩/١١

ئێوە ناتوانن بمانوەستێنن

ئێمە ئەم ئەنتراکسەمان هەیە

ئێستا ئێوە دەمرن

دەترسن؟

بمرێ ئەمریکا

بمرێ ئیسرائیل

ئەڵلاهو ئەکبەر

من واقم وڕ ما لەو بیرکردنەوە قێزەونە: ئایا ئەمە شەپۆلی دووەم بوو، هێرشی بایۆلۆژی؟

من لێدوانم لەبارەی دەرەنجامە تۆقێنەرەکانی هێرشی چەکە زیندەگییەکان پێگەیشت. یەکێک لە هەڵسەنگاندنەکان گەیشتبووە ئەو ئەنجامەی کە "هێرشێکی ئاولەی

باش ڕێکخراو لەلایەن کارمەندێکی دەوڵەتییەوە بۆ سەر ناوچەی دانیشتووانی شاری نیویۆرک" دەشێ دەستبەجێ ٦٣٠,٠٠٠ کەس و ٢ بۆ ٣ ملیۆن کەس بەر لەوەی بڵاوبوونەوەکە کۆنترۆڵ بکرێ، تووش بکات. سیناریۆیەکی تر تەرکیزی کردبووە سەر بڵاوبوونەوەی چەکی زیندەگی لەسەر هێڵەکانی میترۆ لە چوار شاری گەورە لە کاتی ئەرەباڵغی هاتوچۆدا. دەشێ لە سەرەتادا ٢٠٠,٠٠٠ کەسێك تووش ببن و تێکڕا ملیۆنێك قوربانی بکەوێتەوە. دەشێ تێچوونە ئابوورییەکان "لە ٦٠ ملیارد دۆلارەوە بۆ چەند ملیارێك یان زیاتر بێ، دەوەستێتە سەر ئەوەی کە بارودۆخی هێرشەکە چۆن دەبێ".

هەر کە هەواڵی ئەنتراکس گەیەنرا، ترس لە سەرتاسەری وڵاتدا بڵاو بووەوە. ملیۆنان ئەمریکی لە کردنەوەی سندوقی پۆستەکانیان دەترسان. ژوورەکانی پۆستەی ئۆفیس دەخران. دایکان رایانکردە نەخۆشخانەکان بۆ داواکردنی پشکنین بۆ ئەو منداڵانەیان کە سەرماخوردەگیی بەربڵاویان هەبوو. ساختەچییانی سەرلێشێواو نامەگەلێکیان بەستەبەندی دەکرد و بۆدرەی جوانکاری یان ئاردیان پێوەردەکرد کە ترسی خەڵکی زیاد دەکرد. دەزگای پۆستە، لە زیاتر لە دووسەد شوێنی سەرتاسەری وڵاتدا چەند نموونەیەکی پۆستەی بۆ ئەنتراکس پشکنی. پۆستەی کۆشکی سپی لە تەواوی ماوەی سەرۆکایەتییەکەمدا ڕێچکەکەی گۆڕیندرابوو و تیشکی لێدەدرا. هەزاران کارمەندی حکومەت، لەوانەش من و لۆرا ئامۆژگاری کراین کە دەرمانی (سیپرۆ) کە ئەنتی بایۆتیکێکی بەهێز بوو، بەکاربهێنین.

گەورەترین پرسیار لەماوەی هێرشی ئەنتراکسدا ئەوە بوو ئاخۆ لە کوێوە ئاراستە دەکرێ. یەکێك لە باشترین دەزگاکانی هەواڵگری لە ئەورووپا پێی وتین کە گومانیان لە عێراقە. ڕژێمی سەدام حوسێن یەکێك بوو لەو ڕژێمە کەمانەی کە تۆمارێکی بەکارهێنانی چەکی کۆکوژی هەبوو و لەساڵی ١٩٩٥دا دانی بەوەدانا بوو کە ئەنتراسکی هەیە. ئەوانیتر گومانیان وابوو کە قاعیدە دەستی تێدایە. بەداخەوە، بەڵگەی کۆنکریتیمان نەبوو و سەرەداوی باشی کەممان هەبوو.

مانگێك پاش ١١ی سێپتێمبەر، کۆنفرانسێکی ڕۆژنامەوانیی تەلەفزیۆنیم لە کۆشکی سپییەوە بەست. کاتێکی زووتری ئەو ڕۆژە، ئێمە ئاستی وریایی تیرۆرمان بەرز کردەوە

له کاردانەوە بەرانبە راپۆرتگەلێك لەبارەی هۆشداریی بەرپرسێکی باڵای تاڵیبان لەمەڕ هێرشێکی گەورەی تر بۆسەر ئەمریکا.

(ئان کۆمپتن)ی ئەی.بی.سی نیوز وتی "...ئەبێ ئەمریکییەکان سۆراخی چی بکەن؟" لێدوانێکی سی.ئای.ئەی لەسەر هەڕەشەی تیرۆریستان بۆ بڵاوکردنەوەی ئەنتراکس لە فڕۆکەیەکی بچوکەوە بەسەر شارێکدا لە هۆشی مندا تازە بوو. وتم "ئان، ئەگەر تۆ کەسێکت دۆزییەوە کە پێشتر قەت نەتبینیووە و سواری فڕۆکەیەکی کشتوکاڵی دەبێت کە هی خۆی نییە، ئەوا راپۆرت بدە"

قسەکەم بووە مایەی پێکەنین، بەڵام لە پشت گاڵتەکەوە، واقیعێکی شێتکەر هەبوو: ئێمە بڕوامان وابوو کە هێرشی زیاتر بەڕێوەیە، بەڵام نەماندەزانی کەی، کوێ، یان لەلایەن کێوە. راگرتنی باڵانسی راست لەنێوان وریاکردنەوە و هۆشداریدان بە خەڵکی لە ماوەی دواتری ئیدارەکەمدا وەکو تەحەددییەك مایەوە. پێ بەپێی تێپەڕبوونی کات، هەندێ لە رەخنەگران وتییان ئێمە هەڕەشەمان ئاوساندووە یان ئاستەکانی وریاکردنەوەمان بۆ قازانجی سیاسی قۆستۆتەوە. ئەوان بە تەواوی هەڵە بوون. ئێمە هەواڵگریمان بە جددی وەرگرتبوو و ئەوەندەی پێمان کرا کردمان بۆ بەئاگا و سەلامەت هێشتنەوەی گەلی ئەمریکا.

***

جۆرج تێنێت لە لێدوانێکی هەواڵگریی درەنگانی ئۆکتۆبەردا، لەکاتێکدا کە سیگارە نیوە جوەراوەکەی لە دەمی دەکردەوە بە دەنگێکی زل وتی "ئەمە خراپترینە لەوەتەی لە پاش ١١ی سێپتێمبەرەوە بینیوومانە". ئەو لە سەرچاوەیەکی جێ متمانەوەی باڵاوە هۆشدارییەکی بە نموونە هێنایەوە لەبارەی ئەمەی کە هێرشێك لە ٣٠ یان ٣١ی ئۆکتۆبەردا ئاراستە دەکرێت کە گەورەترە لەوەی سەنتەری بازرگانیی جیهانی.

پاش ژمارەیەك هۆشداریی ناڕاست، ئێمە بڕوامان وابوو کە دەشێت ئەمە راست بێت. من و دیك چێنی رازی بووین لەسەر ئەوەی کە دەبێ ئەو بەرەو شوێنێکی سەلامەتی دەرەوەی واشنتن بجوڵێت– شوێنگە ئاشکرانەکراوە بەناوبانگەکە– بۆ زامنکردنی بەردەوامیی حکومەت. دەزگای نهێنی پێشنیاری ئەوەی کرد کە منیش بڕۆم. من پێم وت

که له شوێنی خۆم دەمێنمەوە. لەوانەیە ئەمە کەمێك خۆدەرخستنی منی پیشاندابێت. ئەمە بەشی هەرە زۆری پەیوەندی بە چارەنوسەوە هەبوو. من مشتومڕی خۆم براندبووەوە. ئەگەر ئەوە ئیرادەی خودا بێت لەوەی کە لە کۆشکی سپی دەمرم، ئەوا قبوڵمە. لۆراش هەمان هەستی هەبوو. ئێمە دڵنیا بووین لەوەی کە حکومەت لە هێرشێك دەرباز دەبێت، ئەگەرچی ئێمەش نا.

من تاکە یەك هۆکاری باشم هەبوو بۆ جێ هێشتنی واشنتن بۆ ماوەی چەند سەعاتێك. (یانکییەکان)ی نیویۆرك، بانگهێشتی منیان کردبوو بۆ هاویشتنی یەکەم تۆپ لە یاریی کۆتایی بەیسبۆڵی کۆمەڵەی سەرەکی ئەمریکا. حەوت هەفتە پاش ١١ی سێپتێمبەر، ئەمە ئاماژەیەکی بەهێز دەگەیەنێت بۆ سەرۆك کە لە ستادیۆمی (یانکی)دا دەر بکەوێت. ئومێدەوار بووم کە سەردانم، ڕۆحیەتی نیویۆرکییەکان بەرز دەکاتەوە.

ئێمە بە هێزی ئاسمانی یەك بەرەو نیویۆرك فڕین و بە کۆپتەر چووینە گۆڕەپانێکی نزیك ستادیۆمی بەیسبۆڵەکە. من چوومە ناو قەفەسی ڕاهێنانی بەیسبۆڵ بۆ شلکردنەوەی قۆڵم. کارمەندێکی دەزگای نهێنی درعێکی دژە فیشەکی بە سنگمدا کرد. پاش ڕاهێنانی لێدانی چەند تۆپێك، یاریزانی گەورەی یانکی، دێرێك جیتەر هاتە لام بۆ پشودان. کەمێك بە یەکەوە قسەمان کرد. پاشان پرسیاری کرد "هێی سەرۆك، تۆ بە نیازی تۆپەکە لەسەر گردەکە یان لە بەردەمییەوە لێ بدەی؟"

پرسیارم لەوە کرد کە ڕەئی چییە. ئەو وتی "لە گردۆڵکەکەوە لێیدە. ئەگەرنا هوهات بۆ دەکەن". من بەوە ڕازی بووم. لە ڕێگەیدا بەرەو دەرەوە، لە شانییەوە ئاوڕێکی دایەوە و وتی "بەڵام با هەڵنەبەزێتەوە ئەگینا هوهات بۆ دەکەن".

پاش نۆ مانگ لە سەرۆکایەتی، ڕاهاتبووم لەسەر ناساندنم بە جەماوەر. بەڵام قەت هەستێکی وەکو ئەو کاتەم بۆ دروست نەبوو کە بۆب شێپارد، ڕاگەیەنەری وتار گشتیی ناسراوی یانکییەکان وتی "تکایە بەخێرهاتنی سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکان بکەن". من بەسەر گردۆڵکەکەدا سەرکەوتم و سڵاوێکم کرد و پەنجەیەکی (ئۆکەی)یم پیشاندا و چوومە بەرانبەر (تۆد گرین). پێدەچوو زۆر لە شەست پێ دوورتر بێ. گرتینم لە

خڕبوونەوەدا بوو. تۆپەکە هەستێکی وەکو هاویشتنی قورسایی ئەبەخشی. تۆپەکەم هاویشت و لێیگەڕام بفڕێت.

ژاوەژاوەی ناو ستادیۆمەکە وەکو تەقینەوەیەک وابوو "یو ئێس ئەی، یو ئێس ئەی، یو ئێس ئەی!" من خەیاڵم ڕۆیشتەوە لای ئەو کرێکارانەی کە لە شوێنەواری تاوەرەکان نیشیان دەکرد. تەوقەم لەگەڵ تۆد گرین کردن وێنەیەکم لەگەڵ بەڕێوەبەرەکان (جۆ تێر)ی یانکییەکان و (بۆب برێنلی)ی ئەریزۆنا دایامۆندباکس، گرت و ڕێگەم بەرەو لای خاوەنی تیمەکە (جۆرج ستاینبرێنەر) گرتەبەر. من پێناسی تۆپ هەڵدەرێکی هێمن بووم. دڵم خۆش بوو کە لۆرا و باربارای کچم بینی. ئەو باوەشێکی گەورەی لێدام و وتی "باوکە تۆپ لێدانەکەت وەکو بروسک بوو!"

درەنگانی ئەو شەوە گەڕاینەوە بۆ واشنتن و چاوەڕوانی ڕۆژی دواترمان کرد. ٣١ی ئۆکتۆبەر بەبێ هیچ هێرشێک تێپەڕی.

***

دانانی وڵات لە پێگەی جەنگدا پێویستی بە زیاتر لەوە هەبوو کە بەرگرییە فیزیکییەکانمان توندوتۆڵ بکەین. ئێمە پێویستمان بە ئامرازی یاسایی، دارایی و هەواڵگری باشتر هەبوو بۆ دۆزینەوەی تیرۆریستان و وەستاندنیان بەر لەوەی زۆر درەنگ ببێت.

یەکێك لە کەلێنە گەورەکانمان لە تواناکانمان بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی تیرۆر ئەوە بوو کە زۆرێك پێیان دەگوت "دیوارەکە". پێ بەپێی تێپەڕبوونی کات، حکومەت ڕستێك ڕێوشوێنێکی گرتبووە بەر کە ڕێگر بوون لەوەی کارمەندانی سەپاندنی یاسا و هەواڵگری، زانیاریی سەرەکی ئاڵوگۆڕ بکەن.

"من بە ماوەیەکی کورت دوای هێرشەکان، لە کۆبوونەوەیەکدا وتم "چۆن دەتوانین هاوڵاتییانمان دڵنیا بکەینەوە لەوەی کە ئێمە پارێزگارییان لێ دەکەین ئەگەر خەڵکی خۆمان تەنانەت نەتوانن لەگەڵ یەکتریدا بدوێن؟ دەبێ کێشەکە چارەسەر بکەین".

داواکاری گشتی (جۆن ئاشکرۆفت) ڕێبەرایەتی کرد لە نووسینی پرۆپۆزەڵێکی یاسایی. ئەنجامەکەشی بریتی بوو لە (یاسای نیشتمانپەروەری ئەمریکا). پرۆژەیاساکە دیوارەکەی

ئایرد و ڕێگەیدا بە کارمەندانی سەپاندنی یاسا و هەواڵگری کە زانیاریی ئاڵوگۆڕ بکەن. ئێمە توانا دژەتیرۆرەکانی ئێمەی مۆدێرنیزە کرد لە ڕێگەی بەخشینی ڕێڕەو بە لێکۆڵەران بۆ ئامرازەکانی وەکو گوێهەڵخستن لە هێڵەکانی پەیوەندیکردن، کە ڕێگەی بۆ خۆشکردن شوێنپێی ئەو گومانلێکراوانە هەڵبگرن کە ژمارەی مۆبایلەکانیان دەگۆڕی- توانایەک کە ماوەیەکی زۆر بوو بەکاردەهێنرا بۆ گرتنی بازرگانانی ماددەی هۆشبەر و سەرۆکی باندە قاچاغەکان. ئەمە ڕێخۆشکەر بوو بۆ ڕێوشوێنی دارایی توند بۆ بلۆککردنی موڵک و ماڵی تیرۆریستان. هەروەها ئەمە سەرپەرشتیی دادوەری و کۆنگرێسی گرتەخۆ بۆ پاراستنی ئازادییە مەدەنییەکان.

ئەم ڕێوشوێنەی ئێمە، لەناوخۆدا کەمێک نائاسودەیی هێنایەکایەوە. یاسای نیشتمانپەروەر، ڕێگەیدا بە حکومەت تا سۆراخی پاساوی یاسایی بکات بۆ پشکنینی تۆماری بازرگانیی تیرۆریستە گومانلێکراوەکان، وەکو پسوڵەی کرێدیت کارت، گرێبەستی بەکرێگرتنی شوقە و تۆمارەکانی کتێبخانە. وەکو کارمەندێکی پێشووی کتێبخانە، لۆرا حەزی بەو بیرۆکەیە نەدەهات کە کارمەندانی فیدراڵ لەناو کتێبخانەکاندا بێن و بچن. منیش هەروا. بەڵام کۆڕی هەواڵگری خەمێکی گەورەی هەبوو لەوەی کە تیرۆریستان کۆمپیوتەرەکانی کتێبخانەکان بە مەبەستی پەیوەندیکردن بەکاربێنن. تۆمارەکانی کتێبخانە ڕۆڵی گێڕا لە ژمارەیەک کەیسی گەورە، وەکو کوشتارەکانی چەکداری (زۆدایک) لە کالیفۆرنیا. دوایین شت کە دەمویست، ڕێگەدان بوو بە سەربەستی و دەستگەیشتن بە زانیاریی دابینکراو لەلایەن کتێبخانەکانی ئەمریکا بۆئەوەی لەدژی قاعیدە بەکاربهێنرێن.

یاسا دانەران درکیان بە ناهەمواریی هەڕەشەکە کرد و یاسای نیشتمانپەروەریان بە ٩٨ بەرانبەر ١ لە ئەنجومەنی پیران و ٣٥٧ بەرانبەر ٦٦ لە ئەنجومەنی نوێنەران پەسەند کرد. من لە ٢٦ی ئۆکتۆبەری ٢٠٠١دا یاساکەم واژۆ کرد. سیناتۆری دیموکراتی (پاتریک لیهی)ی خەڵکی ڤێرمۆنت وتی " ئێمە کاتمان وەرگرت بۆ ڕوانین لێی، کاتمان وەرگرت بۆ خوێندنەوەی و کاتمان وەرگرت بۆ لابردنی ئەو بەشانەی کە نادەستووری بوون و ئەو بەشانەش کە بە ڕاستی کاریگەریان دەخستەسەر ئازادییەکانی هەموو ئەمریکییەکان".

هاوکارە دیموکراتەکەی، سیناتۆر (چوک شومەر)ی نییویۆرک، وتی "ئەگەر تەنیا یەک

وشەی سەرەکی هەبێ کە جەخت لەم پرۆژە یاسایە بکاتەوە، ئەوا بریتییە لە بالانس. لە کۆمەڵگەی نوێی پشا ١١ی سێپتێمبەردا کە ئێمە ڕووبەڕووی دەبینەوە، بالانس وشەیەکی سەرەکییە...بالانس و ئەقڵ زاڵ بوون".

لە ماوەی پێنج ساڵی دواتردا، یاسای نیشتمانپەروەر یارمەتی داین تا گەلێک خانەی تیرۆری شیمانەیی لە نیویۆرک، ئۆریگۆن، ڤێرجینیا و فلۆریدا تێکبشکێنین. لە یەکێک لەی نموونەکاندا، دەسەڵاتەکان سەپاندنی یاسا و هەواڵگری ئاڵوگۆڕی ئەو زانیارییەیان کرد کە بووەهۆی دەستگیرکردنی شەش ئەمریکیی یەمەنی لە (لاکاوانا)ی نیویۆرک کە بۆ کامپێکی مەشقی تیرۆریستی لە ئەفغانستان سەفەریان کردبوو و چاویان بە ئوسامە بن لادن کەوتبوو. پێنجیان تاوانبار دەرچوون لەبەرانبەر دابینکردنی پشتگیریی ماددی بۆ ئەلقاعیدە. ئەویتریان دانی نا بە سەفەقاتی نایاسایی لەگەڵ قاعیدەدا.

هەندێ کەس بانگەشەی ئەوەیان کرد کە ئەو شەش کەسەی (لاکاوانا) و ئەوانیتر کە دەستگیرمان کردبوون کەمێک لە "فریودراوی ئەقڵ بەرتەسک" زیاترن بە پیلانی خەیاڵییەوە کە "نیازی بەجێگەیاندنی کردەوەی تیرۆریستییان نەبووە". من هەمیشە لەوە ڕاماوم کە چۆن سەرزەنشتکەران دەتوانن ئەوەندە دڵنیا بن. دواجار، لە ئۆگەستی ٢٠٠١دا، بیرۆکەی ئەمەی کە تیرۆریستانی فەرمانپێکراو لە ئەشکەوتەکانی ئەفغانستانەوە بە فڕۆکەی بازرگانیی ئەمریکی هێرش دەکەنەسەر سەنتەری بازرگانیی و پێنتاگۆن، تەواو بڕوانەکراو دیار بوو. بەلای منەوە، وانەی ١١ی سێپتێمبەر سادە بوو: سەرکێشی مەکە.

کاتێک شارەزایانی سەپاندنی یاسا و هەواڵگریمان خەڵکانێکی پەیوەندیدار بە تۆڕە تیرۆریستییەکانیان دۆزییەوە، من زیاتر ڕەخنەم لێدەگیرا لە بەرانبەر زوو دەستبەسەر کردنیان لەبری چاوەڕوانبوون تا ئەو کاتەی ئیتر درەنگ بووە.

هەرکە تازەیی ١١ی سێپتێمبەر نەما، بەهەمان شێوە پشتگیریی گەورەی کۆنگرێسیش لە یاسای نیشتمانپەروەر. لایەنگیرانی ئازادییە مەدەنییەکان و وتارنووسان لە هەردوو حزبەکەوە یاساکەیان وەکو جێگرەوەی هەموو شتێک کە ڕقیان لێیە لە جەنگ دژی تیرۆر، بە خراپ وەسف کرد. بڕگە سەرەکییەکانی یاسای نیشتمانپەروەر، وەکو

مۆڵەت بۆ گوێهەڵخستن لە هێڵەکانی پەیوەندیکردن، لە ساڵی ٢٠٠٥دا ئێکسپایەر دەبوون. من جەختم کردەوە لە مۆڵەتدانەوەی. هەروەکو بە کۆنگرێسم وت، هەڕەشەکە ئێکسپایەر نەبووە، بۆیە نابێ یاساکەش ئێکسپایەر بێت.

یاسادانەران، ئیشەکەیان دوادەخست و سکاڵایان دەکرد. بەڵام کاتێک دواجار دەنگیاندا، بە ڕێژەی ٨٩ بەرانبەر ١٠ لە ئەنجومەنی پیران و ٢٥١ بەرانبەر ١٧٤ بە نوێکردنەوەیدا. لە سەرەتاکانی ٢٠١٠دا، برگە سەرەکییەکانی یاسای نیشتمانپەروەر جارێکی تر لەلایەن کۆنگرێس زۆرینە دیموکرات، مۆڵەتیان پێدرایەوە.

یەک پەشیمانیم لەمەڕ یاسای نیشتمانپەروەر، ناوەکەیەتی. کاتێک ئیدارەکەم پرۆژەیاساکەی نارده کۆنگرێس، لە سەرەتادا بە یاسای دژەتیرۆری ٢٠٠١ ناسرابوو. کۆنگرێس زیرەکی نواند و ناوەکەی گۆڕی. سەرەنجام، دەلالەتێک هەبوو لەوەی کە ئەو خەڵکەی دژی یاساکە بوون، نیشتمانپەروەر نین. من مەبەستم ئەوە نەبوو. دەبووایە فشار بۆ کۆنگرێس بێنم تا بەر لەوەی پرۆژەیاساکە واژۆ بکەم، ناوەکە بگۆڕێ.

***

وەکو بەشێک لە لێکۆڵینەوەی ١١ی سێپتێمبەر، ئێمە بۆمان دەرکەوت کە دوو لەو فرۆکەرفێنانەی گریان بەردایە ئەمریکا، (خالد ئەلمیحزار) و (نەواف الحازمی)، بەر لە هێرشەکە دە دوانزە جار پەیوەندییان بە ڕێبەرانی ئەلقاعیدەوە لە دەرەوە کردووە. پرسیاری کتوپڕم ئەوە بوو کە: بۆچی گوێمان بۆ پەیوەندییە تەلەفۆنییەکە هەڵنەخستووە؟ ئەگەر گوێمان لێ بووایە میحزار و حازمی چی دەڵێن، ئەوا لەوانەیە هێرشەکانی ١١ی سێپتێمبەرمان بوەستاندایە.

پیاوی ئەو وەڵامانە (مایک هایدن) بوو، ژەنەراڵی سێ ئەستێرەی هێزی ئاسمانی کە ڕێبەرایەتیی ئاژانسی ئاسایشی نیشتمانی دەکرد. ئەگەر کۆڕی هەوالگری، مێشکی ئاسایشی نیشتمانی بێت، ئەوا ئاژانسی ئاسایشی نیشتمانی بەشێکە لە زیرەکی مرۆیی. ئاژانسەکە پڕە لە کۆدشکێن و شارەزایانی تەکنۆلۆژیی زیرەک شانبەشانی ڕاڤەکاران و زمانەوانان. مایک پێی وتم ئاژانسەکە توانای چاودێریکردنی پەیوەندییە تەلەفۆنییەکانی قاعیدەی پێش یانزەی سێپتێمبەری هەبووە بۆ ناو ئەمریکا. بەڵام دەسەڵاتی یاسایی

نەبووە بۆ کردنی ئەمە بەبێ وەرگرتنی فرمانی دادگا، پرۆسەیەک کە دەشێ قورس و خاو بێت.

هۆکارەکە، یاسایەک بوو بەناوی یاسای (چاودێریی هەوالگریی بیانی). ئەم یاسایە کە لە ساڵی ۱۹۷۸دا نووسراوە، پێش بڵاوبوونەوەی بەکارهێنانی مۆبایل و ئینتەرنێت، رێگر بووە لە ئاژانسی ئاسایشی نیشتمانی لەوەی کە چاودێریی اتصالاتی پەیوەندیدار بە خەڵک بکات لەناو ئەمریکادا بەبێ یادداشتێکی یاسایی لە دادگای یاسای چاودێریی هەوالگریی بیانی. بۆ نموونە، ئەگەر تیرۆریستێك لە ئەفغانستان، پەیوەندی بکردایە بە تیرۆریستێك لە پاکستان، ئاژانسی ئاسایشی نیشتمانی دەیتووانی گوێ بۆ وتوێژەکەیان هەڵبخات. بەڵام ئەگەر هەمان تیرۆریست پەیوەندی بە یەکێکەوە بکردایە لە ناو ئەمریکا یان ئیمەیڵێکی بناردایە و بە سێرڤەری کۆمپیوتەرێکی ئەمریکیدا رەت ببووایە، دەبووایە ئاژانسەکە تەقدیمی فرمانێکی دادگا بکات.

ئەمە بێ مانا بوو. بۆچی دەبێ چاودێریکردنی اتصالاتی ئەلقاعیدە بە تیرۆریستانەوە لەناو ئەمریکادا سەختتر بێ لە پەیوەندیکردنەکانیان لە دەرەوە؟ هەروەکو مایك هایدن وتی، ئێمە "کوێرانە بەناو دەکەوتین بەبێ سیستەمێکی ئاگادارکەرەوەی پێشینە".

پاش ۱۱ی سێپتێمبەر، ئێمە نەمانتووانی کوێرانە بەناو بکەوین. ئەگەر بکەرانی قاعیدە تەلەفۆنیان بۆ ناوەوە یان دەرەوەی ئەمریکا بکردایە، ئەوا بە دڵنیاییەوە پێویستمان بەوە بوو کە بزانین تەلەفۆن بۆ کێ دەکەن و چی دەڵێن. بە لەبەرچاوگرتنی ناکاویی هەڕەشەکانیش، نەماندەتووانی رێگە بە خۆمان بدەین تا لە پرۆسەی قبوڵی دادگادا گیر بخۆین. داوام لە ئۆفیسی راوێژکاری یاسایی کۆشکی سپی و وەزارەتی داد کرد تا توێژینەوە لەوەدا بکەن ئاخۆ دەتوانم مۆڵەت بە ئاژانسی ئاسایشی نیشتمانی بدەم بۆ چاودێریکردنی اتصالاتی قاعیدە بۆ ناوەوە و دەرەوەی وڵات بەبێ یادداشتی یاسای (چاودێریی هەوالگریی بیانی). هەردوولا پێیان وتم دەتوانم. ئەوان گەیشتنە ئەو ئەنجامەی کە ئەنجامدانی چاودێری لەدژی دوژمنانمان لە جەنگدا، دەکەوێتە چوارچێوەی ئەو دەسەڵاتانەی لەلایەن بڕیاری جەنگی کۆنگرێسەوە و دەسەڵاتی فەرماندەی گشتی بە سەرۆک دراوە. ئەبراهام لینکۆڵن لە جەنگی ناوخۆدا رێگەی بە چاودێری ماشێنەکانی

تەلیگرام دابوو. ودرۆ ویلسن لە ماوەی یەکەم جەنگی جیهانیدا فرمانی کردبوو بە گوێهەڵخستن بۆ نزیکەی هەموو پەیامێکی تەلەفۆنی و تەلەگراف کە دێنە ناو ئەمریکا و لێیەوە دەڕوات. فرانکلین رۆزڤێلت رێگەی بە سوپا دابوو تا اتصالات بخوێنێتەوە و سانسۆر بکات لەماوەی دووەم جەنگی جیهانیدا.

پێش ئەوەی من پرۆگرامی چاودێریی تیرۆریست پەسەند بکەم، ویستم دڵنیابمەوە لەوەی کە رێگە لەخراپ بەکاربردن بگرم. ئارەزووی ئەوەم نەبوو کە ئاژانسی ئاسایشی نیشتمانی بکەمە تۆتالیتارەکەی ناو رۆمانەکانی جۆرج ئۆروێل. دەمزانی کە برایانی کەنەدی لەگەڵ جەی ئەدکار هوڤەر ببوون بەیەک بۆئەوەی بەشێوەیەکی ناپاسایی گوێ لە وتوێژەکانی خەڵکانی بێ تاوان بگرن، لەوانەش مارتین لوتەر کینگ جونیەر، سەرۆک لیندن جۆنسن درێژەی بەو کردارە دابوو. پێم وابوو ئەمە لاپەڕەیەکی خەمناک بوو لە مێژووماندا و من نیازم نەبوو دووبارەی بکەمەوە.

لە بەرەبەیانی ٤ی ئۆکتۆبەری ٢٠٠١دا، مایک هایدن و تیمە یاساییەکە هاتنە ئۆفیسی ئۆڤاڵ. ئەوان دڵنیایان کردمەوە کە پرۆگرامی چاودێریی تیرۆریست بە وریاییەوە دیزاین کراوە بۆ پارێزگاری کردن لە ئازادییە مەدەنییەکانی خەڵکی بێ گوناه. ئامانجی پرۆگرامەکە، چاودێریکردنی ئەو ژمارە بەناو پیسانە بوون کە شارەزایانی هەواڵگری پاساویان هەبوو بۆئەوەی بڕوایان وابێت هی بکەرانی قاعیدەن. زۆرێکیان لەناو مۆبایلەکان و کۆمپیوتەرەکانی ئەو تیرۆریستانەدا دۆزرابوونەوە کە لە شەڕگەدا گیرابوون. ئەگەر ئێمە بەشێوەی رێکەوت هەر بەشێکی اتصالاتی خۆجێیی بێگەردمان چاودێری بکردایە، پێشێلکردنەکە دەگەیەنرایە وەزارەتی داد بۆ لێکۆڵینەوە. بۆ دڵنیابوون لەوەی کە پرۆگرامەکە تەنیا بایی پێویست بەکاردەهێنرێ، دەبووایە ناوبەناو هەڵبسەنگێنرایەتەوە و پەسەند بکرایەتەوە.

من فرمانمدا تا پرۆگرامەکە بەردەوام بێ. ئێمە چوون بۆ کۆنگرێسمان لەبەرچاو گرت بۆ بەدەستهێنانی بە یاساکە، بەڵام ئەندامانی سەرەکیی هەردوو حزبەکە کە لێدوانی تەواو نهێنییان لەبارەی پرۆگرامەکەوە پێگەیشتبوو رازی بوون لەسەر ئەوەی کە

چاودێریکردنەکە پێویستە و مشتومڕی یاسادانان شیاو نییە بەبێ پیشاندانی شێوازەکانمان بە دوژمن.

دەمزانی کە پرۆگرامی چاودێریی تیرۆریست ڕۆژێك لە ڕۆژان تەقەی تێدەکەوێ. لەگەڵ ئەوەشدا بڕوام وابوو کە پێویستە. پاشەواری سەنتەری بازرگانی جیهانی هێشتا دوکەڵی لێهەڵدەستا. هەر بەیانییەك من ڕاپۆرتی هەواڵگریم پێ دەگەیشت لەبارەی هێرشێکی ئەگەریی تر. چاودێریکردنی اتصالاتی تیرۆریست بۆ ناو ئەمریکا زۆر گرنگ بوو بۆ هێشتنەوەی خەڵکی ئەمریکا بە سەلامەتی.

***

لە ٢٢ی دیسەمبەردا، ڕێبوارێکی بریتانی بەناوی (ریچارد رەید) هەوڵیدا فڕۆکەیەکی هێڵی ئاسمانی ئەمریکی کە ١٩٧ سەرنشینی لە پاریسەوە بۆ میامی هەڵگرتبوو بتەقێنێتەوە، بە تەقاندنەوەی تەقەمەنی لەناو پێڵاوەکانیدا. خۆشبەختانە، سەرنشینێکی بەئاگا ڕەفتارە گوماناوییەکەی بەدی کردبوو و سەرنشینەکان دابوویان بە ئەرزا بەر لەوەی کار لەکار بترازێت. فڕۆکەکە بە ئاراستەی بۆستن سوڕێنرابووەوە کە لەوێ ڕەید کەلەپچە کرابوو. ئەو دواتر بە پرسیارکەرانی وتبوو کە ئامانجەکەی ئەوە بووە ئابووریی ئەمریکا بە هێرشێك لە ماوەی وەرزی پشوودا پەکبخات. ئەو بە چوار چالاکی تیرۆریستی، بە تاوانبار لەقەڵەمدرا و بووەهۆی ئەوەی حوکمی تاهەتایی لە زیندانی فیدراڵیدا لە فلۆریدا، کۆلۆرادۆ بەسەر ببات.

هێرشە پوچەڵکراوەکە کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر من هەبوو. سێ مانگ پاش ١١ی سێپتێمبەر، بیرهێنەرەوەیەکی زیندوو بوو لەمەڕ ئەوەی کە هێرشەکان بەشێوەیەکی تۆقێنەرانە واقیعی بوون. کارمەندانی شاشەی فڕۆکەخانە دەستیان کرد بو داواکردنی دانانی پێڵاوی گەشتیاران لە خاڵەکانی پشکنیندا. من دەمزانی کە ئەگونجاوییەك دەهێنینەکایەوە، بەڵام هەستم کرد کە لە شوێنی خۆیدایە بۆ بەرگرتن لە هێرشێکی دووبارەبووەوە. دەمزانی بەرنامەکەم بە تەواوی جێبەجێ بووە کاتێك دەبووایە دایکی هەشتاودوو ساڵەی لۆرا پێڵاوەکانی دابکەنێت بەر لە گەشتە ئاسمانییەکەی کریسمەسی

له میدالاندەوە بۆ واشنتن. بەدڵنیاییەوە ئومێدەوار بووم کە لەو نزیکانە نەبم کاتێک داوا لە دایکم دەکەن هەمان شت بکات.

کارەساتە نزیکەکەی سەر ئەتلانتیک، ڕۆشنایی خستەسەر کەلێنێکی بەرفراوانتر لە بۆچوونمان لەمەڕ جەنگ دژی تیرۆر. کاتێک ریچارد ڕەید دەستگیر کرا، دەستبەجێ ڕادەستی سیستەمی دادپەروەری کرا کە وەکو تاوانبارێکی ئاسایی هەمان پارێزگاریی دەستووری پێبەخشی. بەڵام کابرای تەقێنەرەوەی پێلاو تالانچییەک یان بانکبڕێک نەبوو بەڵکو سەربازێکی پیادە بوو لە جەنگ دژی ئەمریکای ئەلقاعیدە. ئەو دوو ڕۆژ پێش هێرشە هەوڵ بۆ دراوەکە ئیمەیڵی بۆ دایکی ناردبوو: "ئەوەی کە من دەیکەم بەشێکە لە جەنگی بەردەوامی نێوان ئیسلام و بێباوەڕی". بە بەخشینی ماف بێدەنگ مانەوە بەم تیرۆریستە، ئێمە دەرفەتی کۆکردنەوەی هەواڵگریی گرنگمان لەدەستدا لەمەڕ پلانەکەی و یارمەتیدەرانی. کەیسی ڕەید ڕوونی کردەوە کە ئێمە پێویستمان بە بەرنامەیەکی نوێ هەیە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ تیرۆریستە گیراوەکاندا. لەم جۆرە نوێیەی جەنگدا، هیچ سەرچاوەیەکی هەواڵگری بۆ هێرشە ئەگەرییەکان نییە کە لە خودی تیرۆریستەکان بەهادارتر بێت. لە نێوەندی تەوژمی بەردەوامی هێرشەکان لە پاش ١١ی سێپتێمبەردا، دەستم بە سێ بڕیاری هەرە گرنگەوە گرت کە دەبوایە لە جەنگی دژەتیرۆردا بیاندەم: شەڕکەرانی دەستگیرکراوی دوژمن بخەمە کوێوە، چۆن دۆخی یاساییان دیاری بکرێت و جەخت بکرێتەوە لەوەی کە دواجار ڕووبەڕووی دادپەروەری دەبنەوە، و ئەمەی کە چۆن بزانین ئاخۆ لەبارەی هێرشەکانی ئایندەوە شت دەزانن بۆئەوەی ئێمە بتوانین پارێزگاری لە گەلی ئەمریکا بکەین.

لە سەرەتادا، زۆربەی شەڕکەرانی دەستگیرکراوی قاعیدە لە زیندانەکانی شەڕگەکان لە ئەفغانستان دەهێڵرانەوە بۆ لێکۆڵینەوە لەگەڵ کردن. لە مانگی نۆڤەمبەردا، ئەفسەرانی سی.ئای.ئەی چوون بۆ لێکۆڵینەوەکردن لەگەڵ ئەو زیندانییانەی تالیبان و قاعیدە کە لە قەڵایەکی ئەفغانیی سەدەی نۆزدە دەستبەسەر کرابوون بەناوی (قلعه جەنگی). پشێوی بەدوادا هات. بە بەکارهێنانی ئەو چەکانەی بۆ کۆمەڵە بینایەکە دزەیان پێکرابوو،

شەڕکەرانی دوژمن یەکێك لە ئەفسەرانیان بەناوی جۆنی "مایك" سپان کوشت، ئەمەش بووە یەکەم مەرگی سەربازی ئەمریکی لە جەنگەکەدا.

تراژیدیاکە ڕۆشنایی خستەسەر پێویستیی بۆ بەشێکی ئارام بۆ تێدا هێشتنەوەی تیرۆریستە گیراوەکان. بژارەیەکی کەم هەبوون، هیچیشیان بە شێوەیەکی دیاریکراو سەرنجراکێش نەبوون. بۆ ماوەیەك، ئێمە دەستبەسەرکراوانی قاعیدەمان لەناو کەشتییەکانی هێزی دەریاییدا دەهێشتەوە لە دەریای عەرەبیدا. بەڵام ئەمە چارەسەرێکی دوورمەودای کرداری نەبوو. شیمانەیەکی تر بریتی بوو لە ڕەوانەکردنی تیرۆریستان بۆ بنکەیەکی ئارام لە دوورگەیەکی دووری خاکی ئەمریکا، وەکو (گوام). بەڵام دەشێ هێشتنەوەی تیرۆریستانی دەستبەسەرکراو لەسەر خاکی ئەمریکا، ئەو پارێزگارییە دەستوورییانە چالاك بکات کە بە پێچەوانەوە بەدەستی ناهێنن، وەکو مافی بێدەنگ مانەوە. ئەمەش بەدەستهێنانی دەستوبردی هەواڵگریی پێویست زۆر ئەستەمتر دەکات.

ئێمە بڕیارماندا دەستبەسەرکراوان لە بنکەیەکی هێزی دەریاوانیی لاتەریك لە ڕووبەرێکی باشووری کوبا بەناوی (کەنداوی گوانتانامۆ) بهێڵینەوە. بنکەکە لەسەر خاکی کوبا بوو، بەڵام ئەمریکا بەپێی ڕێککەوتنێکی یاسایی کە پاش جەنگی ئیسپانی-ئەمریکی ئەنجامیدابوو، کۆنترۆڵی کردبوو. وەزارەتی داد ئامۆژگاری ئەوەی کردم کە ئەو زیندانییانەی دەبرێنە ئەوێ، مافی ئەوەیان نییە هانا ببەنەبەر سیستەمی دادپەروەریی تاوان لە ئەمریکا. ئەو ڕووبەرەی دەورەی گوانتانامۆ دەدات دوورەدەستە و دانیشتووانی دەگمەنە. هێشتنەوەی تیرۆریستان لە کوبای فیدل کاسترۆ دا بە زەحمەت ئاسۆیەکی سەرنجراکێشی هەبوو. بەڵام هەروەکو دۆن ڕەمسفێلد وتی گوانتانامۆ "خراپترین بژارەیە، بەڵام تاکە بژارەیەکە کە هەیە". لە گوانتانامۆ، دەستبەسەرکراوان، پەناگەی خاوێن و سەلامەت، سێ ژەم لە ڕۆژێکدا، کۆپییەکی کەسیی قورئان، دەرفەتی نوێژکردنی پێنج جار لە ڕۆژێکدا پێدەدرا و هەمان ئەو چاودێرییە تەندروستییەی پاسەوانەکانیشیان وەردەگرت. ئەوان بواری وەرزش و کتێبخانەیەکی پڕ لە کتێب و دی ڤی دییان هەبوو. یەکێك لە کەرەستە هەرە باوەکان، وەرگێڕانێکی عەرەبیی (هاری پۆتەر) بوو.

لە ماوەی چەند ساڵێکدا، ئێمە ئەندامانی کۆنگرێس، ڕۆژنامەنووسان و چاودێرانی نێودەوڵەتیمان بانگهێشت دەکرد تا سەردانی گوانتانامۆ بکەن و هەلومەرجەکە بە چاوی خۆیان ببینن. زۆر کەس سەریان دەسوڕما لەوەی کە دەیانبینی. کاربەدەستێکی بەلجیکی پێنج جار گوانتانامۆی پشکنی و بە "زیندانێکی نموونەیی" ناوی برد کە چارەسەری باشتر لە زیندانییە بەلجیکییەکان دەداتە دەستبەسەرکراوان. ئەو وتی "من هەرگیز کردەوەی توندوتیژی یان شتێك کە شۆکی کردبم لە گوانتانامۆ بەدی نەکردووە. نابێ کەس ئەم سەنتەرە بە ئەبوغرێب بشوبهێنێت".

لەکاتێکدا کە چارەسەری مرۆییمان بۆ زیندانییانی گوانتانامۆ بەپێی پەیماننامەکانی جنێڤ بوو، ئەقاعیدە وەکو مەسەلەیەکی یاسیی، بڕگەکانی پەیماننامەی جنێڤی پیادە نەدەکرد. ئامانجی جنێڤ دابینکردنی ئەنگێزە بوو بۆ دەوڵەت-نەتەوەکان بۆئەوەی شەڕکردن لە جەنگەکان بەپێی ڕستێك ڕێسای ڕێککەوتن لەسەر کراو کە ژیانی بێ گوناهانە و شکۆی مرۆڤ دەپارێزێ- و سزادانی ئەو جەنگاوەرانەی ئەوە ناکەن. بەڵام تیرۆریستان ڕێزی دەوڵەت-نەتەوەیان نەدەگرت. ئەوان پەیماننامەکانی جنێڤیان واژۆ نەکردبوو. تەواوی دۆخی ئۆپەراسیۆنەکەیان-بە ئاگایانە کوشتنی بێ گوناهێك- ناکۆك بوو لەگەڵ پرەنسیپەکانی جنێڤدا. وە ئەگەر قاعیدە ئەمریکییەکی بگرتایە، ئەوا چانسێکی کەم هەبوو کە بە شێوەیەکی مرۆییانە مامەڵەی لەگەڵدا بکەن.

ئەمەش بە ڕوونییەکی بێ چەندوچونەوە لە دوادواکانی ٢٠٠٢دا جەختی لێکرایەوە کاتێك تیرۆریستان لە پاکستان ریپۆرتەری (وۆڵ ستریت جۆرناڵ) (دانێل پێرل)یان ڕفاند. ئەوان بانگەشەی ئەوەیان کرد کە ئەو سیخوڕی سی.ئای.ئەیە و هەوڵیاندا بە بارمتەگرتنی، ئەمریکا بهێننە ناو دانوستانی ئازادکردنیەوە. ئەمریکا بەرنامەیەکی لەمێژینەی دانوستان نەکردن لەگەڵ تیرۆریستانی هەبوو و منیش بەردەوام بووم لەسەری. دەمزانی ئەگەر یەك داواکانی یەك تیرۆریست قبوڵ بکەم، ئەمە تەنیا هانی ڕفاندنی زیاتر دەدات. دام و دەزگای سوپا و هەواڵگریمان بە پەلە بەدوای (پێرل)دا دەگەڕان، بەڵام نەیانتوانی لە کاتی خۆیدا شتێ بکەن بە شتێ. لە دوایین

چرکەساتەکانیدا، دانی پێرل وتبووی "باوکم جولەکەیە، دایکم جولەکەیە، منیش جولەکەم". پاشان دەستگیرکەرانی قاعیدەی ملیان پەڕاندبوو.

هەر کە بڕیارم لەسەر پارێزگاریی جنێڤ دا، بەهەمان شێوە بڕیارمدا سیستەمێکی یاسایی دروست بکەم بۆ دەستنیشانکردنی تاوانباریی و بەرائەتی زیندانییەکان. جۆرج واشنتن، ئەبراهام لینکۆڵن، ویلیام مکینلی و فرانکلین روزڤێلت لە سەردەمی جەنگدا رووبەڕووی هەمان ئەو تەنگژە ببوونەوە کە چۆن سەربازانی دەستبەسەرکراوی دوژمن بدەنە دادگا. هەموویان گەیشتبوونە هەمان ئەنجامگیری: دادگایەکی بەڕێوەبراو لەلایەن سوپاوە.

لە ١٣ی نۆڤەمبەری ٢٠٠١دا، فرمانێکی تەنفیزیم واژۆ کرد بۆ دامەزراندنی دادگا سەربازییەکان بۆ دادگاییکردنی تیرۆریستە دەستگیرکراوەکان. سیستەمەکە تەقریبەن لەسەر ئەوەیان بونیاد نرابوو کە لە ساڵی ١٩٤٢ فرانکلین روزڤێلت دروستی کردبوو کە هەشت سیخوڕی نازی دادگایی کردبوو کە دزەیان کردبووە ناو ئەمریکا. دادگای باڵا بە کۆی دەنگ پاڵپشتیی یاسایی ئەو دادگایانەی کردبوو.

من دڵنیا بووم لەوەی کە دادگا سەربازییەکان دادگاییەکەی دادپەروەرانە دابین دەکەن. زیندانییەکان مافی گریمانەی بەرائەت، نواندنیان لەلایەن پارێزەرێکی لێهاتوو و مافی خستنەرووی بەڵگەیان هەبوو (بەڵگەیەک کە بەهای ئەزموونی هەبێت لە کەسێکە معقولەوە). لەبەر هۆکاری کرداریی ئاسایشی نیشتمانیی، ئەوان رێگەیان پێ نەدەدرا تا ئەو زانیارییە نهێنییە ببینن کە میتۆد و سەرچاوە هەواڵگرییەکانی ئاشکرا دەکرد. قایلکردنی بەرگریکارێك پێویستی بە رازیبوونی دوو لەسەر سێی دادگا هەبوو. زیندانی دەیتوانی تانە لە بڕیاری دادگا بدات یان بیگەیەنێتە وەزارەتی بەرگری و سەرۆك.

شتێك کە مۆرکی بڕیاری پەیوەست بە دادگاکانم- و زۆر بڕیاری تر بوو لە جەنگە نوێکەدا- تەنگژەی نێوان پاراستنی گەلی ئەمریکا و پاڵپشتی ئازادییە مەدەنییەکان بوو. بەرزڕاگرتنی بەهاکانمان زۆر گرنگ بوو بۆ پێگەمان لە جیهاندا. ئێمە نە دەمانتوانی رێبەرایەتیی جیهانی ئازاد بکەین نە هاوپەیمانانی نوێ ئامادە بکەین بۆ قەزیەکەمان ئەگەر ئەوە وتارمان لەسەر دەدا پیادەمان نەکردایە. بڕوام وابوو کە دادگا سەربازییەکان

بالانسی راست و دروستیان راگرتبوو، پالپشتی حوکمی یاسان دەکرد لەکاتێکدا کە
ولاتیان دەپاراست.

***

لە ٢٨ی مارسی ٢٠٠٢دا، دەمتوانی جۆش و خرۆشێك لە دەنگی جۆرج تێنێتدا بەدی بکەم. ئەو راپۆرتی ئەوەی گەیاند کە پۆلیسی پاکستان- بە یارمەتی ئێف بی ئای و سی ئای ئەی- ئۆپەراسیۆنێکی هەڵکوتانەسەریان لەدژی ژمارەیەك پەناگەی قاعیدە لە شاری (فەیسەڵئاباد)ی پاکستان ئەنجام داوە. ئەوان زیاتر لە دە دوانزە بکەر، لەوانەش ئەبو زوبەیدە، دەستگیر کردووە.

من بۆ ماوەی چەند مانگێك راپۆرتم لەبارەی زوبەیدە دەبیست. کۆڕی هەواڵگری بڕوای وابوو کە ئەو هاوکارێکی جێ متمانەی ئوسامە بن لادنە و موجاهید ئامادەکەر و بکەرێکی باڵایە کە کەمپێکی لە ئەفغانستان بەڕێوەبردبوو کە تیایدا هەندێ لە فڕۆکەرفێنانی ١١ی سێپتێمبەر مەشقیان بینیبوو. ئەو بە تێوەگلان لە پیلانەکانی پێشوو بۆ وێرانکردنی ئامانجگەلێك لە ئوردن و تەقاندنەوەی فڕۆکەخانەی نێودەوڵەتیی لۆس ئەنجلس تۆمەتبار بوو. سی ئای ئەی بڕوای وابوو کە ئەو پلانی جارێکی تر هێرشکردنەسەر ئەمریکا دادەنێت.

زوبەیدە پێش دەستگیر کردنی لە شەڕە تەقەیەك بە سەختی بریندار کرابوو. سی.ئای.ئەی دکتۆرێکی بەپەلە پێگەیاندبوو کە ژیانی رزگار کردبوو. پاشان پاکستانییەکان ئەویان سپاردەی بەندیخانەکەی ئێمە کردبوو. ئێف بی ئای دەستی کردبوو بە پرسیارکردن لە زوبەیدە کە دیاربوو لەسەر ئەوە مەشقی پێکرابوو چۆن بەرگەی لێکۆڵینەوە بگرێ. ئەو چەند برگەیەکی زانیاری ئاشکرا کرد کە پێی وابوو ئێمە هەنوکە دەیزانین. مایەی ترس بوو کە ئێمە زۆرمان نەدەزانی. بۆ نموونە، ئێمە زانیاریی لێبڕاوانەمان وەرگرت لەمەڕ ناوێکی نوێ بۆ (خالید شێخ موحەمەد) کە زوبەیدەش جەختی لەوە کردبووەوە سەرپەرشتی هێرشەکانی ١١ی سێپتێمبەری کردووە.

پاشان زوبەیدە لە وەڵامدانەوەی پرسیارەکان وەستا. جۆرج تێنێت پێی وتم کە پرسیارکەران پێیان وایە زوبەیدە زۆر زیاتری پێیە بۆ ئاشکراکردن. ئەگەر ئەو شتێکی

زیاتر شاردبێتەوە، ئەبێ چی بێت؟ زوبەیدە باشترین سەرەداوی ئێمە بوو بۆ خۆلادان لە هێرشێکی کارەساتباری تر. من وەکو ڕێنوێنییەک بۆ تیمەکە وتم "دەبێ بگەینە ئەوەی کە دەیزانێ. بژارەکانی بەردەممان چین؟"

بژارەیەکیان ئەوە بوو کە سی.ئای.ئەی بەسەر پرسیارکردن لە زوبەیدە دا زاڵ بێت و بۆ شوێنێکی سەلامەت لە وڵاتێکی تر بیگوازێتەوە کە لەوێ ئاژانسەکە بتوانێت کۆنتڕۆڵی تەواوی بەسەر ژینگەکەیدا هەبێ. شارەزایانی سی.ئای.ئەی لیستێکی تەکنیکەکانی لێکۆڵینەوەیان ئامادە کرد کە جیاوازبوون لەوانەی کە زوبەیدە سەرکەوتووانە بەرگەیانی گرتبوو. جۆرج دڵنیای کردمەوە لەوەی کە هەموو پرسیارکردنەکان لەلایەن شارەزایانی هەوالگریی بەئەزموون پیادە دەکرێن کە بە مەشقی بەرفراواندا تێپەڕیون. کارمەندانی پزیشکی لەوێ دەبن بۆ زامنکردنی ئەوەی کە دەستبەسەرکراوەکە جەستەی یان دەروونی زیانی پێناگات.

بە ڕێنمایی من، وەزارەتی داد و پارێزەرانی سی.ئای.ئەی چاوخشاندنەوەیەکی یاسایی وردیان ئەنجام دا. ئەوان گەیشتنە ئەو ئەنجامەی کە پرۆگرامی پەرەپێدراوی پرسیارکردن گونجاوە لەگەڵ دەستوور و هەموو یاسا پەیوەندیدارەکان، لەوانەش ئەوانەی کە ئەشکەنجە قەدەغە دەکەن.

من سەیرێکی لیستی تەکنیکەکانم کرد. دوو تەکنیک هەبوون کە هەستم کرد تێیانپەڕاندووە، تەنانەت ئەگەرچی یاساییش بن. بە سی.ئای.ئەیم وت کە بەکاری نەهێنن. تەکنیکێکی تر لەئاوهەڵکێشان بوو، پرۆسەی شێوە خنکاندن. گومانی تیا نییە کە ڕێوشوێنەکە سەخت بوو، بەڵام شارەزایانی پزیشکی سی.ئای.ئەییان دڵنیا کردەوە کە ئازارێکی درێژ ناگەیەنێ.

من دەمزانی کە پرۆگرامێکی لێکۆڵینەوەی وەها هەستیار و مشتومڕئامێز ڕۆژێک لە ڕۆژان ئاشکرا دەبێ. کاتێک ئەمەش ڕوویدا، ئەوا دەکەوینە بەر ڕەخنەی ئەمەی کە ئەمریکا سازشی لەسەر بەها ئەخلاقییەکانی کردووە. من ئەوەم پێ باش بوو کە زانیارییەکان بە شێوەیەکی تر وەرگرین. بەڵام هەڵبژاردنی نێوان ئاسایش و بەهاکان واقیعی بوو. ئەگەر مۆڵەتی لەئاوهەڵکێشانم نەدابا بۆ ڕێبەرانی باڵای ئەلقاعیدە، ئەوا

دەبووایە قبوڵی مەترسییەکی گەورەتر بکەم بۆ ئەوەی کە وڵات هێرشی دەکرێتەسەر. ئاگە بەرپرسیارێتیی هەرە گرنگم وەکو سەرۆک پاراستنی وڵات بوو. من بەکارهێنانی تەکنیکەکانی پرسیارکردنم قبوڵ کرد.

تەکنیکە نوێکان زۆر کاریگەر دەرچوون. زوبەیدە برێکی زۆری زانیاری دەرخست لەبارەی ئۆپەراسیۆنەکان و بونیادی قاعیدە. هەروەها ئەو، ئەو سەرەداوانەی دابین کرد کە یاریدەدەر بوون بۆ دەرخستنی شوێنی (رەمزی بن ئەلشیبە)ی پلاندانەری لۆجستیی هێرشەکانی ١١ی سێپتێمبەر. پۆلیسی پاکستانی لە یەکەم ساڵیادی ١١ی سێپتێمبەردا ئەوی گرتبوو.

دواتر زوبەیدە بۆ پرسیارکەرانی روون کردبووەوە کە بۆچی جارێکی تر دەستیکردووە بە وەڵامدانەوەی پرسیارەکانز تێگەیشتنی ئەو لە ئیسلام ئەوە بوو کە دەبووایە ئەو تەنیا تا ئاستێکی دیاریکراو بەرگەی پرسیارکردن بگرێت. لەئاوهەڵکێشان ئەو تەکنیکە بوو کە رێگەی بەودا تا بگاتە ئەو ئاستە، ئەرکە ئاینییەکەی جێبەجێ بکات و پاشان هاوکاری بکات. ئەو وتی "دەبێ ئێوە ئەمە بەسەر هەموو برایاندا جێبەجێ بکەن".

***

لە ١ی مارسی ٢٠٠٣دا، جۆرج تێنێت بەسەرهاتێکی سیخوڕی گێڕایەوە کە گونجاو بوو بۆ رۆمانێکی (جۆن لو کارێ). زانیاریی دەرهێنراو لە رێگەی پرسیارکردنەوە لە ئەبو زوبەیدە و رەمزی بن ئەلشیبە، شانبەشانی هەواڵگریی تر، یارمەتی ئێمەی دابوو تا نیشانە لە سەرکردەیەکی گەورەی ئەلقاعیدە بگرینەوە. پاشان کارمەندێکی بیانیی ئازا کە سی.ئای.ئەی ئامادەی کردبوو ئێمەی بەرەو دەرگای بینایەیەك رێنوێنی کرد. دواتر کارمەندەکە وتی "دەمەوێ منداڵەکانم لەم شێتانە ئازاد بن کە ئاینمان دەشێوێنن و خەڵکانی بێ گوناه دەکوژن".

هێزەکانی پاکستان هەڵیانکوتایە سەر بینایەکە و ئامانجەکەیان دەرپەڕاند. ئەو کەسە بەرپرسی ئۆپەراسیۆنەکانی قاعیدە و بکوژی دانی پێرل و بەرنامەدارێژەری ١١ی سێپتێمبەر بوو: خالید شێخ موحەمەد.

من ئاسودە بووم کە یەکێك لە ڕێبەرانی قاعیدە لە شەرگەکە هێنرایە دەرەوە. بەڵام ئاسودەییەکەم زۆری نەخایاند. ئەو کارمەندانەی کە لە شوێنەکەی خالید دا دەگەڕان شتێکیان دۆزییەوە کە دواتر کاربەدەستێك بە سەرچاوەی دەوڵەمەندی هەواڵگری بەهادار ناوی دەبرد. خالید شێخ موحەمەد بە ڕوونی پلانی هێرشی زیاتری دادەنا. پێنەدەچوو ئەو ئامادە بێ هیچ زانیارییەکمان لەبارەی خۆیانەوە پێ بدات. ئەو وتی "من قسەت لەگەڵ دەکەم"، "پاش ئەوەی دەگەمە نیویۆرك و پارێزەرەکەم دەبینم".

جۆرج تێنێت پرسیاری ئەوەی کرد ئاخۆ دەسەڵاتی ئەوەی هەیە تەکنیکی لێکۆڵینەوەی پەرەپێدراو لەسەر خالید شێخ محەمەد بەکار بهێنێت، لەوانەش لەئاوهەڵکێشان. من بیرم لە کۆبوونەوەکەم کردەوە لەگەڵ ژنەکەی دانی پێرل کە سکی بە کورەکەی پڕ بوو کاتێك مێردەکەی کوژرا. بیرم لەو ٢,٩٧٣ کەسە کردەوە کە لە ١١ی سێپتێمبەردا لەلایەن قاعیدەوە لە خێزانەکانیان زەوت کران. هەروەها بیرم لە ئەرکی خۆم کردەوە بۆ پارێزگاری لە وڵات لە دەستی کردەوە تیرۆر. وتم "بێگومان".

شکاندنی خالید شێخ محەمەد قورس دیار بوو. بەڵام کاتێ شکا، زانیارییەکی زۆری پێداین. ئەو پلان گەلێکی ئاشکرا کرد بۆ هێرشکردنە سەر ئەمریکا بە ئەنتراکس و ڕێنمایی کردین بۆ سێ کەس کە لە پرۆگرامی چەکی بایۆلۆژیی ئەقاعیدەوە تێوە گلابوون. ئەو زانیاری دابین کرد کە بووەهۆی دەستگیرکردنی (حەمبەلی)ی لقی هەرە ترسناکی قاعیدە لە باشووری خۆرهەڵاتی ئاسیا و ئەندازیاری هێرشی تیرۆریستی (بالی) کە بووەهۆی کوژرانی ٢٠٢ کەس. ئەو وردەکاریی زیاتری دابین کرد کە ڕێنمایی کردین بەرەو براکەی حەمبەلی کە مەشقی بە چەند بکەرێك دەکرد بۆ بەئەنجامگەیاندنی هێرشێکی تر لەناو ئەمریکادا، لەوانەشە وێنەیەکی ١١ی سێپتێمبەر لە کەناری خۆرئاوا کە تیایدا تیرۆریستان فڕۆکەیەکی رفێنراو ئاراستەی تاوەری کتێبخانە دەکەن لە لۆس ئەنجلس.

ساڵانێك دواتر، ڕۆژنامەی واشنتن پۆست، بابەتێکی لاپەڕەی یەکەمی لەبارەی وەرچەرخانی خالید شێخ موحەمەد بڵاو کردەوە. ناونیشانەکەی ئەمە بوو "چۆن زیندانییەك بوو بە سەرمایەیەك". ئەم بابەتە باسی ئەوەی دەکرد کە چۆن موحەمەد

"پێدەچوو خۆشی ببینێت ، هەندێ جار بۆ چەند سەعاتێک، لە دەرفەتی قسەکردن لەسەر کارکردنە ناوخۆییەکانی قاعیدە و پلانەکان، ئایدۆلۆژیا و بکەرەکان و ... ی گروپەکە. تەنانەت ئەو هەندێ جار تەختەی تەباشیری بەکاردەهێنا". ئەو هەوالگرییەی ئەو دابینی کرد، کە زۆر گرنگ بوو بۆ رزگارکردنی گیانی ئەمریکییەکان، تەقریبەن بە دڵنیاییەوە دەرنەدەکەوت بەبێ پرۆگرامی لێکۆڵینەوەی پەرەپێدراوی سی.ئای.ئەی.

لەو هەزاران تیرۆریستەی کە ئێمە پاش ۱۱ی سێپتێمبەر دەستگیرمان کردن، نزیکەی سەد کەسیان خرابوونە پرۆگرامی سی.ئای.ئەیەوە. نزیکەی یەک لەسەر سێی ئەوانە، بە بەکارهێنانی تەکنیکە پەرەپێدراوەکان پرسیاریان لێکرا. سێیانیان لەئاوهەڵکێشران. ئەو زانیارییانەی کە زیندانییەکانی ناو پرۆگرامی سی.ئای.ئەی ئاشکرایان کرد، نزیکەی زیاتر لەنیوەی ئەوەی پێکدەهێنا کە سی.ئای.ئەی لەبارەی قاعیدەوە دەیزانی. لێکۆڵینەوەکان یارمەتیدەر بوون بۆ شکاندنی پیلان گەلێک بۆ هێرشکردنە سەر سوپای ئەمریکا و دامەزراوە دیپلۆماسییەکان لە دەرەوە، فرشۆکەخانەی هیسرۆ و ناوچەی بازرگانیی (کەناری وارف) لە لەندەن و چەندە ئامانج لە ئەمریکا. شارەزایان کۆری هەوالگری پێیان وتم کە بەبێ پرۆگرامی سی.ئای.ئەی، هێرشێکی تر دەکرایە سەر ئەمریکا. پاش ئەوەی ئێمە پرۆگرامی سی.ئای.ئەیمان پیادە کرد، ئێمە ژمارەیەکی بچوکی یاسادانەرانی هەردوو حزبەکەمان لە هەبوونی ئاگادار کردەوە. لەو کاتەدا، هەندێ کەس نیگەرانی ئەوە بوون کە ئێمە زۆر فشار ناهێنین. بەڵام ساڵانێک دواتر، کاتێک هەڕەشەکە ناکاویی کەمتر پێوە دیار بوو و ئاراستە سیاسییەکان وەرچەرخابوون، زۆرێک لە یاسادانەران ببوونە رەخنەگری سەرسەخت. ئەوان تۆمەتی ئەوەیان ئاراستەکرد کە ئەمریکییەکان ئەشکەنجەی نایاساییان ئەنجام داوە. ئەمە راست نەبوو. من داوام لە زۆربەی ئەفسەرانی یاسایی لە حکومەتی ئەمریکا کردبوو بۆ چاوخشاندنەوە بە میتۆدەکانی لێکۆڵینەوە و ئەوان جەختیان لەوە کردبووەوە کە ئەوان ئەشکەنجەیان ئەنجام نەداوە. دەربڕینی ئەمەی کە کارمەندانی هەوالگریمان بە پەیڕەویکردنی ئەو رێنماییە یاساییانەی وەریانگرتووە یاسایان پێشێلکردووە، پڕئیهانە و هەڵە بوو.

پرۆگرامی لێکۆڵینەوەی سی.ئای.ئەی چەندە ژیانی رزگار کرد. ئەگەر ئێمە بکەری زیاتری قاعیدەمان دەستگیر بکردایە کە بەهای هەوالگریی گرنگیان هەبوو، ئەوا پرۆگرامەکەم لە بەرانبەر ئەوانیشدا بەکاردەهێنا.

***

لە بەرەبەیانی ١٠ی ئازاری ٢٠٠٤دا، دیک چێنی و ئاندی کارد بە راگەیاندنێکی سەرسوڕهێنی سڵاویان لێکردم: پرۆگرامی چاودێریی تیرۆریست لە کۆتایی رۆژەکەدا ئێکسپایەر دەبێت.

پرسیارم کرد "چۆن دەشێ کۆتایی بێت؟ ئەمە زۆر گرنگە بۆ پارێزگاری لە وڵات".

ئەوەتەی لە ئۆکتۆبەری ٢٠٠١ەوە مۆڵەتم بە پرۆگرامەکە دابوو، دوو ساڵ و نیو تێپەڕیبوو. لەو کاتەدا، ئاژانسی ئاسایشی نیشتمانی پرۆگرامەکەی بەکاردەهێنا بۆ دەرخستنی وردەکاری سەرەکی لەبارەی پیلان و شوێنەکانی تیرۆریستان. بەڕێوەبەری ئاژانسەکە (مایک هایدن) دواتر بە ئاشکرا وتی پرۆگرامەکە "سەرکەوتوو بووە لە سۆراخکردن و بەرگرتن لە هێرشەکانی ناو ئەمریکا" و ئەوە "لە حوکمە شارەزاکەی ئەوەوە دەبوو کە ئێمە هەندێ لە بکەرانی قاعیدەی ١١ی سێپتێمبەرمان لەناو ئەمریکا سۆراخ بکردایە بەر لەوەی هێرشەکان پیادە بکەن".

ئاندی بارودۆخەکەی روون کردەوە. لەکاتێکدا کە جۆن ئاشکرۆفت هەر لە ٢٠٠١ەوە نووزوو پێشنیاری نوێکردنەوەی پرۆگرامەکەی دەکرد، وەزارەتی داد نارەزایەتییەکی یاسایی خستبووەڕوو لە بەرانبەر بڕگەیەکی پرۆگرامەکەدا.

من پرسیارم کرد "بۆچی من لەبارەی ئەمەوە نەمزانیبوو؟" ئاندی هەمان نابڕوایی منی پیشاندا. ئەو پێی وتم کە تازە لەبارەی نارەزایەتییەکەی شەوی پێشووەوە زانیوویەتی. لەوانەیە تیمە یاساییەکە بیری لەوە کردبێتەوە کە دەشێت نارازیبوونەکە بەبێ دەستێوەردانی سەرۆک کۆتایی پێبهێنرێ. بە ئاندیم وت کە لەگەڵ ئاشکرۆفت و کێشەکە. لەهەمان کاتدا، دەبووایە بە فرۆکە بڕۆم بۆ (کلیڤلاند) بۆ پێشکەشکردنی وتارێك لەبارەی بەرنامە و رێوشوێنی بازرگانی.

کاتێک گەڕامەوە، ئاندیم بانگ کرد. بەرەوپێشچوونێکی کەم ئەنجامدرابوو. وەزارەتی داد دەستیگرتبوو بە نارەزایەتییەکەیەوە. پارێزەرەکانیشم نەدەجولان. ئەوان قەناعەتیان وابوو کە پرۆگرامەکە یاساییە. پرسیارم کرد "ئاشکرۆفت لەکوێیە؟ ئاندی وەڵامی دایەوە "ئەو لە نەخۆشخانەیە".

ئەمە بۆ من هەواڵ بوو. پەیوەندیم بە جۆنەوە کرد کە بۆم دەرکەوت لە نەشتەرگەرییەکی بەپەلەی بەردی گورچیلە هەڵساوەتەوە. پێم وت کە بەنیازبووم ئاندی و ئال بنێرمە لای بۆئەوەی لەبارەی مەسەلەیەکی پێویستەوە قسەی لەگەڵ بکەن. ئەوان بە فرمانی مۆڵەتپێدانەوەی پرۆگرامەکەوە رۆیشتن بۆ نەخۆشخانە. کاتێ گەڕانەوە، پێیان وتم کە ئاشکرۆفت واژۆی نەکردووە. تاکە رێگە بۆ بەردەوامیدان بە پرۆگرامەکە بریتی بوو لە فەرامۆشکردنی نارەزایەتیی وەزارەتی داد. کەیفم بەو بیرۆکەیە نەهات، بەڵام بەڵام بەدیلێکی ترم بەدی نەکرد. من فرمانێکم واژۆ کرد بۆ زیندووهێشتنەوەی پرۆگرامی چاودێریکردنی تیرۆریست لەسەر بنەمای دەسەڵاتم وەکو سەرۆکی لقی تەنفیزی.

من بە دڵێکی ناخۆشەوە چوومە ناو جێگە و هەستێکم هەبوو لەمەڕ ئەوەی کە تەواوی بابەتەکە نازانم. مەبەستم بوو بیزانم.

***

سەر لەبەیانیی ١٢ی ئازار کە گەیشتمە ئۆفیسی ئۆڤاڵ ئاندی پێی وتم "جەنابی سەرۆک، ئێمە رووبەڕووی کێشەیەکی گەورە بووینەتەوە. جیم کۆمی داواکاری گشتیی نوێنەرە و دەیەوێ دەست لەکار بکێشێتەوە لەبەرئەوەی تۆ ماوەی پرۆگرامەکەت درێژ کردووەتەوە. بەهەمان شێوە چەند کاربەدەستێکی تری وەزارەتی دادیش.

واقم ورما. کەس بە منی نەوتبوو کە جۆم کۆمی ی جێگری جۆن ئاشکرۆفت بەرپرسیارێتییەکانی ئاشکرۆفتی خستووەتە ئەستۆ کاتێک ئەو چووە نەشتەرگەری بکات. ئەگەر ئەوەم بزانیایە، ئەوا هەرگیز ئاندی و ئال-م نەدەناردنە ژووری نەخۆشخانەی جۆن.

داوام کرد کە بەشێوەیەکی تایبەتی قسە لەگەڵ کۆمی بکەم پاش لێدوانی بەیانیانی ئێف بی ئای کە ئەو لە شوێنی جۆن ئاشکرۆفت ئامادە بوو. کاتێکی زۆرم لەگەڵ جیم

بەسەر نەبردبوو، بەلام دەمزانی کە تۆمارێکی بێ هاوتای هەیە وەکو دادوەر لە نیویۆرک. من سەرەتا ئەوەم روونکردەوە کە ئەرکێکم لەسەر شانە بۆ ئەنجامدانی ئەوەی کە پێویستە بۆ پارێزگاری لە ولات. هەستم کرد کە پرۆگرامی چاودێریی تیرۆریست جەوهەرییە بۆ ئەو هەولە. ئەو نیگەرانیی خۆی دەربڕی لەبارەی لایەنی کێشەئامێزی پرۆگرامەکە. من وتم "من تەنیا لەوە تێ ناگەم کە بۆچی لە دوایین چرکەدا ئەم مەسەلەیە دەهێنیتە پێشەوە". پێدەچوو شۆک بووبێت. پاشان بۆمبێکی تری هاویشت "جەنابی سەرۆک، ستافەکەت ماوەی چەند هەفتەیەکە لەبارەی ئەمەوە زانیویانە". ئەو تاکە کەسێك نەبوو کە پلانی دەست لەکارکێشانەوەی دانابوو. بۆب مویلەری بەڕێوەبەری ئێف.بی.ئایش لەگەڵ بوو. من خەریکی بینینی گەورەترین دەست لەکارکێشانەوەی بەکۆمەڵ بووم لە مێژووی مۆدێرنی سەرۆکایەتیدا لەکاتێکدا کە لە ناوەڕاستی جەنگدابووین.

بۆب-م بانگ کردە ئۆفیسی ئۆڤاڵ. ئەوم لە ماوەی دوو ساڵ و نیوی رابردوودا باش ناسیبوو. ئەو پیاوێکی باش و شایستە بوو، ئەستێرەی پێشووی یاریی (هۆکی)ی پرینستن بوو و لە مارینزدا خزمەتی کردبوو و لە سان فرانسیسکۆ ئۆفیسی بریکاری وەزارەتی دادی بەڕێوە دەبرد. بە بێ دوودڵی، لەگەڵ کۆمی-دا هاوڕابوو. ئەو وتی، ئەگەر بەسەر نارەزایەتییەکەی وەزارەتی داد دا بەردەوام بم لەسەر پرۆگرامەکە، ئەوا ناتوانێ لە ئیدارەکەی مندا خزمەت بکات.

دەبووایە بڕیارێکی گەورە بدەم و بەخێراییش. هەندێ لە کەسانی ناو کۆشکی سپی بڕوایان وابوو کە دەبێ لەسەر دەسەلاتەکانی خۆم بمێنمەوە بەپێی بڕگەی دووی دەستوور و بەرگەی دەرچوونەکان بگرم. هەندێکی تر ئامۆژگاریی ئەوەیان خستەڕوو کە نارەزایەتییەکانی داد قبول بکەم، پرۆگرامەکە هەموار بکەم و ئیدارەکە بە پایەداری بهێلمەوە.

ئامادەبووم کە بەپێی بڕگەی دوو، داکۆکی لە دەسەلاتەکانی سەرۆکایەتیی خۆم بکەم. بەلام بە هیچ باجێك نا. بیرم لە (شەوی قەسابخانەی شەممە) کردەوە لە ئۆکتۆبەری ١٩٧٣دا کاتێك دەرکردنی داواکاری (واتەرگەیت) (ئارکیبۆلد کۆکس) لەلایەن سەرۆك

ریچارد نیکسنەوە بووەهۆی ئەوەی کە داواکارە گشتییەکەی و جێگری داواکاری گشتی دەست لەکار بکێشنەوە. ئەمە ئەو قەیرانە مێژووییە نەبوو کە من نامەزانێ بیەم کۆپی بکەمەوە. ئەمە ئەوەندە قەناعەتی پێ نەدەدام تا بزانم ئاخۆ من بەپەیوەست بە پرەنسیپە یاساییەکان راستم لەکاتێکدا کە ئیدارەکەم دەتەقییەوە و پرۆگرامە سەرەکییەکانمان لە جەنگی دژە تیرۆردا دەکەوتنەبەر ئەو زریانی میدیایەی کە بە دڵنیاییەوە بەدوادادەهات. بریارم دا بە هەموارکردنی ئەو بەشەی پرۆگرامەکە کە ئەوان بە کێشەئامێز دەیانبینی، نیگەرانیی وەزارەتی داد هێور بکەمەوە و لەهەمان کاتدا پرۆگرامەکە لە شوێنی خۆیدا بهێڵمەوە. کۆمی و مویلەر هەرەشەی دەستلەکارکێشانەوەکانیان کشاندەوە. پرۆگرامی چاودێری بەردەوامبوو لە هێنانەکایەی ئەنجام و ئەمەش لەهەمووی گرنگتر بوو.

من حەسامەوە لەوەی کە قەیرانەکە تێپەڕی، بەڵام ئەوەم پێناخۆش بوو کە روویدا. من بۆ راوێژکارانم روون کردەوە کە من هەرگیز نامەوێت جارێکی تر وەها بیناگا بکرێم. نیازی خراپم لە کەس بەدی نەدەکرد. یەکێک لەو پرسیارە هەرە سەختانەی کە هەموو کۆشکێکی سپی رووبەڕووی دەبێتەوە ئەوەیە کە چۆن کاتی سەرۆک بەڕێوە ببەیت و چ کاتێک مشتومڕەکانی بەرنامە و رێوشوێن بخەیتەسەر مێزەکەی. ناکۆکی لەسەر پرۆگرامی چاودێری کەیسی حوکمدانێکی خراپ بوو. لە سالانی دواتردا کەموکورتیی رێککەوتن لەئارادا نەبوو، بەڵام هەرگیز جارێکی تر شتێکی وەها روونەدایەوە.

***

یەکێک لە کتێبە پەسەندەکانم بریتییە لە (بایۆگرافیی سەرۆک هاری ترومان)ی مێژوونووسی زیرەک دەیڤد مکلۆ. من سەرسەختی، پرەنسیپ و روئیای ستراتیژیی ترومانم بەدڵ بوو. کاتێک ئەو لە پڕ لە دوایین مانگەکانی دووەم جەنگی جیهانی ئۆفیسی گرتە دەست، وتی "هەست دەکەم مانگ، ئەستێرەکان و هەموو هەسارەکان بەسەرمندا باریوون". لەگەڵ ئەوەشدا، کابرای (مێزوری) دەیزانی کە چۆن بریارێک بدات و دەستی پێوە بگرێت. ئەو، ئەو شتەی دەکرد کە دەیزانی راستە و زۆر گوێی بەوە نەدەدا رەخنەگران چی دەڵێن. کاتێک ئەو لە ١٩٥٣دا ئۆفیسی جێ هێشت، پلەبەندیکردنی ئەو

لە بیستەکاندا بوو. ئەمڕۆکە ئەو وەکو یەکێك لە سەرۆکە گەورەکانی ئەمریکا دەژمێردرێت.

پاش ئەوەی بوو بە وەزیری دەرەوە، کۆندی بایۆگرافییەکی وەزیری دەرەوەی ترومان (دین ئەچیسن)ی پێدام. هەردوو کتێبەکە ئەوەیان بیر هێنامەوە کە چۆن بڕیارەکانی ترومان لە دوادواکانی ١٩٤٠ەکان و سەرەتاکانی ١٩٥٠کاندا بناغەیان داناوە بۆ سەرکەوتن لە جەنگی سارد دا و یارمەتیدەر بوون بۆ شکڵپێدانی ئەو جیهانەی من وەکو سەرۆك بۆم ماوەتەوە. ترومان تەقەلای کرد لە پێکهێنانی هاوپەیمانێتیی ناتۆ، یاسای ئاسایشی نیشتمانیی لە ١٩٤٧دا واژۆ کرد، کە سی.ئای.ئەی، ئەنجومەنی ئاسایشی نیشتمانی و وەزارەتی بەرگری دروست کرد. شەڕی جەنگێکی بەدناوی کرد کە بووەهۆی سەرهەڵدانی هاوپەیمانێکی دیموکرات لە کۆریای باشوور و پەیمانی کۆمەکی دا بە هەموو ئەو وڵاتانەی بەرەنگاریی هاتنە سەر حوکمی کۆمەنیست دەکەن، ئەمەش (ڕێبازی ترومان) بوو.

هەروەکو سەردەمی ترومان، ئێمە لە سالانی سەرەتای ململانێیەکی دووروودرێژدا بووین. ئێمە چەندەها ئامرازمان چێ کردبوو بۆ مامەڵە کردن لەگەڵ هەڕەشەکاندا. من کردنی ئەم ئامرازانە بەو دامەزراوە و یاسایانەی کە بۆ جێگرەوەکانم دەستەبەر دەبن، کرد بە ئەولەویەتێکی باڵا.

لە هەندێ بواردا ئێمە لە سەرەتایەکی باشدا بووین. وەزارەتی ئاسایشی نیشتمانی، لەکاتێکدا کە ئەگەری تووشبوونی بە کەموکورتیی هەر بیرۆکراسییەکی گەورەی هەبوو، باشبوونێکی بەسەر بیست و دوو ئاژانسی ناهەماهەنگدا تۆمار کرد. ئێف بی ئای لقێکی ئاسایشی نیشتمانی نوێی دروست کردبوو کە تەرکیزی خستبووەسەر ڕێگرتن لە هێرشی نوێ. وەزارەتی بەرگری، فەرماندەییەکی باکووری نوێی دامەزراندبوو بە تاکە بەرپرسیارێتیی بەرگری کردن لە نیشتمان. وەزارەتی خەزێنە ڕێگایەکی توندی نوێی پەیڕەو کردبوو بۆ تێکدانی سەرچاوە داراییەکانی تیرۆریستان. ئێمە زیاتر لە نەوەد وڵاتمان سازدابوو بۆ (دەستپێشخەریی زیادکردنی ئاسایش) بە ئامانجی وەستاندنی قاچاغیی نێودەوڵەتیی کەرەستە پەیوەندیدارەکانی چەکی کۆکوژ. تا ڕادەیەك لەسەر بنەمای ڕاسپاردەی کۆمسیۆنی ١١ی سێپتێمبەر، ئێمە سەنتەرێکی دژەتیرۆریزمی

نیشتمانیی نوێمان دروستکردبوو و بەڕێوەبەرێکی هەواڵگریی نیشتمانیمان بۆ دانابوو- گەورەترین ریفۆرمی کۆڕی هەواڵگری لەو سەروەختەوە کە ترومان سی.ئای.ئەی دروستکردبوو.

لە بوارەکانی تردا ئیشمان هەبوو بیکەین. هەندێ لە ئامرازە هەرە گرنگەکانمان لە جەنگی دژە تیرۆردا، لەوانەش پرۆگرامی چاودێریی تیرۆریست و پرۆگرامی لێکۆڵینەوەی سی ئای ئەی، پەیوەست بوون بە دەسەڵاتی بەرفراوانی برگەی دوو و بڕیاری کۆنگرێسی پەیوەست بە جەنگ. باشترین رێگە بۆ زامنکردنی ئەمەی کە ئەوانە پاش جێهێشتنی ئۆفیسم بە جێگیری دەمێننەوە، کارکردن بوو لەگەڵ کۆنگرێس بۆ بەیاساکردنی ئەو پرۆگرامانە. هەروەکو دادوەر رۆبەرت جاکسن لە رەئییەکی بەرجەستەدا لە ١٩٥٢دا روونی کردەوە، سەرۆک لەو کاتەدا زۆرترین دەسەڵاتی هەیە کە بە پشتگیریی روونی کۆنگرێس رەفتار دەکات. تەحەدییەکە ئەوە بوو کە چۆن پرۆگرامی چاودێریی تیرۆریست و پرۆگرامی لێکۆڵینەوەی سی.ئای.ئەی بخەینە‌ڕووی کۆنگرێس بەبێ پیشاندانی وردەکارییەکە بە دوژمن. بڕوام وابوو کە ئەمە دەکرێ، بەڵام دەبووایە لە نزیکەوە کار لەگەڵ ئەندامانی کۆنگرێسدا بکەین بۆ بونیادنانی مشتومڕەکە بەبێ ئاشکراکردنی نهێنییە هەستیارەکان. ئێمە ستراتیژییەکمان گەڵاڵە دەکرد بۆ ئەنجامدانی ئەمە. پاشان دوو رووداو هاتنە بەردەممان.

***

ستیف هادلی لە دیسەمبەری ٢٠٠٥دا پێی وتم "نیویۆرک تایمز جارێکی تر بابەتی چاودێرییەکەی خستووەتەوە بەر باس".ساڵی پێشتر، تایمز بڵاوکردنەوەی بابەتێکی لەبەرچاو گرتبوو بۆ دەرخستنی پرۆگرامی چاودێریی تیرۆریست. کۆندی و مایک هایدن قسەیان لەگەڵ رۆژنامەکە کردبوو بۆ ئاشکرا نەکردنی برگە سەرەکییەکانی پرۆگرامەکە. من داوام لە بڵاوکەرەوەی تایمز (ئارسەر سولزبێرگەر جونیەر) و نووسەر (بیل کێلەر) کرد کە لە بەرواری ٥ی دیسەمبەری ٢٠٠٥دا بێن من ببینن. ئەمە داوایەکی دەگمەن بوو و من ستایشی ئامادەییانم کرد بۆ قسەکردنی رووبەڕوو. ئەوان لە دەوروبەری پێنجی ئێوارە گەیشتن. من، ستیف هادلی، ئاندی کارد، مایک هایدن لە ئۆفیسی ئۆڤاڵ بەخێرهاتنمان

کردن. ئێمە لەژێر پۆرترێتەکەی جۆرج واشنتن لە پەنا ئاگردانەکە دانیشتین. من پێم وتن کە وڵات هێشتا لە مەترسیدایە و ڕۆژنامەکەیان خەریکی زیادکردنی مەترسییەکەیە لە ڕێگەی دەرخستنی پرۆگرامی چاودێریی تیرۆریست بە جۆرێک کە دەشێ ورپایی بە دوژمنانمان بدات. پاشان مۆڵەتم بە ژەنەراڵ هایدن دا تا بەرچاوڕوونییان لە پرۆگرامەکە پێبدات.

مایك کەسایەتییەکی هێمنە. ئەو، ئەو پیاوە پڕ ماسولکەیە نییە کە هەوڵ دەدات بە ئەستێرەکانی سەرشانی خەڵکی بترسێنێت. ئەو لەبارەی ژیانی درێژی لە هەواڵگریدا و گومانی لە هەر پرۆگرامێك کە دەشێ ببێتەهۆی کۆکردنەوەی زانیاریی لە هاوڵاتیانی ئەمریکی، قسەی کرد. ئەو قسەکانی پوخت کردەوە بە ئەو ئامرازە پارێزەرانەی لەکاردان، ئەو چاوخشاندنەوە یاساییە بێ شومارانەی کە هەن و ئەو ئەنجامانەی پرۆگرامەکە بەرهەمی هێناون. لێدوانی مایك نزیکەی سی خولەکی خایاند. من لە نزیکەوە پیاوانی تایمز-م بینی. ئەوان ڕووقایم بوون. من پێم وتن کە دەتوانن هەر پرسیارێك لە مایك بکەن کە دەیانەوێ. ئەوان پرسیارێکی زۆریان نەبوو. من ڕاستەوخۆ سەیری سولزبێرگ-م کرد بە پێداگرییەوە وتم کە دەبێ بابەتەکەی بکشێنێتەوە لەبەر هۆکاری ئاسایشی نیشتمانی. ئەو وتی کە داواکەی من لەبەرچاو دەگرێت.

دە ڕۆژ دواتر، بیل کێلەر پەیوەندی بە ستیڤەوە کرد بۆئەوەی بڵێت کە تایمز لەسەر بابەتەکە بەردەوام دەبێ. ئێمە دەرفەتمان نەمابوو لەبەردەم مشتومڕێکی داخراودا. ئەوان لەسەر وێبسایتەکەیان دایاننابوو بەر لەوەی کە کێلەر تەلەفۆن بکات. من لە تایمز نائومێد ببووم و توڕە بووم لە هەر کەسێك کە لە ڕێگەی ناپاکی لە وڵاتەکەی، بابەتەکەی دزەپێکردبوو. وەزارەتی داد لێکۆڵینەوەیەکی تاوانی کردەوە لە بەرانبەر دەرخستنی زانیاریی نهێنی. تاوەکو هاوینی ٢٠١٠ ش کەس دادگایی نەکرابوو.

چەپەکان بە هیستریاوە کاردانەوەیان پیشاندا. سیناتۆرێك هەڵیدایە "ئەو سەرۆك جۆرج بوشە، نەك شا جۆرج بوش". یەکێکی تر وتی "پێدەچێت ئیدارەی بوش بڕوای وابێ لەسەروو یاساوەیە". ئاکامێکی ڕاستەوخۆی دزەپێکردنەکە بریتی بوو لە بەلارێدابردنی تازەکردنەوەی یاسای نیشتمانپەروەر کە بڕیار بوو لەلایەن کۆنگرێسەوە

مۆڵەت بدرێتەوە. هاری رەیدی رێبەری کەمینەی ئەنجومەنی پیران کە لە ٢٠٠١ دەنگی بە یاساکە دابوو، لە گردبوونەوەیەکی سیاسیدا بە سەربەرزییەوە وتی "ئێمە یاسای نیشتمانپەروەرمان کوشت".

سەرەنجام، یاسای پاتریۆت نوێکرایەوە، بەڵام دزەکردنەکە کێشەیەکی گەورەتری دروست کرد. ئەو کۆمپانیایانەی تێلیکۆمیونیکەیشن کە گومانی ئەوەیان لێدەکرا یارمەتی حکومەت دەدەن لە کارپێکرنی پرۆگرامی چاودێریی تیرۆریست، رووبەڕووی سکاڵای یاسایی خەڵکانی پەیوەندیدار بوونەوە. ئەمە نادادپەروەرانە بوو. ئەو کۆمپانیایانەی کە رازیبوون بەوەی ئەرکی نیشتمانپەروەرانەی خۆیان ئەنجام بدەن بە یارمەتیدانی حکومەت تا ئەمریکا بپارێزێ، شایستەی ئەوە بوون کە سڵاویان ئاراستە بکرێ نەک شکاتیان لێ بکرێت. یەک شت گومانی تیا نەبوو: هەر ئومێدێك بە هەماهەنگیی ئایندە لە پیشەسازیی تێلکۆمیونیکەیشنەوە لەئارادا نەمابوو مەگەر ئەوەی کە بمانتووانیایە حەسانەی یاسایی پەیدا بکەین.

لە سەرەتاکانی ٢٠٠٦دا، من دەستم کرد بە سۆراخکردنی یاسادانەران بۆ پرۆژەیاسایەکی پەیوەست بە مۆدێرنیزەکردنی یاسای چاودێریی هەواڵگریی بیانی. یاسا نوێکە مۆڵەتی ئاشکرای دەدا بەو جۆرە چاودێرییەی کە ئێمە لە ژێر سایەی پرۆگرامی چاودێریی تیرۆریستدا ئەنجامان دابوو و هەروەها پاراستنی بەرپرسیارێتیی یاسایی کۆمپانیا تێلکۆمیونیکەیشنەکان.

مشتومڕەکە بۆ ماوەی دووساڵ بەشێوەیەکی رێك و پێك بەردەوام بوو. خۆشبەختانە، من دوو پشتیوانی قەناعەتهێنم هەبوون: (مایك مکۆنێل)ی عەمیدی ڕوونبیری پێشووی هێزی دەریایی بەڕێوەبەری هەواڵگریی نیشتمانی و داواکاری گشتی ژەنەراڵ (مایك موکاسی)ی دادوەری فیدراڵی باوەڕبەخۆی خەڵکی نیویۆرك. ئەوان چەندەها سەعاتیان لە بینایەی کۆنگرێسدا بە روونکردنەوەی پێویستیی داخستنی کەلێنەکان لە تواناکانی هەواڵگریمان و ئەو ئامرازانەی پارێزگاری کە هەمانن بۆ نەهێشتنی خراپ بەکاربردن، بەسەربرد.

دواجار، هەردوو ئەنجومەنی کۆنگرێس دەنگدانێکیان لە هاوینی ۲۰۰۸دا سازدا. ئەنجومەنی نوێنەران پرۆژەیاساکەی بە ۲۹۳ بەرانبەر ۱۲۹ دەنگ تێپەڕاند. لە ئەنجومەنی پیران، ٦۹ دەنگی هێنا. یاساکە لە جەوهەردا مشتومڕی لەسەر یاسابوونی چالاکییەکانی چاودێریکردن کۆتایی پێ هێنا. کۆنگرێس پشتگیریی دووحزبی خستبووەڕوو بۆ یاسایەک کە تەنانەت نەرم و نیانییەکی زیاتر لەوەی دابینکردبوو کە ئێمە لە پرۆگرامی چاودێریی تیرۆریستدا دەستەبەرمان کردبوو.

***

ڕووداوی دووەم کە دەستی ئێمەی گرت، لە حوزەیرانی ۲۰۰٦دا بوو کاتێک دادگای باڵا لەسەر ڕووبەڕووی بوونەوەی (حەمدان لەبەرانبەر ڕەمسفێلد) حوکمیدا. بڕیارەکە دەرەنجامی زیاتر لە چوار ساڵی ئەو سکاڵایە بوو کە پەیوەندی هەبوو بەو دادگا سەربازییانەی من لە ساڵی ۲۰۰۱دا مۆڵەتم پێدابوون. دوو ساڵ و نیوی بۆ وەزارەتی بەرگری خایاندبوو تا ڕێوشوێنەکان ڕێکبخات و یەکەم دادگایی دەستپێبکات. گومانی تیا نییە کە ئەمە ئەرکێکی لۆجستی و یاسایی ئاڵۆز بوو. بەڵام من کەلێنێکی دڵنیای تامەزۆرییم بۆ پرۆژەکە بەدی کرد. بەو هەموو گووشارەوە لە ئەفغانستان و عیراق، قەت پێنەدەچوو ئەو دادگایانە ئەولەویەتێکی سەرەکی بن.

ئەو پارێزەرانەی کە پشتیوانی زیندانییەکانیان دەکرد بە پەلەتر هەنگاویان نا. لە ساڵی ۲۰۰٤دا، پارێزەرێکی دیاریکراو لەلایەن هێزی دەریایی بۆ سالم حەمدان- شۆفێری ئوسامە بن لادن کە لە ئەفغانستان دەستگیر کرابوو- تەحەدای دادپەروەرێتیی دادگایەکەی کرد. دادگای پێداچوونەوە وەکو سیستەمێکی دادپەروەریی سەردەمی جەنگ پاڵپشتیی ڕەوایەتیی دادگایەکانی کرد. بەڵام لە حوزەیرانی ۲۰۰٦دا، دادگای باڵا ئەو حوکمەی ئاوەژوو کردەوە. دادگا بڕیاری ئەوەیدا کە، بە پێچەوانەی فرانکلین ڕۆزفێلت و پێشینانی، من پێویستم بە مۆڵەتپێدانێکی ئاشکرا هەیە لەلایەن کۆنگرێسەوە بۆ دامەزراندنی دادگاکان.

حوکمەکە بەهەمان شێوە کاری کردەسەر پرۆگرامی لێکۆڵینەوەی سی.ئای.ئەی. لە ڕەئیی زۆرینەیدا، دادوەر جۆن پۆل ستیڤنس حوکمی ئەوەی ڕاگەیاند کە بەشێکی

پەیماننامەی جنێڤ کە بە بڕگەی سێی باو- کە بە شێوەیەکی تایبەت بۆ "ململانێی چەکداری نوسراوە نەك ئەمەی تایبەتمەندییەکی نێودەوڵەتی هەبێ"- بە شێوەیەك لە شێوەکان بەسەر جەنگی ئەمریکا لەگەڵ قاعیدە پیادە کرا. بڕگەکە ڕێگەی گرت لە "دەستدرێژکردنەسەر شکۆی مرۆڤ"، دەستەواژەیەکی تەمومژاوی کە دەکرا بە هەر مانایە لێکبدرێتەوە. سەرەنجام، پارێزەرەکانی سی.ئای.ئەی نیگەرانی ئەوە بوون کە ئەو کارمەندانەی هەواڵگری کە پرسیاریان لە تیرۆریستەکان دەکرد لەپڕ ڕووبەڕووی مەترسی یاسایی ببنەوە. سی.ئای.ئەی پێی وتم کە دەبێ ئەو پرۆگرامەی لێکۆڵینەوە هەڵپەسێرێت کە زانیاریی ژیان ڕزگارکەری زۆری دابوو بەدەستەوە.

من بە توندی ناکۆك بووم لەگەڵ بڕیاری دادگا، کە من بە نموونەیەکی ئاراستەکردنی گۆڕانکاریی دادوەری لەقەڵەممدا. بەڵام من ڕۆڵی دادگای باڵام لە دیموکراسیی دەستووریدا قبوڵ کرد. نیازم نەبوو کە نموونەی سەرۆك ئەندرو جاکسن دووبارە بکەمەوە کە وتبووی "جۆن مارشاڵ بڕیاری خۆی داوە، دەبا ئێستا جێبەجێی بکات!" ئاخۆ سەرۆکەکان کەیفیان پێ بێت یان نا بڕیارەکانی دادگا یاسای ئەو خاکەن.

هاوشێوەی دزەکردنەکەی پرۆگرامی چاودێریی تیرۆریست، بڕیاری دادگای باڵا ڕوونی کردەوە کە کاتی ئەوەیە سۆراخی یاسایەك بکات بۆ بە سیستەمکردنی دەزگای دادگا سەربازییەکان و پرۆگرامی لێکۆڵینەوەی سی.ئای.ئەی. من پرسەکەم خستە بەردەم ئەو خەڵکانەی زنجیرەیەك وتار و بەیانیان هەبوو. دراماتیکیترینیان لە ژووری (ئیست)ی کۆشکی سپییەوە سەرچاوەی گرت لە ساڵی ٢٠٠٦دا. وەکو ڕێگایەك بۆ ڕۆشنایی خستنەسەر مەترسییەکانی تێپەڕاندنی پرۆژە یاساکە، من ڕامگەیاند کە خالید شێخ موحەمەد و سێزدە زیندانیی باڵای ڕێکخراوی قاعیدە لە زیندانی سی.ئای.ئەیەوە دەگوازینەوە بۆ گوانتانامۆ، کە لەوێ ڕووبەڕوویی دادگایی ئەو دادگایانە دەبنەوە کە کۆنگرێس دروستیان دەکات.

کۆنگرێسمانێك ڕایگەیاند "ئەم پرۆژەیاسایە سەرۆك دەکا بە دیکتاتۆر". یاسادانەرانی تر ڕەفتاری سوپای ئێمە و شارەزایانی سی.ئای.ئەی-یان بە هی تالیبان و سەدام حسێن بەراورد کرد.

من ئاسودەبووم لەوەی کە گەلی ئەمریکا حوکمێکی باشتر ئەدات. زۆربەی ئەمریکییەکان لە پێویستیی ئەوە تێگەیشتبوون کە شارەزایانی هەوالگری ئامرازیان لەبەردەستدا بێ بۆ دەرهێنانی زانیاری لەو تیرۆریستانەی پلانی هێرشکردنەسەر وڵاتیان دادەڕشت. هەروەها نەیاندەویست کە زیندانییانی گوانتانامۆ بهێنرێنە ئەمریکا و بەهەمان ئەو مافە دەستوورییەی کە تاوانبارە ئاساییەکان هەیانە لە دادگا مەدەنییەکاندا دادگایی بکرێن. لەماوەی مانگێکی وتارەکەی (ئیست روم)مدا، کۆنگرێس یاسای (کۆمسیۆنە سەربازییەکان)ی ساڵی ٢٠٠٦ی بە زۆرینەیەکی ئاسودەبەخشی دووحزبی تێپەڕاند. هەموو ئەو شتانەی تیابوو کە داوامان کردبوو، لەوانەش دەسەڵات بۆ دادگاکان بۆ دەستپێکردنەوە و بۆ سەرۆک تا تەکنیکی لێکۆڵینەوەی پەرەپێدراو بەکاربهێنێت، چ بیەوێ یان نەیەوێ.

***

لەکاتێکدا کە گوێم لە دوایین لێدوانی سی.ئای.ئەی دەگرت لە بەرەبەیانی پێش مەراسیمی دەستبەکاربوونی سەرۆک ئۆباما، من لە هەموو ئەو شتانە تێفکریم کە لە ١١ی سێپتێمبەرەوە روویاندابوو: هۆشداریی راستەقینەکان و زەنگە هەڵەکان، ئەو ژەهرەی بوتۆکس کە پێمان وابوو دەمانکوژێت و ئەو پیلانانەش کە ئێمە پوچەڵمان کردبوونەوە. ساڵانێك تێپەڕیبوو، بەڵام هەڕەشەکە نا. تیرۆریستان هەڵیانکوتابووە سەر باڵی، جاکارتا، ریاز، ئیستانبوڵ، مەدرید، لەندەن، عەمان و مومبای. راپۆرتە هەوالگرییەکانی بەیانیانم روونیان کردبووەوە کە سووربوون لەسەر ئەوەی جارێکی تر هێرش بکەنە سەر ئەمریکا.

پاش شۆکی ١١ی سێپتێمبەر، پلانێکی یاسایی، سەربازی یان سیاسی نەبوو بۆ رووبەڕووبوونەوەی دوژمنێکی نوێ کە هەموو یاساکانی جەنگی نەریتی رەت کردبووەوە. بە هاتنی ئەو کاتەی کە من ئۆفیسم جێ هێشت، ئێمە سیستەمێکی پرۆگرامە دژەتیرۆرە کاریگەرەکانمان لەسەر بنەمایەکی تەشریعی و یاسایی بێگەرد جێگیر کردبوو.

بێگومان، شت هەن کە هیوادار بووم جیاواز بێنەکایە. من نائومێد بووم لەوەی کە دادگا سەربازییەکان وەها خاو بەڕێوە دەچن. تەنانەت پاش ئەوەش کە یاسای کۆمسیۆنە سەربازییەکان پەسەند کرا، سکاڵایەکی تر جارێکی تر پرۆسەکەی دواخست.

بە هاتنی ئەو کاتەی کە من ئۆفیسم جێ هێشت، ئێمە تەنیا دوو دادگاییمان ئەنجام دابوو.

قورسیی ئەنجامدانی دادگاییەکان، بەدیهێنانی ئامانجێکی سەختتر کردبوو کە من لە سەرەتای دووەم خولمدا خستبوومە بەرنامەوە: داخستنی زیندانەکە لە گوانتانامۆ بە شێوەیەکی بەرپرسانە. لەکاتێکدا کە بڕوام وایە کردنەوەی گوانتانامۆ پاش ١١ی سێپتێمبەر پێویست بوو، ئۆردوگای دەستبەسەرکردنەکە ببووە ئامرازێکی دەستبەسەرکردن بۆ دوژمنانمان و سەرقاڵکەرێك بۆ هاوپەیمانەکانمان.

ئیشم کرد بۆ دۆزینەوەی ڕێگایەك بۆ داخستنی زیندانەکە بەبێ سازشکردن لەسەر ئاسایش. بە هاتنی ئەو کاتەی کە ئۆفیسم جێ هێشت، ژمارەی زیندانیانی گوانتانامۆ لە نزیکەی ٨٠٠ کەسەوە بۆ کەمتر لە ٢٥٠ کەس کەمی کردبوو. ئومێدەوارم زۆرێك لەوانەی کە ماونەتەوە ڕووبەڕووی دادگا ببنەوە بۆ تاوانەکانیان. لەوانەیە هەندێ لە تیرۆریستە مەترسیدارە تاوانکارە مکوڕەکان دادگاییکردنیان قورس بێت. دەزانم کە ئەگەر ئازادم بکردنایە و ئەمریکییان بکوشتایە، خوێن بە دەستەکانمەوە دەبوو. بڕیاردان لەسەر چۆنێتی مامەڵەکردن لەگەڵیاندا قورسترین بەشی داخستنی گوانتانامۆ بوو.

لەلایەکی تریشەوە، لەوانەبوو من بمتوانیایە خۆم لە هەندێ ناکۆکی و تەگەرە یاسایی لابدەم لە ڕێگەی سۆراخکردنی یاسایەك بۆ دادگا سەربازییەکان، پرۆگرامی چاودێریی تیرۆریست و پرۆگرامی لێکۆڵینەوەی پەرەپێدراوی سی.ئای.ئەی ڕێگ لەو کاتەدا کە دروست دەکران. ئەگەر پێویستی بکردایە ئەندامانی کۆنگرێس ڕێك لەو کاتەی من بڕیارم دەدا، بڕیار بدەن- ڕاستەوخۆ پاش ١١ی سێپتێمبەر- دڵنیام کە هەر شتێك ئێمە داوامان بکردایە قبوڵیان دەکرد. لەگەڵ ئەوەشدا لە حاڵەتی ، پرۆگرامی چاودێریی تیرۆریست و پرۆگرامی لێکۆڵینەوەی پەرەپێدراوی سی.ئای.ئەی، مەترسی دەرخستنی وردەکاریی کرداری بۆ دوژمن لەوانە بوو کە من نەمدەتووانی خۆمی لێ بدەم تا ئەو کاتەی کە باشتر دەمانتووانی دەست و پەنجە لەگەڵ بارودۆخە ئاسایشییەکەدا نەرم بکەین.

من بەردەوام تووشی کێشە دەبووم لە بەرانبەر دەرەنجامی نیازنەکراو لەدژی کۆڕی زانیاری و وەزارەتی داد لەبەرانبەر ڕۆڵیان لە پرۆگرامەکانی چاودێری و پرسیارکردندا.

ئەفسەرانی هەواڵگریمانە شارەزایەتی و بوێرییەوە فەرمانەکانیان بەجێ دەگەیاند و ئەوان شایەنی سوپاسی ئێمەن بۆ پارێزگاری لە وڵاتمان. کاربەدەستانی یاسایی ئیدارەکەم، هەوڵی خۆیاندا بۆ چارەسەرکردنی پرسە ئاڵۆزەکان لە رۆژگاری مەترسی لە رادەبەدەر لەسەر وڵاتەکەمان. جێگرەوەکانیان ماف ناکۆکبوونیان هەیە لەگەڵ ئەنجامگیرییەکانی ئەوان. بەڵام بەتاوانکردنی جیاوازییەکانی رەئی یاسایی، نموونەیەکی دزێو بۆ دیموکراسییەکەمان تۆمار دەکات.

هەر لە سەرەتاوە، من دەمزانی کە کاردانەوە گشتییەکان بەرانبەر بڕیارەکانم بەوە دیاری دەکرێت ئاخۆ هێرشێکی تر لەئارادا دەبێت یان نا. ئەگەر هیچ رووی نەدایە، هەرچییەك بمکردایە، لەوانەیە بە کاردانەوەیەکی زیادەڕەوانە ببینرایە. ئەگەر جارێکی تر هێرشمان بکرایەتەوە سەر، ئەوا خەڵکی داوای ئەوەیان دەکرد بزانن بۆچی زیاتر خۆم ماندوو نەکردووە.

ئەمە سروشتی سەرۆکایەتییە. پەی پێبردنەکان لەژێر کاریگەری درەنگ تێگەیشتن دروست دەبن.

لە ساتی بڕیارداندا، تۆ ئەو خاڵەت نییە. لە ١١ی سێپتێمبەردا، من سوێندم خوارد کە هەرچییەك پێویست بێ دەیکەم بۆ پاراستنی ئەمریکا لە چوارچێوەی دەستوور و یاساکانی وڵاتدا. مێژوو دەتوانێ مشتومڕی ئەو بڕیارانە بکات کە داومن، ئەو بەرنامانەی هەڵمبژاردوون و ئەو ئامرازانەی لەدوای خۆم جێم هێشتوون. بەڵام ناکرێ هیچ مشتومڕێ هەبێ لەسەر یەك راستی: پاش مۆتەکەی ١١ی سێپتێمبەر، ئەمریکا حەوت ساڵ و نیو بەبێ هێرشێکی تیرۆریستیی سەرکەوتووی تر بۆ سەر خاکەکەمان گوزەراندی. ئەگەر من وەکو سەرۆك دەسکەوتی هەرە واتاداری خۆم لە رستەیەکدا پوخت بکردایەتەوە، ئەوا ئەمەیان دەبوو.

# ئەفغانستان

ژووری (تریتی) یەکێك بوو لە شوێنە هەرە دڵخوازەکانم لە کۆشکی سپیدا. ئەمە کە ژوورێکی بەرفراوان و سەرنجڕاکێشە، لە قاتی دووەمە لەنێوان ژووری خەوتنی لینکۆڵن و ژووری (هێلکەیی زەرد). بەر لە بونیادنانی (لای خۆرئاوا)، ژووری تریتی، ئۆفیسی سەرۆکایەتی بوو. ناوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٨٩٨، ئەو کاتەی کە سەرۆك ویلیام مکینلی هەڵیبژارد بۆ واژۆکردنی پەیماننامە (تریتی)ی کۆتاییهێنان بە جەنگی ئیسپانیا-ئەمریکا.

ئەو پارچە ئەساسەی کە دیارە لە ناو ژوورەکەدا، مێزێکی دارگوێزی تۆخی گەورەیە کە لەسەر ئەوێ پەیماننامەکە واژۆ کرا و کابینەی سەرۆك یولیسیس. ئێس گرانت جێبەجێی کرد. من ئەو مێزەم بەکارهێنا بۆ پێداچوونەوەی وتارەکان، خوێندنەوەی لێدوانەکان و ئەنجامدانی پەیوەندییە تەلەفۆنییەکان، زۆرجار ئێوارەی دوای ئەوەی کە لە ئۆفیسی ئۆڤاڵ دەگەڕامەوە ئەمانەم دەکرد. لە بەرانبەر مێزەکەدا تابلۆیەکی زەیتیی گەورە هەبوو بەناوی (ئاشتیپارێزان). ئەم تابلۆیە سەرۆك لینکۆڵن لەسەر کەشتیی هەڵمیی (ریڤەر کوین) پیشان دەدات لەگەڵ ژەنەراڵ گرانت، ژەنەراڵ ویلیام تێکومسە شێرمان و ئەمیراڵ دەیڤد پۆرتەر لە دوایین مانگی جەنگی ناوخۆدا. لینکۆڵن لەبارەی ستراتیژییەکەوە بۆ تێکشاندنی کۆنفیدراسی (ویلایەتە یەکگرتووەکان) و بونیادنانی ئاشتییەکی دادپەروەرانە و درێژخایەن، لەگەڵ فەرماندە سەربازییەکانیدا راوێژ دەکات. پێش ١١ی سێپتێمبەر، دیمەنەکەم وەکو چرکەساتێکی دڵڕفێن لە مێژوودا بینی. پاش هێرشەکە، مانایەکی قووڵتری گرتەخۆ. تابلۆیەکە، رۆشنیی ئامانجی لینکۆڵنی بیرهێنامەوە: ئەو بۆ قەزیەیەکی پیرۆز جاڕی شەڕی دا.

پاش نیوەڕۆی یەکشەممە، ٧ی ئۆکتۆبەری ٢٠٠١، من چوومە ناو ژووری (تریتی) و بۆ موخاتەبەکردنی گەل. چەند سەعاتێك پێشتر، فرۆکە بۆمب هاوێژە دوورمەوداکان لە بنکەی هێزی ئاسمانیی (وایتمان) لە (مەیزووری) هەستابوون. ژێردەریاییە ئەمریکی و بریتانییەکان لە کەنداوی عەرەبی موشەکەی تۆماهۆکیان ئاراستە کردبوو. فرۆکە شەڕکەرەکانی هێزی دەریایی، لەسەر کەشتییەکانی (یو ئێس ئێس کارل ڤینسن) و (یوئێسئێس ئینتەرپرایز) بەرز ببوونەوە.

وتم "بە فرمانی من، سوپای ئەمریکا چەند هێرشێکی لەدژی کەمپەکانی مەشقی تیرۆریستی قاعیدە و بارەگا سەربازییەکانی رژێمی تاڵیبان لە ئەفغانستان ئەنجام داوە". هەستم بە بەکێشبوونێك کرد بەرەو بڕیارەکە. دەمزانی کە جەنگەکە مەرگ و خەفەت لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت. هەر ژیانێکی لەدەستچوو، خێزانێك بۆ تاهەتایە وێران دەکات. لە کۆتایی وتارەکەمدا، برگەیەکم لەو نامەیە خوێندەوە کە لە کچێکی پۆلی چوار پێم گەیشتبوو کە باوکی لە سوپادا بوو. نووسیبووی "بایی ئەوەندەی کە نامەوێ باوکم بچێ بۆ شەڕ، ئەوەندەش ئامادەییم تیایە باوکم بدەم بە تۆ".

شلەژانم لەبارەی قوربانیدان بەهۆی تەنگتاویی قەزیەکەوە هێور ببووەوە. نەهێشتنی پەناگەی ئارامی قاعیدە لە ئەفغانستان، جەوهەری بوو بۆ پاراستنی گەلی ئەمریکا. ئێمە بە ئاگاییەوە ئەرکەکەمان داڕشتبوو. ئێمە لە پێویستی و بەرگری کردن لەخۆ، نەك تۆڵە، هەنگاومان نابوو.

من لە پەنجەرەی ژووری (تریتی)یەوە روانیمە دەرەوە. لە دوورەوە دەمتووانی پەیکەری یادەوەریی جێفەرسن ببینم، کە وشەکانی راگەیاندنی سەربەخۆیی لەسەر دیوارەکە داتاشرابوون: "ئێمە ئەم راستییانە وەکو بەڵگەی حاشاهەڵنەگر هەڵدەگرین، ئەمەی کە هەمووان بە یەکسانی دروستکراون". لەمبەر بۆ ئەوبەری (پۆتۆماك) پێنتاگۆنی برینداری لێبوو. بۆ ماوەی بیست و شەش رۆژی پاش ١١ی سێپتێمبەر، ئێمە پلانمان دانابوو و خۆمان ئامادەکردبوو. ئێستا ئیتر چاوەڕوانییەکە بەسەرچووبوو. دژەهێرشی ئەمریکا لەرێگەدابوو. ئازادکردنی ئەفغانستان دەستی پێکردبوو.

***

ناردنی ئەمریکییەکان بۆ جەنگ، قوڵترین بڕیاری سەرۆکایەتیم بوو. من ئەمەم لە ساڵی ١٩٨٩دا بینیبوو، کاتێك من، لۆرا و کچەکان کریسمەسمان لە کامپ دەیڤد بەسەر برد. لە بیستی دیسەمبەردا، باوکم بیست و حەوت هەزار سەربازی ڕەوانەی پاناما کردبوو بۆ لەسەر حوکم لابردنی دیکتاتۆر (مانوێل نۆریگا) و گەڕاندنەوەی دیموکراسی.

ئۆپەراسیۆنی قەزیەی دادپەروەرانە، سەرکەوتوو ببوو. دیکتاتۆر بەخێرایی لەسەر حوکم لادرابوو. زیانەکانی ئەمریکا کەم بوون. هەمووشیان بە ڕۆحێکی ئیحتیفالییەوە وەرگیرابوون. بەڵام باوکم وەها نەبوو. بۆ بریندارەکان و خێزانەکانی کوژراوان- و بۆ فەرماندەکانیان- باجی شەڕەکە بە شێوەیەکی ئازاربەخش گەورە بوو.

من لە ئێوارەی بەر لە کریسمەسدا لە تەك دایکم و باوکمەوە وەستابووم و گۆرانی (کریسمەس کارۆل)مان دەوت کاتێك پیاوێکی ئایینیی هێزی دەریایی هاتە لامان. وتی "گەورەم، من هەر ئێستا لە (ویلفۆرد هۆڵ) لە (سان ئەنتۆنیۆ) گەڕامەوە، ئەو شوێنەی سەربازە بریندارەکانی لێن. بە جەماعەتم وت ئاخۆ پەیامێکیان هەیە بۆ سەرۆك، ئەو ئەتانبینم". ئەو بەردەوام بوو "ئەوان وتیان، تکایە بە سەرۆك بڵێ ئێمە مایەی شانازیمان کە خزمەتی وڵاتێکی گەورە دەکەین و شانازی بەوە دەکەین کە خزمەتی پیاوێکی گەورەی وەکو جۆرج بوش دەکەین". چاوەکانی باوکم پڕ بوون لە فرمێسك.

چرکەساتە کاریگەرەکە نیگایەکی زۆر نزیکی پێبەخشیم لەمەڕ ڕێژەی مردن لە ئەنجامی ڕەوانەکردنی سەربازدا بۆ شەڕ. بەڵام هیچ شتێك ئامادەی نەکردم بۆ ئەو هەستەی کاتێك من ئەو سەرۆکە بووم کە فرمانی ئەدا.

***

هەروەکو لە سەردانەکانمەوە دەزانم لە ماوەی سەرۆکایەتیی باوکمدا، کامپ دەیڤد یەکێکە لە ئیمتیازە گەورەکان کە دراوە بە سەرۆك. ئەم شوێنە کە کەوتووەتە چیاکانی (کاتۆکتین) لە ماریلاند و نزیکەی حەفتا مایل لە واشنتنەوە دوورە، پانتاییەکی ٢٠٠ هێکتارییە و لە کۆشکی سپییەوە نیوسەعات بە هەلیکۆپتەر دوورە. بەڵام زۆر دوورتر هەستی پێدەکرێ. ناوچە هێمنەکە، لەلایەن هێزی دەریاییەوە بەڕێوە دەبرێ و لەلایەن

مارینزەوە پارێزگاری لێ دەکرێت. پێکدێت لە کابینەی تۆکمە و ڕێڕەوی قەشەنگ بەناو دارستانەکاندا بۆ پایسکلسواری و پیاسە. فەزاکە هاندەری تێڕامان و بیرکردنەوەی ڕوونە.

کابینەی سەرۆکایەتی بە ئەسپین ناسراوە. دیوی ناوەوەی سادەیە، بەڵام ئاسودەبەخشە. بونیادە دارینەکە، سێ ژووری خەوتنی هەیە، قەبارەیەکی تەواوە بۆ خێزانەکەمان. ژوورێکی دانیشتنی بەر خۆرەتاوی هەیە کە لەوێ لەگەڵ مارڤینی برام و هاوڕێکانم سەیری تۆپی پێم دەکرد و ئاگردانێکی بەردین هەیە کە من و لۆرا حەزمان دەکرد لە تەنیشتییەوە کتێب بخوێنینەوە.

بە نزیکەی چارەکە مایلێك لە خوار گردەکەوە خانویەکی گەورە هەبوو بەناوی (لۆرێل) بە پانتاییەکی گەورەوە بۆ نان خواردن، ئۆفیسێکی سەرۆکایەتیی بچوك و ژوورێکی ناوپۆشی دار بۆ کۆنفرانس کە جیمی کارتەر ئەو کاتەی دانوستانی پەیماننامەکانی کامپ دەیڤدی دەکرد، بەکاری دەهێنا.

ئەمەش ئەو شوێنە بوو کە سەر لە بەیانیی یەکشەممەی ١٥ی سێپتێمبەر تیمی ئاسایشی نەتەوەییم تیایدا گردبوونەوە بۆ دەستکردن بە گەڵاڵەکردنی پلانی شەڕ بۆ ئەفغانستان. میزاجەکە هۆشیارانە، شێلگیرانە و بە تەرکیز بوو. ئەوەی لەگەڵ من لەدەوری مێزی دار مازوو دانیشتبوون، گەورە کاربەدەستانی ئاسایشی نیشتمانی بوون لە سەرتاسەری حکومەتەوە. پێکەوە چەند دەیەیەکی بەڕێوەبردنی قەیرانیان ئەزموون کردبوو.

یەکەم وتاری سەرەکی ئەو بەیانییە لەلایەن بەڕێوەبەری سی.ئای.ئەی جۆرج تێنێتەوە بوو. شەش مانگ پێشتر، بە ڕێنمایی من، جۆرج و ئەنجومەنی ئاسایشی نیشتمانی دەستیان کردبوو بە گەڵاڵەکردنی ستراتیژییەکی گشتگیر بۆ تێکشکاندنی تۆڕی ئەلقاعیدە. لە چوار ڕۆژی نێوان ١١ی سێپتێمبەر و کۆبوونەوەی کامپ دەیڤد، تیمی سی.ئای.ئەی پلانەکەیان چاکتر کردبوو. جۆرج پێشنیاری ئەوەی کرد کە دەسەڵاتی زیاتر بدەم بۆ کردەوەی نهێنی، لەوانەش مۆڵەتدان بە سی.ئای.ئەی بۆ کوشتن یان

دەستگیرکردنی بکەرانی قاعیدە بەبێ ئیعازی هەموو جارێکی من. بڕیارمدا کە وەڵامی داواکارییەکە بدەمەوە.

کرۆکی پلانی سی.ئای.ئەی هەڵمەتێکی نوێ بوو لە ئەفغانستان کە تیایدا پلانی ١١ی سێپتیمبەر داڕێژرابوو. ڕەگی ئامادەیی تیرۆریستی لە ئەفغانستان دەگەڕێتەوە بۆ ١٩٧٩، کاتێك یەکێتیی سۆڤیەت ئەوێی داگیر کرد و ڕژێمێکی بوکەڵەییەکەی بونیاد نا. خێڵە ئەفغانییەکان، شانبەشانی باندێك شەڕکەری ئیسلامیی توندڕەو بەناوی (موجاهیدین)، لەدژی داگیرکاریی بیانی ڕابوون. بە کۆمەکی ئەمریکا، پاکستان و سعودییە، یاخیبووان لە ساڵی ١٩٨٩دا پانزە هەزار زیانی گیانییان گەیاند و سۆڤیەتییەکانیان دەرپەڕاند. دوو ساڵ دواتر، زلهێزەکە هەرەسی هێنا.

ئازاد لە داگیرکەرانی کۆمەنیست، گەلی ئەفغان هەلی ئەوەیان هەبوو وڵاتەکەیان بونیاد بنێنەوە. بەڵام حکومەتی ئەمریکا چیتر بەرژەوەندیی نەتەوەیی لە ئەفغانستاندا نەبینییەوە، بۆیە پشتیوانی بڕی. دابڕانی ئەمریکا، یاریدەدەر بوو بۆ دروستبوونی بۆشایی. دەنگاوەرانی خێڵەکی کە شکستیان بە سۆڤیەتییەکان هێنابوو، لولەی چەکیان ئاراستەی یەکتری کردبووەوە. سەرەنجام، تاڵیبان، کە گروپێکی ئیسلامیی فەندەمێنتاڵیست بوو، دەسەڵاتیان گرتە دەست. ئەوان لقێکی ئیسلامیی توندڕەوی بەربەرییان سەپاند کە چوونی کچان بۆ قوتابخانەیان قەدەغە کردبوو، داوایان لە پیاوان دەکرد کە ریشیان تا درێژییەکی دیاریکراو بهێڵنەوە و نەیاندەهێشت ژنان بەبێ هاوڕێیەتی پیاوێکی خزمماڵەوە جێبهێڵن. سادەترین خۆشییەکان – گۆرانی وتن، چەپڵە لێدان و کۆلارە هەڵدان– قەدەغە کرابوون.

حوکمەکانی تاڵیبان لەلایەن پۆلیسی ئایینی دڕندەوە دەسەپێنران. ڕاپۆرتێکی ساڵی وەزارەتی دەرەوە ژنێکی دەکرد کە لە ململانێی هەڵگرتنی دوو منداڵی بچوك و بارێك لە شتومەکدا بوو لە (جادەیەکی مەزار شەریف). کاتێك ڕووپۆشە درێژەکەی لە ڕوخساری خزابوو، ئەو بە ئانتێنێکی ئۆتۆمبێل لێی درابوو. دژی شتە ناچیزەکان دەبرانە گۆڕەپانی نیشتمانیی تۆپی پێ بۆ بڕینی دەستیان.

هاوڕەگەزبازەکان تا مردن بەرد باران دەکران، و هەر کەسێکیش کە گومانی زینای لێبکرایە. بە ماوەیەکی کورت دوای ئەوەی تاڵیبان کابوڵی داگیر کرد، سەرۆکی پێشووی ئەفغانستانیان لە شوێنی خۆی لە بارەگای یو ئێن، رفاند. پاش لێدان و بڕینی گونەکانی، جەستەیان بە عەمودی گڵۆپەوە هەڵواسیبوو. لە پارێزگای (بامیان)، کە شوێنگەی کەمینەی (هەزارەکان)ە، تاڵیبان لانی کەم ۱۷۰ مەدەنیی بێ گوناهی لە کانوونی دووەمی ۲۰۰۱دا کۆکوژ کرد. کاتێکی دواتری ئەو ساڵە، دوو پەیکەری بودای تەمەن ۱۵۰۰ ساڵەی پارێزراویان تەقاندەوە.

هەندێ کەس هەبوون کە پێشوازیی گەرمییان لە تاڵیبان دەکرد. ماوەیەکی کورت پاش دەسەڵات گرتنەدەستیان، مەلا رادیکاڵەکان ئوسامە بن لادنی دامەزرێنەری قاعیدەیان پەنادا. لەنێوان ۱۹۹٦ بۆ ۲۰۰۱دا، بن لادن ژمارەیەك کەمپی لە ئەفغانستان بونیاد نا بۆ مەشقپێکردنی دە هەزار تیرۆریستی رێکخراو. لە بەرانبەردا، بن لادن لە سامانی کەسیی خۆی کێشایەوە بۆ کۆمەك کردنی تاڵیبان. بە هاتنی ۱۱ی سێپتێمبەر، ئەفغانستان تەنیا دەوڵەتێکی سپۆنسەری تیرۆر نەبوو، بەڵکو دەوڵەتێك بوو کە تیرۆر سپۆنسەری دەکرد.

لەکاتێکدا کە ئایدۆلۆژیای تاڵیبان توند بوو، کۆنترۆڵی بەسەر وڵاتەکەیدا وەها نەبوو. لە ناوچەیەکی بچوکی باکووری ئەفغانستاندا، گروپێکی فەرماندە خێڵەکییەکان کە پێیان دەوترا (هاوپەیمانێتیی باکوور) پشتیوانیی دانیشتووانی لۆکاڵەکەی هەبوو. لە ۹ی سێپتێمبەری ۲۰۰۱دا، بکەرەکانی بن لادن، سەرۆکی خۆشەویستی هاوپەیمانیی باکوور (ئەحمەد شا مەسعود)یان تیرۆر کرد. کوشتنی ئەو، وای لە هاوپەیمانێتییەکە کرد کە هاوکاری ئەمریکا بکات. ئێمە لە دوژمنێك و مکورییەك بۆ کۆتایی هێنان بە حکومی تاڵیبان، هاوبەش بووین.

پلانی جۆرج بانگەوازی سازدانی تیمەکانی سی.ئای.ئەی بوو بۆ چەکدارکردن، دارایی بۆ دابینکردن و چوونەپاڵ هێزەکانی هاوپەیمانێتیی باکوور بوو. پێکەوە ئەوان تەوژمە سەرەتاییەکانی هێرشەکەیان پێکدەهێنا. بە یەکخستنی هێزەکانمان لەگەڵ ئۆپۆزسیۆنی

لۆکالدا، خۆمان لادەدا لە دەرکەوتن وەکو داگیرکەرێک. ئەمریکا یارمەتی گەلی ئەفغانی دەدا تاوەکو خۆیان ئازاد بکەن.

***

ئێمە بە تەنیا هەنگاومان نەدەنا. کۆلن پاول بە کۆکردنەوەی ولاتان بۆ ناو هاوپەیمانێتییەکەمان، کارێکی بێ وێنەی ئەنجام دابوو. هەندێ ولات، وەکو بریتانیا و ئوستڕالیا، پێشنیاری دابەزاندنی هێزیان کردبوو. ئەوانیتر، لەوانەش ژاپۆن و کۆریای باشوور، پەیمانی کۆمەکی مرۆیی و پشتگیریی لۆجستییان دابوو. کۆریای باشوور دواتر هێزی سەربازی رەوانە کردبوو. هاوکارە عەرەبییە سەرەکییەکان، وەکو ئوردن و سعودییە، لە هەوالگریی هەستیاردا لەبارەی ئۆپەراسیۆنەکانی قاعیدەوە هاوبەش بوون.

ولاتی هەرە گرنگ کە هەماهەنگمان کردبوو، پاکستان بوو. هیچ ولاتێک ئەوەندەی دراوسێ خۆرهەلاتییەکەی لە ئەفغانستان کاریگەری نەبوو. لە ١١ی سێپتێمبەردا، پاکستان یەکێك بوو لە تەنیا سێ ولات کە دانیان بە تالیبان دا نابوو. سعودییە و ئیمارات دوانەکەی تر بوون.

لەوانەیە هەندێ کەس بە پاکستان هاوسۆزی ئایدۆلۆژیای تالیبان بووبن. بەلام ئەنگێزەی سەرەکی بریتی بوو لە پارسەنگ دانەوە بە هیندستان، نەیاری رەزاقورسی پاکستان. تا ئەو کاتەی کە پاکستان وەفادار بوو بەرانبەر حکومەتی ئەفغانستان، هەرگیز گەمارۆ نەدەدرا.

پاکستان مێژوویەکی پرکێشەی لەگەڵ ئەمریکا هەبوو. پاش هاوکاریی نزیکمان لە جەنگی سارد دا، کۆنگرێس کۆمەکی بۆ پاکستان هەلپەساردبوو- لەوانەش ئەو ئێف شانزە ویستراوانەی ئەمریکا بەلێنی دابوو پێی بفرۆشێت- لە ئەنجامی نیگەرانیی لە بەرانبەر پرۆگرامی چەکی ناوکیی ولاتەکە. لە ١٩٩٨دا، پاکستان تاقیکردنەوەیەکی ناوکیی نهێنیی ئەنجامدابوون کە سزای زیاتری لێ کەوتبووەوە. سالێك دواتر، ژەنەراڵ پەروێز موشەرەف بە کودەتایەك، حکومەتی دیموکراتییانە هەلبژێردراوی سەرنگون کردبوو. بەهاتنی ٢٠٠١، ئەمریکا نزیکەی هەموو کۆمەکێکی لە پاکستان بڕیبوو. لە ١٣ی سێپتێمبەردا، کۆلین تەلەفۆنی بۆ سەرۆك موشەرەف کرد و جەختی لەوە کردەوە کە

دەبێ بڕیار بدات لە کام بەرەیەیە. ئەو لیستێکی دانوستان لەسەرنەکراوی داواکاری خستەڕوو، لەوانەش ئیدانەکردنی هێرشەکانی ١١ی سێپتێمبەر، نکوڵیکردن لە پەناگەی ئارام بۆ قاعیدە لە پاکستان، ئاڵوگۆڕی هەواڵگری، بەخشینی مافەکانی فڕین بە ئاسمانی وڵاتەکەیدا بە ئێمە و بڕینی پەیوەندی دیپلۆماسی بە تالیبانەوە.

موشەرەف ڕووبەڕووی گوشاری توندی ناوخۆیی بووەوە. هەڵگەڕانەوە لەدژی تالیبان بۆ توندڕەوانی ناو حکومەتەکەی و دەزگای هەواڵگرییەکەی شتێکی بیرلێنەکراوە بوو. لە ماوەی ناوبڕێکدا لە کۆبوونەوەی ئەنجومەنی جەنگدا لە کامپ دەیڤد، تەلەفۆنێکم بۆ موشەرەف کرد. وتم "دەمەوێ سوپاست بکەم لەبەرانبەر گوێگرتنت بۆ داواکارییەکانی وڵاتە خەمبارەکەمان و چاوەڕێ دەبم بۆ پێکەوە کارکردن بۆ دانە دادگای ئەو خەڵکانە".

موشەرەف وتی "مەترسییەکان گەورەن. ئێمە لەگەڵ ئێوەین".

پەیوەندییەکانمان لەگەڵ پاکستان ئاڵۆز کەوتەوە. بەڵام لە ماوەی چوار ڕۆژدا، دراوسێی هەرە گرنگی ئەفغانستانمان لە پشتیوانێکی تالیبانەوە کردبووە شەریکێك بۆ لابردنیان لەسەر حوکم.

***

وتاری دواتر لەلایەن سوپاوە بوو. دۆن ڕەمسفێلد بانگهێشتی سەرۆکی هەیئەی ئەرکانی هاوبەش (هیوگ شێلتن)، هەڵمەتبەرێکی سوپا لە دوایین مانگی کارەکەیدا، و جێگری سەرۆك (دیك مایەرز)، ئەو ژەنەراڵەی هێزی ئاسمانی کە کاندیدم کردبوو بۆ شوێنگرتنەوەی، کردبوو. ئەوان سێ بژارەیان خستبووە بەردەمم.

یەکەمیان بریتی بوو لە پلانی شیمانەیی پێنتاگۆن، ستراتیژی لەپێشدا هەبوو بۆ بەکارهێنانی لە حاڵەتی ئیمێرجێنسیدا. ئەم پلانە هاوێشتنی موشەکی کروزی بۆ سەر کەمپەکانی قاعیدە لە ئەفغانستان پێویست دەکرد. دەکرا پلانەکە دەستبەجێ پیادە بکرێ، بێ هیچ مەترسییەك بۆ سەر سەربازانی ئەمریکی.

بژارەی دووەم بریتی بوو لە ئاوێتەکردنی لێدانی موشەکە کروزەکان لەگەڵ هێرشە بۆمبهاوێژییەکان. ئەمە ڕێگەی بۆ ئێمە خۆش دەکرد بۆ پێکانی ئامانجی زیاتر، لەکاتێکدا کە فڕۆکەوانەکانمان ڕووبەڕووی مەترسی سنووردار دەکردەوە.

سێیەم و توندترین بژارە بریتی بوو لە جێگیرکردنی موشەکی کروز، بۆمبهاوێژ و هێز لەسەر ئەرز. ئەمەیان زیاتر بژارەیەکی تیۆری بوو، دەبووایە سوپا وردەکاری زۆرتر لەسەر ئەمە بدات بە دەستەوە.

ژەنەراڵ شیلتن جەختی لەوە کردەوە کە کات و دیپلۆماسی پێویستە بۆ جێگیرکردنی هێزەکانمان لە وڵاتێکی شاخاوی عاسێدا. ئێمە پێویستمان لە مافەکانی بنکە و بارگەدانان، مۆڵەتی فڕین و توانای گەڕان و ڕزگارکردن دەبێت- چ جای کەش و هەوای گونجاو و بەختێکی باش.

مشتومڕێکی بەرفراوان بەدواداهات. جۆرج تێنێت هۆشداری ئەوەیدا کە لێدانێکی تۆڵەسێنانە لەسەر خاکمان ئەگەری هەیە. ئەو وتی "ئێمە ناتوانین بەریان پێبگرین ئەگەر ئەوان پلانی خولی دووەمیان دارشتبێت". هەروەها ڕەشبینانە وتی "وای بۆدەچم کە جۆرە چەکێکی کیمیای و بایۆلۆژییان هەبێ".

دیک چێنی نیگەرانی ئەوە بوو کە ڕەنگە جەنگ پاکستانیش بگرێتەوە و وا لە حکومەت بکات کۆنترۆڵی وڵات و بە ئەگەرێك لە ئەگەرەکان تەقەمەنیی ناوکی لەدەست بدات. هەروەکو ستیڤ هادلی-ی جێگری ڕاوێژکاری ئاسایشی نیشتمانی بەشێوەیەکی جوان گوزارشتی لێکردبوو "ئەمە سیناریۆیەکی مۆتەکەئاسا دەبێ".

لە ساتێك لە ساتەکاندا، جێگری وەزیری بەرگری (پۆل ولفۆویتز) پێشنیاری ئەوەی کردبوو کە شەڕ لەگەڵ عیراق و بەهەمان شێوە تالیبانش لەبەرچاو بگرین. پێش ١١ی سێپتێمبەر، دیکتاتۆریەتی دڵڕەقانەی سەدام حسێن بە شێوەیەکی بەرفراوان وەکو ترسناکترین وڵات لە جیهاندا لەقەڵەم درابوو. ڕژێمەکە، تۆمارێکی درێژی پشتگیریی تیرۆریزمی هەبوو، لەوانەش پارەدان بە خێزانەکانی تەقینەرەوە خۆکوژە فەلەستینییەکان. هێزەکانی سەدام بەشێوەیەکی ڕۆتینی تەقەیان لەو فڕۆکەوانە ئەمریکی و بریتانییانە دەکرد کە لە ناوچەی دژەفڕینی سەپێنراو لەلایەن نەتەوە یەکگرتووەکانەوە دەسوڕانەوە. عیراقیش زیاتر لە دەیەیەك بەرەنگاریی ئەو بڕیارانەی یونێن-ی کردبوو کە داوای دەکرد بیسەلمێنێت چەکە کۆکوژەکانی لەناوبردووە.

دۆن ڕەمسفێڵد وتی "ڕووبەڕووبوونەوەی عێراق پابەندییەکی گەورە بە ئەنتی تیرۆریزم پیشان دەدات".

کۆلن لە بەرانبەر ئەمە هۆشداریدا. ئەو وتی "وێڵبوون بەدوای عێراق لە ئێستادا لە شێوەی کورتپێهێنانی چاوەڕوانییەکاندا دەبینرێ". ئێمە نەتەوە یەکگرتووەکان، وڵاتانی ئیسلامی و ناتۆ لەدەست دەدەین. ئەگەر قەرار وایە لە عیراق بدەین، دەبێ لەو کاتەدا ئەمە بکەین کە خۆمان هەڵیدەبژێرین. بەڵام نابێ ئێستا ئەمە بکەین، چونکە رایەڵمان بەم مەسەلەیەوە نییە".

جۆرج تێنێت-یش هەمان رەئی هەبوو و وتی "ئێستا لە عیراق مەدە. ئەمە هەڵەیەکی گەورە دەبێت. پێویستە یەکەم ئامانج قاعیدە بێت".

دیک چێنی لە هەڕەشەی سەدام حسێن تێدەگەیشت و بڕوای وابوو کە دەبێ موخاتەبەی بکەین. ئەو وتی "بەڵام ئێستا کاتی ئەوە نییە. ئێمە تین و توانمان لەدەست دەدەین. لە ئێستادا دەبێ خەڵکی لەنێوان ئەمریکا و پیاوە خراپەکاندا یەکێکیان هەڵبژێرن".

من پێشوازیم لە مشتومڕە پڕجۆش و خرۆشەکە کرد. گوێگرتن لە مشتومڕەکە و دید جیاوازەکان یاریدەدەر بوون بۆ روونکردنەوەی بژارەکان. من نیازم نەبوو لەو ساتانەدا بڕیار بدەم. ئەمەیان رۆژی دواتر بوو.

***

رۆژی یەکشممە، ١٦ی سێپتێمبەر، رۆژی تێرامان بوو. من و لۆرا چووین بۆ رێورەسمی ئایینی لە پەرستگای جوانی (ئێفەرگرین) لە کامپ دەیڤد. پەرستگاکە کە لە ماوەی ئیدارەی ریگن-دا دەستپێکردبوو و لە سەردەمی باوکمدا تەواو کرابوو، شوێنێکی تایبەت بوو بۆ خێزانەکەی من. یەکەم ئاهەنگی گواستنەوە کە لەوێ ئەنجامدرا لەنێوان دۆرۆی خوشکم و مێردە نایابەکەی، (بۆبی کۆچ) بوو.

لە سەعات ١٠ی بەیانیی ئەو یەکەم یەکشەممەیەی پاش ١١ی سێپتێمبەر، ڕووناکی درەنگانی هاوین بە دارستانە کپەکەدا تێپەڕی بۆ ناو پەرستگاکە. هێزی دەریایی و

هەیئەی مارینز و ئەندامانی خێزان لە پەرستگاکە هاتنە لامان، هەروەکو ئەندامانی تیمی ئاسایشی نەتەوەییش کە لە کۆبوونەوەکەی ڕۆژی پێشوو مابوونەوە، هاتن.

کامپ دەیڤد بەرەکەتی بەسەردا باریبوو کە قەشەیەکی ئاپابی وەکو پیاوی ئایینی هێزی دەریایی (بۆب ویلیامز)ی هەبوو. سروتەکەی ئەو لەو یەکشەممەیەدا کاریگەر و ئاسودەبەخش بوو. ئەو پرسیارگەلێکی ئاراستە کرد کە زۆرێک لە ئێمەمانانی گیرۆدە کردبوو: "بۆچی؟...چۆن دەشێ ئەمە رووبدات خودایە؟"

بۆب وتی وەڵامەکە لەودیو توانای ئێمەوەیە. ئەو دانی نا کە "هەندێ جار ژیان پێچ و پەنایەکە لە هاودژییەکان و ناگونجاوییەکان. لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە دەتوانین ئاسودەیی وەرگرین لە زانینی ئەوەی کە پلانی خودا سەردەکەوێ. ئەو چەند دێرێکی لە وتەی (سەینت ئیگناتیۆس)ی لۆیۆلا هێنایەوە : "وا نزا بکە کە هەمووی بەندە بە خوداوە، چونکە هەروایە. بەڵام کار بکە وەك بڵێی هەمووی پەیوەستە بە خۆمانەوە، چونکە هەروایە".

پاش ڕێوڕەسمە ئایینییەکە، من و لۆرا سواری (مارین وەن) بووین بۆ فڕینەوە بەرەو واشنتن. بە هاتنی ئەو پاش نیوەڕۆیە، من گەیشتبوومە ساتێکی بڕیاردانی یەکلاییکەرەوە لە سەرۆکایەتییەکەمدا: ئێمە شەڕی دژی تیرۆر دەکەین لە بەرانبەر شەڕانگێزییەکەدا و یەکەم بەرەی جەنگیش ئەفغانستان دەبێ.

بڕیارەکەم دابڕانێك بوو لە ڕێوشوێن و بەرنامەکانی ئەمریکا لە ماوەی دوو دەیەی رابردوودا. پاش ئەوەی تیرۆریستانی حزبوڵڵا بنکەکانی مارینز و باڵیۆزخانەی ئێمەی لە لوبنان لە ساڵی ۱۹۸۳دا تەقاندبووەوە، سەرۆك ریگن هێزەکانمانی کشاندبووەوە. کاتێك مافیا تیرۆریستەکان لە سۆماڵ هەلیکۆپتەرێکی بلاك هۆکی ئەمریکییان لە ساڵی ۱۹۹۳دا بەردابووەوە، سەرۆك کلینتن سەربازەکانمانی دەرهێنابوو. لە ۱۹۹۸دا، تەقاندنەوەی دوو باڵیۆزخانەی ئەمریکی لە خۆرهەڵاتی ئەفریقا لەلایەن قاعیدەوە وای لە سەرۆك کلینتن کردبوو موشەکی کروز بهاوێژێتە پێگەکانی قاعیدە لە ئەفغانستان. بەڵام کەمپەکانی مەشق بەشێوەیەکی بەرفراوان جێ هێڵرابوون و لێدانە دوورمەوداکان بێ ئاکام و پووچ

دەرچوون. کاتێك قاعیدە کەشتی (یوئێس ئێس کۆل) لە کەناراوی یەمەن تەقاندەوە، ئەمریکا تەقریبەن هیچ کاردانەوەیەکی نیشان نەدا.

پێشینانی من بڕیاری خۆیان لە سەردەمێکی جیاوازدا دا. پاش ئەوەی قاعیدە نزیکەی سێ هەزار کەسی لە ئەمریکا کوشت، روون بوو کە تیرۆریستان نەبوونی کاردانەوەیەکی جدیان لەلایەن ئێمەوە بە نیشانەیەکی لاوازی و بانگهێشتێك بۆ تەقەلای هێرشی بێ شەرمانەی زیاتر لێکدابووەوە. پەیامەکانی قاعیدە زۆرجار وەکو بەڵگەیەکی ئەوە ئاماژە پێدەکرد کە، وەکو بن لاد خۆی دەڵێت، "ئەمریکییەکان پڵنگی کاغەزین" کە دەکرێ "لە کەمتر لە بیست و چوار سەعاتدا" راوبنرێن.

پاش ١١ی سێپتێمبەر، من سوور بووم لەسەر گۆڕینی ئەو بۆچوونە. من بڕیارمدا یەکێك لەو بژارە هەرە توندانەی سێ بژارەکەی ژەنەراڵ شیلتن پیادە بکەم کە داینابوون. موشەکی کروز و هێرشی بۆمبهاوێژ بەشێك دەبن لە کاردانەوەمان، بەڵام ئەمانە بەس نین. هاویشتنی بۆمبی گرانبەها بۆ سەر کەمپە دانیشتووان دەگمەنەکان دەستی تاڵیبان لە وڵاتەکە بەرنادات یان پەناگەی قاعیدە وێران ناکات. ئەمە تەنیا بڕوای تیرۆیستان بتەو دەکات بەوەی کە بەبێ ئەوەی باجێکی جدی بدەن دەتوانن لێمان بدەن. ئەم جارە ئێمە هێز دادەبەزێنین و لەوێ دەیانهێڵینەوە تا قاعیدە دەردەپەڕێنرێت و کۆمەڵگەیەکی ئازاد سەرهەڵدەدات. ئەگەر بەڵگەی لێبڕاوانەم دەست نەکەوتایە بۆ رایەڵکردنەوەی سەدام بە پیلانی ١١ی سێپتێمبەرەوە، ئەوا کارم دەکرد بۆ چارەسەرکردنی کێشەی عێراق بە شێوەیەکی دیپلۆماسی. ئومێدەوار بووم گووشاری یەکخراو لەلایەن جیهانەوە بشێ سەدام ناچار بکات بۆ وەڵامدانەوەی ئەرکە نێودەوڵەتییەکانی. باشترین رێگە بۆ ئەوەی پیشاندانی بدەین کە ئێمە جدین، سەرکەوتن بوو لە ئەفغانستان.

سبەینەی دواتر، ئەنجومەنی ئاسایشی نیشتمانیم لە ژووری (کابینە) کۆ کردەوە. وتم "ئامانجی ئەم کۆبوونەوەیە، سپاردنی ئەرکە بۆ یەکەم شەپۆلی جەنگ دژی تیرۆریزم. ئەمەش لەوڕۆوە دەست پێدەکات".

***

بە ماوەیەکی کورت دوای ١١ی سێپتێمبەر، (دێنی هاستێرت)ی سەرۆك ئەنجومەنی نوێنەران، پێشنیاری ئەوەی کە کردبوو کە من موخاتەبەی دانیشتنێکی هاوبەشی کۆنگرێس بکەم، هەروەکو چۆن سەرۆك فرانکلین رۆزڤێلت پاش رووداوەکەی پێرل هاربەر ئەمەی کردبوو. من کەیفم بە بیرۆکەکە هات، بەڵام ویستم چاوەڕێ بم تاوەکو ئەو کاتەی شتێك دەبێ بیڵێم. ئێستا هەمبوو. ئێمە وتارەکەمان بۆ ٢٠ی سێپتێمبەر دانا.

دەمزانی گەلی ئەمریکا پرسیارێکی زۆریان هەیە: کێ هێرشی کردووەتە سەرمان؟ بۆچی رقیان لێمانە؟ جەنگ چۆن چۆنی دەبێ؟ هەر هاوڵاتییەکی ئاسایی چی لێ چاوەڕێ دەکرێت؟ وەڵامەکان کرۆکی وتارەکەی منیان پێکدەهێنا. من بڕیارمدا بانگهێشتی میوانێکی تایبەت بکەم تا لە وتاردانەکەمدا ئامادە بێت، ئەویش سەرۆك وەزیرانی بریتانیا تۆنی بلێر بوو. چەند سەعاتێك بەر لەوەی بەرەو بینایەی کۆنگرێس بکەومە ڕێ، تۆنی هاتە کۆشکی سپی بۆ نانی ئێوارە. من بۆ لای سوچێکی هێمن بردم تاوەکو دەنگ و باسی تازەی پێبدەم لەبارەی پلانەکانی جەنگ، لەوانەش بڕیارم بۆ دابەزاندنی هێزی زەمینی. ئەو جەختی لەوە کردەوە کە بریتانیای مەزن لەگەڵ ئێمەدا دەبێت. نزیکترین هاوپەیمانی ئەمریکا لە جەنگەکانی دوایین سەدەدا لە یەکەم جەنگی سەدەی نوێدا لەگەڵ ئێمەدا دەبێ.

لەکاتێکدا کە چرکەساتی پێشکەشکردنی وتارەکە نزیك دەبووەوە، تۆنی وتی "پێناچێت تۆ بە هیچ شێوەیەك نیگەران بیت، جۆرج. ئایا کاتێکت بە تەنیا پێویست نییە؟" من بیرم لەوە نەکردبووەوە تا ئەو کاتەی ئەو قسەی کرد. پێویستم بەوە نەبوو تەنیا بم. من کاتم وەرگرتبوو بۆ دانی بڕیارێکی ئاگایانە و دەمزانی دەمویست چی بڵێم. سەرباری ئەمەش، ستایشی لە تەك وەستانی هاوڕێکەم کرد.

لە ١٤ی سێپتێمبەردا ژینگەی ناو ژووری ئەنجومەنی نوێنەران هەستێکی جیاوازی لە کەنیسەی نیشتمانیی سەرەکی ئەبەخشی. ئاوێتەیەك هەبوو لە وزە، تووڕەیی و بەرەنگاری. من دواتر بۆم دەرکەوت کە زیاتر لە هەشتاودوو ملیۆن کەس تەماشای تەلەفزیۆن دەکەن، گەورەترین ژمارەی بینەر تا ئەو کاتە بۆ وتاری سەرۆکایەتی. من بەم شێوەیە دەستم پێکرد "لە ڕەوگەی ئاسایی رووداوەکاندا، سەرۆکەکان دێنە ئەم ژوورە

بۆ راپۆرتدانی ساڵانە لەسەر دەسکەوت و پلانەکانی حکومەت". "ئەمشەو، راپۆرتێکی وەها پێویست نییە. بگرە ئەنوکە لەلایەن گەلی ئەمریکاوە پێشکەشکراوە...هاوڵاتیانم، ئێمە بەرنامەی ساڵانەی خۆمان بینیووە- و بەهێزیشە".

من بە ئاقاری پرسیار و وەڵامەکاندا هەنگاوم نا- ناسنامەی تیرۆریستان، ئایدۆلۆژیایان و ئەو جۆرە نوێیەی جەنگ کە ئێمە بەرپامان دەکرد. وتم "کاردانەوەکەمان زۆر زیاتر دەبێ لە تۆڵەی دەستبەجێ و لێدانی جیا جیا". "نابێ ئەمریکییەکان پێشبینی یەک شەڕ بکەن، بگرە هەڵمەتێکی درێژخایەن، بە پێچەوانەی هەر یەک لەوانەی تاوەکو ئێستا بینیوومانە. لەوانەیە لێدانی دراماتیکی بگرێتەخۆ، ئۆپەراسیۆنی بینراو لەسەر تەلەفزیۆن، و شاراوە، نهێنی تەنانەت لە سەرکەوتنیشدا...هەر وڵاتێک، لە هەر ناوچەیەک، ئێستا بڕیارێک هەیە کە بیدات. چ ئەوەی ئێوە لەگەڵمانن، یان لەگەڵ تیرۆریستانن".

من دوایین هۆشداریم دایە تاڵیبان: "ئەوان تیرۆریستان رادەست دەکەن، یان هەمان چارەنووسیان دەبێ". ئێمە ئومێدێکی کەممان هەبوو بەوەی کە سەرکردەکانی ئەفغانستان وەڵام ئەدەنەوە. بەڵام پیشاندانی بەرەنگارییان بە جیهان، پاساوی ئێمەی توندتر دەکرد بۆ گورزی سەربازی. لەکاتێکدا کە لە ئەنجامگیری نزیک دەبوومەوە، وتم:

"لە خەم و تورەییماندا، ئەرکی خۆمان و چرکەساتی خۆمان دۆزییەوە....ئێمە بە تەقەلای خۆمان، بە ئازایەتی خۆمان جیهان لە پای ئەم قەزیەیەدا کۆ دەکەینەوە. ئێمە ماندوو نابین، پەکمان ناکەوێ و شکست ناهێنین.

ئەوە ئومێدی منە کە لە مانگ و ساڵانی ئایندەدا، ژیان تەقریبەن بۆ باری ئاسای دەگەڕێتەوە. ئێمە دەگەڕێینەوە بۆ سەر ژیان و رۆتینیاتی خۆمان و ئەمەش باشە. تەنانەت بەپێی تێپەڕینی کات خەفەتیش نامێنێت. بەڵام دەبێ ئاواتمان هەروا تێنەپەڕێ. هەر یەک لە ئێمە بیریەتی کە ئەو رۆژە چی روویدا و بەسەر کێدا هات. ئێمە ئەو ساتەمان بیرە کە هەواڵەکان چی خوێندەوە- لە کوێ بووین و چیمان دەکرد. هەندێ کەس وێنەی ئاگر، یان بەسەرهاتی رزگاردنیان لە یاد دەبێ. هەندێ کەس یادەوەری روخسارێک و دەنگێکیان لە یاد دەبێ کە بۆ تامەتایە رۆیشت.

منیش ئەمەم هەلگرتووە: ئەمە ئارمی پۆلیسی ئەو پیاوەیە کە ناوی جۆرج هاوەردە، کە لە هەوڵی رزگارکردنی ئەوانیتردا لە سەنتەری بازرگانی جیهانی گیانی سپارد. ئەمە دایکی پێی داوم، ئارلین، وەکو یاکردنەوەیەکی پڕشانازییانەی کورەکەی. ئەمە بیرهێنەرەوەی منە بۆ ئەو ژیانانەی کۆتاییان هات و ئەرکێك کە کۆتایی نایەت. من ئەم برینەی سەر جەستەی ولاتەکەم یان ئەوانەی کە دروستیان کرد لەیاد ناکەم. من سەر دانانەوێنم: پشو نادەم، من لەم ململانێیەدا بۆ ئازادی و ئاسایشی گەلی ئەمریکا مل نادەم".

***

رۆژی دواتر، ٢١ی سێپتێمبەر، من خۆم خستە ناو پلاندانانی جەنگ. مامەڵەکردن لەگەڵ سوپادا وەکو فەرماندەی هێزە چەکدارەکان ئەزموونێکی نوێ بوو. یەکپۆشیی ئەفسەران بە ریزێك قردێلەوە، رۆشنایی دەخستەسەر شارەزایەتیی سەربازییان کە زۆر بەرفراوانتر بوو لەوەی من.

بەری حەوت مانگ، من و لۆرا لە کۆشکی سپی ئامادەی ئێوارەخوانێك بووین بۆ سەرکردە سەربازییەکان و هاوسەرەکانیان. ئومێدەوار بووم کە کەمێك لە رەسمیاتەکە بشکێنم و لە ئاستێکی کەسیدا ژەنەراڵ و ئەدمیراڵەکان بناسم، بۆئەوەی بەلایانەوە ئاسایی بێت بۆچوونی راشکاوانەیان بە من بگەیەنن و هەستێکی ئاسودەتریان هەبێ کە پرسیارم لێ بکەن.

یەکێك لەو فەرماندانەی کە من چاوم پێیان کەوت تۆمی فرانکس بوو کە لەگەڵ (کاسی) ژنیدا هاتنە کۆشکی سپی. تۆمی، سینگی بە میداڵ داپۆشرابوو، لەوانەش کۆمەڵێك ئەستێرەی برۆنز و دڵی پەمەیی لە جەنگی ڤێتنامەوە. وەکو ژەنەراڵێکی یەك ئەستێرەیی، ئەو لە جەنگی کەنداودا فەرماندەیی سەربازەکانی کردبوو. لە ساڵی ٢٠٠٠دا، ئەو پۆستی گەورەی فەرماندەیی ناوەندی وەرگرتبوو، کە رووبەرێکی لە ژووروی ئەفریقاوە تاوەکو ئاسیای ناوەڕاست دەگرتەوە، لەوانەش ئەفغانستان.

وتم "ژەنەراڵ، دەزانم تۆ خەڵکی میدلاندی تەکساسی".

بە خەندەیەکی گەرم و گوڕ و بە خاوییەکی تەکساسیانەوە وتی "بەڵێ جەنابی سەرۆک" وتم" بیستوومە کە تۆ لەگەڵ لۆرا چوویت بۆ قوتابخانەی ئامادەیی".

وتی "بەڵێ گەورەم، ساڵێک پێش ئەو تەخەروجم کرد. بەڵام نیگەران مەبە جەنابی سەرۆک هەرگیز رقم لێی نەبووە".

پێکەنینێکی گەورەم بە دەما هات. ئەمە شتێکی خۆش بوو کە بە فەرماندە گشتییە نوێکەتی بڵێیت. هەستێکم هەبوو لەمەڕ ئەوەی کە من و تۆمی بەینمان زۆر خۆش دەبێ.

تۆمی روونی کردەوە کە ئەرکەکە لە ئەفغانستان ئاسان نابێت. هەموو شتێک لەبارەی وڵاتەکەوە پرکێشە دیار بوو. شوێنێکی دابڕاو، سەخت و بەرایبە. بەشە باکوورییەکەی، زێدی ئوزبەک، هەزارە، تورکمان، تاجیك و قەومە رەسەنەکانی ترە. بەشە باشوورییەکەی لەلایەن پشتوونەکان داگیر کراوە. نەیارییە خێڵەکی، ئەتنی و ئایینییەکان دەگەڕێتەوە بۆ بەری سەدەیەک. لەگەڵ ئەوەشدا، بە هەموو جیاوازییەکانیانەوە، گەلی ئەفغانستان شێوازێکیان هەیە بۆ یەکگرتن لەدژی بیانییەکان. ئەوان لە سەدەی نۆزدەدا بریتانییەکانیان کردە دەرەوە. لە سەدەی بیستەمدا سۆڤیەتییەکانیان کردە دەرەوە. تەنانەت ئەلیکساندەری مەزنیش نەیتوانی وڵاتەکە داگیر بکات. ئەفغانستان ناوێکی نەگریسی بەدەستهێنابوو: گۆڕستانی ئیمپراتۆریەتەکان.

پلانی جەنگی تۆمی، کە دواتر ناوی کۆدی وەگرت ئۆ.ئی.ئێف (ئۆپەراسیۆنی ئازادیی خۆگر)، چوار قۆناغی لەخۆی گرت. یەکەمیان گرێدانەوەی خێزە تایبەتییەکان بوو بە تیمەکانی سی.ئای.ئەی بۆ پاککردنەوەی رێگاکە بۆئەوەی هێزە سەربازییە تەقلیدییەکان بێن. قۆناغی دواتر هەڵمەتێکی ئاسمانیی گەورە بوو بۆ دەرپەڕاندنی ئامانجەکانی قاعیدە و تاڵیبان و بەردانەوەی کەرەستەی مرۆیی لە ئاسمانەوە بۆ گەیاندنی کۆمەک بە گەلی ئەفغان. قۆناغی سێیەم بریتی بوو لە بانگەواز بۆ هێزی زەمینیی هەم لە ئەمریکا و هەم لە شەریکەکانی هاوپەیمانێتییەوە بۆ چوونەناو وڵاتەکە و ڕاوکردنی پاشماوەی شەڕکەرانی تاڵیبان و قاعیدە. دواجار، ئێمە وڵاتەکە سەقامگیر دەکەین و یارمەتی گەلی ئەفغان دەدەین تا کۆمەڵگەیەکی ئازاد بونیاد بنێن.

من رۆڵی خۆمم لەوەدا بینییەوە کە دڵنیا بمەوە لەوەی ئاخۆ پلانەکە گشتگیر و کۆکە لەگەڵ ڕوئیای ستراتیژی– لەم حاڵەتەدا، نەهێشتنی تالیبان، بەرگرتن لە پەناگە بۆ قاعیدە، و یارمەتیدان بۆ دەرکەوتنی حکومەتێکی دیموکرات. من پرسیارێکی زۆرم لە تۆمی کرد: چەند سەرباز پێویست دەبێ؟ چ جۆرە بنکەدانانێك فەراهەم دەبێ؟ چەند دەخایەنێ تا هەمووان دەجوڵێنین بۆ ئەوێ؟ چ ئاستێکی بەرەنگاریی دوژمن پێشبینی دەکات؟ هەوڵم نەدا بڕیارە تاکتیکییەکان یان لۆجستییەکان بەڕێوە ببەم. غەریزەم ئەوە بوو کە متمانە بە حوکمی سەرکردایەتیی سوپا بکەم. ئەوان شارەزایانی مەشق دیتوو بوون. منیش فەرماندەیەکی گشتیی تازە بووم. فۆتۆیەکانی سەردەمی ڤێتنامی لیندۆن جۆنسن و (ڕۆبەرت مکنامارا)ی وەزیری بەرگریم لەبیرە کە ڕژاونەتە سەر نەخشەکان بۆ دیاریکردنی ئامانجەکانی بۆمب لێدان بۆ ئەرکە ڕۆتینییەکان. بەڕێوەبردنە بەشەکییەکەیان، لە سەرەوە تا خوارەوەی هەیکەلی فەرماندەیی کاریگەریی هەبوو. کاتێك من لە قوتابخانەی فڕین بووم، یەکێك لە مامۆستایانم کە لە ڤێتنام فڕۆکەوانی کردبوو، سکاڵای ئەوەی دەکرد کە هێزی ئاسمانی ئەوەندە سنووردار بوو کە دوژمن دەیتووانی دەقاودەق بزانێ چ کاتێك و لە کوێ دەفڕین. بە بۆچوونی ئەو هۆکارەکەش ئەمە بوو "سیاسییەکان نەیاندەویست خەڵکی تووڕە بکەن".

***

یەکێك لەو ڕووبەرانی کە تیایدا تۆمی پێویستی بە یارمەتی بوو، ڕێکخستنی پشتیوانی بوو لە دراوسێکانی ئەفغانستانەوە. بەبێ هاوکاریی لۆجستی لە ئوزبەکستان و تاجیکستانەوە، ئێمە نەماندەتووانی هێزەکانمان بۆ ناو ئەفغانستان بجوڵێنین. من سەرۆکەکانی ئەو کۆمارانەی سۆڤیەتی پێشووم نەدەناسی. بەڵام ڕوسیا هێشتا کاریگەرییەکی گەورەی لە ناوچەکەدا هەبوو و من ڤلادیمێر پوتین–م دەناسی.

من و پوتین بۆ یەکەم جار ئەو مانگی حوزەیرانە لە کۆشکێکی سلۆڤینی کە جارێك لە جاران لەلایەن سەرکردەی کۆمەنیستی (تیتۆ) بەکاردەهێنرا، یەکتریمان بینی. ئامانجی من لە لوتکەکەدا بریتی بوو لە بڕینی هەموو جۆرە تەنگژەیەك و دروستکردنی پەیوەندییەك لەگەڵ پوتن. من ئەولەویەتێکی گەورەم بەخشی بە دیپلۆماسیی کەسی.

زانینی کەسایەتی، کارەکتەر و خەمەکانی سەرکردەیەکی جیهانیی هاوتات، دۆزینەوەی خاڵی هاوبەش و مامەڵەکردنی لەگەڵ پرسە ناکۆکئامێزەکان ئاسان دەکرد. ئەمە وانەیەک بوو کە من لە باوکمەوە وەرمگرتبوو کە یەکێک بوو لە پیادەکەرانی گەورەی دیپلۆماسیی کەسی. یەکێکی تریان ئەبراهام لینکۆڵن بوو. لینکۆڵن دەیگووت "ئەگەر دەتەوێ پیاوێک بۆ قەزیەکەت بەدەست بهێنی، سەرەتا قەناعەتی پێ بێنە کە تۆ هاوڕێی ئەویت".

لوتکەکە لەگەڵ پوتیندا بە کۆبوونەوەیەکی بچوک دەستی پێکرد– تەنیا من و ڤلادیمیر، راوێژکارانی ئاسایشی نیشتمانیمان و وەرگێڕەکان. ئەو کەمێک بە کەمێک نائاسودەییەوە دەستی پێکرد. ئەو بە قسەکردن لە کۆمەڵێک کاغەزی تێبینییەوە دەستی پێکرد. بابەتی یەکەم بریتی بوو لە قەرزی سەردەمی سۆڤیەتی روسیا.

پاش چەند خولەکێک، من وتارەکەیم بە پرسیارێک لێکدایەوە: "ئایا راستە کە دایکت خاچێکی پێداویت کە تۆ لە ئۆرشەلیم پیرۆزت کردووە؟"

رواڵەتێکی شۆک ئاسا روخساری پوتینی داپۆشی کاتێک پیتەری وەرگێڕ دێڕەکەی بە روسی پێ وتەوە. من روونم کردەوە کە بەسەرهاتەکە لە جۆرێک خوێندنەوەی باکگراوند هۆشی منی گرتووە– پێم نەوت کە ئەوە لە لێدوانێکی هەواڵگرییەوە وەرمگرتووە– و تینوو بووم کە زیاتر بزانم. پوتین بە خێرایی هاتەوە تایم و بەسەرهاتەکەی گێڕایەوە. روخسار و دەنگی نەرم بووەوە کاتێک روونی کردەوە کە ئەو خاچەکەی لە خانووە دێهاتییەکەی هەڵواسیبووە، دواتر ئاگری تێبەربووە. کاتێک ئاگرکوژێنەرەوەکان گەیشتوون، پێی وتوون کە تاکە شتێک کە خەمیەتی ئەو خاچەیە. ئەو بە شێوەیەکی دراماتیکی ئەو چرکەساتەی گێڕایەوە کە کرێکارێک لەپی دەستی کردووەتەوە و خاچەکەی پیشانداوە. ئەو وتی، "هەروەکو ئەوە وابوو ئەو مانایە ببەخشێ".

وتم "ڤلادیمیر، ئەمە بەسەرهاتی خاچەکەیە. شتەکان هەمان مانای خۆیان هەیە". هەستم بە دەرچوونی نائاسودەیی کرد لە ژووری کۆبوونەوەکە.

پاش کۆبوونەوەکە، ریپۆرتەرێک پرسیاری کرد ئاخۆ پوتین پیاوێکە کە ئەمریکییەکان دەتوانن متمانەی پێ بکەن. وتم بەڵێ. بیرم لەو هەستە کردەوە لە دەنگی ڤیلادیمێردا کاتێک بەسەرهاتی خاچەکەی گێڕایەوە. وتم "سەرنجمدایە چاوەکانی ئەو پیاوە...

دەمتووانی هەستێك بە رۆحی بکەم". لە ساڵانی دواتردا، پوتین هۆکارگەلێکی پێدام تا چاو بە بۆچوونەکەمدا بخشێنمەوە.

سێ مانگ پاش کۆبوونەوەکەمان لە سلۆڤینیا، پوتین یەکەم سەرکردەی بیانی بوو کە لە ١١ی سێپتێمبەردا تەلەفۆن بۆ کۆشکی سپی بکات. ئەو نەیتوانیبوو لەسەر هێزی ئاسمانیی یەك پەیوەندیم پێوە بکات، بۆیە کۆندی لە سەنتەرە ژێر زەمینییەکەوە قسەی لەگەڵ کردبوو. ئەو کۆندی دڵنیا کردبووەوە کە روسیا ئامادەیی سەربازی زیاد ناکات وەکو کاردانەوەیەك لە بەرانبەر جوڵەکەمان بۆ ئاستی (دێفکۆن سێ)، هەروەکو یەکێتی سۆڤیەت لە ماوەی جەنگی سارد دا بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی ئەمەی کردبوو. کاتێك رۆژی دواتر قسەم لەگەڵ ڤیلادیمێر کردەوە، پێی وتم کە فرمانێکی واژۆ کردووە بۆ راگەیاندنی خولەکێکی بێ دەنگی بۆ پیشاندانی هاریکاری لەگەڵ ئەمریکادا. ئەو بەم قسانە کۆتایی هێنا "ئیرادەیەکی باش بۆ سەرکەوتن بەسەر خراپەدا. دەمەوێ بزانی کە لەم ململانێیەدا، ئێمە لە پای یەکتردا دەوەستین".

لە ٢٢ی سێپتێمبەردا، لە کامپ دەیڤدەوە تەلەفۆنم بۆ پوتین کرد. لە وتوێژێکی درێژی بەرەبەیانی شەممەدا، ئەو رازی بوو بەوەی کە بواری ئاسمانی بۆ فرۆکەکانی سوپای ئەمریکا بکاتەوە و کاریگەری خۆی لەسەر کۆمارەکانی پێشووی سۆڤیەت بەکاربێنێت بۆئەوەی یارمەتیدەر بن لە جوڵاندنی هێزەکانمان بەرەو ئەفغانستان. من گومانم لەوە هەبوو کە نیگەرانی ئەوە بێت روسیا دەورەی دەدرێت، بەڵام ئەو زیاتر نیگەرانی کێشەی تیرۆریستی بوو لە ناوچەکەیدا. ئەو تەنانەت فرمانیدا تا ژەنەراڵە روسییەکان زانیاری بدەنە هاوتا ئەمریکییەکانیان لەبارەی ئەزموونیان لە ماوەی داگیرکردنی ئەفغانستاندا لە ١٩٨٠کاندا.

ئەمە وتوێژێکی بێ وێنە بوو. من بە ڤیلادیمێرم وت کە ستایشی ئامادەییەکەی دەکەم بۆ جوڵان بەرەو ئەودیو گومانەکانی رابردوو. پێش ماوەیەکی درێژ، رێکەوتنی خۆمانمان هەبوو لەگەڵ کۆمارەکانی پێشووی سۆڤیەتدا.

***

له دواداواکانی سێپتێمبەردا، جۆرج تێنێت راپۆرتی ئەوەیدا کە یەکەمین تیمەکانی سی.ئای.ئەی چوونەتە ناو ئەفغانستان و پەیوەندییان کردووە بە هاوپەیمانێتیی باکوورەوە. تۆمی فرانکس پێی وتم کە ئامادە دەبێت بۆ بەزوویی دابەزاندنی هێزە تایبەتەکانمان. من پرسیارێکم ئاراستەی تیمەکە کرد کە لە مێشکمدا بوو: "کەوابوو کێ بەنیازە وڵات بەڕێوە ببات؟"

بێ دەنگییەك دروست بوو.

من دەمویست جەخت بکەمەوە لەوەی کە تیمەکە بە باشی بیری لە ستراتیژی پاش جەنگ کردووەتەوە. هەستێکی بەهێزم هەبوو لەمەڕ ئەوەی کە گەلی ئەفغان دەبێ سەرکردەی نوێیان هەڵبژێرن. ئەوان ناخۆشییەکی زۆرتریان لەوە چەشتبوو- و گەلی ئەمریکاش زۆری دەخستە مەترسییەوە- کە ڕێگە بدەن وڵات بخزێتەوە ناو زۆرداری. داوام لە کۆلن کرد تا پلانێك دابڕێژێت بۆ گواستنەوە بەرەو دیموکراسی.

لە هەینیی ٥ی ئۆکتۆبەردا، ژەنەراڵ دیك مایەرز پێی وتم کە سوپا ئامادەیە بۆ جوڵان. منیش ئامادە بووم. ئێمە زیاتر لە دوو هەفتەمان بە تاڵیبان دابوو تا وەڵامی دوایین هۆشداری من بدەنەوە. تاڵیبان وەڵامی هیچ کام لەو داواکارییانەی ئێمەی نەدابووەوە. کاتیان تەواو ببوو. دۆن رەمسفێڵد لە ڕێگای گەڕانەوەیدا بوو لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و ئاسیای ناوەڕاستەوە کە لەوێ ژمارەیەك ڕێککەوتننامەی بنکەدانانی بەئەنجام گەیاندبوو. من چاوەڕێی ئەوم دەکرد بگەڕێتەوە بەر لەوەی کە فرمانی رەسمی دەربکەم. لە بەرەبەیانی شەممەی ٦ی ئۆکتۆبەردا، لە ڕێگەی ڤیدیۆکۆنفرانسێکی بێ مەترسیەوە لە کامپ دەیڤدەوە قسەم لەگەڵ دۆن و دیك مایەرز کرد. من بۆ دوایین جار پرسیارم لێیان کرد ئاخۆ هەر شتێك کە پێویستیانە بەردەستیانە. هەموو شتێکیان هەبوو. وتم "دەستپێبکەن. ئەمە کردارێکی راستە".

من لە دڵەوە دەمزانی کە لێدانی قاعیدە، لابردنی تاڵیبان و ئازادکردنی خەڵکی ئازارچەشتووی ئەفغانستان پێویست و دادپەروەرانەیە. بەڵام نیگەرانی هەموو ئەو شتانە بووم کە بە خراپ دەکەوتنەوە. پلان دانەرانی سوپا مەترسییەکانیان دیاریکردبوو: لەبرسامردنی بەکۆمەڵ، سەرهەڵدانی شەڕی ناوخۆ، هەرەسهێنانی حکومەتی پاکستان،

راپەڕینی موسڵمانانی سەرتاسەری جیهان و شتێك كە لە هەمووی زیاتر لێی دەترسام- هێرشێکی تۆڵەسێنانە بۆ سەر خاکی ئەمریکا.

کاتێك بەیانیی دواتر سواری (مارین وەن) بووم بۆ گەڕانەوە بۆ واشنتن، لۆرا و هەندێ لە راوێژکارانی سەرەکی زانیان کە من فرمانەکەم داوە، بەڵام تەقریبەن کەسی تر ئەمەی نەکردبوو. بۆ پاراستنی نهێنیی ئۆپەراسیۆنەکە، من لەگەڵ خشتەی راگەیەنراوی پێشوومدا رۆیشتم کە چوون بۆ مەراسیمێکی لە (دامەزراوەی یادکردنەوەی نیشتمانیی ئاگرکوژێنەوە کۆچکردووەکان) لە (ئێمیتسبێرگ)ی ماریلاند لەخۆ گرتبوو. من قسەم لەبارەی ٣٤٣ ئاگرکوژێنەوەی نیویۆرك سیتی کرد کە گیانی خۆیان لە ١١ی سێپتێمبەردا بەخشیبوو، کە تا ئەو کاتە خراپترین رۆژی ئاگرکوژاندنەوەی ئەمریکا بوو. زیانە گیانییەکان هەر لە سەرۆکی بەڕێوەبەرایەتییەکە (پیت گانسی) تاوەکو ئەو گەنجانەی تێدابوو کە لە یەکەمین مانگەکانی کارەکەیاندا بوون.

یادەوەرییەکە، بیرهێنەرەوەیەکی زیندووی ئەوە بوو کە بۆچی ئەمریکا بە زوویی دەچێتە جەنگەوە. سوپاکەشمان تێگەیشتبوو. حەوت هەزار مایل لەولاترەوە، یەکەمین بۆمبەکان هاوێژران. لە هەندێ لەو بۆمبانە، سەربازەکانمان پیتەکانی (ئێف دی ئێن وای)یان نووسیبوو.

***

یەکەمین راپۆرتەکان لە ئەفغانستانەوە پۆزەتیف بوون. لە یەکەم دوو سەعاتی بۆمبارانی ئاسمانیدا، ئێمە و هاوپەیمانە بریتانییەکانمان سیستەمی بەرگریی ئاسمانیی ناچیزەی تاڵیبان و ژمارەیەك کامپی مەشقی ناسراوی قاعیدەیان راماڵیبوو. لە پشت بۆمبەکانەوە، ئێمە زیاتر لە سی و حەوت هەزار بەشە خۆراك و پێداویستی بوژاندنەوەمان بۆ گەلی ئەفغان خستبووە خوارەوە، کە ئەمەش خێراترین گەیاندنی کۆمەکی مرۆیی بوو لە مێژووی جەنگدا.

پاش چەند رۆژێك، کەوتینە ناو کێشەوە. هەڵمەتە ئاسمانییەکە زۆرترین بەشی ژێرخانی تاڵیبان و قاعیدەی وێران کردبوو. بەڵام کێشەمان هەبوو لە جێگیرکردنی هێزە تایبەتەکانمان. ئەوان لە بنکەیەکی ئاسمانیی سۆڤیەتی پێشوودا لە ئۆزبەکستان جێگیر

کرابوون، لە ناوچەی نیشتنەوە لە ئەفغانستان بە دوورایی پانزە هەزار پێی شاخە بەرزەکان لە کەشێکی بەستەڵەک و بەفرەزریانی کوێرکەردا دابڕێنرابوون.

من فشارم هێنا بۆ هەنگاونان. دۆن و تۆمی دڵنیایان کردمەوە کە ئەوەندەی بکرێ خێرا دەجولێین. بەڵام بە تێپەڕینی رۆژان، زیاتر و زیاتر نائومێد دەبووم. کاردانەوەکەمان زیاتر لەو جەنگە ئاسمانییە دەچوو کە ئەمریکا لە رابردوودا ئەنجامی دابوو. نیگەرانی ئەوە بووم کە پەیامێکی هەڵە بە دوژمن و بە گەلی ئەمریکا بگەیەنین. دواتر تۆمی فرانکس ئەو رۆژانەی بە ماوەیەک "لە دۆزەخەوە" ناو برد. منیش هەمان هەستم هەبوو.

دوانزە رۆژ پاش ئەوەی دەستپێکی جەنگم راگەیاندبوو، دواجار یەکەمین تیمەکانی هێزە تایبەتەکان نیشتبوونەوە. لە باکوور، هێزەکانمان پەیوەندییان کرد بە سی.ئای.ئەی و جەنگاوەرانی هاوپەیمانێتیی باکوور. لە باشووردا، تیمێکی بچوکی هێزە تایبەتەکان هەڵیانکوتابووە سەر بارەگای سەرکردایەتیی سەرکردەی تاڵیبان (مەلا عومەر) لە قەندەهار. چەند مانگێك دواتر، لە کارۆلاینای باکوور سەردانی (فۆرت براگ)م کرد، لەوێ چاوم کەوت بە ئەندامانی ئەو تیمەی هێزە تایبەتەکان کە ئەو هەڵمەتەیان ئەنجامدابوو. ئەوان خشتێکی پاشماوەی کۆمەڵگەکەی مەلا عومەریان پێدام. من ئەو خشتەم لە ژووری خوێندنەوەی تەنیشت ئۆفیسی ئۆڤاڵ هەڵگرت وەکو بیرهێنەرەوەیەکی ئەمەی کە ئێمە بە هێزی پیادەوە لەسەر زەوی لە شەڕداین- و ئەمەی کە ئەمریکییەکانی سەر ئەو زەوییە بوێر و شارەزان.

***

گەیشتنی هێزەکان، گومانەکانی لەناو وڵاتدا نەڕەواندەوە. لە ٢٥ی ئۆکتۆبەردا، کۆندی پێی وتم خاویی ئۆپەراسیۆنەکان، کە لێشاوێکی رەخنەی لەناو میدیادا رورووژاندبوو، کاریگەری دەخستەسەر تیمی ئاسایشی نیشتمانی. جەنگەکە تەنیا هەژدە رۆژی بەسەردا تێپەڕیبوو، بەڵام هەندێك کەس هەنوکە باسیان لە ستراتیژیی جێگرەوە دەکرد.

لە کاتەکانی نادڵنیاییدا، هەر نیشانەیەکی گومان لە سەرۆکەوە، بە تەواوی سیستەمەکەدا بڵاو دەبێتەوە. لە کۆبوونەوەیەکی ئەنجومەنی ئاسایشی نیشتمانیی بەیانیی دواتردا، وتم "تەنیا دەمەوێ جەخت لەوە بکەمەوە کە هەموومان لەسەر ئەم

پلانە کۆکین، وانییە؟" بە دەوری مێزەکەدا هاتم و پرسیارم لە هەر ئەندامێکی تیمەکە کرد. هەموویان کۆک بوون.

من تیمەکەم دڵنیا کردەوە لەوەی کە ئێمە ستراتیژییەکی دروستمان هەیە. پلانمان بەباشی قەناعەتهێن بوو. سوپاکەمان بەتوانا بوو. قەزیەکەمان دادپەروەرانە بوو. نابێ ڕێگە بدەین بۆ ملدان لەبەرانبەر قسەی لابەلا یان ڕێگە بدەین راگەیاندن بمانترسێنێت. وتم "ئێمە بڕوابەخۆ و ئارام و پایەدار دەمێنینەوە".

دەمتووانی هەست بە بوژانەوە بکەم لە ژوورەکەدا. ئەزموونەکە ئەوەی بیرهێنامەوە کە تەنانەت خەڵکی هەرە سەرکەوتوو و بەهێزیش هەندێ جار پێویستی بە دڵنیاکردنەوە هەیە. هەروەکو دوایی بە رۆژنامەنووس (بۆب ودۆرد)م گووت، سەرۆک دەبێ "کالسیۆمی بڕبڕەی پشت بێت".

خۆشحاڵ بووم کە ئێمە ئەو کاتەی لە ٣١ی ئۆکتۆبەردا (نیویۆرک تایمز)مان بینی، بڕبڕەکانمان بەهێز کردبوو. رۆبەرت جۆنی ئەپڵ بابەتێکی بەناونیشانی "بیرهاتنەوەی تەڵەزگەیەکی سەربازی: ئەفغانستان وەکو ڤێتنام". رستەی سەرەتای بەم شێوەیە نوسیبوو "وەکو تارماییەکی پێشوازی لێنەکراو لە رابردووی ناخۆشەوە، وشەی خورپەبەخشی "تەڵەزگە" وتوێژگەلێکی لەناو کاربەدەستانی حکومەت و خوێندکارانی بەرنامە و ڕێوشوێنی دەرەوەدا هێناوەتە کایەوە، هەم لێرە و هەم لە دەرەوە". لە هەندێ رووەوە، ئەمە پێشبینیکراو بوو. ریپۆرتەرەکانی جیلی من، هەموو شتێ لە ئاوێزەی واتەرگەیت و ڤێتنامەوە دەبینن. لەگەڵ ئەوەشدا، سەرم سوڕما کە (تایمز) نەیتووانی تەنانەت مانگێکیش چاوەڕوان بێت لەوەی ئەفغانستان بە ڤێتنام بشوبهێنێت.

جیاوازییەکانی نێوان دوو جەنگەکە، زۆر گەورە بوون. دوژمن لە ئەفغانستان تازە سێ هەزار کەسی بێ گوناهی لەسەر خاکی ئەمریکا کوشتبوو. ئەو کاتە ئێمە هیچ هێزێکی تەقلیدیمان لە ئەفغانستان نەبوو، بە بەراورد بە ئەو سەدان هەزارەی کە لە ڤێتنام بوون. ئەمریکا لە پشت هێزەکانمان و ئەرکەکەیانەوە یەکگرتوو بوو. ئێمەش هاوپەیمانێتییەکی رووڵەگەشەمان هەبوو لە بەرەکەمانەوە.

هیچ کام لەو جیاوازییانە بۆ میدیا خەم نەبوو. مشتومڕ لەمەڕ ئەوەی کە پێی دەوترا تەڵەزگە لەلاپەڕە یەکەکان و لەسەر تەلەڤزیۆنەکان بەردەوام بوو. من شانم لێ هەڵتەکاند. دەمزانی کە هەر کە ئەنجامەکانمان دا بەدەستەوە، زۆربەی ئەمریکییەکان ئارام و پشتیوان دەبن.

***

لە نزیکی نۆڤەمبەردا، ئەنجامەکان گەیشتن. بە پشتگیری ئەفسەرانی سی.ئای.ئەی و هێزە تایبەتەکان، ژەنەراڵەکانی هاوپەیمانێتیی باکوور بەرەو پێگەکانی تاڵیبان جوڵان. جەنگاوەرانی ئەفغان پێشڕەوی هێرشە زەمینییەکانیان دەکرد، لەکاتێکدا کە هێزە تایبەتەکانمان جی.پی.ئێس و سیستەمەکانی ڕێنمایی لەیزەریان بەکاردەهێنا بۆ ئاراستەکردنی لێدانە ئاسمانییەکان. جەنگاوەرانی هاوپەیمانێتیی باکوور و هێزە تایبەتەکانمان، هەڵمەتێکی ئەسپسوارییان ئەنجامدا و شاری ستراتیژیی مەزار شەریفیان ئازاد کرد. دانیشتووان بۆ ئاهەنگ گێڕان ڕژانە ناو شەقامەکانەوە. چەکە هەرە مۆدێرنی سەدەی بیست و یەک، هاوشان لەگەڵ هەڵمەتێکی ئەسپسواری بە تایبەتمەندیی سەدەی نۆزدە، تاڵیبانی لە سەنگەری باکوور دەرپەڕاندبوو.

من سوکناییم هات. لەکاتێکدا کە بڕوام بە ستراتیژییەکەمان هەبوو و قسەوباسی تەڵەزگەم ڕەتکردبووەوە، هەستم بە شڵەژانێك دەکرد. ئەستەم بوو بە دڵنیاییەوە بزانیت ئاخۆ ئەو شێوازەی ئێمە سەرکەوتوو دەبێت. کەوتنی مەزار شەریف دڵنیای کردمەوە. بە ڤیلادیمێر پوتینم وت "لەوانەیە ئەم شتە وەکو جلە کۆنێك هەڵوەشێتەوە". بە زوویی هەڵوەشایەوە. لە ماوەی چەند ڕۆژێکدا، نزیکەی هەر شارێکی گەورە لە باکوور شکستی خوارد. تاڵیبان هەڵات بۆ کابول بۆ ناو پێچ و پەنای شاخەکان لە خۆرهەڵات و باشووردا. ژنان لەماڵەکانیان هاتنە دەرەوە. منداڵان کۆلارەیان هەڵدایە ئاسمان. پیاوان ڕیشیان تاشی و لە سەر شەقامەکان دەستیان کرد بە سەما. پیاوێك گوێی لە مۆسیقا گرت- کە لەژێر حوکمی تاڵیباندا قەدەغەبوو- بە هەڵکردنی کاسێت ریکۆردەرەکەی و کردنە گوێی هێدفۆنەکانی. هاواری کرد "ئێمە ئازادین!". مامۆستایەکی ژن وتی "من دڵخۆشم، چونکە باوەڕم وایە کە ئێستا دەرگاکانی قوتابخانە بۆ کچان دەکرێنەوە".

من شاگەشکە بووم بە دیمەنەکانی ئازادبوون. لۆراش بەهەمان شێوە. شەممەی پاش کەوتنی کابوڵ، ئەو وتاری رادیۆیی هەفتانەی پێشکەش کرد، یەکەم جار بوو کە خانمێکی یەکەم ئەمە بکات. ئەو وتی "رژێمی تاڵیبان ئێستا لە بەشی هەرە زۆری وڵاتەکەدا لە پاشەکشەدایە و گەلی ئەفغانستان- بەتایبەت ژنان- خۆشی دەبینن. ژنانی ئەفغان- لە رێگەی ئەزموونی سەختەوە- دەزانن بەشەکانی تری جیهان چیان بۆ دەردەکەوێت...شەڕی دژەتیرۆر بەهەمان شێوە شەڕە بۆ ماف و شکۆمەندییەکانی ژنان".

وتارەکەی لۆرا، کاردانەوەی پۆزەتیڤی لە سەرانسەری جیهاندا جوڵاند. بەماناترینیشیان لە ژنانی ئەفغانستانەوە بوو. فراوانکردنی دەرفەت لە ئەفغانستان، بەتایبەت بۆ ژنان و کچان، بوو بە زەنگێك بۆ لۆرا. لە ساڵانی دواتردا، ئەو چاوی کەوت بە مامۆستایان و کاروەگەڕخەرانی ئەفغان، رێگەی خۆشکرد بۆ گەیشتنی کتێب و دەرمان، پشتگیریی ئەنجومەنێکی نوێی ژنانی ئەمریکا-ئەفغانی کرد کە زیاتر لە ٧٠ ملیۆن دۆلاری لە کۆمەکەکانی گەشەپێدانی تایبەتدا ئامادە کردبوو و سێ سەفەری بۆ وڵاتەکە ئەنجام دا. لەکاتێکدا کە من وەکو فەرماندەی گشتی هەستم بە ئاسودەیی زیاتر دەکرد، ئەو وەکو خانمی یەکەم شوێن پێی خۆی دەدۆزییەوە.

***

بە ئازادبوونی باکووری ئەفغانستان، هۆشی ئێمە چووەسەر باشوور. جۆرج تێنێت راپۆرتی ئەوەی گەیاند کە بزووتنەوەی دژە تاڵیبان لە دەوری سەرکردەی پەشتون (حامید کارەزای) لە خڕبوونەوەدایە. کارەزای فەرماندەیەکی سەربازیی ئاسایی نەبوو. ئەو لە نزیك قەندەهار گەورە ببوو، بڕوانامەی کۆلێژی لە هێندستان بەدەستهێنابوو، بە چوار زمان قسەی دەکرد و پێش ئەوەی تاڵیبان حوکم بگرێتە دەست، لە حکومەتی ئەفغانیدا خزمەتی کردبوو.

دوو رۆژ پاش ئەوەی کە هەڵمەتی بۆمبهاوێژییەکەمان دەستی پێکردبوو، کارەزای لەسەر مۆتۆرسایکلێکەوە لە پاکستان هاتبووە خوارەوە، لە سنوور پەڕیبووەوە و چەند سەد کەسێکی کۆ کردبووەوە بۆ گرتنی (تارین کۆت) کە شارێکی بچوکی نزیك قەندەهار

بوو. تاڵیبان بە هاتنی کارەزای زانیبوو و هێزی ناردبوو بۆ کوشتنی. بە نزیکبوونەوەی چواردەور گیرانی، سی.ئای.ئەی هەلیکۆپتەرێکی ناردبوو بۆ هەڵگرتنی. پاش ماوەیەکی کورت، کارەزای گەڕابووەوە بۆ سەرکردایەتی بەرەنگارییەکە. ئەو لە دواداوکانی نۆڤەمبەردا گروپێک مارینز چوویوونە پاڵی. پاشماوەی کاربەدەستانی تاڵیبان بەرەو قەندەهار رایانکردبوو. لە ٧ی دیسەمبەری ٢٠٠١دا، لە شەستەمین ساڵیادی پێرل هاربەردا کە دوو مانگی مابوو بۆ ئەو رۆژەی وتارەکەم لە ژووری (تریتی) پێشکەشکرد، شارەکە شکستی هێنابوو.

***

بە دەرپەڕاندنیان لە سەنگەرەکانیان، پاشماوەکەی تاڵیبان و قاعیدە رایانکرد بۆ سنووری سەرسەختی خۆرهەڵاتی ئەفغانستان لەگەڵ پاکستاندا. لە سەرەتاکانی ٢٠٠٢دا، تۆمی فرانکس هێرشێکی گەورەی بەناوی ئۆپەراسیۆنی ئەناکۆندا ئەنجامدا. هێزەکانمان، پێکەوە لەگەڵ شەریکەکانی هاوپەیمان و هێزەکانی ئەفغانستان، پاشماوەی شەڕکەرانی تاڵیبان و قاعیدەیان لە خۆرهەڵاتی ئەفغانستان رامالی. ئەفسەرانی سی.ئای.ئەی و هێزە تایبەتەکان بەرەو ئەشکەوتەکان جوڵان، داوای لێدانی ئاسمانییان دەکرد لە حەشارگەکانی تیرۆریستان و زیانی جدیان بە سوپای قاعیدە دەگەیاند.

هیوادار بووم کە پەیوەندییەکی تەلەفۆنیم پێبگات بەو هەواڵەوە کە ئوسامە بن لادن لەناو ئەوانەدایە کە مردوون یان دەستگیر کراون. ئێمە بە بەردەوامی بەدویدا دەگەڕاین و زانیاری ناوبەناو بەڵام ناکۆکمان لەبارەی شوێنەکەیەوە پێدەگەیشت. هەندێ لە راپۆرتەکان دەیانگووت لە جەلال ئابادە. ئەوانیتر دەیانگوت لە پیشاوەرە، یان لە دەریاچەی نزیک قەندەهارە یان لە زنجیرە ئەشکەوتی تۆرا بۆرایە. سەربازەکانمان سۆراخی هەر سەرەداوێکیان ئەکرد. چەند جارێك وامانزانی کە بەدەستمانهێناوە. بەڵام هەواڵگری هەرگیز بە هیچ نەگەیشت.

ساڵانێك دواتر، رەخنەگران تۆمەتی ئەوەیان داتاشی کە رێگەمان بە بن لادن داوە تا لە داوەکە دەرباز بێت لە تۆرابۆرا. بە دڵنیاییەوە من بەو شێوەیە نەمدەبینی. من نووزوو لەبارەی بن لادنەوە پرسیارم لە فەرماندەکانمان و کاربەدەستانی سی.ئای.ئەی دەکرد.

ئەوان بیست و چوار سەعات کاریان دەکرد بۆ دۆزینەوەی شوێنەکەی و دڵنیایان دەکردمەوە کە ژمارەی سەرباز و سەرچاوەی پێویستیان لەبەردەستدایە. ئەگەر بە دڵنیاییەوە بمانزانیایە لە کوێیە، ئەوا لە ئاسمان بووایە یان لە زەوی، دەماندایە دادگا.

ئۆپەراسیۆنی ئەناکۆندا، کۆتایی قۆناغێکی سەرەتایی جەنگەکەی دیاری کرد. وەکو هەر جەنگێکی تر، هەڵمەتەکەمان لە ئەفغانستان بە کاملی بەڕێوە نەچوو. بەڵام لە شەش مانگدا، ئێمە تالیبانمان لە دەسەڵات لابردبوو، کەمپەکانی مەشقی قاعیدەمان وێران کردبوو، نزیکەی بیست و شەش ملیۆن کەسمان لە زۆرداریيەکی بێ وێنە رزگار کردبوو، رێگەمان دابوو بە کچانی ئەفغان تا بگەڕێنەوە بۆ قوتابخانە و بناغەمان دانا بۆ سەرهەڵدانی کۆمەڵگەیەکی دیموکرات. قات و قڕی لەئارادا نەبوو، شەڕی ناوخۆ رووینەدا، حکومەت لە پاکستان نەڕووخا، راپەڕینی جیهانیی موسڵمانان رووینەدا و هیچ هێرشێکی تۆڵەسێنانەش نەکرایە سەر خاکەکەمان.

***

دەسکەوتەکان لە باجی قورسەوە هاتن. لەنێوان دەستپێکی جەنگ و ئۆپەراسیۆنی ئەناکۆندا بیست و حەوت سەربازی بوێر کوژران. من هەریەک لە ناوەکانم، زۆرجار لە لێدوانەکانی سەرلەبەیانیی زوودا لەسەر مێزی (ریزەلوت) دەخوێندەوە. من وێنای ئەو ئازارەم کرد کە خێزانەکانیان دەیانچەشت کاتێک ئەفسەرێکی سوپا لە بەردەم دەرگاکەیان راست دەبووەوە. نزای ئەوەم کرد کە خوا لە گەرمەی خەفتەکەیاندا سوکناییان پێ بدات.

لە سەرەتاکانی جەنگدا، بڕیارمدابوو کە نامە بۆ ئەندامانی خێزانی ئەو ئەمریکییانە بنووسم کە لە شەڕگەکاندا گیانیان لەدەستدابوو. دەمویست رێز لە قوربانییەکانیان بنێم، خەمی خۆم دەرببڕم و ستایشی وڵاتیان پێبگەیەنم. کاتێک لە ٢٩ی نۆڤەمبەری ٢٠٠١دا دەستم کرد بە نوسین، ئەو نامەیەی ئەبراهام لینکۆڵنم بیر کەوتەوە کە لە ساڵی ١٨٦٤دا بۆ (لیدیا بیکسبی) نوسیبووی، ئەو ژنە ماساشوستییەی کە بڕوا وابوو کە پێنج کوڕی لە شەڕی ناوخۆدا لەدەستدابێت.

لینكۆلن نوسیبووی "هەست دەكەم كە دەبێ هەر وشەیەكی من چەندە لاواز و بێ كەلك بێت كە هەوڵ بدات لە خەفەتێكی وەها گەورەی لەدەستچوونێك لات بدات". "بەڵام ناتوانم خۆم لابدەم لە پێشكەشكردنی ئەو دڵنەواییەی كە لەوانەیە لە سوپاسی ئەو كۆمارەدا كە مردن بۆ رزگاركردنی، بدۆزرێتەوە. نزا دەكەم كە باوكی ئاسمانیمان كە ئازاری ماتەمتان سوك بكات و تەنیا ئەو یادەوەرییە خۆشەی لا بەجێبهێڵێت كە لەگەڵ خۆشەویست و لەدەستچووەكەت هەتبووە و ئاكە شانازی دەبێ هی تۆ بێ كە قوربانییەكی وەها گەورەت داوە لەپێناو ئازادیدا".

نامەكەی من بۆ (شانۆن سپان) بوو، ژنی مایك سپانی ئەفسەری سی.ئای.ئەی كە لەو زیندانەی لە مەزار شەریف راپەڕی كوژرا و یەكەم مەرگی شەڕگەی جەنگەكە بوو،

"بەڕێز شانۆن،

لەبری گەلێكی سوپاسگوزار، من و لۆرا هاوخەمی قووڵی خۆمان ئاراستەی تۆ و خێزانەكەت دەكەین لەبەرانبەر لەدەستدانی مایك. دەزانم دڵت دێشێت. نزاكانمان هاوڕێی هەمووتانە. مایك لە شەڕێكی دژی خراپەكاراندا مرد. ئەو گیانی خۆی بەخشی بۆ قەزیەیەكی پیرۆز—ئازادی. دەبێ منداڵەكانت ئەوە بزانن كە خزمەتی ئەو بە گەلەكەمان قارەمانانە و ئازایانە بوو.

خوا بەرەكەتی، شانۆن، منداڵەكانت و هەموو ئەوانە بدات كە ماتەمی پیاوێك باش و ئازا دەگێڕن.

دڵسۆزتان،

جۆرج دەبلیو بوش"

نامەكانم بۆ خێزانەكانی هەر ئەندامێكی سوپا نارد كە ژیانی خۆی لە جەنگی دژەتیرۆردا بەخشیبوو. لە كۆتایی سەرۆكایەتییەكەمدا، نامەم بۆ نزیكەی پێنج هەزار خێزان نوسیبوو.

***

سەرباری نامەناردنەكانیشم، ئەغلەب چاوم بە ئەندامانی خێزانی كەسی كوژراو دەكەوت. هەستم كرد كە بەرپرسیارێتیی منە ئاسودەیی ببەخشمە ئەوانەی

خۆشەویستیان لەدەستداوە. کاتێك لە ئازاری ٢٠٠٢دا سەردانی (فۆرت براگ)م کرد، چاوم بەو خێزانەکانی ئەو سەربازانە کەوت کە لە ماوەی ئۆپەراسیۆنی ئەناکۆندا دا کوژرابوون. من نیگەران بووم. ئایا تورەن؟ ئایا دڵیان ناخۆشە؟ ئامادە بووم هاوبەشی فرمێسکەکانیان بم، گوێیان لێ بگرم، قسەیان لەگەڵ بکەم- هەرچییەك کە پێم بکرێ بۆ هێورکردنەوەی ئازارەکانیان.

یەکێك لەو بێوەژنانەی کە بینیمن (ڤالێری چاپمەن) بوو. مێردەکەی، عەریفی تەکنیکیی هێزی ئاسمانی (جۆن چاپمەن)، ئازایانە هێرشی کردبووە سەر دوو پەناگەی قاعیدە لە چیا عاسێکاندا لە کەمینێکدا، یارمەتی رزگارکردنی هاوتیمەکانی دابوو بەر لەوەی ژیانی خۆی بسپێرێت. ڤالێری پێی وتم جۆن حەزی لە هێزی ئاسمانی بووە. ئەو کاتێك نۆزدە ساڵان بووە خۆی ناونووس کردووە و بۆ ماوەی حەڤدە ساڵ خزمەتی کردووە.

من خۆم دانەواندەوە بۆئەوەی چاو ببڕمە دوو کچەکەی ڤالێری- مەدیسن، تەمەن پێنج ساڵان و بریانا، تەمەن سێ ساڵان. وێنای کچەکانی خۆم کرد لەو تەمەنەدا. بە بیرکردنەوە لەوەی ئەوان بەبێ باوك گەورە دەبن، دڵم شکا. پێم وتن کە ئەو پیاوێکی باش بوو کە بە بوێرییەوە خزمەتی کرد. فرمێسکەکانم گێڕایەوە. ئەگەر کچەکان هیچ شتێکیان لە کۆبوونەوەکە بیر مابێت، ویستم ئەوە بێت کە چەندە رێزی باوکیانم گرتووە نەك فەرماندەیەکی گشتیی گرینۆك.

کە کۆبوونەوەکە بەرەو تەواو بوون چوو، ڤالێری کۆپییەك نامیلکەی یادەوەریی مێردەکەی پێدام. ئەو لە ناخەوە وتی "ئەگەر کەسێك جارێك لە جاران پێت بڵێ کە ئەوەی دەیکەیت هەڵەیە، سەیری ئەمە بکە". ئەو تێبینییەکی لەسەر نامیلکەکە نوسیبوو: "جۆن کاری خۆی ئەنجامدا، ئێستا تۆ هی خۆت ئەنجام بدە".

هەر کاتێك بڕیارم لەبارەی جەنگەوە دەدا، وشەکانی ئەو هێتری ئەوانیترم دەهاتەوەیاد.

***

بە پێی تێپەڕینی کات، خۆشیی ئازادکردن ڕێگەی خۆش کرد بۆ ئەرکی ماندووکەری یارمەتیدانی خەڵکی ئەفغانستان بۆ بونیادنانەوە-یان، بەشێوەیەکی دەقاودەقتر، بونیادنان لە کاولاشێکەوە. ئەفغانستان لە ٢٠٠١دا، سێیەمین وڵاتی هەژاری جیهان بوو. کەمتر لە ١٠٪ی دانیشتووان دەستیان بە چاودێریی تەندروستی دەگەیشت. لە پێنج ژن چواریان نەخوێندەوار بوون. لەکاتێکدا کە ڕووبەری خاکی ئەفغانستان و دانیشتووانەکەی هاوشێوە بوو لەگەڵ تەکساسدا، دەرامەتە ئابوورییە ساڵانەکەی نزیک بوو لە هی بیلینگز، مۆنتانا. تێکڕایی تەمەن چل و شەش ساڵی تاڵ بوو. لە ساڵانی دواتردا، ئەفغانستان زۆرجار بەراورد دەکرا بە عیراق. بەڵام دوو وڵاتەکە لە دوو خاڵی تەواو جیاوازەوە دەستیان پێکرد. لە سەروەختی ئازادکردنەوە، تێکڕای بەرهەمی خۆماڵیی تاکەکەسی لە ئەفغانستان کەمتر بوو لە هی یەک لەسەر سێی عیراق. ڕێژەی مردنی ساوا لە ئەفغانستان دووقات زیاتر بوو بە بەراورد بە عیراق. یارمەتیدانی خەڵکی ئەفغان بۆئەوەی بێنە پاڵ جیهانی مۆدێرن، بە ڕوونی ئەرکێکی درێژ و تاقەتپڕوکێن دەبێ.

کاتێک خۆم بۆ سەرۆکایەتی کاندید کرد، هەرگیز چاوەڕوانی ئەرکێکی وەهام نەدەکرد. لە پاییزی ٢٠٠٠دا، من و ئالگۆر مشتومڕمان لەسەر تەنگەتاوترین ئەو پرسانە کرد کە ڕووبەڕووی ئەمریکا دەبنەوە. جارێک لە جاران وشەکانی، ئەفغانستان، بن لادن یان ئەلقاعیدە نەهاتنە بەر باس. ئێمە قسەمان لەسەر بونادنانەوەی وڵات کرد. لە یەکەم ڕووبەڕووبوونەوەماندا من وتم "من و جێگر سەرۆک ناکۆکین لە بەرانبەر بەکارهێنانی هێزی سەربازیدا. "من زۆر بەئاگا دەبم لەبارەی بەکارهێنانی هێزی سەربازی وەکو بونیادنەرەوەی وڵات".

لەو کاتانەدا، من نیگەرانی زیاد لە سنوور فراوانکردنی سوپامان بووم لە ڕێ"ەی خستنە ئەستۆی ئەرکەکانی ئاشتیپارێزی، هەروەکو چۆن لە بۆسنیا و سۆماڵ هەمانبوو. پاش ١١ی سێپتێمبەر، من ڕەئیم گۆڕا. ئەفغانستان ئەرکی سەرەنجامی بونیاندنانەوەی وڵات بوو. ئێمە وڵاتەکەمان لە دیکتاتۆریەتێکی دڕندە ڕزگار کردبوو و ئەرکێکی ئەخلاقیمان هەبوو کە شتێکی باشتر لە پاش خۆمان جێ بهێڵین. هەروەها بەرژەوەندییەکی ستراتیژیمان هەبوو لە یارمەتیدانی گەلی ئەفغان بۆ بونیادنانی

کۆمەڵگەیەکی ئازاد. تیرۆریستان لە شوێنانی پڕ ئاژاوە، نائومێد و سەرکوتکردن، پەنایان گرتبوو. ئەفغانستانێکی دیموکرات ئەلتەرناتیڤێکی ئومێدبەخش دەبوو بۆ دیمەنی توڕەوان. یەکەم هەنگاو بریتی بوو لە بەهێزکردنی رێبەرێکی ڕەوا. کۆلن پاول لەگەڵ کاریەدەستانی نەتەوە یەکگرتووەکاندا کاری لەسەر پرۆسەیەك کرد بۆ گەلی ئەفغان بۆ هەڵبژاردنی حکومەتێکی کاتی. ئەوان بڕیاریاندا گردبوونەوەیەکی نەریتیی ئەفغان ساز بدەن بەناوی (لۆیا جیرگە) یان ئەنجومەنی مەزن. ئەفغانستان ئەوەندە شوێنێکی سەلامەت نەبوو بۆ بەستنی کۆبوونەوەکە، بۆیە راوێژکار گێرهارد شرۆدەری ئەڵمانیا بەشێوەیەکی بەخشندانە پێشنیاری کرد کە خانەخوێی ئەنجومەنەکە بێت لە (بۆن).

پاش نۆ رۆژی ئازادکردنەکە، نوێنەران (حامید کارەزای)یان وەکو سەرۆکی دەسەڵاتی کاتی هەڵبژارد. کاتێك کارەزای لە ٢٢ی دیسەمبەر-١٠٢ رۆژ پاش ١١ی سێپتێمبەر- گەیشتە کابول بۆ رێوڕەسمی دەستبەکاربوونەکەی، ژمارەیەك سەرکردەی هاوپەیمانێتی باکوور و پاسەوانە تایبەتییەکانیان لە فڕۆکەخانە پێشوازییان لێکردن. لەکاتێکدا کە کارەزای بە راڕەوی فڕۆکەخانەکەدا دەڕۆیشت، فەرماندەیەکی سەربازیی تاجیکیی سەرسوڕماو پرسیاری کرد ئاخۆ پیاوەکانی لە کوێن. کارەزای وەڵامی دابووەوە "بۆچی، جەنەراڵ، ئێوە پیاوانی منن. هەموو ئەوانە لە ئێوە کە ئەفغانین، پیاوی منن".

***

پێنج هەفتە دواتر، بۆ یەکەم جار روانیمە چاوەکانی حامید کارەزای. بە تەمەنێکی چل وچوارساڵی، بە تایبەتمەندیی شیك و ریشێکی ماش و برنجییەوە، کارەزای وەکو فیگەرێکی جیاواز بەرجەستە دەبوو. عەبایەکی نیوقۆڵی سەوزی درەوشاوەی بەسەر شێرتێکی خۆڵەمێشیدا بەردابووەوە، لەگەڵ کڵاوێکی قوچەك کە لە پێستی بزن دروستکرابوو و بەشێك بوو لە نەریتی خێڵەکەی باشووری ئەفغانستانی.

من وتم "جەنابی سەرۆك، بەخێربێی بۆ ئەمریکا و بۆ ئۆڤیسی ئۆڤاڵ". من ماوەی ساڵانێك چرکەساتی بێ وێنەم لەو ئۆفیسەدا بەسەربردن. کردنەوەی دەرگاش بۆ سەرکردەیەکی ئەفغانستانی ئازاد چوار مانگ پاش ١١ی سێپتێمبەر، لەو ساتانە بوو.

کارەزای وتی "لەبری خۆم و گەلەکەم، سوپاست دەکەم جەنابی سەرۆک". وتی "ئەمریکا لە ١٩٨٠کاندا ئەفغانستانی لەدەست یەکێتیی سۆڤیەت رزگار کرد. ئێستاش تۆ ئێمەت لەدەست تالیبان و قاعیدە رزگار کرد". "ئێمە سەربەخۆین و لەسەر دوو پێی خۆمان دەوەستین". هەروەها وتی "بەڵام پێویستمان بە یارمەتی ئێوەیە. پرسیاری هەرە باو کە لە وەزیرەکانمەوە لە ئەفغانستان دەیبیستم ئەوەیە کە ئاخۆ ئەمریکا بەردەوام دەبێت لە کارکردن لەگەڵماندا".

من کارەزای-م دڵنیا کردەوە کە دەتوانێ وەکو شەریکێك متمانە بە ئەمریکا بکات و ئێمە جارێکی تر دەستبەرداری وڵاتەکەی نابین. ئێمە باسمان لە قەڵاچۆکردنی پاشماوەی بکەرەکانی تالیبان و قاعیدە، پێویستیی مەشقکردن بە سوپای ئەفغان و هێزی پۆلیس و گرنگیی بونیادنانی رێگاکان، کلینیکەکانی تەندروستی و قوتابخانەکان کرد.

شەوی دواتر، جارێکی تر کارەزای-م بینییەوە لە ئەنجومەنی نوێنەران بۆ وتاری ساڵانەی دەسکەوت و پلانەکانم. لۆرا لە تەنیشت منەوە دانیشتبوو. ریزێك لە دواوە، جێگری کارەزای- و وەزیری نوێی کاروباری ژنانی ئەفغانستان- دکتۆرە سیما سەمار دانیشتبوو.

***

ئەرکی راستەوخۆی کارەزای پیشاندانی ئەوە بوو کە بە رۆیشتنی تالیبان، ژیانی باش دەبێت. بۆ پشتگیریکردنی، من زالمای خەلیلزادم، کە ئەمریکییەکی ئەفغانیی بەهرەمەند بوو لە ستافی ئەنجومەنی ئاسایشی نیشتمانیدا، نارد کە وەکو نێردەی تایبەتی من و دواتر وەکو بالیۆزی ئەمریکی لەوێ کار بکات. زالمای و کارەزای سەدان ملیۆن دۆلاریان لە کۆمەکی ئەمریکا بەکارهێنا بۆ بونیادنانی ژێرخان، راهێنانی مامۆستایان، چاپکردنی کتێبی خوێندن و فراوانکردنی تۆرەکانی کارەبا و ئاوی پاك بۆ دانیشتووانی دەشتەکی ئەفغانستان. پرۆگرامێك کە لەلایەن (ئاژانسی ئەمریکی بۆ گەشەپێدانی نێودەوڵەتی) دارایی بۆ دابین دەکرا، یارمەتیدەر بوو بۆئەوەی زیاتر لە سێ ملیۆن منداڵی ئەفغانی بگەرێنەوە بۆ قوتابخانە. ئەمەش سێ قاتی ئەو ژمارەیە بوو کە لەژێر حوکمی تالیباندا دەیانخوێند. نزیکەی ملیۆنێك خوێندکاری نوێ کچ بوون.

هەر لە سەرەتاوە، ویستمان ئەوەندەی بکرێ وڵاتی زیاتر بخەینە ناو هەوڵی بونیادنانەوەوە. شێوازێکی فرەلایەنی قورسایی دارایی سوکتر دەکات و وڵاتانی سەرتاسەری دەخاتە ناو چوارچێوەی ململانێی ئایدۆلۆژی لەدژی توندڕەوان. جۆنیشیرۆ کۆیزومی سەرۆک وەزیرانی ژاپۆن لە کانوونی دووەمی ٢٠٠٢دا میوانداریی کۆنفرانسێکی کۆمەکبەخشانی نێودەوڵەتی کرد. کۆبوونەوەی تۆکیۆ بەڵێنی ٤,٥ ملیارد دۆلاری دا. ئەمریکا و ژمارەیەک هاوپەیمانی سەرەکی بڕیاریاندا بەرپرسیارێتی لە ئەستۆ بگرن بۆ بارمەتیدانی بونیادنانی کۆمەڵگەیەکی مەدەنی لە ئەفغانستان. ئێمە پێشەنگیمان کرد لە مەشقپێکردنی سوپایەکی نیشتمانیی ئەفغانیی نوێ. ئەڵمانیا ئەرکیزی خستەسەر مەشقپێکردنی پۆلیسی نیشتمانی. بریتانیا ئەرکی ڕووبەڕووبوونەوەی ماددەی هۆشبەری گرتەبەر. ئیتاڵیا کاری کرد بۆ ریفۆرمی سیستەمی دادپەروەری. ژاپۆن دەستپێشخەرییەکی ئەنجامدا بۆ لەچەکداماڵینی فەرماندە جەنگییەکان و میلیشیاکان.

ئاسایشی بنچینەیی پێشمەرجێکی پێویست بوو بۆ دەستکەوتی سیاسی و ئابووری. بۆیە وەکو بەشێک لە پرۆسەی بۆن، ئێمە پشتگیریی دروستکردنی (هێزی هاوکاریی ئاسایشی نێودەوڵەتی)مان لەژێر چەتری نەتەوەیە کگرتووەکاندا دروستکرد کە بە (ئیساف) ناسرابوو. لە پاییزی ٢٠٠٢دا، ناتۆ رازی بوو بە وەرگرتنی فەرماندەیی ئیساف کە نزیکەی پێنج هەزار سەربازی بیست و دوو وڵاتی دەگرتەخۆ. ئێمە بەهەمان شێوە هەشت هەزار سەربازی ئەمریکیمان لە ژێر فەرماندەیی تۆمی فرانکسدا مەشقیان بە هێزە ئاسایشییەکانی ئەفغانی دەکرد و ئۆپەراسیۆنیان لەدژی پاشماوەی قاعیدە و تاڵیبان ئەنجام دەدا. لەو سەروەختەدا، پێدەچوو سیانزە هەزار سەرباز سەرباز گونجاو بێ. ئێمە بە ژمارەیەکی زۆر کەمتری سەرباز ڕاوی تاڵیبانمان نا و پێدەچوو دوژمن لە راکردندا بێت. من لەبارەی ئەمەوە کۆک بووم لەگەڵ سەرکردەکانی سوپا کە پێویستمان بە ئامادەییەکی زیاتر نابێ. ئێمە هەموومان نیگەرانی دووبارەکردنەوەی ئەزموونی سۆڤیەتییەکان و بریتانییەکان بووین کە دواجار وەکو داگیرکەر دەرکەوتن.

ئەم ستراتیژییە لە سەرەتادا بەباشی کاری کرد. بەڵام لەلایەکی ترەوە، سەرکەوتنمان بە ئاستێکی سەربازی کەمەوە ئاسودەییەکی ساختەی بەخشی و ئارەزووەمان بۆ

بەرقەرارکردنی شوێنپێیەکی سەربازیی بچوک، ئێمەی لە کەموکورتی سەرچاوەکاندا جێ هێشت. چەند ساڵێک دەخایەنێ تا ئەم کەموکورتییانە ڕوون دەبنەوە.

لە حوزەیرانی ٢٠٠٢دا، ئەفغانەکان لە دووەم (لۆیا جیرگە)دا گردبوونەوە بۆ هەڵبژاردنی حکومەتی کاتی. ئەمجارەیان ئاسایش بایی پێویست باش بوو تا کۆنفرانسەکە لە کابول ببەستێت. نوێنەرەکان کارەزایان هەڵبژارد بۆئەوەی ڕێبەرایەتیی حکومەتی نوێ بکات و ئەو وەزیرانی کابینەی لە چەندە باکگراوندی ئایینی و ئەتنی دەستنیشانکرد. من ئەوەم کرد بە ئەولەویەتێک کە ڕووبەڕوو لە کارەزای ئاگادار بمەوە. دەمزانی کە ئەرکێکی ماندووکەری هەیە و دەمویست مەعنەویاتی بەرز بکەمەوە و لە پابەندییەکەمان دڵنیای بکەمەوە. من ئامۆژگاری و هەندێ داواکاریم خستەڕوو، بەڵام وریابووم لەوەی فرمانی پێ نەدەم. باشترین ڕێگا بۆ یارمەتیدانی بۆئەوەی وەکو ڕێبەرێک گەشە بکات، ڕەفتارکردن بوو لەگەڵی وەکو ڕێبەرێک.

حکومەتە ساواکە بەرەوپێشچوو. لە سێپتێمبەری ٢٠٠٣دا، سەرۆک کارەزای پێی وتم موچەی تێکڕای ئەفغانییەک لە دۆلارێکی ڕۆژانەوە بۆ سێ دۆلاری ڕۆژانە زیادی کردووە- کە باشبوونێکی گەورەیە، بەڵام بەهەمان شێوەش بیرهێنەرەوەی ئەوەیە کە وڵاتەکە چەندە لە فۆرمێکی بەراییدا ماوەتەوە. دەسکەوتی هەرە گەورەی حکومەت دارشتنی دەستوورێکی نوێ بوو، کە لەلایەن سێیەمین (لۆیا جیرگە)وە لە کانوونی دووەمی ٢٠٠٤دا پشتڕاستکرایەوە. وڵاتێک کە بەری سێ ساڵ زۆری لە ژنان دەکرد پەنجەرەیماڵەکانیان لە ڕەش بۆیاخ بکەن، ئێستا مافە بنچینەییەکانیان دەپاراست، لەوانەش ئازادی قسەکردن و کۆبوونەوە. دەستوور دەستەیەکی دادوەریی سەربەخۆی دامەزراند و دەستەیەکی یاسادانانی دوو ئەنجومەنی پێکهێنا و ڕێگەی بە ژناندا تا ٢٥٪ی (ئەنجومەنی خەڵک) پێکبهێنن. هەنگاوی دواتر بریتی بوو لە ئەنجامدانی یەکەم هەڵبژاردنی سەرۆکایەتیی ئازادی مێژووی ئەفغانستان، کە بۆ ٩ی ئۆکتۆبەری ٢٠٠٤ دیاریکرا. تالیبان و قاعیدە پەیمانی ئەوەیان دا کە دەنگدەران، کاندیدەکان و کاریەدەستانی هەڵبژاردن بکوژن. ئەمریکا، ناتۆ و کاربەدەستانی نەتەوە یەکگرتووەکان یارمەتیدەر بوون بۆ مەشقپێکردنی کارمەندانی هەڵبژاردن و ئاسایش دابینکردن بۆ

بنکەکانی دەنگدان. من هیوادار بووم کە گەلی ئەفغان ئارەزووی خۆیان بۆ ئازادی لە بنکەکانی دەنگداندا دەربڕن. لە راستیدا، کەس نەیدەزانی چاوەڕێی چی بکات.

کاتێک بەرەبەیان هات، جیهان دیمەنێکی بێ وێنەی بەدی کرد. لە سەرانسەری ولاتدا، ئەفغانەکان لە زووەوە تامەزرۆیانە ریزیان بەستبوو بۆ دەنگدان. لە پێشەوەی ریزەکەی دەرەوە، یەکەم بنکەی دەنگدان کە بکرێتەوە کچێکی نۆزدە سالان بوو. ئەو وتبووی "ناتوانم هەستەکانم روون بکەمەوە لەبارەی ئەوەی کە چەندە خۆشحالم". "من هەرگیز بیرم لەوە نەکردبووەوە کە لەم هەلبژاردنەدا دەنگ دەدەم".

لە سەرتاسەری ولاتدا، دەنگدان گەیشتە سەروو هەشت ملیۆن، واتە نزیکەی ٨٠٪ی دانیشتووانی تەمەنی دەنگدان. هەموو گروپێکی ئەتنی یان ئایینی بەشداری کرد، هەروەکو ملیۆنان ژنیش. بنکەکانی دەنگدان دوو سەعات زیاتر بە کراوەیی مانەوە بۆ هەلمژینی پانتاییەکانی خەلک.

کۆندی لە بەرەبەیاندا لە میزوری، واتە ئەو شوێنەی کە شەوی پێشتر تیایدا رووبەڕووبوونەوەم لەگەل جۆن کێری کردبوو، هەوالەکەی پێ گەیاندم. من بە ئەنجامەکان دلخۆش بووم، بەلام سەرم سوڕ نەما. پێم وایە کە ئارەزووی مرۆیی بۆ ئازادی، جیهانییە. مێژوو پیشانی دەدات کە، کاتێک دەرفەت بدرێت، خەلکی هەر نەژادێک و ئایینێک، سەرکێشیی سەرووئاسایی ئەنجام دەدەن بۆ ئازادی. لە یەکێک لە گوندەکاندا، پیاوێکی بێ ددان بە مەندیلێکی رەشەوە، وتی "ئەمە وەکو رۆژی سەربەخۆیی، یان رۆژی سەربەستی، وایە. ئێمە ئاسایش و ئاشتی بۆ ئەم ولاتە دەهێنین".

کاتێک سندوقەکانی دەنگدان کرانەوە، حامید کارەزای بوو بە سەرۆکێکی ئازادانە هەلبژێردراو. مێژوو شێوازێکی تاریککردنی یادەوەرییەکانی هەیە. بەلام من هەمیشە ئەو خۆشی و شانازییەم لەبیرە کە لە یەکەم رۆژی هەلبژاردندا هەستم پێکرد، کاتێک گەلی ئەفغانستان- ئەو خاکەی کە ١١ی سێپتێمبەری تیادا لەدایک بوو-دەنگی خۆیاندا بە ئایندەی ئازادی دا.

***

لە سێپتێمبەری ٢٠٠٥دا، گەلی ئەفغان جارێکی تر چووەوە بەردەم سندوقەکانی دەنگدان، ئەمجارەیان بۆ هەڵبژاردنی دەستەیەکی یاسادانانی نیشتمانی. زیاتر لە ٢,٧٠٠ کاندید بۆ ٢٤٩ کورسی ناوی خۆیان دانا. نزیکەی ٧ ملیۆن دەنگدەر دەنگیاندا، سەرباری هەڕەشەکانی تاڵیبان و بانگەوازەکانی بایکۆت کردن. ئەنجومەنی نیشتمانیی نوێ ٦٨ ژن و نوێنەری نزیکەی هەموو گروپێکی ئەتنی گرتەخۆی.

دیک چێنی لە دانیشتنی دەستبەکاربوونی ئەنجومەنەکەدا لە دیسەمبەری ٢٠٠٥دا نوێنەرایەتیی ئەمریکای کرد. مەراسیمەکە بە وتارێکی سۆزیانە لەلایەن پاشای پێشووی وڵات، (زاهیر شا)ی نەوەد و یەك ساڵە، دەستی پێکرد. ئەو وتی "سوپاسی خودا دەکەم کە ئەمڕۆ من لە مەراسیمێکدا بەشداری دەکەم کە هەنگاوێکە بەرەو بونیادنانەوەی ئەفغانستان پاش چەند دەیەیەك لە شەڕکردن." هەروەها وتی "گەلی ئەفغانستان سەردەکەوێت!"

من هاوڕا بووم لە گەشبینییەکەی. چوار ساڵ پاش کەوتنی تاڵیبان، وڵاتەکە سەرۆکێك و پەرلەمانێکی هەڵبژاردبوو. بەڵام دەمزانی کە هەڵبژاردنەکان تەنیا یەکەم هەنگاو بوون. دیموکراسی تەنیا گەشتێکە کە پێویستی بە وڵاتێك هەیە بۆ بونیادنانی دامەزراوە حوکمڕانەکان، لەوانەش دادگاکانی یاسا، هێزەکانی ئاسایش، سیستەمێکی پەروەردە، ڕاگەیاندنی ئازاد و کۆمەڵگەیەکی مەدەنیی چالاك. ئەفغانستان هەندێ بەرەوپێشچوونی ئومێدبەخشی ئەنجام دابوو. نزیکەی پێنج ملیۆن منداڵ، لەوانەش ملیۆن و نیوێك کچ گەڕابوونەوە بۆ قوتابخانە. ئابووری بە تێکڕایەکی زیاتر لە ١٥٪ لە ساڵێکدا، گەشەی دەکرد. شارێیەکی تازەی خواست لەسەر لە کابولەوە بۆ قەندەهار تەواو کرابوو. چوار لە حەوت ملیۆن پەنابەر گەڕابوونەوە بۆ سەر ماڵ و حاڵیان.

لە ڕواڵەتدا، پێدەچوو ئێمە بەرەوپێش بچین. بەڵام لەژێرەوە کێشە لە هەڵتۆقیندا بوو. لە حوزەیرانی ٢٠٠٥دا، تیمێکی هێزی دەریایی سیڵ (دەریایی، ئاسمانی، وشکانی)ی پێکهاتوو لە پێنج کەس کە لە بەرزایی چیاکان کاریان دەکرد کەوتنە بۆسەی تاڵیبانەوە. سەرکردەی تیمەکە (ملازم مایکڵ مورف) ڕۆیشتە شوێنێکی گونجاو بۆ داواکردنی یارمەتی بۆ سێ هاوکارە بریندارەکەی. ئەو، ئەوەندە لەسەر هێڵ مایەوە کە شوێنگەی

هاوتیمەکانی دیاری بکات بەر لەوەی بە سەختی بریندار ببێت. کاتێک کۆپتەرێکی هێزە تایبەتەکان گەیشت بۆ دەرهێنانی تیمی سیڵەکان، شەرکەرانی تاڵیبان بەریان دایەوە. نۆزدە ئەمریکی کوژران، بەو هۆیەوە ئەو رۆژە بووە کوشندەترین رۆژی جەنگ لە ئەفغانستان و خراپترینیان بۆ سیڵەکان لە دووەم جەنگی جیهانییەوە. ئەندامێکی تیمی سیڵ بەناوی (مارکوس لوترێل)، ئەوەندە ژیا کە بەسەرهاتە بێ وێنەکە لە کتێبەکەیدا بەناوی (تاکە رزگاربوو) بگێڕێتەوە.

دوو ساڵ دواتر، من میداڵی فەخرم بەخشی بە دایک و باوکی ملازم مایکڵ مورفی لە ژووری (ئیست)ی کۆشکی سپی. ئێمە لە بارەی کورەکەیانەوە قسەمان کرد، کە وەرزشەوانێکی بەتوانا و دەرچوویەکی زیرەکی (پێن ستەیت) بوو کە یەکێک لە رووبەڕووبوونەوەکانی لەگەڵ کێشەدا ئەو کاتە بوو کە بۆ پارێزگاریکردن لە منداڵێکی کەم ئەندام لە گۆرەپانی قوتابخانەدا تووشی شەڕ ببوو. لە کۆبوونەوەی پێش رێوڕەسمەکەدا، ئەوان نیشانەیەکی ئالتونیان پێ بەخشیم کە ناو، وێنە و پلەکەی مایکیشی لەسەر هەڵکەنرابوو. من لەژێر قەمیسەکەمەوە دامنا و لەماوەی رێوڕەسمەکەدا پۆشیبووم.

کاتێک یارمەتیدەری سوپا ناوی میداڵی فەخری هێنا، من چاوم بەناو ئامادەبواندا گێڕا. گروپێکی هێزی دەریایی سیڵ بینی بە جلە شینەکانیانەوە. ئەم پیاوە دروستبووانەی ناو جەنگ فرمێسک بە رووومەتەکانیاندا دەهاتە خوار. هەروەکو دواتر بە دانیێل و ماورین مورفیم وت، من لە بیرهێنەرەوەکەی مایک لە نزیک دڵمەوە، توانام بەدەستهێنا.

هێرشی کارەساتبار بۆسەر تیمی سیڵ زەنگێکی گرفتی داهاتوو بوو.

***

لە ساڵی ٢٠٠٥ و ٢٠٠٦دا، میلیشیاکانی تاڵیبان کرێکارانی بونیادنانی رێگایان دەکوشت، قوتابخانەکانیان دەسوتاند و لە پارێزگاکانی نزیک سنووری پاکستان، مامۆستایان دەکوشت. لە سێپتێمبەری ٢٠٠٦دا، بۆمبدانەرەوەیەکی خۆکوژ، پارێزگاری (پاکتیا)ی لە نزیک ئۆفیسەکەی خۆیەوە لە (گاردێز) کوشت. رۆژی دواتر،

بۆمبدانەرەوەیەکی تری خۆکوژ لە ماتەمینییەکەیدا خۆی تەقاندەوە و شەش ماتەمگێڕی کوشت.

لێدوانەکانی سی.ئای.ئەی و سوپا زیاتر و زیاتر راپۆرتی خەمناکیان دەگرتەخۆ لەبارەی کاریگەریی تالیبانەوە. کێشەکە بەهۆی زنجیرەیەک نەخشەی رەنگاورەنگەوە کە لە نۆڤەمبەری ٢٠٠٦دا بینیمن، قووڵتر بووەوە. سێبەرەکە لەسەر نەخشە چەندە تاریکتر بووایە، هێرشی زیاتر لەو بەشەی ئەفغانستان ئەنجام دەدرا. نەخشەی ٢٠٠٤، سێبەرەکانی کەمتر بوو. نەخشەی ٢٠٠٥، رووبەری تاریکتری لە بەشەکانی باشوور و خۆرهەڵاتی وڵاتەکە دەگرتەخۆ. بەهاتنی ٢٠٠٦، تەواوی حەوزی باشووری خۆرهەڵات رەش بوو. تەنیا لە یەک ساڵدا، ژمارەی بۆمبی تەقێنراوەی لابەلا دووقات زیادی کردبوو. ژمارەی هێرشە چەکدارییەکان سێ قات زیادی کردبوو. ژمارەی تەقینەوە خۆکوژییەکان زیاتر لە چوارقات زیادی کردبوو.

روون بوو کە پێویستمان بە چاککردنی ستراتیژییەکەمان هەیە. شێوازی فرەلایەن بۆ بونیادنانەوە، کە لەلایەن خەڵکێکی زۆر کۆمەڵی نێودەوڵەتی پێشوازی لێکرابوو، لە شکست دابوو. هەماهەنگییەکی کەم هەبوو لەنێوان وڵاتاندا و کەس بایی پێویست سەرچاوەکانی نەدەخستەکار بۆ تەقەلایەکە. دەستپێشخەریی ئەڵمانی بۆ بونیادنانی هێزی پۆلیس کورتی هێنابوو. ئەرکی ئیتاڵی بۆ ریفۆرمی سیستەمی دادوەری شکستی هێنابوو. هەڵمەتی دژە ماددەی هۆشبەری بریتانی لە هەندێ ناوچەدا ئەنجامی دابووە دەستەوە، بەڵام لە پارێزگا بەپیتەکانی باشووردا، وەکو (هێلماند) پەرەی سەندبوو. سوپای نیشتمانیی ئەفغان کە ئەمریکا مەشقی پێکردبوو، باش بیوو، بەڵام لە هەوڵێکدا بۆ دوورخستنەوەی حکومەتی ئەفغان بۆ لەئەستۆگرتنی خەرجییەکی تەحەمولنەکراو، سوپامان زۆر بە بچوکی هێشتبووەوە.

ئەرکی سەربازیی فرەلایەن بەهەمان شێوە نائومێدی لێکەوتەوە. هەر ئەندامێکی ناتۆ هێزی سەربازی رەوانەی ئەفغانستان کردبوو. بەهەمان شێوە دە دوانزە وڵاتی تریش. بەڵام نۆرێک لە پەرلەمانەکان سنووربەندیی توندیان دانابوو- کە بە هۆشدارییە نیشتمانییەکان دەناسران- بۆ ئەوەی کە هێزە سەربازییەکان رێگەیان پێدراوە چی

بکەن. هەندێکیان ڕێگەیان پێ نەدرابوو لە شەودا دەوریەیان هەبێت. ئەوانیتر ڕێگەیان پێ نەدرابوو بچنە شەڕەوە. ئەنجامەکە، هێزێکی ناچالاک و ڕێکنەخراو بوو لەکاتێکدا کە سەربازەکان بە ڕێسای جیاواز شەڕیان دەکرد و زۆرێکیان هەر شەڕیان نەدەکرد.

شکستەکانی ناو حکومەتی ئەفغانیش بەشێکی کێشەکە بوو. لەکاتێکدا کە من سەرۆک کارەزایم خۆش دەویست و ڕێزم دەگرت، گەندەڵییەکی یەکجار زۆر هەبوو. فەرماندەکانی جەنگ بڕێکی یەکجار زۆری پارەی گومرگیان دەخستە گیرفانەوە لەکاتێکدا کە دەبوایە بۆ کابوڵ بچێت. ئەوانیتر بڕێک قازانجیان لە بازرگانی ماددەی هۆشبەرەوە دەست دەکەوت. ئەنجامەکە ئەوە بوو کە ئەفغانەکان باوەڕیان بە حکومەتەکەیان لەدەستدا بوو. کە شوێنێکیش نەبوو ڕووی تێکەن، زۆرێک لە ئەفغانەکان متمانەیان کردە سەر تاڵیبان و فەرماندە توندڕەوە دڵڕەقەکانی وەکو (گولبەدین حیکمەتیار) و (جەلالودین حەقانی). ڕاپۆرتێکی سی.ئای.ئەی لە زاری ئەفغانییەکەوە دەیگوت "باکم نییە کێ لەسەر حوکمە، ئەگەر هەر لایەنێک بێت ئاسایش دابین بکات. ئاسایش لەهەمووی گرنگترە".

مەترسییەکان زۆر لەوە زیاتر بوون کە وازبهێنرێ تا ئەفغانستان بکەوێتەوە دەست توندڕەوان. من بڕیارمدا کە دەبێ ئەمریکا بەرپرسیارێتیی زیاتر بگرێتەئەستۆی، تەنانەت ئەگەرچی ئێمە خەریک بووین پابەندییەکی گەورەی نوێ لە عێراق بە ئەستۆوە بگرین.

بە تیمی ئاسایشی نیشتمانیم گووت "نەفرەتی لێ بێ، ئێمە دەتوانین زیاتر لە شتێک بکەین لە یەک کاتدا. ناکرێ لە ئەفغانستان بدۆڕێین".

لە پاییزی ٢٠٠٦دا، فرمانمدا بە زیادکردنی سەرباز کە دەبووەهۆی تەکانپێدانی ئاستەکانی هێزمان لە بیست و یەک هەزارەوە بۆ سی و یەک هەزار لە ماوەی دوو ساڵی داهاتوودا. من زیادکردنە ٥٠٪یەکەم بە "زیادکردنی بێدەنگ" ناوبرد. بۆ یارمەتیدانی ئەفغانستان تا شوێنپێ و کاریگەریی فراوان بکات، ئێمە کۆمەکی ئاوەدانکردنەوەمان زیاتر لە دووقات زیاد کرد. ئێمە ژمارەی (تیمەکانی ئاوەدانکردنەوە)مان زیاد کرد کە ئەندامانی سوپا و شارەزایانی مەدەنییان کۆ دەکردەوە بۆ زامنکردنی ئەمەی کە دەسکەوتە ئاسایشییەکان بۆ باشبوونی واتاداری ژیانی ڕۆژانە تەرجەمە دەکرێن. ئێمە بە

هەمان شێوە قەبارەی سوپای نیشتمانیی ئەفغانمان زیاد کرد، هەوڵی ڕووبەڕووبوونەوەی ماددەی هۆشبەرمان فراوان کرد، تەقەلاکانی هەوالگریمان بەدرێژایی سنووری پاکستان فراوان کرد و شارەزایانی مەدەنیی حکومەتی ئەمریکامان نارد بۆ یارمەتیدانی وەزیرە ئەفغانەکان تا لەباردابوونیان بەهێز بکەن و گەندەڵی کەم بکەنەوە.

من داوام لە هاوپەیمانانی ناتۆ کرد کە لەگەڵ پابەندێتیی ئێمەدا بگونجێن لەڕێگەی لابردنی هۆشداری لەسەر سەربازەکانیان و زیادکردنی هێزی زیاتر. ژمارەیەک سەرکردە وەڵامدەرەوە بوون، لەوانەش (ستیڤن هارپەر) ی کەنەدا، (ئەندرێ فۆگ راسمنسن)ی دانیمارک و (نیکۆلاس سارکۆزی)ی فەرەنسا. بریتانی و کەنەدییەکان بەتایبەت، شەڕیان کرد و زیانی گیانیی بەرچاویان پێکەوت. ئەمریکا خۆشبەخت بوو کە ئەوانی لەتەک خۆیدا بەدی کرد و وەکو هی خۆمان ڕێز لە قوربانییەکانیان دەگرین.

سەرکردەکانی تر بە ڕاشکاوییەوە پێیان وتم کە پەرلەمانەکانیان هەرگیز ئەوەندە ڕێگا نادات. ئەمە منی شێت دەکرد. وا دادەنرا کە ئەفغانستان جەنگێک بێت کە جیهان بڕوای وایە پێویست و دادپەروەرانەیە. لەگەڵ ئەوەشدا، زۆرێک لە وڵاتان هێزی سەربازیی ئەوەندە سنووردارکراویان دەنارد کە ژەنەراڵەکانمان دەیانوت تەنیا بۆشاییان پڕ کردووەتەوە. ناتۆ چووبووە ناو هاوپەیمانێتییەکی دوو لاوە، کە هەندێ وڵات ئامادەی شەڕ بوون و زۆرێکیان نا.

***

هەموارکردنەکانی ناو ستراتیژییەکەمان، توانای باشکردین بۆ لەناوبردنی یاخیبووان. لەگەڵ ئەوەشدا توندوتیژی هەر بەردەوام بوو. هۆکاری سەرەکی گرفتەکە نە لە ئەفغانستان و هەروەکو هەندێ دەیانوت، نە لە عێراقیش سەرچاوەی دەگرت، بەڵکو لە پاکستانەوە بوو.

لە زۆربەی ماوەی سەرۆکایەتیمدا، پاکستان لەلایەن پەروێز موشەرەفەوە حوکمڕانی دەکرا. من بڕیارەکەی ئەوم بەلاوە پەسەند بوو کە پاش ١١ی سێپتێمبەر لە تەک ئەمریکادا وەستا. ئەو لە ٢٠٠٢دا هەڵبژاردنە بەراییەکانی ئەنجام دابوو کە تیایدا حزبەکەی بردبوویەوە و قسەی لەسەر "میانڕەوییەکی ڕۆشنگەرانە" کردبوو وەکو

جێگرەوەیەکی توندڕەویی ئیسلامی. ئەو خۆی لە مەترسیی جددی دا بۆ شەڕکردن لەگەڵ قاعیدە. تیرۆریستان لانی کەم چوار جار هەوڵیاندا تیرۆری بکەن.

لە مانگەکانی دوای ئازادکردنی ئەفغانستان، بە موشەرەفم وت کە من بێزارم لەو راپۆرتانەی کە دەڵێن هێزەکانی قاعیدە و تالیبان بەرەو پارێزگا خێڵەکییە خراپ بەڕێوەبراوەکانی پاکستان رادەکەن- ناوچەیەک کە زۆرجار بە وایڵد وێست (سەردەمی بێ یاسایی خۆرئاوای ئەمریکا) بەراورد دەکرا. وتم "من ئەوپەڕی ئامادەییم تیا دەبێت کە هێزە تایبەتەکانمان بۆ سەر سنوور بنێرم بۆ پاکسازی ئەو ناوچانە".

ئەو پێی وتم کە ناردنی سەربازەکانی ئەمریکا بۆ شەڕ لە پاکستاندا وەکو پێشێلکردنێکی سەروەریی پاکستان دەبینرێ. لەوانەیە راپەڕینێک دروست دەبێ. لەوانەیە حکومەتەکەی بڕوخێت دەشێ توندڕەوان کۆنترۆڵی وڵاتەکە بکەن، لەوانەش ئەتەمەنیی ناوکی.

من پێم وت، لەو حاڵەتەدا، دەبێ سەربازەکانی ئەو پێشڕەوی بکەن. بۆ ماوەی چەند ساڵێك، ئەم پلانە کاری کرد. هێزەکانی پاکستان سەدان تیرۆریستیان خستە داوەوە، لەوانەش سەرکردەکانی قاعیدەی وەکو (خالید شێخ محەمەد)، (ئەبو زوبەیدە) و (ئەبو فەرەج ئەللیبی). هەروەها موشەرەف (ئە، ق، خان)ی دەستگیر کرد کە باوکی سەنگینی بۆمبی ناوکیی پاکستان بوو، ئەمەش لە بەرانبەر فرۆشتنی چەند پێکهاتەکەیە لە پرۆگرامی وڵاتەکەی بە بازاڕی رەش. هەروەك موشەرەف زۆرجار بیری دەهێنامەوە، هێزەکانی پاکستان باجێکی گەورەیان دا لە بەرانبەر لەناوبردنی توندڕەواندا. زیاتر لە هەزار و چوارسەد سەرباز لە جەنگ دژی تیرۆر کوژران.

لە بەرانبەر هاوکاریی پاکستاندا، ئێمە سزاکانمان لابرد، پاکستانمان کرد بە هاوپەیمانێکی گەورەی دەرەوەی ناتۆ و پارمەتیماندا بۆ تەمویلکردنی ئۆپەراسیۆنە دژە تیرۆرەکانی. ئێمە بەهەمان شێوە لەگەڵ کۆنگرێسدا ئیشمان کرد بۆ دابینکردنی ٣ ملیارد دۆلاری کۆمەکی ئابووری و کردنەوەی بازاڕەکانمان بە ڕووی کاڵا و خزمەتگوزاریی پاکستانیی زیاتردا.

پێ بەپێی ئیپەڕیشی کات، ڕوون بووەوە کە موشەرەف یان نایەوێ یا ناتوانێ هەموو بەڵێنەکانی جێبەجێ بکات. بەشێکی کێشەکە پەیوەندی هەبوو بە گرژی پاکستان لەگەڵ هیندستاندا. لە نزیکەی هەر وتوێژێک کە هەمانبوو، موشەرەف هیندستان بە بەدکرداری تۆمەتبار دەکرد. چوار ڕۆژ پاش ١١ی سێپتێمبەر، ئەو پێی وتم کە هیندییەکان "هەوڵ دەدەن بۆ یەکسانکردنی ئێمە لەگەڵ تیرۆریستان و هەوڵ دەدەن کاریگەری بخەنە سەر مێشکی تۆ". سەرەنجام، سوپای پاکستانی زۆربەی سەرچاوەکانی خستە بواری خۆئامادەکردن بۆ جەنگ لەگەڵ هیندستان. سەربازەکانی مەشقیان پێدەکرا بۆ دەستپێکردنی شەڕێکی تەقلیدی لەگەڵ دراوسێکەیدا لە ناوچە خێڵەکییەکان، نەک ئۆپەراسیۆنەکانی دژەتیرۆر. شەڕ لەدژی توندڕەوان بە پلەی دوو دەهات.

کێشەی پەیوەندیدار ئەوە بوو کە هێزەکانی پاکستان بە بەراورد بە سۆراخکردنی قاعیدە، ئەوەندە شێلگیرانە سۆراخی تاڵیبانیان نەدەکرد. هەندێ کەس لە دەزگای هەواڵگریی پاکستانی، پەیوەندیی نزیکیان لەگەڵ کاربەدەستانی تاڵیباندا هەبوو. ئەوانی تر بەرنامەیەکی بیمەیان دەویست لە بارێکدا کە ئەمریکا واز لە ئەفغانستان بێنێت و هیندستان هەوڵی دەدا لەوێ کاریگەری دروست بکات. هۆکارەکە هەرچییەک بێ، ئەو شەرکەرانەی تاڵیبان کە بۆ ئەفغانستان رایانکردبوو، لە ناوچە خێڵەکییەکان و شارە قەرەباڵغەکانی وەکو (پیشاوەر) و (کوێتا)ی پاکستاندا خۆیان پەنادابوو. لە ٢٠٠٥ و ٢٠٠٦دا، ئەم پەناگانە یاریدەدەر بوون بۆ سەرهەڵدانی یاخیگەری.

لە ئازاری ٢٠٠٦دا، من لە ئیسلامئاباد سەردانی پەرویز موشەرەفم کرد. کۆبوونەوەکەمان سەردانێکی هیندستانیشی بەدواداهات کە لەوێ من و سەرۆک وەزیران (مانهۆمان سینگ) ڕێککەوتننامەیەکمان واژۆ کرد بۆ ڕێگەخۆشکردن بۆ هاوکاریی ناوکیی لەنێوان دوو وڵاتەکەماندا. ڕێککەوتننامەکە بەرجەستەکردنێکی هەوڵەکانمان بوو بۆ باشکردنی پەیوەندییەکانی نێوان کۆنترین دیموکراسیی جیهان و گەورەترین دیموکراسیی جیهان. بڕوام وایە کە هیندستان، کەماڵی نزیکەی ملیاردێک کەس و چینێکی ناوەندی خوێندەوارە، ئەوەی لەباردایە کە ببێتە نزیکترین دۆستی ئەمریکا. ڕێککەوتننامەی

ناوکی، هەنگاوێکی مێژوویی بوو، چونکە ڕۆڵی نوێی وڵاتەکەی دیاریکرد لەسەر شانۆی جیهان.

ڕێکەوتننامە ناوکییەکە بە شێوەیەکی سروشتی نیگەرانییەکانی لە پاکستاندا لابرد. باڵیۆزەکەمان، ئەفسەری ناسراوی کۆنی دەزگای دەرەوە بەناوی (ریان کرۆکەر)، وەکو نیشانەیەکی ڕێز پێداگری کرد لەسەر ئەوەی کە دەبێ شەوەکە لە ئیسلامئاباد بەسەر ببەین. هیچ سەرۆکێك لە ٣٧ ساڵ لەمەوبەری سەروەختی ریچارد نیکسنەوە ئەمەی نەکردووە. دەزگای نهێنی نیگەران بوو، بەتایبەت پاش تەقینەوەیەکی نزیك کونسوڵی ئەمریکا لە (کەراچی) ڕۆژێك پێش گەیشتنی ئێمە. بەڵام سیمبۆلیزم لە دیپلۆماسیدا زۆر گرنگە و دەمویست ئاماژەی ئەوە بکەم کە پەیوەندییەکانمان دەنرخێنم. لە فڕۆکەخانە، کاروانێکی ئۆتۆمبێلی رووکەش بەرەو باڵیۆزخانە کەوتنە ڕێ کە زۆربەیان بەتاڵ بوون. سەرۆکی پرۆتۆکۆڵەکەی من، باڵیۆز (دۆن ئێنسێنات) لە لیمۆزینە سەرۆکایەتییەکەدا لە شوێنی من دانیشتبوو، لەکاتێکدا کە من و لۆرا بە نهێنی بە هەلیکۆپتەری بلاك هۆك ڕۆیشتین.

لە بەرانبەر وریاییە ئاسایشییە توندەکاندا، سەرۆك موشەرەف سەردانێکی هێمن و خۆشی ڕێکخست. ئەو و هاوسەرەکەی (سەهبا)، لە وێنەی کۆشکی سپی خۆیاندا کە بە (ئەیوانی سەدر) ناسراوە بە گەرمی پێشوازییان لێکردین. ئێمە چاومان کەوت بە رزگاربووانی بومەلەرزەیەك بە ئەندازەی ٧,٦ لە ئۆکتۆبەری پێشوودا لە باکووری پاکستان کە ببووەهۆی کوژرانی زیاتر لە حەفتاوسێ هەزار کەس. ئەمریکا کۆمەکی بوژانەوەی ٥٠٠ ملیۆن دۆلاری تەرخان کردبوو. کۆپتەرە (شینۆك)ەکانمان بە (فریشتەکانی بەزەیی) ناسران. ئەزموونەکە جەختکردنەوە بوو لە وانەیەك: فۆرمێکی هەرە بەهێزی دیپلۆماسی بریتییە لە پیشاندانی دڵی باشی ئەمریکا بە جیهان.

کاتێکی دواتری ئەو ڕۆژە، من چوومە گۆرەپانی باڵیۆزخانە بۆ تەماشاکردنی یاری (کریکێت) کە چالاکیی سەرگەرمیی نیشتمانیی پاکستانە. لەوێ کاپتنی تیمی نیشتمانیم بینی کە ناوی (ئینزەمامولحەق) بوو کە هاوتای پاکستانیی مایکڵ جۆردان بوو. بە خۆشیی ئەو منداڵانەی قوتابخانە کە لەوێ بوون، من چەند لێدانێکی تۆپی کریکێتم

ئەنجامدا، من لە یارییەکە شارەزا نەبووم، بەڵام شتێکم بە شتێ کرد. لە ئێوارەخوانی ئەو شەوەدا، من بە وتنی "من بەهۆی زگزاکییەکەوە فریو درام، ئەگینا تۆپ لێدەرێکی باشتر دەبووم" دەستم پێکرد.

کۆبوونەوەکانم لەگەڵ سەرۆک موشەرەف تەرکیزی خستبووەسەر دوو ئەولەویەتی گرنگ. یەکێکیان سووربوونی بوو لەسەر کارکردن وەکو سەرۆک و گەورە ژەنەراڵ، کە پێشێلکردنێکی دەستووری پاکستان بوو. من زۆرم لێکرد تا واز لە سوپا بێنێت و وەکو مەدەنییەک حوکمڕانی بکات. ئەو بەڵێنیدا کە ئەمە بکات. بەڵام زۆر پەلەی نەبوو.

هەروەها جەختم لە گرنگی شەڕ دژی توندڕەوان کردەوە. من وتم "دەبێ ئێمە ئەو خەڵکانە لە خزانە ناو وڵاتەکەی تۆ و گەڕانەوەیان بۆ ئەفغانستان دوور بخەینەوە".

موشەرەف وتی "ئێمە دڵنیایی خۆمانتان پێ دەدەین کە ئێمە لەگەڵ ئێوە لەدژی تیرۆریزم هاوکار دەبین. ئێمە بە تەواوی لەگەڵدایین".

توندوتیژیی لە پەرەسەندن بەردەوام بوو. لەکاتێکدا کە یاخیگەری زیادی دەکرد، حامید کارەزای لە موشەرەف قەڵس دەبوو. ئەو سەرۆکی پاکستانی بە ناسەقامگیرکردنی ئەفغانستان تۆمەتبار دەکرد. موشەرەف بەو تۆمەتدانەپاڵە هەستی بە ئیهانە کرد. بە هاتنی پاییزی ٢٠٠٦، بە ئەستەم قسەیان پێکەوە دەکرد. بڕیارمدا بە دیپلۆماسییەکی کەسیی شێلگیرانەوە بێمە ناوەوە. لە سێپتێمبەری ٢٠٠٦دا، کارەزای و موشەرەفم بانگهێشتی ئێوارەخوانێکی کۆشکی سپی کرد. کاتێک کە لە باخچەی (ڕۆز) بەخێرهاتنم کردن، ئەوان تەوقەکردن تەنانەت سەیرکردنی یەکتریشیان ڕەت دەکردەوە.

میزاجەکە بەرەو باشی نەچوو کاتێک ئێمە بۆ ئێوارەخوان لە (ژووری نانخواردنی خێزانیی کۆن) دانیشتین. من، دیک چێنی، کۆندی رایس، ستیڤ هادلی تەماشامان دەکرد کاتێک کارەزای و موشەرەف بوو بە شەڕەقسەیان. لە ساتێک لە ساتەکاندا، کارەزای موشەرەفی تۆمەتبار کرد بە پەنادانی تاڵیبان.

موشەرەف بە بێزارییەوە وەڵامی دایەوە "دە پێم بڵێ لە کوێن"، کارەزای وەڵامی دایەوە "خۆت دەزانی لەکوێن!" موشەرەف وتی "ئەگەر بمزانیایە، دەمگرتن". کارەزای وتی "دە بڕۆ بیانگرە!"

لەوە ئیزامام ئاخۆ ئەم ئێوارەخوانە هەڵە بووە. بە موشەرەف و کارەزایم وت کە مەترسییەکان لەوە گەورەترن کە بیکەن بە ئاکۆکی کەسی. من ئێوارەخوانەکەم بۆ ماوەی دوو سەعات و نیو بەڕێوە برد لە هەوڵی ئەوەدا کە یارمەتییان بدەم زەمینەیەکی ماوبەش بدۆزنەوە. پاش ماوەیەك، دەمەقاڵێیەکە وەستا و کۆبوونەوەکە بەرهەمهێن دەرچوو. دوو سەرکردەکە رازی بوون کە هەواڵگریی زیاتر ئاڵوگۆڕ بکەن، چاویان بە خێڵەکانی لە هەردوو دیوی سنوورەکەوە بکەوێت بۆ پابەند بوون بە ئاشتی و دەمەقاڵێی بەئاشکرا رابگرن.

وەکو شێوازێکی بەرگرتن لە لێشاوی شەڕکەرانی تاڵیبان، موشەرەف پێی وتین کە ئەو بەو زووانە زنجیرەیەك رێکەوتنی لەگەڵ خێڵەکاندا ئەنجامداوە لە ناوچەی سنووریدا. لەژێر رێککەوتننامەکاندا، هێزەکانی پاکستانی بە تەنیا ناوچەکان جێ دەهێڵن، لەکاتێکدا کە سەرکردە خێڵەکییەکان پابەند دەبن بە رێگرتن لە تاڵیبان لەوەی کە بکەر ئامادە بکەن یان دزە بکەنە ناو ئەفغانستان.

هەرچەندە نیازێکی باشی بۆ کرابوو، ستراتیژییەکە شکستی هێنا. خێڵەکان ئیرادە یان توانای ئەوەیان نەبوو کە توندڕەوان کۆنترۆڵ بکەن. هەندێ لە خەمڵاندنەکان پیشانیان دەدا کە لێشاوی شەڕکەرانی تاڵیبان بۆ ناو ئەفغانستان چوارقات زیادی کردووە.

موشەرەف بەڵێنی بە من و کارەزای دابوو–هەردووکیان لە ستراتیژییەکە بەگومان بوون– کە ئەگەر رێککەوتننامەکان شکستیان هێنا ئەوا سەرباز دەنێرێتەوە بۆ ناوچە خێڵەکییەکان. بەڵام لەبری تەرکیز خستنەسەر ئەو کێشەیە، موشەرەف و سوپای پاکستان زیاتر و زیاتر بەهۆی قەیرانە سیاسییەکەوە هۆشیان پەرت دەبوو. لە ئازاری ٢٠٠٧دا، موشەرەف سەرۆکی دادگای باڵای هەڵپەسارد کە ترسی ئەوەی لێ هەبوو حوکمێك دەربکات و بە پێشێلکردنی یاسا تۆمەتباری بکات، چونکە هەم وەکو سەرۆك و هەم وەکو فەرماندەی گشتیی سوپا کاری دەکرد. پشتیوانانی دیموکراسی و پارێزەران رژانە ناو شەقامەکان. موشەرەف بە راگەیاندنی ئیمێرجێنسی وەڵامی دایەوە، کە دەستووری پەکخست، ژمارەیەکی زیاتر دادوەرانی لەسەر کار لابرد و هەزاران نەیاری سیاسی دەستگیر کرد.

گووشارەکان لەسەر من زیادیان کرد بۆ ئەوەی پەیوەندییەکان لەگەڵ موشەرەف ببڕم. من نیگەرانی ئەوە بووم کە لادانی لەسەر شانۆکە پشێوی بخاتەوە. لە پاییزی ۲۰۰۷دا چەند وتوێژێکی راشکاوانەم لەگەڵ ئەنجامدا. وتم "لێرەوە وێنەکە زۆر دزێو دیارە. وێنەکە لێرەوە ئەوەیە کە تۆ لە پارێزەرانت داوە و خستوونتە زیندانەوە. پێم ناخۆشە کە رێگایەکی ئاشکرای بەرەوپێشچوون لەئارادا نییە". بە پێداگریشەوە رێگایەکم خستەڕوو: بەروارێك بۆ هەڵبژاردنی ئازاد دیاری بکە، لە سوپا دەست بکێشەوە و حاڵەتی ئیمێرجێنسی هەڵبگرە.

موشەرەف هەر یەك لەو پابەندییانەی ئەنجامدا و لەسەریان مایەوە. کاتێك بەرواری هەڵبژاردنە پەرلەمانییەکانی دانا، سەرۆك وەزیرانی پێشوو (بێنەزیر بوتۆ) لە هەندەران گەڕایەوە بۆ پێشبڕکێکردن. ئەو مینبەرێکی دیموکراسیخوازانەی راگەیاند کە ئەوی کرد بە ئامانجێکی توندڕەوان. بەداخەوە، ئەو لە ۲۷ی دیسەمبەری ۲۰۰۷دا لە گردبوونەوەیەکدا لە (راوالپیندی) تیرۆر کرا. لە شوباتی ۲۰۰۸دا، شوێنکەوتووانی ئەو بەشێوەیەکی بەرچاو هەڵبژاردنەکانیان بردەوە. ئەوان حکومەتێکیان پێکهێنا و موشەرەف بەشێوەیەکی ئاشتییانە لەسەر حوکم هاتە خوار. (ئاسف عەلی زەرداری)ی هاوسەری بوتۆ شوێنی ئەوی وەکو سەرۆك گرتەوە. دیموکراسیی پاکستان بەسەر قەیرانەکەدا سەرکەوت. پێ بەپێی تێپەڕبوونی کات، حکومەتی پاکستان وانەی لە تیرۆرکردنەکەی بوتۆ وەرگرت. هێزەکانی پاکستان گەڕانەوە بۆ شەڕ لە ناوچە خێڵەکییەکاندا- نەك تەنیا لە دژی قاعیدە، بەڵکو لەدژی تالیبان و توندڕەوانی تریش. لەگەڵ ئەوەشدا ساڵێك لەدەستچووبوو کاتێك هۆشی پاکستان چووەوەسەر قەیرانە سیاسییە ناوخۆییەکەی. تالیبان و توندڕەوانی تر ئەو دەرفەتەیان قۆستەوە بۆ زیادکردنی شەپۆلی ئۆپەراسیۆنەکانیان لە ئەفغانستان کە توندوتیژی لێ پەیدا بوو و بووەهۆی ئەوەی کە زۆرێك لە ئەفغانەکان لە حکومەتەکەیان و هاوپەیمانێتییەکەی ئێمە هەڵگەڕێنەوە. زۆر جەوهەری بوو کە ئێمە رێگایەك بدۆزینەوە بۆ ئەنجامدانەوەی هێرشەکان.

***

بە هاتنی ناوەڕاستی ٢٠٠٨، من بێ تاقەت بووم لە خوێندنەوەی راپۆرتە هەواڵگرییەکان لەبارەی پەناگەکانی توندڕەوان لە پاکستان. خەیاڵم چووەوە سەر کۆبوونەوەیەک کە لە ٢٠٠٦دا لەگەڵ هێزە تایبەتەکان لە ئەفغانستان ئەنجاممدا.

پرسیارم کرد "ئایا ئێوە هەر شتێك کە پێویستتانە، لەبەردەستتانە؟"

ئەندامێکی (سیڵ) دەستی بەرز کردەوە و وتی "نەخێر گەورەم".

لەوە تێفکریم ئەبێ کێشەکەی چی بێت.

ئەو وتی "جەنابی سەرۆك، ئێمە پێویستمان بە مۆڵەتە بۆ هێرش لەناو پاکستاندا".

من لە ناکاویی هەڕەشەکە تێگەیشتم و ویستم شتێك بکەم لەوبارەیەوە. بەڵام لەسەر ئەم پرسە، حوکمی موشەرەف لە شوێنی خۆیدا بوو. کاتێك هێزەکانمان رووبەڕووی بەرەنگارییەکی چاوەڕواننەکراو بوونەوە، کەوتنە ناو شەڕەتەقەیەکەوە بوون بە سەردێڕی هەواڵە جیهانییەکان. لە سەردێڕی هەواڵێکی پاکستانیدا هاتبوو "کۆماندۆکانی ئەمریکا هێرش دەکەنەسەر سەروەریی پاکستان. ئیسلامئاباد هەڵچوو. هەردوو ئەنجومەنی پەرلەمان بڕیاری کۆی دەنگیان دا بۆ مەحکوم کردنی کردارەکەمان. هیچ دیموکراسییەك ناتوانێ بەرگەی پێشێلکرانی سەروەرییەکەی بگرێت.

من بەدوای رێگای تردا گەڕام بۆ گەیشتن بە ناوچە خێڵەکییەکان. (پریدەیتەر) کە ماشێنێکی ئاسمانیی بێ شۆفێرە، دەیتووانی چاودێریی ڤیدیۆیی ئەنجام بدات و بۆمبی رێنمایی کراو بە لەیزەر بهاوێت. من مۆڵەتم بە کۆڕی هەواڵگریدا تا فشار بخەنەسەر توندڕەوان. زۆرێك لە وردەکارییەکانی کردارەکانمان بە نهێنی مایەوە. بەڵام هەر زوو کە فرمانمدا، راگەیاندنەکان دەستیان کرد بە راپۆرتدان لەسەر لێدانی زیاتری پریدەیتەرەکان. پیاوی ژمارە چواری قاعیدە بەناوی (خالید ئەلحەبیب) مرد. بەهەمان شێوە ئەو سەرکردانەی قاعیدە کە بەرپرس بوون لە پروپاگەندە، سازدان، کاروباری ئاسایش و پلاندانان بۆ هێرشی دەرەکی. یەکێك لە دوایین ئەو راپۆرتانەی پێم گەیشت، قاعیدەی بە "گیرۆدەبوو و رامالراو" لە ناوچەی سنووری لەقەڵەم دا.

ئێمە بەهەمان شێوە پشتیوانیمان بۆ حکومەتی دیموکراتی پاکستان زیاد کرد. ئێمە پارە، مەشق و کەرەستەمان دابین کرد و پێشنیاری ئۆپەراسیۆنی هاوبەشی دژەتیرۆرمان کرد- هەمووشی بە ئامانجی زیادکردنی تواناکانی پاکستان بوو. کاتێک قەیرانی دارایی لە ٢٠٠٨دا هاتەکایەوە، ئێمە هەنگاومان نا بۆ دڵنیابوونەوە لەوەی کە پاکستان ئەو کۆمەکەی کە پێویستیەتی بۆ نەرمکردنەوەی کاریگەرییەکانی قەیرانی ئابووری وەریگرتووە و تەرکیزمان لەسەر شەڕی توندڕەوەکان هێشتەوە.

یەکێک لە دوایین پرۆژەکانی تیمی ئاسایشی نیشتمانیم چاو خشاندنەوە بوو بە ستراتیژمان لە ئەفغانستاندا. ئەمەش لەلایەن (دۆگ لوت)ەوە بەڕێوەبرا کە ژەنەراڵێکی سێ ئەستێرەی هۆشمەند بوو و هەماهەنگیی ڕۆژ لەدوای ڕۆژی پیادەکردنی ئۆپەراسیۆنەکانی دەکرد لە ئەفغانستان و عێراقدا. ڕاپۆرتەکە بانگەوازی تەقەلای تۆکمەتری دژەیاخیگەرێتی دەکرد، لەوانەش سەرچاوەی سەربازی و مەدەنیی زیاتر لە ئەفغانستان و هاوکاری نزیک لەگەڵ پاکستاندا بۆ سۆراخکردنی توندڕەوان. ئێمە مشتومڕمان لەسەر ئەوە کرد ئاخۆ لە دوایین هەفتەکانی سەرۆکایەتیمدا بەرنامەی ئەنجامەکانمان بەشێوەیەکی ئاشکرا ڕابگەیەنین. ستیڤ هادلی قسەی لەگەڵ هاوتاکەی کرد لە ئیدارەی دواتردا کە وای پێ باش بوو ڕاپۆرتەکە بە هێمنی سپاردە بکەین. بڕیاری ئەوەمدا کە ستراتیژی نوێ هەلێکی سەرکەوتنی باشتری هەبێ ئەگەر دەرفەتێک بۆ چاوپێداخشاندنەوەی بدەین بە تیمە نوێکە کە بە گونجاویان بینی و پاشان وەکو هی خۆیان پەیڕەوییان لێکرد.

***

لە دیسەمبەری ٢٠٠٨دا، گەشتێکیماڵئاواییم بۆ ئەفغانستان ئەنجامدا. هێزی ئاسمانیی یەک لە دەوروبەری سەعات ٥ی بەیانی لە (بنکەی ئاسمانیی باگرام) نیشتەوە. ...ن بە قەدپاڵێکی پڕاوپڕ لە سەربازم وت "من پەیامێکم پێیە بۆ ئێوە. ...لبژاردنە پیرۆزەتان بۆ خزمەتکردن و پاراستنی هاوڵاتییە ئەمریکییەکانتان. ئەوەی کە ...ە لە ئەفغانستان دەیکەین گرنگە، بوێرانەیە و خۆنەویستانەیە. ئەمە هاوشێوەیە ...ەڵ ئەوەی کە سەربازە ئەمریکییەکان لە شوێنانی وەکو (نۆرماندی) و (ئیۆ جیما) و

(کۆریا) ئەنجامیاندا. جیلی ئێوە لە تۆزقاڵێکەوە وەکو هەر جیلێکی پێشووی تر مەزنە. ئەو کارەش کە ئێوە هەر ڕۆژێك دەیکەن مێژووی چەندەها جیلی ئایندە پێکدەهێنێت.

تەوقەم لەگەڵ سەربازەکان کرد و سواری هەلیکۆپتەری بلاك هۆك بوومەوە بۆ فڕینێکی چل خولەکی بەرەو کابول. ئەفغانستان یەکێکە لەو شوێنانەی کە دەبێ ببینیت بۆئەوەی لێی تێبگەیت. شاخەکان گەورە و سەختن، زەوییەکەش ڕەق و تەق و ڕووتەڵە. دیمەنەکە چۆڵ و ترسناك دیارە. وەکو زۆرێك لە ئەمریکییەکان، من هەندێ جار بیرم لەوە کردووەتەوە ئاخۆ چۆن کەسێك توانیویەتی ماوەی حەوت ساڵ خۆی لە سوپاکەمان بشارێتەوە. کاتێك دەمڕوانییە سروشتی خاکی ئەفغانستان، تێگەیشتنی ئاسان بوو.

هەر کە لە کابول نزیك کەوتینەوە، بۆنێکی تیژم کرد. بۆم دەرکەوت کە لە تایە سوتاوەکانەوە دێت– بەداخەوە، شێوازێکی ئەفغانی بوو بۆ خۆ گەرمکردنەوە. تایبەتمەندیی هەواکە لەسەر ئەرز باشتر نەبوو. کاتێ گەڕامەماڵەوە بۆ ماوەی هەفتەیەك کۆکیم، کە بیرهێنەرەوەیەکی ئەوە بوو کە وڵاتەکە ڕێگایەکی درێژی لەبەردەمدایە.

کاتێك لە کۆشکی سەرۆکایەتی نیشتینەوە، سەرۆك کارەزای بە ڕۆب و کڵاوەکەی جارانییەوە هاتە دەرەوە بۆئەوەی چاوی بە من بکەوێ. ئەو منی بە وەزیرانی کابینەکەی ناساند و بۆ خواردنەوەی چا بەرەو ژوورێکی دانیشتنی گەورە هاوڕێیەتی کردم. هەروەکو پێشوو، ئەو چالاك و زیتەڵ بوو. ئەو شانازی لێ دەباری کاتێك وێنەکانی کوڕە منداڵەکەی (میروەیس) و تاکە منداڵی، پیشان دام. ئەو باسی لە پلانەکانی کرد بۆ زیادکردنی بواری کشتوکاڵی ئەفغانستان و هاندانی کەرتی بزنسەکەی لە بوارەکانی وەکو تێلێکۆمیونیکەیشن. پاش کۆبوونەوەکان، ئەو منی بەرەو حەوشە تۆزاوییەکە ڕێنمایی کرد. ئێمە بە تەوقەیەك و باوەشێك لە یەکتر جیابووینەوە. گومانی تیا نییە ئەو هەڵەگەلێکی ئەنجام دابوو. بەڵام سەرباری ئەو هەموو هێزانەی لەدژی کاریان دەکرد، ئەو هەرگیز سووربوونی لەسەر ڕێبەرایەتیکردنی وڵاتەکەی بەرەو ڕۆژێکی باشتر لەدەست نەدا. ئەو یارمەتیدەر بوو تا ئومێد بە گەلی ئەفغان بدات، شتێك کە ئەوان ساڵانێك نەیانبوو. بۆ ئەمە، کارەزای هەمیشە سوپاس و ستایشی منی پێ دەدرا.

که سواری هەلیکۆپتەرەکەم بووم، بیرم لەو پاش نیوەڕۆیەی ئۆکتۆبەری ٢٠٠١ کردەوە که دەستپێکردنی جەنگم لە ژووری (تریتی) ڕاگەیاند. وڵاتێکی کۆنترۆڵکراو لەلایەن دڵرەقترین ڕژێمەکانی مێژوو، ئێتر لەلایەن سەرکردە ئازاد هەڵبژێردراوەکانەوە حوکمڕانی دەکرا. ئەو ژنانەی کە لە ماڵەکانیاندا بەند بوون لە پەرلەماندا خزمەتیان دەکرد. لەکاتێکدا کە هێشتا مەترسی بوو، قاعیدە ئەو کەمپانەی لەدەستدابوو کە بەکاری هێنابوون بۆ مەشقپێکردنی دە هەزار تیرۆریست و پلانی ١١ی سێپتێمبەر. گەلی ئەفغان لە هەڵبژاردنێکی فرەلایەنی ئازاد دا دەنگی خۆی دابوو و سوپایەکی پەیتاپەیتا بەتواناتری حەفتاونۆ سەربازی بونیاد نابوو. ئابووریی ئەفغانستان قەبارەی دووهێند ببوو. چوونە قوتابخانە، لە نۆسەد هەزارەوە ببووە زیاتر لە شەش ملیۆن، لەوانەش زیاتر لە دوو ملیۆن کچ. دەستگەیشتن بە چاودێریی تەندروستی لە ٨٪ەوە گەیشتبووە ٨٠٪. لە ساڵچی ٢٠١٠دا، پێنتاگۆن ئاشکرای کرد کە جیۆلۆجیستەکان نزیکەی بایی یەک تریلیۆن دۆلار کانزای ژێر زەوییان لە ئەفغانستان دۆزیوەتەوە کە سەرچاوەیەکی گەورەی سامان بوو بۆ گەلی ئەفغان کە تاڵیبان هەرگیز نەیدەدۆزییەوە.

هەروەها من دەمزانی کە ئیشێکی تەواونەکراو لەدوای خۆم بەجێ دێڵم. ویستێکی بێ ڕادەم هەبوو بۆ دانەدادگای بن لادن. ئەمەی کە نەمانکرد، دەچێتە ڕیزی داخەکانمەوە. ئەمە بە دڵنیاییەوە بەهۆی نەبوونی هەوڵەوە نەبوو. بۆ ماوەی حەوت ساڵ، ئێمە لە گووشارەکەمان بەردەوام بووین. لەکاتێکدا کە ئێمە هەرگیز سەرکردەی قاعیدەمان نەدۆزیەوە، زۆرمان بۆ هێنا تا شێوازی سەفەرکردنی، پەیوەندیکردن و کارکردنی بگۆڕێت. ئەمەی یارمەتیدان تا پاش ١١ی سێپتێمبەر لە گەورەترین هیوای دابیبڕین: بینینی ئەمریکا کە جارێکی تر هێرشی دەکرێتەوە سەر.

لەکاتێکدا کە من ئەمە لە ساڵی ٢٠١٠دا دەنووسم، جەنگ لە ئەفغانستاندا بەردەوامە. تاڵیبان هەر ئەکتیڤە و حکومەتی ئەفغان لە ململانێدایە بۆ بەدەستهێنانی کۆنترۆڵی تەواوی وڵاتەکەی. هەر لە سەرەتاوە، دەمزانی کە کاتی پێویستە تا یارمەتی گەلی ئەفغان بدەیت دیموکراسیەکی کارا بونیاد بنێن کە لەگەڵ کەلتوور و نەریتەکانیدا کۆک بێت. ئەرکەکە تەنانەت زۆر ماندووکەرتر دەرکەوت لەوەی کە چاوەڕێم کردبوو.

حکومەتەکەمان خۆی ئامادە نەکردبوو بۆ بونیادنانەوەی وڵاتەکە. بە پێی تێپەڕینی کات، ئێمە ستراتیژی و تواناکانمان خستەکار. لەگەڵ ئەوەشدا، هەژاری لە ئەفغانستان ئەوەندە زۆر قووڵ بوو و ژێرخان ئەوەندە کەموکورتی زۆر بوو کە ساڵانێکی دەویست تا کارەکە تەواو بێت.

من بەوپەڕی بڕوامەوە پێم وایە کە ئەرکەکە شایەنی تێچوونەکەیە. خۆشبەختانە، من تاکە کەس نیم. لە پاییزی ٢٠٠٩دا، سەرۆک ئۆباما بە ڕەوانەکردنی سەربازی زیاتر و ڕاگەیاندنی پابەندییەکی نوێ بە دژەیاخیگەرێتی لە ئەفغانستان و زیادکردنی گووشار لەسەر پاکستان بۆئەوەی لە ناوچە خێڵەکییەکاندا شەڕی توندڕەوان بکات، ڕووبەڕووی ڕەخنەگران بووەوە.

سەرەنجام، تاکە ڕێگا کە قاعیدە و تاڵیبان بتوانن ئەفغانستان بەدەست بهێننەوە، ئەوەیە کە ئەمریکا دەست لە وڵاتەکە هەڵگرێت. ڕێگەدان بە توندڕەوان بۆئەوەی دەسەڵات بەدەست بهێننەوە، ژنانی ئەفغان ناچار دەکات تا بگەڕێنەوە ژێر دەستەمۆیی، کچان لە قوتابخانە دەربهێنرێن و خیانەت لە هەموو ئەو دەستکەوتانە بکرێت کە نۆ ساڵی ڕابردوودا بەدەست هاتبوون. بەهەمان شێوە دەبێتەهۆی ئەوەی کە ئاسایشمان بکەوێتە مەترسییەوە. پاش جەنگی سارد، ئەمریکا دەستبەرداری ئەفغانستان ببوو. ئەنجامەکە بریتی بوو لە پشێوی، شەڕی ناوخۆ، زاڵبوونی تاڵیبان، پەناگە بۆ قاعیدە و مۆتەکەی ١١ی سێپتێمبەر. لەبیرچوونەوەی ئەو وانەیە، هەڵەیەکی خەمناک دەبوو.

***

لە دیسەمبەری ٢٠٠٨دا بەر لەوەی لە بنکەی ئاسمانی باگرام بەرز ببمەوە بە مەبەستی گەڕانەوە بۆ نیشتمان، ڕۆیشتمەوە بۆ قەدپاڵەکە بۆ دوایین کۆبوونەوەی دوایین گەشتی دەرەوەم وەکو سەرۆک. لە ژوورێکدا گروپێکی هێزە تایبەتەکان وەستابوون. زۆرێکیان لە چەندەها گەشتدا لە ناو سەرماوسۆڵەی شاخەکاندا بۆ ڕاوکردنی تیرۆریستان و تاڵیبان ئەرکیان ئەنجام دابوو. ئەوان یەکێک لە ئیشە هەرە سەخت و ترسناکەکانی جیهانیان هەبوو. من تەوقەم لەگەڵیان کرد و پێم وتن کە چەندە سوپاسگوزاری خزمەتەکەیانم. پاشان گروپێکی بچوکی سەربازان لە حەفتاو پێنجەم فەوجی هەڵمەتبەر هاتنە ژوورەکە.

سەرۆکی فەسیلەکەیان کاپتن (رامۆن رامۆس) پرسیاری ئەوەی کرد ئاخۆ من ئامادەم بەشداریی لە مەراسیمێکی کورتدا بکەم. دەستی بۆ جانتایەک برد و ئاڵایەکی گەورەی ئەمریکای لێک کردەوە و دەستی راستی بەرز کردەوە. ژمارەیەک پیاو لەبەرانبەری راوەستان و هەمان شتیان کرد. ئەو سوێندێکی پێشکەش کرد کە پیاوەکانی تر دووبارەیان کردەوە "من لە ناخەوە سوێند دەخۆم کە پشتگیری و بەرگری لە دەستووری ئەمریکا دەکەم لە دژی هەموو دوژمنان، بیانی و ناوخۆیی..."

لەوێ، لەو قەدپاڵە تەنیایەدا، لە وڵاتێکدا کە ١١ی سێپتێمبەر پلانی بۆ دانرابوو، لە هەشتەمین ساڵی جەنگێک بۆ پاراستنی ئەمریکا، ئەم پیاوانە لە بەرەکانی پێشەوە، خزمەتی سەربازییان دووپات کردەوە.

# عیراق

رۆژی چوارشەممە، ١٩ی ئازاری ٢٠٠٣، چوومە ناو کۆبوونەوەیەکەوە کە هیواداربووم پێویست نەبێت.

تیمی ئاسایشی نیشتمانی لە ژووری (بارودۆخ)ی کۆشکی سپی کۆ ببووەوە، کە سەنتەرێکی بوێریی کەرەستەکانی کۆمیونیکەیشن و ئەفسەرانی ئەرکە لە قاتی خوارەوەی لای خۆرئاوا. لەسەرەوەی سەنتەرەکەدا چوارگۆشەیەکی شاشەی ڤیدیۆ ژەنەراڵ تۆمی فرانکسی پیشاندا کە لەگەڵ یاریدەدەرانی بالای لە بنکەی ئاسمانیی (شازادە سوڵتان) لە سعودیە دانیشتبوو. لە چوارگۆشەکانی تردا، فەرماندەکانی پێشەوەی سوپا، هێزی دەریایی، مارینز، هێزی ئاسمانی و ئۆپەراسیۆنە تایبەتەکان هەبوون. هاوتاکانیان لە هێزە چەکدارە بریتانییەکان و هێزە بەرگرییەکانی ئوستراڵیا هاتنە پاڵمان.

دوو پرسیارم لە هەر یەکێکیان کرد: ئایا هەر شتێك کە پێویستە بۆ سەرکەوتن هەتانە؟

و ئایا بەو ستراتیژییە ئاسودەن؟

هەر فەرماندەیەك بەشێوەیەکی پۆزەتیڤ وەڵامی دایەوە.

دوایین کەس کە قسەی کرد تۆمی بوو. ئەو وتی "جەنابی سەرۆك، ئەم هێزە ئامادەیە".

رووم کردە دۆن رەمسفێڵد و وتم "جەنابی وەزیر، لەبەر ئاشتی جیهان و سوود و ئازادیی گەلی عیراق، لێرەوە فرمانی پیادەکردنی ئۆپەراسیۆنی ئازادیی عیراق دەدەم. خوا بەرەکەت بداتە سەربازەکانمان".

ئۆمی سڵاوێکی سەربازی کرد و وتی "جەنابی سەرۆکن خوا بەرەکەت بداتە ئەمریکا

".

هەر کە سڵاوم کردەوە، هێزی راکێشانی چرکەساتەکە لێیدام. بۆ ماوەی زیاتر لە ساڵێك، لە هەوڵی ئەوەدا بووم کە بەبێ جەنگ رووبەڕووی هەڕەشەی سەدام حسێن ببمەوە. ئێمە هاوپەیمانێتییەکی نێودەوڵەتیمان پێکهێنابوو بۆ فشار خستنەسەری بۆئەوەی خۆی لە پرۆگرامەکانی چەکی کۆکوژ پاك بکاتەوە. ئێمە بڕیارێکی کۆدەنگی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکانمان بەدەستێنابوو بۆ ئەوەی کە دەرەنجامی کارەساتبار لەئارادا دەبێت ئەگەر بەرەنگاری لەئارادابێت. ئێمە قسەمان لەگەڵ وڵاتانی عەرەبی کردبوو بۆ دوورخستنەوەی سەدام بۆ هەندەران. من دوایین چل و هەشت سەعاتم بە سەدام و کوڕەکانی دابوو تا خۆیان لە جەنگ بپارێزن. دیکتاتۆر هەموو دەرفەتێك رەت کردەوە. تاکە ئەنجامگیریی لۆژیکی ئەوە بوو کە ئەو شتێك هەبێ دەیشارێتەوە، شتێکی ئەوەندە گرنگ کە ئامادەیە بچێتە جەنگەوە لە پێناویدا. دەمزانی فرمانەکەم چ دەرەنجامێك دەبێ. من لەگەڵ ئەو بێوەژنانەدا گریابووم کە مێردەکانیان لە ئەفغانستان لەدەستدابوو. من ئەو منداڵانەم لەباوەش گرتبوو کە چیتر دایك یان باوکیان نەبوو. نەمدەویست جارێکی تر ئەمریکییەکان بنێرمەوە بۆ جەنگ. بەڵام پاش مۆتەکەی ١١ی سێپتێمبەر، سوێندم خواردبوو کە چی پێویستە بۆ پارێزگاری ئەمریکا بیکەم. رێگەدان بە دوژمنێکی سەرسەختی ئەمریکا تا ریکۆردێك لە چەکەکانی کۆکوژ بدات بەدەستەوە، مەترسییەك بوو کە من نەمدەتوانی خۆی لێ بدەم.

من کاتم پێویست بوو بۆ هەڵمژینی هەستەکانی ئەو چرکەساتە. ژووری (بارودۆخ)م جێ هێشت، بە قادرمەکاندا سەرکەوتم بەرەو ئۆفیسی ئۆڤاڵ و بە دەوری (فریزی باشوور)دا پیاسەیەکی لەسەرخۆی هێمنم ئەنجامدا. نزام بۆ سەربازەکانمان، بۆ سەلامەتی وڵات و بۆ بەهێزیم کرد لە رۆژانی داهاتوودا. سەگی (سپرینگ سپانێل)ەکەمان لە کۆشکی سپییەوە بازیدا و بەرەو لای من هات. خۆش بوو کە هاوڕێیەك ببینی. دڵخۆشییەکەی پێچەوانەبوو لەگەڵ ئەو قورساییەی لەسەر دڵم هەبوو.

ئەنیا یەک پیاو هەبوو کە لە هەستی من تێدەگەیشت. لە ژووری (تریتی) لەسەر مێزەکەم دانیشتم و بە پەرۆشەوە نامەیەکم نووسی:

"باوکی بەڕێزم،...

لە دەوروبەری ۹:۳۰ی بەیانی، فرمانم بە وەزیری بەرگریدا تا پلانی ئۆپەراسیۆنی ئازادکردنی عێراق جێبەجێ بکات. سەربارى ئەو راستییەی کە چەند مانگێک لەمەوبەر بڕیاری بەکارهێنانی هێزم داوە، ئەگەر ئەوە پێویستی کردبێت، واتە ئازادکردنی عێراق و دەربازکردنی وڵاتەکە لە چەکی کۆکوژ، ئەوا بڕیارەکە لە هەستەوە بوو...

دەزانم هەنگاوێکی دروستم ناوە و نزا دەکەم کە خەڵکێکی کەم گیان لەدەست بدەن. عێراق ئازاد دەبێت، جیهان سەلامەتتر دەبێت. هەستی چرکەساتەکە تێپەڕیووە و ئێستا چاوەڕوانیی هەواڵ دەکەم لەسەر ئەو کردەوە نهێنییەی کە روودەدات.

دەزانم تۆ بە چ دۆخێکدا تێپەڕیویت.

دڵسۆزت،

جۆرج"

چەند سەعاتێک دواتر، وەڵامەکەی بە فاکس گەیشت:

"جۆرجی بەڕێز،

ئەو تێبینییە دەستنووسەت کە تازە پێم گەیشت، دڵی گرتم. تۆ شتێک راست ئەنجام دەدەیت. بڕیارەکەت، کە تازە داوتە، سەختترین بڕیارێک بووە کە تاوەکو ئێستا دابێتت. بەڵام تۆ ئەم بڕیارەت بە بەهێزی و لەدڵەوە داوە. دروستە کە نیگەرانی لەدەستچوونی ژیانی بێگوناهەکان بیت، ئەمریکی بێت یان عێراق. بەڵام تۆ ئەوەت ئەنجامدا کە پێویست بوو. لەوانەیە تۆزقاڵێک یارمەتیدەر بێت لەکاتێکدا کە تۆ رووبەڕووی کۆمەڵێک لەو کێشە سەختانە دەبیتەوە کە هەر سەرۆکێک لە سەردەمی لینکۆڵنەوە رووبەڕوویان بووەتەوە: تۆ قورساییەکە بە بەهێزی و شکۆمەندییەوە لە ئەستۆ دەگریت...

قسەکانی رۆینت لەبیر بێت کە دەیگووت "لەوە زیاتر خۆشم دەوێیت کە زمان دەتوانێ گۆ بکات.

دە کەوایە

منیش هەروا"

ئەو بۆمبانەی کە ئەو شەوە بەسەر بەغدا دا بارین، دەستپێکی قۆناغی ئازادکردنی عێراقی دیاریکرد. بەڵام ئەوە تاکە لێدانی ئاسمانی نەبوو کە لە ماوەی سەرۆکایەتییەکەمدا هەواڵی دروستکرد.

لە شوباتی ٢٠٠١دا، من لە (سنات کریستۆبال)ی مەکسیک سەردانی سەرۆک (ڤینسنت فۆکس)م کرد. یەکەم گەشتی دەرەوەم وەکو سەرۆک بۆ رۆشنایی خستنەسەر پابەندیم بوو بۆ فراوانکردنی دیموکراسی و بازرگانی لە ئەمریکای لاتین. بەداخەوە هەواڵ لە عێراقەوە گەیشت. لەکاتێکدا کە ئێمە سەرسامی خۆمان بە دیمەنە هێمنەکانی کێڵگەکەی ڤینسنت پیشان دەدا، بۆمبهاوێژەکانی ئەمریکا لە سیستەمی بەرگریی ئاسمانیی عێراقیان دەدا. ئەمە ئەرکێکی تا رادەیەک رۆتینی بوو بۆ سەپاندنی ناوچەکانی دژەفڕین کە پاش ئەوەی سەدام هەزاران شیعە و کوردی بێگوناهی لەدوای جەنگی کەنداو کوشتبوو، دروستکرابوون.

سەدام سلیەیەکی هاویشتبوو کە ئاسمانی بەغدای رووناک کردبووە و سەرنجی (سی.ئێن.ئێن)ی راکێشابوو. کاتێک من و ڤینسنت لە ماڵەکەی چووینە دەرەوە بۆ کۆنفرانسێکی رۆژنامەنووسی، ریپۆرتەرێکی مەکسیکی وتی "پرسیارێکم بۆ سەرۆک بوش هەیە...ئایا ئەمە دەستپێکی جەنگێکی نوێیە؟"

ئەو پەرچەکردارە بیرهێنەرەوەی ئەو بارودۆخە خراپبووە بوو کە ئەمریکا لە عێراق رووبەڕووی ببووەوە. زیاتر لە بەری دەیەیەک، لە ئابی ١٩٩٠دا، تانکەکانی سەدا حسێن سنووری کوێتیان بەزاندبوو. باوکم رایگەیاندبوو کە شەڕانگێزییەکی نەوروژێنراو قبوڵ ناکرێت و دەرفەتی ئەوەی پێدا تا لە کوێت بکشێتەوە. کاتێک دیکتاتۆر بەرەنگاریی داواکانی کرد، باوکم هاوپەیمانێتییەکی سی و چوار وڵاتی پێکهێنا- لەوانەش وڵاتانی عەرەبی- بۆ سەرکوتکردنی. بڕیاری ناردنی سەربازە ئەمریکییەکان بۆ کوێت بۆ باوکم

ئازاربەخش بوو– و جێبەجێکردنی بێزارکەر بوو. ئەنجومەنی پیران بە ڕێژەیەکی لاوازی ٥٢ بە ٤٧ دەنگی دا بە مۆڵەتی هێزی سەربازی. گروپێك لە یاسادانەران نامەیەکیان دایە دەست باوکم کە مەزندەی دە هەزار بۆ پەنجاهەزار مەرگی سەربازانی ئەمریکی کردبوو. سەرۆکی پێشوو، جیمی کارتەر، داوای لە ئەندامانی ئەنجومەنی ئاسایشی نیشتمانی کردبوو کە دژی جەنگەکە بوەستنەوە. هەرچۆنێك بێت نەتەوە یەکگرتووەکان دەنگی بە پشتیوانی جەنگەکە دا.

ئۆپەراسیۆنی زریانی بیابان سەرکەوتنێکی سەرسوڕهێنی لێ کەوتەوە. هێزەکانی هاوپەیمانان سوپای عیراقیان لە کوەیت لە کەمتر لە ١٠٠ سەعات وەدەرنا. سەرەنجام، ١٤٩ ئەمریکی لە گۆڕەپاندا کوژران. من شانازیم بە یەکلاییکەرەوەیەتی باوکمەوە دەکرد. بیرم لەوە دەکردەوە ئاخۆ هێز بۆ بەغداش دەنێرێت. جارێك لە جاران و بۆ تا هەتایە دەرفەتی ئەوەی هەبوو کە جیهان لە سەدام رزگار بکات. بەڵام بە رزگارکردنی کوەیت وەستا. بەو شێوەیە بوو کە پێناسەی ئەرکەکەی کردبوو. بۆ ئەمە بوو کە کۆنگرێس بڕیاری دابوو و هاوپەیمانێتییەکە هاتبووەسەر جێبەجێ کردنی. من بە تەواوی لە هۆکارەکەی تێگەیشتم.

***

وەکو مەرجێك بۆ کۆتاییهێنان بە دوژمنکارییەکانی جەنگی کەنداو، بڕیاری ژمارە ٦٨٧ی نەتەوە یەکگرتووەکان سەدامی پابەند کرد بە تێکشاندنی چەکەکانی کۆکوژ و موشەکی دوورهاوێژی زیاتر لە نەوەد مایل. بڕیارەکە خاوەنداریێتیی عیراقی بۆ چەکە بایۆلۆژی، کیمیایی یان ناوکییەکان یان ئامرازەکانی بەرهەمهێنانیان قەدەغە کرد. بۆ زامنکردنی ملکەچبوون، سەدام پابەند کرا بە قبوڵکردنی سیستەمێکی چاودێریکردن و پشتڕاکردنەوەی یو ئێن.

لە سەرەتادا، سەدام بانگەشەی ئەوەی کرد کە عەمبارێکی سنووورداری چەکی کیمیایی و موشەکی (سکود)ی هەیە. بەپێی تێپەڕبوونی کات، پشکنەرانی یوئێن بڕێکی یەکجار گەورەی تەقەمەنییان دۆزییەوە. سەدام هەزاران بۆمب و گوللە تۆپ و کڵاوەی بە کەرەستەی کیمیایی ئاخنیبوو. ئەو پرۆگرامێکی چەکی ناوکی هەبوو کە دوو ساڵی مابوو

بۆ بەرهەمهێنانی بۆمب کە زۆر نزیکتر بوو لە مەزەندەی پێش جەنگی (سی.ئای.ئەی)ی هەشت بۆ دەساڵ. کاتێک زاواکەی لە ١٩٩٥دا ئینشیقاقی کرد، سەدام دانی بەوە دانا کە رژێمەکە ئەو پرۆگرامەی چەکی بایۆلۆژی شاردووەتەوە کە ئەنتراکس و بوتۆکسی گرتووەتەخۆ.

بۆ هێشتنەوەی سەدام لەژێر چاودێریدا، یوئێن سزای ئابووری توندی بەسەردا سەپاند. بەڵام هەر کە تورەیی لە بەرانبەر داگیرکردنی کوەیت لەلایەن عێراقەوە نەما، هۆشی جیهان پەرت بوو. سەدام نزیکەی دوو ملیارد دۆلاری لە بەرنامەی نەوت بەرانبەر خۆراک لادەبرد- کە یوئێن هێنابوویە کایەوە بۆ دابینکردنی پێویستییە مرۆییە بنچینەییەکانی عێراقییە بێ گوناهەکان- بۆ دەوڵەمەندکردنی داروودەستەکەی و بونیادنانەوەی هێزی سوپاکەی، لەوانەش پرۆگرامە پەیوەندیدارەکانی چەکی کۆکوژ. لەکاتێکدا کە منداڵان لەبرسا دەمردن، هەڵمەتێکی پروپاگەندەی رێکخست تیایدا سەرزەنشتی سزاکانی دەکرد لەبەرانبەر ئەو مەینەتییەدا.

بە هاتنی ١٩٩٨، سەدام شەریکە بازرگانییە سەرەکییەکانی وەکو روسیا و فەرەنسای قایلکردبوو تا فشارێکی لە یوئێن-دا کۆ بکەنەوە بۆ شلکردنەوەی سزاکان. پاشان فشاری خستەسەر پشکنەرانی یوئێن تا وڵات جێ بهێڵن. کێشەکە روون بوو: سەدام قەت ئەوەی پشتراست نەکردەوە کە هەموو چەکەکانی جەنگی کەنداوی تێکشکاندبێت. بە رۆیشتنی پشکنەرەکان، جیهان هیچ لێ دیار نەما ئاخۆ ئەو پرۆگرامەکانی دەست پێدەکاتەوە.

ئیدارەی کلینتن بە دەستپێکردنی ئۆپەراسیۆنی رێوی بیابان وەڵامی دایەوە- هەڵمەتێکی بۆمبهاوێژیی چوار رۆژی کە بەهاوبەشی لەگەڵ بریتانیا بوو بە ئامانجی داماڵینی سەدام لە تواناکانی چەکی کۆکوژ. لە وتارێکی تەلەفزیۆنیی زۆرترین بینەردا لە ئۆڤاڵ ئۆفیسەوە لە دیسەمبەری ١٩٩٨دا، سەرۆک کلینتن روونی کردەوە:

"راستییە تاڵەکە ئەوەیە کە تا ئەو کاتەی سەدام لەسەر حکوم بمێنێت، هەڕەشە دەبێت بۆ سەر گەلەکەی، ئاشتی ناوچەکەی، ئاسایشی جیهان. باشترین رێگە بۆ نەهێشتنی ئەو هەڕەشە بۆ جارێک و تاهەتایە، بریتییە لە حکومەتێکی عێراقیی نوێ-

حکومەتێك کە ئامادەیە بە ئاشتی بژیت لەگەڵ دراوسێکانی، حکومەتێك کە رێز لە مافەکانی خەڵکەکەی دەگرێت...

هەرچەندە سەختیش بن کە هەروان، دەبێ باجەکانی هەنگاونان لە بەرانبەر باجی هەنگاونەناندا هەڵبسەنگێنرێن. ئەگەر سەدام بەرەنگاریی جیهان بکات و ئێمە نەتوانین وەڵام بدەینەوە، ئەوا لە ئایندەدا رووبەڕووی هەڕەشەیەکی یەکجار گەورەتر دەبینەوە. سەدام جارێکی تر لە دراوسێکانی دەدات. شەڕ لەدژی گەلەکەی خۆی ئەنجام دەدات. قسەکانی منیشتان بیر نەچێت، ئەو چەکە کۆکوژەکان دروست دەکات. ئەو بەکاریان دەهێنێت".

هەمان ساڵ، کۆنگرێس بە زۆرینەی دەنگ یاسای ئازادکردنی عیراقی تێپەڕاند و کلینتن واژۆی کرد. یاساکە بەرنامەیەکی رەسمیی نوێی ئەمریکای راگەیاند: "بۆ پشتگیریکردنی هەوڵەکانی لابردنی رژێمی سەرکردایەتیکراو لەلایەن سەدام حسێنەوە لە دەسەڵات لە عیراقدا و بۆ هاندانی سەرهەڵدانی حکومەتێکی دیموکراتیك".

***

بەهاتنی سەرەتاکانی ٢٠٠١، سەدام حسێن جەنگێکی سوکی لەدژی ئەمریکا بەڕێوە دەبرد. لە ١٩٩٩ و ٢٠٠٠دا، هێزەکانی حەوسەد جار تەقەیان لەو فرۆکەوانانەی ئێمە کردبوو کە بەسەر ناوچەکانی دژەفڕیندا دەوریەیان هەبوو.

لە ماوەی هەشت مانگی یەکەمی ئۆفیسەکەمدا، بەرنامەکەم تەرکیزی خستبووەسەر توندکردنی سزاکان— یان هەروەکو کۆلن پاول وتی، هێشتنەوەی سەدام لە قاوغەکەیدا. پاشان ١١ی سێپتێمبەر بەسەردا هات و دەبووایە ئێمە روانینێکی تازەمان هەبێ بۆ هەر هەڕەشەیەك لە جیهاندا. سپۆنسەری دەوڵەتیی تیرۆر هەبوون. دوژمنی سەرسەختی ئەمریکا هەبوون. حکومەتی شەڕانگێز هەبوون کە هەڕەشەیان لە دراوسێکانیان دەکرد. وڵات هەبوون کە داواکارییە نێودەوڵەتییەکانیان پشتگوێ دەخست. دیکتاتۆر هەبوون کە سەرکوتی گەلەکانیان دەکرد. هەروەها رژێم هەبوون کە ئێشیان لەسەر بەرنامەی چەکی کۆکوژ دەکرد. عیراق هەموو ئەو هەڕەشانەی لێکدابوو.

سەدام حسێن تەنیا هاوسۆزی لەگەڵ تیرۆریستاندا نەبوو. ئەو پارەی دەدایە خێزانەکانی تەقینەرەوە خۆکوژە فەلەستینییەکان و پەناگەی بۆ تیرۆریستانی وەکو (ئەبو نیزاڵ) فەراهەم دەکرد کە سەرپەرشتیاری ئەو هێرشانە بوو کە نۆزدە کەسی لای بلیتبڕەکانی هێڵێکی ئاسمانیی ئیسرائیلی کوشت لە رۆما و ڤیەننا و (ئەبو عەباس)ی پەنادابوو کە کەشتیی گەشتی دەریایی (ئەخیل لۆرۆ)ی رفاندبوو و ئەمریکییەکی پیری سەر کورسی دووتایەی کوشتبوو.

سەدام حسێن تەنیا دوژمنێکی سەرسەختی ئەمریکا نەبوو. ئەو تەقەی لە فڕۆکەی ئێمە کردبوو، بەیانێکی دەرکردبوو بۆ ستایشکردنی ١١ی سێپتێمبەر و هەوڵی تیرۆرکردنی سەرۆکی پێشوو، واتە باوکمی دابوو.

سەدام حسێن تەنیا هەڕەشەی لە دراوسێکانی نەدەکرد. ئەو دوانی داگیر کردبوو، ئێران لە ١٩٨٠کاندا و کوەیت لە ١٩٩٠کاندا.

سەدام حسێن تەنیا داواکارییە نێودەوڵەتییەکانی پێشێل نەکردبوو. ئەو تەحەدای شانزە بڕیاری یونێن-ی کردبوو کە هی سەردەمی جەنگی کەنداو بوون.

سەدام تەنیا حوکمی زۆردارانەی پیادە نەدەکرد. ئەو و داروودەستەکانی ئەشکەنجەی خەڵکی بێ تاوانیان ئەدا، نەیارانی سیاسییان لەبەردەم خێزانەکانیاندا لاقە دەکرد، نەیارانیان بە تێزاب ئەسوتاند و دەیان هەزار عیراقییان زیندەبەچاڵ کرد. لە ساڵی ٢٠٠٢، حکومەتی سەدام فرمانێکی دەرکرد کە ئەو خەڵکەی رەخنە لە سەرۆک یان خێزانەکەی بگرێت ئەوا زمانی دەبڕدرێت. کاتێکی دواتری ئەو ساڵە، مامانێکی عیراقی بە تۆمەتی لەشفرۆشی سەری بڕدرا. تاوانی راستەقینەی ژنەکە قسەکردنی ئاشکرای بوو لەبارەی گەندەڵی لە وەزارەتی تەندروستیی عیراقدا.

سەدام تەنیا سۆراخی چەکەکانی مۆکەڵکوژی نەدەکرد. ئەو بەکاری هێنابوون. ئەو گازی خەردەل و ئەعسابی لەدژی ئێرانییەکان بەکارهێنابوو و زیاتر لە پێنج هەزار مەدەنیی بێتاوانی لە هێرشی کیمیایی ١٩٨٨دا لە شاری هەڵەبجەی کوردی کۆکوژ کردبوو. کەس نەیدەزانی کە سەدام چی لە زەخیرەی بایۆلۆژی و کیمیاییەکەی کردووە، بەتایبەت پاش ئەوەی پشکنەرانی کردبووە دەرەوە. بەڵام پاش پێداچوونەوەی

زانیارییەکان، نزیکەی هەر ئاژانسێکی هەواڵگریی گەورە لە جیهاندا گەیشتبووە هەمان ئەنجامگیری: سەدام چەکی کۆکوژی لە تەقەمەنییەکانیدا هەیە و توانای بەرهەمهێنانی زیاتریشی هەیە. راپۆرتێکی هەواڵگری کێشەکەی پوخت کردبووەوە: "هەر لە کۆتایی پشکنەرانەوە لە ١٩٩٨دا، سەدام تەقەڵای چەکی کیمیایی جێگیر کردووە و دەستی کردووە بە هەوڵدان بۆ جوڵان بەرەو پێشەوە لە بواری ناوکیدا".

پێش ١١ی سێپتێمبەر، لەوانەیە سەدام کێشەیەك بووبێت کە ئەمریکا بتوانێ بەڕێوەی ببات. لە چاویلکەی جیهانی پاش ١١ی سێپتێمبەرەوە، تێڕوانینم گۆڕا. من تازە شایەتی ئەو زیانە بووم کە بەهۆی نۆزدە خەنجەربۆکس بەدەستی توندڕەو دروستببوو. من تەنیا دەمتووانی وێنای شیانی ئەو وێرانکارییە بکەم کە دیکتاتۆرێکی دوژمن چەکە کۆکوژەکانی رادەستی تیرۆریستان بکات. ئەمەش لەکاتێکدا بوو کە لێشاوی هەڕەشەکان بۆ ناو ئۆفیسی ئۆڤاڵ رۆژانە بەردەوام بوون- زۆرێکیشیان پەیوەندیدار بوون بە چەکی کیمیایی، بایۆلۆژی و ناوکی- کە هەر لە شیمانەیەکی واقیعیی تۆقێنەر دەچوون. مەترسییەکان لەوە گەورەتر بوون کە متمانە بە قسەکانی دیکتاتۆر بکرێت لەبەرانبەر قورسایی ئەو بەڵگەیە و ئەو کۆدەنگییەی جیهان هەیبوو. وانەی ١١ی سێپتێمبەر ئەوەبوو کە ئەگەر ئێمە چاوەڕێی ئەوە بکەین مەترسی بەتەواوی بەرجەستە ببێت، ئەوا ئێمە زۆر زیاد چاوەڕێمان کردووە. من گەیشتمە بڕیارێك: ئێمە بە شێوازێك لە شێوازەکان، رووبەڕووی هەڕەشەی عیراق دەبینەوە.

***

یەکەم بژارەم بەکارهێنانی دیپلۆماسی بوو، ریکۆردمان لەو بوارەدا هاندەر نەبوو. ئێمە لە هەشتاکاندا پەیوەندییەکی دوولایەنەمان لەگەڵ بەغدا بەرقەرار کرد. ئێمە لە ١٩٩٠ەکاندا بڕیارگەلێکی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکانمان دەستەبەر کرد. سەرباری دەستەویەخەبوونمان، سەدام تەنیا شەرانگێزتر دەبوو. ئەگەر دیپلۆماسی سەربکەوتایە، ئەوا شێوازێکی تەواو جیاوازمان پێویست دەبوو. بڕوامان وابوو کە لاوازیی سەدام ئەوەیە کە حەزی لە دەسەڵاتە و هەر شتێك دەکات بۆ پاراستنی. ئەگەر قایلی بکەین کە ئێمە جددین لەبارەی رووخاندنی رژێمەکەی، ئەوا دەرفەتێك دەبێت بۆ

دەستبەرداربوون لە چەکە کۆکوژەکانی، کۆتایی بە پشتگیریی تیرۆر دێنێت، ل هەڕەشەکردن لە دراوسێکانی دەوەستێت و بەپێی تێپەڕبوونی کات، ڕێز لە ماف مرۆییەکانی خەڵکەکەی دەگرێت. ئەگەرەکانی سەرکەوتن دووروودرێژ بوون. بەڵام بە لەبەرچاوگرتنی ئەلتەرناتیڤەکە، هەوڵەکە شایستە بوو. شێوازەکە پێی دەوترا دیپلۆماسیی بەزۆر.

دیپلۆماسیی بەزۆر لەگەڵ عیراقدا پێکهاتبوو لە دوو ڕێچکە: یەکێکیان کۆکردنەوەی هاوپەیمانێتیی وڵاتان بوو بۆ ڕوونکردنەوەی ئەمەی کە بەرەنگاریی سەدام لەبەرانبەر ئەرکە نێودەوڵەتییەکانیدا شایەنی قبوڵکردن نییە. ئەویتریان بریتی بوو لە گەڵاڵەکردنی بژارەیەکی سەربازیی جێ متمانە کە بتوانرێ بەکار بهێنرێ ئەگەر ملی کەچ نەکرد. ل سەرەتادا ئەو دوو ڕێچکەیە بە تەریبی یەکتر دەڕۆیشتن.لەکاتێکدا کە بژارەی سەربازی ڕوونتر دەبوو زیاتر بەرەوپێش دەچوو، ڕێچکەکان ئاوێتەی یەکتر دەبوونەوە. ئەوپەڕی تواناامان پێش یەکتربڕینیان بوو. ئەمە چرکەساتی بڕیارەکە دەبوو. سەرەنجامیش، بڕیارەکەی دەکەوتەوە لای سەدام.

***

لە شوباتی ٢٠٠١دا، سەرۆک وەزیرانی بریتانیا تۆنی بلێر و (چێری)ی هاوسەری هاتنە کامپ دەیڤد بۆ سەردانی من و لۆرا. تۆنی یەکەم سەرۆکی دەرەوە بوو کە ئێمە بانگهێشتمان کردن، وەکو نیشانەیەک بۆ پەیوەندی تایبەتی نێوان ئەمریکا و بریتانیا.

دڵنیا نەبووم کە چی لە تۆنی چاوەڕێ بکەم. دەمزانی کە سەرۆک وەزیرانی حزبی کرێکارانی چەپی میانڕەوە و هاوڕێیەکی نزیکی بیل کلینتنە. دەستبەجێ بۆم دەرکەوت کە ئەو ڕاشکاو، دۆستانە و خۆش مەشرەبە. هیچ شتێکی ڕواڵەتی لە تۆنی و چێری بەدی نەدەکرا. پاش نانی ئێوارە، بڕیارماندا تەماشای فیلمێکی سینەمایی بکەین. کاتێک ڕازی بوون لەسەر میت زە پارێنتس (دایک و باوکی بناسە) کە فیلمێکی کۆمیدی بوو لە نواندنی ڕۆبەرت دینیرۆ و بێن ستیلەر، من و لۆرا زانیمان کە بوشەکان و بلێرەکان بەیەکەوە دەگونجێن.

من و تۆنی باسمان لە پرسە گەورەکانی رۆژ کرد. پوختەیەکی لەبارەی سیاسەتی ئەورووپا پێدام. ئێمە قسەمان لەسەر ئامانجە هاوبەشەکانی فراوانکردنی بازرگانی ئازاد، کەمکردنەوەی مەینەتی لە ئەفریقا و موخاتەبەکردنی توندوتیژی لەسەر خاکی پیرۆز کرد. کاتێکی زۆرمان بە پرسە کۆمەڵایەتییەکانەوە خەریك نەکرد. ئەمەیان بۆ من و چێری جێهێڵرابوو.

لە هاوینی ۲۰۰۱دا، بلێرەکان من و لۆرایان بانگهێشت کرد بۆ (چێکەرز)، کە خانووی دێهاتیی چەند نهۆمیی سەرۆك وەزیرانی بریتانیا بوو. چێکەرز خانوویەکی گەورەی کۆن بوو بە ئەساسێکی ئارامبەخشی رەسەن و پۆرترێتەکانی سەرۆك وەزیرانی پێشوو. لەبری پێشوازیکردنێکی رەسمی، بلێرەکان ئێوارەخوانێکی گەرم و گوڕی خێزانییان لەگەڵ وچار مناڵەکەیان رێکخست– لەوانەش لیۆی بچوك کە تەمەنی چوارده مانگ بوو.

تا نیوەی نان خواردنەکە رۆیشتبووین کە مەسەلەی سزای مردن هاتە بەر باس. چێری کۆك نەبوو لەگەڵ هەڵوێستی مندا. تۆنی کەمێك نائاسوده دیار بوو. من گوێم لە بۆچوونەکانی گرت و پاشان داکۆکیم لەوانەی خۆم کرد. پێم وت کە بڕوام وایە سزای مەرگ ، ئەگەر بە باشی بەڕێوە ببردرێت، دەتوانی بە رەواندنەوەی تاوان چەندەها ژیان رزگار بکات. وەکو پارێزەرێکی بەهرەمەند کە من رێزم بۆی هەبوو، چێری بەڵگاندنەکانی منی رەت کردەوە. لە ساتێکە لە ساتەکاندا، من و لۆرا گوێمان لە (ئێوان)ی کوڕە زیرەکەکەی بلێر بوو دەیگووت "دایکە ناوبڕێك بدە بەو پیاوە".

چەندەی کاتی زیاترمان بەیەکەوە بەسەر برد، رێزم بۆ تۆنی زیاتر دەبوو. بە تێپەڕبوونی ساڵان، ئەو بوو بە نزیکترین دۆست و باشترین هاوڕێ لەسەر ئاستی جیهان. ئەو لە ماوەی سەرۆکایەتییەکەمدا زیاتر لە سی جار هاتە ئەمریکا بۆ کۆبوونەوەکان. من و لۆرا لە ئێرلەندای باکوور، سکۆتلەندە و لەندەن سەردانمان کردووە. لە نۆڤەمبەری ۲۰۰۲دا، تۆنی و چێری بانگهێشتیان کردین بۆ ماڵەکەیان لە (تریمدن کۆلێری) و ناوچەی کانە کۆنەکە لە دێهات. ئەوان لەو خانووەی ستایلی سەردەمی ڤیکتۆری، چایان پێشکەش کردین و بردیانین بۆ یانەی شارۆچکەکە (دەن کاو). ئێمە چپس و ماسیمان خوارد لەگەڵ بەزالیا کە من بیرەیەکی بێ کحولی (بیتبێرگەر) ناودیوم کرد. پاش نانی

نیوەڕۆ، سەردانی قوتابخانەیەکی لۆکاڵمان کرد و تەماشای ڕاهێنانێکی تۆپی پێمان کرد. خەڵکەکە شایستە و گەرم و گوڕ بوون، جگە لە خۆپیشاندەرێك کە تابلۆیەکی بە دەستەوە بوو لێی نوسرابوو "نەخۆشیی شێتی کاوبۆی".

تۆنی پێکەنینێکی خێرا و ژیرییەکی زیرەکانەی هەبوو. پاش یەکەم کۆبوونەوەمان، ڕیپۆرتەرێکی بریتانی پرسیاری ئەوەی کرد ئاخۆ چیمان هاوبەشە. من وەڵامم دایەوە "هەردووکمان مەعجونی ددانی کۆلگەیت بەکاردێنین". تۆنیش وتی "جۆرج، ئەوان دوایی لەوە دەکۆڵنەوە ئاخۆ تۆ چۆن ئەمە دەزانی". کاتێك ئەو موخاتەبەی دانیشتنێکی هاوبەشی کۆنگرێسی کرد لە ساڵی ۲۰۰۳دا، تۆنی باسی لە جەنگی ۱۸۱۲ کرد، کاتێك هێزەکانی بریتانیا کۆشکی سپیان سوتاند. ئەو وتی "دەزانم ئەمە بە جۆرێك لە جۆرەکان درەنگە، بەڵام... ببوورن".

بە پێچەوانەی زۆرێك لە سیاسییەکانەوە، تۆنی بیرمەندێکی ستراتیژی بوو کە دەیتووانی ئەودیو دۆخی هەنوکەیی ببینێت. هەروەکو دواتر بۆم دەردەکەوت، من و ئەو دوو ڕۆحی ئاشنای باوەڕمان بووین بە هێزی وەرچەرخێنەری ئازادی. لە دوایین هەفتەی سەرۆکایەتیمدا، من شانازیم بەوەوە کرد کە کردم بە یەکێك لەو سەرکردە کەمانەی میداڵی ئازادیی سەرۆکایەتییان وەرگرت.

سەرباری هەموو شتێکیش، تۆنی ئازا بوو. هیچ پرسێك ئەوەندەی عیراق بە ڕوونی دەری نەخست. وەکو من، تۆنی سەدامی بە هەڕەشەیەك دادەنا کە جیهان لە دوای ۱۱ی سێپتێمبەرەوە ناتوانێ بەرگەی بگرێت. بریتانییەکان ئامانجی توندڕەوان بوون. ئەوان هەواڵگرییەکی بەرفراوانیان لەسەر سەدام هەبوو. بەشێوەیەکی کەسیش لەو هەڕەشەیە تێگەیشتن کە ڕووبەڕوویانە. سەدام تەقەی لە فڕۆکەکانیشیان دەکرد.

ئەگەر قەرار بووایە سەدام لەسەر حوکم لابدەین، ئەوا من و تۆنی ئەرکێکمان لەسەر شان بوو بۆ یارمەتیدانی گەلی عیراق تا دیکتاتۆریەتی سەدام بە دیموکراسی جێگۆڕکێ پێبکەن.

وەرچەرخانەکەش کاریگەری لەودیو سنوورەکانی وڵاتەکەوە دەبێت. خۆرهەڵاتی ناوەڕاست سەنتەری ململانێیەکی ئایدۆلۆژیی جیهانی بوو. لەلایەکەوە خەڵکێکی شایستە

هەبوون کە دەیانویست بە شکۆمەندی و ئاشتییەوە بژین. لەلایەکی ترەوە توندڕەو هەبوون کە سۆراخی سەپاندنی دیدە رادیکاڵەکانیان دەکرد لە ڕێگەی توندوتیژی و ترساندن. ئەوان هەلومەرجی بێ هیوایی و سەرکوتکردنیان لە دوورمەودا بەکاردەهێنا بۆ ساغکردنەوە و بڵاوکردنەوەی ئایدۆلۆژیاکەیان. باشترین ڕێگا بۆ پاریزگاریکردن لە وڵاتەکانمان لە دوورمەودا دا، ڕووبەڕووبوونەوە بوو لەگەڵ ڕوئیا تاریکەکەیان بە ئەلتەرناتیڤێکی پێویستترەوە.

ئەلتەرناتیڤەکە ئازادی بوو. ئەو خەڵکەی کە دەتوانن سەرکردەکانیان لە سندوقی دەنگدانەوە هەڵبژێرن، بە ئەگەرێکی کەمتر ڕوو دەکەنە توندوتیژی. ئەو خەڵکە گەنجەی کە بە ئومێدی ئایندەوە گەورە دەبن، سۆراخی مانا ناکەن لە ئایدۆلۆژیای تیرۆردا. هەر کاتێک کە ئازادی لە کۆمەڵگەدا ڕەگی داکوتا، دەشێ بۆ ئەوانیتریش بگوازێتەوە.

لە نیسانی ٢٠٠٢دا، تۆنی و چێری سەردانی من و لۆرایان کرد لە کراوفۆرد. من و تۆنی باسمان لە دیپلۆماسیی بەزۆر کرد وەکو شێوازێك بۆ موخاتەبەکردنی هەڕەشە لە عێراقەوە. تۆنی وتی ئێمە سۆراخی بڕیارێکی ئەنجومەنی ئاسایشی نیشتمانیی نەتەوە یەکگرتووەکان دەکەین کە دەرفەتێکی ڕوون بە سەدام بدات: ڕێگە بدات بە پشکنەرانی چەك بگەڕێنەوە عێراق یان ڕووبەڕووی مەترسی جددی ببێتەوە. من زۆر باوەڕم بە نەتەوە یەکگرتووەکان نەبوو. ئەنجومەنی ئاسایش شانزە بڕیاری دەرکردبوو لەدژی سەدام بەبێ ئەوەی ئاکامیان هەبێ. بەڵام من بە بیرۆکەکەی تۆنی ڕازی بووم.

***

بە درێژایی ٢٠٠٢ بابەتی عێراقم لەگەڵ سەرکردەکانی تری جیهاندا باس کرد. زۆرێکیان لە هەڵسەنگاندنەکەی من لەمەڕ هەڕەشە هاوڕابوون، لەوانەش جۆن هاوەردی ئوستراڵیا، جۆزێ ماریا ئەزناری ئیسپانیا، جونیشیرۆ کۆیزومیی ژاپۆن، جان پیتەر پۆلکەنێندی هۆڵەندا، ئەندێرس فۆگ راسمونسنی دانیمارك، ئەلیکساندەر کواسنیوسکیی پۆڵەندە و زۆربەری سەرکردەکانی تری ناوەڕاست و خۆرهەڵاتی ئەورووپا. دیار بوو کە هەندێ لە بەهێزترین لایەنگرانی ڕووبەڕووبوونەوەی سەدام ئەوانە بوون کە تازەترین یادەوەرییان لە دیکتاتۆریەت هەبوو. سەرۆك وەزیران (سیم کالاس)ی ئەستۆنیا، کۆمارێکی پێشووی

سۆڤیەت، پێی وتم "لە دوادواکانی ١٩٣یەکاندا، دیموکراسییە خۆرئاواییەکان لە بەرانبەر مەترسیدا ڕاڕا بوون".

سەرکردەکانی تر ڕوانگەیەکی جیاوازیان هەبوو. ڤیلادیمێر پوتن سەدامی بە هەڕەشە دانەدەنا. بە بۆچوونی من بەشێکی هۆکارەکە ئەوە بوو کە ڕوسیا نەیدەویست گرێبەستە نەوتییە چەورەکانی بخاتە مەترسییەوە. فەرەنساش بەرژەوەندیی ئابووریی گرنگی لە عێراقدا هەبوو. بەلامەوە سەیر نەبوو کە جاک شیراک پێی وتم ئەو پشتگیریی پشکنینە ڕاستەوخۆکانی چەک دەکات، بەڵام هۆشداریدا لە بەرانبەر هەڕەشەکردنی هێزی سەربازی. کێشەی لۆژیکی شیراک ئەوە بوو کە بەبێ هەڕەشەیەکی بەرچاوی هێز، دیپلۆماسی جارێکی تر ناکاریگەر دەمایەوە.

یەکێک لە سەرکردە هەرە سەرسەختەکان، گێرهارد شرۆدەری ئەڵمانیا بوو. من لە ٢٠٠١دا پێنج جار چاوم بە شرۆدەر کەوت. ئەو ئارام، خۆشڕوو و بایەخدەر بوو بە تۆکمەکردنی پەیوەندییە دوولایەنەکانمان. من ستایشی سەرکردایەتییەکەیم کرد لە ئەفغانستان، بەتایبەت ئامادەیی بۆ میوانداریکردنی (لۆیا جیرگە) لە شاری بۆن.

من لە سەردانەکەیدا بۆ کۆشکی سپی لە ٣١ی کانوونی دووەمی ٢٠٠٢دا، مەسەلەی عێراقم لەگەڵ گێرهارد خستەبەر باس. لە وتاری ساڵانەی پێش دوو ڕۆژمدا، من ئەو هەڕەشانەم باس کردبوو کە لەلایەن عێراق، ئێران و کۆریای باکوورەوە ئاراستە دەکرێن. وتم "دەوڵەتانی وەها و هاوپەیمانە تیرۆریستەکانیان تەوەرێکی خراپەن، خۆیان چەکدار دەکەن بۆ خستنەبەر هەڕەشەی ئاشتیی جیهان". میدیا دەستەواژەی "تەوەری خراپە"ی قۆستەوە. ئەوان مانای دێڕەکەیان وەها گەیاند ئەو سێ وڵاتە هاوپەیمانێتییەکیان دروستکردووە. ئەمە مەبەستەکەی پەڕاندبوو. ئەو تەوەرەی من ئاماژەم پێکردبوو، ڕایەڵی نێوان ئەو حکومەتانەی کە ئێشیان لەسەر چەکی کۆکوژ دەکرد و ئەو تیرۆریستانە بوو کە دەیانتوانی ئەو چەکانە بەکاربهێنن. مەبەستێکی گەورەتر لە وتارەکەدا هەبوو کە کەس نەیدەتوانی بیپەڕێنێت: من شێلگیرم لەمەڕ ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ عێراقدا.

لە کۆبوونەوەیەکی بچوکی ئۆفیسی ئۆڤاڵدا، بە ئامادەبوونی کۆندی رایس و ئاندی کارد، من بە راوێژکاری ئەڵمانی، گێرهارد شرۆدەرم وت، من سوورم لەسەرئەوەی کە دیپلۆماسی بخەمەکار. هیوادار بووم کە ئەویش یارمەتیدەر بێت. هەروەها دڵنیاشم کردەوە کە قسەکانی ئێمە بەتاڵ نابن. بژارەی سەربازی، دوایین هەڵبژاردنی من بوو، بەڵام ئەگەر پێویست بوایە هەر بەکارم دەهێنا. ئەو وتی "ئەوەی کە لەبارەی ئەفغانستانەوە راستە، لەبارەی عیراقیشەوە هەروایە. پێویستە ئەو وڵاتانەی کە سپۆنسەری تیرۆر دەکەن رووبەرووی دەرەنجامەکەی ببنەوە. ئەگەر تۆ بیکەیتە شتێکی خێرا و یەکلابیکەرەوە، من لەگەڵ تۆدا دەبم".

من ئەم قسانەم وەکو بەڵێنێکی پشتگیری وەرگرت. بەڵام هەر کە کاتێکی دواتری ئەو ساڵە هەڵبژاردنەکانی ئەڵمانیا گەیشتن، شرۆدەر ئاراستەیەکی تری هەبوو. ئەو شیمانەی بەکارهێنانی هێزی لە دژی عیراق رەت کردەوە. وەزیری دادی وتی "بوش دەیەوێ هۆش لەبەرانبەر کێشە سیاسییە ناوخۆییەکانی پەرت بکات...هیتلەریش ئەمەی کرد". من تووشی شۆک بووم و پەست ببووم. قورس بوو بیر لە شتێکی پڕئیهانەتر لەوە بکەیتەوە کە کاربەدەستێکی ئەڵمانی بەراوردت بکات بە هیتلەر. من بەردەوام بووم لە کارکردن لەگەڵ گێرهارد شرۆدەر لە بوارەکانی بەرژەوەندیی هاوبەشدا. بەڵام وەکو کەسێك کە دیپلۆماسیی کەسی بەرز دەنرخاند، من ئەولەویەتێکی گەورەم بە متمانە دا. هەر کە ئەو متمانەیە پێشێلکرا، قورس بوو کە جارێکی تر پەیوەندیی بونیادنەرانەت هەبێت.

***

دوو مانگ پاش ١١ی سێپتێمبەر، داوام لە دۆن رەمسفێڵد کرد تا چاو بەو پلانانەی شەڕی عیراقدا بخشێنێتەوە کە هەن. پێویستمان بە گەڵاڵەکردنی نیوە بەزۆرەکەی دیپلۆماسیی بەزۆر بوو.

دۆن رەمسفێڵد ئەرکی تازەکردنەوەی پلانەکانی بە تۆمی فرانکس بەخشی. رێك پاش کریسمەسی ٢٠٠١، تۆمی هاتە کراوفۆرد بۆئەوەی لەبارەی عیراقەوە لێدوانم بۆ بدات. ئەو پلانەی کە بەردەست بوو، پێویستی بە کەڵەکەکردنێکی شەش مانگە و چوارسەد هەزار سەرباز هەبوو. ئەزموونی ئەفغانستان لە پێشی پێشەوەی هۆشماندا بوو. لە سایەی

تەکنۆلۆژیای نوێ و پلاندانانێکی تازەگەرانە، بە بەکارهێنانی سەربازێکی زۆر کەمتر تالیبانمان تەفروتونا کردبوو و لە کەمپەکانی قاعیدە نزیک کەوتبووینەوە. ئێمە لەلایەن خەلکی ئەفغانەوە بە داگیرکەر نەدەبینراین.

تۆمی بە تیمی ئاسایشی نیشتمانی وت کە کار دەکات بۆ پیادەکردنی هەمان چەمکی شوێنپێی سوك بەسەر عێراقدا. ئەو وێنای گرتنێکی خێرای کرد لە کوەیتەوە لە باشوور، سعودییە و ئوردنەوە لە خۆرئاوا و تورکیاوە لە باکوور. ئەو وتی "ئەگەر ئێمە (هێزەکانی ئۆپەراسیۆنی تایبەت)ی فرەلایەن و شارەزامان لەبەردەستدا بێت کە ئامانجەکان بۆ قومبەلە زیرەکەکان بناسنەوە ، ئەوا پێویستمان بە هێزی تەقلیدیی کەمتر دەبێت. ئەمەش وانەیەکە لە ئەزموونی ئەفغانستانەوە".

من نیگەرانی زۆرم هەبوون. دەمویست بزانم کە هێزەکانمان چەندە خێرا دەتوانن بجولێن و چ جۆرە بنکەدانانێکمان پێویست دەبێ. هەروەکو لە ئەفغانستاندا، من نیگەرانی لەبرسامردنی دانیشتووانی لۆکاڵ بووم و پرسیاری ئەوەم کرد کە دەتوانین چی بکەین بۆ پارێزگاری لە خەلکی بێ گوناه. نیگەرانی ئەوە بووم کە سەدام بە دەستی ئەنقەت زیان بە کێلگە نەوتییەکان بگەیەنێت یان موشکە بهاوێتە ئیسرائیل. گەورەترین ترسم ئەوە بوو کە چەکی بایۆلۆژی یان کیمیایی لە دژی هێزەکانمان، هاوپەیمانەکانمان یان مەدەنییە عێراقییەکان بەکار بهێنێت. داوام لە تیمەکە کرد کە بەردەوام بێت بۆ ئیشکردن لەسەر پلانەکە. من لە کۆتایی کۆبوونەوەکەدا وتم "پێویستە ئێمە هەر گەشبین بین کە دیپلۆماسی و فشاری نێودەوڵەتی سەردەکەوێ لە چەکداماڵینی رژێمەکە. بەڵام ناتوانین رێگە بدەین چەکی کۆکوژ بکەوێتە دەستی تیرۆریستان. من رێگە نادەم ئەمە رووبدات".

***

لەنێوان دیسەمبەری ۲۰۰۱ و ئۆگەستی ۲۰۰۲دا، زیاتر لە دە دوانزە جار چاوم کەوت بە تۆمی فرانکس و قسەم لەگەڵیدا کرد. پلانەکە باشتر و باشتر دەبوو، بەڵام من قەناعەتم نەدەکرد. دەمویست جەخت لەوە بکەمەوە کە ئەوەندەی بکرێت زۆرترین شیمانەمان لەبەرچاو گرتووە. کۆمەڵێك پرسیارم لە دۆن و تۆمی کرد، یەکەم پرسیاریش ئەمە بوو

"چی ئەبێ ئەگەر سەدام بڕیاریدا...؟" یەکێک لەو سیناریۆیانەی کە زۆرجار دەمخستە بەر باس ئەوەبوو کە سەدام هێزەکانی لە بەغدا بڵاویکاتەوە و سەربازەکانمان بخاتە ناو شەڕێکی خوێناویی ناو ئاوەدانی. من شەڕەی ساڵی ۱۹۹۳ی سۆماڵم لەبیر بوو و نەمدەویست ئەوە لە عێراق دووبارە بێتەوە. تۆمی و تیمەکە هەموو وەڵامەکانیان لەو خاڵەدا پێ نەبوو و منیش چاوەڕێم نەدەکرد پێیان بێت. بەڵام سەخت کاریان دەکرد بۆ پێناسەکردنەوەی پلانەکە و هەر وێنەیەک کە بۆیان دەهێنام لە وێنەی پێشووی پلانەکە باشتر بوو.

ئەو پلانە تازەکراوەوەی کە تۆمی لە ٥ی ئۆگەستی ۲۰۰۲دا لە ژووری (بارودۆخ) خستیە ڕوو، چەند نیگەرانییەکی سەرەکی چارەسەر کردبوو. ئێمە نۆرەمان گرتبوو بۆ مۆڵەتوەرگرتنی بنکەدانان و فڕین لە سەرکردەکانی کەنداو. تۆمی پلانێکی داڕشتبوو بۆ ئۆپەراسیۆنە تایبەتەکان بۆ گرتنی شوێنگە گوماناوییەکانی چەکی کۆکوژ، کێڵگە نەوتییەکانی باشووری عێراق و هاوێژەرەکانی موشەکی سکود. ئەو بەهەمان شێوە بۆمبارانکردنێکی چڕی دیزاین کردبوو کە زیانێکی گەورەی بە نوخبەی یەکەکانی گاردی کۆماریی سەدام دەگەیاند ئەگەر لە پایتەختدا بمانایەتەوە و چانسی سیناریۆی (بەغدایەکی قەڵا) کەم دەبووەوە. تۆمی بە شێوەزارە تەکساسییەکەی وتی "جەنابی سەرۆک، ئەمە شۆک و ترس دەخاتەوە".

چەندەها پرس مابوون کە بگەنە ئەنجام. ئێمە هەموومان نیگەرانی شیمانەی ئەوە بووین کە سەدام هێرشی کیمیایی یان بایۆلۆژی بکاتە سەر سەربازەکانمان، بۆیە سوپا لە پرۆسەی فەراهەمکردنی (جلی پارێزەر)دا بوون. ئێمە لەژێر پەردەی مەشقکردن و ڕاهێنانی ڕۆتینیدا پەیتا پەیتا ڕێژەی سەرباز و کەرەستەمان لە کوێت زیاد کردبوو کە دەستپێکردنی خێرای ئۆپەراسیۆنەکانی شەڕی شیاو کردبوو ئەگەر فرمانم بدایە.

سەرۆکی هەیئەی ئەرکان، دیک مایەرز باسی گرنگیی قایلکردنی تورکیای کرد بۆ کردنەوەی خاکەکەی بۆئەوەی بتوانین بەرەیەکی باکوور پێک بهێنین. جۆرج تێنێت نیگەرانی خستەڕوو لەبارەی جەنگێکی هەرێمایەتیی فراوانتر کە تیایدا سووریا هێرش دەکاتەسەر ئیسرائیل یان ئێران گروپی تیرۆریستی دەست لەپشتی ئاراستە دەکات،

حزبوڵلا ناسەقامگیری دەخاتەوە. دۆن رەمسفێلد ئامازەی بەوەدا کە دەشێ جەنگەکە ئوردن و سعودیە ناسەقامگیر بکات، ئەمەی کە ئەمریکا دەشێ لە سۆراخکردنی سەدامن گیر بخوات و ئەمەی کە دەشێ عیراق پاش ئازادکردن پارچەپارچە ببێت.

ئەو سیناریۆ شیمانەییانە، بێدارکەرەوە بوون. بەڵام بەهەمان شێوە ئەو لێدوانانەش کە بەدەستمان دەگەیشتن. لە راپۆرتێکی مانگی تەموزدا هاتبوو "عیراق دەستیکردووە بە پاراستن و لە هەندێ حاڵەتدا تەنانەت پەرەدان بە ژێرخان و شارەزایەتیی پێویست بۆ بەرهەمێنانی چەکی کۆکوژ". لێدوانێکی تر هۆشداریدا لەمەڕ ئەوەی کە رژێمی سەدام "تەقریبەن بە دڵنیاییەوە کار دەکات بۆ بەرهەمهێنانی ئامرازی هۆکار بۆ ئەنتراکس شانبەشانی ژەهری بوتۆکس، ئەفلاتۆکسین و ریسین". هەروەها تیایدا هاتبوو "ماشێنی ئاسمانییە ئۆتۆماتیکەکان ئامرازی کوشندەتر بە بەغدا ئەدەن تا چەکی بایۆلۆژی بگەیەنن". راپۆرتەکە هەر بەمشێوە تۆقێنەرە بەردەوام دەبێت "ئەزموون پیشانی دەدات کە سەدام چەکی کۆکوژ بۆ بەکارهێنان بەرهەم دێنێت، نەک تەنیا بۆ بەرگرتن و رەواندنەوە". لە هاوینی ۲۰۰۲دا من هەواڵێکی نائاساییم پێگەیشت. (ئەبو مەسعەب زەرقاوی)ی تیرۆریستێکی رێکخراوی قاعیدە کە چەکی بایۆلۆژی لە ئەفغانستاندا تاقی کردبووەوە، ئێش لە تاقیگەیەکدا دەکات لە باکووری خۆرهەڵاتی عیراقدا. لە لێدوانەکەدا هاتبوو "لەوانەیە دامەزراوە گومانلێکراوەکە لەو ناوچەیەدا خەریکی بەرهەمهێنانی ژەهرەکان بێت بۆ تیرۆریستان بۆئەوەی بەکاری بێنن". هەروەها تیایدا هاتبوو "زەرقاوی پلاندانەرێکی تیرۆریستیی چالاکە کە نیشانەی لە بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا و ئیسرائیل گرتووەتەوە: راپۆرتێکی هەستیار لە دەزگایەکەوە پیشانی دەدات کە زەرقاوی لە تەقەلا دا بووە کە کەرەستەیەکی کیمایی نەزانراوی سەرچاوەگرتوو لە باکووری عیراق بۆ ناو ئەمریکا دزەپێبکات".

ئێمە نەماندەتوانی دڵنیابین ئاخۆ سەدام دەزانێ زەرقاوی لە عیراقە. ئێمە هەواڵگریمان لەبەردەستدا بوو کە دەریدەخست زەرقاوی دوو مانگی لە بەغدا بەسەر بردووە بۆ چارەسەری پزیشکی و ئەمەی کە بکەری تری قاعیدە هاتوونەتە ناو عیراقەوە. سی.ئای.ئەی لەگەڵ دەزگایەکی هەواڵگریی گەورەی عەرەب ئیشی کردبوو بۆ

ناچارکردنی سەدام بۆیٚ رادەستکردنی زەرقاوی. ئەو رەتی کردبووەوە. پرسیارەکە ئەوە بوو ئاخۆ تاقیگەی ژەهرەکە لە هاوینی ٢٠٠٢دا بۆمباران بکرێت. ئیمە لەسەر ئەم بابەتە ژمارەیەك کۆبوونەوەی ئەنجومەنی ئاسایشی نیشتمانیمان ئەنجامدا. ژەنەراڵ دیك مایەرز، قسەی لەسەر بژارەکان کرد: موشەکی تۆماهۆك، لێدان بە بۆمبهاوێژی بی دوو یان هێرشێکی زەمینیی شاراوە. دیك چێنی و دۆن زەرقاوییان بە هەڕەشەیەکی روون بینی و بەڵگەی ئەوەیان هێنایەوە کە لەناوبردنی، جەختکردنەوەیە لەو بیروباوەڕەی کە ئەمریکا بەرگەی پەناگەی ئارام بۆ تیرۆر ناگرێت.

کۆلن و کۆندی هەستیان بەوە کرد کە لێدانی ئاسمانیی تاقیگەکە زیانێکی نارەزایی نێودەوڵەتی لێدەکەوێتەوە و هەوڵەکانمان بۆ بونیادنانی هاوپەیمانییەك بۆ رووبەڕووبوونەوەی سەدام دەپچڕێنێت- بەتایبەت هەوڵمان بۆ رازیکردنی تورکیا، کە زۆر هەستیار بوو بەرانبەر هەر چالاکییەك لە باکووری عیراق. کۆلن وتی "ئەمە بە دەستپێکێکی تاکلایەنە بۆ جەنگی عیراق دەبینرێت".

من کەوتمە بەردەم تەنگژەیەك. ئەگەر ئەمریکا لە عیراقەوە هێرشی بایۆلۆژی بکرێتەسەر، ئەوا بەرپرس دەبم لە لەناوبردنی هەڕەشەکە ئەو کاتەی دەرفەتمان هەبووە. لەلایەکی ترەوە، دەشێ بۆمباران کردنی کامپەکە دیپلۆماسی لاواز بکات و رووبەڕووبوونەوەی سەربازی بوروژێنێت.

من بە کۆڕی زانیاریم وت کە لە نزیکەوە چاودێریی دامەزراوەکە بکەن. لەم کاتەدا، من بڕیارمدا بەردەوام بم لە هەوڵی دیپلۆماسی. بەڵام یەك شت بەلامەوە روون بوو: عیراق هەڕەشەیەکی جددی بوو کە رۆژ بەرۆژ مەترسیدارتر دەبوو.

***

بەشی زۆری ئۆگەستی ٢٠٠٢م لە کراوفۆرد بەسەر برد، کە شوێنێکی باش بوو بۆ رامان لە بڕیاری دواتر کە رووبەڕووی دەبوومەوە: چۆن لە رێچکەی دیپلۆماسیدا بەرەوپێش بچین. بژارەیەك بریتی بوو لە سۆراخکردنی بڕیارێکی یوئێن کە داوا لە سەدام بکات رێگە بە پشکنەرانی چەك بدات. ئەویتریان بریتی بوو لە دەرکردنی دوایین هۆشدارییەك کە

داوای لێبکات چەك دانێت- و هاوپەیمانییەك کۆ بکاتەوە بۆ لەسەر حوکم لابردنی ئەگەر مل نەدات.

لە روانگەی یاساییەوە، بڕیارێك پێویست نەبوو. پێش سێ ساڵ، سەرۆك کلینتن و هاوپەیمانەکانی ناتۆمان دیکتاتۆر سلۆبۆدان میلۆسۆڤیچ-یان لە سربیا لەسەر حوکم لابردبوو بەبێ بڕیارێکی ئاشکرای یوئێن. دیك و دۆن بەڵگەی ئەوەیان دەهێنایەوە کە بۆ عێراقیش پێویستمان بە بڕیارێك نییە. دواجار ئێمە شانزە بڕیارمان هەبوو. ئەوان بڕوایان وابوو کە چوون بۆ یوئێن پرۆسەیەکی بیرۆکراسیی دوورودرێژی لێدەکەوێتەوە کە سەدام ترسناکتر دەکات. منیش هەمان نیگەرانیم هەبوو. لەلایەکی ترەوە، نزیکەی هەر هاوپەیمانێك کە راوێژم لەگەڵ کردبێ- تەنانەت لایەنگرانی وەفاداری رووبەڕووبوونەوەی سەدام، وەکو جۆن هاوەردی سەرۆك وەزیرانی ئوسترالیا- پێیان وتم بڕیاری یوئێن جەوهەرییە بۆ بەدەستهێنانی پشتیوانیی گشتی لە هەر وڵاتێکدا.

کۆلن هەمان ڕەئی هەبوو. ڕۆژێك پێش ئەوەی کراوفۆرد جێ بێڵم، داوام لێکرد کە بەشێوەیەکی تایبەت لە ژووری (تریتی) پێکەوە قسە بکەین. کۆلن زۆر لەوە بەسۆزتر بوو کە لە کۆبوونەوەی ئەنجومەنی ئاسایشی نیشتمانی بینیبووم. ئەو پێی وتم کە بڕیارێکی یوئێن تاکە رێگەیە بۆ بەدەستهێنانی هەر پشتگیرییەك لە بەشەکانی تری جیهاندا. هەروەها بەردەوام بوو وتی ئەگەر ئێمە سەدام لەناوبەرین، ئەوا لێدانی ئاسمانی ئاسانترین شت دەبێت. پاشان هەروەکو کۆلن وتی، ئەمریکا عێراق "دەباتەوە". ئێمە بەرپرس دەبین لەوەی یارمەتیدەر بین لە بونیادنانەوەی وڵاتێکی پارچەپارچە بوو. من بە وریاییەوە گوێم گرت و هاوبەشی نیگەرانییەکەی کۆلن بووم. ئەمەش هۆکارێکی تر بوو کە ئومێدەواری ئەوە بووم دیپلۆماسی ئاکامی هەبێ. ئەو هاوینە، ئەگەری جەنگ ببووە بابەتی سەرەکی ناو هەواڵەکان لە واشنتن. ریپۆرتەرەکان زووزوو پرسیاری ئەوەیان دەکرد ئاخۆ پلانێکی جەنگ لەسەر مێزەکەم هەیە.

لە ١٥ی ئۆگەستدا، من ڕۆژنامەی (وۆل ستریت جۆرناڵ)م کردەوە و ستوونێکی بینی بە قەڵەمی برێنت سکۆوکرۆفت، راوێژکاری ئاسایشی نیشتمانیی باوکم. ستوونەکە بەناونیشانی (هێرش مەکە سەر سەدام) بوو. برێنت بەڵگەی ئەوەی هێنابووەوە کە

جەنگ لەگەڵ عیراقدا دابڕانێکە لە جەنگ دژی تیرۆر و دەشێت "قیامەتێك لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست" هەستێنێت. ئەنجامگیرییەکەی ئەوە بوو کە دەبێت ئێمە "فشار بخەینەسەر ئەنجومەنی ئاسایشی یوئێن بۆ سوور بوون لەسەر کۆمسیۆنێکی پشکنینی کاریگەر بۆ عیراق". ئەمەیان راسپاردەیەکی بەجێ بوو. بەڵام من لەوە تورە بووم کە برێنت پێی باشبووە ئامۆژگارییەکەی بڵاو بکاتەوە لەبری ئەوەی کە بە منی بڵێت. من پەیوەندیم بە باوکمەوە کرد. ئەو دڵنیای کردمەوە و وتی "کوڕم، برێنت دۆستە". لەوانەیە ئەمە راست بێت. بەڵام دەزانم کە رەخنەگران دواتر نووسینەکەی برێنت دەقۆزنەوە ئەگەر رێچکەی دیپلۆماسی شکست بێنێ.

هەندێ کەس لە واشنتن دەنگۆی ئەوەیان بڵاو کردەوە کە ستوونەکەی برێنت، شێوازی باوکم بووە بۆ گەیاندنی پەیامێك لەبارەی عیراقەوە. ئەمەیان زۆر بێ مانا بوو. وەکو یەکێك لەو خەڵکە، باوکیشم لە مەترسییەکان تێدەگەیشت. ئەگەر بڕوای وابووایە کە من بە شێوازێکی چەوت لەگەڵ عیراقدا مامەڵە دەکەم، ئەوا بەوپەڕی دڵنیاییەوە خۆی پێی دەگوتم.

***

رۆژی شەممە، ٧ی سێپتێمبەری ٢٠٠٢، کۆبوونەوەیەکی تیمی ئاسایشی نیشتمانیم لە کامپ دەیڤد ئەنجامدا بۆ بە کۆتاگەیاندنی بۆچوونەکەم لەسەر بڕیارەکە. پێش پەنجاویەك هەفتە، ئێمە لە خانوی (لۆرێل) کۆ ببووینەوە بۆ پلانی جەنگ لە ئەفغانستان. ئێستاش لەهەمان ژوور دانیشتووین و لە هەوڵی ئەوەداین رێگەیەك بدۆزینەوە بۆ نەهێشتنی هەڕەشەکە لەعیراقدا بەبێ جەنگ.

من چانسم دایە هەریەکێك لە ئەندامانی تیمەکە تا بەڵگاندنی خۆیان بخەنەڕوو. دیك پێشنیاری ئەوەی کرد کە کەیسەکە لەدژی سەدام دابڕێژینەوە، سی تا شەست رۆژی پێبدەین بۆ ئاشکراکردنەکەی و پاشان ئەگەر ملی نەدا بە زەبر ئەمەی لەگەڵدا بکەین. دیك وتی "کاتی هەنگاونان هاتووە. ناتوانین دوای بخەین بۆ ساڵێکی تر...کۆمسیۆنێکی پشکنین کێشەکەمان چارەسەر ناکات".

کۆلن جەختی لە بڕیاری یوئێن کردەوە و وتی "ئەگەر ئێمە کەیسەکە ببەینە یوئێن، ئەوا دەتوانین هاوپەیمانێتی پێکبهێنین. ئەگەر نا، ئەوا هەنگاوەکانی تاکلایەنە بۆمان قورس دەبێت. پشتگیریی نێودەوڵەتیمان نابێ بۆ جێبەجێکردنی پلانە سەربازییەکە".

پاش گوێگرتنی دوایین جار بۆ بژارەکان، من بڕیارمدا: ئێمە سۆراخی بڕیارێک دەکەین. وتم "تەمومژێک هەیە لە دیدی کۆمەڵی نێودەوڵەتی لەبارەی سەدامەوە. دەبێت لایببەین. یان ئەوەتا هیچ شاراوەییەک ناهێڵێتەوە لەبارەی چەکەکانی، یان جەنگ روودەدات".

من بە تیمەکەم وت کە هەفتەی دواتر ئەم پەیامە بە وتار لە نەتەوە یەکگرتووەکاندا بخاتەڕوو. من بیر نەتەوە یەکگرتووکەنم هێنایەوە کە بەرەنگاریی سەدام هەڕەشەیەکە لە رەوایەتیی دامەزراوەکە. یان ئەوەتا قسەی ئەنجومەنی ئاسایش پیادە دەکرێ، یان ئەوەتا یوئێن تەنیا وەکو دەستەیەکی نێودەوڵەتیی بێ سوود بوونی هەیە وەکو (کۆمەڵەی نەتەوەکان).

ئەو شەوە تۆنی بلێر هاتە کامپ دەیڤد. ئەو خۆشحاڵ بوو کاتێک پێم وت پلانم هەیە داوا لە یوئێن بکەم بۆ بڕیارێک. ئەو وتی "زۆرێک لە نەیاران هیوای ئەوە دەخوازن کە تاکلایەنە رەفتار بکەین- پاشان ئەوان دەتوانن سکاڵا بکەن، بەڵام تۆ تەحەدایان دەکەیت".

هەردووکمان لەوە تێگەیشتین کە بڕیارەکە چ مانایەکی دەگەیاند. هەر کە هەڵوێستی خۆمان لە نەتەوەیەکگرتووەکان خستەڕوو، دەبێ ئامادەی ئەوە بین لەگەڵ دەرەنجامەکاندا بڕۆین. ئەگەر دیپلۆماسی شکستی هێنا، تەنیا یەک بژارە دەمێنێتەوە. بە تۆنی-م وت "من نامەوێ بچمە جەنگەوە، بەڵام ئەمە دەکەم".

تۆنی رازی بوو. پاش کۆبوونەوەکە بە (ئالستێر کامبێل)ی یەکێک لە گەورە یاریدەدەرانی تۆنیم وت "گەورەکەت گونی هاتووە". دڵنیا نیم کە ئەمە بۆ گوێچکەی زیرەکی سەرۆکێکی بریتانی چی دەگەیەنێ. بەڵام بەلای هەر کەسێکەوە لە تەکساس، ماناکەی روونە (واتە ئازا بووە).

***

من لە ١٢ای سێپتێمبەری ٢٠٠٢دا بە نوێنەرانی نەتەوە یەکگرتووەکانم وت "ئێستا هەموو جیهان ڕووبەڕووی تاقیکردنەوەیەك و نەتەوە یەکگرتووەکان ڕووبەڕووی ساتێکی گرنگ دەبێتەوە. ئایا بڕیارەکانی ئەنجومەنی ئاسایش ڕێزیان لێ دەگیرێ و دەسەپێنرێن یان بەلاوە دەنرێن بەبێ دەرەنجام؟ ئایا نەتەوە یەکگرتووەکان خزمەتی ئامانجی دامەزراندنەکەی دەکات یان ناپەیوەندیدار دەبێ؟"

پێشکەشکردنی وتارەکە ئەزموونێکی سوریالی بوو. نوێنەرەکانی بە بێدەنگی دانیشتن، تەقریبەن لە شوێنی خۆیان بەستبوویان. ئەمە وەکو قسەکردن بوو بۆ مۆزەخانەیەکی مۆمیاکان.

کاردانەوەی دەرەوەی ژوورەکە ئومێدبەخش بوو. هاوپەیمانان سوپاسیان کردم لەبەرانبەر ڕێزگرتن لە یوئێن و قبوڵکردنی ئامۆژگارییان بۆ سۆراخکردنی بڕیارێك. زۆرێك لەناو وڵاتدا ستایشی ئەوەیان کرد کە من تەحەدای یوئێنم کردووە. لە سەروتارێکی واشنتن پۆستدا هاتبوو: "ئەگەر یوئێن لە ڕووی ئەم پێشێلکارییە بێ ئابڕووانە درێژخایەنەی دەسەڵاتەکەیدا هەر ناچالاك بێت لە مەسەلەیەکدا کە پەیوەندی بە چەکی کۆکوژەوە هەیە، ئەوا بەدڵنیاییەوە موجازەفەی ئەو ناپەیوەندیدارییە دەکات کە جەنابی بوش لەبارەیەوە هۆشداریدا".

***

کاتێك مشتومڕی یوئێن دەرکەوت، ئێمە کارمان لەسەر بڕیارێکی تر کرد، مۆڵەتی جەنگ لە کۆنگرێسەوە. وەکو بەشێکی مشتومڕەکە، ڕێبەرانی کۆنگرێس داوایان لە کۆڕی هەواڵگریکرد تا دۆکیومێنتەکانی(مەزندەی هەواڵگریی نیشتمانی) ئامادە بکات کە شیکردنەوەی پرۆگرامەکانی چەکی کۆکوژی سەدام بگرێتەخۆی. سی.ئای.ئەی بە بەکارهێنانی بەشی زۆری هەمان ئەو هەواڵگرییەی لە هەژدە مانگی ڕابردوودا پێشانیان دەدام، دۆکیومێنتەکانیان کۆکردەوە. لە دەستەواژەیەکی پوختەدا کە دواتر ئاشکرا کرا، (مەزندەی هەواڵگریی نیشتمانی) گەیشتبووە ئەو ئەنجامەی کە "بەغدا چەکی کیمیایی و بایۆلۆژی و هەروەها موشەکی هەیە کە سنورداریتییەکانی یوئێن دەبەزێنن، ئەگەر هەروا

بە نەپشکنراوی بمێنێتەوە، لەوانەیە لە ماوەی ئەم دەیەیەدا چەکی ناوکی بەدەستبێنێت".

هەوالگری کاریگەری لەسەر ئەندامانی کۆنگرێس دانا. سیناتۆر جۆن کێری وتی "کاتێك من دەنگ دەدەم بە مۆڵەتدانی سەرۆکی ئەمریکا بۆ بەکارهێنانی هێز، ئەگەر پێویست بکات، بۆ لە چەکداماڵینی سەدام حسێن، لەبەرئەوەیە کە بڕوام وایە ئەقەمەنییەکی کوشندەی چەکی کۆکوژ لەدەستی ئەودا هەڕەشەیەکە و هەڕەشەیەکی گەورەشە".

سیناتۆر جەی رۆکفێلەر، دیموکراتێکی بەڕێز لە لیژنەی هەوالگری وتی: "توانا هەنوکەییەکانی چەکی بایۆلۆژی و کیمیایی لەمڕۆدا هەڕەشەی راستەقینەن لە ڕووی ئەمریکا...سبەینێ دەتوانێ ئەم چەکانە بخاتە بەردەستی زۆرێك لەو گروپە تیرۆریستییانە، ئەو لایەنە سێیەمییانەی پەیوەندییان بە حکومەتەکەیەوە هەیە. بە نۆرەی خۆیان، ئەو گروپانە دەتوانن ئەو چەکانە بهێننە ئەمریکا و هێرشێکی کارەساتبار بکەنەسەر هاوڵاتیانمان. من زۆر لەمە دەترسم".

سیناتۆر چوك هاگڵ، کۆمارییەکی نێبراسکا، پشتیوانی لە بڕیارەکە کرد. ئەو وتی "مەترسییەکانی هەنگاونەنان زۆر گەورەن، ئێمە بۆئەوە هەڵبژێردراوین کە کێشە چارەسەر بکەین، نەك تەنیا مشتومڕیان لەسەر بکەین. کاتی ئەوە هاتووە هێلکاریی رەوگەیەکی نوێ بکەین لە عیراق و لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا".

لە ١١ی ئۆکتۆبەری ٢٠٠٢دا، ئەنجومەنی پیران بە ڕێژەی ٧٧ بەرانبەر ٢٣ دەنگی بە بڕیارەکەدا. ئەنجومەنی نوێنەران بە ٢٩٦ بەرانبەر ١٣٣ دەنگی بە بڕیارەکەدا. هەردوو ڕێژەکە زۆر زیاتر بوون لە دەنگەکانی جەنگی کەنداو. بڕیارەکە گەلێك دەنگی دیموکراتە بەرچاوەکانی وەکو ڕێبەری کەمینەی ئەنجومەنی نوێنەران (دیك گێفارت)، ڕێبەری زۆرینەی پیران (تۆم داشل) و سیناتۆر (هیلاری کلینتن)، (جۆ بایدن)، (جۆن کێری)، (جۆن ئێدواردز) و (هاری ڕەید)ی زامن کرد.

هەندێ لە ئەندامانی کۆنگرێس دواتر بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە ئەوان دەنگیان بە مۆڵەتدانی جەنگەکە نەدەدا، بەڵکو بە درێژەدان بە دیپلۆماسی ئەدا. لەوانەیە دەقی

بڕیارەکەیان نەخوێندبێتەوە، زمانەکەی ڕێك و ڕەوان بوو: "سەرۆك مۆڵەتی پێدراوە تا هێزە چەکدارەکانی ئەمریکا بەکاربهێنێت لەکاتێکدا کە بە پێویست و گونجاوی بزانێت بۆ بەرگریکردن لە ئاسایشی نیشتمانیی ئەمریکا لەدژی هەڕەشەی بەردەوامی ئاراستەکراو لەلایەن عێراقەوە و سەپاندنی هەموو بڕیارە پەیوەندیدارەکانی ئەنجومەنی ئاسایشی نیشتمانیی ئەمریکا پەیوەست بە عێراقەوە".

***

دەنگی یەکلاییکەرەوە لە نەتەوە یەکگرتووەکان لە ٨ی نۆڤەمبەردا بوو. کۆلن لەسەر مەسائیلی بچوك لەدانوستاندا بوو، بەڵام هەر سەرسەخت بوو لەسەر ئەو بڕگانەی کە لێپێچینەوەیان لە سەردام دەکرد. پرسیارەکە ئەوە بوو ئاخۆ بڕیارەکە دەنگ دەهێنێت. ئێمە پێویستمان بە دەنگی نۆ لە پانزە ئەندامی ئەنجومەنی ئاسایش بوو بەبێ ڤیتۆی فەرەنسا، ڕوسیا یان چین. ئێمە هەر لەسەر هێڵی تەلەفۆن بووین لە هەوڵی ئەوەدا کە هەمووان ڕازی بکەین. ماوەیەکی کورت پاش دەنگدانی ئەنجومەنی ئاسایش، زەنگی تەلەفۆنی ئۆفیسی ئۆڤاڵ لێیدا. کۆلن وتی "سلاو گەورەم. جێبەجێمان کرد".

دەنگدانەکە کۆدەنگ بوو؛ ١٥ بەرانبەر سفر. نەك تەنیا فەرەنسا، بەڵکو ڕوسیا و چین و سوریاش دەنگیان دابوو. ئێستا ئیتر جیهان یەکدەنگ بوو: سەدام "دوایین دەرفەتی هەبوو بۆ ملدان" بۆ ئەرکی ئاشکراکردن و لەچەکداماڵین. ئەگەر نەیکردایە، ئەوا ڕووبەڕووی "دەرەنجامی جددی" دەبووەوە. لەژێر بەندەکانی بڕیاری ١٤٤١ی ئەنجومەنی ئاسایشی یونێندا، عێراق سی ڕۆژی لەبەردەمدابوو تا "بەیاننامەیەکی هەنوکەیی ورد و تەواو" لە هەموو پرۆگرامە پەیوەندیدارەکانی چەکی کۆکوژ بدات بە دەستەوە. بڕیارەکە ئەو قورساییەی سەلماندنی ڕوون کردەوە کە لەئەستۆی سەدامدایە. پێویست نەبوو پشکنەران بیسەلمێنن کە چەکیان هەیە. دەبووایە ئەو بیسەلمێنێت کە نیەتی.

کاتێك دوایین مۆڵەتەکە لە ٧ی دیسەمبەردا گەیشت، سەدام ڕاپۆرتەکەی پێشکەش کرد. من ئەمەم وەکو تاقیکردنەوەیەکی سەرەکی بینی. ئەگەر بە دانانی ڕاستگۆیانە بێتەپێش، ئەمە ئاماژەیەك دەبێ کە تێگەیشتووە لەو پەیامەی جیهان ئاراستەی دەکات. لەبری ئەمە، بەستەیەك کاغەزی ناپەیوەندیداری ڕادەست کرد کە ڕوون بوو مەبەستی

فریودانی لەپشتە. (هانس بلیکس) ئەو پیاوە رەفتار نەرمەی کە رێبەرایەتی تیمی پشکنینی یوئێنی دەکرد، دواتر وتبووی "دەوڵەمەندە بە فراوانیدا، بەلام هەزارە لە زانیاریدا". جۆ لیبەرمان زۆر وردتر بوو. ئەو وتی بەیاننامەکە "دوانزە هەزار لاپەڕەیە، سەد کیلۆ درۆیە".

ئەگەر سەدام لەسەر رێسای فریودان بەردەوام بوو، تاکە رێگە بۆ هێشتنەوەی گوشار لەسەر عێراق بریتییە لەوەی کە خۆمان هەندێ بەڵگە بخەینەڕوو. داوام لە جۆرج تێنێت و جێگرە بەتواناکەی (جۆن مکلۆگلین) کرد پێم بڵێن کە دەتوانین کام هەواڵگرییە لە نهێنێتی بهێنینە دەرەوە بۆ روونکردنەوەی پرۆگرامەکانی چەکی کۆکوژی عیراق. ژەند رۆژێك بەر لە کریسمەس، جۆن یەکەم هەوڵی خۆیانی خستەڕوو. زۆر قایلکەر نەبوو. خەیاڵم چووەوەسەر ئەو لێدوانانەی سی.ئای.ئەی کە وەرمگرتبوون، ئەو دۆکیومێنتانەی (مەزندەی هەواڵگری نیشتمانی) کە گەیشتبوونە ئەو ئەنجامەی سەدام چەکی بایۆلۆژی و کیمیایی هەیە و ئەو داتایەی سی.ئای.ئەی بۆ وتارەکەی من لە یوئێن لە مانگی سێپتێمبەردا دابینی کردبوو. وتم "بەدڵنیاییەوە دەتوانین کارێکی باشتری روونکردنەوەی بەڵگەکە لەدژی سەدام ئەنجام بدەین". جۆرج تێنێت کۆك بوو. ئەو وتی "ئەمە گۆڵێکە".

من بڕوام پێیکرد. من بۆ ماوەی نزیکەی دوو ساڵ لێدوانی هەواڵگریم لەسەر عیراق وەردەگرت. ئەنجامگیری ئەمەی کە سەدام چەکی کۆکوژی هەیە تەقریبەن کۆدەنگییەکی جیهانی بوو. سەرۆکی پێش من بڕوای وابوو. کۆمارییەکان و دیموکراتییەکانی کۆنگرێس بڕوایان وابوو. ئاژانسەکانی هەواڵگری لە ئەڵمانیا، فەرەنسا، بریتانیا، روسیا، چین و میسر بڕوایان وابوو. هەروەکو باڵیۆزی ئەڵمانیا لە ئەمریکا، کە پشتیوانی جەنگ نەبوو، دواتر وتی "پێم وایە هەموو حکومەتەکانمان بڕوایان وایە کە عیراق چەکی کۆکوژی بەرهەمهێناوە و دەبێ گریمانەی ئەوە بکەین کە ئەوان هێشتا...چەکی کۆکوژیان هەیە". ئەگەر هەر شتێك بێ، ئێمە نیگەرانی ئەوە بووین کە سی.ئای.ئەی لە سەدام تێدەگەیشت، هەروەکو پێش جەنگی کەنداویش وەها بوو.

بێگومان، لەلایەکی ترەوە، دەبووایە ئێمە هەموومان زیاتر هانی هەواڵگریمان بدایە و چاومان بە گریمانەکانماندا بخشاندایەتەوە. بەڵام لەو کاتەدا، بەڵگەکە و لۆژیك روویان لە

ناراستەیەکی تر بوو. من پرسیارم لەخۆم کرد، ئەگەر بە راستی سەدام چەکی کۆکوژی نەبێت، ئەی بۆچی خۆی تووشی شەڕێك کرد کە تەقریبەن بە دڵنیاییەوە ئەیدۆڕاند؟

***

لە ماوەی سەرۆکایەتیمدا لە هەر کریسمەسێکدا، من و لۆرا تەواوی بنەماڵەکەمان بانگهێشت دەکرد بۆ لای خۆمان لە کامپ دەیڤد. ئێمە دڵخۆش بووین بە درێژەدان بەو نەریتەی دایك و باوکم دەستیان پێکرد. ئێمە خۆشیمان لەو ساتە وەرگرت بۆ پشودان لەگەڵ ئەوان، دایکی لۆرا، باربەرا و جێنا و براکانم و خوشکەکەم و خێزانەکانیان. ئێمە دڵخۆش بووین بە بینینی نمایشی منداڵان لە ژووری ئایینی کامپ دەیڤد و گۆرانی وتن لەگەڵ ئەندامانی سوپا و خێزانەکانیان. لە ساڵانی دواتردا، ئێمە نەریتێکمان داهێنا بۆ بەخشینی دیاری بەناوی یەکێك لە ئەندامانی بنەماڵەکەوە. جێب و دۆرۆ کتێبیان بە کتێبخانەی کەشتیی فڕۆکەهەڵگری (یوئێس ئێس جۆرج ئێچ دەبلیو بوش) بەخشی. مارڤن و هاوسەرەکەی (مارگرێت) کاسێکیان بەخشی بە ژووری ئایینی کامپ دەیڤد لەبری من و لۆرا. ئێمە بەناوی دایك و باوکمەوە دیارییەکمان بە بونیادی (دۆرۆسی وۆکەر بوش) بەخشی لە سەنتەری پزیشکیی باشووری

مەین.

لە ناوەڕاستی ئاهەنگەکانی کریسمەسی ساڵی ٢٠٠٢دا، من و باوکم لەبارەی عێراقەوە قسەمان کرد. لە بەشی هەرە زۆریدا، من لە پرسە گەورەکاندا سۆراخی ئامۆژگاریی باوکم نەدەکرد. من و ئەو هەردووکمان لەوە تێگەیشتبووین کە من زانیاریی زیاتر و باشترم لەو لەبەردەستدایە. زۆربەی وتوێژەکانمان بۆ ئەوە بوو کە دڵنیای بکەمەوە کارێکی باش ئەنجام دەدەم و ئەویش ئاسودەیی و خۆشەویستی خۆی دەربڕێت.

عێراقیش پرسێك بوو کە دەمویست بزانم لەبارەیەوە چۆن بیر دەکاتەوە. بە باوکم وت کە من نزا دەکەم بۆ ئەوەی بتوانین بەشێوەیەکی ئاشتییانە مامەڵە لەگەڵ سەدامدا بکەین، بەڵام خۆشم بۆ ئەلتەرناتیف ئامادە دەکەم. من ستراتیژییە دیپلۆماسییەکەم خستەڕووی– پشتگیریی تۆکمە لەلایەن بلێر، هاوەرد و ئەزنار. نادڵنیایی لەبەرانبەر

شیراك و شرۆدەر و هەوڵەکانم بۆ قایلکردنی سعودییەکان، ئوردنییەکان، تورکەکان و ئەوانیتر لە خۆرهەلاتی ناوەڕاستدا.

ئەو لەگەڵ ئەو هیوایەی مندا بوو کە دیپلۆماسی سەرکەوتوو بێت. ئەو وتی "کوڕم دەزانی جەنگ چەند سەختە و دەبێ تۆ هەوڵ بدەیت هەر شتێ کە بتوانی بیکەیت بۆئەوەی خۆتی لێ لادەیت. بەڵام ئەگەر ئەو کابرایە مل نەدات، ئەوا ڕێگەچارەیەکی ترت نابێت".

ماوەیەکی کورت پاش سەری ساڵی نوێ، نامەیەکم بۆ باربەرا و جێنا نارد لە کۆلێژ. بۆم نوسیبوون "من خۆم ماندوو دەکەم تا ئاشتی بپارێزم و خۆم لە جەنگ لابدەم. هیوادارم ئەو کابرایە لە عیراق بە شێوەیەکی ئاشتییانە چەك دابماڵێت. ئێمە فشاری دەخەینە سەر تا ڕێك ئەمە بکات و بەشی زۆری جیهانیش لەگەڵماندایە".

***

هەر کە ٢٠٠٣ دەستی پێکرد، پەیتا پەیتا روونتر دەبووەوە کە نزاکەم وەڵامی نییە. لە ٢٧ی کانوونی دووەمدا، هانس بلیکس راپۆرتێکی رەسمی لە نەتەوە یەکگرتووەکان پێشکەش کرد. تیمە پشکنینەکەی ئەو کڵاوە جەنگییانەی کە سەدام راینەگەیاندبوو یان تێکینەشکاندبوون، نیشانەکانی کەرەستەی ڤی.ئێکسی ژەهراویی ئەعساب و ماددە سەرەتاییە کیمیاییەکان بۆ گازی خەردەلی دۆزیبووەوە. سەرباری ئەمەش، حکومەتی عیراقی بەرەنگاریی پرۆسەی پشکنینی دەکرد. رژێمەکە لە ڕێگەی بلۆککردنی فڕۆکەکانی (یو-تو)ی چاودێری و شاردنەوەی سێ هەزار دۆکیومێنت لە ماڵی کاربەدەستێکی ناوکیی عیراقی، بڕیاری ١٤٤١ی پێشێل کردبوو. بلیکس وتی "پێدەچێ عیراق قبوڵکردنێکی راستەقینەی ئەو چەکداماڵینە نەخاتەڕوو کە لێی داواکراوە، تەنانەش لەمڕۆشدا.

دەمتوانی ببینم کە چی روودەدات: سەدام دەیویست قورسایی سەلماندن لە خۆیەوە بگوازێتەوە بۆ سەر ئێمە. من بیر دۆستەکانم هێنایەوە کە بڕیاری یوئێن بە روونی دەڵێت بەرپرسیارێتیی سەدامە کە مل بدات. هەروەکو (محەمەد بەرادعی)ی بەڕێوەبەری ئاژانسی نێودەوڵەتی وزەی ئەتۆم لە دواداوکانی کانوونی دووەمدا روونی کردەوە "تۆپەکە بە تەواوی لە ساحەی عیراقدایە...ئێستا دەبێ عیراق بیسەلمێنێت کە

بەرینە...دەبێ لە ڕێگای خۆیان بێنە دەرەوە بۆ سەلماندنی ئەمەی کە هیچ چەکێکی کۆکوژیان نییە بە هەر شێوازێك کە شیاوە". لە دوادواکانی کانوونی دووەمدا، تۆنی بلێر هاتە واشنتن بۆ دانیشتنێك لەبارەی ستراتیژییەوە. ئێمە لەسەر ئەوە کۆك بووین کە سەدام لە ڕێگەی سپاردنی بەیاننامەیەکی ساختەوە بڕیاری ١٤٤١ی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکانی پێشێل کردووە. ئێمە پاساوێکی گەورەمان هەبوو بۆ خستنەگەڕی "دەرەنجامی جددی". بەڵام تۆنی ویستی بگەڕێینەوە بۆ یوئێن بۆ بڕیاری دووەم کە روونی بکاتەوە عێراق "شکستی هێنا لەو دوایین دەرفەتەی کە پێی درابوو".

تۆنی وتی "ئەمە شتێك نییە کە پێویستمان پێی بێت. بەڵکو دووەم بڕیار پارێزگاریی سەربازی و سیاسیمان پێدەدات".

من ترسم هەبوو لە بیرۆکەی گەڕانەوە بۆ یوئێن. دیك، دۆن و کۆندی دژ وەستانەوە. کۆلن پێی وتم پێویستمان بە بڕیارێکی تر نییە و ناشتوانین بڕیارێکی تر بەدەست بێنین. بەڵام ئەگەر تۆنی بڕیاری دووەمی بوێت، ئەوا هەوڵ دەدەین. وتم "بەو شێوەیەی کە بۆی دەچم، مەسەلەی دووەم بڕیار بریتییە لە چۆنێتی یارمەتیدانی دۆستەکانمان بە باشترین شێوە".

باشترین ڕێگە بۆ بەدەستهێنانی دووەم بڕیار بریتی بوو لە خستنەڕووی بەڵگە لەدژی سەدام. داوام لە کۆلن کرد کە وتارێك لە یوئێن پێشکەش بکات. ئەو وەکو دیپلۆماتێکی ڕێزلێنراو کە بەوە ناسراوە لەگەڵ شیمانەی جەنگدا نییە، قورسایی هەبوو. دەمزانی کە کارێکی تەواو و وریایانە ئەنجام دەدات. لە سەرەتاکانی شوباتدا، کۆلن بەشێوەیەکی کەسی چوار شەو و چوار ڕۆژی لە سی.ئای.ئەی لە چاوخشاندنەوە بە هەواڵگریدا بەسەر برد بۆ دڵنیابوونەوە لەوەی کە ئاسودەیە بە هەر قسەیەك کە لە وتارەکەیدا دەیکات. لە ٥ی شوباتدا، ئەو لە ئەنجومەنی ئاسایشی یوئێن مایکرۆفۆنەکەی بەدەستەوە گرت. ئەو وتی "ڕاستییەکانی پەیوەست بە ڕەفتاری عێراق، پیشانی دەدات کە سەدام و ڕژێمەکەی هیچ هەوڵێکیان نەداوە بۆ ئەو چەکداماڵینەی لەلایەن کۆمەڵی نێودەوڵەتییەوە داوا کراوە. لە ڕاستیدا، ڕاستییەکان و ڕەفتاری عێراق دەریدەخەن کە سەدام حسێن و ڕژێمەکەی هەوڵەکانیان بۆ بەرهەمهێنانی چەکی کۆکوژی زیاتر پەردەپۆش دەکەن".

وتارەکەی کۆلن گشتگیر، ڕەوانبێژانە و ڤایلکەر بوو. بە دژایەتیکردنی باکگراوندی بەرەنگاریی سەدام بۆ پشکنەرانی چەک، ئەم وتارە کاریگەرییەکی قووڵی هەبوو لەسەر مشتومڕی گشتی. دواتر، زۆرێک لە بانگەشەکانی ناو وتارەکەی کۆلن دروست نەبوون. بەڵام لەکاتی خۆیدا، قسەکانی ئەو، ڕەنگدەرەوەی حوکمی لەبەرچاوگیراوی ئاژانسەکانی هەواڵگری بوو لە ناوخۆ و لە دەرەوەدا.

جاک شیراک پاش وتارەکەی کۆلن پێی وتم "ئێمە هەردووکمان دوو کەسی ئەخلاقین". منیش بە ڕێزەوە وەڵامم دایەوە "بەڵام لەم بارەدا، ئەخلاق بەشێوەی جیاواز دەبینین". بەڵام لەبەر خۆمەوە وتم: ئەگەر دیکتاتۆرێک کە ئەشکەنجەی خەڵکەکەی دەدات و هێرشی گازییان دەکاتە سەر نائەخلاقی نەبێت، کەواتە کێ ئەخلاقییە؟

سێ ڕۆژ دواتر، شیراک چووە بەردەم کامێراکان و وتی "ئەمڕۆکە هیچ شتێک پاساوی جەنگ نادات". ئەو، گێرهارد شرۆدەر و ڤیلادیمێر پوتن بەیانێکی هاوبەشی نارەزاییان دەرکرد. هەرسێکیان لە ئەنجومەنی ئاسایش دانیشتن. ئەگەرەکانی دووەم بڕیار تاریک بوون.

تۆنی وتی ئێمە بەرەوپێش هەنگاو دەنێین. لە ۱۹ی شوباتدا بۆی نوسیم "ئێستا مەترسییەکان زۆر گەورەترن. لە لوتکەی ئەوروپاوە بۆم دەردەکەوێت کە فەرەنسا دەیەوێ ئەم بکاتە تاقیکردنەوەیەک چارەنووسساز: ئایا ئەوروپا دۆست یان ڕکابەری ئەمریکایە؟" ئەو بیری هێنامەوە کە ئێمە لە هاوپەیمانێتییەکی ئەوروپیی بەهێزەوە پشتیوانیمان هەیە، لەوانەش ئیسپانیا، ئیتاڵیا، دانیمارک، هۆڵەندا، پورتوگال و هەموو ئەوروپای خۆرهەڵات. لە دەنگدانێکی تازەی ناتۆدا، ۱۵ ئەندامی هاوپەیمانێتییەکە پشتگیریی کردەوەی سەربازییان لە عێراقدا خستبووە ڕوو و تەنیا بەلجیکا و لوکسامبۆرگ لەگەڵ ئەڵمانیا و فەرەنسادا بوون. سەرۆک وەزیرانی پورتوگال، جۆزی بارۆسۆ قسەی بۆ زۆرێک لە ڕێبەرانی ئەوروپا کردبوو کاتێک بە بروانەکردنەوە پرسیبووی، "ئێمە ڕووبەڕووی بژارەی ئەمریکا یان عێراق دەبینەوە و خەریکە عێراق هەڵبژێرین؟"

من و تۆنی لەسەر ستراتیژییەک ڕازی بووین: ئێمە شانبەشانی سەرۆکی هۆشمەندی ئیسپانیا سەرۆک وەزیران جۆزی ماریا ئەزنار، دووەم بڕیار لە یوئێندا دەخەینەڕوو. ئەگەر

بابی پێویست دەنگی بەڵێمان کۆ کردەوە، لەوانەیە بتوانین فەرەنسا و روسیا رازی بکەین بۆ بێ دەنگ بوون لەبری ڤیتۆ کردن. ئەگەر نا، ئەوا بڕیارەکە واز لێ دێنین و روون دەبێتەوە کە ئەوان دوایین تەقەلای دیپلۆماسییان بلۆک کردووە.

دووەم بڕیار، کە لە ٢٤ی شوباتی ٢٠٠٣دا خستمانەڕوو بۆ هۆکارێکی تر گرنگ بوو. تۆنی لەسەر پرسی عێراق لەناوخۆدا رووبەڕووی گووشارێکی ناوخۆی توند ببووەوە و گرنگ بوو بۆی پیشانی بدات کە هەموو ئەلتەرناتیڤێکی شیاوی بۆ هێزی سەربازی بەکارهێناوە. چەند باڵێکی حزبی کرێکاران لێی هەڵگەڕابوونەوە. بەهاتنی سەرەتاکانی مانگی ئازار، روون نەبوو ئاخۆ حکومەتەکەی بەردەوام دەبێت.

تەلەفۆنم بۆ تۆنی کرد و نیگەرانی خۆمم پێگەیاند. پێم وت کە پێم باشترە لە هاوپەیمانێتییەکە بێتە دەرەوە و پارێزگاری لە حکومەتەکەی بکات نەك تیایدا بمێنێتەوە و حکومەتەکەی لەدەست بدات.

لە وەڵامدا وتی "پێم وتی لەگەڵ تۆدام".

من جارێکی تر جەختم لە مەبەستەکەم کردەوە. وتی "من لەوە تێدەگەم و لە چاکەی خۆتە کە وا دەڵێیت. من بە تەواوی باوەڕم بەوە هەیە و تا کۆتایی لەگەڵیدا دەڕۆم".

من رەنگدانەوەیەکی قسەیەکی وینستن چەرچڵم لە دەنگی هاوڕێکەمدا بیست. ئەوە چرکەساتی بوێرییە کە تاهەتایە لەگەڵمدا دەمێنێتەوە.

***

لەسەر داوای تۆنی، من دوایین هەوڵی خۆمم دا بۆ رازیکردنی مەکسیك و شیلی کە دوو ئەندامی رارای ئەنجومەنی ئاسایش بوون بۆ پشتگیری دووەم بڕیار. یەکەم تەلەفۆنم بۆ هاوڕێم سەرۆك ڤینسنت فۆکس بوو. وتوێژەکە بە سەرەتایەکی رەشبینانە دەستپێکرد. کاتێك بە ڤینسنتم وت کە من لەبارەی بڕیارەکەی یوئێن-ەوە قسەی لەگەڵ دەکەم، پرسیاری کرد کە مەبەستم کام بڕیارەیە. وتم "ئەگەر بتوانم کەمێك ئامۆژگاریت پێ بدەم ئەوا نابێ ببینرێی کە لەگەڵ فەرەنسییەکاندا دەوەستیت". ئەو وتی بیری لێدەکەمەوە و پێم دەڵێتەوە. سەعاتێك تێپەڕی. پاشان کۆندی لە باڵیۆزخانەوە تەلەفۆنیان بۆ کردبوو.

ڤینسنت داخلی خەستەخانە کرابوو بۆ نەشتەرگەریی پشت. قەت گوێم لێ نەبیبوو باسی شتێکی وا بکات.

وتوێژەکەم لەگەڵ سەرۆک (ریکاردۆ لاگۆس)ی شیلی ئەنجامی باشتری نەبوو. ئەو سەرکردەیەکی کاریگەر و پیاوێکی ئەکادیمیی دیار بوو. ئێمە دانوستانمان لەسەر ڕێککەوتننامەیەکی بازرگانیی ئازاد کردبوو کە هیوادار بووم کۆنگرێس بەزوویی پەسەندی بکات. بەڵام رای گشتی لە شیلی لەدژی ئەگەر جەنگ بوو و ریکاردۆ نابەدڵ بوو لە پشتگیریی بڕیارەکە. ئەو باسی بەخشینی دوو سێ هەفتەی تری بە سەدام کرد. پێم وت کە پێدانی دوو سێ هەفتەی تر هیچ لە مەسەلەکە ناگۆڕێ. سەدام هەنوکە سەند ساڵێکی بۆ ملدان تێپەڕاندووە. وتم "جێگەی خەمە کە دۆخە گەیشتە ئێرە". بۆ دوایین جار پرسیارم کرد ئاخۆ پلانی چی هەیە بۆ دەنگدان. وتی نەخێر.

لەکاتێکدا کە پرۆسەی دیپلۆماسی بەرەو ناکامی دەچوو، گووشار بۆ کردار لەزیادبووندا بوو. لە سەرەتاکانی ٢٠٠٣دا، سەرۆکی یەدەکی فیدراڵ، ئالان گرینسپان پێی وتم ئەم ناجێگیرییە زیان بە ئابووری دەگەیەنێ. شازادە بەندەری سعودی کە ماوەیەکی درێژ بوو باڵیۆزی وڵاتەکەی بوو لە ئەمریکا و لە سەروەختی سەرۆکایەتی باوکمەوە هاوڕێم بوو، هاتە ئۆفیسی ئۆڤاڵ و پێی وتم هاوپەیمانەکانمان لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بڕیارێکیان دەوێت.

هەر کاتێک کە گوێبیستی ئەوە دەبووم کەسێک بانگەشەی ئەوە دەکات پەلەمان کردووە بۆ جەنگ، بیرم دەچووەوە سەر ئەو ماوەیە. دەیەیەک بەسەر ئەو بڕیارانەی جەنگی کەنداو دا تێپەڕیبوون کە داوای چەکداماڵینیان لە سەدام کردبوو، زیاتر لە چوار ساڵ تێپەڕیبوو بەسەر دەرکردنی پشکنەراندا، شەش مانگ تێپەڕیبوو بەسەر دوایین هۆشداریی من لە نەتەوە یەکگرتووەکاندا، چوار مانگ تێپەڕیبوو بەسەر بڕیاری ١٤٤١ کە "دوایین دەرفەت"ی بە سەدام بەخشیبوو و سێ مانگیش بەسەر ئەو دوامۆڵەتەدا تێپەڕیبوو بۆ ئاشکراکردنی تەواوەتیی چەکە کۆکوژەکانی. دیپلۆماسییەکە پەلەی پێوە دیار نەبوو. بەڵکو وا دیاربوو کە تاهەتایە درێژەی دەبێ. لە هەمان کاتدا، هەڕەشەکان هەر بەردەوام بوون. سەرۆک حوسنی موبارەکی میسر بە تۆمی فرانکسی وتبوو کە عێراق

چەکی بایۆلۆژی هەیە و بەدڵنیاییەوە لەدژی سەربازەکانمان بەکاری دەهێنێت. ئەو رەتی کردبووەوە کە ئەم تۆمەتە بە ئاشکرا دەربڕێت لە ترسی تورەکردنی شەقامی عەرەبی. بەڵام هەواڵگرییەکەی سەرکردەیەکی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست کە سەدامی بەباشی دەناسی، کاریگەری لەسەر بیرکردنەوەی من دانا. هەروەکو چۆن مەترسی هەبوو لە هەنگاونانی کرداریدا، بەهەمان شێوە لە هەنگاونەنانیشدا مەترسی هەبوو: سەدام بە چەکی بایۆلۆژییەوە هەڕەشەیەکی جددی بوو بۆ سەر هەموومان.

***

لە زستانی ٢٠٠٣دا، لە سەرچاوەی جیاوازەوە سۆراخی بیروبۆچوونم کرد لەسەر عێراق. من داوای ئامۆژگاریم لە ئەکادیمییەکان، ئۆپۆزسیۆنی عێراقی لە هەندەران و ئەوانیتر لە دەرەوەی ئیدارەکەم کرد. یەکێك لەو کەسە هەرە نایابانەی کە چاوم پێی کەوت (ئێلی ویسێل)ی نووسەر، رزگاربووی هۆلۆکۆست و وەرگری شایستەی نۆبڵی ئاشتی بوو. ئێلی پیاوێکی بەڕێز و هۆشیارە. بەڵام سۆزێك لە چاوە حەفتاو چوار ساڵییەکانیدا بەدی دەکرا کاتێك زۆرداریی سەدامی بە جینۆسایدی نازی بەراورد کرد. ئەو وتی "جەنابی سەرۆك، تۆ ئەرکێکی ئەخلاقیت لە ئەستۆیە کە لەدژی خراپەکار هەنگاو بنێیت". هێزی بیروباوەڕەکەی بە قووڵی کاری تێکردم. ئەوەش پیاوێك کە هەموو ژیانی خۆی بۆ ئاشتی تەرخان کردبوو، پێی دەوتم کە هەنگاوی کرداری بنێم لە عێراقدا. هەروەکو دواتر لە ستونێکدا روونی کردەوە: "هەرچەندە من دژی جەنگم، من لەگەڵ تەدەخول کردنم کاتێك هیچ بژارەیەکی تر نامێنێتەوە، هەروەکو لەم حاڵەتەی تەمومژاوێتیی و دواخستنەکانی سەدامدا".

من هەمیشە بیرم لەوە کردووەتەوە ئاخۆ بۆچی رەخنەگرانی جەنگ دان نانێن بە بەڵگاندنی ئەخلاقیی کەسانی وەکو ئێلی ویسێل. زۆرێك لەوانەی کە لەدژی کردەوەی سەربازی لە عێراق خۆپیشاندانیان کرد، لایەنگرانی دڵسۆزی مافەکانی مرۆڤ بوون. لەگەڵ ئەوەشدا ئیدانەیان کردم لە بەرانبەر بەکارهێنانی هێز لەدژی ئەو پیاوەی کە کوردی کیمیاباران کردبوو، بە هەلیکۆپتەر شیعەی گوولەباران کردبوو، عەرەبی ناو قامیشەڵانەکانی کۆکوژ کردبوو و دەیان هەزار کەسی رەوانەی ناو گۆڕی بەکۆمەڵ

کردبوو. تێگەیشتم کە بۆچی لەوانەیە خەڵکی کۆک نەبن لەسەر ئەو هەڕەشەیەی کە سەدام حسێن خستوویەتەڕووی ئەمریکا. بەڵام نەمدەزانی چۆن هەر کەسێک دەتوانێ نکوڵی لەوە بکات کە ئازادکردنی عیراق قەزیەی مافەکانی مرۆڤی بەرەو پێش بردووە.

لەکاتێکدا کە دیپلۆماسی بە بنبەست دەگەیشت، دانیشتنەکانی پەیوەست بە پلاندانانی سوپاکەمان تەرکیزی خستبووە سەر ئەوەی کە پاش لابردنی سەدام روودەدات. لە ساڵانی دواتردا، هەندێ لە رەخنەگران رەخنەی ئەوەیان دەگرت کە ئێمە شکستمان هێناوە لە خۆ ئامادەکردن بۆ قۆناغی دوای جەنگ. بە دڵنیاییەوە ئەمە ئەو شتە نییە کە دێتەوە بیرم.

هەر لە پاییزی ٢٠٠٢وەوە، گروپێکی ڕێبەرایەتیکراو لەلایەن جێگری ڕاوێژکاری ئاسایشی نیشتمانی، ستیڤ هادلی پلانی قووڵی بەرهەم هێنابوو بۆ عیراقی پاش سەدام. گەورەترین دوو نیگەرانیی ئێمە، لەبرسامردن و پەنابەران بوون. ٦٠٪ی عیراقییەکان پشت ئەستوور بوون بە حکومەت وەکو سەرچاوەی سەرەکیی خۆراک. ئەگەری هەبوو کە لە ماوەی جەنگدا نزیکەی دوو ملیۆن عیراقی ئاوارە بن.

لە ١٥ی کانوونی دووەمدا، ئێلیەت ئەبرامز، ئەندامی باڵای ستافی ئەنجومەنی ئاسایشی نیشتمانی، لێدوانێکی چڕوپڕی لەبارەی ئامادەکارییەکانمانەوە گەیاند. ئێمە پلانمان دانابوو بۆ جێگیرکردنی خواردەمەنی، بەتانی، دەرمان، خێمە و کەرەستەکانی تری بوژانەوە. ئێمە نەخشەگەلێکمان ئامادە کرد بۆ پیشاندانی ئەمەی کە پەنابەران دەشێ لەکوێ شوێنیان بکرێتەوە. ئێمە شارەزایانی بوژانەوەی مرۆییمان خستەکار بۆ چوونە عیراق شانبەشانی سەربازەکانمان. ئێمە پێگەکانی نزیکەی پەنجاو پێنج هەزار بنکەکەی دابەشکردنی خۆراکی عیراقمان دەستنیشان کردبوو و لەگەڵ ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکاندا ئامادەکاریمان کردبوو- لەوانەش پرۆگرامی خواردنی جیهانی- بۆ دڵنیابوونەوە لەوەی کە خۆراکێکی زۆر ئەبێت.

هەروەها ئێمە پلانگەلێکمان گەڵاڵە کرد بۆ ئاوەدانکردنەوەی دوورمەودا. ئێمە سەرنجمان خستەسەر دە بوار: پەروەردە، تەندروستی، ئاو و کەرەستەی خاوێنراگرتن، کارەبا، پەناگە، گواستنەوە، حوکمڕانی و حوکمی یاسا، کشتوکاڵ، اتصالات و بەرنامەی

ئابووری. بۆ هەریەکەیان، ئێمە داتامان کۆ کردەوە، ستراتیژییەکمان گەڵاڵە کرد و ئامانجی دروستمان دانا. بۆ نموونە، (یونێس ئەید) ئەوەی دەستنیشان کرد کە عیراق ٢٥٠ نەخۆشخانەی گشتیی ناسەربازی، ٢٠ نەخۆشخانەی سەربازی، ٥ نەخۆشخانەی کۆلێژی پزیشکی و ٩٩٥ سەنتەری چاودێریی تەندروستیی پزیشکیی مەدەنی هەیە. پلانەکەمان بانگەوازی دەکرد بۆ زیادکردنی پێداویستیی پزیشکی بۆ ناو وڵاتەکە، کارکردن بۆ سازدانی دکتۆر و پەرستارە عیراقییەکانی دەرەوەی وڵات و گەڕانەوەیان بۆ وڵات و مەشقپێکردنی کارمەندانی پزیشکیی نوێ و سەرەنجام سپاردنی کۆنترۆڵ بە وەزارەتی تەندروستیی نوێی عیراق.

یەکێك لە پرسیارە هەرە گرنگەکان ئەوە بوو کە چۆن پلان دابنرێت بۆ سیستەمی سیاسیی پاش سەدام. هەندێ کەسی ناو ئیدارەکەم پێشنیاری ئەوەیان کرد کە راستەوخۆ دەسەڵات رادەستی گروپێك لە عیراقییەکانی تاراوگە بکەین. من کەیفم بەو بیرۆکەیە نەهات. لەکاتێکدا کە تاراوگەییەکان پەیوەندیی نزیکیان هەبوو لە واشنتن، پێم وابوو دەبێ یەکەم سەرۆکی عیراق ئەو کەسە بێ کە ئەوان هەڵیانبژاردووە. من ئەزموونی بریتانیم لە ١٩٢٠ەکاندا لەبیر بوو. بریتانیا پاشایەکی ناعیراقی (فەیسەڵ)ی دانابوو کە بە ناشەرعی دەبینرا و دانانی، کینە و ناسەقامگیری لێ کەوتەوە. ئێمە نیازمان نەبوو ئەو هەڵەیە دووبارە بکەینەوە. تەحەدییەکی گەورەی تر ئەوە بوو کە چۆن پاش سەدام ئاسایش بەرقەرار بکرێت. هەندێ لە راپۆرتەکانی هەواڵگری پێشبینی ئەوەیان دەکرد کە بە رووخانی رژێمەکە، پۆلیس و سوپای سەدام لە بەرەیەکەوە دەچن بۆ بەرەیەکی تر. گەورە فەرماندەکان- ئەوانەی کە دەستیان بە خوێنی بێگوناهان سوور بوو- بانگ ناکرێن بۆ پەیوەندیکردنەوە. بەڵام ئێمە پشت بە بەشەکەی تری هێزەکانی سەردەمی سەدام دەبەستین بۆ بونیادنانی پۆلیس و سوپای عیراقی نوێ.

لە کانوونی دووەمی ٢٠٠٣دا، من رێنماییەکی سەرۆکایەتیم دەرکرد (ئێن ئێس پی دی ٢٤)، بۆ دروستکردنی ئۆفیسێکی نوێی ئاوەدانکردنەوە و کۆمەکی مرۆیی (ئۆرها). ئۆرها بەرپرس بوو لە گۆڕینی پلانە چەمکییەکانمان بۆ کرداری کۆنکریتی. ئۆفیسەکەمان لە پێنتاگۆن دامەزراند، بۆئەوەی هەوڵە مەدەنییەکان لە عیراقدا وەکو ئۆپەراسیۆنە

سەربازییەکانمان بە هەمان هەیکەلی فەرماندەییدا تێپەڕن. بۆ سەرکردایەتیکردنی ئۆفیسەکە، دۆن رەمسفێلد (جەی گارنەر)ی راسپارد کە ژەنەراڵێکی خانەنشین بوو و لە سالی ۱۹۹۱دا هەماهەنگیی هەوڵی بوژاندنەوەی کردبوو لە باکووری عیراقدا. ئەو لەناو حکومەتدا دەستەیەك لە شارەزایانی مەدەنی ئامادە کرد بۆ چوون بۆ بەغدا.

بە ئامادەبوونی پلانەکان و کارمەندەکانمان لە پێش جەنگدا، هەستم کرد باش خۆمان سازداوە. لەگەڵ ئەوەشدا بەئاگابووین لە سنووردارێتییەکان. تواناکانی بونیادنانەوەی ولاتمان سنووردار بوون و کەس دڵنیا نەبوو لەوەی کە چ پێویستییەك سەرهەڵدەدات. سوپا وتەیەکی کۆنی هەبوو: "لەگەڵ یەکەم بەرکەوتن لەگەڵ دوژمندا هیچ پلانێکی جەنگ نامێنێت". لەکاتێکدا کە لە وانەی عیراقەوە فێر دەبووین، ئەم وتەیە لەبارەی ژینگەی پاش جەنگەوە دووجار راست بوو.

***

بەهاتنی ئازاری ۲۰۰۳، پلانی شەڕ ئامادە بوو. پاش زیاتر لە ساڵێك بەدواداچوون و پرسیار کردن، تۆمی فرانکس و تیمەکەی ئۆپەراسیۆنێکیان دارشتبوو کە من دڵنیا بووم کە بە نەرمی و بەشێوەیەکی یەکلاییکەرەوە سەدام سەرنگون دەکات لەکاتێکدا کە گیانلەدەستدانی ئەمریکی و عیراقییەکان کەم دەکاتەوە. تاکە نادڵنیایی کە مابوو، رۆڵی تورکیا بوو. بۆ ماوەی چەند مانگێك، ئێمە خەریکی فشارخستنەسەر تورکەکان بووین بۆئەوەی رێگەمان پێ بدەن خاکی ئەوان بەکاربێنین بۆئەوەی بتوانین پانزە هەزار سەربازی (لقی پیادەی چوار) لەلای باکوورەوە داخڵی عیراق بکەین. ئێمە بەڵێنماندا کۆمەکی ئابووری و سەربازی دابین بکەین، یارمەتی تورکیا بدەین بەشی هەبێت لە پرۆگرامە سەرەکییەکانی (سندوقی دراوی نێودەوڵەتی) و پشتگیریی خۆمان بۆ وەرگیرانی تورکیا لە یەکێتیی ئەوروپا بەرقەرار بکەین. کابینەی سەرۆك وەزیران عەبدوڵلا گویل داواکەی ئێمەی قبوڵ کرد. بەڵام کاتێك پەرلەمان لە ۱ی ئازاردا دوایین دەنگیدا، ئەو رێژەیەی کە پێویست بوو کورتی هێنا. من نائومێد و پەست بووم. لە یەکێك لەو داواکارییە هەرە گرنگانەی کە تا ئەو کاتە خستبوومانەڕوو، تورکیا، هاوپەیمانی ناتۆمان، پشتی لە ئەمریکا کرد.

دۆن و تۆمی، لقی پیادەی چواریان لە خۆرهەلاتی دەریای ناوەڕاستدا هێشتەوە کە دەکرا لەوێوە بە تورکیادا ڕەت بکرێن ئەگەر حکومەت بڕیاری خۆی گۆڕی، ئەگینا لە کۆەیتەوە پەیوەندی بە هەڵمەتەکانەوە بکات. ئێمە بەهەمان شێوە پلانی ئەوەمان دانابوو کە هەزار سەربازی پەرەشوت لە هێزی ئاسمانی ١٧٢وە بخەینە خوارەوە بۆ هەرێمی کوردی لە باکووری عێراق. ئەمە یەکەم بژارەمان نەبوو، بەلام لانی کەم ئێمە شوێنپێیەکمان لە بەرەی باکوور دەبوو.

لە باشوور، ئێمە زیاتر لە ١٥٠,٠٠٠ سەربازی ئەمریکیمان لە سەر سنووری عیراق لەگەل نزیکەی ٩٠,٠٠٠ سەربازی تری نیشتەجێکراو لە ناوچەی کەنداو هەبوو. من بە تەواوی ڕوونم کردبووەوە کە ئەگەر پێویست بکات ئەوا بەکاریان دەهێنم. دیپلۆماسیی بەزۆر ئێمەی گەیاندبووە ئەوپەڕی پنتی توانای خۆمان. سوپا و ڕێچکە دیپلۆماسییەکان بە تەواوی بەیەکداچووبوون. بژارەی نێوان جەنگ و ئاشتی پەیوەندی هەبوو بە خودی سەدام حسێنەوە.

بۆ ماوەی چەند مانگێک، ئەنجومەنی ئاسایشی نیشتمانی تەقریبەن بەشێوەیەکی ڕۆژانە کۆ دەبووەوە بۆ قسەکردن لەسەر عێراق. دەمزانی کە هەموو ڕاوێژکارەکانم بەکوێ گەیشتوون. دیک چێنی نیگەران بوو لەبارەی پرۆسەی خاوی دیپلۆماسییەوە. ئەو هۆشداری ئەوەیدا کە سەدام حسێن دەتوانێ کات بەکاربهێنێت بۆ بەرهەمهێنانی چەکەکان، شاردنەوەی چەک یان پیلانی هێرشێک. ئەو زستانە لە یەکێک لە نیوەڕۆخوانەکانی هەفتانەماندا، دیک ڕاستەوخۆ پرسیاری لێکردم "ئایا نیازتە ئاگاداری ئەو کابرایە بیت یان نا؟" ئەم شێوازی ئەو بوو بۆ وتنی ئەمەی کە ئێمە بایی پێویست کاتمان بە دیپلۆماسی داوە. من ستایشی ئامۆژگاری ڕێک ڕەوانی دیکم کرد. پێم وت کە هێشتا ئامادە نیم بۆ جولان. وتی "باشە جەنابی سەرۆک، ئەمە بڕیاری خۆتە". پاشان بە خەندەیەکەوە یەکێک لە دیرە هەرە دڵخوازەکانی خۆی دەربڕی "هەربۆیە ئەو هەموو پارەیەت دەدەنێ". دۆن ڕەمسفێڵد ئەوەندە یەکلاییکەرەوە نەبوو. ئەو دڵنیای کردمەوە کە هەرکاتێک فرمانمدا ئەوا سوپا ئامادەیە. ئەو بەهەمان شێوە هۆشداری ئەوەیدا کە ئێمە ناتوانین ١٥٠,٠٠٠ سەرباز لەسەر سنووری عیراق بۆ تامەتایە واز لێبێنین. فشاری

لۆجستیکیی پشتیگیری لەو هێزە زۆرانە، گەورە بوو. لە ساتێك لە ساتەکاندا، کەڵەکەکردنەکە سەربازییەکە بەهای زیریی لەدەست دەدا، چونکە سەدام دەگەیشتە ئەو ئەنجامەی کە ئێمە جددی نین لە ناردنە ناوەوەی هێز.

کۆندی بەئاگابوو لەوەی لە کۆبوونەوەکانی ئەنجومەنی ئاسایشی نیشتمانیدا بێ لایەن بمێنێتەوە، بەڵام ئەو بە نهێنی رەئی خۆی پێ گوتم. ئەو لایەنگیرێکی بەهێزی پشکنینەکان بوو. بەڵام پاش کۆبوونەوە لەگەڵ بلیکس و تیمەکەی، ئەو گەیشتە ئەو بڕوایەی کە سەدام هیچ ناکات بەس تەگەرە دروست دەکات. ئەو بە نابەدڵییەوە گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە تاکە رێگە بۆ سەپاندنی بڕیاری نەتەوە یەکگرتووەکان، بەکارهێنانی بژارەی سەربازییە.

کۆلن، قووڵترین خۆبەدوورگرتنی هەبوو. لە کۆبوونەوەیەکی یەك بە یەکدا لە سەرەتاکانی ٢٠٠٣، ئەو پێی وتبووم کە دەتوانین بە شێوەیەکی دیپلۆماسی هەڕەشەی عێراق بەڕێوە ببەین. ئەو بەهەمان شێوە پێی وتبووم کە ئەو بە تەواوی ئاسودە نییە بە پلانەکانی جەنگ. ئەمە تووشی سەرسوڕمانی نەکردم. ئەو ئۆپەراسیۆنەی کە تۆمی فرانکس بەرهەمی هێنابوو، سێ قاتی ئەو رێژەیەی سەربازی بەکاردەهێنا کە لە جەنگی کەنداودا بەکارهێنرابوون. ئەمەش دابڕانێکی روون و ئاشکرا بوو لەو بڕوایەی کە ئەمریکا دەتوانێ تەنیا بە پیادەکردنی هێزی گەورەی یەکلاییکەرەوە جەنگەکان بباتەوە- کە زیاتر بە (بیروباوەڕی پاوڵی) ناسرابوو.

من خۆشحاڵ بووم کە کۆلن وتی نیگەرانییەکانی لەبارەی پلانەکەوە بۆ تۆمی باس کردووە. کۆلن لە ماوەی (زریانی بیابان)دا سەرۆکی هەیئەی ئەرکان بوو و بڕوام وابوو کە تۆمی قسەکانی بەهەند وەردەگرێت. لەکاتێکدا کە من هێشتا ئومێدەوار بووم بە کاریگەری دیپلۆماسی، بە کۆلنم وت کە ئەگەری ئەوە هەیە کە بگەینە خاڵێك کە تیایدا جەنگ تاکە بژارەیەکە کە ماوەتەوە.

***

بەرەبەیانی شەممە، ١٦ی ئازار، سواری هێزی ئاسمانیی یەك بووم و بەرەو دوورگەکانی (ئازۆر) فریم، ناوچەیەکی پورتوگالی کە دوو لەسەر سێی رێگای واشنتن

بەرەو لیشبۆنەیە. من بە ڕێگاوە بووم بەرەو دوایین لوتکە لەبارەی ستراتیژیی دیپلۆماسی لەگەڵ تۆنی بلێر، جۆزێ ماریا ئەزنار و سەرۆک وەزیران جۆزێ باروسۆی پورتوگال. لەکاتێکدا کە فەرەنسییەکان، ئەڵمانەکان و ڕوسەکان دژی دووەم بڕیاری یوئێن بوون و مەکسیکییەکان و شیلییەکان نابەدڵ بوون لە دەنگدان، ئێمە هەموومان کۆک بووین لەسەر ئەوەی کە ڕەوگەی دیپلۆماسی بە کۆتا گەیشتووە. ئێمە پلانمان دانا کە دووەم بڕیاری یوئێن لە بەرەبەیانی دووشەممەدا بکشێنینەوە. ئەو ئێوارەیە، من چل و هەشت سەعاتم مۆڵەت دەدایە سەدام و کوڕەکانی تا وڵات جێ بێڵن، دوایین دەرفەت بۆ خۆلادان لە جەنگ.

دەنگدانی هەستیاری تۆنی لە پەرلەمان، ڕۆژی سێشەممە بوو. پێی وتم ئەگەر دەنگدانەکە شکست بێنێت ئەوا دەکشێتەوە، بەو مانایەی کە بریتانیا لە هاوپەیمانێتی سەربازی پاشەکشە دەکات. هەرگیز وێنای ئەوەم نەکردبوو کە وەها لە نزیکەوە چاودێریی دەنگدانێکی پەرلەمانیی بریتانیا بکەم، چ جای ئەوەی کە لایەنگریی سەرۆک وەزیرانێکی حزبی کرێکاران بکەم. کە دوورگەکانی ئازۆرمان جێهێشت، تەوقەم لەگەڵ هاوڕێکەم کرد.کۆندی بە ڕێگاوە بەرەو هێزی ئاسمانیی یەک وتی "هیوادارم ئەمە دوایین جار نەبێ کە دەیانبینین".

فڕین بەرەو نیشتمان درێژخایەن و هێمن بوو. پاش پلاندانانێکی زۆر و چاوەڕوان بوون، چرکەساتەکە گەیشتبوو. ئەگەر سەدام وڵاتەکەی جێ نەهێڵێت ئەوا لە ماوەی سێ ڕۆژدا دەچینە جەنگەوە. من بە قووڵی نائومێد بووم کە دیپلۆماسی شکستی هێناوە. بەڵام بەڵێنم بە گەلی ئەمریکا، هاوپەیمانانمان و جیهان دا کە ئێمە بڕیارەکانی یوئێن پیادە دەکەین. من پەیمانی خۆم نەدەشکاند. بۆ ماوەی چەند مانگێک، من ئامۆژگاریم وەرگرتبوو، گوێم بۆ چەندەها ڕەئی شل کردبوو و دژەبۆچوونەکانم لەبەرچاو گرتبوو. هەندێ کەس بڕوای وابوو کە بە هێشتنەوە پشکنەران لە عێراقدا، دەتوانین سەدام کۆت بکەین. بەڵام من نەمدەزانی چۆن. ئەگەر بە سەداممان بوتایە کە چانسێکی تری هەیە-پاش ئەوەی ڕامانگەیاندبوو کە ئەمە دوایین چانسیەتی- ئەوا ئێمە متمانەمان لەرزۆک دەبوو و ئەویش بەهێز دەبوو.

ئەوانیتر دەیانگوت هەڕەشەکە ئەوەندەش جددی نییە کە بیری لێ دەکەینەوە. ئەمە ئاسان بوو بۆیان کە وابڵێن. ئەوان بەرپرس نەبوون لە پارێزگاری لە وڵات. من ئازاری راچڵەکێنەری ١١ی سێپتێمبەرم لەبیر بوو، ئەو هێرشە لەناکاوەی کە هۆشداریمان لەپێشدا وەرنەگرت بۆی. ئەم جارەیان ئێمە هۆشداریمان وەکو زەنگێکی تیژ پێدرابوو. ساڵانێکی هەواڵگری، بە شێوەیەکی بەرچاو ئاماژەی دەدا بەو ئەنجامگیرییەی کە سەدام چەکی کۆکوژی هەیە. ئەو لە رابردوودا بەکاری هێنابوون. ئەو بەرپرسیارێتیی سەلماندنی لەناوبردنیانی جێبەجێ نەکردبوو. ئەو هاوکاری لەگەڵ پشکنەران رەت کردبووەوە، تەنانەت بە هەڕەشەی داگیرکردنێکیش لەبەردەم دەروازەکەیدا. تاکە ئەنجامگیریی لۆژیکی ئەوە بوو کە ئەو چەکی کۆکوژی شاردووەتەوە. بە لەبەرچاوگرتنی پشتیوانییەکەشی بۆ تیرۆر و رقی بۆ ئەمریکای دوژمنی سەرسەختی، ئەستەم بوو بزانین ئەم چەکانە ئەنجامیان بە کوێ دەگات.

ئەوانیتر بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە نیازی راستەقینەی ئەمریکا کۆنترۆڵکردنی نەوتی عێراق یان رازیکردنی ئیسرائیلە. ئەو تیۆرانە درۆ بوون. من بۆ پارێزگاری لە گەلی ئەمریکا سەربازەکانمان دەنارد.

دەمزانی کە باجەکە قورس دەبێت. بەڵام هەنگاونەنانیش باجەکەی قورس بوو. بە لەبەچاوگرتنی هەموو ئەو شتانەی کە دەمانزانی، رێگەدان بە سەدام بۆئەوەی لەسەر حوکم بمێنێتەوە، موجازەفەیەکی زۆر گەورە بوو. دەبووایە گرەو لەسەر ئەوە بکەم کە یان ئەوەتا هەرکام لە ئاژانسە هەواڵگرییە گەورەکان بەهەڵەداچوون یان سەدام دڵی باش دەبێت. پاش بینینی کارەساتی ١١ی سێپتێمبەر، ئەمە موجازەفەیەک نەبوو کە من بیگرمەبەر. کردەوەی سەربازی دوایین پەنام بوو. بەڵام بڕوام وابوو کە پێویستە. رۆژی دواتر، دووشەممە، ١٧ی ئازاری ٢٠٠٣، باڵیۆز جۆن نیگرۆپۆنتی دووەم بڕیاری لە نەتەوە یەکگرتووەکان کێشایەوە. ئەو شەوە، من لە هۆڵی (کرۆس)ی کۆشکی سپییەوە موخاتەبەی گەلم کرد. وتم "ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان پابەند نەبووە بە بەرپرسیارێتییەکانییەوە، بۆیە ئێمە بەوانەی خۆمان پابەند دەبین". هەروەها وتم "...پێویستە سەدام حسێن و کوڕەکانی لە ماوەی چل و هەشت سەعاتدا عێراق جێ

بهێڵن. ڕەتکردنەوەیان بۆ ئەمە، دەبێتەهۆی پێکدادانی سەربازی، کە لەکاتی دیاریکراوی خۆمانەوە دەست پێدەکات".

***

دوو ڕۆژی دواتر وەکو هەفتەیەك وابوون. ئێمە لە سێشەممەدا هەواڵی خۆشمان پێگەیشت: تۆنی بلێر دەنگەکەی پەرلەمانی بە ڕێژەیەکی بەهێز بەدەستهێنابوو. بریتانیا لەگەڵماندا دەبوو.

جۆرج تێنێت و کۆلن پاول هەواڵی تازەیان لەبارەی بەرەوپێشچوونەکانی پەیوەست بە عێراق پێ دەگەیاندم. دوایین ئومێدمان ئەوە بوو کە سەدام ڕازی بێت بچێتە هەندەران. لە ساتێك لە ساتەکاندا، پێدەچوو پێشنیارێکی حکومەتێکی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بۆ ناردنی سەدام بۆ بیلاڕوس بە ١ تا ٢ ملیارد دۆلارەوە کاریگەری دروست بکات. لەبری ئەمە، لە یەکێك لە دوایین کردارەکانیدا، سەدام فرمانیدا زمانی یەکێك لە نەیارەکانی ببڕدرێت و وازی لێبهێنرێت تا دەمرێ. دیکتاتۆری عێراق بڕیاری خۆی دابوو. جەنگی هەڵبژارد. لە بەرەبەیانی چوارشەممەدا، من لە تەواوی ئەنجومەنی ئاسایشی نیشتمانیم لە ژووری (بارودۆخ) کۆکردەوە کە لەوێ فرمانمدا بە ئۆپەراسیۆنی ئازادکردنی عێراق. شەش سەعات دواتر، تەلەفۆنێکی چاوەڕواننەکراوم لە دۆن ڕەمسفێڵدەوە پێگەیشت. ئەو وتی کە شتێکی گرنگی پێیە بۆ قسە لەسەر کردن. ئەو و جۆرج تێنێت بە ڕێگاوە بوون بەرەو ئۆفیسی ئۆڤاڵ.

کاتێ گەیشتن، پرسیارم کرد "چ باسە؟"

جۆرج وتی "جەنابی سەرۆك. پێمان وایە چانسێکمان هەیە بۆ کوشتنی سەدام حسێن".

ئەوەی کە دواتر هات، یەکێك بوو لە کۆبوونەوە هەرە سەرووئاساییەکانی سەرۆکایەتیم. بە ئامادەبوونی تەواوی تیمی ئاسایشی نیشتمانی لە ئۆفیسی ئۆڤاڵ، ڕاوێژکاران خۆیان هێنا و برد بۆ دابینکردنی دوایین هەواڵی تازە لە گۆڕەپانەکەوە. تۆڕێکی سەرچاوە هەواڵگرییەکان لەعێراق ڕاپۆرتی ئەوەیان گەیاند کە لەوانەیە سەدام و هەندێ لە کەسانی خێزانەکەی ئەو شەوە لە ناوچەیەکی دەرەوەی بەغدا بەسەر ببەن کە

پێی دەوترێ (کێڵگەکانی دۆرە). ئەگەر شوێنگەکە بدۆزینەوە، ئەوا لەوانەیە ئێمە بتوانین رژێم بێ سەر بکەین.

من بەگومان بووم. ئەگەر فرمانی لێدانی ئاسمانیم بکردایە، ئەوا ئێمە لە پلانە پاش داڕێژراوەکەمان دادەبڕاین کە بریتی بوو لە دوو رۆژی ئۆپەراسیۆنی نهێنی پێش دەستپێکردنی جەنگی ئاسمانی. من وێنای هەموو ئەو شتانەم کرد کە دەشێ بە نەخوازراو بکەونەوە. دەبووایە دوو بۆمبهاوێژی ئێف-١١٧ بەبێ هاوڕێ بەسەر شارێکی تەواو قایمکراودا بفڕن. گەورەترین نیگەرانیی من ئەوە بوو کە هەواڵگرییەکە تەڵەیەک بێت. ئەی ئەگەر ئەو کەسەی رووی کردووەتە کێڵگەکانی دۆرە سەدام نەبێت، بەڵکو پاسێکی پڕ لە منداڵ بێت؟ یەکەم وێنەکانی جەنگەکە کوشتنی منداڵانی بێ تاوانی عێراقیمان پیشان دەدەن.

باشترین رێگەچارە دەستگرتن بوو بە پلانەکەوە. بەڵام بیرۆکەیەک لە مێشکمدا هەر دەهات و دەچوو: دەشێ بە کوشتنی دیکتاتۆر جەنگەکە بەر لەوەی دەست پێبکات، کۆتایی پێ بێت و چەندەها ژیان رزگار بکات. هەستم بە بەرپرسیارێتی کرد کە دەرفەتەکە بقۆزمەوە. ژەنەراڵ مایەرز پێی وتم فڕۆکەکان سوتەمەنییان تێکراوە و موشەکەکانی هێرشی زەمینیی تۆماهۆک پرۆگرام کراون. من رووم کردە تیمەکە کە لە ئۆفیسی ئۆڤاڵ کۆ ببوونەوە و وتم "با دەرچین". رێک پاش ئەوەی کە مۆڵەتی چل و هەشت سەعاتە بەسەرچوو، بۆمباران دەستپێکرد.

کۆندی بەرەبەیانی دواتر تەلەفۆنی کرد. شایەتحاڵێک پیاوێکی بینیووە کە شێوەی لە سەدام چووە و لە کێڵگەکانی دۆرە لەژێر داروپەردو هاتووەتە دەرەوە. بەڵام بە تێپەڕینی رۆژان، راپۆرتەکان گۆڕان. ئۆپەراسیۆنەکە زەنگێک بوو بۆ ئەو شتانەی کە دەهاتن. نیازمان راست بوو. فڕۆکەوانەکان ئازایانە رەفتاریان کرد. بەڵام هەواڵگری بەهەڵەداچووبوو.

***

رۆژی پاش دەستپێکردنی تەقە لە کێڵگەکانی دۆرە، شەپۆلێک چالاکیی سەربازی دەستی پێکرد. لە سنووری باشووری عێراق لەگەڵ کوێتدا، هەیئەی سەربازیی پێنج د

هێزی یەکی هێردراوی مارینز هەڵمەتی هاوتەریبی خۆیان بۆ بەغداد دەست پێکرد. لە هەمان کاتدا، هێزە ئاسمانییەکانمان پایتەختیان بۆمباران کرد. لە شەپۆلی سەرەتایی لێدانەکەدا، زیاتر لە سێ سەد موشەکی کرووز – کە بۆمبهاوێژی کەشفنەکراو بە رادار پەدوایانەوە بوون– بەشی زۆری سەرکردایەتیی حکومەت و فەرماندەیی سوپای سەدامیان وێران کرد. بە پێچەوانەی تەقینەوەکەی درێسدن، لێدانە ناوکییەکانی هیرۆشیما و ناگاساکی، یان بەکارهێنانی ناپالم لە ڤێتنام، هێرشەکەمان بەشی زۆری دانیشتووانی مەدەنیی و زێرخانی نەگرتەوە. ئەمە تەنیا شۆك و شەپۆل نەبوو، بەڵکو یەکێك بوو لە لێدانە ئاسمانییە هەرە دروستەکان لە مێژوودا.

لە باشووری عێراقدا، مارینز دابەزی بۆ پارێزگاری لە کێڵگە نەوتییە سەرەکییەکان. هێزە تایبەتەکانی پۆڵەندە و (سێل)ەکانی هێزی دەریایی ئەمریکا پارێزگارییان لە زێرخانی نەوتی دەریا کرد. لقێکی بریتانی بە زرێپۆشەوە شاری بەسرەی باشوور و بەندەری چالاکی ئوم قەسری ئازاد کرد. ئاگرتێبەربوونی نەوت و زیانپێگەیاندنی کە لێی دەترساین، بەرجەستە نەبوو و ئێمە رێچکەیەکمان پاك کردبووەوە بۆ هاتنی کۆمەکی مرۆیی بۆ ناو عێراق.

لە باکووری عێراق، سەربازە پەرەشوتبازەکان خاڵە سەرەکییەکانی ترانزیتیانگرت و یارمەتیدەر بوون بۆ بونیادنانی پردێکی ئاسمانی بۆ پێداویستی و کۆمەکە مرۆییەکان. بە پشتگیریی هێزە کوردییەکان، کەمپی زەرقاوی تێکشکێنرا. لە خۆرئاوای عێراق، هێزە تایبەتەکانی ئەمریکا، بریتانیا و ئوستراڵیا دەوریەیان لە بیابان ئەنجامدا بۆ موشەکی سکود و دڵنیابوونەوە لەوەی کە سەدام هەرگیز دەرفەتی ئەوەی نییە هێرش بکاتەسەر سعودیە، ئوردن، ئیسرائیل یان هاوپەیمانانی تر لە ناوچەکە.

بە هاتنی کۆتایی دووەم هەفتە، سەربازەکانمان گەیشتبوونە دەوروبەری بەغدا. ئەوان بەرگەی زریانی چاوکوێرکەر، گەرمای سوتێنەر و جلوبەرگی پارێزەری قورسیان گرتبوو بۆ خۆپاراستن لەو هێرشە بایۆلۆژی و کیمیاییەی لێی دەترساین. ئەوان رووبەڕووی بەرەنگاریی توندی هێزە هەرە دڵسۆزەکانی سەدام ببوونەوە کە لە ئۆتۆمبێلە مەدەنییەکانەوە هێرشیان ئەنجام دەدا و لە پشت قەڵغانە مرۆییەکانەوە خۆیان

دەشاردەوە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەوان خێراترین بەرەوپێشچوونی زرێپۆشییان لە مێژووی جەنگدا تەواو کرد. بە درێژایی رێگەکە، ئەوان شیرینی و دەرمانیان پێشکەشی منداڵان دەکرد و گیانی خۆیان خستە مەترسییەوە بۆ پارێزگاریکردن لە عیراقییەکان.

لە ٤ی نیساندا، عەریف پۆل رەی سمیس و پیاوەکانی خەریکی گرتنی گۆرەپانێکی نزیک فرۆکەخانەی بەغدا بوون. گاردەکانی کۆماریی سەدام بۆسەیان بۆ دانان، ژمارەیەك لە پیاوەکانی عەریف سمیسیان بریندار کرد. بە کەوتنەبەر تەقەی دوژمن، عەریف سمیس رەشاشێکی پڕ کرد لە فیشەك و بەردەوام بوو لە تەقەکردن تا سەخت بریندار بوو. راپۆرتی پاش کردەوەی سوپا دەریدەخست کە ئەو پەنجا سەربازی دوژمنی کوشتووە و گیانی سەد ئەمریکی رزگار کردووە. لە بەرانبەر کردەوە بوێرانەکەیدا، پۆل رەی سمیس بووە یەکەمین سەرباز لە جەنگی دژە تیرۆردا کە میداڵی فەخری پێ بەخشرا. لە نیسانی ٢٠٠٥دا، من میداڵەکەم لە کۆشکی سپی بەخشی بە ژنەکەی (بریجیت) و کوڕە گەنجەکەی.

رۆژی پاش ئەوەی کە عەریف سمیس گیانی خۆی بەخشی لە پێناو گرتنی فرۆکەخانەدا، لقی پیادەی سێ چووە ناو بەغداوە. یەکەم لقی مارینز دوو رۆژ دواتر گەیشت. لە بەرەبەیانی ٩ی نیساندا لە کۆبوونەوەی ئەنجومەنی ئاسایشی نیشتمانیدا، تۆمی فرانکس راپۆرتی ئەوەی گەیاند کە لەوانەیە پایتەخت لە ئان و ساتدا بروخێت. کۆبوونەوەی دواترم لەگەڵ سەرۆك (رودۆڵف شوستەر)ی سلۆڤاکیا بوو. دیموکراسییە ساواکەی، یەکێك لەو چل و هەست وڵاتەی کە پەیمانی پشتگیریی سەربازی یان لۆجستی دابوو لە عیراقدا، یەکەیەکی ناردبوو کە بۆ بەڕێوەبردنی کاریگەریی هێرشی چەکی کۆکوژ مەشقیان پێکرابوو.

سەرۆك شوستەر فرمێسك رژایە چاوەکانی کاتێك باسی شانازی وڵاتەکەی دەکرد لە یارمەتیدانی ئازادکردنی عیراقدا. من ئەو چرکەساتەم لە هۆشمدا هێشتەوە کاتێك گوێبیستی ئەوە دەبووم رەخنەگران دەڵێن ئەمریکا تاکلایەنە هەنگاوی ناوە. تۆمەتە ناڕەواکە هاوپەیمانانی ئێمەی بێ بەها دەکرد و منیان تووڕە دەکرد.

کاتێک کۆبوونەوەکە کۆتایی هات، دان بارتلێت پێی وتم پێویستە من سەیرێکی تەلەفزیۆن بکەم. من تەلەفزیۆنم لە ئۆفیسی ئۆڤال دانەنابوو، بۆیە من چوومە ئەو شوێنەی دەرەوە کە یاریدەدەرانی کەسیم دانیشتبوون. من بینیم کۆمەڵێک لە عیراقی لە گۆرەپانی فیردەوسی بەغدا هاواری خۆشییان دەکرد کاتێک ماشێنێکی مارینز پەیکەرێکی چل پێ درێژی سەدام دەهێننە خوارەوە.

بۆ ماوەی بیست رۆژ، من لێوانلێو بووم لە شڵەژان. ئێستا لێوانلێو بووم لە حەسانەوە و شانازی. هەروەها بەئاگاش بووم لە تەحەداکانی دواتر. هێزەکانی سەدام هێشتا چەند بەشێکی باکووری عیراقیان کۆنترۆڵ کردبوو، لەوانەش زێدەکەی (تکریت). چەند خانەیەکی بەرەنگاری لەلایەن شەرکەرانی دڵرەقی بەعسی ناسراو بە (فیدایی سەدام) هەبوون. سەدام و کورەکانیشی لە هەڵاتندا بوون. هەروەکو بە جۆرج ماریا ئەزنارم وت کاتێک ویستم هەواڵەکەی پێ بگەیەنم، "ئێمە نابینیت کە هیچ هەڵپەرینێکی سەرکەوتن ئەنجا بدەین".

***

دەبووایە من سۆراخی ئامۆژگاریی خۆم بکەم. تۆمی فرانکس هەستی کرد کە گرنگە پیشانی بدەیت قۆناغێکی نوێ لە جەنگ دەستی پێکردووە. وەکو رێگایەکی ئەنجامدانی ئەمە، من بریارمدا وتارێکی لەسەر کەشتیی (یو ئێس ئێس ئەبراهام لینکۆڵن) پێشکەش بکەم کە پاش دە مانگ لەسەر دەریا دەگەرایەوە بۆ وڵات. پێنج هەزار دەریاوان، ئەندامی هێزی ئاسمانی و مارینز لەسەر کەشتییەکە پشتگیرییان لە ئۆپەراسیۆنەکان کرد لە ئەفغانستان و عیراقیش.

لە ١ی مایسی ٢٠٠٣دا، من پاش ٣٠ ساڵ چوومە ناو فرۆکەیەکی سەربازیی. فرۆکەوانی هێزی دەریایی، (سکۆت زێڵەم) کە بە رەمزی بانگ کردنەکەی (زێد مان) ناسرابوو، لەبارەی رێوشوێنەکانی سەلامەتیی لە بنکەی ئاسمانیی هێزی دەریایی دوورگەی باکوور کرد لە سان دییگۆ. فەرماندە جۆن لوسیەر، فرۆکەوانێکی زیتەڵ بە سی ڤییەکی پراوپر لە چالاکیی نیشتنەوە لەسەر کەشتی، (ڤیکینگ ئێس-سری بی)یەکەی لە سەر زەوی هەستاند. لە ساتێک لە ساتەکاندا، ئەو کۆنترۆڵەکانی دایە دەست من و منیش بۆ ماوەی

چەند خولەکێك بەسەر ئۆقیانوسی هێمندا فڕیم. بەڵام پاش چەند جولەیەك، خۆم ئۆکێ کرد. فەرماندەکە بە شێوەیەکی ژیرانە کۆنترۆڵەکەی وەرگرتەوە لەکاتێکدا کە لە کەشتییە فڕۆکە هەڵگرەکە نزیك دەبووینەوە. ئەو فڕۆکەکەی بەسەرەو سەر پانتاییەکی ئاراستە کرد و نیشتەوە.

لەسەر کەشتیی (لینکۆڵن)، من چوومە لای ستاف نیشاندنەوە، بەلای شوێنگەی نیشتنەوە و هەستان دا پیاسەم کرد و لەگەڵ دەریاوان و مارینزەکاندا شتم خوارد. لە وتارەکەمدا وتم "هاوڵاتیانی ئەمریکیم، ئۆپەراسیۆنە جەنگییە گەورەکان لە عێراقدا کۆتاییان هاتووە...گواستنەوە لە دیکتاتۆریەتەوە بەرەو دیموکراسی کاتی دەوێ، بەڵام شایستەی هەر لە تەقەلایەکە. هێزەکانمان دەمێننەوە تا ئەو کاتەی کارەکەمان بە ئەنجام دەگات. پاشان ئێمە دەڕۆین و عێراقێکی ئازاد لە دوای خۆمانەوە جێ دەهێڵین".

من ئەو لافیتە گەورەیەم تێبینی نەکردبوو کە ستافەکەم لەسەر پردی کەشتییەکە هەڵیانواسیبوو، کە بۆ تەلەڤزیۆن دانرابوو. لێی نوسرابوو "ئەرکەکە بە ئەنجام گەیشت". ئەمە وەکو رێزێك بوو بۆ خەڵکی سەر کەشتییەکە کە تازە درێژترین ئەرکی لە پۆلی کەشتییە فڕۆکە هەڵگرە هاوشێوەکانی، تەواو ببوو. لەبری ئەمە، پێدەچوو من ئاماژە بە هەڵپەرکێی سەرکەوتنە بکەم کە من لەدژی هۆشداریم دابوو. "ئەرکەکە بە ئەنجام گەیشت" دواتر بوو بە رەخنەیەکی خێرا بۆ هەموو ئەو شتانەی کە دواتر لە عێراقدا بە نەخوازراو کەوتنەوە. وتارەکەم روونی کردەوە کە کارەکەمان دوورە لە تەواوبوونەوە. بەڵام هەموو روونکردنەوەکان لە جیهاندا نەیاندەتووانی بۆچوونەکە پێچەوانە بکەنەوە. نمایشەکەمان بەلارێداچوو. ئەمە گەورەترین هەڵە بوو.

***

بە رۆیشتنی سەدام لە دەسەڵات، ئامانجە ناوەندییەکەمان بوو بە یارمەتیدانی عێراقییەکان تا دیموکراسییەك بهێننە کایەوە کە بتوانێ خۆی بەرێوە ببات، خۆی پایەدار بکات، داکۆکی لەخۆی بکات و وەکو هاوپەیمانێك لە جەنگ دژی تیرۆر خزمەت بکات. ئامانجەکە تامەزرۆیی لە پشت بوو، بەڵام من گەشبین بووم. زۆرێك لەو شیمانە خەمناکانەی کە پێش جەنگ پلانمان بۆ دانابوو و لەبارەیانەوە نیگەران بووین، روویان

ئەدا. بەغدایەکی قەڵا نەهاتەکایەوە، کێڵگە ئەوتییە گەورەکان ئاگریان تێبەرنەبوو، لەبرسامردنی بەربڵاو نەهاتەکایەوە، کۆکوژیی مەدەنی لەسەر دەستی سەدام رووی نەدا، هێرشی چەکی کۆکوژ نەکرایە سەر سەربازەکانمان و هێرشی تیرۆریستیش نەکرایە سەر ئەمریکا یان هاوپەیمانەکانمان.

یەك شیمانەی گرنگ هەبوو کە ئێمە وەکو پێویست خۆمان بۆی ئامادە نەکردبوو. لە هەفتەکانی پاش ئازادکردندا، بەغدا چووەبووە ناو حاڵەتێکی بێ یاساییەوە. من تووشی شۆك بووم کە بینیم تاڵانچییەکان کەرەستەی بەهادار لە مۆزەخانەی نیشتمانیی عیراق دەهێننە دەرەوە و راپۆرتگەلێکم لەسەر رفاندن، کوشتن و لاقەکردن خوێندەوە. بەشێکی روونکردنەوەکە ئەوە بوو کە سەدام ماوەیەکی کورت پێش جەنگ، هەزاران تاوانکاری ئازاد کردبوو. بەڵام کێشەکە لەوە قوڵتر بوو. سەدام کاریگەری خستبووە سەر سایکۆلۆژیای عیراقییەکان بە جۆرێك کە ئێمە بە تەواوی تێنەدەگەیشتین. ئەو گومان و ترسەی کە ئەو سالانێك بوو دایدەچاند، سەری هەڵدەدا.

لە کۆبوونەوەیەکی ئەنجومەنی ئاسایشی نیشتمانیدا لە دواداوکانی نیسان پرسیارم کرد "ئەرێ ئەوە چی روودەدات؟ بۆ کەس ئەو تاڵانچییانە ناوەستێنێت؟"

وەڵامە کورتەکە ئەوە بوو کە هێزی مرۆیی لە بەغدا کەمە. کە رژێم رووخا، هێزی پۆلیسی عیراقی هەرەسی هێنابوو. سوپای عیراقی توابووەوە. بەهۆی بڕیارەکەی تورکیاوە، زۆرێك لەو سەربازانەی ئەمریکا کە بەغدایان ئازاد کردبوو، دەبووایە بەرەو باکوور برۆن بۆ ئازادکردنی پاشماوەی وڵات. ئەو زیانەی کە لەو رۆژانەی سەرەتادا کەوتەوە، کێشەگەلێك خولقاند کە بۆ چەند ساڵێکی تر درێژەی دەبوو. عیراقییەکان بۆ کەسێك دەگەڕان کە بیانپارێزێت. بە نەتوانینی پاراستنی عیراق، ئێمە یەکەم هەلمان بۆ پیشاندانی ئەمەی کە دەتوانین، لەدەستدا.

بۆشایی ئاسایشی هاوشان بوو لەگەڵ بۆشایی سیاسی. بڕیارمدا ناوی بەڕێوەبەرێکی ئەمریکی بهێنم بۆ دابینکردنی سیستەم لەکاتێکدا کە ئێش دەکەین بۆ بونیادنانی حکومەتێکی رەوا. بیرۆکەکە بوو بە دەسەڵاتی کاتیی هاوپەیمانان کە بە بڕیاری نەتەوە

یەکگرتووەکان مۆڵەتی پێدرا و لەلایەن ئەفسەرێکی دیاری خزمەتگوزاریی دەرەوە و شارەزای رووبەڕووبوونەوەی تیرۆر، بالیۆز (ئێل. پۆل جێری بریمەر) سەرکردایەتی کرا. جێری هەر لە سەرەتاوە کاری تێکردم. ئەو رێبەرێکی سەرسەخت بوو کە هەمان رای منی هەبوو لەبارەی ئەوەی کە عیراقییەکان توانای دیموکراسییان هەیە. ئەو دەیزانی کە کاتی پێویستە تا ئەوان دەستوورێك دەنووسنەوە و خۆیان بۆ هەڵبژاردنەکان ئامادە دەکەن. لە یەکێك لە یەکەم کۆبوونەوەکانماندا، پێی وتم کە توێژینەوەیەکی ئۆپەراسیۆنەکانی پاش جەنگی پێشووی خوێندووەتەوە و پێی وایە سەربازی زیاترمان بۆ عیراق پێویستە.

من پرسی زیادکردنی سەربازەکانمان لەگەڵ دۆن رەمسفێڵد و سەرکردایەتی سوپا باس کرد. ئەوان جەختیان کردەوە لەوەی کە بایی پێویستی لێیە. ئەوان چاوەڕوانیی گەیشتنی سەربازی زیاتریان کرد لە دۆستانی هاوپەیمانەوە و بڕوایان وابوو کە ئێمە دەتوانین بە خێرایی مەشق بە سوپایەکی عیراقی و هێزی پۆلیس بکەین. ئەوان بە هەمان شێوە نیگەران بوون لەمەڕ وروژانی ناسیۆنالیزمی عیراقی و کەوتنەوەی پشێوی بە دەرکەوتن لە بەرگی داگیرکردنی وڵاتدا.

من حوکمەکەی دۆن و سوپام قبوڵ کرد. ئەو ئاژاوە و توندوتیژییەی کە دەمانبینی ئاگادارکەرەوە بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا زوو بوو. بارودۆخەکە بیری یەکەم رۆژە قورسەکانی ئەفغانستانی خستمەوە. ئەوەم رەتکردەوە کە پێش ئەوەی دەرفەتی جێگیربوونی هەبێ، دەستبەرداری ببم.

بریمەر لە ١٢ی مایسی ٢٠٠٣دا گەیشتە عیراق. یەکێك لە یەکەمین ئەرکەکانی بریتی بوو لە پێکهێنانی ئەنجومەنێکی حوکمڕانیی عیراقی کە بەرپرسیارێتیی وەزارەتە سەرەکییەکان هەڵبگرێت و خۆی ئامادە بکات بۆ گەڕاندنەوەیەکی رەسمیی سەروەری. سۆراخکردنی سیاسەتی خێڵەکی، ئایینی و ئەتنیی عیراق ئاڵۆز بوو. بەڵام جێری و تیمەکەی کارێکی باڵایان ئەنجامدا. ئەنجومەنی حوکمڕانی لە مانگی تەمموزدا، واتە رێك چوار مانگ پاش ئازادکردن، دەسەڵاتی گرتە دەست. ئەنجومەنەکە بیست و پێنج عیراقی

لە باکگراوندە جیاجیاکان گرتبووەخۆ. عیراقییەکان هێشتا ڕێگەیەکی درێژیان لەبەردەمدا بوو، بەڵام ئەوان هەنگاوی یەکەمیان بەرەو حکومەتێکی نوێنەر نابوو.

پێکهێنانی ئەنجومەنی حوکمڕانی، ڕێگایەکی گرنگ بوو بۆ پیشاندانی ئەمەی کە دیکتاتۆریەتی سەدام بۆ تاهەتایە نەما. لەگەڵ هەبوونی ئەو بابەتە لە بیرکردنەوەیدا، جێری بە ماوەیەکی کەم پاش گەیشتنی بۆ بەغدا دوو فرمانی دەرکرد. یەکێکیان ڕاگەیاندنی ئەوە بوو کە چەند ئەنجامێکی دیاریکراوی حزبی بەعسی سەدام شیاو نابن بۆ کارکردن لە حکومەتی نوێی عیراقدا. ئەوەیتریان هەڵوەشاندنەوەی ڕەسمیی سوپای عیراق بوو کە هەر خۆی بەشێکی زۆر ون بوو.

لە هەندێ ڕووەوە، فرمانەکان نیشانەکانی خۆیان پێکا. کورد و شیعەی عیراق– زۆرینەی دانیشتووان– پێشوازییان کرد لە دابڕانی خاوێن لە سەدام. بەڵام فرمانەکان کاریگەرییەکی سایکۆلۆژییان هەبوو کە من پێشبینیم نەکردبوون. زۆرێک لە سوننەکان ئەمەیان وەکو ئاماژەیەك بینی کە شوێنیان لە عیراقی ئایندەدا نابێت. ئەمە بەتایبەت لە حاڵەتی سوپادا مەترسیدار بوو. تازە هەزاران چەکدار پێیان وترابوو کە ناویستڕێن. لەبری خۆناونوس کردن بۆ سوپای نوێ، زۆرێکیان دەستیان دایە یاخیبوون.

لەلایەکی ترەوە، دەبووایە مشتومڕی زیاترم لەسەر فرمانەکانی جێری بکردایە، بەتایبەت لەسەر ئەوەی کە هەڵوەشاندنەوەی سوپا چ پەیامێك دەگەیەنێت و ریشەکێشکردنی بەعس چەند سوننی دەگرێتەوە. بەو شێوەیەی کە لەلایەن ئەحمە چەلەبیی ئاوارەی لەمێژینەی تاراوگە تێبینی کرابوو، پرۆگرامی ریشەکێشکردن زۆر لەوە قووڵتر ڕامالینی دەبوو کە بیرمان لێکردبووەوە، لەوانەش ئەندامانی ئاستی ناوەڕاستی وەکو مامۆستایان. شیاو بوو کە ئێمە هەرچۆنێك بێت هەنوکە فرمانەکانمان دەرکردبوو. ئەمانە بانگەوازی لێبڕاوانە بوون و هەر ئەلتەرناتیڤێك رستێك کێشەی جیاجیای دەنایەوە. ئەگەر شیعە گەیشتبایە ئەو ئەنجامەی کە ئێمە جددی نین لەبارەی کۆتایی هێنان بە سەردەمی حزبی بەعس، لەوانەیە لە هاوپەیمانان هەڵگەڕانایەتەوە، ئامانجی دیموکراسییەکی عیراقیی یەکگرتوویان ڕەت بکردایەتەوە و لەگەڵ ئێراندا خۆیان

یەکبخستایە. ئەستەم بوو بە دڵنیاییەوە بزانیت چی روو ئەدا، بەڵام مشتومڕەکە باشتر ئێمەی ئامادە دەکرد بۆئەوەی کە دواتر ئەهات.

***

بە درێژایی هاوین بارودۆخی ئاسایش روو لەخراپبوون بوو. عێراق دەبووە موگناتیسێک بۆ توندڕەوان- یاخیبووانی بەعسی، فیدائیییانی سەدام، تیرۆریستانی دەرەکیی سەر بە قاعیدە و دواتر شیعەی میلیشیا و بکەرانی ئێرانی. ئەو گروپانە ئایدۆلۆژیای جیاوازیان هەبوو، بەڵام لە ئامانجێکی راستەوخۆدا هاوبەش بوون: دەرکردنی ئەمریکا لە عێراق. ئەوان دەیانزانی کە قەت ناتوانن لە شەڕی راستەوخۆدا لە سەربازەکانمان ببەنەوە، بۆیە ئەوان بۆمب قەراغ رێگەیان بەکاردەهێنا و هێرشیان دەکردە سەر ئامانجە ناسەربازییەکانی وەکو باڵیۆزخانەی ئوردن و دامەزراوەکانی یوئێن لە بەغدا. تاکتیکێکی تر رفاندنی کارمەندانی ئاوەدانکردنەوە بوو و کوشتنیان بوو لە دیمەنی ڤیدیۆیی سەر ئینتەرنێتدا. ستراتیژییەکەیان بریتی بوو لە پیشاندانی وێنەی عێراق بەشێوەی بێ هیوا و سەرنەکەوتوو، کە رای گشتی ئەمریکای لەدژی جەنگ دەجوڵاند و فشاری دەخستە سەر ئێمە پاشەکشە بکەین هەروەکو لە ڤێتنام.

تا رادەیەک، ئەوان سەرکەوتوو بوون. بۆ ئەمریکییەکی ئاسایی قورس بوو جیاوازی بکات لەنێوان تیرۆریستێکی نامۆ و ئەو ملیۆنان عێراقییە ئاساییەی کە سوپاسگوزاری ئازادکردن بوون. ئێمە هەوڵماندا هەواڵە خۆشەکان بڵاو بکەینەوە-ئارامیی رێژەیی لە باکووری کوردی و باشووری شیعی، بونیادنانەوەی قوتابخانەکان و نەخۆشخانەکان و مەشقپێکردنی سوپای عێراقیی نوێ. بەڵام لە چاوی میدیاکاندا-و بۆیە لە چاوی گشتیدا- هیچ کام لەو بەرەوپێشچوونە هێمنانە نەیدەتووانی لەگەڵ تەقاندنەوەکان و سەربڕینەکاندا پێشبڕکێ بکات.

لە سەرەتاکانی تەموزدا، ریپۆرتەرێک لەبارەی هێرشەکانی سەر سەربازەکانمان پرسیاری لێکردم. وتم "هەندێ کەس هەن پێیان وایە کە ئەگەر هێرش بکەنە سەرمان ئەوا لەوانەیە ئێمە لە ناوەختدا بڕیاری رۆیشتن بدەین...وەڵامی من ئەمەیە: چیتان لەدەست دێ بیکەن."

هەر کاتێک کە لەبارەی عیراقەوە دوابێتم، خەڵکێکی جیاجیا گوێیان گرتووە، کە هەریەکەیان روانگەیەکی جیاوازی هەبووە. بە شێوەیەکی تایبەت چوار جۆرم بەبیردا دێن. یەکەم جۆر گەلی ئەمریکایە. پشتگیرییان جەوهەری بوو بۆ تەمویلکردن و بەشداریکردنی جەنگ. بڕوام وایە کە زۆربەی ئەمریکییەکان دەیانویست لە جەنگەکەدا سەرکەوتوو بین. بەڵام ئەگەر باجەکە زۆر قورس دیار بووبێت یان سەرکەوتن زۆر دوور بووبێت، ئەوا ماندوو بوون. گرنگ بوو بۆ من کە پێداگری بکەم لە گرنگیی قەزیەکە و سووربوونمان لەسەر سەرکەوتن.

دووەم جۆر سەربازەکانمان بوون. ئەوان بە خۆبەخشی خزمەتیان دەکرد و دوور لە ماڵەوە گیانی خۆیان دەخستە مەترسییەوە. پێویست بوو ئەوان خێزانەکانیان بزانن کە بڕوام پێیان هەیە، بە پایەدارییەوە لە پشت ئەرکەکانیانەوە وەستاوم و لەسەر بنەمای سیاسەت بڕیاری سەربازی نادەم.

سێیەم جۆر گەلی عیراق بوون. هەندێکیان دەیانویست بڕۆین، بەڵام دڵنیابووم لەوەی کە زۆرینەیەکی گەورەی عیراقییەکان دەیانویست تا کاتی پێویست بمێنینەوە بۆ هاوکار بوون لە هێنانەکایەی کۆمەڵگەیەکی دیموکراتیدا. گرنگ بوو کە سووربوونی خۆم لەسەر تەواوکردنی ئەو کارەی دەستمان پێکردووە بگەیەنم. ئەگەر عیراقییەکان گومانی ئەوەیان لادروستبووایە کە بەنیازین دەستبەرداریان بین، ئەوا روویان دەکردە سەرچاوەی پارێزگاریی تر. دوایین جۆری گوێگر، دوژمن بوو. ئەوان بڕوایان وابوو کە کرداری درندەییان دەتوانێ کار بکاتەسەر بڕیارەکانمان. دەبووایە جەخت بکەمەوە لەوەی کە هەرگیز ناتوانن.

دەربڕینی "چیتان لەدەست دێ بیکەن"ەکەم بۆ پیشاندانی بڕوابوون بوو بە سەربازەکانمان و ئاماژەدان بوو بەوەی کە دوژمن قەت ناتوانێ ئیرادەمان بلەقێنێت. بەڵام زیانی رەخنە پیشانیدا کە من بۆچوونێکی چەوتم لەلای گوێگرانی تر جێهێشتووە. من لە ئەزموونەکەوە فێر بووم و لە ساڵانی ئایندەدا لە نزیکەوە ئاگاداری ئەوە بووم کە چۆن موخاتەبەی هەر کام لە جۆرەکانی گوێگر دەکەم.

***

بە هاتنی پاییزی ۲۰۰۲، هاوپەیمانی نێودەوڵەتی لە عیراقدا پێکهاتبوو لە هێزە زەمینییەکانی سێ وڵات، لەوانەش دوو فیرقەی فرەنەتەوەی سەرکردایەتیکراو لەلایەن بریتانیا و پۆڵەندە و پشتگیریی لۆجستیی زۆرێکی تر. هێزەکانی هاوپەیمانان ژوورەکانی ئەشکەنجەدان، ژوورەکانی لاقەکردن و گۆڕی بەکۆمەڵی لەخۆگری هەزاران لاشەیان دۆزیبووەوە. ئەوان دامەزراوەکیان دۆزیبووەوە کە جلی پارێزەری حاڵەتی ئامادەباشی و سرنج بە دژەژەهرەوە بۆ ئامرازی گازی ئەعسابی تێدابوو. بەڵام ئەوان زەخیرەی چەکی بایۆلۆژی و کیمیاییان نەدۆزیبووەوە کە تەقریبەن هەر ئاژانسێکی گەورەی هەواڵگری لە جیهاندا بڕوای وابوو سەدام هەیەتی.

کاتێک سەدام چەکی کۆکوژی لەدژی سەربازەکانمان بەکارنەهێنا، من ئاسودە بووم. کاتێک زوو پاش ڕووخانی بەغدا زەخیرەکەمان نەدۆزییەوە، تووشی سەرسوڕمان بووم. کاتێک تەواوی هاوینەکە بەبێ دۆزینەوەی هیچ تێپەڕی، شڵەژام. گروپەکانی ڕاگەیاندن بە بەردەوامی پرسیارەکەیان دەوروژاند، "کوا چەکە کۆکوژەکان؟" منیش هەمان پرسیارم هەبوو. سوپا و تیمەکانی هەواڵگری دڵنیایان کردمەوە کە لە گەڕان بەردەوام دەبن. ئەوان ئەو شوێنگە شاراوانەیان پشکنی کە سەدام لە ماوەی جەنگی کەنداو دا بەکاری هێنابوون. ئەوان هەواڵگرییان کۆکردەوە و نیشانەکانیان بەسەر دەکردەوە. لە ساتێک لە ساتەکاندا، سی.ئای.ئەی بیستبووی کە لەسەر پردێکی ڕووباری فوراتەوە قوتووی گەورە گەورە تێبینی کراون. غەواسەکانی هێزی دەریایی خۆیان گەیاندبووە شوێنەکە. هیچیان نەدۆزیبووەوە. کاربەدەستێکی پایەبەرزی ئیمارات چەند هێڵکارییەکی ئەو تونێلانەی پیشاندا کە بڕوای وابوو سەدام بەکاری هێناوە بۆ شاردنەوەی چەکەکان. ئێمە زەویمان هەڵکۆڵی. هیچ شتێک پەیدا نەبوو.

جۆرج تێنێت (دەیڤد کەی) کە ساڵی ۱۹۹۱ لە عیراق سەرۆکی پشکنەرانی یوئێن بوو بۆ چەک، ڕاسپارد کە سەرۆکایەتی تیمێکی پشکنینی نوێ بکات. کەی گەڕانێکی سەراپاگیری لە عیراقدا ئەنجامدا و بەڵگەی پوچەڵنەکراوەی دۆزییەوە لەمەڕ ئەوەی کە سەدام درۆی لەگەڵ جیهاندا کردووە و بڕیاری ۱٤٤١ی پێشێل کردووە. ئەو لە ئۆکتۆبەری ۲۰۰۳دا بە کۆنگرێسی وت "پرۆگرامەکانی چەکی کۆکوژی عیراق، زیاتر لە دوو دەیە

بەردەوام بووە کە هەزاران کەس تیایدا کاری کردووە، ملیاردەها دۆلاری بۆ تەرخان کراوە و بە وریاییەوە لەلایەن ئۆپەراسیۆنەکانی ئاسایش و فریودان پەردەپۆش کراوە کە تەنانەت لەودیو کۆتایی ئۆپەراسیۆنی ئازادکردنی عیراقەوە بەردەوامی هەبووە". بەڵام شتێك هەبوو کە کەی نەیدۆزیبووەوە: ئەو زەخیرەیەی چەکی ناوکی کە هەمووان چاوەڕێی بوون.

ئەوەی کە مابووەوە، دەستەواژەیەکی نوێی دا بەدەستەوە: "بوش درۆی کرد، خەڵك مرد". تۆمەتەکە نالۆژیکی بوو. ئەگەر بمویستایە وڵات بەرەو جەنگ گومڕا بکەم، بۆچی من تۆمەتێکم دادەتاشی کە بە ماوەیەکی کورت پاش داگیرکردنی وڵاتەکە پوچەڵ دەکرایەوە؟ هەروەها ئەو تۆمەتەی خرابووە پاڵم درۆزنانە بوو. ئەندامانی ئیدارەی پێشوو، جۆن کێری، جۆن ئێدواردز و زۆرینەیەکی گەورەی کۆنگرێس هەموویان هەمان ئەو هەواڵگرییەیان خوێندبووەوە کە گەیشتبووە ئەو ئەنجامەی عیراق چەکی کۆکوژی هەیە. بە هەمان شێوە ئاژانسە هەواڵگرییەکانی سەرانسەری جیهانیش. کەس درۆی نەدەکرد. ئێمە هەموومان بەهەڵەداچووبووین. نەبوونی زەخیرەی چەکی کۆکوژ ئەو ڕاستییەی نەگۆڕی کە سەدام هەڕەشەیە. لە کانوونی دووەمی ٢٠٠٤دا، کەی وتی :" شتێکی بەجێیە کە بگەینە ئەو ئەنجامەی کە عیراق هەڕەشەیەکی گەورەی خستبووە ڕوو...ئەوەی کە لە ماوەی پشکنینەکەدا بۆمان دەرکەوت، عیراقی کردە شوێنێکی مەترسیدارتر لەوەی تەنانەت پێش جەنگ بیرمان لێ کردبووەوە".

لەگەڵ ئەوەشدا، دەزانم کە نەتوانینی دۆزینەوەی چەکی کۆکوژ بۆچووی گشتی لەمەڕ جەنگ وەردەچەرخێنێت. هەڵبەت لەکاتێکدا کە بە ڕۆیشتنی سەدام جیهان سەلامەتترە، واقعیەتەکە ئەوە بوو کە من بەشێوەیەکی سەرەکی لەسەر بنەمای ئەو هەواڵگرییەی کە هەڵە دەرچوو سەربازی ئەمریکیم ڕەوانەی شەڕ کردبوو. ئەمە زەبرێکی گەورە بوو لە متمانەمان-متمانە بە من- کە بڕوابەخۆبوونی گەلی ئەمریکای دەهێنایە لەرزە. کاتێك چەکەکانمان نەدۆزییەوە کەس ئەوەندەی من تووشی شۆك و تورە نەبوو. هەر کاتێك کە بیرم لێ دەکردەوە هەستم بە هێلنجدان دەکرد. هێشتاش هەروام.

***

لەکاتێکدا کە شەڕ لە عێراقدا زۆر لەوە قورستر بوو کە پێشبینیم کردبوو، هەرگەشبین بووم. من کارتێکراو بووم بە بوێریی ئەو سەد هەزار عێراقییەی بە خۆبەخشی چوونەپاڵ هێزەکانی ئاسایشیان، بەو سەرکردانەی کە شوێنی ئەندامانی تیرۆرکراوی ئەنجومەنی حوکمڕانییان گرتەوە و بەو خەڵکە ئاسایییەش کە ئاواتەخوازی ئازادی بوون.

هیچ شتێك ئەوەندەی سەربازەکانمان بڕوابەخۆبوونی پێ نەبەخشیم. لەسایەی ئەوان، زۆربەی ئەندامانی باڵای ڕژێمی سەدام تاوەکو کۆتایی ۲۰۰۳ یان گیران یان کوژران. لە مانگی تەموزدا، تێبینییەکی هەواڵگریمان پێ گەیشت کە دوو کوڕەکەی سەدام لە ناوچەکی موسڵی باکووری عێراقن. شانبەشانی هێزە تایبەتەکان، سەربازانی ۱۰۱ی ئاسمانی لە ژێر فەرماندەیی ژەنەراڵ دەیڤد پێترایۆس گەمارۆی ئەو بینایەیاندا کە دوو کوڕەکانی سەدامی (عودەی و قوسەی) تێدا بوون. عودەی و قوسەی خۆیان شاردبووەوە. پاش شەش سەعات شەڕە تەقە، هەردووکیان کوژران. دواتر هەواڵگریمان پێگەیشتبوو کە سەدام فرمانی کوشتنی باربارا و جێنای دابوو لە بەرانبەر کوژرانی دوو کوڕەکەی.

دوو ڕۆژ پاش هەرەسی بەغدا، من و لۆرا سەردانی سەنتەری پزیشکیی سەربازیی (والتەر رید)مان کرد. ئێمە چاومان کەوت بە نزیکەی سەد ئەندامی برینداری سوپا و خێزانەکانیان. هەندێکیان لە ئەفغانستان و زۆرێکیان لە عێراق بیبوون. ئەمە ئەزموونێکی ناخۆش بوو کە بڕوانیتە پێخەفەکانی نەخۆشخانەیەك و دەرەنجامەکانی ڕەوانەکردنی ئەمریکییەکان بۆ شەڕ ببینیت. ئاسودەبەخشییەك ئەوە بوو کە دەمزانی چاودێرییەکی پزیشکیی بێ وێنە لەلایەن شارەزایانی بەسۆزی سیستەمی چاودێریی تەندروستیی سەربازی وەردەگرن.

لە والتەر رید، چاوم کەوت بە ئەندامێکی تیمی دێلتا، کە یەکێکە لە یەکە دەستبەژێرەکانی هێزە تایبەتەکانمان. لەبەر هۆکاری نهێنیپارێزی، ناتوانم ناوی بێنم. ئەو نیوەی بەشی خوارەوەی قاچی لەدەستدابوو. لەکاتێکدا کە تەوقەم لەگەڵ دەکرد وتم "ستایشی خزمەتەکەت دەکەم. بەداخم کە زیانت پێگەیشتووە". لە وەڵامدا وتی "خەم

مەخۆ بۆ من جەنابی سەرۆك. تەنیا قاچێکی ترم بدەرێ بۆ ئەوەی بتوانم جارێکی تر بگەڕێمەوە بۆ ئەوێ".

لە سەنتەری پزیشکیی هێزی دەریایی نیشتمانی، مارینزێکی تەمەن چل و دوو ساڵم بینی بەناوی عەریف (گوادالوپێ دێنۆگیەن). ئەو بەری چەند هەفتەیەك بریندار ببوو، کاتێك ئاربیجییەك بە ئۆتۆمبێلەکەی کەوتبوو. تەقینەوەکە بەشێکی کەللەسەر و دەستی راستی بردبوو، ساچمە چووبووە ناو بەشی سەرەوەی پشت و قاچەکانی و پەردەی گوێی دڕاندبوو.

کاتێك پرسیارم کرد ئاخۆ هیچ داواکارییەکی هەیە، گوادالوپێ وتی دووانی هەیە. داوای پلەبەرزکردنەوەی ئەو عەریفەی کرد کە گیانی رزگار کردبوو. هەروەها داواشی کرد کە ببێتە هاوڵاتییەکی ئەمریکی. پاش ١١ی سێپتێمبەر فرمانێکی تەنفیزیم دەرکردبوو بۆ شیاویی دەستبەجێ بەهاوڵاتیکردنی هەر کەسێکی بیانی کە لە سوپادا خزمەت بکات.

گوادالوپێ ئەو کاتەی کە لە مەکسیکەوە بۆ ئەمریکا هاتبوو منداڵ بوو. ئەو میوەی لێدەکردەوە بۆ یارمەتیدانی خێزانەکەی بۆئەوەی بژێوییەکیان دەست بکەوێ تا ئەو کاتەی کە لە تەمەنی حەڤدە ساڵیدا چووبووە پاڵ سوپا. پاش خزمەتکردنی بۆ ماوەی بیست و پێنج ساڵ- و ئامادەبوون لە دوو جەنگی عیراقدا- ویستبووی ئاڵای سەر جلە سەربازییەکانی ببێ بە هی خۆی. ئەو رۆژە لە نەخۆشخانە، من و لۆرا ئامادەی رێوڕەسمی بەهاوڵاتیبوونەکەی بووین کە لەلایەن بەڕێوەبەری مەکتەبی خزمەتگوزاریی هاوڵاتیبون و کۆچبەران بەڕێوە چوو. گوادالوپێ دەستی راستی بەرز کردەوە کە بە لەفاف پێچرابوو و سوێندی هاوڵاتیبوونی خوارد.

چەند ساتێك دواتر، مارینز (ئۆ جەی سانتاماریا) هات کە خەڵکی فلیپین بوو. ئەو تەمەنی بیست و یەك ساڵ بوو و لە عیراق بە سەختی بریندار ببوو. ئەو لە پرۆسەی ئاڵوگۆڕی خوێنی جەستەیدا بوو. لە نیوەی رێوڕەسمەکەدا دەستی کرد بە گریان. ئەو تاوەکو کۆتایی رێوڕەسمەکە هێزی هێنایەبەر خۆی. من مایەی شانازیم بوو کە وەڵام بدەمەوە "هاوڵاتییە ئەمریکییەکەم".

***

لە پاییزی ٢٠٠٣دا، ئاندی کارد بە بیرۆکەیەکەوە هاتە لام. ئایا ئارەزوومەندم کە گەشتێك بۆ عیراق ئەنجام بدەم بۆ سوپاسکردنی سەربازەکان؟ بێگومان بەڵێ.
مەترسییەکە گەورە بوو. بەڵام جێگری سەرۆکی ستاف (هۆو هاگن) بە کارکردن لەگەڵ دەزگای نهێنی و ئۆفیسی سەربازیی کۆشکی سپی، ڕێگای سەرخستنی داڕشت. هەفتەی (سوپاسگوزاری)یەکە سەفەرم کرد بۆ کراوفۆرد و بە راگەیاندنەکانم وت کە تەواوی پشووەکە لەوێ دەمێنمەوە. پاشان، شەوی چوارشەممە لە کێڵگەکە هاتمە دەرەوە و بۆ بەغدا فڕیم.
چەند هەفتەیەك پێش سەفەرەکە بە لۆرام وت. ئەو دڵنیا بووەوە کە وتم ئەگەر هەواڵەکە دزە بکات ئەوا سەفەرەکە هەڵدەوەشێنمەوە. نزیکەی سی خولەك پێش ئەوەی گەشتەکە ئەنجام بدەم بە باربارا و جێنام وت. باربارا وت "باوکە دەترسم. بە سەلامەتی بگەڕێرەوە ماڵەوە".
من و کۆندی ڕۆیشتینە ناوچەیەکی نیمچە دانیشتووان، کڵاوی بەیسبۆڵەکەمان نزم کردبووەوە و بەرەو فڕۆکەخانە هەنگاومان نا. بە مەبەستی نهێنیپارێزی، هیچ کاروانێکی ئۆتۆمبێل نەبوو. تەقریبەن بیرم چووبووەوە کە قەرەباڵغی هاتوچۆ چۆنە بەڵام ڕۆژی پێش سوپاسگوزاری، یادەوەرییەکان زیندوو بوونەوە. ئێمە بە هێواشی بەرەوپێش چووین، بەلای ئۆتۆمبێلێکدا جارانی پێشوودا رەت بووین کە پڕبوو لە کارمەندی دژەهێرش و لەکاتی خۆیدا گەیشتینە هێزی ئاسمانیی یەك. هاوکاتبوون گرنگ بوو. پێویست بوو لەکاتی خۆرئاوابوونی بەغدا بنیشینەوە.
ئێمە لە تەکساسەوە بەرەو بنکەی هێزی ئاسمانیی ئەندروز فڕین کە لەوێ سواری وێنەیەکی دووانەی هێزی ئاسمانیی یەك بووین و بەرەو عیراق فڕین. فڕۆکەکە ستافێکی بچوك، کارمەندانی دەزگای نهێنی و سوپا و گروپێکی راگەیاندن کە سوێندی نهێنیپارێزی خواردبوو، هەڵگرتبوو. من لە گەشتە دە سەعات و نیویەکەدا کەمێك خەوتم. هەر کە نزیکی بەغدا بووینەوە، ئاوێکم کرد بە خۆما، ریشم تاشی و بەرەو بەشی فڕۆکەوانەکان چووم بۆئەوەی نیشتنەوەکە ببینم. کۆلۆنێل مارك تیلمان دەستی گرت بەسەر

کۆنترۆڵەکاندا. من بە تەواوی متمانەم پێی هەبوو. هەروەکو زۆرجار لۆرا دەیگوت "ئەو مارکە بە دڵنیاییەوە دەتوانێت ئەم فڕۆکەیە بنیشێنێتەوە".

لە سەروەختی خۆرئاوابوون لە ئاسۆوە، دەمتووانی منارەکانی بەغدا لە دوورەوە بەدی بکەم. شارەکە لەسەرەوەڕا زۆر هێمن دیار بوو. بەڵام ئێمە لە خەمی موشەکە زەمین بۆ ئاسمانەکان بووین لەسەر زەوی. لەکاتێکدا کە جۆ هاگن ئێمە دڵنیاکردەوە لەوەی کە سوپا پشتێنەیەکی فراوانی دەوروبەری فڕۆکەخانەی نێودەوڵەتیی بەغدای سەلامەت ڕاگرتووە، میزاجی ناو فڕۆکەکە شڵەژاو بوو. کاتێک بە شێوەی سپرینگی نیشتینەوە، هەندێ لە ئەندامانی ستاف چوونە لای یەکتر بۆ نزای بەکۆمەڵ. لەدوایین ساتدا کۆلۆنێل تیلمان فڕۆکەکەی ڕێك کرد و ڕاڕەوەکەی ماچ کرد، شایەنی نەبوو.

ئەوانەی کە لە فڕۆکەخانە چاوەڕێیان دەکردم جێری بریمەر و ژەنەراڵ ریکاردۆ سانشێزی فەرماندەی باڵای زەمینی بوون لە عیراق. جێری وتی "بەخێر بێیت بۆ عیراقێکی ئازاد".

ئێمە چووینە هۆڵی نانی خواردنی سوپا، کە تیایدا شەش سەد سەرباز کۆببوونەوە بۆ ژەمی سوپاسگوزاری. وادانرابوو کە جێری میوانی شەرەف بێت. ئەو بە سەربازەکانی وت کە پەیامێکی ڕۆژی پشووی لە سەرۆکەوە پێیە. وتی "با بزانین لێرە کێ لە هەمووان گەورەترە..."

ئەم درامایە هی من بوو. من لە پشت پەردەیەکەوە هاتمە سەر سەکۆی هۆڵێکی پڕاوپڕ. زۆرێك لە سەربازانی سەرسوڕماو بۆ چرکەساتێك واقیان وڕما، پاشان دەستیان کرد بە وپس و هوها. هەندێکیان فرمێسك بە چاویاندا دەهاتە خوار. من بەو هەستە تەواو کارتێکراو بووم. ئەمانە هەر ئەو ڕۆحانە بوون کە ڕێك پێش هەشت مانگ بە فرمانی من عیراقیان ئازاد کردبوو. زۆرێکیان شەڕیان بینیبوو. هەندێکیان مردنی هاوڕێکانیان بینیبوو. من هەناسەیەکی قووڵم هەڵکێشا و وتم، "لەبری ئەمریکا پەیامێکم پێیە. سوپاستان دەکەین لە بەرانبەر خزمەتی گەورەتاندا، ئێمە شانازیتان پێوە دەکەین و ئەمریکا بە پایەدارییەوە لە پشت ئێوە وەستاوە".

پاش ونارەکە، نانی ئێوارەم لەگەڵ سەربازەکان خوارد و چوومە ژوورێکی تەنیشت بۆ بینینی چوار ئەندامی ئەنجومەنی حوکمڕانی، پارێزگاری بەغدا و چەند ئەندامێکی ئەنجومەنی شار. ژنێک، کە بەڕێوەبەری نەخۆشخانەیەکی دایکان بوو، پێی وتم کە ژنان بە بەراورد بە سەردەمی ژێر دەسەڵاتی سەدام چەندە دەرفەتیان هەیە. دەمزانی کە عیراق هێشتا ڕووبەڕووی کێشەی گەورە دەبێتەوە، بەڵام گەشتەکەم جەختکردنەوەیەک بوو لە باوەڕم بەوەی کە دەکرێ کۆنترۆڵ بکرێن.

بەشی هەرە ترسناک فڕینەوە بوو لە بەغداوە. پێیان وتین کە هەموو لایتەکان بکوژێنینەوە و تەلەفۆنەکانمان بە تەواوی بێدەنگ بکەین تا ئەو کاتەی کە دە هەزار پێ بەرز دەبینەوە. من هێشتا لە حاڵەتێکی سۆزیی بەرزدا بووم. بەڵام خۆشیی چرکەساتەکە، هەستێکی نامۆی ناجێگیری شوێنی گرتەوە کاتێک ئێمە ئەرزەکەمان جێ هێشت و بە هێمنییەوە بەناو شەوەکەدا بەرزبووینەوە.

پاش چەند خولەکێکی پڕفشار، ئێمە گەیشتینە بەرزاییەکی سەلامەت. من بانگی کارمەندێکی بەدالەی ناو فڕۆکەکەم کرد و پێیم وت لۆرام بۆ وەرگرێت. پرسیاری کرد "ئەوە لە کوێیت؟" وتم "لە ڕێگام بەرەو ماڵەوە. بە کچەکان بڵێ هەموو شتێ باشە".

پێدەچوو ئاهی هاتبێتەوە بەر. پێدەچوو کەمێک لەبارەی کاتەکانەوە سەری لێ شێوابێت. بیری نەدەهاتەوە کە ئاخۆ وتوومە سەعات ١٠ی بەیانی لە ئاسمان دەبم یان لە نیوەڕۆدا. لە ١٠:١٥ دا تەلەفۆنی بۆ کارمەندێکی دەزگای نهێنی کردبوو لە کێلگەکە و پرسیاری لێکردبوو ئاخۆ هیچ هەواڵی سەرۆک بوشی لایە. کارمەندەکە وتبووی با تەئکید بکەمەوە. چەند چرکەیەک دواتر وەڵامی دابووەوە "بەڵێ خانمەکەم. ئەوان نەوەد خولەک دوورن".

ئەو بۆی دەرکەوتبوو کە کارمەندەکە مەبەستی دایك و باوکمە کە لە ڕێگەدابوون بۆ بەسەربردنی (سوپاسگوزاری) لەگەڵ ئێمەدا. وتبووی "نا مەبەستم جۆرجی خۆمە". کارمەندەکە هەڵوەستەیەکی کردبوو و وتبووی "لە ڕاستیدا خانم ئەو لە خانووی کێلگەکەدایە". نهێنیپارێزی ئەوەندە توند بوو کە کارمەندانی ناو کیلگەکە هێشتا ئاگاداری ئەوە نەبوون کە من بۆ خۆشترین گەشتی سەرۆکایەتییەکەم دەرچووبووم.

***

له شه‌ممه، ١٣ی سێپتێمبه‌ردا، دۆن ره‌مسفێڵد ته‌له‌فۆنی کرد. ئه‌و تازه قسه‌ی له‌گه‌ڵ ژنه‌راڵ (جۆن ئه‌بی زه‌ید) کردبوو که شوێنی تۆمی فرانکسی گرتبووه‌وه پاش خانه‌نشینبوونی له مانگی ته‌موزدا. جۆن ژه‌نه‌راڵێکی لوبنانیی ئه‌مریکیی هۆشمه‌ند بوو که ده‌یتووانی به عه‌ره‌بی قسه بکات و له خۆرهه‌ڵاتی ناوه‌ڕاست تێده‌گه‌یشت. جۆن بڕوای وابوو که سه‌دام حسێنمان ده‌ستگیر کردووه. پێش ئه‌وه‌ی ئه‌مه به جیهان رابگه‌یه‌نین، ده‌بووایه ١٠٠٪ دڵنیا بین.

به‌یانیی دواتر، کۆندی ته‌له‌فۆنی کرده‌وه بۆ پشتڕاستکردنه‌وه‌ی هه‌واڵه‌که. ئه‌وه سه‌دام بوو. تاتۆیه‌کانی –سێ خاڵی شین له نێوان مه‌چه‌ك و ده‌ستیدا که ره‌مزی خێڵه‌که‌ی بوو– به‌ڵگه‌ی حاشاهه‌ڵنه‌گری دا به‌ده‌سته‌وه. من دڵخۆش بووم. گرتنی سه‌دام هانده‌رێکی گه‌وره ده‌بێ بۆ سه‌ربازه‌کانمان و گه‌لی ئه‌مریکا. هه‌روه‌ها جیاوازییه‌کی سایکۆلۆژیی بۆ عیراقییه‌کان دروست ده‌کات، که زۆرێکیان پێیان وابوو ده‌گه‌ڕێته‌وه. ئێستا روون بوو: سه‌رده‌می دیکتاتۆر بۆ تاهه‌تایه به‌سه‌رچووبوو.

چه‌ند مانگێك دواتر، چوار پیاو هاتن له کۆشکی سپی بمبینن. ئه‌وان ئه‌ندامانی تیمی دێلتا بوون که سه‌دامیان گرتبوو. ئه‌وان چیرۆکی گرتنه‌که‌یان گێڕایه‌وه. هه‌واڵگریی به‌ره‌و کێڵگه‌یه‌کی نزیك زێدی سه‌دام (تکریت) رێنماییان کردبوون. که سه‌ربازه‌کان به‌سه‌ر ئه‌رزه‌که‌دا گه‌ڕابوون، یه‌کێکیان کونێکی دۆزیبووه‌وه. ئه‌و بازی دابووه ناوه‌وه و پیاوێکی په‌ڕپوتی توڕه‌ی راکێشابووه ده‌ره‌وه.

پیاوه‌که وتبووی "من ناوم سه‌دام حسێنه. من سه‌رۆکی عیراقم و ده‌مه‌وێ دانوستان بکه‌م".

سه‌ربازه‌که وتبووی "سه‌رۆك بوش سڵاوی هه‌یه".

سه‌دام سێ پارچه چه‌کی پێبوو، له‌وانه‌ش ده‌مانچه‌یه‌ك که پیاوه‌کان له سندوقێکی شوشه‌دا دایانه ده‌ستم. پێیم وتن که من دیارییه‌که له ژووری توێژینه‌وه‌ی تایبه‌تی ئۆفیسی ئۆڤاڵ ده‌خه‌مه‌ڕوو و رۆژێکیش له کتێبخانه‌ی سه‌رۆکایه‌تیمدا. ده‌مانچه‌که هه‌میشه ئه‌وه‌ی بیر ده‌خسته‌مه‌وه که دیکتاتۆرێکی زۆردار که به‌پرس بوو له مه‌رگ و

ئێشێکی زۆر، بە سەربازەکانی ئێمە دەورە درا لەکاتێکدا کە خۆی لە کونێکدا گرمۆڵە کردبوو.

لەکاتێکدا کە من ئەم بیرۆکانە تۆمار دەکەم، زیاتر لە حەوت ساڵ تێپەڕیووە بەسەر ئازادکردنی عیراق لەلایەن سەربازانی ئەمریکییەوە، من بە تەواوی بڕوام وایە کە لابردنی سەدام لەسەر حوکم بڕیارێکی دروست بوو. بە هەموو ئەو تەگەرانەش کە دوایی پەیدابوون، ئەمریکا بەبێ دیکتاتۆرێکی بکوژ کە سۆراخی چەکی کۆکوژ و لە چەقی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا پشتگیریی تیرۆری دەکرد، سەلامەتترە. ناوچەکە بە دیموکراسییەکی ساوا ئومێدەوارترە کە دەبێتە نموونەیەک بۆ ئەوانەی کە دواتریش دێن. خەڵکی عیراقیش حاڵی لەگەڵ حکومەتێکدا باشترە کە وەڵامیان بداتەوە لەبری ئەوەی کە ئازاریان بدات و بیانکوژێت.

بەو شێوەیەی کە هیوامان خواست، ئازادکردنی عیراق لەودیو سنوورەکانەوە کاریگەری هەبوو. شەش رۆژ پاش گرتنی سەدام، کۆلۆنێل موعەمەر قەزافیی لیبیا- دوژمنی لەمێژینەی ئەمریکا و دەوڵەتی سپۆنسەری تیرۆر- رایگەیاند کە خەریکی بەرهەمهێنانی چەکی کیمیایی و ناوکی بووە. پەیمانیدا کە پرۆگرامەکانی چەکی ناوکی شانبەشانی موشەکە پەیوەندیدارەکان لەژێر باری سیستەمێکی تۆکمەی پشتڕاستکردنەوەی نێودەوڵەتیدا، لەناو ببات. دەشێت تەوقیتەکە رێکەوت بووبێت. بەڵام بڕوا ناکەم.

جەنگەکە بەهەمان شێوە چەند دەرەنجامێکی لێکەوتەوە کە ئێمە نیازمان نەکردبوو. بە درێژایی ساڵانێك، کاتێکی زۆرم لە بیرکردنەوەی ئەوەدا بەسەر برد کە چ شتێك لە عیراقدا بەلاڕێدا رۆیشتووە و بۆچی. من گەیشتبوومە ئەو ئەنجامەی کە ئێمە دوو هەڵەمان ئەنجامداوە کە یەکسانن بە زۆرێك لەو تەگەرانەی هاتنە بەردەممان.

یەکەمیان ئەوەیە کە کاتێك پاش رووخانی رژێمی سەدام بارودۆخەکە بەرەو خراپی چوو، ئێمە خێراتر و توندتر کاردانەوەمان نەبوو. لە دەمانگی دوای داگیرکردنەکە، ئێمە ژمارەی سەربازمان لە ١٩٢,٠٠٠ەوە کەم کردەوە بۆ ١٠٩,٠٠٠. زۆرێك لەو سەربازانەی کە هێڵرابوونەوە تەرکیزیان خستبووەسەر مەشقپێکردنی پۆلیس و سوپای عیراقی و نەك

پارێزگاری لە عیراقییەکان. من نیگەرانی ئەوە بووم کە بە دەرکەوتن لە بەرگی داگیرکەردا، کینە دروست بکەین. ئێمە بڕوامان وابوو کە دەتوانین مەشق بە هێزەکانی ئاسایشی عیراقی بکەین تا سەرکردایەتی شەڕەکە بکەن. هەروەها پێمان وابوو کە بەرەوپێشچوون بەرەو دیموکراسییەکی نوێنەر، بەخشینی پشکێك بە عیراقییە باکگراوند جیاوازەکان لە وڵاتەکەیاندا، باشترین ڕێچکەیە بۆ ئاسایشێکی درێژخایەن.

لەکاتێکدا کە لۆژیکێك لە پشت ئەم گریمانانەوە هەبوو، ئارەزووی گەلی عیراق بۆ ئاسایش بوو بە ڕقیان لە داگیرکردن. یەکێك لە گاڵتەجارییەکانی جەنگەکە ئەوەیە کە ئێمە بە توندی ڕەخنەمان لەلایەن چەپەکان و هەندێ لایەنی نێودەوڵەتی ئاراستە کرا لە بەرانبەر خواستمان بۆ بونیادنانی ئمپراتۆریەتێك لە عیراقدا. ئێمە هەرگیز سۆراخی ئەوەمان نەکردبوو. لە ڕاستیدا، ئێمە ئەوەندە دژی هەر شتێك بووین کە وەکو ئیمپراتۆریەت دەربکەوتایە کە کارەکەمان زۆر قورستر کەوتەوە. بە کەمکردنەوەی سەربازەکانمان و تەرکیز خستنەسەر مەشقپێکردنی عیراقییەکان، ئێمە بێباکانە ڕێگەمان بە یاخیگەریدا تا توانا پەیدا بکات. پاشان شەڕکەرانی قاعیدە پۆل پۆل ڕژانە ناو عیراقەوە بە مەبەستی دەسکەوتنی پەناگەیەکی نوێ کە ئەرکەکەی ئێمەی هەم قورستر و هەم گرنگتر کرد.

کەمکردنەوەی سەربازەکان وەها بەخێرایی، گرنگترین شکستی تەنفیزکردن بوو لە جەنگەکەدا. سەرەنجام، ئێمە ستراتیژییەکەمان گونجاند و کێشەکانمان چارەسەر کرد، سەرباری گووشاری تەقریبەن جیهانی بۆ جێهێشتنی عیراق. ئەمەش چوار ساڵی پڕ تێچوون و ئازاربەخشی ویست. لەو کاتانەدا، بەرەوپێشچوون یەکجار زۆر خاو دیار بوو. بەڵام ڕوانگەی مێژوو بەرفراوانترە. ئەگەر عیراق دوای پەنجا ساڵ ببێتە دیموکراسییەکی کارا، لەوانەیە ئەو چوار ساڵە سەختە زۆر جیاواز دیار بن.

هەڵەکەی تر شکستی هەواڵگری بوو لەمەڕ چەکی کۆکوژی عیراق. نزیکەی دەیەیەك دواتر، قورسە وەسفی ئەوە بکەیت کە گریمانەیەك چەندە بەربڵاو بووە لەبارەی ئەوەی کە سەدام چەکی کۆکوژی هەیە. پشتیوانانی جەنگ بڕوایان پێی بوو، نەیارانی جەنگ بڕوایان پێی بوو، تەنانەت ئەندامانی خودی ڕژێمی سەدامیش بڕوایان پێی بوو. ئێمە

هەمووومان دەمانزانی کە هەواڵگریی قەت ١٠٠٪ راست دەرناچێت. ئەمەش سروشتی کارەکەیە. بەڵام بڕوام وابوو کە هەواڵگری لەبارەی چەکی کۆکوژی عیراقەوە حاشاهەڵنەگرە. ئەگەر سەدام چەکی کۆکوژی نەبێت، بۆچی هەر بۆ پشکنەرانی ناسەلمێنێت؟

هەر لایەنێکی سایکۆلۆژیم بخوێندایەتەوە، دەیوت سەدام رزگاربوویەکە. ئەگەر ئەو ئەوەندە بایەخ بە مانەوەی لە دەسەڵاتدا دەدات، بۆچی رژێمەکەی دەخاتە مەترسییەوە بە وەهاپیشاندانی کە چەکی کۆکوژی هەیە؟

بەشێك لە روونکردنەوەکە دوای گرتنی سەدام هات، کاتێك ئەو لەلایەن ئێف بی ئایەوە قسەی لێوەرگیرا. ئەو بە کارمەندەکانی وت کە ئەو لەوە نیگەرانتر بوو کە لەبەردەم ئێراندا لاواز دەربکەوێت نەك ئەمەی کە لەلایەن هاوپەیمانانەوە لەسەر حوکم لاببردرێت. ئەو هەرگیز بیری لەوە نەکردبووەوە کە ئەمریکا لەسەر بەڵێنەکانمان بەردەوام بێت بۆ لەچەکداماڵینی بە زەبر. من دڵنیا نیم کە دەبووایە چیترم بکردایە بۆئەوەی پیشانی سەدامی بدەم کە ئەوەی دەیڵێم بە جدیمە. من لە وتاری ساڵانەمدا ئەوم وەکو بەشێك لە تەوەری خراپە ناوهێنا . قسەم بۆ ژوورێکی پڕاوپڕی نەتەوە یەکگرتووەکان کرد و بەڵێنمدا کە ئەگەر دیپلۆماسی شکست پێنێت ئەوا ئەو لە چەك دابماڵم. بڕیارێکی کۆدەنگی ئەنجومەنی ئاسایشمان خستە ڕووی. ئێمە پشتیوانییەکی دووحزبیی بەهێزمان لە کۆنگرێسی ئەمریکاوە وەرگرت. ئێمە هێزێکی ١٥٠,٠٠٠ سەربازیمان لەسەر سنوورەکەی دابەزاند. من ئاگادارییەکی دوایین چل و هەشت سەعاتم پێ گەیاند کە ئێمە خەریکە وڵاتەکەی داگیر دەکەین. لەوە زیاتر ئەبووایە چەندە روونتری بکەمەوە؟

راستە کە سەدام ئیعازی تێکەڵی لە فەرەنسا، ئەڵمانیا و روسیاوە – و لە خۆپیشاندەرانی دژەجەنگی سەرانسەری جیهانەوە پێدەگەیشت. ئەمە هیچ کەڵکی نەبوو. بەڵام جەنگ هەڵەی ئەوان نەبوو. تەنیا یەك کەسی بە دەسەڵات هەبوو کە خۆی لە جەنگ لابدات، ئەویش بەکاری نەهێنا. بەو هەموو جیهان فریودانەیەوە، کەسی سەدام سەرەنجام ئەوەی کە لە هەمووان زیاتر فریویدا، خۆی بوو.

من هەر زوو بڕیارمدا کە ڕەخنە ناگرمە نیشتمانپەروەرانی ماندوو لە سی.ئای.ئەی لەبەرانبەر هەواڵگرییە ناراستەکەیان لەبارەی عیراقەوە. من نەمدەویست پەنجە بۆ ئەو لێکۆڵینەوانە رابکێشم کە لە ۱۹۷۰کاندا مەعنەویاتی کۆڕی هەواڵگرییان رووخاند. بەڵام دەمویست بزانم بۆچی ئەو زانیارییەی کە وەرمگرت هەڵە بوو و چۆن دەتوانین لە ئایندەدا لە هەڵەیەکی هاوشێوە خۆمان لابدەین. من کۆمسیۆنێکی بێ لایەنی سەرۆکایەتیکراو لەلایەن دادوەر (لاری سیلبەرمان) و سیناتۆری دیموکراتی پێشوو (چوک رۆب)م دامەزراند بۆ توێژینەوە لەو پرسیارە. لێکۆڵینەوەکەیان راسپاردەی بەنرخی لێکەوتەوە—وەکو هەماهەنگیی زیادکراو لەنێوان ئاژانسەکان و بڵاوکردنەوەی رای ناکۆکی زیاتر— کە هەواڵگری بۆ سەرۆکەکانی پێشوو پشت پێبەستووتر دەکرد، بەبێ لاوازکردنی توانای کۆڕی هەواڵگریمان لە ئەنجامدانی کارەکەیدا.

***

سروشتی مێژوو وایە کە ئێمە تەنیا ئەو کاتەی کە کردارەکەمان ئەنجامدا دەرەنجامەکەی دەزانین. بەڵام هەنگاونەنانیش بەهەمان شێوە دەرەنجامی هەبووە. وێنای ئەوە بکە کە جیهان چۆن دەبوو ئەگەر هێشتا سەدام لەسەر حوکم بووایە لە عیراق. ئەو هێشتا هەڕەشەی لە دراوسێکانی دەکرد، سپۆنسەری تیرۆری دەکرد و لاشەی لەناو گۆڕە بەکۆمەڵەکاندا کۆ دەکردەوە. نرخی بەرزبووەوەی نەوت— کە لە زیاتر لە ۳۰ دۆلار بۆ بەرمیلێك لە ۲۰۰۳دا پێنج ساڵ دواتر گەیشتبووە نزیکەی ۱٤۰ دۆلار— سەدامی لە ساماندا نقوم دەکرد. سزاکان، کە هەنوکە لە پەرتبووندابوون، تەقریبەن بە دڵنیاییەوە دەشکێنران. سەدام هێشتا ئەو ژێرخان و شارەزایەتییەی لەبەردەستدا دەبوو کە چەکی کۆکوژ بەرهەم بێنێت. هەروەکو دوایین راپۆرتی پشکنینەکانی چەك لەلایەن (چارلز دویلفەر)یش ئەنجامگیری کردبوو "سەدام خەریکی ئەوە بووە کە توانای چەکی کۆکوژی عیراق بونیاد بنێتەوە...پاش ئەوەی سزاکان لادەبران و ئابووریی عیراق جێگیر دەبوو".

ئەگەر سەدام لەسەر ئەو نیازە بەردەوام بووایە، ئەوا لەوانەیە جیهان شایەتی پێشبڕکێیەکی چەکی ناوکی بێت لەنێوان عیراق و ئێراندا. لەوانەیە سەدام رووی بکردایەتە گروپی تیرۆریستی سوونەی وەکو قاعیدە— هاوسەرگیرییەکی پەیوەندیداری

نەك ئایدۆلۆژی- وەكو جێگرەوە لە هەوڵێكدا بۆ گونجاندنی بەكارهێنانی گروپی تیرۆریستیی وەكو حزبوڵا لەلایەن ئێرانەوە. هەلەكانی بەردەستكەوتنی چەكی بایۆلۆژی، كیمیایی یان ناوكی لەلایەن تیرۆریستانەوە زیاد دەبوو. فشاری سەر دۆستەكانمان لە ناوچەكەدا-بەتایبەت ئیسرائیل، كوەیت، سعودیە و ئیمارات- توند دەبوو. گەلی ئەمریكاش لەمڕۆدا كەمتر لە ئاسایشدا دەبوو.

لە بری ئەمە، لە ئەنجامی هەنگاوی كرداریمان لە عیراقدا، یەكێك لە دوژمنە هەرە پابەند و مەترسیدارەكانی ئەمریكا بۆ تاهەتایە لە هەڕەلێكردنمان وەستا. ناوچەیە هەرە ناسەقامگیرەكەی جیهان یەكێك لە گەورەترین سەرچاوەكانی توندوتیژی و تۆقاندنی لەدەستدا. وڵاتە شەڕانگێزەكانی سەرانسەری جیهان باجی پشتیوانیی تیرۆر و سۆراخكردنی چەكی كۆكوژیان بینی. لە ماوەی نۆ مانگیشدا، بیست و پێنج ملیۆن عیراقی لە ژێر دیكتاتۆریەتی ترسەوە كەوتنە بەردەم ئاسۆی دیموكراسییەكی كارای ئاشتییانە. لە دیسەمبەری ٢٠٠٣دا، هێشتا رێگەیەكی درێژیان بۆ ئەو خەونە لەبەردەمدا بوو. بەڵام دەرفەتێكیان هەبوو و ئەمەیان زۆر گەورەتر بوو لەوەی پێشتر هەیانبوو.

***

قورسترین رۆژانی جەنگ هێشتا نەهاتبوون. لە كانوونی دووەمی ٢٠٠٤دا، سەربازەكانمان نامەیەكیان لە زەرقاوییەوە بۆ رێبەرانی گەورەی قاعیدە گرت. ئەو لەبارەی فشارە گەشەكردووەكەی سەری نوسیبووی و پلانی خۆی بۆ مانەوە دارشتبوو. ئەو نوسیبووی "دەبێ شیعە بخەینە ناو شەڕەكەوە، چونكە ئەمە تاكە رێگەیە بۆ درێژكردنەوەی ماوەی شەڕی نێوان كافران و ئێمە". ئەو ئامانجێكی نوێی بۆ جیهادییەكانی عیراق دانابوو -نانەوەی "شەڕی تایەفی".

# سەرکردایەتیکردن

"ئەمشەو لەم هۆڵەدا، ئێمە بڕیار دەدەین کە لایەنی ریفۆرم بین نەک پاڵدانەوە. ئێمە نەک پەراوێز بەڵکو لاپەڕەگەلێکی چیرۆکی ئەمریکا دەنووسینەوە. ئێمە بەرهەمی دەستەکانمان دەخەینەسەر میراتی باوکان و دایکانمان و ئەم وڵاتە گەورەتر لەوەی دۆزیمانەوە جێ دەهێڵین...ئەگەر ئێوە متمانەی خۆتانمان پێبدەن، ئەوا رێزی لێ دەگرم. دەسەڵاتم پێ بدەن، بەکاری دێنم. دەرفەتم پێ بدەن تا سەرکردایەتی ئەو وڵاتە بکەم و سەرکردایەتی دەکەم".

من ئەو قسانەی لە کۆنفرانسی نیشتمانیی کۆماریدا کردمن لە ساڵی ٢٠٠٠ بە جددیم بوون. کاتێک چوومە ناو سیاسەتەوە، بڕیارێکمدا: من رووبەڕووی کێشەکان دەبمەوە نەک ئەمەی کە تێیان پەڕێنم بۆ جیلەکانی ئاییندە. من سەرسامی ئەو سەرۆکانە بووم کە کاتی خۆیان لە ئۆفیسدا بەکارهێنا بۆ پیادەکردنی گۆڕانکاریی وەرچەرخێن. من (تیۆدۆر روزڤێلت)م خوێندبووەوە کە نزیکەی سەدەیەک پێش من لە کۆشکی سپی خزمەتی کردبوو. ئەو بەرپرسیارێتییە داراییەکانی لە ئەستۆ گرتبوو، هێزێکی دەریایی بەهێزی بونیاد نابوو و بزووتنەوەی وتوێژی خستبووەگەڕ. من بەهەمان شێوە لە رۆناڵد ریگنەوە فێر بووم کە سلوکێکی گەشبینانەی لەگەڵ روونیی ئەخلاقی و بیروباوەڕی کەمکردنەوەی باجەکان، بەهێزکردنی سوپا و بەزاندنی سۆڤیەتی ئاوێتە کردبوو سەرباری ئەو رەخنانەی بە درێژایی سەرۆکایەتییەکەی لەئارادا بوون.

یەکێك لەو وانانەی کە لە روزڤێلت و ریگن فێری بووم سەرکردایەتیکردنی خەڵك بوو نەك ئەمەی کە سۆراخی ئەنجامەکانی راپرسییەکان بکەم. بڕیارمدا تەکان بدەمەبەر

ریفۆرمە کاریگەرەکان، نەک ئەمەی کە دەستکاری وەزعی راهێن بکەم. هەروەکو بە راوێژکارانم وت "من ئەم کارەم بۆئەوە وەرنەگرتووە تا یاری بە تۆپی بچوک بکەم".

***

دوو هەفتە پاش ئەوەی کە بەرەو کۆشکی سپی رۆیشتین، من و لۆرا یەکەم شەوی فیلمی سینەماییمان لە (فامیلی سیەتە) بەسەر برد. ئەم سینەمایە کە کەوتووەتە نهۆمی سەر ئەرزی کۆشکی سپی، چل و شەش کورسیی ئاسودەبەخش و شاشەیەکی نەوەد و سێ پێی چوارگۆشە دەگرێتەخۆی. ریکخراوی ئەمریکیی (مۆشن پیکچەر) کە سالانێك لەلایەن تەکساسییەکی نایاب بەناوی (جاك ڤالێنتی)ی بەرێوە دەبرا، بەخشندانە فیلمە سینەماییەکانی بۆ یەکەم خێزان دەستەبەر کردبوو. ئێمە هەرگیز پێویستی نەدەکرد چاوەرێی شتە سەرنجراکێشەکانی ئایندە بین.

بۆ یەکەمین ئامادەبوونمان، من و لۆرا (سێزدە رۆژ)مان هەڵبژارد لەبارەی مامەڵەکردنی سەرۆك کەندی لەگەڵ قەیرانی موشەکیی کوبی. فیلمە سینەماییەکە بژارەیەکی گونجاو بوو بۆ میوانی فەخریمان، سیناتۆر (تێد کەنەدی)ی ماساشوسێتس. لە رواڵەتدا، من و تێد شتی هاوبەشی زۆرمان نەبوو. ئەو لیبراڵ بوو و منیش کۆنسێرڤاتیڤ. ئەو لە (کەیپ کۆد) گەورە ببوو و منیش لە خۆرئاوای تەکساس. ئەو نزیکەی چل ساڵی لە بینایەی کۆنگرێس بەسەر بردبوو، من تەقریبەن لە سەر شانۆکە تازە بووم.

من و تێد لەو شتەدا هاوبەش بووین کە لۆرا پێی دەگوت مەسائیلی خێزانی. پرێسکۆت بوشی باپیرم رێك لەو کاتەدا کە جۆن ئێف کەنەدی نوێنەرایەتی (ماساشوسێتس)ی کردبوو، لە ئەنجومەنی پیراندا نوێنەرایەتیی (کۆنێکتیکەت)ی کردبوو. من و لۆرا خۆشحاڵ بووین بە دانیشتن لەگەڵ هاوسەرەکەی تێد (ڤیکی) و پاتریکی کوری کە کۆنگرێسمانێکی (رۆد ئایلەند) بوو و کاتیلین کەنەدی تاونسەندی برازای کە یاریدەدەری حاکمی ماریلاند بوو لەگەڵ کەیتی کچی کاتلین.

تێد دۆستانە، بەرێز و پڕ بوو لە وزە. ئەو شێوەزاری تایبەتی بنەماڵەی کەنەدی و گەشانەوەیەکی ئێرلەندیی بێ وێنەی هەبوو. بە ئاسانی خەندەی بەسەر لێوانیدا دەهات و هەندێ جار پێکەنینێکی گەورەی و گەرم و گوڕی لێدەکەوتەوە. هەستم بە پەیوەندییەك

کرد بە مێژووەوە کاتێك تەماشای فیلمێکی سینەماییمان کرد لەبارەی ئەمەی کە چۆن براکانی قەیرانێکیان لە کۆشکی سپییەوە کپ کردبووەوە. فیلمە سینەماییەکە تاکە ئامانجی من نەبوو بۆ بانگهێشتکردنی تێد. ئەو باڵاترین دیموکراتی لیژنەی پیران بوو کە یاسای پەروەردەی دارشتبوو. ئەو چەند ئامارەیەکی پیشان دا لەمەر ئەوەی کە بایەخ بە پرۆپۆزەڵی ریفۆرمی مـن بـۆ قوتابخانـەکان دەدات بـەناوی (هـیچ منـداڵێك پـشتگوێ ناخرێت).

مـن و تێـد هـەردووکمان شـۆك ببـووین بـەو ئەنجامانـەی کـە لـە قوتابخانەکانمانـەوە دەهاتن. لە ئابووریی جیهانیی کێبڕکێ ئامێزدا، کارە باشەکان پێویستیان بـە مەعریفـە و شـارەزایەتی هـەبوو. بـەڵام خوێنـدکارانی ئـەمریکی بـە شـێوەیەکی رۆتـینی دوای هاورێیەکانیان دەکـەوتن لـە رشتە سـەرەکییەکاندا. لـە تاقیکردنەوەیـەکی نێودەوڵـەتیی ماتماتیکدا بۆ بەراوردکردنی بیست و یـەك وڵات، قوتابیـانی دوایـین سـاڵی قوتابخانـەکانی ئامادەیی ئەمریکا تەنیا لە پێش قیبرس و ئەفریقای باشوورەوە بوون.

بەشێکی کێشەکە پەیوەنـدی بـەوەوە هـەبوو کـە ملیۆنـان منـداڵ لـە قۆناغێکـەوە بـۆ قۆناغێکی تر دەجولان بەبێ ئەوەی کەس پرسیار بکات کە چی فێر بـوون. زۆرێکیـان لـە باکگراوندی هەژار و کەمینەوە دەهاتن. لە ساڵی ٢٠٠٠دا، نزیکـەی ٧٠٪ی پـۆلی چـوار لـە باکگراوندەکانی ئەوپەڕی هەژار نەیاندەتووانی بە توانای ئەو ئاستە بخوێننـەوە. نزیکـەی ٤٠٪ی خوێندکارانی کەمینە نەیانتووانی لـە مـاوەی چـوار سـاڵدا ئامـادەیی تـەواو بکـەن. چۆن کۆمەڵگەیەك کە بەڵێنی دەرفەتی یەکسانی بە هەمووان داوە دەتوانێ دەستبەرداری موحتاجترین هاوڵاتییـانی بێـت؟ لـە سـەرەتای هەڵمـەتی ٢٠٠٠وە مـن کێشەکەم ناونـابوو "دەمارگیریی نەرمی چاوەڕوانییە نزمەکان". من بەڵێنم دابوو پرسە گەورەکان لە ئەستۆ بگرم. بە دڵنیاییەوە ئەمە یەکێکیان بوو.

لەم ساڵانەی دواییدا، مشتومڕی پەروەردەی نیشتمانی لە پرۆپۆزەڵە مام ناوەندەکانی وەکو جلی یەکپۆشی و بانگەوازی ناواقیعییانەی هەڵوەشاندنەوەی وەزارەتی پەروەردەدا چـەقیبوو. سـەرکەوتن زۆرجـار بـەو دۆلارانـەی کـە خـەرج دەکـرا، نـەك ئەنجامـە بەدەستهاتووەکان پێناسـە دەکرا. مـن لـە جیهانێکـەوە هـاتووم کـە تیایدا لێپێچینەوە

واقعیەتێکی ڕۆژانە بوو. لە بەیسبۆلدا، هەر لایەنێکی ئارەزوومەند دەتوانێ ڕۆژنامە بکاتەوە، ئەدائی تۆ لە چوارگۆشەی خاڵەکاندا شی بکاتەوە و داوای گۆڕانکاری بکات. "تۆپ هەڵدانی زیاتر، بوش!" دەستەواژەیەکی ئاشنا بوو. پەروەردە زۆر گرنگتر بوو لە بەیسبۆڵ، لەگەڵ ئەوەشدا زۆربەی خەڵکی بیرۆکەیەکیان نەبوو لەبارەی ئەوەی کە قوتابخانەکانیان ئەدائیان چۆنە. وەکو حاکم، من لەگەڵ دەستەی یاسادانانادا کارم کرد بۆ تێپەڕاندنی یاسایەك کە داوا لە قوتابخانەکان بکات هەر ساڵێك خوێندکاران لە شتە بنچینەییەکان تاقی بکاتەوە، بەشێوەیەکی ئاشکرا ئەنجامەکان ڕابگەیەنێت و ڕێگە بە دایکان و باوکان بدات تا منداڵەکانیان لە قوتابخانە لاوازەکانەوە بگوازنەوە. لەنێوان ١٩٩٤ و ١٩٩٨دا، ڕێژەی سەدیی ئەو پۆلی سێیانەی کە ئەدائی ئەو ئاستەیان هەبوو لە ٥٨ەوە گەیشتە ٧٦. خوێندکارانی کەمینە گەورەترین دەسکەوتیان پیشاندا، کەلێنی دەسکەوتیان لەگەڵ هاوتا سپی پێستەکانیاندا بەرتەسك کردەوە.

کاتێك من خۆم بۆ سەرۆکایەتیێ کاندید کرد، بڕیارمدا یاسایەکی فیدراڵی ڕوون پێشنیار بکەم کە ئامانجی ڕوونی دادەنان- هەر منداڵێك لە هەمان قۆناغدا فێری خوێندنەوە و ئەنجامدانی ماتماتیك فێر دەبێت- و قوتابخانەکانی بەرپرس دەبن لە بەرەوپێشچوون. لە ژێر باری (هیچ منداڵێك پشتگوێ ناخرێت)، ویلایەتەکان هەر ساڵێك قوتابیانی نێوان قۆناغی سێ و هەشتیان لە خوێندنەوە و ماتماتیکدا تاقی دەکردەوە، جارێکیش لە ئامادەیی. قوتابخانەکان بەشێوەیەکی ئاشکرا ئەنجامەکانیان بڵاو دەکردەوە کە بەسەر ئەتنیك، ئاستی داهات و پۆلێنبەندییەکانی تردا دابەش دەکران. داتاکە ڕێگەی بە دایکان و باوکان و هاوڵاتیانی خەمخۆر دەدا تا قوتابخانەکان، مامۆستایان و مەنهەج هەڵسەنگێنن. ئەو قوتابخانانەی کە ئەنجامەکانیان لەژێر ستانداردەوە بووایە، لە سەرەتادا هاوکاری زیاتریان وەردەگرت، لەوانەش پارە بۆ قوتابیان بۆئەوەی لە وانەکانی پاش قوتابخانە، چ تایبەت یان گشتی، ئامادە بن. بەڵام ئەگەر قوتابخانەکان بە شێوەی دووبارە نەیانتووانیایە بەرەوپێشچوونی پێویست ئەنجام بدەن، ئەوا ڕووبەڕووی دەرەنجام دەبوونەوە. دایکان و باوکان بژارەی ئەوەیان دەبوو کە منداڵەکەیان بۆ قوتابخانەیەکی گشتیی یان تایبەتی باشتر. پرەنسیپەکان ڕوون بوون: تۆ ناتوانیت

کێشەیەک چارەسەر بکەیت تا ئەو کاتەی کە دەستنیشانی دەکەیت. لێپێچینەوە بەردی بناغەی ریفۆرمە.

من ئەفریبەن لە هەر بۆنەیەکی هەڵمەتەکەمدا رۆشناییم دەخستە سەر (هیچ منداڵێک پشتگوێ ناخرێت)، لەوانەش کۆنفرانسی ( رێکخراوی نیشتمانیی بەرەوپێشبردنی خەڵکی نەژادەکانی تر ). من ریپۆرتەرەکانم وت هیوادارم بە "سەرۆکی پەروەردە" بناسرێم. ئەو شەوەش کە لەگەڵ تێد کەنەدی سەیری (سیانزە رۆژ)مان کرد هەمان شتم وت. وتم "لەبارەی تۆوە نازانم، بەڵام حەز دەکەم موفاجەئەی خەڵک بکەم. با پیشانیان بدەین کە هێشتا واشنتن دەتوانێ شت بکات". بەیانیی دواتر، نامەیەک گەیشتە ئۆفیسی ئۆڤاڵ:

"بەرێز جەنابی سەرۆک،

تۆ و خاتوو بوش هیچ کاتێک ئەوەندەی بەلای من و (ڤیکی) و ئەندامانی خێزانەکەمان لە شەوی رابردوو و ئەو چەند رۆژەی رابردوودا بەهادار نەبوون. من زۆر ستایشی لەبەرچاوگرتنە هۆشمەندانەکەت دەکەم. وەکو تۆ، من هەموو نیازێکم هەیە بۆ ئەنجامدانی شتەکان، بەتایبەت لە بواری پەروەردە و چاودێریی تەندروستیدا. ئێمە بە درێژایی رێگەکە جیاوازییەک یان دووانمان دەبێت، بەڵام من چاوەڕوانی چەند واژۆکردنێکی گرنگی (باخچەی رۆز) دەبم.

لەگەڵ رێزی گەرم گوڕدا

تێد کەنەدی"

من دڵخۆش بووم. (هیچ منداڵێک پشتگوێ ناخرێت) هەلێکی زۆر باشتری هاتە بەردەم بۆ بوون بە یاسا بە هەبوونی پشتگیری لەلایەن (شێرەکەی ئەنجومەنی پیران)ەوە. ئەمە دەستپێکی دۆستایەتییەکی هەرە چاوەڕواننەکراوی من بوو لە واشنتن.

***

تێد کەنەدی تاکە یاسادانەرێك نەبوو کە مجامەلەم کرد. لە ماوەی یەکەم دوو هەفتەم لە ئۆفیسدا، چاوم کەوت بە زیاتر لە ١٥٠ ئەندامی کۆنگرێس لە هەردوو حزبەکە. ئومێدەوار بووم کە ئەو پەیوەندییە بەرهەمهێنەرانەیەی لەگەڵ بۆب بولۆک، پیت لانی و یاسادانەرانی تری تەکساس بەرقەرارم کرد، کۆپی بکەمەوە. لە بابەتێکی هەواڵەکاندا

هاتبوو "ئەگەر پەیوەندییەکانی نێوان کۆنگرێس و کۆشکی سپی بەزوویی بەرەو خراپبوونی جاری جاران بچێت، بەهۆی نەبوونی هەوڵی خۆ لێ لادانی نابێت لەلایەن سەرۆک بوشەوە". لە بابەتێکی تردا هاتبوو کە من "گەورەترین هێرشی سیحر بە بەراورد بە هەر سەرۆکێکی جێبەجێکاری تر ئەنجام دەدەم".

راگەیاندنەکان هەوڵەکەی منیان بە هەر شتێك ناوزەند بکردایە، هەردوو ئەنجومەنەکەی کۆنگرێس بەزوویی (هیچ منداڵێك پشتگوێ ناخرێت)یان گرتە ئەستۆ. بە هاتنی مانگی ئازار، لیژنەی پەروەردەی ئەنجومەنی نوێنەران پرۆژەیاسایەکی تەواو کردبوو کە هەموو برگە سەرەکییەکانی پرۆپۆزەڵەکەی منی گرتبووەخۆ. پاشان ئەنجومەنی نوێنەران جوڵەی خۆی کرد. کۆنگرێسمان جۆن بۆنەری ئۆهایۆ، سەرۆکی کۆماریی شارەزای لیژنەی پەروەردەی ئەنجومەنی نوێنەران لەگەڵ کۆنگرێسمان جۆرج میلەری کالیفۆرنیا کە یەکێك بوو لە ئەندامە هەرە لیبراڵەکانی ئەنجومەنەکە، کاری لەسەر پرۆژەیاسا بەهێزەکە کرد. ئەنجومەنەکە پرۆژەیاساکەی بە ٣٨٤ بەرانبەر ٤٥ دەنگ پەسەند کرد. پرۆسەی ئاشتکردنەوەی پرۆژەیاساکانی ئەنجومەنی نوێنەران و ئەنجومەنی پیران بە درێژایی هاوین بەردەوام بوو. کاتێك کۆنگرێس لە سەرەتاکانی سێپتێمبەر لە پشووەکەی گەڕایەوە، بە سەردانێکی دوور رۆژەی قوتابخانەکان لە فلۆریدا دەستم کرد بە وزەپێدانەوەی مشتومڕەکە. لۆرا لەسەر ئەوە کۆك بوو کە یەکەم شایەتی بێ وێنەی لە بینایەی کۆنگرێس بدات. وەکو مامۆستا و کارمەندێکی کتێبخانە، ئەو متمانەیەکی بێ هاوتای پەیوەست بە پەروەردە هەبوو. ئامادەبوونی ئەو بۆ ١١ی سێپتێمبەری ٢٠٠١ دیاری کرابوو.

بە هاتنی کۆتایی ئەو بەیانییە، روون بوو کە من نابمە سەرۆکی پەروەردە. بەڵکو سەرۆکی جەنگم. بە درێژایی پایزەکە، پاڵم بە کۆنگرێسەوە نا تا (هیچ منداڵێك پشتگوێ ناخرێت) تەواو بکەن. تێد کەنەدی وتارێکی بوێرانەی پێشکەش کرد بۆ بەرگریکردن لە بەرپرسبوون لەبەردەم رێکخراوی پەروەردەی نیشتمانی، گروپێکی مامۆستایان کە بەشی نۆریان بەلای دیموکراتەکاندا دەشکانەوە و بە تەواوی دژی پرۆژەیاساکە بوون. سیناتۆر جود گرێگ و کۆنگرێسمان بۆیهنەر کە جارێك لە جاران لایەنگری هەڵوەشاندنەوەی

وەزارەتی پەروەردە بوون، چوونە پاڵ کۆمارییەکان کە نیگەران بوون لەبارەی ڕۆڵی فیدراڵی لە پەروەردەدا. وەکو من، ئەوان بەڵگەی ئەوەیان دەهێنایەوە کە ئەگەر ئێمە بڕیار وایە پارە لە قوتابخانەکان خەرج بکەین، ئەوا پێویستە ئەو ئەنجامانە بزانین کە بەرهەمی دێنن. هەفتەیەک پێش کریسمەس، کۆنگرێس بە زۆرینەیەکی دووحزبی، (هیچ منداڵێک پشتگوێ ناخرێت)ی پەسەند کرد.

***

بە تێپەڕینی ساڵان، (هیچ منداڵێک پشتگوێ ناخرێت) ناکۆکییەکی زۆری نایەوە. حاکمەکان و کاربەدەستانی پەروەردەی ویلایەتەکان سکاڵای ئەوەیان دەکرد کە بیرۆکراسییەکە ئەوەندە توندە کە زۆرێک لە قوتابخانەکان بە شکستخواردوو لەقەڵەم دراون. کاتێک لە ساڵی ٢٠٠٥دا مارگرێت سپێلینگز بوو بە وەزیری پەروەردە، سنووردارێتییە بیرۆکراتییەکانی چاک کرد و ئاسانی بۆ ویلایەتەکان زیاد کرد. بەڵام ئێمە هەردووکمان جەختمان کردەوە لەوەی کە ڕێوشوێنەکانی لێپێچینەوە کاڵ ناکەینەوە. ئامانجی یاسا ئەوە بوو کە ڕاستی دەربخات، ئەگەرچی ناخۆشیش بێت. هەندێ لە ڕەخنەگران دەیانگوت نادادپەروەرانەیە کە هەر ساڵێک قوتابی تاقی بکرێتەوە. من پێم وابوو تاقی نەکردنەوەیان نادادپەروەرانەیە. پێوانەکردنی بەرەوپێشچوون تاکە ڕێگە بوو بۆ زانینی ئەمەی کە کام قوتابییانە پێویستیان بە یارمەتییە. ئەوانیتر لەبارەی ئەو شتەی کە پێیان دەوت "وانەوتنەوە بۆ تاقیکردنەوە" سکاڵایان هەبوو. بەڵام کە تاقیکردنەوە باش دیزاین کرابێت بۆ پێوانەکردنی زانین لەبارەی بابەتەکەوە، هەموو قوتابخانەکان تاکە شتێک کە دەبووایە بیکەن وانەوتنەوەی بابەتەکە بوو.

بانگەشەیەکی باوی تر ئەوە بوو کە (هیچ منداڵێک پشتگوێ ناخرێت) کە دارایی کەمی بۆ دابینکراوە. بە لەبەرچاوگرتنی ئەمەی کە ئێمە لە ماوەی هەشت ساڵی سەرۆکایەتیماندا خەرجیی فیدراڵیمان بۆ پەروەردە بەرزکردبووەوە بۆ ٣٩٪، لەکاتێکدا کە بەشی هەرە زۆری پارەی زیادە بۆ هەژارترین قوتابیان و قوتابخانەکان دەڕۆیشت، بڕواکردن بەمە قورس بوو.

لە ئاستێکی بنەڕەتیتردا، ئەو ڕەخنەگرانەی کە لەبارەی پارەکەوە سکاڵایان دەکرد، لە (هیچ منداڵێك پشتگوێ ناخرێت) تێنەگەیشتبوون. بنەمای یاساکە ئەوەیە کە سەرکەوتن ناتوانێ بە دۆلاری خەرجکراو پێوانە بکرێت، بەڵکو دەبووایە بە ئەنجامی بەدەستهاتوو حوکمی لەسەر بدرێت.

بە هاتنی ئەو کاتەی کە من ئۆفیسم جێ هێشت، ئەنجامەکانی ماتماتیکی پۆلی چوار و پۆلی هەشت گەیشتبووە بەرزترین ئاستی لە مێژوودا. بە هەمان شێوە ئەنجامەکانی خوێندنەوەی پۆلی چوار. خوێندکارانی هیسپانیك و ئەمریکییە ئەفریقییەکان ریکۆردی نوێیان شکاند لە بابەتە جیاجیاکاندا. کەلێنەکە رێك بەو شێوەیەی کە ویستبوومان بەرتەسك بووەوە: هەموو خوێندکاران ئاستیان بەرەو باشی چوو، بەڵام خوێندکارانی کەمینە زیاتر.

لە کانوونی دووەمی ٢٠٠٨دا، من سەردانی قوتابخانەی بنەڕەتیی (هۆرەس گریلی)م کرد لە شیکاگۆ بۆ یادکردنەوەی شەشەمین ساڵی (هیچ منداڵێك پشتگوێ ناخرێت). قوتابخانەکە ٧٠٪ی هیسپانیك و ٩٢٪ی هەژار بوون. ئەم قوتابخانەیەك لە هەموو قوتابخانە گشتییەکانی تری شیکاگۆ تەمبەڵ تر بوو. لێهاتوویی قوتابی لە خوێندنەوە لە ٥١٪ی ٢٠٠٣ گەیشتبووە ٧٦٪ لە ٢٠٠٧دا. زیرەکیی ماتماتیك لە ٥٩٪وە گەیشتبووە ٨٦٪.

ئەمە ئارامبەخش بوو کە ببینیت قوتابخانەیەکی قوتابییانی کەمینەی کەم داهات دەبوژێنەوە. پۆلی شەشێك بەناوی (یاسینیا ئادەم) وتی خۆشی لە تاقیکردنەوەکان دەبینم. پاشان وتی "ئەو کاتە مامۆستاکانت دەتوانن بزانن کە لەچیدا یارمەتیت پێویستە. لە کۆتایی سەردانەکەمدا، بە قوتابیان، دایکان و باوکان و راگەیاندنەکانم وت کە ئاواتم چی بووە: (هیچ منداڵێك پشتگوێ ناخرێت) پارچەیەکە لە یاسادانانی مافە مرۆییەکان.

***

راهاتبووم لەسەر ئەوەیە کە بە توانج بڵێم من بەرهەمی پرۆگرامێکی بونیادنراو لەسەر ئیمانم. بە هاتنی ١٩٨٦، ئیمان منی گۆڕیبوو و وازم لە خواردنەوە هێنابوو. دە ساڵ

دواتر، چاوەکانم لە بەرانبەر توانای پرۆگرامە دینییەکان بۆ وەرچەرخاندنی بەرنامەی گشتی کرانەوە. لە حوزەیرانی ١٩٩٦دا، دوو کەنیسەی ئەمریکیی ئەفریقی لە (گرنفیل)ی تەکساس سوتێنران. تاوەکو ١٩٦٥، تابلۆیەك لەسەر شەقامی سەرەکیی شارۆچکەکە ریکلامی ئەمەی کردبوو "رەشترین خاك، سپیترین خەڵك". وەکو حاکم، من ترسی ئەوەم هەبوو کە شایەتی زیادبوونێك بین لە نەژادپەرستیی کۆن.

من سەفەرم کرد بۆ گرینڤیلّ بۆ ئیدانەکردنی سوتاندنەکان. خەڵکێکی فرە نەژاد کە نزیکەی چوار هەزار کەسێك دەبوون لە ستادیۆمی تۆپی پێیەکە خڕ بوونەوە. وتم "ناوبەناو، تەکساسییەکان لاف ئەوە لێدەدەن کە ئەوەی ئێمە ویلایەتێکی گەورەیە. بەڵام چەندە ویلایەتێکی گەورەیە، ئەوەندەش بواری ترسنۆکی و رق و دەمارگیری نییە". پاشان مایکرۆفۆنەکەم دایە تۆنی ئێڤانس کە قەشەیەك بوو لە گروپی (ئۆك کلیف بایبل) لە دالاس. ئەو چیرۆکی خانوویەکی گێڕایەوە کە درزێك لە دیوارەکەیدا بوو. خاوەنەکەی درزگرێکی هێنابوو بۆئەوەی درزەکە داپۆشێت. هەفتەیەك دواتر درزەکە دەرکەوتبووەوە. بۆیە درزگرێکی تری بانگ کردبوو. هەفتەیەك دواتر دیسان دەرکەوتبووەوە. دواجار خاوەن ماڵەکە بانگی بۆیەچییەکی کۆنی کردبوو کە سەیرێکی کردبوو و وتبووی "کوڕم، جارێ بناغەکە چاك بکە و ئینجا تۆ دەتوانی درزی ناو دیوارەکە چاك بکەیت".

خەڵکەکە سەریان لەقاند و چەپڵەیان لێدا. پاشان تۆنی رووی کردە من و وتی "حاکم، شتێك هەیە پێتی بڵێم".

وتی "پێویستە ئێمە بناغەکان چاك بکەین و پرۆگرامە کۆنەکانی حکومەتەکەی تۆش کارەکە ئەنجام نادەن". ئەو وتی ئەلتەرناتیڤێکی باشتری پێیە. ئەمەیان کاریگەرترین سیستەمی خۆشگوزەرانی بوو لە جیهاندا. پڕ بوو لە بینایە لە زۆرێك لە سوچەکانی جاددەکان، لیستێك لە کرێکارانی ئارەزوومەند و کۆبوونەوەی ناوبەناو بۆ توێژینەوەی ریوشوێنێکی کاملّ بۆ رزگارکردنی گیانەکان.

ئەو قسەی لەسەر پەرستگاکان دەکرد. راستیشی دەکرد. پرۆگرامە بونیادنراوەکان لەسەر دین توانای ئەوەیان هەبوو ژیان بگۆڕن بە شێوازێك کە پرۆگرامە عەلمانییەکان

هەرگیز نەیانتووانیووە. وتم "حکومەت دەتوانێ پارە بدات. بەڵام ناتوانێ ئومێد بخاتە دڵی کەسێکەوە، یان مانا بە ژیانی کەسێك بدات".

من سۆراخی چەند ڕێگایەکم کرد بۆئەوەی تەکساس لە چەند ڕێکخراوێکی ئایینی نزیك بێتەوە. چاوم کەوت بە (چوك کۆلسن)، ڕاوێژکاری کۆشکی سپیی ریچارد نیکسن کە ماوەیەکی لە زیندانی فیدراڵیدا بەسەر بردبوو و تۆبەی کردبوو. چوك ڕێکخراوێکی دامەزراندبوو تایبەت بە بڵاوکردنەوەی مەسیحییەت لەپشت شیشەکانی زیندانەوە. ئێمە کۆك بووین لەسەر ئەوەی کە پرۆگرامێکی بونیادنراو لەسەر ئایین لە لایەکی زیندانی تەکساس دەست پێ بکەین. پرۆگرامەکەی چوك بەناوی (دەستپێشخەریی ئازادیی گۆڕانی ناخ) ڕێنمایی دابین دەکرد بۆ خوێندنەوەی کتێبی پیرۆز و کۆرسێکی وانەکانی ژیان. پرۆگرامەکە بەهێز و کراوە دەبوو بۆ ئەو زیندانییانەی کە لە کۆتایی حوکمەکانیان نزیك ببوونەوە.

هەر زیندانییەك کە بەشدار دەبوو دەچووە لای ئامۆژگاریکەرێك و لەگەڵ ئازادبوونی لە گردبوونەوەیەکی کڵێسادا پێشوازی لێدەکرا.

لە ئۆکتۆبەری ١٩٩٧دا، من سەردانی بەندیخانەی (جێستەر دوو)م کرد لە نزیك (شوگەرلاند)ی تەکساس کە تیایدا ژمارەیەك زیندانی پەیوەندییان کردبوو بە (گۆڕانی ناخ). لە کۆتایی خولەکەدا، گروپێك لە پیاوان بە جلی سپییەوە ڕژابوونە ناو گۆڕەپانەکەوە. ئەوان نیمچە بازنەیەکیان دروست کردبوو و سرودی (ئەمەیزینگ گرەیس)یان وتبوو. پاش چەند پارچەیەك، منیش چوومە ناو کۆرسەکەوە.

بەیانیی دواتر، کارێن هیوگز ڕۆژنامەی (هوستن کرۆنیکڵ)ی بۆ هێنام. من لە یەکەم لاپەڕەی ڕۆژنامەکەدا بوو شانبەشانی گروپێکی کۆرسی بەندیخانەکە. بابەتەکە پیشانی دەدا کە پیاوەکەی تەنیشت من (جۆرج ماسن)، پێش دوانزە ساڵ بە تاوانی کوشتنی ژنێك حوکم درابوو. ئەو ڕۆژە لە گۆڕەپانی بەندیخانەکە، ئەو بە بکوژێك نەدەچوو. ئەو ڕەفتارێکی باش و خەندەیەکی نەرم و نیانی هەبوو. گومانی تیا نەبوو کە بووەتە پیاوێکی ڕۆحانی.

***

کاتێك خۆم کاندید کرد بۆ سەرۆکایەتی، بڕیارمدا تا دەستپێشخەرییەکی سەرانسەریی بونیادنراو لەسەر ئایین بکەمە بەشێکی ناوەندی هەڵمەتەکەم. لە یەکەم وتاری تایبەت بە بەرنامە و ڕێوشوێنەکەم کە لە (ئیندیاناپۆلیس) پێشکەشم کرد، وتم "لە هەر حاڵەتێکدا کە ئیدارەکەم بەرپرسیارێتییەك بەدی بکات بۆ یارمەتیدانی خەڵك، ئەوا ئێمە یەکەم جار ڕوو دەکەینە ڕێکخراوە ئایینییەکان، خێرخوازییەکان و گروپە کۆمەڵایەتییەکان".

نۆ ڕۆژ پاش دەستبەکاربوونم، من چەند فرمانێکی تەنفیزیم دەرکرد بۆ دروستکردنی ئۆفیسێکی (دەستپێشخەرییە ئایینی و کۆمەڵایەتییەکان) لە کۆشکی سپی و لە پێنج وەزارەتی کابینەکەدا. ئۆفیسەکان ڕێساکانیان گۆڕی و ئەو کۆسپانەیان شکاند کە ڕێگرن بوون لەوەی گروپە خێرخوازییە ئایینییەکان بگەنە پرۆسەی کۆمەکی فیدراڵی. بۆ جەختکردنەوە لە سروشتی بێ لایەنیی دەستپێشخەرییەکە، من چەند دیموکراتێکم دانا بۆ کارکردن وەکو یەکەم دوو بەڕێوەبەر. یەکەمیان (جۆن دیلولیۆ) بوو کە پرۆفیسۆرێکی نوێساز بوو لە زانکۆی پەنسلڤانیا. ئەویتریان (جیم تۆوی) بوو کە پیاوێکی تەواو شایستە بوو کە بەشی خزمەتگوزاریی کۆمەڵایەتیی فلۆریدای بەڕێوە بردبوو و وەکو پارێزەری (دایکە تێرێزا) کاری کردبوو. من زووزوو بە تۆوی-م دەگووت ئێمە کۆمەڵگەیەکی دادپەروەرخوازمان هەیە کە دایکە تێرێزا پێویستی بە پارێزەرێك بووە.

هەندێ گەس دەیانگوت دەستپێشخەرییە ئایینییەکە هێڵی نیوان کڵێسا و دەوڵەتی کاڵ کردووەتەوە. من ئەم نیگەرانییەم بە جددی وەرگرت. نابێ حکومەت هەرگیز ئایین بسەپێنێت. هەر هاوڵاتییەك بەو شێوەیەی کە خۆی دەیەوێ، ماف پەرستن، یان نەپەرستنی هەیە. من هەمیشە وریا بووم لەو کەسانەی کە ئایینییان وەکو چەکێکی سیاسی بەکاردەهێنا و دەیانوت ئێمە ڕاستترین لە نەیارەکانمان. دێڕی دڵخوازم لە کتێبی پیرۆز بۆ سیاسییەکان بریتییە لە (ماتێیۆ ٧:٣)- "بۆچی دەرزیەك لە چاوی براکەتاندا دەبینن، بەڵام گاسنێك لە چاوی خۆتاندا نابینن؟"

لە هەمان کاتدا، پێویست ناکات حکومەت لە ئایین بترسێت. ئەگەر پرۆگرامەکانی خزمەتگوزاریی کۆمەڵایەتیی بەڕێوەبراو لەلایەن خەڵکی ئایینییەوە خەڵك ناچار نەکەن یان جیاکاری نەکەن لەدژی ئەو خەڵکەی خزمەتگوزارییەکە وەردەگرێ، پێم وابوو

شایەنی هەلیکە بۆ کێبڕکێ لەگەڵ دۆلارەکانی باجدەر. دەبێ حکومەت پرسیار بکات کە کام ڕێکخراوە باشترین ئەنجام دەدات بە دەستەوە، نەک ئەمەی کە ئاخۆ دروشمەکەیان خاچ بووە، نیوەمانگ بووە یان ئەستێرەکەی داود.

دەستپێشخەرییەکە نزیکەی ٢٠ ملیارد دۆلاری ساڵانەی لە سندوقی فیدراڵ واڵا کرد بۆ پێشبڕکێی نێوان گروپە ئایینییەکان. زۆرێک لەو ڕێکخراوانە ئەزموونی پەیوەندیکردنیان لەگەڵ حکومەتدا نەبوو، بۆیە ئێمە چل کۆنفرانس و زیاتر لە چوارسەرد سیمیناری پەیوەست بە نوسین بۆ کۆمەکمان سازدا بۆ یارمەتیدانیان تا بزانن چۆن داوای تەمویلکردنەکە بکەن. سەرەنجام، زیاتر لە پێنج هەزار کۆمەڵ و ڕێکخراوی ئایینی، کە زۆربەیان خێرخوازیی جەماوەریی بچوک بوون، کۆمەکە فیدراڵییەکەیان وەرگرت. لە کانوونی دووەمی ٢٠٠٨دا، من سەردانی پرۆگرامی (جێریکۆ)م کرد لە خۆرهەڵاتی بالتیمۆر. پرۆگرامەکە کە لەلایەن (خزمەتگوزارییەکانی کۆمەڵگەی ئێپیسکۆپاڵ)ی ماریلاند بەڕێوە دەبرێت و بە دارایی وەزارەتی کار کۆمەک دەکرێت، ئامۆژگاری، ڕاوێژ و خزمەتگوزارییەکانی مەشقی کار بۆ پیاوانی حوکمدراوی تازە بەردراو دابین دەکات. کاتێک چوومە ناو ژوورەکە، نۆ پیاوەکەی جێریکۆ بێدەنگ بوون. من بڕێکی بەرچاوی گومانگەراییم بەدی کرد. بۆ شکاندنی بەستەڵەکەکە وتم "من لە ساتێک لە ساتەکانی ژیاندا زۆر دەمخواردەوە و دەزانم دڵێکی گۆڕاو چەندە دەتوانێ یارمەتیدەرتان بێت بۆ دەست و پەنجە نەرمکردن لەگەڵ معتادبووندا".

پیاوەکان دەمیان کردەوە و چیرۆکی خۆیان گێڕایەوە. یەکێکیان حوکمدرا بوو بە فرۆشتنی ماددەی هۆشبەر، یەکێکی تریان بە هەبوونی کۆکاین، ئەویتریان دزی. زۆرێکیان چەند جارێک زیندانی کرابوون و بەردرابوون و دەستبەرداری خێزانەکانیان ببوون. لە سایەی ئەو خزمەتگوزارییانەی کە لە جێریکۆ وەریان دەگرت، ئەوان دەستیان کردبوو بە دۆزینەوەی ماناکانیان بۆ ژیانیان. یەکێکیان بە شێوەیەکی سۆزاوی ڕوونی کردەوە کە چەندە دڵخۆش بووە بەوەی کە لەگەڵ سێ کچەکانیدا یەکی گرتووەتەوە. ئەو وتی "شەش مانگ لەمەوبەر من تێکشکابووم. ئێستاش تەوقە لەگەڵ سەرۆکدا دەکەم". ئەویتریان بە شانازییەوە پێی وتم کە دوو ئۆفەری ئیشی وەرگرتووە. وتی

"ماددەی هۆشبەر هەمیشە کێشەیەک بووە لە ژیانمدا تاوەکو ئێستا. سوپاس بۆ جێریکۆ، من ئەزموونی خۆشیم وەرگرت".

ڕێژەی تاوانگەرایی (بەردەوامبوون لە تاوان)ی ناو پرۆگرامی جێریکۆ ٢٢٪ بوو، کە زیاتر لە نیوەی تێکڕای ڕێژەکەی بالتیمۆر بوو. ئەو پیاوانەی ئەو ڕۆژە من بینیمن لەناو ئەو پانزە هەزار کەسە دابوون کە سوودمەند ببوون لە دەستپێشخەریی (داخڵبوونەوەی زیندانی) کە ئێمە لە ساڵی ٢٠٠٤دا دەستمان پێکردبوو. ڕێژەی تاوانگەراییان ١٥٪بوو، واتە یەک لەسەر سێی تیکڕای نیشتمانی.

سەرووئاساییترین کۆبوونەوەی من لەسەر دەستپێشخەرییە ئایینییەکان ڕێک لەناو هۆڵێکی ئۆفیسی ئۆڤاڵدا بوو. لە حوزەیرانی ٢٠٠٣دا، من مشتومڕێکی مێزگردم لەگەڵ سەرکردە ئایینییەکان سازدابوو. چوک کۆلسن و ژمارەیەک ئەندامی گۆڕانی ناخ ئامادەی بوون. کاتێک من بەرەو ژووری (روزڤێڵت) هەنگاوم نا، چاوم بە پیاوێکی ئەمریکی ئەفریقیی ئاشنا کەوت. بەرەو لای ڕۆیشتم و باوەشێکی گەورەم پیاکرد و وتم "دڵنیام کە دڵخۆشم بە ئامادەبوونت".

ئەوە جۆرج ماسن بوو، ئەو پیاوەی ناو کۆرسی بەندیخانەکە لە شوگەرلاند. بە ئازادبوونی، ئیشێکی وەکو دەرگاوان لە کڵێساکەی دەستکەوتبوو. ئەو بەهەمان شێوە سەرپەرشتی خوێندنەوەیەکی کتێبی پیرۆزی کردبوو و وەکو ئامۆژگاریکەری ئەوانەی تر کە بەندیخانەیان جێ دەهێشت، ئیشی کردبوو. هێزی مەسیح چ کاریگەرییەکی رزگارکەری هەیە: جۆرج ماسن و جۆرج دەبلیو بوش پێکەوەن لە کۆشکی سپی.

***

چاودێریی دەرمان کە لە ساڵی ١٩٦٥ لەلایەن سەرۆک جۆنسنەوە دامەزرێنرا، یارمەتی خەڵکێکی پیری بێشوماری دابوو تا ژیانێکی تەندروستتر بژین. بەڵام لەکاتێکدا کە دەرمان بەرەوپێش چووبوو، چاودێریی دەرمان وا نەبوو. سوودەکان لەلایەن بیرۆکراسییەکی حکومەتەوە دیاری دەکران کە بەفیڕۆدەر و خاوبوون بۆ گۆڕان. کاتێک کۆمپانیا تایبەتەکانی بیمە تێچووی پشکنینی مەکیان گرتەخۆ بۆ پارێزگاری لەدژی شێرپەنجەی مەمک، چاودێریی تەندروستی دە ساڵ و یاسایەکی کۆنگرێسی پێویست بوو.

تایبەتمەندییەکی هەرە کۆنی چاودێریی دەرمان ئەوە بوو کە تێچووی ڕەچەتەی دەرمانی دابین نەدەکرد. پرۆگرامەکە ٢٨,٠٠٠ دۆلاری پارەی نەشتەرگەریی قورحەی دەدا، بەلام ٥٠٠ دۆلاری ساڵانەی ئەو حەبانەی نەدەدا کە ڕێگرن بوون لە زۆربەی قورحەکان.

من واقم وڕما لەبەرانبەر بەسەرهاتی ئەو ئەمریکییە بەتەمەنانەی کە دەبووایە لەنێوان کڕینی دەرمان و میوەوسەوزەدا یەکێکیان هەلبژێرن. ژنێکی شەست و نۆ ساڵە کە چاوم پێیکەوت بەناوی (ماری جەین جۆنز)ی خەلکی ڤێرجینیا، دەبووایە بیست سەعات لە هەفتەیەکدا ئیش بکات تەنیا بۆ ئەوەی بتوانێ پارەی فاتورەیەکی ٥٠٠ دۆلاریی مانگانە بدات بۆ ڕەچەتەی دەرمان و ئینسۆلین. ئەو پێی وتم کە هەندێ جار سێ بۆ چوار جار دەرزی بەکارهێناوە بۆ پاشەکەوتکردنی پارە.

چاودێریی تەندروستی تەنیا بەسەرنەچووبوو، بەلکو مایەپوچ دەبوو. ئاوێتەیەک لە تێچووی بەرزبووەوەی تەندروستی و خانەنشینی بەڕێگاوەی جیلی بەلێشاو لەدایکبووان قەرزێکی تەمویلنەکراوی ١٢ تریلیۆن دۆلاری هێنابووە کایەوە. جیلی دواتر، لەناو فاتورەدا نقوم دەبوو.

ئەو تێچوونە بەرزبووەوانەی کە چاودێریی دەرمانیان مایەپوچ دەکرد کاری کردبووە سەر تەواوی سیستەمی چاودێریکردنی تەندروستی. خەرجیی تەندروستیی ئەمریکا لە ٧,٥٪ی تێکڕای بەرهەمی خۆماڵیی لە ساڵی ١٩٧٢ بۆ ١٥٪ زیادیکردبوو لە ٢٠٠٢دا. بەشێکی ڕوونکردنەوەکە تێچووی تەکنۆلۆژیای پزیشکیی نوێ بوو. کەیسە یاساییە بێ بنەماکان ڕۆلیان هەبوو. بەلام هۆکاری سەرەکی کەموکورتییەکی بنچینەیی بوو لە سیستەمەکەدا: زۆربەی خەلکی نەیاندەزانی چاودێریی تەندروستییان چ تێچوونێکی هەیە.

خەلکی پیر و خەلکی هەژار لە ڕێگەی (چاودێریی دەرمان) و (کۆمەکی دەرمانی) حکومەت پارەکەی ئەدا. زۆربەی ئەو ئەمریکییانەی کە ئیشیان دەکرد لەڕێگەی خاوەنکارەکانیان تێچوونەکەیان بۆ دابین دەکرا و پشتیان بە لایەنی سێیەم بەستبوو کە کۆمپانیایەکی بیمە بوو بۆ دانوستانکردن لەسەر نرخەکان و دیاریکردنی کرێیەکان. زۆرێك

لەو ئەمریکییانەی کە کارمەندی خۆیان بوون نەیاندەتووانی بەرگەی بیمەی تەندروستی بگرن، چونکە یاسای باج ئەوانی بێبەش کردبوو و ڕێساگەلێك خاوەن پرۆژە بچوکەکانی بەربەست کردبوو لە سەرکێشیکردن بە درێژایی سنوورە دادوەرییەکان.

ئەوەی کە سیستەمەکە لێی کەم بوو، هێزەکانی بازاڕ بوو. دۆخێکی بەکاربەرێتی یان توانای کڕین نەبوو بۆ باشترین معاملە، کێبڕکێ نەبوو بۆ ئیشی کڕیار و هیچ شەفافیەتێکیش نەبوو لەبارەی کوالیتی و نرخەوە. سەرەنجام، پاڵنەرێکی کەم هەبوو بۆ دکتۆرەکان یان نەخۆشەکان تا ئەو سەرچاوانە سنووردار بکەن کە بەکاریان دەهێنا کە زۆر گرنگ بوو بۆ کەمکردنەوەی تێچوونەکان.

من ریفۆرمی چاودێریی دەرمانم بە ڕێگایەك بینی بۆ چارەسەرکردنی دوو کێشە. یەکەم، بە زیادکردنی سوودێکی ڕەچەتەی دەرمان، ئێمە پرۆگرامەکان مۆدێرنیزە دەکرد و چاودێرییەکی تەندروستیی کوالیتیمان بۆ پیرەکان دابین دەکرد کە حکومەتەکەیان بەڵێنی لەسەر دابوو. دووەم، بە گەیاندنی سوودی دەرمان لە ڕێگەی پلانە بیمەییە تایبەتییەکانەوە کە لە پێشبڕکێدا بوون بۆ ئیشی بەساڵاچووان، ئێمە دەمانتووانی هێزەکانی بازاڕ بخەینە ناو سیستەمی چاودێریی تەندروستییەوە. ریفۆرمکردنی پرۆگرامەکە بە هەمان شێوە دەرفەتێکی دروست دەکرد بۆ فراوانکردنی (بژاردەی چاودێریی دەرمانیی زیادە)، کە دواتر بە (سوودی چاودێریی دەرمانی) ناونرایەوە کە ڕێگەیدەدا بە بەساڵاچووان تا هەموو چاودێریی تەندروستی خۆیان لە ڕێگەی پلانە بیمەییە تایبەتییە هەرزان و نەرم و نیانەکانەوە بەدەست بێنن.

دەمزانی کە ریفۆرمی چاودێریی دەرمانی، پرسێکی سیاسیی سەخت دەبێ. ناساندنی هێزەکانی بازاڕ لەناو پرۆگرامی تەندروستیی حکومەتدا، چەپەکانی تورە دەکرد. دانانی سوودێکی دەرمانی ڕەچەتەکراو، بەلای ڕاستەکانەوە ناپەسەند دەبێ. بەڵام من بڕیارمدا کە تەحەدییەك بگرمە بەر.

لەژێر باری پلانەکەماندا، ئەو بەساڵاچووانەی کەسوودێکی دەرمانیی ڕەچەتەکراویان دەویست، دەبووایە پلانە تایبەتییەکان هەڵبژێرن لەبری چاودێریی دەرمانیی بەڕێوەبراو لەلایەن حکومەتەوە. ئێمە هاوکێشەی تەمویلی چاودێریی دەرمانیمان دەگۆڕی بۆئەوەی

پرۆگرامی بەڕێوەبراو لەلایەن حکومەتەوە لە گۆڕەپانێکی تەختاندا لەگەڵ پلانە تایبەتییەکاندا پێشبڕکێ بکات. هەردوو ریفۆرمەکە هێزی بازاڕی زیاتریان دەناساند و یارمەتیدەر دەبوون بۆ موخاتەبەکردنی تێچووە بەرزبووەوەکانی چاودێریی تەندروستی.

پێش ڕاگەیاندنی پلانەکەم، پیشانی سەرکردەکانی کۆماریمدا لە ئەنجومەنی نوێنەران. پێیان وتم کە پلانەکەم دەرفەتی نابێت لە بینایەی کۆنگرێس. دیموکراتەکان هەرگیز پشتگیریی پرۆژەیاسایەك ناکەن کە پێویست دەکات بەساڵاچووان دەستبەرداری تێچووی چاودێریی دەرمانیی حکومەت بن بۆ وەرگرتنی سوودێکی دەرمانی ڕەچەتەبۆکراو. هەندێ لە کۆمارییەکانیش ڕازی نەدەبوون.

من ڕووبەڕووی بڕیارێکی سەخت بوومەوە. دەمتووانی شەڕ بکەم بۆ کەیسێکی لەدەستچوو یان سازش بکەم. بڕیارمدا سوودێکی دەرمانیی ڕەچەتەبۆکراو پێشنیار بکەم کە لەلایەن پلانە تەندروستییە تایبەتییەکانەوە بەڕێوە ببرێت، بەڵام بۆ هەموو بەساڵاچووان کراوە بێت، بەوانەشەوە کە دەیانویست تێچووی چاودێریی دەرمانی حکومی بهێڵنەوە.

تیمی چاودێرییە دەرمانییەکەم، لە نزیکەوە لەگەڵ سەرکردەی زۆرینەی ئەنجومەنی پیران (بیڵ فێرست) و سەرۆکی لیژنەی دارایی (چوك گراسلی)ی خەڵکی ئایۆوا کاری کرد. چوك بە شێوەیەکی ژیرانە دوو هاوڕێی دیموکراتی گرنگی هێنایە ناو پرۆسەی داڕشتنی ڕەشنووسەکەوە کە ئەوانیش هەردوو سیناتۆر (ماکس بۆکس)ی مۆنتانا و (جۆن برێوکس)ی لویزانا بوون. ئەوان پرۆژەیاسایەکی بەهێزیان بەرهەمهێنا کە پشتیوانیی سی و پێنج دیموکراتی مسۆگەر کردبوو. لە مانگی حوزەیراندا، ئەنجومەنی پیران پرۆژەیاساکەی بە ڕێژەی ٧٦ بۆ ٢١ دەنگ تێپەڕاند.

لە ئەنجومەنی نوێنەران، هەندێ لە کۆنسێرڤاتیڤەکان ڕەخنەیان ئاراستەی تێچوونی سوودی دەرمان کرد، کە ئێمە دواجار لەماوەی دە ساڵدا بە ٦٢٤ ملیارد دۆلار قەبڵاندبوومان. بەڵام سەرۆکی پەرلەمان دێنی هاستێرت، ڕێبەری زۆرینە (تۆم دیلەی) و سەرۆکی لیژنەی ڕێگا و ئامرازەکان (بیڵ تۆماس) هاوپەیمانێتییەکی لاوازیان پێکهێنابوو بۆ پەسەندکردنی یاساکە بە ڕێژەی ٢١٦ بەرانبەر ٢١٥ دەنگ. تەنیا نۆ دیموکراتی

ئەنجومەنی نوێنەران دەنگیاندابوو بە سوودێك کە ساڵانێك بوو داوایان کردبوو. بەشەکەی تر بە نەخێر دەنگیان دابوو. لە ماوەی مشتومڕەکەدا لەسەر نهۆمی زەمینیی کۆنگرێس، تاکە دیموکراتێکیش رەخنەی لە پرۆژەیاسای چاودێریی دەرمانی نەگرت لەبەرانبەر تێچوونە زۆرەکەیدا. زۆربەیان دەیانویست پارەی زیاتر خەرج بکرێت.

ئەو رێژە لاوازەی ئەنجومەنی نوێنەران، لێکدانی پرۆژەیاساکانی پیران و نوێنەرانی کرد بە شتێکی جەوهەری وەکو رێگایەك بۆ بەدەستهێنانی پشتگیریی کۆمارییەکان. بۆ موخاتەبەکردنی نیگەرانییەکانی تێچوون، ئێمە برگەیەکی ناودێرکراو بە پاڵنەرمان زیاد کرد کە ئەگەر خەرجیی چاودێریی دەرمان زیاتر لەوەی کە چاوەڕواندەکرا بەرزبووەوە، ئەوا پیادە دەکرا. ئەو کاتە کۆنگرێس داوای لێدەکرا تا ریفۆرم ئەنجام بدات بۆ موخاتەبەکردنی کێشەکە.

ئێمە بەهەمان شێوە رۆشناییمان خستەسەر حساباتی پاشەکەوتی تەندروستی، کە بەرهەمێکی بیمەی تەندروستیی نوێی تازەگەرانە بوو بەهۆی پرۆژەیاسایەکی ئەنجومەنی نوێنەران هاتبووە کایەوە. حساباتی پاشەکەوتی تەندروستی کە تێچوونی بۆ تاکەکەسان و کۆمپانیا بچوکەکان ئاسان دەکرد، بیمەی تەواو داشکێنراوی کەم کرێی لەدژی نەخۆشیی کارەساتبار لەگەڵ حسابی پاشەکەوتی بێ باجی لێك دەدا بۆ دانی خەرجیی پزیشکیی رۆتینی. خاوەنکاران یان تاکەکان دەیانتووانی بەشداری حسابەکە بکەن کە هی تاکەکەس بوو و دەکرا لە کارێکەوە بۆ کارێکی تر بگوازرێتەوە. لەبەرئەوەی خاوەنانی حساباتی پاشەکەوتی تەندروستی پارەی خەرجیی چاودێریی تەندروستی خۆیان دەدا و هەر پارەیەکی ماوەیان هەڵدەگرتەوە، ئەوان پاڵنەریان هەبوو بۆئەوەی هەر ساخڵەم بن، روو بکەنە باشترین معامەلە و دانوستان لەسەر نرخی باشتر بکەن.

لە ناوەراستی نۆڤەمبەردا، رێکخراوی خانەنشینانی ئەمریکا، کە گروپێکی پشتیوانیی کاریگەری بەساڵاچووان بوو، پشتگیری لە پرۆژەیاسا سازش لەسەرکراوەکە کرد. (بیل نۆڤێل)ی بەڕێوەبەری جێبەجێکاری رێکخراوەکە وتی "ئەمە پرۆژەیاسایەکی کامڵ نییە، بەڵام ئەمریکا ناتوانێ چاوەڕوانی کامڵەکە بێت". دواتر ئەو لەلایەن سەرکردە

دیموکراتییەکان، یەکێتییەکانی کرێکاران و ڕۆژنامە لیبراڵەکان ڕەخنەی لێگیرا. بەڵام هەڵوێستەکەی ئەو شانبەشانی ئەندامانی ڕاڕای کۆنگرێس ڕۆیشت.

دەنگی یەکلاییکەرەوە لە ٢١ی نۆڤەمبەری ٢٠٠٢دا درا. من و لۆرا دەمێک بوو بەرنامەمان دانابوو کە ئەو ڕۆژە لە بریتانیا بەسەر ببەین، وەکو بەشێک لە یەکەم سەردانی دەوڵەتیی ڕەسمی لەلایەن سەرۆکێکی ئەمریکییەوە لە سەروەختی ویدرۆ ویلسنەوە. هەندێ کەس پێشنیاریان کرد گەشتەکە هەڵوەشێنمەوە. من ڕەتم کردەوە. من بیری تیمەکەم هێنایەوە کە "لە لەندەن تەلەفۆن هەیە، خۆتان دەزانن".

***

من و لۆرا کاتێکی خۆشمان لەگەڵ شاژنە ئێلیزابێسی دووەم بەسەر برد کە ژنێکی جادوویی سەنگین بوو بە حەزێکی گاڵتەی توندەوە. لە ساڵی ٢٠٠٧دا، بەڕێزیان لەگەڵ شازادە فیلیپ هاتبوون بۆ ئاهەنگی یادی چوارسەدساڵەی نیشتەجێکردنەکەی (جەیمزتاون). لە وتەی بەخێرهاتنەکەمدا لەبەردەم حەوت هەزار کەس لەسەر فریزی باشوور، سوپاسی شاژنم کرد لەبەرانبەر دۆستایەتییە لەمێژینەکەی لەگەڵ ئەمریکادا. وتم "ئێوە یارمەتی گەلی ئەمریکاتاندا تا ئاهەنگی خۆی بگێڕێت لە ...١٧" خۆم ڕاگرت بەر لەوەی بەروارەکە تەواو بکەم ، ١٧٧٦ کە ساڵێکی گرژ بوو لە پەیوەندییەکانی ئەمریکا-بریتانیا و توانجێک بوو لە تەمەندرێژیی شاژنی هەشتاویەک ساڵە خەندەیەکی ناراستەوخۆی ئاراستەکردم. وتم "شاژن نیگایەکی تێبڕیم کە هەر دایک لە منداڵەکەی دەگرێت". لە ئێوارەخوانێکدا لە باڵیۆزخانەی بریتانیا شەوی دواتر، شاژن وتی "نەمدەزانی ئاخۆ بڵێم ساڵی ١٧٧٦ ئەو کاتەی کە لێرە بووم..."

میواندارێتیی شاژنە ئەلیزابێس لە کۆشکی بەکینگهام لە ماوەی سەردانە دەوڵەتییەکەماندا لە ٢٠٠٣، بێ وێنە بوو. ئێمە کاتێک لە گۆڕەپانەکە پاسەوانیی شەرەفمان پشکنی، سڵاوێکی ٤١ یەک کەسیمان لێکرا و لە شوقەیەکی بەلجیکیی پاک و خاوێنی ڕێک و پێک خەوتین. ژوورەکەمان هی مامی شاژنە ئەلیزابێس، شا ئێدواردی سێیەم بوو پێش ئەوەی لە ساڵی ١٩٣٦دا دەستبەرداری تەختی پاشایەتی بێت بۆ هاوسەرگیریکردن لەگەڵ ژنێکی جیابووەوەی ئەمریکی. ئاوێنەیەکی سێ سەد ساڵە، بایی

نزیکەی ١٥ ملیۆن دۆلار کەلوپەلی کۆنی تێدابوو و لەوێشەوە دیمەنێکی جوانی باخچەی کۆشکەکە دەبینرا. لە چاخواردنەوەکەی دوانیوەڕۆماندا لەگەڵ فەخامەتیان و شازادە فیلیپدا، لەبارەی سەگەکانییەوە پرسیارم لە شاژن کرد. چەند خولەکێك دواتر، کارەکەرێك بە سەگێکی بچوکەوە دەرکەوت. ئەوان بەرێز و دۆستانە بوون. تاکە ئومێدم ئەوە بوو کە ئەگەر (بارنی) چاوی بە شاژن بکەوتایە، وەکو ئەوان بەباشی رەفتاری دەنواند– و بۆ سەربەخۆیی سکۆتلەندە نەدەوەڕی.

ئەو ئێوارەیە، شاژن و شازادە فیلیپ خوانێکی دەوڵەتیی جوانیان لەسەر شەرەفی ئێمە رێك خست. شوێنەکەی ئێمە دە پارچە کەرەستەی زیو و حەوت پێکی شەرابی کریستاڵی لێ دنرابوو. دیاربوو کە هەواڵ نەگەیشتبووە مۆبەخی پاشایەتی لەبارەی ئەوەی کە من کحولم وازلێهێناوە. بەر لەوەی لە قاتە رشە و قەمیسە سپییەکەمدا بۆ تۆست کردنەکە بوەستم، سەیرێکی لۆرام کرد لە درێسە شەرابییە جوانەکەیدا. بیرم لەوە دەکردەوە ئاخۆ هەمان بیرکردنەوەی منی هەبێ: ئێمە لە گوشتبرژێنەکەی حەوشەی پشتەوەی میدلاندەوە ئەو رێگا درێژەمان بڕیووە.

***

حاڵەتە دەوڵەتییەکەی بەکینهام پالاس جیاوازییەکی گەورەی پیشاندا لەگەڵ ئەوەی کە لە گەشتی گەڕانەوەی بەرەو وڵاتمدا چاوەڕێم دەکرد. کاتێك هێزی ئاسمانیی یەك بەرز بووەوە، بەڕێوەبەری یاسادانان (دەیڤد هۆبز) تەلەفۆنی بۆ کردم و لیستێکی پێدام کە دە دوانزە ئەندامی ڕاڕای ئەنجومەنی نوێنەرانی لەخۆگرتبوو کە زۆربەیان کۆنسێرڤاتیڤ بوون. من لەسەر ئۆقیانووسی ئەتڵەسییەوە دەستم کرد بە تەلەفۆنکردن دەنگ خڕکردنەوە. ژمارەیەك لە کۆنگرێسمانەکان بەردەست نەبوون بۆ وەڵامدانەوەی تەلەفۆنەکەم. ئەندامێکی گەنج وەڵامی دایەوە "من بۆئەوە نەهاتووم بۆ واشنتن تا قەبارەی حکومەت گەورە بکەم". منیش لە وەڵامدا وتم "منیش هەروا. من بۆ ئەوە هاتووم تا دڵنیا بمەوە کە حکومەت باش کار دەکات. ئەگەر بڕیار وایە پرۆگرامێکی چاودێریی دەرمانمان هەبێت ئەوا دەبێ مۆدێرن بێ نەك تێکشکاو".

ئەویش وتی "ئەمەش تەنیا ئیمتیازێکە کە تاهەتایە گەورە دەبێت".

له وه‌ڵامدا وتم "كه‌واته تۆ له‌گه‌ڵ هه‌ڵوه‌شاندنه‌وه‌ی چاودێریی ده‌رماندایت؟ ئه‌مه ده‌رفه‌تێكه بۆ هێنانه‌كایه‌ی كێبڕكێ له ناو سیسته‌مه‌كه‌دا و راگرتن تێچوونه‌كان له نزمیدا. هه‌روه‌كو خۆت ده‌زانی ئه‌مه یه‌كجار زۆر باشتره له‌و كاره‌ی كه له هه‌ر سه‌رۆكێكی تر ره‌نگه ده‌ستت كه‌وێت"

ئه‌و قایل نه‌بوو. كاتێك گه‌یشتمه‌وه واشنتن زنجیره‌یه‌ك ته‌له‌فۆنی ترم كرد. ئێمه خه‌ریكی ئه‌نجامدانی به‌ره‌وپێشچوونێك بووین، به‌ڵام دیار بوو كه سه‌خت ده‌بوو. كاتێك ئه‌نجومه‌نی نوێنه‌ران له سه‌عات ۳ی به‌ره‌به‌یاندا ده‌نگی دا، هه‌ژماره‌كه كورتی هێنا. سه‌رۆكی په‌رله‌مان دانی هاستێرت، ده‌نگدانه‌كه‌ی به كراوه‌یی هێشته‌وه به‌و ئومێده‌ی كه كه‌مێك له كۆنگرێسمانه‌كان ده‌نگه‌كانیان بگۆڕن. رێك پێش ٥ی به‌ره‌به‌یان، ده‌یڤد هۆبس به ته‌له‌فۆنێك بێداری كردمه‌وه، وتی "ته‌نیا دوو ده‌نگمان پێویسته. ده‌توانی قسه له‌گه‌ڵ چه‌ند كۆنگرێسمانێكی تردا بكه‌یت؟"

ئه‌و مۆبایله‌كه‌ی به چه‌ند ئه‌ندامێكی كۆماری ده‌ستاوده‌ست پێكرد بۆئه‌وه‌ی كه بشێ بیركردنه‌وه‌یان بگۆڕن و رازی ببن. ئه‌وه‌نده‌ی كرا به‌باشترین شێوه داكۆكیم له كه‌یسه‌كه‌م كرد. كه‌مێك دواتر ده‌یڤد ته‌له‌فۆنی كرده‌وه. موعجیزه‌ی موعجیزه‌كان، ئه‌نجومه‌نی به رێژه‌ی ۲۲۰ به ۲۱٥ پرۆژه‌یاساكه‌ی په‌سه‌ند كردبوو. چه‌ند رۆژێك دواتر نۆره‌ی ئه‌نجومه‌نی پیران هات. من له ۸ی دیسه‌مبه‌ری ۲۰۰۳دا، یاسای ۲۰۰۳ی مۆدێرنیزه‌كردنی چاودێریی ده‌رمانم له هۆڵی (ده‌ستوور) واژۆ كرد. له پشت په‌رده‌وه، گروپێك به‌ته‌مه‌ن هه‌بوون كه سوودیان له یاسا نوێكه وه‌رده‌گرت. یه‌كێك له‌وانه ماری جه‌ین جۆنز بوو، ئه‌و ژنه‌ی (ڤێرجینیا) كه ده‌بووایه ده‌رزییه‌كانی به‌كاربهێنێته‌وه بۆ ته‌حه‌مولكردنی ئینسۆلینه‌كه. سوودی ده‌رمانی ره‌چه‌ته‌كراو ساڵانه نزیكه‌ی ۲,۷۰۰ دۆلاری بۆ پاشه‌كه‌وت ده‌كرد.

یاسا نوێكه داوای كرد سوودی ده‌رمانی ره‌چه‌ته‌كراو له ۱ی كانوونی دووه‌می ۲۰۰٦دا پیاده بكرێت. گومانگه‌راكان ده‌یانگوت پیره‌كان كێشه‌یان بۆ دروست ده‌بێ له هه‌ڵبژاردن له‌نێوان بژاره تایبه‌تییه پێشبڕكێكاره‌كاندا. من بڕوام وابوو كه به‌ساڵاچووان توانایه‌كی

زۆریان دەبێ بۆ بڕیاردان لەبارەی ژیانی خۆیان و دەبێ حکومەت متمانەیان پێبکات کە ئەوان دەتوانن ئەمە بکەن.

وەزیری تەندروستی و خزمەتگوزارییە مرۆییەکان (مایك لیڤیت) لەگەڵ بەڕێوەبەری چاودێریی دەرمان (مارك مکلێلان) کاریان لەسەر هەڵمەتێکی گەورەی نزیکبوونەوەی گشتی کرد. ئەمەش ئەنجامی هەبوو. زیاتر لە ٢٢ ملیۆن بەساڵاچوو لە ماوەی پێنج مانگی سەرەتایی ناونوسیندا، بەشداریی خۆیان نیشاندابوو بۆ سوودی دەرمانی رەچەتەکراو. لە راپرسییەکی ٢٠٠٨دا، ٩٠٪ی وەرگرانی سوودی دەرمانی رەچەتەکراوی چاودێریی دەرمانی – ٩٥٪ی سوودمەندانی کەم داهات– وتبوویان کە دڵیان بە پرۆگرامەکە خۆشە.

سەرەنجام، مۆدێرنیزەکردنی چاودێریی دەرمانی ئاڵوگۆڕێك بوو. ئێمە سوودێکی نوێی خواستراومان هێنایەکایەوە، بەڵام پارەیەکی زۆرترمان لەوەی کە ویستبووم خەرج کرد. ئێمە پێشبڕکێیەکی پەیوەست بە بازاڕمان لەناو پلانە دەرمانییە تایبەتەکاندا هێنایە کایەوە، بەڵام نەمانتوانی سوودی نوێ وەکو هێزێك بەکاربهێنین بۆ جوڵاندنی ژمارەیەکی زیاتری بەساڵاچووان لە چاودێریی دەرمانیی حکومییەوە بۆ ناو پلانەکانی چاودێریی دەرمانی تایبەت بجوڵێنین. ئێمە حساباتی پاشەکەوتی تایبەتیمان دروست کرد، بەڵام نەمانتووانی کۆنگرێس رازی بکەین بەوەی کە داوا لە چاودێریی دەرمانیی حکومی بکات تا لە هەمان ئاستی یەکساندا کێبڕکێ بکات لەگەڵ پلانە تایبەتییەکاندا.

بە هاتنی ئەو کاتەی کە ئۆفیسم جێ هێشت، زیاتر لە ٩٠٪ی سوودمەندانی چاودێریی دەرمانی، تێچووی دەرمانی رەچەتەیان هەبوو. دە ملیۆن کەس لە رێگەی سوودی چاودێریی تەندروستییەوە، بەشداری پلانەکانی چاودێریی تەندروستیی کەرتی تایبەتییان کردبوو. نزیکەی حەوت ملیۆن ئەمریکی، خاوەنی حسابی پاشەکەوتی تەندروستی بوون، کە زیاتر لە یەك لەسەر سێی ئەو ژمارەیە پێشتر بیمەی تەندروستییان نەبوو.

***

لە سایەی پێشبڕکێی نێوان پلانەکانی کەرتی تایبەتدا، تێکڕای کرێی مانگانەی تێچووی دەرمانی رەچەتە لە یەکەم ساڵدا لە مەزەندەیەکی سەرەتایی ٣٥ دۆلارەوە

دابەزی بۆ ٢٣ دۆلار. بە هاتنی ٢٠٠٨، مەزندەی سەرەتایی ٦٣٤ ملیارد دۆلار دابەزیبوو بۆ ژێر ٤٠٠ ملیارد دۆلار. سوودی دەرمانی رەچەتەکراوی چاودێریی دەرمانی یەکێك بوو لەو پرۆگرامە کەمانەی حکومەت کە بەباشی چووە ناو بودجەوە. هێزەکانی بازاڕ کاریگەرییان هەبوو. ئێمەش سیستەمی چاودێریی تەندروستیمان بە ئاراستەیەکی ڕێکدا جوڵاندبوو: دوور لە کۆنترۆڵی حکومەت و بەرەو بژارەکان و پێشبڕکێی سیستەمی بازاڕی تایبەت، کە باشترین ڕێگەیە بۆ کۆنترۆڵکردنی تێچوونەکان لە دوورمەودا دا.

***

لە سالی تازەی ٢٠٠٤دا لە باشووری تەکساس کاتێك لەگەڵ باوکم باڵندەی (کوەیڵ)مان راو دەکرد، بە باوکمم وت "گەشبینم. ئەم هەڵبژاردنە لەسەر ئەوەیە کە کێ دەزانێ چۆن سەرکردایەتی بکات، کێ دەتوانێ پرسە گەورەکان بخاتە ئەستۆی خۆی و کێ دەتوانێ ئەمریکا بپارێزێت".

باوکم نیگەران بوو. ئەو بۆ ماوەی چەند مانگێك تێبینی ئەوەی دەکرد کە چۆن دیموکراتەکان پلارم تێدەگرن. پلارەکان کاریگەرییان هەبوو. پلەی پەسەندیم پاش ١١ی سێپتێمبەر گەیشتبووە ٩٠٪ و پاش ئازادکردنی عێراق دابەزیبوو بۆ ٣٥٪. بە هاتنی کۆتایی ٢٠٠٣، لە هەندێ راپرسییەکاندا پلەکە لە پەنجاکاندا بوو. باوکم پێشتر ڕێساکەی بینیبوو. پلەی پەسەندییەکی لە ١٩٩١دا فڕیبوو، پاشان بەر لە هەڵبژاردنی ١٩٩٢، بە تەواوی دابەزیبوو.

من دڵنیام کردەوە کە کارل ڕۆڤ ـی هاوڕێی هەردووکمان، هەڵمەتێکی ستراتیژیی بەهێزی گەڵاڵە کردووە. وتم "ئەگەر ئێمە بە دروستی ئەنجام بدەین، ئەوا زۆر باش دەبێت. بەتایبەت ئەگەر ئەوان (هاوەرد دین) کاندید بکەن".

من ئەو دیموکراتەی پێشەوەی کاندیدکراوەکان، حاکمی پێشووی (ڤێرمۆنت)م لەو بۆنانەوە دەناسی کە لە ١٩٩٠ەکاندا ئامادەیان بووین. دین زۆر مکوڕ، بەرزەفڕ و دیسپلین نەکراو بوو. من زۆر بە تەنگەوە بووم کە ئەو لە پاڵاوتنەکەدا دەرچێت.

بەداخەوە، پێشەنگیی دین نەما بەر لەوەی کە دەنگی تاکە نوێنەرێك بباتەوە. (جۆن کێری)ی ماساشوسێتس سەرکەوتنێکی ناجێگیری لە ئایۆوا بەدەست هێنا، هەڵبژاردنە

بەرالییەکانی نیوهەمپشایەری بردەوە و بازی دایە ناو پالاوتنەکە. کێری کە جەنگاوەرێکی دێرینی ڤێتنام و سیناتۆرێکی چوار خولە بوو، زۆری خۆی ماندوو دەکرد، مشتومڕکارێکی لێهاتوو بوو و هەڵمەت بەڕێوەبەرێکی سەرسەخت بوو. من ئەوم بە نەیارێکی پایەدار لەقەڵەمدا.

کێری بەهەمان شێوە خاڵی لاوازی هەبوون. ئەو ئەقڵیەتێکی پرۆسەگەرای یاسادانەرێکی لەمێژینەی هەبوو بۆ تۆماری دەنگەکانییەوە لیبراڵترین کەسی ئەنجومەنی پیران دەهاتە ژمار. لە پاییزی ٢٠٠٣دا، ئەو لە دژی پرۆژەیاسایەکی ٨٧ ملیارد دۆلاری بۆ تەمویلکردنی سەربازان لە عیراق و ئەفغانستان دەنگی دابوو. ماوەیەکی کورت پاش پالاوتنی، هەڵمەتەکەم ریکلامێکی خستەگەڕ بۆ ڕۆشنایی خستنەسەر هەڵوێستەکەی. کێری لە وەڵامدا وتبووی "لە راستیدا من دەنگم بە ٨٧ ملیاردەکە دابوو بەر لەوەی دەنگی لەدژ بدەم".

هەر لەو ساتەدا کە گوێم لە دەنگەکە بوو، قسەم لەگەڵ کارل کرد. وتم "ئێمە وەها دەست پێدەکەین". "گەلی ئەمریکا وا لە سەرۆکەکەی چاوەڕێ دەکات کە هەڵوێستێکی روونی هەبێت و داکۆکی لێ بکات، بەتایبەت کاتێ پەیوەندی هەیە بە پشتیوانیکردن لەو سەربازانەی کە لە جەنگدان". ئێمە پەتپەتێنەکەیمان گرت و بەدرێژایی پاشماوەی هەڵمەتەکە لەگەڵیدا رۆیشتین.

***

لە ١٠ی ئازاری ٢٠٠٤دا، نامەیەکم لە جێناوە پێگەیشت کە لە دوایین ساڵی زانکۆی تەکساس بوو. لە ساڵی ٢٠٠٠دا، نە جینا و نە باربارا ئامادەی تاکە بۆنەیەکی هەڵمەتەکەشم نەبوون. ئەوان جەختیان لەوە کردبووەوە کە پەیوەندییان بە سیاسەتەوە نییە. بۆیە خوێندنەوەی قسەکان جێنا سەرسوڕهێنەر بوون:

"باوکی بەڕێزم

شەوی رابردوو زیندە خەوێکم بینی، زیندە خەوێك کە بە گریانەوە لێی راچڵەکیم. هەرچەندە من هێشتا ئەوەندەی تۆ رۆحانی نیم، من ئەم خەونەم وەکو نیشانەیەك

وەرگرت. تۆ بە درێژایی ژیانت کارت کردووە بۆ ئەوەی هەرچییەک کە من و باربارا پێویستمانە پێمان بدەیت. تۆ خۆشەویستی، پشتگیریت بە ئێمە بەخشیوە و دەزانم هەر بڕیارێک کە داوتە ئێمەشت خستووەتە ناو.

تۆ و دایکم مانای خۆشەویستی بێ مەرجتان فێری ئێمە کرد. من دەمبینی کە دایکم خۆنەویستانە، بە نەرمییەوە خۆی دایە دەست باوکە لەکاتێکدا کە ئازاری دەچەشت. منیش بینیم کە تۆ سالێکی تەمەنی ژیانت بە گامپی بەخشی. من لەگەڵ ئەو ئازارەی تۆدا بووم لە شەوی هەڵبژاردندا. لە تەمەنی بیست و دوو سالیدا، دواجار من فێری ئەوە بووم کە ئەو ئازارە هەستی چۆنە.

رقم لەو درۆیانەیە کە لەبارەی تووە دەوترێن. رقم لەوە خەڵکی رەخنەت لێبگرن. رقم لەوەیە کە خەڵکی ناتوانن ئەو کەسە ببینن کە من خۆشم دەوێ و رێزی لێ دەگرم، کەسێک کە هیوادارم رۆژێک لە رۆژان وەکو ئەو بم.

هەر لەبەر ئەو هەموو هۆکارانەیە کە بڕیارم داوە ئەگەر تۆ بتەوێ، ئەوا لە پاییزەکەدا تەواوی کاتەکە ئیشت بۆ دەکەم. تکایە بیری لێ بکەرەوە، قسەش لەگەڵ دایکم بکە و وەڵامم لێ بگێڕەرەوە. لە ئێستادا من وازم هێناوە لە فۆرم پڕکردنەوە بۆ کار لە نیویۆرک. دەزانم لەوانەیە کەمێک دەست و پێ سپی بم، بەڵام بە مەشقێکی باش، دەتوانم وا لە خەڵکی بکەم ئەو باوکە ببینن کە خۆشم دەوێت.

لەوانەیە ئەمە لە بڕیارێکی تەنگەتاوانە و ناکاوەوە بێت، بەڵام بە بەردەوامی بیرم لێکردووەتەوە. دەمەوێ هەوڵ بدەم شتێکت پێ ببەخشم کە تۆ لەو بیست و دوو سالەدا بە منت بەخشیووە.

لە خەوەکەمدا، من یارمەتی تۆم نەدا. کەسێکیشم بینی بردوویەتەوە کە نەدەبووایە. بۆیە گریام، بۆ تۆ گریام، بۆ ولاتەکەمان و بۆ گوناهی خۆم گریام. نامەوێ خەوەکەم ببێتە راستی، بۆیە ئەگەر دەکرێ بەشێوەیەک لە شێوەکان یارمەتیت بدەم، تکایە رێگەم پێبدە. دەتوانین لە جەژنی ئیستەر (فصح)دا زیاتر قسەی لەسەر بکەین.

دڵسۆزت

جێنا"

هێشتا کە ئەو قسە جوانانەم بیر دێنەوە خەریکە دەخنکێم. ئەمە بەهەمان شێوە ڕەنگدەرەوەی هەست وسۆزی بارباراش بوو..من دڵخۆش بووم کە ویستبوویان بێنە پاڵ هەڵمەتەکەوە. دوایین هەڵمەتی من، یەکەمی ئەوان دەبێ.

یەکەم بۆنە من و باربارا تیایدا ئامادە بووین، گردبوونەوەیەك بوو لە بەردەم پانزەهەزار کەس لە (مارکیت)ی میشیگان، کە شارۆچکەیەکی سەرووی بوو و لە سەروەختی (ویلیام هاوەرد تافت)ەوە هیچ سەرۆکێك سەردانی نەکردبوو. پێش ئەوەی وتارەکەم پێشکەش بکەم، باربارا لە ریزی پێشەوەی پشت مینبەرەکەوە شوێنی خۆی گرت.

ڕاگەیەنەرەکە منی ناساند و ئامادەبووان هوتافیان کێشا. کاتێك بۆ لای مایکرۆفۆنەکە هەنگاوم نا، رووم وەرگێڕا بۆئەوەی سەیرێکی باربارا بکەم، فرمێسك بەسەر کوڵمەکانیدا جۆگەلەیان بەستبوو. پاش بەسەربردنی چوار ساڵ لە کەمپی کۆلێژ، ئەو تووشی سەرسوڕمان بوو کە ئەو پشتگیرییە پڕجۆش و خرۆشەی بۆ باوکی بینی. ئەمە ئەو هەستەی هێنامەوە یاد کە بۆ باوکم هەمبوو کاتێك گوێبیستی هوتافکێشانی خەڵك بووم بۆی. بازنەکە کامڵ بوو.

***

لە هەندێ رووەوە، هەڵمەتی ٢٠٠٤ ئاسانتر بوو لەوەی ٢٠٠٠. من سوودم لە تەڵەزگەکانی سەرۆکایەتی وەرگرت، بەتایبەت هێزی ئاسمانیی یەك و مارین یەك. لە روویەکی ترەوە، ٢٠٠٤ سەختتر بوو. من هەم کاندید و هەم سەرۆك بووم، دەبووایە باڵانسێك لەنێوان ئەو دووانەدا دروست بکەم.

من هێزم لە خەڵکی دەوروبەرم وەردەگرت، بەتایبەت لۆرا و کچەکان. من حەزم لە گەشتەکانمان بوو بە پاس بە خۆرئاوای ناوەڕاستدا کە هەزاران هاوڵاتی لەمبەر بۆنەوبەری شەقامە سەرەکییەکانی شارۆچکە بچوکەکان ریزیان بەستبوو. رۆژێکیان لە (ویسکنسن) ئێمە لە زێدی (دیك تەب) خڕ بووینەوە، ئەو دکتۆرە فرە بەهرەیەی هێزی ئاسمانی کە بۆ هەموو شوێنێك لەگەڵ مندا سەفەری دەکرد. من دروشمێکی دەستنووسم

خوێندەوە کە لێی نوسرابوو "بەخێربێیتەوە، دکتۆر تەب!" بە پیتی بچوک لە ژێریشیەوە نوسرابوو "تۆش، جۆرج دەبلیو".

هیچ شتێك ئەوەندەی پشتیوانەکانم لە رەوگەی هەڵمەتەکەدا رۆحیان ئاسودە نەکردم. جۆش و خرۆش و دڵسۆزییان ئیلهامی پێدەدام ئەوەندە خۆم ماندوو بکەم کە نائومێدیان نەکەم. لە شارۆچکەی ١٦,٥٠٠ کەسیی (پۆپلار بلەف)ی میزوری، ٢٣,٠٠٠ کەس ئامادەی وتارەکەم بوون. لە شارۆچکەی (وێست چێستەر)ی ئۆهایۆ، ٤١,٠٠٠ کەس پارکی (ڤۆیس ئەڤ ئەمێریکا)یان پڕ کرد. کاتێك هەڵوێستە گۆڕاوەکانی (جۆن کێری)م خستەڕوو، دەریایەك لە دەستەکان بەلای راست و چەپدا چوون و هاتن و هوتافی "پەت پەتێن، پەت پەتێن"یان دەکێشا. هەندێ کەس جلی شێوە نەعل (کە بە ئینگلیزی فلیپ فلۆپ هەمان مانای نەعلی هەیە)یان لەبەردا بوو. من گروپی نوێم ناسین لەوانەش گروپی پارێزەرانی بوش، ئۆهایۆکانی بوش و گروپە دڵخوازەکەی باربارا و جینا، گروپی دوانەی بوش.

من بەتایبەت بەو دێرانە هان دەدرام کە نوسرابوون (خوا بەرەکەتت بدات). لەکاتێکدا کە تەوقەم دەکرد و ئەوەستام بۆ وێنە گرتن، سەرسام بووم بە ژمارەی ئەو کەسانەی کە هەمان ئەو وشانەیان دووبارە دەکردەوە "ئێمە نزا بۆ تۆ دەکەین". پێم وتن کە نزاکەیان دیارییەکی بێ وێنەیە. ئەوان هێزیان پێدام. بینینی ئەو دەنگدەرانەش ئومێدی ئەوەی پێ بەخشیم کە هەندێ لە پشتیوانانی بوش کە پاش ئاشکرابوونی (لێخوڕینی ژێر کاریگەری کحول) لە ساڵی ٢٠٠٠دا لە ماڵەوە مانەوە، ئەمجارەیان لە ٢٠٠٤دا دێنەوە بەردەم سندوقەکانی دەنگدان.

***

جۆن کێری–ش پشتیوانی خۆی هەبوو. فیلمسازی هۆلیود مایکڵ مور، بە فیلمێکی دۆکیومێنتارییەوە دەرکەوت کە شتێك نەبوو جگە لە هەڵمەتی پرۆپاگەندە. لە بەرانبەردا کێری وتی، سەرگەرمکەرانی هۆلیود "دڵ و رۆحی وڵاتەکەمانیان" گەیاندووە. کۆمەکبەخشانی وەکو (مۆگول جۆرج سۆرۆس) بڕی گەورەگەورەی پارەیان دایە کێری لە رێگەی (٥٢٧ەکان) رێکخراوێکی کۆمەك کۆکەرەوە کە بەسەر ئەو یاسایانەی دارایی هەڵمەتدا پەڕیبوونەوە کە زۆرێك لە دیموکراتەکان پێشەنگی بوون. هەلگەڕاوەکانی ستاف

سی.ئای.ئەی زانیارییان دزەپێکردبوو بە مەبەستی ئیحراجکردنی ئیدارەکە. هێرشەکە راپۆرتی ساختەی دان رازەری لێکەوتبووەوە لەسەر بنەمای ساختە لەمەڕ ئەوەی کە من لە گاردی نیشتمانیی ئاسمانیی تەکساس ئەرکی خۆمم رانەپەڕاندووە.

لەکاتێکدا کە میدیا تامەزرۆی ئەوە بوو خزمەتی سەربازیم بپشکنێت، تامەزرۆییان کەمتر چاوبرسیانەتر بوو کاتێک دەهاتنەسەر کێری. لە شوباتی ٢٠٠٤دا، من و تیم روسێرت کەوتینە ناو گفتوگۆیەکی یەک سەعاتەی رووبەڕوو. پاش پرسیارکردنی بەشێوەیەکی سەرەکی لەبارەی عیراقەوە، فشاری بۆ هێنام کە ئاخۆ هەموو تۆمارەکانی پەیوەست بە سوپام دەخەمە بەر چاوی گشتی. بەڵێنمدا کە ئەمە بکەم. ماوەیەکی کورت پاش ئەمە، بە وەزارەتی بەرگریم وت کە هەر دۆکیومێنتێکم کە پەیوەندی بە خزمەتی گاردەوە هەیە بڵاوی بکاتەوە. پاش ئەوەی کامێراکان کوژانەوە، تیم وتی "ئەمڕۆ کارێکی باشت ئەنجامدا جەنابی سەرۆک".

وتم "سوپاس تیم، هیواداریشم ئەوەندەش لەگەڵ کێریدا سەرسەخت بیت لەبارەی تۆمارە سەربازییەکانیەوە". وتی "بڕوام پێبکە هەروا دەبم."

تیم دوو مانگ دواتر گفتوگۆی لەگەڵ جۆن کێری کرد و لەبارەی تۆمارە سەربازییەکانی پرسیاری لێکرد. کێری بەڵێنیدا کە لەماوەی هەڵمەتەکەیدا بیانخاتە بەردەم خەڵك. بەڵام هەرگیز ئەمەی نەکرد.

لە کۆنفرانسی نیشتمانیی دیموکراتەکاندا لە (بۆستن)، کێری هاوتا کەشتیوانەکانی پێشووی بانگهێشت کرد و بە سڵاوێکی سەربازی پاڵاوتنەکەی قبوڵ کرد. لە یەکەم دێڕی قسەکانیدا وتی "من جۆن کێریم و من راپۆرتی کارەکەم ئەگەیەنم". وتارەکەی بانگەوازێك بوو بۆ "وتنی راستی بە گەلی ئەمریکا" و بەڵێنیدا کە "فەرماندەیەکی گشتی بێت کە هەرگیز گومڕای شەڕمان ناکات".

بەلگاندنەکەی کێری لەمەڕ ئەوەی کە من وڵاتەکەم بەرەو عیراق گومڕا کردووە لە تاقیکردنەوەی ژیریی گشتی دەرنەچوو. وەکو ئەندامێکی ئەنجومەنی پیران لە ساڵی ٢٠٠٢دا، هەمان ئەو هەواڵگرییەی منی لە بەردەستدا بوو و گەیشتە ئەو قەناعەتەی کە دەنگی پشتگیری بە بڕیاری جەنگ بدات.

کێری خۆی خستبووە ناو هاودژییەکەوە. من لە وێستەگەیەکی هەڵمەتەکەمدا لە (نیوهەمپشایەر) وتم "نەیارەکەم وەڵامی ئەو پرسیارەی نەدایەوە، کە ئێستا ئێمە دەیزانین، ئاخۆ پشتگیریی جەنگی عیراقی کردووە یان نا". چەند رۆژێك دواتر، کێری بە قولاپەکەوە بوو. وتی "بەڵێ، دەنگم بە مۆڵەتدانەکە داوە".

ئەمە دانپیانانێکی سەیر بوو. پاش بەکارهێنانی سەکۆی گەورەی کۆنفرانسەکەی بۆ تۆمەتی ئەمەی کە من ئەمریکا بەرەو جەنگ گومڕا کردووە- یەکێك لەو تۆمەتە هەرە جددییانەی کە هەر کەسێك دەتوانێ بیخاتە ملی فەرماندەیەکی گشتی- جۆن کێری وتی ئەگەر جارێکی تر هەلی بۆ بڕەخسێتەوە ئەوا مۆڵەتی جەنگ دەداتەوە.

***

بردنەوەی کەیسەکە لە کێری گرنگ بوو، بەڵام بەهەمان شێوەش گرنگ بوو کە پیشانی دەنگدەرانی بدەم بەردەوام دەبم لە لەئەستۆگرتنی پرسە گەورەکان. من کاربەدەستی گەورەی وەکو (ئان ریچاردن)م بینیبوون کە هەڵمەتی روانین لە رابردوویان بەڕێوە دەبرد و سوێندم خواردبوو کە هەڵەکانیان دووبارە نەکەمەوە. وتم "تاکە هۆکارێك بۆ روانین لە رابردوو لە هەڵمەتێکدا، ئەوەیە دەستنیشانی بکەیت کێ باشترینە لە ئاراستەکردنمان بەرەو پێشەوە. هەرچەندە زۆرمان کردووە، بەڵام من لێرەم بۆئەوەی پێتان بڵێم زۆر ماوە بیکەین".

لە کۆنفرانسی کۆمارییەکان لە نیویۆرك و لە وتارەکانی سەرانسەری وڵاتمدا، ئەجێندایەکی تامەزرۆی دووەم خولم گەڵاڵە کرد. پەیمانمدا ئاسایشی کۆمەڵایەتی مۆدێرنیزە بکەم، سیستەمی کۆچبەرێتی ریفۆرم بکەم، یاسای باج چاو پێدابخشێنمەوە، لەکاتێکدا کە لەسەر (هیچ منداڵێك پشتگوێ ناخرێت) و دەستپێشخەرییە ئایینییەکە، ریفۆرمی چاودێریی دەرمان پیادە بکەم و لەسەروو هەموویانەوە جەنگی دژەتیرۆر بەردەوام بم.

من بە درێژایی پاییزەکە بە سەرانسەری وڵاتدا هاتم و چووم بە ناوبرێکەوە بۆ هەر یەکێك لە سێ رووبەڕووبوونەوەکان. یەکەمیان لە زانکۆی مایامی بوو. رووبەڕووبوونەوەکە بەشێوەیەکی بەهێز بەلای جۆن کێریدا شکایەوە. وەکو زۆرانبازێکی

گەوگەر، پاش هەر پرسیارێك لە سوچەكەیەوە دەردەپەڕی و بە جۆش و خرۆشەوە دەستی رادەوەشاند. ئەم تەكنیكە زۆر كاریگەر بوو. من كاتێكی زۆرم بەسەر دەبرد لەوەدا كە كام لەو هێرشە زۆرانەی وەلام بدەمەوە.

منیش بەشێوەی كەوانەی دەستم راوەشاند. كاتێك كێری وتی دەبێ كردەوەی سەربازیی ئەمریكا بە پشكنینی جیهانیدا تێپەڕێت، من دژی وەستامەوە و وتم "من نازانم كۆمت مەبەستت چییە لەوەی كە "بە پشكنینی جیهانیدا رەت ببێت... بۆچوونی من ئەوەیە كە تۆ كردەوەی خۆپارێزی دەگریە بەر بۆئەوەی گەلی ئەمریكا بپارێزیت".

لە گەشتی ئۆتۆمبێلەكەدا بەرەو گردبوونەوەی پاش رووبەڕووبوونەوەكە، پەیوەندییەكی تەلەفۆنیم لە كارێن هیوگزەوە پێ گەیشت. وتی تۆڕەكانی راگەیاندن وێنەی تۆ بە شێوەی ناوبڕی جیاجیا پیشان دەدەن لەكاتێكدا كە كێری قسە دەكات. لە روالەتدا من كارێكی باشم نەكردبوو بە خۆنمایشكردن لە وەلامدانەوەی بۆچوونەكانیدا. هەروەك چۆن هەناسەهەلكێشانەكانی ئالگۆر لە یەكەم رووبەڕووبوونەوەدا لە سالی ۲۰۰۰ بووە بابەتی روماڵكردنەكان، روخسارە گرژەكەم بووە هەوالی ۲۰۰٤. هەردوو جارەكە پێم وابوو نادادپەروەرانەیە.

تەنانەت چەند رۆژێك دواتر بابەتێكی سەیرتر دەركەوت، كاتێك فۆتۆیەكی رووبەڕووبوونەوەكە بلاو بووەوە. وێنەكە گنجێكی بەشی پشتەوەی قاتەكەمی پیشان دەدا. كەسێك ئەو بیرۆكەیەی لا دروست بوو كە ئەو گنجە لە راستیدا وایەرێكی رادیۆی شاراوە بووە كە لەگەلّ كارل رۆڤدا پەیوەست بووە. دەنگۆیەكە لەسەر ئینتەرنێت بلاو بووەوە و بووە شتێكی خۆش لای تیۆردانەرەكانی پیلانگێری. ئەمە ئەزموونێكی سەرەتای دیاردەیەكی سەدەی بیست و یەك بوو: خاوەن بلۆگ (لاپەڕەی ئینتەرنێتی)ە سیاسییەكان. لەلایەكی ترەوە، زۆر خراپ بوو كە رادیۆیەكم پێ نەبووایە، بۆئەوەی كارل بتوانێ پێم بلێت دەم و چاوت گرژ مەكە.

دووەم و سێیەم رووبەڕووبوونەوە باشتر بوو. ئەمجارەیان دەم و چاوم ئارام و قاتەكەم رێك بوو و دەمتوانی رووبەڕووی مشتەكۆلەكانی كێری ببمەوە. بەلام هەروەكو چۆن دۆخەكە لە زۆربەی رووبەڕووبوونەوە سەرۆكایەتییەكاندا وایە، زۆربەی زەبرە توندەكان

لە خودەوەن. لە دوایین رووبەڕووبوونەوەماندا لە (تیمپ) پیشکەشکار (بۆب شیفەر) بابەتی هاوسەرگیریی هاوڕەگەزەکانی هێنایە بەر باس و وتی "ئایا باوەڕت وایە کە هاوڕەگەزبازی هەڵبژاردنێکە ؟" وتم "من نازانم. ئەوە دەزانم کە لە ئەمریکادا بژارەیەکمان هەیە کە بریتییە لە هەڤژینی و ڕێزگرتن و شکۆمەندی". پاشان بیروباوەڕی خۆمم دەربڕی لەمەڕ ئەوەی کە هاوسەرگیری لەنێوان ژن و پیاودایە و پێویستە یاسا رەنگدەرەوەی ئەو راستییە زەمەنییە بێت.

کێریش کە بەهەمان شێوە دژی هاوسەرگیریی رەگەزی جیاواز بوو، لە وەڵامدا وتی "ئێمە هەمووومان منالانی خوداین، بۆب، ئەگەر بشڕوانیتە کچەکەی دیک چێنی کە هاوڕەگەزبازە، پێت دەڵێت کە ئەو کەسەیە کە هەیە، ئەو کەسەیە کە وەها لەدایک بووە".

من رووم کردە لۆرا، باربارا و جێنا کە لە ریزی پێشەوە دانیشتبوون. دەمتوانی ئەو شۆکەی سەر روخساریان بخوێنمەوە. دوایی کارێن هیوگز پێی وتم کە گوێی لە "ها"کان بووە. لە سیاسەتی ئەمریکادا رێسایەکی نەنوسراوە هەیە کە دەڵێت منداڵەکانی کاندید لە دەرەوەی سنوورەکانن. ئەمەی کە چۆن کێری بابەتی رەگەزێتیی کچی هاوەڵێکی خۆکاندیدکردنی من لە رووبەڕووبوونەوەیەکی پەخشکراوی سەرانسەریدا بێنێتە بەر باس مایەی شۆکە.

ئەمە بێ پێشینە نەبوو. هەفتەیەک پێشتر لە رووبەڕووبوونەوەیەکی جێگری سەرۆکایەتیدا، هاوەڵی خۆکاندیدکردنی کێری، سیناتۆری کارۆلینای باکوور (جۆن ئێدواردز) رێگایەکی دۆزییەوە بۆئەوەی بابەتەکە باس بکات. توانجێک رێکەوتە، بەڵام دووان پیلانە. کێری و ئێدواردز ئومێدەوار بوون کە کۆنسێرڤاتیڤەکان بهێننە سەر خت کە دژی روانگەکەی کچی دیک چێنی بوون. لەبری ئەمە، ئەوان دووڕوو و دڵڕەق دەرکەوتن. لین چێنی قسەی بۆ زۆرێک لە ئێمە کرد کاتێک ئەو قسانەی بە "فێڵێکی سیاسیی سوکەڵە و پفدراو" ناوبرد.

***

لە ساڵی ٢٠٠٠، موفاجەئەکەی ئۆکتۆبەرمان لە فۆرمی دەرکەوتنی (لێخوڕینی ژێر کاریگەری کحول)دا هات. لە ساڵی ٢٠٠٤دا لەلایەن ئوسامە بن لادنەوە دەربڕدرا. لە ٢٩ی ئۆکتۆبەردا، سەرۆکی قاعیدە لە پەیامێکی ڤیدیۆییدا هەڕەشەی "مانهاتنێکی تر"ی ئاراستە کرد و گاڵتەی بە کاردانەوەی من لە بەرانبەر ١١ی سێپتێمبەر لە پۆلێکی فلۆریدا کرد. دیاربوو کە لاسایی قسەکانی مایکڵ موری دەکردەوە. وتم "ئەمریکییەکان ناترسن و کارتێکراو نابن بە دوژمنێکی وڵاتەکەمان". جۆن کێریش هەمان قسەی مکوڕبوونی دەربڕی.

دوایین ڕۆژی هەڵبژاردنی ژیانی سیاسیم، کە ٢ی نۆڤەمبەری ٢٠٠٤ بوو، ئەو کاتە دەستی پێکرد کە سواری مارین یەك ببووم لە گەشتێکی نیوەشەومدا لە دالاسەوە بۆ کێڵگەکە. ئێمە تازە قسەمان بۆ گردبوونەوەیەکی هەشت هەزار لایەنگر کردبوو لە زانکۆی میتۆدیستی باشوور، ئەو شوێنەی کە لۆرا لێی خوێندبوو- ئەمەش حەوتەمین وێستگەم بوو لە ڕۆژێکی درێژی ٢,٥٠٠ مایلی سەرانسەری وڵاتدا.

من، لۆرا، باربارا و جێنا ڕۆژی دواتر لە سپێدەدا بێداربووین. ئێمە بە تامەزرۆییەوە لە بنکەی ئاگرکوژێنەوەی کراوفۆرد دەنگەکانمان هەژمار کرد، چوار دەنگی بەهێز لە ستوونی بوش-چێنی دابوون. من بە گروپێکی ریپۆرتەرانم وت "من متمانەم بە حوکمی گەلی ئەمریکا هەیە. بێگومان هیوادارم ئەم هەڵبژاردنە لەمشەودا کۆتایی بێت".

من لەگەڵ جێبی برام سۆراخێکم کرد، حاکم وتی "فلۆریدا باش دیارە، جۆرج".

پاشان قسەم لەگەڵ کارل کرد، ئەو کەمێك لەبارەی ئۆهایۆوە نیگەران بوو، بۆیە بیستەمین وێستگەی هەڵمەتەکەم چووم بۆ ویلایەتەکە. پاش سوپاسکردنی خۆبەخشان و خستنەکاری ناوەندێکی اتصالات لە (کۆلەمبس)، بەرەو (دی.سی) کەوتینەڕێ.

لەکاتێکدا کە فڕۆکەکە لە بنکەی هێزی ئاسمانیی ئەندروز نیشتەوە، کارل هاتە کابینەکە پێشەوە. یەکەم خولی یەکەمی دەنگە دەرچووەکان گەیشتبوو. ئەو وتی "خەمناکن".

وا هەستم کرد یەك مشتەکۆڵەی لە گەدەم داوە. من شەرگەی ویلایەتی پەنسلڤانیا ٢٠ خاڵ لە خوارەوە بووم. ڕاگەیاندنی دەنگەکانی ویلایەتە کۆمارییە پایەدارەکانی وەکو

(میسیسیپی) و (کارۆلینای باشوور) زۆر نزیك ببووە. ئەگەر ژمارەکان راست بن، ئەوا تووشی شکستێکی گەورە دەبم.

بە شڵەژانەوە، لە فرۆکەکەوە بەرەو مارین یەك کەوتمەڕێ. فڕینە دە خولەکییەکە بەرەو کۆشکی سپی وەکو چەند سەعاتێك وابوو. دواجار تایەکانی کۆپتەرەکە لەسەر فریزی باشوور جێگیر بوون. گروپەکانی راگەیاند خۆیان تێکرد بۆ ئامادەکردنی هەواڵێکی باش بۆ ئێوارە. کارێن هیوگز ئامۆژگارییەکی باشی خستەڕوو: "هەمووتان دەم بە خەندە بن!"

چوومە قاتی سەرەوە بۆ شوێنی دانیشتن و لە ناو ژووری (تریتی)دا کاتێکم بەسەر برد. نەمتوانی بڕوا بکەم. پاش ئەو هەموو ئیشە قورسەی چوار ساڵی رابردوو و ئەو هەموو مانگە تاقەتپڕوکێنەی ناو هەڵمەتەکە، خەریکە بەشێوەیەکی یەکلاییکەرەوە لە ئۆفیس دەکرێمە دەرەوە. دەمزانی ژیان بەردەوام دەبێت، هەروەکو چۆن بۆ باوکیشم وەها بوو. بەڵام رەفزکردنەکە پێوەدان بوو.

پێش ماوەیەکی درێژ، کارل تەلەفۆنی کردبوو. ئەو هەر خەریکی ژماردن بوو و قەناعەتی وابوو کە مەنهەجەکە کەموکورتی تێدایە. من لە یەك کاتدا تووڕە و ئاسودە بووم. نیگەرانی ئەوە بووم کە ژمارە فریودەرەکان لایەنگیرانمان نائومێد بکات و دەنگەران لەو شوێنانە خەمبار بکات کە هێشتا سندوقەکانی دەنگدان کراوەن. ئێمە بیرمان لە هەمان شت دەکردەوە: ئەوەش شوێنێکی تر، بزانین چۆنە.

لە سەعات هەشتی ئێوارە، سندوقەکانی دەنگدان لە فلۆریدا داخران. هەروەکو جێب ئەو بەیانییە پێشبینی کردبوو، ئەنجامە سەرەتاییەکان مژدەبەخش بوون. ئەنجامی دەنگە دەرچووەکان لە لە کارۆلینای باشوور و میسیسیپی بەخێرایی دژیەك کەوتنەوە بە سەرکەوتنێکی پایەدار لە هەردوو ویلایەتەکەدا. بەشەکەی تری کەناری خۆرئاوا بەو شێوەیە بوو کە پێشبینی کرابوو. دەرەنجامەکە لە چوار ویلایەت لە دەرکەوتندا بوو: ئایۆوا، نیومەکسیکۆ، نێڤادا و ئۆهایۆ. کێم مێهلمان، بەڕێوەبەری زیرەکی هەڵمەتەکەم کە هەوڵێکی مێژوویی دابوو بۆ پەی بردن بە دەنگەکان، دڵنیابوو لەوەی کە هەر چوار ویلایەتەکەمان بردووەتەوە. هەر یەك لەو ویلایەتانە، لەلایەن لانی کەم هەواڵی

دەزگایەکی ڕاگەیاندن لە بەرژەوەندی ئێمە ڕاگەیەنرابوون. بەڵام پاش نسکۆکەی ساڵی ۲۰۰۰، هیچ دەزگایەکی ڕاگەیاندن نەیدەویست من بخاتە سەری سەرەوە.

سەرنجەکە لەسەر ئۆهایۆ بوو بە بیست دەنگی لیژنەی هەڵبژاردنەوە. من بە زیاتر لە ۱۲۰,۰۰۰ دەنگی بەهێزەوە پێشەنگ بووم. سەعاتەکە لە نیوەشەودا لێیدا، سەعات یەک، سەعات دوو. لە سەعات ۲:٤٥ خولەك تەلەفۆنێکم لە تۆنی بلێرەوە پێ گەیشت. پێی وتم کە ئەو لە لەندەن بەو بیرکردنەوەیەوە چووەتە ناو جێگا کە من شکستم هێناوە و خۆی ئامادە کردووە بۆئەوەی لەگەڵ سەرۆك کێری ڕێك بکەوێت. وتی "جۆرج نەك تەنیا بردووتەوە، بەڵکو دەنگی زیاتر لە هەر سەرۆکێك تر لە مێژوودا بەدەستهێناوە".

وتم "ئەگەر تەنیا هەڵمەتەکەی کێری ئەمەی بزانیایە، ئەوا لە سەروەختی کۆلێژەوە من ئەوەندە درەنگ بێدار نەدەبووم!"

دەوروبەری سەعات چوار، دەنگۆی ئەوە بڵاو بووەوە کە کێری و ئێدواردز پلانی ئەوەیان داناوە کە کەیسێکی یاسایی تۆمار بکەن بۆ ناڕەزایەتی دەربڕین لەسەر دەنگی ئۆهایۆ. وەکو دووبارەبوونەوەیەکی شانۆییەکەی ساڵی ۲۰۰۰، ژمارەیەك ڕاوێژکار پێیان وتم سەرکەوتن ڕابگەیەنم ئەگەرچی تۆڕەکانی ڕاگەیاندن ئەنجامی پێشبڕکێیەکەیان ڕانەگەیاندبوو و نەیارەکەم ملی نەدابوو. پێش چوار ساڵ، ئەوە جێب بوو کە ژیرانە ئامۆژگاری کردم کە لە ئۆستن وتار نەدەم. ئەمجارەیان لۆرا بوو. ئەو وتی "جۆرج تۆ ناتوانیت بچیتە ئەوێ. چاوەڕێ بە تا وەکو براوە ڕادەگەیەنرێیت".

لە دەوروبەری ئەو کاتەدا، دان بارتلێت، بڕگەی هەواڵگریی بەکەڵکی وەرگرت. نیکۆڵ واڵاس، بەڕێوەبەری اتصالاتی هەڵمەتەکەم، (دان)ی بە (مایك مکێری)ی یاریدەدەری کێری گەیاندبوو، مکێری وتبووی سیناتۆر بڕیاری دروست دەدات ئەگەر ئێوە کاتی پێ بدەن. دان وتبووی "فشار مەخەنە سەر ئەو کابرایە".

جارێکی تر جەماوەری نائومێد چاوەڕێی ئەو کاندیدە بوو کە هەرگیز نەگەیشت. بۆیە من ویستم ئەو ئاهەنگەی سەرکەوتن ببەخشم بە لایەنگرانم کە لە ساڵی ۲۰۰۰ بێبەشمان کردبوون لێی. بەڵام پێنەدەچوو. ڕێك پاش سەعات ٥ی سەر لەبەیانی، من ئاندی کاردم لەبری خۆم نارد. وتی "سەرۆك بوش بڕیاری داوە ڕێزی کاتی زیاتر بە سیناتۆر جۆن

کێری بدات بۆ تێڕامان لە ئەنجامەکانی ئەم هەڵبژاردنە. ئێمە قەناعەتمان وایە کە سەرۆک بوش بە لانی کەم ٢٨٦ دەنگی لیژنەی هەڵبژاردن، هەڵبژاردنەوەکەی بردووەتەوە".

***

لە سەعات ١١:٠٢ بەیانیی دواتر، یاریدەدەری کەسیم، ئاشلی کاوانۆ، دەرگای ئۆفیسی ئۆڤاڵی کردەوە. وتی "جەنابی سەرۆک. سیناتۆر جۆن کێری لەسەر هێڵە".

کێری بەڕێز بوو. پێم وت کە ئەو نەیارێکی شایستە بوو کە هەڵمەتێکی چالاکی بەڕێوە برد. من تەلەفۆنم بۆ لۆرا کرد و ئەو گروپە بچوکەی یاریدەدەرانی بالآم لە ئۆفیسی ئۆڤالْ لەباوەش گرت. بە ڕاڕەوەکەدا چوومە خوار بۆ ئۆفیسی دیك کە لەوێ تەوقەیەکی پڕ بەدڵم لەگەڵ کرد. دیك لەوانەیە نییە باوەشی پیا بکرێت.

دواجار پەیوەندیم بە باوك و دایکمەوە کرد. پاش بێدار مانەوە بە درێژایی شەو، ئەوان لە سەر لە بەیانیی زوودا لە کۆشکی سپی هاتبوونە دەرەوە و بەبێ زانینی ئەنجامەکان بەرەو هوستن گەڕابوونەوە. باوکم وتی "پیرۆزت بێ کوڕم". باوکم ئەمەی زیاتر لە هاتنەوەبەری پشوویەك دەربڕی نەك لە خۆشی. ئێمە لەو بارەیەوە قسەمان نەکردبوو، بەڵام هەڵبژاردنی ٢٠٠٠ تاکە هەڵبژاردنێك نەبوو کە لەمێشکماندا بوو. ئێمە هەردووکمان ئازاری ١٩٩٢مان لەیاد بوو. دەمزانی کە زۆر دڵخۆشە بەوەی کە من بەو دۆخەی ئەودا تێنەپەڕیمەوە.

پاش دەستپێکە تەمومژاوییەکەی، شەوی هەڵبژاردنی ٢٠٠٤، سەرکەوتنێکی گەورەی لێکەوتبووەوە. لە سەروەختی هەڵبژاردنی باوکمەوە لە ١٩٨٨دا، من بووم بە یەکەم سەرۆك کە توانی زۆرترین دەنگی گشتی بباتەوە. هەروەکو لە ٢٠٠٢شدا، کۆمارییەکان لە هەردوو ئەنجومەنی نوێنەران وپیراندا دەنگێکی زۆریان بەدەست هێنا.

ڕۆژی پاش ئەوەی کە کێری ملی دا، کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەنووسیی بەرەبەیانم ساز دا. یەکێك لە ڕیپۆرتەرەکان پرسیاری ئەوەی کرد ئاخۆ "هەست بە سەربەستیی زیاتر دەکەم".

من بیرم لەو ئەجێندا تامەزرۆیە دەکردەوە کە بە درێژایی ساڵی رابردوو گەڵاڵەم کردبوو. وتم با بەم شێوازە بە تۆی بڵێم "من سەرمایەم بەدەستهێنا لە هەڵمەتەکەدا، سەرمایەی سیاسی، ئێستاش نیازم وایە خەرجی کەم".

***

ئەوەندەی بیرم بێت، ئاسایشی کۆمەڵایەتی وەکو ئاگر بووە لە سیاسەتی ئەمریکادا. دەستی لێ بدە و سوتاویت.

لە ساڵی ۲۰۰٥دا، لە دەست لێدان زیاترم کرد بەو پرسەوە. لە باوەشم گرت. ئەمەم لەبەر یەک هۆکار کرد: نادادپەروەرانەیە کە جیلێکی خەڵکی گەنج وا لێ بکەیت کە پارە بدنە سیستەمێك کە بەرەو مایەپوچی دەچێت.

ئاسایشی کۆمەڵایەتی، کە لە ۱۹۳٥دا لەلایەن فرانکلین رۆزڤێلت بونیادنرا، سیستەمێکی (پارە بدە کاتێك دەڕۆی)یە. ئەو فاتورانەی کە خانەنشینان کۆی دەکەنەوە، پارەکەی لەو باجی موچانە دەدرێت کە کرێکارانی ئەمڕۆ دەیدەن. سیستەمەکە بە باشی کاری کرد تا ئەو کاتەی کە بۆ هەر سودمەندێك چل کرێکار هەبوو، هەروەکو لە ۱۹۳٥دا. بەڵام بەپێی تێپەڕبوونی کات، هێڵکاریی دانیشتووان گۆڕا. کێرڤی تەمەن زیادی کرد. ئاستی منداڵ بوون دابەزی. سەرەنجام، بەهاتنی ۲۰۰٥ بۆ هەر سودمەندێك کە پارەی رادەکێشا، تەنیا سێ کرێکار هەبوون کە پارەیان دەخستە ناو سیستەمی ئاسایشی کۆمەڵایەتییەوە. بە هاتنی ئەو کاتەی کە گەنجێکی دەستکردوو بە کار لە یەکەم دەیەی سەدەی بیست و یەکدا خانەنشین دەبێ، رێژەکە دوو بۆ یەك دەبێ.

بۆ هێورکردنەوەی کێشەکە، کۆنگرێس سوودەکانی ئاسایشی کۆمەڵایەتی وا رێکخستووە کە خێراتر لە هەڵاوسان بەرز ببنەوە. بە دەستپێکردنی لە ۲۰۱۸دا، ئاسایشی کۆمەڵایەتی وا رێکخراوە کە پارەیەکی کەمتر وەربگرێت لەوەی کە ئەیدات. ئەم کورتهێنانە هەر ساڵێك زیاد دەکات، تا ئەو کاتەی کە سیستەمە لە ۲۰٤۲دا مایەپوچ دەبێ. ساڵی ۲۰٤۲ دووردەست دیار بوو، تا ئەوەی کە من حسابەکەم کرد. ئەمە ئەو کاتە بوو کە کچەکانم کە لە ۱۹۸۱ لەدایکبوون، لە خانەنشین بوون نزیك دەبنەوە.

بۆ کەسێك کە دەیەوێ پرسە گەورەکان بخاتە ئەستۆی، هیچ شتێك لە ریفۆرمکردنی ئاسایشی کۆمەڵایەتی گەورەتر دیار نەبوو. بڕیارمدا کە هیچ کاتێك لەوە باشتر نییە کە لە گەرمەی هەڵبژاردنەوەمدا هەوڵەکە بخەمە گەڕ.

بەوە دەستم پێکرد کە سێ پرەنسیپ بۆ ریفۆرم دابنێم. یەکەم، بۆ بەساڵاچووان و خەڵکانی نزیك خانەنشینی، هیچ شتێك ناگۆڕێ. دووەم، وا دەکەم کە ئاسایشی کۆمەڵایەتی نەرم بێت بەبێ زیادکردنی باجەکانی موچەکان، کە تازە لە ٢٪وەوە بۆ ١٢٪ زیادی کردبوو. دەبێ کرێکارانی گەنج بژارەی بەدەستهێنانی داهاتی باشتریان لەبەردەستدا بێت لە رێگەی سەرمایەگوزاریکردنی بەشێك لە باجەکانی ئاسایشی کۆمەڵایەتییان لە حسابی خانەنشینیی کەسیدا.

حساباتی خانەنشینیی کەسی بۆ ئاسایشی کۆمەڵایەتی، شتێکی تازە دەبێ، بەڵام زۆربەی ئەمریکییەکان بە چەمکەکە ئاشنا بوون. دەکرێ ئەمانەش بەشێوەیەك سەرمایەگوزاری بکرێن کە بەپێی تێپەڕبوونی کات گەشە بکەن و سوود لە فائیدەی تێکەڵ وەربگرن. برەکان بەهۆی دامەزراوە داراییە ناسراوەکان بەڕێوە دەبرێن کە کرێی کەم وەردەگرن و قەدەغەیەك دەبێ لەدژی راکێشانی پارە بەر لە خانەنشین بوون. تەنانەت لە ئاستی کۆنسێرڤاتیڤی داهاتی ٣٪دا، پارەی خاوەن حسابێك هەر بیست وچوار ساڵ جارێك دووقات زیاد دەکات. بە پێچەوانەوە، داهاتی ئاسایشی کۆمەڵایەتیی ١,٢٪ شەست ساڵ دەخایەنێ تا دووقات دەبێ. بەپێچەوانەی سوودەکانی ئاسایشی کۆمەڵایەتییەوە، حسابی خانەنشینیی کەسی، موڵکێکی تاکی کرێکاران دەبێ نەك حکومەت و دەکرێ لە جیلێکەوە بگوازرێتەوە بۆ جیلێکی تر.

لە سەرەتاکانی ٢٠٠٥دا، من لەگەڵ سەرکردە کۆمارییەکانی کۆنگرێس دانیشتم بۆ قسەکردن لەبارەی ستراتیژی یاسادانانمان. پێم وتن کە مۆدێرنیزەکردنی ئاسایشی کۆمەڵایەتی، ئەولەویەتی من دەبێ. کاردانەوەکە لە باشترین حاڵەتیدا کەمێك گەرم و گوڕ بوو. رێبەرەکەمان وتی "جەنابی سەرۆك، ئەمە پرسێکی باو نییە. قسەکردن لەسەر ئاسایشی کۆمەڵایەتی کورسیمان لەدەست دەدات".

لە وەڵامدا وتم "نا، ئەتوانینی دەست و پەنجە نەرم کردن لەگەڵ پرسەکەدا ئەمەی لێ دەکەوێتەوە".

دیار بوو کە بیریان لەو دوو ساڵەی سوری هەڵبژاردنی کۆنگرێس دەکردەوە. من بیرم لەو بەرپرسیارێتییە دەکردەوە کە وە سەرۆکێك کە ڕێبەرایەتی پرسە پەیوەندیدارەکانی ئایندەی وڵات دەکات، بیرم دەکردەوە. من ئەوەم بیرهێنانەوە کە من دوو جار لەسەر ئەم پرسە هەڵمەتم ئەنجام داوە و کێشەکە تەنیا خراپتر دەبێ. بە چارەسەرکردنیشی، خزمەتێکی گەورەمان بە وڵاتەکەمان دەکرد. سەرەنجامیش، بەرنامەیەکی باش سوودی بۆ سیاسەتێکی باش هەیە.

ڕێبەری ئەنجومەنی نوێنەران وتی "ئەگەر تۆ ڕێبەرایەتی بکەیت، ئێمە لە پشتت دەبین. بەڵام کەمێك لە دوورەوە لە پشتتەوە دەبین".

***

کۆبوونەوە لەگەڵ کۆمارییەکانی کۆنگرێس پیشانیدا کە چە سەرکەوتنێك بۆ سەرەوەم لە بەردەمدایە پەیوەست بە ئاسایشی کۆمەڵایەتییەوە. هەرچۆنێك بێت بڕیارمدا بەرەوپێش بڕۆم. کاتێك ئاورم دەدایەوە سەرۆکایەتییەکەم، نەمدەویست بڵێم خۆم لە پرسێکی گەورە لاداوە. لە وتاری ساڵانەمدا لە ٢٠٠٥ وتم "ئاسایشی کۆمەڵایەتی سەرکەوتنێکی ئەخلاقی گەورەی سەدەی بیست بوو. دەبێ لەم سەدە نوێیەشدا ڕێز لە ئامانجەکانی بگرین". "هەرچۆنێکیش بێت، سیستەمەکە لەم ڕێرەوەی ئێستایدا بەرەو مایەپوچی دەڕوات. بۆیە پێویستە ئێمە بچینە پاڵ یەکتری بۆ بەهێزکردن و ڕزگارکردنی ئاسایشی کۆمەڵایەتی".

ڕۆژی دواتر کۆمەڵێك گەشتم ئەنجامدا بۆ پەرەپێدانی هۆشیاری لەبارەی کێشەکانی ئاسایشی کۆمەڵایەتی و کۆکردنەوەی گەلی ئەمریکی بۆ سووربوون لەسەر گۆڕان. من وتارگەلێکم پێشکەش کرد، کۆمەڵی فەرمانگەکانم کۆ کردەوە، تەنانەت مەراسیمێکم لەگەڵ یەکێك لە سودمەندانی ئاسایشی کۆمەڵایەتی ڕێکخست کە دایکم بوو. ئەو وتی "من لێرەم چونکە نیگەرانی حەڤدە نەوەکانمانین و هاوسەرەکەشم بەهەمان شێوە. ئەوان ئاسایشی کۆمەڵایەتی وەرناگرن".

یەکێك لە گەشتە هەرە لەیادەکانم بۆ کارگەیەکی ئۆتۆمبێلی نیسان بوو لە (کانتۆن)ی میسیسیپی. زۆرێك لە ئامادەبووان، کرێکارانی ئەمریکی ئەفریقی بوون. وتم کێ سۆشەڵی هەیە، تەقریبەن هەموویان دەستیان هەڵبڕی. کەیفم بەو بیرۆکەیە هات کە خەڵکی بە شێوەیەکی نەریتی موڵکیان نییە، هێلکەی ناو هێلانەیەك نادۆزنەوە و بڵێین هی ئێمەیە. هەروەها بیرم لەوە کردەوە کە دەبێ چەندی تر خەڵکی لەو شێوەیە هەبێ. ئاسایشی کۆمەڵایەتی بەتایبەت بۆ ئەمریکییە ئەفریقییەکان نادادپەروەرانە بوو. لەبەرئەوەی کێرڤی تەمەنیان کورتتر بوو، ئەو کرێکارە رەش پێستانەی کە تەمەنێکیان لە پارەدان بە سیستەمی ئاسایشی کۆمەڵایەتی تەرخان کردبوو، تێکڕای ۲۱,۰۰۰ دۆلار کەمتریان لە سپی پێستانی هەمان خاوەن داهات وەردەگرت. حسابە کەسییەکان کە دەکرا بەرەو جیلێکی تر بگوازرێنەوە، بە درێژایی ئەو رێگەیە بەرەو جیاوازیی نادادپەوەرانە دەرۆیشتن.

لە ۲۸ی نیساندا، داوای کۆنگرەیەکی رۆژنامەوانیی کاتی قەڵەباڵغترین بینەرم کرد بۆ گەڵاڵەکردنی پرۆپۆزەڵەکەم. ئەو پلانەی کە من لە خۆم گرتبوو، بیرۆکەی دیمۆکراتێك بوو بەناوی (رۆبەرت پۆزن). پرۆپۆزەڵەکەی ئەو کە بە (بەیەکگەیاندنی هەڵکشاو) ناسرابوو، سوودەکانی بە شێوەیەك دانابوو کە بە خێراترین شێوە لە بەرژەوەندی هەژارترین ئەمریکییەکان و خاوترین شێوە بۆ دەوڵەمەندترین ئەمریکییەکان گەشە بکات. گەشەیەکی مام ناوەندیش بۆ ئەوانە دەبێت کە لەو نێوانەدان. بە گۆڕینی هاوکێشەی گەشەی سوود، پلانەکە زۆرینەیەکی گەورەی کورتهاتووی ئاسایشی کۆمەڵایەتی لادەبات. سەرباری ئەمە، هەموو ئەمریکییەکان دەرفەتی ئەوەیان دەبێت کە داهاتی زیاتر لە رێگەی حسابی خانەنشینی کەسییەوە بەدەست بێنن.

هیوادار بووم کە هەردوو لایەنەکە پرۆپۆزەڵەکە بگرنە خۆیان. کۆمارییەکان دڵخۆش دەبوون بەوەی کە ئێمە ئاسۆی بودجە چاك بکەین، بەبێ ئەوەی کە باجەکان زیاد بکەین. دەبووایە دیموکراتەکان دڵخۆش بە رزگارکردنی ئاسایشی کۆمەڵایەتی لە رێگەی پێشکەشکردنی سوودە گەورەکان بە هەژاران، کەمینەکان و چینی کرێکار- ئەو بازنانەی کە پێیان وابوو ئەوان نوێنەرایەتییان دەکەن.

ئیمی یاسادانانەکەم بە توندی پاڵی بە یاساکەوە نا، بەڵام ئەقریبەن هیچ پشتیوانییەکی بەدەست نەهێنا. ڕێبەرانی دیموکرات لە ئەنجومەنی نوێنەران و پیران بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە من دەمەوێ ئاسایشی کۆمەڵایەتی بە "تایبەت" بکەم. بێگومان ئەمە زمانێکی ڕاپرسییەکان بوو کە دەیوست خەڵك بترسێنێت. ئەمە ڕاست نەبوو. پلانەکەم ئاسایشی کۆمەڵایەتی ڕزگار کرد، ئاسایشی کۆمەڵایەتی مۆدێرنیزە کرد و دەرفەتی بە ئەمریکییەکاندا تا ببنە خاوەنی پارچەیەك لە ئاسایشی کۆمەڵایەتییەکەیان. ئاسایشی کۆمەڵایەتی بە "تایبەت" نەکرد. هەستم کرد شتێکی بەرفراوانتر هەیە لەودیو دژایەتی دیموکراتەکانەوە. بەڕێوەبەری (ئەنجومەنی ئابووریی نیشتمانی) ئال هوبارد، لەبارەی کۆبوونەوەیەکەوە قسەی بۆ کردم کە لە بینایەی کۆنگرێس ئەنجامی دابوو. سیناتۆرێکی دیموکراتیی بەتەمەن پێی وتبوو "حەز دەکەم لەمەیاندا هاوکار بم، بەڵام ڕێبەرەکانمان ڕوونیان کردووەتەوە کە قەرار وانییە ئێمە هاوکار بین".

ئەو دژایەتییە دیموکراتییە توندەی لەسەر ئاسایشی کۆمەڵایەتی ڕووبەڕووی بوومەوە، تەواو پێچەوانەوە بوو لەگەڵ ئەو پشتگیرییە دووحزبییەی لە پرۆژەیاسای (هیچ منداڵێك پشتگوێ ناخرێت) و لە ساڵەکانمدا لە تەکساس بەدەستمهێنا. من بەو گۆڕانە نائومێد بووم و بەردەوام بیرم لەوە دەکردەوە کە بۆچی ڕوویدا. پێم وایە هەندێ کەسی بەرەکەی تر هەبوون کە هەرگیز هەڵبژاردنی ٢٠٠٠یان پێ هەرس نەکراو سوور بوون لەسەر ئەوەی کە هاوکاریم نەکەن. ئەوانیتر ڕقیان لەوە هەستابوو کە لە ساڵانی ٢٠٠٢ و ٢٠٠٤دا هەڵمەتم لەدژی کاربەدەستانی دیموکراتییەکان سازدابوو، وەکو یارمەتیدانێکی کاندیدە کۆمارییەکان بۆئەوەی ئایکۆنە دیموکراتییەکانی وەکو سیناتۆر ماکس کلێلاندی جۆرجیا و ڕێبەری زۆرینەی ئەنجومەنی پیران، تۆم داشل لەسەر کورسییەکانیان لەسەر کورسییەکانیان نەمێنن.

بێگومان منیش هەندێ بەرپرسیارێتیم دەکەوێتە ئەستۆ. من پەشیمان نیم لە هەڵمەت سازدان بۆ هاوتا کۆمارییەکانم. من هەمیشە ڕوونم کردووەتەوە کە نیازم بووە توانای حزبەکەمان لە واشنتن زیاد بکەم. لەکاتێکدا کە ئامادەییم تیا بووە یاسادانان لە

کاردانەوە بەرانبەر نیگەرانییەکانی دیموکراتییەکان دەستکاری بکەم، لەسەر پرەنسیپەکانم سازشم نەکردووە، شتێك کە هەندێ کەس پێیان وابووە لەبەرانبەر هاوکاریکردندا بووە. لەسەر ئاسایشی کۆمەڵایەتی، لەوانەیە من بە پاڵنانی پرسێك، رەزامەندیی دەنگدەرانم خراپ خوێندبێتەوە کە هەر لە سەرەتاوە رێککەوتنی دووحزبیی کەمی لەسەر هەبوو. هۆکارەکە هەرچییەك بێت، هەرەسەکەی ناو پشتگیریی دووحزبی خراپ بوو بۆ ئیدارەکەم و بۆ وڵاتەکەشم.

لەکاتێکدا کە هیچ دیموکراتێك لەگەڵدا نەبوو، پێویستم بە پاڵپشتییەکی کۆماریی بەهێز هەبوو بۆئەوەی پرۆژەیاساکە بە کۆنگرێسدا تێبپەرێنم. من ئەمەشم بەدەستنەهێنا، زۆرێك لە کۆمارییە گەنجەکان، وەکو پۆل رایانی ویسکنسن، پشتیوانی ریفۆرمیان دەکرد. بەڵام ژمارەیەکی کەم لە کۆنگرێس ئامادەبوون موخاتەبەری پرسێکی وەها ناکۆکئامێز بکەن.

هەرەسی ریفۆرمی ئاسایشی کۆمەڵایەتی، یەکێك بوو لە نائومێدییە هەرە گەورەکانی سەرۆکایەتیم. سەرباری هەوڵەکانمان، حکومەت دواجار رێك ئەو شتەی کرد کە من هۆشداریم لەدژ دابوو: کێشەکەمان رەوانەی جیلێکی تر کرد. لەلایەکی ترەوە، من دڵنیا نەبووم لەوە زیاتر چی بکەم.

من ئەوەندەی بکرێ کەیسی ریفۆرمم بەشێوەی بەرفراوان و قایلکەرانە خستەروو. هەوڵمدا بگەمە بەرەکەی تریش و پرۆپۆزەڵی ئابووریناسێکی دیموکراتەکانم کردە چەقی پلانەکەم. شکستی ریفۆرمی ئاسایشی کۆمەڵایەتی، سنوورەکانی دەسەڵاتی سەرۆك پیشان دەدات. ئەگەر کۆنگرێس سوور بێت لەسەر هەنگاو نەنان، ئەمە هەموو ئەو شتە دەبێت کە سەرۆکێك دەتوانێ بیکات.

هەنگاونەنان باجی خۆی دەبێت. پێنج ساڵ دوای ئەوەی کە پرۆپۆزەڵی ریفۆرمەکەم خستووەتەروو، قەیرانی ئاسایشی کۆمەڵایەتی زۆر توندتر بووە. بەرواری مایەپووچبوونی مەزەندەکراو لە ٢٠٤٢ەوە گەیشتووەتە ٢٠٣٧. کورتهێنان لە ئاسایشی کۆمەڵایەتیدا- تێچوونی چاك کردنی کێشەکە- لەوەتەی من لە ٢٠٠٥دا پرسەکەم ووروژاندووە، گەیشتووەتە ٢ تریلیۆن دۆلار. ئەمەش زیاترە لەوەی کە تێکرا لە جەنگی عێراق،

مۆدێرنیزەکردنی چاودێریی دەرمانی، پرۆگرامی ئاساییکردنەوەی موڵك و ماڵی پرکێشە، خەرجمان کردووە. بۆ هەر کەسێك کە نیگەرانە لەو کورتهێنانانەی رووبەڕووی نەوەکانی ئایندە دەبێتەوە، ئەتوانینی ریفۆرمکردنی ئاسایشی کۆمەڵایەتی لە دەرفەتە لەکیسچووە هەرە گرانبەهاکانی سەردەمی مۆدێرنە.

***

ئەو لەبەردەم دەرگایەکە بە تەنیا لەبەر باران وەستابوو. بێ تاقەت و ترساو دیاربوو. پێش چەند رۆژێك، (پاولا رێنـدن) ماڵئاوایی لـە خێزانەکـەی کردبوو لـە مەکسیك و بـە سواری پاس بەرەو هوستن کـەوتبووە رێ. ئـەو بـەبێ پـارە و بـەبێ هـاورێ گەیشتبووە جێ، تاکە شتێك کە پێـی بـوو، ئەدرێسی (٥٥٢٥ رایـەر درایـڤ) و ناوەکانی خاوەنکارە تازەکانی بوو، جۆرج و باربارا بوش.

ئەو ئێوارەیەی ١٩٥٩ کە دەرگام کردەوە، من سیانزە ساڵان بووم. ماوەیـەك پـێش ئێستا، پاولا ببووە دایکی دووەمی من، برا بچوکەکانم و خوشکەم. ئەو خـۆی زۆر مانـدوو دەکرد، ئاگاداری خێزانەکەمان لە تەکساس ئەوەی خۆشی بوو لە مەکسیکۆ. دواجار ئـەو خانوویەکی کڕی و خێزانەکەی هێنایە هیوستن. ئەو دەڵێت پڕ شانازیترین رۆژی ژیانی، ئەو رۆژە بـوو کـە نـەوە کوڕەکـەی کۆلێـژی تـەواو کـرد. وەکـو حـاکم و سـەرۆك، کاتێـك لـەبارەی ریفـۆرمی کۆچـبەرێتییەوە قـسەم کـرد، پـاولام لـە مێـشکدا بـوو. وتم "بـەها خێزانییەکان لە (ریۆگراند) ناوەستن".

وەکو پاولا، زۆربەی ئەوانەی مەکسیکیان بەجێهێشت و هاتنە ئەمریکا، بۆ ئـەوە هـاتن تـا خـواردن بخەنەسـەر مێـزی خێزانـەکانیان. زۆرێکیـان ئیـشی پشتـشکێنیان کـرد، بەروبومیان لە کێڵگەکان هەڵدەگرتەوە یان لـەژێر خۆرەتـاوی تەکساسدا قیریان لەسـەر خانووەکـان دەڕشـت. هەنـدێکی وەکـو پـاولا، ڤیـزای ئیـشی بـەردەوامیان وەردەگـرت. ئەوانیتر وەکو کرێکارانی کاتی لە رێگەی پرۆگرامی (براسیرۆ)وە دەهـاتن. هەنـدێکیان بە شێوەی نایاسایی لە سنوور دەپەڕینەوە.

بە درێژایی چوار دەیەی دواتر، قـەبارەی ئـابووریی ئـەمریکا لـە ژێـر ٣ تریلیۆنـەوە بـۆ زیاتر لە ١٠ تریلیۆن دۆلار فراوان بـوو. پێویـستبوونی کرێکاران زۆر زیـادی کـرد. لەگـەڵ

ئەوەشدا گۆڕینی یاساکانی کۆچبەرێتی و دامەزراندن خاو بوو. پرۆگرامی باسێرۆ ل ١٩٦٤دا ئێکسپایەر بوو و جێگۆرکێی پێ نەکرا.

پێداویستیی ڤیزای ئیشی بەردەوام، لە داواکاری بۆ کار زیاتر نەچووە سەرەوە. لەکاتێکدا کە ڕێگایەکی کرداری نەبوو بۆ چوونە ناو وڵات بە شێوەیەکی یاسایی، ژمارەی کۆچبەرانی هاتووی نایاسایی زیادی کرد.

پیشەسازیی نهێنیی قاچاغچیان و ساختەکارانی بەڵگەنامە، کە بە (کۆیۆت) ناسرابوون، بە درێژایی سنوور سەریان هەڵدا. ئەوان خەڵکانیان دەخستە ناو سندوقی ئۆتۆمبێلەوە یان لەناو بیابانی سوتێنەردا جێیان دەهێشتن. ژمارەی مردووان مایەی شۆك بوو. لەگەڵ ئەوەشدا ژمارەی کۆچبەران، کە سووربوون لەسەر خۆراك پەیداکردن بۆ خێزانەکانیان، کەمی نەکرد.

بەهاتنی ئەو کاتەی کە من خۆم بۆ سەرۆکایەتی کاندید کرد، کۆچبەرێتی کێشەیەکی جددی بوو و بەرەو خراپتر دەچوو. ئابوورییەکەمان پێویستی بە کرێکار بوو، بەڵام یاساکانمان لاواز دەبوون و مافەکانی مرۆڤ پێشێل دەکران. لە هەڵمەتی ساڵی ٢٠٠٠مدا، بڕیارمدا پرسەکە بگرمە ئەستۆم. من بڕوام بەوە هەبوو کە دەتوانین چارەسەرێکی ئەقڵانی بدۆزینەوە کە خزمەتی بەرژەوەندییە نیشتمانییەکانمان بکات و لە هەمان کاتدا پاڵپشتی بەهاکانیشمان بێت.

یەکەم هاوکار بۆ ریفۆرمی کۆچ، سەرۆکی مەکسیك (ڤینسنت فۆکس) بوو. ڤینسنت و هاوسەرەکەی (مارتا)، یەکەم مێوان ئێوارەخوانی دەوڵەتی بوون لەلای من و لۆرا لە ڕێکەوتی ٥ی سێپتێمبەری ٢٠٠١دا. من قسەم لەسەر شیمانەی پرۆگرامێکی کرێکاری کاتی کرد کە بە شێوەیەکی یاسایی ڕێگە بە مەکسیکییەکان بدات بێنە ناو وڵاتەوە و ئیشێکی دیاریکراو بۆ ماوەیکی دیاریکراو بکەن. ڤینسنت پشتگیریی بیرۆکەکەی کرد، بەڵام زیاتری دەویست. ئەو هیوادار بوو کە هەموو مەکسیکییەکانی ناو ئەمریکا بە یاسایی بکرێن، ڕێوشوێنێك کە ئەو بە (بەرێساییکردن) ناوی دەبرد. من روونم کردەوە کە ئەمە روو نادات. بڕوام وا بوو کە لێبووردن- ئەمەی کە کۆچبەرانی نایاسایی بکەیتە

هاوڵاتیانی ئۆتۆماتیکی– یاسا لاواز دەکات و ڕێگە بۆ کۆچبەرێتی نایاسایی زیاتر خۆش دەکات.

پاشان ١١ی سێپتێمبەر بەسەرداهات و نیگەرانیی سەرەکیم ئەوە بوو کە تیرۆریستان بەشێوەی تێبینی نەکراو بێنە ناو وڵاتەوە. من پرۆگرامێکی کرێکاری کاتیم ڕاگرت و تەرکیزم خستە سەر ئاسایشی سنوور. لە چوار ساڵی پاش ١١ی سێپتێمبەر، ئێمە لەگەڵ کۆنگرێس کارمان کرد بۆ زیادکردنی تەمویلی پارێزگاریی سنوور بۆ ٦٠٪ ، زیاتر لە ١٩٠٠پۆلیسی دەوریەی سنوورمان دامەزراند و تەکنۆلۆژیای نوێشمان خستە کار، وەکو کامێراکانی تیشکی ژێر سوور (ئینفرارێد).

لە ئۆکتۆبەری ٢٠٠٥دا، پرۆژەیاسایەکی ئاسایشی نیشتمانیم واژۆ کرد کە ٧,٥ ملیارد دۆلاری بۆ توندوتۆڵکردنی سنوور دابین دەکرد. پرۆژەیاساکە وەبەرهێنانی ئێمەی لە ژێرخانی تەکنۆلۆژیا و هەواڵگریدا لە سەر سنوور قوڵ کردەوە. هەروەها دارایی دابین کرد بۆ زیادکردنی شوێنی خەوتن لە بەندیخانە فیدراڵییەکانی نزیک سنوور، بۆ ڕێگەدان بە کاربەدەستان تا چیتر ئەو کۆچبەرە نایاساییانەی دەستگیریان کردوون، نەگەڕێنەوە بۆ ناو کۆمەڵگە– کردارێکی ماندووکەر کە بە بگرە و بەردەوە ناسرابوو.

هیوادار بووم کە تەرکیزی ئێمە لەسەر ئاسایش، ئەمریکییەکان دڵنیا بکاتەوە کە ئێمە شێلگیرین لە وەستاندنی کۆچبەرانی نایاسایی بۆ ناو وڵاتەکەمان. بەڵام ڕێوشوێنە بەرگریکارییەکان بە تەنیا کێشەکەیان چارەسەر نەدەکرد. ئابووریی ئەمریکا موگناتیسێک بوو بۆ خەڵکانی هەژار و بەئومێد. بەرزترین و درێژترین پەرژین لە جیهاندا، ئەوانەی نەدەوەستاند کە سووربوون لەسەر دەرخوارددانی خێزانەکانیان. پرۆگرامی کرێکاری کاتی، چارەسەرەکە بوو. ئەگەر ئەو کۆچبەرانەی دەهاتن بۆ ئیشکردن بیانتووانیایە بەشێوەیەکی یاسایی بێنە ناو وڵاتەوە، ئەوا پێویست نەبوو کە لەمبەر بۆ ئەوبەری سنوور دزە بکەن. ئابووری کۆڵەکەیەکی هێزی کاری جێ متمانەی دەبوو.

(کۆیۆت)ەکان و بەکاربەرانی مافەکانی مرۆڤ بازارەکەیان لەدەست دەچوو. پۆلیسی دەوریەی سنووریش دەیتووانی تەرکیز بخاتە سەر وەستاندنی تاوانکاران، بازرگانانی ماددەی هۆشبەر و تیرۆریستان.

له ١٥ی مایسی ٢٠٠٦دا، یەکەم وتاریٚ بیٚ وێنەی سەرۆکایەتیم لە کاتی پڕبینەردا لەبارەی کۆچبەرێتییەوە پێشکەش کرد. وتم "ئێمە وڵاتی یاساکانین و دەبی یاساکانمان پیادە بکەین. بە هەمان شێوە وڵاتی کۆچبەرانین و پێویستە ئەو نەریتە بتەو بکەین کە لە زۆر رووەوە وڵاتەکەمانی بەهێز کردووە".

پاشان پلانێکی پێنج بەشیم خستەروو بۆ ریفۆرمی سیستەمی کۆچ. یەکەم پێکهاتە، بریتی بوو لە وەبەرهێنانێکی نوێی گەورە لە ئاسایشی سنووردا، لەوانەش دووقاتکردنی قەبارەی دەوریەی سنوور تاوەکو ساڵی ٢٠٠٨ و دابەزاندنی شەش هەزار سەربازی گاردی نیشتمانی بەشێوەیەکی کاتی بۆ پاڵپشتیی دەوریەی سنوور. بەشی دووەم بریتی بوو لە پرۆگرامی کرێکاری کاتی کە پێناسێکی تەزویر نەکراوی دەگرتەخۆ. سێیەمیان بریتی بوو لە رێوشوێنی توندی کۆچبەرێتی لە شوێنەکانی کاردا کە بەکاربردنی کەم دەکردەوە و یارمەتیدەر دەبوو بۆ خاوکردنەوەی داواکاری بۆ کرێکاری نایاسایی. چوارەمیان بریتیبوو لە تێکەڵکردن، لە رێگەی داواکردن لە کرێکاران کە فێری ئینگلیزی ببن. دواجار، پرسیارێکی ئاڵۆزم لە مشتومڕەکەدا رووبەڕوو بووەوە: چی بکرێت لە نزیکەی دوانزە ملیۆن کۆچبەری نایاسایی کە لە وڵاتدا هەن؟

وتم "هەندیٚ کەس لەم وڵاتەدا دەڵێن چارەسەرەکە ئەوەیە کە هەر کۆچبەرێکی نایاسایی سنوورداش بکرێتەوە و ئەمەی کە هەر پرۆپۆزەڵێك کە تیایدا نییە، لێبووردن بیگرێتەوە". وتم "من لەگەڵ ئەمە دا نیم...زەمینەیەکی مام ناوەند هەیە لەنێوان بەخشینی هاوڵاتیێتی ئۆتۆماتیکی بە هەر کۆچبەرێکی نایاسایی و پرۆگرامی سنووورداشکردنەوەی بەکۆمەڵدا".

من جیاوازیم کرد لە نێوان ئەو کۆچبەرە نایاساییانەی کە بەم دواییانە سنووریان بەزاندبوو و ئەوانەش کە ساڵانێکی زۆر بوو لە ئەمریکا ئیشیان دەکرد و وەکو ئەندامانی بەرپرسی کۆمەڵ رەگیان داکوتابوو. من پێشنیاری ئەوەم کرد کە کۆچبەرانی دووەم رێگەیان پیٚ بدرێت داوای هاوڵاتیبوون بکەن پاش ئەوەی مەرجە قورسەکانیان تێدا دەبێت، لەوانەش بەخشینی غەرامەیەك، دانی باجەکان بە باشی، فێربوونی ئینگلیزی و چاوەڕێبوون بە ریز لە پشت ئەوانەی کە پەیڕەویی یاسایان کردووە.

ده ڕۆژ دوای وتارەکەم، ئەنجومەنی پیران پرۆژەیاسایەکی بە سپۆنسەریی سیناتۆر چوک هاگلی نێبراسکا و مێل مارتینێزی فلۆریدا کە ناوەڕۆکی وتارەکەی منی هەلگرتبوو، پەسەند کرد. بەڵام ئەنجومەنی نوێنەران، کە تەنیا تەرکیزی خستبووەسەر ئاسایشی سنوور، نەیتوانی پرۆژەیاساکە پێش هەڵبژاردنە میانەییەکان لە نۆڤەمبەری ٢٠٠٦دا، جێبەجێ بکات. ئەوە بوو دواتر دیموکراتەکان کۆنترۆڵی کۆنگرێسیان گرتە دەست.

***

بە ماوەیەکی کورت دوای هەڵبژاردنەکانی ٢٠٠٦، گرووپێك یاسادانەری پیرم بانگ کردە ئۆفیسی ئۆڤاڵ. پاشان تێد کەنەدیم جیا کردەوە. بە داخەوە، لە سەروەختی (هیچ منداڵێك پشتگوێ ناخرێت)ەوە پەیوەندییەکانمان بەرەو خراپی چووبوو. دەمزانی تێد ناکۆکە لەگەڵ مندا لە لابردنی سەدا حسێن. بەڵام من لەو وتارە توندانەی نارەحەت بوو کە دەیگووت سەرۆك "بۆندی بنچینەیی متمانەی لەگەڵ گەلی ئەمریکادا شکاندووە". منی بە ریچارد نیکسن بەراورد کرد و عیراقی بە "ڤێتنامی جۆرج بوش" ناودێر کرد.

قسە رەقەکانی، زۆر ناکۆك بوون لەگەڵ ئەو پیاوە خۆشرووە بەرێزەی کە ناسیبووم. من بەشێوەیەکی تایبەت لەوە سەرم سوڕما کە تێد بۆ ماوەی ساڵانێك ئامانجی هێرشی سیاسیی زۆر توند بوو. یەکێك لە پەشیمانییەکانم ئەوەیە کە نەدەبووایە بۆ هیچ وتووێژێك لەبارەی جەنگەوە لەگەڵ تێد دابنیشم. من بیرکردنەوەیم نەگۆڕی، بەڵام ئەو پیاوێکی شایستە بوو و لەوانەیە گفتوگۆکانمان ببوایەتەهۆی ئەوەی کە بەلاغەتەکەی نەرم بکات.

هیوادار بووم کە ریفۆرمی کۆچ، دەرفەتێك بێت بۆ بوژاندنەوەی هاوکاریی نێوانمان. لە کۆبوونەوەکەماندا پاش هەڵبژاردن پێم وت "پێم وایە ئەمە شتێکە کە دەتوانین تێیپەڕێنین". ئەو بە رازیبوونەوە وتی "با دیسان بیسەلمێنین کە گومانەکان بەهەڵەداچوون".

لە بەهاری ٢٠٠٧دا، تێد لەگەڵ سیناتۆرە کۆمارییەکانی ئاریزۆنادا، جۆن مککەین و جۆن کیل هاوکاری کرد لەسەر پرۆژەیاسایەك کە ئاسایشی سنووری توندوتۆڵ کرد، پرۆگرامی کرێکاری کاتی هێنایەکایەوە و ڕێگایەکی سەخت بەڵام عادیلانەی دانا بۆ هاوڵاتیبوون بۆ ئەو ئەو کۆچبەرە پەیڕەوکارانەی یاسا کە ساڵانێك بوو لە ئەمریکا بوون.

من بۆ رازیکردن لەبارەی پرۆژەیاساکەوە بە وڵاتدا سەفەرم کرد بەتایبەت پەیوەست بە جەختکردنەوەی لەسەر ئاسایشی سنوور و تێکەڵبوون. هەست لەسەر هەردوو دیوی پرسەکە جوڵا. لەکاتێکدا کە کۆچبەران لە سەرانسەری وڵاتدا ئیشیان لە وڵاتدا بەدەستهێنا، فشاریان خستەسەر قوتابخانە و نەخۆشخانە خۆجێییەکان. دانیشتووان نیگەرانی گۆڕانی کۆمەڵگەکەیان بوون. پێشکەشکارانی بەرنامەی وتوێژ و راڤەکارانی تەلەڤزیۆنی لەژێر ناونیشانی "سێیەم داگیرکاریی جیهانیی ئەمریکا" هۆشدارییان دا. لە هەمان کاتدا، جەماوەرێکی زۆری پشتیوانانی بەیاساییکردن رژانە ناو شارە گەورەکان کە ئاڵای مەکسیکیان بەرز کردبووەوە، تەحەدییەک کە زۆرێک لە ئەمریکییەکانی تووڕە کرد.

میزاجی شەپۆلە ئاسمانییەکان، کاری کردە سەر دید لە واشنتن. کۆنگرێسمانەکان پەیمانیاندا "ئێمە ئەمریکا تەسلیم ناکەین" و وتیان پشتیوانانی ریفۆرم "پیتێکی سووری (ئەی) بۆ ئەمنێستی واتە لێبووردن لە سنگیان بدەن". لەلایەکی ترەوە، سەرۆکی حزبی دیموکرات پرۆگرامی کرێکاری کاتی بەراورد کرد بە "بەکرێگرتنی کارەکەر"ی سەردەمانی زوو. سەرۆکی گەورەترین یەکێتیی کرێکاری ئەمریکا ریفۆرمەکەی بە "دژەخێزان و دژەکرێکار" ناوبرد.

لە گەرمەی گرژییەکاندا، پاش ئەوەی وتارێکم لە کۆلێژی جەنگی دەریایی لە (نیپۆرت) رۆد ئایلەند پێشکەش کردبوو، تەلەفۆنێکم لە تێد کەنەدییەوە پێ گەیشت. وتی "جەنابی سەرۆک، پێویستە تۆ تەلەفۆن بۆ هاری رەید بکەیت و پێی بڵێیت ئەنجومەنی پیران لە کۆتایی هەفتەشدا لە دانیشتن بەردەوام بن". ئێمە بڕوامان وابوو کە دەنگێک یان دوو دەنگمان پێویستە بۆ ئەوەی پرۆژەیاسای ریفۆرمە گشتگیرەکە پەسەند بکرێت، بەڵام ئەنجومەنی پیران بەرنامەی دانابوو بۆ ناوبڕێک بۆ پشووی چواری تەمموزی. بە لەبەرچاوگرتنی گرنگی یاسایەکە، پێم وابوو واباشترە کە کاتی زیاتریان پێ بدرێت بۆ پەسەندکردنی پرۆژەیاساکە. لە رواڵەتدا هاری رەید کۆک نەبوو. ئەگەر تێد نەیتوانیبایە رێبەری زۆرینەی حزبەکەی رازی بکات، ئەوا ئەگەرەکانی من باش نەبوون. من تۆپی خۆمم هەڵدا، بەڵام زۆر درەنگ بوو. هاری بڕیاری خۆی دابوو. ئەو دەنگی کۆتایی هێنان بە وتوێژەکانی دا کە شکستی هێنا و پاشان کۆبوونەوەی

ئەنجومەنی پێڕانی دواخست. سیناتۆرەکان چوونە ماڵەوە و گوێیان بۆ جەماوەری تووڕەیان لەسەر رادیۆ و تەلەفزیۆنەکان هەڵخست. بە هاتنی ئەو کاتەی کە گەڕانەوە بۆ واشنتن، ریفۆرمی کۆچ مردبوو. سەرەنجام، (کۆیۆت)ەکان هێشتا لە ئیشدابوون، کۆچبەران بەردەوام بوون لە پەڕینەوە لە سنوور بە شێوەیەکی نایاسایی و پرسێکی سیاسی یەکلاییکەرەوە بە چارەسەرنەکراوی مایەوە.

***

لەکاتێکدا کە من نائومێد بووم لەوە کە پرۆژەیاساگەلێکم واژۆ نەکردن بۆئەوەی ببنە یاسا، لەوە پەشیمان نەبووم کە ریفۆرمی ئاسایشی کۆمەلایەتی و کۆچم گرتبووە بەر. هەوڵەکانمان هۆشیاریی گشتی وروژاند لەمەڕ ئەو کێشانەی کە لانەدەچوون. وانەیەکی مێژوو ئەوەیە کە هەندێ جار زیاتر لە سەرۆکێك، بگرە زیاتر لە جیلێکی پێویستە تا ئامانجێکی یاسادانانی گەورە بپێکێت. لیندۆن جۆنسن هەوڵەکانی خۆی خستە سەر ئەوانەی هاری ترومان بۆئەوەی چاودێری دەرمان بهێنێتە کایەوە. هیوادارم هەوڵەکانی ئێمە بۆ ئاسایشی کۆمەڵایەتی و کۆچبەرێتی بناغەیەك دابین بکات بۆ سەرۆکێکی داهاتوو تا هەردووکیان ریفۆرم بکات. بەلایەنی کەمەوە، من توانیم کەمێك شۆك لەسەر بابەتە ئاگراوییە لا بدەم.

ئەگەر پێویستبووایە جارێکی تر لە سەر ڕا بیکەمەوە، پاڵم دەنا بۆ ریفۆرمی کۆچبەرێتی نەك ئاسایشی کۆمەڵایەتی وەکو یەکەم دەستپێخەریی گەورەی خولی دووەمم. بە پێچەوانەی ئاسایشی کۆمەڵایەتییەوە، ریفۆرمی کۆچ پشتگیریی دووحزبی هەبوو. ئەو دژایەتییە بەلێشاوەی کە لە ساڵانی ٢٠٠٦ و ٢٠٠٧ لەدژی ریفۆرمی کۆچ تەقیەوە، لەوانەیە لە ساڵی ٢٠٠٥دا ئەوەندە توند نەبووایە. هەروەها پێویستی نەدەکرد کە ئەو گرژییانە کۆنترۆڵ بکەین کە بەهۆی زیادبوونی توندوتیژی لە عیراق و لە زریانی کاترینا کەوتنەوە. هەر کە پرۆژەیاسای سەرکەوتووی کۆچبەرێتی پەسەند دەکرا، دەیتووانی دۆخێکی لەبار دروست بکات بۆ ئاسانکردنی دەست و پەنجە نەرمکردن لەگەڵ ئاسایشی کۆمەڵایەتیدا. لەبری ئەمە، پێچەوانەکەی روویدا. کاتێك ئاسایشی کۆمەڵایەتی شکستی هێنا، دابەشبوونی دووحزبی زیاتر کرد و ریفۆرمی کۆچی سەختتر کرد.

شکستی ریفۆرمی کۆچ، نیگەرانی گەورەتر لەبارەی ئاراستی سیاسەتمان دەوروژێنێت.

ڕێبازی بێباکبوون لەبەرانبەر ئەوانیتر، ڕێبازی قورسکردنی هاوردە، ئەو ڕەسەنایەتیگەرییەش کە کاری کردە سەر مشتومڕی کۆچ، بووە هۆی ئەوەی کە کۆنگرێس ڕێککەوتننامەکانی بازرگانی ئازاد لەگەڵ کۆلۆمبیا، پاناما و کۆریای باشوور بەربەست بکات. من ئەو شڵەژانە ڕاستەقینەیە دەزانم کە خەڵکی لەبارەی پێشبڕکێی بیانییەوە هەستی پێ دەکەن. بەڵام ئابووریمان، ئاسایشمان، کەلتوورمان، هەمووی بەهۆی دانانی دیوار لە چواردەوری خۆمان و دابڕانمان لە جیهان، لاواز دەبێت. نابێ ئەمریکییەکان قەت لە پێشبڕکێ بترسن. وڵاتەکەمان هەمیشە بوژاوەتەوە کاتێک بە بڕوابەخۆبوون و بەهاکانمانەوە دەست و پەنجەمان لەگەڵ جیهاندا نەرم کردووە. ئەمە بۆ سەدەی بیست و یەکیش ڕاستە.

ڕێگایەک بۆ کەمکردنەوەی کاریگەریی جەمسەرە ئایدۆلۆژییەکان لە کۆنگرێسدا، بریتییە لە شێوازی هەڵبژاردنمان بۆ ئەندامانی کۆنگرێس. لە ساڵی ٢٠٠٦دا، تەنیا نزیکەی ٤٥ لە ٤٣٥ ئەندامانی ئەنجومەنی نوێنەران بە جددی ڕکابەری دەکران. لەبەرئەوەی ئەندامانی ئەو ناوچە بەناو سەلامەتانە پێویست ناکا نیگەرانی تەحەددییەکانی حزبی نەیار بن، گەورەترین لاوازییان ئەوەیە کە لەناو حزبەکەی خۆیاندا بکەونە دواوە. ئەمە بەتایبەت لە سەردەمی ئەو خاوەن بلۆگانەدا تەواو ڕاستە کە ئەو سیاسییانە دەکەنە ئامانج کە ئەوان پێیان وایە لە ڕووی ئایدۆلۆژییەوە خەوشیان هەیە. سەرەنجام، ئەندامانی کۆنگرێسی هەردوو حزبەکە وەکو زامنێک لەدژی تەحەداکارە سەرەکییەکان، بەرەو جەمسەرەکان دەڕۆن.

ئەگەر ناوچە کۆنگرێسییەکان (بازنەکانی هەڵبژاردن) بەهۆی گروپی بەتەمەنانی ناحزبی هێڵکاری بکرێن نەک یاسادانەرانی ویلایەتیی حزبی- حکومەتەکەمان بەرهەمهێنتر- و سیاسەتمان بەشارستانیتر دەبێ. ئەمەش یارمەتیدەر دەبێ بۆ هەڵبژاردنی گشتیی پێشبڕکێکارانەتر و کۆنگرێسێکی کەمتر جەمسەرگیر. ئەنجامدانی گۆڕانکارییەکە، پێویستی بەوەیە کە سیاسییەکان دەستبەرداری هەندێ لە دەسەڵاتەکەیان بن، کە کارێکی ئەوەندە ئاسان نییە. بەڵام بۆ ئەو سەرۆکانەی ئایندە کە

سۆراخی مامەڵەکردن لەگەڵ کێشەیەکی گەورەدا دەکەن، ئەم کارە شایستەی ئەوەیە لە ئەستۆ بگیردرێت.

***

یەکێك لە لایەنە هەرە بەرچاوەکانی سەردەمی سەرۆکایەتیم، بینینی ئەوە بوو کە چۆن فەلسەفەکەم لەلایەن خەڵکی جیاوازەوە بە شێوەی جیاواز لێك دەدرێتەوە. مایەی پێکەنین بوو کە دەمبینی رۆژنامەکان منیان بە بە کۆنسێرڤاتیڤترین سەرۆکی مێژوو لەقەڵەم دەدا کەچی خەڵکانی راستڕەو وەکو دژێکی کۆنسێرڤاتیڤ دەبینی. زۆرجار ئەوان قسەیان لەسەر هەمان پرس دەکرد. من ئایدۆلۆژێکی تەواو کۆنسێرڤاتیڤ بووم بەهۆی ئاراستەکردنی هێزەکانی بازاڕ بۆ ناو چاودێریی دەرمانی و لیبراڵی حکومەتی گەورە بووم لە بەرانبەر هێنانەکایەی سوودی دەرمانی رەچەتەکراو. کۆنسێرڤاتیڤێکی بێ دڵ بووم لە بەرانبەر ئاشکراکردنی قوتابخانە شکستخواردووەکان و لیبراڵێکی دڵ بریندار بووم لەبەرانبەر خەرجکردنی پارەی زیاتر لە قوتابیانی هەژار. ئەمە هەمووی پەیوەندی هەبوو بەو کەسەی پرسیارت لێی دەکرد.

من شانازی دەکەم بە واژۆکردنی مۆدێرنیزەکردنی (هیچ منداڵێك پشتگوێ ناخرێت) و (چاودێری دەرمانی) دوو یاسا کە ژیانی هاوڵاتییانمانی باش کرد و پیشانیدا کە پرەنسیپە کۆنسێرڤاتیڤەکانی لێپێچینەوە و پێشبڕکێی پەیوەست بە بازاڕ رێگای کاریگەرن بۆ بەدەستهێنانی ئەنجامەکان. دڵخۆشم کە دەستپێشخەریی پەیوەندیدار بە ئایینەوە هەر بەردەوامە. ئاسودەم کە رۆژێك لە رۆژان ریفۆرمی ئاسایشی کۆمەڵایەتی و کۆچبەرێتی دەبنە واقیع. هەرچییەك بێت گرنگ نییە، من قەناعەتم هەیە کە ئێمە سەرکردایەتی ئەو پرسانەمان کرد کە لەهەموویان گرنگتر بوون– و هەرگیز بە تۆپی بچوك یاریمان نەکرد.

# کاترینا

پرسیارم کرد "کێ بەرپرسیارە لە ئاسایشی (نیوئۆرلیێنز)؟" پرسیارەکەم، مشتومڕو پرژاوەژاوەکەی ڕۆژی هەینیی ناو ژووری کۆنفرانسی هێزی ئاسمانیی یەکی کپ کرد. پارێزگار رەی ناگین بەسەر مێزە رەشەکەدا پەنجەی ئاماژەی بۆ حاکم کاسلین بلانکۆ ڕاکێشا و وتی "حاکم بەرپرسیارە".

هەر سەرێك لە شوێنی خۆیەوە سوڕا. حاکمی لویزیانا بەستی. ئەو شلەژاو و بێزار دیار بوو. بەبێ ئەوەی ڕەتی خۆی بلێت وتی "پێم وایە پارێزگارە".

چوار ڕۆژ بەسەر ئەو کاتەدا تێپەڕیبوو کە زریانی کاترینا لە (کەناری کەنداو)ی دابوو. بای سەروو ۱۲۰ مایل لە سەعاتێکدا هێڵی کەناریی (میسیسیپی) تەخت کردبوو و دیوارێکی لە ناو بەسەر بەربەستەکانی نیوئۆرلیێنزدا ئاراستە کردبوو. ۸۰٪ی شارەکە، کە دانیشتووانەکەی ۴۵۰,۰۰۰ کەس بوو، لافاو لێیدابوو. قسەوباسی تالان و توندوتیژی هەواڵەکانی پڕکردبووەوە.

بەپێی یاسا، دەسەڵاتدارانی لۆکاڵ و ویلایەت، بەرپرسیارێتییان خستبووە ئەستۆی کارەساتە سروشتییەکان، لەکاتێکدا کە حکومەتی ڕۆڵی پشتگیری دەبینی. ئەو بۆچوونە ماوەی ئەو هەشت زریان، نۆ تۆفانی خولگەیی و زیاتر لە دووسەد گەردەلول، لافاو، گرکەوتنەوە و ئیمێرجێنسییەکانی تر کە لە ساڵی ۲۰۰۱وە ڕووبەڕوومان بیوونەوە، ئارادا بوو. یەکەم وەڵامدەرەوانی ویلایەتی و لۆکاڵ بەرپرس بوون لە کۆنترۆڵکردنی دانەوەی کاترینا لە ئەلاباما و میسیسیپی کە من سەرەتای ڕۆژەکە سەردانم کردبوون.

بەڵام پاش چوار رۆژ لە پشێوی، روون بوو کە دەسەڵاتداران لە لویزیانا ناتوانن رێبەرایەتی بکەن.

پلانی سەرەتایی بۆ من ئەوە بوو کە لە فڕۆکەخانەی نیوئۆرلیەنز بنیشمەوە، حاکم بلانکۆ و پارێزگار ناگین هەڵبگرم و لە گەشتێکی هەواییدا رووپێوییەکی زیانەکە بکەم. بەڵام لە گەشتی ئاسمانیی مارین یەکدا لە میسیسیپی-ەوە، پەیامی ئەوەمان پێگەیشت کە حاکم، پارێزگار و وەفدێکی کۆنگرێسی لویزیانا یەکەم جار داوای کۆبوونەوەیەکی تایبەت دەکەن لەسەر هێزی ئاسمانیی یەک.

تۆنی دەنگەکان بە گرژییەوە دەستی پێکرد و خراپتر بوو. حاکم و پارێزگار دەمەقاڵێیان کرد. هەمووان ئاژانسی (بەڕێوەبردنی ئیمێرجێنسی فیدراڵ)یان تۆمەتبار کرد لە نەتوانینی وەڵامدانەوەی پێویستییەکانیان. کۆنگرێسمان (بۆبی جیندال) ئاماژەی بەوە کرد کە بەڕێوەبردنی ئیمێرجێنسی فیدراڵ داوای لە خەڵکی کردووە وەڵامی داواکانیان بدەنەوە سەرباری نەبوونی کارەبا لە شارەکەدا. من بە سەیرکردنێکی مایک براونی بەرێوەبەری (بەڕێوەبردنی ئیمێرجێنسی فیدراڵ)سەرم راوەشاند و وتم "ئێمە چارەسەری دەکەین". سیناتۆر ماری لاندریۆ بە تەقینەوەیەکی سۆزیی پوچ قسەکانی بڕی. دەبووایە لە ساتێك لە ساتەکاندا پێی بڵێم "ئەرێ بێ دەنگ ئەبیت؟".

داوام کرد بەتەنیا قسە لەگەڵ حاکم بلانکۆ بکەم. لە ژووری کۆنفرانسەکە بە راڕەوێکی بەرتەسکدا بەرەو کابینەیەکی بچوکی لای هێزی ئاسمانیی یەك رۆیشتین. پێم وت ئاشکرا و روونە کە هێزەکانی کاردانەوەی لۆکاڵ و ویلایەت دەستەوستان بوون. بە پێداگرییەوە وتم "حاکم، دەبێ تۆ رێگە بدەیت بە حکومەتی فیدراڵ تا بەرپرسیارێتیی کاردانەوەکە بگرێتە ئەستۆ". وتی پێویستم بە بیست وچوار سەعاتە تا بیری لێبکەمەوە. وتم "٢٤ سەعات کاتمان نییە، هەنوکە یەکجار زۆر چاوەڕێ بووین".

حاکم ئامادە نەبوو وەڵام بداتەوە.

دواتر داوام کرد بە تەنیا پارێزگار ناگین ببینم. لەو کاتەوە کە کاترینا هەڵیکردبوو، چوار رۆژی لە هۆتێلێکی ناوشار بەسەر بردبوو. ئەو خۆی نەشتبوو و ژەمێکی گەرمی نەخواردبوو تا ئەو کاتەی کە نانی بەیانی لەسەر هێزی ئاسمانیی یەك خوارد و

گەرماوەکەی منی بەکارهێنا. ئێوارەی پێشوو لە گفتوگۆیەکی رادیۆییدا، تورەیی خۆی بەسەر حکومەتی فیدرالدا هەلرشتبوو. ئەو وتی "قونتان هەلگرن و وەرن شتێ بکەن" و "با گەورەترین قەیرانی نەفرەتی لەمێژووی ئەم ولاتەدا چارەسەر بکەین". پاشان دەستی کرد بە گریان. کاتێک لەسەر فرۆکەکە بینیم، رەی داوای لێبووردنی کرد لەبەرانبەر گریانەکەی و روونی کردەوە کە ئەوەی ماندوو بووە.

پرسیارم لە پارێزگار کرد ئاخۆ رەئی چۆنە لەبەرانبەر فیدرالیزەکردنی کاردانەوەکە. ئەو پشتگیری کرد. وتی "کەس بەرپرس نییە. پێویستمان بە هەیکەلێکی فەرماندەیی روون هەیە". بەلام تەنیا حاکم دەتوانێ داوای ئەوە بکات کە حکومەتی فیدرال کۆنترۆلی ئیمێرجێنسییەکە لە ئەستۆ بگرێت.

***

بە هاتنی ئەو کاتەی کە زیانەکە خەملێنرابوو، زریانی کاترینا بە پرتێچوونترین کارەساتی سروشتیی لە مێژووی ئەمریکا پلەبەندی کرا. لە راستیدا تاکە کارەساتێک نەبوو، بەلکو سیان بوو- تۆفانێک کە چەندەها مایلی کەناری کەنداوی رامالیبوو، لافاوێک کە بەهۆی شکانی بەربەستەکانی نیوئۆرلینز دروست ببوو و کەوتنەوەی توندوتیژی و بێ یاساییەک لە شارەکەدا. لە ئاستێکدا، تراژیدیاکە دەستەوستانی مرۆڤی پیشاندا لەبەرانبەر تورەیی سروشتدا. کاترینا زریانێکی یەکجار بەهێز بوو کە لە بەشێکی ولاتیدا کە بەشێوەیەکی سەرەکی کەوتووەتە ژێر ئاستی دەریاوە. تەنانەت کاردانەوەیەکی بێ خەوشیش نەدەبووە هۆی وەستاندنی زیانە کارەساتئامێزەکە.

کاردانەوەکە نەک تەنیا کەم و کورت بوو، هەروەکو ئەو کاتە وتم، بەلکو قبوڵنەکراویش بوو. لەکاتێکدا کە کرداری ئیلهامبەخشی لەخۆبردوویی و قارەمانانە هەبوون لەماوەی لەپاش زریانەکەدا، کاترینا بیرۆکەی پەرت و پلاوی، ناکارایی و ئەو هەستە دروست دەکات کە حکومەت هاولاتیانی وێل دەکات. هەلەی جددی لە هەموو ئاستەکانەوە هات، لە شکستەوە بۆ فرمانکردن بە چۆلکردنی هاوکاتی نیوئۆرلیەنز، بۆ پارچەپارچەبوونی هێزەکانی ئاسایشی لۆکال، بۆ اتصالات و هەماهەنگیی خەمناک. وەکو سەرۆکی حکومەتی فیدرال، دەبووایە من کەموکورتییەکانم زووتر تێبینی بکردایە و خێراتر

ئەدەخولم بکردایە. شانازی بەخۆمەوە دەکەم کە توانیم بڕیاری کاریگەر و تۆکمە بدەم. لەگەڵ ئەوەشدا، لە ڕۆژانی پاش کاترینادا، ئەمە ڕووی نەدا. کێشەکە ئەوە نەبوو کە من بڕیاری هەڵەمدا، بەڵکو ئەوە بوو کە کاتێکی زۆری خایاند تا بڕیارمدا.

هەروەها من هەڵەی تریشم کرد لە ڕێگەی نەتوانینی بایی پێویست گەیاندنی نیگەرانییەکانم بە قوربانییەکانی کاترینا. ئەمە کێشەی پەیبردن بوو، نەك واقیع. دڵم بەو خەڵکە سوتا کە لە سەربانەکەیان گیریان خواردبوو و چاوەڕێی ڕزگاربوونیان دەکرد. من زۆر بەو ڕاستیە پەست بووم کە بەهێزترین وڵات لەجیهاندا ناتوانێ ئاو بگەیەنێتە ئەو دایکانەی کە منداڵەکانیان لەژێر خۆرەتاوی سوتێنەردا وشك هەڵاتون. لە سیانزەهەمین سەردانمدا بۆ نیبوئۆرلیەنز پاش زریانەکە، هاوخەمی قوڵم بە زیانلێکەوتووان گەیاند و سووربوونی خۆمم نیشاندا بۆ یارمەتیدانی دانیشتووان تا ماڵ و حاڵیان بونیاد بنێنەوە. لەگەڵ ئەوەشدا زۆرێك لە هاوڵاتیان، بەتایبەت لەناو کۆمەڵی ئەمریکیی ئەفریقیدا، گەیشتنە ئەو قەناعەتەی کە سەرۆکەکەیان گوێی پێ نەداون.

هەروەکو چۆن کاترینا لە زریانێك زیاتر بوو، بەهەمان شێوە کاریگەرییەکەی لە تێکشکاندنێکی فیزیکی گەورەتر بوو. متمانەی هاوڵاتی بە حکومەت سڕیەوە. دابەشبوونی لە کۆمەڵگە و ناو سیاسەتدا زیاتر کرد. هەروەها تەمێکی بەسەر خولی دووەممدا هێنایە کایەوە.

هەر زوو دوای زریانەکە، زۆر کەس بڕیاریاندا لەبارەی ئەوەی کە چی ڕوویداوە و کێ بەرپرسە. ئێستا کە کاتەکە تێپەڕیبووە و هەستەکان سارد بوونەتەوە، وڵاتەکەمان دەتوانێ هەڵسەنگاندنێکی هۆشیارانە بکات لەبارەی هۆکارەکانی وێرانکارییەکە، سەرکەوتنەکان و شکستەکانی کاردانەوەکە و لە هەمووی گرنگتر، ئەو وانانەی کە لێی کەوتنەوە.

***

من لە مێشکی خۆمدا دیمەنەکەم لێدایەوە: زیانی زریانەکە بەرفراوان بوو. حاکم سەرزەنشتی واشنتنی کرد لەبەرانبەر ئەوەی کە خاو و بیرۆکراتی بووە. میدیا لۆمەی

کۆشکی سپی کرد. سیاسییەکان بانگەشەی ئەوەیان کرد کە حکومەتی فیدراڵ کەس دەستی نەدەگەیشتێ.

ساڵ ساڵی ۱۹۹۲ بوو و من تەماشای ئەوەم کرد کە باوکم بەرگەی یەکەم ململانێی خێزانەکەمان لەگەڵ سیاسەتی کارەساتی سروشتی دەگرێت. بە نزیکبوونەوەی هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی، زریانی (ئەندرو) کەناری فلۆریدای رامالیبوو. حاکم (لاوتن چیلز)ی دیموکراتی و هەڵمەتی بیل کلینتن دارمانەکەیان قۆستبووەوە بۆ بانگەشەی ئەمەی کە حکومەتی فیدراڵ هیچی نەکردووە. رەخنەکەیان نادادپەروەرانە بوو. باوکم فرمانی دابوو بە کاردانەوەیەکی نەرم لە بەرانبەر زریانەکەدا. ئەو ئاندی کاردی ناردبوو، کە ئەو کاتە وەزیری گواستنەوە بوو، بۆئەوەی لە فلۆریدا بژیت بۆ چاودێریکردنی بوژانەوەکە. بەڵام هەر کە خەڵکی ئەو پەیبردنەیان لادروستببوو کە باوکم بێ باک بووە، پێچەوانەکردنەوەکەی قورس بوو.

وەکو حاکمی تەکساس، من ژمارەیەکی زۆر کارەساتی سروشتیم بەڕێوە بردووە. هەر لە ئاگرکەوتنەوەکانی قەزای (پارکەر) تا لافاوەکانی (هیل کەنتری) و هوستن و تا ئەو گەردەلولەی کە شاری بچوکی (جارێل)ی تێک و پێک دا. هەرگیز هیچ گومانێک نەبوو لەبارەی دابەشبوونی هێزی کار. لەژێر یاسای (ستافۆرد) کە لە ساڵی ۱۹۸۸دا پەسەند کرا، کاربەدەستانی ویلایەتی و لۆکاڵ بەرپرسبوون لە رێبەرایەتی کردنی کاردانەوە سەرەتاییەکە. حکومەتی فیدراڵ دوایی گەیشت، ئەمیش لەسەر داوای ویلایەتەکە. وەکو حاکم، ئەمە رێك بەو شێوازە بوو کە دەمویست.

وەکو سەرۆك، بەرپرسیارێتیم کەوتە ئەستۆ بۆ لایەکەی تری هاوکاریی ویلایەت–فیدراڵ. من (جۆ ئالابۆ)ی سەرۆکی ستافەکەم لە ئۆفیسی حاکم راسپارد بۆ رێبەرایەتیکردنی ئاژانسی (بەڕێوەبردنی ئیمێرجێنسی فیدراڵ). پاش ۱۱ی سێپتێمبەر، ئەو بیست و پێنج تیمی (گەڕان و رزگارکردن)ی بۆ نیویۆرك و پێنتاگۆن نارد کە گەورەترین خستنەکار بووە لە مێژوودا. جۆ بەشێوەیەکی کاریگەر لەگەڵ رودی جولیانی و جۆرج پاتاکی ئیشی کرد بۆ لابردنی پاشەوارەکان، پشتگیریکردنی پۆلیس و ئاگرکوژێنەوەی لۆکاڵ و گەیاندنی ملیاردەها دۆلار بۆ یارمەتیدانی بوژانەوەی نیویۆرك.

کاتێك من لەگەڵ کۆنگرێس کارم کرد بۆ ڕێکخستنەوەی حکومەت لە ۲۰۰۲دا، ئاژانسی (بەڕێوەبردنی ئیمێرجێنسی فیدراڵ)، کە ئاژانسێکی سەربەخۆیە لە ۱۹۷۹وە، بوو بە بەشێك لە وەزارەتی نوێی ئاسایشی نیشتمانی. پێم وابوو شتێکی لۆژیکییە بۆ ئەو کاربەدەستانەی کە ئەرکی بەرگرتن لە هێرشی تیرۆریستییان لە ئەستۆیە شانبەشانی ئەوانە کار بکەن کە خۆیان بۆ کاردانەوە ئامادە دەکەن. بەڵام ئەو جوڵەیە بە مانای نەمانی سەربەخۆیی ئاژانسی (بەڕێوەبردنی ئیمێرجێنسی فیدراڵ) هات. نازانم ئاخۆ ئەوە ڕێکخستنەوە بوو یان ئارەزووی ئەو بۆ گواستنەوە بوو بۆ کەرتی تایبەت، بەڵام (جۆ ئالآبۆ) بڕیاری جێهێشتنی دا. ئەو جێگرەکەی، (مایکڵ براون)ی ڕاسپارد بۆئەوەی شوێنی بگرێتەوە. من ئامۆژگارییەکەیم وەرگرت.

یەکەم تاقیکردنەوەی بونیادی کاردانەوەی ئیمێرجێنسییە نوێیەکە لە ماوەی وەرزی زریانی ۲۰۰٤دا هات. لە ماوەی شەش هەفتەدا، چوار زریانی گەورە– چارلی، فرانسس، ئیڤان و جین– لە فلۆریدایاندا. ئەمە یەکەم جار بوو لە نزیکەی ۱۲۰ ساڵدا کە ویلایەتێك ڕووبەڕووی ئەو هەموو زریانە ببووەوە. من چوار گەشتم بۆ ویلایەتەکە ئەنجامدا، کە تیایدا سەردانی ئەو دانیشتووانەم کرد کە ماڵ و حاڵیان لە (پێنساکۆلا) لەدەستدابوو، ئەو کشتیارانەی کاهو لە (لەیك وەیلز) کە سەوزاییەکەیان ڕاماڵرابوو و ئەو کرێکارانەی بوژانەوەش کە پێداویستییان بە (پۆرت سەینت لوسی) دەگەیاند. تێکڕا، هەر چوار زریانەکە بووەهۆی زیاتر لە ۲۰ ملیارد دۆلار زیان، کارەبای لە زیاتر لە ۲٫۳ ملیۆن خەڵك کوژاندبووەوە و ۱۲۸ کەسی کوشتبوو. ڕێژەکە زۆر گەورە بوو، لەگەڵ ئەوەشدا دەشیا ڕێژەی گیانلەدەستدان زۆر زیاتر بێت. حاکمی فلۆریدا، بەڕێوەبەرێکی جێبەجێکاری بەهێز بوو کە لە پێویستیی ڕێبەرایەتیکردنی کاردانەوەی کارەساتەکە لەلایەن کاربەدەستانی لۆکاڵ و ویلایەتی تێدەگەیشت. جێبی برام دۆخی ئیمێرجێنسی ڕاگەیاند، هێڵی اتصالی ڕوونی بونیادنا و داواکاری دیاریکراوی خستەڕووی حکومەتی فیدراڵ. ئاژانسی بەڕێوەبردنی ئیمێرجێنسی فیدراڵ بە دابەزاندنی ۱۱٫۰۰۰ کرێکار لە سەرانسەری فلۆریدا و ویلایەتە بەرکەوتووەکانی تر وەڵامی دایەوە، کە گەورەترین ئۆپەراسیۆن بوو لە مێژوویدا. لە فلۆریدا، ئاژانسی بەڕێوەبردنی ئیمێرجێنسی فیدراڵ ١٤ ملیۆن ژەم، ۱۰٫۸

کاتێک من لەگەڵ کۆنگرێس کارم کرد بۆ ڕێکخستنەوەی حکومەت لە ٢٠٠٢دا، ئاژانسی (بەڕێوەبردنی ئیمێرجێنسی فیدراڵ)، کە ئاژانسێکی سەربەخۆیە لە ١٩٧٩وە، ئاژانسی بەشێک لە وەزارەتی نوێی ئاسایشی نیشتمانی. پێم وابوو شتێکی لۆژیکییە بۆ ئەو کاربەدەستانەی کە ئەرکی بەرگرتن لە هێرشی تیرۆریستییان لە ئەستۆیە شانبەشانی ئەوانە کار بکەن کە خۆیان بۆ کاردانەوە ئامادە دەکەن. بەڵام ئەو جوڵەیە بە مانای نەمانی سەربەخۆیی ئاژانسی (بەڕێوەبردنی ئیمێرجێنسی فیدراڵ) هات. نازانم ئاخۆ ئەوە ڕێکخستنەوە بوو یان ئارەزووی ئەو بۆ گواستنەوە بوو بۆ کەرتی تایبەت، بەڵام (جۆ ئاڵبۆ) بڕیاری جێهێشتنی دا. ئەو جێگرەکەی، (مایکڵ براون)ی ڕاسپارد بۆئەوەی شوێنی بگرێتەوە. من ئامۆژگارییەکەیم وەرگرت.

یەکەم تاقیکردنەوەی بونیادی کاردانەوەی ئیمێرجێنسییە نوێیەکە لە ماوەی وەرزی زریانی ٢٠٠٤دا هات. لە ماوەی شەش هەفتەدا، چوار زریانی گەورە- چارلی، فرانسس، ئیڤان و جین- لە فلۆریدایاندا. ئەمە یەکەم جار بوو لە نزیکەی ١٢٠ ساڵدا کە ویلایەتێک ڕووبەڕووی ئەو هەموو زریانە ببووەوە. من چوار گەشتم بۆ ویلایەتەکە ئەنجامدا، کە تیایدا سەردانی ئەو دانیشتووانەم کرد کە ماڵ و حاڵیان لە (پێنساکۆلا) لەدەستدابوو، ئەو کشتیارانەی کاهو لە (لەیك وەیلز) کە سەوزاییەکەیان ڕامالرابوو و ئەو کرێکارانەی بوژانەوەش کە پێداویستییان بە (پۆرت سەینت لوسی) دەگەیاند. تێکڕا، هەر چوار زریانەکە بووەهۆی زیاتر لە ٢٠ ملیارد دۆلار زیان، کارەبای لە زیاتر لە ٢,٣ ملیۆن خەڵك کوژاندبووەوە و ١٢٨ کەسی کوشتبوو. ڕێژەکە زۆر گەورە بوو، لەگەڵ ئەوەشدا دەشیا ڕێژەی گیانلەدەستدان زۆر زیاتر بێت. حاکمی فلۆریدا، بەڕێوەبەرێکی جێبەجێکاری بەهێز بوو کە لە پێویستیی ڕێبەرایەتیکردنی کاردانەوەی کارەساتەکە لەلایەن کاربەدەستانی لۆکاڵ و ویلایەتی تێدەگەیشت. جێبی برام دۆخی ئیمێرجێنسی ڕاگەیاند، هێڵی اتصالی ڕوونی بونیادنا و داواکاری دیاریکراوی خستەڕووی حکومەتی فیدراڵ. ئاژانسی بەڕێوەبردنی ئیمێرجێنسی فیدراڵ بە دابەزاندنی ١١,٠٠٠ کرێکار لە سەرانسەری فلۆریدا و ویلایەتە بەرکەوتووەکانی تر وەڵامی دایەوە، کە گەورەترین ئۆپەراسیۆن بوو لە مێژوویدا. لە فلۆریدا، ئاژانسی بەڕێوەبردنی ئیمێرجێنسی فیدراڵ ١٤ ملیۆن ژەم، ١٠,٨

گالۆن ئاو و نزیکەی ١٦٣ ملیۆن پاوەند بەفری نارد. پاشان ئاژانسەکە یارمەتی گەیاندنی ١٣,٦ ملیارد دۆلاری دا لە بوژانەوەی ئیمێرجێنسیدا بۆ خەڵکی بەرکەوتوو. مایک براون بەو ئەدائەی کە نواندنی، متمانەی منی بەدەستهێنا و منیش تاکەکەس نەبووم. ڕەخنەگرێکی سەرسەتخت، جێب وتی مایك کارێکی باشی ئەنجام داوە.

بەڕێوەبردنی کاریگەری زریانەکانی ٢٠٠٤ چەندەها ژیانی ڕزگار کرد و یارمەتی قوربانییەکانیدا تا بونیاد بنێنەوە. بە تاقیکردنەوەی مۆدێلەکەمان لەبەرانبەر چوار زریانی گەورەی یەك لەدوای یەك، هاتینە سەر ئەو قەناعەتەی کە دەتوانین مامەڵە لەگەڵ هەر شتێکدا بکەین.

***

سێشەممە، ٢٣ی ئۆگەستی ٢٠٠٥، دەزگای کەش و هەوای نیشتمانی تێبینی زریانێکی کرد بەسەر (باهاماس)دا. لە سەرەتادا بە تۆفانی خولگەیی (دیپرێشن تویلف) لەقەلەم درا، پاشان توند بوو و بوو بە زریانێکی خولگەیی و ناوی کاترینای وەرگرت. بەهاتنی ٢٥ی ئۆگەست زریانێکی نمرە یەك بوو کە بەرەو باشووری فلۆریدا دەهات. سەعات ٦:٣٠ی ئێوارە، کاترینا بە شەپۆلێك بای هەشتا مایل لە سەعاتێکدا، سەربانی ماڵەکانی ڕامالی و زیاتر لە پێیەك بارانی داکرد. سەرباری فرمانەکانی چۆڵ کردن، هەندێ خەڵك بەشێوەیەکی نائیران مانەوەی لەژێر زریانەکەدا هەڵبژارد. چواردە کەس گیانی لەدەستدا.

من لە کراوفۆردەوە بەردەوام هەواڵی تازەم پێدەگەیشت، کە من و لۆرا بەشی زۆری مانگی ئۆگەستمان تیایدا بەسەر برد. ڕاگەیاندنەکان کاتی دوورکەوتنەوەی منیان لە واشنتن بە بەسەربردنی پشوو ناوبرد. بەڵام بەو شێوەیە نەبوو. من لێدوانی هەواڵگریی ڕۆژانەم لەشوێنگەیەکی ئارامەوە لەوبەر جاددەوە وەردەگرت، زووزوو قسەم لەگەڵ ڕاوێژکارەکان دەکرد و کێڵگەکەم وەکو بنکەیەکی کۆبوونەوەکان و سەفەرکردن بەکارهێنا. بۆ هەر کوێ بڕۆیشتمایە بەرپرسیارێتییەکانی سەرۆکایەتی بەدوامەوە بوون. ئێمە تازە (لای خۆرئاوا)ی کۆشکی سپیمان گواستبووەوە بۆ ٢٠ مایڵ بە دوورایی قوڵتری خۆرئاوا.

پاش لێدانی باشووری فلۆریدا، کاترینا بە سەرانسەری کەنداوی مەکسیکۆ بەرەو ئالاباما، میسیسیپی و لویزانا جولا. یاریدەدەرێ بالام لە کراوفۆرد، جۆ هاگنی جێگری سەرۆکی ستاف لە بەرەوپێشچوونەکان ئاگاداری دەکردمەوە. بە هاتنی رۆژی شەممە، ٢٧ی ئۆگەست، کاترینا نمرە سێ بوو. لە رۆژی یەکشەممەدا، بەهێزتر بوو و بوو بە نمرە چوار و پاشان نمرە پێنج، کە ترسناکترین پلەبەندی بوو. سەنتەری زریانی نیشتمانیش چاوخشاندبووەوە بە پێشبینییەکەی بۆ ئاراستەی زریانەکە. لە بەرەبەیانیی رۆژی شەممە، کاترینا رووی کردبووە نیبوئۆرلێنز.

شارەکەم باش دەناسی. نیبوئۆرلێنز بە ئۆتۆمبێل نزیکەی شەش سەعات لە هوستنەوە دوور بوو و لە رۆژانی لاوێتیترمدا زۆرجار گەشتی پێم بەرەو ئەوێ ئەنجام دەدا. کەیفم بە خواردن، کەلتوور و ئەو خەڵکە چالاکەی نیبوئۆرلێنزی ناسراو بە (بیگ ئیزی) دەهات. بەهەمان شێوە ئاگادار بووم لە ترسی گەورەی شارەکە. خەڵکی لۆکاڵ بە (گەورەکەیان) ناودێریان کردبوو، زریانێکی (نزا بکە قەت روونەدات) کە دەیتوانی شارەکەیان نقوم بکات.

هەرکەسێك کە سەردانی نیبوئۆرلێنزی کردبێت لە شڵەژانەکەیان تێگەیشتووە. شارە نزمەکە شێوەکەی وەکو نیوە دەفرێك بوو. سیستەمێکی بەربەست و کەناڵ –لێواری دەفرەکە– پارێزگاریی سەرەکیی لافاو بۆ شارەکە دابین دەکات. بەربەستەکان کە لەلایەن لەشکری ئەندازیارانی سوپا بونیادنراوە، مێژوویەکی سەربەگۆبەندیان هەیە. کاتێك من حاکم بووم، کتێبی بی وێنەی (جۆن باری)م خوێندبووەوە بەناوی (تەوژمی بەرزبووەوە) لەبارەی لافاوی گەورەی میسیسیپی لە ساڵی ١٩٢٧دا. پاش ئەوەی لێزمەباران رووبارەکانی بەرز کردبووەوە، کاربەدەستانی نیبوئۆرلێنز حاکمی لویزیانایان رازی کردبوو تا بەربەستێك بتەقێنێتەوە بە ئومێدی پارێزگاری لە شارەکە. ئەو هەنگاوە بیووەهۆی وێرانکردنی دوو دێهات (پلاکمینس) و (سەینت بێرنارد). بەپێی تێپەربوونی کات، بەربەستەکان تۆکمە کرابوون، بەتایبەت پاش زریانی (بێتسی) لە ١٩٦٥دا. ئەوان لەماوەی چل ساڵی دواتردا، بەرگەی حەوت زریانیان گرتبوو.

وانەیەکی زریانەکانی ٢٠٠٤ی فلۆریدا ئەوە بوو کە خۆئامادەکردنێکی تۆکمە پێش هەر زریانێک، زۆر گرنگە بۆ سەرکەوتنی کاردانەوەکە. کاتێک ئێمە بۆمان دەرکەوت کە کاترینا رووی کردووەتە نیوئۆرلێنز، من ئاژانسی بەڕێوەبردنی ئیمێرجێنسی فیدراڵم خستە بەرزترین حاڵەتی ئامادەباشییەوە. حکومەت زیاتر لە ٣,٧ ملیۆن لیتر ئاو، ٤,٦ ملیۆن پاوەند بەفر، ١,٨٦ ملیۆن ژەمی ئامادە بۆ خواردن و ٣٣ تیمی پزیشکی ئامادە کرد. تێکڕا، ئەمە گەورەترین ئامادەکاریی پێداویستییەکانی بوژاندنەوە بوو لە مێژووی ئاژانسی بەڕێوەبردنی ئیمێرجێنسی فیدراڵدا.

سوپاش هێزی بۆ شوێنی خۆی جوڵاند. ئەدمیراڵ (تیم کیتین)- سەرۆکی فەرماندەیی نوێی باکوور، کە ئێمە پاش ١١ی سێپتێمبەر دروستمان کرد بۆ پارێزگاری لە خاک- تیمەکانی کاردانەوەی کارەساتی رەوانەی کەناری کەنداو کرد. گاردی کەنار کۆپتەرەکانی خستە ئامادەباشییەوە. زیاتر لە پێنج هەزارکارمەندی گاردی نیشتمانی لە ویلایەتە بەرکەوتووەکاندا لە ئامادەباشیدا بوون. هێزەکانی گارد لە ویلایەتەکانی ترەوە ئامادە ببوون بۆ وەڵامدانەوەی بانگەوازەکانی کۆمەک. بە پێچەوانەی بانگەشەکانی دواتر، هەرگیز کەموکوڕیی پیاوانی گاردی بەردەست لە ئارادا نەبوو، چ لەبەر هۆکاری عێراق یان هەر شتێکی تر.

هەموو ئەو چالاکییە فیدراڵانە، بە نیازی پشتگیریکردن بوو لە کاربەدەستانی لۆکاڵ و ویلایەت. تیمەکەی من، کە لەلایەن وەزیری ئاسایشی نیشتمانی (مایک شێرتۆف) رێبەرایەتی دەکرا- پارێزەرێکی لێهاتوو و پیاوێکی شایستە کە پیشەی ژیانی خۆی وەکو دادوەر وازلێهێنابوو بۆئەوەی کارەکە وەرگرێت- لە نزیکی حاکمەکانی لویزیانا، میسیسیپی، ئالاباما و فلۆریدا مایەوە. حاکم بلانکۆ داوای راگەیاندنێکی ئیمێرجێنسی کرد بۆ رێگەدان بە لویزیانا تا سەرچاوەکانی فیدراڵ بەکاربێنێت بۆ دارایی و پشتیوانی دابینکردن بۆ ئامادەکارییەکانی ویلایەت پەیوەست بە کاردانەوەی کارەسات. لە مێژووی نوێدا تەنیا یەک جار- پێش زریانی فلۆید لە ١٩٩٩دا- سەرۆکێک راگەیاندنێکی ئیمێرجێنسی دەرکردووە بەر لەوەی زریانێک بکەوێتەوە. من لە شەوی شەممەدا واژۆم کرد شانبەشانی راگەیاندنی تر بۆ میسیسیپی و ئالاباما لە رۆژی دواتردا.

***

لە بەرەبەیانی ڕۆژی یەکشەممەدا، سەنتەری زریانی نیشتمانی، زریانی کاترینای نەک تەنیا بە "یەکجار توند بەڵکو بە بەشێوەیەکی ناوازە گەورە"ش لەقەڵەمدا. پارێزگا ناگین ڕێنمایی بڵاوکردبووەوە لەمەڕ چۆڵکردنی خۆبەخشانە. من ئەوەندە باش نیوئۆرلێنز شارەزا بووم کە تێگەیشتم ئەمە سوودی نابێت. خەڵکی بۆ ماوەی ساڵانێک هۆشداریی زریانێکی وێرانکەریان وەرگرتبوو. هەندێ کەس ئەم هۆشدارییانەیان وەکو پاساوێک بەکارهێنا بۆ ئاهەنگ گێڕان لەسەر شەقامی بۆربون لە بەرەنگاریکردنی خوداکانی زریاندا. ئەوانیتر ئامرازەکانی چۆڵکردنیان نەبوو. چۆڵکردنەکە پێویستی بەوە بوو کە بەزۆر بێت، بە ڕێوشوێنی تایبەتەوە بۆ ئەو خەڵکەی کە پێویستیان بە یارمەتی بوو، وەکو پاسی گواستنەوە بۆ ئەوانەی کە ئۆتۆمبێلیان نەبوو- هەنگاوێک کە شارەکە هەرگیز نەینا و دیمەنی دڵتەزێنی پاسە بەتاڵە ریزبەستووەکانی ژێرئاوکەوتووی گەراجی قوتابخانەکانی نیوئۆرلیەنزی لێکەوتەوە.

من لە سەعات ٩:١٤ی بەیانی پەیوەندیم بە حاکم بلانکۆوە کرد.

پرسیارم کرد "لە نیوئۆرلیەنز چ باسە؟" "ناگین فرمانی بەزۆری دەرکرد؟"

ئەو وتی نەخێر، سەرباری ئەو هۆشدارییە توندانەی شەوی رابردوو لە (ماکس مەیفیلد)ی بەڕێوەبەری سەنتەری زریانی نیشتمانی وەریانگرتووە. ماکس وتی ئەوە تەنیا دووەم جار بوو لە ماوەی کارە سی و شەش ساڵەکەیدا کە ئەوەندە شڵەژاو بووە بە شێوەیەکی کەسی پەیوەندی بە کاربەدەستە هەڵبژێردراوەکانەوە کردووە. بە حاکم بلانکۆم وت "دەبێ پارێزگار فرمان بە خەڵکەکە بکات بڕۆن. ئەمە تاکە رێگەیە کە ئەوان گوێبیست بن". "تەلەفۆنی بۆ بکە و پێی بڵێ. خەڵکەکەم پێم دەڵێن ئەمە زریانێکی کارەساتبار دەبێ".

ئەو وتی "ئەوان ناتوانن خەڵکی یەک بە یەک لەکاتی خۆیدا بهێننە دەرەوە". بەداخەوە، دەمزانی راست دەکات. بەڵام وا باشتر بوو کە ئێستا دەست پێ بکەیت نەک زیاتر چاوەڕێ بکەیت.

پرسیارم لە حاکم کرد "چی ترت لە حکومەتی فیدراڵ پێویستە؟"

ئەو دڵنیای کردمەوە کە لە نزیکەوە خەریکی کارکردن بووە لەگەڵ تیمەکەمدا و ئەوەی کە پێویستییەتی لەبەردەستیدایە.

وتم "دڵنیایت؟" وتی "بەڵێ جەنابی سەرۆک، ئێمە خستوومانەتە ژێر کۆنترۆڵەوە".

"وتم "باشە، لەوێ بە. پەیوەندیش بکە بە رەی و پێی چۆڵ بکە، هەر ئێستا". سەعاتێك دواتر، پارێزگار ناگین یەکەم چۆلکردنی بەزۆری لە مێژووی نیوئۆرلیەنزدا راگەیاند. ئەو وتی "ئەمە هەرەشەیەکە کە هەرگیز پێشتر رووبەرووی نەبووینەتەوە". کەوتنەوەی کاترینا کەمتر لە بیست و چوار سەعاتی مابوو.

من بەهەمان شێوە تەلەفۆنم بۆ (هالی باربەر)ی حاکمی میسیسیپی؛ حاکم (بۆب ریلی)ی ئالاباما و جێبی برام لە فلۆریدا کرد. پێم وتن کە دەتوانن متمانە بکەنە سەر پشتیوانییەکی بەهێز لە حکومەتی فیدراڵەوە.

کەمێك بەر لە ١١ی بەیانی، من لەگەڵ کاربەدەستانی ئەو ویلایەتانەی کە کاترینا دەیانگرتەوە، چوومە پاڵ ڤیدیۆکۆنفرانسی ئاژانسی بەڕێوەبردنی ئیمێرجێنسی فیدراڵ. ئەمە حاڵەتێکی دەگمەن بوو بۆ سەرۆکێك کە ئامادەی لیدوانێکی ئاستی ستاف لەو شێوەیە بێت. من هەندێ روخساری واق ورماوم لەسەر شاشەکە بەدی کرد کاتێك دەم و چاوم دەرکەوت. بەڵام دەمویست بە تەواوی حکومەتەکە بڵێم کە من زریانەکەم چەندە بە جددی وەرگرتووە.

مشتومڕێك هەبوو لەسەر ئەگەری هاتنی لافاو بە درێژایی هێڵی کەناری و ئەگەری ئەمەی کە ئاو لەسەر بەربەستەکانی نیوئۆرلیێنزەوە بڕژێت. بەڵام کەس پێشبینی ئەوەی نەکرد کە بەربەستەکان بشکێن- کێشەیەکی جیاواز و توندتر کە لە هەمووی گرنگتر بوو.

ماکس مەیفیلد وتی " ئەو سەرەداوە و پێشبینییەکەی کە ئێستا هەیە، ئەوەیە کە لافاوێکی بچوك لە ناو خودی نیوئۆرلیێنزدا هەڵدەستێت. بەڵام ئێمە هەمیشە وتوومانە کە مۆدێلی زیادبوونی زریانەکە تەنیا لە چوارچێوەی ٢٠٪دا ئەگەری تەواوی هەیە".

چەند خولەکێك دواتر، من چوومە بەردەوام کامێراکان. وتم "زریانی کاترینا ئێستا لە نمرەبەندیی پێنجدایە. ئێمە ناتوانین بایی پێویست پێوانەی ئەو مەترسییە بکەین کە زریانەکە لە ناوچەکانی کەناری کەنداودا دەیخاتەوە. داوا لە هەموو هاوڵاتیان دەکەم کە

سەلامەتییان و سەلامەتیی خێزانەکانیان لە سەری سەرەوە دابنێن لە ڕێگەی ڕۆیشتن بۆ ناوچە بێ مەترسییەکان. تکایە بە وریاییەوە گوێ لەو ڕێنماییانە بگرن کە کاربەدەستانی لۆکاڵ و ویلایەت دەیخەنەڕوو".

***

لە سەعات ٦:١٠ بەیانیی ٢٩ی ئۆگەست، زریانی کاترینا لە لویزیانای دا. چەقی زریانەکە بە دێهاتی (پلاکمینس)ی پنتی ئەوپەڕی باشووری خۆرهەلاتی ویلایەتەکەدا ڕەت بوو و هەڵیکردە باکوور و بە سنووری لویزیانا-میسیسیپیدا بە دووریی چل مایلی خۆرهەلاتی نیوئۆرلیەنز تێپەڕی. برایان ویلیامزی ئێن.بی.سی نیوز وتی "لە ڕاستیدا خراپترین کەش و هەوا لەم سیستەمەدا بە لای سەنتەری شاری نیوئۆرلیەنزدا ڕەت دەبێت و دەچێتە خۆرهەلاتمان". ئەو وتی "نیوئۆرلیەنز باشترینی خراپترین کەیسی سیناریۆکان ئەزموون دەکات". ژمارەیەک لە ڕۆژنامەنووسەکانی گۆرەپانەکە دەیانوت شارەکە "خۆی لە فیشەکێک لاداوە".

حاکم بلانکۆ جەختی لەوە کردەوە کە، لەکاتێکدا کە کەمێک ئاو بەسەر بەربەستەکاندا ڕژاوە، هیچ شکانێک تۆمار نەکراوە. من و ستافەکەم بەو خەیاڵەی بەربەستەکان خۆیان گرتووە، چووینە ناو جێگە.

لە میسیسیپی، نادڵنیایی لەبارەی زیانەکەوە لەئارادا نەبوو. هەشتا مایلی هێڵی کەناری ڕامالرابوو. ناو شاری (گەلفپۆرت) کەوتبووە ژێر دە پێ ئاو. گازینۆکان، بەلەمەکان و پردەکان وێران ببوون. (یوئێس-٩٠)، شاڕێییەکی گەورە کە لەمبەر بۆ ئەوبەری باشووری میسیسیپی بوو، داخرابوو. لە شاری (وەیڤلاند)، ٩٥٪ی بونیاد و بیناکان بە توندی زیانیان بەرکەوتبوو یان وێران ببوون.

***

لە سەر لە بەیانیی سێشەممەدا، ڕۆژی دووەمی کاترینا، من بۆم دەرکەوت کە یەکەم ڕاپۆرتەکان بەهەڵەداچوون. بەربەستەکانی نیوئۆرلینز شکابوون. ئاوی دەریاچەی (پۆرتچاترەین) دەڕژایە ناو شارەکەوە و دەفرەکەی پڕ دەکردەوە. بەپێی مەزندەکان

٨٠٪ بۆ ٩٠٪ی دانیشتووان چۆڵیان کردبوو، بەڵام دەیان هەزار کەس ئەمەیان نەکردبوو، لەوانەش زۆرێك لە خەڵکانی هەژار و لاوازی رووبەرە نزمەکان.

لەکاتێکدا کە گرنگ بوو پێداویستیی بوژاندنەوە بێنیتە ناو شارەوە، دەبووایە یەکەم ئەولەویەتمان رزگارکردنی گیانەکان بێت. کۆپتەرەکانی گاردی کەنار رێبەرایەتیی هەوڵەکەیان کرد. لەکاتێکدا کە فڕۆکەوانەکان خۆیان لە هێڵەکانی کارەبا و درەختەکان لا دەدا، رزگارکەرەکان بە پەتە جولاوەکاندا دەهاتنە خوار بۆ هەلگرتنەوەی دانیشتووان لەسەر سەربانەکانەوە. کاتێك گوێبیستی ئەو رەخنانە بووم کە دەڵێن کاردانەوەی فیدراڵ لە بەرانبەر کاترینادا خاو بووە، بیرم لەو گاردانەی کەنار کردەوە کە یەکێك لە ئۆپەراسیۆنە هەرە خێرا و کاریگەرییەکانی رزگارکردنیان لە مێژوودا ئەنجامدا.

من لە سان دییگۆ، ئەو شوێنەی کە تیایدا یادی شەستەمین ساڵوەگەڕی سەرکەوتنی ئەمریکام لە مەکۆی ئۆقیانووسی (هێمن)ی دووەم جەنگی جیهانی کردەوە، وتم "ئەم بەیانییە دڵ و نزاکانمان لەگەڵ هاوڵاتیانی ناوچەی کەناری کەنداوە کە ئازارێکی زۆریان بەدەست زریانی کاتریناوە چەشتووە...خەڵکانی باش لە لویزیانا و میسیسیپی و ئالاباما و ناوچە بەرکەوتووەکانی تر پێویستیان بە یارمەتی و بەزەیی و نزای هاوڵاتیانمان دەبێت".

پاش وتارەکە، بڕیارم دا بگەڕێمەوە بۆ کراوفۆرد، سەر لە بەیانی چوارشەممە بارگەکەم لێك نێم و بگەڕێمەوە بۆ واشنتن. جۆ هاگن پەیوەندی کردبوو بە حاکم بلانکۆ و حاکم باربەر بۆ قسەکردن لەسەر ئەگەری سەردان. هەردووکیان پێیان وابوو زۆر زووە. گەیشتنی سەرۆك پێویستی بە ژمارەیەك کاربەدەستی سەپاندنی یاسا بوو بۆ دابینکردنی ئاسایش لە فڕۆکەخانە، ئامبولانسێك و کارمەندانی تەندروستی یەدەك و چەندەها سەرچاوەی تر. حاکمیش نەیدەویست کە سەرچاوەکانی رزگارکردن بکشێنێتەوە بۆ گەیشتنی من. منیش هاوڕا بووم.

لەسەر فڕۆکەی هێزی ئاسمانیی یەك، پێیان وتم کە رێگای گەشتە ئاسمانییەکەمان بەسەر هەندێ ناوچەماندا دەبات کە کاترینا لێی داوە. ئێمە دەمتوانی بە نزمی بەسەر کەناری کەنداودا بفڕین بۆئەوەی دیمەنێکی نزیکتر بەدی بکەم. ئەگەر لە ناوچە کارەسات

لێدراوەکە نەنیشتمەوە، وا بۆی چووم کە باشترین شتێکی تر ئەوەیە دۆخی کاولاشەکە لە سەرەوەڕا ببینم. ئەوەی کە بینیم، هەناسەی بڕیم. نیئۆرلیەنز تەقریبەن بە تەواوی کەوتبووە ژێر ئاوەوە. لە هەندێ شوێندا، تاکە شتێ کە ئەمبینی، سەربانی خانووە ژێر ئاوکەوتووەکان بوو.

گومەزە گەورەکان کەوتبوون. ئەو پردەی کە نیئۆرلێنزی بە (سلیدێل) دەگەیاند بۆ ناو دەریاچەی (پۆنتچارترەین) هەرەسی هێنابوو. ئۆتۆمبێلەکان بەسەر ئەو رووبارانەدا گلۆر ببوونەوە کە پێشتر جادە بوون. دیمەنەکە دەتگوت هی ناو فیلمێکی ترسناکە.

وێرانەکەی ناو میسیسیپی تەنانەت خراپتر بوو. بە درێژایی چەندەها مایلی وشکانی، هەر بونیادێکی وەستاو بچوک ببووەوە بۆ پارچە تەختەیەک. درەختە سنەوبەرەکان بە درێژایی کەنار وەکو دەنکە شقارتە راکشابوون. ئەو گازینۆ گەورانەی کە لەسەر بەلەمەکان بونیادنرابوون لەناو کەنداوەکەدا، وێران ببوون و بە چەند پارچەیەک گەیشتبوونە وشکانی. پردەکەی سەر (بەی سەینت لویس) نەمابوو. لەبەرخۆمەوە وتم لەوانەیە تەقینەوەی بۆمبی ناوکی ئاوها بێت.

بە روانین لە دەرەوەی پەنجەرەکە، تاک شتێک کە بیرم لێ دەکردەوە ئەوە بوو کە دەبێ خەڵکی سەر ئەرزەکە بەرگەی چی بگرن. چی بە مێشکتدا گوزەر دەکات کە تەواوی کۆمەڵگاکەت وێران بووە؟ ئایا مێشکت دەکەیە عەمباری هەموو ئەو شتانەی لەدوای خۆت جێت هێشتووە؟ من زیاتر نیگەرانی ئەو خەڵکە بووم کە بێ ماڵ و حاڵ بوون. من وێنای ئەو نائومێدییەم کرد کە ئەوان هەستیان پێ دەکرد کاتێک لە سەربانەکانیان دەهاتن و دەچوون بۆ خۆ دوورگرتن لەو ئاوەی بەرز دەبووەوە. من نزایەکی بێ دەنگم بۆ سەلامەتییان خوێند.

لە ساتێک لە ساتەکاندا، تیمی راگەیاندنمان چەند وێنەیەکی ناو کابینەکەی گرتبوو. من ئەو کاتە بە ئەستەم تێبینیم کردبوون، نەمدەتوانی سەرنجم لەسەر وێرانەکەی خوارەوە لا بیەم. بەڵام کاتێک وێنەکان دەرچوون، بۆم دەرکەوت کە هەڵەیەکی گەورەم ئەنجام دابوو. وێنەی من لە حاڵەتی شۆڕبوونەوە بەسەر وێرانەکەدا ئاماژەی بەوە دەدا کە من دابڕاوم لە ئازاری سەر ئەرزەکە. ئەوە هەستی من نەبوو. بەڵام هەر کە پەیبردنەکە

لای خەڵک دروستبوو، نەمتوانی بیگۆڕم. بۆ ئەو هەموو هەوڵانەی کە دامن بۆ خۆلادان لەو کێشەیەی پەیبردن کە باوکم لە ماوەی زریانی (ئەندرو)دا ڕووبەڕووی ببووەوە، دواجار منیش دووبارەم کردەوە.

من زۆر جار لەوە ڕاماوم کە دەبووایە ئەو ڕۆژە چ شتێکی جیاوازم بکردایە. بڕوام وایە کە نەنیشتنەوە لە نیوئۆرلینز ڕاست بوو. وەڵامدەرەوانی ئیمێرجێنسی لە هەوڵەکانی ڕزگارکردن دوور دەخرانەوە و ئەمەش هەڵە دەبوو. بڕارەیەکی باشتر ئەوە بوو کە لە فڕۆکەخانەی (باتن ڕۆگ)ی پایتەختی ویلایەتەکە، بوەستم. لە دووریی هەشتا مایلی باکووری ناوچە لافاولێدراوەکە، دەمتووانی لەگەڵ حاکم ستراتیژییەک دابنێم و قوربانییانی کاترینا دڵنیا بکەمەوە کە وڵاتەکەیان لەگەڵیاندایە.

نیشتنەوە لە (باتن ڕۆگ) هیچ گیانێکی ڕزگار نەدەکرد. سوودەکەی تەنیا بریتی دەبوو لە پەیوەندیی گشتیی باشتر. بەڵام کاتێك تۆ سەرۆکیت، پەیوەندییە گشتییەکان گرنگن، بەتایبەت کاتێک خەڵکی ئازار دەچێژن. کاتێک زریانی (بێتسی) لە ساڵی ١٩٦٥دا (نیوئۆرلیەنز)ی ویران کرد، لیندن جۆنسن لە واشنتنەوە کەوتەڕێ بۆ سەردانێکی درەنگوەختی شەو. ئەو بە لایتێک بەرەو پەناگەیەک کەوتبووە ڕێ. ئەو کاتێک گەیشتبووە پانتاییەکی قەرەباڵغ و تاریک وتبووی "ئەوە سەرۆکتانە! من لێرەم تا یارمەتیدان بدەم!" بەداخەوە من دوای نموونەکەی ئەو نەکەوتم.

***

کاتێک پاش نیوەڕۆی چوارشەممە لە کۆشکی سپی نیشتمەوە، کۆبوونەوەیەکی بەپەلەم لە ژووری (کابینە) سازدا بۆ قسەکردن لەسەر کاردانەوەکە. بە تیمەکەم وت "هەر ئاژانسێك پێویستی بەوەیە کە بەرەو پێش هەنگاو بنێت. بڕواننە سەرچاوەکانتان و ڕێگایەک بەرەو زیاتر بدۆزنەوە".

لە باخچەی (ڕۆز) بەیانێکم پێشکەش کرد بۆ خستنەڕووی کاردانەوەی فیدراڵ. وەزارەتی گواستنەوە شاحینەی ناردبوون بۆ گەیاندنی پێداویستییەکان. دەزگاکانی مرۆیی و تەندروستی، تیمی پزیشکی و یەکەکانی تەرم هەڵگرتنەوەیان دابین کردبوو. وەزارەتی وزە یەدەکی پەترۆلی ستراتیژیی کردبووەوە بۆ پارێزگاری لە بەرانبەر

بەرزبوونەوەیەکی گەورە لە نرخەکانی گازدا. وەزارەتی بەرگری، کەشتی (یوئێس ئێس باتان)ی بۆ خستنەگەڕی گەڕان و رزگارکردن و (یوئێس ئێن ئێس کۆمفرت)، کە کەشتییەکی نەخۆشخانەیە، بۆ دابینکردنی چاودێریی پزیشکی رەوانە کردبوو. ئاژانسی بەڕێوەبردنی ئیمێرجێنسی فیدراڵ پێداویستیی بۆ ناوچە کارەسات لێدراوەکە ناردبوو و پەناگەی بۆ خەڵکانی راکردوو دروست کردبوو. ئێمە دواتر زانیمان کە کێشەی گەورەی رێکخستن و سۆراخکردن هەبووە کە بووەتەهۆی ئەوەی زۆرێك لە گەیاندنەکان دوا بکەوێ یان هەرگیز تەواو نەبێ.

رێوشوێنە لۆجستییەکان پێویست بوون، بەڵام بەس نەبوون بە بەراورد بەو وێنانەی نائومێدی کە ئەمریکییەکان لەسەر شاشەکانی تەلەفزیۆن بینیبوویان. قوربانی هەبوون کە دەپاڕانەوە بۆ ئاو، خێزان هەبوون کە لەسەر بەرزەپردەکان ئاوارە ببوون و خەڵکانێك لەسەر سەربانەکان گیرسابوونەوە و تابلۆیان بەرز کردبووەوە کە لێی نوسرابوو "یارمەتیم بدەن!" زیاتر لە هەر کەسێك کە گفتوگۆی لەگەڵ دەکرا هەمان شتی دەوت: "ناتوانم بڕوا بکەم کە ئەمە لە ئەمریکا روو دەدات".

لە سەرووی زریان و لافاوەوە، ئێمە ئێستا رووبەڕووی کارەساتی سێیەم دەبووینەوە: پشێوی و توندوتیژی لە نیوئۆرلیەنز. تاڵانچییان پەنجەرەیان دەشکاند بۆ دزینی چەك، جل و بەرگ و خشڵ. بەهۆی تەقەوە کۆپتەرەکان نەیاندەتوانی بنیشنەوە. بینایەکانی ناو شار گڕیان لێ بەرز دەبووەوە.

هێزی پۆلیس بێ دەسەڵات بوو لە گەڕاندنەوەی سیستەم. لەکاتێکدا کە زۆرێك لە ئەفسەرانی ئەرکی خۆیان بە شەرەفەوە بەجێ هێنا، هەندێکیان وازیان لە پۆستەکانی خۆیان هێنابوو بۆ دەست و پەنجە نەرم کردن لەگەڵ ئیمێرجێنسییەکانی خۆیاندا. ئەوانیتر چوونەپاڵ تاوانکارەکان. من زۆر پەست بووم بە بینینی دیمەنی تەلەفزیۆنیی ئەو ئەفسەرانەی پۆلیس کە بە تەلەفزیۆنێکی شاشە گەورەوە لە باوەشیاندا، لە فرۆشگاکان دەهاتنە دەرەوە. هەستم کرد پێچەوانەیەکی ئەوە دەبینم کە پێش چوار ساڵ لە مانهاتن بوویدا. لەبری خۆ کردنە ناو باڵەخانەکان بۆ رزگارکردنی ژیانەکان، هەندێ لە یەکەم وەڵامدەرەوەکان لە نیوئۆلیەنز فرۆشگاکانیان دەشکاند بۆ دزینی مەوادی ئەلکترۆنی.

دیمەنە تۆقێنەرەکە لەلای بینایەی (سوپەردۆم) زیاتر دەبوو کە تیایدا دەیان هەزار کەس خەڵکی کۆ ببوونەوە بۆ خۆ پەنادان. پاش سێ رۆژ، سەربانەکەی کەوتە تک کردن، سیستەمی هەوا ئەیرکۆندشن وەستابوو و ئامێرەکانی خاوێنراگرتن شکابوون. میدیا چەند راپۆرتێکی بڵاو کردەوە لەمەڕ رەفتاری ئازارگەرایانەی وەکو لاقەکردن و کوشتن. لەنێوان پشێوی و اتصالاتی لاوازدا، حکومەت هەرگیز بەدڵنیاییەوە نەیدەزانی چی روودەدات. چەند رۆژێکی خایاند تا بزانین هەزاران کەسی تر بەبێ خواردن یان ئاو لە سەنتەری کۆنفرانسی نیوئۆرلیەنزدا کۆبوونەتەوە. لەکاتێکدا کە پۆلیس نەیدەتوانی بێ یاسایی بوەستێنێت، تاکە چارەسەر بریتی بوو لە ئامادەیی سەربازیی بەهێزتر. لە دوانیوەڕۆی چوارشەممەدا، نیوئۆرلیەنز چوار هەزار هێزی گاردی نیشتمانی هەبوو بە هەبوونی پاڵپشتیشەوە لە رێگەدا. بەڵام پێدەچوو گاردەکە لەژێر فەرماندەیی حاکمدا دەستەوسان بێت. یەکێك لە بژارەکان بریتی بوو لە دابەزاندنی سەربازی ئەرك چالاك و دانانی ئەوان و هێزەکانی گارد لە لویزیانا لەژێر فەرماندەییەکی یەکگرتووی حکومەتی فیدراڵدا. هێزەکانی لقی هەوایی ٨٢ چاوەڕوانی فرمان بوون بۆ دابەزین و منیش ئامادە بووم بۆئەوەی پێیان بدەم. بەڵام کێشەیەکمان هەبوو. یاسای (پۆس کۆمیتاتەس)ی ١٨٧٨ ریگر بوو لەوەی سوپای ئەرك چالاك لەناو ئەمریکادا مامەڵە لەگەڵ یاساسەپاندن دا بکات. دۆن رەمسفێڵد، بە قسەکردن بۆ زۆرێك لەوانەی ناو سوپا، دژی ناردنی ٨٢ی هەوایی بووەوە.

تەنیا یەك دۆخی ئاوارتن هەبوو لە یاسای (پۆس کۆمیتاتەس). ئەگەر من رابمگەیندایە کە نیوئۆرلیەنز لە حاڵەتی یاخیگەریدایە، ئەوا دەمتووانی سەربازانی فیدراڵ بە دەسەڵاتی تەواوی یاسا سەپاندنەوە رەوانە بکەم. دوایین جار کە یاسای یاخیگەری بەکارهێنرابوو ساڵی ١٩٩٢بوو، کاتێك باوکم سوپای ناردبوو بۆ سەرکوتکردنی ئاژاوەگێڕانی لۆس ئەنجلس. لەو حاڵەتەدا، حاکم (پیت ولسن)ی کالیفۆرنیا داوای خستنەکاری هێزی فیدراڵی کردبوو. دەتوانرێ یاسای یاخیگەری بەسەر دژایەتییەکانی حاکمیشدا تێپەڕێنرێت. لە نموونەیەکی هەرە ناسراودا، سەرۆك دوێت ئایزنهاوەر بەرەنگاریی حاکم (ئۆرڤال فۆبەس)ی کردبوو لە رێگەی دابەزاندنی لقی هەوایی ١٠١ بۆ

سەپاندنی بڕیاری دادگای باڵا لەدژی جیاکردنەوەی قوتابیانی قوتابخانەی ئامادەیی سێنترال لە (لیتڵ ڕۆک) ی ئەرکەنساس.

لە بەرەبەیانی پێنجشەممەدا، واتە چوارەم ڕۆژ، بە ڕەسمی ئاسۆی فیدرالیزەکردنی کاردانەوەکەی لەگەڵ حاکم بلانکۆ و تیمەکەی خستەبەر باس. حاکم نەیدەویست واز لە دەسەڵاتەکەی بهێنێت و سپاردەی حکومەتی فیدراڵی بکات. ئەمەش منی خستە دۆخێکی سەختەوە. ئەگەر یاسای یاخیگەرێتیم لەدژی هیواکانی بخستایە کار، جیهان تێبینی سەرۆکێکی کۆماری دەکرد کە بە ڕاگەیاندنی یاخیگەرێتی لە شارێک کە بەشێوەیەکی سەرەکی ئەفریقی ئەمریکییە، لەدژی حاکمێکی دیموکراتی مێینە رادەپەڕێت. ئەمە لە هەر شوێنێک بێ، مقۆمقۆی دەنایەوە. بە ئەنجامدانی ئەمە لە (ویلایەتەکانی باشوور) کە تیایدا چەند سەدەیەك لە کێشمەکێشی مافەکانی ویلایەتەکان لەئارادا بووە، لەوانە بوو دۆزەخ بەرپا ببێت. دەبووایە حاکم رازی بکەم تا بیرکردنەوەکەی بگۆڕێت. من بڕیارمدا ڕۆژی دواتر هەوڵەکە بدەم.

من ئەوەندەی هەر ساتێکی سەرۆکایەتییەکەم بێزار بووم. هەموو غەریزەکانم پێیان دەوتم کە دەبێ سەربازەکانی فیدراڵ بنێرم بۆ نیوئۆرلیەنز بۆ وەستاندنی توندوتیژی و خێراکردنی بوژانەوە. بەڵام من لەگەڵ حاکمێکی لاسار، پێنتاگۆنێکی نابەدڵ و یاسایەکی بەسەرچوو گیرم خواردبوو. دەمویست بەسەر هەموویاندا باز بدەم. بەڵام لەو کاتەدا، نیگەرانی ئەوە بووم کە دەرەنجامەکە قەیرانێکی دەستووری و بە ئەگەرێکیش یاخیگەرییەکەی سیاسی بێت.

***

لە بەرەبەیانی هەینیدا، پێنجەم ڕۆژ، کۆبوونەوەیەکی سەعات حەوتم لە ژووری بارودۆخ لەگەڵ تیمی سەرانسەریی کاردانەوەی کاترینا ئەنجام دا. وتم "دەزانم ئێوە هەمووتان لەبەری خۆتان ماندوو دەکەن". "بەڵام نایبڕێت. دەبێ ئەوەندەی بکرێ زوو سیستەم لە نیوئۆرلیەنز بەرقەرار بکەین. لەکۆنتڕۆڵ دەرچوونی ئەو بارودۆخە مایەی قبوڵ نییە".

کاتێك من و مایك شێرتۆف بەرەو مارین یەك چووین بۆ گەشتەکەی کەناری کەنداو، من هەمان پەیامم گەیاندە راگەیاندنەکان. وتم "ئەنجامەکان قبوڵکراو نین. من هەر ئێستا بەرەو ئەوێ دێم".

ئێمە هێزی ئاسمانی یەکمان بەرەو (مۆبایل)ی ئالاباما خستە جوڵە کە لەوێ چاوم کەوت بە حاکم بۆب ریلی و هالی هاربەر. هەردووکیان دوو سەرکردەی کاریگەر بوون کە پلانی چۆڵکردنی کاریگەریان پیادە کردبوو، لە نزیکەوە لەگەڵ دەسەڵاتدارانی لۆکاڵ کاریان کردبوو و ئۆپەراسیۆنی بوژاندنەوەیان بەخێرایی خستبووەگەڕ.

پرسیارم لە بۆب و هالی کردبوو ئاخۆ پشتگیریی فیدراڵیان پێویستە. هەردووکیان پێیان وتم بەڵێ. بۆب وتی "مایك براون کارێکی بێ وێنە ئەنجام دەدات". دەمزانی کە مایك لەژێر فشاردایە و من دەمویست مەعنەویاتی بەرز بکەمەوە. کاتێك چەند خولەکێك دواتر قسەم بۆ راگەیاندنەکان کرد، ستایشەکەم دووپات کردەوە.

وتم "براونی. تۆ کارێکی بێ وێنە ئەنجام دەدەی".

هەرگیز وێنای ئەوەم نەکردبوو کە ئەو قسانە دەچنە ناواخنی فەرهەنگی سیاسیی بەدناو. لەکاتێکدا کە سکاڵاکان لەبارەی ئەدای مایك براون زیادیان کرد، بەتایبەت لە نیوئۆرلیەنز، رەخنەگران قسە هاندەرەکانی منیان بۆ لێدانی من بەکارهێنایەوە.

وێستگەیەکی ترمان، (بیلۆکسی)ی میسیسیپی بوو. من پێش دوو رۆژ بەسەر ناوچەکەدا فڕیبووم، بەڵام هیچ شتێك ئامادەی نەکردبووم بۆ ئەو کاولاشەی سەر ئەرزەکە. من بەناو وێرانەیەکدا رۆیشتم. رەگی داری هەڵکەنراو و پاشەوار لە هەموو شوێنێك بڵاو ببووەوە. تەقریبەن هیچ بونیادێك قیت رانەوەستابوو. پیاوێك لەسەر بلۆکێکی کۆنکریت دانیشتبوو کە دوو پارچە بەردی بچوکتر لەبەردەمی بوون. بۆم دەرکەوت کە ئەوە بناغەی خانووەکە بووە و دوو پارچە بەردەکەش پلیکانەی بەردەم ماڵەکەی بوون. لەو نزیکانە ئامێرێکی تێکشکاو هەبوو کە پێدەچوو قاپشۆرەکەی بوو بێت.

من لە تەنیشتییەوە دانیشتم و پرسیارم لێ کرد ئاخۆ مەعنەویاتی چۆنە. چاوەڕێی ئەوەم کرد بڵێت هەر شتێک کە هەیبووە وێران بووە. لەبری ئەوە وتی "من باشم... زیندووم و دایکیشم زیندووە".

من واقم وڕما بەو ڕۆحیەتەی و بەو ڕوانگەیەی. هەمان ڕوانگەم لای زۆرێکی تر بەدیکرد. یەکێک لەو کەسە هەرە کاریگەرانەی کە بینیمن، پارێزگار (ئەی جەی هۆلۆوەی)ی (بیلۆکسی) بوو. "ڕێگاکە بەتەواوی، هۆلۆوەی" دروشمێکی پشتگیریی قارەمانێتیی نیشتمانیی ١٩٦٠ی تیمی تۆپی پێی (ئۆل میس) بوو. لەکاتێکدا کە کاترینا زیاتر لە شەش هەزار ماڵ و بزنسی لە بیلۆکسی وێران کردبوو، تۆزقاڵێک لە بەزەیی بەخۆدا هاتنەوە لە پارێزگاردا بەدی نەدەکرا. ئەو سوور بوو لەسەر بونیادنانەوەی شارەکە بەشێوەیەکی باشتر لە پێشوو. حاکم باربەر ڕۆحی ویلایەتەکەی خستبووە ناو قسەکانەوە کاتێک وتی خەڵکی "قۆڵی لێ هەڵدەماڵن و میسیسیپی بونیاد دەنێنەوە".

دواین وێستگەمان، نیوئۆرلینز بوو کە تیایدا من داوای خۆم لەسەر هێزی ئاسمانی یەکەوە ئاراستەی حاکم بلانکۆ کرد. وێڕای دووبارەکردنەوەی داواکەم، ئەو جەختی کردەوە لەوەی کە نیازی نییە وەڵامێک پێ بدات لەبارەی فیدراڵیزەکردنی کاردانەوەکەوە. گووشار خستنەسەری هیچ سوودێکی نەبوو، حاکم پێداگری دەکرد.

پاش گەشتێکی کۆپتەر بۆ شارە لافاو لێدراوەکە، ئێمە لە بنکەیەکی گاردی کەنار دابەزین لە نزیک بەربەستی شکاو جادەی (حەڤدەهەم). لە لایەکی بەربەستەکەوە، شارۆچکەی (میتێری) هەبوو کە تا ڕادەیەک وشک بوو. لەلایەکەی ترەوە دێهاتی ئۆرلیەنز هەبوو کە بە قووڵایی و ئەوەندەی چاو بڕ بکات کەوتبووە ژێر ئاوەوە. سەیرێکی شکاوییە سێ سەد پێییەکەم کرد، ببووە دەروازەیەک بۆ ڕێژگەیەکی وێرانکەری ئاو. بە پێچەوانەی ١٩٢٧ەوە، هیچ بەربەستێک لە ساڵی ٢٠٠٥دا نەتەقێنرابووەوە. بەڵام کاریگەریی تۆقێنەر لەسەر خەڵکی لە ڕەوگەی لافاوەکەشدا ڕێک هەروا بوو.

کاتێک ئەو ئێوارەیە گەڕامەوە کۆشکی سپی، ئاندی کارد لە ئۆڤاڵ ئۆفیس هاتە لام. ئەو و ڕاوێژکاری کۆشکی سپی، هاریت مایەرز ڕۆژەکە – و شەوی پێشتر – لەگەڵ پارێزەران و پێنتاگۆن لەسەر ڕێگایەک کاریان دەکرد بۆ دابەزاندنی سەربازی فیدراڵی لە

لویزیانا. ئەوان گەیشتبوونە پرۆپۆزەلێکی باش: ژەنەراڵێکی سێ ئەستێرە فەرماندەیی هەموو هێزەکان دەکات لە لویزیانا. لەو مەسەلانەی پەیوەندی هەیە بە هێزەکانی ئەرک چالاک، ئەو لەمن دەگێڕێتەوە. لەو مەسەلانەی پەیوەندی هەیە بە گاردەوە، ئەو راپۆرت دەداتە حاکم بلانکۆ. ئەم بونیادە دوولایەنەیە ئەو شتەی دایە حکومەتی فیدراڵ کە پێویستمان پێ بوو- هەیکەلێکی فەرماندەیی و سەربازی ئەرک چالاک بۆ زامنکردنی شارەکە- لەکاتێکدا کە نیگەرانییەکانی حاکمی رەواندەوە. ئاندی نامەیەکی بۆ فاکس کرد کە بۆ خستنەڕووی پلانەکە پێش نیوەشەو.

بەیانیی دواتر، رۆژی شەشەم، تەلەفۆنێك لەلایەن باتن رۆگەوە بۆ کۆشکی سپی کرا. حاکم رەفزی کردبووەوە.

من پەست ببوومز سێ رۆژم لە هەوڵی ئەوەدا بەسەر بردبوو کە حاکم قایل بکەم. بە فیرۆدانی کات بوو. لە ١٠:٠٠ی بەیانی، چوومە باخچەی (رۆز) بۆ راگەیاندنی دابەزاندنی زیاتر لە حەوت هەزار سەربازی ئەرک چالاک لە نییوئۆرلیەنز- بەبێ دەسەڵاتەکانی سەپاندنی یاسا. من نیگەرانی بارودۆخەکە بووم. ئەگەر ئەوان تووشی شەڕە تەقە بوونایە، ئەوا هەڵەی من دەبوو. بەڵام بڕیارمدا کە ناردنی سەرباز بە دەسەڵاتێکی کەمکراوەوە باشترە لە نەناردنیان. فەرماندەی هێزی ئەرکی هاوبەشی کاترینا، ژەنەراڵێکی شەش پێ و دوو ئینچی جددی بوو کە بە (رەیجن کاجون) ناسرابوو. ژەنەراڵ روس ئۆنەر کە باوباپیرانی لە رەچەڵەکی ئەورووپیی لویزیانا بوون، چەندەها زریانی بینیبوو و خەڵکی کەناری کەنداوی بەباشی دەناسی.

ژەنەراڵ ئۆنەر رێك ئەو شتەی کە بارودۆخەکە پێویستی بوو، هێنایە کایەوە: ژیریی باو، شارەزایەتییە باشەکانی پەیوەندیکردن و توانای بڕیاردان. ئەو بە خێرایی متمانەی کاربەدەستە هەڵبژێردراوەکان، فەرماندەکانی گاردی نیشتمانی و سەرکردەکانی پۆلیسی لۆکالی بەدەستهێنا.کاتێك یەکەیەکی هێزەکانی گارد و پۆلیس بە چەکی دەهرێنراوەوە هەوڵیاندا بچنە ناو سەنتەری کۆنفرانسەکە بۆ گەیاندنی خواردن، ئۆنەر بە سەر کامێرایەکدا کەوت کە هاواری کرد "چەکەکانتان دانێن، نەفرەتی!" ژەنەراڵ بە

دروشمێکی تەواوەوە هاتە پێش بۆ وەسفکردنی بۆچوونەکەی : "لەگەڵ گەمژەدا تێ مەکەوە".

لەکاتێکدا کە ئەمانتووانی کاردانەوەکە بە یاسا فیدراڵیزە بکەین، ژەنەراڵ ئۆنەر بە شێوەیەکی کاریگەر بە ئیرادە بەهێزەکەی و هێزی کەسایەتییەکەی، ئەمەی کرد. پارێزگار ناگین ئەوی بە "کابرا جۆن واینەکە...کە لە کۆپتەرەکە دابەزی و دەستی کرد بە جوێن و خەڵکیش دەستی کرد بە جوڵە". ئەگەر هەر بمزانیایە دەتوانێ ئەوەندە کاریگەر بێ بەبێ پێسپاردنی ئەو دەسەڵاتەی کە پێم وابوو پێویستیەتی، ئەوا پێش چەند رۆژێك مشتومڕە یاساییەکەم دەبڕی و سەربازەکانم بەبێ دەسەڵاتەکانی یاسا سەپاندن دەنارد".

***

دووشەممە، ٥ی سێپتێمبەر، رۆژی هەشتەم، گەشتی دووەمم بۆ کەناری کەنداو ئەنجام دا. ژەنەراڵ ئۆنەر لە (باتن رۆگ) هاتە لام و لەسەر کاردانەوەکە قسەی بۆ کردم. ئۆپەراسیۆنەکانی گەڕان و رزگارکردن تەقریبەن تەواو ببوون. بینایەی (سوپەردەم) و سەنتەری کۆنفرانس چۆڵ کرابوون. ئاو لە شارەکە دەکرایە دەرەوە. لە هەمووی گرنگتر، سەربازەکانمان بەبێ تەقاندنی فیشەکێك سیستەمیان گەڕاندەوە.

من و لۆرا سەردانی سەنتەرێکی چۆڵکراومان کرد کە لەلایەن کەنیسەیەك بەناوی سەنتەری (نزای جیهان) بەڕێوەدەبرا. سەدان کەس، لەوانەش زۆرێك لەوانەی لە بینایەی (سوپەردەم)دا بوون، لەمبەر بۆ ئەوبەری نهۆمی هۆڵی وەرزشی لەسەر بەرە دانیشتبوون. زۆربەیان بێ تاقەت و سەرگەردان بوون. کچێك دەگریا لەکاتێکدا کە هاواری دەکرد "ناتوانم دایکم بدۆزمەوە". (تی.دی جەیکس)ی هاوڕێم، قەشەیەکی خەڵکی دالاس کە بۆ سەردانەکە لەگەڵمان هاتبوو، نزای کرد بۆ ئاسودەیی و چاکبوونیان. تی.دی لەو جۆرە پیاوانەیە کە ئیمانی دەکاتە کردار, ئەو پێی وتم کە چەند ئەندامێکی کەنیسەکەی بەخێرهاتنەوەی لە بیست قوربانیی کاترینا کردووە بۆ ماڵەکانیان.

نموونەی تری هاوخەمی هەبووە بەدرێژایی کەناری کەنداو. لەگەڵ ئەو هەموو لایەنە وێرانکەی دەرەنجامی کاترینا، ئەم بەسەرهاتانە وەکو نموونەی درەوشاوەی کارەکتەری

ئەمریکا دەردەکەون. پاکیزەکەرە(معمد)ەکانی باشوور مۆبەخێکی جولاویان دروستکرد بۆ خۆراکپێدانی دەیان هەزار خەڵکی برسی. ئاگرکوژێنەوانی نیویۆرک ستی بە شاحینەیەک بەناو نیوئۆرلینزدا چوونە خوارەوە کە بەشی ئاگرکوژێنەوە پاش ١١ی سێپتیمبەر پێیدابوون. خۆبەخشانی خاچی سووری ئەمریکی و لەشکی رزگارکردن سەنتەری ٢٤ سەعاتییان کردبووەوە بۆ یارمەتیدانی قوربانییانی کارەساتەکە. هەر ویلایەتێکی ولات، چۆلکەرانی گردتبووە خۆی. شاری هوستن بەتەنیا پێشوازی لە دووسەد و پەنجا هەزار کەس کرد.

چۆلکردنەکە بوو بە گەورەترین کۆچەوی ئەمریکییەکان لە سەروەختی (تەوژمی تۆز و خۆڵ)ی ١٩٣٠یەکان.

بۆ رێبەرایەتیکردنی دارایی کۆکردنەوە لە کەرتی تایبەت بۆ قوربانیانی کاترینا، دوو کەسی پێکەوە چاوەڕواننەکراوم راسپاردبوو: باوکم و بیل کلینتن. کاترینا لە راستیدا ئەدائی ئەوان بوو. پاش ئەو تسونامییە گەورەیەی لە مانگی دیسەمبەری ٢٠٠٤دا لە باشووری خۆرهەلاتی ئاسیای دا، ئەوان لەسەر داوای من خۆیان رێکخستبوو و زیاتر لە یەک ملیارد دۆلاریان بۆ قوربانیان کۆ کردبووەوە.

لەکاتێکدا کە پێکەوە بە جیهاندا سەفەریان کردبوو، سەرۆکەکانی پێشوو- ٤١ و ٤٢، کە من وام پێ دەوتن- پەیوەندییەکیان پەیدا کرد. باوکم نائومێدییەکانی ١٩٩٢ی بیر چووەوە و رکابەرەکەی پێشووی لەئامێز گرت. من ستایشی ئەوە دەکەم کە بیل رێزێکی زۆری لە باوکم دەگرت و پەیتا پەیتا کەیفم پێ دەهات. کاتێک داوام لێکردن تا پاش کاترینا پرۆسەیەکی تری پارە کۆکردنەوە بگرنە ئەستۆ، ئەوان دەستبەجێ رازی بوون. دوایی دایکم بە تەلەفۆن توانجێکی هاویشت و وتی "دەبینم کە باوکت و زڕبراکەت ئاشت کردوونەتەوە".

بەداخەوە، رۆحی بەخشندەیی لای هەموو کەسێک نییە. لە پرۆگرامێکی تەلەفزیۆنیی خێرخوازیدا لە ئێن.بی.سی بۆ کۆکردنەوەی پارە بۆ قوربانیانی کاترینا، (کانی وێست)ی راپەڕ بە بینەرانی تەلەفزیۆنی وت "جۆرج بوش گوێ بە رەشپێستان نادات". دواتر جێس جاکسن سەنتەری کۆنفرانسی نیو ئۆرلینزی بەراورد کرد بە "بنە کەشتییەک لە کۆیلە".

ئەندامێکی گروپی رەشپێستان لە کۆنگرێس بانگەشەی ئەوەی کرد کە ئەگەر قوربانیانی زریانەکە "سپی پێست، ئەمریکییەکانی چینی ناوەند" بوونایە، ئەوا یارمەتی زیاتریان پێ دەگەیشت.

پێنج ساڵ دواتر، بە زەحمەت دەتوانم ئەم وشانە بنووسمەوە بەبێ هەستکردن بە قێزەونی. من هەست بە ئیهانەیەکی گەورە دەکەم بەو قسەیەی گوایە ئێمە وامان کردووە هاوڵاتیانی ئەمریکی ئازار بچێژن تەنیا لەبەرئەوەی رەشپێستن. هەروەکو ئەو کاتە بە راگەیاندنەکانم وت "زریانەکە جیاوازی ناکات، هەروەکو چۆن هەوڵی بوژاندنەوەکەش ئەمە ناکات. کاتێک ئەو کۆپتەرانەی گاردی کەنار، کە زۆرێکیان هەر لەسەرەتاوە لەشوێنەکە بوون، خەڵکیان لەسەر سەربانەکانەوە هەڵدەگرت، رەنگی پێستی کەسیان نەپشکنی".

چەندەی زیاتر بیرم لێکردەوە، ئەوەندە زیاتر تورە دەبووم. من وا پەروەردە بووم کە بروام وابێت نەژادپەرستی یەکێکە لە گەورەترین شتە خراپەکان لەناو کۆمەڵگەدا. من ئەو بوێرییەی باوکم بەلاوە پەسەند بوو کاتێک بەرەنگاریی دژایەتیی نیمچە گردوونیی لە بازنەکانی هەڵبژاردنییەوە کرد لە بەرانبەر دەنگدان بە پرۆژەیاسای (نیشتەجێبوونی کراوە)ی ١٩٦٨. من شانازی بەوەوە دەکەم کە دەنگی زیاتری رەشپێستم لە هەر کۆمارییەکی تر لە مێژووی حاکمی تەکساسدا بەدەستهێنا. من ئەمریکیی ئەفریقیم لە پۆستە هەرە گەورەکانی حکومەتدا دامەزراندبوو، لەوانەش یەکەم راوێژکاری ئاسایشی نیشتمانیی ژنی رەشپێست و یەکەم دوو وەزیری دەرەوەی رەشپێست.

دڵم شکا کاتێک بینیم منداڵانی کەمینە لە سیستەمی قوتابخانەدا جیا دەکرێنەوە، بۆیە من دەستپێشخەریی رێوشوێنی خۆجێییم واژۆ کرد، واتە یاسای (هیچ منداڵێک پشت گوێ ناخرێت) بۆ کۆتایی هێنان بە دەمارگیریی نەرمی چاوەڕوانییە نزمەکان. پرۆگرامێکی ١٥ ملیارد دۆلاریم خستبووەگەڕ بۆ شەڕ لەدژی ئێچ ئای ڤی/ئایدز لە ئەفریقا. وەکو بەشێک لە کاردانەوە بەرانبەر کاترینا، ئیدارەکەم لەگەڵ کۆنگرێسدا کاری کرد بۆ دابینکردنی زیاتر لە ٤٠٠ملیۆن دۆلار بە قەرز بۆ زانکۆ و کۆلێژە رەشپێستە مێژوویەکانی کەناری کەنداو بۆ چاککردنەوەیان و تازەکردنەوەی هەوڵەکانی وەرگرتنی خوێندکار.

من وەکو سەرۆك رەخنەیەکی زۆرم رووبەڕوو بووەوە. من حەز نەکرد گوێم لێ بێت خەڵکی بانگەشەی ئەوە دەکەن کە لەبارەی چەکی کۆمەڵکوژی عیراق درۆم کردووە یان باجەکانم لە بەرژەوەندیی دەوڵەمەندان کەم کردووەتەوە. بەڵام دەنگۆی ئەمەی کە من نەژادپەرستم بەهۆی کاردانەوەی کاترینەوە، زۆر پوچ بوو. من ئەو کاتە بە لۆرام وت کە ئەمە خراپترین چرکەساتی سەرۆکایەتیم بووە. ئەمڕۆش هەمان هەستم هەیە.

***

لە ماوەی دووەمین هەفتەی کاترینادا، مایك شێرتۆف پێشنیاری ئەوەی کرد کە گۆڕانکارییەکی کەسی بکەین. کاربەدەستانی لۆکاڵ و ویلایەت هەر خەریکی سکاڵا بوون لەبارەی خاویی ئاژانسی بەڕێوەبردنی ئیمێرجێنسی فیدراڵ و شێرتۆف پێی وتم ئەو بڕوای بە بەڕێوەبەر مایك براون نەماوە. ئەو هەستی کرد کە بەڕێوەبەری ئاژانسی بەڕێوەبردنی ئیمێرجێنسی فیدراڵ لەژێر گووشاردا بەستوویەتی و بووەتە لاسارێك. من پێشنیارەکەی شێرتۆفم قبوڵ کرد بۆ هێنانەپێشی جێگری ئەدمیراڵ (تاد ئالێن)- سەرۆکی ستافی گاردی کەنار کە بە ڕێبەرایەتیکردنی هەوڵەکانی گەڕان و رزگارکردن کارێکی ناوازەی ئەنجام دابوو- وەکو ئەفسەرێکی فیدراڵی بنچینەیی کە هەماهەنگیی ئۆپەراسیۆنەکانی کەناری کەنداوی دەکرد.

رۆژی یەکشەممەی ئەو هەفتەیە، چواردەهەمین رۆژ، من سەردانی سێیەمم بۆ کەناری کەنداو ئەنجامدا. من بە هەلیکۆپتەر لەسەر کەشتیی (یوئێس ئێس، ئایۆوا جیما) نیشتمەوە کە چووبووە ناو رووباری میسیسیپییەوە. بەری دووساڵ، من ئایۆوا جیما-م خستبووەکار بۆ ئازادکردنی لیبریا لە دیکتاتۆر چارلز تایلەر. دۆخێکی سوریالی بوو لەسەر کەشتییەکی هێرشیبەری سەربازی بوەستیت کە سەرپەرشتی شارێکی ئەمریکی گەورە دەکات کە بەدەست برینەکانی زریانێکی توندەوە دەناڵێنێت.

بەیانیی دواتر، ئێمە سواری شاحینە سەربازییە دە تەنییەکان بوین بۆ گەشتێك بە ناو نیوئۆرلیەنزدا. دەزگای نهێنی نیگەران بوو. لە سەروەختی تیرۆرکردنی کەنەدییەوە لە ١٩٦٣دا، رۆیشتنەکە یەکێك بوو لەو سەروەختە هەرە کەمانەی کە تیایدا سەرۆکێك لەناو ماشێنێکی سەر کراوەدا بە شارێکی قەرەباڵغی گەورەدا بڕوات. دەبووایە ئێمە خۆمان لە

وليەرە كارەباییە هەڵواسراوەكان لابدەین و بەناو حەوزە قووڵەكانی ئاودا رێ بكەین.
تەقریبەن هەموو خانووەكان هێشتا چۆڵ بوون. هەندێ لە دیوارەكانیان، ئەو بەروارەی
كە تیایدا سۆراخ دەكران و ژمارەی لاشەی دۆزراوەی لەناوەوە بە سپرەی لێ نوسرابوو.
من خەڵكێكی كەمم بینی كە لە ناو تەمێكدا دەهاتن و دەچوون. لەو نزیكانە كۆمەڵێك
سەگ هەبوون كە بۆ خواردن دەوەڕین، كە زۆرێكیان شوێنی قەپگرتنیان لەسەر
جەستەیان بوو. ئەمە پیشاندانێكی زیندووی كەشی (مانەوەی گونجاوترین) بوو كە
بەسەر شارەكەدا زاڵ بوو.

لە ١٥ی سێپتێمبەردا، هەژدەمین رۆژ، من گەرامەوە بۆ نیوئۆرلیەنز بۆ
پێشكەشكردنی وتارێكی كاتی زۆرترین بینەر بە گەل. بڕیارمدا وتارەكە لە گۆڕەپانی
(جاكسن)ەوە ئاراستە بكەم كە بەناوی ژەنەراڵ (ئەندرو جاكسن)ەوە كراوە كە لەدژی
بریتانییەكان لە كۆتاییەكانی جەنگی ١٨١٢دا بەرگری لە نیوئۆرلیەنز كردبوو. بینایەی
ناسراوی (فرێنچ كۆرتەر) لە ماوەی زریانەكەدا نیمچە زیانێكی پێگەیشتبوو. من وتارەكەم
وەكو دەرفەتێك بینی بۆ روونكردنەوەی ئەوەی كە لە رێ لایداوە، بەڵێندانی
چارەسەركردنی كێشەكان و دانانی روئیایەك بۆ بەرەوپێشبردنی كەناری كەنداو و
وڵاتەكە. نیوئۆرلیەنزی چۆڵكراو، نامۆترین مەكۆ بوو كە لێیەوە وتارێك پێشكەش بكەم.
جگە لە موەلیدەكان، وزەی كارەبا هێشتا لە شارەكەدا نەبوو. لە یەكێك لە شارە هەرە
چالاكەكانی جیهاندا، تاكە خەڵكێك كە لەو ناوە بوون، كۆمەڵێك كاربەدەستی حكومی و
سەربازی لقی هەوایی ٨٢ بوون.

لەكاتێكدا كە كەنیسەی سەرەكیی سەینت لویس لە پشت منەوە لە رووناكی شیندا
دەدرەوشایەوە، دەستم پێكرد:

"ئێوارەتان باش. من لە شاری نیوئۆرلیێنزەوە قسەتان لەگەڵ دەكەم- كە تەقریبەن
چۆڵە و هێشتا بەشێكی لەژێر ئاوە و چاوەڕێی گەڕانەوەی ژیان و ئومێدە...

ئەمشەو من...ئەم پەیمانە گەلی ئەمریكا دەخەمەروو: لە تەواوی ناوچە زریان
لێدراوەكەدا، ئێمە هەرچییەك پێویست بێ دەیكەین، ئەوەندەی پێویست بكات
دەمێنینەوە، بۆ یارمەتیدانی هاوڵاتیان تا كۆمەڵگاكەیان و ژیانیان بونیاد بنێنەوە. هەموو

ئەوانەش کە ئایندەی (شاری نیوەمانگ) دەخەنەژێر پرسیار پێویستە بزانن کە مەحاڵە بەبێ نیوئۆرلیەنز ئەمریکا وێنا بکەن و ئەم شارە گەورەیە جارێکی تر هەڵدەستێتەوە".

من زنجیرەیەك پابەندیی دیاریکراوم خستەڕوو: زامنکردنی ئەمەی کە قوربانییان کۆمەکی دارایی پێویستیان پێ گەیشتووە، یارمەتیدانی خەڵکی بۆئەوەی لە هۆتێلەکان و پەناگەکان بێنە دەرەوە و بچنە ناو شوێنی نیشتەجێبوونی دوورمەوداوە. دابینکردنی سەرچاوەی فیدراڵی بۆ پاککردنەوەی پاشەوار و بونیادنانەوەی ڕێگاکان، پردەکان و قوتابخانەکان، دابینکردنی هاندەرەکانی باج بۆ گەڕاندنەوەی ئیش و کار و دامەزراندنی کرێکارانی لۆکاڵ و بەهێزکردنی بەربەستەکانی نیوئۆرلیەنز بۆ ئەوەی بەرگەی زریانێکی گەورەی ئایندە بگرێت. هەروەها بەردەوام بووم لە قسەکانم:

" چوار ساڵ پاش ئەزموونی ئاگرکوژاندنەوەی ١١ی سێپتێمبەر، ئەمریکییەکان هەمووو مافێکی ئەوەیان هەیە کە پێشبینی کاردانەوەی کاریگەر بکەن لە سەروەختی ئیمێرجێنسیدا. کاتێك حکومەتی فیدراڵ ناتوانێ وەڵامدەرەوەی ئەرکێکی وەها بێت، من، وەکو سەرۆك، بەرپرسم لە کێشەکە و چارەسەرەکە. بۆیە من فرمانم بە هەر وەزیرێکی کابینەکەکە کرد کە بەشداری لە چاوخشاندنەوەیەکی گشتگیری کاردانەوەی حکومەت بکەن بۆ زریانەکە. ئەم حکومەتە وانەگەلێك لە زریانی کاتریناوە فێر دەبێت".

***

من ئەو بەڵێنانەم بە جددی وەرگرت. لە ماوەی چەند مانگی دواتردا، من لەگەڵ کۆنگرێسدا کارم کرد بۆ زامنکردنی ١٢٦ ملیارد دۆلار بۆ بونیادنانەوەی سندوقەکانی تەمویل، کە تاوەکو ئەو کاتە زۆرترین بوو بۆ هەر کارەساتێکی سروشتی لە مێژووی ئەمریکادا. من بڕیارمدا تا پۆستێکی نوێ بهێنمەکایەوە بۆ زامنکردنی ئەمەی کە کەسێك بەرپرسە لە هەماهەنگیی بونیادنانەوە و زامنکردنی ئەمەی کە پارەکە بە شێوەیەکی ژیرانە خەرج دەکرێ. یەکەم جار تاد ئاڵێن ڕۆڵەکەی گێڕا.

کاتێك من پاڵاوتم بۆئەوەی فەرماندەی کەناری کەنداو بێت، داوام لە (دۆن پاول)، هاوڵاتییەکی تەکساسی و سەرۆکی پێشووی (کۆمسیۆنی بیمەی تەوفیری فیدراڵ)، کرد کە شوێنەکەی بگرێتەوە.

بە سەرۆکی ستاف، ئاندی کارد- و دواتر جۆن بۆلتن-م وت کە چاوەڕوانی ڕاپۆرتی بەرەوپێشچوونی ناوبەناو دەکەم لەبارەی دەستپێشخەرییەکان لە کەناری کەنداو. گەورەکاریەدەستان بەشێوەیەکی ڕۆتینی لە ژووری (ڕوزڤێلت) کۆبوونەوە بۆ لێدوانی چڕوپڕتر لەبارەی پرسی وەکو ئەمەی کە چۆن قوربانیانێکی زۆر چەکەی سوودەکانی کارەساتیان وەرگرتووە، ژمارەی ئەو قوتابخانانەی کەناری کەنداو کە کرانەوە و پێوانەی ئەو پاشەوارەکەی کە پاک کراوەتەوە.

دەمویست خەڵکی کەناری کەنداو پێش هەمووان ببینن کە من پابەندم بە بونیادنانەوە، بۆیە لەنێوان ئۆگەستی ٢٠٠٥ بۆ ئۆگەستی ٢٠٠٨ حەڤدە گەشتم ئەنجام دا. لۆرا تێکڕا بیست و چوار گەشتی ئەنجامدا. ئێمە هەردووکمان کارتێکراو بووین بەو مکوڕی و ڕۆحیەتەی ئەو خەڵکەی دەمانبینین.

لە ئازاری ٢٠٠٦دا، من سەردانی بەربەستی بەندەری پیشەسازیم کرد کە شکابوو و لافاوی پیا هاتبووە ناوەوە. زبڵ و داروپەردوویەکی کەڵەکەبووی زۆرمان بینی کاتێک بەرەو شوێنگەکە ڕۆیشتین، ئەمەش بیرهێنەرەوەیەکی ئەوە بوو کە دەبێ ناوچەکە چەندەی تر وەها گوزەر بکات.

من و پارێزگار ناگین دەستم بە کڵاوە ڕەقەکانمانەوە گرتبوو، بازماندایە سەرەوەی بەربەستەکە و داروپەردو کۆکەرەوەکانمان بینین کە حەفتا پێ لەژێر زەوی کۆڵەکە ڕاگیر دەکەن- بناغەی بتەوی ئامادەکراو بۆ بەرەنگاریی زریانی هاوشێوەی کاترینا. هیچ شتێک لەوە گرنگتر نەبوو کە دانیشتووانی ئاوارەبووی نیوئۆرلیەنز دڵنیا بکەیتەوە لەوەی کە گەڕانەوە بۆ ئەو شارەی کە خۆشیان دەوێت بێ مەترسییە.

لە دووەمینساڵیادی زۆریانەکەدا، من و لۆرا سەردانی قوتابخانەی تایبەتی (دکتۆر مارتین لوتەر کینگ جونیەر بۆ زانست و تەکنۆلۆژیا) کرد. پێش دوو ساڵ، قوتابخانەکە پانزە پێ کەوتبووە ژێر ئاوەوە. بەشێوەیەکی سەرەکی لە سایەی ڕاگری مکوڕی لۆکاڵەکە، دۆریس هیکس، قوتابخانەکە ببووە یەکەم قوتابخانەی ناوچەکە کە بکرێتەوە. وەکو کارمەندێکی پێشووی کتێبخانە، لۆرا دڵتەنگ بوو کە ئەو هەموو کتێبە زیانبەرکەوتووەی زریانەکەی بینی. ئەو دەستی کرد بە هەڵمەتێکی کۆمەک کۆکردنەوەی

تایبەت بۆ یارمەتیدانی قوتابخانەکانی نیوئۆرلیەنز تا بەشەکانیان بونیاد بنێنەوە. بە درێژایی سالانێک، رێبەرایەتییەکەی ئەو بەخشندەیی گەلی ئەمریکا باریدەدەر بوو بۆ ناردنی دەیان هەزار کتێب بۆ قوتابخانەکانی سەرانسەری کەناری کەنداو.

بەسەرهاتی میسیسیپیش بەهەمان شێوە بەرزکەرەوەی مەعنەویات بوو. لە نۆگەسنی ٢٠٠٦دا، من گەڕامەوە بۆ بیلۆکسی کە چوار رۆژی پاش زریانەکە سەردانم کردبوو. کەناراوەکان کە بەری سالێک بە پاشەوار داپۆشرابوون، جوانییە رەونەقدارەکەیان بۆ گەڕابووەوە. حەوت گازینۆ، کە پشتیوانی سەدان کار بوون، کرابوونەوە. گردبوونەوەکانی کەنیسە کە پەرتەوازە ببوون، جارێکی تر دروست ببوونەوە. ژیانی خەلکێکی کەم گۆڕابوو بە بەراورد بە هی (لین پاتێرسن). کاتێک پێش سالێک بینیم، ئەو ئۆتۆمبێلی لە قوڕ و لیتە لە شوێنێک دەهێنایە دەرەوە کە هیچ خانوویەکی لێ نەمابوو. کاتێک گەڕامەوە بۆ بیلۆکسی، گەشتێکی بە من و لۆرا کرد بۆلای مالە تازەکەی کە بە یارمەتی پارەی باجدەران بونیاد نرابووەوە.

لە سەروبەندی کاترینا دا، من پرسیارم لە (فران تاونسند)- داواکارێکی گشتی بەهرەمەندی خەلکی نیویۆرک ستی کە وەکو راوێژکاری ئاسایشی نیشتمانیی من لە کۆشکی سپی ئیشی دەکرد- کرد بۆ توێژینەوەی ئەمەی کە چۆن دەتوانین باشتر کاردانەوەمان هەبێت بۆ زریانەکانی ئاییندە. راپۆرتەکەی جەختی کردەوە لە پرەنسیپی پایەداری ئەمەی کە کاربەدەستانی لۆکاڵ و ویلایەت بە باشترین شێوە تەیار بکرێن بۆ رێبەرایەتیکردنی کاردانەوەیەکی کاریگەری ئێمێرجێنسی. راپۆرتەکەی بەهەمان شێوە پێشنیاری گۆرانکارییەکی کرد لە ئاراستەگیریی حکومەتی فیدرالدا. ئێمە شێوازی نوێمان دارشت بۆ یارمەتیدانی دەسەلاتدارانی لۆکاڵ و ویلایەت تا ئاسانکاریی چۆلکردنی پێش وەخت بکەن، سیستەمی اتصالاتی پالپشتمان هێنایەکایەوە، سەنتەرێکی ئۆپەراسیۆنی نیشتمانیمان دامەزراند بۆ بلاوکردنەوەی راپۆرتی بارودۆخی هاوکات و پرۆسەیەکی سیستەماتیکمان بونیاد نا بۆ خستنەکاری سەرچاوەکانی فیدراڵ- لەوانەش سەربازە ئەرک چالاکەکان- لەو حالەتانەدا کە تیایدا یەکەم وەلامدەرەوانی ویلایەت و لۆکاڵ دەستەوستان ببوون.

سیستەمی کاردانەوەی ئیمێرجێنسی نوێ لە ئۆگەستی ٢٠٠٨دا تاقیکرایەوە، کاتێک زریانی (گوستاف) بە درێژایی کەنداوی مەکسیکۆ بەرەو نیوئۆرلیەنز هەڵیکرد. لە ڕۆژانی نزیک زریانەکەدا، من ڤیدیۆ کۆنفرانسی ناوبەناوم لەگەڵ کاربەدەستانی فیدراڵ، ویلایەت و لۆکاڵ ئەنجام دەدا. مایک شێرتۆف و بەڕێوبەری نوێی ئاژانسی بەڕێوەبردنی ئیمێرجێنسیی فیدراڵ، سەرۆکی پێشووی ئاگرکوژاندنەوەی قەزای (مایامی دەید) (دەیڤ پۆلیسن) گواستییەوە بۆ (باتن ڕۆگ) بۆ چاودێریکردنی ئۆپەراسیۆنەکان. پەناگەکان ئامادەکرابوون و بەباشی زەخیرەیان بۆدانرابوو. حاکم بۆبی جیندالی لویزیانا، کۆمارییەکی بەهرەمەند کە لە ٢٠٠٧دا هەڵبژێردرا، لە نزیکەوە لەگەڵ پارێزگار ناگین ئیشی کرد بۆ فرمانپێکردنی چۆڵکردنەکە. پارێزگار وتی "پێویستە ئێوە بترسن و پێویستە هەر ئێستا قونتان لە نیوئۆرلێنز بجولێنن".

کاتێک زریانی گوستاف هەڵیکرد، یەکەم راپۆرتەکان ئەوە بوون کە نیوئۆرلیەنز خۆی لە لێدانێکی راستەوخۆ لاداوە. ئەمە پێشتر بیستبوو: لەگەڵ ئەوەشدا، ئەمجارەیان بەربەستەکان خۆیان گرت و زیانەکان لە نیوئۆرلێنز بچوک بوون. چەند هەفتەیەک دواتر، زریانی (ئیک) خۆی کرد بە (گالڤیستن)ی تەکساسدا. زیانی موڵک و ماڵ بەرفراوان بوو- تەنیا ئەندرو و کاترینا پرزیانتر بوون- بەڵام لە سایەی خۆئامادەکردنێکی باشدا لەسەر ئاستی ویلایەت، خەڵکێکی زۆر رزگاریان بوو. بۆ هەموو ئەو زیانەی کە کاترینا خستیەوە، بەشێک لە کاریگەری درێژخایەنی زریانەکە ئەوەیە کە توانای حکومەتی فیدراڵی باش کرد بۆ پشتگیری لە حکومەتەکانی ویلایەت و لۆکاڵ لە کاردانەوە بەرانبەر کارەساتە گەورەکاندا.

***

تەنانەت کاتێک ناوچەکانی نیوئۆرلێنز چاک کراونەتەوە و خانووەکانی میسیسیپی بونیاد نراونەتەوە، هیچ کەسێک کە بەرگەی کاترینا گرت، بە تەواوی چاک نەبووەتەوە. ئەمە بە تایبەت بۆ ئەو دەیان هەزار کەسە راستە کە ماڵ و حاڵیان لەدەستدا و- لەهەمووی خراپتر- خێزانەکانی ئەو هەزار و هەشتسەد ئەمریکییەکەی کە مردن.

بە شێوازێکی جیاواز، ئەمە بۆ منیش راستە. لە کارەساتێکی نیشتمانیدا، ئاسانترین کەس کە لۆمە بکرێت سەرۆکە. کاترینا دەرفەتێکی سیاسی نواند کە رەخنەگران بۆ سالانێك قۆستیانەوە. دۆخی پاش کاترینا- شانبەشانی هەرەسی ریفۆرمی ئاسایشی کۆمەلایەتی و دەهۆڵی توندوتیژی لە عیراق- پاییزی ٢٠٠٥ی کردە ماوەیەکی زیانبەخش لە سەرۆکایەتییەکەمدا. تەنیا پێش سالێك، من هەڵبژاردنەوەم بە دەنگێکی زیاتری هەر کاندیدێك لە مێژوودا بردبووەوە. بە هاتنی کۆتایی ٢٠٠٥، بەشی زۆری سەرمایەی سیاسیم لەناوچووبوو. بە بینینی بەرزبوونەوەی پلەبەندیی سەرۆکایەتیم، زۆرێك لە دیموکراتەکان- و هەندێ لە کۆمارییەکانیش- گەیشتنە ئەو ئەنجامەی کە باشترە دژایەتیم بکەن نەك ئیشم لەگەڵ بکەن. ئێمە گەلێك شتی گرنگمان ئەنجامدا، لەوانەش مۆڵەتدانەوەی دەستپێشخەریی ئایدز، تەمویلکردنی تەواوی سەربازەکانمان، پەسەندکردنی (سام ئالیتۆ) بۆ دادگای باڵا و کاردانەوە لەبەرانبەر قەیرانی دارایی. بەلام میراتی پاییزی ٢٠٠٥، بۆ پاشماوەی کاتی سەرۆکایەتییەکەم درێژ بووەوە.

ئەمە بەو مانایە نییە کە لەماوەی کاتریندا هەڵەم نەکرد. دەبووایە من وام لە حاکم بلانکۆ و پارێزگار ناگین بکردایە کە زووتر نیوئۆرلیَنز چۆڵ بکەن. دەبووایە من رۆژی دووەم، لە کالیفۆرنیاوە رێك بگەڕابامایەوە بۆ واشنتن یان رۆژی سێیەم لە (باتن رۆگ) لامبدایە. دەبووایە هەوڵێکی زیاتر بدەم بۆ گەیاندنی هاوخەمیم بە قوربانیان و مکوڕیم بۆ یارمەتیدان، بەو شێوەیەی کە لە رۆژانی ١١ی سێپتێمبەر کردم.

گەورەترین هەڵەی زەقم ئەوە بوو کە زۆر چاوەڕێم کرد بۆ دابەزاندنی سەربازی ئەرك چالاك. بەهاتنی رۆژی سێیەم، روون بوو کە سەربازانی فیدراڵ پێویست بۆ گەڕاندنەوەی سیستەم. ئەگەر پێویست بووایە سەرلەنوێ بیکەمەوە، ئەوا دەستبەجێ لقی ٨٢ی هەواییم دەنارد بەبێ دەسەلاتی سەپاندنی یاسا. من ئەو کاتە راڕا بووم چونکە نەمدەویست سەربازەکانمان بەبێ دەسەلاتی وێڵ بکەم بۆ وەستاندنی هێرشەکانی قەناس و کردە تۆقێنەرەکانی تری توندوتیژی کە لە تەلەڤزیۆنەوە گوێبیستیان دەبووین. ئێمە دواتر زانیمان کە ئەم رووداوانە زۆر زیادەڕەوییان تێدا کراوە و دەرەنجامی پەیامنێرە

پاشەرۆژیە زۆر خشارەکان بووە بۆ پڕکردنەوەی هەر چرکەیەکی سوڕی هەواڵەکانی بیست و چوار سەعاتە.

سەرەنجام، چیرۆکی کاترینا ئەوەیە کە، زریانی سەدە بوو. ناوچەیەکی بە قەبارەی بەریتانیای ویران کرد، داروپەردوویەکی بە قەبارەی نۆ قاتی هەر زریانێکی تۆمارکراوی پێشووی خستەوە و خەڵکێکی زیاتری لە هەر زریانێکی حەفتا و پێنج ساڵی رابردوو کوشت. زیانە ئابوورییەکە–سێسەد هەزار ماڵ ویران بوون و زیانی ۹٦ ملیارد دۆلار بە موڵک گەیشت– لە هەر زیانی زریانێکی تری پێشووی تێپەڕاند.

لەگەڵ ئەوەشدا ویرانە و مەرگەکە دوایین پەیام نەبوو بۆ خەڵکی کەناری کەنداو. لە ئۆگەستی ۲۰۰۸دا، من سەردانی (گەڵف پۆرت)ی میسیسیپیم و ماڵی (جاکسن باراکس)م کرد لە نیوئۆرلیەنز، ماڵی ئەو گاردە نیشتمانییەی لویزیانا کە لە ماوەی کاتریندادا لافاو لێیدابوو. مایەی شۆک بوو کە ببینیت لە ماوەی سێ ساڵدا چ گۆڕانێك روویداوە.

لە میسیسیپی، کرێکاران چل و شەش ملیۆن یاردی موکەعەبی پاشەواری زریانەکەیان پاك کردبووەوە، کە دووقاتی ئەو پاشەوارە بوو کە زریانی ئەندرو لە پاش خۆی جێی هێشتبوو. زیاتر لە چل و سێ هەزار کەس ماڵەکەیان بونیاد نابووەوە یان چاك کردبووەوە. هاتوچۆ لەسەر ئەو پردە نوێیانە دەستی پێکردەوە کە کەناری بیلۆکسییان بە کەناری سەینت لویس دەگەیاند. گەشتیاران و کارمەندان گەڕابوونەوە بۆ گازینۆ پڕجۆش و خرۆشەکان و هۆتێلەکانی کەنار دەریا. لە نیشانەیەکی ئیلهامبەخشیشدا، هەر کتێبخانەیەك کە کاترینا لێی دابوو، کرابووەوە. لەکاتێکدا کە زۆر کەس پێشبینی ئەوەیان دەکرد کە نیوئۆرلێنز قەت جارێکی تر نابێتەوە بە شارێکی گەورە، ٨٧٪ی دانیشتووانی پێش کاترینا، گەڕابوونەوە. ئەو پردەی کە نیوئۆرلێنزی بە سلیدیڵ گرێ دەدا، کرابووەوە. ژمارەی ریستۆرانتەکان لە شارەکەدا لە ژمارەی ئەوانەی پێش کاترینا زیاتر بوو. زیاتر لە حەفتا هەزار هاوڵاتی ماڵەکانیان بونیاد نابووەوە یان چاك کردبووەوە. بەربەستەکان و دیوارەکانی لافاو بە دەوری نیوئۆرلێنزدا قایم کرابوون و لەشکری ئەندازیارانی سوپا دەستیانکردبوو بە پرۆژەی گەورە بۆ دابینکردنی

"پارێزگاریی ۱۰۰ ساڵەی لافاو". بینایەی سوپەردەم کە جارێک لە جاران هەزاران قوربانیی کاترینا گرتبووەخۆ، ببووەوە مەنزڵی پرشانازیی تیمی پاڵەوانی بۆڵینگ (نیوئۆرلیەنز سەینتس).

گۆڕانکاریی هەرە ئیلهامبەخش، لە پەروەردەدا بوو. قوتابخانە گشتییەکان کە پێش زریانەکە لە رزیندابوون، وەکو دامەزراوەی مۆدێرن، بە مامۆستا و رێبەری نوێوە کرانەوە کە پابەند بوون بە ریفۆرم و ئەنجامەکانی. ژمارەیەک قوتابخانەی تایبەت لە سەرانسەری شارەکەدا هەڵتۆقین کە بژارەی زیاتر و نەرم و نیانی گەورەتریان دەخستە بەردەم دایکان و باوکان. کەنیسەی ئەبرەشیی گەورەی کاسۆلیکی کە لەلایەن ئوسقوفی گەورە (ئەلفرێد هیوگز) بەرێوەدەبرا، بەردەوام بوو لەسەر نەریتی دێرینەی نایابیی پەروەردە لە رێگەی کردنەوە قوتابخانەکانی بەشێوەیەکی خێرا. ساڵی پاش کاترینا، قوتابیانی نیوئۆرلێنز ئەنجامەکانی تاقیکردنەوەکانیان باش کرد. ئەوان لە ساڵی دواتردا باشتریش بوون و تەنانەت ساڵی دواتری جیاوازییان هەبوو.

کاتێک من لە ژووری (ئیست)ی کۆشکی سپییەوە لە کانوونی دووەکی ۲۰۰۹دا وتاری ماڵئاواییم پێشکەش کرد، یەکێک لەو میوانانەی کە بانگهێشتم کردبوو (دکتۆر تۆنی رێکاسنەر)ی راگری قوتابخانەی تایبەتی (سامویل جەی گرین) بوو لە نیوئۆرلێنز. تۆنی لە تەموزی ۲۰۰۵دا لە قوتابخانەکە دەستیپێکردبوو پاش ئەوەی کەوتبووە دۆخێکی پەروەردەیی زۆر خراپەوە، سەرپەرشتیکردنی کەوتبووەوە دەست ویلایەتەوە. پاشان کاترینا هەڵیکردبوو.

کاتێک لە ساڵی ۲۰۰۷ سەردانم کرد، تۆنی لەبارەی میتۆدە تازەگەرەکانی وانەوتنەوە قسەی بۆ کردم، وەکو هاندانی قوتابیان تا بۆ ماوەی چەند هەفتەیەک سەرنج بخەنەسەر یەک بابەت لە یەک کاتدا. هەروەها باسی ئەنجامەکانی بۆ کردم. سەرباری ئەو ناخۆشیانەی کە رووبەرووی قوتابییەکانی دەبوونەوە، رێژەی سەدیی ئەوانەی کە لە ئاستی قۆناغەکەدا دەیانخوێندە و بیرکارییان شیکار دەکرد، لە سێ قات زیاتر ببوو. تۆنی وتی "ئەم قوتابخانەیە، کە لە رابردوودا بە باشی خزمەتی کۆمەڵگەی نەکردبوو، ئێستا ئێتر بە راستی رووناکییەکی لێوە دەبینرێ".

ئەم رۆحیەتی نوێبوونەوەیە لە قوتابخانەی تایبەتی (سامۆێل جەی گرین) لە سەرانسەری کەناری کەنداو ئامادەیی هەیە. بە رێبەرایەتیی کەسانی وەکو تۆنی، نەوەیەکی نوێ دەتوانێ ژیانێکی باشتر لەوەی کە بۆی ماوەتەوە بونیاد بنێت. میراتی راستەقینەی کاتریناش هی هیوا دەبێت.

# دیاردەی هەستانەوە لە مەرگ

لە ٣٠ی ئەمموزی ٢٠٠٨دا، موحەمەد کالیسیبولا لە ریزی پێشەوە ئێغذی (ئیست) دانیشت. ئەو پیاوێکی ئەفریقی بالابەرز و رێك بوو. خەندەیەکی گەورەی گەشی هەبوو و وا دادەنرا کە مردبێت.

پێش پێنج سال، من و لۆرا لە (ئێنتەب)ی ئۆگەندا محەمەدمان بینیبوو لە کلینیکێك کە لەلایەن رێکخراوی پشتگیری ئایدز (تاسۆ) بەڕێوە دەبرا. رێکخراوەکە کە لە ناو خانوویەکی یەك نهۆی بونیادنراو بە بریکدا بوو، خزمەتی هەزاران نەخۆشی ئایدزی کردبوو. وەکو زۆربەی ئەوانەی کە بەدەست قۆناغە پێشکەوتووەکانی نەخۆشییەکەوە دەنالێنن، موحەمەد بەرەو نەمان دەچوو. کەمی دەخوارد، تووشی تۆبە تای بەردەوام دەبوو. بۆ ماوەی نزیکەی سالێك خرابووە ناو پێخەفێکەوە.

پێم وابوو تاسۆ شوێنێکی نائومێدییەکی گەورەیە. بەلام وا نەبوو. لەسەر تابلۆیەکی دەستنووسی سەر دەرگاکە نوسرابوو "ژینێکی پۆزەتیڤ لەگەل ئایدز". کۆرسێکی مندالان، کە زۆرێکیان ئەو هەتیوانە بوون کە دایك و باوکیان بە ئایدز لەدەستدابوو، سرودگەلێکیان دەوت کە وێنەدەرەوەی ئومێد و ئیمانیان بوو. ئەوان بە پارچەیەکی شیرینی "ئەمریکای جوان" کۆتاییان بە سرودەکە دەهێنا. محەمەد لە پێخەفی نەخۆشخانەکەیەوە پێی وتم "خەونێکم هەیە. رۆژێك لە رۆژان دێمە ئەمریکا".

من بە ئیلهامێك لە کلینیکەکە هاتمە دەرەوە. نەخۆشەکان ئەو بیروباوەڕەیان بتەو کردم کە هەموو ژیانێك شکۆ و بەهای خۆی هەیە، چونکە هەر کەسێك نیشانەیەکی

خودای گەورەی هەڵگرتووە. من ئازاری ئەوانم وەکو تەحەددییەک لە بەرانبەر وشەکانی کتێبی پیرۆزی بینی: "ئەوەی کە زۆری پێ دەدرێ، زۆری لێ داوا دەکرێ".

ئەمریکا زۆری پێدرابوو و مکوڕ بووم لەسەر ئەوەی کە وەڵامی داواکە بدەینەوە. سەرەتاکانی ئەو ساڵە، من دەستپێشخەرییەکی ١٥ ملیارد دۆلاریم واژۆ کردبوو و کۆنگرێسیش پەسەندی کردبوو بۆ شەڕ لەدژی ئایدز لە ئەفریقا. پلانی ئیمێرجێنسی سەرۆکایەتی بۆ هێورکردنەوەی ئایدز (ڕێپفار) پێکهاتبوو لە گەورەترین دەستپێشخەریی پزیشکیی نێودەوڵەتی بۆ شەڕ لەدژی نەخۆشییەکی دیاریکراو. ئومێدەوار بووم کە ئەمە وێنەیەکی پزیشکی دەبێت لە پلانی مارشاڵ. لە کلینیکی تاسۆ وتم "ئەمە پەیمانی وڵاتەکەمە بۆ گەلی ئەفریقا و گەلی ئۆگەندا. ئێوە لەم شەڕەدا تەنیا نین. ئەمریکا بڕیاری داوە هەنگاو بنێت".

سێ مانگ دواتر، محەمەد یەکەم دەرمانی دژەتەنی وەگرتبوو. دەرمانەکە، توانای نوێ کردەوە. دواجار ئەو دەیتووانی لە پێخەف بێتە دەرەوە. ئەو لە کلینیکی تاسۆ ئیشێکی وەرگرت و بایی پێویست پارەی بەدەستهێنا تا پاڵپشتی شەش منداڵەکەی بکات. لە هاوینی ٢٠٠٨دا، ئێمە محەمەدمان بانگهێشت کرد بۆ کۆشکی سپی بۆ بینینی من کە پرۆژەیاسایەك واژۆ دەکەم کە پابەندیی جیهانیی ئێمە نزیکە دووقات دەکرد بۆ شەڕ لەدژی ئایدز. من بە زەحمەت ناسیمەوە. جەستە لاوازەکەی بەهێز ببووەوە. ئەو گەڕابووەوە بۆ ناو ژیان.

ئەو تاکەکەسێك نەبوو. لە ماوەی پێنج ساڵدا، ژمارەی ئەو ئەفریقییانەی کە دەرمانی ئایدزیان وەردەگرت لە پەنجا هەزارەوە بۆ نزیکەی سێ ملیۆن زیادی کردبوو-زیاتر لە دوو ملیۆنیان لەلایەن پلانە سەرۆکایەتییەکە پشتگیریی کرابوون. ئەو خەڵکەی کە وازیان لێهێنرابوو بمرن، گەڕانەوە بۆ ژیانێکی تەندروست و بەرهەمهێن. بە بیرهێنانەوەی چیرۆکی هەستاندنەوەی هاوڕێکەی لەلایەن عیساوە، ئەفریقییەکان دەستەواژەیەکیان هەبوو بۆ وەسفکردنی وەرچەرخانەکە. ئەوان بە دیاردەی هەستانەوە لە مەرگ ناویان دەبرد.

***

لەساڵی ١٩٩٠دا، باوکم داوای ئەوەی لێکردم کە ڕێبەرایەتی وەفدێك بکەم بۆ گامبیا بۆ ئاهەنگ گێڕانی بیست و پێنج ساڵەی ساڵوەگەڕی سەربەخۆیی. گامبیا کە وڵاتێکی خۆرئاوای ئەفریقا بوو و دانیشتووانەکەی نزیکەی نۆسەد هەزار کەس دەبوو، لەناو ئەمریکا زیاتر بە زێدی باوباپیرانی (ئالێکس هالی)ی نووسەری (ڕەگ و ڕیشە) ناسرابوو. من و لۆرا کتێبی براوەی خەڵاتی پولیتزەرمان خوێندبووەوە کە تیایدا هالی بڕبڕەی دەگەڕێنێتەوە بۆ ئەو پیاوە ئەفریقییەی کە لەلایەن بازرگانانی کۆیلەوە لە ١٧٠٠کاندا بردراوە. بەداخەوە، گامبیا پێنەدەچوو لەو کاتەوە زۆر بەرەوپێش چووبێت. من و لۆرا بە ئۆتۆمبێلێکی شۆفلێتی کۆن کە لەلایەن باڵیۆزخانەوە دابین کرابوو، بەناو (بانجول)ی پایتەختدا گەڕاین. ڕێگای سەرەکی داڕێژرابوو. بەشەکەی تریشی خۆڵ بوو. زۆربەی ئەو خەڵکەی کە ئێمە دەمانبینین بە پێ دەهاتن و دەچوون، زۆرجار بە کۆڵەپشتێکی زۆر گەورەشەوە. بەشە گرنگەکەی سەفەرەکەمان، مەراسیمێك بوو بۆ ئاهەنگی سەربەخۆیی گامبیا. ئەمە لە ستادیۆمی نیشتمانی سازدرا کە تیایدا بۆیاخی دیوارەکە لێ دەبووەوە و کۆنکرێتەکە ورد دەبوو. بیرم دێت کە ستادیۆمەکانی قوتابخانەی ئامادەیی لە تەکساس یەکجار زۆر مۆدێرنتر بوون لەو نموونەیەی گامبیا.

هەشت ساڵ دواتر گامبیا لە ئاگاییمدا بوو کاتێك دەستم کرد بە بیرکردنەوە لە خۆکاندید کردن بۆ سەرۆکایەتی. من و کۆندی رایس کاتێکی زۆرمان لە کۆشکی حاکمیدا بە مشتومڕ لەسەر بەرنامە و ڕێوشوێنی دەرەوە بەسەر برد. ڕۆژێکیان وتووێژەکەمان هاتە سەر ئەفریقا. کۆندی هەستێکی بەهێزی لەسەر بابەتەکە هەبوو. ئەو هەستی کرد کە ئەفریقا توانایەکی گەورەی هەیە، بەڵام زۆرجار پشتگوێ خراوە. ئێمە کۆك بووین لەسەر ئەوەی کە ئەفریقا دەبێتە بەشێك لە بەرنامە و ڕێوشوێنی دەرەوەم.

من ئەمریکام بە وڵاتێکی بەخشندە دانا کە بەرپرسیارێتییەکی ئەخلاقی هەیە بۆ بینینی ڕۆڵی خۆی بۆ یارمەتیدانی نەهێشتنی هەژاری و نائومێدی. پرسەکە ئەوە بوو کە چۆن ئەمە بە شێوەیەکی کاریگەر بکرێت. پرۆگرامەکانی کۆمەکی دەرەکیمان لە ئەفریقا ڕێچکە و تۆمارێکی تەمبەڵی هەبوو . زۆربەیان لە ماوەی جەنگی سارد دا دیزاین کرابوو بۆ پشتگیری لە حکومەتە دژە کۆمەنیستەکان. لەکاتێکدا کە کۆمەکەکەمان ڕژێمە

دۆستەکانی لە دەسەڵاتدا هێشتەوە، کارێکی وەهایان نەکرد بۆ باشکردنی ژیانی خەڵکی ئاسایی. لە ساڵی ٢٠٠١دا، ئەفریقا ١٤ ملیارد دۆلاری لە کۆمەکی بیانی وەرگرت، کە زیاتر بوو لە هی هەر کیشوەرێکی تر. لەگەڵ ئەوەشدا گەشەی ئابووریی بۆ هەر تاکەکەسێک نزم بوو، تەنانەت خراپتر بوو لەو دۆخەی کە لە ١٩٧٠کاندا تیایدا بوو. کێشەیەکی تر ئەوە بوو کە مۆدێلی نەریتیی کۆمەکی دەرەکی پاتێرنالیستیک بوو (پێدانی کۆمەک و پارێزگاری بەبێ ئازادی بژاردن و بەرپرسیارێتی): وڵاتێک دەوڵەمەندی کۆمەکبەخش چەکێکی نووسی و بە وەرگرەکەی وت کە چۆن خەرجی بکات. من بڕیارمدا ئاراستەیەکی تر لە ئەفریقا و شوێنی تری جیهانی رووڵەگەشە بگرمە بەر. ئێمە پەیوەندییەکانمان لەسەر بنەمای دۆستایەتی بونیاد دەنا، نەک پاتێرنالیزم. ئێمە متمانەی ئەوەمان بە وڵاتانی رووڵەگەشە هەبوو کە ستراتیژییەکانی خۆیان دیزاین بکەن بۆ بەکارهێنانی پارەی باجدەری ئەمریکی. لە بەرانبەردا، ئەوان ئەدای خۆیان پێوانە دەکرد و بەرپرس دەبوون. ئەنجامەکەش ئەوەیە کە وڵاتان هەستیان کرد وەبەرهێنانیان لە سەرکەوتنی خۆیاندا کردووە، لەکاتێکدا کە باجدەرە ئەمریکییەکان دەیانتووانی کاریگەری بەخشندەییان ببینن.

لەکاتێکدا کە کۆندی لە یەکەم وتوێژماندا روونی کردەوە، یەکەم کێشە لە ئەفریقا لەهەموو ئەوانەیتر دیارتر بوو: قەیرانی مرۆیی ئایدز. ئامارەکان تۆقێنەر بوون. نزیکەی دە ملیۆن کەس لە ئەفریقای باشووری ( سەحرای گەورە)ی ئەفریقادا مردبوون. لە هەندێ وڵاتدا، یەکێك لە هەر چوار پێگەیشتوویەك ڤایرۆسی ئایدزیان هەڵگرتبوو. مەزەندە دەکرا کە تێکڕای ژمارەی تووشبووان بەهاتنی ٢٠١٠ سەرروو سەد ملیۆن بێت. نەتەوە یەکگرتووەکان پێشبینی ئەوەی کردبوو کە ئایدز دەبێتە خراپترین پەتا لە دوای پەتای تاعون کە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بڵاو ببووەوە.

کاتێك سەرۆکایەتیم گرتەدەست، ئەمریکا کەمێك زیاتر لە ٥٠٠ملیۆن دۆلاری ساڵانەی بۆ شەڕی جیهانیی ئایدز خەرج دەکرد. ئەمەش لە هەر وڵاتێکی تر زیاتر بوو. لەگەڵ ئەوەشدا هیچ نەبوو بە بەراورد بە مەودای پەتاکە. پارەکەش بە پەرپوتی بە سەرانسەری

ئەمەش ئاژانسی جیاوازدا بلاو دەبووەوە. بەشی زۆری کارەکەشیان دووبارەبووەوە بوو، ئەمەش نیشانی ئەوە بوو کە ستراتیژییەکی روون لەئارادا نییە.

باجدەرانی ئەمریکی شایستەی – و ویژان داواکاری – پلانێك بوو کە کاریگەرتر بوو لەم هەوڵە پەرتەوازەیە. من بڕیارمدا کە رووبەڕووبوونەوەی پەتای ئایدز لە ئەفریقا بکەمە بڕگەیەکی سەرەکیی بەرنامەی دەرەکیم.

***

لە ئازاری ۲۰۰۱دا، من لەگەڵ سکرتێری نەتەوە یەکگرتووەکان، کۆفی ئەنان کۆ بووەمەوە کە دیپلۆماتێکی قسە نەرمی خەڵکی غانا بوو. من و کۆفی لە هەموو پرسێکدا کۆك نەبووین، بەڵام زەمینەیەکی هاوبەشمان بەدی کرد لە سووربوونمان بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ پەتای ئایدزدا. ئەو پێشنیاری دروستکردنی سندوقێکی جیهانی کرد بۆ شەڕی ئایدز، توبەرکولۆس و مەلاریا بۆ ئامادەکردنی سەرچاوەکان لە سەرانسەری جیهانەوە.

من گوێم گرت بەڵام هیچ پابەند نەبووم. من بوئێن بەلامەوە بیرۆکراتیك، تاقەتپڕوکێن و ناکارا بوو. من نیگەرانی ئەوە بووم کە کۆمەکێکی دارایی پێکهاتوو لە کۆمەکەکانی وڵاتانی جیاواز بە بەرژەوەندیی جیاوازەوە، پارەی باجدەر بەشێوەیەکی ئاراستەکراو و کاریگەر خەرج نەکات.

لەگەڵ ئەوەشدا، وەزیری دەرەوە کۆلن پاول و وەزیری تەندروستی و خزمەتگوزارییە مرۆییەکان (تۆمی تۆمپسن) پێشنیاری ئەوەیان کرد کە من بە پەیمانێکی سەرەتایی ۲۰۰ ملیۆن دۆلار پشتیوانی لە سندوقی جیهانی بکەم. ئەوان پێیان وابوو ئەمە ئاماژەیەکی باش دەنێرێت بۆ ئەوەی کە ئەمریکا یەکەم بەشدارە. سووربوونی ئەوان گومانگەرایی منی کۆنترۆڵ کرد. من پابەندی خۆمان لە ۱۱ی مایسی ۲۰۰۱دا لە باخچەی (رۆز) لەگەڵ کۆفی و سەرۆك (ئۆلوسێگەن ئۆباسانجۆ)ی نەیجریا راگەیاند. سەرۆك ئۆباسانجۆ وتی "من لەبری هەموو تووشبووانی ئایدز لە جیهاندا، سوپاست دەکەم، بەتایبەت لەبری هەموو تووشبووانی ئایدز لە ئەفریقادا". من لە وتارەکەمدا وتم "ئەم بەیانییە، ئێمە سەرەتایەکی باشمان دەست پێکرد". بەڵام نەموت پلانم هەیە کە زیاتریش بکەم.

***

چوار رۆژ پاش ئەوەی ئێمە پابەندییەکەمان بۆ سندوقی جیهانی ڕاگەیاند، تیرۆریستان هێرشیان کردە سەر ئەمریکا. پێش ١١ی سێپتێمبەر، من هێورکردنەوەی نەخۆشی و هەژاریم وەکو ئەرکێکی مرۆیی لەبەرچاو گرتبوو. پاش هێرشەکان، بۆم ڕوون بووەوە کە ئەمە لە ئەرکێکی ویژدان زیاترە. ئاسایشی نیشتمانیمان ڕاستەوخۆ پەیوەست بوو بە ئازاری مرۆییەوە. ئەو کۆمەڵگایانەی کە لە هەژاری و نەخۆشیدا چەقیون، بێ هیوایی تیایاندا گەشە دەکات. بێ هیواییش خەڵکی ساز دەدات بۆ چەکدارکردنیان لەلایەن تیرۆریستان و توندڕەوانەوە. بە ڕووبەڕووبوونەوەی ئێش و ئازار لە شوێنانی وەکو ئەفریقا، ئەمریکا ڕۆحیەتی بەکۆمەڵ و ئاسایشەکەی بەهێز دەکات. بەهاتنی سەرەتاکانی ساڵی ٢٠٠٢، من گەیشتبوومە ئەو ئەنجامەی کە سندوقی جیهانی، کاردانەوەیەکی بەس نەبوو بۆ قەیرانی ئایدز. کاتێک ئەمریکا هاوبەشییەکەی ئێمەی بۆ ٥٠٠ ملیۆن دۆلار زیاد کرد، سندوقەکە لە پارەی کەم بوو و لە هەنگاونانیش خاو بوو. لەهەمان کاتدا، پەتای ئایدز ژمارەیەکی زیاتری ئەفریقییەکانی دەنارده ناو گۆڕەکانیان. زۆرینەیان لەنێوان تەمەنەکانی پانزە و چل و نۆدا بوو کە کلیلی دیمۆگرافی بوو بۆ وڵاتە بەرهەمهێنەرەکان. بە ئاوڕ لێ نەدانەوەی، نەخۆشییەکە مەزەندە دەکرا تا ٢٠٢٠ شەست و هەشت ملیۆن کەس بکوژێت، کە زیاترە لەوەی کە لە دووەم جەنگی جیهان مردبوون. نەمدەتووانی بەرگەی ئەو بیرۆکەیە بگرم کە خەڵکی بێتاوان بمرێت لەکاتێکدا کە کۆمەڵی نێودەوڵەتی تەمبەڵی دەکات. من بڕیارمدا کە کاتی ئەوەیە ئەمریکا دەستپێشخەریی جیهانیی ئایدزی خۆی ڕابگەیەنێت. ئێمە کۆمەکە داراییەکانمان کۆنترۆڵ دەکرد. ئێمە بە خێرایی دەجولاین و سوور بووین لەسەر ئەنجامەکان.

جۆش بۆڵتن، تیمێکی پێکهێنا بۆ ئیشکردن لەسەر ڕاسپاردەکان. لە حوزەیراندا، ئەوان بە پرۆپۆزەڵێکەوە هاتنە لام بۆئەوەی بەشێوەیەکی تایبەت تەرکیز بخەنەسەر لایەنی وێرانکەری قەیرانی ئایدز: کاریگەرییەکەی لەسەر منداڵان و ژنان. لەو کاتەدا، ١٧,٦ ملیۆن ژن و ٢,٧ ملیۆن منداڵ نەخۆشی ئایدزیان هەبوو. هەر چل و پێنج خولەکێک، ساوایەکی تر بە ڤایرۆسەکەوە لەدایک دەبوو.

بەم دواییانە، زاناکان دەرمانی نوێیان دۆزیبووەوە، بەتایبەت دەرمانێک بەناوی (نێڤیراپین) کە دەیتوانی ئاستی گواستنەوە لە دایکەوە بۆ منداڵ بە ڕێژەی ٥٠٪ کەم بکاتەوە. بەڵام بەو فراوانییە لە ئەفریقا یان بەشەکانی تری جیهانی ڕوو لەگەشە بەردەست نەبوو. تیمەکە پێشنیاری ناردنی ٥٠٠ ملیۆن دۆلاری لە ماوەی پێنج ساڵدا کرد بۆ کڕینی دەرمان و مەشقپێکردنی کرێکاراني چاودێریی تەندروستیی لۆکاڵ لە وڵاتانی هەرە زیاتر تووشبووی ئەفریقی و کاریبی.

وتم "هەر ئێستا دەستی پێبکە". پلانەکە بۆ بەشێکی دیاریکراوی قەیرانەکە لە بەشە هەرە پێداویستەکانی جیهان گونجێنرا. پلانەکە کاربەدەستانی لۆکاڵی خستە دۆخی ڕێبەرایەتییەوە. هەروەها ئامانجێکی نامەزۆریانە بەڵام واقیعی هەبوو: چارەسەرکردنی یەک ملیۆن دایک و ڕزگارکردنی سەد و پەنجا هەزار ساوا لە هەر ساڵێکدا، پاش پێنج ساڵ. لە ١٩ی حوزەیرانی ٢٠٠٢دا، من لە باخچەی ڕۆز، دەستپێشخەریی (نێودەوڵەتیی بەرگرتنی ئایدزی منداڵ و دایک)م ڕاگەیاند. لە ماوەی حەفدە مانگدا، ئێمە پابەندیی ئەمریکامان بۆ شەڕی جیهانیی ئایدز دووقات کردبوو.

***

ئەو بەیانییەی کە من پرۆگرامی دایک و منداڵم ئاشکرا کرد، بانگی جۆش بۆڵتنم کرد بۆ ئۆفیسی ئۆڤاڵ. پێم وت "ئەمە دەستپێکێکی باشە، بەڵام بەس نییە. بچۆرەوە لای بۆردی هێڵکاریکردنەکە و گەورەتر بیر بکەرەوە".

چەند مانگێک دواتر، ئەو و تیمەکە پێشنیاری پرۆگرامێکی بەرفراوانیان کرد کە تەرکیزی خستبووە سەر چارەسەر، بەرگرتن و چاودێریی ئایدز- ستراتیژییەک کە سەرەنجام بوو بە پلانی ئیمێرجێنسی سەرۆکایەتی بۆ هێورکردنەوەی ئایدز (ڕێپفار).

بەشی یەکەمی پرۆپۆزەڵەکە، چارەسەر، لە هەموویان شۆڕشگێڕانەتر بوو. لە سەرانسەری ئەفریقا، مەزەندەی ئەوە دەکرا کە چوار ملیۆن نەخۆشی ئایدز پێویستیان بە دەرمانی دژەڤایرۆس بێت بۆ مانەوە لە ژیاندا. کەمتر لە پەنجا هەزار دەرمانەکەیان وەردەگرت، لە سایەی بەرەوپێشچوونەکانی تەکنۆلۆژیای دەرمان، بەرنامەی چارەسەری ئایدز کە پێویستی بە سی حەب لە ڕۆژێکدا بوو، دەتوانرا بە شێوەی کۆکتێلێکی

دەرمانی دوو جار لە ڕۆژێکدا بەکاربهێنرێت، بە زوویی، تەنیا یەک حەب پێویست دەبوو. دەرمانە نوێکە زۆر کاریگەرتر و کەمتر ژەهراوی بوو بۆ نەخۆشەکان. هەروەها نرخەکە لە ١٠،٠٠٠ دۆلار لە ساڵێکدا کەم ببووەوە بۆ ژێر ٣٠٠ دۆلار، بۆ ٢٥ دۆلار لە مانگێکدا، ئەمریکا دەیتوانی ژیانی نەخۆشێکی ئایدز بۆ چەند ساڵانێک درێژ بکاتەوە.

بە تیمەکەم وت "ئێمە پێویستمان بە کەلک وەرگرتنە لە بەرەوپێشچوونەکە. بەڵام ئایا ئێستا دەرمان دەگەیەنینە خەڵکەکە؟"

(تۆنی فۆسی) باسی پرۆگرامێکی کرد لە ئوگەندا کە لەلایەن (دکتۆر پیتەر موگینی) سەرپەرشتی دەکرا، دکتۆرێکی نوێساز کە لە کلینیکێکی پێشکەوتوو ئیشی دەکرد و یەکێک بوو لەو یەکەم کەسانەی کە دەرمانی دژە ڤایرۆسی هێنایە ئەفریقا. لە کۆبوونەوەیەکی ئۆفیسی ئۆڤاڵدا، تۆنی چەند فۆتۆیەکی کرێکارانی تەندروستیی ئوگەندای پیشان دام کە لە (تاسۆ) ئیشیان دەکرد و سواری ماتۆڕەکانیان دەبوون بۆ بردنی دەرمانی دژەڤایرۆس دەرگا بە دەرگا بۆ نەخۆشە کەوتووەکانی ناو ماڵ. لەکاتێکدا کە تەنیا بەشێکی تەواو ببوو، پرۆگرامەکانی تاسۆ و موگینی پیشانیاندا کە دەکرێ چ شتێک بە پشتگیریی زیاترەوە شیاو بێ. سەرباری چارەسەرەکەش، ئوگەندا هەڵمەتێکی توندوتۆڵی بەرگرتنی بەناوی (ئەی‌بی‌سی) خستەگەڕ: خۆ دوورگرتن، وەفادارمە یان کۆندۆم بەکاربێنە. ڕێگاکە سەرکەوتوو بوو. بەپێی مەزەندەکان، ڕێژەی تووشبووانی ئوگەندە لە ١٥٪ی ١٩٩١ەوە دابەزیبوو بۆ ٥٪ی ٢٠٠١.

(ڕێفار) برگەیەکی تریشی دەگرتەخۆی: چاودێریکردنی قوربانییانی ئایدز، بەتایبەت هەتیوان. دڵم شکا بەوەی کە چواردە ملیۆن منداڵ دایکان و باوکانیان بە ئایدز لەدەستدابوو. بەهەمان شێوە نیگەرانی کردم. نەوەیەکی بێ ڕەگ و ڕیشە، نائومێدی خەڵکی گەنج ئەبار دەبوو بۆ قۆستنەوەیان لەلایەن توندڕەوانەوە.

من پێداگریم کرد لەسەر وردەکارییەکانی پلانەکە. پرسیارم کرد "ئامانجەکانتان چییە؟ ئێمە دەتوانین چ شتێک بەدی بێنین؟"

ئێمە سێ ئامانجمان دانان: چارەسەری دوو ملیۆن نەخۆشی ئایدز بکە، ڕێگریە لە تووشبوونی حەوت ملیۆن کەس و چاودێریی دە ملیۆن کەسی تووشبووی ئایدز بکە. ئێمە

هاوکار دەبووین لەگەڵ حکومەت و خەڵکی ئەو وڵاتانەی کەپابەند بوون بە شەڕی ئایدزەوە. سەرکردە لۆکاڵەکان ستراتیژیان گەڵاڵە دەکرد بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئامانجگەلی دیاریکراو و ئێمەش پشتیوانیمان دەکردن.

پرسیاری دواتر ئەوەبوو کە کام وڵاتانە بگرینەوە. بڕیارماندا سەرنج بخەینە سەر هەژارترین و نەخۆشترین وڵاتان؛ دوانزە لە باشووری سەحرای گەورە و دووان لە ناوچەکانی کاریبی. ئەم چواردە وڵاتە یەکسانبوون بە ٥٠٪ی تووشبووانی ئایدز لە جیهاندا. ئەگەر ئێمە بمانتوانیایە بڵاوبوونەوەی نەخۆشییەکە لە ناوەراستەکەیدا بوەستێنین، ئەوا دەمانتوانی مۆدێلێک بهێنینەکایەوە بۆئەوەی وڵاتانی تر و سندوقی جیهانی لەسەری بڕۆن.

بڕیاری کۆتایی ئەوە بوو کە چەند پارە خەرج بکەین. گروپی جۆش پێشنیاری ١٥ ملیارد دۆلاری کردبوو لەماوەی پێنج ساڵدا. تیمی بودجەکەم نیگەرانیان دەبڕی. لە دوادواکانی ٢٠٠٢دا، ئابووری ئەمریکا لە ململانێدا بوو. لەوانەیە گەلی ئەمریکا لەوە تێنەگات کە بۆچی ئێمە ئەو هەموو پارەیەمان لە دەرەوە خەرج دەکەین لەکاتێکدا کە هاوڵاتیانی خۆمان دەیانناڵاند.

من ئامادە بووم کە ئەو نارەزایەتییە لە ئەستۆ بگرم. من بڕوام بەخۆم هەبوو کە دەتوانم روونی بکەمەوە کە چۆن رزگارکردنی گیانەکان لە ئەفریقا خزمەت بە بەرژەوەندییە ستراتیژی و ئەخلاقییەکانمان دەکات. کۆمەڵگە تەندروستترەکان کەمتر ئەگەری ئەوەیان هەیە تیرۆر و جینۆساید بخەنەوە. ئەوان زۆر کامەرانتر و باشترن لەوەی کە کاڵا و خزمەتگوزارییەکانی ئێمە وەربگرن. خەڵکی ناوخۆیی لە ئەنگێزەکانی ئەمریکا، بەخشندەیی و بەزەیی ئێمە بەدی دەکەن. هەروەها بڕوام وابوو کە گەلی ئەمریکا پشتیوانتر دەبێ ئەگەر ئێمە بتوانین پیشانی بدەین کە پارەی باجەکانیان، چەندەها گیان رزگار دەکات.

دواتر رەخنەگران بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە من بۆ ئەوە (رێپفار)م دەستپێکردووە کە مافی ئایینی کپ بکەمەوە یان سەرنجەکان لەسەر عیراق پەرت بکەم. ئەو تۆمەتانە نابەجێن. من بۆ ئەوە دەستپێشخەریی ئایدزم خستەروو تا گیانەکان رزگار بکەم. مایک

گێرسن، سەرۆکی وتارنووسینەکەم و راوێژکاری متمانەپێکراوم، بەباشترین لەمبارەیەوە لە کۆبوونەوەی نۆڤەمبەری ٢٠٠٢دا قسەی کرد. ئەو وتی " ئەگەر ئێمە بتوانین ئەمە بکەین و نەیکەین، ئەوا دەبێتە سەرچاوەی شەرم". من لە دیسەمبەری ٢٠٠٢دا بڕیارەکەم دا بۆ هەنگاونان بە پلانەکەوە. تەنیا چەند کەسێک بە پلانەکەیان دەزانی. من ڕێنمایی تیمەکەم کرد کە بەو شێوەیە بمێننێتەوە. ئەگەر وشەیەک دزەی بکرادیە، ئەو شەڕێکی فورس لەنێوان ئاژانسەکانی حکومەتدا دروست دەبوو بۆ کۆنترۆلکردنی پارەکە. چەند ئەندامێکی کۆنگرێس دەکەوتنە لاوازکردنی تەرکیزی پرۆگرامەکە لەڕێگەی ئاراستەکردنەوەی چەند کۆمەکێك بۆ ئامانجی خۆیان. من نەمدەویست (ڕێپفار) بە گیرخواردن لە بیرۆکراسی و بەرژەوەندییە رکابەرەکان کۆتایی بێت.

من لە وتاری ساڵانەمدا لە ٢٨ کانوونی دووەمی ٢٠٠٣دا وتم "بەدەگمەن مێژوو دەرفەتێکی گەورەتری لەوە پێشکەش کردووە بۆ کردنی شتێکی وەها گەورە بۆ خەڵکێکی وەها زۆر...ئەمشەو من پلانی ئیمێرجێنسی سەرۆکایەتی بۆ هێورکردنەوەی ئایدز (ڕێپفار) پێشنیار دەکەم- کارێکی بەزەیی لە سەروو هەموو هەوڵە نێودەوڵەتییە هەنوکەییەکانەوە بۆ یارمەتیدانی گەلی ئەفریقا". ئەندامانی هەردوو حزبەکە پشتیوانی خۆیان لە پلانەکە خستەڕوو. ئەوەی کە لە تەنیشت لۆراوە وەستابوو، پیاوێک بوو کە پرۆگرام و وڵاتەکەی ببووە ئیلهامێك بۆ (پێپفار)، دکتۆر پیتەر موگینیی خەڵکی ئۆگەندا.

***

نیازم وابوو کە راگەیاندنەکە بکەمە کاریگەرییەکی گەورە و هەرواش بوو. گەورە کاربەدەستی ئایدزی سەرۆک کلینتن بە "ئیلهامبەخش و بە روونی لە ناخەوە" ناودێری کرد. ڕۆژنامەی شیکاگۆ تریبیون کاردانەوەی زۆرێك لە ڕۆژنامەکانی پوخت کردەوە کاتێك لە ستوونەکەیدا نوسیبووی "سەرسوڕهێن وشەیەکی زۆر بەهێز نییە بۆ راگەیاندنەکەی سەرۆك بوش".

هەروەکو چاوەڕوان دەکرا، هەندێ نارەزایەتی هەبوو. گەورەترینیان لە کاردانەوەی بەرانبەر ستراتیژیی بەرگتنی ئەی.بی.سی-دا هات. رەخنەگرانی چەپ برگەی خۆدوورگرتنەکەیان بە ئایدۆلۆژیك لەقەڵەمدا "جەنگ دژی کۆندۆمەکان" کە بەبۆچوونی

ئەوان ناواقیعی و ناکاریگەر بوو. من ئاماژەم بەوە کرد کە خۆبەدوورگرتن هەموو جارێ کاریگەر بووە. هەندێ لە راستڕەوان دژی دابەشکردنی کۆندۆم بوو، کە بە بۆچوونی ئەوان سێکسی ناسنووورداری هان دەدا. لانی کەم ئەندامانی کۆنگرێس ئەوەندە زیرەك بوون کە رەخنە لە (بی) بۆ وەفادار بوون لەناو هاوسەرێتیدا، نەگرن.

بەشێوەیەکی گاڵتەجاڕانە، هەردوو لایەنەکە تۆمەتی ئەوەیان داتاشی کە ئێمە بەهاکانی خۆمان دەسەپێنین- کەمپێکیان دەیگوت فەندەمینتالیزمی ئاینی دەسەپێنیت و ئەویتریان دەیگوت بڵاوکردنەوەی سێکس. هیچ کام لە بەلگاندنەکان مانایان نەبوو بۆ من، چونکە ستراتیژی ئەی.بی.سی لە ئەفریقا گەڵاڵە کرابوو، لە ئەفریقا پیادە کرابوو و لە ئەفریقا سەرکەوتوو ببوو.

لە بەهاری ٢٠٠٢دا، ئەنجومەنی نوێنەران یاسای (پێپفار)ی گرتە بەر. پرۆژەیاسەکە لەلایەن کۆنگرێسمانی کۆماری (هێنری هاید)ی (ئیلینۆی) و کۆنگرێسمانی دیموکراتی (تۆم لانتۆس)ی کالیفۆرنیا سپۆنسەری دەکرا کە دوو پشتیوانی بنەڕەتیی مافەکانی مرۆڤ بوون. لە نموونەیەکی جوانی هاوکاریی دووحزبیدا، ئەوان یارمەتیدەر بوون بۆ ئاراستەکردنی پرۆژەیاساکە بە رێژەی ٣٧٥ بە ٤١ دەنگ بە ئەنجومەندا.

پاشان پرۆژەیاساکە بۆ ئەنجومەنی پیران رۆیشت، کە لەوێ پشتیوانییەکی بەهێزی وەرگرت لە رێبەری زۆرینە (بیل فریست) ، ئەو دکتۆرەی کە گەشتی تەبشیریی پزیشکیی ساڵانەی بۆ ئەفریقا ئەنجام دەدا و سیناتۆر (دیگ لوگار)ی ئیندیانا، سەرۆکی هۆشمەندی لیژنەی پەیوەندییەکانی دەرەوە. بیل و دیك پشتیوانییان لەناو ژمارەیەکی زۆری یاسادانەراندا کۆکردەوە، هەر لە کۆنسێرڤاتیڤی وەکو (جێس هێلمز)ی کارۆلاینای باکوور تا لیبراڵەکانی وەکو (جۆ بایدن)ی (دێلاوێر) و (جۆن کێری)ی ماساشوسێتس. من بە بیلم وت هیوادارم پرۆژەیاساکە واژۆ بکەم بەرلەوەی بۆ لوتکەی (گرووپی هەشت) بڕۆم لە (ئیڤیان)ی فەرەنسا، بۆئەوەی مەودایەکی زۆرترم هەبێ بۆ رازیکردنی هاوپەیمانەکانمان تا بێنە پاڵمان. بیل بەشێوەیەکی بێ وچان کاری کرد بۆئەوەی تا بەو بەرواره رابگات. سێ رۆژ پێش ئەوەی وڵات جێبێڵم، (پێپفار)م بە واژۆیەك کردە یاسا.

***

دوو مانگ دواتر، من و لۆرا لە باشووری سەحرای گەورە نیشتینەوە. یەکەم وێستگەمان سەنیگال بوو. پاش کۆبوونەوەیەکی بەیانی لە کۆشکی سەرۆکایەتی، سەرۆک عەبدوللا واد و ژنەکەی (ڤیڤیان) بەرەو یەکێک لەو شوێنە هەرە جادووییانەی کە وەکو سەرۆک سەردانم کردبوو هاوڕێیەتییان کردین، دوورگەی (گۆری).

گەشتەکەمان بە شوێنێک بە ناوی (خانووی کۆیلان) دەستی پێکرد. لێپرسراوی مۆزەخانەکە بۆ ناو ژووره بچوکە گەرمەکان ڕێنمایی من و لۆرای کرد. یەکێکیان ئەرازووی تێدابوو بۆ کێشانی کۆیلەکان. یەکێکی تریان بەسەر چەند خانەیەکدا دابەش کرابوو بۆ لێکجیاکردنەوەی پیاوان، ژنان و منالان. ئێمە بە ڕێڕەوێکی بەرتەسکدا ڕۆیشتین بەرەو (دەرگای بێ گەڕانەوە) کە خالی دەستپێک بەرەو (ڕێڕەو ناوەڕاست)ی ترسێنەر. من تەنیا دەمتووانی وێنای ئەو ڕۆحە بێ هیوایانە بکەم کە لە خێزانەکانیان دزرابوون و هەڵدرابوونە ناو کەشتییەوە بەرەو سەرزەمینێکی نامۆ. من دەستم لە ملی لۆرا کردبوو کاتێک لە بەرانبەر ئۆقیانوسێکی شیندا دەرکەوتین.

کۆلن پاول و کۆندی رایس لە پشتمانەوە وەستابوون. من بیرم لەو دژیەکە دەکردەوە کە باووباپیرانیان بەرگەی چیان گرتبووە و کۆلن و کۆندیش بەچی گەیشتوون. پاش گەشتەکە، لە دوورگەکەوە وتارێکم پێشکەش کرد:

"لەم شوێنەوە، ئازادی و ژیان زەوت کراون فرۆشران. مرۆڤەکان دەگەیەنران و جیا دەکرانەوە، دەکێشران و نیشانەی بازرگانیی کۆمپانیاکانیان لێ دەدرا و وەکو بار بە گەشتێکی دەریاییدا بەبێ گەڕانەوە ڕەوانە دەکران. یەکێک لە کۆچە هەرە گەورەکانی مێژوو بەهەمان شێوە یەکێک بوو لە تاوانە هەرە گەورەکانی مێژوو...

بۆ ماوەی دوو سەد و پەنجا ساڵ، کۆیلەکان بەرگەی شاڵاوێکیان گرت بۆ سەر کەلتوور و شکۆیان. ڕۆحی ئەفریقییەکان لە ئەمریکا نەشکا. لەگەڵ ئەوەشدا، ڕۆحی دەستگیرکەرەکانیان بۆگەنی کرد...کۆمارێکی بونیادنراو لەسەر یەکسانی بۆ هەمووان بوو بە بەندیخانەیەک بۆ ملیۆنان. لەگەڵ ئەوەشدا، هەروەکو لەپەندێکی ئەفریقیدا هاتووە "هیچ مشتەکۆڵەیەک ئەوەندە گەورە نییە کە ئاسمان بشارێتەوە". هەموو جیلە

چەوساوەکانی ژێر یاساکانی مرۆڤایەتی نەیانتووانی ئومێدی ئازادی تێکبشکێنن و ئامانجەکانی خودا شکست پێبێنن...

لە ململانێی سەدەکاندا، ئەمریکا بۆی دەرکەوت کە ئازادی مولکی نەژادێك نییە. ئێمە بە دڵنیاییەوە دەزانین کە ئازادی مولکی نەتەوەیەك نییە. ئەم باوەڕە بە مافە سروشتییەکانی مرۆڤ، ئەم بیروباوەڕەی کە دەبێ دادپەروەری بگاتە هەر شوێنێك کە خۆر پیایدا رەت دەبێ، ئەمریکا بەرەو جیهان ئاراستە دەکات. بەو هێز و سەرچاوانەی کە پێمان دراوە، ئەمریکا سۆراخی ئەوە دەکات ئاشتی بباتە هەر شوێنێك کە ململانێی لێیە، ئومێد بباتە هەر شوێنێك کە ئێشی لێیە و ئازادی بباتە هەر شوێنێك کە زۆرداری لێیە".

(پێپفار) لاپەڕەیەکی نوێ بوو لە چیرۆکی دەرنەکەوتووی ئازادیی، شکۆمەندی و ئومێدی ئەفریقا. لە هەر وڵاتێك کە سەردانم دەکرد، بەڵێنی ئەوەمدا کە ئەمریکا پابەندییەکانی جێ بەجێ دەکات. لە باشووری ئەفریقا، کە تیایدا نزیکەی پێنج ملیۆن نەخۆشی ئایدزیان هەبوو، من داوام لە سەرۆکی ناثارەزوومەندی وڵاتەکە (تابۆمبیکی) کرد کە بە کراوەیی و راستەوخۆ رووبەڕووی نەخۆشییەکە بێتەوە. لە (بۆتسوانا)، وڵاتێکی تا رادەیەك دەوڵەمەند کە تیایدا ٣٨٪ی خەڵکی پێگەیشتوو تووش ببوون، سەرۆك (فێستەس مۆگا) پەیمانیدا کۆمەکەکانی (پێپفار) بەکاربێنێت بۆ درێژەدان بەو هەوڵە کاریگەرەی دەستپێکردبوو بۆ شەڕ لەدژی نەخۆشییەکە. لە نەخۆشخانەی نیشتمانیی لە (ئەبوجا)ی نەیجریا، سەردانی ئەو ژنانەم کرد کە سوودیان لە دەستپێخەریی دایك و منداڵ وەرگرتبوو. ئەوان لە خۆشیا گەشابوونەوە لەکاتێکدا کە مناڵە تەندروستەکانیان پیشان دەدام. بەڵام بۆ هەر مناڵێك کە بەبێ ڤایرۆسەکە لەدایك دەبوو، زۆرێکیان بە رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ کێشەی ئایدز دەستیان بە ژیان دەکرد.

بەشی هەرە لەیادی گەشتەکە، سەردانمان بوو بۆ کلینیکی (تاسۆ) لە ئوگەندا کە لەوێ چاوم بە محەمەد کالیسوبولا کەوت. بە هاوڕێیەتی سەرۆك (یۆوەری موسێڤینی) و هاوسەرەکەی (جانێت)، من و لۆرا بە دەوری ژوورەکەدا هاتین و چووین و نەخۆشەکانمان گرتە باوەش. زۆرێکیان پێشوازییان لێکردین. ئەوان ئومێد و ترسەکانی خۆیان

خستەڕوو. پەرستارێك کە ناوی (ئەگنس) بوو پێی وتم کە مێردەکەی لە ساڵی ١٩٩٢دا بە ئایدز مردووە. کاتێك پشکنینی بۆ کرابوو، دەرکەوتبوو کە ئەویش تووش بووە. ئەو یەکێك بوو لەو چەند کەسە بەختەوەرەی کە توانیبووی دەرمانی دژەڤایرۆس وەرگرێت. داوای لێکردم ئەوەندەی بکرێ زوو، دەرمانی زیاتر بنێرم. کاتێك دەرمانە پشتگیریکراوەکانی (پێپفار) گەیشتنە ئۆگەندا، ئەگنس یاریدەدەر بوو لە پەرستاریکردنی زۆرێك لە نەخۆشەکانی تاسۆ. یەکێك لەوانە موحەمەد بوو. کاتێك ئەو لە ٢٠٠٨دا هاتە کۆشکی سپی، ئەگنسیش هات.

بەڕێوەبەری تاسۆ، کە دکتۆرێك بوو بەناوی ئەلێکس کۆتینۆ، دوایی وتی من یەکەم سەرکردەی جیهانم کە بینیوویەتی ئەفریقییەکی تووش بوو بە ئایدز لە باوەش بگرێت. من سەرم سوڕما. من ئەوە لەبیرە کە دایکم کاتێك لە ١٩٨٩دا توشبوویەکی ئایدزی لەباوەش گرتبوو ببووە سەردێڕی هەواڵە جیهانییەکان. کردارەکەی ئەو، ئەو ئەفسانەیەی بەتاڵ کردبووەوە کە دەیگوت دەشێ بە دەست لێدان تووشی نەخۆشییەکە ببیت. من شانازیم بەوەوە دەکرد کە میراتی ئەوم بۆ مابووەوە لە ڕێگەی کەمکردنەوەی ئەو هەستە ناپەسەندەی پەیوەست بە ئایدز هەیە. هیوادار بووم کە بە ڕێگایەکی بچوك شکۆی خەڵکی ئازارچەشتوو بگەڕێنمەوە. لەسەروو هەموو ئەمانەشەوە، ویستم پیشانی بدەم کە گەلی ئەمریکا مشورخۆرە.

یەکێك لە لایەنە بەرچاوەکانی گەشتەکەمان بۆ ئەفریقا ئەوە بوو کە باربارای کچمان لەگەڵمان هات. لە بۆتسوانا، من ئەو و لۆرا، بە گەشتێك چووینە ناوچەی سروشتی پەرژینکراوی مۆکۆلۆدی. هیوامان وابوو کە پشوو بدەین، هەوایەکی پاك هەڵمژین و هەندێ ئاژەڵی کێوی ببینین. بۆ شکاندنی تینویەتیی ڕاگەیاندنی گەڕۆك، ستافی کۆشکی سپی بڕیاریدا ئێمە وێنەیەك بگرین.

وەکو هەمیشە، ئامادەکارییەکان پڕ وردەکاری بوون. شاحینەیەکی ڕاگەیاندنی پڕ لە کامێرا و ریپۆرتەر لە شوێنێکی پاککراوەدا جێگیر بوو. لەکاتێکدا کە ئۆتۆمبێلەکەی ئێمە بە سوچەکەدا سوڕایەوە، ڕاگەیاندن ڕیزی بەستبوو بۆ وێنەیەکی کاملێ ئێمە لە حاڵەتی تەماشاکردنی چەند فیلێکدا. لە ڕواڵەتدا، فیلەکان حیواری سیناریۆکەیان پێ نەدرابوو.

ماوەیەکی کورت دوای ئەوەی کە ئێمە گەیشتین، فیلمێکی نێرینەی ویژاو لەبەردەمی پەخشی ڕاستەوخۆی نێودەوڵەتیدا سواری هاوتا مێینەکەی بوو. تیمی پێشڕەوییمان لەژێر گەرمای خۆرەتاوی ئەفریقادا زەرد هەڵگەڕان. من، لۆرا و باربارا دامانە قاقای پێکەنین.

گەشتەکە، یەکەم گەشتی باربارا بوو بۆ ئەفریقا و بە قووڵی کاری تێکرد. پاش تەواوکردنی خوێندنی کۆلێژ و ئەنجامدانی کاری خۆبەخشانە لە هەڵمەتەکەی ٢٠٠٤مدا، ئەو دەستی کرد بە کارکردن بۆ کلینیکێکی ئایدزی منداڵان لە نەخۆشخانەی (وار مێمۆریاڵ)ی خاچی سوور لە کەیپ تاونی باشووری ئەفریقا. بە کەوتنەژێر کاریگەری ئەزموونەکەی، دواتر ڕێکخراوێکی سوودنەخوازی بەناوی گرووپی تەندروستی جیهانی دامەزراند. لەسەر بنەمای مۆدێلێکی هاوشێوەی (وانە بڵێرەوە بۆ ئەمریکا)، ڕێکخراوەکەی ئەو تازەدەرچووانی کۆلێژ دەنێرێتە کلینیکەکانی سێ وڵاتی ئەفریقا و دوو شاری ناو ئەمریکا. ئەوان پشتگیریی چاودێریکردنی نەخۆشەکانی ئایدز و نەخۆشییەکانی تر دەکەن، ژێرخانی تەندروستی بەهێز دەکەن و یارمەتی خەڵك دەدەن لەگەڵ هیوا و شکۆمەندیدا بژین.

جێناش سۆزێکی بۆ دروست بوو بۆ کارکردن لەگەڵ نەخۆشەکانی ئایدزدا. ئەو لە چەند وڵاتێکی ئەمریکای لاتیندا خۆبەخشانە بۆ یونیسێف کاری کرد. کاتێك گەڕایەوە ماڵەوە، کتێبێکی ناوازەی نووسی کە بوو بە پڕفرۆشترین بە ناونیشانی (چیرۆکی ئانا) کە لەبارەی کچێکەوە بوو بە نەخۆشی ئایدزەوە لەدایك ببوو.

من و لۆرا زۆر شانازیمان بە کچەکانمانەوە دەکرد. ئەوان ببوون بەو ژنە پرۆفێشناڵانەی خزمەتی قەزیەیەکی گەورەتر لە خۆیان دەکرد. ئەوان بەشێکن لە بزاڤێکی گەورەتری ئەمریکییەکان کە کات و پارەی خۆیان بۆ یارمەتیدانی خەڵکانی نەگبەت تەرخان دەکەن. ئەم گیانە باشانە بەشێکن لەوەی کە من پێی دەڵێم سوپاکانی بەزەیی. زۆرێکیان لە ڕێکخراوە دینییەکانەوە دێن و سۆراخی قەرەبوو ناکەن. ئەوان حەقدەست لە فۆرمێکی تردا وەردەگرن.

***

یەکێك لە بڕیارە سەرەتاییە هەرە گرنگەکانی پەیوەست بە (پێپفار) ئەوە بوو کێ بەڕێوەی ببات. بەڕێوەبەرێکی لێهاتووم دەویست کە دەیزانی چۆن ڕێکخراوێك ڕێکبخات کە ئەرکیز بخاتە سەر ئەنجامەکان. من کەسە ڕاستەقینەکەم لە بزنسمانێکی ئیندیانادا دۆزییەوە کە بەڕێوەبەرێکی جێبەجێکاری پێشووی کۆمپانیای (ئێلی لیلی) بوو بەناوی (ڕاندڵ تۆبیاس).

یەکەم ڕاپۆرتەکانی ڕاندی نائومێدکەر بوون. ساڵێك پاش واژۆکردنی (پێپفار) کەمتر لە سەدهەزار نەخۆش دەرمانی دژەڤایرۆسیان وەردەگرت. چەقەنەیەکم لێدا و وتم "ئەمەیە؟ ئێمە لە دوو ملیۆنەوە زۆر دووریـن". ڕاندی منی دڵنیا کردەوە کە پێپفار کەوتووەتە سەر سکە. گرنگترینی ئەرکەکان لە ماوەی یەکەم ساڵدا ئەوە بوو کە وڵاتان وا لێبکەیت ستراتیژییەکانی خۆیان دارێژن، هێزی مرۆیی تەیار بکەن و دەست بکەن بە بونیادنانی ژێرخان. هەر کە ئەو بناغەیەمان ئامادە دەبوو، ژمارەی ئەو کەسانەی کە دەرمانەکەیان وەردەگرت بەشێوەیەکی دراماتیکی زیادیان دەکرد.

بەهاتنی ساڵی ٢٠٠٥، هاوکارە ئەفریقییەکانمان بەتەواوی هاتبوونە ناوەوە. گروپە دینییەکان و ئەوانەیتر کە پێپفار پشتگیری دەکردن، هەردووکیان ئەفریقی و ئەمریکی بوون، یارمەتیی کلینیکەکانی ستافیان دا و پەیامەکانی بەرگرتنیان بەسەر ملیۆنان کەسی کیشوەرەکەدا دابەش کرد. هەتیوەکان و نیوەمردووەکان چاودێریی بەخەمیان وەردەگرت. نزیکەی چوارسەد هەزار کەسێك دەرمانی دژەڤایرۆسیان وەردەگرت. ئێمە لەسەر ڕێڕەوی خۆمان بووین بۆ گەیشتن بە ئامانجەکە.

***

بەداخەوە، ئایدز تاکە نەخۆشی نەبوو کە لە ئەفریقا پەرەی دەسەند. بە هاتنی ٢٠٠٥، مەلاریا نزیکەی یەك ملیۆن ئەفریقی لە ساڵێکدا خستبووە خەتەری مردنەوە؛ زۆربەشیان منداڵانی ژێر تەمەنی پێنج ساڵی بوون. مەلاریا بەهۆی گەستنی مێشولەوە دەگوازرێتەوە، ٩٪ی هەموو مردنەکان لە ئەفریقا پێکدێنێت، تەنانەت لە ئایدزیش زیاترە. ئابووریناسان مەزەندەی ئەوەیان کردووە کە نەخۆشییەکە تێچووی ١٢ ملیارد دۆلاری لە ساڵێکدا

خستووەتە ئەستۆی ئەفریقا لە خەرجییە پزیشکییەکان و توانای لەدەستچووی بەرهەمهێنان. ئەمەش زەبرێکی توندە لەو ئابوورییانەی کە هەنوکە لاوازن.

هەر کەسێک لەو مردووانە پێویست بوون. مەلاریا شیاوی چارەسەرکردن و بەرگرتنە. ئەمریکا لە ١٩٥٠کاندا مەلاریای ریشەکێش کرد و ستراتیژییەکی باش بونیادراو هەبوو بۆ شەڕ لەدژی ئەخۆشییەکە. ئەمە پێویستی بە ئاوێتەیەک لە سپرای مێروکوژ، تۆڕەکانی پێخەف و دەرمان هەبوو بۆ تووشبووان. چارەسەرەکان بەشێوەیەکی دیاریکراو گرانبەها نەبوون. تۆڕەکان پێخەف هەر یەکێکیان ١٠ دۆلاری دەویست، لەوانەش گەیاندنەکەی.

لە حوزەیرانی ٢٠٠٥دا، من پرۆگرامێکی ١,٢ ملیارد دۆلاریی پێنج ساڵەم راگەیاند کە تەمویلی هەوڵەکانی ریشەکێشکردنی مەلاریای لە پانزە وڵاتدا دەکرد. وەکو پێپفار، دەستپێشخەریی مەلاریای سەرۆک توانای بە ئەفریقییەکان دەدا تا چەند ستراتیژییەک گەڵاڵە بکەن بۆ وەڵامدانەوەی پێداویستییەکان. ئێمە بەرەو ئامانجێکی پێوانەکراو کارمان دەکرد: کەمکردنەوەی رێژەکانی مردن بە مەلاریا بە رادەی ٥٠٪ بەدرێژایی پێنج ساڵی داهاتوو.

من ئەدمیراڵ (تیم زیمەر)م راسپارد، کە فرۆکەوانێکی هێزی دەریایی بوو بە ئەزموونی هەوڵە نێودەوڵەتییەکانی بوژاندنەوەوە، بۆ رێبەرایەتیکردنی دەستپێشخەریی مەلاریا. لە یەکەم دوو ساڵیدا، دەستپێشخەرییەکە گەیشتە یانزە ملیۆن ئەفریقی. بە هەمان شێوە کاردانەوەیەکی بەسۆزی لەلایەن ئەفریقییەکانەوە لێکەوتەوە. یانەکانی کوڕان و کچان، سەربازانی دیدەوانی و پۆلەکانی قوتابخانە بە بەستەی دە دۆلاری کۆمەکیان پێشکەش دەکرد بۆ کڕینی تۆڕەکانبۆ منداڵانی ئەفریقی. رێکخراوە دینییەکان و کۆمپانیا زەبەلاحەکان، بەتایبەت ئەوانەی کە لە ئەفریقا ئیشیان دەکرد، بەشێوەیەکی بەخشندانە پارەیان بۆ قەزیەکە تەرخان کرد. بە پشتیوانی دەستپێشخەریی مەلاریا، رێژەکانی توشبوون لە وڵاتە دەستنیشانکراوەکاندا دەستی کرد بە کەمبوونەوە. دراماتیکیترین ئەنجامیش لە (زانزیبار) بوو. کاربەدەستانی تەندروستی، هەڵمەتێکی توندوتۆڵی سپرای رشتن، دابەشکردنی تۆڕەکانی پێخەف و دەرمان بۆ قوربانییانی مەلاریا و ژنانی سکپڕ،

خستەگەر. لە یەکێک لە دوورگەکانی زانزیبار، ژمارەی کەیسەکانی مەلاریا تەنیا لە ساڵێکدا بۆ زیاتر لە ٩٠٪ کەم بووەوە.

لە ٢٥ی نیسانی ٢٠٠٧دا، من و لۆرا لە باخچەی ڕۆز، میواندارییەکەم (ڕۆژی هۆشیاریی مەلاریا)مان کرد. ئەمە دەرفەتێک بوو بۆ جاڕدانی بەرەوپێشچوون و پیشاندانی ئەنجامەکانی بەخشندەیی بە هاوڵاتیانمان.

لە کۆتایی قسەکانمدا، کۆمپانیای (سەمای خۆرئاوای ئەفریقای کانکوران) گۆانییەکی ڕاستەوخۆی پێشکەش کرد. بە کەوتنەژێر کاریگەری دۆخی ئاهەنگییەوە، منیش چوومە سەر شانۆکە. جوڵەکانم هەواڵە ناوخۆییەکاندا لێدرانەوە و بوومە سەرسوڕهێنێکی لاوەکی لەسەر یوتیوب. کچەکانم خۆشییەکی تایبەتیان بینی لە توانج تێگرتنم: "باوکە، پێمان وایە نابێ تۆ لەگەڵ گۆرانی (سەما کردن لەگەڵ ئەستێرەکاندا) پرۆڤە بکەیت".

منیش وتم "پێم وتن کە ئامانجی من بەرزکردنەوەی هۆشیارییە".

***

لە ساڵی ٢٠٠٦دا، مارک دیبول شوێنی ڕاندی تۆبیاسی گرتەوە وەکو هەماهەنگێکی پێپفار. وەکو دکتۆرێکی پزیشکی و کەسایەتی ڕێزلێنراوی ناو کۆڕی ئایدز، مارک ڕێزێکی زۆری بۆ پێپفار ڕاکێشا. پاش یەکێک لە گەشتەکانی بۆ ئەفریقا، پێی وتم کە خەڵکانێکی زۆری کیشوەرەکە نیگەران بوون لەبارەی ئەوەی کە دوای بەسەرچوونی مۆڵەتی پێنج ساڵەی پێپفار لە ٢٠٠٨دا، چی ڕوودەدات. حکومەتەکان پشت ئەستوور بوون بە پشتگیریی بەردەوام و خەڵکیش بەهەمان شێوە. مارک پێی وتم داوای لە کاربەدەستێکی کلینیکێکی تەندروستی لە ئەسیوپیا کردووە ئاخۆ کەس دەزانێ کورتکراوەی پێپفار چییە؟ ئەو وتبووی بەڵێ "پێپفار واتە گەلی ئەمریکا مشوری ئێمە دەخۆن".

مارک بڕوای وابوو کە ئێمە بەرپرسیارێتییەکمان لە ئەستۆیە بۆ درێژەدان بە پرۆگرامەکە- و دەرفەتێک بۆ قۆستنەوەی بەرەوپێشچوونەکە. بە دووقاتکردنی ئاستی تەمویلی سەرەتایی پێپفار، ئێمە بە درێژایی پێنج ساڵی دواتر دەمانتوانی چارەسەری ٢,٥ ملیۆن کەسی ئەفریقا بکەین، ڕێگربین لە تووشبوونی ١٢ ملیۆن کەس و پشتیوان بین بۆ چاودێریی ١٢ ملیۆن کەس.

دووقاتکردنی کۆمەکەکە، پابەندییەکی گەورە دەبوو. بەڵام دەستپێشخەریی ئایدز کاریگەر بوو و من بڕیارمدا درێژە بدەم بە چالاکییەکە. لە ٣٠ی مایسی ٢٠٠٧دا، من چوومە باخچەی ڕۆز و داوام لە کۆنگرێس کرد کە بە پابەندییەکی نوێی ٣٠ ملیارد دۆلارییەوە بۆ پێنج ساڵی داهاتوو، مۆڵەت بداتەوە بە دەستپێشخەرییەکە. بۆ ڕۆشنایی خستنەسەر بەرەوپێشچوونەکە، من بانگهێشتی ژنێکی ئەفریقای باشوورم کرد بەناوی (کونێن تانتۆ). لۆرا پێش دوو ساڵ ئەوی بینیبوو و بەسەرهاتە ئیلهامبەخشەکەی بۆ من گێڕابووەوە. کونێن ئایدزێکی جۆری ئیجابی هەبوو، بەڵام لە سایەی ئەو دەرمانەی لە ڕێگەی دەستپێشخەریی دایك و منداڵ وەریگرتبوو، کوڕێکی توشنەبووی ببوو. پاش وتارەکەم، بارۆنی چوار ساڵانم گرتە باوەش و بەو بیرۆکەیەکە دڵم خۆش بوو کە ژیانی بەهاداری بەهۆی باجدەرانی ئەمریکییەوە ڕزگاری بووە. ئەو وزە و تەندروستیی باشی خۆی لە ڕێگەی جوڵانەوە و دەست بەرزکردنەوە بۆ کامێراکان خستەڕوو. پاشان سەرنجێکی نێودەوڵەتیی تێگرتم بۆ "ئیتر بەسە. دامگرە".

هەنگاوی دواتر، بریتی بوو لە هاندانی وڵاتانی تر بۆ هاتنەپاڵمان. لە هاوینی ٢٠٠٧دا، من و لۆرا بەرەو ئەڵمانیان کەوتینەڕێ بۆ لوتکەی (گروپی هەشت) کە لەلایەن ڕاوێژکار (ئەنگێلا مێرکل)ەوە میوانداری دەکرا. ئەرکێکی سەرەکی، بریتی بوو لە ڕازیکردنی هاوتاکانم لە لوتکەکە بۆ خۆگونجاندن لەگەڵ پەیمانەکانی ئەمریکا لەبارەی ئایدز و مەلاریاوە.

ئەنگێلا پێی وتم بابەتی سەرەکیی لوتکەکە بریتی دەبێت لە گەرمبوونی گۆی زەوی. من ئامادە بووم بۆئەوەی لەسەر پرسەکە بونیادنەر بم. لە وتاری ساڵانەمدا لە ٢٠٠٦، وتبووم ئەمریکا "خووی بە نەوتەوە گرتووە"- دێڕێك کە بەلای هەندێ لە هاوڕێیانەوە لە تەکساس باش هەرس نەکرابوو. من لەگەڵ کۆنگرێس ئیشم کردبوو بۆ برەودان بە ئەلتارناتیڤی نەوت، لەوانەش زیندەسووتەمەنییەکان، ئۆتۆمبێلە هایبرید و هایدرۆجینەکان، گازی سروشتی، خەڵوزی خاوێن و وزەی ناوکی. من بەهەمان شێوە پرۆسەیەکی نێودەوڵەتیم پێشنیار کردبوو کە، بە پێچەوانەی پرۆتۆکۆڵی کەموکورتی کیۆتۆ، هەموو ژێنگەپیسکەرە گەورەکان- لەوانەش چین و هیندستان- ی کۆدەکردەوە

و متمانەی دەکردە سەر تەکنۆلۆژیاکانی وزەی پاک بۆ کەمکردنەوەی دەردراوەکانی گازە گەرمیدەرەکان بەبێ خاوکردنەوەی ئەو گەشە ئابوورییەی کە پێویستە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە.

من نیگەرانی ئەوە بووم کە تەرکیزی چڕ لەسەر گۆڕانی کەش و هەوا ببێتەهۆی ئەوەی کە وڵاتان پێداویستییە کتوپڕەکان لە جیهانی رووڵەگەشەدا فەرامۆش بکەن. من بە ئەنگێلام وت "ئەگەر بڕیار وایە کە رێبەرانی جیهان کۆ ببنەوە و قسەلەسر شتێك بکەن کە لەوانەیە پێش پەنجا ساڵ کێشە بووبێت، ئەوا باشترە لەبارەی ئەو خەڵکەوە شتێك بکەین کە هەر ئێستا بە ئایدز و مەلاریا دەمرن".

بە یارمەتی ئەنگێلا مێرکل، رێبەرانی گروپی هەشت رازیبوون لەسەر گونجاندنی ئامانجەکانی هێورکردنەوەی ئایدز لەگەڵ ئەوانەی کە ئەمریکا دایناببوون. پێکەوە، ئێمە لەماوەی پێنج ساڵی دواتردا چارەسەرمان بۆ پێنج ملیۆن کەس دابین دەکرد، رێگر دەبووین لەوەی بیست و چوار ملیۆن کەسی تر تووش ببن و پشتیوان دەبووین بۆ چاودێریی بیست و چوار ملیۆن کەسی تر. ئەوان بەهەمان شێوە رازی بوون لەسەر گونجاندنی ئامانجەکانی دەستپێشخەریی ئێمە پەیوەست بە مەلاریا. ئەو پابەندییە مێژووییانە دەتوانن جیاوازییەکی گەورە دروست بکەن لە ژیانی خەڵکی ئەفریقا و سەرانسەری جیهاندا. ئەوەش دەکەوێتە ئەستۆی ئیدارەکانی داهاتوو کە زامنی ئەوە بکات وڵاتان سۆراخی پەیمانەکانیان دەکەن.

***

ئەو پرەنسیپانەی لێپێچینەوە و هاوکاری کە رێنمایی پێپفاری دەکرد بەهەمان شێوە لە پشت ناوەرۆکی ئاراستە نوێکەی ئێمەوە بوو بۆ بەرەوپێشچوونی ئابووری، حسابی تەحەدای هەزارە (مکا). بۆئەوەی بۆ تەمویلەکانی (مکا) رەوا بێت، دەبووایە وڵاتان وەڵامدەرەوەی سێ پێوەری پێناسەکراو بن: لە دەرەوەی گەندەڵیدا حوکمڕانی بکەن، بەرنامە ئابوورییەکانی پەیوەست بە بازاڕ سۆراخ بکەن و لە تەندروستی و پەروەردەی خەڵکەکانیاندا وەبەرهێنان بکەن. گۆڕان لە ئاراستەگیرییەکەدا دراماتیك بوو. کۆمەکی ئابووری وەکو وەبەرهێنانێك مامەڵەی لەگەڵدا دەکرا نەك دەسکەلایەك. سەرکەوتن بە ئەو

ئەنجامانەی کە بەرهەمی دەهێنا پێوانە دەکرا نەك پارەی خەرجکراو، (مکا) پشتگیری لە هەندێ سەرچاوەی باوەڕنەکراوەوە بەدەستهێنا. یەکێکیان (بۆنۆ)ی گۆرانیبێژی سەرەکیی (یوتو) بوو. جۆش و کۆندی بە بۆنۆ ئاشنا ببوون و پێیان وتم ئەستێرەکە دەیەوێ لە ئۆفیسی ئۆڤاڵ سەردانم بکات. من لەو کەسایەتییە هونەرییانە بە گومان بووم کە پێدەچوو قەزیەی هەنوکەیی وەکو ڕێگایەکی بەرەوپێشبردنی پیشەکانیان بگرنەبەر. بەڵام ئەوان دڵنیایان کردمەوە کە بۆنۆ سەرڕاستە. سەردانەکەی ئەو بۆ ئەو بەیانییەی ١٤ی ئازاری ٢٠٠٢ دانرا کە من (مکا)م ڕاگەیاند. جۆش لێدوانێکی کورتی پێدام لەمەڕ ئەو پرسانەی کە لەوانەیە بێنەپێش. ئەو دوایین پرسیاری هەبوو بەر لەوەی کە بەرەو ئۆفیسی ئۆڤاڵ ڕێنمایی بکەین. وتی "جەنابی سەرۆك، تۆ دەزانی کە بۆنۆ کێیە، وایە؟" وتم بێگومان "ئەو ئەستێرەیەکی ڕۆکە". جۆش سەری لەقاند و بەرەو دەرگاکە رووی وەرگێڕا. وتم "ئەو هاوسەرگیری لەگەڵ (چێر) کردبوو وانییە؟" جۆش لە بێ بڕواییدا خۆی هێنا و برد. من ئەوەندەی توانیم رووم وەرنەگێڕا.

بۆنۆ بە کەسایەتییە ڤۆڵتێ بەرزەکەیەوە و شەپقە جیاوازەکەیەوە خۆی کرد بە ئۆفیسی ئۆڤاڵدا. ئەو بە خێرایی ئەو بیرۆکەیەی بەتاڵ کردەوە کە گوایە کۆمەك دابینکەرێکی سەربەخۆ بێت. ئەو لەبارەی بودجەکانی ئێمەوە دەیزانی، لە ڕاستییەکان تێدەگەیشت و دیدی دروستی هەبوو لەبارەی تەحەدییەکان لە ئەفریقا. ئەو دیارییەکی هۆشمەندانەی بۆ هێنام، ئینجیلێکی ئێرلەندیی کۆن.

ئەو پرسیاری کرد "ئایا دەزانی کە ٢,٠٠٣ دێڕی کتێبی پیرۆز ڕاستەوخۆ بەناو جیهانی هەژاراندا بڵاو دەبێتەوە؟" هەروەها وتی "خەڵکی خێران لە ئاماژەکردن بە گوناهە ئاشکراکانی وەکو ناپاکی هاوسەرێتی. بەڵام هەندێ جار ئێمە هەرە گرنگەکانیان فەرامۆش دەکەین، تاکە شوێنێك کە کتێبی پیرۆز ڕاستەوخۆ قسە لەسەر حوکمدان دەکەن لە ماتێێو ٢٥دایە: هەرچییەك کە ئێوە کردتان بۆ یەکێك لە لابەلاترین براکانی من، ئەوان بۆ منتان کردووە".

من وتم " تۆ ڕاست دەکەیت. گوناهی فەرامۆش کردن هەر ئەوەندەی ئەوانیتر جددیە". من دڵخۆش بووم کاتێك ئەو پشتگیریی بەهێزی بۆ (مکا) دەربڕی کە ئەو بڕوای

وابوو ئەو شێوازەی جیهان بۆ بەرەوپێشچوون گرتوویەتەبەر، بەشۆڕش دەکات. من بە وریاییەوە گوێم گرتبوو کاتێك پێی وتم کاری زیاتر بکەم لەبارەی ئایدزەوە. "بە چەند سەبێك دەتوانی ملیۆنەها گیان رزگار بکەیت. ئەمە باشترین ریکلامی شیاو دەبێ بۆ ئەمریکا. پێویستە تۆ شتەکان بە سور، سپی و شین بۆیە بکەیت".

پاش کۆبوونەوەکەمان، بۆنۆ هاتە لای من و کاردینالْ (تیۆدۆر مککاریك) کە پیاوێکی بەرێز و رۆحانی بوو، بۆ گەشتێك بە لیمۆزینەکەمان بۆ پێشکەشکردنی وتارەکەم لە (بانکی گەشەپێدانی ئینتەرئەمەریکان). بۆنۆ لە مەراسیمەکەدا بەشداری کرد و بەرنامەکەی ئێمەی بەرز هەڵسەنگاند. دواتر من زانیم کە یەکێك لە تەمویلکەرە گەورەکانی ئەو، وەبەرهێنەری سەروولیبرالْ (جۆرج سۆرۆس)، رەخنەی توندی بە بۆنۆ گرتووە لە بەرانبەر پەیوەندیکردن بە منەوە لە مەراسیمی (مکا)دا بێ ئەوەی هیچ شتێکی زیاتری لەبەرانبەردا دەست بکەوێت. سۆرۆس بە بۆنۆی وتبوو "ئەوەی کە هەتە لەبەرانبەر قاپێك نیسکدا ساغت کردووەتەوە". رێزم بۆ بۆنۆ زیادی کرد. ئەو گەرم و گوڕ بوو لەگەڵ لۆرا و کچەکاندا.

ئەو رووژوو نامەی سوپاسی بۆ دەناردم. ئەو پیاوی ئیمانێکی راستەقینەیە. بۆنۆ دەکرا دەمارگیر بێ، بەڵام هەرگیز بە شێوازێکی دووڕووانە یان سیاسی وانەبوو. کاتێك (پێپفار) بە سەرەتایەکی خاو دەستیپێکرد، ئەو لە ئۆفیسی ئۆڤاڵْ هاتە لام. ئەو وتی "تۆ پیاوی ئەنجامە پێوانەکراوەکانی. کەوابوو کوا ئەنجامەکان؟" دەبووایە من بەو بڵێم، بەڵام بواری ئەدا نوقەیەك بکەم. ئەو کاتەی کە پرۆگرامەکە کەوتبووە سەر سکە و بەرێوە دەچوو، گەرایەوە. وتی "بمبوورە گومانم لێ کردی. بەو بۆنەیەوە، دەزانی حکومەتی ئەمریکا ئێستا گەورەترین کڕیاری کۆندۆمە لە جیهاندا؟"

پێکەنیم. بۆنۆ دڵێکی گەورە و سیخورمەیەکی تیژی هەبوو. تاکە ئەنگێزەی ئەو، سۆزی بوو بۆ ئەو قەزیەیەی کە تیایدا هاوبەش بووین. من، لۆرا، باربارا و جێنا ئەمان بە هاورێیەك لەقەڵەمدا.

***

هەموان لەگەڵ بۆنۆدا هاوڕا نەبوون. سێ مانگ پاش ئەوەی کە (مکا)م ڕاگەیاند، چوومە لوتکەی (گروپی هەشت) لە (کاناناسکیس)ی کەنەدا. سەرۆک وەزیران (جین شریتین) بابەتی کۆمەکی دەرەکی هێنایە بەر باس. من یەکەم کەس بووم کە قسەم کرد. من لەبارەی پرەنسیپە ئەنجام خوازراوەکانی (مکا) قسەم کرد کە دابڕانێکی بەرچاو بوو لە نەریتی پێوانەکردنی بەخشندەیی بە ڕێژەی سەدیی ئەو تێکڕای بەرهەمی خۆماڵییەی کە وڵاتێك لە کۆمەکی دەرەکی خەرجی دەکات کە گروپی هەشت هەیبوو.

کاتێك قسەکانم تەواو کرد، جاك شیراك بەرەو پێشەوە چەمایەوە و قۆڵی گرتم. وتی" جۆرج، تۆ زۆر تاکڕەویت". پاشان دەستی کرد بە قسە "چۆن ئەمریکا دەتوانێ سوور بێت لەسەر کۆمەك گرێ بداتەوە بە دژە گەندەڵی؟ دواجار، سێ جیهانەکە گەندەڵی دروست کرد!" ئەو روونی کردەوە کە من لە کەلتووری ئەفریقی تێ ناگەم.

ئەمە یەکەم قسەی لەڕوو بوو بۆمن لەلایەن شیراکەوە. من بەلامەوە کۆمیدی نەبوو. دیار بوو کە ئامادەبێت ئیدانەی خەڵکی جیهانی رووڵەگەشە بکات لەبەرانبەر وەزعی راهینی گەندەڵی، هەژاری و حوکمڕانی خراپ، هەمووشی لەبەرئەوەی کە ئەو هەستی بە گوناه کردووە لەبارەی ئەوەی کە وڵاتانی وەکو فەرەنسا لەسەردەمی کۆلۆنیالیدا کردوویانە.

کاتێك محازەرەکە تەواو بوو، دەستم بەرز کردەوە. شریتین، سەری لەقاند. ئەو ویستی هەلێك بداتە سەرکردەکانیتر قسە بکەن. بەڵام من نەمتوانی رێگە بدەم بەیانەکەی شیراك شوێنی خۆی بگرێت. من وەکو پەرچەکردارێك وتم: "ئەمریکا وڵاتانی ئەفریقای کۆلۆنیزە نەکردووە. ئەمریکا گەندەڵی دروست نەکردووە و ئەمریکا ماندووبووە لەوەی کە سەیر بکات پارەیەکی باش دەدزرێت لەکاتێکدا کە خەڵکی بەردەوامن لە چەشتنی ئازار. بەڵێ، ئێمە بەرنامەی خۆمان دەگۆڕین. پێت خۆش بێت یان نا".

شیراك تووڕەیی خۆی هەڵڕشتبوو. بۆیە منیش دەبووایە ئەمە بکەم. زۆربەی سەرکردەکانی تر شۆك ببوون. هاوڕێم، سەرۆك وەزیرانی ژاپۆن خەندەیەکی نەرمی تێگرتم و سەری رەزامەندی بۆ لەقاندم.

بە درێژایی شەش ساڵی دواتر، (مکا) ٦،٧ ملیارد دۆلاری پارەی خستنەگەڕی بە پاڵپشتی سی و پێنج وڵاتی هاوکار وەبەرهێنا. (لێسۆسۆ) پەیمانەکەی (مکا)ی بەکارهێنا بۆ باشکردنی پرۆژەی ئاوەکەی. (بورکینا فاسۆ) سیستەمی جێ متمانەی مافەکانی موڵکایەتی دروستکرد. پرۆژەکانی لەم بابەتە، کۆڵەکە بوون بۆ وڵاتان بۆ هێنانەکایەی ئەو بازاڕانەی کە هانی گەشەی کەرتی تایبەتیان دەدا، سەرمایەی بیانییان رادەکێشا و زەمینەیان خۆش دەکرد بۆ بازرگانی کە بنچینەیەکی تری ئەجێندانی گەشەپێدانەکەم بوو. بازرگانیی ئازاد و دادپەروەرانە لە رێگەی دروستکردنی کڕیاری نوێ بۆ بەرهەمەکانمان شانبەشانی بژارەی زیاتر و نرخی باشتر بۆ بەکاربەرەکانمان، سوود بە ئەمریکا دەگەیەنێ. بازرگانی بەهەمان شێوە دڵنیاترین رێگایە بۆ یارمەتیدانی خەڵك لە جیهانی رووڵەگەشەدا بۆ گەشەپێدانی ئابوورییەکانیان و دەرهێنانی خۆیان لە هەژاری. بەپێی توێژینەوەیەك، سوودەکانی بازرگانی چل جار کاریگەرترە لە کەمکردنەوەی هەژاری بە بەراورد بە کۆمەکی دەرەکی. کاتێك بووم بە سەرۆك، ئەمریکا سێ رێککەوتننامەی جێگیری لەگەڵ سێ وڵاتدا هەبوو: کەنەدا، مەکسیك و ئیسرائیل. بە هاتنی ئەو کاتەی کە ئۆفیسم جێ هێشت، رێککەوتنمان لەگەڵ حەڤدە وڵاتدا هەبوو: لەوانەش وڵاتانی رووڵەگەشەی وەکو ئوردن، مەغریب، عەممان و دیموکراسییە ساواکانی ئەمریکای ناوەڕاست. بۆ گەشەپێدانی زیاتری ئابوورییەکانی ئەفریقا، ئێمە لەگەڵ هاوکارانی گروپی هەشتدا کارمان کرد بۆ هەڵوەشاندنەوەی زیاتر لە ٣٤ ملیارد دۆلاری قەرزی وڵاتانی ئەفریقا. دەستپێشخەرییەکە ئەو دەربازبوونە گەورەیەی لە قەرز قۆستەوە کە سەرۆك کلینتن زامنی کردبوو. راپۆرتێکی رێکخراوی (داتا)ی بۆنۆ گەیشتبووە ئەو ئەنجامەی کە دەربازبوون لە قەرز رێگەی بۆ وڵاتانی ئەفریقا خۆش کردبوو تا چل و دوو منداڵی تر بنێرن بۆ قوتابخانە.

دەستپێشخەرییەکی ئابووریی زیندوو بریتی بوو لە یاسای دەرفەت و گەشەی ئەفریقا (ئاگۆوا) کە گومرکەکانی لەسەر زۆربەی هەناردەکانی ئەفریقا بۆ ئەمریکا لابرد. سەرۆك کلینتن (ئاگۆوا)ی واژۆ کرد؛ منیش کارم لەگەڵ کۆنگرێس کرد بۆ فراوانکردنی. منیش وەکو یەکەم کەس کاریگەرییەکەیم بینی کاتێك چاوم کەوت بە چەند کاروەگەڕخەرێك لە

غانا کە بەرهەمەکانیان بۆ ئەمریکا هەناردە دەکرد. ژنێك پرۆژەیەکی دەست پێکردبوو بەناوی (دایکانی جیهانی). ئەو تایبەتمەند بوو لەبواری یارمەتیدانی پیشەگەرانی ژن بۆئەوەی بازاڕی نوێ بدۆزنەوە بۆ فرۆشتنی کاڵاکانی وەکو سابون، سەبەتە و خشڵ. لە ماوەی پێنج ساڵدا، کۆمپانیاکەی ئەو لە حەوت کارمەندەوە گەشەی کردبوو بۆ نزیکەی سێ سەد کارمەند. بەرگدروویەکی جلی ژنان بەناوی (ئێسەر) پێی وتم "من یارمەتی ژنانی تر دەدەم و یارمەتی خێزانەکەی خۆشم دەدەم".

***

لە شوباتی ٢٠٠٨دا، من و لۆرا گەڕاینەوە بۆ باشووری سەحرای گەورە. گەشتەکە دووەم گەشتی من و پێنجەمی ئەو بوو. ئێمە سەردانەکەمان وەکو هەلێك بینی بۆ دەرخستنی هەندێ لە باشترین رێبەرانی ئەفریقا کە بە پاکییەوە خزمەتی خەڵکی خۆیان دەکرد و دەست و پەنجەیان لەگەڵ کێشەکانی وەکو هەژاری، گەندەڵی و نەخۆشیدا نەرم دەکرد. نموونەی باشی ئەوان لە جیاوازییەکی گەورەدا بوو لەگەڵ ئەو رێبەرە ئەفریقییەی کە سەردێڕی هەواڵەکانی گرتبوو، (رۆبەرت موگابی)ی زیمبابۆی. موگابی دیموکراسی سەرکوتکردبوو، خەڵکەکەی خستبووە بەر هەلاوسانێکی نائاسایی و وڵاتەکەی لە هەناردەکەرێکی تەواوەوە کردبووە هاوردەکەرێکی تەواو. تۆمارە ئابڕوبەرەگەی بەڵگەی ئەوە بوو کە پیاوێك دەتوانێ وڵاتێك وێران بکات. من دەمویست پیشانی جیهانی بدەم کە سەرکردایەتییەکی باش دەتوانێ یارمەتی وڵاتێك بدات بگاتە لوتکەی لێهاتووییەکەی.

من و لۆرا لە گەشتەکەماندا سێ وێستگەمان بەسەر کردەوە. لە هەریەکەیاندا، ئێمە نموونەی ئیلهامبەخشی هاوکارییەکانمان بینی لەگەڵ ئەفریقادا. من چاوم کەوت بە منداڵانی قوتابخانە لە (بێنین) و (لیبریا) کە کتێبی خوێندنیان هەبوو، ئەمەش لە سایەی دەستپێشخەریی (پەروەردەی ئەفریقا)ی ئێمە. لە (رواندا)، من پەیماننامەیەکی وەبەرهێنانی دوولایەنەم واژۆ کرد کە دەستگەیشتنی بە دارایی بۆ کاروەگەڕخەرانی رواندی زیاد دەکرد. لە غانا، من دەستپێشخەرییەکی نوێم راگەیاند بۆ شەڕ لەدژی نەخۆشییە خولگەییە پشتگوێخراوەکانی وەکو کرمی ئەنکلستوما و تای لولپێچ. درێژترین

پەردانمان بۆ تانزانیا بوو کە وڵاتێکی چڵ و دوو کەسی بوو لەسەر کەناری خۆرهەڵاتی ئەفریقا. لە ژێر سەرکردایەتیی سەرۆک (جاکایا کیکویت)دا، تانزانیا بەشداری کردبوو لە (پێپفار)، دەستپێشخەریی مەلاریا و (مکا)دا.

کاتێك هێزی ئاسمانیی یەك بەرەو دارالسلام نزم بووەوە، پێم وترا کە لەوانەیە گروپێك ژنی تانزانی ببینم کە وێنەی منیان لەسەر جلەکانیان چاپ کردووە. لەکاتێکدا کە بە قادرمەکانی فڕۆکەکەدا دەچوومە خوار، کۆمەڵە ژنێك بە لێدانی تەپڵەکان و قۆچەکان سەمایان دەکرد. کاتێك یەکێك رووی کردە مۆسیقاکە، من وێنەی خۆمم لەسەر پشتی بینی.

وەکو زۆرێك لە وڵاتانی باشووری سەحرای ئەفریقا. ئابووری تانزانیا بەهۆی قەیرانی ئایدزەوە لاواز ببوو. سەرۆك (کیکویت) ئامەزۆر بوو لەبارەی شەڕ دژی نەخۆشی. ئەو هاوسەرەکەی (سەلما) پشکنینی ئایدزیان لەسەر تەلەفزیۆنی نیشتمانی ئەنجامدابوو بۆ خستنەرووی نموونەیەك باش بۆ گەلی تانزانیا. تەنانەت لە هەمووی کاریگەرتر، کیکویت هەتیوێکی ئەبەنی کردبوو کە دایك و باوکی بە ئایدز مردبوون.

سەرۆك کیکویت ئێمەی بۆ کلینیکێکی ئایدز برد لە نەخۆشخانەی (ئامانا دیستریکت هۆسپیتەڵ) کە لە ساڵی ٢٠٠٤دا بە پشتگیریی پێپفار کرابووەوە. لەکاتێکدا کە بەڕێوەبەری نەخۆشخانەکە رێنمایی ئێمەی کرد، من و لۆرا کچێکمان بینی کە لە گۆڕەپانەکە لەگەڵ داپیرەی لەسەر سەکۆیەك دانیشتبوو. ئەو نۆ ساڵان بوو و هەڵگری ئایدزی نیجابی بوو. ئەو ڤایرۆسەکەی لە دایکییەوە بۆ مابووەوە کە مردبوو. ئایدز باوکیشی کوشتبوو. لەگەڵ ئەوەشدا، کچە بچوکەکە خەندەی لەسەر لێوان بوو. داپیرەی روونی کردەوە کە (خزمەتگوزارییەکانی بوژاندنەوەی کاسۆلیك) پارەی کچەکە دەدەن بۆ وەرگرتنی چارەسەر لە کلینیکی (پێپفار). ژنە پیرەکە وتی "وەکو موسڵمانێك، من هەرگیز وێنای ئەوەم نەکردووە کە گروپێکی کاسۆلیك بەو شێوەیە یارمەتیم بدەن. من زۆر سوپاسگوزاری گەلی ئەمریکام".

لە کۆنفرانسێکی هەواڵدا، من داواکەم بۆ کۆنگریس دووپات کردەوە بۆ مۆڵەتدانەوە و فراوانکردنی پێپفار. سەرۆك کیویت دەستی کرد بە قسە " ئەگەر ئەم پرۆگرامە، بپچرێت

یان چیتر بەردەوام نەبێت، ئەوا خەڵکێکی زۆر هیوا لەدەست دەدەن؛ بەدڵنیاییەوە مەرگ لەئارادا دەبێ. تکایەی بەسۆزانەم ئەوەیە کە پێپفار بەردەوام بێت". ریپۆرتەرێکی ئەمریکی پرسیاری لێکرد ئاخۆ تانزانییەکان دڵخۆش بوون لەبارەی ئاسۆی بوون بە سەرۆکی باراک ئۆباما. وەڵامی کیویت جۆش و خرۆشی پێ بەخشیم کە وتی "بەلای ئێمەوە، گرنگترین شت ئەوەیە کە لێیگەڕێن هاوڕێیەکی باشی ئەفریقا بێت وەکو سەرۆک بوش".

***

لەکاتێکدا کە ئێمە بەرەو واشنتن دەڕۆیشتینەوە، من و لۆرا لەسەر ئەوە کۆک بووین کە گەشتەکە باشترین بووە لە ماوەی سەرۆکایەتییەکەمدا. دۆخێکی نوێ و پڕ وزە و هیوا هەبوو لە سەرانسەری ئەفریقادا. خۆشەویستی لێوانلێو بۆ ئەمریکا سەرسوڕهێن بوو. هەر جارێک کە گوێبیستی سیاسییەک یان وتارنوسێکی ئەمریکی دەبم کە قسە لەبارەی وێنەی لاوازی ئەمریکا لە جیهاندا دەکات، بیر لەو دەیان هەزار ئەفریقییە دەکەمەوە کە لە بەدرێژایی شەقامەکان ریزیان بەستووە بۆ سڵاوکردن لە کاروانی ئۆتۆمبێلەکانمان و دەربڕینی سوپاسگوزاریی بۆ ئەمریکا.

بە هاتنی ئەو کاتەی کە ئۆفیسم جێ هێشت لە بەرواری کانوونی دووەمی ٢٠٠٩دا، پێپفار پشتیوانی چارەسەری بۆ ٢,١ ملیۆن کەس و چاودێریی زیاتر لە ١٠ ملیۆن کەسی کردبوو. پارەی باجدەرانی ئەمریکی یارمەتیدەر بوو بۆ پارێزگاری لە دایکان و ساواکان لە ماوەی زیاتر لە ١٦ ملیۆن حاڵەتی سکپڕیدا. زیاتر لە ٥٧ ملیۆن کەس سوودمەند بوون لە پشکنینی ئایدز و دانیشتنەکانی راوێژکاری.

ئەنجامەکانی دەستپێشخەریی مەلاریا بەهەمان شێوە هاندەر بوون. لە ماوەی دابەشکردنی تۆڕەکانی پێخەفی ئامادەکراو بە مێشولەکوژ، سپرای ناو ماڵ و گەیاندنی دەرمان بۆ دایکانی تووشبوو و سکپڕ، دەستپێشخەریی مەلاریا یارمەتیدەر بوو بۆ پارێزگاری بیست و پێنج ملیۆن کەس لە مردنی ناوەخت. ژمارەیەک وڵات، لەوانەش ئەسیوپیا، رواندا، تانزانیا و زامبیا لە پێشەوەی خشتەکەدا بوون لە وەڵامدانەوەی ئامانجی کەمکردنەوەی رێژەکانی توشبوون بە مەلاریا بە رێژەی زیاتر لە ٥٠٪.

پێویستییەکانی ئەفریقا هێشتا زۆرن. هێشتان زیاتر لە بیست و دوو ملیۆن کەس لەگەڵ نەخۆشی ئایدزدا دەژین. هەندێ لەوانەی پێویستیان بە دەرمانی دژە ڤایرۆسە، هێشتا دەستیان ناکەوێ. لەکاتێکدا کە مەلاریا لە پاشەکشێ دایە، هێشتا منداڵ هەن کە بە گەستنی مێشولە دەمرن. هەژاری هێشتا بەربڵاوە. ژێرخان کەموکورتی هەیە و هێشتاش خانەی تیرۆریستی و زۆرداری هەن.

لەکاتێکدا کە ئەم تەحەدییانە ترسێنەرن، گەلی ئەفریقا هاوکاری بەهێز لە پشتییەوە هەن. ئەمریکا، گروپی هەشت، یونێن، کۆڕی ئایینی و کەرتی تایبەت هەمووی زیاتر لە پێشوو هاتوونەتە ناوەوە. ژێرخانی تەندروستی وەکو بەشێکی پێپفار رەگی داکوتاوە و دەستپێشخەریی مەلاریا سوودی گشتگیر لە بوارەکانی تری ژیانی ئەفریقادا لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت.

لەوانەیە گۆڕانی هەرە گرنگ لەم ساڵانەی دواییدا، لە شێوازی روانینی ئەفریقییەکاندا بووبێت لە خۆیان. هەروەکو چۆن ئایدز چیتر وەکو حوکمێکی مەرگ نابینرێ، گەلی ئەفریقاش ئەو گەشبینییە نوێیەیان پەیدا کردووە کە ئەوان دەتوانن کێشەکانیان کۆنترۆڵ بکەن، شکۆمەندییان بگەڕێیننەوە و بە هیواوە بەرەوپێش بچن.

لە گەشتەکەماندا لە ساڵی ٢٠٠٨ بەرەو ئەفریقا، من و لۆرا سەردانی قوتابخانەیەکمان کرد کە تیایدا هەرزەکاران– کە زۆرێکیان هەتیو بوون– لەبارەی ئایدزەوە وانەیان پێ دەوترا. یەکێك لە وانەکان تەرکیزی خستبووە سەر پیشاندانی کچان کە چۆن داوای سێکسی بەتەمەنەکان رەت بکەنەوە، کە بەشێك بوو لە برگەی خۆبەدوورگرتنی پێپفار. لەکاتێکدا کە بەلای گروپێك قوتابیدا تێپەڕیم، وتم "خوا باشە". ئەوان بە یەك دەنگ هاواریان کرد "هەموو کاتێك!".

لێرە لە رواندا، وڵاتێك کە سەدان هەزار کەسی بە جینۆساید و ئایدز لەدەست داوە، ئەم منداڵانە هەست بە بەرەکەت دەکەن. بەدڵنیاییەوە ئێمەومانان لە شوێنانی ئاسودەی وەکو ئەمریکا دەتوانین وانەیەك فێر بین. من بریارمدا جارێکی تر بیڵێمەوە. "خودا باشە".

کۆرسەکە جارێکی تر تەنانەت بە دەنگێکی بەرزتر وتیەوە، "هەموو کاتێك!"

# زیادکردنی سەرباز

لە سێپتێمبەری ٢٠٠٦دا، بە نزیکبوونەوەی هەڵبژاردنە میانەییەکان، (میشێل مککۆنێل)ی هاورێم هاتە ئۆفیسی ئۆڤاڵ. سیناتۆرە کۆمارییەکەی (کێنتاکی) داوای کردبوو کە من بە تەنیا ببینێت. لوتێکی سیاسیی تیژی هەبوو و بۆنی کێشەی دەکرد.

وتی "جەنابی سەرۆک، لێبوونەوەی جەماوەرت خەریکە کۆنترۆڵمان لە کۆنگرێس لەدەست دەدات".

میش مەبەستێکی هەبوو. زۆرێک لە ئەمریکییەکان لەو سەرۆکایەتییەی من ماندوو ببوون. بەڵام ئەمە تاکە هۆکار نەبوو کە حزبەکەمان لەکێشەدا بوو. من ئەوەم هاتەوە خەیاڵ کە کۆنگرێسمانی کۆماری رەوانەی زیندان کرابوون لە بەرانبەر وەرگرتنی بەرتیل، بەهۆی فەزیحەی سێکسەوە، یان لە کۆکردنەوەی پشتگیری بۆ لێکۆڵینەوە تێوەگلابوون. پاشان خەرجییەکی بەفیرۆدەرانە، نموونەی پرۆژەی حکومی بۆ کۆکردنەوەی دەنگ و شکستمان لە ریفۆرمی ئاسایشی کۆمەڵایەتی سەرباری هەبوونی زۆرینە لە هەردوو ئەنجومەنەکە، لەئارادا بوون.

پرسیارم کرد "باشە مێش، دەتەوێ لەمبارەیەوە چی بکەم؟"

وتی "جەنابی سەرۆک، هەندێ سەرباز لە عێراقەوە بگەرێنەوە بۆ نیشتمان" ئەو تەنیا نەبوو. لەکاتێکدا کە توندوتیژی لە عێراق زیاد دەبوو، ئەندامانی هەردوو حزبەکە داوای کشانەوەیەکیان کردبوو.

وتم "مێش، بڕوام وایە کە ئامادەییمان لە عێراق پێویستە بۆ پارێزگاری لە ئەمریکا و من سەرباز ناکشێنمەوە ئەگەر هەلومەرجی سوپا پاساو نەدات". من روونم کردەوە کە

دەستکاریی ئاستەکانی هێزی سەربازی دەکەم بۆ بەدیهێنانی سەرکەوتن لە عیراق نەك بۆ سەرکەوتن لە دەنگداندا.

ئەوەی کە پێم نەوت، ئەوە بوو کە من پێچەوانەی پێشنیارەکەی ئەوم لەبەرچاو گرتووە. لەبری کشاندنەوەی سەرباز، من خەریکی دانی سەختترین و بێ جەماوەرترین بڕیار بووم لەماوەی سەرۆکایەتییەکەمدا: دابەزاندنی دەیان هەزار سەربازی تر لە عیراق بە ستراتیژییەکی نوێوە، فەرماندەیەکی نوێ و ئەرکێك بۆ پاراستنی گەلی عیراق و یارمەتیدانی هێنانەکایەی دیموکراسییەك لەناو دڵی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا.

***

ڕەشبینیی سێپتێمبەری ٢٠٠٦ پێچەوانەبوو لەگەڵ ئەو ئومێدەی زۆر کەس پاش ئازادکردنی عیراق هەستیان پێکرد. ساڵی پاش داخلبوونی هێزەکانمان بۆ ناو وڵاتەکە، ئێمە رژێمی سەدامامان رووخاند، دیکتاتۆرمان دەستگیر کرد، قوتابخانەکان و کلینیکەکانی تەندروستیمان بونیاد نانەوە و ریفۆرمی ئەنجومەنی حوکمڕانیمان کرد کە نوێنەرایەتیی هەموو گروپە تایەفی و ئەتنییە گەورەکانی دەکرد. لەکاتێکدا کە بێ یاسایی و توندوتیژی رۆیشتبووە سەروو چاوەڕوانییەکانمانەوە، پێدەچوو زۆربەی عیراقییەکان سوور بن لەسەر بونیادنانەوەی کۆمەڵگەیەکی ئازاد. لە ٨ی ئازاری ٢٠٠٤دا، ئەنجومەنی حوکمڕانی گەیشتە ڕێککەوتنێك لەسەر (یاسای بەڕێوەبردنی کاتی). ئەم دۆکیومێنتە بنچینەییە داوای گەڕاندنەوەی سەروەری دەکرد لە مانگی تەموزدا، کە هەڵبژاردنی بۆ ئەنجومەنێکی نیشتمانی، داڕشتنی دەستوور و خولێکی تری هەڵبژاردن بۆ حکومەتێکی دیموکراتی، بەدوادا دەهات.

بۆ ماوەی نزیکەی سێ ساڵ، ئەم نەخشەرێگایە رێنمایی ستراتیژییەکەی ئێمەی کرد. ئێمە بڕوامان وابوو کە یارمەتیدانی عیراقییەکان تا ئەو بنچینانە بەدی بێنن، باشترین رێگەیە بۆ پیشاندانی شیعە، سونە و کورد کە پشکیان هەبووە لە وڵاتێکی سەربەست و ئارامدا. هەر کە عیراقییەکان لە پرۆسەی دیموکراتیکدا وەبەرهێنانیان کرد، ئومێدەواربووین کە ناکۆکییەکانیان لە بەردەم سندوقی دەنگدان یەکلایی دەکەنەوە،

لێرەوەش دوژمنانی عێراقی ئازاد پەراوێز دەخەن. بە کورتی، ئێمە بروامان وابوو کە بەرەوپێشچوونی سیاسی رێگە بوو بەرەو ئاسایش- و سەرەنجام رێگە بەرەو نیشتمان.

ستراتیژیی سەربازیمان تەرکیزی خستەسەر سۆراخکردنی توندڕەوان لەکاتێکدا کە مەشقی بە هێزەکانی ئاسایشی عیراق دەکرد. بە پێی تێپەڕبوونی کات، ئێمە بەرەو ئامادەییەکی سەربازی بچوکتر دەجولاین، رووبەڕووی ئەو بۆچوونە دەبووینەوە کە ئێمە داگیرکەرین و رەوایەتیی سەرکردە عێراقییەکانمان پەرە پێ دەدا. من ستراتیژییەکەم پوخت کردەوە "لەکاتێکدا کە عێراقییەکان دەکەونە سەر پێی خۆیان، ئێمە دێینە خوارەوە". دۆن رەمسفێلد بەراوردکردنێکی لەیادنەچووی هەبوو: "پێویستە دەستمان لە کوشنی بایسکیلەکە بەردەین".

من تاووتوێی مێژووی پاش جەنگی ئەڵمانیا، ژاپۆن و کۆریای باشوورم کردبوو. هەریەکەیان چەندەها ساڵ- و ئامادەیی سەربازیی ئەمریکا-یان پێویست بوو بۆ تەواوکردنی گواستنەوە لە کارەساتی جەنگ بۆ دیموکراسیی سەقامگیر. بەڵام هەر کە گەیشتنە ئەو خاڵە، کاریگەریی وەرچەرخانیان، شایستەیی باجەکەی سەلماند. ئەڵمانیای خۆرئاوا وەکو داینەمۆی کامەرانیی ئەوروپا و کلاورۆژنەی ئازادی دەرکەوت لەماوەی جەنگی سارد دا. ژاپۆن بوو بە دووەم ئابووری گەورەی جیهان و کۆڵەکەی ئاسایش لە ئۆقیانوسی هێمندا. کۆریای باشوور بوو بە یەکێك لە هاوکارە هەرە گەورەکانی بازرگانیمان و زەمینەیەکی ستراتیژی لەبەرانبەر دڕاوسێیەکەی باکووری.

هەرسێ وڵاتەکە، سوودمەند بوون لە دانیشتووانە تا رادەیەك هاوشێوەکانیان و ژینگەی ئاشتییانەی پاش جەنگ. لە عێراقدا، گەشتەکە قورستر بوو. عیراق لەو سەروەختەوە کە لە پاشەواری ئیمپراتۆریەتی عوسمانی وڵاتەکەی دروستکردبوو، دوچاری تەنگژەی تایەفی و ئەتنی هاتبوو. ترس و بێ متمانەیی دروستکراو لەلایەن سەدامەوە، ئاشتەوایی نێوان عێراقییەکانی سەخت کردبوو. بەهەمان شێوە ئەو هێرشە توندوتیژانەش کە توندڕەوەکان ئەنجامیان دەدا.

سەرباری توندوتیژی، هیوا هەبوو. عیراق دانیشووانێکی گەنج و خوێندەوار، کەلتوورێکی زیندوو و دامەزراوەی حکومیی کارای هەبوو. توانای ئابووریی بەهێزی

فەرماندەی گشتی. زۆرینەی گەورەی ئەوانەی کە چاوم پێیان کەوت وەکو (دۆن ل) بوون: تێکشکابوون بەهۆی قوربانیەکەیانەوە، بەڵام شانازییان دەکرد بە خزمەتی ئەندامەکەیانەوە. هەندێ لە خێزانەکان تورەیی خۆیان هەڵدەڕشت. کاتێك لە حوزەیرانی ٢٠٠٤دا لە ویلایەتی واشنتن سەردانی (فۆرت لویس)م کرد، دایکێکم بینی کە کوڕەکەی لە عیراق لەدەستدا بوو. ئەو دیار بوو کە تورەیە. هەوڵمدا هێوری بکەمەوە.

وتی "تۆ ئەوەندەی ئوسما بن لادن تیرۆرستێکی گەورەی". هیچم نەبوو لە بەرانبەر دا بیلێم. ئەو کوڕەکەی لەدەستدابوو، ماف ئەوەی هەبوو کە ئەوەی پێیەتی هەڵیڕێژێت لە بەرانبەر پیاوێکدا کە کوڕەکەی ناردبوو بۆ جەنگ. من بە داخ بووم کە خەفەتەکەی ئەو ئێشەی لا دروست کردبوو. ئەگەر دەربڕینی تورەییەکەی یاریدەدەر بوو بێت بۆ سارێژکردنەوەی برینەکەی، ئەمە بەلای منەوە ئاسایی بوو.

هەمان رۆژ، چاوم کەوت بە (پاتریك و سیندی شیهان)ی خەڵکی (ڤاکاڤیل)ی کالیفۆرنیا. کوڕە کوژراوەکەیان، پسپۆڕ (کەیسی شیهان) بۆ دوایین ئەرکی، خۆبەخشانە کاری کردبوو، هەوڵێکی بوێرانە بۆ رزگارکردنی تیمێکی هاوەڵە سەربازەکانی کە لە شاری سەدر کەوتبوونە بەر ئاگر. پاش چاوپێکەوتنەکە، سیندی لەگەڵ رۆژنامەیەکی شارەکە، بۆچوونەکانی لەبارەی منەوە دەربڕی " ئێستا دەزانم کە ئەو مکوڕە لەبارەی ویستنی ئازادی بۆ عیراقییەکان...دەزانم کە ئەو بەداخ و پەژارەیە و هەست بە ئازارێك دەکات بۆ قوربانییەکەمان. دەشزانم کە ئیماندارە".

بە هاتنی ئەو هاوینە، سیندی شیهان بوو بە چالاکوانێکی دژە جەنگ. بەپێی تێپەڕبوونی کات، بەلاغەتەکەی توندتر و توندتر بوو. ئەو بوو بە قسەکەری رێکخراوێکی دژەجەنگ بەناوی (کۆد پینك) کە لەدژی ئیسرائیل دەدوا و لایەنگیریی دیکتاتۆری دژە ئەمریکی (هوگۆ شاڤێز)ی ڤەنزویلای دەکرد و دواجاریش خۆی بۆ کۆنگرێس پاڵاوت لەدژی سەرۆك پەرلەمان (نانسی پیلۆسی). هەست بە خەفەت دەکەم بۆ سیندی شیهان. ئەو دایکێکە کە بە روونی دیارە کوڕەکەی زۆر خۆشویستووە. ئەو خەفەتەی بەهۆی لەدەستچوونی کوڕەکەیەوە خواردی، ئەوەندە قووڵ بوو کە هەموو ژیانی برد. هیوا وابوو کە رۆژێ لە رۆژان ئەو و هەموو خێزانەکانی سەربازە کوژراوەکان ئاسوودە ببن بە بینینی

عیراقێکی ئازاد و جیهانێکی ئارامتر وەکو یادەوەرییەکی گونجاو بۆ قوربانیدانی کەسە خۆشەویستەکەیان.

***

کاتێك قاعیدە پەناگەی ئارامی لە ئەفغانستان لەدەستدا، تیرۆریستان کەوتنە سۆراخی پەناگەیەکی نوێ. پاش ئەوەی ئێمە لە ٢٠٠٣دا سەداممان لەسەر حوکم لابرد، بن لادن داوای لە شەرکەرانی کرد کە پشتگیریی جیهاد بکەن لە عیراقدا. لە زۆر رووەوە، عیراق زیاتر ئارەزوومەندیان بوو لە ئەفغانستان. ئەو وڵاتە سامانی نەوت و رەگوریشەی عەرەبی هەبوو، بەپێی تێپەربوونی کات، ژمارەی توندڕەوانی پەیوەست بە قاعیدە لە ئەفغانستان بۆ چەند سەد کەسێك کەمیکرد، لەکاتێکدا کە ژمارەی مەزەندەکراو لە عیراقدا گەیشتە دە هەزار.

تورەوی تریش هەبوون لە عیراقدا: بەعسییەکانی پێشوو، یاخیبووانی سوننە توندڕەوانی شیعەی پشتیوانیکراو لەلایەن ئێرانەوە. بەڵام هیچ کامیان ئەوەندە قاعیدە دڵرەق نەبوون. رەخنەگران بەڵگەی ئەوەیان دەهێنایەوە کە ئامادەیی قاعیدە دەیسەلمێنێ ئێمە بە ئازادکردنی عیراق تیرۆریستانمان وروژاندووە. من هەرگیز ئەو لۆژیکەم پێ قبوڵ نەبووە. قاعیدە لە ١١ی سێپتێمبەردا یەکجار زۆر وروژابوو کاتێك تاکە سەربازێك لە عیراقدا نەبوو. ئایا کەس بە راستی بڕوای وابوو کە ئەو پیاوانەی سەری بەندکراوانی بێ تاوانیان دەپەڕاند یان لە بازاڕەکاندا خۆیان دەتەقاندەوە، هاوڵاتیی ئاشتیخواز دەبوون ئەگەر وازمان لە سەدام بهێنایە؟ ئەگەر ئەم توندڕەوانە هەوڵیان نەدایە بۆ کوشتنی ئەمریکییەکان لە عیراقدا، ئەوا هەوڵیان دەدا لە شوێنێکی تر ئەمە بکەن. ئەگەریش ئێمە رێگەمان بدایە لە عیراق دەرمان پەڕێنن، ئەوا بەوە قایل نەدەبوون هەر لەوێ بوەستن. بۆ نیشتمان بەدوامان دەکەوتن.

بۆ هەموو ئەو گیانانەی زەوتیان کرد، دوژمنانمان نەیانتووانی لە بەدەستهێنانی تاکە ئامانجێکی ستراتیژیمان لە عیراقدا بمانوەستێنن. لە بەهاری ٢٠٠٤دا، زەرقاویی تیرۆریست- کە دواتر ئوسامە بن لادن بە "میری قاعیدە لە عیراق" ناوی دەبرد- هەڕەشەی تێکدانی گواستنەوەی سەروەری کرد، کە خستبوویە ٣٠ی حوزەیران. لە

مانگی مایسدا، ئەڤینەرەوەیەکی خۆکوژ سەرۆکی ئەنجومەنی حوکمڕانی (عزەدین سەلیم)ی تیرۆر کرد. چەند هەفتەیەك دواتر، هێرشی هەماهەنگ بۆ سەر پۆلیسی عیراق و باڵەخانەکانی حکومەت بووەهۆی کوژرانی زیاتر لە سەد کەس، لەوانەش سێ سەربازی ئەمریکی. بۆ پچڕاندنی پلانەکانی هێرشی گەورەی تر، ئێمە بڕیارماندا پرۆسەی گواستنەوەکە دوو رۆژ پێش کاتی خۆی جێبەجێ بکەین. من لە٢٨ی حوزەیراندا لە لوتکەی ناتۆ بووم لە ئەستەنبوڵ کاتێك هەستم کرد دۆن رەمسفێڵد دەست لە شانم دەدات. ئەو پارچە کاغەزێکی بە دەستوخەتی کۆندی خستە بەر دەستم: "جەنابی سەرۆك، عیراق خاوەن سەروەرییە. نامەکە لە ١٠:٢٦ی بەیانیدا بە کاتی عیراق لەلایەن بریمەرەوە گەیشتووە".

منیش بە خەتێکی پەڕپوتەوە نوسیم "با ئازادی حوکڕان بێت!" پاشان لەگەڵ سەرکردەکەی لای راستم تەوقەم کرد. لە وەرچەرخانێکی گونجاوی مێژوودا، من لەگەڵ پیاوێکدا هاوبەشی ئەو چرکەساتە بووم کە هەرگیز راڕا نەبوو لە پابەندییەکەی بە ئازاکردنی عیراقەوە (تۆنی بلێر).

حەوت مانگ دواتر، لە کانوونی دووەمی ٢٠٠٥دا، عیراقییەکان گەیشتنە بناغەیەکی تر: هەڵبژاردنەکان بۆ ئەنجومەنێکی نیشتمانیی کاتی. جارێکی تر، تیرۆریستان هەڵمەتێکیان سازدا بۆ وەستاندنی بەرەوپێشچوون. زەرقاوی "جەنگێکی هەمەلایەنە لەدژی ئەم پرەنسیپە شەیتانییەی دیموکراسی" راگەیاند و پەیمانیدا هەر عیراقییەك کە سەروکاری لەگەڵ هەڵبژاردنەکەدا هەبێ، بکوژێت.

بە گەڕانەوەم بۆ وڵات، گووشار زیادی کرد. وتارێکی رۆژنامەی (لۆس ئەنجلس تایمز) هەڵبژاردنەکەی بە "ساختە" ناوبردوو و پێشنیاری دواخستنی کردبوو. من بڕوام وابوو کە دواخستنەکە دوژمن بەهێز دەکات و دەبێتەهۆی ئەوەی کە عیراقییەکان پابەندییەکەمان بە دیموکراسییەوە بخەنەژێر پرسیارەوە. ئەنجامدانی دەنگدانەکە، ئیمان لە عیراقییەکاندا پیشان دەدات و یاخیبووان وەکو دوژمنانی ئازادی پیشان دەدات. بە تیمی ئاسایشی نیشتمانیم وت "دەبێ هەڵبژاردنەکان ئەنجام بدرێن." "ئەمە چرکەساتی رۆشنی دەبێت بۆ جیهان".

له ٥:٥١ بەیانیی ٣٠ی کانوونی دووەمی ٢٠٠٥دا، بانگی ئەفسەرێکی ئۆوری (بارودۆخ)م کرد تا یەکەم زانیاریم پێ بدات. وتی بالیۆزمان لە بەغدا هەواڵی لێشاوێکی گەورەی دەنگدەری گەیاندووە- سەرباری بایکۆت لەلایەن زۆرێك لە سوننەکانەوە. لەکاتێکدا کە تیرۆریستیان هەندێ هێرشیان ئەنجامدا، راگەیاندنەکانی سەرانسەری جیهان عێراقییەکانیان لە حاڵەتی بەرزکردنەوەی پەنجەی بە مەرەکەبیان لە دۆخێکی خۆشیدا پیشان دەدا. ریپۆرتەرێك ژنێکی نەوەد ساڵەی بینیبوو کە بە کورسی دووتایە بەرەو سندوقی دەنگدان پاڵی پێوە دەنرا.

هەواڵێکی تر باسی دەنگدەرێکی دەکرد کە لە هێرشێکی تیرۆریستیدا قاچێکی لەدەستدابوو. ئەو وتبووی "ئەگەر پێویست بووایە ئەوا بە گاگۆلکێ بۆ ئێرە دەهاتم. ئەمڕۆکە من بۆ ئاشتی دەنگ دەدەم".

هەڵبژاردنەکان ئەنجومەنێکی نیشتمانییان پێك هێنا کە لیژنەیەکی راسپارد بۆ دارشتنی دەستوور. لە مانگی ئۆگەستدا، عێراقییەکان گەیشتنە رێککەوتنێك لەسەر پێشکەوتووترین دەستوور لە جیهانی عەرەبیدا- دۆکیومێنتێك کە مافە یەکسانەکانی بۆ هەمووان مسۆگەر دەکرد و پارێزگاری لە ئازادییەکانی ئایین، کۆبوونەوە و دەربڕین دەکرد. کاتێك دەنگدەران لە ١٥ی ئۆکتۆبەردا چوونە بەردەم سندوقەکانی دەنگدان، رێژەی دەنگدەر تەنانەت گەورەتر بوو لەوەی کانوونی دووەم. توندوتیژی کەمتر بوو. ژمارەیەکی زۆرتری سوونەکان دەنگیاندا. دەستوور بە رێژەی ٧٩٪ بە ٢١٪ پەسەند کرا.

سێیەمین هەڵبژاردنی ساڵ، کە لە مانگی دیسەمبەردا ئەنجام درا، بۆ شوێنپێگرتنەوەی ئەنجومەنی کاتی بوو بە ئەنجومەنێکی یاسادانانی جێگیر. جارێکی تر، عێراقییەکان بەرەنگاری هەڕەشە تیرۆریستییەکان بوونەوە. نزیکەی دوانزە ملیۆن عێراقی- رێژەیەکی دەنگدەر کە زیاترە لە ٧٠٪- دەنگیان خۆیان دا. ئەمجارەیان سوننە بە ژمارەی یەکجار زۆر بەشدارییان کرد. دەنگدەرێك پەنجەی بە مەرەکەبی بەرزکردەوە و هاواری کرد "ئەمە دڕکێکە بۆ چاوی تیرۆریستان".

من شانازیم دەکرد بە سەربازەکانمانەوە و دڵخۆش بووم بۆ عیراقییەکان. بە سێ هەڵبژاردنی ٢٠٠٥ەوە، ئەوان بناغەیەکی گەورەیان لەسەر ڕێگای بەرەو دیموکراسی دانابوو. من هیوادار بووم کە پێشکەوتنی سیاسی یاخیبووان گۆشەگیر بکات و ڕێگە بدات تا سەربازەکانمان شەرکەرانی قاعیدە یەك لەدوای یەك دەربکێشێت. پاش ئەو هەموو خەمباری و قوربانیدانە، هۆکارێکی راستەقینە هەبوو بۆ گەشبینی.

***

مزگەی (عەسکەریە) لە مزگەوتی ئاڵتونیی سامەڕا بە یەکێك لە شوێنگە هەرە پیرۆزەکان دادەنرێ لە ئیسلامی شیعەدا. ئەم شوێنە، گۆڕی دوو ئیمامی گەورە دەگرێتەخۆ کە باوك و باپیرەی ئیمامە نادیارەکە دەگرنەخۆ، ڕزگارکەرێك کە شیعە بڕوای وایە دادپەروەری بۆ مرۆڤایەتی دەگەڕێنێتەوە.

لە ٢٢ی شوباتی ٢٠٠٦دا، دوو بۆمبی گەورە مزگەوتەکەیان وێران کرد. هێرشەکە تووڕەییەکی یەکجار گەورەی لای شیعە دروست کرد کە هاوشێوە بوو لەگەڵ هێرش بۆ سەر (بازیلیکا)ی سەینت پیتەرز یان (دیواری بوراق). سەرکردەی کاریگەری شیعە (عەبدولعەزیز ئەلحەکیم) پێی وتم "ئەمە هاوتایە لەگەڵ ١١ی سێپتێمبەرەکەی ئێوە".

من خەیاڵم گەڕایەوە بۆ ئەو نامەیەی زەرقاوی لە ساڵی ٢٠٠٤دا بۆ سەرکردەکانی قاعیدە کە پێشنیاری هەڵایساندنی شەڕێکی کردبوو لەنێوان سوننە و شیعەی عیراقدا. لەکاتێکدا کە هەندێ هێرشی کتوپڕی تۆڵەسەندنەوە لەئارادا بوون، پێنەدەچوو توندوتیژی لە کۆنترۆڵ دەرچێ. من ئاسودە بووم. شیعە دان بەخۆداگرتنی پیشاندابوو، منیش هانم دابوون بەردەوام بن لەوە. لە وتارێکی ١٣ی ئازارمدا، وتم "عیراقییەکان ڕوانیبوویانە چاڵە ڕەشەکە و ئەوەی کە بینییان کەیفیان پێ نەهات".

من هەڵە بووم. بە هاتنی سەرەتاکانی نیسان، توندوتیژی تایەفی تەقیبووەوە. چەند باندێکی هەڵچوی چەکدارانی شیعە سوننەی بێ تاوانیان ڕفاندبوو و کوشتبوو. سووننەش بە تەقینەوەی خۆکوژی لە ناوچە شیعەنشینەکان وەڵامیان دەدانەوە. قەیرانەکەش بەهۆی نەبوونی حکومەتێکی عیراقیی بەهێز، قووڵتر دەبووەوە. حزبەکان تاوەکو هەڵبژاردنی مانگی دیسەمبەر لە تەقەلادا بوون بۆ بەدەستهێنانی پۆست. ئەمە لایەنێکی

سروشتی دیموکراسییە، بەلام بە هەلکشانی توندوتیژی، عیراق پێویستی بە سەرکردەیەکی بەهێز هەبوو. من کۆندی و بالیۆز زالمای خەلیلزادم راسپارد – کە لە کابولەوە بەرەو بەغدا هاتبوو– کە لە بەرانبەر عیراقییەکاندا مکوڕ بن بۆ دیاریکردنی سەرۆك وەزیرانێك. چوار مانگ پاش هەلبژاردن، ئەوان دیاریکردنێکی سەرسوڕهێنیان پیشاندا: نوری ئەلمالیکی.

مالیکی کە ئەیارێك بوو لەلایەن سەدامەوە بە مەرگ حوکم درابوو، لە تاراوگە لە سوریا دەژیا. ئەو رۆژەی کە دەستنیشان کرا تەلەفۆنم بۆی کرد. لەبەرئەوەی تەلەفۆنێکی سەلامەتی نەبوو، لە بالیۆزخانەی ئەمریکا بوو. زالمای وتی "جەنابی سەرۆك، ئەمەش سەرۆك وەزیرانی نوێیە".

وتم "سوپاس، بەلام کەمێك زیاتر لە سەر هێل بمێنەرەوە بۆئەوەی سەرۆك وەزیران بزانێ کە من و تۆ چەندە نزیکین لە یەکترییەوە".

کاتێك مالیکی هاتە سەر هێل وتم "پیرۆزە جەنابی سەرۆك وەزیر. دەمەوێ بزانی کە ئەمریکا بەتەواوی پابەندە بە دیموکراسی لە عیراقدا. ئێمە پێکەوە کار دەکەین بۆ شکستپێهێنانی تیرۆریستان و پشتیوانی لە گەلی عیراق. بە بروابەخۆبوونەوە سەرکردایەتی بکە".

مالیکی دۆستانە و دلسۆز بوو، بەلام ئەزموونێکی سیاسی کەمی هەبوو. من روونم کردەوە کە خوازیاری پەیوەندییەکی کەسیی نزیکم. ئەویش هەمان ویستی هەبوو. لە چەند مانگی دواتردا، ئێمە زووزوو بە ڤیدیۆ کۆنفرانس و تەلەفۆن قسەمان دەکرد. من لەوە وریابووم کە خۆمی بەسەردا نەسەپێنم یان سەختگیر دیار نەبم. دەمویست من بە دۆستێك، لەوانەشە بە ئامۆژگارێك دابنێ. ئەو فشارێکی زۆری لەوانیترەوە بۆ دەهات. لە منەوە ئامۆژگاری و لێکتێگەیشتنی پێ دەگەیشت. هەر کە متمانەیم بەدەست هێنا، من لە پێگەیەکی باشتردا دەبووم بۆ یارمەتیدانی تا بریاری سەخت بدات.

***

من هیوادارบووم کە پێکهاتنی حکومەتی مالیکی یارمەتیدەر بێت لە دابینکردنی ناوبڕێك لە توندوتیژیدا. بەلام وەها نەبوو. راپۆرتەکان لەبارەی کوشتارە تایەفییەکان

زۆر توندتر دەبوو. فیرقەکانی مەرگ رفاندنی زۆر بێ شەرمانەیان ئەنجام دەدا. ئێران پارە، مەشق و کەرەستەی تەقینەوەیان بۆ چەکداران دابین دەکرد بۆ کوشتنی سەربازەکانمان. عیراقییەکان دەچوونەوە ناو قاوغی تایەفییان، لە هەرکوێیەک بیانتوانیایە سۆراخی پارێزگارییان دەکرد.

فەرماندەی زەمینیمان لە عیراق ژەنەراڵ (جۆرج کەیسی) بوو، کە ژەنەراڵێکی چوار ئەستێرەی بەئەزموون بوو و فەرماندەیی سەربازەکانی کردبوو لە بۆسنیا و وەکو جێگری سەرۆکی ستاف سوپا خزمەتی کردبوو. دۆن رەمسفێلد ئەوی راسپاردبوو بۆ فەرماندەیی عیراق کاتێك ژنەراڵ ریکاردۆ سانشێز لە هاوینی ٢٠٠٤دا کارەکەی تەواو ببوو.

پێش ئەوەی جۆرجلە بەغدا دەست بەکار ببێت، من و لۆرا ئەو و هاوسەرەکەیمان (شێیلا)مان بانگهێشت کرد بۆ نانی ئێوارە لە کۆشکی سپی. باڵیۆزی ئەمریکا لە عیراق، (جۆن نێگرۆپۆنتی)یش - دیپلۆماتێکی بەئەزموون و شارەزا کە خۆی بۆ کارەکە تەرخان کردبوو- و دیانای هاوسەری ئامادەی خوانەکە بوون. جۆرج بایۆگرافییەکەی راهێنەری تۆپی پێی ئەفسانەیی، (ڤینس لۆمباردی) پێدام. جۆرج لەماوەی دوایین وەرزی لۆمباردی-دا وەکو بەڕێوەبەرێکی کەرەستە و کەلوپەل بۆ (واشنتن رێدکینز) کاری کردبوو. بەهرەکە دەدوا. وەکو راهێنەرەی کە ئەو پێی سەرسام بوو، جۆرج درەوشاوە نەبوو. ئەو فەرماندەیەکی پایەدار و راشکاو بوو- "خشتێکی گرانیت" بوو کە جارێك لە جاران لۆمباردی پێی دەوترا.

ژەنەراڵ کەیسی- وەکو ژەنەراڵ ئەبی زەید و دۆن رەمسفێلد- قەناعەتی وابوو کە ئامادەیی سەربازیمان هەستێکی داگیرکاری دروستکردووە کە توندوتیژی زیاد کردووە و بەنزینی بە یاخیگەرێتیدا کردووە. بۆ دوو ساڵ و نیو، من پشتیوانی ستراتیژی کشاندنەوەی هێزەکانمان کردبوو لە دۆخێکدا کە عیراقییەکان بەرەوپێش دەچن. بەڵام لەو چەند مانگەی پاش تەقینەوەکەی سامەڕا، دەستم کردبوو بە پرسیارکردن لەبارەی ئەوەی کە ئاخۆ شێوازەکەی ئێمە لەگەڵ واقیعدا دەگونجێ. توندوتیژی تایەفی لەبەرئەوە سەری هەڵنەدابوو کە ئامادەییمان زۆر گەورە بوو. لەبەرئەوە روویدا بوو کە قاعیدە

وتم "ئەمە کاریگەری نییە. ئێمە پێویستمان بەوەیە کە بە دیدێکی تر بڕوانینە ئەواوی ستراتیژییەکە. پێویستم بەوەیە هەندێ بژارەی نوێ ببینم".

ئەو لە وەڵامدا وتی "جەنابی سەرۆک، بەداخەوە تۆ ڕاست دەکەیت". ستیف ڕۆیشت چاوپێداخشاندنەوەیەکی چڕوپڕ ڕێك بکات. هەر شەوێك، تیمی عیراق لە ستاف ئاسایشی نیشتمانی، یادداشتێکی ئامادە دەکرد بۆ وردکردنەوەی بەرەوپێشچوونە سەربازی و سیاسییەکانی بیست و چوار سەعاتی ڕابردوو. ئەو وێنەیەی ئەوان کێشایان فیت نەبوو. ڕۆژێکی دوادواکانی وەرزی بەهار، دوای کۆبوونەوەیەك من داوام لە (مێگان ئۆسلیڤان)، هەڵگری دکتۆرا کە ساڵێکی بە ئیشکردن بۆ جێری بریمەر لە عیراق بەسەر بردبوو، کرد نەڕوات. ئەو چەند پەیوەندییەکی لەگەڵ زۆرێك لە گەورە کاربەدەستانی حکومەتی عیراق ئەنجام دابوو. من پرسیارم کرد ئاخۆ ئەو چی بیستووە لە بەغداوە. وتی "دۆزەخە، جەنابی سەرۆك".

لە ناوەڕاستی حوزەیراندا، ستیف گروپێکی شارەزایانی دەرەوەی ڕێکخستبوو بۆ ئەوەی لێدوانم پێ بدەن لە کامپ دەیفد. (فرێد کاگان) کە ئەکادیمییەکی سوپا بوو لە (دامەزراوەی پرۆژەی ئەمریکی) ، پرسیاری ئەوەی کرد ئاخۆ بایی پێویست سەربازمان هەیە بۆ کۆنترۆڵکردنی توندوتیژییەکە. ڕۆبەرت کاگان، ڕۆژنامەنووسی ناسراو، پێشنیاری ئەوەی کرد کە ستراتیژییەکی دژە یاخیگەریی توندتر بگرینە بەر. (مایکڵ ڤیکەرز) کە کارمەندێکی پێشووی سی.ئای.ئەی بوو و لە ۱۹۸۰کاندا یارمەتیدەر بوو لە چەکدارکردنی موجاهیدینی ئەفغانی، پێشنیاری ئەوەی کرد ڕۆڵێکی گەورەترمان هەبێت بۆ (ئۆپەراسیۆنە تایبەتییەکان). ئیلیەت کۆهن، نووسەری (فەرماندەیی باڵا)، کتێبێك لەبارەی پەیوەندیی نێوان سەرۆکەکان و ژەنەراڵەکانیان کە بە پێشنیاری ستیف خوێندبوومەوە، پێی وتم من پێویستم بەوەیە کە فەرماندەکانم بخەمەژێر پرسیار بۆ ئەنجامەکانیان.

بۆ دابینکردنی ڕوانگەیەکی تر، ستیف چەند وتارێکی لە کۆلۆنێلەکان و ژەنەراڵە یەك ئەستێرەکان بۆ هێنام کە فەرماندەیی سەربازەکانیان کردبوو لە عیراقدا. جوداییەك سەری هەڵدا: لەکاتێکدا کە هەردوو ژەنەراڵ کەیسی و ئەبی زەید پشتگیریی ستراتیژی

(مەشقپێکردن و کشانەوە)یان دەکرد، زۆرێك لەوانەی کە لە جەنگەکەوە زۆر نزیك بوون پێیان وابوو سەربازی زیاترمان پێویستە.

یەکێك لەوانەی کە سەرنجی راکێشام کۆلۆنێل ئێیچ.ئار.مکماستەر بوو. من کتێبەکەیم لەبارەی ڤێتنام (راگەیاندنی ئەرك) خوێندبووەوە کە سەرکردایەتیی سەربازی بەوە تۆمەتبار کردبوو بایی پێویست کار ناکەن بۆ راستکردنەوەی ئەو ستراتیژییەی لەلایەن سەرۆك جۆنسن و وەزیری بەرگری بۆب مکنامارا پەیڕەو کرابوو. لە ساڵی ٢٠٠٥دا، کۆلۆنێل مکماستەر فەرماندەیی فیرقەیەکی دەکرد لە شارێکی باکووری عیراق بەناوی (تەلەعفەر). ئەو بە بەکارهێنانی سەربازەکانی بۆ رامالینی یاخیگەران، پاراستنی ناوچە تازە گیراوەکە و پارەتیدان بۆ بونیادنانەوەی ئابووریی و دامەزراوە سیاسییەکانی لۆکاڵ، ستراتیژیی دژەیاخیگەری پەیڕەو کردبوو. ئەم رێبازەی رامالین، پاراستن و بونیادنان، تەلەعفەری لە سەنگەرێکی یاخیگەرەوە کردبوو بە شارێکی تا رادەیەك ئارام و کارا.

یەکێکی تر لە پیادەکەرانی دژەیاخیگەری ژەنەراڵ دەیڤد پترایۆس بوو. من یەکەم جار ئەوم لە لە ساڵی ٢٠٠٤ لە (فۆرت کامپێل) بینی. ئەو وەکو یەکێك لە ژەنەراڵە گەنجە هەرە زیرەك و هەرە چالاکەکان لە سوپادا ناوی دەرکردبوو. ئەو وەکو خوێندکارێکی زیرەکی پۆلەکەی لە (وێست پۆینت) خوێندنی تەواو کردبوو و دکتۆرای لە (پرینستن) بەدەستهێنابوو. لە ساڵی ١٩٩١دا، ئەو بە رێکەوت لە راهێنانێکی مەشقدا فیشەك بەر سنگی کەوتبوو. ئەو بەرگەی گەشتێکی کۆپتەری شەست مایلی گرتبوو بەرەو سەنتەری پزیشکی زانکۆی ڤاندەربیلت کە لەوێ گیانی لەلایەن دکتۆر (بیل فیرست) رزگار کرابوو، ئەو دکتۆرە کۆمارییەی کە دواتر بوو بە رێبەری ئەنجومەنی پیران.

لە سەرەتاکانی جەنگدا، ژەنەراڵ پێترایۆس فەرماندەیی لقی ١٠١ی هەوایی کردبوو لە موسڵ. ئەو سەربازەکانی ناردبوو بۆ ژیان لەگەڵ دانیشتووانی عیراقی و ئەنجامدانی دەوریە بەپێ لەسەر شەقامەکان. ئامادەیی ئەوان، دانیشتووانی دڵنیا کردەوە لەوەی کە ئێمە بۆ پارێزگاری ئەوان لەوێین. پاشان پێترایۆس هەڵبژاردنەکانی لۆکاڵی ئەنجامدا بۆ پێکهێنانی ئەنجومەنی پارێزگا، کۆمەکی ئاوەدانکردنەوەی خەرج کرد بۆ بوژاندنەوەی

چالاکیی ئابووری و سنووری لەگەڵ سوریا کردەوە بۆ زەمینەخۆشکردنی بازرگانی. شێوازەکەی ئەو دژە یاخیگەریتی ناو کتێبەکان بوو. بۆ شکستپێهێنانی دوژمن، ئەو هەوڵی دەدا خەڵك بەلای خۆیدا رابکێشێت. ئەمەش کاریگەری هەبوو. لەکاتێکدا کە توندوتیژی لە بەشی هەرە زۆری عیراقدا زیادی دەکرد، موسڵ تا رادەیەك بەهێمنی مایەوە. بەڵام کاتێك ئێمە سەربازمان لە موسڵ کەم کردەوە، توندوتیژی گەڕایەوە. هەمان شتیش لە تەلەعفەر روویدەدا.

پاش چاودێریکردنی مەشقپێکردنی هێزەکانی ئاسایشی عیراقی، ژەنەراڵ پەترایۆس لە (فۆرت لیڤنوێرس)ی کەنساس دامەزرێنرا بۆ نوسینەوەی پەیڕەونامەی دژەیاخیگەریتیی سوپا. بنەمای دژەیاخیگەریتی ئەوەیە کە ئاسایشی بنچینەیی پێویستە بەر لەوەی بکرێ دەستکەوتە سیاسییەکان بەدی بێن. ئەمەش پێچەوانەی ستراتیژییە هەنوکەییەکەمان بوو. من بڕیارمدا تا لە نزیکەوە چاودێریی کاری ژەنەراڵ پێترایۆس– و خۆیشی بکەم.

***

لە گەرمەی هەموو ئەو هەواڵە ناخۆشانەی ٢٠٠٦دا، پنتێکی رووناکاییمان هەبوو. لە سەرەتاکانی حوزەیراندا، هێزە تایبەتییەکانی ژێر فەرماندەیی ژنەراڵی کاریگەر ژەنەراڵ ستانلی مکریستاڵ سۆراخی زەرقاویی سەرکردەی قاعیدەیان لە عیراق کرد و کوشتیان. بۆ یەکەم جار لە سەروەختی هەڵبژاردنەکانی دیسەمبەرەوە، ئێمە توانیمان نیشانەیەکی دراماتیکیی بەرەوپێشچوون پیشانی خەڵکی بدەین.

هەفتەیەك دواتر، من پاش رۆژێك لە کۆبوونەوەکانی ئەنجومەنی ئاسایشی نیشتمانی، بە هێمنی لە کامپ دەیڤد هاتمە دەرەوە. من لەگەڵ گروپێکی بچوکی یاریدەدەران بازم دایە ناو هەلیکۆپتەرێکی گواستنەوەی سوپا، بەرەو بنکەی هێزی ئاسمانیی ئەندروز رۆیشتم و سواری هێزی ئاسمانی یەك بووم. یانزە سەعات دواتر لە بەغدا نیشتینەوە.

بە پێچەوانەی گەشتی جەژنی (سوپاسگوزاری)یەکەمەوە لە ٢٠٠٣دا، کاتێك کۆبوونەوەکانم لە فرۆکەخانە ئەنجامدا، بڕیارمدا لە ناوچەی سەوز چاوم بە مالیکی بکەوێت، کە ناوچەیەکی تۆکمەکراو بوو لە ناوەڕاستی بەغدا. هەلیکۆپتەرە سەربازییەکان بە نزمی و بە خێرایی ئێمەیان بەسەر شارەکەدا برد، ناوبەناو رووناکییەکیان دەردەکرد

وەکو پارێزگارییەك لە بەرانبەر موشەکە سوورخکەرەکانی گەرمی. کاتێك گەیشتمە بالیۆزخانە سەرۆك وەزیران چاوەڕێی منی دەکرد. لە سەرەوەختی هەڵبژاردنیەوە لە نیساندا، ویستبووم مالیکی رووبەڕوو ببینم. لە پەیوەندییە تەلەفۆنییەکانماندا، ئەو شتی راست و دروستی وتبوو. بەڵام من بیرم لەوە دەکردەوە ئاخۆ دڵنیاکردنەوەکانی لە شوێنی خۆیاندان.

وتم "بڕیارەکان و کردارەکانت سەرکەوتن دەستنیشان دەکەن. ئەمە ئاسان نابێت، بەڵام گرنگ نییە چەندە سەختە، ئێمە یارمەتیت دەدەین".

مالیکی سوپاسی ئەمریکای کرد لە بەرانبەر ئازادکردنی وڵات و جەختی لە ئارەزووەکەی کردەوە بۆ هاوڕێیەتییەکی نزیك. وتی "ئێمە سەرکەوتن بەسەر تیرۆردا بەدەست دێنین، کە سەرکەوتنێکە بۆ دیموکراسی. خەڵکێکی تاریکی زۆر هەن کە ترسیان لە سەرکەوتنی ئێمە هەیە. ئەوان حەقیانە کە نیگەران بن، چونکە سەرکەوتنمان لەسەر تەخت دەیانهێنێتە خوار".

سەرۆك وەزیران رەفتارێکی نەرم و نیان و دەنگێکی هێمنی هەبوو، بەڵام من هەستم بە ناخێکی سەرسەخت کرد. سەدام چەندەها ئەندامی بنەماڵەی مالیکی لەسێدارە دابوو، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو رەتی کردبووەوە دەستبەرداری رۆڵەکەی بێت لە حزبی ئۆپۆزسیۆندا. بوێرییە کەسییەکەی تۆوێك بوو کە هیوادار بووم چەکەرە بکات بۆئەوەی ببێتە رێبەرێکی بەهێز کە عیراقییەکان پێویستیانە.

سەرۆك وەزیران منی بردە ژووری کۆنفرانسێك بۆ ئاشنابوون لەگەڵ کابینەکەیدا کە بریتی بوون لە رێبەرانی شیعە، سوننە و کورد. من لە رێگەی ڤیدیۆ کۆنفرانسەوە ئەوم بە تیمەکەم ناساند. راوێژکارانم، کە نەیاندەزانی من کامپ دەیڤدم جێهێشتووە، سەریان سوڕما بە بینینی من لە بەغدا. عیراقییەکان دڵخۆش بوون بە موخاتەبەکردنی هاوتاکانیان لە یەکەمین کۆبوونەوەی ئاسایشی نیشتمانیی هاوبەش لەنێوان ئەمریکا و عیراقدا.

کۆبوونەوە گرنگەکەی تر لەگەڵ جۆرج کەیسیدا بوو. ئەو ژەنەراڵە ماندوونەناسەی کە بۆ ماوەی دوو ساڵ لە عیراق بوو و لەسەر داوای من گەشتەکەی درێژ کردەوە. ئەو پێی

وتم کە ٨٠٪ی توندوتیژیی تایەفی لە دووراپی ٣٠ مایلی بەغدا روو دەدات. کۆنترۆلکردنی پایتەخت گرنگ بوو بۆ هێمنکردنەوەی بەشەکەی تری وڵات.

ژەنەراڵ کەیسی، پلانی هەوڵێکی نوێی دادەنا بۆ مسۆگەرکردنی ئاسایشی عیراق. هێرشەکە (ئۆپەراسیۆنی پێکەوە بەرەو پێشەوە) هەوڵی ئەدا بۆ پیادەکردنی شێوازی پاك بکەرەوە، بپارێزە و بونیاد بنێی پیادە دەکرد کە جارێك لە جاران لە تەلەعفەر و موسڵ سەرکەوتوو ببوو. من هاوڕێیەکم دەبینیز ستراتیژیی "پاك بکەرەوە، بپارێزە و بونیاد بنێ" پێویستی بە هێزی سەربازیی چڕوپڕ بوو. بەڵام ژەنەراڵەکانمان دەیانویست ئامادەیی سەربازیمان کەم بکەنەوە. ئەو یەکێك لە گومانەکانی منی بەیان کرد. ژەنەراڵ کەیسی وتی "من بە روونکردنەوەی بۆ تۆ، پێویستم بە کردنی کارێکی باشترە". وتم "بەڵێ وایە".

***

هاوینی ٢٠٠٦ خراپترین ماوەی سەرۆکایەتیم بوو. من بە بەردەوامی بیرم لە جەنگ دەکردەوە. لەکاتێکدا کە من بە مکوڕیی حکومەتەکەی مالیکی و مەرگی زەرقاوی ورەم پەیدا کرد، بە قووڵی نیگەران بووم لەبارەی ئەو توندوتیژییەی هەموو شتێکی تری داگیر دەکرد. نێکرای ١٢٠ عیراقی لە رۆژێکدا دەمردن. جەنگ بۆ زیاتر لە سێ ساڵ درێژ ببووەوە و ئێمە زیاتر لە ٢,٥٠٠ ئەمریکیمان لەدەستدا بوو. ئەمریکییەکان تەقریبەن بە رێژەی دوو بە یەك وتبوویان ئەوان ئەو رێگایەیان بەلاوە ناپەسەندە کە من بەهۆیەوە مامەڵە لەگەڵ عیراقدا دەکەم.

بۆ یەکەم جار، من نیگەرانی ئەوە بووم کە لەوانەیە ئێمە سەرکەوتوو نەبین. ئەگەر عیراق بەسەر هێڵە تایەفییەکاندا دابەش ببێت، ئەرکی ئێمە بە بنبەست دەگات. دەشیا ئێمە بڕوانینە دووبارەبوونەوەیەکی ڤێتنام و زەبرێکی دراماتیکی لە بەرژەوەندییەکانمان. ئەگەر هەر شتێك بێ، دەرەنجامەکانی شکست لە عیراقدا تەنانەت خراپتر دەبێ لەوەی ڤێتنام. ئێمە قاعیدە بە پەناگەیەکی ئارامەوە لە وڵاتێکدا جێ دێڵین کە سامانی نەوتی گەورەی هەیە. ئێمە ئێرانێکی شەرانگێزمان لە سۆراخکردنیدا بەرەو چەکی ناوکی بەهێز دەکرد. ئێمە هیواکانی ئەو خەڵکەمان لەرزۆك دەکرد کە لە سەرانسەری رۆژهەڵاتی

ناوەڕاستدا موجازەفەیان بۆ ئازادی دەکرد. سەرەنجام، دوژمنانی ئێمە دەیانتووانی پەناگەی خۆیان بەکاربێنن بۆ هێرشکردنە سەر خاکەکەمان. ئێمە دەبووایە نەهێڵین ئەمە ڕوویدات.

من بڕیارێکی ئاگایانەمدا بۆ پیشاندانی مکوڕی، نەك گومان، لە خەڵکدا. من دەمویست گەلی ئەمریکا تێبگات لەوەی کە لە ناخی دڵمەوە بڕوام بە کەیسەکە هەیە. عیراقییەکان پێویستیان بەوە بوو بزانن ئێمە دەستبەرداریان نابین. دوژمنانمان پێویستیان بەوە بوو بزانن ئێمە سوورین لەسەر تێکشکاندنیان. سەرباری هەموو ئەمانەش، من بیرم لە سەربازەکانمان دەکردەوە. من هەوڵمدا وێنای ئەوە بکەم هەستەکە چۆنە کاتێك بیست ساڵانێك بیت لە بەرەکانی پێشەوە، یان دایکێك بیت کە نیگەرانە لەبارەی کورەکەی یان کچەکەیەوە. دوایین شت کە ئەوان پێویستیان بوو بیبیستن ئەوە بوو کە فەرماندەیەکی گشتی چەندە سکاڵا دەکات لەبارەی سەرلێشێواوییەکەیەوە. ئەگەر من نیگەرانیم هەبووایە لەبارەی ئاراستەی جەنگەکەوە، ئەوا پێویستم بەوە دەبوو گۆڕانکاری بکەم لە بەرنامە و ڕێوشوێن، نەك ئەمەی کە لەناو خەڵکدا هات و هاوار بکەم. من هێز و توانام لە خێزان، هاوڕێیان و ئیمانم وەرگرت. کاتێك ئێمە سەردانی کامپ دەیڤدمان دەکرد، من و لۆرا حەزمان لە نزاکردن بوو لەگەڵ خێزانەکانی سوپادا لە پەرستگای بارەگاکەدا. پیاوە ئایینییەکە لە ساڵی ٢٠٠٦دا، فەرماندەیەکی هێزی دەریایی چل و هەشت ساڵان بوو بە ناوی (ستان فۆرێنا) کە یەکێك بوو لەو باشترین وتاربێژانەی کە تا ئەو کاتە لەبارەیەوە بیستبووم. ئەو لە سروتێکدا وتی "ئەهریمەن ڕاستەقینە، پەیوەندیدار بە کتێبی پیرۆز و بڵاوە". "هەندێ کەس دەڵێن فەرامۆشی بکە، هەندێ دەڵێن بوونی نییە. بەڵام ئەهریمەن نابێ فەرامۆش بکرێ، بەڵکو دەبێ جڵەو بکرێ". دواتر وتەیەکی (ئیدمۆند بێرك)ی سەرکردەی سەدەی هەژدەهەمی هێنایەوە و وتی: "تاکە شتێك کە پێویستە بۆ سەرکەوتنی ئەهریمەن ئەوەیە کە پیاوان باش هیچ نەکەن".

ستان بڕوای وابوو کە وەڵام بۆ ئەهریمەن، ئازادییە. ئەو بەهەمان شێوە دەیزانی کە باجێك دەبێ. ئەو لە سروتێکدا وتی " قەت قەزیەیەکی پیرۆزی بەتاڵ لە قوربانیدان

نەبووە". "ئەگەر ئازادی تەنیا لەو حاڵەدا کە هیچ باجێکی بۆ ئێمە تێ نەچێت شایستەی داکۆکیکردن بێت، ئەوا ئێمە وەکو گەلێك بێ سنوور موحتاجین".

سەرباری ئەوەش، ستان کەسێکی گەشبین بوو و هیواگەراییەکەی رۆحیەتی بەرز کردەوە. ئەو وتی " کتێبە پیرۆزەکان بەهای گەورە دەدەن بە ئیمانداری، خۆگری و کۆنترۆلکردن". "ئێمە وارناهێنین. ئێمە هەمیشە بڕوامان وایە کە شتێك نییە بەناوی دۆخی بێ هیوایی".

من بەهەمان شێوە ئاسودەییم لە مێژوودا دۆزییەوە. لە مانگی ئۆگەستدا من کتێبی (لینکۆلن: ژیانی مەبەست و دەسەڵات)ی ریچارد کارۆردین-م خوێندەوە، کە یەکێك بوو لەو چواردە بایۆگرافییەی لینکۆلن کە لە ماوەی سەرۆکایەتییەکەمدا خوێندبوونمەوە. کتێبەکان ئەو دارمانەیان خستبووە بەر باس کە لینکۆلن هەستی پێکردبوو کاتێك ئەو تەلەگرامانەی خوێندبووەوە کە باسی شکستهێنانی ویلایەتە یەکگرتووەکانیان دەکرد لە شوێنانی وەکو (چانسیلۆرسیڤیل) کە تیایدا شانزە هەزار کەس بریندار ببوو یان کوژرابوون. قوربانییەکان تاکە کێشەی ئەو نەبوون. لینکۆلن دەبووایە لە فەرماندەیەکەوە بۆ لای فەرماندەیەکی تر بچێت تا یەکێکی دۆزیەوە کە شەڕ دەکات. ئەو بینەری مەرگی (ویلی)ی کوڕی بوو لە کۆشکی سپی و (ماری تۆد)ی هاوسەری لەبەرچاو بوو کە لەناو خەمۆکیدا نغرۆ بوو. لەگەڵ ئەوەشدا، لە سایەی ئیمانی بە خودا و باوەڕی قووڵی بەوەی کە ئەو جەنگی لەپێناو قەزیەیەکی دادپەروەرانەدا جاڕ دابوو، لینکۆلن خۆی گرت.

تایبەتمەندییەکی سەرکردایەتیی لینکۆلن ئەوە بوو کە پەیوەندیی بەسۆزی لەگەڵ سەربازانی ئاساییدا دەبەست. لە تاریکترین رۆژانی جەنگدا، ئەو چەندەها سەعاتی لە (ماڵی سەربازان) لەگەڵ بریندارانیدا بەسەر دەبرد لە واشنتن. هاوخەمی ئەو وانەیەکی بەهێزی گەیاند و بوو بە مۆدێلێك بۆ سەرۆکەکانی تری جەنگ بۆئەوەی پەیڕەوی بکەن.

یەکێك لە لایەنە هەرە بزوێنەرەکانی سەرۆکایەتیم، خوێندنەوەی نامەگەلێك بوو لە خێزانەکانی ئەندامانی کوژراوی سوپا. من سەدان نامەم پێدەگەیشت و لێشاوی تەواوی کاردانەوەکانیان توند دەکردەوە. زۆرێك لەو نامانە سۆزێکی هاوبەشیان دەردەبڕی:

کارەکە تەواو بکە. دایك و باوکێکی سەربازێکی کوژراو لە ویلایەتی جۆرجیا نوسیبوویان "گەورەترین دڵنێیشەی ئێمە ئەوەیە کە ببینین ئەرکی عیراق وازی لێدەهێنرێت". دایکێکی خەمبار لە ئەریزۆنا ئیمەیڵی کردبوو و نوسیبووی "پێویستە ئێمە ئەوە تەواو بکەین کە دەستمان پێکردووە پێش ئەوەی بکشێینەوە".

لە دیسەمبەری ٢٠٠٥دا، نامەیەك لە پیاوێك لە (پێنساکۆلا)ی فلۆریداوە پێگەیشت:

"بەڕێز سەرۆك بوش،

من ناوم (بود کلەی)یە. کوڕەکەم (دانێل کلەی) لە فیرقەی مارێنزی ئەمریکا هەفتەی رابردوو، ڕێکەوتی ١-١٢-٢٠٠٥ لە عیراق کوژرا. ئەو یەکێك بوو لەو دە مارینزەی کە بە قومبەلەی دەستکرد کوژران لە فەلوجە.

دان مەسیحی بوو- ئەو عیسای وەکو گەورە و ڕزگارکەر دەناسی- بۆیە ئێمە دەزانین لە کوێیە. لە دوایین نامەیدا نوسیبووی (ئەو دانەیەی کە پێم ماوە بۆ خێزانەکەم- بۆئەوەی لە حاڵەتی مردنمدا بخوێنرێتەوە) دەڵێت، ئەگەر تۆ ئەمە دەخوێنیتەوە، ئەمە بەو مانایەیە کە پێشبڕکێی من کۆتایی هاتووە. ئەو ئێستاله ماڵەوەیە- ماڵی ئەو و ماڵی راستەقینەی ئێمە.

من لەبارەی ئەوەوە بۆت دەنوسم کە چەندە شانازی دەکەین (دایك و باوکی و خێزانەکەی) بە تۆوە لە بەرانبەر تۆ و ئەوەی کە هەوڵ ئەدەی بیکەیت بۆ پارێزگاری لە هەموومان. ئەمە دووەم گەشتی دان بوو لە عیراقدا- ئەو دەیزانی و دەیوت بوونی لەوێ بۆ پارێزگاری لە ئێمەیە. زۆر کەس بەو شێوەیە ناڕوانن.

من دەمەوێ هانتان بدەم. من لە وتارەکانتدا قسەی وەکو "مانەوە لەسەر ڕەوگەکە" دەبیستم. دەشزانم کە زۆر کەس لەم (جەنگی دژە تیرۆر)ەدا لەدژی تۆن و ئەمەی کە تۆ دەبێ بێ تاقەت بوو بیت لە ململانێی کردنی ئەوەی کە دروستە. ئێمە و زۆرێك لەوانیتر بۆ تۆ نزا دەکەن بۆ بینینی ئەنجامەکەی- وەکو لینکۆڵن دەڵێ "لەوانەیە ئەمانە بەبێ ئاکام نەمردبێتن". تۆ بارێکی قورست لەسەر شانە- ئێمە نزات بۆ دەکەین.

خوا بتپارێزێ،

بود کلەی"

من بانگهێشتی بود و (سارا)ی خێزانی و ژنەکەی دانێل، (لیزا)م کرد بۆ وتاری ساڵانەم لە مانگی دواتردا. پێش وتارەکە، من خانەوادەی کلەی-م لە ئۆفیسی ئۆڤاڵ بینی. ئێمە باوەشمان کرد بەیەکدا و ئەوان جەختیان کردەوە لەوەی کە نزایان بۆ کردووم. من کارتێکراو بووم بەو توانایەیان. خودا کردارێکی بێ وێنەی ئەنجام دابوو بە گۆڕینی دڵەکانیان لە دۆخی خەفەتەوە بۆ سۆز و بەزەیی. ئیمانیان ئەوەندە روون و واقیعی بوو کە ئەوەی منی تۆکمە کرد. من ئومێدەوار بووم کە رۆحیەتی خانەوادەکە بەرز بکەمەوە، بەڵام ئەوان هی منیان بەرزکردەوە.

ئەمانە تاکە کەس نەبوون، رۆژێکی سەری ساڵی نوێی ٢٠٠٦، من و لۆرا سەفەرمان کرد بۆ سەنتەری پزیشکیی (بروک ئارمی) لە سان دیێگۆ. ئێمە سەردانی پەنجاودوو ئەندامی بریندارى سوپا و خێزانەکانیانمان کرد. لە ژوورێکدا، ئێمە چاومان کەوت بە عەریفی ستاف (کریستیان باگ)ی گاردی نیشتمانیی (ئۆرێگۆن) لەگەڵ ژنەکەی، (مێلیسا). کاتێک جێبەکەی بەر بۆمبێکی قەراغ رێگە کەوتبوو، کریستیان لە دەوریەیەکدا بوو لە عیراق. ئەو بۆ ماوەی چل و پێنج خولەک لەناو جێبەکەدا گیری خواردبوو و هەردوو قاچی لەدەستدا بوو.

کریستیان پێی وتم ئەو راکەرێك بووە و پلانی ئەوەی دانابوو کە رۆژێك لە رۆژان را بکاتەوە. وێناکردنی ئەمە قورس بوو. هیوادار بووم کە رۆحیەتی بەرز رابگرم. وتم "هەر کە ئامادە بوویتەوە، تەنیا پەیوەندی پێوە بکە". "منیش لەگەڵ تۆ رادەکەمەوە".

لە ٢٧ی حوزەیرانی ٢٠٠٦دت، من لە فریزی باشوور چاوم کەوت بە کریستیان. ئەو دوو قاچی دەسکردی دروستکراو لە فایبەری کاربۆنی هەبوون. ئێمە چەند خولێك بە دەوری ئەو رێڕەوەدا رامان کرد کە بیڵ کلینتن دروستی کردبوو. من سەرسام بووم بە توانا و رۆحیەتەکەی کریستیان. بە زەحمەت دەمتوانی وێنای ئەوە بکەم ئەمە هەمان ئەو پیاوەیە کە بەری شەش مانگ لەسەر قەرەوێڵەی نەخۆشخانە بەسترابووەوە. ئەو وەکو قوربانی نەیدەڕوانییە خۆی. ئەو شانازی بەوەوە دەکرد کە لە عیراق کردوویەتی و هیوادار بوو کە نموونەکەی ئیلهامبەخش بێت بۆ ئەوانیتر.

من ئەو هاوینە و ساڵانی دواتریش زۆر بیرم لە کریستیان کردەوە. وڵاتەکەمان بە سوپاس و پشتیوانی، قەرزاری بوو. من شتێکی زیاتر قەرزاری بووم: نەمدەتوانی لێگەڕێم عیراق شکست بێنێت.

***

لە ١٧ی ئۆگەستدا، من لەگەڵ تیمی ئاسایشی نیشتمانی لە ژووری روزفێلت لەگەڵ ژەنەراڵ کەیسی، ژەنەراڵ ئەبی زەید و باڵیۆز خەلیلزاد بە ڤیدیۆ سکرین کۆ بوومەوە. ئەنجامەکانی (ئۆپەراسیۆنی پێکەوە بەرەوپێشەوە) مژدەبەخش نەبوون. سەربازەکانمان تیرۆریستان و فیرقەکانی مەرگیان لە دەوروبەری بەغدا وەدەرنابوو. بەڵام هێزەکانی عیراق نەیاندەتووانی کۆنترۆڵ بەرقەرار بکەن. ئێمە دەمانتووانی پاکسازی بکەین، بەڵام نەماندەتووانی بپارێزین.

وتم "پێدەچێ بارودۆخەکە بەرەو خراپتر بچێ. دەمەوێ بتوانم بڵێم پلانێکم هەیە بۆ بەرپەرچدانەوە. ئەمریکا دەتوانێ سەرکەوتوو بێ؟ ئەگەر بەڵێ، چۆن؟ فەرماندەکانمان چۆن وەڵامی ئەمە دەدەنەوە؟"

ژەنەراڵ کەیسی پێی وتم ئێمە دەتوانین لە رێگەی گواستنەوەی خێراتری بەرپرسیارێتییەوە بۆ عیراقییەکان سەرکەوتوو بین. دۆن رەمسفێلد وتی "پێویستە ئێمە یارمەتییان بدەیت یارمەتی خۆیان بدەن". ئەمە شێوازێکی تری وتنی ئەوە بوو کە دەبێ ئێمە دەست لە کوشنی بایسیکلەکە هەڵگرین. دەمویست پەیامێك بگەیەنمە تیمەکە کە من جیاواز بیر دەکەمەوە. وتم "دەبێ سەرکەوتوو بین. ئەگەر ئەوان نەتوانن ئەوە بکەن، ئێمە دەیکەین. ئەگەر بایسکیلەکە ئەملاوئەولا بکات، ئەوا ئێمە دەستمان دەخەینەوە سەر کوشنەکە. دەبێ ئێمە دڵنیا بینەوە کە شکست ناهێنین".

سەرۆکی ستاف جۆش بۆلتن کە دەیزانی من بەرەو کوێ سەر دەنێم، نیشانەیەکی سەرسوڕمانی دانا. ئەو لە کۆتایی کۆبوونەوەکەدا وتی "ئەگەر بەرەو خراپتر بچێ، تیمەکە دەتوانێ پێشنیاری چ رێوشوێنێکی تری رادیکاڵ بکات؟"

من بەو قەناعەتەوە کۆبوونەوەکەم جێ هێشت کە ئێمە دەبێ خۆمان ئەو رێوشوێنانە گەڵاڵە بکەین. من مۆڵەتم بە ستیڤ هادلی دا کە ئەو چاوپێداخشاندنەوەیەی تیمی عیراقی

ئەنجومەنی ئاسایشی نیشتمانیی ئەنجامی داوە، بەرەسمی بکات. دەمویست تەحەدای هەر گریمانەیەك بکەن کە لە پشت ستراتیژییەکەمانەوە هەیە و بژارەی نوێ بەرهەم بێنن. من بە زوویی ئەوانم وەکو باندێك لە جەنگاوەری کەسیی خۆم بینین.

بەهاتنی پاییز، هێڵکارییەکانی ناو لێدوانەکانم تێکڕای نزیکەی هەزار هێرشیان لە هەفتەیەکدا پیشاندا. چەند حاڵەتێکم بینی کە تیایاندا توندڕەوانی تایەفی ئەشکەنجەی مەدەنییەکان دەدەن، نەخۆشەکانی ناو نەخۆشخانە دەرفێنن و لەماوەی نوێژی هەینیدا مزگەوتەکان دەتەقێننەوە. ژەنەراڵ کەیسی دووەم ئۆپەراسیۆنی گەورەی ئەنجام دابوو بۆ گەڕاندنەوەی ئاسایش بۆ بەغدا، ئەمجارەیان لەگەڵ هێزێکی عیراقیی زیاتردا بۆ رێکێفکردنی ناوچەکە. جارێکی تر شکستی هێنا.

بڕیارم دا کە گۆڕینی ستراتیژی پێویستە. بۆ ئەوەی ئەو گۆڕانکارییە جێگەی تەقدیری گەلی ئەمریکا بێت، دەبووایە گۆڕینی کارمەندانی لەگەڵدا بێت. دۆن رەمسفێڵد پێشنیاری ئەوەی کردبوو کە لەوانەیە من پێویستم بە دوو چاوی جیاواز هەبێت بۆ عیراق. ئەو راستی دەکرد. من بەهەمان شێوە پێویستم بە فەرماندەی نوێ هەبوون. هەردوو جۆرج کەیسی و جۆن ئەبی زەید گەشتی درێژکراوەیان بۆ وڵاتەکە ئەنجام دابوو و بەرنامەی ئەوەیان هەبوو بگەڕێنەوە وڵات. کاتی ئەوە هاتبوو چاوی نوێ لە پۆستەکانی ئەوانیشدا دابنرێن.

بە نزیکبوونەوەی هەڵبژاردنە میانەییەکانی ٢٠٠٦ن بەلاغەتی پەیوەندیدار بە عیراق گەرم بوو. سەرۆکی لیژنەی نیشتمانیی دیموکراتەکان (هەوارد دین) وتی "ئەو بیرۆکەیەی کە ئێمە جەنگی یعراق دەبەینەوە بەداخەوە تەواو ناڕاستە". کۆنگرێسمان (جۆن مورتا)ی پەنسلڤانیا کە یەکێك بوو لە یەکەمین دیموکراتە دیارەکان کە داوای کشانەوەی دەستبەجێی کرد وتی "ئێمە هۆکاری کێشەین". سیناتۆر جۆ بایدن، ئەندامی باڵای لیژنەی پەیوەندییەکانی دەرەوە پێشنیاری ئەوەی کرد عیراق دابەش بکرێ بۆ سێ کیانی جیا. کۆمارییەکانیش نیگەران بوون، هەروەکو میچ مکۆنێل بە داواکارییەکەی لە ئۆفیسی ئۆڤاڵ بۆ کەمکردنەوەی ژمارەی سەرباز، جەختی کردبووەوە.

من بڕیارمدا چاوەڕێ بم تاوەکو پاش هەڵبژاردنەکان بۆ ڕاگەیاندنی هەر بەرنامەیەك یان گۆڕینێکی کارمەندان. من نەمدەویست گەلی ئەمریکا یان سوپا وا بیر بکەنەوە کە من لەبەر هۆکاری سیاسی، بڕیاری پەیوەست بە ئاسایشی نیشتمانی دەدەم. کۆتا هەفتەی بەر لە هەڵبژاردنە میانەییەکان، من لە کراوفۆرد چاوم کەوت بە بۆب گەیتس و داوام لێکرد ببێتە وەزیری بەرگری. بۆب لە کۆمسیۆنی (بەیکەر-هاملیتن)دا کاری کردبوو کە گردبوونەوەیەکی پێکهێنراو بوو لەلایەن کۆنگرێسەوە بۆ تاووتوێ کردنی بارودۆخ لە عیراقدا. ئەو پێی وتم کە وەکو ڕاسپاردەیەکی کۆمسیۆنەکە، پشتیوانی لە زیادکردنی سەرباز کردووە. بە بۆبم وت کە فەرماندەیەکی نوێم لە عیراقدا پێویستە. ئەو چاوی بە کاندیدەکاندا دەخشاند و ئامۆژگاریی خۆی دەخستەڕوو. بەڵام پێم وت کە سەرنجێکی باش بداتە دەیڤد پێترایۆس.

پاش دوو سوڕی هەڵبژاردن کە تیایدا کۆمارییەکان ژمارەکەیان لە کۆنگرێس زیادی کرد، ئێمە لە ساڵی ٢٠٠٦دا زەبرێکی گەورەمان بەرکەوت. لە هەردوو ئەنجومەنەکەدا زۆرینەمان لەدەستدا. سەرۆکی نوێی ئەنجومەنی نوێنەران (نانسی پێلۆسی) ڕایگەیاند "گەلی ئەمریکا هاتە گۆ...پێویستە ئێمە دەست بکەین بە کشاندنەوەیەکی بەرپرسانەی سەربازەکانمان لە عیراق".

***

هەر کە چاوخشاندنەوەمان بە ستراتیژیی عیراقدا توند بوو، سەرنجمان خستە سەر سێ بژارەی سەرەکی. یەکەمیان داوای لێ دەکردین کە ستراتیژی هەنوکەیی مەشقپێکردنی هێزەکانی عیراق پەرەپێبدەین لەکاتێکدا کە ئەوەی خۆمان بکشێنینەوە. عیراقیەکان بەرپرسیارێتیی زیاتری مامەڵەکردنیان لەگەڵ توندوتیژی دەگرتەئەستۆ، لەکاتێکدا کە ئێمە سەرنجمان دەخستە سەر ئەرکە سنووردارترەکان، لەوانەش ڕاوکردنی قاعیدە.

بژارەی دووەم ئەوە بوو کە سەربازەکانمان لە بەغدا بکشێنینەوە تا ئەو کاتەی کە توندوتیژی تایەفی پەکی دەکەوێ. لە مانگی ئۆکتۆبەردا، کۆندی سەفەری کردبوو بۆ عیراق و لەلایەن مالیکی و ئەوانیترەوە ڕەوێنرابووەوە. کۆندی دەیگوت ئەگەر ئەوان

مکوڕ بن لەسەر شەڕی تایبەت، بۆچی دەبێ سەربازەکانمان لە ناوەڕاستی شەڕی خوێناوییاندا بەجێ بهێڵین؟

بژاردەی سێیەم ئەوە بوو کە سەربازەکان دووقات زیاد بکەین. ئێمە دەیان هەزار سەربازی زیاترمان دەنارد بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی هەڵمەتی بەرفراوانی دژەیاخیگەری لە بەغدا. لەبری کشانەوە لە شارەکان، سەربازەکانمان دەچوونە ناوەوە، لەناو خەڵکدا دەژیان و دانیشتووانی مەدەنییان دەپاراست.

پرسیارە بنەڕەتییەکە ئەوە بوو ئاخۆ عیراقییەکان ئیرادەی سەرکەوتنیان هەیە. بڕوام وابوو کە زۆربەی عیراقییەکان پشتگیری لە دیموکراسی دەکەن. قەناعەتم وابوو کە دایکانی عیراق، وەکو هەموو دایکانی تر، دەیانویست منداڵەکانیان بە هیواوە بۆ ئایندە گەشە بکەن. من چاوم کەوتبوو بە خوێندکارانی نێردراو بۆ دەرەوە، دکتۆرەکان، چالاکوانانی ژن و ڕۆژنامەنووسان کە سوور بوون لەسەر ژیان لە ئازادی و ئاشتیدا. ساڵێک پاش ئازادکردنی عیراق، چاوم بە گرووپێک لە خاوەن بزنسی بچوک کەوت کە لە سەردەمی سەدامدا کاڵای وەکو سەعات و فەرشیان بەرهەم دەهێنا. بۆ کڕینی کەرەستەکان، ئەوان دیناری عیراقییان بە دراوی بیانی گۆڕیبووەوە. کاتێک بەهای دینار دابەزیبوو، سەدام بەدوای تۆمەت داتاشینەوە بوو و فرمانی کردبوو دەستی ڕاستی پیاوەکان ببڕدرێتەوە. بەرهەمهێنەری فیلمی دۆکیومێنتاری (دۆن نۆرس) و ڕۆژنامەوانی تەلەفزیۆنی هوستن (مارڤین زیندلەر) گوێبیستی بەسەرهاتەکە ببوون و عیراقییەکانیان هێنابوو بۆ تەکساس کە لەوێ هەریەکەیان دەستی دەستکردی لەلایەن (دکتۆر جۆ ئاگریس) بە خۆڕایی بۆ دروستکرابوو.

کاتێک عیراقییەکان گەیشتنە نوفیسی ئۆڤاڵ، هێشتا لە فێربوونی ئەوەدابوون کە چۆن دەستی ڕاستیان بەکار بێنن. هەموویان سوپاسگوزاری گەلی ئەمریکا بوون لە بەرانبەر ئازادکردنیان لە زۆرداریی سەدام. هەمووشیان ئومێدی بە وڵاتەکەیان هەبوو. عیراقییەک قەڵەمێکی بە دەستە یەک مانگەکەی دەستدایە و بە ماندووبوونەوە چەند وشەیەکی عەرەبی لەسەر پارچە کاغەزێک نوسی: "نزایەک بۆئەوەی خودا بەرەکەت بداتە ئەمریکا".

من سەرسام بووم بەو جیاوازییەی نێوان رژێمێکی دڵرەق کە دەستی پیاوانی دەبڕییەوە و کۆمەڵگەیەك کە ئەوەندە بەسۆز بوو کە یارمەتیدەر دەبوو بۆ گەڕاندنەوەی شکۆمەندییەکەی. بڕوام وابوو ئەو پیاوەی عیراقییەی کە ئەو وشانەی نوسی، لەبری ملیۆنان هاوڵاتیی هۆی دەدوا. ئەوان سوپاسگوزاری ئەمریکا بوون لەبەرانبەر ئازادکردنیان. ئەوان دەیانویست لە ئازادیدا بژین و منیش دەستبەرداریان نەدەبووم.

***

لە دواواکانی ئۆکتۆبەردا، من ستیڤ هادلیم نارد بۆ کۆبوونەوەیەکی تایبەت لەگەڵ سەرۆك وەزیران نوری مالیکی لە بەغدا. هەڵسەنگاندنەکەی ستیڤ ئەوەبوو کە مالیکی "یا ئەوەتا بێ ئاگایە لەوەی کە روودەدات، نیازەکانی دەرناخات یان تواناکانی ئەوەندە نین کە نیازە باشەکانی بکاتە کردار". پێش ئەوەی بڕیارێك بەرەو پێشەوە بدەم، پێویستم بەوە بوو کە دیاری بکەم کام لەوانە راستە.

لە ٢٩ی نۆڤەمبەری ٢٠٠٦دا، بۆ بینینی مالیکی لە عەممانی ئوردن کەوتمەڕێ. سەرکردایەتییەکەی سەرۆك وەزیرانی عیراق چەند جارێك ئێمەی بێزار کردووە. ئەو هەمیشە سەربازی عیراقی دانەدەبەزاند کە وای دەوت. هەندێ لە کەسانی ناو حکومەتەکەی پەیوەندیی گوماناوییان بە ئێرانەوە هەبوو. ئەو کاری پێویستی نەکردبوو بۆ سۆراخکردنی توندڕەوانی شیعە. ژنەراڵ کەیسی کە تورە ببوو حەقی بوو لە بەرانبەر ئەوەی کە کاربەدەستانی تایەفەگەرای نزیك مالیکی سەربازانی ئێمەیان کۆت کردبوو لەوەی کە بچنە ناوچە شیعەنشینەکان.

لەگەڵ ئەوەشدا، بە درێژایی شەش مانگ لە دەسەڵاتدا، مالیکی وەکو سەرکردە پێگەیشتبوو. ئەو بەرگەی هەڕەشەی کوشتن، ئەگەری کودەتا و چەندەها وەفدی کۆنگرێسی هاتوو بۆ عیراق بۆ سەرزەنشتکردنی، گرتبوو. چەند رۆژێك بەر لە لوتکەی بەرنامە بۆدانراوی نێوانمان، سەرکردەی رادیکاڵی شیعە، موقتەدا سەدر هەڕەشەی ئەوەی کردبوو کە پشتیوانانی لە حکومەت بکشێنێتەوە ئەگەر سەرۆك وەزیران لەگەڵمدا کۆ بێتەوە. هەرچۆنێك بێت مالیکی هەر هات.

ئەو لەکاتێکدا کە دۆکیومێنتێکی بە مۆری تازەی حکومەتی عێراقییەوە خستە بەردەستم، بە شانازییەوە وتی "ئەمە پلانەکەی منە". لەناو نامەکەدا، پرۆپۆزەڵێکی برێومێند هەبوو بۆ زامنکردنەوەی بەغدا لە ڕێگەی هێزەکانی عێراقەوە. دەمزانی کە پۆلیس و سوپاکەی ئامادەیی ئەوەیان تیا نییە کە بەرپرسیارێتییەکی وەها بگرنە ئەستۆ. ئەوەی کە گرنگ بوو ئەوە بوو کە مالیکی بە کێشەی توندوتیژیی تایەفی دەزانی و ئامادەیی پیشان دەدا بۆ سەرکردایەتیکردن.

پرسیارم کرد "ئەمریکییەکان دەیانەوێ بزانن ئاخۆ پلانەکەت ڕێگەمان پێ دەدات تا سۆراخی بکوژانی سوننە و شیعە بکەین".

لە وەڵامدا وتی "ئێمە جیاکاریی ئەتنی ناکەین".

داوام کرد کە بە تەنیا لەگەڵ سەرۆک وەزیراندا بدوێم. پێدەچوو مالیکی ئامادە بێت بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی توندوتیژی. من بڕیارمدا  بە زیادکردنی ئاسۆی زیادکردنی سەرباز، پابەندییەکەی تاقی بکەمەوە.

وتم "گووشاری سیاسی بۆ وازهێنان لە عێراق گەورەیە. بەڵام من ئامادەم ئەگەر تۆ بەرەنگاری ئەو گووشارە ببیەوە ئەگەر تۆ بڕیارە سەختەکان بدەیت". هەروا بەردەوام بووم لە قسەکانم "من ئامادەم دەیان هەزار سەربازی زیادە ڕەوانە بکەم بۆ یارمەتیدانت تا بەغدا بگریتەوە. بەڵام پێویستە تۆ چەند گەرەنتییەکی دیاریکراوم بدەیتێ".

چوومە سەر لیستەکە : دەبووایە ئەو هێزی عێراقیی زیاتر بخاتەکار و دەبووایە دەرکەون. دەکرا هیچ دەستوەردانێکی سیاسی نەبێ لە ئۆپەراسیۆنە سەربازییە هاوبەشەکانماندا– چیتر ڕێگەمان لێ نەگیردرێ بچنە ناوچە شیعەنشینەکان. دەبووایە ئەو ڕووبەڕووی میلیشیا شیعەکان بێتەوە، لەوانەش سوپای سەدر. کە ئاسایشیش باش دەبوو، دەبووایە ئەو بەرەوپێشچوون لە ئاشتەوایی سیاسیی نێوان شیعە، سوننە و کورد ئەنجام بدات.

لە هەر حاڵێکدا، مالیکی پەیمانی پێدام کە پەیڕەوی دەکات. لە گەشتی بەرەو ماڵەوەدا لە ئوردنەوە، بیرم لە بژارەکان کردەوە بۆ ستراتیژییەکی نوێ. خێراکردنی سپاردنی دەسەڵات بە عێراقییەکان ڕێگەچارەیەکی کرداری نەبوو. ئەمە زیاتر وەکو

ستراتیژییە هەنوکەییەکە بوو، کە شکستی دەهێنا. پێم وایە کرداری نەبوو لە شارەکان بکشێینەوە و واز لە توندوتیژی بهێنین تا پەکی بکەوێت. نەمدەتوانی داوا لە سەربازەکانمان بکەم بکشێنەدواوە و تەماشای کوشتنی عێراقییە بێ گوناهەکان بکەن لەلایەن توندڕەوانەوە. ترسی ئەوەم هەبوو کە عێراق ئەوەندە بە خراپی تێک بشکێت کە چاککردنەوەی ئەستەم بێ.

بڕارەی زیادکردنی سەرباز مەترسی تایبەت بەخۆی لەگەڵ خۆیدا هێنا. زیادکردنی ژمارەی سەرباز لەناوخۆی ئەمریکادا بەتەواوی نەخوازراو بوو. شەڕەکە قورس دەبوو و قوربانییەکان زۆر دەبوون. ئەگەر مالیکی وێڵی بکردینایە، ئەوا لەوانەبوو ئێمە نەمانتوانیایە توندوتیژی بنەبڕ بکەین.

پاش بینینی مالیکی، بڕوام وابوو کە ئێمە دەتوانین متمانە بە پشتیوانییەکەی بکەین. زیادکردنی سەرباز باشترین دەرفەتی ئێمە، لەوانەشە دوایین دەرفەتی ئێمە بوو‌بێت بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانمان لە عێراقدا.

***

بەدرێژایی چەند هەفتەیەکی مشتومڕی توند لە هەردوو مانگی نۆڤەمبەر و دیسەمبەردا، زۆربەی تیمی ئاسایشی نیشتمانی کەوتنە پشتیوانیکردنی زیادکردنەکە. دیک چینی، بۆب گەیتس، جۆش بۆلتن و ستیف هادلی و جەنگاوەرەکانی ئەنجومەنی ئاسایشی نیشتمانی لە پشت شێوازە تازەکەوە بوون. کۆندیش دەبووە پشتیوان چونکە زیادکردنی سەرباز لەژێر ستراتیژییە کۆنەکەدا نەدەبوو.

گرنگ بوو کە لەسەر بڕیارێکی وەها مشتومڕئامێز و گرنگ یەکگرتوویی هەبێ. کۆنگرێس و ڕاگەیاندنەکان سۆراخی هەر درزێکیان دەکرد لەناو ئیدارەکەدا. ئەگەر بیاندۆزیایەتەوە ئەوا دەیانقۆستەوە بۆ پاساودانی دژایەتییان و بلۆککردنی پلانەکە. بۆ گەیشتن بەو کۆدەنگییە، گروپێکی تریش پێویست بوو کە بێتەپاڵ، ئەویش هەیئەی ئەرکان بوو.

هەیئەی ئەرکانی هاوبەش کە بە یاسای ١٩٤٧ی ئاسایشی نیشتمانی دامەزرێنرابوو، پێکهاتبوو لە سەرگەورەی هەریەکە لە لقەکان لەگەڵ سەرۆک و جێگر سەرۆک. روکنەکان

بەشێك نین لە هەیکەلی فەرماندەیی، بۆیە بەرپرسیارێتیی راستەوخۆیان نییە لە ئۆپەراسیۆنە سەربازییەکان. لایەنێکی سەرەکیی رۆڵیان بریتییە لە پشتگیریی تەندروستی و بەهێزیی هێزە چەکدارەکان. بەپێی یاسا، سەرۆکی هەیئەی ئەرکان، راوێژکاریی بنەڕەتیی سەرۆکی وڵاتە.

سەرۆکی هەیئەی ئەرکانی هاوبەش لە ۲۰۰٦دا ژەنەراڵ پیت پەیس بوو، پیست یەکەم مارینز بوو کە وەکو سەرۆك خزمەت بکات و یەکێك بوو لە ئەفسەرە هەرە گەورەکانی جیلەکەی. وەکو ملازمێکی گەنج لە ڤێتنام، پیت ڕێبەرایەتیی فەسیلەیەکی دەکرد کە بەرگەی شەڕی قورسی گرتبوو. لە پاشماوەی ژیانیدا، وێنەی ئەو مارینزانەی هەڵگرتبوو کە لەژێر فەرماندەییەکەیدا گیانیان لەدەستدابوو. کاتێك ئۆفیسی سەرۆکایەتی هەیئەی گرتەدەست، ئەو لە دەرفەتێکدا ناوەکانی پێ وتم. ئەو هەرگیز ناوی ئەوان و باجی جەنگی بیر نەچووەوە.

پیت ستراتیژییەکی خستبووەگەڕ بۆ چاوخشاندنەوە بە هەیئەی ئەرکاندا و من داوام لە ستیڤ هادلی کرد تا دڵنیا بێتەوە لەوەی کە چەمکی زیادکردنی سەرباز لە مشتومڕەکانیاندا شوێنی خۆی هەیە. بڕیارمدا بچم روکنەکان لە پێنتاگۆن ببینم بۆ گوێگرتن لە بیروڕا کەسییەکانیان.

دوو رۆژ بەر لە کۆبوونەوەکە، پیت هاتە ئۆفیسی ئۆڤاڵ. ئەو پێی وتم کە من گوێبیستی هەندێ نیگەرانیی ئەوان دەبم، بەڵام ئامادەن بۆ پشتیوانیی پرۆسەی زیادکردنەکە. پیت بەهەمان شێوە مەزەندەیەکی دایە ستیڤ لەبارەی ئەمەی کە لەوانەیە چەند سەرباز پێویست بێت بۆ دروستکردنی جیاوازی: پێنج لیوا، بیست هەزار ئەمریکی.

لە ۱۳ی دیسەمبەری ۲۰۰٦دا، چوومە ناو (تانك) ژووری کۆنفرانسی سەلامەتی سەرۆکی هەیئە لە پێنتاگۆن. چوون بۆ شوێنەکەیان شێوازێکی پیشاندانی ڕێزم بوو بۆیان. من بەوە دەستم پێکرد کە بڵێم من بۆ ئەوە لێرەم تا گوێبیستی بیروبۆچوونیان ببم و داوای ئامۆژگارییان لێبکەم.

من بە دەوری مێزەکەدا چوومە لای هەر یەکەیان. روکنەکان نیگەرانیی خۆیانیان دەربڕی. ئەوان نیگەرانیی ئاستی پابەندیی مالیکی بوون. ئەوان پێیانوابوو کە پێویستە

ئاژانسەکانی تری حکومەت زیاتر بەشداربن لە عیراقدا. ئەوان پرسیاری ئەوەیان کرد ئاخۆ پێویستییەکانی زیادکردنی سەرباز دەستەوسانمان ناکات لەبەرانبەر ئەگەرەکانی تردا بۆ نموونە ئەنگازەیەك لە نیمچەدوورگەی کۆریا.

نیگەرانیی هەرە گەورەیان ئەوە بوو ئاخۆ زیادکردنی سەرباز "سوپا دەشکێنێت" لە رێگەی فشاری زۆر خستنەسەر ئەندامانی سوپا و خێزانەکانیان. زۆرێك لە سەربازەکانمان لە عیراق لە گەشتی دووەم و سێیەمدا بوون لە وڵاتەکەدا. بۆئەوەی زیادکردنی سەرباز شیاو بکەین، دەبووایە هەندێ لە گەشتەکان لە ١٢وە بۆ پانزە مانگ درێژ بکەینەوە. لەوانەبوو کاریگەری لەسەر بەسەربازیکردن، مەعنەویات، مەشق، ئامادەیی و خێزانەکانی سەربازان قووڵ بێت.

سەرۆکی ستاف سوپا پیت شومەیکەر و فەرماندەی مارینز جەیمز کۆنوەی پێشنیاری زیادکردنێکی کە قەبارەی دەزگاکانیاندا. ئەوان بروایان وابوو کە فراوانکردن فشاری سەر هێزەکانمان هێور دەکاتەوە و یارمەتیدەر دەبێ بۆ زامنکردنی ئەمەی کە ئێمە ئامادەین بۆ ململانێی ئەگەری لە شوێنانی تری جیهاندا. من کەیفم بەو بیرۆکەیە هات و بەڵێنمدا لەبەرچاوی بگرم.

لە کۆتایی کۆبوونەوەکەدا، من بیرکردنەوەکەم پوخت کردەوە "من هاوبەشی ئەو نیگەرانییەی ئێوەم لەبارەی شکانی سوپا. دڵنیاترین رێگە بۆ شکانی سوپا ئەوەیە عیراق بدۆڕێنین".

***

پلانی سەرەتاییم ئەوەیە کە هەفتەیەك یان دوو هەفتە پێش کریسمەس ستراتیژیی نوێی عیراق رابگەیەنم. بەڵام بەروارەکە نزیك دەکەوتەوە، من گەیشتمە ئەو ئەنجامەی کە ئێمە پێویستمان بە کاتی زیاتر هەیە. داوام لە بۆب کرد سەردانی عیراق بکات کە لە ١٨ی دیسەمبەردا وەکو وەزیری بەرگری سوێندی خواردبوو.

دوو رۆژ بەر لە کریسمەس، بۆب لە کامپ دەیڤد هاتە لام. وتی سەردانی مالیکی کردووە و پلانەکەی بۆ زیادکردنی سەربازی عیراقی بڕار کردووە بۆئەوەی لەگەڵ ئەوەی ئێمەدا بگونجێ. مالیکی یاسای شەڕی رادەگەیاند، سێ لیوای تری لە بەغدا دادەبەزاند،

پارێزگارێکی سەربازیی دادەنا و دوو فەرماندەی بە دەسەڵاتی کراوەوە دەست نیشان دەکرد کە بەدوای توندڕەوانی هەر باکگراوندی تایەفی بکەون. بۆب بەهەمان شێوە بڕیاری لەسەر راسپاردەکەی دابوو بۆ فەرماندەیەکی نوێ. ئەو فەرماندەیەش ژەنەراڵ دەیڤد پێترایۆس بوو. ئێمە کۆک بووین لەسەر پاڵاوتنی ژەنەراڵ کەیسی بۆ پلەبەرزکردنەوەی بۆ سەرۆکی ستاف سوپا. جۆرج تۆمارێکی درێژ و جیاوازی هەبوو و ئەزموونەکەی سوودی بە سوپا دەگەیاند. من بەهەمان شێوە دەمویست روونی بکەمەوە کە لۆمەی ئەو ناکەم لە بەرانبەر کێشەکان لە عیراقدا.

دوایین پرس بۆ بڕیاردان بریتی بوو لە قەبارەی زیادکردنەکە. هەندێ کەسی ناو سوپا پێشنیاری ئەوەیان کرد کە ئێمە لە سەرەتادا پابەند بین بە دوو لیوای زیادەوە- نیمچە زیادکردنێکی نزیکەی دە هەزار سەرباز- بە شیمانەی ناردنی زیاتر لە سێ لیوای تر لە دواییدا. پیت پەیس راپۆرتی ئەوەیدا کە ژەنەراڵ دەیڤد پترایۆس و ژنەراڵ رەی ئۆدێرنۆ، فەرماندەی ژمارە دوو لە عیراق، هەر پێنج لیواکەیان راستەوخۆ دەوێت.

ئەگەر فەرماندەکانی سەر ئەرزمان هێزی تەواویان بوێ، ئەوا پێیان دەدرێت. بڕیارمدا پێنج لیوا بۆ بەغدا بنێرم لەگەڵ دوو بەتالیۆنی زیادەی مارینز بۆ پارێزگای ئەنبار. ئێمە سەربازەکانمان لەناو هێزە دروستبووەکانی عیراقدا جێگیر دەکرد بۆ ئەوەی بتوانین رێنمایی عیراقییەکان بکەین لە شەڕگەکاندا و ئامادەیان بکەین تا پاش زیادکردنی سەرباز بەرپرسیارێتیی زیاتر بگرنە ئەستۆ. دواجار من سێ راسپاردەی ئەرکانی هاوبەشم قبوڵ کرد. کۆندی سەرکردایەتیی زیادکردنی سەرچاوە مەدەنییەکانی دەکرد. من گەرەنتیی گشتیم لە سەرۆک وەزیران مالیکی بەدەست دەهێنا لەبارەی ئازادیی سەربازەکانمان بۆ جموجۆڵ. منیش داوام لە کۆنگرێس دەکرد تا قەبارەی سوپا و مارینز زیاد بکات بۆ نەوەد هەزار هێز.

لە ٤ی کانوونی دووەمی ٢٠٠٧دا، من ڤیدیۆ کۆنفرانسێکی نهێنیم لەگەڵ مالیکی ئەنجامدا. وتم "خەڵکێکی زۆر لێرە پێیان وایە ئێمە ناتوانین سەرکەوتوو بین. بەڵام من بە پێچەوانەوە. ئەگەر تۆ لێی بێیتە دەرەوە، منیش دێمە دەرەوە". دوو رۆژ دواتر، ئەو موخاتەبەی گەلی عیراقی کرد و ئاماژەی بە پابەندی خۆی کرد بە زیادکردنەکە. وتی

"پلانی ئاسایشی بەغدا پەناگەیەکی ئارام بۆ هیچ لەیاسادەرچوویەک دابین ناکات، بەبێ لەبەرچاوگرتنی لایەنگیریی تایەفی".

بڕیارەکە سەخت بوو، بەڵام من ئاسودەبووم بەوەی کە دەستبەجێ دابووم. من زانیاری و بیروڕام لە خەڵکی ناوەوە و دەرەوەی ئیدارەکە کۆ کردبووەوە. من تەحەدای گریمانەگەلێکم کردبوو و بە وریاییەوە هەموو بژارەکانم هەڵسەنگاندبوو. دەمزانی کە لە کورت مەودادا زیادکردنی سەرباز نەخوازراو دەبێت. بەڵام لەکاتێکدا کە زۆر کەس لە واشنتن دەستبەرداری ئاسۆی سەرکەوتن ببوون لە عیراقدا، من وا نەبووم.

لە سەعات نۆی ئێوارەی ١٠ کانوونی دووەمی ٢٠٠٧دا، لە ژووری کتێبخانەی کۆشکی سپی چوومە بەردەم کامێراکان. وتم "دۆخی عیراق بەلای گەلی ئەمریکاوە مایەی قبوڵ نییە– و بەلای منیشەوە هەروا. سەربازەکانمان لە عیراق ئازایانە شەڕیان کردووە. ئەوان هەر شتێکیان کردووە کە داوامان لێکردوون بیکەن. لە هەر شوێنێک نادروستییەک دروست بووبێت، بەرپرسیارێتییەکەی لە ملی منە".

"روونە کە ئێمە پێویستمان بە گۆڕینی ستراتیژییەکەیە لە عیراقدا...بۆیە من زیاتر لە بیست هەزار سەربازی ترم پابەند کردووە بە ناردنیان بۆ ئەوێ. زۆرینەی هەرە زۆریان– پێنج لیوا– دەنێردرێنە بەغدا".

***

کاردانەوەکە نەرم و یەکلایەنە بوو. سیناتۆرێک وتی "بڕوام وانییە کە فراوانکردنێکی بیست هەزار سەربازی لە عیراقدا کێشەکان چارەسەر بکات". یەکێکی تریان وتی "بڕوام وانییە کە وەڵامەکە ناردنی سەربازی زیاتر بۆ عیراق بێت". سێیەمیان وتی "ترسناکترین هەڵەی بەرنامەی دەرەوەیە لەم وڵاتەدا لە سەروەختی ڤێتنامەوە". ئەوانەش هەر کۆمارییەکان بوون. چەپەکان تەنانەت دەنگیان بەرزتریش بوو. سیناتۆرێکی تازەکار پێشبینی ئەوەی کرد کە زیادکردنی سەرباز "توندوتیژی تایەفی لەوێ ناوەستێنێت بەڵکو پێچەوانەکەی دێنێتە کایەوە". ستوونووسێکی واشنتن پۆستیش زیادکردنەکەی بە "زیادکردنێ:ی خەیاڵپڵاوانەی جەنگ لەعیراق، کە تەنیا دەکرێ لە جیهانێکی ناواقیعی بەدی بکرێ کە تیایدا بەرازەکان دەفڕن و ماسییەکان بە بایسکیل دەچنە سەر کار".

رۆژی پاش ئەوەی کە زیادکردنەکەم راگەیاند، کۆندی، بۆب گەیتس و پیست پەیس لە بینایەی کۆنگریس گەواهییاندا. پرسیارکردنەکە لە هەردوو بەرەکەوە دڵڕەقانە بوو. کۆنگرێسمانێکی دیموکراتی بە ژەنەراڵ پەیسی وت "ئەمە دەبەنگانەترین و شێتانەترین پلانێکە کە من تاوەکو ئێستا بینیبێتم یا بیستبێتم لە ژیانمدا". سیناتۆرێکی کۆماری بە کۆندی وت "من لەمەدا لەگەڵ سەرۆکدا رۆیشتم، کەچی خۆم لە خەونێکی خۆیدا دۆزییەوە". دواتر کۆندی هاتە ئۆفیسی ئۆڤاڵ بۆئەوەی من ببینێت. وتی "جەنابی سەرۆك ساغکردنەوەی ئەم بابەتەمان زۆر قورس کەوتووەتەوە".

لە نێوەندی گومانگەراییەکی جیهانیدا، چەند رۆحێکی ئازا بەرگرییان لە زیادکردنی سەرباز کرد. لە هەمووشیان دیارتر سیناتۆر جۆ لیبەرمانی (کۆنێکتیکەت)ی لەمێژینە دیموکرات بوو کە بەهۆی پشتیوانییەکەی لە جەنگ لەلایەن حزبەکەیەوە دەرکرابوو، سیناتۆر (لیندسی گراهام)ی کارۆلاینای باشوور کە ئەندامێکی (یەدەکی هێزی ئاسمانی) بوو و سیناتۆر جۆن مککەینی (ئەریزۆنا).

من و مککەین پەیوەندییەکی ئاڵۆزمان هەبوو. ئێمە لە ساڵی ٢٠٠٠دا لەدژی یەکتر هەڵمەتمان سازدابوو و لە هەندێ پرسی وەکو کەمکردنەوەی باج و ریفۆرمی چاودێریی دەرمانی و لێکۆڵینەوە لە تیرۆریستان ناکۆك بووین. لەگەڵ ئەوەشدا لە ساڵی ٢٠٠٤ هەڵمەتێکی سەختی بۆ پشتیوانی من سازدابوو و دەمزانی پلانی ئەوەی هەیە کە لە ساڵی ٢٠٠٨دا خۆی بۆ سەرۆکایەتی بپاڵێوێت. زیادکردنی سەرباز دەرفەتێکی بەودا تا دوورایيەك لەنێوانماندا دروست بکات، بەڵام نەیقۆستەوە. ئەو لایەنگرێکی لەمێژینەی سەربازی زیاتر بوو بۆ عێراق و لەناخەوە پشتیوانیی ستراتیژیی نوێی کردبوو. ئەو وتی "من ناتوانم گەرەنتی سەرکەوتن بدەم. بەڵام دەتوانم گەرەنتی شکست بدەم ئەگەر ستراتیژییە نوێیەکە پەیڕەو نەکەین".

لایەنگیری هەرە رەزامەندی زیادکردنی سەرباز، ژەنەراڵ پێترایۆس بوو. وەکو نووسەری پەیڕەونامەی (دژەیاخیگەریتیی سوپا)، ئەو دەسەڵاتێکی نکوڵی نەکراو بوو لەو ستراتیژییەدا کە رێبەرایەتی دەکرد.

فیکر، لێهاتوویی و ئەخلاقی کاری ئەو ناسراو بوو. لە یەکێک لە سەردانەکانیدا بۆ نیشتمان، بانگهێشتی ژەنەراڵم کرد بۆ بایسکلسوارییەك لە (فۆت بێلڤوار)ی ڤیرجینیا. ئەو زیاتر راکەرێك بوو، بەڵام ئەو بایی ئەوەندە بروای بەخۆی بوو کە تەحەدییە قبوڵ بکات. ئەو شانبەشانی گروپی بایسکلسوارە بەئەزموونەکانی سەرۆکایەتی خۆی گرت.

پاش رنگەبڕینەکە، من چوومەناو بینایەیەکی (فۆرت بێلڤوار) بۆ وەرگرتنی پەیوەندییەکی تەلەفۆنی لەلایەن سەرۆك وەزیرانی ژاپۆن. لە پشتەوە گوێم لە ژاوەژاوێك بوو، خۆم کرد بە دەرگاکەدا و بینیم پێترایۆس بەناو زنجیرەیەك ترۆپك و نشێویدا پێشڕەویی گروپەکە دەکات.

دەرکەوتنی پێترایۆس جۆرە کینەیەکی دروستکردبوو. من دەنگۆم لە کۆمەڵێك خەڵکەوە بیستبووەوە هۆشداری ئەوەیان دەدا کە خۆپەرستییەکی لەرادەبەدەری هەیە. لە ساڵی ٢٠٠٤دا، کاتێك پێترایۆس سەرکردایەتیی هەوڵێکی دەکرد بۆ مەشقپێکردنی هێزەکانی ئاسایشی عێراق، بەرگی گۆڤاری نیوزویك وێنەیەکی نزیکی پێترایۆسی گرتبووەخۆ کە لەسەرەوە نوسرابوو "ئەم پیاوە دەتوانێ عێراق رزگار بکات؟" کاتێك بابەتەکەم لەگەڵیدا باس کرد، پێکەنین گرتی و وتی "هاوپۆلەکانی لە وێست پۆینت هەرگیز نایەڵن ئەمەیان بیر ببەمەوە". من ستایشی ئەو تێبینییە خۆنەویستانەیەم کرد. ئەمەش مجامەلەیەکی باش بوو بۆ هاندانی.

دانیشتنی گوێبیستبوون لە پێترایۆس کەوتە دواداوکانی مانگی کانوونی دووەم. وتی "پێم وایە لەم ساتەدا لە بەغدا، دانیشتووان تەنیا دەیانەوێ سەلامەت بن". کاتێکیش جۆن مککەین پێداگری کرد لەوەی ئاخۆ دەکرێ ئەرکەکە بەبێ زیادکردنی سەرباز سەرکەوتوو بێت ، پێترایۆس وتی "نەخێر گەورەم". ئەنجومەنی پیران ئەوی بە رێژەی ٨١ بە سفر پەسەند کرد.

ژەنەراڵم بانگ کرد بۆ ئۆفیسی ئۆڤاڵ بۆنەوەی لە بەرانبەر ئەو دەنگەدا پیرۆزبایی لێبکەم. دیك چێنی، بۆب گەیتس، پیت پەیس و ئەندامانی تری تیمی ئاسایشی نیشتمانی لەوێ بوون بۆئەوەی هیوای سەرکەوتنی بۆ بخوازن. وتم "دەمەوێ لەگەڵ فەرماندەکەم ساتێك بەتەنیا بم".

لەکاتێکدا کە تیمەکە دوورکەوتنەوە، من ژەنەراڵ پێترایۆسم دڵنیا کردەوە کە من بڕوام پێیەتی و دەتوانێ هەرکاتێ بیەوێ قسەم لەگەڵ بکات. لە کۆتایی کۆبوونەوەکەدا وتم "هەروایە. ئێمە سەربازەکات دووقات دەکەین".

کاتێک لە دەرگاکە چووە دەرەوە، وتی "جەنابی سەرۆک، ئەمە زیاتر وەکو گشتگیرێک وایە".

***

لە ١٠ ی شوباتی ٢٠٠٧دا، دەیڤد پێترایۆس فەرماندەیی بەغدی گرتە دەست. ئەرکی ئەو هێندەی هەر ئەرکێك کە لەماوەی چەند دەیەیەکدا فەرماندەی ئەمریکی تر رووبەڕووی ببوونەوە ماندووکەر بوو. هەروەکو لە یەکەم رۆژدا بە سەربازەکانی وت "دۆخی عیراق بێ رادە پڕکێشەیە، مەترسییەکان گەورەن، رێگای بەرەو پێشەوە قورس دەبێ و بێگومان رۆژانێکی سەخت لەبەردەمماندا دەبن". هەروەها وتی "لەگەڵ ئەوەشدا، سەخت بێ ئومێدکەر نییە. ئەم ئەرکانە شیاوی بەدەستهێنانن، ئەم ئەرکەش شیاوی ئەنجامدانە".

لەکاتێکدا کە سەربازە زیادکراوەکانمان رژانە عیراقەوە، ژەنەراڵ پێترایۆس و ئۆدێرنۆ هێزەکانیان لە پەراوێزی بەغدا بەرەو مەخفەرەکانی ناو شار گواستەوە. سەربازەکانمان شانبەشانی هێزەکانی ئاسایشی عیراق جموجۆڵیان دەکرد و بەپێ دەوریەیان ئەنجام دەدا، لەبری ئەوەی کە بە زرێپۆشەکان ئەمە بکەن. لەکاتێکدا کە ئەوان بۆ یەکەم جار چوونەناو پەناگەکانی دوژمن، توندڕەوان بەرەنگارییان کرد.

ئێمە لە شوباتدا ٨١ سەرباز، لە ئازاردا ٨١ سەرباز، لە نیساندا ١٠٤ سەرباز، لە مایسدا ١٢٦ سەرباز و لە حوزەیراندا ١٠١ سەربازمان لەدەستدا– یەکەم جار بوو لە جەنگدا سێ مانگی یەك لەدوای یەك رووبەڕووی قوربانیی ژمارەی سێ قات ببووینەوە. قوربانییەکان ئازاربەخش بوون. بەڵام لە ٢٠٠٧دا شتێکی جیاواز هەستی پێکرا: ئەمریکا جارێکی تر زاڵ ببوو.

ژەنەراڵ پێترایۆس سەرنجی بۆ پێشکەوتنێکی پێوانەکراو راکێشام: ژمارەی تێبینییە هەواڵگرییەکان لە دانیشتووانی عیراقەوە. لە رابردوودا، عیراقییەکان لە سزای قورسی

پاخیبووان یان فیرقەکانی مەرگ دەترسان لە بەرانبەر هاوکاری کردنی هێزەکانی ئێمە. بەڵام لەکاتێکدا کە ئاسایش بەرەو باشی چوو، ژمارەی تێبینییەکان لە ١٢,٥٠٠وە لە شوباتدا گەیشتە نزیکەی ٢٥,٠٠٠ لە مانگی مایسدا. سەربازەکانمان و کارمەندانی هەوالگریمان تێبینییەکانیان بەکارهێنا بۆ پاک کردنەوەی شەقامەکان لە پاخیبووان و چەکەکان. ستراتیژیی دژەپاخیگەری کاریگەر بوو: ئێمە لە ڕێگەی دابینکردنی ئەو شتەی کە خەڵکی لە هەموو شتێ زیاتر پێویستیان پێی بوو، واتە ئاسایش، خەڵکمان بەلای خۆماندا ڕادەکێشا.

ئێمە پاکسازی، پاراستن و بونیادنانمان پەیڕەو دەکرد، ئەمەش بەشی زۆری لە سایەی ئەو هەڵمەتە مەدەنییەی کە باڵیۆز رایان کرۆکەر ڕێبەرایەتی کرد. من یەکەم جار رایانم لە پاکستان بینی لە ماوەی سەردانەکەمدا لە ٢٠٠٦. ئەو کاتە لەوێ وەکو باڵیۆز کاری دەکرد. ئەو وەکو دیپلۆماتێکی لەسەرخۆ و خاکی کاری دەکرد. بەڵام لەژێر هێمنییە دەرەکییەکەیەوە، پیاوێکی چاونەترس هەبوو کە بە شێوەیەکی بەربڵاو وەکو باشترین ئەفسەری دەزگای دەرەوە لە جیلی خۆی لەقەڵەم درابوو.

رایان کە عەرەبییەکەی زۆر باش بوو، لە سەرانسەری خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا ئیشی کردبوو، لەوانەش چەند گەشتێکی بۆ عیراق ئەنجام دابوو. ئەو لە ١٩٨٣دا لە هێرشێکی تیرۆریستی بۆ سەر باڵیۆزخانەکەمان لە لوبنان رزگاری ببوو و لەدەست باندێکی تورە رایکردبوو کە بەدوای شوێنی نیشتەجێ بوونی لەسوریا دەگەڕان. کاتێک من ستراتیژییە نوێکەم لە عیراق ڕاگەیاند، بڕیارمدا باڵیۆزەکانیش بگۆڕم. من زالمای خەلیلزادم دەستنیشان کرد کە ببێتە نوێنەری بەردەوامی ئێمە لە نەتەوە یەکگرتووەکان کە لە بەغدا کاری باشی ئەنجام دابوو. کۆندی زۆری پێنەچوو کە پێشنیاری جێگرەوەیەکی بۆ ئەو کرد. ئەو وتی رایان تاکە پیاوێکە بۆ ئیشەکە. رایان بە خێرایی ڕێزی منی بەدەستهێنا. ئەو بەهرەیەکی سروشتی هەبوو بۆ سۆراخکردنی کێشەکەکان و بنەبڕ کردنیان. ئەو بە ڕاشکاوییەوە لەبارەی تەحەدییەکانەوە قسەی دەکرد، بەڵام حەزێکی گاڵتەی تەمومژاوی هەبوو و حەزی دەکرد پێبکەنێت. لە یەکێک لەماوە سەختەکاندا پرسیارم لێیکرد "ئەمرۆ چیت بۆ هێناوم خۆرەتاو؟" ئەو لێدوانەکەی بە خەندەیەکی

گەورەوە دەست پێکرد. ئەو بێ وچان لەگەڵ پێترایۆسدا کاری دەکرد و متمانەی عێراقییەکانی لەهەموو لایەنەکانەوە بەدەست هێنابوو.

چەقی پرۆسەی زیادکردنی سەرباز بریتی بوو لە دووقاتکردنی ژمارەی (تیمەکانی ئاوەدانکردنەوەی پارێزگاکان) کە شارەزایانی مەدەنی لەگەڵ ئەندامانی سوپا هەماهەنگ کردبوو. من لەگەڵ ئەو رێبەرانەی تیمی ئاوەدانکردنەوەی پارێزگاکان کە لە سەرانسەری عێراق خرابوونەکار لە چەند ڤیدیۆ کۆنفرانسێکدا کۆبوومەوە. ئەوان گروپێکی کاریگەر بوون، ژمارەیەکیان جەنگاوەری دێرینی سەرسپی بوون. یەکێکی تریش لەوانە ئەفسەرێکی مێینەی دەزگای دەرەوە بوو کە کورەکەی وەکو مارینز لە عێراق خزمەتی دەکرد. ئەوان کەوتنە باسی پرۆژەکانیان کە لە پشتگیریی رۆژنامەیەکی لۆکاڵ لە بەغدا دەستی پێدەکرد تا یارمەتیدانی بونیادنانی گۆڕەپانەکان لە نەینەوا و تا دروستکردنی تاقیگەیەکی پشکنینی گڵ بۆ باشکردنی کشتوکاڵ لە دیالە.

ئەمە هەمیشە کارێکی پرشنگدار نەبوو، بەڵام گرنگ بوو بۆ ئەو ستراتیژییە دژەیاخیگەریەی ئێمە پیادەمان دەکرد.

من لانی کەم هەفتەی جارێك لەگەڵ ژەنەراڵ پێترایۆس و باڵیۆز رایان کرۆکەر لە رێگەی ڤیدیۆکۆنفرانسەوە قسەم دەکرد، هەندێ جاریش زیاتر لەوە. بڕوام وابوو کە پەیوەندیی کەسیی نزیك و پەیوەندی پێوەکردنی ناوبەناو گرنگن بۆ ئەوەی ستراتیژییەکی نوێ سەرکەوتوو بێت. وتوێژەکان دەرفەتێکیان پێدام تا گوێبیستی یەکەمین راپۆرتەکان بم لەسەر هەلومەرجی عێراق. ئەم وتوێژانە رێگەیان بە پێترایۆس و کرۆکەردا تا بێزارییەکانی خۆیان هەڵڕێژن و راستەوخۆ پێداگری لە بڕیارگەلێك بکەن لەلایەن فەرماندەی گشتییەوە.

بارودۆخەکە روو لە باشی بوو، بەڵام ئێمە هەموومان نیگەران بووین لەبارەی ئەگەری تەقینەوەیەکی تری هاوشێوەی سامەڕا، گۆڕەرێکی یارییەکەکە کە توندوتیژی تایەفی هەڵدایساندەوە. پێترایۆس ئاماژەی بە کێشەیەکی تر کرد. وتی "سەعاتی واشنتن زۆر خێراتر دەڕوات لەوەی بەغدا".

ئەو راستی دەکرد. کەمتر لە هەفتەیەک پاش گەیشتنی پێترایۆس بۆ عیراق، زۆرینەی نوێی دیموکراتەکان لە ئەنجومەنی نوێنەران یاسایەکی غیر ملزمی پەسەند کرد کە تیایدا هاتبوو "کۆنگرێس نارەزامەندە بەرانبەر بڕیارەکەی سەرۆک جۆرج دەبلیو بوش کە لە ١٠ی کانوونی دووەمی ٢٠٠٧دا راگەیەنرا بۆ دابەزاندنی زیاتر لە ٢٠,٠٠٠ سەربازی ئەمریکیی زیادە لە عیراقدا".

پاش رۆژێک لە توندوتیژیی سەخت لە نیساندا، سیناتۆر هاری رەیدی (ناڤادا) رایگەیاند "جەنگەکە دۆڕێنرا، زیادکردنە هیچ دەسکەوتی نییە". رێبەری زۆرینەی ئەنجومەنی پیران تازە بەرەی خۆی بەکارهێنابوو بۆئەوەی بلێت ١٤٥٠٠٠ سەربازی ئەمریکی و ئەو خێزانانەیان کە ئەوان لەپێناویاندا دەجەنگان، بۆ قەزیەیەکی دۆڕاو دەجەنگان. ئەو زیادکردنی سەربازی بە شکست لەقەڵەمدا بوو تەنانەت پێش ئەوەی کە سەربازە زیادەکان بگەنە شوێنی خۆیان. ئەمە یەکێک بوو لەو کردارە هەرە نابەرپرسانەیەی کە من لەماوەی هەشت سالی سەرۆکایەتیمدا لە واشنتن تێبینیم کردبوو.

لە ١ی مایسدا، کۆنگرێس پرۆژەیاسایەکی تەمویلی جەنگی بۆ ناردم بۆ پێدانی دوامۆڵەتێکی کشانەوە لە کۆتاییەکانی ئەو ساڵەدا. دیاریکردنی بەروارێکی کشانەوەی رەمەکی، زەمینەی خۆش دەکرد بۆ دوژمنانمان تا چاوەڕێی رۆیشتنمان بکەن و توانامان لاواز بکەن بۆ بەدەستهێنانی رەزایەتی سەرکردە لۆکاڵەکان کە گرنگ بوون بۆ سەرکەوتنمان. من پرۆژەیاساکەم ڤیتۆ کرد. کۆمارییەکانی کۆنگرێس، بە سەرپەرشتیی رێبەری کەمینەی ئەنجومەنی پیران (میچ مکۆنێل)- کە پشتگیریی زیادکردنی سەربازی کردبوو پاش ئەوەی رامگەیاندبوو و دواتر سەربەرزانە پێی وتم کە هەڵە بووە لە پێشنیارکردنی کشانەوە- و رێبەری کەمینەی ئەنجومەنی نوێنەران جۆن بۆهنەر، لەسەر هەڵوێستی خۆیان مانەوە. دیموکراتەکان ڤیتۆیان نەبوو بۆ زاڵبوون بەسەر ڤیتۆیەکەمدا. لە ٢٥ی مایسدا، من پرۆژەیاسایەکم واژۆ کرد بۆ تەمویلکردنی تەواوەتیی سەربازەکانمان بەبێ خشتەیەکی زەمەنیی کشاندنەوەی سەربازەکان.

***

ئەوان پێیان دەوت "سەحوە".

ئەنبار گەورەترین پارێزگاری عێراقە، درێژبووەوەیەکی نارێکی بیابانە کە لە سنووری خۆرئاوای بەغداوە دەست پێدەکات بەرەو سنوورەکان سوریا، ئوردن و سعودیە دەکشێت. لە رووبەری پەنجا هەزار مایلی چوارگۆشەدا، ئەنبار نزیکەی هەمان پێوانەی رووبەری نیویۆرکی هەیە. دانیشتووانەکەی زۆربەیان سووننەن. بۆ نزکەی چوار ساڵ، قەڵای یاخیبووان بوو– پەناگەیەکی قاعیدەش بوو.

قاعیدە دەستی گرتبوو بەسەر شارە بنەڕەتییەکانی ئەنباردا، دزەی کردبووە ناو هێزەکانی ئاسایش و ئایدۆلۆژیای خۆیان بەسەر دانیشتواندا سەپاندبوو. وەکو تاڵیبان، ئەوان رێگربوون لە چوونەدەرەوەی ژنان لە ماڵ بەبێ هاوڕێیەتی نێرینەیەك و وەرزش و چالاکیە سەرگەرمییەکانی تریان قەدەغە کردبوو. ئەوان هێرشیان دەکردە سەر سەربازانی ئەمریکا، هێزەکانی ئاسایشی عێراق و هەر کەسێکی تر کە بەرەنگاری دەکردن. بە هاتنی ٢٠٠٦، ئەنبار مەنزڵی تێکڕای چل و یەك هێرش بوو لە رۆژێکدا.

سەربازەکانمان دۆکیومێنتێکی قاعیدەیان دۆزییەوە کە بونیادێکی چڕوپڕی حوکمڕانی لە ئەنبار خستبووەڕوو، لەوانەش بەڕێوەبەرایەتییەکی پەروەردە، بەڕێوەبەرایەتییەکانی خزمەتگوزارییە کۆمەڵایەتییەکان و "یەکەیەکی لەسێدارەدان". کۆڕی هەواڵگریمان بڕوای وابوو کە ئەنبار بنکەی پلاندانانی هێرشەکان بێت بۆ سەر ئەمریکا. لە ئۆگەستی ٢٠٠٦دا، ئەفسەرێکی هەواڵگریی باڵای مارینز لە ئەنبار راپۆرتێکی فراوانی گشتێنراوی نووسی کە تیایدا گەیشتبووە ئەو ئەنجامەی پارێزگاکە لەدەست دەرچووە.

پاشان هەموو شتێك گۆڕا. خەڵکی ئەنبار تێڕوانینێکیان بۆ ژیان هەبوو لەژێر قاعیدەدا و کەیفیان بەوە نەدەهات کە دەیانبینی. لە سەروبەندی ناوەڕاستی ساڵی ٢٠٠٦وە، شێخانی خێڵ بەیەکەوە کۆبوونەوە بۆ دەرهێنانەوەی پارێزگاکەیان لەدەست توندڕەوان. سەحوە هەزاران کەسی چەکدار کرد.

وەکو بەشێك لە پرۆسەی زیادکردنی سەرباز، ئێمە چوار هەزار مارینزی ترمان لە ئەنبار دابەزاند کە لەوێ پاڵپشتیی شێخەکانی خێڵیان کرد و بڕوابەخۆبوونیان زیاد کرد. زۆرێك لە جیهادیستەکانی قاعیدە رایانکردە بیابان. توندوتیژی لە پارێزگاکە بە رێژەی

زیاتر لە ٩٠٪ کەمبووەوە. لەماوەی چەند مانگێکدا، خەڵکی ئازاری ئەنبار– بە پشتگیریی سەربازانمان– پارێزگاکەیان گرتبووەوە. پەناگەیەکی ئارامی قاعیدە بوو بە شوێنگەیەکی گەورەترین شکستی ئایدۆلۆژی.

لە رۆژی کرێکاراندا لە ٢٠٠٧، سەردانێکی ناکاوم بۆ ئەنبار ئەنجامدا. هێزی ئاسمانیی یەك بەسەر ئەو ناوچەیەدا فڕی کە لە تەپۆلکەیەکی لمینی زەبەلاح دەچوو و لە بنکەی ئاسمانیی ئەلئەسەد نیشتەوە کە پەڵەیەکی قیری رەش بوو لە ناوەڕاستی چەند مایلێك قیری قاوەیی. ئێمە لە قادرمەکانەوە بەناو گەرمایەکی سوتێنەردا چووینە خوارەوە و بەخێرایی بەرەو ژوورێکی بنکەکە رۆیشتین کە فێنککەرەوەی لێ بوو. من گوێبیستی ژمارەیەك لێدوان بووم و پاشان چاوم کەوت بە گروپێك لە شێخی خێڵ کە راپەڕینی ئەنباریان خستبووەگەڕ. ئەوان کۆمەڵێك کەس پەرپوت و خاکی بوون. خوی دۆستانە و زیندوویان کاربەدەستانی لۆکاڵیان بە خۆرئاوای تەکساس بیر هێنامەوە. بەڵام لەبری جینز و پوت، رۆبی درێژ و عەگالی رەنگاورەنگیان لەسەر بوو.

شێخەکان لە شانازیدا گەشانەوە لەکاتێکدا باسی ئەوەیان کرد کە بەدەستیان هێناوە. توندوتیژی بە شێوەیەکی دراماتیکی نزم ببووەوە، ئۆفیسەکانی قایم قامەکان و ئەنجومەنەکانی شار کارا ببوونەوە، حاکمەکان گوێبیستی کەیسی یاسایی دەبوون و دادپەورییان پیادە دەکرد. بە یارمەتیی هەڵمەتی مەدەنیمان، ئەنجومەنی پارێزگای رەمادی کرابووەوە کە لە دانیشتنی دەست بەکاربوونیدا، سی و پێنج ئەندام ئامادە ببوون. سەرۆك وەزیران مالیکی و سەرۆك جەلال تاڵەبانی ئامادەی کۆبوونەوەکە بوون. شتێکی سەرووئاسایی بوو کە مالیکی، شیعە، تاڵەبانی، کورد و ژوورێکی پڕ لە شێخی سوننە ببینیت کە قسە لەسەر ئایندەی وڵات دەکەن. کاتێك سەرۆك وەزیران پرسیاری کرد ئاخۆ چیان پێویستە، ئەوان لیستێکی درێژی داواکارییان پێ بوو: پارەی زیاتر، کەلوپەل و کەرەستەی زیاتر و ژێرخانەی زیاتر. مالیکی سکاڵای ئەوەی دەکرد کە بودجە بایی ئەو هەموو داواکارییانەی ئەوانی تێ نابێت. تاڵەبانی یارمەتیدەر بوو بۆ ناوبژیوانیی ناکۆکییەکان. من لە پشتەوە دانیشتم و خۆشیم لە دیمەنەکە بینی. دیموکراسی لە عێراقدا کەوتبووە کار.

مـن سوپاسـی شـێخەکانم کـرد لەبەرانبـەر میوانـدارییان و ئازایـەتییان لـە جـەنگی دژەتیرۆردا. شێخێك بە جۆش و خرۆشەوە وتـی "ئەگـەر پێویـستت بـە ئێمـە بـوو، مـن و پیاوەکانم دەچین بۆ ئەفغانستان!"

***

واشنتن پڕ ژاوەژاو بوو کاتێك پێترایۆس و کرۆکەر لە ١٠ی سێپتێمبەردا گەیشتنەوە بۆ گەواهیدان لەبەردەم کۆنگرێس و خستنەڕووی راسپاردە لەسەر رێگای بەرەوپێشچوون لە عیراقدا. بۆ ماوەی چەند مانگێك، دیموکراتەکان پەیمانی ئـەوەیان دابـوو کـە گەواهیـدانی خۆیـان بـەکار بهێـنن بـۆ بـڕینی تـەمویلکردنی جـەنگ. لـە مـانگی تـەممووزدا، رۆژنامـەی نیویۆرك تایمز رایگەیاند کە قەیرانەکە لـە عیراقـدا "لەدەسـتچوو" و داوای کشانەوەیەکی گشتگیری کرد، سەرباری ئەو ئەگەرەی کە دەشێ کشانەوەیەکی دەستبەجێ ببێتـەهۆی "پاکتاوی ئەتنیی زیاتر، تەنانەت جینۆسایدیش" و "ببێتە سەنگەرێك کە لێیـەوە دەشێ چالاکیی تیرۆریستی تەشەنە بسەنێت". مایەی سەرسوڕمان بوو کە ببینم تـایمز، کـە بـە راستی ببووە پێشەنگی ماقـە مرۆییـەکان، ببێتـە لایـەنگیری بەرنامەیـەك کـە دانـی نـابوو دەشێ ببێتەهۆی جینۆساید. سەر لەبەیانیی گوێبیستبوونەکان، گرووپی باڵی چـەپ (مـوڤ ئۆن.ئۆرگ) ریکلامێکی یەك لاپەڕەیی بڵاو کردەوە کە لێی نوسرابوو "ژەنەراڵ پێترایـۆس یان ژەنەراڵ خیانەت لەئێمە؟ پلانی نهێنی بۆ کۆشـکی سـپی دادەنـێ". ئەمـە هێرشـێکی سەرسـوڕهێن بـوو بـۆ سـەر ژەنـەراڵێکی چوار ئەسـتێرە. بەهـەمان شـێوە هەڵەیـەکی سیاسیش بـوو دیموکراتـەکان لـە کـۆنگرێس هەوڵیانـدا خۆیـان لـە پاڵپـشتیی ریکلامەکـە بپارێزن لەکاتێکدا کە لە پشتیەوە پشتیوانیی سۆزی دژە جەنگیان دەکـرد. سـیناتۆرێکی نیویـۆرك رەخنـەی تونـدی لـە ریکلامەکـە گـرت، بـەڵام وتـی راپۆرتەکـەی پێترایـۆس پێویستی بە "هەڵپەساردنی ئامادەی نابڕوایی" هەیە. لەلایـەن خۆیانـەوە، پێترایـۆس و کرۆکەر لەسەرخۆ، ئارام و قایلکەر بوون. ئـەوان راستییەکانیان گەیانـد. رێـژەی مردنـی مەدەنییە عیراقییەکان لـە ٧٠٪وە دابـەزیبوو بـۆ ٤٥٪ لـە سەرانسەری وڵاتـدا. مـردن لـە ئەنجامی توندوتیـژیی تایەفیـەکان لەبەغدا بـە رێـژەی ٨٨٪ و لەسەرانسەری وڵاتـدا بـە رێژەی ٥٥٪ کەمی کردبوو. هێرشی قومبەلەی دەستکرد بە رێژەی سێ یەك کـەمیکردبوو

و تەقینەوەی ئۆتۆمبێلەکان و هێرشە خۆکوژییەکان بە نزیکەی ٥٠٪ کەمیکردبوو. ئەو بزووتنەوەیەی سەحوە کە ئێمە لە ئەنبار بینیمان بە پارێزگای دیالە، ناوچە سوننەکانی بەغدا دا بڵاو ببووە. وێنەکە راست و دروست بوو: زیادکردنی سەرباز کاریگەر بوو.

دوو شەو پاش گەواهیدانەکە، من موخاتەبەی گەلم کرد. وتم "لەبەر ئەم سەرکەوتنە، ژەنەراڵ پێترایۆس بڕوای وایە کە ئێمە گەیشتوونەتە ئەو خاڵەی کە لێیەوە دەتوانین دەسکەوتە ئاسایشییەکانمان بە هێزێکی ئەمریکی کەم بەرقەرار بکەین...ئەو پرەنسیپەی کە رێنمایی بڕیارەکانی من دەکات لەبارەی ژمارە سەربازانەوە لە عیراق برتییە لە (بە سەرکەوتوویی بگەڕێرەوە). چەندەی زیاتر سەرکەوتوو بین، ژمارەی زیاتری ئەمریکییەکان دەتوانن بگەڕێنەوە وڵات".

ئەو دەستەواژەیەی کە زۆرترین جار لە وتارەکەمدا دووبارە بووەوە "بە سەرکەوتوویی بگەڕێرەوە" بوو. گەمەی زیرەکانە بە وشەکان لەلایەن (ئێد گیلێسپی)ی پێشنیار کرابوو کە هاوڕێیەکی زیرەك و بەهادار بوو و رازی ببوو تیمی اتصالاتم بەڕێوە ببات کاتێك دان بارتلێت گەڕابووەوە ماڵەوە بۆ تەکساس. بەڵام لە مێشکی خۆمدا، گرنگترین پەیامی گرنگ ئەوە بوو کە فەرماندەکانمان چەندەی سەربازیان پێویست بێت دەیانهێڵینەوە، تا ئەو کاتەش کە پێویستیان پێ دەبێ.

رۆژی وتارەکەم، من گوێبیستی هاوڕێی ژەنەراڵ پێترایۆس، ژەنەراڵی خانەنشین جاك کین بووم کە لەگەڵ دیك چێنی قسەی دەکرد. من کەیفم پێیدەهات و رێزم لێ دەگرت. ئەو لەماوەی پرۆسەی بڕیارداندا ئامۆژگاریی بەنرخی دابینکردبوو و بە ئاشکرا پشتگیریی زیادکردنی سەربازی کردبوو. من داوام لە جاك کرد کە پەیامێکی کەسی لە منەوە بە پێترایۆس بگەیەنێت: "من سێ ساڵ بوو چاوەڕوان بووم بۆ ستراتیژییەکی سەرکەوتوو. ئێستاش لەناوەختدا دەستبەرداری نابم. من سەربازی زیاتر کەم ناکەمەوە تا ئەو کاتەی کە تۆ قایلیت ئەمە بکەین".

***

سێ هەفتە پاش گەواهیدانی لەمێژینە چاوەڕێکراو، من چوومە گۆڕەپانەکانی جولانەوەی سوپا لە (فۆرت مایەر)ی ڤێرجینیا بۆ ماڵئاوایی کردن لە هاوڕێیەك.

ماوەیەکی کورت پاش ئەوەی کە زیادکردنی سەربازم ڕاگەیاند، بۆب گەیتس پێشنیاری ئەوەی کردبوو کە من ژەنەراڵ پیت پەیس کاندید نەکەمەوە بۆ خولی دووەمی سەرۆکایەتی ئەرکانی هاوبەش. ژینگەی کۆنگرێس دوژمنکارانە بوو و بۆب لە ژمارەیەک سیناتۆری بیستبووەوە– بەتایبەت کارل لیڤین، سەرۆکی نوێی لیژنەی دەزگا چەکدارەکانی ئەنجومەنی پیران– کە دانیشتنی گوێبیستبوون لە پیت ناکۆکئامێز دەبێت. نیگەرانییەکە ئەوە بوو کە سیناتۆرەکان ئەویان وەکو تورەکەی مشتەکۆڵە بەکاردەهێنا بۆ هەموو ئەو تورەییەی لەمەڕ عیراق هەیانە.

من پیتم بەلاوە پەسەند بوو. بۆ ماوەی شەش ساڵ سوودم لە ئامۆژگارییەکانی وەرگرتبوو. دەمزانی کە سەربازەکانمان چەندە خۆشیان دەوێ. دەمویست ئەو کاتەی کە سەرۆکایەتیم تەواو دەبێ پیت سەرۆکی ئەرکان بێ. بەڵام من وێنای دیمەنی گوێبیستبوونەکەم کرد– پرۆتێستۆکەران هاواریان دەکرد و سیناتۆرەکان خۆیان بۆ کامێراکان دەنواند، هەموویان بە دەنگێکی نێگەتیڤ دەگەیشتنە ئەنجام کە پیتی ڕیسوا دەکرد. من بە نابەدڵییەوە بە حوکمەکەی بۆب ڕازی بووم. من (مایک مولەن)ی ئەدمیراڵی وریای هێزی دەریاییم کاندید کرد کە ببێتە ببێتە سەرۆکی دواتری ئەرکان.

پیت هەرگیز سکاڵای نەدەکرد. ئەو تاوەکو کۆتایی شەریفانە کاری کرد. پاش سپاردنی ئەرکەکانی، ئەو چوار ئەستێرەکەی لەسەر جلە سەربازییەکانی لابردبوو، خستبوویە سەر کارتێک و لە خوارەوەی مۆنۆمێنتی ڤێتنام جێی هێشتبوو لە نزیک ناوی مارینزێک کە پێش چوار دەیە گیانی لەدەست دابوو. ئەو هیچ کامێرا و دەزگایەکی ڕاگەیاندنی نەهێنابوو. دواتر، کارتەکە لە خوارەوەی دیوارەکە دۆزرابووەوە. لێی نوسرابوو "بۆ گیدۆ فارینارۆ، مارینزی ئەمریکی، ئەم ئەستێرانە هی تۆن، نەک من! لەگەڵ ڕێز و خۆشەویستیدا، سەرۆکی فەسیلەکەت، پیت پەیس".

من دڵتەنگ بووم بۆ پیت و خێزانەکەی. کاتێک من لە ساڵی ٢٠٠٨دا میداڵی سەرۆکایەتیم بۆ ئازادی پێبەخشی، تەنیا بەشێک لە پەژارەم کەم بووەوە.

***

جموجۆڵ و چالاکیی پرۆسەی زیادبوونەکە لە ساڵی ٢٠٠٨یشدا بەردەوام بوو. بەهاتنی بەهار، زیاتر لە نەوەد هەزار عیراقی، شیعە و سوننە، چووبوونەپاڵ گروپەکانی (هاولاتیانی مشورخۆری خۆجێیی) وەکو ئەوانەی کە لە ئەنبار دەستپێکرد. زۆرێک لەو هێزانە کە دواتر بە (کوڕانی عیراق) ناسرا، چوونە پاڵ سوپا و هێزی پۆلیسی کاریگەرتر کە گەیشتبووە زیاتر لە ٤٧٥,٠٠٠ . ئەوان پاشماوەی یاخیبووە سەرەکییەکان و قاعیدەیان لە پەناگەکانیان رامالی. تیرۆریستان پەنایان بردە بەر بەکارهێنانی منالان و کەم عەقڵەکان وەکو خۆتەقێنەرەوە، کە ئەمە هەم لادانی ئەخلاقی و نەتوانینی ئامادەکردنی شەرکەری لای ئەوان پیشان دەدا.

هەروەک بەو شێوەیەی کە شارەزایانی دژەیاخیگەری پێشبینییان کردبوو، دەسکەوتە ئاسایشییەکانی ٢٠٠٧ لە ساڵی ٢٠٠٨دا کران بە پێشکەوتنی سیاسی. سەربەست لە مۆتەکەی توندوتیژیی تایەق، عیراقییەکان لیشاوێک لە یاسای گەورەیان تێپەڕاند، لەوانەش یاسایەک بۆ دۆخی ئەندامانی پێشووی حزبی بەعس، بودجەی نیشتمانی و یاسایەک بۆ زەمینەخۆشکردنی هەڵبژاردنی پارێزگاکان. لەکاتێکدا کە حکومەت هێشتا دەبووایە کار بکات بۆ هەندێ رێوشوێنی سەرەکی، لەوانەش یاسایەکی بەشکردنی دەرامەتی نەوت، ئەدائی سیاسیی عیراقییەکان بابەتێکی جێ سەرنج بوو بە لەبەرچاوگرتنی ئەو هەموو ناخۆشییەی کە بەرگەیان گرتبوو.

گەورەترین نیگەرانی لە ٢٠٠٨دا، ئامادەیی توندڕەوە شیعەکان بوو. لەکاتێکدا کە ئاسایش لە زۆربەی بەشی عیراقدا لەماوەی زیادکردنی سەربازدا باش ببوو، توندڕەوانی شیعە کە زۆرێکیان پەیوەندیی نزیکیان لەگەڵ ئێراندا هەبوو، ناوچەیەکی زۆری بەسرەیان گرتبوو کە دووەم شاری گەورەی عیراقە.

لە ٢٥ی ئازاری ٢٠٠٨دا، هێزەکانی عیراق لە بەسرە هێرشیان کردە سەر توندڕەوان. سەرۆک وەزیران مالیکی سەفەری کرد بۆ باشوور بۆ چاودێریکردنی ئۆپەراسیۆنەکە. زۆربەی هەرە زۆری تیمی ئاسایشی نیشتمانیم لە نێوان دوو دۆخی ترس و نیگەرانیدا بوون. سوپا نیگەرانی ئەوە بوو کە مالیکی پلانێکی باش دارێژراوی نەبێت. هەندێ کە لە

بالیۆزخانە پرسیاری ئەوەیان دەکرد ئاخۆ ئەو بایی پێویست پشتگیری دەکرێت لەناو حکومەتی عێراقدا. سی.ئای.ئەی هێرشەکەی مالیکی بە مەزەندەیەکی تاریك ناوبرد.

من بۆچوونم جیاواز بوو. مالیکی سەرکردایەتی دەکرد. بۆ بەشی هەرە زۆری دوو ساڵ، من داوام لێکردبوو کە داداپەروەرێتیی خۆی پیشان بدات. من چەند جارێك وتبووم "بکوژێکی شیعە ئەوەندەی بکوژێکی سوننە تاوانبارە". ئێستاش ئەو بە شێوەیەکی تەواو ئاشکرا بەدواداچوونی دەکرد. کاتێك ستیڤ هادلی و برێت مکگورك ئەو بەیانییەی پاش ئەوەی مالیکی هێرشەکەی دەست پێکرد هاتنە ئۆفیسی ئۆڤاڵ، وتم "پێم مەڵێن ئەمە شتێکی خراپە. مالیکی وتی ئەوە دەکات و ئێستاش ئەوە دەیکات. ئەمە چرکەساتێکی یەکلاییکەرەوەیە. تەنیا دەبێ یارمەتی بدەین سەرکەوتوو بێت".

هێرشەکە دوور بوو لەوەی لە کتێبەکاندا هاتبوو، بەڵام کاریگەریش بوو. هێزەکانی عێراق ئاسایشیان لە بەسرە دابین کرد. سەرکەوتنیان سەری رادیکاڵی شیعەی وەکو موقتەدا سەدر و پشتیوانانی لە ئێران سورِ ماند. سەرباری هەموو ئەمانەش، ئۆپەراسیۆنی بەسرە مالیکی وەکو سەرکردەیەکی بەهێز بونیاد نا. سەرۆك وەزیران گەیشتبووە خاڵی گەورەی برِیارێکی خۆی و برِیارەکەشی دا.

چەند هەفتەیەك پاش هێرشی حکومەتی عێراق لە بەسرە، پێترایۆس و کرۆکەر گەرِانەوە بۆ واشنتن بۆ گەواهیدان لە مانگی نیساندا. ئەمجارەیان، ریکلامی دژەجەنگ لە رۆژنامەکاندا لەئارادا نەبوون و شەرِی درێژکراوە بۆ تەمویل لەکایەدا نەبوو. کەناڵی ئێن بی سی نیوز کە لە نۆڤەمبەری ٢٠٠٦دا بە رەسمی رایگەیاندبوو کە عێراق لە حاڵەتی شەرِی ناوخۆدایە، چیتر زاراوەکەی بەکارنەدەهێنا. راگەیاندنێکی گەورەی پاشگەزبوونەوە بوونی نەبوو.

بە ناوهێنانی دەسکەوتەکانمان لە عێراق بە "ناسك و شیاوی پێچەوانە بوونەوە"، ژەنەراڵ پێترایۆس پێشنیاری ئەوەی کرد کە بەردەوام بین لە کشاندنەوەی سەربازەکانمان تاوەکو ئاستی پێش زیادکردنەکە و پاشان هەڵوەستەیەك بکەین بۆ هەڵسەنگاندنی زیاتر. هەروەکو رایان کرۆکەر وتی "لەکۆتاییدا، ئەمەی کە چۆن عێراق جێ دەهێڵین و چی لەدوای خۆمان جێ دێڵین گرنگتر دەبێ لەوەی کە چۆن هاتووین.

ڕەوگەی هەنووکەییمان سەختە، بەڵام کاریگەری هەیە... ئێمە پێویستمان بەوەیە لەگەڵیدا بمێنینەوە". منیش هاوڕابووم.

***

ئەوە پێوەرێکی سەرکەوتنی زیادبوونی سەرباز بوو کە یەکێک لە هەرە گەورەترین مقۆمقۆکانی سەرەتای ۲۰۰۸ عیراقی نەگرتەخۆ. لە مانگی ئازاردا، ئەدمیراڵ فۆکس فالۆن- کە وەکو فەرماندەی فەرماندەیی ناوەندیی ئەمریکا شوێنی جۆن ئەبی زەیدی گرتبووەوە- گفتوگۆیەکی بۆ گۆڤارێك ئەنجامدا کە تیایدا وتبووی ئەو تاکەکەسە کە لە نێوان من و جەنگ دژی ئێران وەستاوە. ئەمە زۆر پوچ بوو. پرسیارم لە سەرۆکی ئەرکانی هاوبەش مایك مولەن و جێگری سەرۆك هۆس کارترایت کرد کە ئەوان چیان دەکرد ئەگەر لە جێی فالۆن بوونایە. هەردووکیان وتیان دەستمان لەکار دەکێشایەوە. ماوەی کەم دواتر، فۆکس دەست لەکارکێشانەوەکەی پێشکەش کرد. لە چاکەی خۆی، جارێکی تر مەسەلەکەی نەهێنایەوە بەر باس. لە دوایین کۆبوونەوەماندا، من سوپاسی خزمەتەکەیم کرد و پێم وت شانازی بە کارە باشەکەیەوە دەکەم.

دەبووایە فەرماندەیەکی نوێ بدۆزمەوە بۆ ئەوەی فەرماندەیی ناوەند بەڕێوە ببات. تەنیا یەك کەس هەبوو کە دەمویست، ئەویش دەیڤد پێترایۆس بوو. ئەو سێ ساڵی پێشووی لە عیراقدا بەسەر بردبوو و من دەمزانی کە ئەو ئومێدەوارە کە فەرماندەیی خوازراوی ناتۆ لە ئەوروپا بگرێتە دەست. بەڵام ئێمە بۆ فەرماندەیی ناوەندی پێویستمان پێی بوو. وتی "ئەگەر کوڕانی بیست و دوو ساڵ بتوانن لە شەڕدا بمێننەوە، منیش دەتوانم".

پرسیارم لە ژەنەراڵ پێترایۆس کرد ئاخۆ کێ باشە شوێنی بگرێتەوە لە عیراق. ئەو بەبێ دوودڵی ناوی فەرماندەی جێگری پێشووی هێنا ژەنەراڵ رەی ئۆدێرنۆ. من یەکەم جار ئۆدێرنۆم لە (فۆرت هود) بینی کاتێك وەکو حاکمی تەکساس گەشتێکم بۆ ئەوێ ئەنجام دا. بە باڵایەکی شەش پێ و نیو و سەرێکی سفرەوە، ژەنەراڵ پیاوێکی سەنگینە. ئەو لە لایەنگرانی سەرەتای زیادکردنی سەرباز بوو و یارمەتیدەر بوو بۆ سەرکەوتنی

ستراتیژییەکە لە ڕێگەی دابەزاندنی سەربازە زیادەکان لە سەرانسەری بەغدا بەشێوەیەکی ژیرانە.

بەلای ژەنەراڵ ئۆدێرنۆوەن بردنەوە لە عیراقدا لە ئەرکی ئەو وەکو سەربازێك زیاترە. ئەمە شتێکی کەسییە. کاتێك ئۆدێرنۆ لە مانگی دیسەمبەری ٢٠٠٤دا بە مۆڵەت لە ماڵەوە بوو، پێشوازیم لە خانەوادەکەی، لەوانەش کوڕەکەی کە ملازم ئەنتنی ئۆدێرنۆ بوو، خریجی ویست پۆینت و قۆڵێکی لە شەڕی عیراق لەدەست دابوو، کرد بۆ ئۆفیسی ئۆڤاڵ. باوکی بە هێمنی وەستابوو، لێوانلێو بوو لە شانازی، لەکاتێکدا کە کوڕەکەی دەستی ڕاستی بەرز کردەوە بۆ سڵاو کردن لە من. تەنانەت ئەگەرچی ڕەی ئۆدێرنۆ تازە گەڕابووەوە نیشتمان بۆ وەرگرتنی پۆستێکی گەورە لە پێنتاگۆن، ئەو داواکەی قبوڵ کرد بۆ گەڕانەوە بۆ بەغدا وەکو فەرماندە.

ئەوە ئاسودەیی پێبەخشیم کە بزانم سەرۆکی دواتر دەتوانێ متمانە بکاتە سەر ئامۆژگاریی دوو ژەنەراڵی ژیری تاقیکراوەی شەڕگەکان. بە شێوازی خۆمان، ئێمە درێژەمان دابوو بە یەکێك لە نەریتە گەورەکانی مێژووی ئەمریکا. لینکۆڵن هەردوو ژەنەراڵ گرانت و شێرمانی دۆزیبووەوە. ڕوزڤێلت ئایزنهاوەر و برادلی هەبوو. منیش دەیڤد پێترایۆس و ڕەئی ئۆدێرنۆم دۆزیبووەوە.

***

بەهاتنی ئەو کاتەی کە زیادکردنی سەرباز لە عیراق لە ساڵی ٢٠٠٨ کۆتایی هات، توندوتیژی لە وڵاتەکەدا گەیشتبووە نزمترین ئاستی خۆی لە سەرەوەختی دەستپێکردنی جەنگەوە. کوشتاری تایەفی کە لە ساڵی ٢٠٠٦دا تەقریبەن وڵاتەکەی پارچەپارچە کردبوو، بە ڕێژەی زیاتر لە ٩٥٪ دابەزیبوو. سەرۆك وەزیران نوری مالیکی کە جارێك لە جاران ڕووبەڕووی سەرزەنشتێکی بەرفراوان دەبووەوە، وەکو سەرکردەیەکی بڕوابەخۆ هاتبووەوە مەیدان. قاعیدە لە عیراق بە توندی زیانی بەرکەوتبوو و پەراوێز خرابوو. کاریگەریی زیانبەخشی ئێران کەم ببووەوە. هێزەکانی عیراق خۆیان ئامادە دەکرد بۆ وەرگرتنی بەرپرسیارێتیی ئاسایش لە زۆربەی پارێزگاکاندا. ڕێژەی مردنی ئەمریکییەکان، کە بە شێوەیەکی ڕۆتینی لە خراپترین دۆخی درێژبووەوەی جەنگدا گەیشتبووە سەد

کەس لە مانگێکدا، هەرگیز جارێکی تر لە بیست و پێنج ئێنەپەڕی و ناوەکو کۆتایی سەرۆکایەتییەکەم گەیشتبووە ژمارە تاکەکان. لەگەڵ ئەوەشدا، هەر مەرگێك بیرهێنەرەوەی ئازاربەخشی باجی جەنگ بوو.

دوایین ئامانجی گەورەی من ئەوە بوو کە بەرنامەی عیراق بخەمە سەر سکەیەکی جێگیر بۆ ئەو کەسانی لەدوای من دێن. لە دوادواکانی ۲۰۰۷دا، ئێمە دەستمان کرد بە کارکردن لەسەر دوو ڕێککەوتننامە. یەکێکیان پێی دوترا ڕێککەوتننامەی دۆخی هێزەکان (سۆفا) کە کۆڵەکەی یاسایی گرتبووەخۆ بۆ هێشتنەوەی سەربازەکانی ئەمریکا لە عیراق پاش ئەوەی مۆڵەتی نەتەوە یەکگرتووەکان لە کۆتایی ۲۰۰۸دا بەسەر دەچوو. ئەوەیتریان پێی دەوترا ڕێککەوتننامەی زەمینەی کاری ستراتیژی (سفا) کە پەیمانی دەدا بە هاوکاریی دیپلۆماتی، ئابووری و ئاسایشی لەنێوان وڵاتەکانماندا.

مشتومڕ لەسەر ڕێککەوتننامەکان چەند مانگێکی پێچوو. دەبووایە مالیکی ڕووبەڕووی دژایەتییەکی جددی بێتەوە لەلایەن ئاراستەکانی ناو حکومەتەکەیەوە، بەتایبەت ئەوانەی کە پەیوەندیی گوماناوییان بە ئێرانەوە هەبوو. لە ناوەڕاستی هەڵمەتی سەرۆکایەتیدا، کاندیدە دیموکراتییەکان (سۆفا)یان وەکو پلانێکی هێشتنەوەی سەربازەکان لەعیراق بۆ تاهەتایە، ڕەت کردەوە. سی.ئای.ئەی گومانی هەبوو لەوەی کە مالیکی ڕێککەوتننامەکە واژۆ بکات. من ڕاستەوخۆ لەبارەی ئەمەوە پرسیارم لە سەرۆك وەزیران کرد. ئەو دڵنیای کردمەوە کە سۆفای دەوێت. ئەو لە ڕابردوودا لەسەری قسەی خۆی بوو و بڕواشم وابوو کە جارێکی تریش هەر وابێت.

مالیکی دانوستانکارێکی سەرسەخت بوو. ئەو سازشی لەلای ئێمەوە دەست دەکەوت و پاشان دەهاتەوە داوای زیاتری دەکرد. لە ئاستێك لە ئاستەکاندا، دانوستانە درێژخایەنەکە بێزارکەر بوو. بەڵام لە ئاستێکی تردا، من کارتێکراو بووم کە بینیم عێراقییەکان وەکو نوێنەرانی دیموکراسییەکی خاوەن سەروەری ڕەفتار دەکەن.

لە بارێکدا کە کات تێپەڕ دەبوو بەبێ هیچ ڕێککەوتنێك، پەیتا پەیتا نیگەران دەبووم. لە یەکێك لە ڤیدیۆکۆنفرانسەکانماندا وتم "جەنابی سەرۆك وەزیر، من تەنیا چەند مانگێکم لە ئۆفیسدا ماوە. پێویستم بەوەیە بزانم ئاخۆ تۆ ئەو ڕێککەوتننامانەت دەوێ یان نا.

ئەگەر نا، من شتی باشتر هەیە بیکەم". دەمتوانی بزانم کە ئەو کەمێک سەری سوڕماوە. ئەمە ئاماژەی من بوو بۆئەوەی کە ئیتر بەسە بۆ داوای زیاتر. وتی "ئێمە ئەم ڕێککەوتننامانە تەواو دەکەین. ئەمە ڕەزامەندی منە".

بە هاتنی نۆڤەمبەر، ڕێککەوتننامەکان تەقریبەن تەواو ببوون. دوایین پرسی ناکۆکئامێز ئەوە بوو کە سۆفا تیایدا هاتبوو لەبارەی کشانەوەی ئەمریکا لە عێراق. مالیکی وتی پارمەتیدەرێك دەبێ بۆی ئەگەر ڕێککەوتننامەکە بەڵێن بگرێتەخۆی بۆ کشاندنەوەی سەربازەکانمان لە بەروارێکی دیاریکراودا. دانوستانکارەکانمان لەسەر پابەندییەك گیرسانەوە بۆ کشاندنەوەی هێزەکانمان تاوەکو کۆتایی ٢٠١١.

بۆ ماوەی چەند ساڵێك، من ڕەتم کردبووەوە کە خشتەیەکی زەمەنیی ڕەمەکی دابنێم بۆ جێهێشتنی عێراق. هێشتاش نیگەران بووم بە پابەند بوون بە بەروارێکەوە، بەڵام ئەمەیان ڕەمەکی نەبوو. ڕێککەوتننامەکە لەنێوان دوو حکومەتی خاوەن سەروەریدا دانوستانی لەسەر کرابوو و بەرەکەتی ژەنەراڵ پێترایوس و ژەنەراڵ ئۆدیرنۆی پێوەبوو کە چاودێریی پیادەبوونەکەیان دەکرد. ئەگەر هەلومەرج بگۆڕایە و عێراقییەکان داوای بەردەوامبوونی ئامادەیی هێزەکانی ئەمریکایان بکردایە، ئەوا ئێمە سۆفامان دەستکاری دەکرد و سەربازەکانمان لە وڵاتەکەدا دەهێشتەوە.

غەریزە سیاسییەکانی مالیکی ژیرانە دەرچوون. سۆفا و سفا، لە سەرەتاوە وەکو بەڵگەنامەی چڕبووەوە لەسەر مانەوەمان لە عێراق دەبینران، کەچی دواجار وەکو ڕێکەوتننامەی ڕێگەخۆشکردن بۆ جێهێشتنمان بینران. ئەو پەرچەکردارەکەی کە ئێمە لە سەرەتاوە دەترساین لە کۆنگرێس یان پەرلەمانی عێراقەوە ئاراستە بکرێ، بەرجەستە نەبوو. لەکاتێکدا کە من لە ساڵی ٢٠١٠دا دەنوسم، سۆفا بەردەوامە لە ڕێنمایی کردنی ئامادەییمان لە عێراقدا.

***

لە ١٣ی دیسەمبەری ٢٠٠٨دا، من سواری هێزی ئاسمانیی یەك بووم بۆ چوارەمین گەشتم بۆ عێراق، کە لەوێ سۆفا و سفام لەگەڵ سەرۆك وەزیران مالیکی واژۆ دەکرد. لە ئاسمانەوە، بیرم لە گەشتەکانی پێشوو بۆ وڵاتەکە دەکردەوە. ئەو گەشتانەم شوێنەواری

جەماوەی جەنگیان هەڵدەگرت. خۆشییەکی سەردان هەبوو لە یەکەم سەفەردا بە ڕۆژی سوپاسگوزاریی ٢٠٠٣دا، کە چەند مانگێك پاش ئازادکردنی عیراق و چەند هەفتەیەك پاش گرتنی سەدام بوو. لە گەشتەکەی بینینی مالیکیدا لە حوزەیرانی ٢٠٠٦، نادڵنیاییەك هەبوو، کاتێك توندوتیژیی تایفەی لەزیادبووندابوو و ستراتیژییەکەمان شکستی دێنا. لە سێپتیمبەری ٢٠٠٧دا گەشبینییەکی وریایانە هەبوو بۆ ئەنبار، کاتێك وادیار بوو زیادکردنی سەرباز کاریگەری هەیە بەڵام هێشتا لەبەردەم دژایەتییەکی جددیدایە. ئێستا ئیتر ئەمە دوایین گەشت بوو. تەنانەت ئەگەرچی پێدەچوو بەشی زۆری ئەمریکا جەنگی پشتگوێ خستبێت، سەربازەکانمان و عیراقییەکان ئاسۆیەکی سەرکەوتنی درێژخایەنیان هێنابووەوە کایەوە.

ئێمە لە بەغدا نیشتینەوە و بە کۆپتەر چووین بۆ کۆشکی سەلام کە پێش شەش ساڵ هی سەدام و ڕژێمە درندەکەی بوو. وەکو سەرۆك، من ئامادەی زۆرێك لە مەراسیمەکانی پێشووی گەیشتنم ببووم. هیچیان وەکو ئەوە بزوێنەر نەبوون کە لەناو گۆرەپانی کۆشکی ئازادکراو لە تەنیشت سەرۆك جەلال تاڵەبانی بوەستم و تەماشای شەکانەوەی ئاڵاکانی ئەمریکا و عیراقی ئازاد بکەم کە لە تەك یەکتری بوون لەکاتێکدا کە باندی سوپا سوردی نیشتمانی ئێمەی لێ دەدا.

لەوێوە ئێمە بە ئۆتۆمبێل ڕۆیشتین بۆ شوێنەکەی سەرۆك وەزیران کە لەوێ من و مالیکی سۆفا و سفامان واژۆ کرد و دوایین کۆنگرەی ڕۆژنامەنووسیمان سازدا. ژوورەکە پڕاوپڕ بوو و ئامادەبووان بە بەراورد بە ڕێورەسمێکی ئاسایی نزیکتر بوون. ژمارەیەك لە ڕۆژنامەنووسی عیراقی لە بەردەم مندا لەلای چەپەوە دانیشتبوون. لەلای دەستە ڕاستمەوە گروپێکی ڕاگەیاندنی گەڕۆك و چەند ریپۆرتەرێکی عیراقی هەبوون. لەکاتێکدا کە مالیکی داوای یەکەم پرسیاری کرد، پیاوێك لە ڕاگەیاندنە عیراقییەکان لەپڕ هەستایە سەرپێ. ئەو دەنگێکی لێوە هات کە وەکو وەڕینێکی گەورە بوو؛ شتێك بە عەرەبی کە بە دڵنیاییەوە پرسیار نەبوو. پاشان گەیشتە کۆتاییەکەی بۆ شتێکی بە ئاراستەی من هاویشت. ئەوە چی بوو؟ تاکەپێڵاو بوو؟

دیمەنەکە چووە دۆخێکی کارەباییەوە. هەستم کرد تێد ویلیامزم کە دەیگووت دەشوانێ تەقەڵەکانی تۆپی بەیسبۆڵ لە دوورەوە لە کاتی هەڵدانیدا ببینێت. تاکە پێڵاوەکە وەکو هەلیکۆپتەر بە ئاراستەی من هات. خۆم لادا. کابرا قۆڵێکی چالاکی هەبوو. ئیوە چرکەیەک دواتر، تاکێکی تریشی هاویشت. ئەمەیان ئەوەندە خێرا نەبوو. بە نەرمی سەرم لادا و پێڵاوەکە بەسەرمدا تێپەڕی. خۆزگە ئەو شتە نەفرەتیەم دەگرتەوە.

پشێوی دروستبوو. خەڵکی هاواریان کرد و کارمەندانی ئاسایش کەوتنە جوڵە. من هەمان ئەو هەستەم هەبوو کە لە پۆلێکی فلۆریدا لە ١١ی سێپتێمبەر هەمبوو. دەمزانی کاردانەوەکەی من لە سەرانسەری جیهاندا پەخش دەکرێ. دەنگدانەوەکە چەندە گەورە بووایە، بۆ هێرشبەرەکە باشتر دەبوو.

من بە دەست ئاماژەم بۆ(دۆن وایت)ی کارمەندی دەزگای نهێنیم کرد. نەمویست دیمەنێکی تەلەفزیۆنیم هەبێ کە تیایدا بە پەلە دەبرێمە دەرەوە. سەرنجێکم دایە مالیکی کە دیار بوو شۆک ببوو. ریپۆرتەرانی عێراقی هەستیان بە شەرم دەکرد و پەست بوون. یەکێک لە پیاوەکان بە خەمبارییەوە سەری دەلەقاند و پۆزشی دەهێنایەوە. من دەستەکانم بەرز کردەوە و داوام لە هەمووان کرد کە ئارام ببنەوە.

وتم "ئەگەر ئێوە ڕاستییەکانتان دەوێ، ئەوەی کە هاویشتی پێڵاوێکی ڕەقەم دە بوو". هیوادار بووم بە بچووککردنەوەی چرکەساتەکە بتوانم پێڵاوهاوێژەکە لە بەدیهێنانی ئامانجەکەی بۆ تێکدانی ڕێورەسمەکە، دوور بخەمەوە.

پاش کۆنگرە ڕۆژنامەوانییەکە، من و مالیکی لەگەڵ وەفدەکانمان چووینە قاتی سەرەوە بۆ نانی ئێوارە. ئەو هێشتا دەلەرزی و زۆر پۆزشی هێنایەوە. من ئەوم بە تەنیا جیاکردەوە لەگەڵ جەمال هیلالی وەرگێڕی عەرەبی و پێم وتی چیتر نیگەران نەبێت. سەرۆک وەزیران گوڕوتینی هێنایەوە بەر خۆی و داوای کرد لەسەر خوانەکە قسە بکات. ئەو وتەیەکی سۆزی پێشکەش کرد لەبارەی ئەمەی کە چۆن پێڵاوهاوێژەکە نوێنەرایەتی گەلەکەی ناکات و وڵاتەکەی چەندە سوپاسگوزارە بەرانبەر ئەمریکا. ئەو باسی ئەوەی کرد کە ئێمە چۆن دوو دەرفەتمان بەوان داوە کە ئازاد بن، یەکەم لە ڕێگەی

ئازادکردنیانەوە لە سەدام حسێن و جارێکی تر بە یارمەتیدانیان بۆ ئازادبوون لە توندوتیژیی تایەفی و تیرۆریستان.

بڵاو پێدادرانم لەلایەن رۆژنامەنووسێکەوە، بوو بە یەکێك لە ئەزموونە نائاساییەکانم. بەڵام ئەی ئەگەر کەسێك پێش هەشت ساڵ بیوتایە سەرۆکی ئەمریکا لە بەغدا لەگەڵ سەرۆك وەزیرانی عیراقی ئازاد نانی ئێوارە دەخوات؟ هیچ- تەنانەت هاویشتنی پێڵاوێکیش لە کۆنفرانسێکی رۆژنامەوانیدا- لەوە نائیحتیمالیتر دیار نەدەبوو.

***

ساڵانێك دوای ئەم کاتەش، لەوانەیە مێژوونووسان ئاوڕ بدەنەوە و زیادکردنی سەرباز وەکو ئەنجامگیرییەکی پشت تێکراو ببینن، پردێکی حەتمی لەنێوان ساڵانی توندوتیژی کە بەدوای ئازادکردن و ئەو دیموکراسییەدا هات کە سەریهەڵدا. لەو کاتەدا هیچ شتێك لەبارەی زیادکردنی سەربازەوە حەتمی دیار نەبوو. رای گشتی تەواو لەدژی وەستابووەوە. کۆنگرێس هەوڵیدا بلۆکی بکات. دوژمن بێ وچان شەڕی دەکرد تا ئیرادەی ئێمە بشکێنێت.

لەگەڵ ئەوەشدا، لە سایەی شارەزایی و بوێریی سەربازەکانمان، ئەو ستراتیژییە نوێیەی دژەیاخیگەری کە ئێمە گرتمانەبەر، هەماهەنگیی بێ وێنەی نێوان هەوڵە مەدەنی و هەوڵە سەربازییەکانمان و ئەو پاڵپشتییە بەهێزەی بۆ سەرکردە سیاسییەکانی عیراق دابینمان کرد، ئەو جەنگەی کە بە شێوەیەکی بەربڵاو بە شکست لەقەڵەم درابوو دەرفەتی هەبوو بە سەرکەوتن کۆتایی بێ. بە هاتنی ئەو کاتەی کە ئۆفیسم جێ هێشت، توندوتیژی بە شێوەیەکی دراماتیکی کەم بیووەوە. چالاکیی ئابووری و سیاسی دەستی پێکردبووەوە. قاعیدە تووشی شکستێکی سەربازی و ئایدۆلۆژیی گرنگ هاتبوو. لە ئازاری ۲۰۱۰دا، عیراقییەکان جارێکی تر چوونەوە بەردەم سندوقەکانی دەنگدان. لە سەردێڕێکی وێنانەکراودا پێش سێ ساڵ، نیوزویك لەسەر بەرگی گۆڤارەکەی نوسیبووی "دواجار سەرکەوتن: سەرهەڵدانی عیراقێکی دیموکرات". عیراق هێشتا ڕووبەڕووی تەحەدی دەبێتەوە و کەس ناتوانێ بە دڵنیاییەوە بزانێ ئاخۆ چارەنووسی وڵاتەکە چی دەبێ. بەڵام ئێمە، ئەمە دەزانین: لەبەرئەوەی ئەمریکا عیراقی ئازاد کرد و پاشان رەتی

کردەوە دەستبەرداری بێت، خەڵکی ئەو وڵاتە دەرفەتێکیان هەیە ئازاد بن. لەکاتێکدا کە ئەو دوورابیەی بڕیووە، هیوادارم ئەمریکا بەردەوام بێت لە پشتگیریی دیموکراسی تازەی عێراق. ئەگەر عێراقییەکان داوای ئامادەیی بەردەوامی سەربازی بکەن، دەبێ ئێمە دابینی بکەین. عێراقێکی ئازاد و ئارام لە بەرژەوەندیی گرنگی ئێمەدایە. دەکرێ ئەم وڵاتە هاوپەیمانێکی بەهادار بێ لە چەقی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، سەرچاوەیەکی سەقامگیری بێت لە هەرێمەکەدا و کڵاورۆژنەیەکی هیوا بێت بۆ ریفۆرمخوازانی سیاسی لە ناوچەکەدا و سەرانسەری جیهاندا. وەکو ئەو سیستەمە دیموکراسییانەی کە ئێمە لە ئەڵمانیا، ژاپۆن و کۆریای باشوور یارمەتیدەر بووین لە بونیادنانیان، عێراقێکی ئازاد ئێمە پارێزراوتر دەکات بۆ نەوەکانی ئایندە.

من زۆرجار لەوە راماوم ئاخۆ دەبووایە من زووتر فرمانم بکردایە بە زیادکردنی سەرباز. بۆ ماوەی سێ ساڵ، بناغەی ئێمە لە عێراقدا ئەوە بوو کە پێشکەوتنی سیاسی پێوانەی سەرکەوتنە. عێراقییەکان لە کاتی خۆیدا هەموو بنچینەکانیان دانا. دیاربوو کە ستراتیژییەکەی ئێمە کاریگەرە. تەنیا پاش ئەوەی کە توندوتیژیی تایەفی لە ٢٠٠٦دا سەریهەڵدا روون بووەوە کە ئاسایشی زیاتر پێویستە بەر لەوەی پێشکەوتنی سیاسی بەردەوام بێت. پاش ئەوە، من پرۆسەی زیادکردنی سەربازم گەڵاڵە کرد بە جۆرێك کە حکومەتەکەمانی یەکخست. ئەگەر من زووتر هەنگاوم بنایە ئەوا لەوانەبوو دابەشبوونێك دروست بکەم کە لەلایەن رەخنەگرانی جەنگ لە کۆنگرێس بقۆزرێتەوە بۆ بڕینی تەمویل و رێگرتن لە سەرکەوتووبوونی پرۆسەی زیادکردنی سەرباز هەر لە دەستپێکی جەنگی عێراقەوە بڕوام وابوو کە ئازادی شتێکی گەردوونییە– و دیموکراسی لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست هەرێمەکە ئارامتر دەکات. جار هەبووە کە ئەمە مەحاڵ دیار بووە. بەڵام من هەرگیز ئیمانم بەوە لەدەست نەداوە کە ئەمە راستە.

من هەرگیز ئیمانم بە سەربازەکانیشمان لەدەست نەداوە. من بە بەردەوامی سەرسام بووم بە ئامادەییان بۆ خۆبەخشی کردن لە بەرانبەر مەترسیدا. لە ئۆگەستی ٢٠٠٧دا، من سەفەرێکم بۆ (رینۆ)ی نێڤادا کرد بە مەبەستی قسەکردن بۆ فەیلەقێکی ئەمریکی. دواتر چاوم کەوت بە بیل و کریستین کریسۆڤ خەڵکی (تۆکی)ی کالیفۆرنیا. کوڕەکەیان کە

مارینزێکی تەمەن بیست و پێنج ساڵ بوو بەناوی ناتان کریسۆف، گیانی خۆی لە عیراق بەخشیبوو. ئۆستنی براشی هەر مارینز بوو و لە کۆبوونەوەکەدا بوو. ئۆستن و کریستین پێیان وتم کە ناتان چەندە حەزی لە ئیشەکەی بووە. پاشان بیلّ دەستی کرد بە قسە.

وتی "جەنابی سەرۆك، من نەشتەرگەرێکی ئێسقانم. دەمەوێ لەسەر شەرەفی ناتان بچمە پاڵ گروپی پزیشکیی هێزی دەریایی".

من کارتێکراو بووم و سەرسم سوڕما. پرسیارم کرد "تەمەنت چەندە؟"

لە وەڵامدا وتی "قوربان شەست ساڵم".

من شەست و یەك ساڵ بووم و شەست ساڵ بەلامەوە زۆر بەتەمەن نەبوو. سەیرێکی هاوسەرەکەیم کرد. ئەویش سەری رەزامەندی لەقاند. بیلّ روونی کردەوە کە ئەو ئامادەیە خۆی لە مومارەسەی پزیشکیی ئێسقان خانەنشین بکات، بەڵام پێویستی بە بەڵگەنامەیەکی تایبەتی سازشکردن لەسەر تەمەن هەیە بۆئەوەی بۆ هێزی دەریایی شیاو بێت.

وتم "بزانم چیم پێدەکرێ".

کاتێك گەڕامەوە بۆ واشنتن، پاش لێدوانێکی سەر لە بەیانی بەسەرهاتەکەم بۆ پیت پەیس گێڕایەوە. سازشی تەمەنی دکتۆر کریسۆف هاتە بەر باس. ئەو بە مەشقێکی چڕوپڕی پزیشکیی شەڕگەدا تێپەڕی. ماوەیەکی کورت دوای ئەوەی ئۆفیسم جێهێشت، ئەو چووە عیراق کە لەوێ شانبەشانی ئۆستن خزمەتی کرد و مارینزی برینداری چارەسەر کرد.

نوسیبووی "حەز دەکەم بیر لەوە بکەمەوە کە من و ئۆستن لێرە لە عیراق ئەرکی تەواونەبووی ناتان تەواو دەکەین". "ئێمە بە کارەکەمان لێرە رێز لە یادەوەرییەکەی دەنێین". لە ۲۰۱۰دا، من زانیم کە دکتۆر کریسۆف لە عیراق گەڕاوەتەوە- و پاشان سواری کەشتی بووە بۆ ئەفغانستان.

ناتان کریسۆف یەکێکە لەو ٤,٢٢٩ ئەمریکییەی کە لە ماوەی سەرۆکایەتییەکەمدا گیانیان لە عیراقدا بەخشی. زیاتر لە ۳۰,۰۰۰ لە جەنگدا بریندار بوون. من هەمیشە ئەو خەفەتەی کە خێزانەکانیان هەستی پێدەکەن لەگەڵ خۆمدا هەڵدەگرم. هەرگیز ئەو

شانازییە لەبیر ناکەم کە بە کارەکەیان هەیانبوو، ئەو ئیلهامەی کە بەوانیتریان بەخشی و ئەو جیاوازییەی کە لە جیهاندا هێنایانە کایەوە. هەر ئەمریکییەک کە لە عیراقدا خزمەتی کرد یارمەتیدەر بوو بۆ پارێزراوترکردنی وڵاتەکەمان، دەرفەتی ژیانی ئازادانەی بە بیست و پێنج ملیۆن کەس بەخشی و ئاراستەی خۆرهەڵاتی ناوەراستی بۆ نەوەکانی داهاتوو گۆڕی. هەندێ شت هەن لە عیراقدا کە لەبارەیانەوە بەهەڵەدا چووبووین، بەڵام ئەو قەزیەیە تاهەتایە راستە.

# ئەجێندای ئازادی

ڕێک بەر لە نیوەڕۆی ٢٠ی کانوونی دووەمی ٢٠٠٥دا، چوومە سەر مینبەری مەراسیمی دەست بەکاربوون. لە لای خۆرئاوای بینایەی کۆنگرێسەوە، ڕوانیمە جەماوەرێکی چوارسەدهەزار کەسی کە سەرانسەری (بازاڕی نیشتمانی)یان گرتبووەوە.

دەمتووانی لە پشتیانەوە مۆنۆمێنتی واشنتن، پەیکەری لینکۆڵن و گۆڕستانی نیشتمانیی (ئارلینگتن) لەودیو ڕووباری پۆتۆماک ببینم.

مەراسیمی دەستبەکاربوونی ٢٠٠٥ سێیەمین جار بوو کە من سەرسامی خۆمم بەو دیمەنە دەردەبڕی. لە ساڵی ١٩٨٩دا، من کوڕێکی سەربەرز بووم کە تەماشای سوێندخواردنی باوکی دەکات. لە ٢٠٠١دا، من لە ژێر بارانی سارد و لە ژێر تەمی ناکۆکئامێزی هەڵبژاردندا سوێندی سەرۆکایەتیم خوارد. دەبووایە سەرنج بخەمەسەر هەنگاوێکی سەر قادرمەکانی کۆنگرێس کە زۆر لەوە بەرتەسکتر بوون کە بیرم لێ کردبووەوە. کاتێکی ویست تا لەگەڵ دەنگەکان و دیمەنەکاندا ڕاهاتم. نیگام بڕیە کۆمەڵانێکی تێکچڕژاوی ئۆڤەرکۆتی ڕەش و سپی. من بیرم لەوە کردەوە ئاخۆ ئەو لێزمە شڵت و شۆیە بینینی (شاشەی تێکست)ەکە سەخت دەکات کاتێک وتاری دەستبەکاربوونەکەم پێشکەش دەکەم.

چوار ساڵ دواتر، ئاسمان خۆرەتاو و ڕۆشن بوو. ڕەنگەکان زۆر درەوشاوەتر دیار بوون. ئەندامەکانی هەڵبژاردنیش یەکلاییکەرەوە بوون. لەکاتێکدا کە بە قادرمە ڕەنگ شینەکاندا بەرەو سەر شانۆکە چوومە خوارەوە، دەمتوانی دەموچاوە جیاجیاکانی ناو قەرەباڵغییەکە بناسمەوە. من جۆ و جان ئۆنێلم شانبەشانی گروپێک لە خەڵکی میدلاند

ناسییەوە. من خەندەیەکم بۆ هاوڕێ خۆشەویستەکانم کرد منیان بە ژنەکە بێ هاوتاکەی تەنیشتم ناساندبوو. شتێك گومانی تیا نەبوو؛ لەکاتێکدا کە ئێمە ئەو شەوەی ۱۹۷۷خۆشیمان لە لەفەی بێرگەرەکەمان دەبینی، کەس لە ئێمە چاوەڕوانی ئەمەی نەدەکرد.

من لە ریزەکەی پێش لۆرا، باربارا و جێنا شوێنی خۆم گرت. دایك و باوکم، دایکی لۆرا و براکانم و خوشکەکەم لەو نزیکانە دانیشتبوون. سیناتۆر ترێنت لۆت، سەرۆکی لیژنەی دەست بەکاربوون بانگی لە سەرۆکی دادوەران ویلیام رێنکویستی کرد بۆ سەر مینبەرەکە. من لەگەڵ لۆرا، باربارا و جێنا بەرەو پێشەوە چووم، لۆرا کتێبی پیرۆزی هەلگرت کە هەم باوکم و هەم خۆم سوێندمان پێی خواردبوو. کتێبەکە لەسەر ئیزایا ٤٠:٣١ کرابووەوە: "بەڵام ئەوانەی کە هیوایان بە خودا هەیە توانایان نوێ دەکەنەوە. ئەوان وەکو هەڵۆ لە شەقەی باڵ دەدەن، ئەوان رادەکەن و داناهێزرێن، دەڕۆن و لەهۆش ناچن".

دەستی چەپم لەسەر کتێبی پیرۆز دانا و دەستی راستم بەرز کردەوە لەکاتێکدا کە سەرۆکی دادوەریی ئەخۆش سی و پێنجەمین سوێندی بەڕێوەبرد. کاتێك بە "بۆیە خودایە یارمەتیم بدە" کۆتاییم هێنا تۆپەکانی سلاوی سەربازی تەقێنران، من لۆرا و کچەکانم لەباوەش گرت، کشامە دواوە و لە چرکەساتەکەدا قاڵ بووم.

پاشان کاتی ئەوە هات وتارەکە پێشکەش بکەم:

لەم کردبوونەوەیەی دووەمدا، ئەرکەکانمان نەك بەو وشانەی کە بەکاریان دەهێنم، بەڵکو ئەو مێژووەی کە پێکەوە بینیوومانە پێناسە کراون. بۆ ماوەی نیوسەدە، ئەمریکا لە ڕێگەی چاودێریی بەردەوام لە سنوورە بەردەوامەکاندا بەرگری لە ئازادیمان کرد. پاش رووخانی کۆمەنیزم، سالانێکی هێمنی، سالانێکی کێی، سالانێکی پشووی رێژەیی هات- و پاشان رۆژی ئاگر هات. ئێمە هەستیاریی خۆمان بینیووە- و قوڵترین سەرچاوەکەیمان بینیووە. تا ئەو کاتەی کە تەواوی ناوچەکانی جیهان پڕ بین لە کینە و زۆرداری- ناسکن بن بەرانبەر ئەو ئایدۆلۆژیایانەی کە گەشە بە رق دەدەن و پاساوی کوشتن دەدەن- توندوتیژی خۆی کۆدەکاتەوە و لە هێزێکی وێرانکەردا چەندجارە دەبێت و سنوورە هەرە

بەرگریکاراوەکان دەبەزێنێت و هەڕەشەیەکی کوشندە دەڕەوێنێت. تەنیا یەک هێزی مابوو هەیە کە دەتوانێ حوکمی رق و کینە بشکێنێت و نواندنەکانی زۆرداران ئاشکرا بکات و وەڵامدەرەوەی هیواکانی خەڵکی شایستە و خۆگر بێت و ئەمە هێزی ئازادیی مرۆڤە.

ئێمە بەهۆی ڕووداوەکان و ژیریی باو دەگەینە یەک ئەنجامگیری: مانەوەی ئازادی لە خاکی ئێمەدا زیاتر و زیاتر پشت ئەستوور دەبێ بە سەرکەوتنی ئازادی لە سەرزەمینەکانی تر. باشترین هیوا بۆ ئاشتی لە جیهانەکەماندا فراوانکردنی ئازادییە لە هەموو جیهاندا... کەوابوو ئەوە بەرنامەی ئەمریکایە بۆ سۆراخکردن و پشتیوانی لە گەشەی دامەزراوە و بزاڤە دیموکراتیییەکان لە هەر وڵات و کەلتوورێکدا بە ئامانجی یەکلاییکەرەوەی کۆتایی هێنان بە زۆرداری لە جیهانەکەماندا".

***

پاش ١١ی سێپتێمبەر، من ستراتیژییەکم گەڵاڵە کرد بۆ پارێزگاری لە وڵاتەکە کە دواتر بە رێبازی بوش ناسرا: یەکەم، جیاوازی مەکە لەنێوان تیرۆریستان و ئەو وڵاتانەی کە پەنایان دەدەن— و لە هەردووکیان بپێچەوە. دووەم، شەڕ لەدژی دوژمن ببەرە دەرەوە پێش ئەوەی بتوانن لێرە لە نیشتمان هێرش لەدژمان ئەنجام بدەن. سێیەم، ڕووبەڕووی هەڕەشەکان ببەرەوە بەر لەوەی بە تەواوی بەرجەستە بین.

چوارەمیشیان، ئازادی بەرەوپێش ببە و بیکە بە ئەلتەرناتیڤێك بۆ ئایدۆلۆژیای سەرکوتکردن و ترسی دوژمن.

ئەجێندای ئازادی، کە من بە پایەی چوارەم ناوم دەبرد، هەم خەیاڵی و هەم واقیعی بوو. خەیاڵی بوو لەوەدا کە ئازادی دیارییەکی جیهانییە لە خودای گەورەوە. واقیعییە چونکە ئازادی کرداریترین ڕێگای پارێزگارییە لە وڵاتەکەمان لە دوورمەودا دا. هەروەکو لە دووەمین وتاری دەستبەکاربوونمدا وتم " بەرژەوەندییە زیندووەکانی ئەمریکا و قوڵترین بیروباوەڕەکانمان ئێستا یەکن".

هێزی وەرچەرخێنەری ئازادی لە شوێنانی وەکو کۆریای باشوور، ئەڵمانیا و خۆرهەڵاتی ئەورووپا سەلمێنرابوو. بەلای منەوە، زیندووترین نموونەی هێزی ئازادی

پەیوەندیی من بوو بە سەرۆك وەزیران جونیشیرۆ کۆیزومیی ژاپۆن. کۆیزومی یەکێك بوو لەو یەکەم سەرکردانەی جیهان کە پاش ١١ی سێپتێمبەر پشتگیریی خۆی خستەڕوو. چەندە سەیرە. پێش شەست ساڵ، باوکم وەکو فڕۆکەوانێکی هێزی دەریایی شەڕی ژاپۆنییەکانی کردبوو. باوکی کۆیزومی لە حکومەتی ئیمپریالیی ژاپۆندا خزمەتی کردبوو. ئێستاش کوڕەکانیان پێکەوە کاریان دەکرد بۆ پاراستنی ئاشتی. لە سەروەختی دووەم جەنگی جیهانییەوە شتێکی گەورە گۆڕابوو: بە پەیڕەویکردن لە دیموکراسیی ستایلی ژاپۆنی، دوژمنێك ببووە هاوپەیمان.

***

ڕاگەیاندنی ئەجێندای ئازادی هەنگاوێك بوو. جێبەجێکردنی هەنگاوێکی تر بوو. لە هەندێ شوێن، وەکو ئەفغانستان و عێراق، ئێمە بەرپرسیارێتییەکەی ئاوازەمان هەبوو بۆ بەخشینی دەرفەتێك بەو خەڵکەی ئازادمان کردبوون کە کۆمەڵگای ئازاد بونیاد بنێن. بەڵام ئەم نموونانە ئاوارتە بوون، نەك ئەمەی ڕێسایەك بن.

من روونم کردەوە کە ئەجێندای ئازادی "بە شێوەیەکی سەرەکی ئەرکی سوپا نییە". ئێمە لە ڕێگەی پاڵپشتی حکومەتە دیموکراتییە تازە دروستبووەکان لە شوێنانی وەکو فەلەستین، لوبنان، جۆرجیا و ئۆکرانیا ئازادیمان بەرەو پێش دەبرد. ئێمە نەیاران و ریفۆرمخوازانی دیموکراتیی ژێر باری ڕژێمە سەرکوتگەرەکانی وەکو ئێران، سوریا، کۆریای باکوور و ڤەنزوێلامان هان دەدا. هەروەها ئێمە پشتگیریی ئازادیمان دەکرد لەکاتێکدا کە پەیوەندییە ستراتیژییەکانمان لەگەڵ وڵاتانی وەکو سعودییە، میسر، روسیا و چین بەرقەرار دەکرد.

ڕەخنەگرەکان تۆمەتی ئەوەیان دروست کرد کە ئەجێندای ئازادی شێوازێکی ئەمریکایە بۆ سەپاندنی بەهاکانمان بەسەر ئەوانیتردا. بەڵام ئازادی بەهایەکی ئەمریکی نییە، بەهایەکی گەردوونییە. ئازادی ناکرێ بسەپێنرێ، پێویستە هەڵبژێردرێ. کاتێکیش خەڵکی هەڵبژاردنەکەیان خرایە بەردەم، ئەوا ئازادی هەڵدەبژێرن. لە کۆتایی دووەم جەنگی جیهانیدا، نزیکەی ٢٤ سیستەمی دیموکراسی لە جیهاندا هەبوون. کاتێك من لە کانوونی دووەمی ٢٠٠١دا سەرۆکایەتیم گرتە دەست، ١٢٠ بوون.

ماوەیەکی کورت دوای هەڵبژاردنی ٢٠٠٤، کتێبی (بۆ دیموکراسی)ی ناتان شارانسکیم خوێندەوە، نەیارێك کە نۆ ساڵی لە کەمپە زۆرەملێکانی سۆڤیەتدا بەسەر بردبوو. شارانسکی لە کتێبەکەدا باسی ئەوە دەکات کە چۆن ئەو و هاوتا زیندانییەکانی کارتێکراو بوون بە بیستنی ئەوەی کە سەرکردەکانی وەکو رۆناڵد ریگن بە رۆشنییەکی ئەخلاقییەوە دەدوێن و داوای ئازادکردنی ئەمان دەکەن.

لە بەشێکی لەیادنەچووی کتێبەکەیدا، شارانسکی باسی هاوڵاتییەکی نەیاری سۆڤیەتی دەکات کە دەوڵەتی زۆرداری بە سەربازێك شوبهاندبوو کە بە بەردەوامی لولەی تفەنگەکەی لەسەر زیندانییەك رادەگرێت. سەرەنجام، دەستەکانی شل دەبن و زیندانییەکە رادەکات. من ئەوەم بە بەرپرسیارێتیی ئەمریکا زانی کە گووشار بخاتەسەر دەستەکانی زۆردارانی جیهان. کردنی ئەم ئامانجە بە بەشێکی سەرەکی بەرنامەی دەرەکیمان، یەکێك بوو لە بڕیارە هەرە پڕئەنجامەکانم وەکو سەرۆك.

***

شەپۆلی گەورەی ئازادی کە لە ماوەی نیوەی دووەمی سەدەی بیستدا بەشی زۆری جیهانی رامالی، بەشێوەیەکی بەرچاو هەرێمێکی بازدابوو: خۆرهەڵاتی ناوەڕاست.

راپۆرتێکی گەشەپێدانی مرۆیی عەرەبیی نەتەوەیەکگرتووەکان، کە لە ساڵی ٢٠٠٢دا دەرچوو، دۆخی تاریکی هەرێمەکەی دەرخستبوو: یەك لە سێ کەس نەخوێندەوار بوو. رادەی بێکاری ١٥٪ بوو. کەمتر لە ١٪ی دانیشتووان دەست بە ئینتەرنێت دەگەیشت. رێژەکانی مردنی دایك نزیك بوو لەوانەی وڵاتانی کەمترین ئاستی گەشەکردن. بەرهەمی ئابووریی تاکەکەسی زۆر بچوك بوو.

نووسەرانی راپۆرتی یوئێن، کە گروپێك بوون لە توێژەرانی عەرەبی سەنگین، ئەنجامە خەمناکەکانیان دەگەڕاندەوە بۆ سێ کەموکورتی: کەموکورتییەك لە زانیندا، کەموکورتییەك لە پێگەیاندنی ژناندا و لەهەمووی گرنگتر، کەموکورتی لە ئازادیدا. لە بەشی هەرە زۆری جەنگی سارد دا، ئەولەویەتی ئەمریکا بۆ خۆرهەڵاتی ناوەڕاست سەقامگیری بوو. هاوپەیمانەکانمان لەسەر ئەنتی کۆمەنیزم بونیادیان گرتبوو؛ ستراتیژییەك کە ئەو کاتە بەجێ بوو. بەڵام لە ژێرەوە، کینە و رق بونیادی گرت. زۆرێك

لە خەلکی وەکو رزگارکەرێك روویان دەکردە مەلا رادیکالەکان و مزگەوتەکان. لە نێوەندی ئەم هەلومەرجانەدا، تیرۆریستان خاکێکی بەپیتی سازدانی جیهادیستیان دۆزییەوە. پاشان نۆزدە تیرۆریست لە خۆرهەلاتی ناوەڕاست لەدایك بوون، لەناو فڕۆکەکان لە ئەمریکا دەرکەوتن. پاش ١١ی سێپتێمبەر، بڕیارمدا کە ئەو سەقامگیرییەی ئێمە لە بڕەوپێدانیدا بووین، سەرابێکە. تەرکیزی ئەجێندای ئازادی لەسەر خۆرهەلاتی ناوەڕاست دەبێت.

***

شەش مانگ بەر لەوەی سەرۆکایەتی بگرمە دەست، وتوێژەکانی ئاشتیی کامپ دەیڤد لەنێوان ئیسرائیلی و فەلەستینییەکاندا شکستی هێنا. سەرۆك کلینتن بێ وچان کاری کردبوو بۆ پێکەوە ئاشتکردنەوەی سەرۆك وەزیران ئێهود باراك و سەرکردەی فەلەستینی یاسر عەرەفات. باراك پێشنیارێکی بەخشندانەی خستەڕوو بۆ رادەستکردنی بەشی هەرە زۆری کەناری خۆرئاوا و غەزە، دوو ناوچەی زۆرینە فەلەستینی کە لەلایەن هێزەکانی ئیسرائیلەوە داگیر کرابوون و نشینگەی ئیسرائیلی تیادا بونیادنرابوون. عەرەفات رەفزی بەو دابوو.

دوو مانگ دواتر، لە سێپتێمبەری ٢٠٠٠دا، بێزاری لەسەر رێککەوتننامەی ئاشتی- هاوکات لەگەل سەردانی وروژێنەری سەرکردەی ئیسرائیلی ئارێل شارۆن بۆ حەرەمی شەریفی ئۆرشەلیم- دووەم ئینتیفازەی لێ کەوتەوە. توندڕەوانی فەلەستینی، کە زۆرێکیان پەیوەندییان بە گروپی تیرۆریستی حەماسەوە هەبوو، لێشاوێك هێرشی تیرۆریستییان لەدژی مەدەنییە بێ گوناهەکانی ئیسرائیل ئەنجامدا. من سەرزەنشتی سەرۆك کلینتنم نەکرد نە لە بەرانبەر شکستهێنانی کامپ دەیڤد و نە بۆ ئەو توندوتیژییەش کە بەدوایدا هات. سەرزەنشتی عەرەفاتم کرد. ئەمریکا، ئەوروپا و یوئێن ناوچە فەلەستینییەکانیان پڕکردبوو لە کۆمەکی گەشەپێدان. بەشێکی چاکی رەوانەی حسابی بانکیی عەرەفات کرابوو. ئەو شوێنێکی لە لیستی گۆڤاری فۆربز بۆ دەولەمەندترین "پاشا، شازادە و دیکتاتۆرەکان"ی جیهان گرتبوو. لەگەل ئەوەشدا،

میللەتەکەی لە هەژاری، نائومێدی و توندڕەویدا گیری خواردبوو. بۆ کەسێک کە وەرگری خەڵاتی ئاشتی بوو، بە دڵنیاییەوە پێنەدەچوو زۆر بایەخ بە ئاشتی بدات.

گەلی ئیسرائیلی بە شێوازی هەر سیستەمێکی دیموکراسی وەڵامی هێرشە توندوتیژەکەیان دایەوە: ئەوان سەرکردەیەکیان هەڵبژارد کە بەڵێنی پارێزگاریکردنی پێدان، ئەو کەسەش ئاریێل شارۆن بوو. من یەکەم جار لە ١٩٩٨دا شارۆنم ناسی، کاتێک من و لۆرا لەگەڵ سێ هاوتای حاکم چووینە ئیسرائیل بە گەشتێک کە (هاوپەیمانێتیی جولەکەی کۆماری) سپۆنسەرییان کردبوو.

سەردانەکە یەکەم گەشتی من بوو بۆ خاکی پیرۆز. یادەوەری هەرە لەیادنەچووم ئەو کاتە بوو کە ئاریێل شارۆن، ئەو کاتە وەزیرێک بوو لە کابینەی بنیامین نەتەنیاهو، گەشتێکی هەلیکۆپتەری لەناو وڵاتەکەدا بۆ رەخساندین. شارۆن پیاوێکی زل، فەرماندەیەکی تانکی حەفتا ساڵەی پێشوو بوو کە لە هەموو جەنگەکانی ئیسرائیلدا بەشداری کردبوو. ماوەیەکی کورت پاش ئەوەی کە هەلیکۆپتەرەکە بەرز بووەوە، ئاماژەی کرد بە پەڵەیەک لەسەر ئەرزەکە. ئەو بە دەنگە گڕەکەی بە شانازییەوە وتی "من لەوێ شەڕم کردووە". کاتێک کۆپتەرەکە رووی کردە کەناری خۆرئاوا، ئاماژەی کرد بە کۆمەڵە ماڵێکی دابڕاو، وتی "من ئەو نشینگەیەم بونیادناوە". شارۆن دەستی هەبووە لە بەرنامەی (ئیسرائیلی گەورەتر)دا کە سازشەکانی لەسەر خاک رەت دەکردەوە. ئەو شارەزای هەر ئینچێک لە خاکەکە بوو و پێنەدەچوو کە نیازی بێت هیچی لێ بگەڕێنێتەوە.

لە کاتێکی تر دا شارۆن بە ئاماژە کردن بە دووریی نێوان دەریا و سنوورەکانی ١٩٦٧ وتی "لێرەوە وڵاتەکەمان تەنیا نۆ مایل فراوان بوو". دواتر من بە گاڵتەوە وتم "ئێمە لە تەکساس راڕەوی لەوە درێژترمان هەیە". من سەرم سوڕمابوو بە هەستیاریی ئیسرائیل لە ناوچەیەکی شەڕانگێزدا. لەو کاتەوەی کە سەرۆک هاری ترومان تەحەدای وەزیری دەرەوەی کرد لە رێگەی دانان بە ئیسرائیل لە ساڵی ١٩٤٨دا، ئەمریکا بووەوە باشترین هاوڕێی دەوڵەتە جولەکەکە. من گەیشتبوومە ئەو قەناعەتەی کە بەرپرسیارێتیمان لەئەستۆیە بۆ هێشتنەوەی پەیوەندییەکە بە بەهێزی.

کەمێك زیاتر لە دوو ساڵ دواتر، بە تەلەفۆن لە ئۆفیسی ئۆڤاڵەوە پەیوەندیم کرد بە شارۆنەوە بۆ پیرۆزبایی لێکردنی بە هەڵبژاردنی وەکو سەرۆك وەزیران. ئەو وتی "لەوانەیە، پاش ئەو هەموو ساڵە و ئەو هەموو جەنگەی کە بەشداریم تیایانا کرد، ئێمە ئاشتی بەرقەرار بکەین لە ناوچەکەدا".

لە ١ی حوزەیرانی ٢٠٠١دا، خۆتەقێنەرەوەیەك بیست و یەك ئیسرائیلی لە یانی شەوانەی (دۆلفیناریەم) لە تەل ئەبیب کوشت. هێرشەکانی تر بۆ سەر پاسە ئیسرائیلییەکان، وێستگەکانی شەمەندەفەر و بازاڕەکان بوون. هێزەکانی بەرگریی ئیسرائیلی چەند ئۆپەراسیۆنێکیان کردە ئامانج لە ناو قەڵاکانی حەماسدا، بەڵام فەلەستینییە بێ گوناهەکان- لەوانەش پێنج کوڕ کە لەو ڕۆژەدا دەچوون بۆ قوتابخانە- لە ماوەی ئۆپەراسیۆنەکاندا کوژران.

من تووشی شۆك بوو لەبەرانبەر ئەو توندوتیژی و قوربانی لێکەوتنەوەیەی هەردوولا. بەڵام ئەوەم ڕەتکردەوە کە هاوتاییەکی ئەخلاقی قبوڵ بکەم لەنێوان هێرشە خۆکوژییەکانی فەلەستینییەکان بۆ سەر بێ گوناهانی مەدەنی و کردەوە سەربازییە ئیسرائیلییەکان کە بۆ پارێزگاری لە خەڵکەکانیان بوو. پاش ١١ی سێپتێمبەریش دیدەکانم وردتر بوونەوە. ئەگەر ئەمریکا مافی ئەوەی هەبووبێت بەرگری لە خۆی بکات و ڕێگە بگرێت لە هێرشەکانی داهاتوو، ئەوا دەبووایە سیستەمە دیموکراتییەکانی تریش ئەو مافانەیان هەبێت.

من لە ماوەی یەکەم ساڵی سەرۆکایەتیمدا سێ جار قسەم لەگەڵ عەرەفات کردووە. ئەو گفت و لفتی خۆش بوو و منیش لە بەرانبەردا نەرم و نیان بووم. بەڵام ئێمە ئەوەمان لێ چاوەڕێ دەکرد کە ڕووبەڕووی توندڕەوی بێتەوە. لە شوباتی ٢٠٠١دا پێم وت "دەزانم ئەمانە پرسی قورسن بۆ تۆ و گەلەکەت، بەڵام باشترین ڕێگە بۆ هەڵبڕینی ئەمە و دەستکردن بە چارەسەرکردنی بارودۆخەکە ئەوەیە کە توندوتیژی لە هەرێمەکە بوەستێنرێ".

له کانوونی دووەمی ٢٠٠٢دا، هێزی دەریایی ئیسرائیلی کەشتییەکی لە دەریای سووردا وەستاند کە پێی دەوترا (کارین ئەی). چەندە چەکی کوشندەی تێدابوو. ئیسرائیلییەکان بروایان وابوو کە کەشتییەکە لە ئێرانەوە بەرەو شاری غەزەی فەلەستینی هاتووە.

عەرەفات نامەیەکی نارد کە تیایدا بێ گوناهی خۆی خستبووە ڕوو. ئەو نوسیبووی "بەقاچاخ هاتنی چەک بە تەواوی دژیەکە لەگەڵ پابەندیی دەسەڵاتی فەلەستینی بە پرۆسەی ئاشتییەوە". بەڵام ئێمە و ئیسرائیلییەکان بەڵگەمان هەبوو کە پێچەوانەی بانگەشەکەی سەرکردەی فەلەستینی بوو. عەرەفات درۆی لەگەڵ کردبووم. من قەت جارێکی تر متمانەم پێی نەکردەوە. لە ڕاستیدا، جارێکی تر هەر قسەم لەگەڵیدا نەکردەوە. بە هاتنی بەهاری ٢٠٠٢، من گەیشتبوومە ئەو ئەنجامەی کە تا ئەو کاتەی عەرەفات لە دەسەڵاتدایە ئاشتی ئاسان نابێ.

***

میری جێنشین عەبدوڵلا پرسیاری لێم کرد "بەرازەکە کەی رامەڵلا جێ دەهێڵێت؟" ئەمە ٢٥ی نیسانی ٢٠٠٢ بوو. دیار بوو کە فەرمانڕەوای سعودی دڵی بە ئارێل شارۆن خۆش نەبوو. لەو کاتەوەی کە سەرۆک فرانکلین ڕۆزفێلت لە ساڵی ١٩٤٥ لەسەر کەشتیی (یوئێس ئێس کوینسی) لەگەڵ دامەزرێنەری سعودییەی عەرەبی (شا عەبدولعەزیز) کۆببووەوە، پەیوەندی ئەمریکا لەگەڵ ئەو وڵاتەدا دژوارترین بوو. ئەو وڵاتە عەرەبییە سوننیە پێنجەم وڵاتی نەوتی جیهانە و وەکو پاسەوانی کەعبەی پیرۆز و مەدینە کاریگەرییەکی بێ رادەی هەیە لەناو موسڵمانانداا. من میری جێنشین عەبدوڵلام بانگهێشت کردبوو -یەکێك لە سی و شەش کوڕەکەی عەبدولعەزیز- بۆ کێڵگەکەمان لە کراوفۆرد وەکو شێوازێکی بەهێزکردنی پەیوەندییە کەسییەکەمان. لە چاوەڕوانیی لوتکەی عەرەبیی ئازاری ٢٠٠٢دا لە بەیروت، میری جێنشین بە ڕاگەیاندنی پلانێکی نوێی ئاشتی، سەرکردایەتییەکی بەهێزی پیشاندا. بەپێی ڕوئیای ئەو، ئیسرائیل خاکەکەی دەگەڕاندەوە بۆ فەلەستینییەکان، ئێمە دەوڵەتێکی سەربەخۆمان بونیاد دەنا کە تیرۆری ڕەت دەکردەوە و دانی دەنا بە مافی بوونی ئیسرائیل. وردەکاریی زۆر هەبوو بۆ دانوستان لەسەر کردن، بەڵام چەمکەکە ئەوە بوو کە من پشتگیریم لێ دەکرد.

ئێوارەی لوتکەی عەرەبی، خۆتەقینەرەوەیەکی حەماس چووە ناو ژووری نان خواردنی هۆتێلێکی پڕ لەو خەڵکەی کە ئاهەنگی جەژنی فوسحی جولەکەیان دەگێڕا لە شاری ئیسرائیلیی (نەتانیا). میوانێك وتی "لەپڕ بوو بە دۆزەخ. بۆنی دوکەڵ و تۆز لەناو دەممدا بوو و گوێم دەزرینگایەوە". وەکو یەکێك لە خوێناویترین دووەم ئینتیفازە، تەقینەوەکە بووەهۆی کوژرانی ٣٠ ئیسرائیلی و بریندار بوونی ١٤٠ کەس.

لە بەرانبەردا، سەرۆك وەزیران شارۆن فرمانیدا بە هێرشێکی رامالین بەناو کەناری خۆرئاوادا. هێزە ئیسرائیلییەکان بەخێرایی سەدان چەکداری گومانلێکراویان گرت و چواردەوری عەرەفاتیان گرت لە ئۆفیسەکەیدا لە رامەڵڵا. شارۆن رایگەیاند کە دیوارێکی ئەمنی دادەنێت بۆ جیاکردنەوەی ئۆردوگا ئیسرائیلییەکان لە فەلەستینییەکان لە کەناری خۆرئاوادا. پەرژینەکە بەشێوەیەکی بەربڵاو ئیدانە کرا. من هیوادار بووم کە ئەمە ئەو ئاسایشە دابین دەکات کە ئیسرائیلییەکان پێویستیان پێی بوو بۆ بڕیاردانێکی سەختی ئاشتی.

بەشێوەیەکی تایبەت قسەم لەگەڵ شارۆن کرد و داوام لێکرد کە هێرشەکە کۆتایی پێ بێنێت کە ئاکامی پێچەوانەی لێ کەوتبووەوە. عەرەفات لە ژێر رووناکایی مۆمدا گفتوگۆیەکی تەلەفزیۆنی ئەنجامدا و وەکو پاڵەوانێکی قوربانی دەردەکەوت. شارۆن هەنگاوینا. من لە باخچەی رۆز بە شێوەیەکی ئاشکرا وتارێکم پێشکەش کرد و داوام لێکرد کە بکشێتەوە. وتم "ئیتر بەسە". لەگەڵ ئەوەشدا شارۆن نقەی نەکرد.

بەهاتنی ئەو کاتەی کە میری جێنشین گەیشتە کێڵگەکەمان، پلانی ئاشتییەکەی وەلانرابوو. ئەو لە بەرانبەر توندوتیژییەکە تووڕە بوو، رقی لە شارۆن هەڵسابوو و –منیش زوو بۆم دەرکەوت– کە لەمن بێزارە.

میری جێنشین پیاوێکی نەرم و نیان، خاکی و تەقریبەن شەرمن بوو. ئەو لەسەرخۆ قسەی دەکرد، کحولی نەدەخواردەوە و رۆژانە پێنج جار نوێژی دەکرد. لە ماوەی هەشت ساڵدا، من قەت بەبێ رۆبە تەقلیدییەکانی نەمبینیبوو.

پاش مشتومڕێکی کورت، عەبدوڵڵا داوای کاتێکی تەنیای کرد لەگەڵ وەزیری دەرەوە و باڵیۆزەکەی. چەند خولەکێك دواتر. وەرگێڕی وەزیری دەرەوە، جەمال هیلال بە

دەموچاوێکی گرژەوە هاتە لام و وتی "جەنابی سەرۆك، وابزانم سعودییەکان دەیانەوێ بڕۆن".

من سەرم سوڕما، وامزانی کۆبوونەوەکە بەباشی بەڕێوە دەچێت. بەڵام جەمال ڕوونی کردەوە کە سعودییەکان پێشبینی ئەوەیان لە من کردووە شارۆن قایل بکەم لە رامەڵلا بکشێتەوە بەر لەوەی میری جێنشین بگات. ئێستاش ئەوان پێداگرییان لەسەر ئەوە دەکرد کە من ڕاستەوخۆ پەیوەندی بکەم بە سەرۆك وەزیرانی ئیسرائیلەوە. من نیازم نەبوو بەو شێوەیە مامەڵە لەگەڵ دیپلۆماسیدا بکەم. من کۆڵنم نارد بۆ ژووری دانیشتن بۆ زانینی ئەوەی کە چ باسە. ئەو جەختی لەوە کردەوە کە میوانەکان بەرەو دەرگا دەڕۆن. پێدەچوو پەیوەندیی گرنگی ئەمریکا لەگەڵ سعودیە بە جددی بشکێت. من لەگەڵ جەماڵ بەرەو ژووری دانیشتن چووم و داوای ساتێکی تەنیام کرد لەگەڵ میری جێنشیندا. من لە لێدوانەکانی پێشینەدا دوو شتی جێ سەرنجم لەبارەیەوە خوێندبووەوە. یەکێکیان ئەوە بوو کە ئەو ئیمانداری بە تەقوایە. ئەویتریشیان ئەوە بوو کە کەیفی بە کێڵگەکەی دێت.

وتم "جەنابی پاشا، دەمەوێ لەبارەی ئایینەوە قسە بکەین". من باسی بڕوای خۆم کرد بە مەسیحییەت و ڕۆڵی ئایین لە ژیانمدا. هیوادار بووم ئەویش لەلایەن خۆیەوە بابەت بکاتەوە بە قسە کردن لەبارەی ئیمانەکەیەوە. ئەو لە میزاجێکی وادا نەبوو کە وتوێژ بکات.

لە دوایین تەقەلادا، وتم "پێش ئەوەی تۆ بڕۆیت، دەتوانم کێڵگەکەمت پیشان بدەم؟" ئەو سەری لەقاند. چەند خولەکێك دواتر، میری جێنشین سواری پیکەبی فۆرد بوو. پاشان من، ئەو و جەمال بە گەشتێك بەناو موڵکەکەدا دەرچووین. ئاماژەم کرد بە جۆرە جیاوازەکانی درەخت و ئەو گژوگیا چیمەنەی کە لۆرا چاندبووی و ئەو گاڕانەش کە دەلەوەڕا. میری جێنشین بە بێدەنگی دانیشتبوو. من بەرەوپێشچوونێکی وەهام نەبوو.

پاشان گەیشتینە بەشێکی لاتەریکی موڵکەکە. قەلێکی مێیینەی تەنیا لەسەر ڕێگاکە وەستابوو. من پیکەبەکەم وەستاند. قەلەکە لە شوێنی خۆی نەجولا. میری جێنشین پرسیاری کرد "ئەوە چییە؟"

وتم ئـەوە قەلـە. وتم "بنیامین فـرانکلین ئەوەنـدەی کـەیفی بـە قـەل هـاتووە کـە ویستبوویەتی ببێتە باڵندەی نیشتمانیی ئەمریکا".

لەپڕ هەستم کرد میر قۆڵی گرتم. وتی "براکـەم، ئەمـە نیشانەیەکە لـە ئـەڵڵاوە. ئەمە ئاماژەیەکی باشە".

مـن هـەرگیز لـە گرنگیـی باڵندەکـە تێنەگەیشتم، بـەڵام هەسـتم کـرد کـە گرژییەکـە دەڕەوێتەوە. کاتێکە گەڕاینەوە بۆ ناو خانووەکە، یاریدەدەرەکانمان پێیان سەیر بوو کە وتمان ئامادەی نان خواردنی نیوەڕۆین. ڕۆژی دواتر، پەیوەندییەکی تەلەفۆنیم لە دایك و باوکمەوە پێگەیشت. میری جێنشین لە هوستن لایدابوو بۆ سـەردانکردنیان. دایکم وتی ئەو فرمێسك لە چاویدا قەتیس بووە کە کاتەکەی لە کراوفۆرد گێڕاوەتەوە و باسی لـەوە کـردووە کــە دەتــوانین چ ســتێك پێکــەوە بەدەســت بێــنین. لــە پاشمــاوەی سەرۆکایەتییەکەمدا، پەیوەندیم بە میری جێنشینەوە- کە بە زوویی دەبوو بـە شا- زۆر نزیکتر بووەوە. پێشتر قەت قەلێکی مێیینەم لەو بەشەی موڵەکەمدا نەبینیبوو و لـەو کاتەشەوە جارێکی تر نەمبینییەوە.

***

لەکاتێکدا کە زیاتر بیرم لە پشێوی نـاو خۆرهـەڵاتی ناوەڕاست دەکردەوە، گەیشتمە ئـەو ئەنجامـەی کـە کێشەی بنـەڕەتی بریتییـە لـە نـەبوونی ئـازادی لـە سـەر خـاکی فەلەستینی. بە نەبوونی دەوڵەتێك، فەلەستینییەکان شوێنی دروستیان نەبوو لە جیهاندا. بە نـەبوونی دەنگ لـە ئایندەیاندا، فەلەستینییەکان ئامادەیـان تێدا بـوو کـە لەلایـەن توندڕەوانەوە تەیار بکرێن. بە نـەبوونی سـەرکردەیەکی فەلەستینیی هەڵبژێردراوی ڕەوا کە پابەند بێت بە شەڕ دژی تیرۆر، ئیسرائیلییەکان دۆستێکی جێ متمانـەیان نـەبوو بۆ ئاشتی. مـن بـڕوام وابـوو کـە چارەسـەرەکە ئەوەیـە دەوڵەتێکی فەلەستینی دیموکرات هەبێت کە لەلایەن ئەو کاربەدەستە هەڵبژێردراوانەوە ڕێبەرایەتی بکرێ کە وەڵامی خـەڵك دەدەنەوە، تیرۆر ڕەت دەکەنەوە و سۆراخی ئاشتی دەکەن لەگەڵ ئیسرائیلدا.

لەکاتێکدا کـە لـە بـەهاری ٢٠٠٢دا توندوتیژی لـە خـاکی پـیرۆز پـەرەی دەسـەند، مـن بڕیارمدا کە ئێمە پێویستمان بە گۆڕەرێکی یارییەکە هەیـە. مـن بـە وتـارێکی گـەورە لـە

باخچەی رۆز، پابەندێتیم بە دیموکراسی فەلەستینی خستەڕوو. من یەکەم سەرۆک دەبووم کە بە ئاشکرا بانگەوازی دەوڵەتێکی فەلەستینی بکاتە بابەتێکی بەرنامەکەی. هیوادار بووم کە دانانی روئیایەکی بوێرانە یارمەتیدەر بێت بۆئەوەی هەردوولا بڕیاری سەختی پێویست بدەن بۆ ئاشتی.

بیرۆکەکە ناکۆکی نایەوە، کە لە ئیدارەکەی منەوە دەستی پێکرد. لەکاتێکدا کە کۆندی و ستیڤ هادلی پشتیوانییان دەکرد، دیک چێنی، دۆن رەمسفیلد و کۆلن پاوڵ پێیان وتم کە نابێ وتارەکە پێشکەش بکەم. دیک و دۆن خەمی ئەوەیان بوو کە پشتگیریی لە دەوڵەتی فەلەستینی لە نێوەندی ئینتیفازەدا وەکو پاداشتکردنی تیرۆریزم دەربکەوێت. کۆلن نیگەرانی ئەوە بوو کە بانگەواز بۆ سەرکردایەتییەکی فەلەستینیی نوێ عەرەفات تەریق بکاتەوە و دەرفەت بۆ چارەسەرێکی دانوستان لەسەر کراو کەم بکاتەوە.

من لە مەترسییەکان تێگەیشتم، بەڵام قەناعەتم وابوو کە دەوڵەتێکی فەلەستینیی دیموکرات و سەرکردایەتییەکی فەلەستینیی نوێ تاکە رێگەن بۆ بونیادنانی ئاشتییەکی نوێ. لە رێکەوتی ٢٤ی حوزەیرانی ٢٠٠٢دا لە باخچەی رۆز وتم "روئیای من دوو دەوڵەتە کە لە ئاشتی و ئاسایشدا لە تەک یەکتریدا دەژین". "بێگومان مەحاڵە ئەو ئاشتییە دەستەبەر بکەین تا ئەو کاتەی کە هەردوو لایەن شەر دژی تیرۆر دەکەن. من بانگەوازی گەلی فەلەستین دەکەم کە سەرکردەی نوێ هەڵبژێرن، ئەو سەرکردانەی کە تیرۆر سازشیان پێ ناکات. من داوایان لێدەکەم کە دیموکراسییەکی کرداری بونیاد بنێن لەسەر بنەمای هەڵکردن و ئازادی. ئەگەر گەلی فەلەستینی بەشێوەیەکی چالاک سۆراخی ئامانجەکانی بکات، ئەمریکا و جیهان بەشێوەیەکی چالاک پشتگیریی تەقەلاکانیان دەکەن".

پشتگیریم لە دەوڵەتی فەلەستینی کەوتە ژێر کۆنترۆڵی بانگەوازم بۆ سەرکردایەتییەکی نوێ. لە سەردێڕێکدا نوسرابوو "بوش داوای لەسەرحوکم لادانی عەرەفات دەکات". ماوەیەکی کورت پاش وتارەکەم، دایکم پەیوەندی پێوە کردم و وتی "دەنگ و باسی یەکەم سەرۆکی جولەکە چۆنە؟" هەستێکی پێکەنیناویم هەبوو کە بۆچی ئەو لەگەڵ

بەرنامەکەی مندا ناکۆکە. ئەمە بەو مانایە بوو کە باوکیشم هەروایە. من سەرم سوڕنەما. لەکاتێکدا کە پێم وابوو عەرەفات سەرکردەیەکی شکستخواردووە، زۆر کەس لە جیهانی بەرنامەی دەرەوەدا ئەو دیدەیان قبوڵ بوو کە عەرەفات نوێنەرایەتی باشترین هیوای ئاشتی دەکات. من بە توانجە زیرەکانەکەی دایکم پێکەنیم، بەڵام لە دڵەوە پەیامەکەیم وەرگرت: من لەگەڵدام بۆ ناڕەزایەتییەکی جددی.

ڕۆژی پاش وتارەکە، ڕۆیشتم بۆ کاناناسکیس، کەنەدا بۆ کۆبوونەوەی ساڵانەی گروپی هەشت. وا دادەنرا کە لوتکەکە سەرنج بخاتەسەر کۆمەکی دەرەکی، بەڵام وتارەکەم لەسەر خۆرهەڵاتی ناوەڕاست لە هۆشی هەمووان‌دا بوو. سەر لەبەیانیی پێش کۆبوونەوەی یەکەم خۆم کرد بە هۆڵی وەرزشییەکەدا بۆ بینینی تۆنی بلێر. ئەو بە خەندەیەکەوە وتی "جۆرج بە ڕاستی زریانێکی تەواوت بەرپا کردووە".

ئەوانیتر کەمتر کۆک بوون. جاک شیراک، سەرۆکی کۆمسیۆنی ئەورووپا ڕۆمانۆ پرۆدی و سەرۆک وەزیرانی کەندا جین شرێتین بە ڕوونی ناکۆک بوون. بە رەفزکردنی عەرەفات، براوەی راگەیەنراوی خەڵاتی نۆبڵی ئاشتی، من دیدەکانی ئەوانم ئاوەژوو دەکردەوە. من پێم وتن کە من بڕوام وایە کە عەرەفات قەت نابێتە هاوکارێکی متمانەپێکراو بۆ ئاشتی.

کۆلن بە خستنەڕووی پلانێکی چڕوپڕ بۆ گواستنەوە لە وتارەکەی منەوە بۆ دەوڵەتی فەلەستینی، پێشرەوی کرد. ئەمە پێی دەوترا نەخشەڕێگە کە سێ قۆناغی گرتبووەخۆی: یەکەم، فەلەستینییەکان هێرشی تیرۆریستی دەوەستێنن، شەڕی گەندەڵی دەکەن، ریفۆرمی سیستەمە سیاسییەکەیان دەکەن و هەڵبژاردنی دیموکراتی ئەنجام دەدەن. لە بەرانبەردا، ئیسرائیل لە نیشینگە مۆڵەت نەدراوەکان دەکشێتەوە. لە قۆناغی دووەمدا، هەردوولا دانوستانی ڕاستەوخۆ ئەنجام دەدەن کە دەبێتەهۆی دروستبوونی دەوڵەتی فەلەستینیی کاتی. لە قۆناغی سێیەمدا، فەلەستینی و ئیسرائیلییەکان پرسە هەرە ئاڵۆزەکان چارەسەر دەکەن، لەوانەش دۆخی ئۆرشەلیم، مافەکانی فەلەستینییە پەنابەرەکان و سنوورە جێگیرەکان. وڵاتانی عەرەبیش پشتیوانیی دانوستانەکان دەکەن و پەیوەندیی ئاسایی لەگەڵ ئیسرائیلدا بەرقەرار دەکەن.

بە هاندان لەلایەن تۆنی بلێرەوە، من بڕیارمدا نەخشەڕێگە لە بەهاری ٢٠٠٣دا، بە ماوەیەکی کورت پاش لابردنی سەدام حسێن لەسەر حوکم، رابگەیەنم. هەم ئیسرائیلییەکان و هەم فەلەستینییەکان پشتگیریی پلانەکەیان کرد. لە سەرەتاکانی حوزەیراندا، من لە شەرەم ئەلشەیخی میسر، چاوم کەوت بە سەرکردە عەرەبەکان بۆ جەختکردنەوە لە پابەندیی خۆم بە ئاشتی و داوا لێکردنیان کە بێنە ناو پرۆسەکەوە. پاشان سەفەرم کرد بۆ عەقەبە، ئوردن، بۆ دانیشتنێك لەگەڵ نوێنەرانی فەلەستینی و ئیسرائیلی. بە لەبەرچاوگرتنی ئەو خوێڕێژییە تازەیە، پێشبینی دانیشتنێکی گرژم کرد. بەڵام مایەی سەرسوڕمان بوو کە دۆخەکە ئارام و دۆستانە بوو. روون بوو کە زۆرێك لە سەرکردەکان لە تەقەلاکانی پێشووی ئاشتییەوە یەکتریان دەناسی. بەڵام دەمزانی کە مێژوویەکی زۆر هەیە کۆنترۆڵ بکرێت. محەمەد زەحلان، سەرۆکی ئاسایشی فەلەستینی، حەزی کرد ئەوە بیر خەڵکەکە بێنێتەوە کە لە کوێ فێری عیبری بووە: لە زیندانەکانی ئیسرائیلدا.

فەلەستینییەکان بەناوهێنانی سەرۆك وەزیرانێك لە لوتکەکەدا (مەحمود عەباس) هەنگاوێکی گرنگیان نابوو. عەباس پیاوێکی دۆستانە بوو و پێدەچوو کە بە راستی ئاشتی بوێت. ئەو کەمێك لەخۆی نادڵنیا بوو، ئەمەش بەشێکی بەهۆی ئەوەوە بوو کە ئەو هەڵنەبژێردرابوو و بەشێکی بەهۆی ئەوەی کە هەوڵی دەدا لە سێبەری عەرەفات بێتە دەرەوە. ئەو وتی کە ئامادەیە رووبەڕووی تیرۆریستان بێتەوە. بەڵام بەر لەوەی قسەکانی بەکردار بکات پێویستی بە پارە و هێزی ئاسایشی جێ متمانە هەبوو.

پاش کۆبوونەوە رەسمییەکە، بانگی شارۆن و عەباسم کرد بۆ پیاسەیەك بەسەر فریزەکەدا. لەژێر درەختەکانی خورمادا، پێم وتن کە ئێمە دەرفەتێکی مێژووییمان هەیە بۆ ئاشتی. ئاریل شارۆن روونی کردەوە- لە عەقەبە و دواتر لە وتارە گرنگەکەیدا لە شاری هێرزلیا- کە ئەو وازی لە بەرنامەی (ئیسرائیلی گەورەتر) هێناوە، کە بەرەوپێشچوونێکی گەورە بوو. ئەو لە عەقەبە وتی "لە بەرژەوەندی ئیسرائیله کە حوکمی فەلەستینییەکان نەکات، بەڵکو فەلەستینییەکان خۆیان لە دەوڵەتی خۆیاندا حوکمڕانی بکەن". عەباس رایگەیاند "پێویستە ئینتیفازەی چەکدارانە کۆتایی بێت و

پێویستە ئێمە لە گەشتەکەماندا بەرەو کۆتاییهێنان بە داگیرکاری و ئازاری فەلەستینی و ئیسرائیلییەکان ئامرازی ئاشتییانە بەکاربێنین". ئێمە رێگایەکی درێژمان لەبەردەمدا بوو، بەڵام ئەمە چرکەساتێکی ئومێدەوارانە بوو لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا.

لە نیسانی ٢٠٠٤دا، ئاریێل شارۆن هاتە واشنتن بۆ ئاگاداکردنەوەی من لە بڕیارێکی مێژوویی: ئەو پلانی دانابوو بۆ کشانەوە لە نشینگەکانی ئیسرائیل لە غەزە و هەندێ بەشی باکووری کەناری خۆرئاوا. وەکو باوکی بزووتنەوەی نیشتەجێکردن، شتێکی ئازاربەخش دەبێت بۆی کە بە خێزانە ئیسرائیلییەکان بڵێت دەبێ خانووەکانیان چۆڵ بکەن. بەڵام هەنگاوە بوێرانەکەی دوو ئامانجی گرنگی بەدیهێنا: ئیسرائیلی لە داگیرکاریی پڕتێچوونی غەزە دەرباز کرد و بە گەڕانەوەی خاکەکە بۆ ژێر دەستی فەلەستینییەکان، وەکو قیستێك بوو بۆ سەر دەوڵەتێکی ئایندە.

هیوادار بووم کە عەباس بە هەنگاوێکی پۆزەتیڤ لەگەڵ بڕیارە سەختەکەی شارۆندا بێتەوە. بەڵام لە سێپتێمبەری ٢٠٠٣دا، سەرۆك وەزیران عەباس دەستی لەکارکێشایەوە پاش ئەوەی عەرەفات هەموو جارێك بەربەستی بۆ دروستکردبوو. رێك ساڵێك دواتر، عەرەفات مرد. لە کانوونی دووەمی ٢٠٠٥دا، دەنگدەرانی فەلەستینی بۆ یەکەم جار لە ماوەی دەیەیەکدا چوونە بەردەم سندوقەکانی دەنگدان. عەباس لەسەر بەرنامەیەك بۆ رێگرتن لە توندوتیژی و دەستپێکردنەوەی بەرەوپێشچوون رووەو دەوڵەتێکی فەلەستینی، هەڵمەتی سازدا. ئەو بە زۆرینەی دەنگ هەڵبژێردرا.

ئەو کەوتە کارکردن بۆ هێنانەکایەی دامەزراوەکانی دەوڵەتی دیموکراتی و داوای هەڵبژاردنی ئەنجومەنی یاسادانانی کرد.

حزبەکەی عەباس، فەتح، هێشتا نغرۆ بوو لە گەندەڵیی سەردەمی عەرەفاتدا. ئەلتەرناتیڤی سەرەکی، حەماس بوو، ئەو رێکخراوە تیرۆریستییەی کە بەهەمان شێوە دەزگایەکی سیاسی باش رێکخراوی هەبوو. ئاسۆی سەرکەوتنی حەماس، بەشێوەیەکی دەرکپێکراو ئیسرائیلییەکانی نیگەران کرد.

من پشتگیریی هەڵبژاردنەکانم کرد. ئەمریکا نەیدەتوانی لە پێگەیەکدا بێت کە پاڵپشتیی هەڵبژاردنەکان بکات لەو حاڵەتەدا نەبێ کە کەیفمان بە ئەنجامەکە بهاتایە.

دەمزانی کە هەڵبژاردنەکە تەنیا هەنگاوێك لە دیموکراسییەوە دوور دەبێ. هەر کەسێك بیبردایەتەوە ئەوا بەرپرسیارێتییەکانی حوکمڕانی بۆ دەمایەوە- بونیادنانی ڕێگا و قوتابخانە، سەپاندنی حوکمی یاسا و بونیادنانی دامەزراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی. ئەگەر ئەدائیان باش بووایە، ئەوا هەڵدەبژێردرانەوە. ئەگەر نا، ئەوا خەڵکی هەلێکیان دەبوو بۆئەوەی ڕەئی خۆیان بگۆڕن. ئەنجامەکە هەرچییەك بووایە، هەڵبژاردنی ئازاد و عادیلانە ڕاستییەکەی دەردەخست.

لە ٢٥ی کانوونی دووەمی ٢٠٠٦دا، ڕاستییەکە ئەوە بوو کە فەلەستینییەکان ماندوو ببوون لە گەندەڵیی فەتح. حەماس ٧٤ کورسی لە ١٣٢ کورسی بردەوە. هەندێ لایەن ئەنجامەکانیان وەکو تەگەرەیەکی ئاشتی لەقەڵەمدا. من زۆر دڵنیا نەبووم. حەماس سەرنجی خستبووە سەر بەرنامەی حکومەتێکی خاوێن و خزمەتگوزاریی گشتیی پێویست نەك جەنگ لەگەڵ ئیسرائیل.

حەماس بەهەمان شێوە سوودی بینیبوو لە هەڵمەتی لاوازی فەتح. فەتح زۆرجار چەندەها کاندیدی بۆ هەمان پۆست دەپاڵاوت کە بووەهۆی پەرتکردنی دەنگەکانی حزبەکە. هەڵبژاردنەکە ڕوونی کردەوە کە فەتح دەبێ حزبەکەی مۆدێرنیزە بکات. بەهەمان شێوە لەناو حەماسدا بڕیارێکی سەپاند: ئایا بەڵێنەکەی پیادە دەکات بۆ حوکمڕانی وەکو حزبێکی ڕەوا یان پەنا دەباتەوە بەر توندوتیژی.

***

لە ئازاری ٢٠٠٦دا، دەنگدەران چوونەوە بەردەم سندوقەکان بۆ هەڵبژاردنێکی تر. ئەمەیان لە ئیسرائیل بوو. پێش دوو مانگ، شارۆن تووشی جەڵتەیەکی پەکخەر ببوو. من هەمیشە بیرم لەوە کردووەتەوە ئاخۆ چ شتێك شیاو دەبوو ئەگەر هێشتا ئارێل لەسەر حوکم بووایە. ئەو ڕێزی خۆی لەسەر ئاسایش بونیاد نابوو، متمانەی گەلی ئیسرائیلی هەبوو و من بڕوام وابوو کە دەتوانێ ببێتە بەشێك لە ئاشتییەکی مێژوویی.

دەنگدان بە سەرۆك وەزیرانی نوێ دەبووە تاقیکردنەوەیەك بۆ پابەندیی ئیسرائیل بە چارەسەری دوودەوڵەتەوە. جێگری سەرۆك وەزیران ئێهود ئۆلمێرت هەڵمەتێکی چالاکی سازدا بۆ پشتیوانی لێکردنی. من لە گەشتی ١٩٩٨مدا چاوم بە ئێهود کەوتبوو کاتێك ئەو

پارێزگاری ئۆرشەلیم بوو. ئەو بڕوابەخۆ و هێمن بوو بە ڕەفتارێکی کۆمەڵایەتیانە و پێکەنینێکی ئامادەوە. ئەو لە ماوەی هەڵمەتەکەیدا وتی "تاکە چارەسەر لە ئێستادا دوو دەوڵەتە- یەکێکی جولەکە و یەکێکی فەلەستینی". لە ساتێك لە ساتەکاندا، ئەو پێشنیاری ئەوەی کرد کە ئەگەر پێویست بکات ئەو تاکلایەنە دەوڵەتی فەلەستینی بونیاد دەنێت. دەنگدەرانی ئیسرائیلی لە دەنگدانەکەدا پاداشتیان کرد.

ئۆلمێرت و عەباس کە سەرباری سەرکەوتنەکەی حەماس لە هەڵبژاردنەکانی ئەنجومەنی یاسادانانەدا، سەرۆکایەتییان بەدەست هێنابووەوە، بە خێرایی پەیوەندییەکی ئیشکردنیان دروستکرد. ئەوان لەسەر پرسەکانی وەکو ئاسایشی بازگەکان و ئازادکردنی هەندێ لە بەندییەکان ڕێککەوتن. پاشان لە حوزەیرانی ٢٠٠٧دا، باڵی چەکداریی حەماس دەستوەردانی ئەنجامدا. لە ڕێسایەکی ئاشنادا لە ململانێی ئایدۆلۆژی، توندڕەوان بە توندوتیژی وەڵامی بەرەوپێشچوونی ئازادییان دایەوە. تیرۆریستانی حەماس بە پشتیوانیی ئێران و سوریا کودەتایەکیان بەرپا کرد و کۆنترۆڵی غەزەیان گرتە دەست. شەڕکەران بە ماسکی ڕەشەوە بارەگاکانی سەرکردایەتیی فەتحیان تالان کرد، سەرکردەکانی حزبەکەیان لە سەربانەوە فڕێ دەدایە خوارەوە و ئەندامانی باڵی سیاسیی حەماسیان دەکردە ئامانج. سەرۆك عەباس بە کردنەدەری حەماس لە کابینەکەی و تۆکمەکردنی دەسەڵاتەکەی لە کەناری خۆرئاوا کاردانەوەی پیشاندا. عەباس بە تەلەفۆن پێی وتم "ئەمە لەخۆیدا کودەتایەکە دژی دیموکراسی. سوریا و ئێران لە هەوڵی ئەوەدان کە گڕ بەربدەنە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست". ئێمە کۆمەکی ئاسایشی و ئابووریمان ڕەوانەی حکومەتەکەی عەباس کردەوە لە کەناری خۆرئاوا و پشتگیریی گەمارۆیەکی هێزی دەریایی ئیسرائیلیمان کرد لە چواردەوری غەزە. لەکاتێکدا کە ئێمە کۆمەکی مرۆییمان دەنارد بۆ بەرگرتن لە لەبرسامردن، خەڵکی غەزە جیاوازییەکی زیندووی دەبینی لەنێوان هەلومەرجی ژیانیان لەژێر سایەی حەماس و ئەوانەی کە لەژێر سێبەری سەرکردەی دیموکرات، عەباسدا بوون. بەپێی تێپەڕینی کات، من بڕوام وابوو کە ئەوان داوای گۆڕان دەکەن.

من و کۆندی قسەمان لەسەر ڕێگەیەک کرد بۆ دەستپێکردنەوەی تین و تواتی دەوڵەتێکی فەلەستینیی دیموکرات. ئەو پێشنیاری کۆنفرانسێکی نێودەوڵەتی کرد بۆ دانانی زەمینەیەک بۆ دانوستانەکانی نێوان حکومەتی عەباس و ئیسرائیلییەکان. من سەرەتا بەگومان بووم. پێئەدەچوو دۆخی پاش کودەتا تیرۆریستییەکە کاتێکی گونجاو بێت بۆ لوتکەی ئاشتی. بەڵام دواتر کەیفم بە بیرۆکەکە هات. ئەگەر فەلەستینییە راڕاکان بیانتوانیایە ببینن کە دەوڵەت ئەگەرێکی واقعییە، ئەوا ئەنگیزەیەکیان دەبوو بۆ رەفزکردنی توندوتیژی و پشتیوانی ریفۆرم.

ئێمە کاتی کۆنفرانسەکەمان بۆ نۆڤەمبەری ۲۰۰۷ لە ئەکادیمیای هێزی دەریایی لە ئەناپۆلیسی ماریلاند لە ئەمریکا دیاریکرد. من و کۆندی پانزە وڵاتی عەرەبیمان، لەوانەش سعودیە، رازی کرد تا وەفدیان بۆ کۆنفرانسەکە بنێرن. گرتنەخۆی زووی دۆستانی عەرەب لە پرۆسەکەدا بڕوای فەلەستینییەکانی بتەو دەکرد و قورستری دەکرد بۆیان کە دواتر ڕێکەوتننامەیەکی ئاشتی رەت بکەنەوە، بەو شێوەیەی کە عەرەفات لە کامپ دەیڤد کردبووی.

تاقیکردنەوەی سەرەکیی کۆنفرانسەکە ئەوە بوو ئاخۆ عەباس و ئۆلمێرت دەتوانن رازی بن بە بەیانێکی هاوبەشی پەیمان بەستن بۆ کردنەوەی دانوستانەکان. کاتێک ئێمە سواری هەلیکۆپتەر بووین بەرەو ئەناپۆلیس، داوام لە کۆندی کرد بۆ بەیانەکە. ئەو وتی بەرەوپێشوونێکی زۆریان ئەنجام داوە بەڵام تەواو نەبوون. ئەو وتی "دەبێ تۆ خۆت ئەمەیان پێشکەش بکەیت".

من عەباس و ئۆلێمێرتم بەتەنیا جیا کردەوە. پێم وتن ئەگەر نەتوانن لەسەر بەیانەکە کۆک بن، ئەوا لوتکەکە وەکو شکستێک دەبینرێت و توندڕەوان بەهێز دەکات. ئەوان ڕێنمایی دانوستانکارەکانیان کرد کە لەگەڵ کۆندی کار بکەن. چەند خولەکێک پێش ئەوەی کە ئێمە لە بەردەم کامێراکان دەربکەوین، ئەو دۆکیومێنتەکەی بۆ هێنام. کاتی ئەوە نەبوو کە فۆنتەکە گەورە بکەین، بۆیە من چاویلکەکانی خوێندنەوەم دەرهێنا و لەو لاپەڕەیەوە خوێندمەوە: "ئێمە رازین لەسەر ئەوەی کە دەستبەجێ دانوستانی

دوولایەنەی نیەتپاکانە دەست پێبکەین بۆنەوەی بگەینە پەیماننامەیەکی ئاشتی...و هەموو تەقەلایەك دەخەینەگەڕ بۆ گەیشتنە ڕێککەوتنێك بەر لە کۆتایی ۲۰۰۸".

ژوورەکە کەوتە چەپڵەلێدان. عەباس و ئۆلمێرت هەریەکەیان وتاری خۆی پێشکەش کرد. سەرۆك عەباس وتی "ئازادی تاکە وشەیەکە کە نیشانەی ئایندەی فەلەستینییەکانە". سەرۆك ئۆلمێرت وتی "بڕوام وایە کە ڕێگەیەك لە ئارادانییە جگە لە ئاشتی...بڕوام وایە کاتی هاتووە. ئێمە ئامادەین".

ئەوە چرکەساتێکی مێژوویی بوو کە بینیم وەزیری دەرەوەی سعودیە بەڕێزەوە گوێ لە سەرۆك وەزیرانی ئیسرائیل دەگرێت و چەپڵە بۆ قسەکانی لێدەدات. کۆنفرانسی ئەناپۆلیس وەکو سەرکەوتنێکی چاوەڕواننەکراو ستایش کرا. لۆس ئەنجلس تایمز نوسیبووی "نابێ بەدگومانی لەبارەی وتوێژەکانی ئەناپۆلیسەوە ئەو هیوایە تەماوی بکات کە لە تەقەلاوە سەرچاوەی گرتووە".

ماوەیەکی کورت پاش ئەناپۆلیس، دوو لایەنەکە لەسەر ڕێککەوتننامەیەکی ئاشتی دانوستانیان کردەوە. ئەحمەد قورەیع نوێنەرایەتی فەلەستینییەکانی دەکرد و وەزیری دەرەوەی تزیبی لیڤنی نوێنەرایەتی ئیسرائیلییەکانی دەکرد. سەرۆك وەزیرانی فەلەستینی سەلام فەیاز، ئابووریناسێك کە دکتۆرای لە زانکۆی تەکساس هێنابوو، دەستیکرد بە پیادەکردنی ئەو ریفۆرمانەی لەمێژ بوو پێویست بوون لە ئابووریی فەلەستینی و هێزەکانی ئاسایشدا. ئێمە کۆمەکی داراییمان نارد و ژەنەراڵێکی پایەبەرزمان ڕەوانە کرد بۆ یارمەتیدانی مەشقپێکردنی هێزەکانی ئاسایشی فەلەستین. ئەو ڕۆژەی کە بارەگای سەرۆکایەتی جێهێشت، تۆنی بلێر پۆستێکی قبوڵ کرد وەکو نێردراوی تایبەت بۆ یارمەتیدانی فەلەستینییەکان تا دامەزراوەکانی دەوڵەتی دیموکراتیك بونیاد بنێن. ئەمە کارێکی پرشنگدار نەبوو، بەڵام پێویست بوو. تۆنی بە گاڵتەوە وتی "ئەگەر من خەڵاتی ئاشتی ببەمەوە، ئەوا دەزانی کە شکستم هێناوە".

دانوستانەکان هەندێ پرسی گرنگیان چارەسەر کرد، بەڵام ڕوون بوو کە واژۆکردنی ڕێکەوتننامەیەك پێویستی بە دەستەویەخەبوونی زیاتری سەرکردەکان هەیە. بە ڕەزامەندیی من، کۆندی چاودێریی کەناڵێکی جیای وتوێژە ڕاستەوخۆکانی نێوان عەباس

و ئۆلمێرتی کرد. دیالۆگەکە لە پڕۆپۆزەڵێکی نهێنیدا لە ئۆلمێرتەوە بۆ عەباس ئەنجامگیری کرابوو. خستنەڕووەکەی ئەو بریتی بوو لە گەڕاندنەوەی زۆرینەیەکی هەرە گەورەی خاکی کەناری خۆرئاوا و غەزە بۆ فەلەستینییەکان، قبوڵکردنی بونیادنانی تونێلێك بۆ بەیەکەوەبەستنەوەی دوو سەرزەمینی ئیسرائیلی، ڕێگەدان بە ژمارەیەکی سنووورداری پەنابەرانی فەلەستینی کە بگەڕێنەوە ئیسرائیل، دەستنیشانکردنی ئۆرشەلیم وەکو پایتەختێکی هاوبەشی هەردوو ئیسرائیل و فەلەستین و سپاردنی کۆنترۆڵی شوێنە پیرۆزەکان بە بەتەمەنە ناسیاسییەکان. ئێمە پرۆسەیەکمان گەڵاڵە کرد بۆ دانانی خستنەڕووە تایبەتییەکە لەناو ڕێککەوتننامەیەکی گشتیدا. ئۆلمێرت سەفەری دەکرد بۆ واشنتن و پڕۆپۆزەڵەکەی لای من دادەنا. عەباسیش رایدەگەیاند کە پلانەکە لە بەرژەوەندیی فەلەستینییەکاندایە. من بانگەوازی هەموو سەرکردەکانم دەکرد کە ڕێککەوتننامەکە بە کۆتا بگەیەنن.

بەرەوپێشچوونەکە پیشاندەری هیوایەکی راستەقینە بوو بە ئاشتی. بەڵام جارێکی تر، ڕووداوێکی دەرەکی هاتە ناوەوە. ئۆلمێرت لەژێر لێکۆڵینەوەدا بوو لە بەرانبەر مامەڵە داراییەکان کاتێك پارێزگاری ئۆرشەلیم بووە. بەهاتنی کۆتایی هاوین، نەیارە سیاسییەکانی بایی پێویست ئامرازیان لەبەردەستدا بوو کە ئەو لەسەر حوکم لابدەن. ئەو زۆری لێکرا تا لە سێپتێمبەردا دەست لەکار بکێشێتەوە.

عەباس نەیدەویست ڕێککەوتن لەگەڵ سەرۆك وەزیرانێکدا بکات کە خەریکی جێهێشتنی ئۆفیسە. وتوێژەکان لە دوایین هەفتەکانی ئیدارەکەمدا وەستان، پاش ئەوەی هێزەکانی ئیسرائیل هێرشیان کردە سەر غەزە لەبەرانبەر هێرشە ڕۆکێتییەکانی حەماسدا.

لەکاتێکدا کە من نائومێد بووم لەوەی ئیسرائیلی و فەلەستینییەکان نەیانتووانی ڕێککەوتننامەکە بە کۆتا بگەیەنن، دڵخۆش بووم بەو بەرەوپێشچوونەی ئەنجاممان دابوو. پێش هەشت ساڵ، من لە دۆخی ئینتیفازەیەکی تووڕە ئۆفیسم گرتبووە دەستێك لە بارێکدا کە یاسر عەرەفات دەسەڵاتی فەلەستینی بەڕێوە دەبرد، سەرکردە ئیسرائیلییەکان پابەند بوون بە بەرنامەی (ئیسرائیلی گەورەتر) و وڵاتانی عەرەبی

ناراستەوخۆ سکالایان دەکرد. بە هاتنی ئەو کاتەی کە ئۆفیسم جێ هێشت، فەلەستینییەکان سەرۆک وەزیرێکیان هەبوو کە تیرۆریزمی ڕەت دەکردەوە. ئیسرائیلییەکان لە هەندێ نشینگە دوور کەوتبوونەوە و پشتیوانی خۆیان بۆ چارەسەری دوو دەوڵەت خستبووە ڕوو. وڵاتانی عەرەبیش ڕۆڵێکی چالاکیان دەبینی لە پرۆسەی ئاشتیدا.

ململانێ لە خاکی پیرۆزدا چیتر هی فەلەستینییەکان لەبەرانبەر ئیسرائیلییەکان نەبوو، یان موسڵمان لەدژی جولەکە نەبوو. بەڵکو لەنێوان ئەوانەدابوو کە سۆراخی ئاشتییان دەکرد و ئەو توندڕەوانەش کە برەویان بە تیرۆر دەدا. کۆدەنگییەکیش هەیە لەسەر ئەوەی کە دیموکراسی بناغەیەکە کە ئاشتییەکی درێژخایەن و دادپەروەرانەی لەسەر بونیاد دەنێیت بە پەیبردن بەوەی کە ئەو ڕوئیایە پێویستی بە سەرکردایەتییەکی بوێر هەیە لەلایەن هەردوو لا و ئەمریکاوە.

***

من و جاك شیراك لەسەر بەشی هەرە زۆری کۆك نەبووین. سەرۆکی فەرەنسا دژی لابردنی سەدام بوو لەسەر حوکم. ئەو یاسر عەرەفاتی بە "پیاوێك لە بوێری" ناو دەبرد. لە یەکێك لە کۆبوونەوەکاندا، پێی وتم "ئۆکرانیا بەشێکە لە فەرەنسا.

بۆیە دواجار مایەی سەرسوڕمان بوو کاتێك من و جاك لە پاریس لە سەرەتاکانی حوزەیرانی ٢٠٠٤دا زەمینەیەکی ڕێککەوتنمان دۆزییەوە. شیراك دیموکراسی لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا هێنایەبەرباس و منیش گوێی خۆم بۆ موحازەرەیەکی تر هەڵخست. بەڵام ئەو بەردەوام بوو لە قسەکانی : "لەم هەرێمەدا، تەنیا دوو دیموکراسی هەن. یەکێکیان بەهێزە، ئیسرائیل. ئەویتریان لاوازە، لوبنان". من نەموت کە ئەو دیموکراسییەکی نوێی پەڕاندووە کە عیراقە.

ئەو باسی لە ئازاری لوبنان کرد لەژێر داگیرکاریی سوریادا کە دەیان هەزار سەربازی خستبووە وڵاتەکەوە، پارەی لە ئابووریی وڵاتەکە بڕیبوو و هەوڵەکانی فراوانکردنی دیموکراسی بەربەست کردبوو. ئەو پێشنیاری کرد کە ئێمە پێکەوە کار بکەین بۆ

وەستاندنی سوریا لە رکێفکردنی لوبنان. من دەستبەجێ رازی بووم. ئێمە بڕیارماندا سۆراخی دەرفەتێك بكەین بۆ هێنانەکایەی بڕیارێکی نەتەوە یەکگرتووەکان. لە ئۆگەستی ٢٠٠٤دا، سەرۆکی لوبنان ئێمیل لەحود، کە بوکەڵەیەکی سوریا بوو، دەستپێکردنی وتارەکانی خۆمانی پێ سپاردین. ئەو رایگەیاند کە خولی سەرۆکایەتییەکەی درێژ دەکاتەوە، کە پێشێلکردنێکی دەستووری لوبنانی بوو. من و شیراك پێکەوە سپۆنسەریی بڕیاری ١٥٥٩ی یوئێن-مان کرد کە پرۆتێستۆی بڕیارەکەی لەحودی دەکرد و داوای لە سوریا دەکرد هێزەکانی بکشێنێتەوە. ئەم بڕیارە لە ٢ی سێپتێمبەری ٢٠٠٤دا پەسەند کرا.

بۆ ماوەی شەش مانگ، سوریا بە بەرەنگاری وەڵامی دایەوە. پاشان لە ١٤ی فێبریوەری ٢٠٠٥دا، ئۆتۆمبێلێکی گەورەی بە مین چێنراو لە بەیروت کاروانی ئۆتۆمبێلی رەفیق حەریری، سەرۆك وەزیرانی پێشووی سەربەخۆیی خوازی لوبنان، تێکشکاند. هەموو بەڵگەکان روو لە پیلانێکی سووری بوون. ئێمە باڵیۆزەکەمان لە دیمەشق بانگ کردەوە و پشتگیریی لێکۆڵینەوەیەکی نەتەوەیەکگرتووەکانمان کرد.

هەفتەیەك پاش کوژرانی رەفیق حەریری، من و شیراك نانی ئێوارەمان لە پرۆکسێل خوارد. ئێمە بەیانێکی هاوبەشمان دەرکرد بۆ ناودێرکردنی ئۆتۆمبێل تەقاندنەوەکە بە کردەیەکی تیرۆریستی و جەختمان لە پشتیوانی بۆ "لوبنانێکی خاوەن سەروەری، سەربەخۆ و دیموکراتی کردەوە". من و شیراك وڵاتانی عەرەبیمان کۆکردەوە بۆ فشارخستنەسەر سەرۆکی سوریا بەشار ئەسەد تا مل بۆ بڕیارەکەی یوئێن بدات. لە تێپەڕبوونی مانگێك بەسەر کوژرانی حەریری دا، نزیکەی یەك ملیۆن لوبنانی- یەك لەسەر چواری دانیشتووانی وڵات- رژانە گۆڕەپانی شەهید لە بەیروت بۆ ئیدانەکردنی داگیرکاریی سوریا. خەڵکی دەستیان کرد بە قسەکردن لەبارەی شۆڕشی سیدار، بە ناوی ئەو درەختەی کە لە ناوەراستی ئاڵای لوبناندا هەیە.

سورییەکان پەیامەکەیان پێگەیشت. لەژێر فشاری یەکگرتووی کۆمەڵی نێودەوڵەتی و گەلی لوبناندا، سەربازانی داگیرکەری سوری لە دوادواکانی ئازاردا دەستیان کرد بە کشانەوە. بەهاتنی کۆتایی نیسان، ئەوان رۆیشتبوون. هاوڵاتییەکی لوبنانی بە

ریپۆرتەرێکی وتبوو "خەڵکی لێرە دەترسان لە هەر شتێك كە بیڵێن. خەڵکی لەمڕۆدا زیاتر کرانەوە و هەست بە ئاسودەیی زیاتر دەکەن لە دەربڕینی ئەوەی کە بیری لێ دەکەنەوە".

ئەو بەهارە، بزووتنەوەی ١٤ ی ئازاری دژە سوری زۆرینەی کورسییەکانی لە پەرلەمان بردەوە. فوئاد سەنیۆرە، راوێژکاری نزیکی حەریریی کوژراو کرا بە سەرۆك وەزیران.

شۆڕشی سیدار دەستنیشانکەری گرنگترین سەرکەوتنەکانی ئەجێندای ئازادی بوو. ئەمە لە وڵاتێکی فرەئایین بە زۆرینەی موسڵمانەوە روویدا. ئەمە بە گووشارێکی دیپلۆماسیی بەهێز لەلایەن جیهانی ئازاد و دەستێوەردانی ناسەربازیی ئەمریکی روویدا. خەڵکی لوبنان لەبەر سادەترین هۆکار سەربەخۆییان بەدەست هێنا: دەیانویست ئازاد بن.

سەرکەوتنی دیموکراسی لە لوبنان دوو مانگ پاش هەڵبژاردنی ئازاد لە عیراق و هەڵبژاردنی سەرۆك عەباس لە سەر زەوییەکانی فەلەستین هات. هەرگیز پێشتر سێ کۆمەڵگەی عەرەبی ئەوەندە پێشکەوتنیان بەرەو دیموکراسی بە خۆوە نەبینیووە. لوبنان، عیراق و فەلەستین توانایان هەبوو کە ببنە بناغەی هەرێمی ئازاد و ئاشتیانە.

سەرکردەی سیاسیی لوبنانی وتی "سەیرە بۆ من کە ئەمە بڵێم، بەڵام ئەم پرۆسەیەی گۆڕان بەهۆی داگیرکردنی عیراق لەلایەن ئەمریکاوە دەستی پێکردووە. من لەبارەی عیراقەوە بەدگومان بووم، بەڵام کاتێك سێ هەفتە لەمەوبەر گەلی عیراقم بینی دەنگ دەدەن، کە هەشت ملیۆن دەبوون، ئەمە دەستپێکی جیهانێکی عەرەبیی نوێ بوو. گەلی سوریا، گەلی میسر، هەموویان دەڵێن شتێك لە گۆڕاندایە. دیواری بەرلین رووخاوە. دەتوانین ئەوە ببینین".

ئەو تاکە کەس نەبوو کە تەوژمەکە ببینێت یان دان بە دەرەنجامەکانی دابنێت. ئەم رابوونەی دیموکراسی لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست لە ٢٠٠٥دا توندڕەوانی سڕ کرد. لە ٢٠٠٦دا، بەرەنگار بوونەوە.

***

لە ١٢ای تەموزی ٢٠٠٦دا، من و لۆرا لە لە ڕێگاماندا بەرەو لوتکەی گروپی هەشت لە سەینت پیتەرزبێرگی روسیا ئەڵمانیان لاماندا. راوێژکاری ئەڵمانی ئەنگێلا مێرکل و هاوسەرەکەی (پرۆفیسۆر جواخیم سۆیەر) ئێمەیان بانگهێشت کردبوو بۆ شارۆچکەی ستراڵسەند کە لە ناوچەی زێدی ئەنگێلا بوو. من و لۆرا سەرسام بووین بە باسی گەشەکردنی ئەنگێلا لە ئەڵمانیای خۆرهەڵاتی کۆمەنیستی. ئەو وتی منالێتییەکەی خۆش بووە، بەڵام دایکی، بە بەردەوامی هۆشداری پێداوە کە مشتومڕی ناو خێزانەکەی لە ناو خەڵکدا باس نەکات. پۆلیسی نهێنی (ستاسی) لەهەموو شوێنێك بووە. من و لۆرا لە کامپ دەیڤد بیرمان لە ئەنگێلا کردەوە کاتێك تەماشای (ژیانی ئەوانیتر)مان کرد کە فیلمێك بوو لەبارەی ژیان لە ژێر سێبەری ستاسیدا. سەخت بوو بڕوا بکەیت کە کەمتر لە بیست ساڵ تێپەڕیووە لەوەتەی کە دەیان ملیۆن ئەوروپی بەو شێوەیە ژیاون. ئەمە بیرهێنەرەوەی ئەوە بوو کە چۆن ئازادی بە شێوەیەکی دراماتیکی دەتوانێ کۆمەڵگەیەك بگۆڕێت.

سەرباری ئیشکردن وەکو لایەنگرێکی سەرسەختی دیموکراسی، ئەنگێلا جێ متمانە، دڵگیر و گەرم و گوڕ بوو. ئەو بەخێرایی بوو بە یەکێك لە نزیکترین هاوڕێکانم لەسەر شانۆی جیهانی.

لەکاتێکدا کە ئێمە لە ڕێگەدابووین بەرەو ئەڵمانیا، تیرۆریستانی حیزبوڵڵا لە باشووری لوبنان شاڵاوێکیان بە درێژایی سنووری ئیسرائیل دەستپێکرد، دوو سەربازی ئیسرائیلییان رفاند و قەیرانێکی تری بەرنامەی دەرەوەیان دەستپێکرد. ئیسرائیل بە هێرشکردنە سەر ئامانجەکانی حیزبوڵڵا لە باشووری لوبنان و تەقاندنەوەی فرۆکەخانەی بەیروت، کە خاڵێکی گواستنەوەی چەك بوو، وەڵامیان دایەوە. حیزبوڵڵا بە هەڵدانی رۆکێت بۆ سەر شارۆچکە ئیسرائیلییەکان و کوشتن یان بریندارکردنی سەدان مەدەنی تۆڵەیان سەندەوە.

وەکو حەماس، حیزبوڵاش حزبێکی سیاسیی رەوا و باڵێکی تیرۆریستی هەبوو کە لەلایەن ئێرانەوە پارەی پێدەدرا و چەکدار دەکرا و لەلایەن سوریاوە پشتیوانی دەکرا. حیزبوڵڵا لە پشت تەقاندنەوەکەی ساڵی ١٩٨٣ی بارەگای مارینزی ئەمریکییەوە بوو لە

لوبنان، لە پشت کوشتنی مەلەوانێکی هێزی دەریایی ئەمریکا لەسەر فڕۆکەیەکی هێڵی ئاسمانیی (تی.دەبلیو.ئی)ی رفێنراو بوو لە ١٩٨٥؛ لە پشت هێرشەکانی سەر باڵیۆزخانەی ئیسرائیلی و سەنتەرێکی کۆمەڵایەتی جولەکە لە ئەرجەنتین بوو لە ١٩٩٢ و ١٩٩٤دا و لە پشت تەقاندنەوەی کۆمەڵە شوقەکانی خوبار تاوەرز بوو لە سعودیەی عەرەبی لە ساڵی ١٩٩٦دا.

ئێستا حیزبوڵڵا راستەوخۆ هێرش دەکاتە سەر ئیسرائیل. هەموو سەرکردەکانی گروپی هەشت لە لوتکەکە هەمان کاردانەوەی سەرەتاییان هەبوو: حیزبوڵڵا ململانێیەکەی هەڵایساندووە و ئیسرائیل ماف ئەوەی هەبوو داکۆکی لەخۆی بکات. ئێمە بەیانێکی هاوبەشمان دەرکرد کە تیایدا هاتبوو "ئەم بکەرە توندڕەوانە و ئەوانەی کە پشتگیرییان لێ دەکەن ناکرێ رێگەیان پێبدرێ تا خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بخەنە ناو پشێوییەوە و ململانێیەکی فراوانتر بوروژێنن". ئیسرائیلییەکان هەلێکیان هەبوو بۆئەوەی زەبرێکی گەورە لە حزبوڵڵا و سپۆنسەرەکانیان بدەن لە ئێران و سوریا. بەداخەوە، ئەوان بەخراپ مامەڵەیان لەگەڵ هەلەکەدا کرد. هەڵمەتی تەقاندنەوەی ئیسرائیلی لە چەند ئامانجێکی گوماناویی بەهای سەربازی دا، لەوانەش چەند شوێنگەیەک لە باکووری لوبنانی دوور لە بنکەی حزبوڵڵا. زیانەکە لە پەخشی تەلەفزیۆنی کەوت. بۆ ئاڵۆزکردنی بابەتەکان، سەرۆک وەزیران ئۆلمێرت رایگەیاند کە سوریا ناکرێتە ئامانج. من پێم وابوو ئەمە هەڵەیەکە. نەهێشتنی هەڕەشەی تۆڵەسەندنەوە رێگەی بە سوریادا تا لە قوڵایەکە دوور بکەوێتەوە و خۆیان بەهێز بکەن بۆ درێژەدان بە پشتیوانیی حزبوڵڵا.

لەکاتێکدا کە توندوتیژی بۆ هەفتەی دووەم درێژەی کێشا، زۆرێک لە سەرکردەکانی گروپی هەشت کە دەستیان کردبوو بە پشتگیریی ئیسرائیل داوای ئاگربەستیان کرد. من نەچوومە پاڵیان. لەوانەیە ئاگربەست بوژانەوەیەکی کورت مەودا دابین بکات، بەڵام هۆکاری بنچینەیی ململانێکان چارەسەر ناکات. ئەگەر حزبوڵڵایەکی باش چەکدارکراو لە باشووری لوبنانەوە بەردەوام بوو لە هەڕەشەکردن لە ئیسرائیل، تەنیا مەسەلەی کات دەبێ بۆ ئیسرائیل کە هێزەکان حزبوڵڵا لاواز بکات. من بەهەمان شێوە ویستک پەیامێکی

بۆ ئێران و سووریا ببێژم؛ ئەوان ڕێگەیان پێنادرێ تا ڕێکخراوە تیرۆریستییەکان وەکو سوپای بریکار بەکاربێنن بۆ هێرش کردنە سەر دیموکراسییەکان بەبێ ئەوەی سزا بدرێن.

بەداخەوە ئیسرائیل مەسەلەکانی خراپتر کرد. لە هەفتەی سێیەمی ململانێکەدا، بۆمبهاوێژەکانی ئیسرائیل باڵەخانەیەکیان لە شاری قەنای لوبنان وێران کرد. بیست و هەشت مەدەنی کوژران، زیاتر لە نیوەیان منداڵ بوون. سەرۆک وەزیران سینیۆرە تووڕە بوو. سەرگردە عەرەبییەکان بە توندی ئیدانەی تەقاندنەوەکەیان کرد. کوشتارێک کە بیست و چوار سەعات لە تەلەفزیۆنەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست لێدەدرایەوە. من نیگەرانی ئەوەم لادروست بوو کە هێرشی ئیسرائیل لەوانەیە حکومەتی دیموکراتیی سەرۆک وەزیران سینیۆرە بڕوخێنێت.

من داوای کۆبوونەوەیەکی تیمی ئاسایشی نیشتمانیم کرد بۆ قسەکردن لەسەر ستراتیژییەکەمان. ناکۆکی لەناو تیمەکەدا گەرم داهات. دیک چینی وتی "پێویستە ڕێگە بە ئیسرائیل بدەین کۆتایی بە حزبوڵڵا بێنێت". لە وەڵامدا کۆندی وتی "ئەگەر تۆ ئەوە بکەیت، ئەوا ئەمریکا لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست دەمرێت". کۆندی پێشنیاری ئەوەی کرد کە لە یوئێن سۆراخی بڕیارێک بکەین بۆ ئاگربەست و دابەزاندنی هێزی ئاشتیپارێزی فرەنەتەوە.

هیچ کام لە بژاردەکان نموونەیی نەبوون. لە کورت مەودا دا، ویستم ئەوە ببینم کە حزبوڵڵا و پشتیوانەکانی بە توندی زەبریان بەردەکەوێت. لە دوورمەودا دا، ستراتیژییەکەمان بریتی بوو لە گۆشەگیرکردنی ئێران و سووریا وەکو ڕێگایەکی کەمکردنەوەی کاریگەرییان و هاندانی گۆڕان لەناوەوەدا. ئەگەر ئەمریکا بەردەوام بووایە لە پشتگیریی هێرشی ئیسرائیل، ئەوا دەبووایە ئێمە بڕیارەکانی یوئێن یەک لەدوای یەک ڤیتۆ بکەین. سەرەنجام، لەبری گۆشەگیرکردنی ئێران و سووریا، ئێمە خۆمان گۆشەگیر دەکرد.

من بڕیارمدا کە سوودە دوورمەوداکانی هێنانەوەی گوشار لەسەر سووریا و ئێران زیاترە لە دەستکەوتە کورت مەوداکانی لێدانی زەبری زیاتر لە حزبوڵڵا. من کۆندیم نارد بۆ یوئێن کە لەوێ دانوستانی لەسەر بڕیاری ١٧٠١ کرد کە داوای کۆتاییهێنانی

دەستبەجێی توندوتیژی، لەچەکداماڵینی حیزبوڵڵا و میلیشیاکانی تری دەکرد لە لوبنان، گواستنەوەی دەریایی چەکەکانی بۆیکۆت دەکرد و هێزێکی ئاسایشیی نێودەوڵەتیی تۆکمەی لە باشووری لوبنان دادەبەزاندا. حکومەتی لوبنانی، حزبوڵڵا و ئیسرائیل بڕیارەکەیان قبوڵ کرد. ئاگربەست لە بەرەبەیانی ١٤ی ئۆگەستدا پیادە کرا.

جەنگی ئیسرائیل لەدژی حزبوڵڵا لە لوبنان چرکەساتێکی تری یەکلاییکەرەوە بوو لە ململانێی ئایدۆلۆژیدا. لەکاتێکدا کە هێشتا ناسکە و لەلایەن سووریاوە ڕووبەڕووی فشار دەبێتەوە، دیموکراسیی ساوای لوبنان بەهۆی ڕەتبوونی بە تاقیکردنەوەکەدا، بەهێزتر دەرکەوت. ئەنجامەکە بۆ ئیسرائیل ئاوێتە بوو. هەڵمەتە سەربازییەکەی حزبوڵڵای لاواز کرد و یارمەتیدەر بوو بۆ گرتنی سنوورەکەی. لەهەمان کاتدا ئەدائی سەربازیی لەڕۆکی ئیسرائیل؛ سەنگی نێودەوڵەتیی لەدەستدا. وەکو ورووژێنەرانی ململانێکە، حزبوڵڵا- شانبەشانی سووریا و ئێران- بەرپرسیارێتیی خوێنڕێژییەکەی هەڵگرت. خەڵکی لوبنان دەیانزانی. لە راڤەیەکی زانراوی جەنگدا، حەسەن نەسروڵڵای سەرۆکی حزبوڵڵا دوو هەفتە پاش ئاگربەستەکە پۆزشی هێنایەوە. ئەو وتی "ئەگەر بمانزانیایە گرتنی سەربازەکان ئەمەی لێدەکەوتەوە، ئەوا بە دڵنیاییەوە ئێمە ئەوەمان نەدەکرد".

***

کاتێك کۆندی لە سەرەتاکانی ٢٠٠٥دا یەکەم گەشتی خۆی وەکو وەزیری دەرەوە بۆ ئەورووپا ئەنجامدا، پێی وتم کە چاوەڕێی ئەوەی کردووە ناکۆکییەکانمان لەسەر عیراق پرسی سەرەکی بێت. هەفتەیەك دواتر، ئەو بە پەیامێکی سەرسوڕهێنی هەواڵی ئەو سەرکردانەی لێگێڕاینەوە کە چاوی پێیان کەوتبوو. ئەو وتی "ئەوان لەبارەی عیراقەوە قسە ناکەن. ئەوان هەموویان لەبارەی ئێرانەوە نیگەرانن".

بە هاتنی ئەو کاتەی کە من سەرۆکایەتیم گرتبووە دەست، ڕژێمی تیۆکرات لە ئێران بۆ ماوەی بیست ساڵ هەڕەشەی خستبووە ڕووی سەرۆکەکانی ئەمریکا. ئێران کە لەلایەن ئەو مەلا رادیکاڵانەوە ڕێبەرایەتی دەکرا کە لە شۆڕشی ١٩٧٩دا دەسەڵاتیان قۆرخ کردبوو، یەکێك بوو لە دەوڵەتە سەرەکییەکانی سپۆنسەری تیرۆر لە جیهاندا. لە هەمان کاتدا، ئێران کۆمەڵگەیەکی تا ڕادەیەك مۆدێرن بوو بە بزاڤێکی چەکەرەکردووی

ئازادییەوە. لە ئۆگەستی ٢٠٠٢دا، گروپێکی ئۆپۆزسیۆنی ئێرانی بە بەڵگەیەکەوە هاتە پێش کە دەیگوت رژێم خەریکی بونیادنانی دامەزراوەیەکی پیتاندنی یورانیۆمی شاراوەیە لە (ناتەنز) شانبەشانی بونیادنانی کارگەیەکی نهێنیی بەرهەمهێنانی شاوی قورس لە (ئەراک)- دوو نیشانەی پڕناوەرۆکی پرۆگرامی چەکی ناوکی. ئێرانییەکان دانیان بە پیتاندنەکەدا دەنا، بەڵام بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە تەنیا بۆ بەرهەمهێنانی کارەبایە. ئەگەر ئەمە راست بووایە، بۆچی رژێم دەیشاردەوە؟ و بۆچی ئێران پێویستی بە پیتاندنی یورانیۆم بوو لەکاتێکدا کە کارگەیەکی وزەی ناوکیی ئیشکەری نەبوو؟ شاوا لەپڕ، سکاڵایەکی زۆر لەئارادا نەبوون لەبارەی دانانی ئێران لە تەوەری خراپەدا.

لە ئۆکتۆبەری ٢٠٠٣دا، حەوت مانگ پاش ئەوەی سەدام حسێنمان لە دەسەڵات لابرد، ئێران پەیمانیدا هەموو پیتاندنێکی یورانیۆم و دەکارکردنەوە هەڵپەسێرێت. لە بەرانبەردا، بریتانیا، ئەڵمانیا و فەرەنسا رازی ببوون لەسەر دابینکردنی سوودی دارایی و دیپلۆماسی، وەکو تەکنۆلۆژیا و هاریکاری بازرگانی. ئەوروپییەکان رۆڵی خۆیان بینیبوو و ئێمەش هەروا. رێککەوتنەکە هەنگاوێکی پۆزەتیڤ بوو بەرەو ئامانجی کۆتایی ئێمە بۆ وەستاندنی پیتاندنی ئێران و بەرگرتن لە پێشبڕکێی چەکی ناوکی لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا. لە حوزەیرانی ٢٠٠٥دا، هەموو شتێك گۆڕا. ئێران هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی ئەنجامدا. هەر هیچ نەڵێین، پرۆسەکە گوماناوی بوو. (ئەنجومەنی شورای چاودێر) کە کۆمەڵێك مەلای ئیسلامیی بەتەمەن بوون، بڕیاریاندا کە کێ خۆی بپاڵێوێت. مەلاکان (دەستەی بەسیج)یان بەکارهێنا، کە شێوە میلیشیایەکی گاردی شۆڕشگێڕی ئێرانی بوو، بۆ بەڕێوەبردنی دەنگدەران و کاریگەریخستنەسەر دەنگەکان. پارێزگاری تاران (مەحمود ئەحمەدی نەژاد) وەکو براوە راگەیەنرا. جێی سەرسوڕمان نەبوو، ئەو پشتیوانییەکی بەهێزی لەلایەن بەسیجەوە هەبوو.

ئەحمەدی نەژاد ئێرانی بە رێڕەوێکی نوێی شەرانگێزانەدا ئاراستە کردەوە. رژێمەکە بوو بە ئامرازێکی سەرکوتکەرتر لەناوخۆدا، دەستێوەردەرتر لە عێراق و چالاکتر لە ناسەقامگیرکردنی لوبنان، فەلەستین و ئەفغانستاندا. ئەحمەدینەژاد ئیسرائیلی بە "لاشەیەکی بۆگەن" ناو برد کە دەبێ "لەسەر نەخشە بسڕدرێتەوە". ئەو هۆلۆکۆستی

وەكو "ئەفسانە"یەك ڕەت كردەوە. ئەو وتاری نەتەوە یەكگرتووەكانی بەكارهێنا بۆ پێشبینی كردنی ئەوەی كە ئیمامی نادیار دەردەكەوێتەوە بۆ ڕزگاركردنی جیهان. من نیگەرانیم لادروست بوو لەمەڕ ئەوەی كە ئێمە لەبەرانبەر كەسێكداین كە لە سەركردەی ترسناك زیاترە. لەوانەیە ئەم كابرایە شێت بێت.

وەكو یەكێك لە یەكەم كردارەكانی، ئەحمەدینەژاد ڕایگەیاند كە ئێران وتوێژی یورانیۆم دەست پێدەكاتەوە، بەڵام جیهان ئەم جوڵەیەی وەكو هەنگاوێك بەرەو پیتاندن بۆ چەكێك ناسییەوە. ڤیلادیمێر پوتن– بە پشتیوانی من– پێشنیاری ئەوەی كرد كە سوتەمەنی پیتێنراو لە ڕوسیا بۆ ڕیاكتەرە مەدەنییەكانی ئێران دابین بكات، ئەو كاتەی كە كەمێكی بونیاد نا، بۆئەوەی ئێران پێویستی بە دامەزراوەكانی پیتاندنی خۆی نەبێت. ئەوروپییەكانیش پێشنیاری پشتیوانییان بۆ پرۆگرامێكی ناوكی مەدەنی ئێرانی خستەڕوو لە بەرانبەر وەستاندنی چالاكییە ناوكییە گوماناوییەكانی. ئەحمەدینەژاد ئەمەشی ڕەت كردەوە. تەنیا یەك ڕوونكردنەوەی لۆژیكی لەئارادا بوو: ئێران یورانیۆمی بۆ بەكارهێنانی لە بۆمبدا دەپیتاند.

من ڕووبەڕووی خاڵێكی گەورەی بڕیاردان بوومەوە. ئەمریكا ناتوانێ ڕێگە بە ئێران بدات تا چەكی ناوكی هەبێت. ڕژێمە تیۆكراتییەكە دەتوانێ خۆرهەڵاتی ناوەڕاست داگیر بكات، فشار بخاتە سەر جیهان، تەكنۆلۆژیای چەكە ناوكییەكان ڕادەستی بریكارە تیرۆریستەكان بكات یان بۆمبەكە لەدژی ئیسرائیلی بەكاربهێنێت. من لە سۆنگەی دوو سەعاتی زەنگ لێدەرەوە بیرم لە كێشەكە كردەوە. یەكێكیان بەرەوپێشچوونی ئێران بەرەو بۆمبەكە دیاری دەكرد، ئەویتریشیان سۆراخی توانای ڕیفۆرمخوازانی دەكرد بۆ هاندانی گۆڕان. ئامانجی من ئەوە بوو كە سەعاتی یەكەم خاو بكەمەوە و ئەوەی دووەمیان خێرا بكەم. من لەبەرچاوگرتنی سێ بژارەم لەبەردەمدا بوو. هەندێ كەس لە واشنتن پێشنیاری ئەوەیان كرد كە دەبێ ئەمریكا ڕاستەوخۆ لەگەڵ ئێران دانوستان بكات. من بڕوام وابوو كە قسەكردن لەگەڵ ئەحمەدینەژاد ڕەوایەتی بەو تێڕوانینەكانی دەدات و بزاڤی ئازادیی ئێرانی سارد دەكاتەوە و لێرەوە سەعاتی گۆڕان خاو دەبێتەوە. من بەهەمان شێوە گومانم لەوە هەبوو كە ئەمریكا بتوانێ بەرەوپێشچوونی زۆر لە

وتووێژەکان یەك بە یەکەکان لەگەڵ ڕژێمدا ئەنجام بدات. دانوستانی دوولایەنە لەگەڵ دیکتاتۆرێکدا بەدەگمەن بۆ سیستمێکی دیموکراسی باشی لێدەکەوێتەوە. لەبەرئەوەی دەوکەنە بەردەم لێپێچینەوەیەکی کەم، ڕژێمە تۆتالیتارەکان ڕووبەڕووی هیچ فشارێك نابینەوە بۆ پابەندبوون بە قسەکانیانەوە. ئەوان ئازادن لە شکاندنی ڕێککەوتننامەکان و پاشان داواکاریی نوێی دەخەنەڕوو. دیموکراسی بژارەیەکی لەبەردەمدایە: مل بدە یان پێکهەڵپڕانێك بوروژێنە. بژارەی دووەم دیپلۆماسیی فرەلایەن بوو کە بەهۆی دار عەسا و گێزەر ئیشی لەسەر دەکرێت. ئێمە دەمانتوانی بچینەپاڵ ئەوروپییەکان بۆ خستنەڕووی پاکجێك هاندەر بۆ ئێران لەبەرانبەر وازهێنان لە چالاکییە ناوکییە گوماناوییەکەی. ئەگەر ڕژێمەکە هاریکاری ڕەت بکردایەتەوە، ئەو کاتە هاوپەیمانێتییەکە بەشێوەیەکی ناکەکەسی سزای قورسی لە ڕێگەی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە بەسەر ئێراندا دەسەپاند. سزاکان تەگەرەیان دەخستە بەردەم ئێران لەدەستکەوتنی تەکنۆلۆژیای پێویست بۆ چەك و لێرەوە سەعاتی بۆمبەکە خاو دەبووەوە. هەروەها قورس دەبوو بۆ ئەحمەدینەژاد کە بەڵێنە ئابوورییەکانی بباتە سەر، کە بەم هۆیەوە بزاڤی ریفۆرمی وڵات بەهێز دەبوو.

دوایین بژارە لێدانی سەربازی بوو لە دامەزراوە ناوکییەکانی ئێران. ئەم ئامانجە بۆ وەستاندنی سەعاتی بۆمبەکە دەبوو، لانی کەم بەشێوەیەکی کاتی. دیار نەبوو ئاخۆ چ کاریگەرییەك دەخاتەسەر سەعاتی ریفۆرم. هەندێ پێیاوان وابوو کە وێرانکردنی پرۆژە بەنرخەکەی ڕژێم ئۆپۆزسیۆن بەهێز دەکات. ئەوانیتر نیگەرانی ئەوە بوون کە ئۆپەراسیۆنێکی سەربازیی دەرەکی، ناسیۆنالیزمی ئێرانی بوروژێنێت و خەڵکی لەدژی ئێمە یەکبخات. من ڕێنمایی پێنتاگۆنم کرد تا تاووتوێی ئەوە بکات ئاخۆ چی پێویستە بۆ لێدانەکە. کردەی سەربازی هەمیشە لەسەر مێز دەبێت، بەڵام دەبێتە دوایین ئامرازی من.

من لە بەهاری ۲۰۰٦دا بە شێوەیەکی بەرفراوان لەسەر بژاردەکان مشتومڕم لەگەڵ تیمی ئاسایشی نیشتمانی کرد. لە نزیکەوە ڕاوێژم لەگەڵ ڤیلادیمێر پوتن، ئەنگێلا مێرکل و تۆنی بلێر کرد. ئەوان دڵنیایان کردمەوە کە ئەوان پشتگیریی لە سزای قورس دەکەن ئەگەر ئێران ڕەفتارەکەی نەگۆڕی. لە مانگی مایسدا، کۆندی ڕایگەیاند کە ئێمە دەچینە

پاڵ ئەوروپییەکان بۆ دانوستان لەگەڵ ئێراندا، بەڵام تەنیا ئەگەر رژێم بەشێوەی پشتڕاستکراوە پیتاندنەکەی هەڵپەسارد. پاشان ئەو لەگەڵ ئەنجومەنی ئاسایش کاری کرد بۆ دانانی دوامۆڵەتێک بۆ وەڵامەکەی ئێران: ٣١ی ئۆگەست. هاوین تێپەڕی و وەڵامەکە هەرگیز پەیدا نەبوو.

تەحەدای دواتر بریتی بوو لە گەڵاڵەکردنی سزا کاریگەرەکان. ئەمریکا نەیدەتوانی بە تەنیا هیچ وەها بکات. ئێمە بۆ ماوەی چەند دەیەیەک بە قورسی سزامان خستبووە سەر ئێران. من رێنمایی وەزیری خەزێنەم کرد تا تەگەرە بۆ کۆمپانیا و بانکەکانی ئێران دروست بکات لە گواستنەوەی پارەدا. ئێمە بەهەمان شێوە هێزی قودسی دەستەی گاردی شۆڕشگێری ئێرانیمان وەکو رێکخراوێکی تیرۆریستی دیاریکرد کە زەمینەی بۆ خۆشکردین تا سامانەکەی سڕ بکەین. دۆستەکانیشمان لە هاوپەیمانێتی دیپلۆماسی لەلایەن خۆیانەوە سزای نوێیان بەسەردا سەپاند. ئێمەش لەگەڵ یونێن کارمان کرد بۆ پەسەندکردنی هەردوو بڕیاری ١٧٣٧ و ١٧٤٧ کە هەناردەی چەکی ئێرانی قەدەغە کرد، سامانە سەرەکییەکانی ئێرانی سڕ کرد و رێگەی گرت لە وڵاتان لە دابینکردنی کەرەستەی پەیوەندیداری چەکی ناوکی بۆ ئێران. رازیکردنی ئەوروپییەکان، روسییەکان و چینییەکان لەسەر سزاکان، دەستکەوتێکی دپلۆماسی بوو. بەڵام هەر ئەندامێك فریوی ئەوەی خوارد خۆی دابڕێنێت و سوودی ئیدیعانی ببینێت. من زۆرجار ئەوەم بیری دۆستەکانم هێناوەتەوە کە ئێرانێکی چەکدار بە ئەتۆم چەندە ترسناکە. لە ئۆکتۆبەری ٢٠٠٧دا، ریپۆرتەرێك لە کۆنگرەیەکی رۆژنامەنووسیدا لەبارەی ئێران پرسیاری لێ کردم. وتم "من بە خەڵکم وتووە ئەگەر ئێوە بایەخ ئەدەن بە خۆلادان لە سێیەم جەنگی جیهانی،ئەوا دیارە کە دەبێ بایەخ بدەیت بە رێ لێگرتنیان لەوەی کە زانیاریی پێویستیان هەبێ لەبارەی دروستکردنی چەکی ناوکی".

ئاماژەی من بە سێیەم جەنگی جیهانی، نیمچە هیستریایەکی دروستکرد. خۆپیشاندەران لە دەرەوەی وتارەکەی مندا دەرکەوتن بە تابلۆی وەکو "لە ئێران دوورمان خەرەوە". رۆژنامەنووسان هەناسەیان بڕا، بەسەرهاتی پڕمقۆمقۆ بڵاوبوونەوە لەبارەی ئەمریکا لەلێواری جەنگدا. هیچیان دەرکیان بە مەبەستەکە نەکرد. من سۆراخی

ئەوەم نەدەکرد جەنگ هەڵبسێنم. من هەوڵ دەدا هاوپەیمانێتییەکە بپارێزم بۆ خۆلادان لێی.

لە نۆڤەمبەری ٢٠٠٧دا، کۆڕی هەواڵگری (مەزەندەی هەواڵگریی نیشتمانی) لەبارەی پرۆگرامی ناوکیی ئێرانەوە بەرهەم هێنا. مەزەندەکە، بەو شێوەیەی کە بۆی دەچووین، جەختی لەوە دەکردەوە کە ئێران وەکو بەرەنگارییەک لەبەرانبەر پابەندییەکانی ناو پەیماننامەکەی، ئیش لەسەر پرۆگرامێکی نهێنیی چەکی ناوکی دەکات. بەهەمان شێوە ریپۆرتی ئەوەی دەگەیاند کە لە ٢٠٠٣دا، ئێران هەوڵە نهێنییەکەی هەڵپەساردوو بۆ دیزاینکردنی کڵاوەی جەنگی- کە بەلای هەندێ کەسەوە بە کەمترین بەشی مەترسیداری بونیادنانی چەکێك دادەنرێ. سەرباری ئەو راستییەی کە ئێران ئەو موشەکانەی تاقی دەکردەوە کە دەکرا وەکو سیستەمێکی گەیاندن بەکاربهێنرێن و دەستپێکردنەوەی پیتاندنی یورانیۆمی راگەیاندبووەوە، مەزندەی هەواڵگریی نیشتمانی بە راگەیاندنێکی سەرسوڕهێن دەستپێکردبوو: "ئێمە بە بڕوایەکی بەرزەوە حوکمی ئەوە دەدەین کە لە پاییزی ٢٠٠٣دا، تاران پرۆگرامی چەکی ناوکی وەستاندووە".

ئەنجامگیرییەکەی مەزەندەی نیشتمانی ئەوەندە سەیر بوو کە من دڵنیابووم بە خێرایی بۆ ناو راگەیاندنەکان دزە دەکات. هەرچەندە رقیشم لەو بیرۆکەیە بوو، بڕیارمدا ئەنجامە سەرەکییەکان ئاشکرا بکەم بۆئەوەی بتوانین هەواڵەکان بە راستییەکان بنەخشێنین. پەرچەکردارەکە راستەوخۆ بوو. ئەحمەدینەژاد وەکو "سەرکەوتنێکی گەورە" پێشوازی لە مەزەندەی هەواڵگریی نیشتمانی کرد. تین و توان بۆ سزای نوێ لەناو ئەوروپییەکان، روسەکان و چینییەکاندا رەویەوە. لەکاتێکدا کە رۆژنامەنوسی نیویۆرک تایمز (دەیڤد سانگەر) بە دروستی وتی "مەزەندەی هەواڵگریی نوێ، فشاری نێودەوڵەتیی سەر ئێرانی شل کردەوە- هەمان ئەو فشارەی کە بەڵگەنامەکە خۆی بانگەشەی ئەوەی کردووە کە بەشێوەیەکی سەرکەوتووانە تینی بۆ وڵاتەکە هێناوە تا هەوڵەکانی چەکی هەڵپەسێرێت".

لە کانوونی دووەمی ٢٠٠٨دا، گەشتێکم بۆ خۆرهەڵاتی ناوەڕاست ئەنجام دا کە لەوێ هەوڵمدا سەرکردەکان دڵنیا بکەمەوە لەوەی ئێمە پابەندین بە مامەڵەکردن لەگەڵ ئێراندا.

ئیسرائیل و هاوپەیمانە عەرەبەکانمان خۆیان لە چرکەساتێکی دەگمەنی یەکگرتوویدا دۆزییەوە. هەردوولا بە قوڵی نیگەران بوون لە بەرانبەر ئێران و پەست بوون لە مەزەندە هەواڵگرییەکەی ئەمریکا. لە سعودیەی عەرەبی، من چاوم کەوت بە شاعەبدوڵلا و ئەندامانی (حەوت سودەیری)یەکە، کە کۆمەڵە برایەکی کاریگەری شافەهدی کۆچکردوون.

پرسیارم کرد "خاوەن شکۆ، دەتوانم کۆبوونەوەکە دەست پێبکەم؟" وتم "دڵنیام کە هەریەکێک لە ئێوە بڕوای وایە من وەکو ڕێگایەك بۆ خۆلادان لە هەنگاونانی سەربازی لەدژی ئێران، مەزەندەی هەواڵگریم نوسیبووە". کەس قسەی نەکرد. سعودییەکان ئەوەندە بەڕێز بوون کە بە دەنگی بەرز جەختیان لە گومانەکانیان کردەوە.

مەزەندەی هەواڵگریی نیشتمانی تەنیا بنکۆڵی دیپلۆماسی نەکرد. بەڵکو بەهەمان شێوە لەلایەنی سەربازی دەستەکانی منی بەستەوە. هۆکاری زۆر هەبوون لەبارەی ئەوەی کە نیگەران بووم لە ئەنجامدانی کردەوەی سەربازی، لەوانەش کاریگەرێتییە نادڵنیاکەی و ئەو کێشە جددیەکانی بۆ دیموکراسی تازەی ناسکی عیراق دروست دەکرد.

بەڵام پاش مەزەندەی هەواڵگری، چۆن دەمتوانی ڕوونی بکەمەوە کە کردەی سەربازی بەکاردێنم بۆ وێرانکردنی ئەو دامەزراوە ناوکییانەی وڵاتێك کە کۆڕی هەواڵگری وتوویەتی پڕۆگرامی ناوکیی چالاکی نییە؟

من نازانم بۆچی مەزەندەی هەواڵگریی نیشتمانی بەو شێوەیە نوسرابوو کە نوسرابوو. بیرم لەوە دەکردەوە ئاخۆ کۆڕی هەواڵگری ئەوەندە هەوڵی داوە خۆی لە دووبارەکردنەوەی هەڵەکەی عیراق لابدات کە هەڕەشەی ئێرانی نادیدە گرتووە. هەڵبەت من هیواداربووم کە ڕاڤەکارانی هەواڵگری لە هەوڵی ئەوەدا نەبن کە کاریگەری بخەنەسەر ڕێوشوێن و بەرنامە. ڕوونکردنەوەکە هەرچییەك بێت، مەزەندەی هەواڵگریی نیشتمانی کاریگەرییەکی گەورەی هەبوو- و باشیش نەبوو.

من بەشی هەرە زۆری ٢٠٠٨م بە کارکردن بۆ بونیادنانەوەی هاوپەیمانێتیی دیپلۆماسی لەدژی ئێران بەسەر برد. لە مانگی ئازاردا، ئێمە توانیمان خولێکی تری سزاکانی یوئێن بەدەست بێنین، کە ڕێگەی گرت لە وڵاتان بازرگانی تەکنۆلۆژیای بەکارهێنانی دوولایەنە

لەگەڵ ئێراندا بکەن کە دەتوانرا لە پرۆگرامی چەکی ناوکیی ئێراندا بەکاربهێنرێت. ئێمە بەهەمان شێوە قەڵغانی بەرگریی موشەکیمان فراوانکرد، لەوانەش سیستەمێکی نوێ بونیادنراو لە پۆڵەندە و کۆماری چیک بۆ پاراستنی ئەوروپا لە موشەک هاوێژیی ئێران.

لەهەمان کاتدا، من کارم کرد بۆ خێراکردنی سەعاتی ریفۆرم لەرێگەی کۆبوونەوە لەگەڵ نەیارانی ئێرانی، داوای ئازادکردنی زیندانیانی سیاسی، تەمویلکردنی چالاکوانانی کۆمەڵگەی مەدەنیی ئێرانی و بەکارهێنان تەکنۆلۆژیای رادیو و ئینتەرنێت بۆ بەخشکردنی پەیامە ئازادیخوازییەکان بۆ ئێران. ئێمە بەهەمان شێوە سۆراخی جۆرەها پرۆگرامی هەواڵگری و رێوشوێنی دارایی فراوانمان کرد کە دەیتوانی جوڵەی پرۆگرامی ناوکیی ئێران خاو بکاتەوە یان تێچوونەکەی زیاد بکات.

بەداخم کە سەرۆکایەتییەکەم کۆتایی هات و پرسی ئێرانم چارەسەر نەکرد. من رژێمێکم بۆ جێگرەوەکەم لەدوای خۆم جێهێشت کە لە هەرکاتێکی تر گۆشەگیرترە لە جیهان و سزای قورستری لەسەرە. من بڕوام وابوو کە سەرکەوتنی زیادکردنی سەرباز و سەرهەڵدانی عیراقێکی ئازاد لەسەر سنووری ئێران ئیلهام دەداتە نەیارانی ئێرانی و یارمەتیدەر دەبێ بۆ بەرجەستەکردنی گۆڕان. دڵخۆش بووم کە بینیم بزاڤی ئازادیی ئێران بە خۆپیشاندانی سەرانسەری گوزارشت لە خۆی دەکات پاش هەڵبژێردرانەوەی ساختەی ئەحمەدینەژاد لە حوزەیرانی ۲۰۰۹دا. بڕوام وایە لە رووخساری ئەو خۆپیشاندەرە ئازایانەدا، ئێمە ئایندەی ئێرانمان بینی. ئەگەر ئەمریکا و جیهان شانبەشانیان بوەستن لەکاتێکدا کە فشار لەسەر رژێمی ئێرانی دەهێڵنەوە، هیوای ئەوەم هەیە حکومەت و بەرنامەکانی بگۆڕێن. بەڵام یەک شت مایەی دڵنیاییە: دەبێ ئەمریکا هەرگیز رێگە نەدات ئێران بە بۆمبی ناوکی هەڕەشە لە جیهان بکات.

***

ئێران تاکە وڵات نەبوو کە بە سۆراخکردنی چەکی ناوکی، ئەجێندای ئازادی دەخستە مەترسییەوە. لە بەهاری ۲۰۰۷دا، راپۆرتێکی زۆر نهێنیم لە هاوکارێکی هەواڵگری بیانی پێگەیشت. ئێمە کۆمەڵێک فۆتۆی گوماناویمان کەوتە بەر دیدە کە بینایەیەکی شاراوە بوو لە بیابانی خۆرهەڵاتی سوریا. ئەو بینایەیە هاوشێوەیەکی سەرسوڕهێنی هەبوو لەگەڵ

دامەزراوەی ناوکیی لە (یۆنگبیۆن)ی کۆریای باکوور. ئێمە گەیشتینە ئەو ئەنجامەی کە بینایەکە ریاکتەرێکی تێدایە کە لە توانایدایە پولۆتۆنیۆمی ئاستی چەک بەرهەم بهێنێت. لەبەرئەوەی کۆریای باکوور تاکە وڵات بوو ریاکتەری لەو مۆدێلەی لە سی و پێنج ساڵی رابردوودا بونیادنابوو، گومانی بەهێزمان ئەوە بوو کە ئێمە تازە سوریامان بە ئاشکرا گرتووە کە بە یارمەتی کۆریای باکوور خەریکی بەدەستهێنانی توانای چەکی ناوکییە.

ئەمە بە دڵنیاییەوە ئەنجامگیریی سەرۆک وەزیران ئۆلمێرت بوو. ماوەیەکی کورت پاش ئەوەی راپۆرتەکەم وەرگرت، وتی "جۆرج، من داوات لێدەکەم کە ئەو بینایەیە بتەقێنیتەوە".

بە سەرۆک وەزیرانم وت "سوپاس بۆ وروژاندنی ئەو بابەتە. کاتێکم پێ بدە بۆ روانین لە هەواڵگری و وەڵامت دەدەمەوە".

من کۆبوونەوەی ئاسایشی نیشتمانیم بۆ زنجیرەیەک مشتومڕی توند ئەنجام دا. وەکو بابەتێکی سەربازی، ئەرکی تەقاندنەوەکە راستەوخۆ دەبێ. هێزی ئاسمانی دەتوانێ ئامانجەکە وێران بکات، هەروا بە ئاسانیش. بەڵام بۆمب بەردانەوە بەسەر وڵاتێکی خاوەن سەروەریدا بەبێ هۆشداریدان یان پاساوێکی راگەیەنراو، پەرچەکردارێکی توندی بەدواوە دەبێت. بژاردەی دووەم، هەڵمەتێکی ژێربەژێر بوو. ئێمە شێلگیرانە تاووتوێی بیرۆکەکەمان کرد، بەڵام سی.ئای.ئەی و سوپا گەیشتنە ئەو ئەنجامەی کە زۆر مەترسیدارە تیمێک بە تەقەمەنیی پێویستەوە بۆ ناو و دەرەوەی سوریا دزەپێبکەیت بۆ تەقاندنەوەی دامەزراوەکە.

بژاردەی سێیەم ئەوە بوو کە هاوپەیمانەکانمان لە هەواڵگرییەکە ئاگادار بکەینەوە، پێکەوە دامەزراوەکە بخەینەڕوو و داوا بکەین کە سوریا لە ژێر چاودێریی ئاژانسی وزەی ئەتۆم دایبخات و هەڵیبوەشێنێتەوە. بە دەرکەوتنی ناڕاستگۆیی رژێم، دەمانتوانی توانای خۆمان بەکاربێنین بۆ گووشارخستنەسەر سوریا بۆ کۆتاییهێنان بە پشتگیرییەکەی لە تیرۆر و دەستوەردان لە لوبنان و عێراق. ئەگەر سوریا هەڵوەشاندنەوەی دامەزراوەکەی رەت بکردایەتەوە، ئەوا ئێمە مەعنەویاتێکی گشتیی روونمان دەبوو بۆ هەنگاونانی سەربازی.

پێش ئەوەی بڕیارەکە بدەم، داوام لە بەڕێوەبەری سی.ئای.ئەی (مایك هایدن) کرد کە هەڵسەنگاندنێکی هەواڵگری ئەنجام بدات.

ئەو روونی کردەوە کە راشەکاران بڕوایەکی تەواویان هەیە بەوەی کە کارگەکە ریاکتەری ناوکی تێدایە. بەڵام لەبەرئەوەی نەیاندەتوانی شوێنگەی ئەو بەشە دیاری بکەین کە پێویستە بۆ گۆڕینی پلوتۆنیۆم بۆ چەك، ئەوان تەنیا دڵنیاییەکی کەمیان هەبوو لەبارەی پرۆگرامی چەکی ناوکیی سوریا.

راپۆرتەکەی مایك، بڕیارەکەی منی روون کردەوە. من بە ئۆلمێرتم وت "من ناتوانم پاساوی هێرشێك بدەم بۆ سەر وڵاتێکی خاوەن سەروەری تا ئەو کاتەی کە ئاژانسەکانی هەواڵگریمان دەیسەلمێنن کە ئەمە پرۆگرامێکی چەکە". پێم وت کە بڕیارم لەسەر بژارەی دیپلۆماسیی پشتیوانیکراو بە هەڕەشەی هێز داوە. پێم وایە ستراتیژییەکە پارێزگاری لە پەرژەوەندییەکانی تۆ و دەوڵەتەکەت دەکات و ئەگەری ئەوەش زیاتر دەکات کە ئێمەش بەرژەوەندییەکانمان بەدەست بێنین".

سەرۆك وەزیران نائومێد بوو. وتی "ئەمە شتێکە کە رێك لە دەماری ئەم وڵاتە دەدات". ئەو پێی وتم هەڕەشەی پرۆگرامێکی چەکی ناوکی لە سوریا پرسێکی "بوون"ە بۆ ئیسرائیل و نیگەرانی ئەوە بوو کە دیپلۆماسی بچەقێت و شکست بێنێت. وتی" دەبێ راست و راشکاو بم لەگەڵت. ستراتیژییەکەت بێزارم دەکات". ئەمەش کۆتایی پەیوەندییە تەلەفۆنییەکە بوو.

لە ٦ی سێپتێمبەری ٢٠٠٧دا، دامەزراوەکە تێکدرا. ئەزموونەکە لەزۆر لایەنەوە دەردەکەوت. جەخت کرایەوە لەوەی کە نیازی سوریا بەدەستهێنانی چەکی ناوکییە. بەهەمان شێوە بیرهێنەرەوەیەکی تری دا بەدەستەوە کە هەواڵگری زانستێکی بێ کەموکورتی نییە. لەکاتێکدا کە پێم وترا راشەکارەکانمان تەنیا دڵنیاییەکی کەمیان هەیە لەبارەی ئەمەی کە دامەزراوەکە بەشێك لە پرۆگرامی چەکە ناوکییەکان، چاودێری پاش تەقاندنەوەکە پیشانیدا کە کاربەدەستانی سوری بەشێوەیەکی چڕوپڕ پاشماوەی بینایەکە دادەپۆشن. ئەگەر دامەزراوە بە راستی تەنیا تاقیگەیەکی توێژینەوەی بێ گوناه

بووایە، ئەسەدی سەرۆکی سوریا لەناو هۆڵی نەتەوە یەکگرتووەکاندا بەسەر ئیسرائیلییەکاندا هاواری دەکرد. ئەمە حوکمێك بوو کە من بە دڵنیاییەکی تەواوەوە دام

جێبەجێکردنی لێدانەکە لەلایەن ئیسرائیلییەکانەوە، قەرەبووی ئەو بڕوایەی کردەوە کە من لەماوەی جەنگی لوبناندا بە ئیسرائیلییەکانم نەمابوو. من پێشنیار کرد بۆ ئێهود کە با کاتێك تێپەڕێت و پاشان ئێمە ئۆپەراسیۆنەکە وەکو ڕێگەیەکی گۆشەگیرکردنی ڕژێمی سوریا دەردەخەین. ئۆلمێرت پێی وتم کە نهێنیپارێزییەکی تەواوی دەوێت. ئەو دەیویست خۆی لەهەموو ئەو شتانە لابدات کە لەوانەیە سوریا بخانە سوچێکەوە و وا لە ئەسەد بکات تۆڵە بکاتەوە. ئەمە ئۆپەراسیۆنی ئەو بوو و من هەستم بە واجبێك کرد بۆ ڕێزگرتن لە هیواکانی. من بێدەنگیم پاراست، تەنانەت ئەگەرچی پێم وابوو دەرفەتێك هەیە کە لەدەستی دەدەین. دواجار، تەقاندنەوەکە ئامادەیی ئیسرائیلی پیشاندا بۆ هەنگاونانی تاکلایەنە. سەرۆك وەزیران ئۆلمێرت داوای گڵۆپی سەوزی نەکردبوو و منیش نەمدابوو. ئەو شتێکی کردبوو کە بڕوای وابوو پێویستە بۆ پارێزگاری لە ئیسرائیل.

***

یەکێك لەو کتێبە هەرە کاریگەرانەی کە لەماوەی سەرۆکایەتییەکەمدا خوێندمەوە (سندوقی ئاوی پیۆنگ یانگ)ی نەیاری کۆریای باکوور (کانگ چۆل هوان) بوو. یادداشتەکە، کەلەلایەن هێنری کیسنجەری هاوڕێمەوە پێشنیار کرا، بەسەرهاتی دە ساڵەی دەستبەسەرکردن و بەکاربردنی کانگ لە کەمپی زۆرەملێی کۆریای باکووردا دەگێڕێتەوە. من کانگم بۆ ئۆفیسی ئۆڤاڵ بانگهێشت کرد کە لەوێ ئەو ئێشی دڵتەزێنی لە نیشتمانەکەیدا گێڕایەوە، لەوانەش قات و قڕیی خەمناك و چەوساندنەوە.

چیرۆکی کانگ، قێزی قوڵی منی هێنایەوە لە دیکتاتۆرێك کە چەندەها گیانی لەناوبردبوو، کیم جۆنگ ئیل. لەسەرەتاکانی ئیدارەکەمدا، دۆن ڕەمسفێڵد، وێنەی سەتەلایتی نیمچە دوورگەی کۆریای لە شەودا، پیشان دام. باشوور بە ڕووناکییەکەیەوە زیندوو بوو، لەکاتێکدا کە باکوور تەواو ڕەش بوو. من ڕاپۆرتی هەواڵگریم خوێندەوە لەبارەی ئەمەی کە بەدخۆراکی، کۆریاییەکانی باکووری سێ ئینچ کورتتر کردبووە لە

ئێگرای کۆریاییەکی باشوور. کاتێک من لە ٢٠٠١دا ئۆفیسم گرتە دەست، نزیکەی ملیۆن کۆریایی باکوور لە شەش ساڵی یەک لەدوای یەکدا لەبرسامردبوون.

لە هەمان کاتدا، کیم جۆنگ ئیل خەریکی تێرکردنی شەهوەتی خۆی بوو بۆ کۆنیاکی ئەسڵی، مارسیدسی گرانبەها و فیلمی بیانی. ئەو ڕێچکەیەکی کەسایەتی بونیاد نابوو کە لەسەر کۆریاییەکانی پێویست دەکرد وەکو ڕێبەرێکی خواوەندئاسا بیپەرستن. ماشێنی پروپاگەندەکەی، بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە ئەو دەتوانێ کەش و هەوا کۆنترۆڵ بکات، شەش ئۆپێرای بەناوبانگی نوسیبوو و توانیبووی لە یارییەکی گۆڵفدا، لە خولی یەکەم پێنج جار تۆپ بخاتە کونەکەوە.

کیم بەهەمان شێوە پرۆگرامێکی چەکی ناوکی و توانایەکی موشەکی بالیستی جێگیر کردبوو کە دوو هاوپەیمانی ئەمریکا خستبووە بەر هەڕەشە-کۆریای باشوور و ژاپۆن- و بە ئەگەرێکی زۆر دەگەیشتنە کەناری خۆرئاوای ئەمریکا. پەرەپێدانی ناوکی، نیگەرانییەکی جددی بوو بەو پێیەی کە ڕوداوی ڕیاکتەرەکەی سوریا ئامارەی پێ دەکرد. لە وڵاتێک کە دراوی بەهاداری نەبوو، سیستەمی چەک و کەرەستەی ناوکی قەرەبووی هەناردەی سەرنجڕاکێشی کردبووەوە.

ڕوانگەی ئێمە بۆ کۆریای باکوور بابەتی یەکەم کۆبوونەوەکانی ئەنجومەنی ئاسایشی نیشتمانی بوو، ڕۆژێک پێش ئەوەی کە سەرۆک کیم دای جۆنگی کۆریای باشوور سەردانی ئەمریکا بکات. ئیدارەی پێشوو دانوستانی لەسەر (زەمینەی کاری ڕێککەوتن لەسەرکراو) کردبوو کە سوودی ئابووری خستبووەڕووی کیم جۆنگ ئیل لەبەرانبەر سرشکردنی پرۆگرامی چەکە ناوکییەکانی. دیار بوو کە تەواو قایل نەبووە. لە ساڵی ١٩٩٨دا، ڕژێمەکە موشەکێکی (تایپۆدۆنگ)ی بەسەر ژاپۆندا هەڵدابوو. لە ١٩٩٩دا، کەشتییەکانی لە دەریای زەرد تەقەیان لە کەشتییەکانی کۆریای باشوور کرد. مانگێک دوای ئەوەی کە ئۆفیسم گرتە دەست، ڕژێمەکە هەڕەشەی ئەوەی کرد کە تاقیکردنەوەی موشەکە دوورهاوێژەکان دەست پێدەکاتەوە ئەگەر ئێمە بەردەوام نەبووین لە دانوستانەکان لەسەر ئاسایی کردنەوەی پەیوەندییەکان.

من بە تیمی ئاسایشی نیشتمانییەکەم وت کە مامەڵەکردن لەگەڵ کیم جۆنگ ئیل پەروەردەکردنی منالم بیر دەخاتەوە. کاتێک باربارا و جێنا بچوک بوون و دەیانویست سەرنجیان لێبدرێت، خواردنەکانیان هەڵدەدایە سەر ئەرزەکە. من و لۆرا و لە شوێنی خۆمان دەردەپەڕین و هەڵماندەگرتەوە. جارێکی تر کە دەیانویست سەرنجیان لێ بدرێ، دیسان خواردنەکەیان فڕێ دەدایەوە. وتم "ئەمریکا خەریکی هەلگرتنەوەی خورادنەکەیەتی". ساڵی دواتر، راپۆرتەکانی هەوالگری پیشانیاندا کە ئەگەر ئەوە هەیە کۆریای باکوور ئیش لەسەر پرۆگرامێکی نهێنیی یورانیۆمی پیتێنراوی ئاست بەرز بکات-رێگای دووەم بەرەو بۆمبی ناوکی. ئەمە دەرخستنێکی تەواو نائاسایی بوو. کیم ناپاکی کردبوو بەرانبەر (زەمینەی کاری رێککەوتن لەسەر کراو). من بڕیارێکمدا: ئەمریکا چیتر بە شێوەی دوولایەنە دانوستان لەگەڵ کۆریای باکوور ناکات. لەبری ئەمە، ئێمە چین، کۆریای باشوور، روسیا و ژاپۆن رادەسپێرین کە بەرەیەکی هاوبەش لەدژی رژێمەکە بخەنەروو. کلیلی دیپلۆماسیی فرەلایەن لەگەڵ کۆریای باکووردا چین بوو کە پەیوەندیی نزیکی لەگەڵ هاوتا کۆمەنیستەکەیدا هەبوو. تەحەدییەکە ئەوە بوو کە چین و ئەمریکا بەرژەوەندیی جیاوازیان لەسەرە نیمچەدوورگەی کۆریا هەبوو. چینییەکان سەقامگیرییان دەویست، ئێمەش ئازادی. ئەوان نیگەرانی ئەو پەنابەرانە بوون کە لەودیو سنوورەکەوە دەرژانە ناو وڵاتەکەیانەوە. ئێمەش نیگەرانی لەبرسامردن و مافەکانی مرۆڤ بووین. بەلام یەک پانتایی هەبوو کە تیایدا ئێمە لەسەری کۆک بووین: لە بەرژەوەندیی هیچ لایەکمان نەبوو کە رێگە بدەین کیم جۆنگ ئیل چەکی ناوکی هەبێت.

لە ئۆکتۆبەری ٢٠٠٢دا، من بانگهێشتی سەرۆک جیانگ زیمینی چینم کرد بۆ کێلگەکە لە کراوفۆرد. من کۆریای باکوورم هێنایە بەرباس. وتم "ئەمە هەڕەشەیەکە نەک تەنیا بۆ ئەمریکا، بەڵکو بۆ چینیش". داوام لێیکرد تا بێتەپاڵمان بۆ رووبەڕووبوونەوەی کیم بە شێوەی دیپلۆماسییانە. "ئەمریکا و چین جۆری جیاوازی کاریگەرییان لەسەر کۆریای باکوور هەیە. ئەوەی ئێمە زیاتر نێگەتیڤە، لەکاتێکدا کە ئەوەی ئێوە پۆزەتیڤە. ئەگەر ئێمە ئەو دوو کاریگەرییە لێک بدەین، ئەوا تیمێکی بێ وێنە پێک دەهێنین". سەرۆک

جیانگ بەڕێز بوو، بەڵام پێی وتم کۆریای باکوور کێشەی منە نەک هی ئەو. وتی " پیادەکردنی کاریگەری لەسەر کۆریای باکوور زۆر ئاڵۆزە".

پاش چەند مانگێک نەبوونی بەرەوپێشچوون، هەوڵی بەلگاندنێکی جیاوازم دا. لە کانوونی دووەمی ۲۰۰۳دا، بە سەرۆک جیانگم وت ئەگەر پرۆگرامی چەکە ناوکییەکانی کۆریای باکوور بەردەوام بێت، ئەوا ناتوانم ژاپۆن بوەستێنم- رکابەری مێژوویی چین لە ئاسیا- کە چەکی ناوکیی خۆی دروست بکات. وتم "من و تۆ لە پێگەیەکداین کە پێکەوە کار بکەین بۆ دڵنیا بوونەوە لەوەی کە پێشبڕکێی چەکە ناوکییەکان دەست پێناکات". لە مانگی شوباتدا، من هەنگاوێك چوومە پێشەوە. بە سەرۆک جیانگم وت ئەگەر ئێمە نەتوانین کێشەکە بە شێوەیەکی دیپلۆماسی چارەسەر بکەین، ئەوا دەبێ لێدانێکی سەربازی لەدژی کۆریای باکوور ئەنجام بدەم.

دواتر یەکەم کۆبوونەوەی وتوێژی شەش لایەنە لە بێجینگ ئەنجام درا. بۆ یەکەم جار، کاربەدەستانی کۆریای باکوور لەسەر مێز دانیشتن و بینییان کە نوێنەرانی چین، ژاپۆن، روسیا و کۆریای باشوور و ئەمریکا سەیریان دەکەنەوە. بەرەوپێشچوون هەنگاو بەهەنگاو بوو. من چەند سەعاتێکم بە تەلەفۆنکردن لەگەڵ دۆستەکانمان بەسەر برد، مەترسییەکانم بیر دەهێنانەوە و پێویست بوو بەرەیەکی هاوبەش بەرقەرار بکەم.

لە سێپتێمبەری ۲۰۰۸دا، تۆقرەمان لێهەلگیرا. کۆریاییەکانی باکوور رازی بوون لەسەر دەستبەرداربوونی هەموو چەکە ناوکییەکان و گەڕانەوە بۆ پابەندێتییەکانیان لەژێر (پەیماننامەی پەرەپێنەدانی ناوکی). من گومانم هەبوو. کیم جۆنگ ئیل لە رابردوودا پابەندییەکانی پێشێل کردبوو. ئەگەر جارێکی تر ئەمەی بکردایەتەوە، ئەوا قسەی خۆی دەشکاند نەک تەنیا لە بەرانبەر ئەمریکادا، بەڵکو لەبەرانبەر هەموو دراوسێکانی، لەوانەش چین.

***

لە چواری تەموزی ۲۰۰٦دا، کیم جۆنگ ئیل خواردنەکەی فرێدایە سەر زەوی. ئەو لێشاوێك موشەکی بەسەردا دەریای ژاپۆندا باراند. تاقیکردنەوەکە، شکستێکی سەربازی بوو، بەڵام وروژاندنەکە راستەقینە بوو. تیۆرەی من ئەوە بوو کە کیم بینیوویەتی جیهان

تەرکیزی لەسەر نێرانە و ئارەزوومەندی سەرنجڕاکێشانە. ئەو بەهەمان شێوە دەیویست هاوپەیمانان تاقی بکاتەوە ئاخۆ تا چەند دەتوانێ ڕێ بکات.

من تەلەفۆنم بۆ هو جینتاوی سەرۆکی چین کرد، وتم کیم جۆنگ ئیل ئیهانەی چینی کردجووە و داوام لێیکرد بە ئاشکرا موشەکبارانەکە مەحکوم بکات. ئەو بەیانێکی دەرکرد کە تیایدا جەختی لە پابەندییەکەی کردبووەوە بە "ئاشتی و سەقامگیری" و دژی هەر کردارێك بوو کە "ببێتەهۆی گرژکردنی بارودۆخەکە" قسەکانی نەرم بوون، بەلام ئەوان هەنگاویان بە ئاراستەی دروست نابوو.

سێ مانگ دواتر، کۆریای باکوور جارێکی تر لە ڕێگەی تاقیکردنەوەی تەواوی ناوکی، بەرەنگاری جیهانی کردەوە. کاردانەوەی سەرۆك هو ئەم جارە توندتر بوو. وتی "حکومەتی چینی بە توندی دژی ئەمەیە. ئێمە هاتینە ناو وتوێژەوە بۆ هانابردن بۆ کۆرییەکانی باکوور تا دوور بکەونەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، دراوسێکەمان گوێی خۆی لە ئامۆژگارییەکەمان کەڕ کرد".

بە پشتیوانی هەموو هاوکاران لە وتوێژی شەش لایەنە، ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان بە کۆی دەنگ بڕیاری ١٧١٨ی پەسەند کرد. بڕیارەکە قورسترین سزای لە سەروەختی جەنگی کۆریاوە بەسەر کۆریای باکووردا سەپاند. ئەمریکاش بە هەمان شێوە سزاکانی لەسەر بانکەکانی وڵاتەکە توند کرد و ڕێگەی گرت لەوەی کە کیم جۆنگ ئیل شتومەکە گرانبەهاکانی دەست کەوێ.

گووشارەکە کاریگەری هەبوو. لە شوباتی ٢٠٠٧دا، کۆریای باکوور ڕازی بوو لەسەر داخستنی ریاکتەرە ناوکییە سەرەکییەکەی و ڕێگەی بە پشکنەرانی یونێن دا تا بگەڕێنەوە بو وڵاتەکە بۆ پشتڕاستکردنەوەی کردارەکە. لە بەرانبەردا، ئێمە و شەش لایەنە هاوکارەکە کۆمەکی وزەمان دابین کرد و ئەمریکا ڕازی بوو لەسەر لابردنی کۆریای باکوور لە لیستی دەوڵەتانی سپۆنسەری تیرۆر. لە حوزەیرانی ٢٠٠٨دا، کۆریای باکوور بورجی ساردکردنەوەی (یۆنگبیۆن)ی تەقاندەوە و لە تەلەفزیۆنە نێودەوڵەتییەکەی پیشانیدا. لەم حاڵەتەدا، هیچ پشتڕاستکردنەوەیەکی تر پێویست نەبوو.

لەگەڵ ئەوەشدا، کێشەکە چارەسەر نەکرا. خەڵکی کۆریای باکوور هێشتا لەبرسا دەمردن و ئازاریان دەچەشت. راپۆرتەکانی هەوالگری بەڵگەی زیاتر و زیاتریان دابین دەکرد لەمەڕ ئەوەی کە کۆریای باکوور بەردەوامە لە پرۆگرامی پیتاندنی یورانیۆمی ئاست بەرز، ئەگەرچی بانگەشەی ئەوەی کردبوو کە خستنەوەکاری پلوتۆنیوم دەوەستێنێت. لە کورت مەودا دا، من بڕوام وایە کە وتوێژەکانی شەش لایەنەکە نیشانەی باشترین هەڵ بوو بۆ بەرقەرارکردنی کاریگەری لەسەر کیم جۆنگ ئیل و دەربازکردنی نیمچەدوورگەی کۆریا لە چەکە ناوکییەکان. لە دوورمەودا دا، من قەناعەتم وایە کە تاک ڕێگە بۆ گۆڕانی پڕمانا ئەوەیە کە گەلی کۆریای باکوور ئازاد بن.

***

ئەجێندای ئازادی بابەتێکی هەستیار بوو لەگەڵ چین. بەرنامەکەی من بریتی بوو لە هێنانی چین بوو بۆ ناو ئەو بوارانەی کە ئێمە لەسەری کۆک بووین و ئەم هاوکارییە بەکاربێنین بۆ بونیادنانی ئەو متمانە و ڕێزەی پێویستمان بوو بۆ قسەکردنی ڕاشکاوانە لەبارەی جیاوازییەکانمانەوە.

من کارم کرد بۆئەوەی پەیوەندیی نزیک لەگەڵ سەرکردەکانی چیندا دروست بکەم، جیان زیمینگ و هو جینتاو. من و سەرۆک جیانگ لە سەرەتایەکی سەختەوە دەستمان پێکرد. لە ١ی نیسانی ٢٠٠١دا، فڕۆکەیەکی چاودێریی ئەمریکی ناسراو بە (ئی.پی ٣) خۆی کێشا بە فڕکەیەکی چینی و نیشتنەوەیەکی ئیمێرجێنسی بۆ سەر دوورگەی (هانیان) ئەنجامدا. فڕۆکەوانە چینییەکە لە شوێنەکەی خۆی دەرپەڕی و مرد. ستافە بیست و چوار کەسییەکەی ئێمە لە بنکە سەربازییەکان دەستبەسەر کران و لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدا کرا. قەیرانی بارمتە ئێرانییەك لە مێشکمدا بوو. ئەمە ئەو ڕێگایە نەبوو کە دەمویست پەیوەندی خۆم لەگەڵ چیندا دەست پێبکەم.

پاش چەند ڕۆژێکی پڕئازاری هەوڵدان بۆ پەیوەندیکردن بە چینییەکانەوە، من قسەم لەگەڵ سەرۆک جیانگ کرد کە لە شیلی بوو. چینییەکان بەزوویی ڕازی بوون کە ستافی (ئی.پی سێ) ئازاد بکەن. لەبەرانبەردا، من نامەیەکم نووسی بۆ دەربڕینی پەژارە لە بەرانبەر مردنی فڕۆکەوانەکەیان و نیشتنەوەمان لە هانیان بەبێ مۆڵەتی زارەکی. دواتر

من زانیم کە مامەڵەکردنی چین لەگەڵ قەیرانەکەدا لەسەر بنەمای باوەڕی حکومەت بووە بەوەی کە گەلی چین هەستی بە لاوازی کردووە لە کاردانەوەدا بەرانبەر تەقاندنەوەی ڕێکەوتی باڵیۆزخانەی چین لە بەغدا لە ساڵی ١٩٩٩دا. پاش ڕووداوەکەی (ئی.پی سی)، چینییەکان فاتورەیەکی ١ ملیۆن دۆلارییان بۆ حەوانەوە و خواردنی ستافە ئەمریکییەکە نارد. ئێمە ٣٤,٠٠٠ دۆلارمان خستنەڕوو. لە شوباتی ٢٠٠٢دا، من و لۆرا یەکەم گەشتمان بۆ بێجینگ ئەنجامدا. سەرۆک جیانگ، خانەخوێیەکی دۆستانە و گەرم و گوڕ بوو. پاش خوانێك لەسەر شەرەفی ئێمە لە (هۆڵی گەورەی گەل)؛ ئەو بە ئەدائی "ئۆ سۆل میۆ" ی دوو ژنی چینیی جوان بە جلی سەربازییەوە، سەری ئامادەبووانی گەرم کرد. مۆسیقاکەی ئەو گۆڕانێکی گەورە بوو بە بەراورد بە ساڵی پێشوو کاتێك نەمتوانی بە تەلەفۆن دەستم کەوێت. ئەمە نیشانەیەك بوو بۆئەوەی کە متمانەمان پەیدا دەبێت.

ئەو متمانەیە بەهۆی لێکتێگەیشتنێك لەسەر تایوان بەهێزتر بوو، ئەو دوورگە دیموکراسییەی کە لەسەروەختی پێکدادانانی نێوان جیانگ کای شێك و ماوزیدۆنگ لەماوەی شەڕی ناوخۆی چیندا لە ١٩٤٩ بە شێوەیەکی جیا لە سەرزەمینە سەرەکییەکە حوکمڕانی کرابوو. هەر جارێك کە من چاوم بە سەرکردەکانی چین دەکەوت، جەختم لەوە دەکردەوە کە بەرنامەی لەمێژینەی "یەك چین" ناگۆڕێت. من بەهەمان شێوە ڕوونم کردەوە کە دژی هەر گۆڕانێکی تاکلایەنەم لە وەزعی راهین، لەوانەش ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی لەلایەن تایوان یان کردەی سەربازی لەلایەن چین.

کاتێك هو جینتاو سەرۆکایەتی گرتەدەست، من سوور بووم لەسەر بەرقەرارکردنی پەیوەندییەکی نزیك لەگەڵ ئەویشدا. ئەو کە شانزە ساڵ لە سەرۆکەکەی پێشوو گەنجتر بوو، ڕەفتارێکی پڕجۆش و خرۆشی نەبوو و ئەقڵیەتەکەی شیکاری بوو. وەکو زۆرێك لە جیلی نوێی سەرکردەکانی چین، ئەو وەکو ئەندازیار مەشقی بینیبوو. لە ماوەی نیوەڕۆخوانێکدا کە ژووری (ئیست)، من بە پرسیارێکەوە ڕووم تێکرد کە حەز دەکەم ئاراستەی سەرکردەکانی جیهانی بکەم :" چ شتێك لە شەودا بێدار دەتهێڵێتەوە؟"

من وتم ئەوەی کە بە بێداری دەمهێڵێتەوە، نیگەرانییە لەبارەی هێرشێکی تیرۆریستیی تر بۆ سەر ئەمریکا. ئەو خێرا وەڵامی دایەوە کە گەورەترین نیگەرانییەکەی بریتییە لە

هێنانەکایەی بیست و پێنج ملیۆن دەرفەتی کار لە ساڵێکدا. من وەڵامەکەیم بەلاوە سەرنجڕاکێش بوو. ڕاستگۆیانە بوو. ئەمە پیشانیدا کە هوجینتاو نیگەرانە لەبارەی کاریگەریی کۆمەڵانی ناڕازی و بێکار. ئەمە بەرنامەکانی حکومەتی ڕوون کردەوە لە شوێنانی پرسامانی وەکو ئێران و ئەفریقا. ئەمە بەهەمان شێوە ئاماژەیەك بوو بەوەی ئەو سەرکردەیەکی پراکتیکییە کە سەرنجی خستووەتەسەر ناوەوە، نەك ئایدۆلۆگێك کە ئەگەری هەیە کێشە لە دەرەوە هەڵایسێنێت.

من لەگەڵ سەرۆك هو کارم کرد بۆ دۆزینەوەی زەمینەیەکی هاوبەش لەسەر پرسی وەکو کۆریای باکوور، گۆڕانی کەش و هەوا تا بازرگانی. فراوانکردنی دەستگەیشتنی ئەمریکا بە یەك ملیارد بەکاربەری چین، ئەولەویەتێکی گەورەی من بوو، هەروەکو چۆن دەستگەیشتن بە بازاڕی ئەمریکی بۆ چینییەکان گرنگ بوو. من بەهەمان شێوە بازرگانیم وەکو ئامرازێك بۆ برەوپێدانی ئەجێندانی ئازادی بینی. بڕوام وابوو کە، بەپێی تێپەڕبوونی کات، ئازادی شاراوە لە بازاڕدا وا لە خەڵکی دەکات کە لە گۆڕەپانی گشتیدا داوای ئازادی بکەن. یەکێك لە یەکەم بڕیارەکانم بریتی بوو لە درێژەدان بە پشتگیریی سەرۆك کلینتن بۆ هاتنی چین بۆ ناو ڕێکخراوی بازرگانیی جیهانی. بۆ بتەوکردنی پەیوەندییە ئابوورییەکانمان، من داوام لە وەزیری خەزێنە (هانك پۆلسن) و کۆندی کرد کە (دیالۆگی ئابووریی ستراتیژی) بهێننەکایەوە.

ڕووبەڕێکی ناکۆکی لەگەڵ سەرکردایەتیی چین مافەکانی مرۆڤ بوو. تەرکیزی من لەسەر ئازادیی ئایینی بوو، چونکە بڕوام وابوو کە ڕێگەدان بە خەڵکی بۆ پەرستنی ئەوەی کە دەیانەوێ؛ چەقی ئەجێندای ئازادییە. لە یەکێك لە یەکەم کۆبوونەوەکانمدا، من بۆ سەرۆك جیانگم ڕوون کردەوە کە ئیمان بەشێکی زیندووە لە ژیانی مندا و ئەمەی کە من پێم وت کە پلانم داناوە بۆ هێنانەبەرباسی هەموو ڕۆژێ تاووتوێی وشەکە دەکەم. من پێم وت کە پلانم داناوە لە وەڵامدا وتی "من ئینجیلم پەرەپێدانی ئازادیی پەرستن لە وتوێژەکانماندا. لە وەڵامدا وتی "من ئینجیلم خوێندووەتەوە، بەڵام متمانەم بەوە نییە کە دەیڵێت".

من بە هەردوو جیانگ و هو-م وت کە باوەڕدارانی ئایینی، هاوڵاتییانی ئاشتیخواز و بەرهەمهێن دەبن، ئەو جۆرە خەڵکانەی کە وڵاتەکەیان بەهێزتر دەکەن. پێم وتن

بۆئەوەی چین بگاتە ترۆپکی توانای وەی، پێویستە ئازادی زیاتر بە خەڵکەکەیان بدەن. من موحازەرەم بەسەر ئەواندا نەدا نە بەسەریشمدا سەپاندن، ویستم کردارەکانم پەیامێك بنێرن. من و لورا چووینە کەنیسەیەك لە بێجینگ، چاومان کەوت بە رێبەرانی ئایینیی وەکو (کاردینال جۆزێف زێن)ی هۆنگ کۆنگ و لەبارەی مافەکانی زیندانییانی سیاسی، نەیاران، خاوەن بلۆگ و خواپەرستان و وتاربێژانی ژێربەژێر کرد.

لە لوتکەی ۲۰۰۷ی هاوکاریی ئابووریی ئاسیا-پاسیفیك (ئاپێك)، بە سەرۆك هو-م وت کە پلانم داناوە بۆ ئامادەبوون لە مەراسیمێکدا کە تیایدا دالای لاما میدالی زێڕینی کۆنگرێس وەردەگرێت. رێبەرە بوزییەکە سورچاوەی نیگەرانی بوو بۆ حکومەتی چینی، کە بە وروژاندنی جوداییخوازانی تبت تۆمەتباری دەکرد. من لە ماوەی سەرۆکایەتییەکەمدا پێنج جار چاوم بە دالای لاما کەوت و بۆم دەرکەوت کە پیاوێکی ئاشتیخوازی سەرنجراکێشە. من بە سەرکردەکانی چینم وت کە نابێ لێی بترسن. وتم "ئەمە لێدانێك نییە لە چین، بەڵکو ئەمە پێزانەیەکە بۆ رێزم بۆ دالای لاما و بۆ کۆنگرێسی ئەمریکی. ئێوە دەزانن کە باوەڕی بەهێزم بە ئازادیی ئایینی هەیە".

سەرۆك هوجینتاو لە وەڵامدا وتی "ئەمە پرسێکی سیاسیی هەستیارە لە چین... ئەمە کاردانەوەیەکی بەهێز لەلایەن گەلی چینەوە دەوروژێنێت". مەبەستی ئەوە بوو کە کاردانەوەیەکی بەهێز لەلایەن حکومەتەوە دەوروژێنێت، کە نەیدەویست یەکەم سەرۆکی ئەمریکی بم کە لەگەڵ دالای لاما بە ئاشکرا دەردەکەوێت.

وتم "بە داوای لێبووردنەوە دەبێ بچم بۆ ئەو مەراسیمە". بەهەمان شێوە هەواڵی خۆش هەبوو کە بیبیستم. پرسیارم کرد لەبارەی یارییە هاوینەییەکانی ۲۰۰۸ کە قەرار وابوو چین میوانداری بکات "پلانی یارییە ئۆلۆمپییەکانتان چۆن بەڕێوە دەچێت؟"

ئەو زانیاریی تازەی پێدام لەبارەی پرۆسەی ئامادەسازییەکەوە. پێیم وت کە دێم بۆ یارییەکان. دەمزانی کە رووبەڕووی فشاری ئەوە دەبمەوە کە نەچم و زۆر کەس هەوڵیان دەدا یارییەکان بە سیاسی بکەن، بەڵام من بەڵێنمدا کە ئەو دەتوانێ متمانەم پێ بکات کە ئامادە دەبم. بە گاڵتەوە وتم "تازە هۆتێلەکەشم گرتووە". ئەو ئارام دیار بوو. ئۆلەمپیکی بێجینگ یەکێك بوو رووداوە دیارەکانی دوایین ساڵی سەرۆکایەتیم. من لەگەڵ

لۆرا، باربارا، مارڤینی برام، مارگرێتی براژنم، هاورێکانمان رۆناڵد و لویس بێت و براد فریمان بە سواری هێزی ئاسمانیی یەک کەوتینە رێ. دایکم و باوکم و دۆرۆ لە چین ئێمەیان چاوەڕێی ئێمەیان دەکرد. من و باوکم چووینە لای (ساندی راندت)، کە تەواوی هەشت ساڵەکە لە بێجینگ کاری کردبوو، بۆ کردنەوەی باڵیۆزی تازەی گەورەی ئەمریکا. ئەمە گۆڕانێکی تەواو بوو لە پۆستێکی دیپلۆماسیی پێش سی و سێ ساڵ کە لەلایەن باوکمەوە بەڕێوە دەبرا. لە ئاماژەیەکی سەروو ئاسایی بەخشندەیی، سەرۆک هو لە بینایەی (ژۆنگنانهای)ی حکومەت میوانداریی نیوەڕۆخوانێکی هەموومانی کرد، کە یەکگرتنەوەیەکی خێزانیی بێ وێنەی بوش بوو.

یارییە ئۆڵەمپییەکانی بێجینگ بوو بە سەرکەوتنێکی ئاوازە- و پڕ لەسەرگەرمیش. ئێمە لە حەوزی (وەتەر کیوب) بووین کاتێک تیمی مەلەوانیی پیاوان، گەڕانەوەیەکی دراماتیکییان نمایش کرد کە تیایدا بە پەراوێزێکی بچوک کەوتنە دوای فەرەنسا و میداڵی ئاڵتونیان بۆی مسۆگەر کرد. من چووم بۆ تەماشاکردنی تیمی بێ وێنەی ئەدائی هەردوو کچە وەرزشکار (میستی مەی تینەر) و (کێری وۆڵش) لە یاریی ڤۆڵبۆلی کەنار دەریا. من بووم بە سەردێری هەواڵە نێودەوڵەتییەکان کاتێک دەستێکی هاندانم لە پشتی (میستی)دا- کەمێک لەسەروو شوێنە تەقلیدییەکەوە. ئێمە سەردانێکی ژووری لۆکەرەکانمان کرد بەر لەوەی کە تیمی ئەمریکی و چینی لە یارییەکی یاریی سەلەی پڕتەماشاکەری مێژووییدا رووبەڕووی یەکتر ببنەوە. یاریزانەکان لەوە زیاتر شکۆمەندتر و کاریگەرتر نەدەبوون. کاتێک باوکم هاتە ژوورەکەوە؛ لوبۆرن جەیمز هاواری کرد "سڵاو، باوک".

یارییەکانی ئۆڵەمپیک دەرفەتێکی بە جیهان دا تا جوانی و ئەفرێنەرێتی چین ببینێت. هیوادار بووم کە یارییەکان بەهەمان شێوە نیگایەک بۆ جیهانی بەرفراوانتر بە خەڵکی چین بدەن، لەوانەش شیمانەی راگەیاندنی ئازاد، ئینتەرنێتی کراوە و ئازادیی دەربڕین. زەمەن ئەوە دەردەخات کە کاریگەریی یارییەکانی ئۆڵەمپیک چۆن دەبێ. بەڵام مێژوو پیشانی دەدات کە هەرکە خەڵکی تامی ئازادییان کرد، دواجار زیاتریان دەوێ.

***

٢٣ی نۆڤەمبەری ٢٠٠٢، ڕۆژێکی باراناوی و تەماوی بوو لە بوخارست. لەگەڵ ئەوەشدا دەیان هەزار کەس ڕژابوونە گۆڕەپانی (شۆڕش) بۆ یادکردنەوەی چوونەناو ناتۆی ڕۆمانیا، بەرەوپێشچوونێکی گەورە بۆ وڵاتێک کە تەنیا پێش پانزە ساڵ دەوڵەتێکی کیانی سۆڤیەتی و ئەندامی پەیماننامەی وارشۆ بوو. لەکاتێکدا کە لە سەکۆیەکە نزیک دەکەوتمەوە، بالکۆنییەکی ڕووناکی درەوشاوەم بەدی کرد. من پرسیارم لە پیاوەکەی سەر شانۆکە کرد "ئەوە چییە؟". وتی ئەمە ئەو شوێنەیە کە نیکۆلای چاوچیسکۆ، دیکتاتۆری کۆمەنیستی ڕۆمانیا، دوایین وتاری پێشکەش کرد بەر لەوەی لە ١٩٨٩دا لەسەر حوکم لابدرێت.

لەکاتێکدا کە سەرۆک یۆن بیسکو منی ناساند، باران وەستا و پەلکەزێڕینەیەکی تەواو دەرکەوت. پەلکەزێڕینەکە بە درێژایی ئاسمان ڕاکشا و ڕێک گەیشتە پشت باڵکۆنییەکە کە وەکو یادکردنەوەیەکی ئازادی درەوشایەوە. ئەمە چرکەساتێکی کاریگەر بوو. بە خۆشی ئەو یادە وتم "ئەمڕۆ خوا خەندەی بە ڕووی ئێمەدا دەردەخات".

ڕۆمانیا تاکە سیستەمی دیموکراسیی ساوا نەبوو کە ئاهەنگی ئەو ڕۆژەی دەگێڕا. من بەهەمان شێوە دەنگی ئەمریکام دابوو بە هاتنەناو ناتۆی بولگاریا، ئێستۆنیا، لاتیڤیا، لیتوانیا، سلۆڤاکیا و سلۆڤینیا. من فراوانبوونی ناتۆم وەکو ئامرازێکی بەهێز دەبینی بۆ بەرەوپێشبردنی ئەجێندای ئازادی. لەبەرئەوەی ناتۆ داوا لە وڵاتان دەکات کە پابەند بن بە ستانداردە بەرزەکانی کرانەوەی ئابووری و سیاسی، ئەگەری ئەندامێتی ئەنگیزەیەکە بۆ ڕیفۆرم.

ساڵێک پاش وتارەکەم لە بوخارست، گەنجێکی دیموکراتی کاریزمایی بەناوی (میخایل ساکاشڤیلی) هاتە ناو دانیشتنی دەستپێکی پەرلەمان لە کۆماری پێشووی سۆڤیەت (جۆرجیا). بە قسەکردن بۆ هەزاران خۆپیشاندەری جۆرجی، ئەو وەکو ئەنجامێکی نارەوای هەڵبژاردنێکی گەندەڵانە، ڕەخنەی لە ئەنجومەنەکە گرت. سەرۆک (ئێدوارد شیڤارنادزێ) هەستی بە فشارەکە کرد و دەستی لەکار کێشایەوە. کودەتا بێ خوێنەکە بە شۆڕشی (ڕۆز) ناسرا. شەش هەفتە دواتر، گەلی جۆرجی چووە بەردەم سندوقەکانی دەنگدان و ساکاشڤیلی بە سەرۆکی خۆی هەڵبژارد.

لە نۆڤەبمەری ٢٠٠٤دا، پاش هەڵبژاردنێکی سەرۆکایەتیی ساختە لە ئۆکرانیا، شەپۆلێکی هاوشێوەی پرۆتێستۆ هەڵایسا. سەدان هەزار خۆپیشاندەر جەسارەتیان کرد کە لە کەش و هەوای سەرما وسۆڵەدا برژێنە سەر شەقامەکان بۆ کاندیدی ئۆپۆزسیۆن (ڤیکتۆر یوشچینکۆ). لە ساتێک لە ساتەکانی هەڵمەتەکەدا، یوشچینکۆ دووچاری ژەهراویکردنێکی نادیار هات کە بووەهۆی شێوانی دەم و چاوی. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو رەتی کردەوە کە لە پێشبڕکێکە بێتە دەرەوە. لایەنگرەکانی هەموو رۆژێک بە ملپێچ و قردێلەی پرتەقاڵی دەهاتنە دەرەوە تا ئەو کاتەی کە دادگای باڵای ئۆکرانی فرمانیدا بە ئەنجامدانەوەی هەڵبژاردنەکە. یوشچینکۆ بردییەوە و لە ٢٣ی کانوونی دووەمی ٢٠٠٥دا سوێندی خوارد و بەمەش شۆڕشی پرتەقاڵی تەواو کرد.

لە لوتکەی ٢٠٠٨ی ناتۆدا لە بوخارست، هەردوو جۆرجیا و ئۆکرانیا داوای ئەندامێتیی پلانەکانی کردار (ماپ)یان کرد کە دوایین هەنگاو بوو پێش ئەندامێتیی تەواو. من لایەنگرێکی بەهێزی داواکەیان بووم. بەڵام پەسەندکردن پێویستی بە کۆدەنگی هەبوو و ئەنگێلا مێرکل و نیکۆلا سارکۆزیی سەرۆکی نوێی فەرەنسا بەگومان بوون. ئەوان دەیانزانی کە جۆرجیا و ئۆکرانیا ئەم پەیوەندییانەیان لەگەڵ مۆسکۆ هەیە و نیگەرانی ئەوە بوون کە ناتۆ رابکێشرێتە ناو جەنگ لەگەڵ روسیا. ئەوان بەهەمان شێوە لەبارەی گەندەڵییەوە نیگەران بوون. من پێم وابوو کە هەڕەشەی روسیا، وەرگرتنی جۆرجیا و ئۆکرانیا لە (ماپ) بەهێز کرد. ئەگەری ئەوە کەم بوو کە روسیا بێتەناو شەرانگێزییەوە ئەگەر ئەم وڵاتانە لە رێگەدا بوونایە بەرەو ناتۆ. هەرچی پەیوەندی بە پرسەکانی حوکمڕانییەوە هەیە، هەنگاو بەرەو ئەندامێتی، هانی دەدان تا گەندەڵی نەهێڵن. ئێمە لەسەر سازشێك رێکەوتین: ئێمە نەماندەتوانی ئەندامێتیی (ماپ) بە جۆرجیا و ئۆکرانیا بدەین، بەڵام بەیانێکمان دەردەکرد بۆ راگەیاندنی ئەمەی کە ئەوان لە بەرنامەدان بۆ ئایندەی ئەندامێتیی لە ناتۆدا. لە کۆتایی مشتومڕەکەدا، سەرۆك وەزیران گۆردن براونی بریتانیا سەری هێنایە بن گوێم و وتی "ئێمە ئەندامێتی (ماپ)مان بەوان نەدا، بەڵام لەوانەیە هەنوکە کردبێتمانن بە ئەندام!"

***

مشتومڕی ناتۆ لەسەر جۆرجیا و ئۆکرانیا ڕۆشنایی خستەسەر کاریگەریی ڕوسیا. لە یەکەم کۆبوونەوەمدا لەگەڵ ڤیلادیمیر پوتین لە بەهاری ٢٠٠١دا، سکاڵای ئەوەی کرد کە ڕوسیا هێشتا قورسایی سەردەمی سۆڤیەتی لەسەر شانە. لەو ساتەدا، نەوت بەرمیلی بە ٢٦ دۆلار بوو. ئەو کاتەی کە من لە سێپتێمبەری ٢٠٠٧دا لە لوتکەی (ئاپێک) لە سیدنی پوتینم بینی، نەوت گەیشتبووە ٧١ دۆلار- بەرەو ئەوەش بوو کە لە هاوینی ٢٠٠٨دا بگاتە ١٣٧ دۆلار. ئەو لەسەر کورسییەکەی چەمایەوە و پرسیاری کرد ئاخۆ (سەنەدی دارایی پاڵپشتیکراو بە ڕەهن)ی ڕوسیا حاڵی چۆنە.

ئەو قسەیە پوتینی ڕەسەنی پیشاندا. ئەو هەندێ جار خۆبەزلزان، هەندێ جار سەرنجڕاکێش و هەمیشەش سەرسەخت بوو. لە ماوەی هەشت ساڵی سەرۆکایەتیمدا، زیاتر لە چل جار ڕووبەڕوو پوتینم بینیووە. من و لۆرا سەردانی بێ وێنەمان لەگەڵ ئەو و (لیودمیلا)ی هاوسەری لە ماڵەکەمان لە کراوفۆرد و خانووەکەی لە دەرەوەی مۆسکۆ ئەنجامدەدا کە لەوێ ئەو پەرستگە تایبەتییەکەی خۆی پیشان دام و ڕێگەیدام ڤۆلگا مۆدێل ١٩٥٦ەکەی لێبخورم. ئەو لە فێستیڤاڵی (شەوە سپییەکان) بۆ گەشتێکی سەر بەلەم ئێمەی بە (سەینت پترسبێرگ)دا برد. من ئەوم بۆ (کێنێبەنکپۆرت) بانگهێشت کرد کە لەوێ لەگەڵ باوکم چووینە ڕاوەماسی. من قەت کاردانەوەی پوتینم بیر ناچێت کە بۆ یەکەم جار هاتە ئۆفیسی ئۆڤاڵ. سەرلەبەیانی بوو و ڕووناکی لە پەنجەرەکانی باشووری دەدا. لەکاتێکدا کە ئەو لە دەرگاکەوە هاتە ژوورەوە، دەمی کرایەوە "ئای خوایە...ئەمە چەند جوانە!" ئەمە کاردانەوەیەکی تەواو بوو بۆ کارمەندێکی پێشووی (کەی.جی.بی)ی سۆڤیەتێکی بێ ئیمان.

بەناو هەموو ئەو هەوراز و نشێوییانەدا، من و پوتین لەگەڵ یەکتریدا ڕاشکاو بووین. ئێمە لە هەندێ بواری گرنگدا هاوکاریی یەکتریمان کرد، لەوانەش شەڕ دژی تیرۆریزم، لابردنی تاڵیبان لە ئەفغانستان و ئاسایشی کەرەستە ناوکییەکان. یەکێک لە گەورەترین دەسکەوتەکانی یەکەم کۆبوونەوەمان، لە ٢٠٠١دا بوو لە سلۆڤینیا. من بە پوتینم وت کە پلانم داناوە ئاگاداریی شەش مانگەی داواکراوی پێبدەم لەمەڕ ئەوەی کە ئەمریکا لە پەیماننامەی موشەکی دژە بالیستی دەکشێتەوە، بۆئەوەی هەردوومان بتوانین

سیستەمی بەرگریی موشەکی کاریگەر بهێنینە کایەوە. ئەو روونی کردەوە کە ئەمە زیانی هەیە بۆ لایەنگیریی من لە ئەورووپا. من پێم وت کە لەسەر ئەو پرسە هەڵمەتم بەڕێوە بردووە و گەلی ئەمریکا چاوەڕێی ئەوە لە من دەکات کە پابەند بم. بە پوتینم وت "جەنگی سارد کۆتایی هات. ئێمە چیتر دوژمن نین".

من بەهەمان شێوە پێم وت کە ئەمریکا تاکلایەنە تەقەمەنیی کڵاوە جەنگییە ناوکییە ستراتیژییەکانی خۆی بۆ دوو لەسەر سێ کەم دەکاتەوە. پوتین رازی بوو کە لەگەڵ ئەو کەمکردنەوانەدا بێتەوە. کەمتر لە ساڵێك دواتر، ئێمە (پەیماننامەی مۆسکۆ)مان واژۆ کرد بۆ کەمکردنەوەی ژمارەی کڵاوە جەنگییە دانراوەکانمان لە ٦,٦٠٠ چەکەوە بۆ نێوانی ١٧٠٠-٢,٢٠٠ تاوەکو ٢٠١٢. پەیماننامەکە یەکسان بوو بە گەورەترین کەمکردنەوەی چەکی ناوکی لە مێژوودا و ئەمە بەبێ دانوستانی ناکۆتا روویدا کە زۆرجار رێککەوتننامەی کۆنترۆڵی چەکی لێدەکەوتەوە.

لە ماوەی هەشت ساڵدا، سامانی تازەدۆزراوە کاری کردە سەر پوتین. ئەو لە دەرەوە بوو بە شەڕانگێز و لە ناوەوە بەرگریکار بوو لە ریکۆردەکەی. لە یەکەم کۆبوونەوەی رووبەڕوومان لە خولی دووەمدا لە (براتسلاڤا) من نیگەرانیی خۆمم لەبارەی نەبوونی بەرەوپێشچوونی دیموکراتییانەی روسیا خستەڕوو. من بە شێوەیەکی تایبەت نیگەرانی دەستگیرکردنی بازرگانان و هەڵکوتانە سەر راگەیاندنی ئازاد بووم لە روسیا. وتی "موحازەرەم بۆ دامەدە لەبارەی راگەیاندی ئازادەوە. بەتایبەت پاش ئەوەی ئەو ریپۆرتەرەت کردە دەرەوە".

من بە خەیاڵمدا هات کە ئاماژە بە کێ دەکات. پرسیارم کرد "ڤیلادیمێر مەبەستت دۆن رازەرە؟" ئەو وتی بەڵێ. وتم "وتم بە پێداگرییەوە دەڵێم کە ئەوە بە ئاشکرا باس نەکەیت. گەلی ئەمریکا پێی وادەبێت کە تۆ لە سیستەمەکەی ئێمە تێناگەیت".

لە کۆنگرەیەکی رۆژنامەنووسیی هاوبەشدا لە پاش نیوەڕۆ، من بانگی دوو ریپۆرتەری ئەمریکیم کرد و پوتینیش بانگی دوو رۆژنامەنووسی روسی کرد. دوایین پرسیار لەلایەن (ئالێکسی مێشکۆڤ)ەوە بوو لە ئاژانسی ئینتەرفاکس. پرسیارەکە بۆ پوتین بوو، وتی "سەرۆك بوش بەم دواییانە وتوویەتی کە راگەیاندن لە روسیا ئازاد نییە. نەبوونی

ئازادییەکە چییە؟...بۆچی تۆ زۆر قسە ناکەیت لەبارەی پێشێلکارییەکانی مافەکانی ڕۆژنامەنووسان لە ئەمریکا، لەبارەی ئەو ڕاستییەی کە هەندێ لە ڕۆژنامەنووسان دەرکراون؟" تۆ سەیری ئەم ڕێکەوتە. ئەوەی کە پێی دەوترا ڕاگەیاندنی ئازاد لە ڕوسیا، ڕستەکەی ڤیلادیمێری توتی ئاسا دووبارە دەکردەوە.

من و پوتین حەزمان لە فیتنێس (ڕشاقە) بوو. ڤیلادیمێر سەخت وەرزشی دەکرد، زووزوو مەلەی دەکرد و وەرزشی جودۆی دەکرد. ئێمە هەردووکمان کەسانی لێهاتوو بووین. لە سەردانەکەیدا بۆ کامپ دەیڤد، من پوتینم بە سەگە سکۆتلەندییەکەمان (بارنی) ناساند. ئەو زۆر سەرسام نەبوو. لە سەردانی دواترم بۆ ڕوسیا، ڤیلادیمێر پرسیاری کرد ئاخۆ دەیەوێ بە سەگەکەی بەناوی (کۆنی) ئاشنا بیم. وتم بە دڵنیاییەوە.

لەکاتێکدا کە بەو پانتاییەی خانووەکەیدا دەڕۆیشتین کە قەراغەکانی درەختی (بتولا)ی لێ چێنرابوو، سەگێکی ڕەشی گەورەی (لابرادۆر) بە بازدان بەناو فریزەکەدا هات. ڤیلادیمێر وتی "ئەمە گەورەتر، بەهێزتر و خێراترە لە بارنی". دواتر بەسەرهاتەکەم بۆ هاوڕێم سەرۆك وەزیران ستیفن هارپەری کەنەدا بۆ گێڕایەوە. لە وەڵامدا وتی "تۆ خۆشبەختیت کە ئەو تەنیا سەگەکەی پیشان داویت".

بەسەرهاتی بارنی وانەبەخش بوو. پوتین پیاوێکی پڕ شانازی بوو کە وڵاتەکەی خۆش دەویست. ئەو دەیویست ڕوسیا جارێکی تر هەیکەلێکی دەسەڵاتێکی بەهێزی هەبێت و ئەنگێزەی ئەوەی هەبوو قەڵەمڕەوەکانی کاریگەریی ڕوسیا فراوان بکات. ئەو سیستەمە دیموکراتییەکانی سەر سنوورەکەی دەترساند و وزەی وەکو چەکێکی ئابووری بەکاردەهێنا لە ڕێگەی بڕینی گازی سروشتی لە چەند بەشێکی خۆرهەڵاتی ئەورووپا.

پوتین زۆرزان بوو. وەکو قەرەبوویەك بۆ پشتگیریکردنی لە جاك شیراك و گێرهارد شرۆدەر لە تەقەلاکانیان بۆ پارسەنگدانەوەی کاریگەریی ئەمریکا، پوتین قایلی کردبوون کە بەرگری لە پیادەکردنی دەسەڵاتەکەی بکەن لە ڕوسیا. لە ئێوارەخوانێکی لوتکەی گرووپی هەشت لە سەینت پیترسبێرگ، زۆربەی هەرە زۆری سەرکردەکان لە ڕیکۆردی دیموکراسیدا تەحەدای پوتینیان کردبوو. بەڵام جاك شیراك ئەمەی نەکرد. ئەو ڕایگەیاند کە پوتین لە بەڕێوەبردنی ڕوسیادا کارێکی باش ئەنجام دەدات و ئیشی ئێمە نییە چۆن

ئەمە دەکات. ئەمە هیچ نەبوو بە بەراورد بەوەی کە گێرهارد شرۆدەر کردی. ماوەیەکی کورت دوای ئەوەی کە راوێژکاری ئەڵمانی گێرهارد شرۆدە ئۆفیسی جێهێشت، بوو بە سەرۆکی کۆمپانیایەک کە هی (گازپرۆم) بوو، واتە دامەزراوەی زەبەلاحی وزەی روسیا.

پوتین حەزی لە دەسەڵات بوو و خەڵکی روسیاشی کەیفیان پێی دەهات. ماڵی زیادەی بودجەی سەرچاوەگرتوو لە نەوت سەری نەدەشکاند. ئەو پێگەی خۆی بەکارهێنا بۆ دەستنیشانکردنی جێگرەوەکەی، دیمتری مێدڤێدێڤ. پاشان خۆی کرد بە سەرۆک وەزیران.

خاڵی نزمی پەیوەندیمان لە ئۆگەستی ٢٠٠٨دا بوو کاتێک روسیا تانکی نارد بۆ ناوچە سنوورییەکانی جۆرجیا بۆ داگیرکردنی ئۆسیتیای باشوور و ئەبخازیا کە دوو پارێزگای وڵاتی جۆرجیا بوون، بەڵام پەیوەندیی نزیکیان هەبوو لەگەڵ روسیادا. من لە بێجینگ بوو بۆ مەراسیمی کردنەوەی یارییە ئۆڵەمپییەکان.

من و لۆرا لە ریزەکەدا وەستابووین بۆ سڵاوکردن لە سەرۆک هو جینتاو کاتێک جیم جێفری، جێگری راوێژکاری ئاسایشی نیشتمانیم هێرشەکەی روسیای بەگوێدا چرپاندم. سەیری چەند شوێنێکی بەردەمم کرد لە ریزەکەدا. ڤیلادیمێر لەوێ بوو. بڕیارمدا کە ریزی پێشوازی شوێنێکی گونجاو نییە بۆ دیپلۆماسییەتێکی هەڵچوو.

بەهەمان شێوە پێم وابوو کە گرنگە من نیگەرانی خۆم بگەیەنمە مێدڤێدێڤ. مێدڤێدێڤم باش نەدەناسی. لە نیسانی ٢٠٠٨دا، رێک بەر رادەستکردنی دەسەڵات، ڤیلادیمێر بانگهێشتی مێدڤێدێڤی کردبوو کە لە (سۆچی) کە هاوشێوەی کامپ دەیڤدە، بێتە لامان. دۆخەکە کەشێکی ئاهەنگی هەبوو. پوتین میواندارێتیی نیوەڕۆخوانێکی خۆشی کردبوو کە دواتر سەمای فۆلکلۆریشی بەدواداهات. لە ساتێک لە ساتەکاندا، ئەندامانی وەفدەکەی من، بە منیشەوە، لە شوێنەکانی خۆمان هەستاین بۆئەوەی بچینە سەر شانۆکە. پێدەچوو سەماکە ئاوێتەیەک بێت لە هەڵپەرکێی چوارگۆشەیی و هەڵپەرکێی خێرا. من دڵنیام کە شل و ملتر دەبوو ئەگەر کەمێک ڤۆدکا لە جەستەمدا بووایە. مایەی پرسیاریشە کە لە گەشتەکانمدا بۆ روسیا بە دەگمەن ڤۆدکام بینی، بە پێچەوانەی رۆژانی زووی کۆمەنیزم.

من ستایشی ئەو کاتەم کرد کە لەگەڵ میدڤیدێڤ بردمە سەر کە یەکەم سەرکردەی ناکۆمەنیستی روسیا بوو لەسەروەختی شۆڕشی بەلشەفیکی لە ١٩١٧دا. ئەو وتارێکی کاریگەری پێشکەش کردبوو کە تیایدا پابەندبێتی خۆی بۆ حوکمی یاسا، لیبراڵیزەکردنی ئابووریی روسیا و کەمکردنەوەی گەندەڵی خستبووە ڕوو. من پێم وت کە چاوەڕێی ئەوەم سەرۆك بەرانبەر سەرۆك مامەڵەی لەگەڵدا بکەم. بێگومان پرسیارە گەورەکە ئەوە بوو ئاخۆ ئەو بە راستی وڵاتەکە بەڕێوە دەبات. وەکو شێوازێکی تاقیکردنەوە، پرسیارم لە ڤیلادیمێر کرد ئاخۆ ئەو هێشتا بینایەی (سۆچی) بەکاردەهێنێت پاش ئەوەی کە میدڤیدێڤ ئۆفیسی گرتووەتەدەست. ئەو بەبێ دوودڵی وتی "نەخێر، ئەمە کۆشکی هاوینەی سەرۆکە".

من کاتێك کە گەڕامەوە بۆ هۆتێلەکەم بە بێجینگ پەیوەندیم بە میدڤیدێڤەوە کرد. ئەو گەرم داهاتبوو. منیش بەهەمان شێوە. وتم "ئامۆژگاریی بەهێزم ئەوەیە کە هەر ئێستا ئەم شتە هێور بکەیتەوە". "ئەم ناهاوسەنگییەی کردەوەکانت خەریکە جیهان لەدژت هەڵدەگەڕێنێتەوە. ئێمە لەگەڵ ئەواندا دەبین".

میدڤیدێڤ پێی وتم ساکاشڤیلی وەکو سەدام حسێنە. ئەو بانگەشەی ئەوەی کرد کە ساکاشڤیلی هێرشێکی "بەربەریانە"ی نەوروزێنراوی ئاراستە کردووە کە بووەتەهۆی کوژرانی زیاتر لە هەزار و پێنجسەد مەدەنی.

لە وەڵامدا وتم "هیوادارم نەڵێیت کە بەنیازیت لەبەرانبەردا هەزار و پێنجسەد کەس دەکوژیتەوە. تۆ مەبەستی خۆتت بە دەنگی بەرز و بە روونی بەیان کردووە. هیوادارم ئەوە لەبەرچاو بگریت کە بە جددی پرسیارم کرد".

نیگەرانیی گەورەترم ئەوە بوو کە روسییەکان رێك و رەوان خۆیان بکەین بە (تبلیسی)ی پایتەختی جۆرجیادا و ساکاشڤیلیی دیموکراتییانە هەڵبژێردراو سەرنگون بکەن. روون بوو کە روسەکان نەیاندەتوانی بەرگەی جۆرجیایەکی دیموکرات بگرن بە سەرۆکێکی دۆستی خۆرئاواوە. من بیرم لەوە دەکردەوە ئاخۆ دەبێ هەر شەرانگێز بوونایە لەبەرانبەر ئەو وڵاتە ئەگەر ناتۆ داواکارییەکەی بۆ ئەندامێتیی جۆرجیا لە (ماپ)دا پەسەند بکردایە.

دواتر پەیوەندیم کرد بە ساکاشڤیلییەوە، ئەو بە شێوەیەکی نائاسایی دەترسا. ئەو شالاوی روسیای باس کرد و داوای لێکردم دەستبەرداری جۆرجیا نەبم. وتم "گوێم لێتە. ئامانەوێ جۆرجیا هەرەس بهێنێت". لە رۆژانی دواتردا، لە داکۆکیی یەکپارچەیی خاکی جۆرجیا دەنگم هەڵبڕی، لەگەڵ سەرۆک سارکۆزی- کە ببووە سەرۆکی یەکێتیی ئەورووپا- کارم کرد بۆ کۆکردنەوەی وڵاتان تا داوا لە روسیا بکەن بکشێتەوە، کۆمەکی بوژانەوەم بە فڕۆکەی سەربازیی ئەمریکی رەوانەی جۆرجیا کرد و بەڵێنمدا یارمەتیدەر بم لە بونیادنانەوەی سوپای جۆرجیدا.

لە مەراسیمی کردنەوەی یارییە ئۆڵەمپییەکاندا، من و لۆرا لە هەمان ریزی ڤیلادیمێر و وەرگێڕەکەی دانیشێنرابووین. ئەمە هەلێك بوو بۆ ئەو وتوێژەی کە لە (هۆڵی گەورە) دوامخستبوو. لۆرا و پیاوەکەی تەنیشتی، پاشای کەمبۆدیا، چەند کورسییەك چونە خوارەوە. پوتین خزایە لای من. دەمزانی کە کامێرانی تەلەفزیۆن لەسەرمان دەبن، بۆیە هەوڵمدا جوڵەکانم نائاسایی نەبن. پێم وت کە هەڵەیەکی گەورەی ئەنجام داوە و روسیا خۆی گۆشەگیر دەکات ئەگەر لە جۆرجیا نەیەتە دەرەوە. ئەو وتی ساکاشڤیلی تاوانبارێکی جەنگە- رێك ئەو زاراوەیەی کە میدڤیدێڤ بەکاریهێنابوو- کە روسیای وروژاندووە.

بە پوتینم وت "من هۆشداریم پێداویت کە ساکاشڤیلی کەسێکی خوێن گەرمە". پوتین وتی "منیش خوێن گەرمم".

من جارێکی تر وەڵامم دایەوە "نا ڤیلادیمێر. تۆ خوێن ساردیت".

***

پاش چەند هەفتەیەك لە دیپلۆماسیی سەخت، روسیا زۆربەی سەربازە داگیرکەرەکانی کشاندبووەوە، بەڵام ئامادەییەکی سەربازیی نایاسایان لە ئۆسیتیای باشوور و ئەبخازیا بەرقەرار کردبوو. ڤیلادیمێر پوتین لە ماوەی دوایین هەفتەم لە ئۆفیس تەلەفۆنی بۆ کردم بۆ ماڵئاوایی، کە ئامارەیەکی هۆشمەندانە بوو. لەگەڵ ئەوەشدا، بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە لە پوتین هیوادار بووم و دەمتوانی لە تێپەڕبوون لە جەنگی سارد بەدی بێنم، روسیا وەکو نائومێدییەك لە ئەجێندای ئازادیدا جێگەی نابێتەوە.

روسیا تاکە وڵاتیش نەبوو. هیوادار بووم کە میسریش ببێتە ڕێبەری ئازادی و ریفۆرم لە جیهانی عەرەبیدا، هەروەکو چۆن پێش جیلێك، لەژێر سایەی ئەنوەر ساداتدا ڕێبەری ئاشتی بوو. بەداخەوە، پاش هەڵبژاردنێکی سەرۆکایەتیی مژدەبەخش کە کاندیدەکانی ئۆپۆزسیۆنی گرتبووەخۆ، حکومەت لە ماوەی هەڵبژاردنەکانی ئەنجومەنی یاسادانانداُ لە کاتێکی دواتری ئەو ساڵەدا هاتبووە ناوەوە و ئەو نەیار و خاوەن بلۆگانەی زیندانی کردبوو کە لایەنگری ئەلتەرناتیڤێکی دیموکراتییان کردبوو.

ڤەنزوێلاش لە دیموکراسی لایدابوو. سەرۆك هوگۆ شاڤێز شەپۆلە ئاسمانییەکانی بە سروتی توندی دژە ئەمریکی ئاڵودە کردبوو لەکاتێکدا کە وێنەیەکی ساختەی میللەتگەرایی بڵاو دەکردەوە کە ئەو ناوینابوو (شۆڕشی بۆلیڤاری). بەداخەوە، ئەو پارەی خەڵکی ڤەنزوێلای بەفیڕۆ دەدا و وڵاتەکەیانی وێران دەکرد. ئەو دەبوو بە (ڕۆبەرت موگابی)ی ئەمریکای باشوور. جێگەی داخە کە، سەرکردەکانی نیکاراگوا، بۆلیڤیا و ئیکوادۆر پەیڕەویی نموونەکەی ئەویان دەکرد.

قەڵای دیکتاتۆریی گۆشەگیری تر هەن- شوێنانی وەکو بیلاروس، بورما، کوبا و سودان. هیوادارم ئەمریکا بەردەوام بێت لە وەستان لە تەك نەیاران و لایەنگرانی ئازادی لەوێ. من لەماوەی سەرۆکایەتییەکەمدا چاوم بە زیاتر لە سەد نەیار کەوتبوو. لەوانەیە میحنەتەکەیان سەخت بێت، بەڵام بێ هیوا نییە. هەروەکو لە دووەمین وتاری دەست بەکاربوونمدا وتم، ئەجێندای ئازادی داوای " کاری چڕکراوەی جیلەکان" دەکات. هەر کە گۆڕان دەگات، زۆرجار بەخێرایی دەجوڵێت، هەروەکو جیهان لە شۆڕشەکانی ئەوروپادا لە ١٩٨٩دا و لە وەرچەرخانی خێرای خۆرهەڵاتی ئاسیا پاش دووەم جەنگی جیهانی، تێبینی کرد. کاتێك خەڵکی بۆ دواجار ئازاد دەبن، زۆرجار نەیاران و زیندانییەکان- خەڵکانی وەکو ڤاکلاڤ هاڤێل و نێلسن ماندێلا- کە وەکو سەرکردەی وڵاتانی ئازادیان دێنە مەیدان.

***

سەربازی تەگەرەکانی بەردەم ئەجێندای ئازادی، نموونەگەلێکی زۆری هیوا و پێشکەوتن هەبوون. جۆرجی و ئۆکرانییەکان چوونەپاڵ ڕیزبەندی گەلانی ئازاد، کۆسۆڤۆ بوو بە

وڵاتێکی سەربەخۆ و ناتۆ لە نۆزدە ئەندامەوە بوو بە بیست و شەش. لەژێر سەرکردایەتیی بوێرانەی (ئالڤارۆ ئۆرایب)، دیموکراسیی کۆلۆمبیا، خاکی سەربەخۆی لەدەست تیرۆریستانی ترپاکیدا دەرهێنایەوە. بە پشتیوانیی ئەمریکا، دیموکراسییە فرە ئەتنییەکانی هیندستان و ئیندۆنیزیا و تا بەرازیل و شیلی، لە هەرێمەکانیاندا بوونە سەرکردە و مۆدێل بۆ کۆمەڵگە ئازادە رووڵەگەشەکان لە سەرانسەری جیهاندا.

بەرەوپێشچوونە هەرە دراماتیکییەکانی ئازادی، لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا هاتە کایەوە. لە ٢٠٠١دا، هەرێمەکە زیادبوونی تیرۆریزم، زیادبوونی توندوتیژیی نێوان فەلەستینییەکان و ئیسرائیلییەکان، کاریگەریی ناسەقامگیرکەری سەدام حسێن، پەرەپێدانی چەکی کۆکوژی لیبیا، داگیرکاریی لوبنان لەلایەن دەیان هەزار سەربازی سوریا، چەقبەستی ئابووریی بەربڵاو و بەرەوپێشچوونی کەمی بەرەو ریفۆرمی سیاسی بەخۆیەوە بینیبوو.

بەهاتنی ٢٠٠٩، وڵاتانی سەرانسەری خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بەشێوەیەکی چالاک شەڕی تیرۆریزمیان دەکرد لەبری کردنی پێچەوانەکەی. عیراق دیموکراسییەکی فرەئایین و فرەئەتنی بوو و هاوپەیمانێکی ئەمریکا بوو. لیبیا و دەستبەرداری چەکە کۆکوژەکانی ببوو و پەیوەندییە ئاساییەکانی لەگەڵ جیهان دەست پێکردبووەوە.

گەلی لوبنان سەربازە سورییەکانیان کردبووە دەرەوە دیموکراسییان گەڕاندبووەوە. گەلی فەلەستینی حکومەتێکی ئاشتەواییتری هەبوو کە شانبەشانی ئیسرائیل لە ئاشتیدا دەژیان. بزاڤێکی ئێرانیی ئازاد پاش هەڵبژاردنی سەرۆکایەتیی هاوینی ٢٠٠٩ چالاک ببوو. لە سەرانسەری هەرێمەکەدا، ریفۆرمی ئابووری و کرانەوەی سیاسی پەیتا پەیتا بەرەوپێش دەچوون. کوێت یەکەم هەڵبژاردنی ئەنجامدا کە تیایدا ژنان رێگەیان پێدرا دەنگ بدەن و پۆست بگرنە دەست. لە ٢٠٠٩دا، ژنان چەند کورسییەکیان بەدەستهێنا. ژنان بەهەمان شێوە لە عەممان، قەتەر، ئیمارات و یەمەن پۆستی حکومییان گرتە دەست. بەحرەین مێیینەیەکی جولەکەی کردە باڵیۆز لە ئەمریکا. ئوردن، مەغریب و بەحرەین هەڵبژاردنی پەرلەمانیی پێشبڕکێکارانەیان ئەنجامدا. لەکاتێکدا کە هەر سیستەمێکی پاشایەتیی تەواو رێکخراوە، سعودیە یەکەم هەڵبژاردنی شارەوانیی خۆی

ئەنجامدا و شا عەبدوڵڵا یەکەم زانکۆی کراوەی وڵاتەکەی بە ڕووی پیاوان و ژنانیشدا کردەوە. لەسەرانسەری هەرێمەکە، بازرگانی و وەبەرهێنان فراوان بوو. بەکارهێنانی ئینتەرنێت بە خێرایی گەشەی کرد. دەنگی وتوێژەکانیش لەبارەی دیموکراسی و ریفۆرم بەرزتر بووەوە- بەتایبەت لەناو ژناندا کە من دڵنیام ڕێبەرایەتیی بزاڤی ئازادی دەکەن لە سەرانسەر خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا.

لە کانوونی دووەمی ٢٠٠٨دا، من بۆ ئەبوزەبی و دوبەی سەفەرم کرد، دوو میرنشینی عەرەبی کە بازرگانیی ئازاد و کۆمەڵگەی کراوەیان گرتبووەخۆ. سەنتەری شارەکانیان باڵەخانەی بەئاسماندا چووی درەوشاوەی تێدابوو کە پڕ بوون لە کاروەگەڕخەر و شارەزایانی بزنس، هەم پیاو و هەم ژن. لە دوبەی، من سەردانی ئەو خوێندکارانەی زانکۆم کرد کە لە بوارە جیاجیاکانی وەکو بزنس، زانست و مێژوودا دەیانخوێند. لە دوایین شەوی سەردانەکەمدا، میری جێنشینی ئایندەبینی ئەبوزەبی، هاوڕێم شێخ محەمەد بن زاید، بانگهێشتی کردم بۆ شوێنە تایبەتەکەی خۆی بۆ ئێوارەخوانێکی تەقلیدی. وتی ژمارەیەك لە کاربەدەستانی حکومی دێنە لامان. من چاوەڕێم دەکرد پیاوانی تەمەن ناوەند بن. بەڵام هەڵە بووم. حکومەتەکەی میری جێنشین ژنانی موسڵمانی گەنجی زیرەکی گرتبووەخۆ. ئەوان باسی مکوڕییان کرد لەبارەی درێژەدان بە ریفۆرم و پێشکەوتن- و قوڵکردنەوەی دۆستایەتییان لەگەڵ ئەمریکادا.

لمەکانی ئەبوزەبی زۆر دوور بوو لەو مینبەرەی دەستبەکاربوون کە من لە کانوونی دووەمی ٢٠٠٥دا چوومە سەری. بەڵام ئەو شەوەی بیابان، ئایندەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستم بینی- هەرێمێك کە رێز لە کەلتوورە کۆنەکەی دەگرێت لەکاتێکدا کە جیهانی مۆدێرنیش لەباوەش دەگرێت. چەند دەیەیەکی پێدەچێت تا گۆڕانکارییە تازەکان بە تەواوی بەرجەستە ببن. بە درێژایی رێگەکەش تەگەرە دەبێ. بەڵام من بڕوام بە چارەنووسەکە هەیە: گەلی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست ئازاد دەبن و ئەمریکاش سەرەنجام زیاتر لە ئاسایشدا دەبێت.

# قەیرانی دارایی

"جەنابی سەرۆک، ئێمە ڕووبەڕووی مۆتەکەیەکی دارایی دەبینەوە". ئەمە قسەی بیزارکەری بێن بێرنانك بوون، سەرۆکی ڕەفتار نەرمی (یەدەکی فیدراڵ) کە لە ژووری (ڕۆزڤێلت) لە بەرانبەر من دانیشتبوو. بە درێژایی دوو هەفتەی ڕابردوو، حکومەت (فانی مای) و (فرێدی ماك)ی کۆنترۆڵ کردبوو کە دوو کیانی زەبەلاحی نیشتەجێکردن بوون. (لیهمان برەزەس) گەورەترین مایەپوچی لە مێژووی ئەمریکادا تۆمار کردبوو. مێریل لینچ، لەژێر فشاردا فرۆشرابوو. یەدەکی فیدراڵ قەرزێکی ٨٥ ملیارد دۆلاری دابوو بۆ ڕزگارکردنی (گرووپی نێودەوڵەتی ئەمریکی) . ئێستا (واچۆڤیا) و (واشنتن میوچواڵ) لەسەر لێواری هەرەسدا بوون.

بە هەبوونی پشێوییەکی زۆر لە دامەزراوە داراییەکاندا، بازارەکانی ئانتیمان وەستابوون. بەکاریەران نەیاندەتووانی قەرز بۆ ئۆتۆمبێل و خانوو دەستەبەر بکەن. کۆمپانیا بچوکەکان نەیاندەتووانی قەرز بەدەست بێنن بۆ دارایی دابینکردن بۆ پرۆژەکانیان. بازاڕی سەهم دابەزیبووە نزمترین ئاستی خۆی لە یەکەم ڕۆژی پاش ١١ی سێپتێمبەرەوە.

لەکاتێکدا کە ئێمە لە ژێر تابلۆی زەیتیی (تێدی ڕۆزڤێلت) لە حاڵەتی ئەسپسواریدا، دانیشتبووین، ئێمە هەمووومان دەمانزانی کە ئەمریکا ڕووبەڕووی خەمناکترین تەحەدیی ئابووریی پاش چەندین دەیە دەبێتەوە.

من ڕووم کردە سەرگەورەی تیمە داراییەکەم، وەزیری خەزێنە (هانك پۆلسن)، ڕێبەری سروشتیی بە چەند دەیەیەك لە ئەزموون لە دارایی نێودەوڵەتیدا.

هانك وتی "بارودۆخەکە لە رادەبەدەر جدییە". ئەو و تیمەکە سێ پێوانەیان خستە بەردەمم بۆ بنەبڕکردنی قەیرانەکە. یەکەم، وەزارەتی خەزێنە ٣,٥ تریلیۆن دۆلاری لە کۆمپانیاکانی ئیتیمانی بازاڕی پارەدا زامن دەکرد کە رووبەڕووی پارەکێشانەوەی خاوەن حسابەکان دەبوونەوە. دووەم، یەدەکی فیدراڵ، پرۆگرامێکی دەست پێدەکرد بۆ لابردنی کۆنترۆڵ لەسەر بازاڕ بۆ کاغەزی بازرگانی، کە سەرچاوەیەکی سەرەکیی دارایی دابین کردن بوو بۆ کۆمپانیا و بزنسەکانی سەرانسەری وڵات. سێیەم، کۆمسیۆنی (سەنەدەکان و ئاڵوگۆڕ) فرمانێکی دەردەکرد بۆ نەهێشتنی کاتیی کەم ساغبوونەوەی سەهمە داراییەکان. هانك وتی "ئەمانە هەنگاوی دراماتیکین، بەڵام سیستەمی دارایی ئەمریکا لە مەترسیدایە".

ئەو تەنانەت پرۆپۆزەلێکی بوێرانەتری خستەڕوو. وتی "ئێمە پێویستمان بە دەسەڵاتی فراوانتر هەیە بۆ کڕینی (سەنەداتی دارایی پشت ئەستوور بە رەهن)". ئەو موڵکە داراییە ئاڵۆزانە بەهایان لەدەست دابوو کاتێك بە خستنەمەترسیی میزانیەی کۆمپانیا داراییەکانی سەرانسەری جیهان، بلۆقی نیشتەجێبوون تەقیبوو. هانك پێشنیاری ئەوەی کرد کە داوای سەدان ملیارد دۆلار لە کۆنگرێس بکەین بۆ کڕینەوەی ئەو موڵکە ژەهراوییانە و گەڕاندنەوەی ئاسودەیی بۆ سیستەمی بانکی.

پرسیارم کرد "ئایا ئەمە خراپترین قەیرانە لەسەروەختی بێبازاڕیی گەورەوە؟" بێن وتی "بەڵێ. لە سۆنگەی سیستەمی داراییەوە، ئێمە شتێکی وەکو ئەمەمان لە ١٩٣٠یەکانەوە نەبینیووە و لەوانەیە بەرەو خراپتر بچێت".

وەڵامەکەی، ئەو بڕیارەی روون کردەوە کە رووبەڕووی ببوومەوە: ئایا من دەمویست ئەو سەرۆکە بم کە چاودێری ئەو کارەساتە ئابوورییە دەکات کە دەشێ لە بێبازاڕیی گەورە خراپتر بێ؟

من پەست بووم لەوەی کە بارودۆخەکە گەیشتبووە ئەم خاڵە. گروپێکی تا رادەیەك بچوکی خەڵك– کە زۆرێکیان هی بازاڕی وۆڵ ستریت بوون و هەندێکی تریان نا – گرەوی ئەوەیان کردبوو کە بازاڕی نیشتەجێبوون بۆ تاهەتایە گەشە دەکات. وانەبوو. لە

ژینگەیەکی ئاساییدا، بازاڕی ئازاد حوکمی خۆی ئەدات و لەوانەیە ئەوان شکست بێنن. من دڵخۆش دەبووم کە لێگەڕێم وایان لێبێت.

بەڵام ئەمە ژینگەیەکی ئاسایی نەبوو. بازاڕ لەکارکەوتبوو. وەکو چۆن بێن-یش روونی کردبووەوە، دەرەنجامەکانی ناچالاکی کارەساتبار دەبوون. چەندەی نادادپەروەرانە بوو کە پارەی خەڵکی ئەمریکا بەکاربێنیت بۆ ڕێگرتن لە دارمانێک کە ئەوان لێی بەرپرس نەبوون، تەنانەت نادادپەروەرانەتریش دەبوو کە هیچ نەکەیت و لێیانگەڕێیت ئازاری دەرەنجامەکان بچەژن. بە پەسەندکردنی تەواوی پلانەکەی هانک، وتم "بچوونە ناو کارەکەوە." "ئێمە ئەمە چارەسەر دەکەین".

کۆبوونەوەکەم وەستاند و بەدرێژایی مامەڕەکە بەرەو ئۆفیسی ئۆڤاڵ ڕۆیشتم. جۆش بۆلتن، راوێژکار ئێد گیلێسپی و دانا پێرینۆی سکرتێری بەهرەمەند و کاریگەری رۆژنامەوانیم، بەدوامداهاتن. بەراوردکردنە مێژووییەکەی بێن هێشتا لەگوێمدا دەزرنگایەوە.

وتم "ئەگەر ئەو بە راستی دەڕوانێتە بێبازاڕییەکی گەورەی تر، ئەوا بە دڵنیاییەوە ئەبێ ئەوە بزانن کە من روزڤێڵتم نەک هوڤەر".

***

ڕێك نزیکەی پێش بیست و پێنج ساڵ، لە ئۆکتۆبەری ١٩٨٣دا، من لە میدلاند لەگەڵ هاوڕێی قوتابخانەی هارڤەردم، تۆم کانێب، قاوەم دەخواردەوە. ئێمە گوێمان لە یەکێك بوو کە دەیگووت خەریکە لە دەرەوەی دەرگاکانی (بانکی نیشتمانیی یەکەم)ی میدلاند ریزێك دروست دەبێت. نیشتمانیی یەکەم، گەورەترین بانکی سەربەخۆی تەکساس بوو. ئەم بانکە بۆ ماوەی نەوەد و سێ ساڵ لە میدلاند رەگی داکوتابوو. بەو دواییانە، دەنگۆ بڵاو دەبوونەوە لەبارەی پێگەی دارایی ناجێگیری بانکەکە. کاتێك نرخەکانی نەوت بەرز دەبوونەوە، نیشتمانیی یەکەم زۆرێك لە قەرزەکانی دەرکردبوو. پاشان لە سەرەتاکانی ١٩٨٠کاندا، نرخی نەوتی خاو لە نزیکەی چل دۆلار بۆ هەر بەرمیلێك دابەزیبوو بۆ ژێر سی دۆلار. جوڵەی نەوت دەرهێنان (درێلینگ) خاو ببووەوە. دانەوەی قەرزەکان شکستی هێنابوو. خاوەن حسابەکان پارەکانیان کێشابووەوە. من حسابی کۆمپانیاکەمان کە

تایبەت بوو بە گەڕان بەدوای نەوت، گواستبووەوە بۆ بانکێکی گەورەی نیویۆرک. من نیازم نەبوو لەسەر نەبوونی پارە لای نیشتمانیی یەکەم گرەو بکەم.

من و تۆم بە پەلە خۆمان گەیاندە بانکەکە. لە بالکۆنیی نهۆمی دووەمەوە، ئێمە بینیمان خەڵکی لە هۆڵەکەدا ریزیان بەستووە بۆ نزیک کەوتنەوە لە کارمەندەکانی بەردەم پەنجەرەکان. هەندێکیان زەرفی کاغەزی گەورەیان پێبوو. لەناو قەرەباڵغییەکەدا، خاوەن کێڵگەیەکی کۆنی ناسراو هەبوو، فرانک کۆدێن. وەکو خاوەن کێڵگەکانی خۆرئاوای تەکساس، کۆدێن خۆشبەخت بوو کە زەوییەکەی پڕ بوو لە نەوتێکی زۆر. ئەو هاوپشکێکی گەورەی نیشتمانیی یەکەم بوو. ئەو ریزەکەی رێک دەخست، بە خەڵکی دەوت کە حکومەتی فیدراڵ هەر حسابێکی بە زیاتر لە ١٠٠,٠٠٠ دۆلار تەئمین کردووە. خەڵکی تەنیا سەرنجی ئەویان دەدا. ئەوان پارەکەی خۆیان دەویستەوە.

لە ٤ی ئۆکتۆبەری ١٩٨٣دا، (کۆمپانیای بیمەی تەوفیری فیدراڵ) (نیشتمانیی یەکەم)ی کۆنترۆڵ کرد و بە (یەکەم کۆمار)ی فرۆشت لە دالاس. خاوەن حسابەکان پارێزران، بەڵام هاوپشکەکان رامالران و دامەزراوەکەی میدلاند نەما. پارێزگار (تەین ئەتکینس) قسەی بۆ خەڵکێکی زۆر کرد کاتێك وتی "هەست دەکەم چەپکەگوڵێکی رەش بە دەرگاکەمەوە هەڵدەواسم".

من لە بارەی کارەساتە داراییەکانی ١٨٩٣ و ١٩٢٩وە بیستبووم. ئێستاش دەبووایە پێش هەمووان بینەری تەقینەوەی بڵقێکی پڕمقۆمقۆ بم. (نیشتمانیی یەکەم)، وەکو هەموو دامەزراوە داراییەکان تر، پشت ئەستوور بوو بە ئاسودەیی کڕیارەکانی. هەرکاتێك ئەو ئاسودەیی لەدەست بچووایە، بنکەکە هەلی مانەوەی نەدەما.

***

شانزە ساڵ دواتر، من خۆم کاندید کردبوو بۆ سەرۆکایەتی. بە نزیکەی هەموو پێوەرەکان، ئابووری لە بوژانەوەدا بوو. تێکڕای بەرهەمی خۆماڵیی ئەمریکا بە رێژەی زیاتر لە ٢,٥ تریلیۆن دۆلار زیادی کردبوو لە سەروەختی ئەو بێبازارییەی کە ببووەهۆی ئەوە باوکم هەڵبژاردنەکە بدۆڕێنێت، بەڵام کۆتایی هات بەر لەوەی سەرۆکایەتییەکەی تەواو ببێت. مونەشیری (ناسداك) کە بە سەهمە ئینتەرنێتییەکان گری سەندبوو، لە

۵۰,۰۰۰ەوە گەیشتبووە ٤,۰۰۰. هەندێ لە ئابووریناسان بەڵگەی ئەوەیان دەهێنایەوە کە ئینتەرنێت پێناسەی سوڕی بزنسی کردووەتەوە.

من ئەوەندە دڵنیا نەبووم. لە وتارێکمدا لە دیسەمبەری ۱۹۹۹دا بۆ گەڵاڵەکردنی بەرنامەی ئابووریم، وتم "هەندێ جار ئابووریناسەکان بەهەڵەدا دەچن." "دەتوانم ئەو چاکبوونەوانە بهێنمەوەبیر کە چاوەڕێ دەکرا کۆتاییان بێت، بەلام وا نەبوو ئەو بێبازارییەی چاوەڕێ نەدەکرا رووبدات، روویدا. من هیوای گەشەی بەردەوام دەخوازم- بەلام ئەمە گەرەنتی نییە. پێویستە سەرۆک کار بکات بۆ باشترین کەیس و خۆی بۆ خراپترین ئامادە بکات".

ناوەڕۆکی پلانەکەم کەمکردنەوەیەکی سەراپاگیری باج بوو. بڕوام وابوو حکومەت پارەیەکی زۆری خەڵکی دەبات. بە هاتنی کتایی ۱۹۹۹، باجەکان لە ڕێژەیەکی سەدیی تێکڕای بەرهەمی خۆماڵی بەرزتر بوون بە بەراورد بە هەر ساتێك لە سەروەختی دووەم جەنگی جیهانییەوە. وادادەنرا حکومەت زیادەیەکی گەورە بەرێوە بیات. من دەمزانی پارەکە بۆ کوێ دەچێت: حکومەت رێگایەکی پێناسە دەکرد بۆ خەرجکردنی. دواجار، کۆنگرێس و سەرۆك کلینتن کۆك ببوون لەسەر زیادکردنی خەرجیی ئیختیاری بە رێژەی زیاتر لە ۱٦٪ لە ساڵی دارایی ۲۰۰۱دا.

من هۆکارێکی ترم هەبوو بۆ پشتیوانی لە کەمکردنەوەی باجەکان. من نیگەرانی ئەوە بووم کە ئێمە رووبەڕووی بلقێکی تر ببینەوە، ئەجارەیان لە کەرتی تەکنۆلۆژیادا. لاری لیندسەی، گەورە راوێژکاری ئابووریم، بڕوای وابوو کە وڵات بەرەو بێبازاڕی هەنگاو دەنێت. ئەگەر ئەو راست بووایە، ئەوا کەمکردنەوەی باجەکان دەبوو بە زیادەیەکی جەوهەری. بە دڵنیاییەوە، بێبازاڕی بەشێوەیەکی رەسمی لە ئازاری ۲۰۰۱دا دەستی پێکرد. نیویۆرك تایمز ئەو داکەوتنەی بە بەرەوپێشچوونێکی پۆزەتیڤ بۆ من لەقەڵەمدا. بابەتێك لەژێر سەردێڕی "بۆ سەرۆك، کاتێکی گونجاو بۆ بێبازاڕی". بەلام بە دڵنیاییەوە دۆخەکە بۆ من وەها نەبوو. من بەردەوام ساتێکی سەیری مێژووم بە خەیاڵدا دەهات. لە ساڵی ۱۹۹۳دا، باوکم ئابوورییەکی لە دوای خۆی جێهێشتبوو کە زۆر باشتر بوو لەوەی خەڵك دەرکی پێدەکرد. ئێستا من لەوە خراپترم بۆ مابووەوە.

لەکاتێکدا کە ئابووری بەرەو شکست دەڕۆیشت، کەمکردنەوەی باجەکان، پێویستییەکی نوێی گرتەخۆ. من داوام لە کۆنگرێس کرد خێرا هەنگاو بنێت. لە حوزەیرانی ۲۰۰۱دا، من کەمکردنەوەیەکی باجی ۱،۳۵ تریلیۆنیم واژۆ کرد کە لە سەروەختی واژۆکردنەکەی ڕۆناڵد ریگنەوە لە خولی یەکەمیدا، گەورەترین بوو. پرۆژەیاساکە ڕێژەی بچوکی باجی بۆ هەر باجدەرێکی داهات کەمکردەوە، لەوانەش ملیۆنان خاوەن پرۆژە. ئیتیمانی باجی منداڵی لە ٥٠٠ دۆلارەوە بۆ ١٠٠٠ دۆلار زیاد کرد. سزای هاوسەرگیری کەمکردەوە و نزمترین ئاستی باجی بڕی کە بەو هۆیەوە پێنج ملیۆن خێزانی کەم داهات لە لیستی باجدەرەکان لابران. پرۆژەیاساکە بەهەمان شێوە باجی مردنی لابرد، قورساییەك کە بۆ خاوەنانی بزنسە بچوکەکان، جوتیاران و خاوەن کێڵگەکان نادادپەروەرانە بوو. من بۆم دەرکەوت کە ئەمریکییەکان لە حاڵەتی زیندوویيدا ئەوەندە باجیان داوە کە ئەگەر مردن پێویست ناکات باج بدەن.

من گەشبین بوو بەوەی کە بەکاربەران و بزنسە بچوکەکان کەمبوونەوەکانی باجەکانیان لەوەدا خەرج دەکەن کە ئابووری لە بێبازاڕی بهێننە دەرەوە. بەڵام ئێمە لەبەردەم زەبرێکی ئابووریی تردا بووین کە کەس چاوەڕێی نەدەکرد.

***

ڕێژەی مردنی ١١ی سێپتێمبەر هەموو کاتێك بە ٢،٩٧٣ کەس؛ پێوانە دەکرێت. بەڵام تێچووی ئابووریش بە هەمان شێوە ڕاچڵەکێن بوو. بۆرسەی نیویۆرك چوار ڕۆژ داخرا، کە درێژترین ڕاگرتنی بازرگانی بوو لە سەروەختی بێبازاڕیی گەورەوە. کاتێك بازاڕەکان کرانەوە، (داوجۆنز) ٦٨٤ خاڵ دابەزیبوو، کە گەورەترین دابەزینی یەکرۆژە بوو لە مێژوودا- بۆ ئەو خاڵە.

شوێنەواری هێرشەکان لەسەرانسەر ئابووریدا دیاربوو. گەشتیاری دابەزی. ژمارەیەك هێڵی ئاسمانی مایەپوچیان تۆمارکرد. زۆرێك لە ریستورانتەکان تەقریبەن بە چۆڵی مانەوە. هەندێ هۆتێل ڕاپۆرتی ئەوەیان گەیاند کە ئیشەکەیان ٩٠٪ کەمیکردووە. لەکاتێکدا کە کڕیارە ترسنۆکەکان داواکانیان کشاندەوە، کارگەکان و بزنسە بچوکەکان کرێکارانیان دەرکرد. بە هاتنی کۆتایی ساڵەکە، زیاتر لە یەك ملیۆن ئەمریکی کارەکانیان

لەدەستدابوو. ئابووریناسێکی پێشبینی ئەوەی کرد کە "ئەگەری ئەوە هەیە کە ئەمریکا و بەشەکەی تری جیهان هەر ئێستا بێبازارییەکی تەواو ئەزموون بکەن".

ئەمەش هەر ئەو شتە بوو کە تیرۆریستان نیازیان بوو. دواتر ئوسامە بن لادن بە شانازییەوە وتی "قاعیدە ٥٠٠,٠٠٠ دۆلاری لە رووداوێك خەرج کرد، لەکاتێکدا کە ئەمریکا...– بەپێی نزمترین مەزەندە– ٥٠٠ ملیارد دۆلاری دۆڕاند". بن لادن ئەو ستراتیژییەی کە بە "خوێنبەربوون تا مایەپوچی" ناودێری دەکرد پوخت کردەوە و وتی "گرنگە کە لەرێگەی هەموو شێوازە شیاوەکان سەرنج بخەینەسەر لێدانی ئابووریی ئەمریکا". من ئەوەم بە بەرپرسیارێتیی خۆم بینی کە هانی ئەمریکییەکان بدەم لە رێگەی لە جوڵەدا هێشتنەوەی ئابووری، بەرەنگاریی قاعیدە بکەن. لە دوادواکانی سێپتێمبەری ٢٠٠١دا، من رۆیشتم بۆ فڕۆکەخانەی (ئۆهێر)ی شیکاگۆ بۆ برەودان بە چاکبوونەوەی پیشەسازیی هێڵی ئاسمانی. لەبەردەم فڕۆکەکانی ٧٣٧ی هێڵە ئاسمانییەکانی (ئەمەریکان) و (یونایتد ئەیرلاینز) چوومە سەر قادرمەیەك. بە هەبوونی شەش هەزار کرێکاری هێڵی ئاسمانی لەناو ئامادەبوواندا، وتم "یەکێك لە ئامانجە گەورەکانی جەنگی ئەم وڵاتە، گەڕاندنەوەی ئاسودەیی گشتییە لەناو پیشەسازیی هێڵی ئاسمانیدا. مەبەستم ئەوەیە کە بە خەڵکی موسافیر بڵێم: سواربن. ئیشی خۆتان لەسەرانسەر وڵاتدا ئەنجام بدەن".

دواتر، من بوومە مایەی گاڵتەجاڕی و رەخنە لەبەرئەوەی بە ئەمریکییەکان وتووە پاش ١١ی سێپتێمبەر "بچن شت بکڕن". من قەت ئەو دەستەواژەیەم بەکارنەهێناوە، بەڵام لە خاڵەکەوە نزیکە. لە مانگە پڕهەڕەشەکانی پاش ١١ی سێپتێمبەردا، گەشت کرد بە فڕۆکەکان، سەردانی ناوچە گەشتیارییەکان و بەڵێ شت کڕینیش، کرداری بەرەنگاری و نیشتمانپەروەری بوون. ئەمانە یارمەتیدەر بوون بۆئەوەی بزنسەکان ببوژێنەوە و ئەمریکییە ئیشکەرەکان لە کارەکانیاندا بمێننەوە.

من تووشی سەرسوڕمان بووم بەو رەخنەگرانەی دەیانوت دەبێ من داوای قوربانیی زیاتری ١١ی سێپتێمبەرم بکردایە. پێم وایە بۆ هەندێ کەس ئاسانە بیری بچێتەوە، بەڵام خەڵکی قوربانییان ئەدا. ژمارەی ریکۆردی ئەو خۆبەخشانەی کە یارمەتیی دراوسێکانیان

دابــوو زیــادی کردبــوو. تەنانــەت گــەنجترین هاوڵاتیانمــان هاتبوونــەپاڵ. خوێنــدکارانی سەرانسەری وڵات ١٠ ملیۆن دۆلاریان تەرخان کردبوو—زۆرجار دۆلارێك لە یەك کاتـدا— بۆ ئەو سندوقەی دروستمان کردبوو بۆ سوودگەیاندن بە منالانی ئەفغانی. لە وتاری ساڵانەی ٢٠٠٢مـدا، مـن دەستپێـشخەرییەکی نیـشتمانیی نـوێم دەسـتپێکرد (لەشـکری ئـازادیی ئەمریکا) و داوای لە هەموو ئەمریکییەکان دەکرد چوار هەزار سـەعات تـەرخان بکـەن بۆ خزمەتکردنی ئەوانیتر لە تەواوی تەمەنیاندا.

بـوێرترین خۆبەخـشان ئەوانـە بـوون کـە بـە چـوونپاڵ یـان ناونوسـین بـۆ سـەربازی، ئێف.بی.ئای یان سی.ئای.ئـەی، ژیـانی خۆیـان خـستبووە مەترسییەوە. سـەدان هـەزار کەس لە ساڵانی دوای ١١ی سێپتێمبەردا ئەم رێگەیەیان هەڵدەبـژارد. هـەندێ کـەس دوور لە خێزانەکانیان چەندەها جار ئەرکەکەیان ئەنجام دایەوە. هەزاران هـاوڵاتیی دانسقەمان گیانی خۆیان بەخشی. ئەگەر بڵێیت ئـەم وڵاتـە پـاش ١١ی سـێپتێمبەر قوربـانی نـەداوە، قسەی رەقە و درۆیە.

بـە هـەبوونی کـەموکورتیی سـەربازیکردن— هـەنگاوێك کـە مـن زۆر دژی بـووم— مـن نەمـدەزانی لـەوە زیـاتر دەتـوانم چیم بکردایـە بۆ هانـدانی قوربانیـدان. ئەمـە جـۆرێکی جیاوازی جەنگ بـوو. ئێمـە پێویـستمان بـە ژنـە خۆبەخـشی وەکـو (رۆزی ریڤێتـەر) یـان (باخچەکانی سەکەوتن)ی دابینکردنی خۆراك وەك ئەوەی دووەم جەنگی جیهـانی نـەبوو. ئێمە پێویستمان بەوە بوو خەڵکی دوژمن پەك بخات لە دروستکردنی تۆقاندن.

من هەمیشە بڕوام وابووە ئەو رەخنەگرانەی کە گوتوویانـە مـن داوا لـە خـەڵکی ناکـەم قوربـانی بـدەن، بـە راسـتی سـکاڵای ئـەوەیان کـردووە کـە مـن بـاجم زیـاد نـەکردووە. ستوونووسێکی واشنتن پۆست نوسیبووی "باجـەکان لـە ئـامرازی بەرزکردنـەوەی داهات زیاترن. باجەکان بەیانێکی کۆدەنگین لەسـەر ئامـانجی نیـشتمانی". مـن ئـەو بیرۆکەیـەم رەت کردەوە بەوەی کە باجە گەورەکان بەرەو ئامانجی نیشتمانیی باڵاتر رێ بکـەن. مـن قەناعەتم وایە کـە بەرزکردنـەوەی باجـەکان پـاش کارەسـاتی ١١ی سـێپتێمبەر زیـانی بـە ئابووری دەگەیاند و کاریگەریی پێچەوانەی دەبوو.

***

١١ی سێپتێمبەری ٢٠٠١، ژیانی ئەمریکایی گۆڕی، بەهەمان شێوە بودجەی فیدراڵی وەرچەرخاند. زیادەی مەزەندەکراوی سەرەتاکانی ٢٠٠١ لەسەر خەمڵاندنی گەشبینانە بۆ گەشەی ئابووریی بەهێز سەرچاوەی گرتبوو. تەقینی بلقی تەکنولۆژیا و بێبازاڕیی یەک لەوای یەک بەشێوەیەکی بەرچاو ئەو مەزەندانەی نزم کردەوە. زیانی ئابووریی هێرشە تیرۆریستییەکان تەنانەت نزمتری کردنەوە. پاشان ئێمە رووبەڕووی تێچووی جەوهەریی پارێزگاری لە وڵات و شەڕ دژی تیرۆر بووینەوە. لە نۆڤەمبەری ٢٠٠١دا، میچ دانیەڵ، کە هەڵۆیەکی دارایی خەڵکی ئیندیانا بوو و چالاکانە ئۆفیسی بەڕێوەبردن و بودجەی ئاراستە کردبوو، راپۆرتی رەسمیی گەیاند: ئەوەی کە پێی دەوترا زیادە لە ماوەی دە مانگدا بوونی نەمابوو. بۆ ماوەی چەند ساڵێک، من گوێبیستی سیاسییەکانی هەردوو حزب بووم کە دەیانگوت من ئەو زیاد گەورەیەم بەفیڕۆداوە کە لەبەرم ماوەتەوە. ئەمە بێ مانا بوو. بەشی زۆری زیادەکە وەهم بوو، لەسەر بنەمای گریمانەیەکی ناراست بوو لەمەڕ ئەوەی کە گەشەی ١٩٩٠ەکان درێژەی دەبێ. هەر کە بێبازاڕی و ١١ی سێپتێمبەر سەریان هەڵدا، زیادەیەکی کەم مابووەوە.

بەهاتنی ٢٠٠٢، بێبازاڕی لە رووی تەکنیکییەوە کۆتایی هاتبوو، بەڵام ئابووری هەر خاو بوو. لە سەرەتاکانی کانوونی دووەمی ٢٠٠٣دا، من داوام لە کۆنگرێس کرد کە تەکان بداتە بەر کەمکردنەوەی باجەکانی دەستپێکردوو لە ٢٠٠١ کە بەتەواوی جێگیر نەببوو و کەمکردنەوەی زیاتری باج پەسەند بکات کە دەبێتەهۆی هاندانی وەبەرهێنانی بزنس و هاتنەکایەی دەرفەتی کار.

لەکاتێکدا کە کەمکردنەوەی باجەکانی ٢٠٠١ بە دەنگی زۆرینەی دووحزبی پەسەند کرا- هەروەکو ئەو باج کەمکردنەوەیەی ساڵی ٢٠٠٢ کە تەرکیزی لەسەر بزنسە بچوکەکان بوو- وێنەی ٢٠٠٣ی پرۆژەیاساکە رووبەڕووی دژایەتی جددی بووەوە. چەپەکان لە ژێر ناونیشانی "کەمکردنەوەی باج بۆ دەوڵەمەندان" رەتیان کردەوە. ئەو تۆمەتە هەڵە بوو. باج کەمکردنەوەی بوش، کاتێک بە تەواوی پیادە کرا، لە راستیدا قورسایی ئەو باجەی داهاتی زیادکرد کە کەوتبووە سەر شانی دەوڵەمەندترینەکانی ئەمریکا.

ڕەخنەگرانی تر لەبەرئەوە دژی کەمکردنەوەکانی باج بوون، چونکە پێیان وابوو ئەمە ئاستی کورتهێنان زیاد دەکات. ئەوە ڕاست بوو کە کەمکردنەوەی باج لە کورت مەودا دا کورتهێنانی زیاد دەکرد. بەڵام بڕوام وابوو کە کەمکردنەوەی باج، بەتایبەت ئەوانەی سەر قازانجەکانی فرۆشتن و پشکەکان گەشەی ئابووری زیاد دەکرد. داهاتەکانی باج لەو گەشەسەندنەوە، پێکەوە لەگەڵ سنووردارێتیی خەرجی، یارمەتیدەر دەبوون بۆ نزمبوونەوەی کورتهێنان.

پرۆژەیاسای هێورکردنەوەی باج بە ڕێژەی ٢٣١ بە ٢٠٠ دەنگ بە ئەنجومەنی نوێنەراندا تێپەڕی. دەنگدانەکە لە ئەنجومەنی پیران لە ٥٠ دا قەتیس بوو. دیک چێنی چووە کۆنگرێس بۆ شکاندنی رایەڵەکە لە ڕۆڵە دەستوورییەکەیدا وەکو سەرۆکی ئەنجومەنی پیران. خۆشبەختانە، ئەو بە بەڵێ دەنگی دا. ئەو بە گاڵتەوە وتی وەکو جێگری سەرۆک وەزیران دەنگی زۆری نەهێنا، بەڵام کاتێك هێنای، هەمیشە لە لایەنی براوەدا بوو. من لە دواودواکانی مایسی ٢٠٠٣دا کەمکردنەوەی باجم کردە یاسا. بەهاتنی مانگی سێپتێمبەر، ئابووریی پەیتا پەیتا دەرفەتی کاری دەرەخساندەوە. ئەم جوڵەیەش لە ٤٦ مانگی یەك لەدوای یەکدا نەوەستا.

پاش گەیشتن بە لوتکەی ٦,٢٪ لە مانگی حوزەیراندا، ڕێژەی بێکاری دابەزی بۆ پێنج لە شەش مانگی دواتردا و تێکڕای ٥,٢٪ بوو لەماوەی سەرۆکایەتییەکەمدا کە نزمتر بوو لە تێکڕاییەکانی ١٩٧٠کان، ١٩٨٠کان و ١٩٩٠کان. هەندێ کەس بەڵگەی ئەوەیان دەهێنایەوە کە تەوقیتی چاکبوونەوەی دۆخەکە ڕێك پاش کەمکردنەوەی باجەکان ڕێکەوت بوو. بەڵام من پێم وانییە.

لە نێوەندی گەشەی ئابووریدا، من ئاگاداربووم لەوەی کە وڵات لە بەڕێوەبردنی کورتهێنانەکاندایە. من بەرپرسیارێتیم بۆئەوە گرتە ئەستۆ کە بە جددی سەرپەرشتیارێکی دارایی باش بم. بەهەمان شێوە چوار بەڕێوەبەرەکانی بودجەشم ئەمەیان کرد- میچ دانیەڵز، جۆش بۆلتن، ڕۆب پۆرتمان و جیم نەسل. وەکو سەرۆکێکی سەردەمی جەنگ، پێیانم وت کە دوو ئەولەویتم هەیە: پارێزگاری لە خاك و پشتیوانی لە سەربازەکانمان، چ ئەوانەی لە جەنگدان و چ ئەوانەی کە لە دێرینەکانن. لەودیو ئەو

بوارانەوە، ئێمە چەند بودجەیەکمان پەسەند کردووە کە گەشەی خەرجیی ئیختیاری لە هەر ساڵێکی سەرۆکایەتییەکەمدا خاو کردووەتەوە. لە ماوەی پێنج ساڵی رابردوودا، بودجەکانم گەشەی ئەو خەرجییەیان لەژێر رێژەی هەڵاوسان راگرتووە — لە راستیدا، کەمکردنەوەیەکە.

من لە نزیکەوە کارم لەگەڵ کۆنگرێس کرد بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی خەرجیم- یان بەو شێوەیەی کە پێم دەوت، قەبارەی گشتگیریی کێك بە کرێمەکە. من هەمیشە لەگەڵ کۆنگرێس کۆك نەبووم لەبارەی ئەوەی کە کۆنگرێس چۆن پارچەکان جیا دەکاتەوە. من دژی ئەو نیشانانە بووم کە دەخرانە ناو پرۆژەیاساکانی خەرجییەوە. بەڵام من ڤیتۆی یەك برگەییم نەبوو تا زەربیە بخەمەسەر خەرجیی دەنگ کۆکەرەوانە بۆ پرۆژەکان. من دەبووایە، یان پرۆژەیاسایەك یان بە تەواوی رەت بکەمەوە یان بە تەواوی قبوڵ بکەم. تا ئەو شوێنەی کە کۆنگرێس وەڵامدەرەوەی ناوەرۆکی مەبەستەکانی من بوو، کە ساڵ لەدوای ساڵ وابوو، هەستم کرد دەبێ تاوەکو کۆتایی رێرەوەکە برۆم و پرۆژەیاساکان واژۆ بکەم.

ئەنجامەکان بابەتی مشتومڕێکی توند بوون. هەندێ لە چەپەکان سکاڵای ئەوەیان دەکرد کە کەمکردنەوەی باجەکان کورتهێنانی زیاد کردووە. هەندێ لە راستەکان بەڵگەی ئەوەیان دەهێنایەوە کە نەدەبووایە من سوودی دەرمانی رەچەتەکراوی (چاودێریی دەرمانی) واژۆ نەکەم. دادپەروەرانەیە کە مشتومڕ لەسەر ئەو بژارانەی بەرنامەی حکومەت بکەین؛ بەڵام ئەمە راستییەکانە: ئاوێتەی بودجە بەرتەسکەکان و زیادبوونی باجەکانی داهاتی سەرچاوەگرتووە لە گەشەی ئابووری، بووەهۆی ئەوەی کە کورتهێنان لە ٣,٥٪ی تێکرای بەرهەمی خۆماڵی لە ٢٠٠٤ بگاتە ٢,٦٪ لە ٢٠٠٥ و بگاتە ١,٩٪ لە ٢٠٠٦ و ١,٢٪ لە ٢٠٠٧دا.

تێکرای کورتهێنان لە رێژەی تێکرای بەرهەمی خۆماڵی لەماوەی ئیدارەکەمدا ٢,٠٪ بوو، کە لەژێر تێکرای پەنجا ساڵەی ٣,٠٪وە بووە. رێژەکانی خەرجیی تێکرای بەرهەمی خۆماڵی، باجەکانی تێکرای بەرهەمی خۆماڵی، کورتهێنانی تێکرای بەرهەمی خۆماڵی و قەرزی تێکرای بەرهەمی خۆماڵیی ئیدارەکەم نزمتر بوون لە تێکراییەکانی سێ دەیەی

رابردوو- و لە زۆربەی حاڵەتەکاندا، لەژێر تێکڕاییەکانی دوایین سەرۆکەکانەوە بووە. سەرباری تێچوونەکانی دوو ڕووداوی بێبازاڕی، پڕتێچوونترین کارەساتی سروشتی لە مێژوودا، و جەنگێکی دوو بەرەیی، ڕیکۆردی داراییمان بەهێز بوو.

لەهەمان کاتدا، دەمزانی کە من کێشەیەکی دارایی دوور مەودا لە دوای خۆم جێ دێڵم: گەشەیەکی بەرگەنەگیراو لە خەرجیی پرۆگرامە کۆمەڵایەتییەکان، کە زۆرینەیەکی گەورەی ئایندەی قەرزی فیدراڵ پێکدێنێت. من کۆششی زۆرم کرد بۆ ریفۆرمی هاوکێشەکانی تەمویل بۆ ئاسایشی کۆمەڵایەتی و چاودێریی دەرمانی، بەڵام دیموکراتەکان دژی هەوڵەکانم وەستانەوە و پشتگیریی لەناو حزبەکەمدا گەرم و گوڕ نەبوو. بەشێکی کێشەکە ئەوە بوو کە پێدەچوو قەیرانی دارایی زۆر دوور بێت لە لقی یاسادانان لەو ماوەیەدا کە سەرۆك بووم. لە سەرەتاکانی ٢٠٠٨دا، ئۆفیسی بودجەی کۆنگرێس مەزنەدەی ئەوەی کرد کە قەرزەکە تاوەکو ساڵی ٢٠٢٣ لە ٦٠٪ی تێکڕای بەرهەمی خۆماڵی تێنەپەڕێت. بەڵام بەهۆی قەیرانی داراییەوە- و ئەو بڕیارە خەرجییانەی کە پاش تەواوبوونی سەرۆکایەتیم دران- قەرز تاوەکو کۆتایی ٢٠١٠ لەو ئاستە تێدەپەڕێت. ئەو قەیرانە داراییەی کە زۆر کەس پێی دوور بوو، ئێستا لە بەردەمماندایە.

***

"وۆڵ ستریت سەرخۆش بووە و ئێمە توشی سەرئێشە بووین".

ئەمە ڕێگایەکی زانراوی سادەیەی پیشاندانی بنچینەکانی گەورەترین کارەساتی داراییە لە سەروەختی بێبازاڕیی گەورەوە. ئاڵۆزترین ڕوونکردنەوە دەگەڕێتەوە بۆ بوژانەوەکەی ١٩٩٠ەکان. لەکاتێکدا کە ئابووری ئەمریکا بە ڕێژەیەکی ساڵانەی ٣,٨٪ گەشەی دەکرد، وڵاتانی ڕوولەگەشەی ئاسیا، وەکو چین، هیندستان و کۆریای باشوور، تێکڕای گەشەیان دوونەوەندەی ئەوە بوو.

زۆرێك لەو سیستەمە ئابوورییانە یەدەکی نەختینەی گەورەیان هەڵگرتبوو. بەهەمان شێوە وڵاتانی وزەبەرهەمهێنیش کە لە بەرزبوونەوەی دەقاتی نرخی نەوت لە نێوان

١٩٩٢ و ٢٠٠٨دا سودمەند بیوون. بێن بێرنانك ئەم دیاردەیەی بە "زیادەی هەلگیراوی جیهانی ناو برد". ئەوانیتر بە حەوزی زەبەلاحی پارە ناویان برد.

بەشێکی گەورەی ئەم سەرمایە بیانییە رژایەوەناو ئەمریکا. ئەمریکا وەکو شوێنێکی سەرنجراکێش بۆ وەبەرهێنان بینرا، ئەمەش لەسایەی بازارە بەهێزەکانی سەرمایەمان، سیستەمە یاساییە جێ متمانەکەمان و هێزی کاری بەرهەمهێنمان. وەبەرهێنەرانی بیانی، ژمارەی گەورەی بۆندی وەزارەتی خەزێنەی ئەمریکایان کری، کە بووەهۆی دابەزانی بەهایان. بە شێوەیەکی سروشتی، وەبەرهێنەران دەستیان کرد بە گەڕان بەدوای دەرامەتی بەرزتر.

یەکێك لە ئاسۆکان، گەشەی بازاڕی نیشتەجێبوونی ئەمریکا بوو. لەنێوان ١٩٩٢ و ٢٠٠٧دا، تێکڕای نرخی خانوو لە ئەمریکا تەقریبەن دووقات زیاد بوو. بونیادنەران بە جوڵەی خێرا خانوویان دروست دەکرد. ڕێژەکانی سوود نزم بوو. ئیتیمان ئاسان بوو. قەرزبەخشان چەکی رەهنیان تەقریبەن بۆ هەموو کەس دەنووسی- لەوانەش قەرزوەرگرانی هەلومەرج ناجێگیر کە تۆمارە نزمەکانی ئیتیمانیان دەیخستنە ناو مەترسیی گەورەوە.

وۆڵ ستریت دەرفەتێکی بەدیکرد. بانکەکانی وەبەرهێنان ژمارەی گەورەی چەکی رەهنیان لە قەرزبەخشان کڕییەوە، بەش بەشیان دەکرد، بەپاکیجیان دەکردەوە و دەیانکردە سەنەدی دارایی ئاڵۆز. ئاژانسەکانی پلەبەندیکردنی ئیتیمان، کە ئابونەی چەوریان لە بانکەکانی وەبەرهێنان وەردەگرت، زۆرێك لەو سامانانەیان بە (ئەی.ئەی.ئەی) پلەبەندی دەکرد. کۆمپانیا داراییەکان ژمارەی گەورەی وەسیقەی ئاڵوگۆڕی پابەندنەبوون بە ئیتیمان(سی.دی.ئێس)یان دەفرۆشتەوە بەو گرەوەی کە ئەو چەکانەی رەهن کە سەنەداتی دارایی دەگرنەخۆ، پیادە ناکرێن. بە بازرگانیکردن لەژێر ناوی زلی وەکو واجبە زەمان کراوەکانی قەرز، بەرهەمە نوێیە پەیوەندیدارەکان بە چەکی رەهنەوە، ئەو داهاتەیان لێکەوتەوە کە وەبەرهێنەران بەدوایدا وێڵ بوون. وۆڵ ستریت بەشێوەیەکی چرووپڕ لێی دەفرۆشت.

(فانی مای) و (فرێدی ماك)، ئەو کۆمپانیا تایبەتییانەی کە ئیمتیازی کۆنگرێس و ڕێسای نەرمیان هەبوو، بازاڕیان بە سەنەداتی دارایی پشت ئەستووری بە چەکی ڕەهن، گەرم کردەوە. ئەو دامەزراوە داراییە سپۆنسەرکراوەی حکومەت، نیوەی چەکی ڕەهنیان لە ئەمریکادا کڕییەوە، زۆرێك لە قەرزەکانیان تەئمین کرد و لە سەرانسەری جیهاندا فرۆشتنیانەوە. وەبەرهێنەران بەشێوەیەکی نامەزرۆیانە کڕیاننەوە، چونکە بڕوایان وابوو کە کاغەزی (فانی) و (فرێدی) گەرەنتی حکومەتی ئەمریکای هەلگرتووە.

ئەوە تەنیا وەبەرهێنەرانی بیانی نەبوون کە بەرەو داهاتە بەرزەکان بەکێش بوون. بانکە ئەمریکییەکان بڕی گەورەی پارەی قەرزیان بە زەمانکردنی سەرمایەکەیان رادەکێشا، کردارێك کە بە نفوز ناودەبرا و باریان لە سەنەداتی دارایی پشت ئەستوور بە ڕەهن دەنا. هەندێ لە وەبەرهێنەرانی سەرسەخت، کۆمپانیای خزمەتگوزاریی نوێی دارایی بوون. زۆرێکیان لە سوودیان بینی لە هەلوەشانەوەی یاسای (گلاس ستیگاڵ)ی ١٩٣٢ لە ساڵی ١٩٩٩دا، کە ڕێگری دەکرد لە بانکەکان لەوەی بچنە ناو ئیشی وەبەرهێنانەوە.

لە ترۆپکی بوژانەوەی نیشتەجێبووندا، خاوەندارێتیی خانووبەرە گەیشتە یەکێك لە ماوەکانی بەرزترین لوتکەی خۆی، نزیکەی ٧٠٪. من پشتگیریم لە بەرنامەگەلێك کردبوو بۆ فراوانکردنی خاوەندارێتیی خانوو، لەوانەش کۆمەکی قیست بۆ کڕیارانی کەم و داهات و یەکەم جار. من دڵخۆش بووم بەوەی کە ببینم کۆمەڵگەی خاوەندارێتی گەشە دەکات. بەڵام فرەیی ئەو چرکەساتە، مەترسییەکی بەرجستەی شاردەوە. حەوزی نەختینەی جیهانی، بەرنامەی دراویی ئاسان، بوژانەوەی بازاڕی نیشتەجێ بوون، شەهیەی کۆتنەکراو بۆ موڵکە پشت ئەستوور بە ڕەهنەکان، ئاڵۆزیی ئەندازیاریی دارایی وۆڵ ستریت و قەرزی بەکارهێنراوی دامەزراوە داراییەکان هەمووی پێکەوە خانوویەکی لە پولی دۆمینەیان هێنایە کایەوە. ئەم بونیادە ناجێگیرە چارەنووسی هەرەس بوو هەر کە پولەکەی ژێرەوە- گەشەی بێ وچانی نرخەکانی نیشتەجێبوون- کەوت. ئەمە کە بڕوانینە دواوە روون بوو. بەڵام خەڵکێکی کەم، لەوانەش من، تێبینییان کرد.

***

له مایسی ٢٠٠٦دا، جۆش بۆلتن لەگەڵ میوانێك كە ئەو هەوڵی دەدا ئیش بۆ ئیدارەكە بكات، هێنری "هانك"پۆلسنی بەڕێوەبەری جێبەجێكاری (گۆڵدمان ساش)، هاتنە ژووری (تریتی). هیوادار بووم هانك قایل بكەم تا شوێنی وەزیری خەزێنە (جۆن سنۆو) بگرێتەوە. جۆن لایەنگرێكی كاریگەری ئەجێندا ئابوورییەكەی من بوو، هەر لە كەمكردنەوەی باجەوە تا ریفۆرمی ئاسایشی كۆمەڵایەتی و بازرگانیی ئازاد. ئەو لە بەڕێوەبردنی وەزارەتەكەدا كارێكی باشی ئەنجام دابوو و لە حاڵێكی باشتری پێش دەست بەكاربوونیدا جێی هێشت. ئەو بۆ ماوەی زیاتر لە سێ ساڵ لە ئیشەكەدا بوو و هەم من و هەم بۆلتن هەستمان كرد كاتی روخسارێكی تازە هاتووە.

جۆش پێی وتم كە هانك كەسێكی سەرسەخت- زیرەك، چالاك و بەڕێزە لای بازاڕە داراییەكان. هانك یەكەم جار سارد و دواتر گەرم و گوڕ بوو لە بەرانبەر بیرۆكەی هاتنەناو كابینەكەوە. ئەو لە وۆڵ ستریت كارێكی بێ وێنەی هەبوو و گومانی هەبوو لەوەی بتوانێ لە دوایین ساڵەكانی ئیدارەكەی مندا دەسكەوتێكی وەهای هەبێت. ئەو ناوبانگێكی باشی هەبوو و نەیدەویست ناوەكەی بكێشرێتە ناو قوڕی سیاسەت. ئەو ژینگەپارێزێكی تامەزرۆ بوو كە كەیفی بە تۆڕلێدان بۆ ماسی (تاربۆن) و تەماشاكردنی باڵندەكان دەهات لەگەڵ (وێندی)ی هاوسەریدا- چەند هیوایەتێك كە لەوانەیە نەیتوانیایە بەردەوام بێ لەسەریان. لەكاتێكدا كە هانك كۆمارییەكی لەمێژینە بوو، لەناو خێزانەكەیدا حزبێكی تاكەكس بوو. وێندی هاوڕێی كۆلێژ و پشتیوانی هیلاری كلینتن بوو. دوو منداڵەكانیان لە حزبی كۆماری بەئاگا هاتبوونەوە. من دواتر زانیم كە دایكی هانك گریاوە كاتێك یەكەم جار بیستوویەتی دێتە ناو كابینەكەمەوە.

به شێوازە پایەدار و ژیربەژیرەكەی، جۆش دواجار هانكی رازی كرد تا لە كۆشكی سپی سەردانم بكات. هانك وزە و بروابەخۆبوونی لێدەباری. ئەو دەستەكانی بە شێوەیەك دەجولان وەك بلێی ئۆركێسترای تایبەت بەخۆی ئاراستە دەكات. ئەو شێوازێكی قسەكردنی جیاوازی هەبوو كە لاساییكردنەوەی قورس بوو. هەندێ كەس دەیانگوت

مێشکی ئەوەندە خێرا دەجوڵێت کە دەمی فریای ناکەوێت. ئەمە بێزاری نەکردم. خەڵکی تۆمەتباریان دەکردم بەوەی کە منیش هەمان کێشەم هەیە.

هانك لەوە تێگەیشت کە بەجیهانیبوونی دارایی و ناوی ئەو، لەدەرەوە و لەناوەوە ڕێزیان بۆی دروستکردووە. کاتێك من دڵنیام کردەوە لەوەی کە ئەو دەبێتە ڕاوێژکاری ئابووریی سەرەکیی من و دەستڕۆیشتنی بێ سنووری هەیە، ئەو ئۆفەرەکەی قبوڵ کرد. لەو کاتەدا، هیچمان نەماندەزانی کە تاقیکردنەوەکانی ئەو وەکو وەزیر پێش ئەوانەی (هێنری مۆرگێنتاو)ی ئیدارەی فرانکلین ڕۆزڤێلت یان (ئەلێکساندەر هامیلتن)ی باوکانی دامەزرێنەری وڵات دەکەوێتەوە.

***

کاتێك من ئۆفیسم گرتەدەست، بوومە چوارەم سەرۆك کە لەگەڵ سەرۆکی (یەدەکی فیدراڵ) ئالان گرینسپان خزمەت بکات. (یەدەکی فیدراڵ) کە لە ژێر سەرۆکایەتیی ویدرۆ ویلسن لە ساڵی ١٩١٣دا هاتەکایەوە، بەرنامەی دراویی ئەمریکا دادەنێت و هەماهەنگیی بانکە ناوەندییەکانی تری سەرانسەری جیهان دەکات. بڕیارەکانی، کاریگەرییەکی بەرفراوانی هەیە، هەر لە بەهێزکردنی دۆلار تا ڕێژەی سوود لەسەر قەرزێکی خوجێیی. لەکاتێکدا کە سەرۆك و بۆردی ئەندامان لەلایەن سەرۆکەوە دەستنیشان دەکرێن و ئەنجومەنی پیران پەسەندی دەکات، یەدەکی فیدراڵ بەرنامەی دراوی بەشێوەیەکی سەربەخۆ لە کۆشکی سپی و کۆنگریس دادەنێت. ئەمەش شێوازێکە کە دەبێ وابێت. یەدەکێکی فیدراڵی سەربەخۆ، نیشانەیەکی گرنگی سەقامگیریی بازاڕە داراییەکان و وەبەرهێنەرانی سەرانسەری جیهانە.

من گرینسپانم بۆ کۆشکی سپی بانگهێشت کرد بۆ نیوەڕۆخوانە ئاساییەکان. من و دیك چێنی و ئاندی کارد نانمان دەخوارد. ئالان نا. ئەو تەواوی کاتەکەی بە وەڵامدانەوەی پرسیارەکانمان بەسەر برد. هەبوونی ئەو هەموو داتایە لەلای، سەرسوڕهێن بوو. من پرسیاری ئەوەم لێیکرد ئاخۆ لە چەند مانگی ئایندەدا ئابووری بەرەو کوێ ڕێ دەکات. ئەو دەستی دەکرد بە ئیقتیباس کردنی قائیمەکانی جەردی نەوت، گۆڕانەکان لە پێوانەی پیشەسازیی سکەی شەمەندەفەردا و ئامارە سەرنجڕاکێشەکانی تر. لەکاتێکدا کە بەسەر

ژمارەکاندا دەهات و دەچوو، دەستی چەپی بەسەر مشتەکۆڵەی راستیدا هێنا، وەك بڵێی زانیاریی زیاتر هەڵدەرێژێت. کاتێك بابەتی پۆستی ئەو لە ساڵی ٢٠٠٤دا هاتە پێش بۆ نوێکردنەوە، من هەرگیز دەستنیشانکردنی کەسی ترم لەبەرچاو نەگرت.

کاتێك ئالان نامەیەکی نارد بۆ خانەنشینبوونی لە سەرەتاکانی ٢٠٠٦دا، ئێمە دەستمان کرد بە گەڕان بەدوای جێگرەوەیەکدا. یەکێك لە ناوەکان بەردەوام دووبارە دەبووەوە: بێن بێرنانك. بێن بۆ ماوەی سێ ساڵ لە بۆردی یەدەکی فیدراڵدا خزمەتی کردبوو و وەکو سەرۆکی ئەنجومەنی راوێژکارانی ئابووری لە ساڵی ٢٠٠٥دا هاتبووە ناو ئیدارەکەی منەوە. ئەو لەلای من و ستافەکەش زۆر بەرێز بوو. ئەو کە لە شارۆچکەیەکی کارۆلایناى باشوور گەورە ببوو، خاکی و راشکاو بوو. وەکو من حەزی لە بەیسبۆڵ بوو. بە پێچەوانەی منەوە، تیمە دڵخوازەکەی (بۆستن رێد سۆکس) بوو. ئەو دەیتوانی بابەتە ئاڵۆزەکان بکاتەوە بە زاراوەی ئاسان. بە پێچەوانەی هەندێ کەسەوە لە واشنتن، پرۆفیسۆرە ریش ماش و برنجییەکە بە ئاوازی دەنگەکەی رانەهاتبوو.

من وەکو دڵسۆزییەك، حەزم دەکرد سیخورمە بگرمە بێن. وتم "تۆ ئابووریناسیت، بۆیە هەر رستەیەکت بە لەلایەکەوە...لەلایەکی ترەوە دەست پێدەکات. سوپاس بۆ خوا لایەکی تریشت نەبوو". رۆژێکیان لە ئۆفیسی ئۆڤاڵ لەبەرانبەر لە پێکردنی گۆرەوی رەنگ برۆنزی لەگەڵ قاتی رەش بە بێن پێکەنیم. لە کۆبوونەوەی دواترماندا، تەواو تیمە ئابوورییە بە گۆرەوی برۆنزییەوە دەرکەوتن. بە دیك چێنیم وت "سەیرکە چیان کردووە". جێگری سەرۆك وەزیران بە هێمنی دەلنگی پانتۆڵەکەی هەڵدایەوە. وتم "ئۆهـ، نا، تۆش نا!".

ئەوەی کە لە هەمووشتێکی تر زیاتر لە بێن دەردەکەوت، بایەخدانی بە مێژوو بوو. ئەو شارەزایەتی ئەکادیمیی ناسراو لە بێبازاڕیی گەورە. لەژێر سلوکە نەرم و نیانەکەیەوە مکوڕییەکی گەورە هەبوو بۆ خوڵادان لە هەڵەکانی ١٩٣٠یەکان. من هیوادار بووم کە ئەمریکا جارێکی تر رووبەڕووی سیناریۆیەکی لەو جۆرە نەبێتەوە. بەڵام ئەگەر رووبەڕوو بووینایەتەوە، دەمویست بێن سەرۆکی یەدەکی فیدراڵ بێت.

وەکو سەرۆکی یەدەکی فیدراڵ، بێن پەیوەندییەکی نزیکی لەگەڵ ئەندامانی تری تیمی ئابووری دروست کرد، بەتایبەت هانك پۆلسن. بێن و هانك وەکو کارەکتەرەکانی ئەڵقەی "جوتە سەیرەکە" بوون. هانك توند بوو، بێن هێمن بوو. هانك رێبەرێکی بزنسی یەکلاییکەرەوە بوو، بێن راڤەکارێکی هۆشمەند بوو کە بەشی زۆری ژیانی لە زانکۆکاندا بەسەر بردبوو. هانك قسەکەرێکی سروشتی بوو. بێن گوێگرێکی ئاسودە بوو.

دەشیا کەسایەتییە دژەیەکەکانیان گرژی دروست بکات. بەڵام هانك و بێن بوونە تەواوکەرێکی کامڵ. لە راستیدا، دانانی خاوەن بانکێکی وەبەرهێنەری نمرە یەك و شارەزایەکی بێبازاڕیی گەورە لە دوو پۆستی باڵای ئابووریی وڵاتێکدا، لە بڕیارە هەرە گرنگەکانی سەرۆکایەتیم بوون.

***

ساڵی کۆتاییم لە ئۆفیس بەهەمان شێوازی یەکەم ساڵم دەست پێکرد،کە نیگەرانی بڵقێکی روو لە تەقین بووم و ئیشم لەسەر هێورکردنەوەی باج دەکرد.

لە ناوەڕاستەکانی ٢٠٠٧دا، بەهاکانی خانوو بۆ یەکەم جار لە ماوەی سیانزە ساڵدا دابەزیبوو. ژمارەیەکی زیاتر و زیاتری خاوەن خانووان لە پابەندییەکانیان بە چەکی رەهن لایان دەدا و کۆمپانیا داراییەکان ملیاردەها دۆلاریان لە بواری موڵکە پەیوەندیدارەکانی چەکی رەهن دەنووسی. سەرۆکی ئەنجومەنی راوێژکارانی ئابووری (ئێدی لازیر) کە پرۆفیسۆرێکی زیرەك و بەرێزی ستانفۆرد بوو، راپۆرتی ئەوەیدا کە ئابووری لەخاوبوونەوەدایە. ئەو و تیمە ئابوورییەکەی بڕوایان وابوو کە لەوانەیە ئێمە بتوانین بە باج کەمکردنەوەیەکی تەوقیتکراو کاریگەرییەکان هێور بکەینەوە.

لە کانوونی دووەمی ٢٠٠٨دا، من هانك پۆلسنم نارد بۆ دانوستان لەسەر پرۆژەیاسایەك لەگەڵ سەرۆکی پەرلەمان (نانسی پێلوسی) و رێبەری کەمینەی پەرلەمان (جۆن بوێنەر). ئەوان پلانێکیان دارشت بۆ دابینکردنی هاندەری کاتیی باج بۆ کۆمپانیاکان بۆ رەخساندنی دەرفەتی کار و کەمکردنەوەیەکی کتوپڕی باج بۆ خێزانەکان بۆ بوژاندنەوەی خەرجیی بەکاربەر. لەماوەی مانگێکدا، یاساکە بە زۆرینەیەکی بەرفراوانی دووحزبی

ئیپەڕیندرا. بە هاتنی مانگی مایس، چەکی زیاتر لە ١,٢٠٠ دۆلاری بۆ هەر خێزانێك لە بەرید دا بوو.

ئابووری هەندێ نیشانەی هەستانەوەی پیشاندا. راپۆرتەکانی گەشەی ئابووری پۆزەتیف بوون، بێکاری ٤,٩٪ بوو، هەناردەکان گەیشتبوونە بەرزاییەکان ریکۆرك و هەڵاوسان لەژێر کۆنترۆڵدابوو. من هیوادار بووم کە ئێمە دەتوانین خۆمان لە بێبازارییەك لابدەین.

من هەڵە بووم. بناغەکە لاواز دەبوو و خانووی پولی دۆمینەکە هەرەسی دەهێنا.

***

لە کاتێکی زووی دوانیوەڕۆی پێنجشەممە، ١٤ ئازار، ئێمە زانیمان کە (بیەر ستێرنس)، یەکێك لە گەورەترین بانکە وەبەرهێنەکانی ئەمریکا، رووبەڕووی قەیرانی سیولە دەبێتەوە. وەکو دامەزراوەکانی تری وۆل ستریت، بیەر توانایەکی زۆری پێدرا. بۆ هەر دۆلارێك کە لە سەرمایەدا هەڵیگرتبوو، کۆمپانیاکە ٣٣ دۆلاری بە قەرز وەرگرت بۆ وەبەرهێنان، کە بەشی زۆری لە شێوەی سەنەدە داراییە پشت ئەستوور بە چەکەی رەهنەکان بوو. کاتێك بلقی نیشتەجێبوون تەقی، بیەر بەرکەوت و وەبەرهێنەرانیش حساباتی خۆیان گواستەوە. بە پێچەوانەی کشاندنەوەکانی بانکی نیشتمانیی یەکەم لە میدلاند، زەرفی کاغەزی نەبوو.

من بەو قەیرانە ناکاوە سەرم سوڕما. سەرنجی سەرەکیی من لەسەر پرسە ئابوورییەکانی سەر مێزی وەکو کار و هەڵاوسان بوو. گریمانەی ئەوەم کرد کە هەر گرفتێکی گەورەی ئێتیمان لەلایەن ئاژانسە رێکخەرەکان و پلەبەندیکەرەکان نیشانە دەکرێت. دواجار، من بە واژۆکردنی یاسای (ساربەینس-ئۆکسلی) لەبەرانبەر ساختەکارییەکەی کۆمپانیای (ئینرۆن) و فەزیحەی تی کۆکپانیاکان، رێکخستنی داراییم بەهێز کردبوو. لەگەڵ ئەوەشدا، بڕیارە سەرمایەگوزارییە لاوازەکانی بیەر ستێرن خستیە لێواری هەرەس. لەم حاڵەتەدا، کێشەکە نەبوونی رێکخستن نەبوو لەلایەن حکومەتەوە، بەڵکو نەبوونی حوکمدان بوو لەلایەن جێبەجێکارانی بیەرەوە.

یەکەم غەریزەم ئەوە بوو کە بیەر رزگار نەکەم. لە بازاڕێکی ئابووریی ئازاد دا، ئەو کۆمپانیایانەی کە شکست دێنن، دەبێ لە بزنس بچنە دەرەوە. ئەگەر حکومەت هاتە ناوەوە، ئەوا کێشەیەك دروست دەکەین کە پێی دەوترێ خەتەری ئەخلاقی: کۆمپانیاکانی تریش وای بۆدەچن کە ئەوانیش رزگار دەکرێن کە هانیان دەدات سەرکێشیی زیاتر بکەن. هانك هەمان نیازی منی هەبوو لەدژی دەستێوەردانی حکومەت. بەڵام ئەو روونی کردەوە کە هەرەسی بیەر ستێرنس دەرەنجامی نەخوازراوی بەرفراوانی دەبێت بۆ سیستەمێکی دارایی جیهانی کە لە سەروەختی دەستپێکردنی قەیرانی نیشتەجێبوونەوە لە ٢٠٠٧ لەژێر پاڵەپەستۆدابووە. بیەر پەیوەندیی دارایی هەبوو لەگەڵ سەدان حکومەت، وەبەرهێن و بانکی تر. ئەگەر کۆمپانیاکە لەپڕ شکستی بهێنایە، بڕوابوون بە دامەزراوە داراییەکانی تر دەڕەوییەوە. دەشیا بیەر یەکەم پولی دۆمینە بێت لە زنجیرەیەك کۆمپانیای روو لە شکست. لەکاتێکدا کە من نیگەرانی دروستبوونی خەتەری ئەخلاقی بووم، زیاتر نیگەرانی هەرەسی دارایی بووم.

پرسیارم لە هانك کرد "ئایا کڕیارێك هەیە بۆ بیەر؟"

سەر لەبەیانی رۆژی دواتر، ئێمە وەڵامی خۆمان وەرگرت. چەند جێبەجێکارێك لە (جەی پی مۆرگەن چەیس) ئارەزوومەند بوون بۆ بەدەستهێنانی بیەر ستێرنس، بەڵام نیگەران بوون لەبەرانبەر ئەوەی کە پێگەی مەترسیداری سەنەداتی دارایی پشت ئەستوور بە رەهنی بیەریان بۆ بمێنێتەوە. بە رەزامەندی بێن، هانك و تیم گێزنەر، سەرۆکی یەدەکی فیدراڵی نیویۆرك، پلانێکیان گەڵاڵە کرد بۆ موخاتەبەکردنی نیگەرانییەکانی جەی پی مۆرگەن. یەدەکی فیدراڵ ٣٠ ملیارد دۆلاری بە قەرز دەبەخشی بە زەمانکردنی پشکەکانی رەهنی نەخوازراو کە رێگەی بۆ جەی پی مۆرگەن خۆش کرد تا بیەر ستێرنس بە دوو دۆلار بۆ هەر پشکێك بکڕێتەوە. زۆر کەس لە واشنتن هەنگاوەکەیان بە رزگاکردنی دارایی ناوبرد و رەخنەیان لێگرت. ئەمە لانی کەم بەلای کارمەندانی بیەر کە کارەکانیان لەدەست دابوو یان خاوەن پشکەکان کە رەسیدیان لە کەمتر لە دوو هەفتەدا ٩٧٪ دابەزیبوو، وەها دیار نەبوو. ئامانجمان ئەوەبوو کە پاداشتی بڕیارە خراپەکانی بیەر

ستێرنس نەکەین. ئەمە بۆ پارێزگاریکردن بوو لە گەلی ئەمریکا لە زەبری ئابووری توند. بۆ ماوەی پێنج مانگ، وا دەرکەوت کە ئێمە ئەوەمان کردووە.

***

پرسیارم کرد "هانك، ئەوان دەزانن کە لە رێگەدایە؟"

لە وەڵامدا وتی "جەنابی سەرۆك، ئێمە نیازمان وایە بەخێرایی بجوڵێین و سەریان بسورمێنین. یەکەم دەنگ کە دەیبیستن، بەرکەوتنی سەریان دەبێت بە ئەرزەکە". یەکەم هەفتەی سێپتێمبەری ٢٠٠٨ بوو و هانك پۆلسن تازە پلانێکی دانابوو بۆ دانانی فانی مای و فرێدی ماك، دوو کۆمپانیای دارایی زەبەلاحی سپۆنسەرکراوی حکومی، لەژێر چەتری پارێزگاریی حکومەتدا. لە هەموو ئەو کردارە ئێمێرجێنسییانەی کە دەبووایە حکومەت لە ٢٠٠٨دا بیگرێتە بەر، هیچیان لە رزگارکردنی فانی و فرێدی بێزارکەرتر نەبوون. چەند ساڵێك کێشەکانی پەیوەست بەو دوو دامەزراوە داراییە سپۆنسەرکراوەی حکومەت دیار بوون. فانی و فرێدی لەودیو ئەرکی برەودانیان بە خاوەندارێتیی خانوو فراوان ببوون. ئەوان وەکو سندوقێکی خۆپاراستن رەفتاریان کردبوو کە بڕی گەورەی پارەیان کۆ دەکردەوە و سەرکێشیی گەورەیان دەکرد. لە یەکەم بودجەمدا، من هۆشداریی ئەوەمدا کە فانی و فرێدی ئەوەندە گەورە بوون کە "کێشەیەکی حەتمی"یان هێناوەتەکایەوە کە دەشێ دەرنجامی نەخوازراوی بەدواوە بێت.

لە ساڵی ٢٠٠٣دا، من پرۆژەیاسایەکەم خستەڕوو کە رێکخستنی دامەزراوە داراییە سپۆنسەرکراوەکانی حکومەتی بەهێز دەکرد. بەڵام لەلایەن دۆستە هەرنزیکەکانیان لە واشنتن بلۆك کرا. زۆرێك لە جێبەجێکارانی فانی و فرێدی کاربەدەستانی پێشووی حکومەت بوون. ئەوان دۆستی نزیکیان لە کۆنگرێس هەبوو، بەتایبەت لەگەڵ دیموکراتە کاریگەرەکانی وەکو کۆنگرێسمان بارنی فرانکی ماساشوسێتس و سیناتۆر کریس دۆدی کۆنێکتیکەت.

ئەو کاتە بارنی فرانك وتی "فانی مای و فرێدی ماك لەبەردەم هیچ قەیرانێکی داراییدا نین".

بە تێپەڕبوونی ساڵان ئەو بانگەشەیە ڕاست دەرنەچوو. لە بودجەی ٢٠٠٥مدا، هۆشدارییەکی توندترم گەیاند. لە بودجەدا هاتبوو "دامەزراوە داراییە سپۆنسەرکراوەکانی حکومەت تەواو توانایان پێدراوە، سەرمایەیەکی زۆر کەمی پەیوەست بە موڵکەکانیان بە بەراورد بە دامەزراوە داراییە هاوشێوەکان هەڵگرتووە...بە لەبەرچاوگرتنی قەبارەی گەورەی هەر دامەزراوەیەک، تەنانەت هەڵەیەکی بچوک لەلایەن دامەزراوە داراییە سپۆنسەرکراوەکانی حکومەت، دەشێ دەرەنجامی نەخوازراوی بۆ تەواوی ئابووری هەبێت".

ئەو هاوینە، ئێمە ئیشێکی ترمان لە ئەنجومەنی یاسادانان هەبوو. جۆن سنۆو لە نزیکەوە لەگەڵ (ریچارد شێڵبی)ی سەرۆکی لیژنەی بانکیی ئەنجومەنی پیران کاری کرد لەسەر ریفۆرمکردنی پرۆژەیاسایەک کە رێکخەرێکی نوێی دەهێنایەکایەوە بۆ کەمکردنەوەی قەبارەی مەلەفە سەرمایەگوزارییەکانی دامەزراوە داراییە سپۆنسەرکراوەکانی حکومەت. سیناتۆر شێڵبی، کە یاسادانەرێکی سەرسەخت و زیرەکی ئالاباما بوو، پرۆژەیاساکەی بە لیژنەکەیدا تێپەڕاند سەرباری دژایەتییەکی کۆدەنگیی دیموکراتەکان. بەڵام دیموکراتەکان لە سەکۆی ئەنجومەنی پیرانەوە دەنگدانیان بلۆک کرد. من هەمیشە بەلامەوە سەیرە کاتێک دیموکراتەکان دەڵێن لەبەرئەوە قەیرانی دارایی روویدا چونکە کۆمارییەکان دەستێوەرنەدانیان رەخساند.

بەهاتنی هاوینی ٢٠٠٨، من بە شێوەیەکی ئاشکرا حەڤدە جار داوای ریفۆرمی دامەزراوە داراییە سپۆنسەرکراوەکانی حکومەتم کرد. دەرکەوت کە هەژدەهەمین جار سحرەکەیە. هەموو ئەو شتەی کە ویستی، بریتی بوو لە ئاسۆی توانەوەی ئابووریی جیهانی. لە تەموزدا، کۆنگرێس پرۆژەیاسایەکی ریفۆرمێکی پەسەند کرد برگەیەکی سەرەکیی ئەوەی تیابوو کە ئێمە پێش پێنج ساڵ بۆ یەکەم جار خستمانەروو: رێکخەرێکی بەهێز بۆ دامەزراوە داراییە سپۆنسەرکراوەکانی حکومەت. پرۆژەیاساکە بەهەمان شێوە دەسەڵاتی کاتیی دایە وەزیری خەزێنە تا دەستی فانی و فرێدی بگرێت ئەگەر توانای دانەوەی قەرزەکانیان کەوتە ژێر پرسیار.

ماوەیەکی کورت دوای ئەوەی کە یاساکە پەسەند کرا، ئاژانسی نوێی ڕێکخەر، کە لەلایەن هاوڕێ و بزنسمان (جیم لۆکهارت) بەڕێوە دەبرا، نیگایەکی نوێی بڕیە تۆمارەکانی فانی و فرێدی. بە یارمەتیی وەزارەتی خەزێنە، پشکنەران گەیشتنە ئەو ئەنجامەی کە دامەزراوە داراییە سپۆنسەرکراوەکانی حکومەت لە هیچ ڕوویەکەوە سەرمایەی پێویستیان نییە. لە سەرەتاکانی ئۆگەستدا، هەم فانی و هەم فرێدی زیانی گەورەی وەرزییان ڕاگەیاند.

دەلالەتەکان نائاسایی بوون. لە بانکەکانی شارۆچکەکانەوە تا وەبەرهێنە نێودەوڵەتییەکانی وەکو چین و ڕوسیا، تەقریبەن هەموو ئەوانەی کە کاغەزی دامەزراوە داراییە سپۆنسەرکراوەکانی حکومەتیان هەبوو، پێیان وابوو کە پشتگیریی حکومەتی ئەمریکای هەیە. ئەگەر دامەزراوە داراییە سپۆنسەرکراوەکانی حکومەت شکستیان لە پابەندی بهێنایە، ئەوا دیاردەی کەوتنی دۆمینە دەهاتەکایەوە و ڕێز و قورسایی وڵاتمان دەکەوتە لەرزە.

بە ئامۆژگاریی بەهێزی هانك، بڕیارمدا کە تاکە ڕێگە بۆ وەستاندنی کارەساتەکە ئەوەیە فانی و فرێدی بخرێنە ژێر چەتری پارێزگاریی حکومەتەوە.

ئەوە پەیوەندی بە هانك و جیمەوە هەبوو کە بۆردەکانی فانی و فرێدی قایل بکەن تا ئەم شروبە قوت بدەن. من گومانی ئەوەم هەبوو کە بتوانن بەبێ وروژاندنی تەپۆلکەیەك لە کەیسی یاسایی ئەمە بکەن. بەڵام ڕۆژی یەکشەممە، ٧ی سێپتێمبەردا، هانك لە کۆشکی سپی پەیوەندی پێوە کردم بۆئەوەی پێم بڵێت جێبەجێکراوە. بازاڕەکانی ئاسیا شەوی یەکشەم گردبوونەوە و داوجۆنز لە ڕۆژی دووشەممەدا ٢٨٩ خاڵ زیادی کرد.

***

من کۆتایی هەفتەی دواترم، ١٣ و ١٤ی سێپتێمبەر بە بەڕێوەبردنی کاردانەوەی حکومەت لە بەرانبەر زریانی (ئیك) بەسەر برد. زریانەکە لە بەرەبەیانی شەممەدا کەناری کەنداوی تەکساسی ڕامالیبوو. تەوژمە ١١٠ مایل لە سەعاتێکدای بایەکان و زریانی بیست پێیی لە (گالڤستۆن)ی دا، لە هوستن پەنجەرەکانی هێنایە خوارەوە و زیاتر لە ١٠٠

کەسی کوشت. (ئیک) کە لەدوای زریانی گالڤستۆنی ١٩٠٠ خراپترین زریان بوو لە تەکساس بدات، زیانی زیاتر لە ٢٤ ملیارد دۆلاری خستەوە.

هەمان ئەو کۆتایی هەفتەیە، جۆرێکی جیاوازی زریان لە نیویۆرکی دەدا. وەکو زۆرێک لە دامەزراوەکانی وۆڵ ستریت، لیهمان برەزەرس توانایەکی زۆر پێدرایەوە و بە قورسی کەوتە بەر کاریگەرییەکانی بازاڕی نیشتەجێبوونی وەستاو. لە ١٠ی سێپتێمبەردا کۆمپانیاکە گەورەترین زیانی دارایی بێ وێنەی ڕاگەیاندبوو، ٣,٩ ملیرد دۆلار لە تاکە وەرزێکدا. بڕوابوون بە لیهمان نەما. کڕیارانی قۆزەرەوە، ئەو بازرگانانەی کە قازانج لە نرخە دابەزیووەکانی سەهم دەکەن، یارمەتیدەر بوون لە گەیاندنی سەهمی لیهمان لە ١٦,٢٠ دۆلارەوە بۆ ٣,٦٥ دۆلار بۆ هەر سەهمێک. ئەستەم بوو کە کۆمپانیاکە بتوانێ بگاتە کۆتایی هەفتە.

پرسیارەکە ئەوە بوو کە پێویستە حکومەت، ئەگەر هەیبێ، چ ڕۆڵێک ببینێت لە زیندووراگرتنی لیهماندا. باشترین چارەسەری شیاو ئەوە بوو کە وەکو بیەر سێرن کڕیارێک بۆ لیهمان بدۆزرێتەوە. ئێمە دوو ڕۆژمان لەبەردەمدابوو.

هانک بەرەو نیویۆرک بەڕێ کەوت بۆ چاودێریکردنی دانوستانەکان. ئەو پێی وتم کە لەوانەیە دوو کڕیار هەبن: بانکی ئەمریکا و بارکلەیس کە بانکێکی بریتانی بوو. هیچیان نەیدەویست موڵکە پڕکێشەکانی لیهمان ببات. هانک و تیم گێزنەر ڕێگەیەکیان داتاشی بۆ بونیادنانی ڕێککەوتننامەیەک بەبێ خستنەکار پارەی باجدەران. ئەوان بەڕێوەبەرە جێبەجێکارە گەورەکانی وۆڵ ستریتیان ڕازی کرد تا هاوبەشی لە کۆمەکێکدا بکەن کە موڵکە ژەهراوییەکانی لیهمان هەڵمژێت. لە جەوهەردا، کێبڕکێکارانی لیهمان کۆمپانیایەکەیان لە مایەپوچی دەردەهێنا. هانک ئومێدەوا بوو کە یەکێک لە کڕیاران بگاتە ڕێککەوتن.

بە زوویی ڕوون بووەوە کە بانکی ئەمریکا چاوی لە کڕینێکی ترە، مێریل لینچ. ئەمە بارکلەیس-ی کردە دوایین هیوای لیهمان. بەڵام ڕۆژی یەکشەممە، کەمتر لە دوانزە سەعات پێش ئەوەی بازاڕەکانی ئاسیا بۆ بازرگانیی دووشەممە بکرێنەوە، ڕێکخەرانی

دارایی لە لەندەن بە یەدەکی فیدراڵ و کۆمسیۆنی سەنەداتی دارایی و ئاڵوگۆڕپیان ڕاگەیاند کە ئەوان ئامادە نین کڕینێك لەلایەن بانکی بریتانییەوە پەسەند بکەن.

پرسیارم لە هانك کرد "ئەرێ ئەوە چ باسە؟ وامزانی خەریکە دەگەینە ڕێککەوتنێك".

لەکاتێکدا کە من و هانك بەردەوام قسەمان دەکرد، ئەو پەیوەندییە تەلەفۆنیانەی یەکشەمە- کە وا دادەنرێ ڕۆژی پشووە- هەمیشە خراپترین دیار بووە. هەستم دەکرد کە دووبارە و دووبارە هەمان وتوێژمان هەیە. تاکە شتێك کە دەگۆڕا ناوی کۆمپانیا ڕوو لەشکستەکە بوو. بەڵام ئەمجارەیان، پێنەدەچوو ئێمە بتوانین دیاردەی کەوتنی دۆمینەکە بوەستێنین.

پرسیارم لە هانك کرد "ئایا ئێمە دەتوانین ڕوونی بکەینەوە کە بۆچی لیهمان لە بیەر ستێرنس جیاوازە؟"

وتی "بەبێ جەی پی مۆرگەن وەکو کڕیارێکی بیەر، شکستی دەهێنا. ئێمە هەر نەمانتوانی کڕیارێك بۆ لیهمان بدۆزینەوە".

هەستم کرد ئێمە باشترین شتێك توانیبێتمان کردوومانە. بەڵام کات بۆ لیهمان تەواو ببوو. دامەزراوە وەبەرهێنەرە تەمەن ١٥٨ ساڵەکە ڕێك پاش نیوەشەوی دووشەمەی ١٥ی سێپتێمبەر بە مایەپوچ تۆمار کرا.

***

لە بەرەبەیاندا دۆزەخ بەرپابوو. یاسادانەران ستایشی بڕیاری دەستێوەرنەدانی ئێمەیان کرد. واشنتن پۆست لە ستوونەکەیدا نوسیبووی "حکومەتی ئەمریکا ڕاست بوو لەوەی کە لێگەڕێت لیهمان شکست بێنێت". بازاڕی سەهم ئەوەندە پۆزەتیڤ نەبوو. داونجۆنز زیاتر لە پێنجسەد خاڵ دابەزیبوو.

ئەقلیەتێکی ترس بڵاو بووەوە. وەبەرهێنەران دەستیان کرد بە فرۆشتنەوەی سەنەدە داراییەکان و کڕینی ئاڵتون و کاغەزی وەزارەتی خەزێنە. کڕیارەکان حسابەکانیان لە بانکەکانی وەبەرهێنان کشاندەوە. بازارەکانی ئێتیمان توند بوونەوە لەکاتێکدا کە قەرزبەخشان دەستیان بە نەختینەکانیانەوە گرتەوە. پێویستییەکانی سیستمی دارایی، کە پشت ئەستوور بوو بە سیولە بۆئەوەی وەکو گریس ڕۆڵ ببینێت، لەبران بوون.

وەك بڵێی ئەمە بەس نەبوو، گروپی نێودەوڵەتی ئەمریکی کە کۆمپانیایەکی بیمەی زەبەلاح بوو، ڕووبەڕووی قەیرانی خۆی دەبووەوە. ئەم گروپە بەرنامەی بیمەی ژیان و مولکایەتی دەنوسی و دەستەبەری شارەوانییەکان، سندوقەکانی خانەنشینی و ماشێنە سەرمایەگوزارییەکانی تری دەکرد کە کاریگەری هەبوو بۆ سەر هەر تاکێکی ئەمریکی.

هەموو ئەو بزنسانە تەندروست بوون. لەگەڵ ئەوەشدا کۆمپانیاکە بە شێوەیەك لە شێوەکان لە لێواری تەقینەوەدا بوو.

پرسیارم لە هانك کرد "ئەمە چۆن ڕوویدا؟"

وەڵامەکە ئەوە بوو کە یەکێك لە یەکەکانی گروپەکە، (بەرهەمە داراییەکان)، دەستەبەری بڕی گەورەی واجبە پشت ئەستووری بە وەسیقەکانی ڕەهن کردووە- و لەزیاتریشدا وەبەرهێنانی کردووە. لەکاتێکدا کە چەکی ڕەهن بە ژمارەی گەورە گەورە شکستیان دەهێنا، کۆمپانیاکە ڕووبەڕووی داوای نەختینەی لانی کەم ۸۵ ملیارد دۆلار دەبووەوە کە نەیبوو. ئەگەر کۆمپانیاکە دەستبەجێ بەو بڕە پارەیە نەهاتبایە پێشەوە، نەك تەنیا شکستی دێنا، بەڵکو دامەزراوە داراییە گەورەکان و لەگەڵیشیاندا وەبەرهێنە نێودەوڵەتییەکانیشی دادەڕماند. یەدەکی فیدراڵی نیویۆرك هەوڵی دابوو کە چارەسەرێکی کەرتی تایبەت بدۆزێتەوە. بەڵام هیچ بانکێك نەیدەتوانی ئەو جۆرە پارەیە کۆ بکاتەوە کە گروپەکە لەو کاتەدا پێویستی پێی بوو. تەنیا ڕێگەیەك هەبوو بۆ زیندووهێشتنەوەی گروپەکە: حکومەتی ئەمریکی هاتبایە ناوەوە. بێن بێرنانك وتی گروپی نێودەوڵەتی ئەمریکا، بە پێچەوانەی لیهمان، لە بزنسە جێگیرەکەی بیمەیدا ئەوەندە زەمانات هەیە کە شیاو بێت بۆ قەرزێکی ئیمێرجێنسی یەدەکی فیدراڵ. ئەو مەرجەکانی خستەڕوو: یەدەکی فیدراڵی نیویۆرك ۸۵ ملیارد دۆلاری تەئمینکراو لەلایەن کۆمپانیا پاشکۆکانی بیمەی بەنرخ و جێگیری گروپەکە، دەداتە گروپی نێودەوڵەتی ئەمریکا. لە بەرانبەردا، حکومەت زەمانێك بۆ ۷۹,۹٪ی پشکەکانی گروپەکە وەردەگرێت.

هیچ شتێکی سەرنجڕاکێش لەبارەی ڕێککەوتنەوەکە نەبوو. ئەمە لە بنەڕەتدا خۆماڵیکردنی گەورەترین کۆمپانیای بیمەی ئەمریکا بوو. کەمتر لە چل و هەشت سەعات

پاش مایەپوچبوونی لیهمان، پێدەچوو رزگارکردنی گروپی ئەمریکا هاودژییەکی بەرچاو بێت. بەڵام ئەمە زۆر باشتر بوو لە دارمانێکی دارایی.

***

بە رزگارکردنی گروپی نێودەوڵەتیی ئەمریکا، ئێمە بەرگەی سێ هەفتەی ئێشی داراییمان گرت. رۆژ لەدوای رۆژ، دەنگوباش خراپ و خراپتر دەبوو. من دەچوومە کۆبوونەوەیەکەوە کە دەوترا داو جۆنز دووسەد خاڵ زیادی کردووە و سی خولەک دواتر دەهاتمە دەرەوە دەوترا سێ سەد خاڵ دابەزیووە. بازارەکان ناجێگیر بوون و منیش هەروا. من هەستم کرد کاپتنی کەشتییەکی روو لەنغرۆ بوونم. وەزارەتی خەزێنە، یەدەکی فیدراڵ و تیمی کۆشکی سپیم بیست و چوار سەعات کاریان دەکرد، بەڵام هەموو ئەو شتەی کە دەمانکرد کردنەدەرەوەی ئاو بوو. من بڕیارمدا کە ئێمە ناتوانین بەمشێوەیە بەردەوام بین. ئێمە دەبووایە بەلەمەکە پینە بکەین.

رۆژی پێنجشەممە، ١٨ی سێپتێمبەر- سێ رۆژ پاش ئەوەی کە لیهمان مایەپوچی راگەیاند- تیمی ئابووری لە ژووری روزفێلت کۆبوونەوە. بێن شیمانەی بێبازارییەکی گەورەی تری خستەڕوو. پاشان هانك و سەرۆکی کۆمسیۆنی سەنەداتی دارایی و ئاڵوگۆڕ (کریس کۆکس) پلانەکەیان خستەڕوو: گەرەنتیی هەموو تەوفیراتی بازاڕی پارە بکە، داینەمۆیەکی قەرزبەخشینی نوێی بخەرەگەڕ بۆ دەستپێکردنەوەی بازاڕی کاغەزی بازرگانی، بەشێوەیەکی کاتی رێگربە لە کڕینەوەی قۆزەرەوانەی سەهمە گەورەکانی دارایی و سەدان ملیارد دۆلاری سەنەداتی دارایی پشت ئەستوور بە رەهن بکڕەرەوە- دەستپێشخەرییەکە دواتر بە پرۆگرامی ئاساییکردنەوەی موڵك و ماڵی پڕکێشە (تارپ) ناسرا. ستراتیژییەکە دەستوەردانێکی هەناسەبڕ بوو لە بازاڕی ئازاد. ئەمە لەدژی هەموو غەریزەکانم بوو. بەڵام پێویست بوو بۆ دەرهێنانی وڵات لەو ترسە گەورەیە. بڕیارمدا کە تاکە رێگە بۆ پاراستنی بازاڕی ئازاد لە دوومەودا دا بریتییە لە دەستێوەردان لە کورت مەودا دا.

بە تیمەکەم وت "ئێوە لە سەداسەد پشتگیریی منتان هەیە. ئەمە چیتر رنککەوتنێکی کەیس لەدوای کەیس نییە. ئێمە هەوڵماندا بەرز و نزمییەکان کۆنترۆڵ بکەین، بەڵام کێشەکە قوڵترە لەوەی کە بیرمان لێ دەکردەوە. ئەمە سیستەمییە".

وتوێژەکە هەموو ئەو مشتومڕانەی گرتەوە کە ئێمە لە کۆنگرێس رووبەڕوومان دەبووەوە. وتم "ئێمە کاتی ئەوەمان نییە نیگەرانی سیاسەت بین. با بزانین ئەو شتەی کە راستە چییە و ئەنجامی بدەین".

من بڕیاری خۆمم دابوو: حکومەتی ئەمریکا بە تەواوی دەچووە ناوەوە. من لەبارەی هەر شتێك کە رووبەڕووی دەبووینەوە تێفکریم. لەماوەی چەند هەفتەی رابردوودا، ئێمە بینەری شکستی گەورەترین دوو کیانی رەهن، مایەپوچیی بانکێکی گەورەی وەبەرهێنان، فرۆشتنی یەکێکی تر، خۆماڵیکردنی گەورەترین کۆمپانیای بیمەی جیهان و ئێستاش ئاشکراترین دەستێوەردان بووین لەبازاڕی ئازاد لە سەروەختی سەرۆکایەتی فرانکلین رۆزڤێلتەوە. لەهەمان کاتدا، روسیا جۆرجیا داگیر کردبوو، زریانی ئیك لە تەکساسی دابوو و ئەمریکا لە دوو بەرەوە لە عیراق و ئەفغانستان لە جەنگدابوو. ئەمە دژێوترین شێوازی تەواوکردنی سەرۆکایەتی بوو.

من لە بەرانبەردا خۆمدا هەستم بە پەژارە نەکرد. دەمزانی کە رۆژانێکی سەخت لە بەردەمدا دەبێت. بەزەیی هاتنەوە بەخۆدا تایبەتمەندییەکی خەمناکە لە سەرکردەدا. ئەمە ئاماژەی مەعنەویات رووخێن دەنێرێتە تیمەکە و وڵات. بەهەمان شێوە، من ئاسودە بووم بەو بیروباوەڕەم کە خوای گەورە قورساییەك ناخاتە سەر شانی باوەڕدارێکی کە ناتوانێت بەرگەی بگرێت.

پاش کۆبوونەوەکە، من بەناو ژووری رۆزڤێلتدا هاتم و چووم و سوپاسی هەموانم کرد. من پێم وتن کە ئەوان بۆ ئەوە هەڵبژێردراون کە خزمەت بکەن. لە سەرۆکایەتیدا، هەروەکو لە ژیانیشدا، دەبێ ئەوەی لە بەردەمتدایە رووبەڕووی بیتەوە. ئەمە ئەو شتە نەبوو کە هیواداربووین بێتە بەردەممان، بەڵام تەواو دڵنیا بووین کە دەبێ بەوپەڕی توانامان رووبەڕووی بینەوە.

***

هانك و تیمەکەی لە وەزارەتی خەزێنە پێداگریی زۆریان لە کۆنگرێس کر تا پاکێجی رزگارکردنەکە پەسەند بکات. ئێمە پێشنیاری بڕێکی ٧٠٠ ملیارد دۆلاریمان کرد- کە نزیکەی ٥٪ی بازاڕی رەهن بوو کە ئێمە پێمان وابوو بایی ئەوەندە زۆرە کە جیاوازییەک دروست بکات. زۆرێک لە یاسادانەران درکیان بە پێویستی ڕێوشوێنێکی گەورە و یەکلاییکەرەوە کرد، بەڵام ئەمە شۆک یان تورەیی ئەوانی کەم نەکردەوە. دیموکراتەکان سکاڵای ئەوەیان دەکرد کە لقی جێبەجێکار دەسەڵاتێکی یەکجار زۆر دەقۆزێتەوە. سیناتۆرێکی کۆماری وتی پلانەکەمان "بازاڕی ئازاد بەلاوەنێ و سۆسیالیزم لە ئەمریکا بونیاد بنێ" دەبێت.

لە هەندێ رووەوە، من هاوخەمی رەخنەگران بووم. دوایین شت کە من دەمویست کۆمەککردنی دارایی وۆڵ ستریت بوو. هەروەکو بە جۆش بۆڵتنم وت "ئەو هاوڕێیانەی میدلاندم، پرسیاری ئەوە دەکەن ئاخۆ ئەو کابرایەی تێکۆشەری بازاڕی ئازاد کە ئەوان دەیانناسی چی بەسەر هاتووە؟ ئەوان بیر لەوە دەکەنەوە ئاخۆ بۆچی ئێمە پارەی ئەوان لە رزگارکردنی ئەو کۆمپانیایانە خەرج دەکەین کە هەر لە سەرەتاوە قەیرانەکەیان دروست کرد".

هیواداربووم کە رێگەیەک هەبێت بۆ لێپێچینەوەی تاکە کۆمپانیاکان لەکاتێکدا کە خۆمان لە بەشەکەی تری وڵات دەبوێرین. بەڵام هەر ئابووریناسێک کە من متمانەم پێی هەبوو پێی دەوتم کە ئەمە ئەستەمە. باشبوونی مەین ستریت (شەقامی گشتی) راستەوخۆ بەندە بە چارەنووسی وۆڵ ستریتەوە.

ئەگەر بازاڕەکانی ئێتیمان هەر بەشێوەی بەستوو بمانایەتەوە، گەورەترین قورسایی دەکەوتە سەر شانی خێزانەکانی ئەمریکا: دابەزینی گەورە لە بەهای حساباتی خانەنشینیدا، لەدەستچوونی بەکۆمەڵی کار و دابەزینی زیاتری بەهاکانی خانوو. لە ٢٤ی سێپتێمبەردا، من وتارێکی پڕبینەرترین کاتم پێشکەشی گەل کرد بۆ روونکردنەوەی پێویستیی رزگارکردنی پاکێجەکە. وتم "من لەو بێزارییەی ئەو ئەمریکییە خاوەن پرەنسیپانە تێدەگەم کە قەرزی رەهنەکانیان لەکاتی خۆیدا دەدەن، هەموو ١٥ی نیسانێک باجی داهاتەکانیان تۆمار دەکەن و نابەدڵن لە دانی تێچوونی بارگرانییەکانی وۆڵ

ستریت. بەلام بە لەبەرچاوگرتنی ئەو بارودۆخەی کە رووبەڕووی دەبینەوە، پەسەندنەکردنی پرۆژەیاسایەك لە ئێستادا، زۆر زیاتر لەسەر ئەمریکییەکان دەکەوێت لە کاتێکی دواتردا".

چەند سەعاتێك پێش ئەوەی کە بە شێوەی راستەوخۆ وتارەکە پێشکەش بکەم، یاریدەدەری کەسیم (جارێد وێنستاین) پێی وتم جۆن مککەین دەیەوێ خێرا قسەت لەگەڵ بکات. پرسیارم لە جۆن کرد ئاخۆ ئەو لەبارەی هەڵمەتەکەوە هەست بە چی دەکات، بەلام ئەو رێك چووە سەر بابەتی تەلەفۆنکردنەکەی. ئەو داوای لە من کرد کە لە کۆشکی سپی لەسەر پاکێجی رزگارکردنەکە کۆبوونەوەیەك ساز بدەم.

وتم "کاتێکم پێ بدە تا لەگەڵ هانك قسە بکەم". دەمویست دڵنیا بمەوە لەوەی کە کۆبوونەوەی کۆشکی سپی لە هەوڵەکانی وەزیری خەزێنەم نادات بۆ گەیشتنە رێکەوتنێك لە کۆنگرێس. جۆن وتی نیازیەتی بەیانێك دەربکات. چەند خولەکێك دواتر، ئەو لە تەلەفزیۆنەوە دەرکەوت. ئەو داوای کۆبوونەوەکەی کرد و رایگەیاند کە هەڵمەتەکەی بۆ ئیشی تەواوکات بۆ یاساکە هەڵدەپەسێرێت.

دەمزانی کە جۆن لە پێگەیەکی سەختدایە. ئەو لە دەنگدانەکاندا دەکەوتە دوای سیناتۆری ئیلینۆی (باراك ئۆباما) کە لە هەڵبژاردنە بەراییەکانی دیموکراتەکاندا لە هیلاری کلینتنی بردبووەوە. گومانی تیا نییە کە کێشەی ئابووری زیانی بە جۆن دەگەیاند. حزبەکەمان کۆشکی سپی کۆنترۆڵ کردبوو، بۆیە ئێمە ئامانجێکی سروشتیی پەنجە بۆ راکێشان بووین. لەگەڵ ئەوەشدا، من پێم وابوو کە قەیرانی دارایی باشترین دەرفەتی بە جۆن داوە تا بتوانێ بگەڕێتەوە. لە ماوەکانی قەیراندا، دەنگدەران ئەزموون بەرزتر لە گەنجێتی و کاریزما هەڵدەسەنگێنن. بە هەڵبڕینی تەحەدییەك بە شێوازی دەوڵەتمەدارانە، جۆن دەیتووانی بەڵگەی ئەوە بێنێتەوە کە کاندیدێکی باشترە بۆ ئەم رۆژگارە.

من چوومە ئۆفیسی ئۆڤاڵ، کە لەوێ جۆش بۆڵتن لەگەڵ (جویل کاپلان)ی جێگری و راوێژکار (ئێد گیلێسپی) چاوەڕێ بوون. کەس تامەزۆری بیرۆکەی کۆبوونەوەکە نەبوو.

جۆش وتی هانك لە دژیەتی. بەڵام چۆن دەمتوانی بەرانبەر داواکەی جۆن بڵێم نا؟ دەمتوانی سەردێڕەکان ببینم: "تەنانەت بوش پێی وایە بیرۆکەی مککەینیش خراپە."

ئێمە سەرۆکی پەرلەمان نانسی پێلوسی و رێبەری زۆرینەی ئەنجومەنی پیران (هاری رەید)مان ئاگادار کردەوە کە کۆبوونەوەکە لە دوانیوەرۆی رۆژی پێنجشەممە، ٢٥ سێپتێمبەر ئەنجام دەدرێت. من تەلەفۆنم بۆ سیناتۆر ئۆباما کرد و پێم وت کە ستایشی پچڕاندنی بەرنامەی هەڵمەتەکەی دەکەم. ئەو بە رێزەوە وتی "هەرکاتێك کە سەرۆك بانگ بکات، من ئامادە دەبم". من بانگهێشتەکەم بۆ کۆبوونەوەکە ئاراستە کرد و روونم کردەوە کە ئەمە داوێکی سیاسی نییە. ئەو رازی بوو ئامادە بێت.

لە دەوروبەری ٣:٣٠ی پاش نیوەڕۆی رۆژی دواتر، بەشداران پەیتا پەیتا گەیشتن. هەرچەندە من موجازەفەی ئەوەم نەکرد خۆم بخەمە پارکینگی بەرتەسکی نێوان کۆشکی سپی و بینایەی (ئۆفیسی جێبەجێکاریی ئایزنهاوەر)، پێم وترا کە لە گردبوونەوەیەکی ئۆتۆمبێلە (SUV)ەکان دەچێت. پێش ئەوەی کۆبوونەوەکە دەست پێبکات، من مشتومڕێکی خێرام لەگەڵ رێبەری کەمینەی ئەنجومەنی پیران (میچ مکۆنێل) و رێبەری کەمینەی ئەنجومەنی نوێنەران (جۆن بوێنەر) ئەنجام دا. ئێمە زۆربەی کاتەکەمان بە قسەکردن لەسەر ئەوە بەسەر برد کە چەندە سەختە بگەینە رێککەوتنێك کە بتوانی دەنگی کۆمارییەکان لە ئەنجومەنی نوێنەران مسۆگەر بکات. وتم کارەسات دەبێ ئەگەر کۆمارییەکان پرۆژەیاسای (تارپ) بکوژن و ئابووری هەرەس بێنێت.

رێك پێش ئەوەی لە ژووری (کابینە) دانیشم، چرکەساتێکم لەگەڵ سەرۆکی پەرلەمان (پێلوسی) بەسەر برد. پێم وت پلانم داناوە بۆ ئەوەی داواکارییەکەی بخەمەڕوو پاش ئەوەی کە من و هانك وتەی کردنەوەمان پێشکەش کرد. ئەو بە روونی گومانی ئەوەی هەبوو پاڵنەری من زیان گەیاندن بێت بە دیموکراتەکان. وەکو بورکانێك کە ئامادەی تەقینەوە بێت، وتی "باراك ئۆباما وتەبێژی ئێمە دەبێ".

من شوێنی خۆمم لە ناوەڕاستی مێزێکی تەختەدا گرت کە ریچارد نیکسن پێشکەشی کۆشکی سپی کردبوو. هانك پۆلسن، دیك چێنی، جۆش بۆلتن و من نوێنەرایەتی ئیدارەکەمان کرد. رێبەرانی حزب و سەرۆك لیژنە سەرەکییەکان نوێنەرایەتی کۆنگرێسیان

کرد. هەردوو کاندیدی سەرۆکایەتی، مککەین و ئۆباما لە بەرانبەر مێزەکەوە شوێنی خۆیان گرت. ئەندامانی ستافەکانی ئێمە خۆیان ئاخنییە ناو ژوورەکەوە. کەس نەیویست ئەو رووداوە گرنگەی لە شانۆی سیاسی واشنتن لەدەست بچێت.

من کۆبوونەوەکەم بە جەختکردنەوە لە پێویستیی پەسەندکردنی یاسایەک بەزووترین کات، دەستپێکرد. جیهان تەماشای دەکرد بۆئەوەی بزانێ ئاخۆ ئەمریکا هەنگاو دەنێت و دەبووایە هەدوو حزبەکە رووبەڕووی تەحەدییەکە ببنەوە. هانك هەواڵی تازەی لەبارەی بازارە ناجێگیرەکان خستەڕوو و بانگەوازی منی بۆ پەسەندکردنی خێرا پیشان دایەوە.

من رووم کردە سەرۆکی پەرلەمان. هەروەکوچۆن قسەکەی راست دەرچوو، سەری بەلای باراك ئۆبامادا وەرگێڕا. ئەو رەفتارێک هێمنی هەبوو و لەبارەی لایەنە بەرفراوانەکانی پاکێجەکە قسەی کرد. من پێم وابوو زیرەکی پیشان دەدات کە بە ئامادەبووانی وت کە لە پەیوەندیی بەردەوامدایە لەگەڵ هانك. مەبەستی ئەوە بوو پیشانی بدات کە ئاگادارە و ئامادەیە یارمەتیدەر بێت بۆ پەسەندکردنی پرۆژەیاساکە.

کاتێك ئۆباما قسەکانی تەواو کرد، من رووم کردە جۆن مککەین. ئەو رووی وەرگێڕا. سەرم سوڕما. ئەو خۆی داوای ئەم کۆبوونەوەیەی کردبوو. من پێم وابوو ئەو دێت رێگایەك گەڵاڵە بکات بۆ ئەوەی پرۆژەیاساکە پەسەند بکرێت.

ئەوەی کە وەکو درامایەك دەستی پێکردبوو، بەخێرایی دابەزیە ئاستی گاڵتەجاڕییەك. میزاجەکان هەڵچوون. دەنگەکان بەرزبوونەوە. هەندێ پلار هاویشتران. شەڕەدەمەیەکی بەئاشکرا لەئارادا بوو کە کۆمیدی بوو ئەوەی لێدەرکە کە مەترسییەکان زۆر گەورە بوون.

تاوەکوکۆتایی کۆبوونەوەکە، جۆن قسەی کرد. ئەو بە شێوەیەکی گشتی لەبارەی سەختیی دەنگدانی کۆمارییەکان و هیوای گەیشتنیان بە کۆدەنگییەك قسەی کرد.

پاش ئەوەی هەر کەسە دەرفەتی هەڵرشتنی ناخی خۆی هەبوو، بڕیارم دا کە هیچی تر نییە کە بەدەستی بێنین. من داوام لە کاندیدەکان کرد کە کۆشکی سپی وەکو پشت پەردەیەك بەکارنەهێنن بۆ دەرکردنی بەیانە سیاسییەکان. داوام لە ئەندامانی کۆنگرێس

کرد کە ئێمە پێویستمان بە پیشاندانی بەرەیەکی یەکگرتووە بۆ خۆلادان لە ترساندنی بازاڕەکان. پاشان هەستام و ڕۆیشتم.

***

لە سەرەتاکانی پاش نیوەڕۆی دووشەممەی ٢٩ سێپتێمبەردا، ئەنجومەنی نوێنەران دەستی کرد بە دەنگدان بە پرۆژەیاسای ڕزگارکردنی دارایی. دوو ڕۆژی پێشوومان، پێنجەمین کۆتاهەفتەمان کە بە مامەڵەکردن لەگەڵ قەیرانی دارایی بەسەر بردبوو، لێوانلێو بوو بە دانوستان. هانك و ستاق خزێنەکەی- هاوڕێ لەگەڵ دان مایەر، سەرۆکی هێمنی کاروباری یاسادانانم؛ و کەیت هێنیسەی، بەڕێوەبەری ماندوونەناسی ئەنجومەنی ئابووریی نیشتمانیم- لە هاتوچۆدا بوون بۆ کۆنگریس، کاریان دەکرد بۆ چارەسەرکردنی پرسە ماوەکانی پەیوەست بە (تارپ). کاتێکی درەنگی شەوی شەممە، سەرۆك پیلۆسی و جۆن بوینەر پێیان وتم کە ناوەرۆکی ڕێککەوتنەکەیان ئامادە کردووە. لە بەرەبەیانی دووشەممەدا، من چوومە فریزی باشوور بۆ پیرۆزبایی لە کۆنگریس و داوالێکردنیان بۆ پەسەندکردنی خێرای ڕێککەوتننامەکە. بە گەڕانەوەم بۆ ئۆفیسی ئۆڤاڵ، دەستم کرد بە پەیوەندیکردن بە ئەندامانی کۆماریی ئەنجومەنی نوێنەران لەسەر دەنگدان مکوڕ بن.

بە یەك لەدوای یەکی کۆنگریسمانەکانم وت "بە ڕاستی ئێمە پێویستمان بەم پاکێجەیە". ئەوان هەموویان هۆکاریان هەبوو بۆ نەتوانینی دەنگدانیان. باجی ئەم کارە قورس بوو. بازنەکانی هەڵبژاردنیان لەدژی ئەمە بوون.

یەکێکیان پێی وتم "ناتوانم وۆڵ ستریت ڕزگار بکەم. نامەوێ ببمە بەشێك لە وێرانکردنی بازاڕی ئازاد". لە وەڵامدا وتم "پێت وایە کەیفم بە بیرۆکەی ئەو کارە دێت؟ بڕوام پێ بکە من سەلامەت دەبم ئەگەر ئەم کۆمپانیایانە شکست بێنن. بەڵام تەواوی ئابووری لەسەر لێوارە. ئەو نەفرەتییە هەرەس دێنێ ئەگەر نەیەینە ناوەوە".

لە سەعات ٢:٠٧ی پاش نیوەڕۆ، دوایین دەنگ بە پرۆژەیاساکە درا. بە ڕێژەی ٢٢٨ بە ٢٠٥ دەنگ شکستی هێنا. دیموکراتەکان بە ڕێژەی ١٤٠ بە ٩٥ دەنگیان پێدابوو. کۆمارییەکان ، بە ٦٥ لەگەڵ و ١٣٣ دەنگی دژ ڕەتیان کردبووەوە.

دەمزانی دەنگدانەکە کارەسات دەبێ. حزبەکەم ڕۆڵی سەرەکی بینیبوو لە کوشتنی (تارپ). ئێستا کۆمارییەکان لەبەرانبەر دەرەنجامەکان سەرزەنشت دەکران. لەماوەی چەند خولەکێکدا، بازاڕی سەهم هەڵوەری. داوجۆنز ٧٧٧ خاڵ دابەزی، کە گەورەترین زیانی خاڵ بوو لە تاکە ڕۆژێکدا لە مێژووی ١١٢ ساڵەدا. (ئێس ئەند پی ٥٠٠) ٨,٨٪ دابەزی کە گەورەترین ڕێژەی سەدیی زیانی بوو لە سەروەختی هەرەسی (دووشەممەی ڕەش)ی ١٩٨٧. ڕاڤەکارێك بە (سی.ئێن.بی.سی) وت "ڕێك ئێستا ئێمە لە چرکەساتێکی کلاسیکی دارمانی داراییداین". ماوەیەکی کورت پاش دەنگدانەکە، لە ژووری ڕۆزڤێلت چاوم بە هانك، بێن و بەشەکەی تری تیمی ئابووری کەوت بۆ زانینی هەنگاوی دواترمان. ئێمە بە ڕاستی تاکە بژارەیەکمان هەبوو. ئێمە دەبووایە خولێکی تری دەنگدان لە ئەنجومەنی یاسادانان بەڕێوە ببەینەوە. هیوام ئەوە بوو کە کاردانەوەی توندی بازاڕ زەنگێکی ئاگادارکردنەوە بۆ کۆنگرێس دابین بکات. زۆرێك لەوانەی کە لەدژی پرۆژەیاساکە دەنگیان دابوو، دژایەتییەکەیان لەسەر بنەمای نرخێکی ٧٠٠ ملیارد دۆلاری بوو. پاشان خوێنبەربوونی ١,٢ ترلیۆن دۆلاریی بازاڕەکانیان لەماوەی کەمتر لە سێ سەعات بینیبوو. هەر بارنەیەك کە حسابی خانەنشینی تاکەکەسی، موچەی خانەنشینی، یان حسابی لە کۆمپانیای دارایی (ئی ترەید) هەبووایە تورە دەبوون.

ئێمە بە ڕێبەرایەتیی جۆش بۆڵتن، ستراتیژییەکمان گەڵاڵە کرد بۆئەوەی یەکەم جار پرۆژەیاساکە لە ئەنجومەنی پیراندا بخەینەڕوو و پاشان خولێکی تر لە ئەنجومەنی نوێنەران بخەینەوە کار. هاری ڕەید و میچ مکۆنێل بە خێرایی پرۆژەیاساکەیان بە ژمارەیەك لە برگەی نوێوە بۆ ڕاکێشانی پشتگیریی زیاتر جوڵاند، لەوانەش زیادکردنێکی کاتی لە بیمەی (کۆمپانیای بیمەی تەوفیری فیدراڵ) بۆ خاوەن حسابەکان و پارێزگارییەك بۆ خێزانەکانی چینی ناوەند لە بەرانبەر (باجی جێگرەوەی کەمترین). ناوەرۆکی یاساکە- ٧٠٠ ملیارد دۆلار بۆ بەهێزکردنی بانکەکان و خستنەوەجوڵەی بازاڕەکانی ئێتیمان- نەگۆڕا. ئەنجومەنی پیران شەوی پێنجشەممە دەنگیدا و پرۆژەیاساکە بە ڕێژەی ٧٤ بە ٢٥ پەسەند کرا. ئەنجومەنی نوێنەران دوو ڕۆژ دواتر دەنگیدا، واتە لە هەینی، ٣ی ئۆکتۆبەردا. من جارێکی تر دەستم کردەوە بە تەلەفۆن

کردن بۆ ئەندامە ڕاڕاکان. هۆشدارییەکانم لەبارەی ئەمەی کە سیستەمەکە هەرەس دێنێت ئەمجارەیان قورسایی زیاتری هەبوو. لە سایەی ڕێبەرایەتیی (ڕۆی بلەنت)ی کۆماری و ڕێبەری زۆرینەی دیموکرات (ستێنی هۆیەر) پرۆژەیاساکە بە ڕێژەی ٢٦٣ بەرانبەر ١٧١ دەنگ پەسەند کرا. ئەندامێك کە هەڵوێستی گۆڕیبوو وتی "ڕۆژی دووشەممە من دەنگێکی یەخە شین (کرێکاری)م دا. ئەمڕۆش ئەوە دەنگێکی یەخە سوور، سپی و شین دەدەم".

***

چەند ڕۆژێك پاش ئەوەی کە (تارپ) واژۆ کرا، هانك پێشنیاری گۆڕانکارییەکی کرد لە شێوازی خستنەکاری ٧٠٠ ملیارد دۆلارەکەمان. لەبری کڕینی موڵکی ژەهراوی، ئەو وتی با وەزارەتی خەزێنە ڕاستەوخۆ سەرمایە بخاتە ناو بانکە ناجێگیرەکان لە ڕێگەی کڕینەوەی ئەو پشکە پەسەندانەی کە مافی دەنگدانیان لە کۆمپانیاکاندا نییە.

من ڕقم لە بیرۆکەی کڕینی بەشەکانی بانك لەلایەن حکومەتەوە بوو. نیگەرانی ئەوە بووم کە کۆنگرێس ئەمە بە داوێك لەقەڵەم بدات و ڕوو بکاتە خەرجکردنی پارەکە لە شتێکی تر جگە لە کڕینی موڵکە ژەهراوییەکان. بەڵام ئەمە سەرکێشییەك بوو کە دەبووایە ئەنجامی بدەین. دەبووایە پلانی (تارپ) بگۆڕدرێت ، چونکە بارودۆخی دارایی بە خێرایی خراپتر دەبوو. دیزاینکردنی سیستەمێك بۆ کڕینی سەنەدە دارایی پشت ئەستوور بە ڕەهنەکان ئەو کاتەی بە فیڕۆ دەدا کە دەبووایە لەدەستی نەدەین. کڕینی پشك لە بانکەکان خێراتر و کاراتر بوو. کڕینی سەهم ڕاستەوخۆ سەرمایەی - خوێنی دارایی- دەچاندە ناو سیستەمی بانکیی کەم سەرمایە. ئەمەش مەترسیی شکستی لەناکاوی کەمدەکردەوە پارەیەکی زیاتر بۆ بانکەکان هەڵدەڕژاند تا بە قەرز بیدەن.

چاندنەکانی سەرمایە بەهەمان شێوە بەند و مەرجی خوازراوتری بۆ باجدەرانی ئەمریکی دەرەخساند. بانکەکان بۆ ماوەی پێنج ساڵی یەکەم ٥٪ی سوودیان دەبەخشی. سوودەکە بەپێی تێپەڕینی کات ٩٪ زیادی دەکرد کە دەبووە هاندەرێك بۆ دامەزراوە داراییەکان تا سەرمایەی تایبەتی کەمتر گرانبەها کۆ بکەنەوە و سەهمە پەسەندەکان بکڕنەوە. حکومەتیش زەمانی سەهمی وەردەگرت، کە مافی ئەوەی پێدەدا لە ئایندەدا

پشك بە نرخی كەم بكڕین. هەموو ئەمە ئەگەری ئەوەی زیاتر كرد كە باجدەران پارەكانیان دەست بكەونەوە.

لە ١٣ی ئۆكتۆبەردا، (ڕۆژی كۆلەمبەس)، تیم گێزنەر و بێن، لە شێوەیەكی دراماتیكیدا پلانی كڕینی گەورەیان خستەڕوو. ئەوان بانگی بەڕێوەبەرانی جێبەجێكاری نۆ كۆمپانیای گەورەی داراییان كرد بۆ وەزارەتی خەزێنە و پێیان وتن، لە پێناوی بەرژەوەندیی ولاتدا، ئێمە چاوەڕێتان لێدەكەین كە هەریەكەتان چەند ملیارد دۆلارێك وەربگرن. ئێمە نیگەرانی ئەوە بووین كە هەندێ لە بانكە تەندروستترەكان سەرمایەكە ڕەت بكەنەوە و ئەوانەش بە چاوێكی تر سەیر بكەن كە قبوڵیان كردووە. بەڵام هانك قایلكەر بوو. ئەوان هەموویان ڕازی بوون كە پارەكە وەربگرن.

پیادەكردنی (تارپ) ئەو كاریگەرییە سایكۆلۆژییەی هەبوو كە ئێمە هیواخوازی بووین. پێكەوە لەگەڵ گەرەنتیی نوێی كۆمپانیای بیمەی تەوفیری فیدراڵ بۆ قەرزی بانك، تارپ ئاماژەیەكی دروستی ئاراستە كرد كە نەیدەهێشت سیستمی دارایی ئەمریكا شكست بێنێت. دواجۆنز ٩٣٦ خاڵ بەرز بووەوە، كە گەورەترین تاكەڕۆژی بەرزبوونەوە بوو لە مێژووی بازاڕی سەهمدا.

تارپ كێشە داراییەكانی نەگەیاندە كۆتایی. لەماوەی سێ مانگی دواتردا، (سیتیگروپ) و بانكی ئەمریكا پێویستیان بە كۆمەكی زیاتری حكومەت هەبوو. گروپی نێودەوڵەتیی ئەمریكا بەردەوام بوو لە خراپبوون و دواجار پێویستی بە نزیكەی ١٠٠ملیارد دۆلاری تر بوو. بازاڕی سەهم هەر بە ناجێگیری مایەوە.

بەڵام بەهەبوونی تارپ، بانكەكان پەیتاپەیتا دەستیان كردەوە بە دانی قەرز. كۆمپانیاكان دەستیان كرد بە دۆزینەوەی ئەو سیولەی پێویستیان بوو بۆ تەمویلكردنی ئۆپەراسیونەكانیان. ئەو ترسەی كە بازاڕی تەنیبووەوە، ڕەویەوە. لەكاتێكدا كە ئێمە دەمانزانی بێبازاڕییەكی سەختمان لەبەردەمدایە، هەستم دەكرد كە فشارەكە هێور بووەتەوە. لە ماوەی چەند مانگێكدا، یەكەم كۆتاهەفتەی بێ ترسی پەیوەندییە تەلەفۆنییەكانی پەیوەست بە قەیرانم بەسەر برد. ئاسودەیی، بناغەی ئابووریی بەهێز، لە گەڕانەوەدا بوو.

***

قەیرانی دارایی لە فراوانیدا، جیهانی بوو و بڕیارێکی گەورەی تر ئەوە بوو کە چۆن لە بواری نێودەوڵەتیدا مامەڵەی لەگەڵدا بکەین. پشێوییەکە لە سەروەختی گرتنەدەستی سەرۆکایەتیی یەکێتی ئەوروپا لەلایەن فەرەنساوە هات. نیکۆلاس سارکۆزی، سەرۆکی چالاکی فەرەنسا کە بە ئاراستەیەکی ئەمریکاییدا ئیشی دەکرد، داوای لێکردم کە میوانداریی لوتکەیەکی نێودەوڵەتی بکەم. من کەیفم بە بیرۆکەکە هات. پرسیارەکە ئەوە بوو کە کام وڵاتانە بانگهێشت بکرێن. ئەوەم زانییەوە کە هەندێ لە سەرکردە ئەوروپییەکان پێیان باشە کۆبوونەوەی گروپی حەوت ئەنجام بدرێت. بەڵام گروپی حەوت تەنیا نزیکەی دوو لەسەر سێی ئابووریی جیهانی گرتبووەخۆی. بڕیارمدا کە بە بەستنی لوتکەیەکی گردبوونەوەی گروپی ٢٠، ئەو گروپەی کە چین، روسیا، بەرازیل، مەکسیك، هیندستان، ئوستراڵیا، کۆریای باشوور، سعودیە و ئابوورییە چالاکەکانی تری دەگرتەخۆ.

دەمزانی کە ئاسان نییە بگەیتە رێککەوتنێك لەنێوان بیست سەرکردەدا. بەڵام بە کۆشش و کەمێك فشاری کەسی، جێبەجێمان کرد. لە ١٥ی نۆڤەمبەردا، هەر سەرکردەیەکی لوتکەکە بەیانێکی هاوبەشی واژۆ کرد کە تیایدا هاتبوو "کارەکەمان بە بڕوایەکی هاوبەشی ئەمەی کە پرەنسیپەکانی بازاڕ، بازرگانیی کراوە و سیستەمەکانی وەبەرهێنان و بازاڕە باش رێکخراوەکانی دارایی هانی جوڵان، نوێسازی و کاوەگەرخستن ئاراستە دەکرێت کە جەوهەرین بۆ گەشەی ئابووری، دەرفەتی کا و کەمکردنەوەی هەژاری".

ئەمە ئاماژەیەکی بەهێزی بوو کە ئەو وڵاتانەی نوێنەرایەتیی نزیکەی ٩٠٪ی ئابووریی جیهان دەکەن، لەسەر چەند پرەنسیپێك رازی بکەیت بۆ چارەسەرکردنی قەیرانەکە. بە پێچەوانەی ماوەی بێبازاڕیی گەورە، وڵاتانی جیهان روویان نەدەکردە ناوەوە. ئەو زەمینەی کارەی کە ئێمە لە لوتکەی واشنتن بونیادمان نا، بەردەوام دەبێ لە رێنماییکردنی هاوکاریی ئابووریی جیهانی.

***

لوتکەی ئابووری، گەورەترین ڕووداوی نۆڤەمبەر نەبوو. ئەمەیان لە سێشەممە، ٤ی نۆڤەمبەردا هات کاتێک سیناتۆر باراک ئۆباما بە سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەڵبژێردرا.

من جۆن مککەین-م پێ باشتر بوو. بڕوام وابوو کە ئەو باشتر ئامادەیە کە لە گەرمەی جەنگێکی جیهانی و قەیرانی داراییدا ئۆفیسی ئۆڤاڵ بگرێتە دەست. من هەڵمەتم بۆ ئەو ئەنجام نەدا، ئەمەش بەشێکی لەبەرئەوەی کە من سەرقاڵ بووم بە بارودۆخی ئابوورییەوە، بەڵام بەشی زۆری لەبەر ئەوە بوو کە ئەو داوای نەکرد. دەمزانی کە دەبێ ئەو سەربەخۆیی خۆی ڕابگرێ. من بەهەمان شێوە گومانی ئەوەم هەبوو کە ئەو نیگەرانی دەنگدان بێت. پێم وابوو بەلای جۆنەوە حاڵەتێکی بەرگریکارانەیە کە خۆی لە من بەدوور بگرێت. بڕوام وایە کە بمتوانیایە یارمەتی بدەم خۆی بخاتەڕوو. بەڵام بڕیارەکە هی خۆی بوو. من نائومێد بووم لەوەی کە نەمتوانی شتێکی زیاتر بکەم بۆ یارمەتیدانی.

ئابووری تاکە فاکتەرێك نەبوو کە لەدژی کاندیدە کۆمارییەکە بوو. وەکو باوکم لە ١٩٩٢ و بۆب دۆڵ لە ١٩٩٦دا، جۆن مککەین دیوی هەڵەی سیاسەتی جیلی بوو. لە تەمەنی حەفتاودووساڵیدا، ئەو دەیەیەك بەتەمەنتر بوو لە من و تاوەکو ئەو کاتە بەتەمەنترین کاندیدی سەرۆکایەتی بوو. هەڵبژاردنی ئەو بە مانای جیلێك گەڕانەوەدواوە بوو. لە بەرانبەردا، باراك ئۆبامای چل و حەوت ساڵ نوێنەرایەتی هەنگاوێکی جیلی بەرەو پێشەوەی دەکرد. ئەو بەکێشبوونێکی گەورەی هەبوو بۆ دەنگدەرانی ژێر پەنجا ساڵ و هەڵمەتێکی زیرەکانە، بەدیسپلین و دەوڵەمەند بە تەکنۆلۆژیای بەرز، بەڕێوە برد بۆئەوەی لایەنگرە گەنجەکانی بباتە بەردەم سندوقەکانی دەنگدان. لەکاتێکدا کە ئەگەری بردنەوەی ئۆباما زیاتر و زیاتر دەبوو، من دەستم کرد بە بیرکردنەوە لەوەی ئاخۆ بردنەوەی سەرۆکایەتی لەلایەن ئەمریکییەکی ئەفریقییەوە چ مانایەك دەگەیەنێ. چەند ڕۆژێك پێش هەڵبژاردن من دیمەنێکی چاوەڕواننەکراوم هات بەرچاو. ئەندامێکی ئەمریکیی ئەفریقیی ستافی شوێنی دانیشتنی کۆشکی سپی دوو کوڕە دوانەکەی کە شەش ساڵان بوون لەگەڵ خۆیدا هێنابوو بۆ ئۆفیسی ئۆڤاڵ بۆ گرتنی وێنەیماڵئاوایی. یەکێکیان بە دەوری ژوورەکەدا ڕوانی و دەمی کردەوە "ئەی باراك ئۆباما کوا؟"

من بە روخسارێکی جددییەوە وتم "هێشتا نەهاتووە".

لە شەوی هەڵبژاردندا، من کارتێکراو بووم بە وێنەی ئەو پیاو و ژنە رەشپێستانەی کە لەسەر تەلەفزیۆن هاواریان دەکرد. زیاتر لە یەکێکیان دەیوت "هەرگیز بڕوام نەدەکرد کە تا بیبینی ئەم رۆژە بژیم". تەلەفۆنم بۆ سەرۆکی هەڵبژێردراو کرد بۆ پیرۆزبایی. بەهەمان شێوە تەلەفۆنم بۆ جۆن مککەین کرد بۆئەوەی پێی بڵێم پیاوێکی باش بوویت کە ئەوپەڕی هەوڵی خۆتت بۆ پێشبڕکێکە خستەگەڕ. هەردووکیان سوپاسگوزار بوون. بە سەرۆکی هەڵبژێردراوم وت کە من چاوەڕێم بۆ پێشوازیکردنی لە کۆشکی سپیدا.

کاتێک تەلەفۆنەکەم داخستەوە، نزایەکم خوێند بۆ باشبوونی سەردەمی جێگرەوەکەم. من بیرم لە یەکێک لە وتە سەرۆکایەتییە دڵخوازەکان کرد کە لە نامەیەکی (جۆن ئادامن)دا بۆ (ئابیگەیل)ی هاوسەری هاتبوو: "نزا لە ئاسمان دەکەم کە باشترین بەرەکەت بەسەر ئەم خانووە و هەموو ئەوانەی دواتر بۆیان دەمێنێتەوە ببارێنێت. یاخوا کەس جگە لە خەڵکانی راستگۆ و ژیر لەژێر ئەم بنمیچەدا حوکم نەکەن". ئەم وشانە لەسەر دیواری سەروو ئاگردانی ژووری نان خواردنی دەوڵەتی هەڵکەنراون.

***

چەند مانگێک بەر لە هەڵبژاردنی ٢٠٠٨، بڕیارمدا بوو کە گواستنەوەیەکی تەواو و رێکخراوی دەسەڵات بکەمە ئەولەویەتێک. یەکەم گۆڕانی دەسەڵات لەدوای ١١ی سێپتێمبەرەوە ماوەیەکی هەستیاریی دەبێت و من هەستم بە بەرپرسیارێتی کرد بۆ پیشاندانی سینگوالایی هاتنەناوێکی نەرم و نیان بۆ ناو کۆشکی سپی بە جێگرەوەکەم. گواستنەوەکە لەلایەن جۆش بۆلتن و یەکێک لە جێگرەکانی، یاریدەدەری کەسی بەهرەمەندی پێشووم (بلەیک گۆتسمان) سەرپەرشتیکرا. ئەوان جەختیان لەوە کردەوە کە سەرۆکی هەڵبژێردراو و تیمەکەی لێدوانەکانیان بەدەست بگات، دەستیان بگات بە ئەندامانی باڵای ئیدارەکە و پانتایی ئۆفیس لە بەشە نوێکانیاندا.

بەشێک لە گواستنەوەکە، بەرنامەی ئابووری دەگرتەخۆ. قەیرانی دارایی خاڵێکی بڕیاردانی تری هێنایەپێش: چی بکرێت لەبارەی باروودۆخی خەمناکی پیشەسازیی ئۆتۆمبێل؟ کۆمپانیاکانی (سێ گەورەکە)ی فۆرد، کریزلەر و ژەنەراڵ مۆتۆرز چەند ساڵێک

بوو بەدەست کێشەوە دەیانناڵاند. چەند دەیەیەک لە بڕیارە لاوازەکانی بڕێوەبردن ئۆتۆمبێلسازانی تووشی تێچوونی گەورەی چاودێریی تەندروستی و موچەی خانەنشینی کردبوو. ئەوان خاو بوون لە دەرکپێکردنی گۆڕانکارییەکانی ناو بازاڕ. سەرەنجام، ئەوان بە بەرهەم و نرخدا کەوتبوونە دوای کارگە بیانییەکان. کاتێک ئابووری تووشی پێکان هات، فرۆشی ئۆتۆمبێل دابەزی. پاشان سڕبوونی بازاڕەکانی ئیتیمان نزیکەی هەموو قەرزەکانی ئۆتۆمبێلی راگرت. سەهمەکانی کۆمپانیای ئۆتۆمبێل لە هەرەسی سێپتێمبەر و ئۆکتۆبەری بازاڕی سەهمدا کەوتن. رەسیدەکانی نەختینەیان دابەزییە ئاستە مەترسیدارەکان. ئەوان هیوایەکی کەمیان هەبوو بە کۆکردنەوەی کۆمەک لە بازاڕە تایبەتییەکاندا.

لە پاییزی ٢٠٠٨دا، بەڕێوەبەری جێبەجێکاری ژەنەراڵ مۆتۆرز (ریک واگنەر) دەستی کرد بە خستنەڕووی داوای یارمەتی لە فیدراڵ. ئەو هۆشداری ئەوەیدا کە ژەنەراڵ مۆتۆرز شکست دێنێت و پاشان بازاڕەکانی تری ئۆتۆمبیلسازی بەدوادا دێن. پێم وانەبوو ئەمە رێکەوت بێت کە هۆشدارییەکانی پەیوەست بە مایەپوچی رێک بەر لە هەڵبژاردنەکانی داهاتوون. رەتم کردەوە کە بڕیارێکی پەیوەست بە پیشەسازیی ئۆتۆمبێل بدەم تا دوای هەڵبژاردنەکان.

شەش رۆژ پاش هەڵبژاردنەکان، من لە ئۆفیسی ئۆڤاڵ چاوم بە سەرۆکی هەڵبژێردراو باراک ئۆباما کەوت. باراک سوپاسگوزار و ئاسودە بوو. پێدەچوو هەمان ئەو هەستە سەیرەی منی هەبێت کە من پێش هەشت ساڵ هەمبوو کاتێک بیل کلینتن لە ئۆفیسی ئۆڤاڵ وەکو سەرۆکی هەڵبژێردراو پێشوازی لێکردم. هەروەها دەمتوانی ئەو هەستە بەپرسیارێتییە بەدی بکەم کە پەیتا پەیتا دەوری دەدا. ئەو لەبارەی ئەوەوە پرسیاری کرد کە چۆن من رۆژەکەم بونیادناوە و ستافەکەم رێکخستووە. ئێمە لەبارەی بەرنامەی دەرەوە قسەمان کرد، لەوانەش پەیوەندییەکانی ئەمریکا لەگەڵ چین، سعودیە و زلهێزەکانی تر. ئێمە بەهەمان شێوە لەبارەی ئابووری قسەمان کرد، لەوانەش کێشەی کۆمپانیاکانی ئۆتۆمبێل.

کاتێکی دواتری ئەو هەفتەیە، من بۆ کۆبوونەوەیەك لەگەڵ تیمە ئابوورییەکەم دانیشتم. وتم "بە باراك ئۆبامام وتووە کە نایەڵم ئۆتۆمبێلسازان شکست بێنن". "من ئەم پشێوییە بەسەر ئەودا هەڵناڕێژم".

من دژی رزگارکردنە داراییەکەی ساڵی ۱۹۷۹ی جیمی کارتەر بووم بۆ کریزلەر و بە تەواوی بڕوام وابوو کە دەبێت حکومەت لە دەرەوەی بزنسی ئۆتۆمبێل بێت. لەگەڵ ئەوەشدا ئابووری زۆر لاواز بوو و راوێژکارانی ئابووریم هۆشدارییان دابوو کە دەشێ مایەپوچیی (سێ گەورەکە) ببێتەهۆی لەدەستچوونی زیاتر لە ملیۆنێك کار، دەرامەتەکانی باج بە رێژەی ۱۵۰ ملیارد دۆلار کەم بکاتەوە و تێکرای بەرهەمی خۆماڵیی ئەمریکا بە سەدان ملیارد دۆلار بباتە دواوە.

کۆنگرێس پرۆژەیاسایەکی ئۆفەری ۲۵ ملیاردی دۆلاریی قەرزی بۆ کۆمپانیاکانی ئۆتۆمبێل پەسەندکردبوو لە بەرانبەر زیاتر باشکردنی سوتەمەنی ئۆتۆمبێلەکانیان. هیوادار بووم دەستبەجێ کۆنگرێس رازی بکەین بە بەخشینی ئەو قەرزانە بۆئەوەی کۆمپانیاکان بتوانن ئەوەندە زیندوو بمێننەوە کە کاتێکی موخاتەبەکردنی بارودۆخەکە بە سەرۆکی نوێ و تیمەکەی بدەن.

سەرگەورەی چالاکییەکەم لە پرسی ئۆتۆمبێلدا، وەزیری بازرگانی (کارلۆس گوتیەرز)ی بە رەچەڵەکە کوبی بوو. کارلۆس کە مناڵ بوو کۆچی کردبوو بۆ فلۆریدا. دایك و باوکی چووبوون بۆ مەکسیکۆ کە لەوێ کارلۆس ئیشێکی شۆفێریی شاحینەیەکی کۆمپانیای (کێلۆگ)ی دەست کەوتبوو. بیست و چوار ساڵ دواتر، کارلۆس بوو بە گەنجترین بەڕێوەبەری جێبەجێکار لە مێژووی ئەو کۆمپانیایەدا و تاکە بەڕێوەبەرێکی جێبەجێکاری کۆمپانیای (فۆرچن ۵۰۰). ئەو لە ۲۰۰۵دا پەیوەندی کرد بە ئیدارەکەی منەوە و بە برەودان بە بازرگانی، بەرگری لە هێورکردنەوەی باج و پشتگیری لە ئازادیی لە کوبا، کارێکی بێ وێنەی ئەنجامدا. کارلۆس و تیمەکەی پێداگریی زۆریان لە کۆنگرێس کرد تا قەرزەکان بدات. ئێمە لە ئەنجومەنی نوێنەران بەرەوپێشچوونمان ئەنجامدا، بەڵام ئەنجومەنی پیران جوڵەی لێوە نەهات. تاکە بژارەیەك کە مابووەوە بریتی بوو لە دەستەبەرکردنی پارە لە تارپ. بە تیمەکەم وت کە دەمەوێ قەرزەکان وەکو دەرفەتێك

بەکاریبێنم بۆ سووربوون لەسەر ئەوەی کە ئۆتۆمبێلسازان پلانێکی بزنسی بەجێ گەلاڵە دەکەن. لەژێر مەرجە بەرتەسکەکانی قەرزەکاندا، دەبووایە کۆمپانیاکان تاوەکو نیسانی ٢٠٠٩ لەرووی داراییەوە بکەوتنایەتەوە سەر سکە و لە رێگەی بونیادنانەوەی ئۆپەراسیۆنەکانیان، دانوستانکردنەوە لەسەر گرێبەستەکانی هێزی کار و گەیشتن بە رێککەوتن لەگەڵ خاوەن بۆندەکان بگاتە ئاستی خۆگری. ئەگەر نەیانتووانیایە هەموو ئەو مەرجانە دەستەبەر بکەن، قەرزەکان دەستبەجێ دەکێشرانەوە و مایەپوچی تۆمار دەکرا. رێککەوتنەکە رەخنەی هەردوو لایەکەی لێکەوتەوە. سەرۆکی یەکێتیی ئۆتۆمبێلسازان سکاڵای ئەوەی کرد کە مەرجەکان زۆر توندن. (گرۆڤەر نۆرکویست) کە لایەنگرێی کاریگەر بوو بۆ کۆنسێرڤاتیڤیزمی دارایی، نامەیەکی کراوەی بۆ نوسیم. تیایدا هاتبوو، "بەرێز سەرۆک بوش: نا".

کەس ئەوەندەی من بێزار نەبوو. لەکاتێکدا کە قەرزە بەرتەسکە کورت مەوداکان باشتر بوون لە رزگارکردنێکی دارایی بەئاشکرا، شتێك بێزارکەر بوو کە رزگارکردنی ئۆتۆمبێلسازان دوایین بریاری ئابووریی گەورەی من بێت. بەلام لەکاتێکدا کە بازاڕ هێشتا نیشی نەدەکرد، دەبووایە کرێکاران و خێزانە ئەمریکییەکان لە هەرەسێکی بەربلاو بپارێزم. بەهەمان شێوە جێگرەوەکەم لە خەیاڵدابوو. بریارمدا کە بەو شێوازە مامەڵەی لەگەڵ بکەم کە ئەگەر لە شوێنی بوومایە حەزم دەکرد مامەڵەم لەگەڵ بکرێت.

***

یەکێك لە باشترین ئەو کتێبانەی کە لە ماوەی سەرۆکایەتییەکەمدا خوێندنمەوە (تیۆدۆر رێکس)ی ئێدموند مۆریس بوو کە بایۆگرافیی (تێدی رۆزڤێلت) بوو. لە ساتێك لە ساتەکانی نزیك کۆتایی سەرۆکایەتییە پڕ رووداوەکەی، روزڤیلت هاوار دەکات "دەزانم کاتێك کە دەڕۆم کرێوە دەبێت".

دەمزانی مەبەستی چییە. ماوەی نێوان سێپتێمبەر و دیسەمبەری ٢٠٠٨ وەکو مانگەکانی ٢٠٠١ توندترین، پشێوترین و لێوانلێو لە بریار بوون. لەبەرئەوەی قەیرانەکە کاتێکی زۆر درەنگی ئیدارەکەم سەریانهەڵدا، من لە کۆشکی سپی نەدەبووم تا کاریگەریی زۆربەی ئەو بریارانەی کە دابوومن ببینم. خۆشبەختانە، بەهاتنی ئەو کاتەی

که له کانوونی دووەمی ٢٠٠٩دا ئۆفیسم جێ هێشت، ئەو ڕێوشوێنانەی کە گرتبوونمانە بەر، سیستەمی داراییان جێگیر کردبوو. هەڕەشەی هەرەسێکی سیستەماتیك ڕەت بیوو. ئەو بازاڕانەی ئیتیمان کە جارێك لە جاران سڕببوون، دەستیان کرد بە شل بوونەوە. لەکاتێکدا کە جیهان هێشتا ڕووبەڕووی نائارامیی ئابووریی جددی دەبووەوە، ئەقلیەتی ترس بوونی نەمابوو.

ساڵی دواتر وێنەیەکی ئاوێتەی لەگەڵ خۆیدا هێنا. بازاڕی سەهم لە یەکەم دوو مانگی ٢٠٠٩دا داکەوت، بەڵام لە کۆتایی ساڵەکەدا زیاتر لە ١٩٪ هەستایەوە. لەکاتێکدا کە میزانیە گشتییەکانیان بونیاد نایەوە، دەستیان کرد بە ڕزگاربوون لە پشکە حکومییەکان. بە هاتنی پاییزی ٢٠١٠، زۆرینەی هەرە زۆری ئەو سەرمایەی کە وەزارەتی خەزێنە لەناو بانکەکاندا چاندبووی، بە سوودەکانەوە دەدرایەوە. ئەو پرۆگرامەی کە لەبەرانبەر تێچوونەکانی گاڵتەی پێدەکرا دەشیا بە کۆکردنەوەی پارە بۆ باجدەرانی ئەمریکی، کۆتایی پێ بێت.

من زۆر جار لەوە ڕاماوم ئاخۆ دەبێ ئێمە هاتنی قەیرانی داراییمان تێبینی کردبێت. لە هەندێ ڕووەوە، بەڵێ. ئێمە دەرکمان بەو مەترسییە کرد کە لەلایەن فانی و فرێدی خرایە ڕوو و ئێمە چەندبارە داوامان لە کۆنگرێس کرد تا مۆڵەتی سەرپەرشتیکردنی بەهێزتر بدات و قەبارەی پرۆژەکانیان سنووردار بکات. ئێمە بەهەمان شێوە لە پێویستیی شێوازێکی نوێ بۆ ڕێکخستن تێگەیشتین. لە سەرەتاکانی ٢٠٠٨دا، هانك نموونەیەکی خستەڕوو بۆ بونیادی ڕێکخەری مۆدێرنیزە کراو کە سەرپەرشتیکردنی کەرتی دارایی بەهێز کرد و دەسەڵاتی گەورەتری بە حکومەتدا تا کۆمپانیا ڕوو لە شکستەکان هێور بکاتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، ئیدارەکەی من و ڕێکخەران ڕادەی ئەو سەرکێشییانەی کە وۆڵ ستریت گرتبوویەبەر نادیدە گرت. ئاژانسەکانی پلەبەندیکردن بە ستایشکردنی موڵکە لەرزۆکەکان، دۆخێکی ناراستی ئارامییان پیشاندا. کۆمپانیا داراییەکان قەرزێکی زۆریان کەڵەکە کرد و بە حساباتی میزانییەی شاراوە، لاوازیی خۆیان داپۆشی. زۆرێك لە بەرهەمە نوێکان ئەوەندە ئاڵۆز بوون کە تەنانەت دروستکەرانیشیان بە تەواوی لێیان

ئێنەدەگەیشتن. لەبەر هەموو ئەو هۆکارانە، ئێمە چاومان لە بەرانبەر ئەو قەیرانە دارایییەدا کوێر بوو کە زیاتر لە دەیەیەك بوو لە دروستبووندابوو.

یەکێك لەو پرسیارانەی کە ڕووژوو لێم دەکرا، ئەوە بوو کە چۆن خۆمان لە قەیرانێکی دارایی تر بپارێزین. یەکەم وەڵامم ئەوە بوو کە من دڵنیا نیم هێشتا لەوەیان هاتووینەتە دەرەوە. دامەزراوە دارایییەکانی سەرانسەری جیهان هێشتا نفوزی خۆیان چاك دەکەنەوە و حکومەتەکان لە لە قەرزێکی زۆردا نغرۆ بوون. بۆ چاکبوونەوەی تەواو، پێویستە حکومەتی فیدراڵ لە ڕێگەی کەمکردنەوەی خەرجیی، موخاتەبەکردنی بەرپرسیارێتیيە تەمویلنەکراوەکانی (ئاسایشی کۆمەڵایەتی) و چاودێریی دەرمانی و دروستکردنی هەلومەرج بۆ کەرتی تایبەت- بەتایبەت بزنسە بچوکەکان- بۆ هێنانەکایەی کاری نوێ، ڕێگەی دارایی دوورمەودای باش بکات.

هەر کە ئابووری کەوتە سەر پێیە جێگیرەکانی، دەبێ فانی و فرێدی بکرێنە کۆمپانیای تایبەتی کە لە بازاڕی ڕەهندا پێشبڕکێ لەگەڵ کۆمپانیاکانی تردا بکەن. دەبێ بانکەکان داوایان لێبکرێ پەیڕەوی بکەن لە پێویستییەکانی سەرمایەی بەجێ بۆ بەرگرتن لە زیادەقەرزی. دەبێ ئاژانسەکانی پلەبەندیکردنی ئیتیمان مۆدێلەکەیان بۆ شیکردنەوەی مولکە دارایی ئاڵۆزەکان هەڵبسەنگێننەوە. پێویستە بۆردی بەڕێوەبەرانیش کۆتاییەك دابنێ بۆ ئەو پاکێجانەی قەرەبووکردنەوە کە هاندەری نادروست دەهێننەکایەوە و بەرەو شکست پاداشتی جێبەجێکاران دەکەن.

لەهەمان کاتدا، پێویستە ئێمە وریا بین لەوەی کە زیادەڕەوی نەکەین لە پشتڕاستکردنەوەدا. ڕێکخستنی زیادەڕەوانە وەبەرهێنان خاو دەکاتەوە، نوێسازی پەکدەخات و کاروەگەڕخستن دەڕەوێنێتەوە. پێویستە حکومەت دەستێوەردانی لە بانك، پیشەسازیی ئۆتۆمبێل و کەرتەکانی بیمە خاو بکاتەوە. لەکاتێکدا کە موخاتەبەی ڕێکخستنی دارایی دەکات، نابێ کۆنگرێس پێشێلی سەربەخۆیی یەدەکی فیدراڵ بکات لە مامەڵەکردنی لەگەڵ بەرنامەی دراویدا. قەیرانی داراییش نابێ ببێتە پاساوێك بۆ بەرزکردنەوەی باج کە تەنیا گەشەی ئابووریی پێویست بۆ بەدەستهێنانەوەی توانا، لاواز دەکات.

لەسەرروو هەموو ئەمانەشەوە، پێویستە وڵاتەکەمان ئیمانمان بە بازاڕی ئازاد، پڕۆژەی ئابووریی ئازاد و بازرگانیی ئازا راگیر بکات. بازارە ئازادەکان ئەمریکایان کردووە بە سەرزەمینی دەرفەت و بەپێی تێپەڕبوونی کات، ئەوە لەدوای ئەوە یارمەتیدەربوون بۆ بەرزکردنەوەی ستانداردی ژیان. لە دەرەوە، بازارە ئازادەکان وڵاتە ناجێگیرەکانیان کردووە بە هێزی ئابووری و سەدان ملیۆن کەسیان لە هەژاری دەرهێناوە. سەرمایەداریی دیموکراتی، هەرچەندە ناتەواوە و پێویستی بە چاودێریی ئەقڵانی هەیە، تاوەکو ئێستا سەرکەوتووترین مۆدێلی ئابووری بووە.

***

سورشتی سەرۆکایەتی وایە کە هەندێ جار تۆ ناتوانیت ئەوە هەڵبژێریت کە چ تەحەددییەك دێتەسەر مێزەکەت. تۆ تەنیا بڕیار دەدەیت کە چۆن وەڵام بدەیتەوە. لە دوایین رۆژەکانی ئیدارەکەمدا، من راوێژکارانی ئابووریم کۆ کردەوە بۆ دوایین لێدوان لە ئیدارەکەمدا. من تیمێکی بەهێز و خاوەن ئەزموونم پێکهێنابوو کە توانای خۆگونجاندنی لەگەڵ پێشبینی نەکراو و خستنەڕووی پێشنیاری گەورە هەبوو. ئێمە بەئاگاداربوون لەوەی کە هەمیشە خوازراو نابێت، ئەوەمان کرد کە پێمان وابوو پێویستە. بەلای هەندێ کەسی وڵاتەکەمانەوە، تارپ تەنیا ببووە وشەیەکی چوار پیتی. من بڕوام وایە کە یارمەتیدەر بووە بۆ دەربازکردنی گەلی ئەمریکا لە کارەساتێکی ئابووریی پەیوەندیداری مێژوو. حکومەت ڕوونی کردەوە کە ڕێگەنادات ئابووری شکست بێنێت و ئەو دووەم بێبازاڕییە گەورەیەی بێن بێرنانك لەبارەیەوە هۆشداری دابوو، ڕوویەندا.

لەکاتێکدا کە سەیری ڕوخسارە ماندووەکانی پیاوان و ژنانی تیمە ئابوورییەکەم کرد، بیرم لەوە کردەوە کە ئیدارەکەم بە چ زەحمەتێکدا تێپەڕیووە. ئێمە بۆ ماوەی هەشت ساڵ، هەر رۆژێك باشترین هەوڵی خۆمان داوە. هەموو تواناامان بە کارەکەماندا وە. لە هەر تاقیکردنەوەیەکیشدا، ئێمە فەخرمان کردووە بە خزمەتکردنی ئەو وڵاتەمان کە خۆشمان دەوێ.

# کۆتایی

من ڕۆژی سێشەممە، ٢٠ی کانوونی دووەمی ٢٠٠٩م هەر بەو شێوەیەی دەستپێکرد کە لە هەر ڕۆژێکی ماوەی هەشت ساڵی ڕابردوودا دەستم پێدەکرد: کتێبی پیرۆزم خوێندەوە. یەکێک لە پارچەکانی ئەو دوایین ڕۆژە، پسالم ١٨:٢ بوو- "خودا شاخ، پەنا و ڕزگارکەری منە، خودای من ئەو شاخەی منە کە پەنای بۆ دەبەم". ئامێن

کەمێک پێش حەوتی بەیانی، بە مەسعەد دابەزیمە نهۆمی ئەرزەکەی کۆشکی سپی، بەلای ستونەکاندا تێپەڕیم و بۆ دوایین جار دەرگا نیمچە شوشەییەکەی ئۆفیسی ئۆڤاڵم کردەوە. جۆن بۆڵتن لەناوەوە چاوەڕێ بوو. ئەو بەهەمان ئەو قسانەی ڕۆژانی پێشووی وەکو سەرۆکی ستاف سڵاوی لێکردم: "جەنابی سەرۆک سوپاس بۆ ئیمتیازی خزمەتکردن".

لە بەرەبەیانێکی ئاساییدا، (لای خۆرئاوا) پڕ دەبێ لە یاریدەدەر. بەڵام ئەو دوایین ڕۆژە، بینایەکە بەشێوەیەکی سەیر کپی بوو. زەنگی تەلەفۆن نەبوو، تەلەفزیۆن نەخرابووە سەر هەواڵەکان، لە هۆڵەکاندا کۆبوونەوە نەبوو. تاکە دەنگێک کە گوێبیستی دەبووم غرەغرِی درێڵی کرێکارێک بوو کە ئۆفیسەکانی بۆ تیمە نوێکە نوندوتۆڵ دەکردەوە.

من نامەیەکم لەسەر مێزی (ڕیزەلوت) جێهێشت. وەکو درێژەدانێک بە نەریتی سەرۆکایەتی، نامەیەکی پیرۆزباییم بۆ جێگرەوەکەم نوسیبوو و هیوای سەرکەوتنم بۆ خواستبوو. نوسینەکە خرابووە زەرفێکی نامەی گەورە و ئاراستەی "٤٤ەمین" کرابوو.

بە جۆشم وت "چ فەخرێك بوو بۆم كە هەموو ڕۆژێك بێم لەم ئۆفیسەدا كار بكەم".

پاشان كۆتەكەم لەبەر كرد و چوومە دەرەوە و دوایین هەنگاوم لە ڕێڕەوی ڕاكردنە وەرزشییەكە نا لە فریزی باشوور كە تیایدا من و سەگەكەم (سپۆت) ئەو بەیانییەی فرمانی ئازادكردنی عیراقم دا پیاسەمان كردبوو.

وێستگەی دواترم ژووری (ئیست) بوو كە لەوێ ستاف شوێنی نیشتەجێ بوونی كۆشكی سپی كۆ ببوونەوە. ژوورە پڕەكە جیاوازییەكی گەورەی هەبوو لەگەڵ چۆڵییەكەی (لای خۆرئاوا). نزیكەی هەر ئەندامێكی ستاف شوێنی دانیشتن لەوێ بوون: ئەو گوڵچنانەی كە هەموو ڕۆژێك چەپكەگوڵی فرێشیان لە ئۆفیسی ئۆڤاڵ دادەنا، ئەو ساقی و كارگوزارانەی كە ژیانیان ئاسودە دەكردین، ئەو دارتاش و ئەندازیارانەی كە كۆشكی سپی دەخەنە حاڵەتی كاركردنەوە، ئەو سەپەرشتیارانەی چێشتلێنان كە ژەمی بێ وێنەیان بۆ لێدەناین و بێگومان ئەو وەستایەی هەویر كە شیرینی دەرخوارد دەدام.

زۆرێك لەو ستافەی شوێنی دانیشتن نەك تەنیا لەماوەی هەشتساڵی سەرۆكایەتی مندا، بەڵكو لە ڕۆژگاری دایك و باوكیشمدا لە كۆشكی سپی خزمەتیان كردبوو. لەكاتێكدا كە لۆرا، باربارا و جێنا لە تەكمەوە وەستابوون، بە خەڵكەكەم وت "ئێوە وەكو خێزانێك وابوون بۆ ئێمە. هەندێ شت هەن لە واشنتن كە من بیریان ناكەم، بەڵام زۆر بیری ئێوە دەكەم. لەناخی دڵمانەوە سوپاستان دەكەین".

***

باراك و میشێل ئۆباما پێش ١٠ی بەیانی گەیشتنە (نۆرس پۆرتیكۆ). من و لۆرا، بەو شێوەیەی كە بیل و هیلاری كلینتن پێش هەشت ساڵ بەرانبەر ئێمەیان كرد، بۆ خواردنەوەی قاوە بانگهێشتی ئەوانمان كرد بۆ ژووری (شین). خێزانی ئۆباما لە مەعنەویاتێكی باشدا بوون و تامەزرۆ بوون بۆ گەشتەكەی بەردەمیان. لەهەمانكاتدا، لە ژووری (بارودۆخ)، یاریدەدەرانی ئاسایشی نیشتمانی لەهەردوو تیمەكانمان چاودێریی هەواڵگرییان دەكرد لەمەڕ هەڕەشەی تیرۆریستی لەبەرانبەر ڕێوڕەسمی دەستبەكاربووندا. ئەمە بیرهێنەرەوەیەكی بەرجەستەی ئەوە بوو كە پیاوانی خراپەكار هێشتا دەیانەوێ زیان بە وڵاتمان بگەیەنن، گرنگ نییە كێ سەرۆكە.

پاش سەردانەکەمان، چووینە ناو کاروانی ئۆتۆمبێلەکەوە بۆ گەشتێک بەرەو شەقامی پەنسلڤانیا. خەیاڵم چووەوە سەر ئەو گەشتەی کە پێش هەشت ساڵ لەگەڵ بیل کلینتن ئەنجامم دا. ئەو ڕۆژەی کانوونی دووەکی ۲۰۰۱، هەرگیز نەمدەتوانی وێنای ئەوە بکەم کە لە ماوەی سەرۆکایەتییەکەمدا چیم دێتە ڕێ. دەمزانی هەندێ لەو بڕیارانەی کە داومن بەلای هاوڵاتیانمەوە پەسەند نەبوون. بەڵام ئاسودە بووم بەوەی کە ئامادەیی ئەوەم تیابووە بڕیاری سەخت بدەم و من هەمیشە ئەوەم کردووە کە پێم وابووە ڕاستە.

لە بینایەی کۆنگرێس، من و لۆرا شوێنی خۆمان گرت بۆ مەراسیمی دەست بەکاربوونەکە. من سەرسام بووم بە گواستنەوە ئارامەکەی دەسەڵات، کە یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی دیموکراسییەکەمان. ئامادەبووان لە چاوەڕوانیی سوێندخواردنەکەدا دەهاتنەناوەوە. باراک ئۆباما بۆ هیوا هەڵمەتەکەی خۆی بەڕێوەبردبوو و ئەمەش ئەو شتە بوو کە بە زۆرێک لە ئەمریکییەکانی دابوو.

مەراسیمی دەستبەکاربوون بۆ سەرۆکە نوێکەمان دەستپێکێکی دڵرفێن بوو. بەلای من و لۆراوە، کۆتاییەک بوو. ئەمە نۆرەی سەرۆکێکی تر بوو و من ئامادە بووم بچمەماڵەوە. پاش مەراسیمێکی ماڵئاوایی گەرم و گوڕ لە بنکەی هێزی ئاسمانیی ئەندروز، من ولۆرا سواری هێزی ئاسمانیی یەک بووین- کە ئێستا ناونراوە ئەرکی ئاسمانیی تایبەتی ۲۸۰۰۰. ئێمە لە کاتێکی درەنگی دوانیوەڕۆی ڕۆژێکی جوانی زستانی خۆرئاوای تەکساس گەیشتینە میدلاند. بەرەو گردبوونەوەیەکی جەماوەریی (سێتێنیاڵ پلازا) ڕۆیشتین کە لەوێ ئامادەی ئەو مەراسیمەی بەڕێکردنی پێش هەشت ساڵ بووینەوە. زۆرێک لە ڕوخسارەکانی ناو قەرەباڵغییەکە نەگۆڕابوون، ئەمەش بیرهێنەرەوەیەکی ئەو هاوڕێ ڕاستەقینانە بوو کە پێش سیاسەت، لەماوەی سیاسەتدا و پاش سیاسەتیش لەگەڵمان بوون.

وتم "خۆشە لەماڵەوە بیت. لەوانەیە من و لۆرا تەکساسمان جێ هێشتبێت، بەڵام تەکساس هەرگیز جێی نەهێشتین..کاتێک ئەم بەیانییە لە کۆشکی سپی هاتمە دەرەوە، بە هەمان ئەو بەهایان دەرچووم کە پێش هەشت ساڵ لەگەڵ خۆم هێنابوونم. کاتێکیش

ئەو لەماڵەوە سەیری ئاوێنە دەکەم، هیچ پەشیمانییەکم نییە لەبەرانبەر ئەوەی کە دەیبینم- بێگومان جگە لە قژە سپییەکە".

ئێمە ئەو شەوە بەرەو کراوفۆرد کەوتینەڕێ و لە سپێدەی بەیانیی دواتردا ئامادە بووین بۆ ئەو یەکەم ڕۆژەی کە لۆرا بە "پاش ژیان" ناوی دەبرد. من کارتێکراو بووم بەو کپییە. هیچ لێدوانێکی سی.ئای.ئەی نەبوو ئامادەی بم و کاغەزێکی شینیش لە ژووری بارودۆخەوە نەبوو. هەستم کرد لە سەد مایلّ لە سەعاتێکدا بەرەو نزیکەی دە مایلّ لە سەعاتێکدا ڕۆیشتووم. دەبوایە زۆر لەخۆم بکەم تا ئارام ببمەوە. هەواڵەکانم دەخوێندەوە و بەشێوەیەکی غەریزی بیرم لەوە دەکردەوە کە دەبێ چۆن وەڵام بدەینەوە. پاشان بیرم دەکەوتەوە کە ئەو بڕیارە لەسەر مێزی کەسێکی ترە.

ئیشێکی زۆرم هەبوو بۆئەوەی کاتەکەی پێ پڕ بکەمەوە. ڕۆیشتم ئیش لەسەر بونیادنانی سەنتەری سەرۆکایەتی بوش بکەم لە کەمپی زانکۆی (ساوزەرن میتۆدیست) کە ئەرشیفێکی حکومیی ڕەسمی، مۆزەخانەیەك و دامەزراوەیەکی بەرنامە و ڕێوشوێنی تایبەت بە بەرەودان بە ریفۆرمی پەروەردە، تەندروستیی جیهانی، گەشەی ئابووری و ئازادیی مرۆیی بە جەختکردنەوەیەکی تایبەت لەسەر دروستکردنی دەرفەتێ نوێ بۆ ژنانی سەرانسەری جیهان، دەگرتەخۆی. نیعمەت بوو بۆم کە تاکە سەرۆك بووم ئۆفیس جێ بێڵم و هێشتا دایك و باوکم ماین و سوپاسگوزارم بۆ ئەو کاتە زیاترەی لەگەڵیاندا بەسەر دەبەم. لە حوزەیرانی ٢٠٠٩دا، من و لۆرا چووینە پاڵ بنەماڵە گەورەکەمان لە (کێنێبەنکپۆرت) بۆ یادکردنەوەی هەشتاو پێنج ساڵەی لەدایکبوونی باوکم کە بە بازدانێکی تری پەرەشوتەوە ئاهەنگی پێوە گێڕا. دایکم توانجی ئەوە تێگرت کە هەڵبژاردنی شوێنی نیشتنەوەکەی، کەنیسەی ئوسقوفیی سەینت ئانس ئێپیسکۆپاڵ، ستراتیژییە. ئەگەر بازدانەکە باش دەرنەچووایە، لانی کەم لە نزیك گۆڕستانەوە دەبوو جارجارە، بیرهێنەرەوەیەکی ئەوە دروست دەبێت کە ژیان چەندە گۆڕاوە. ماوەیەکی کورت دوای ئەوەی ڕۆیشتین بۆ دالاس، من (بارنی)م بۆ پیاسەیەکی بەرەبەیانی ئەو دەورووبەرە برد. لەماوەی زیاتر لە دەیەیەکدا شتێکی وام ئەنجام نەدابوو. بارنی قەت ئەمەی بەخۆیەوە نەبینیبوو- تەواوی ژیانی لە کۆشکی سپی، کامپ دەیڤد و کراوفۆرد

بەسەر بردبوو. بارنی فریزەکەی دراوسێکەمانی کردە ئامانج کە لەوێ دەستبەجێ بە ئێشی خۆیەوە سەرقاڵ بوو. لەوێ، من سەرۆکی پێشووی ئەمریکا بووم بە کیسەیەکی پلاستیکی بەدەستەوە بۆ کۆکردنەوەی ئەو شتەی بۆ ماوەی هەشت ساڵ خۆم لێی لادەدا.

***

رۆژی پاش ئەوەی ئۆفیسم جێ هێشت، دەستم کرد بە نووسینی ئەم کتێبە. کارکردن لەسەر ئەمە، دەرفەتێکی گەورە بووە بۆ تێرامان و هیوادارم کە ئەوەندەی من خۆشیم لە نوسینی بینیووە خۆشیتان لە خوێندنەوەی ئەم بیرۆکانە وەرگرتبێت.

کاتێك دەستم کرد بە بونیادنانی ئەم کتێبە لەسەر خاڵە گەورەکانی بڕیاردان، دەمزانی کە بەو مانایەش دەبێ کە هەندێ لایەنی سەرۆکاتیم لادەبەم. من بە تەواوی رووماڵی دەسکەوتەکانی بەرنامەی دەرەوەم نەکرد، وەکو رێککەوتننە ناوکییە مەدەنییە مێژووییەکان لەگەڵ هیندستان یان دەستپێشخەریی (مێریدا) بۆ شەڕ دژی ماددەی هۆشبەر لەگەڵ مەکسیکدا. من تەنیا چەند قسەیەك بۆ تۆماری پەیوەست بە وزە و ژینگە تەرخان دەکەم و باسی بڕیارەکەم ناکەم بۆ دروستکردنی گەورەترین رووبەرەکانی پارێزگاری لە ژیانی دەریایی لە جیهاندا. بەهەمان شێوە باسێکی هەوڵە سەرکەوتووەکانی باشکردنی خزمەتگوزارییەکان بۆ جەنگاوەرە دێرینەکان و کەمکردنەوەی بەکارهێنانی ماددەی هۆشبەر لەلایەن هەرزەکاران و بێ جێگە و رێگەیی درێژخایەن لادەبەم. هەموو ئەو دەستکەوتانە سەرچاوەی شانازین و من سوپاسگوزاری ئەوانەم کە یارمەتیدەر بوون لە بەرجەستەکردنیان.

لەبری رووماڵکردنی هەر پرسێك، هەوڵمداوە روویەکی ئەو بڕیارە هەرە چارەنووسسازانە پیشانی خوێنەر بدەم کە هاتوونەتە سەر مێزەکەم. هەروەکو هیوادارم روونم کردبێتەوە، بڕوام وایە کە هەندێ لەو بڕیارانەم راست بوون و هەندێکیشیان بەهەڵەداچوون. بەڵام لە هەر یەکێکیاندا، ئەوەم کرد کە پێم وابوو لە باشترین بەرژەوەندیی وڵاتەکەماندایە.

هێشتا زۆر زووە کە بڵێین زۆرێك لە بریارەکەمان چیان لێ شین دەبێت. وەکو سەرۆك من شەرەفی ئەوەم هەبوو کە پرسەی جیراڵد فۆرك و رۆناڵد ریگن بگێرم. خۆشبوونی فۆرد لە ریچارد نیکسن، کە جارێك لە جاران بە خراپترین هەڵەکانی مێژووی سەرۆکایەتی دادەنرا، ئێستا بە کردەیەکی لەخۆبردووانەی سەرکردایەتی لەقەڵەم دەدرێت. هەروا شتێك بوو بۆ خۆی کە لەو وتارنوسانەی کە وەکو دەبەنگ و شەڕخواز سەرۆك ریگن-یان لەقەڵەم دەدا، بیبستیت (شارەزا گەورەکەی پەیوەندیکردن) جەنگی ساردی بردەوە.

هیوادارم چەند دەیەیەك دوای ئێستا خەڵکی من وەکو سەرۆکێك ببینن کە درکی بە تەحەدییە ناوەندییەکانی سەردەمەکەمانی کردووە و سوێندی خۆمم پاراستووە بۆ پارێزگاری لە وڵات، کەسێك کە بەبێ دوودڵی سۆراخی بیروباوەڕەکانم کردووە، بەڵام هەرکاتێکیش پێویست بووبێت رەوگەکەم گۆڕیووە، کەسێك کە متمانەی بە تاکەکەسەکان هەبووە لە ژیانیاندا بژارەی خۆیان دیاری بکەن و کەسێك کە کاریگەریی ئەمریکای بەکارهێنا بۆ بەرەوپێشبردنی ئازادی. هیواداریشم ئەوان بگەنە ئەو ئەنجامەی کە من پاڵپشتی شەرەف و شکۆمەندیی ئەو ئۆفیسە بووم کە فەخرم دەکرد بە کارکردن تیایدا.

حوکمەکە لەسەر سەرۆکایەتییەکەم هەرچییەك بێت، من ئاسودەم بەو راستییەکەی کە من لەوێ نابم تا بیبیستمەوە. ئەمە خاڵێکی بریاردانە کە تەنیا مێژوو پێی دەگات.

# DECISION POINTS



GEORGE W. BUSH



لەبلاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما

نرخ (١٢٠٠٠) دینار